
تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
PKK
حەسەن جودی
مێژوویەک لە ئاگر
نهێنی خۆڕاگری بزووتنەوەی ئاپۆجی
دیمانەیەك لەگەڵ ( جەمیل بایك ) دا

# PKK

# مێژوویەک لەئاگر

## نهێنی خۆڕاگری بزووتنەوەی ئاپۆجی

## دیمانەیەک لەگەڵ ( جەمیل بایک )دا

حەسەن جودی

لەبڵاوکراوەکانی کۆمیتەی ڕاگەیاندنی ( پ ج د ک )

# ناوەرۆك

## دوو قسە بۆ مێژوویکی ئاگرین...!!

# دوو قسە بۆ مێژوویەکی ئاگرین...!!

## -١-

باوەڕناکەم بزووتنەوەیەك لەمێژوو و رۆژگاری ئەمڕۆماندا هەبێت هێندەی بزووتنەوەی (PKK) رووبەڕووی پیلانگێڕی و هێرش و شاڵاوی لەناوبردن بووبێتەوە. هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە تاوەکو ئەمڕۆ هەمیشە ئەو بزووتنەوەیە بە مەترسی هەرە مەزن دەبینرێت و هەوڵی لەناوبردنی دەدرێت. هەڵبەتە ئەمەش بێ هۆکار نییە و چەندین هۆکاری هاوبەش وتەنانەت شاراوە لەپشت سەرجەم ئەو پیلانگێڕی و هێرش و شاڵاوانەدا خۆی حەشارداوە. کەواتە ئەو هۆکارانە چیین؟ نهێنی ئەو ترس و فۆبیا مەزنە کە لەبەرامبەر بزووتنەوەی ئاپۆچی و (PKK)دا هەیە چییە؟ ئەگەر هەر لەسەرەتاوە هەوڵی لەناوبردنی ئەو بزووتنەوەیە دەدرێت، بۆچی نەك هەر لەناو نەبردرا، بەڵکو بۆتە گەورەترین بزووتنەوە لەهەر چوار پارچەی کوردستان، تەنانەت بووە بەیەکێك لەگەورەترین بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی خۆرهەڵاتی ناوین و جیهان؟ کەواتە نهێنی مەزنبوون و خۆڕاگری (PKK) چییە؟ (PKK) دووژمنی کێیە و کێ دووژمنایەتی (PKK) دەکات؟ جیهانبینی و هەڵوێست و چەمکەکانی (PKK) بۆ ژیان، مێژوو، ئازادی، وڵات، گەل، فیکر، ئایدیۆلۆژیا، شۆڕش، تاك، کۆمەڵگا، دەوڵەت، دەسەڵات، خیانەت، وڵاتپارێزی و ...هتد، چییە؟ هەروەها چۆن دەڕوانێتە کێشەی کورد، کێشەی ژن و کێشە مرۆڤایەتییەکانی تر؟ لەم پێناوەدا خاوەن چ پرۆژەیەکی چارەسەرییە؟ (PKK) خاوەن چ سیستەمێکی بیرکردنە و و ژیان و کارکردنە؟ بۆچی ئەو پیلان و هێرش و شاڵاوانەی لەناوبردن سەرەتا "ئۆجەلان" دەکەنە ئامانجی خۆیان؟ کەواتە "ئۆجەلان" کێیە و خاوەن چ فیکر و فەلسەفە و سیاسەتێکە؟ رۆڵ و پێگەی "ئۆجەلان" لەنێو ئەو بزووتنەوەیەدا چییە؟ لەبەرامبەر هەموو هەوڵەکانی لەناوبردندا، ئاسۆی داهاتووی بزووتنەوەی (PKK) چییە و چۆن دەبێ؟

گومانم نییە کە ئەم پرسیارانە و سەدان پرسیاری تر لەهۆش و هزری ئەو کەسانە دێت و دەچێت کە خوازیارن لەراستینەی ئەوە تێبگەن کە بۆچی هێندە پیلانگێڕی و هێرش و شاڵاو لەدژی (PKK) دەکرێت؟ بۆچی (PKK)ش هێندە خۆڕاگری و بەرخۆدانی دەکات و تادێت هەر هەنگاوی مەزنتر دەهاوێژێت؟

لێرەدا بۆ گەیشتن بە وەڵامی راستی سەرجەم ئەم پرسیارانە و سەدان پرسیاری دیکە دەتوانین پەنا بۆ کلیلی هەموو دەرگاکان ببەین، ئەویش مێژووە، مێژووی خودی بزووتنەوەی (PKK). بەڵام کاتێك دەرگای مێژووی بزووتنەوەی (PKK)ش دەکەینەوە ئەمجارەیان سەدان پرسیاری دیکە رووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە؛ ئەم بزووتنەوەیە چۆن و کەی و بە چ شێوەیەك لەدایکبووە و دەستی بەجموجۆڵ و تێکۆشان و بەرخۆدان کردووە؟ قۆناخەکانی پێشکەوتنی ئەو بزووتنەوەیە چیین و کەی و چۆن و بە چ شێوەیەك ئەو قۆناخانە بەدوای یەکدا هاتوون؟ چ رووبانداوە و چ پێشکەوتنێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە؟ کارەکتەرە سەرەکییەکانی هەر قۆناخێك لەو قۆناخانە کێن و خاوەن چ تایبەتمەندی و هەڵسوکەوت و پراکتیکێکن؟ هەر پرسیارێك چەندین کلکە پرسیار و لق و پۆپەی لێدەبێتەوە، لەناواخنی وەڵامی هەر پرسیارێکیشدا چەندین پرسیاری دیکە سەرهەڵدەدەنەوە... لەناکامدا خۆمان لەنێو دەریایەك پرسیاردا دەبینینەوە، کە دەگەینە وەڵامی هەر پرسیارێك زیاتر سەرسوڕمانی دەمانگرێ و خولیای پرسیاری تر و

وەڵامی ترمان لەلا زیاتر دەبێت... ئیدی چەندە لەنێو ئەو مێژووەدا قووڵ دەبینەوە هێندەش سەرسام دەبین، هێندەش لەنهێنی پیلان و هێرش و شاڵاوەکانی نەیارانی تێدەگەین... هێندەش لەنهێنی خۆڕاگری و بەرخۆدان و مەزنبوونەکەی تێدەگەین...

لەمیانەی ئەو قووڵبوونەوەیەدا؛ سەرەتا لەوە تێدەگەین کە بزووتنەوەی (PKK) وەك پشکۆیەك لەژێر خۆڵەمێشی هەزاران ساڵەی مێژوودا خۆی حەشارداوە و هەر پزیسك دەدات، تا لەزەمەنێکی شەوەزەنگی بەستەڵەکگرتوودا بڵێسە دەدات و گڕو کڵپە دەسێنێ و گڕکان ئاسا هەڵدەقوڵێ، هەڵدەقوڵێ و گڕ لەمێژوویێکی شووم، لەقەدەرێکی سەپێنراو بەردەدات... مێژوویێکی نوێ دەئافرێنێ... ئیدی مێژوو لەسەرووی قەدەرە سەپێنراوەکانەوە ڕێڕەوی خۆی دەگرێ...

لەم چوارچێوەیەدا؛ کاتێك بەهەگبەیەکی پڕ لەپرس و رامانەوە دەچینە نێو دەریای مێژووی بزووتنەوەی (PKK)وە، بەسەرهات و رووداوەکان، پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکان، پەلکێشی خۆیت دەکات و تا قووڵایی مێژووی مرۆڤایەتیت دەبات، بەجۆش و مۆڕاڵێکی بەرزەوە، بە باوەڕی و ئیرادە و وزەیەکی تۆکمەوە، جارێکی دیکە دەتگەڕێنێتەوە نێو رۆژگاری ئەمڕۆ، لەبانێژەی ئەمڕۆشەوە ئاسۆی داهاتوویێکی پڕشنگدارت نیشان دەدات. بەمەش سەفەر بەنێو ئەو مێژووی (PKK)دا، وەك سەفەرە بەنێو سەمفۆنیایەکی ئەمردا، وەك سەفەرە بەنێو رۆمانێکی بێکۆتاییدا، سەفەرە بەنێو شیعرێکی هارمۆنیدا، داستانێکی پڕ لەماجەڕادا... بێگومان وەك چۆن لەپشت ئەو سیمفۆنیایەدا؛ ئۆرکسترایەکی مەزن، مایسترۆیەکی دانا، بیسەرێکی عاشق دەبینی، ئەوا مسۆگەر لەناواخنی ئەو رۆمانەدا پاڵەوانەکان، بەمەیل و توانستی خۆیانەوە، لەنێو ناکۆکی و ململانێ دان و تادێت گرێی نێو گرفت و رووداوەکان ئاڵۆز دەبێت و رووەو کردنەوە و چارەسەری دەچێت. هەر بەهەمان شێوەش لەو شیعرەدا لەبری ریتمێکی سواو، پانتاییەکی تاریك، چێژ لە هارمۆنیایەکی هەمەچەشنە و پانتایەکی پڕ لە ئیستاتێك وەردەگریت. کاتێك کە بەپەیژەی رووداوەکانی ئەو داستانەدا هەڵدەزنێی لەپێشتدا حیکایەتخوانێك بەهەموو مەندی و حیکمەتی خۆیەوە، شێلگیرانە هەوڵدەدات ئاراستەی رووداوەکان بەرەو ئاقاری ئازادی ببات، بە قازانجی هەموو ئەوانەی عاشق و دێوانەی ئازادین بشکێنێتەوە... چونکە بەهانەی یەکەم و کۆتایی بۆ لەدایکبوونی ئەم سیمفۆنیایە، ئەم رۆمانە، ئەم شیعر و داستانە تەنیا و تەنیا ئازادییە...

بۆیە کە مرۆڤ بەنێو ئەو مێژووەدا دەگوزەرێ، بەردەوام گوێت لەو زایەڵەیە دەبێت کە بەنەغمەیەکی پڕ لەسۆزەوە دەچریکێنێ و دەبێژێ: "ئەگەر ژیانێك هەبێت، با بە ئازادی و بۆ ئازادی بێت، ئەگەر مردنێکیش هەبێت، با هەر بە ئازادی و بۆ ئازادی بێت". ئەمە فەلسەفە و کرۆك و ناوەرۆکی بانگەوازی ئەو پشکۆیەیە کە لەگەڵ یەکەم پزیسکی خۆیدا جاڕی دا... بێگومان کە مرۆڤ بەنێو مێژوویێکی ئاگریندا دەگوزەرێ، موچرك بەدوای موچرك بەگیانی مرۆڤدا دێت، تا ئاستی سەرسامبوون و شۆکبوون دەڕوات؛ چۆن مرۆڤ موچرك نایگرێت و سەرسام و شۆك نابێت کە دەبینێ؛ لەپێناو ئەو بانگەوازییە ئەمردا هەر جەستەیە دەسووتێ، هەر گیانە و هەڵدەکوروزێ... کوا چ سیمفۆنیایەك هەیە وەك ئەم سیمفۆنیایە نەغمەکانی گڕ بن؟ کوا چ رۆمانێك و شیعرێك و داستانێك هەیە وەك ئەم رۆمانە، ئەم شیعر و داستانە حەرفەکانی کڵپە بن؟ چۆن مرۆڤ شۆك نابێت هەر بەتەنیشت ئەو رۆح و جەستانەی دەبنە تۆپەڵێك ئاگر و گڕ لە هەموو ناشیرینییەکانی گەردوون بەردەدەن، رۆح و جەستەگەلێکیش هەن لەبەرد بەردترن، لەبەستەڵەك بەستەڵەکترن، وەك بڵێی گڕی هەموو گەردوون ناتوانێ خاوێنیان بکاتەوە... ئیدی ئەوە سیمفۆنیایەکە بێهەڵچوون و داچوون نابێت، رۆمانێکە بێ ناکۆکی و ململانێ نابێت، شیعرێکە و داستانێکە بێ توخمی نەزۆك و شەڕانگێز نابن...!!

بەڵام سیحری ئاگرینی ئەو مێژووە لەچی دایە؟ لەکوێ دایە؟ ئەمە نهێنییەکە و بەتینی گەرم و بڵێسەداری خۆی تا قووڵایی خۆی دەتبات، ئینجا پێت دەڵێت "ئەوە منم ... ئیدی بمناسە و لێم تێبگە...".

بۆیە ئەوەی لەم مێژووەدا دەیخوێنیتەوە نهێنی لەدایکبوون و مەزنبوونی بزووتنەوەیەکە کە هیچ کەس مەزندەی لەدایکبوونی ناکات، نەخاسمە پێشکەوتن و مەزنبوون و سەرکەوتنەکەی، ئەمە هەر لەدەرەوەی خەیاڵ دابوو... کەچی لەدەرەوەی مەزندە و شیمانەکان، بەبێ ئەوەی روخسەت لەباڵادەستەکانی ئەو جوگرافیایە و جیهان وەربگرێت، سەریهەڵدا... بەڕوو ئاسا رەگی داکوتا و باڵای کرد، چڵ و پۆپەی دەرکرد، چەندە چڵ و پۆپە دەکات ئەوەندەش رەگدادەکوتێ، چەندە بەقووڵایی مێژوودا شۆڕدەبێتەوە ئەوەندەش بەرەو لوتکە هەڵدەکشێ... ئیدی لەنێو دۆزەخی جوگرافیایەکی ونبوودا، ئەو جوگرافیایەی کە لەمێژ ساڵە هەنجن هەنجنیان کردبوو و پاشان سڕیبوویانەوە، درەختێک باڵانما دەکات و خوازیارە لەو دۆزەخەی کە پێی دەگووترێت گێژاو (کائیوس) نسێیەکی فێنك، ساباتێکی دڵڕفێن بۆ گەلانی خێر لەخۆنەدیو، بۆ ژنانی ئازارچەشتوو، بۆ مرۆڤایەتی لەسەر خاکی مێزۆپۆتامیا و هەموو جیهان بخوڵقێنێ...

**ـ ٢ ـ**

ئەوەی وا خەریکە دەیخوێنیتەوە بەرکۆڵی مێژووی تێکۆشانی سی و پێنج ساڵەی بزووتنەوەی (PKK) و ئاپۆچێتییە، لەسەر زمانی یەکێك لەپێشەنگانی ئەو بزووتنەوەیە. ئەم پەرتووکە دیمانەیەکی رۆژنامەوانییە لەگەڵ بەڕێز جەمیل بایك (هەڤاڵ جومعە) کە یەکێکە لەدامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئاپۆچێتی و (PKK)، کە بەدرێژایی تێکۆشانی سی و پێنج ساڵەی ئەو بزووتنەوەیە (تەڤگەرەیە) بەشداری و رۆڵی لەسەرجەم قۆناخەکانی تێکۆشاندا هەبووە و شایەدحاڵ و ئاگاداری رووداو و ئاڵوگۆڕ و پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکان بووە. لەمیانەی ئەم دیدارەدا بەڕێز "جەمیل بایك" بەشیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ورد و فراوانەوە بیرەوەری و رووداوەکان دەگێڕێتەوە و باس لەتەواوی قۆناخەکانی مێژووی بزووتنەوەی (PKK) لەسەرەتاوە تا رۆژی ئەمڕۆ دەکات و هێڵی گشتی ئەو مێژووە دەستنیشان دەکات، کە خۆی لەناو خودی رووداو و پێشکەوتنەکاندا بووە و کارەکتەرێکی گرنگ و چالاکی نێو ئەو مێژووەیە.

لەڕاستیدا یەکێك لەو هۆکارانەی کە هانیدام ئەم دیدارە رێکبخەم بۆنەوە دەگەڕێتەوە کە لەجیهان و خۆرهەڵاتی ناویندا بەگشتی و باشووری کوردستاندا بەتایبەتی، بەشێوەیەکی سیستەماتیك و پلان بۆکراودا، هەڵمەتێکی فراوان و، چڕوپڕ و بەردەوامی؛ رەشکردن، ناوزڕاندن، چەواشەکاری و شێواندن لەبەرامبەر راستینەی بزووتنەوەی (PKK) و رێبەر عەبدوڵڵا ئۆجەلان و شۆڕشگێڕانی نێو ئەم بزووتنەوەیە ئەنجامدراوە و پێشخراوە، لەبەرامبەر فەلسەفە و هزر و ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت و سیستەمی ژیان و بیر و کارکردنی (PKK)دا هەوڵ و تەقەللایەکی بێوچان دراوە و لەمەشدا ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتخایەنیش بێت، تاڕادەیەکی بەرچاو ئەو هەڵمەتانەیان سەریگرتووە. هەڵبەتە دامودەزگاکانی دەوڵەتە زلهێزە ئیمپریالیستەکان، تورکیا و داگیرکەرانی دیکەی کوردستان، هەروەها هێزە بەکرێگیراو و تەسلیمکارەکانی کورد و چەندین نووسەری قەڵەمفرۆش و ویژدانفرۆشی کورد و بیانی رۆڵێکی گرنگیان لەو هەڵمەتەدا بینیوە و تەنانەت لەمڕووەوە لەنێو پێشبڕکێیەکی سەرسوڕهێنەر دابوونە و تا ئانوساتی ئێستاش لەسەر پێشخستنی ئەم هەڵمەتە هەر بەردەوامن و چاوەڕێش ناکرێت "ئیمپریالیزم ـ داگیرکەرانی کوردستان ـ هێزە وابەستەکانی کورد ـ نووسەرە خودفرۆشەکان" هەروا زوو دەستبەرداری ئەم هەڵمەتە هاوبەشەیان ببن. بێگومان زۆر کەمن ئەوانەی بەبێ مەبەست و لەخافڵگیری و نەزانییەوە کەوتوونەتە خزمەتی ئەو هەڵمەتە دژە شۆڕشیەوە. بۆیە گێڕانەوە و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی مێژووی بزووتنەوەی (PKK) لەسەر زمانی خودی (PKK)ییەکان، ئەوانەی بەوپەڕی دروستی و راستگۆیی و جورئەتەوە بەردەوامی بەتێکۆشانی ئازادیخوازانەی خۆیان دەدەن، ئەرکێکی گرنگ و پڕ بەبایەخە.

بەداخەوە خودی شۆڕشگێڕانی ئەم بزووتنەوەیە لەمڕووەوە کەمتەرخەمیان نواندووە و مێژووی ئەو بزووتنەوەیەیان بەشێوەیەکی فراوان بەهەموو کەسێك نەناساندووە. ئەمەش جێی ڕەخنەیە. چونکە ناسین و تێگەیشتن لە (PKK) لەڕێی خودی (PKK) و (PKK)ییەکان ڕاستترین و زانستیانەترین ڕێگەیە بۆ ناسین و تێگەیشتن لەمێژوو و فەلسەفە و سیستەمی بیرکردنەوە و ژیان و تێکۆشانەکەی.

لەمیانەی وردبوونەوە و لێکدانەوەی سەرجەم ئەو هەڵمەتە پروپاگەندەییەی لەدژی ئەو تەڤگەرە بەڕێوە براوە دەبینرێت کە زۆر شێواز و ئوسلوب بەکاربراوە بۆ وێناکردنێکی ناشرین بۆ ئەم بزووتنەوەیە. بەر لەهەموو شتێك خواستوویانە ئەو پەیوەندییە دیالیکتییکەی نێوان " گەل، (PKK)، ئۆجەلان" بشێوێنن یان بیپچڕێنن و لەیەکدابڕاو سەیربکرێن. ئەو هێز و لایەنانە بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندییە دیالیکتکییە بشێوێنن و لەیەکدی بیپچڕێنن هەرچی بەدەمیاندا هاتووە گووتوویانە، هەرچی لەدەستیان هاتووە کردوویانە، لەکەمپینی ناوزڕاندن و ڕەشکردنەوە بگرە تادەگاتە هەوڵەکانی کوشتن و تیرۆر، لەشەڕ و هێرشبردنەوە تادەگاتە پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییەکان ...هتد، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللا بەردەوامانەیان، کەچی وەك لەمیانەی خوێندنەوەی ئەم دیالۆگەدا دەردەکەوێت؛ نەك هەر پەیوەندی تۆکمەی نێوان" گەل، (PKK) و ئۆجەلان " لاواز نەبووە و نەپچڕاوە، نەك هەر ئیرادەی ئازاد و سەربەخۆی ئەم سێینەیە بێ کاریگەر نەبووە و نەشکاوە، بەڵکو تا هاتووە ئەم ئیرادەیە بەهێز و تۆکمەتر بووە و ڕۆحی بەرگری و بەرخۆدانی، پەیوەستبوونی گەل بە فەلسەفە و ژیانی ئازادی (PKK) و ڕێبەر ئۆجەلان تا هاتووە مەزنتر بووە، تا هاتووشە باوەڕی (PKK) و ڕێبەر ئۆجەلان بەهێز و تواناو ئیرادەی گەل و مرۆڤایەتی پێشکەوتنخوازیش تۆکمە و بەهێزتر بووە. بۆیە پێویست دەکات هەرکەس و هێز و لایەنێك بخوازێت دۆستایەتی یان دووژمنایەتی ئەو پەیوەندییە دیالیکتیکیانەیەی ئەم سێینەیە بکات، ئەوا پێویستە ئەو ڕاستینەیە بەقووڵی تێبگات کە ئەو پەیوەندییە سەرچاوەی خۆی لەڕاستینەی فەلسەفە و سیستەمی بیرکردنەوە و ژیان و تێکۆشانی ڕێبەر ئۆجەلان و گەلی کوردستانەوە وەردەگرێت.

لەم ڕوانگەیەوە؛ دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە ناکرێت بەزیهنییەت و چەمك و لۆژیکە باوەکان لە (PKK) و ڕێبەر ئۆجەلان و ئاستی ئەمڕۆی گەلی کوردستان تێبگەین، چونکە بەڕێز ئۆجەلان و (PKK) بەزیهنییەت و چەمکێکی نوێوە سەریانهەڵداوە و تێکۆشاون و پەرەیان سەندووە، بەمەش کەسێتییەکی نوێ و هاوچەرخیان بۆ کورد ئافراندووە. زیهنییەتێك لەسەر بنەمای فەلسەفەیەکی پووخت و سەنتێزی (کۆتێزی)یەوە، لەتیۆری و کرداریدا بەناوێتەیی پێگەیشتووە و پێشکەوتووە، کە قۆناخ بەقۆناخ خۆی پووخت و هەڵاوێرد کردووە و گەیشتۆتە ئەو ئاستەی وەك واقیعێك و ڕاستییەك ڕەنگی خۆی دابکوتێ و لەهەڵکشاندا بێت. بەمەش مێژووی ئەم تەڤگەرە بۆتە قۆناخێکی نوێ و گرنگ لەمێژووی هاوچەرخی گەلی کوردستان و مرۆڤایەتی، پارچەیەکی دانەبڕاو لەمێژووی کوردستان، خۆرهەڵاتی ناوین و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. ئیدی لەرووپەلەکانی مێژووی تەڤگەری (PKK)دا؛ پووختەی مێژووی گەلێك کە دەستبەرداری مەیلی ئازادیخوازانەی خۆی نابێت و لەپێناو گەیشتن بەئازادی لەئاستی هەرە بڵندا قوربانی، قارەمانێتی و گیانفیدایی هەرە مەزنی نواندووە و بۆتە سەرچاوەی مۆراڵ و وزە و توانستێکی بەهادار بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین و جیهان.

ئیدی لەئاکامی تێکۆشانی شکۆدارانەی ڕێبەر ئۆجەلان و تەڤگەری (PKK) و خودی گەلی کوردستان نموونەی تاك و کۆمەڵگایەکی نوێ و هاوچەرخ ئافرێنرا، تا ئاستێکی بەرزیش توانیویەتی قۆناخی "بەگەلبوون" و "بەنەتەوەبوون"ببڕێت و بەڕادەیەك بتوانێت خۆی ناوێتەی فەلسەفەی ئازادی بکات و بەجورئەتەوە بێژێ:" ئەگەر ژیانێك هەبێت با بەئازادی و بۆ ئازادی بێت، ئەگەر مردنێکیش هەبێت با هەر بەئازادی و بۆ ئازادی بێت" و ببێتە

نموونەی" **گەلی سەرکەوتن**"، ببێتە ناسنامەیەکی ئازاد بۆ خۆرهەڵاتی ناوینێکی نوێ، ئەو گەلەی لەهەموو ئاستەکاندا نکۆڵی لێدەکرا و دەتوایەوە و قڕدەکرا، تەنانەت گەیەندرابووە ئەو قۆناخەی خۆی نکۆڵی لەخۆی بکات و رازی بێت بەم نکۆڵیکردنە و لەململانێ و ناکۆکی و شەڕ و پێکدادانە جیهانی و هەرێمییەکاندا وەك "**قۆچی قوربانی**"ی هەمیشەیی و وڵاتەکەیشی وەك "گۆڕەپانی شەڕ"ی بەردەوام وابوو، ئەمڕۆ لەسایەی ئەو تێکۆشانە چڕوپڕەی خۆی و ڕێبەر ئۆجەلان و تەفگەری (PKK)دا زۆر بەجورئەت و شێلگیرییەوە دەڵێت:"من هەم و جگە لەژیانی ئازادانە و سەرکەوتن بەهیچ شێوە ژیانێکی دیکە و ئەنجامێکی دیکە رازی نابم" و وەك ئەرکێکی شارستانی و مێژوویی، ئەخلاقی و مرۆڤایەتی ببێتە داینەمۆی دیموکراتیزەبوونی خۆرهەڵاتی ناوین و پزیسکی شۆڕشێکی زیهنی ـ ویژدانی سەرتاپاگیر...

**حەسەن جودی**

**کەرکوك ـ باشووری کوردستان**

**هاوینی ۲۰۰۸**

# پشکۆیەك لەنێو خۆڵەمێشی مێژوودا

**با سەرەتا لەم خاڵەوە دەست پێبکەین کە تەڤگەری (PKK) وەك هەر تەڤگەرێکی دیکە خاوەن مێژوویێکە، کەواتە شوێنگەی مێژووی (PKK) لە مێژووی کوردستان و هەرێمەکە و مرۆڤایەتیدا چییە؟**

(PKK) لەمێژووی مرۆڤایەتیدا شوێنگەیەکی گرنگ و تایبەتی خۆی هەیە، (PKK) بەو شتەی کە تێکیداوە و ئاشکرای کردووە، بنیادیناوە و ئافراندوویەتی و پێشیخستووە جێی خۆی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا گرتووە، هەمیش هەر لەئێستاوە جێی خۆی گرتووە. (PKK) بۆ مێژووی مرۆڤایەتی چەندین ئەرکی بنچینەیی و گرنگی پێکهێناوە. ئەو ئەرکانە چین؟ یەکەم: تاوەکو ئێستا ئەو مێژووەی مرۆڤایەتی کە دەخوێندرێت و فام دەبێت، مێژووی راستەقینەی مرۆڤایەتی نییە. بەڵکو زیاتر مێژووی دەسەڵاتەکانە. مێژوو بەگوێرەی دەسەڵات و بەرژەوەندییەکانیان و نزیکایەتیان نووسراوەتەوە. کەچی ئەوەی لەبنەڕەتدا مێژوو دەئافرێنێت کۆمەڵگای ژێرەوەیە. بەڵام وا نیشاندراوە و تێگەیەندراوە کەوا کۆمەڵگای ژێرەوە هیچ رۆڵێکی لەمێژوودا نییە، وەك بڵێی ئەوەی مێژووی ئافراندووە و پێشیخستووە دەسەڵاتدارەکان بوون، هەڵبەتە ئەمەش راست نییە. مێژووی مرۆڤایەتی لەبنەڕەتدا مێژووی کۆمەڵگاکانی ژێرەوەیە. مێژوو لەسەر

شانی کۆمەڵگای ژێرەوە پێشکەتووە و گەیشتۆتە ڕۆژی ئەمڕۆ. مرۆڤ ناتوانێت نکۆڵی لەشوێنگەی دەسەڵاتەکان لەمێژوودا بکات، جێی خۆیان هەیە، بەڵام جێی ئەوان زۆر کەم و لاوازە. دەسەڵاتەکان مێژوویان دزیوە، مێژوویان بەهەڵە نووسیوەتەوە، ئەمەشیان بەئەنقەست کردووە.

لەم خاڵەدا (PKK) و سەرۆك ئاپۆ موداخەلەی ئەمەیان کرد. مێژووی راستەقینە چییە؟ مرۆڤایەتی لەسەر کامە مێژوو گەیشتۆتە ڕۆژی ئەمڕۆ؟ ئەوەی مێژووی پێشخستووە چییە؟ راستینەی ئەو مەسەلانەیان خستەڕوو. ئەمە یەکێکە لەخاڵە گرنگەکان.

دووەم: مێژووی مرۆڤایەتی لەسەر شارستانییەتی خۆرهەڵاتی ناوین پێشکەوتووە. خۆرهەڵاتی ناوین بنچینەی مێژووی مرۆڤایەتییە، بنچینەی شارستانییەتە. مرۆڤایەتی چ هەنگاوێکی هاوێشتبێت ئەوا لەسەر ئەو بنچینەیە هەنگاوەکانی هاوێشتوون. بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو مێژووەی کەوا ئێستا دەخوێندرێت یان فام دەکرێت دەبینین خۆرهەڵاتی ناوینی تێدا نییە. وا نیشان دەدرێت کەوا مێژوو لە خۆرئاواوە دەستپێکردووە، ئەمەش شێواندن و ئاوەژووکردنێکە. چونکە وەکو باسمکرد بناخەی مێژووی هەموو مرۆڤایەتی، مێژووی پێشکەوتنی شارستانییەتەکان خۆرهەڵاتی ناوینە. لە خۆرهەڵاتی ناویندا ڕەگ و بناخەی خۆیان داکوتاوە و ئاواکردووە و لەسەر ئەو بنەمایە هەنگاویان هاوێشتووە. بەڵام مرۆڤ دەبینێت نکۆڵی لەم راستییە دەکرێت، ئەمڕۆ خۆرئاوا لەهەموو ڕوویەکەوە مۆرکی لەمێژوو داوە، بۆیە بەئەنقەست نکۆڵی لەشوێنگەی خۆرهەڵاتی ناوین لەمێژوودا دەکات. مێژووی لەخودی خۆیەوە دەستپێکردووە. (PKK)، سەرۆك ئاپۆ بۆ راستکردنەوەی ئەمە هەوڵیان دا. واتا ئەوەیان خستەڕوو کە هەموو مرۆڤایەتی و شارستانییەت لە خۆرهەڵاتی ناوینەوە سەریانهەڵداوە و پێشکەوتوون، پێویستە مرۆڤایەتی نکۆڵی لەمێژووی خۆی و ڕەگ و بناخەی خۆی نەکات. بەپێچەوانە نزیك نەبێتەوە. یەکێك لەو مەسەلانەی راستیانکردەوە ئەمەبوو.

سێیەمیشیان: لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، لەپێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا، لەشارستانییەکاندا رۆڵێکی گرنگی کوردان هەیە. شارستانییەتی ئاواکردووە و پێشیخستووە، هەموو وزە و هێزی خۆی خستۆتە نێو شارستانییەتەوە. بەڵام ئەمڕۆ کورد لە دونیادا پەراوێزخراوە،

مرۆڤ دەتوانێت بڵێت؛ کورد دایکی شارستانییەتە، دایکی مێژووی مرۆڤایەتییە، بەڵام ئەو منداڵەی لێیەوە لەدایکبووە نکوڵی لەدایکی خۆی دەکات. واتا هیچ رۆڵێك بە کورد نابەخشێت. (PKK)، سەرۆك ئاپۆ رۆڵی کورد لەمێژوودا، لەشارستانییەتدا چییە؟ بۆچی کورد ئەمڕۆ لەم دۆخەدا دەژیت؟ راستینەی ئەو مەسەلانەیان خستۆتەڕوو. واتا (PKK) لەهەموو رووێکەوە مێژووی لەشێواندن و ئاوەژووکردنەوە دوورخستەوە و راستیکردەوە، ئەو مێژووەی لینگەوقووچ بوو، خستییەوە سەرپێی خۆی.

ئەو مێژووەی دەزانرێت هەم بەشێکە لەنێو سەرتاپای مێژووی مرۆڤایەتی، هەمیش بەشێکی وەهایە کە تێیدا زۆرێك شێواندن و ئاوەژووکردنەوە هەیە. لەبنەڕەتدا ئەمە مێژووی مرۆڤایەتی نییە، بەڵکو راستینەی مێژووی مرۆڤایەتی شاردراوەتەوە. ئەم مێژووەش مێژووی کۆمەڵگای ژێرەوەیە، مێژووی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینە، لەنێویشدا شوێنگەیەکی تایبەتی کوردان هەیە. (PKK)، سەرۆك ئاپۆ ئەمانەیان خستەڕوو. بێگومان ئەمەش تێڕوانین و نزیکبوونەوەیەکی نوێیە، زیهنییەتێکی نوێیە. (PKK) لەدونیادا نزیکبوون و زیهنییەتێکی نوێی بۆ مێژوو پێشخست، لەو زیهنییەتە باوەی هەبوو گۆڕانکارییەکی مەزنی ئەنجامدا و هێشتاش ئەنجامی دەدات. ئیدی مرۆڤ ئەگەر بیەوێت بزانێت لەمێژوودا چ شوێنگەیەکی (PKK) هەیە و ئەم شوێنگەیە چۆنە، پێویستە لێرەوە (PKK) بناسێت و لێی تێبگات.

لەمێژوودا، زۆر تەڤگەر و سەرۆك دەرکەوتوون، چ بەخراپی و چ بە باشی، هەندێك شتیان بۆ مرۆڤایەتی ئافراندووە، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی مرۆڤایەتییان گۆڕیوە و پێشخستووە، یان بۆ مرۆڤایەتی ژیان و بەهایان قازانجکردووە و لەمێژوودا شوێنی خۆیان گرتووە، بەڵکو ئەوانەی بەمرۆڤایەتیشیان دۆڕاندووە ئەوانیش لەمێژوودا شوێنیان گرتووە. بەڵام بەخراپی شوێنیان گرتووە. تەڤگەرێك، سەرۆکێك لەمێژوودا چ شوێنگەیەکیان هەیە؟ مرۆڤ چ شوێنگەیەکیان پێدەدات؟ ئەمە لەسەر چ دەمێنێتەوە؟ ئەو تەڤگەرە یان ئەو سەرۆکە بۆ مرۆڤایەتی چ هەنگاوێکیان هاوێشتووە؟ چ بەهایەکیان ئافراندووە؟ چ گۆڕانکارییەکیان ئەنجامداوە؟ بەمانە دەناسرێت. ئەگەر گۆڕانکاری مەزنیان کردبێت و قۆناخێکیان بەجێهێشتبێت و قۆناخێکی نوێیان دەستپێکردبێت، لەژیاندا گۆڕانێکی مەزنیان دەستپێکردبێت، لە ئەخلاق و کولتووری مرۆڤایەتیدا

گۆڕانی مەزنیان پێکهێنابێت، ئەوا ئەو تەفگەر و سەرۆکانە جێیەکی باش دەگرن. بەوانەش دەڵێن "تەفگەری پێشەنگ" کە بۆ مرۆڤایەتی پێشەنگییان کردووە، ئەگەر گەلیش بن، پێیان دەگووترێت "گەلی پێشەنگ" ئەگەر سەرۆك بن، پێیان دەڵێن "سەرۆکی پێشەنگ". واتا ئەوانەی گۆڕانکاری بنچینەیی و مەزنیان ئەنجامداوە، مۆرکی خۆیان لەمێژوو و ژیان داوە، ئەوەی لەمێژوودا گۆڕانکاری مەزنیان ئەنجام دابێت ئەوا بەهەمان شێوە شوێنگەیەکی مەزن دەگرن.

ئیدی سەرۆك ئاپۆ و (PKK)ش لەمێژووی مرۆڤایەتیدا لەبەر ئەوەی راستینەی مرۆڤایەتییان لەهەموو رووێکەوە دەرخستۆتەڕوو، شێواندن و ئاوەژووکردن لەمێژووی مرۆڤایەتیدا چین و چۆن و لەکوێدا دەستپێکردووە و پێشکەوتووە؟ چۆن مێژووی راستەقینەی مرۆڤایەتی شاردراوەتەوە، ئەوەیان خستەڕوو. لەزیهنییەتدا گۆڕانکارییەکی زۆر مەزنیان ئەنجام داوە. ئەو زیهنییەتەی تاکو ئێستا هەیە رەتدەکەنەوە و نزیکبوون و زیهنییەتێکی نوێ پێشدەخەن، رووە راستەقینەکەی مێژوو دەردەخەنەڕوو. بۆیە گۆڕانکارییەکی مەزن لەمێژووی مرۆڤایەتی دەئافرێنن. تاوەکو ئێستا کەسێك گۆڕانکارییەکی بەمشێوەیەی نەخستۆتە پێشخۆی و جورئەتی بەمشێوەیەی نەکردووە و گۆڕانکارییەکی وەهاشی ئەنجام نەداوە. بۆیە شوێنگەی (PKK) و سەرۆك ئاپۆ لەمێژووی مرۆڤایەتیدا شوێنگەیەکی تایبەت و پڕ گرنگی خۆیان هەیە.

## ئەگەر شۆڕشگێڕێتی موداخەلەکردنی مێژووە، ئەوا ئەو کاتە ئەو موداخەلەیەی کەوا (PKK) لەمێژوودا کردوویەتی چییە؟

راستە شۆڕشگێڕێتی موداخەلەکردنی مێژووە. ئەگەر لەمێژوودا، ئیدی چ مێژووی مرۆڤایەتی بێت، یان مێژووی گەلێك بێت، رەگەزێك بێت، یان هی چینێك بێت، ئەگەر لەقۆناخێکی مێژوویاندا لەپەلوپۆ کەوتوون و خۆیان ونکردووە و کەتوونەتە نێو گێژاوە و پێشناکەون، لەدۆخی وەهادا پێویست دەکات موداخەلەیەك ئەنجام بدرێت. هەمیش موداخەلەکە بەشێوەیەك راست بێت کەوا رێ لەپێش ئەو دۆخە بگرێت. بەڕادەیەك

مرۆڤایەتی، یان گەلەکە، یاخود چینەکە، لەو دۆخە رزگاری ببێت و زەبری بەرنەکەوێت و نەکەوێت و لاواز و پەرشوبلاو نەبێت، تەنانەت بۆ ئەوەش کە لەناو نەچێت. چونکە کاتێك مرۆڤ لەمێژوو دەڕوانێت، تەنانەت لەرۆژگاری ئەمرۆشدا زۆر شت هەن مرۆڤایەتی دەخەنە نێو مەترسییەوە. بۆ نموونە؛ ئەمرۆ مرۆڤایەتی، وەك دەگووترێت؛ ئەگەر تەدبیر وەرنەگیردرێت زەبرێکی مەزنی بەردەکەوێت. وەك دەڵێن: کێشەی ئیکۆلۆژی (ژینگەیی) پڕ جددی لەئارادا هەیە، ئەمەش هەڕەشە لەژیانی تەواوی مرۆڤایەتی دەکات. هەڵبەتە ئەمەش راستە. کەواتە ئەمرۆ بۆ مرۆڤایەتی کێشەیەکی وەها جددی هەیە، بێسنوور هەڕەشە لەژیانی مرۆڤایەتی دەکات، هەروەها چەکە ئەتۆمی و کیمیاوی و بایۆلۆژییەکانیش بەهەمان شێوە هەڕەشە لەژیانی هەموو مرۆڤایەتی دەکەن. لێرەدا پێویستە موداخەلەیەك بۆ سەر دۆخی ئەمرۆی مرۆڤایەتی بکرێت. لەم رووەوە کێ ئەم موداخەلەیە بکات و پێش لەمانە بگرێت، ئەوا لەمێژووی مرۆڤایەتیدا شوێنگەیەکی شکۆدار دەگرێت. کێ ئەم وێرانکاری و تێکدادانە نەبینێت و بەردەوام بکات و تەنانەت زیاتری بکات، ئەوا لەمێژوودا جێیەکی خراپ دەگرێت.

بۆ نموونە؛ بۆ گەلی کورد ئەو ژیانەی تێیدا دەژیا ژیان نەبوو، دەژیا یان دەمرد دیار نەبوو، ئەگەر گەلێك لەدۆخێکی بەمشێوەیەدا بێت پێویستە موداخەلەیەك ئەنجام بدرێت، ئەگەر بۆ ئەو دۆخە موداخەلە نەکرابایە، ئەوا نەدەتوانرا ئەو گەلە لەو دۆخە دەربخرێت و دەرئەنجام بەو شێوەیە رۆژانە دەمرد و لەناو دەچوو.

کە مرۆڤ لە مێژووی مرۆڤایەتی، گەلان، چینەکان، عەشیرەتەکان، ئایینەکان و ئایینزاکان دەڕوانێت، دەبینێت کە لەم پێناوەدا خەباتیان کردووە، رێکخستنیان پێشخستووە، شەڕیان کردووە و تێکۆشانیان پێشخستووە. هەموو ئەمانە بۆچی بوون؟ بۆ موداخەلەکردنی مێژووە، تاکو خۆیان لەلاوازی و پیسی رزگار بکەن. بۆ ئەوەی بتوانن بژین و بەها بۆخۆیان بئافرێنن و لەکارواندا بەجێنەمێنن. هەمووی لەم پێناوەدا بووە. ئیدی شۆڕشگێڕی بەتەواوی لە کامە خاڵدا پێویستە؟ لەخاڵێکدا کە مرۆڤایەتی، یان گەلێك، چینێك بکەوێتە نێو مەترسییەوە، موداخەلەی شۆڕشگێڕی پێویستە. بێگومان پێویستە ئەمەش راست ئەنجام بدرێت. واتا هەر موداخەلەیەکیش ئەنجامگیر نابێت و پێش لە وێرانکاری و پەرشوبلاوی و مەرگ ناگرێت و پێشکەوتن و سەرکەوتن

بەدیناهێنێت. بۆیە مرۆڤ ناتوانێت بەهەر هەموو موداخەلەیەك بڵێت: ئەوە موداخەلەیەکی شۆڕشگێڕییە. کەواتە کامە موداخەلە شۆڕشگێڕییە؟ ئەو موداخەلەیەی کە پێش لەخراپی و پەرشوبڵاوی و لەناوچوون دەگرێت، پێشکەوتن و سەرکەوتن، ژیان و مەزنکردنی بەهاکان لەگەڵ خۆیدا دێنێت و دەبێتە موداخەلەیەکی شۆڕشگێڕی.

لەم روانگەیەوە موداخەلەی (PKK)ش موداخەلەیەکی شۆڕشگێڕییە، بۆچی شۆڕشگێڕییە؟ چونکە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) هەم بۆ مێژووی مرۆڤایەتی، هەم بۆ مێژووی خۆرهەڵاتی ناوین، هەمیش بۆ مێژووی گەلی کورد موداخەلەیەکی مەزنیان ئەنجام دا. لەو مێژووانەدا راستی چییە؟ ئەوەی کە مرۆڤایەتی و خۆرهەڵاتی ناوین و کورد بەرەو پێشەوە دەبات و سەری دەخات. ئەی چ هۆکارێك بۆ دواوەیان دەگەڕێنێتەوە و بە دۆڕاندنیان دەدا و مەترسی دروست دەکات؟ ئەمانەیان خستەڕوو. واتا لەو مێژووانەدا چ بەبنچینە وەربگیردرێت؟ چ پەسند بکرێت و چ پەسند نەکرێت؟ ئەمانەشی خستەڕوو. لێرەدا سەرۆك یەکلاییبوونەوەیەکی پێشخست. چی هی مرۆڤایەتییە و چی هی مرۆڤایەتی نییە، لەکوێدا هەڵە و خراپی هەیە؟ چ بۆ مرۆڤایەتی، خۆرهەڵاتی ناوین و گەلی کورد پەسند بکات چیش بەلاوە بنێت؟ بۆئەوەی مێژوو بخاتەوە سەرپێی خۆی و لەخراپی و پیسی و چەوتی پاکبکرێتەوە. ئیدی ئەو موداخەلەیەی (PKK) و سەرۆك ئاپۆ بۆ مێژوویان کردووە لەسەر ئەو بنەمایانەیە. لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو بنەمایانە موداخەلەی کردووە بۆیە موداخەلەیەکی شۆڕشگێڕییە. چونکە دەرئەنجامی خۆی هەیە؛ پێشکەوتنی بەدیهێناوە، ئەگەر موداخەلەیەك پێشکەوتن بەدینەهێنێت و بەهاکان قازانج نەکات، ئەوا ئەو موداخەلەیە موداخەلەیەکی شۆڕشگێڕی نییە و هیچ شتێك بەقازانجکردن نادات، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەدۆڕاندن و ونکردنی دەدات. لەمێژوودا موداخەلەی بەو شێوەیە هەن و زۆر شتیان بە مرۆڤایەتی و گەلان لەدەستداوە. تەنانەت هەندێکیانی بەرەو نەمان بردووە. کەواتە هەر موداخەلەیەك کەی و چۆن ئەنجام دەدرێت چ ئەنجامێك بەدەست دەخات؟ ئەگەر مرۆڤایەتی کەوتوو بێت، یان گەلێك کەوتوو بێت و هەمیش لەئاستی هەرە خراپدا کەوتبێت و گەیشتبێتە دوا ئاستی کەوتوویی، واتا ئاستی مردن و لەناوچوون، لەکاتێکی وەهادا موداخەلەکان زیاتر ئەنجام دەدرێن. کە خراپی هەیە و

لەتەشەسەندن دایە و گەیشتۆتە دوا ئاستی خۆی، ئەوا موداخەلەكان لەكاتی وەهادا ئەنجام دەدرێن. چونكە ئەگەر لەكاتی خۆیاندا ئەنجام نەدرێن ئەوا ئەو موداخەلانەش ئەنجامگیر نابن. ئەگەر موداخەلەكە بەهزر و ڕێكخستنێكی ڕاست ئەنجام درا و بەگوێرەی ئەو هزر و ڕێكخستنەش ملیتانی ئەو موداخەلەیە دروست بوون و كار و خەباتیش بەگوێرەی ئەمە بەرەو پێشەوە برا، ئەوا ئەو كاتە ئەو موداخەلەیەش ئەنجامگیر دەبێت. واتا موداخەلەی بەمشێوەیە دەبێتە موداخەلەیەكی شۆڕشگێڕی.

سەرۆك ئاپۆ و (PKK)ش لەمێژووی مرۆڤایەتی و خۆرهەڵاتی ناوین و كوردانەدا موداخەلەیەكی بەمشێوەیان ئەنجام دا. چی هی مرۆڤایەتییە؟ چی هی خۆرهەڵاتی ناوینە؟ چی هی كوردانە؟ چیش هی ئەوان نییە؟ چی ڕاستە و چی چەوتە؟ لەكوێدا شێواندن و ئاوەژووكردنەوە هەیە؟ ئەوەی مرۆڤایەتی، خۆرهەڵاتی ناوین بێهێز و وزە دەكات چییە؟ ئەوەی لەراستینەی خۆیان دوور دەخاتەوە چییە؟ موداخەلە لەچیدا بكرێت و پێشبخرێت تاكو بتوانرێت مرۆڤایەتی، گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین و گەلی كورد ڕزگار بكرێت، لەم ڕووەوە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) سەرەتا لەرووی هزر و زیهنییەتەوە موداخەلەیەكی نوێیان ئەنجام دا، بەزیهنییەتێكی نوێ لەمێژوو نزیك بوونەوە. لەسەر ئەو بنەمایەش ڕێكخستن و ملیتانێتیان پێشخست. هەر بۆیە موداخەلەكە موداخەلەیەكی مەزنە. ئەم موداخەلەیە هەم بۆ مرۆڤایەتی، هەم بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین، هەمیش بۆ گەلی كوردستان هەم بۆ جڤاك (كۆمەڵگا)ی ژێر و هەم بۆ جڤاكی سەروو و دەسەڵاتەكان هەندێك دەرئەنجامی خستەڕوو، زۆر سەراوژێربوونی ئەنجام دا، هەر بۆیە بووە موداخەلەیەكی شۆڕشگێڕی. ئەم موداخەلەیە موداخەلەیەكی مەزنە، ئەو دەرئەنجامانەی كە بەدەستیهێناون مەزنن. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە سەبارەت بە (PKK) و سەرۆك ئاپۆ زۆر گفتوگۆ و مشتومڕ دەكرێت.



ڕێبەر ئۆجەلان لەتافی لاوێتیدا

**سەرۆك ئاپۆ دەبێژێ "مێژوو لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا شاراوەیە، ئێمەش لەقووڵایی مێژوودا شاراوەین" کەواتە (PKK) لەکوێی مێژوودا شاراوەبوو؟ ئەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا نوێنەرایەتی چ مێژوویێك دەکات؟**

بێگومان تێڕوانین و هەڵوێستێکی **سەرۆك ئاپۆ** بۆ مێژوو هەیە. لەسەرەتای مێژووی مرۆڤایەتییەوە تاوەکو ڕۆژی ئەمڕۆمان، ئەوەی مرۆڤایەتی پێشیخستووە و سەریخستووە چییە؟ ئەوەی مرۆڤایەتی لاوازکردووە و بۆ دواوەوەی گەڕاندۆتەوە و بەدۆڕاندنی داوە چییە؟ لەسەر ئەو مەسەلانە لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانی پێشخستووە. سەرۆك بینی کە ئەو مێژووەی ئەمڕۆ دەنووسرێت و وەك مێژوو دەناسرێت مێژوویێکی ڕاست نییە، چونکە لەو مێژووەدا زۆر شێواندن و ئاوەژووکردنەوە و نکۆڵیکردن هەیە.

هەروەها زۆر هەڵوێست و تێڕوانینی لەخۆوە دەستپێکردن (ناوەندگەرا ـ سەنترالیزم) هەن. چەندە ئەو شێواندن و ئاوەژووکردنەوە و نکۆڵیکردنەش لەئارادا بن و مێژووی راستەقینە و بنچینەیی شاردرابێتەوەش، بەڵام ئەوەی بینی کە مێژوو لەسەر رەگ و کۆکی خۆی شیندەبێتەوە. نەك وەك بەو شێوەیەی باسی لێوە دەکرێت و دەگووترێت مێژوو دەژێت. بۆیە سەرۆك گووتی "ئێمە لەسەرەتای مێژوو و مێژووش لەئێمەدا دەژێت" لەبەر ئەم هۆیە ئەو چەمکەی ئافراند. واتا هیچ جارێك ناکرێت نکۆڵی لەمێژووی مرۆڤایەتی بکرێت. مێژوو لەشوێنێك دەست پێناکرێت. ئەوەی مێژووی پێشخستووە ناکرێت نکۆڵی لێبکرێت. بۆ ئەمە ئەو چەمکەی پێشخست. هەر بۆیە سەرۆك گووتی: "من مێژووم خستەوە سەر پێی خۆی". ئەگەر مرۆڤ بڕوانێت دەبینێت کە؛ خۆرئاوا هەموو مێژوو بەخۆیەوە دەبەستێتەوە و لەخۆیەوە دەستپێدەکات. واتا خۆرهەڵاتی ناوین بەتەواوی بەلاوە دەنێت. لای ئەوان مێژوو بەخۆرئاوا؛ بەگریك، هێلینی...هتد دەستپێکردووە. بۆنموونە؛ تۆ دەبینیت سۆسیالیزمی بنیادنراو (ریئال سۆسیالیزم) مێژوو لەخۆیەوە دەستپێدەکات. وەك بڵێی پێش ئەو مرۆڤایەتی یان مێژوویێك نەبووبێت. ئەمەش نکۆڵیکردنێکی مەزنە، بەڵام تۆ چەندە نکۆڵی لەمێژوو بکەیت و بنچینەکەی بشاریتەوە و ئاوەژووشی بکەیت، ئەوا مێژوو دەڵێت:"من هەم" و راستینەی خۆی رووبەڕووی تۆ دەکاتەوە، خۆیشی بە تۆ بەپەسندکردن دەدات، تۆ چەندە نکۆڵی لێدەکەیت بیکە، لەئاکامدا تۆ ناتوانیت نکۆڵی لێبکەیت. تۆ چەندە شێواندن و ئاوەژووکردنەوە ئەنجام بدەیت تۆ ناتوانی راستینەی مێژوو ونبکەیت و بیشاریتەوە، چونکە بە گەلێك شێوە خۆی دەژێنێت.

بەگوێرەی نزیکبوونەوە و چەمکی سەرۆك ئاپۆ بۆ مێژوو؛ مێژوو لەشوێنێکەوە دەستپێناکات، بەکەمێك شت دەستپێناکات، بەڵکو لەرەگ و قووڵایی مرۆڤایەتییەوە مێژوو دەگرێت و دەیهێنێت. مرۆڤایەتی چۆن گەیشتۆتە رۆژی ئەمڕۆ؟ چی مرۆڤایەتی گەیاندۆتە رۆژی ئەمڕۆ؟ ئەوەی مرۆڤایەتی پێشخستووە چییە؟ ئەوەی ژیان و بەها ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤایەتی پێشخستووە چییە؟ لەسەر چ بنەمایەك پێشکەوتوون؟ ئەمانەی بۆ خۆی بەبنچینە وەرگرتووە. بۆیە دەڵێت:" مێژوو لەئێمەدا و ئێمەش لەدەستپێکی مێژوودا دەژین" واتا پەیوەندییەکی دیالیکتیکی نێوان ئەمڕۆ و

مێژوو دەستنیشان دەکات. هەروەها مێژوویش تەنیا وەك شتێکی تێپەڕبوو نابینێت، بەڵکو ئەوەی ئەمڕۆش تێیدا دەژین و بەیانیش تێیدا دەژین ئەوەش مێژووە. هەربۆیە دەڵێت: "ئەمڕۆ ئێمە لەمێژوودا دەژین".

لێرەدا دەبێت بپرسین؛ سەرۆك ئەو تەڤگەرەی لەسەر چ بنامەیەك پێشخست؟ بۆ وەڵامەکەیشی دەتوانین بڵێین؛ بەتەواوی لەسەر مێژووی مرۆڤایەتی پێشیخست. ئەگەر بپرسین؛ بنچینەی مێژووی مرۆڤایەتی چییە؟ بناخەکەی نیۆلۆتیك و شۆڕشی نیۆلۆتیکە. سەرۆك لەو قۆناخەوە مێژووی مرۆڤایەتی وەردەگرێت و دەیگەیەنێتە ڕۆژی ئەمڕۆ. ئیدی لەنێوان ئەو دوو قۆناخە زەمەنییەدا لەمێژوودا چ پێشکەتووە و چۆن پێشکەوتووە؟ لەمێژوودا شتی باش و خراپ چیین؟ هی مرۆڤایەتی و هی دەرەوەی مرۆڤایەتی چیین؟ لێکۆڵینەوە لەسەر هەمووی دەکات و مێژوو و ئەوەی ژیان و بەها بۆ مرۆڤایەتی پێشدەخات، لەهەموو خراپی و ئاوەژووکردن و بەلاڕێدابردن و نکۆڵیکردنێك پاککردەوە. چونکە دەبینێت کە بناخەی مێژووی مرۆڤایەتی نیۆلۆتیکە. ئەوە نیۆلۆتیکە بۆ مرۆڤایەتی سەرەتا هەموو بەهاکان دروست دەکات، شارستانییەتەکانیش لەسەر ئەو بناخەیە پێشدەکەون. ئەگەر مرۆڤایەتی گەیشتۆتە ئەم ئاستەی ئەمڕۆ ئەوا لەسەر ئەو بناخەیە پێشکەوتووە.

هەروەها سەرۆك دەبینێت کە لەدوای نیۆلۆتیکەوە، لەمێژوودا لادان و بەلاڕێداچوونێك هەیە. ئەو شارستانییەتەی بنیادیش دەنرێت لەسەر ئەو بەلاڕێداچوونە پێشدەکەوێت. بۆنموونە؛ لەبنچینەی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەسەڵاتداریێتی، دەوڵەت، باڵادەستێتی، لەئارادا نییە. مرۆڤایەتی لەقۆناخێکی زۆر دوور و درێژدا بەیەکسانی و لەدەرەوەی دەسەڵاتداریێتی ژیاوە، چینەکان لەئارادا نەبوون، دەسەڵاتداریێتی نەبوو. ئەمانە پاشان دەردەکەون و لەئەنجامی بەلاڕێداچوونێکدا دروست دەبن. پێویستە ئەو بەلاڕێداچوونە ڕاستبکرێتەوە و مێژوو ڕاستەڕێی خۆی بگرێت، بۆ ئەوەی ئەو بەلاڕێداچوونە ڕاستبکرێتەوە بەرخۆدانێکی زۆر مەزن بۆ ئازادی ئەنجام دراوە، چەندین ئایین، ئایینزا و ئایدیۆلۆژیا دەرکەوتوون، لەپێناوی ئەوەی ئەو بەلاڕێداچوونە نەهێڵن. هەموو ئەو تەڤگەرانە بۆ ئەوە دەرکەوتوون، تاوەکو ئەو خراپییەی لەنێو مرۆڤایەتیدا دەرکەوتووە پاکبکەنەوە. هەمووی هەوڵدانن بۆ ئەوەی ئەو زوڵم و زۆرییەی هەیە نەیهێڵن و

لەجێگەیدا ئازادی، یەكسانی و دادپەروەری بەدیبهێنن. هەموویان لەم پێناوەدا خەبات و شەڕ و تێكۆشانیان كردووە، ئەوەی مێژووی پێشخستووە و بۆتە دینامیكیەتەكەیشی، ئەوەیە، ئەوەی مرۆڤایەتیشی ژیاندووە هەمان شتە.

بۆیە سەرۆك ئاپۆ لەسەر بناخەی قۆناخی نیۆلۆتیك، واتا لەسەر بەهاكانی كۆمینالی دیموكراتی، هەموو ئەو شەڕ و تەڤگەر و تێكۆشانانەی بۆ ئازادی، دادپەروەری و دیموكراتی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا دەركەوتوون بۆ خۆی بەبنچینە وەرگرتووە و كردوویەتی بەبناخەی (PKK) و (PKK)شی لەسەر ئەو بنەمایە پێشخستووە. ئەو زیهنییەتەی كە لەرێگەیەوە ئەو رێكخستنەی پێ پێشخستووە لەسەر ئەو بناخەیەیە. تەڤگەری (PKK) بەتەواوی هێز و وزەی خۆی لەمەوە وەردەگرێت. لەمێژوودا؛ لەنیۆلۆتیكەوە تا رۆژی ئەمڕۆ هەرچی بەهایەكی كۆمینالی دیموكراتی هەبێت بەبنچینەی وەرگرتووە و لەسەر ئەم بنەمایە خەباتی دیموكراتی، ئازادی، دادپەروەری و یەكسانی پێشدەخات. ئەمەش بناخەیەكی پڕ بەهێز و بنچینەییە.

ئەگەر (PKK) هێندە بەهێزە، هێندەش لەدژیدا هێرش ئەنجام دەدرێت و نەیارانی ناتوانن لەهێرشەكانیاندا ئەنجام وەربگرن، هۆیەكەی بۆ ئەو بناخە تۆكمەیە دەگەڕێتەوە. بۆیە هەموو كەسێك دەڵێت:"ئەم هێزە لەكوێ وەردەگرێت؟!!" هەڵبەتە بەگوێرەی خۆشیان هەندێك لێكۆڵینەوە و لێكدانەوەش دەكەن. شتی هەرە راست ئەوەیە كە (PKK) بناخەیەكی مێژوویی بەهێزی هەیە، چونكە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هەر شتێك كە ئازادی، دادپەروەری، دیموكراسی و یەكسانی بەبنچینە وەربگرێت كردوویەتی بەبناخە بۆ خۆی و خۆی پێ ئاواكردووە، ئەمەش ئاواكردنێكی پڕ بەهێزە و مێژووییە. ئەگەر تۆ لەسەر بناخەیەكی مێژوویی خۆت دابمەزرێنیت ئەوا دەبیتە خاوەن بناخەیەكی پڕ تۆكمە. ئیدی هێزی (PKK) لەمەدا چڕبۆتەوە. بۆیە پێویستە كەس لەشوێنێكی دیكە لەسەرچاوەی هێزی (PKK) نەگەڕێت. ئەگەر بگەڕێت ئەوا هەڵەیە و راست نییە و نایدۆزێتەوە. تەڤگەرێك چەندە لەسەر بنچینەیەكی پتەو و راست ئاوا ببێت، بەو رادەیەش بەهێز دەبێت. ئەگەر لەمێژوویش بڕوانین ئەوا دەبینین كە هەر تەڤگەرێك بەهەمان شێوە هەڵسوكەوتی كردبێت پتەو و بەهێز بووە و توانیویەتی مۆركی خۆی لەمێژوو بدات. چونكە لەبنچینەدا مێژوویان بەئامانج وەرگرتووە، بۆیە

بەهێزبوونە و مۆركی خۆیان لەمێژوو داوە و ڕۆڵی خۆیان بینیوە. هەر تەڤگەرێكیش مێژوو و بنچینەی مێژووی مرۆڤایەتی و دینامیكییەتەكەی بەبنچینە وەرنەگرتبێت، ئەگەر لێی بڕوانیت دەبینیت كە تەڤگەری لەمشێوەیە ڕۆڵێكی ئەوتۆیان نەبینیوە و هیچ گۆڕانكارییەكیشیان ئەنجام نەداوە، هەروەها لەمێژوویشدا شوێنێكیان نەگرتووە. ئەوەی لەمێژوودا شوێنگەیەكی گرتووە، وەكو گووتم؛ ئەو تەڤگەرانەن كەوا مێژوو و بنچینەی مێژووییان بەڕاستی و بۆ ئاواكردنی خۆیان بەبنەما وەرگرتووە، لەسەر بنچینەیەكی پتەو دەستیان پێكردووە، بۆیە هەروا بەئاسانی لەناونەچوونە و هەمیش گۆڕانكارییان ئەنجامداوە.

ئیدی (PKK)ش لەنیۆلۆتیك بەدواوە؛ ئەوەی مرۆڤایەتی ژیاندووە و پێشیخستووە، كە بەها كۆمینالییە دیموكراتییەكانن، بۆخۆی بەبنەما وەرگرتووە. (PKK) كۆی بەرخۆدانی ئەوانە. مرۆڤ لەمێژووی شارستانییەتدا دەبینێت كە بۆ ئازادی، دیموكراسی و یەكسانی زۆر خەبات و تێكۆشان هەن، (PKK) هەموو ئەمانە بەبنەما وەردەگرێت. چونكە ئەگەر تۆ وەها نزیك نەبیتەوە ئەوا ناتوانیت كێشەی كورد چارەسەر بكەیت. چونكە لە كوردستاندا مرۆڤایەتی كەوتۆتە ژێر پێیانەوە، ئەگەر تۆ دەخوازیت گەلی كورد هەڵبسێنیتە سەرپێ، ئەوا دەبێت بزانیت كە تۆ مرۆڤایەتی هەڵدەسێنیتە سەرپێ. كێشەكەش ئەوەیە؛ مرۆڤایەتی لەسەر چ بنەمایەك هەڵدەستێت و هەنگاو دەنێت؟ لەسەر كۆك و ڕەگی خۆی و لەسەر بەهاكانی خۆی هەڵدەستێت و هەنگاودەنێت. ئەگەر تۆ وەهات كرد ئەوا دەتوانیت ڕابوون لەمرۆڤایەتی ئەنجام بدەیت. ئەمڕۆش گەلی كورد بەمجۆرە ڕابووەتە سەرپێیان. بویە هەموو كەس سەرسووڕماوە و دەڵێت:" ئەمە چۆن ڕوویدا؟!" واتا لەبنەڕەتدا دەبووایە ئەمە ڕووینەدابایە. بۆیە نوێنەرانی سیستەمی باڵادەست دەڵێن:" ئێمە گەلی كوردمان خستبووە دۆخێكەوە هەرگیز نەدەبوو ڕابووایە، ئەمە چۆن بوو وەها ڕابوو؟" ئیدی ئەم ڕابوونەی سەرۆك ئاپۆ و (PKK)، مرۆڤایەتی لەسەر بەها و بنچینەی خۆی ڕاكردەوە سەرپێیان، هەڵبەتە ئەمەش زۆر بە زەحمەتی ئەنجام درا.

هەر بۆیە ئەو موداخەلەیەی سەرۆك ئاپۆ پێشیخست موداخەلەیەكی مێژوویی مەزنە و گەلێك دەرئەنجامیشی دەرخستۆتەڕوو، لەبەر ئەوە موداخەلەیەكی شۆڕشگێڕییە.

**بەواتایەك لەواتاكان؛ مێژووی (PKK) مێژووی سەرۆكیشە. چونكە ئەم تەڤگەرە بەو دەستپێكرد. كەواتە ئامادەكاری سەرۆك لەرووی كەسێتی، هزر، رۆح و پراكتیك بۆ ئافراندنی مێژوو و دەستێوەردان لەمێژوو بە چ شێوەیەك بوو؟ یان بڵێین لە چ واتایەكدا مێژووی (PKK) مێژووی سەرۆكیشە؟**

مرۆڤ ناتوانێت مێژووی (PKK) و سەرۆك ئاپۆ لێك جودابكاتەوە. لەوانەیە راستینەی سەرۆك و (PKK) یەك نەبن. مرۆڤ ناتوانێت تەواو بڵێت (PKK) سەرۆكە و سەرۆكیش (PKK)یە. بەلام لەبنچینەشدا هەر وایە. واتا كاتێك مێژووی (PKK) تاوتوێ دەكەیت، ئەوا لەهەمانكاتدا مێژووی سەرۆك ئاپۆش تاوتوێ دەكەیت، كە مێژووی سەرۆك ئاپۆ تاوتوێ دەكەیت، ئەوا مێژووی (PKK)ش تاوتوێ دەكەیت. لەم واتایەدا دەبنە یەك. بەلام بەتەواوی بڵێی (PKK) ئاپۆیە، ئاپۆ (PKK)یە راست نییە. لەراستیدا بەقورسایی ئاپۆ و (PKK) وەكو یەكن. ئەگەر تۆ گووتت: (PKK) ئەوا ئاپۆ بەئەقڵی مرۆڤدا دێت، ئەگەر گووتیشت؛ ئاپۆ ئەوا (PKK) بەئەقڵی مرۆڤدا دێت. تۆ ناتوانیت لەیەكتریان جودا بكەیتەوە، چونكە یەكن. بۆچی؟ چونكە راستینەی مێژوو و ئاستی پێشكەوتنی كۆمەڵگای كورد، لەرووی مێژوویی و كۆمەڵایەتییەوە لەكەسێتی سەرۆك ئاپۆدا گوزارشت لەخۆی دەكات. مرۆڤ لەكەسی سەرۆك ئاپۆدا قووڵبوونەوەیەكی مێژوویی و جڤاكی كورد دەبینێت. واتا مرۆڤ دەبینێت كە چۆن لەكەسی مرۆڤێكدا مێژوو و كۆمەڵگا پێكهاتووە؟ چۆن پێشكەوتووە؟ بۆنموونە؛ ئەگەر لەمێژووی سەرۆك ئاپۆ هەر لەمنداڵییەوە تاوەكو ئەمڕۆ بڕوانیت چ شەڕێكی كردووە؟ چۆن خۆی رێكخستووە؟ چۆن گۆڕانی لەخۆیدا ئەنجام داوە؟ چۆن مێژووی كۆمەڵگای لەخۆیدا پێكهێناوە و گوزارشتیان لێدەكات؟ ئەوا مرۆڤ دەتوانێت لەمێژووی (PKK)ش تێبگات. لەماڵ و گوندەكەیەوە بگرە تا دەگاتە لەگوند دەركەوتنی و هاتنی بۆ ئەنقەرە، لەوێشەوە بۆ (PKK) هەنگاو هاوێشتن. لەمانەدا هەمووی مرۆڤ دەتوانێت لەمێژووی (PKK) تێبگات. لێرەدا

تێدەگەین کە چۆن توانیویەتی لەکەسی خۆیدا هزرێکی سەربەخۆ بەبنچینە وەربگرێت؟ کەسێتییەکی سەربەخۆ و ئازاد چۆن ئاوادەکات؟ چۆن لەسەر ئەو بنەمایەش ڕێکخستن و جڤاکێکی ئازاد دەئافرێنێت؟ هەموو ئەمانە خەبات و شەڕی ئەون. واتا **سەرۆك ئاپۆ** سەرەتا لەگەڵ ماڵی خۆیان، گوندی خۆیان دەستی بەشەڕ کرد. ئیدی خۆی دەرخستە دەرەوەی ئەو زیهنییەتە باوەی هەبوو، ئەو ژیانەی دەگوزەرێندرا. ئەو زیهنییەت و ژیانەی پەسند نەکرد. لەو کاتەوە لێپرسینەوە و پێداچوونەوەی لە خێزان و بنەماڵە و گوند و ژیانی ئەوێ کرد. لەئاکامی ئەو لێپرسینەوە و پێداچوونەوەیەدا خۆی لەژێر کاریگەری خێزان و گوند رزگارکرد. واتا لەوێدا دەستیپێکرد، ئەو زیهنییەت، سیستەم و ژیانەی کەوا هەبوو لەهەموو ڕوویەکەوە خۆی لێپچڕاند و لەدژیاندا ڕاوەستا و ئەوانەی رەتکردەوە.

**سەرۆك ئاپۆ** دەبێژێ:" لەدروستبوونی مندا سێ قۆناخ هەیە. یەکەمیان: قۆناخی لەدایکبوونم". ئەم قۆناخەش تا دەگاتە جێهێشتنی گوند و تا دەبێتە شۆڕشگێڕ و ئاوا دەکات، ئەمە قۆناخێکە، "قۆناخی دووەمین: قۆناخی شۆڕشگێڕییە. (PKK) قۆناخی سێیەمیش: لێپرسینەوەی ئەو شۆڕشگێڕییەتەی هەیە". واتا خۆ رزگارکردنە لەو کێماسی و چەوتیانەی لەو شۆڕشگێڕییەتەدا هەیە، بەتەواوی خۆ ئاواکردنە لەسەر بناخەی زیهنییەتێکی نوێ.

بۆ نموونە؛ مرۆڤ ئەگەر لەسەر کەسێتی **سەرۆك ئاپۆ** بڕوانێت ئەوا دەبینێت کە لەسەر چ بنچینەیەك ئاوابووە و چۆن ئەمەش لە (PKK)دا پێکهاتووە. واتا **سەرۆك ئاپۆ** لەخۆیدا چی ئاواکردووە، خواستوویەتی لە (PKK)شدا و لە جڤاکیشدا هەمان شت ئاوا بکات. بۆیە مرۆڤ ناتوانێت (PKK) و **سەرۆك ئاپۆ** لەیەك جودا بکاتەوە. وەك سەرەتا گووتم؛ تەواو وەك یەك نین. بەڵام لەگشتیدا وەك یەکن. هەرچی لەخۆیدا ئاوایکردووە هەمووی لە (PKK)شدا ئاواکردووە و پێکیهێناوە. بۆیە ئەو زیهنییەتەی لەخۆیدا ئافراندوویەتی کردوویەتی بەزیهنییەتی (PKK)ش، ئەو تایبەتمەندی و پێوانانەی کە لە کەسێتی و ژیان و تەرز و شێوازی خۆیدا ئاوایکردووە هەموویانی لە (PKK)شدا ئاواکردووە. نەك هەر لە (PKK)دا لەجڤاکیشدا خواستوویەتی ئاوای بکات. لەکۆمەڵگادا لەسەر ئەو بنەمایە زۆر هەنگاویشی هاوێشتووە. واتا جڤاکێك و تەڤگەرێکی لەکەسێتی

خۆیدا بەرجەستەکردووە و لەکەسێتی خۆیشیدا (PKK) و جڤاکی بەرجەستەکردووە. هەربۆیە مرۆڤ ناتوانێت (PKK) و سەرۆك ئاپۆ زێدە لەیەکتر جودابکاتەوە، لەبەر ئەومیە جڤاك هێندە سەرۆك ئاپۆ پەسند دەکات و بۆخۆی بەبنچینە وەردەگرێت، لەهەموو رووێکەوە وەك سەرۆك ئاپۆ دمیەوێت خۆی ئاوا بکات. چونکە ئەو ئافراندنەی سەرۆك لەخۆیدا بەدیهێنا ئافراندنێکی مەزنە. چۆن ئەو ئافراندنەی بەدیهێنا؟ سەرەتا لەزیهنییەتدا بەدیهێنا، شەرێکی زیهنی بەڕێوەبرد، لەرووی زیهنییەتەوە زیهنییەتێکی ئازادیخوازی بۆ خۆی بەبنچینە وەرگرت، کە بتوانێت ئیرادە و کەسێتییەکی ئازادیخواز بئافرێنێت. لەسەر ئەو بنەمایەش پراکتیکێکی ئازادیخواز پێشبخات و ئازادی بئافرێنێت. چونکە سەرۆك ئاپۆ بەدوای ئازادیدا دەگەڕا و ئازادی بەبنچینە وەرگرت. هەر شتێك کە خزمەتی ئازادی نەدەکرد، لەدەرەوەی ئازادی بوو و کۆیلایەتی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا هەمووی رەتکردەوە، هەربۆیە شەڕێکی مەزنی لەزیهنییەتدا پێشخست، لەئاکامی ئەو شەڕەدا گەیشتە ئیرادەیەکی ئازاد، هزرێکی ئازاد. لەسەر ئەو بنەمایەش رێکخستن و ملیتانیبوونێك کە ئازادی بەبنچینە و ئامانج وەربگرێت ئاواکرد، گەلێکی ئافراند کە ئازادی بەبنچینە و ئامانج وەربگرێت. هەر بۆیە ئیرادەیەکی پتەوی کوردانی خستەڕوو، چونکە ئەو ئیرادەیەی سەرەتا لەخۆیدا ئافراندبوو، ئەو شتەی لەخۆیدا ئافراندبوو، پێکهێنانی لەنێو (PKK) و جڤاکدا بەبنەما وەرگرت.

بۆیە ئەگەر مرۆڤ بڕوانێت دەبینێت کە ئەو بەهایانەی لە سەرۆك ئاپۆدا پێشکەوت، ئەوا لە(PKK) و جڤاکیشدا پێشکەوتووە، چونکە سەرۆك ئاپۆ لەکەسێتی خۆیدا پێکهێنانی مێژوو و جڤاکی بەبنچینە وەرگرت، واتا ئەمەشی لەچوارچێوەی شەخسیدا دەرهێنا، بەتەواوی خۆی لەخۆیدا دەرهێنا و خۆی کردە (PKK) و خۆی کردە گەلی کورد، خۆی کردە مرۆڤایەتی. چونکە خواستی کێشەی گەلی کورد چارەسەر بکات، کاتێك بینی چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد چارەسەری کێشەی مرۆڤایەتییە، چونکە لە کارەکتەری کێشەی گەلی کورد دایە. بۆیە لەکێشەی کوردەوە دەستیپێکرد و خۆی گەیاندە کێشەی مرۆڤایەتی. بینی کە کێشەی کورد و کێشەی مرۆڤایەتی لەزۆر رووەوە بەیەکەوە پەیوەستن و لەیەك دەچن.

لێرەدا کاتێك خواستی کێشەی مرۆڤایەتی چارەسەر بکات، بینی کەوا کێشەی مرۆڤایەتیش پەیوەستە بەکێشەی ژنەوە. واتا لەکێشەی کوردەوە دەستیپێکرد، بینی کە کێشەی کورد پەیوەستە بەکێشەی مرۆڤایەتییەوە، کێشەی مرۆڤایەتیش کێشەی ژنە. چونکە لەمێژوودا؛ لەدەستپێکدا ژن ئازادی خۆی لەدەستداوە، هەموو کۆیلایەتییەك بە کۆیلایەتی ژن دەستیپێکردووە، هەموو کۆیلایەتی لەسەر ئەو بنەمایە پێشکەوتووە، هەموو دەسەڵاتدارێتی لەسەر ئەو بنەمایە پێشکەوتووە، ئیدی ئەگەر تۆ دەخوازیت کێشەکان چارەسەر بکەیت ئەوا دەبێت ژن بخەیتە ناوەند و تەوەری هەموویانەوە.

لەم روانگەیەوە؛ ئەوەی **سەرۆك ئاپۆ** گوزارشتی لێدەکات مێژووە، جڤاکە، چارەسەری کێشەی مێژوو و جڤاکە. مێژوو و جڤاك لەخودی خۆیدا چارەسەر کرد و لەخودی خۆیشیدا مێژوو و جڤاکی چارەسەر کرد، ئەمەش خۆ بەمەزنی ئافراندنە. لەبەر ئەوەی خۆی بەمەزنی ئافراند، (PKK)شی مەزن ئافراند، گەلی کوردیشی مەزن ئافراندەوە. بۆیە مرۆڤ ناتوانێت مێژووی **سەرۆك ئاپۆ**، (PKK)، گەلی کورد لەیەکتر جودابکاتەوە. چونکە بوون بەیەك، لەسەر بنەمای ئەو یەکبوونەش پێشکەوتن بەدیهات.

**سەرۆك ئاپۆ** هەمیشە هەموو کێشەیەکی کردە کێشەی خۆی، لەخۆیدا چەندە چارەسەری بەدیهێنابێت ئەوا لەنێو تەڤگەر و گەلیشدا خواستوویەتی چارەسەری بەدیبهێنێت، ئەمەی بەبنچینە وەرگرتووە. ئیدی پێشکەوتنی (PKK) و گەلی کورد لەسەر ئەم دیالیکتیکەیە. چونکە هەموو کێشەیەکی کردە کێشەی خۆی و لەخودی خۆیدا چارەسەری کرد، ئەوەی لەخۆیشیدا چارەسەری دەکرد لەنێو پارت و جڤاکیشدا خواستوویەتی چارەسەری بکات. ئیدی ئەمە پێشکەوتنی بەدیهێنا. لە دیالکتیکی سەرۆك ئاپۆدا چارەسەری بنچینەییە، هزری چارەسەری بەبنەماگرتن بنچینەیە، لەبەر ئەوەی چارەسەری بەبنچینە وەردەگرێت ئەوا هزرێك کە چارەسەری پێشبخات بەبنەما وەردەگرێت و کێشەکان چارەسەر دەکات، بەمە پێشکەوتن و سەرکەوتن بەدیدەهێنێت. ئەمەش پەیوەستە بەزیهنییەتەوە، زیهنییەت لەسەر چ بنچینەیەك بێت، بەگوێرەی ئەمەش ژیان، پراکتیك، ئوسلوب، کار، خەبات، کەسێتیش پێشدەکەوێت. لە زیهنییەتی سەرۆك ئاپۆدا ژیانکردن تەنیا بۆ خودی شەخسی خۆی نییە، بەڵکو بەتەواوی ژیانکردنە بۆ ئازادی گەلی کورد، ئازادی مرۆڤایەتی، ئازادی ژن، بەتەواوی ئازادی بۆ

خۆی بەبنچینە وەردەگرێت. لەبەر ئەوەی كۆیلایەتی و دەسەڵاتدارێتی و هەموو شێوەكانیان رەتدەكاتەوە. تەنانەت ژیانبوون و مردنیش هەر بۆ ئازادی بەبنچینە وەردەگرێت، لەدەرەوەی ئەمە شێوە و ژیان و مردنێكی دیكە پەسند ناكات. ئەمەش لەگەڵ خۆیدا ئیرادەیەكی ئازاد، كەسێتی ئازاد، رێكخستنێكی ئازاد، جڤاكێكی ئازاد، دەئافرێنێت.

لەمێژووی گەلی كورددا سەرۆك ئاپۆ مێژوویەكی نوێی پێشخست، هەم جڤاكی ژێرەوەی بەبنچینە وەرگرت، هەمیش لەمێژوودا رۆڵی كوردی بەبنچینە وەرگرت، هەروەها بەتەواوی خۆی خستە دەرەوەی ئەو زیهنییەتە باوەی كە هەیە. سەرەتا زیهنییەتی باوی موحاسەبە كرد، هەم لە كوردستان و هەمیش لەدونیادا، لێپرسینەوە (موحاسەبە)یەكی مەزنی پێشخست، ئیدی ئەو زیهنییەتەی رەتكردەوە و خۆی لێی رزگار كرد. هەر بۆیە ئیرادەیەكی ئازاد و كەسێتییەكی ئازادی لەخۆیدا ئافراند. ئەگەر مرۆڤ لەرووی زیهنییەتەوە ئازادی بۆ خۆی بەبنەما وەرنەگرێت، ئەوا ناتوانێت هزرێكی ئازاد، سیاسەتێكی ئازاد، رێكخستنێكی ئازاد، تەڤگەرێكی ئازاد، گەلێكی ئازاد، جڤاكێكی ئازاد، كەسێتییەكی ئازادیش پێشبخات. بەپێچەوانەوە لەبن ناوی ئازادییدا بە كۆیلایەتی یان بەشێوەیەكی دەسەڵاتدارێتی بژیت، ئەوا وەك چۆن لەسۆڤییەتدا روویدا روودەدات.

لێرەدا لەبەر ئەوەی زیهنییەتی باوی رەتكردەوە و خۆی خستە دەرەوەی ئەم زیهنییەتەوە. بۆیە بەتەواوی لەبیركردنەوە و راماندا بیركردنەوە و رامانێكی ئازادیخوازانەی بەبنچینە وەرگرت، بەڕادەیەك كەس نەیتوانی كۆنترۆڵ لەسەر سەرۆك ئاپۆ دابنێت. لەبەر ئەمەشە هیچ كەس و لایەنێك نەیانتوانیوە لەسەر (PKK)ش كۆنترۆڵ دابنێن، نەیانتوانیوە لەسەر گەلی كوردیش كۆنترۆڵ دابنێن، چونكە بەگوێرەی ئەو زیهنییەتە رێكخستن و ملیتان و گەلێكی ئافراند، ئیدی دەسەڵاتدارێتی و كۆیلایەتی پەسند ناكات، خیانەت و بەكرێگیراوێتی پەسند ناكات. بەتەواوی ئازادی بەبنچینە وەردەگرێت، بۆ ئازادی ژیانبوون، بۆ ئازادی مردن. ئەگەر مردنێكیش هەبێت با بۆ ئازادی بێت. ئەگەر تۆ لەسەر ئەو زیهنییەتە، ئیرادەیەك، كەسێتییەك، گەلێك، تەڤگەرێكت ئاواكرد ئەوا زوو بەزوویی و هەروا بەئاسانی كەس ناتوانێت چاودێری و كۆنترۆڵی لەسەر دابنێت. ئیدی ئەمە چێبوونێكی مەزنە. هێزی ئەم گەلەش لەو خاڵەوە

سەرچاوە دەگرێت. کەس ناتوانێت چاودێری بکات و تەسلیمییەتی بەسەردا بسەپێنێت. بۆچی؟ چونکە بەتەواوی ئازادی بۆخۆی بەبنچینە وەردەگرێت، لەدەرەوەی ئەمە هەر شتێکی دیکە رەتدەکاتەوە. ئەمە پەیوەست بەچییە و بەچییەوە چێبوو؟ ئەگەر سەرۆك ئاپۆ لەو زیهنییەتە باوەی هەیە خۆی رزگار نەکردبا و لێپرسینەوەی لەگەڵ خۆیدا نەکردبا و رەتینەکردبایەوە و زیهنییەتێکی دیکەی بەبنچینە وەرنەگرتبایە ئەوا ئیرادە و کەسێتی و تەڤگەر و جڤاکی سەربەخۆ پێشنەدەکەوت. بۆیە مێژووی سەرۆك ئاپۆ دەبێتە مێژووی (PKK). هەر گۆڕان و پێشکەوتنێك لەسەرۆکدا بەدیهاتبێت ئەوا ئەو گۆڕان و پێشکەوتنانە لە (PKK) و جڤاکیشدا بەدیهاتوون. بۆچی؟ چونکە سەرۆك ئاپۆ ژیانێکی شەخسی لەخۆیدا نەهێشتووە. ژیانی خۆی بەتەواوی کردە ژیانی گەل و رێکخستنەکەی، خۆی لەگەڵ گەل و رێکخستندا کردە یەك، هەموو کێشەکانی گەل و رێکخستنی کردۆتە کێشەی خۆی و لەخۆیدا چارەسەری کردووە، هەرچییەکی لەخۆیشیدا چارەسەر کردبێت ئەوا هەوڵیداوە لەنێو (PKK) و گەلیشدا چارەسەری بکات. بوونەتە یەك و تۆ ناتوانیت جودایی بخەیتە نێوانیانەوە. هەربۆیە گەل دەبێژێ: " (PKK) گەلە، گەلیش لێرەیە" و" بێ سەرۆك ژیان نابێ" چونکە ژیانی خۆی و سەرۆکی کردە یەك، چارەنووسی خۆی و سەرۆکی کردۆتە یەك. ئیدی ئاکامی ئەو زیهنییەتە و بە پراکتیك کردنی ئەو زیهنییەتەیە. ئەو زیهنییەتەی لە سەرۆك ئاپۆدا بەدیهاتووە، بەگوێرەی ئەو زیهنییەتە، پەیوەستە بەو ئەخلاق و کولتوورەی بەدیهاتووە و تەرزی بە پراکتیك بوونییەتی.

## ئەگەر لە واتایەکدا یەکە و لە واتایەکیشدا یەك نییە، کەواتە لە کوێدا مێژووی (PKK) مێژووی سەرۆك ئاپۆ نییە؟



رێبەر ئۆجەلان لەتافی لاویدا

بێگومان شەخسێك لەهەموو روویێکەوە نابێتە پارتییەك، یاخود نابێتە تەڤگەرێك و گەلێك. گەلێك یان تەڤگەر و پارتییەکیش لەهەموو روویێکەوە نابنە شەخسێك. ئەو شتەی بۆتە یەك چییە؟ لە زیهنییەت و بیرکردنەوە و راماندا، لە کولتوور و ئەخلاقدا، لە تەرز و ئوسلوبدا و لە ژیانی ئەو دایە و لە ئیرادەی ئەو دایە. ئەوەی بۆتە یەك ئەمەیە. ئەوەی نەبۆتە یەکیش شەخسێك لە هەموو روویێکەوە ناتوانێت خۆی بکات بەتەڤگەرێك یان گەلێك. ئەوەی نەبۆتە یەکیش لێرەدایە.

**لەمیانەی لێکۆڵینەوەکردنی مێژوودا، بەتایبەتی مێژووی (PKK) زۆر نزیکبوون و چەمکی هەڵە و چەوت دەردەکەونەپێش بۆ مێژوو. کەواتە ئەو نزیکبوون و چەمکە هەڵە و چەوتانەی بۆ مێژوو و مێژووی (PKK) بەتایبەتی دەردەکەون چیین؟ نزیکبوون و چەمکی راست چیین؟ مرۆڤ چۆن دەتوانێت لە مێژوو و مێژووی (PKK) نزیکبێتەوە و لێیەوە ئەنجامگیر بێت؟**

بێگومان لەنزیکبوونەوە (مامەڵەکردن) لە (PKK) و سەرۆك ئاپۆدا زۆر نزیکبوونی هەڵە هەن، هەم لەدەرەوەی تەڤگەری ئێمە و هەمیش لەنێو تەڤگەری ئێمەدا. هەر تەنیا لەدەرەوەی ئێمە نزیکبوونی هەڵە و چەوت نیین، بەڵکو لەنێو تەڤگەری ئێمەشدا هەن. ئەو نزیکبوونانە چیین؟ ئەگەر مرۆڤ بەگشتی باسیان لێوەبکات دوو مامەڵەکردن یان هەڵسوکەوت هەن: یەکەمیان بەشێوەیەکی پڕ خەیاڵی سەیری سەرۆك ئاپۆ دەکات، وەکو بڵێی کەسێکی نائاساییە و مرۆڤ ناتوانێت لێی تێبگات، وەك پێغەمبەرێك دەبینرێت، نزیکبوونێکی وەها هەیە. ئەمەش زیاتر لەنێو تەڤگەری ئێمەدا لەئارادایە، هەڵبەتە ئەمە هەڵەیە. پێویست دەکات مرۆڤ راستینەی سەرۆك ئاپۆ بناسێت و تێبگات، وەها مامەڵە لەگەڵ سەرۆك نەکرێت، پێویستە مرۆڤ وەکو پێغەمبەرێك لێی نەڕوانێت و تێگەیشتن و پەیوەستبوون پێیەوە وەها بە دۆگماتیك و خەیاڵی نەبێت. ئەمە هەڵەیە. نزیکبوونی دووەمیش لەدەرەوەی ئێمەیە، ئەمانە بریتین لە تێنەگەیشتن و نەناسینی راستینەی (PKK) و سەرۆك ئاپۆ، وەك: ناخوازن لێی تێبگەن، هەڵوێستی نکۆڵیکارانە، کەمێك شتی دەربارە دەزانن و ئەمە بەس دەبینن، ئەو جۆرە نزیکبوونە هەڵانە لەدەرەوەی ئێمە هەن.

لەبەرامبەر (PKK)شدا بەهەمان شێوە نزیکبوون و تێگەیشتنی چەوت هەن، هەندێك کەس (PKK) وەك تەڤگەرێکی میللیگەرایی دەبینن، هەندێکیش (PKK) چەپڕەو دەبینن. ئەوانەی (PKK) بەمیللیگەرا دادەنێن دەڵێن:" (PKK) تەڤگەرێکی سۆسیالیستی نییە و تەڤگەرێکی قەومییە. ئەوانەی تریش کە (PKK) چەپ دەبینن دەڵێن:"( PKK) تەڤگەرێکە وڵاتپارێز نییە و دووری کوردانە". ئەوانە وەها نزیك دەبن. هەندێك دەڵێن:"( PKK) تەڤگەرێك نییە بەئیرادە و هێزی خۆیەوە کار بکات، گرێدراوی هەندێك هێز و دەوڵەتە، ئەو هێز و دەوڵەتانەش بۆ ئەوەی تورکیا لاواز بکەن، ئەو تەڤگەرەیان دروستکردووە". واتا دەڵێن:"( PKK) تەڤگەرێك نییە لەسەر هێز و ئیرادەی خۆی رابووبێت، تەڤگەرێکی ئازادیخواز نییە". بۆیە دەڵێن:"( PKK) تەڤگەرێکی تیرۆریستە". بێگومان زۆر نزیکبوونی دیکە و بەگوێرەی خۆیان لە (PKK) دەکەن. ئەمانە هەمووی نزیکبوونی راست نیین. ئەمە لەکاتێکدا تەڤگەری (PKK) وەك چۆن تەڤگەرێکی کوردایەتی و وڵاتپارێزییە و ئەمە بەبنچینە وەردەگرێت، ئەوا

بەهەمان شێوە كێشەكانی مرۆڤایەتیش بەبنچینە وەردەگرێت. نەك وەك دەزانرێت تەنیا تەفگەرێكی قەومی یان چەپ بێت و دووری كێشەی كوردان بێت.

هەروەها سەرۆك ئاپۆ پێغەمبەرێك نییە، وەك هەندێك كەس لەناو ئێمەدا وەها هەڵسوكەوت دەكەن كە سەرۆك پێغەمبەر بێت، یان پێیان وایە مرۆڤ ناتوانێت لە سەرۆك تێبگات و تەواو بەرجەستەی بكات. یان سەرۆك ئاپۆ زۆر لەپێشە و مرۆڤ ناتوانێت پێی بگات. ئەمانە هەمووی راست نیین. بۆچی ئەو نزیكبوونانە پێشدەكەون؟ بۆچی تێگەیشتن لەراستینەی سەرۆك و (PKK) نایەتەدی؟ ئەمە پەیوەستە بەو زیهنییەتەوە. ئەگەر مرۆڤ بەزیهنییەتی باو لە (PKK) نزیك ببێتەوە ئەوا ناتوانێت لە (PKK) تێبگات، جا لەناو ئێمەدا بێت، یان لەدەرەوەی ئێمەدا بێت، ئەگەر كەسانێك ناتوانن راستینەی (PKK) و سەرۆك ئاپۆ تێبگەن، ئەوا لەبەر ئەوەیە كە تێگەیشتنیان لەگەڵ حیسابی ئەوان یەكناگرێتەوە، بۆیە ناخوازن لێی تێبگەن. لەبنەڕەتدا تێدەگەن، بەڵام بەرژەوەندی ئەوان رێگەیان پێنادات راستینەی (PKK) بڵێن. واتا ناخوازن تێیبگەن، بۆیە بەئەنقەست سەبارەت بە (PKK) و سەرۆك ئاپۆ شتی چەوت بڵاودەكەنەوە و هەر شتێك كە مرۆڤایەتی یان گەلی كورد پەسندی نەكەن و نەفرەتی لێبكەن لەسەر (PKK) و سەرۆك ئاپۆ بڵاویدەكەنەوە، بۆ ئەوەی كاریگەری سەرۆك و (PKK) بشكێنن و بێكاریگەریان بكەن. چونكە بەرژەوەندی ئەوان ئەمە دەخوازێت. بۆیە وادەكەن، لەبنەڕەتدا تێدەگەن كە سەرۆك و (PKK) چیین، لەوانەیە بەقووڵی لێی تێنەگەن، چونكە ئەو زیهنییەتەی كە هەیە مرۆڤ لەخۆیدا دەرنەخات مرۆڤ ناتوانێت بەتەواوی و لەهەموو رووێكەوە لە (PKK) و سەرۆك ئاپۆ تێبگات. بەڵام ئەوەی بخوازێت تێیبگات ئەگەر بەقووڵیش نەبێت ئەوا دەتوانێت هەندێك شتیان لێ تێبگات. هەندێك كەس تێدەگەن، بەڵام لەگەڵ بەرژەوەندییان یەكانگیر نابێتەوە، بەرژەوەندیان رێگەیان پێنادات، بۆیە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) بەهەڵە دەناسێنن، كارێكی وەها دەكەن. هەندێكیش بەراستی ناتوانن تێبگەن. چونكە بەو زیهنییەتەی هەیانە ناهێڵێت تێبگەن. ئەمەش لەبنەڕەتدا ئەو زیهنییەتە ناهێڵێت راست تێبگەن. چونكە زیهنییەتی سەرۆك ئاپۆ زیهنییەتێكی دیكەیە و لەو زیهنییەتەی ئەمڕۆ لەدونیادا هەیە، خۆی دەرخستووە و رەتیدەكاتەوە، لەدەرەوەی ئەم زیهنییەتە زیهنییەتێكی دیكە بەبنچینە وەردەگرێت.

ئیدی ئەگەر تۆ دەخوازیت لە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) تێبگەیت ئەوا پێویستە لەزیهنییەتی سەرۆك ئاپۆ تێبگەیت. واتا كام زیهنییەتە بەبنچینە وەردەگرێت؟ ئەگەر تۆ خواستت ئەو زیهنییەتە بناسیت و كەوتیتە لۆژیكی ئەو، ئەوكاتە بەئاسانی دەتوانیت لێی تێبگەیت. شتێك كە مرۆڤ لێی تێنەگات لەئارادا نییە، بەڵام ئەگەر تۆ نەخوازیت لەزیهنییەتی سەرۆك ئاپۆ تێبگەیت، بخوازیت بەو زیهنییەتەی باڵادەست تێیبگەیت ئەوا ناتوانیت تێیبگەیت. ئەو كاتە بەگوێرەی خۆت لێی تێدەگەیت. هەڵبەتە ئەمەش هەڵە دەبێت. لەوانەیە تۆ هەندێك راست تێبگەیت، بەڵام زۆر شتیش بەهەڵە تێیدەگەیت و ناتوانیت بگەیتە راستی ئەو. ئیدی لەبەر ئەمەیە نزیكبوونی هەڵە پێشدەكەوێت. چ لەناو ئێمە و چ لەدەرەوەی ئێمەش ئەوانە روودەدەن. بۆیە ناتوانن تێیبگەن. ئەو زیهنییەتە ناهێڵێت، بەڵام هەندێك لایەنیش، بۆ نموونە؛ دەوڵەتە داگیركەرەكان، دەوڵەتە سەرمایەدارەكان، جڤاكی سەردەست ئەمانە هەموویان بەئەنقەست (PKK) بەهەڵە دەناسێنن. ئەگەر بە قووڵیش نەبێت بۆخۆیان كەمێك تێدەگەن. بەڵام لەزیهنییەتی (PKK)دا مەترسی لەسەر خۆیان دەبینن، ئەگەر دووژمنایەتییەكی مەزنی سەرۆك ئاپۆ دەكرێت لەبەر ئەم هۆیەیە، ئەگەر دەڵێن:"تیرۆریستە" و پیلانگێڕی نێودەوڵەتی پێشدەخەن لەبەر ئەم هۆیەیە. چونكە بینیان كە زیهنییەت، سیستەم، ئەخلاق، كولتوور و ئەو ژیانەی كە لەئارادایە رەتدەكاتەوە و ئەلتەرناتیفێكی نوێ لەشوێنیدا پێشدەخات، ئەمەشیان بۆخۆیان پڕ مەترسیدار بینی و هەر بۆ ئەمەش پیلانگێڕی نێودەوڵەتیان پێشخست. ئیدی ئەمانە بەئەنقەست سەرۆك و (PKK) بەچەوتی دەناسێنن و دەیخەنەڕوو. بەڕادەیەك هەتا كاریگەری بشكێنن، بۆ ئەوەی ئەلتەرناتیفێك لەدژی ئەوان پێشنەكەوێت.

**بەراستی تێگەیشتنی چەوت بۆ تێكۆشانی سی ساڵەی (PKK) دەبینرێت، بۆنموونە؛ نەوەی نوێ كە چاوی خۆی دەكاتەوە (PKK) دەبینێت ئەو مێژووە نابینن، وەك بڵێی (PKK) یەكسەر لەدایكبووە و مەزن بووە. واتا ئەو مێژووە نابینن كە**

**(PKK) چۆن لەدایك دەبێت و چۆن پێشدەکەوێت و چۆن مەزن دەبێت و دەگاتە رۆژی ئەمرۆمان. بەمەش تێگەیشتنێکی راست بۆ ئەم مێژووە نابینرێت و خوێندنەوەیەکی راست بۆ مێژووی (PKK) نییە. ئەمەش لەگەڵ خۆیدا کێشە دروست دەکات. بۆ نموونە؛ وا دەبینرێت کە سەرۆك ئاپۆ دەستگیردەکرێت پاشان باس لەو مەسەلانە دەکات کە ئێستا باسی لێوە دەکات. کەچی ئەگەر چاو بە ئەدەبیاتی (PKK) بخشێنینەوە دەبینین پانزە ساڵ پێش ئێستا، تەنانەت زیاتریش باسی لەو مەسەلانە کردووە کە ئێستا باسی لێوە دەکات، تەنانەت بەفراوانی باسی لێوە کردووە... ئایا لێرەدا ئەمە بە هەڵە خوێندنەوەی مێژووە؟**

راستە، وەکو گووتم؛ هەندێك کەس بەئەنقەست مێژووی (PKK) دەشێوێنن، چونکە لەگەڵ حیسابی ئەواندا یەکانگیر نابێتەوە. زیهنییەتی سەرۆك بۆ خۆیان مەترسیدار دەبینن. هەندێکیش ناتوانن تێیبگەن، بۆیە لەتێگەیشتنیان کەموکوڕی هەیە، بۆیە دەکەونە نێو هەڵەوە. ئەمە پەیوەستە بەم خاڵەوە. ئەگەر مرۆڤ لە مێژووی (PKK) بڕوانێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، ئەو شتانەی سەرۆك لەئیمرالییەوە و لەمیانەی بەرگرینامەکانی و دیدارەکانی لەگەڵ پارێزەرەکانیدا پێشیدەخات هەمووی لەسەرەتای ئەم تەڤگەرەدا هەیە. بۆ نموونە؛ ئەگەر مرۆڤ پەرتووکی **"رێگای شۆڕشی کوردستان - مانیفێستۆ"**(١) بخوێنێتەوە و بەرگرینامەکانی ئێستای بخوێنێتەوە و لەگەڵ یەکدی بەراوردیان بکات دەبینێت زێدە جودایی لەنێوانیاندا نییە، هەموو ئەو شتانەی لە بەرگرینامەکاندا هەیە لە **"رێگای شۆڕشی کوردستان"**دا هەیە. کەواتە شتی جودا چییە؟ سەرۆك هەروەکو خۆیشی دەڵێت:" لە ئیمرالی لەبیرکردنەوە و رامانی خۆمدا گەیشتوومەتە ئاستی پاککردنەوە (پاڵاوتەکاری - هەڵاوێردکردن) و خۆم رەفینە

کردووە ( خۆم پاڵاوتەکردووە، یان خۆم هەڵاوێردکردووە) " واتا لەبیرکردنەوە و رامانی خۆیدا شتی هەڵە و کەموکوڕی بەلاوە ناوە. شتە هەڵەکانی راستکردۆتەوە، شتە پڕ کەموکوڕییەکانی کاملکردووە و دەڵێت:" لەمندا گۆڕان نەبووە، لەمندا قووڵبوونەوەیەك بەدیهاتووە" مرۆڤ کە لەسەر "مانیفێستۆ" و بەرگرینامەکان لێکۆڵینەوە بکات دەتوانێت ئەم راستییە ببینێت کە لەبنچینەدا گۆڕانکاری نیین، بەڵکو قووڵبوونەوەیەکی مەزن بەدیهاتوون، بیرکردنەوە و رامانی خۆی لە هەڵە و کەموکوڕییەکان پاڵاوتووە و هەڵاوێردی کردووە و کاملی کردووە. ئەوەی لە سەرۆك رووی داوە ئەمەیە. هەر لەسەرەتاوە ئەو زیهنییەتەی هەیبووە خستیە ژێر لێپرسینەوەوە، هەوڵیداوە لەهەموو روویێکەوە خۆی لەو زیهنییەتە باوە رزگار بکات. چەندە خۆی لێی بەدوور خست، ئەوەندەش ئەمەی لەنێو تەڤگەر و لەنێو جڤاکیشدا پێشخست. ئەگەر مرۆڤ بڕوانێت؛ لەو رۆژەوەی تەڤگەری (PKK) دەرکەوتووە تارۆژگاری ئەمڕۆ پێشکەوتنەکانی تەڤگەر و سەرۆك لەسەر ئەو بنچینەیە بەدیهاتووە، واتا لەسەر بنەمای زیهنییەتێك بووە، ئەو زیهنییەتە چییە؟ بەتەواوی بە بنەماوەرگرتنی ئیرادەیەکی ئازاد، کەسێتییەکی ئازاد، جڤاکێکی ئازادە. لەهەموو روویێکەوە رەتکردنەوەی کۆیلایەتی و دەسەڵاتدارییە. واتا لەمەدا قووڵبوونەوە هەیە، گۆڕان نییە.

بۆنموونە؛ لەساڵی (١٩٩٨)دا سەرۆك بەبۆنەی ئاگربەستەوە وتەیەکی بۆ تەلەفزیۆن پێشکەش کردبوو، چەند رۆژێك بەر لەئێستا(٢) جارێکی دیکە ئەم وتەیەی سەرۆك لە (ROJ TV) پێشکەش کرایەوە. لە تورکیادا زۆر کەناڵ لە راگەیاندنەکانی خۆیاندا گووتیان:" ئۆجەلان چۆن لە ئیمرالییەوە قسەدەکات و ئەو قسانەش چۆن دەگاتە تەلەفزیۆن و بڵاودەکرێتەوە؟" واتێگەیشت کە ئەم وتانەی سەرۆك تازە لە ئیمرالی‌یەوە گووتراوە. کەچی لەراستیدا لەساڵی (١٩٩٨)دا ئەو قسانە گووتراوە. ئەمە چ دەخاتەڕوو؟ ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەوەی لەم رووەوە لە سەرۆکدا بەدیهاتووە گۆڕانکاری نییە، بەڵکو قووڵبوونەوە هەیە. ئەوانەی ئەو مەسەلانە ئاوەژوو دەکەن ئەوا بەئەنقەست دەیکەن. وانیشان دەدەن گوایە ئەوەی لەبەرگرینامەکاندا هاتووە لەهەموو روویێکەوە نوێیە. واتا سەرۆك ئاپۆ لە قۆناخی ئیمرالی‌دا هەموو شتێکی خستۆتە لایەکەوە و سەرەتایەکی نوێی دەستپێکردووە. ئەمە وانییە.

تەنانەت ئەم قووڵبوونەوانە لەماوەی ئیمرالیشدا دەستی پێنەکردووە. مرۆڤ ئەگەر لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی (PKK) بکات ئەوا دەبینێت ئەم قووڵبوونەوەیە لەسەرەتای ئەم مێژووەدا هەنگاو بەهەنگاو دەستیپێکردووە و هاتووە و پێشکەوتووە، لە ئیمرالیشدا قووڵبوونەوەکە زیاتر پێشکەوتووە، واتا ئەم قووڵبوونەوەیە تەنیا لە ئیمرالی دەستیپێنەکردووە. هەر لەرۆژی دامەزراندنی (PKK)وە تا دەگاتە ئیمرالی ئەم قووڵبوونەوەیە هەنگاو بە هەنگاو پێشکەوتووە. سەرۆك ئاپۆ هەمیشە لەزیهنییەتی خۆیدا هەرشتێك خزمەتی ئازادی نەکردبێت بەلاوەی ناوە و پاکیکردۆتەوە، لەسەر ئەو بنەمایەش قووڵبوونەوەیەکی پێشخستووە. یەکێك خاوەن ویژدان بێت دەتوانێت ئەم راستییە ببینێت. بەڵام یەکێك ویژدانی رەشبووبێت ئەوا بەئەنقەست مەسەلەکان ئاوەژوو دەکاتەوە و دەیشێوێنێت. وەکو گووتم؛ ئەوانەی ئەمە لەگەڵ حیساباتیاندا یەك ناگرێتەوە، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی خۆیان بپارێزن هەڵدەستن بەناوزڕاندنی سەرۆك و (PKK)، تاوەکو کاریگەرییەکانیان بشکێنن. هەندێك کەسیش، جا چ لەناو ئێمەدا بن یان لەدەرەوەی ئێمەدا، لەبەر ئەوەی ناکەونە نێو قووڵایی زیهنییەتی سەرۆك ئاپۆوە و ناتوانن لە لۆژیکی ئەو تێبگەن، بەو زیهنییەتەی هەیە دەخوازن لەسەرۆك ئاپۆ و لە (PKK) تێبگەن. هەڵبەتە ئەمەش بۆخۆی ئاستەنگی هەرە مەزنە لەبەردەم تێگەیشتنی سەرۆك ئاپۆ و (PKK)دا. هەربۆیە بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆیان ئەنجام بەدەستدەخەن. ئیدی ئەگەر ئەو جۆرە نزیکبوونەوانە پێشدەکەون، لەبەر ئەم هۆیانەیە پێشدەکەون. بۆ ئەوەی راست لە (PKK) و سەرۆك ئاپۆ تێبگەن پێویست دەکات بکەونە نێو چوارچێوە و قووڵایی زیهنییەتی سەرۆك ئاپۆ و (PKK) و لۆژیکیانەوە. ئەو قووڵبوونەوەی ئەنجامدراوە و ئەو هەڵە و کەموکوڕیانەی تێیدا بژارکراوە راست تێبگەن.

**(PKK) لەتێکۆشانی سی ساڵەی خۆیدا بە زۆر قۆناخی جودا جودا تێپەڕیوە و زۆر هەنگاوی جددی بەدوای یەکدا هاوێشتووە. کەواتە مێژووی سی ساڵەی (PKK) چۆن پۆلین دەکرێ؟**

مرۆڤ دەتوانێت بەزۆر شێوە مێژووی (PKK) پۆلین بكات. یەك: لەسەرەتای لەدایكبوونی تەڤگەری (PKK) تا دەگاتە قۆناخی پیلانگێڕی نێودەوڵەتی (١٥/٢/١٩٩٩) قۆناخێكە و لەدوای پیلانگێڕی نێودەوڵەتیش قۆناخێكی ترە. بەمشێوەیە دەكرێ مێژووی (PKK) لێكۆڵینەوە و پۆلین بكرێت.

## چۆن و بۆچی وا پۆلین بكرێت؟

چونكە لەدەركەوتنی (PKK)وە تا پیلانگێڕی نێودەوڵەتی كاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو لەسەری بەهێزە. مرۆڤ دەتوانێت ئەم كاریگەرییە لەزیهنییەتدا، لەشێوەی ڕێكخستن و تێكۆشاندا، لەژیاندا، لەكولتوور و ئەخلاقدا، لەئوسلوبدا ببینێت. لەدوای پیلانگێڕی نێودەوڵەتیشەوە وەك سەرۆك دەڵێت:" بیركردنەوە و ڕامانی خۆمم ڕەفینەكرد، هەڵەكانم بەلاوەنا و پاكم كردەوە، كێماسییەكانم تەواو كرد" بۆیە لەدوای پیلانگێڕی نێودەوڵەتییەوە قۆناخێكی دیكە دەستپێدەكات. بۆچی؟ چونكە لەزیهنییەتی سەرۆك ئاپۆدا پاككردنەوەی كاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو هەیە. بۆیە بەقۆناخێكی نوێ دادەنرێت. ئەم شێوە نزیكبوونە و پۆلینكردنە ڕاستە.

هەروەها مرۆڤ دەتوانێت لەسەرەتای (PKK)وە تا دەگاتە قەڵەمبازی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) بكاتە قۆناخێك. ئەمەش دروستبوونی (PKK)یە. لە (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)یشەوە تا دەگاتە پیلانگێڕی نێودەوڵەتیش دەبێتە قۆناخێكی تر. ئەمەش لەپارتیبوونی (PKK)دا قۆناخی دووەمە. قۆناخی یەكەم: ئاواكردنی (PKK)یە. قۆناخی دووەمیش: خەباتكردنە لەپێناو ئەوەی (PKK) چۆن بگاتە بنچینە و ناسنامەی خۆی و لەسەر بنچینەی خۆیدا چۆن پێشبكەوێت؟ ئێمە لەمێژووی (PKK)دا بەم قۆناخە دەڵێین: قۆناخی دووەمی بەپارتیبوون. قۆناخی یەكەم: لەدەركەوتنەوە تا دروستبوون و تا دەگاتە قەڵەمبازی (١٥)ی ئاب. هەرچەندە (PKK) لە (١٩٧٨) دامەزراوە، بەڵام بەتەواوی نەگەیشتۆتە ناسنامە و چوارچێوەی خۆی. بۆیە ئەم قۆناخە تا (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) بەردەوام بوو. ئیدی لەدوای (١٥)ی ئابەوە چۆن بگاتە ناسنامەی خۆی و بنچینەی خۆی؟

لەسەر ئەم بنەمایە خەبات و تێکۆشان پەرەپێدەدات و جڤاك پێشدەخات. بۆیە دەڵێین؛ لەپارتیبووندا قۆناخی دووەمە. لەپیلانگێڕی نێودەوڵەتیش بەدواوە دەبێتە قۆناخی سێیەمین. ئەمەش لەپارتیبووندا قۆناخی سێیەمینە. واتا مرۆڤ دەتوانێت مێژووی (PKK) بۆ سێ قۆناخ پۆلین بکات. یەك: پارتیبوونی یەکەم. کە ئەمە چێبوونی (PKK)یە. دوو: پارتیبوونی دووەمین. کە لە (١٥)ی ئابەوە تا دەگاتە پیلانگێڕی نێودەوڵەتی. سێیەمینیش: پارتیبوونی سێیەمین. واتا لەسەر بناخەی خۆی چێبوون، ئەو هەڵانەی روویانداوە، چۆن ئەمانە بەلاوە بنرێن. لەقۆناخی سێیەمیندا ئەم پرۆسەیە دەستپێکرد، مرۆڤ دەتوانێت بەمشێوەیە پۆلینکردنێك ئەنجام بدات. چونکە لەقۆناخی دووەمیندا: بۆ ئەوەی پارتیبوون لەسەر بناخەی خۆی چێببێت و پێشبکەوێت، جڤاك و ملیتانی خەبات لەسەر ئەو بنەمایە پێشبکەون کار و خەبات کرا. لەمەشدا هەندێك ئەنجامیش بەدەستخران، بەڵام هەندێك لەرێدەرکەوتنیش روویاندا، هەندێك هەڵەش دەرکەوتن. بۆیە (PKK) تەواو لەسەر بناخەی خۆی چێنەبوو و پێشنەکەوت. ئیدی لەگەڵ هاتنی قۆناخی سێیەمیندا لەدوای پیلانگێڕی نێودەوڵەتی، سەرۆك قۆناخی پارتیبوونی سێیەمینی دەستپێکرد، بۆ ئەوەی ئەو هەڵە و کەموکوڕیانە نەمێنن، بۆ ئەوەی بەتەواوی لەسەر بنچینەی خۆی پارتیبوون پێشبکەوێت و سەربکەوێت.

لەلایەکی دیکەوە؛ مرۆڤ دەتوانێت دیسان بەشێوەیەکی دیکە لێکۆڵینەوە و پۆلین بکات: یەك؛ لەسەرەتای تەڤگەرەوە تا دەگاتە پارتیبوون قۆناخێکە، ئێمە بەم قۆناخە دەڵێین: قۆناخی گروپ، کە پاشان تەڤگەر دەکەوێتە قۆناخێکی دیکە کە پارتیبوونە، بێگومان لەنێو هەر قۆناخێکیشدا هەندێك خاڵی بنەڕەتی، وێستگەی سەرەکی هەن، مرۆڤ دەتوانێت لەسەریان رابوەستێت. دیسان دەتوانرێت لەسەرەتای تەڤگەرەوە تا دەگاتە کۆنگرەی سێیەمین (١٩٨٦) بکاتە قۆناخێك. چونکە لەسەرەتاوە تا کۆنگرەی سێیەمین چێبوونی (PKK)یە، (PKK) لەهەموو روویەکەوە یەکلایی دەبێتەوە؛ لەرووی چوارچێوە و ناسنامە و تایبەتمەندییەکانییەوە. لەدوای کۆنگرەی سێیەمینیشەوە قۆناخێکی دیکەیە. ئەم قۆناخە چییە؟ دەتوانین بڵێین؛ قۆناخی چێبوونی ملیتانی ئەو تەڤگەرەیە. واتا تا (١٩٨٦) چێبوونی پارتییە، لەوێش بەدواوە چۆن ملیتانی ئەو تەڤگەر

و پارتییە ئاوابێت؟ هەموو کار و خەبات لەسەر بنەمای ئەمەیە، واتا چۆن ملیتانی (PKK) ئاوا بکرێت. چونکە تۆ کە پارتییەکت دامەزراند و ئەو پارتییە بەهەموو ناسنامەی خۆی دەرکەوتەڕوو، بەڵام ئەمە بەس نییە، بەڵکو پێویستی بەوە هەبوو ملیتانی پارتیش ئاوا بکرێت. ئەگەر بەگوێرەی ئەم پارتییە ملیتانیش ئاوا نەکرایە ئەوا ئەو پارتییە ئەگەر بەهەموو ناسنامەی خۆیشی دەربکەوێتە روو، ئەوا ئەو پارتییە نەدەگەوتە بواری کرداری و ژیانەوە. کێ ئەم پارتییە بخاتە پراکتیکەوە؟ کێ ئەمە بخاتە پراکتیك و ژیانەوە؟ هەڵبەتە ملیتانی ئەو پارتییە ئەمانە دەکات، بۆیە پێویستبوو ملیتانی پارتی ئاوا ببێت. هەربۆیە ئەو شیکردنەوانەی سەرۆك ئاپۆ لەدوای کۆنگرەی سێیەمینەوە بەقورسایی پێشیخست هەمووی بۆ ئەوە بوو ملیتانی پارتی ئاوا ببێت، کە لەسەر ئەو بنەمایەش جڤاك بنیاد بنێتەوە. هەربۆیە سەرۆك لەکۆنگرەی سێیەمدا هەڵسەنگاندنێکی مێژوویی پێشخست و گووتی:" لێرەدا ئەوەی شیبکرێتەوە و هەڵسەنگێندرێت جڤاك و مێژووە نەك کەس و ئەمرۆیە" واتا ئەوەی لە (PKK)دا چارەسەر دەکرێت (شیدەکرێتەوە) جڤاك و مێژووە. هەڵبەتە ئەگەر تۆ لەجڤاك و مێژوودا چارەسەریت پێشخست تۆ دەتوانیت لەشەخس و لەسەردەمیشدا چارەسەری پێشبخەیت، تۆ دەتوانیت لەتاك تێبگەیت و لەسەردەم تێبگەیت. ئەگەر تۆ لەمێژوو تێنەگەیشتیت ناتوانیت لەسەردەمیش تێبگەیت. ئەگەر تۆ لەجڤاك تێنەگەیشتیت تۆ ناتوانیت لەشەخسیش تێبگەیت. ئەگەر تۆ چەندە لەمێژوو و جڤاك تێبگەیت راستینە و کێماسی و هەڵە و چەوتییەکان، خاڵە لاواز و بەهێزەکانی، باشی و خراپییەکانی، ئەگەر لەهەموو رووێکەوە چەندە لێی تێگەیشتیت تۆ دەتوانی سەردەم و شەخسیش لەهەموو رووێکەوە تێبگەیت. ئەوەی لە (PKK)دا شیکراوەتەوە و چارەسەرکراوە ئەمەیە، هەر بۆیە سەرۆك تا کۆنگرەی سێیەم خەبات و تێکۆشانی کرد بۆئەوەی چۆن (PKK) بگەیەنێتە ناسنامەی خۆی. بەکۆنگرەی سێیەمەوە ئیدی (PKK) لەهەموو رووێکەوە یەکلایی بووەوە و بەدیار بوو. لەسەر ئەو بنەمایەش ئیدی چۆن ملیتانی ئەم پارتییە ئاوابێت و جڤاکێك ئاوا بکرێت، چونکە جڤاکیش هەر لەخۆیەوە ئاوا نابێت، لەرووی هزری و رامانەوە کولتوورێك دەرکەوت، پێویست دەکات ملیتانێك ئاوا ببێت تاوەکو ئەو هزر و کولتوور و ئەخلاقە پێك بهێنێت و لەجڤاکیشدا پێشیبخات. دەکرێ

بەمشێوەیەی ئاماژەم پێدا مێژووی (PKK) پۆلین بکرێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت، پۆلینی بەمشێوەیەش راستە.

هەروەها دیسان دەکرێ مرۆڤ لەسەرەتای پەیدابوونی تەڤگەرەوە تا ساڵی (١٩٩٠) بکاتە قۆناخێك، لەساڵی (١٩٩٠)یش بەدواوە بکاتە قۆناخێکی دیکە. ئەمەش پۆلینکردنێکی هەڵە نییە. لەسەرەتاوە تا ساڵی (١٩٩٠) تەڤگەری (PKK) بەتەواوی نەبۆتە تەڤگەرێکی جڤاکی و جەماوەری، خەبات و تێکۆشانی سەرۆك لەو قۆناخەدا بۆ ئەوە بوو کە چۆن تەڤگەری (PKK) لەتەڤگەرێکی کادیرانەوە دەربخات و بیکاتە تەڤگەرێکی جەماوەری. لەئاکامی ئەمەدا تەڤگەر بووە تەڤگەرێکی جەماوەری. ئیدی لەساڵانی نەوەد بەدواوە (PKK) تەنیا تەڤگەرێکی کادیری نییە، بەڵکو تەڤگەرێکی جەماوەریشە. واتا جەماوەر بەتەواوی شوێنی خۆی تێدا گرتووە، هەر کەس شوێنی خۆی تێدا گرتووە. ئیدی (PKK) تەنیا بە کێشەی کادیرانەوە خەریك نابێت و راوەستانی لەسەر ناکات، تا ئەوکاتە زیاتر لەسەر کێشەی رێکخستنی و کادیربوون رادەوەستا، بەڵام دوای ساڵانی نەوەد ئیدی لەسەر کێشەی جەماوەریش رادەوەستا. چونکە تەڤگەر ببووە تەڤگەری گەل، گەل لەهەموو رووێکەوە شوێنی خۆی تێدا گرت. ئیدی کێشەی گەل و جەماوەریش لەنێو تەڤگەردا دەرکەوتنەڕوو، پێویستبوو ئەو کێشانەش بخاتە پێش خۆی و چارەسەریان بکات. دەکرێ ئەمە وەکو قۆناخێك لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

هەروەها دیسان لەسەرەتای تەڤگەرەوە تا دەگاتە کۆنگرەی شەشەمین (زستانی ١٩٩٩) بکرێتە قۆناخێك. دەکرێت بەم قۆناخە بگووترێت قۆناخی منداڵێتی (PKK). چونکە تا کۆنگرەی شەشەمین (PKK) نەبۆتە (PKK). هەرچەندە خۆیشی لەساڵی (١٩٧٨)دا راگەیاندبێت، بەڵام هێشتا نەگەیشتووەتە ناسنامەی خۆی. بۆیە هەموو خەباتی ئەو قۆناخە بۆ ئەوەبوو (PKK) لەهەموو رووێکەوە دیار بێت و بگاتە ناسنامەی خۆی. بۆیە مرۆڤ دەتوانێت بەم قۆناخە بڵێت: قۆناخی زارۆکی (منداڵێتی). لەو قۆناخە بەدواوە؛ کە ئیدی ناسنامەکەی دیار بوو، ملیتانی ئەم پارتییە دروست بوو، ئەو قۆناخەش دەبێتە قۆناخی لاوێتی. لەساڵی (١٩٩٠)یش بەدواوە، کە تەڤگەر لەتەڤگەرێکی کادیری دەرکەوت. بەتەواوی بووە تەڤگەرێکی جەماوەری. ئەم قۆناخەش بووە قۆناخی کامڵبوون. واتا مێژووی مرۆڤێك چۆن لەمنداڵییەوە دەستپێدەکات و بەلاوێتی

تێدەپەڕێت و دەگاتە کامڵبوون، دەکرێ مێژووی (PKK)ش وەها پۆلین بکرێت. ئەم پۆلینکردنەش هەر راستە.

دیسان مرۆڤ دەتوانێت مێژووی (PKK) لەسەرەتایەوە تا دەگاتە قەڵەمبازی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) بکاتە قۆناخێك. لەو قۆناخەدا تەڤگەری چەکداری زێدە لەئارادا نییە، بەڵکو زیاتر تەڤگەرێکی سیاسی و رێکخستنی بوو، زیاتر تەڤگەرێکی سیاسییە و قۆناخی پێشخستنی رێکخستنبوونی سەربازییە. لە (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)ەوە تا دەگاتە (١٩٩٣) قۆناخی گەریلایی و شەڕە، چارەسەرکردنی کێشەکەیە بەشەڕ. لەهەموو رووێکەوە خستنەڕوو و ناساندنی کێشەی کوردە. ئەمەش قۆناخی دووەمینە، واتا قۆناخی یەکەم خۆ رێکخستنکردنە بۆ کێشەیەك (دۆزێك). قۆناخی دووەمینیش ناساندن و خستنەڕووی کێشەکەیە، ئاواکردنی زەمینە و توانستە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە. لەساڵی (١٩٩٣)یش بەدواوە خەباتکردنە لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەکە. چونکە ئیدی کێشەکە لەهەموو رووێکەوە دەرکەوت و ناسرا. بۆ ئەوەی چارەسەر ببێت توانست و زەمینەی دروست بوو. لەساڵی (١٩٩٣)یش بەدواوە پێویستبوو کێشەکە بە سیاسی بگاتە چارەسەری، واتا قۆناخی چارەسەرکردن. لەساڵی (١٩٩٣)دا سەرۆك ئاگربەستی راگەیاند و گووتی:" ئیدی کێشەکە دەرکەوتە ڕوو، بۆ ئەوەی کێشەکە بە سیاسی و دیالۆگ چارەسەر ببێت دەرفەت و توانست دروست بووە. ئیدی پێویستە ئێمە بە دیالۆگ چارەسەری بکەین" بۆ ئەمەش ئاگربەستی راگەیاند.

## ئەو کاتە سەرۆك گووتی:" قۆناخی ژیانەوە سەرکەوت (تەواو بوو) و کاتی چارەسەرییە (دیموکراسییە)..."

راستە. دەکرێ لەساڵی (١٩٩٣) بەدواوە بە قۆناخی چارەسەری دابنرێت. هەروەها دەکرێت مێژووی (PKK) وا پۆلین بکرێت: قۆناخی ژیانەوە؛ قۆناخێکە لە سەرەتای تەڤگەرەوە تا ساڵی (١٩٩٣). لە (١٩٩٣)ش بەدواوە قۆناخی چارەسەرییە.

ئیدی هەموو ئەو پۆلینکردنانە راستن و دەکرێ مرۆڤ بەمشێوەیە لێکۆڵینەوە لە مێژووی (PKK) بکات و لێی تێبگات...

## پەراوێزەکان:

(۱) پەرتووکی "**رێگای شۆرشی کوردستان ـ مانیفێستۆ**": ئەم پەرتووکە لەساڵی (۱۹۷۸) لەلایەن رێبەر ئۆجەلانەوە نووسراوە.

(۲) مەبەستی کاتی سازدانی ئەم دیدارەیە.

## لەساڵانی حەفتاکاندا؛ لەسەردەمی دەرکەوتنی (PKK)دا ڕەوشی جیهان، خۆرهەڵاتی ناوین، تورکیا و کوردستان چۆن بوو؟

وەك دەزانرێت کاتێك کە تەڤگەری ئاپۆچی دەرکەوت، جیهان بۆ دوو جەمسەر دابەش ببوو، یەکێکیان جەمسەری سەرمایەداری (کاپیتالیزم) بوو، کە ئەمریکا پێشەنگایەتی دەکرد، دووەمیشیان جەمسەری سۆسیالیزم بوو، کە یەکێتی سۆڤییەت پێشەنگایەتی دەکرد. لەنێوان هەردوو جەمسەردا ناکۆکی و شەڕێکی مەزن هەبوو. هەر یەکێکیان دەیانویست لەهەموو ڕوویەکەوە ئەوەی دیکە لەناو ببات. بەمەشیان دەگووت "شەڕی سارد" و ئەو شەڕە لەدژی یەکتری بەڕێوەدەبرا. هەموو کەس بەگوێرەی ئەو شەڕە نزیکبوونەوەی خۆی لەهەموو کێشەکان دەکرد. تۆ لەگەڵ کاپیتالیزمیت یان لەگەڵ سۆسیالیزمیت؟ لەڕووی ستراتیژییەوە کامە هێز بۆ خۆت بەبنەما وەردەگریت؟ بۆیە هەموو هێزەکان بەگوێرەی ئەم ڕاستییە ستراتیژ و تاکتیکی خۆیان دیاردەکرد. هەندێك دەوڵەتیش لەجیهاندا هەبوون، نە لایەنگری ئەمریکا بوون نە سۆڤییەت، پێیان دەگووترا "جیهانی سێیەم" یان "وڵاتانی بێلایەن" واتا ئەوانەی بە ئەمریکا و سۆڤییەتەوە گرێدراو نەبوون، لەنێوان سۆڤییەت و ئەمریکادا ئەو هێزانە دەیانخواست خۆیان وەکو هێزێك نیشان بدەن. بۆیە پێیان دەگووترا "هێزی سێیەم". بەڵام ئەو هێزانە زێدە کاریگەریی خۆیان نەبوو، لەبنەڕەتدا جیهان دوو بەش بوو؛ یەك سۆڤییەت و ئەویتریش ئەمریکا، هەموو ناکۆکییەکان بەگوێرەی ئەم ڕاستییە شرۆڤە دەکران، ستراتیژ، تاکتیك، ڕێکخستن و خەبات و هەموو شتێك بەگوێرەی ئەمە پێشدەکەوتن.

کاتێك کە تەڤگەری ئاپۆیەتی (ئاپۆچێتی)یش دەرکەوت، جیهان بەمشێوەیە بوو، جیهان دوو بەش بوو، شەڕێکی سارد بەڕێوە دەچوو، کاریگەری ئەم ڕەوشەش لەسەر هەموو کەس و لایەنێك هەبوو. تەڤگەری ئاپۆچێتی لەبەر ئەوەی زیاتر ئازادی بۆ خۆی بەبناخە وەردەگرت، ئازادیش سۆسیالیزم گوزارشتی لێدەکرد، بۆیە ئاپۆچێتی سۆسیالیزمی بۆخۆی بەبنچینە وەرگرت. ئەو بەشەی سۆڤییەت سەرۆکایەتی دەکرد

بۆخۆی بەبناخە وەرگرت، هەم لەئایدیۆلۆژیادا و هەمیش لەرێکخستن و ستراتیژدا. بێگومان کاریگەری ئەمەش لەسەر تەڤگەرەکەمان دروست بوو، هەروەها ئەو کاتە ناکۆکی تەنیا لەنێوان سۆسیالیزم و کاپیتالیزم، سۆڤییەت و ئەمریکا نەبوو، بەڵکو ناکۆکی لەنێوان خودی سۆسیالیزمیشدا هەبوو، سۆسیالیزم لەنێو خۆیشیدا ببووە چەندین بەش؛ سۆڤییەت جودا بوو، چین جودا بوو، ئەلبانیاش جودا بوو. هەروەها سۆسیال دیموکرات هەبوون جودا بوون. واتا تەڤگەرە سۆسیالیستییەکان وەها بەش بەش ببوون و لەنێوانیاندا ناکۆکی وەها هەبوو، یەکتریان پەسند نەدەکرد و دژی یەکتری رادەوەستان. هەر لایەك خۆی بە سۆسیالیست دەبینی و ئەوەی تری مەحکوم دەکرد. لەم رووەوە لەنێو تەڤگەرە سۆسیالیستەکاندا زیاتر کاریگەری سۆڤییەت و چین هەبوو، کاریگەری ئەلبانیا و کۆمۆنیزمی ئەوروپا و سۆسیال دیموکراتەکان زێدە نەبوو، واتا دیار نەبوو کە کامەیان نوێنەرایەتی سۆسیالیزم دەکات. چونکە هەر کەسێك خۆی بە سۆسیالیست دەدیت و ئەوانی تریشی مەحکوم دەکرد، لەنێوان ئەوانیشدا شەرێکی دژوار هەبوو تاوەکو ئەوانی تر بێکاریگەر بکات و خۆی بالادەست بکات، کاتێك کە تەڤگەری ئاپۆچێتی دەرکەوت ئەو کێشەیە لەنێو سۆسیالیزمدا هەبوو.

بێگومان سەرۆك ئاپۆ ئەمەی بەراست نەبینی. واتا سۆسیالیزمی بە بناخە وەرگرت، بەڵام سۆڤییەت، چین، ئەلبانیا، کۆمۆنیزمی ئەوروپا و سۆسیال دیموکرات هیچیانی بەڕاست نەزانی. بۆیە کۆششی دەکرد لەوە تێبگات لەدەرەوەی ئەوانە سۆسیالیزم چییە و چی نییە. دەیخواست ماهییەت و جەوهەری سۆسیالیزم بەبنەما وەربگرێت. بۆیە بەشی سۆسیالیزمی زانستی بەبنەما وەرگرت، نەك سۆسیالیزمی سۆڤییەت یان چین، یاخود ئەلبانیا، کۆمۆنیزمی ئەوروپا و سۆسیال دیموکرات. دەیخواست خۆی لەژێر کاریگەری ئەوان رزگار بکات.

لەلایەکی دیکەشەوە لەنێوان کاپیتالیزم و سۆسیالیزم و تەڤگەری گەلانی ژێردەستدا ناکۆکییەك هەبوو، لە جیهاندا هەرچی گەلی ژێردەستە هەبوو لەدژی داگیرکەری (کۆلۆنیالی) و ژێردەستی تەڤگەری نەتەوەییان پێشدەخست. تەڤگەری بەمشێوەیەش پڕ بەهێز پێشدەکەوتن و لەتەڤگەری رزگاریخوازی گەلی ڤێتنامدا گەیشتبووە لوتکە، کاریگەری خۆشی هەبوو. کاتێك کە تەڤگەری ئاپۆچێتی دەرکەوت تەڤگەری گەلی ڤێتنام

زۆر بەهێز بوو، کاریگەری هەبوو لەسەر هەموو گەلانی بندەست، کاریگەری لەسەر ئەو چینانەش هەبوو کە لەدژی زوڵم تێدەکۆشان، کاریگەری خۆی لەسەر تەڤگەری ئێمەش هەبوو. لە قۆناخێکی بەو شێوەیەدا تەڤگەرەکەمان دروست بوو.

هەرێمی خۆرهەڵاتی ناوینیش بەتەواوی بەگوێرەی ئەمریکا و سۆڤییەت پارچە پارچە ببوو. ئەمریکا و سۆڤییەت دەیانخواست لەهەرێمەکەدا خۆیان بەهێز بکەن، یەکدی لاواز بکەن، هەم لەئاستی دەوڵەتاندا و هەمیش لەئاستی رێکخستنەکاندا، بەگوێرەی ئەمە دابەش ببوون، بەشێکیان لەگەڵ ئەمریکا و بەشێکیشیان لەگەڵ سۆڤییەت بوون. بۆیە ناکۆکی مەزن لەهەرێمەکەدا بەرێوە دەچوو، هەرێمی خۆرهەڵاتی ناوین لەمێژوودا دوور لەراستینەی مێژوویی خۆی و لەژێر کاریگەری ئەمریکا و سۆڤییەتدا دەگوزەرا. بۆیە هەرێمەکە زیاتر لەنێو بێ کەسێتیدا دەژیا. چونکە هەم دووری راستینەی خۆی ببوو، هەمیش تەواو وەکو ئەوەی ئەمریکا یان سۆڤییەت نەدەژیا. لەنێوان سۆڤییەت و ئەمریکادا ببووە لەیستۆکێك، ئەم هەرێمە لەرەوشێکی بەمجۆرەدا بوو، بۆیە لەنێو پەرشوبڵاوی و بێ کەسێتیدا دەژیا.

کوردستانیش پارچە پارچە ببوو، بەسەر دەوڵەتانی داگیرکەردا دابەش کرابوو، ئەو دەوڵەتانەش یان لەگەڵ سۆڤییەت یان لەگەڵ ئەمریکا پەیوەندییان هەبوو، بۆ ئەوەی سۆڤییەت و ئەمریکا بتوانن لەهەرێمەکەدا یەکتری تەنگەتاو بکەن چاوپۆشیان لەدۆستی خۆیان دەکرد. دۆستەکانیان هەرچییەکیان بکردایە، تەنانەت ئەگەر لەدەرەوەی چەمك و تێروانینی ئەوانیش بایە، بەهۆی بەرژەوەندی خۆیانەوە، هیچیان نەدەگووت.

کوردستان بەتەواوی بەش بەش کرابوو، هەر بەشێکیش لەژێر دەستی داگیرکەرێکدا بوو، کۆمەڵگای کوردستانیش لەنێوخۆیدا بەش بەش ببوو. دەتوانین بڵێین؛ گەلی کورد لە سەرەمەرگدا دەژیا. لەنێوان ژیان و مەرگدا دەهات و دەچوو. گەلێکی بەمجۆرە هەیە یان نییە؟ دەژی یان ناژی؟ دیار نەبوو. چونکە جیهان لەمیانەی یەکەمین و دووەمین جەنگی جیهانیدا رێکخرابوو و شێوەی وەرگرتبوو، لەبنەرەتدا بناخەی ئەم رێکخستنبوونە لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا دانرابوو. خۆرهەڵاتی ناوینیش لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا رێکخستەکرابوو، ئەمەش بەگوێرەی بەرژەوەندی سیستەمی کاپیتالیزم ئەنجام درابوو.

ئەم ڕێکخستەبوونەش لەسەر پارچەبوونی کوردستان و نکۆڵیکردنی کورد دامەزرابوو. بۆیە ئەو سیاسەتەی لەسەر کوردان بەڕێوە دەچوو سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردن بوو. چونکە سیستەم بەتەواوی لەسەر نکۆڵی و قڕکردنی کوردان و پارچەکردنی کوردستان ئاوابوو. سیاسەتیش لەسەر ئەم بنەمایە بەڕێوە دەچوو. کاتێك کە تەڤگەری ئاپۆچێتی سەریهەڵدا نە ئەمریکا و نە سۆڤییەت، نە خۆرهەلاتی ناوین نە دەوڵەتانی داگیرکەر، کەسیان کوردیان پەسند نەدەکرد، بۆیە کوردان بەتەواوی مەحکومی نکۆڵی و قڕکردن ببوون و هەموو کەسێك ئەوەی وەکو سیاسەتێك بەبنەما وەردەگرت.

دەوڵەتانی داگیرکەریش بێسنوور ئەو سیاسەتەیان بەبنەماگرت، کەسیش لەدژی ئەو سیاسەتە ڕانەوەستا. لەبنەڕەتدا داگیرکەران سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردنیان پێشنەخستووە، بەڵکو سیستەمی جیهانی پێشیخستووە. سیستەمی جیهانی لەسەر ئەو بنەمایە خۆی ئافراندووە، بۆیە دەوڵەتانی داگیرکەریش هەروا بەئاسانی نکۆڵی و قڕکردنی بێسنووریان بەڕێوە دەبرد.

ئیدی کورد بەرەو لەناوچوون دەچوو، وای لێهاتبوو نەك جیهان و داگیرکەران نکۆڵیان لە کورد دەکرد، تەنانەت کوردان خۆشیان نکۆڵیان لە خۆیان دەکرد. ئیدی گەیشتبووە قۆناخێکی بەو شێوەیە. چ کاپیتالیست و چ سۆسیالیست هەموو کەسێك نکۆڵی لە کورد دەکرد. مرۆڤ دەتوانێت واتایەك بەو نکۆڵیکردنەی ئەوان بدات، چونکە بەگوێرەی بەرژەوەندی ئەوان بوو، دەتوانن نکۆڵی لە کورد بکەن و لەناویشی ببەن. وەهاشیان کردبوو. بەلأم کورد نکۆڵی و قڕکردنی خۆی پەسند بکات یان نۆرماڵ ببینێت، ئەمە خراپە. ئیدی گەل گەیشتبووە قۆناخێکی بەمشێوەیە. چونکە لەمێژوودا هەندێك ڕاپەڕینی ئەنجام دابوو، ئەو ڕاپەڕینانەش شکستیان هێنابوو و کۆمەڵکوژی بەدواوە هاتبوو، لەدوای کۆمەڵکوژیەکانیش ئەوانەی باش بوون داگیرکەران تەسلیمیان کردبوون و خستبوویاننە نێو نکۆڵیکردنەوە و سیخوڕییان پێ بەپەسندکردن دابوون. بۆیە ئیدی ئیرادەی کوردان شکێنرابوون. ئیدی" ئێمە ناتوانین ڕاببینە سەرخۆ، ناتوانین سەربەخۆ بین، پێویستە ئێمە داگیرکەری پەسند بکەین، نکۆڵی و قڕکردن پەسند بکەین، ئیدی ئەمە قەدەری ئێمەیە" ئەمەیان وەك قەدەرێك پەسند کردبوو.

کوردان هەر خۆیان بە خۆیان ئەومیان بەبنچینە وەرگرت کە"چۆن لە کوردێتی خۆیان رزگاربکەن و خۆیان بە پەسندکردن بدەن و بتوانن بژین". ئەو دۆخەی لە کوردستاندا پێشکەوتبوو دۆخێکی بەمشێوەیە بوو، بەبیرم دێت کاتێك من دەچوومە قوتابخانە، ئێمە لەقوتابخانە تورکی فێردەبووین، بەزۆر تورکییان فێردەکردین، کە دەگەڕاینەوە ماڵ دەمانخواست بە کوردی قسە بکەین، باوکم پێی دەگووتم: " فێری تورکی ببە بۆ ئەوەی ببیتە مرۆڤ" بۆچی وەهای پێدەگووتم؟ چونکە لە کوردێتیدا هیچ شتێك نییە، واتا سەرکەوتنێك لە ئارادا نییە، تۆ نە دەتوانی بخوێنیت نەدەتوانی ببیتە خاوەن کارێك، تۆ ئەگەر لەسەر کوردێتی (کوردبوون)ی خۆت پێداگیری بکەیت نە قوتابخانە نە کار و نەژیانت هەبوو. بۆیە پێیدەگووتم:" فێری زمانی تورکی ببە، تاوەکو ببیت بە مرۆڤ". باوکم بەمرۆڤبوونی لەتورکیبووندا دەبینی. ئەمە بەداخوازی و دڵی ئەو بوو؟ نەخێر. ئەمە بەداخوازی و دڵی ئەو نەبوو. بەڵام ئەمەی پەسند دەکرد هەرچەندە بەدڵیشی نەبووبێت.

ماموستاش دەیگووت:" دەبێت بەتورکی قسە بکەن، کوردی قەدەخەیە". ئەوەی بە کوردی قسەی بکردایە دەستنیشانیان دەکرد و لێیاندەدا. بێگومان ئەوانە دەیانویست بەو شێوەیە داگیرکەری بە پەسندکردن بدەن و کوردان بتوێننەوە. چونکە ئەوانە ماموستای داگیرکەربوون، ئەرکی ئەوان ئەوە بوو کوردان بکەنە تورك. ئەویش گوایە بەخوێندن دەیانویست ئەمە بکەن. دەوڵەت ئەمەی تەنیا لەرێگەی ماموستاکانی نەدەکرد، بەڵکو لەرێگەی خێزانیشەوە ئەمەی ئەنجام دەدا. ئیدی خێزانیش تەنانەت بەمنداڵەکانیان دەگووت:" دەست لە کوردبوونی خۆتان بەربدەن و فێرە زمانی تورکی ببن، بۆ ئەوەی ببنە مرۆڤ". داگیرکەران کوردیان وەکو مرۆڤ نەدەبینی و هەڵسوکەوتی نامرۆڤانەیان لەگەڵدا دەکرد، هەڵسوکەوتی ئاژەڵیان لەگەڵدا دەکرد، بۆیە دەیانگووت:" کوردی کلکدار". سووکایەتیان بە کورد دەکرد و بە مرۆڤیان حیساب نەدەکرد و توانستی ژیانیان بە کورد نەدەدا، هەمیشە سووکایەتی و زوڵمیان لێدەکرد، ئیدی کوردیش ئەو وزمیەی لەخۆیدا نەدەبینی لەدژی ئەو سیاسەتە دەربکەوێت. چونکە زۆر راپەڕینیان لەم پێناوەدا پەرپاکردبوو، هەمووشیان شکستیان هێنابوو. کۆمەڵکوژییان کردبوون، ئیرادەیان شکابوو. بۆیە ئیدی بەدڵخوازی بێت یان نا، بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤ و لەو

سووکایەتی پێکردن و زوڵمە رزگاری ببێت و بتوانێت بژی، داگیرکەری و سیاسەتی داگیرکەرانەی پەسند دەکرد و نکۆڵی و فڕکردنی خۆی پەسند دەکرد. لەمێژوودا؛ زۆر کەم مرۆڤ یان گەل ئەمە پەسند دەکەن. کەسیش وەکو کوردان ئەمەی پەسند نەکردبوو. ئیتر مەترسی مەزنیش لەمەدا بوو.

کاتێك کە تەڤگەری ئاپۆچییش دەرکەوت رەوشی جیهان و هەرێمەکە و گەلی کورد لەو چوارچێوەیەدا بوو. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا چ کاریگەریی هەبوو؟ لەلایەکەوە فیکری سۆسیالیزم بەکاریگەر بوو. لەلایەکی دیکەشەوە تەڤگەری گەلانی ژێردەست بەگشتی و ڤێتنام بەتایبەتی کە لە لوتکەدابوو، بەکاریگەر بووە. بۆیە سەرۆك ئاپۆ لێکۆڵینەوەیەکی مەزنی دەستپێکرد، لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی:" ئەو ژیانەی کە کورد تێیدا دەژی ژیان نییە، مرۆڤ ناتوانێت بەمە بڵێت ژیان. پێویستە مرۆڤ ئەو ژیانە رەتبکاتەوە" بەڵام ئەگەر ئەو ژیانە رەتبکەیتەوە چ ژیانێکی دیکە دەخوازیت؟ ئەو ژیانەش چۆن و بە چ فیکرەیەك دێتەدی، لەسەر ئەو مەسەلانە لێکۆڵینەوەی دەکرد. سەرۆك ئاپۆ دەڵێت:" من گووتم ببمە ژەنەراڵێکی تورکیا بۆ ئەوەی کورد رزگار بکەم، بینیم ئەو رێگایەم لێگیراوە و ئەو رێگایە نابێت، خۆم لە ئیسلامییەتدا قوولکردەوە، بینیم بەمەش نابێت. لەکۆتاییدا بینیم سۆسیالیزم وەڵامی ئەو داخوازییانەم دەداتەوە". چونکە سۆسیالیزم ناهەقی و زوڵم پەسند ناکات و ئازادی بەبنەما وەرگرتووە". بۆیە دەڵێت:" بینیم مەگەر کورد تەنیا بە فیکری سۆسیالیستی رزگاری ببێت و بوومە سۆسیالیست و چارەسەریم لە سۆسیالیزمدا دۆزییەوە" هەروەها دەڵێت:" بەڵام بینیم سۆسیالیزمیش بەش بەش و پارچە پارچەیە؛ سۆڤییەت، چین، ئەلبانیا، کۆمۆنیزمی ئەورووپا، سۆسیال دیموکرات... مرۆڤ ناتوانێت بەمانە لە راستی سۆسیالیزم تێبگات، راستینەی سۆسیالیزم چییە؟" لەو رووەوە کەوتە نێو لێکۆڵینەوەوە؛ ئەو کاتە تەڤگەری گەلی ڤێتنام هەبوو و کاریگەری خۆی هەبوو. مادام تەڤگەری گەلی ڤێتنام لەدژی ئەمریکا دەتوانێت بۆ ئازادی خۆی شەڕ بکات، بۆ وڵاتی خۆی تێبکۆشێت، کەواتە ئێمەش میللەتێکی ژێردەستین و پارچە پارچەین، لە ڤێتنام زۆر خراپترین، ڤێتنامیش پارچە پارچە بووە، بەڵام دیسانیش شەڕ و خەبات دەکات، بەردەوام لەدژی ئەمریکا تێدەکۆشێت، ئەگەر گەلی ڤێتنام دەتوانێت لەدژی ئەمریکا

شەڕ بکات و بەرخودانێکی بەهێز بکات و جیهانیش خاوەنداری لێدەکات، ئەوا ئێمەش دەتوانین بۆ خۆمان خەباتێك بکەین. ئیدی تەڤگەری ئاپۆچێتی لە هەلومەرجێکی بەمجۆرەدا پێشکەوت.

بۆچی ئەم فیکرەیە لە سەرۆك ئاپۆدا پێشکەوت؟ چونکە سەرۆك ئاپۆ لە گوندندا خێزان و گوندی رەتکردەوە و ئەو ژیانەی رەتکردەوە، ئەو پەیوەستبوونەی رەتکردەوە، خۆی لێدابڕی، بیر و ئیرادە و کەسێتی ئازادی بۆخۆی بەبنەما وەرگرت. ئیدی لەمەوە کەوتە نێو لێکۆڵینەوەوە و گەڕان بەدوای ئازادیدا، لەئاکامدا ئەمەی لە سۆسیالیزمدا بینیەوە. کاتێکیش خواستی لە راستینەی سۆسیالیزم تێبگات و لەمەدا چەندە خۆی قووڵکردەوە، ئەوەندەش لەراستینەی گەلی کورد تێگەیشت و لەجیهان و داگیرکەری تێگەیشت. لەسەر ئەو بنەمایە دەستیپێکرد، واتا سەرۆك ئاپۆ خواستی و هەروا تەڤگەرێك پێشبخات پێشنەکەوت، یان هەروا بەداخوازی ئەو پێشنەکەوت. واتا ئەگەر سەرۆك ئاپۆ کەوتە نێو ئەو لێکۆڵینەوانەوە ئەوا لەبەرئەوە بوو کەوا تەڤگەرێکی بۆ گەلی کورد پێویست بینی و ئەو ئەرکەی خستە ئەستۆی خۆیەوە. بێگومان ئەرکێکی وەها لە گۆڕێدا هەبوو ئەرکێکی مێژوویی هەبوو، ئەو ئەرکە مەرجی خستەپێش سەرۆك ئاپۆ، ئەویش خاوەنداری لەم ئەرکە کرد. ئەوەی سەرۆك ئاپۆ کردوویەتی ئەمە بوو، ئەگەر هەلومەرجەکە دروست نەبایە کە بۆ گەلی کورد تەڤگەرێکی ئازادیخوازی دەسەپاند و دەبێت هەندێك کەس ئەو ئەرکە پێکبهێنن، ئەگەر ئەمانە هەموو نەهاتبایە پێشەوە، ئەوا هەڵبەتە سەرۆك ئاپۆ هەر لەخۆیەوە ئەمەی نەخستە ئەستۆی خۆی. ئەگەر ئەو هەلومەرجە نەبایە ئەگەر بشیخواستبایە ئەوا نەیدەتوانی تەڤگەرێکی وەها پێشبخات. واتا هەم هەلومەرجی بابەتی (ئۆبژێکتیف) و هەمیش خودی (سۆبژێکتیف) لەدایکبوونی ئەم تەڤگەرەی دەرخستەپێش. بێگومان لێرەدا رۆڵی سەرۆك ئاپۆش گرنگە. چەندە مەرجی ئۆبژێکتیڤیش پێشبکەوێت، ئەگەر تۆ لەرووی سۆبژەکتیڤەوە موداخەلەیەك نەکەیت، موداخەلەیەکی راست لەئاستی بیر، رێکخستن و چالاکی ئەنجام نەدەیت، ئەوا ناتوانیت تەڤگەرێك پێشبخەیت. رەوشی ئۆبژێکتیف هەندێك هاتبووە ئاراوە، هەمیش لەزۆر رووەوە بەدیهاتبوو، تەڤگەرێکی وەهای دەخواست، تەنانەت لە کوردستاندا زۆر درەنگ کەوتبوو. ئیدی سەرۆك ئاپۆ ئەو ئەرکەی کە درەنگ مابوو

گرتییه ئەستۆی خۆی. لەبەر ئەوەی ئەرکێك بوو زۆر درەنگیش مابوو و **سەرۆك ئاپۆ** خستیه پێشخۆی، ئەوا هەموو کەسێك **سەرۆك ئاپۆشی** پەسند کرد و لەدەوری سەرۆك ئاپۆدا گەیشتنه یەك و کۆبوونەوە.

لەولاتێکدا یان له گەلێکدا، زوڵم و سووکایەتی و نکۆڵیکردن بەهێز بێت و له کەسی ئەو گەلەدا مرۆڤایەتی بکەوێته ژێرپێوە، مرۆڤ دەزانێت که کێشەیەکی مەزن لەو وڵات و گەلەدا هەیه، کێشەیەکی مرۆڤایەتی هەیە، کێشەی ناسنامه هەیه، کێشەی ئازادی هەیه. ئیدی کێ خاوەنداری لەم کێشەیه بکات، ئەوا هەموو کەسێك ئەو بەبنەما وەردەگرێت. ئیدی لەبەر ئەوەی **سەرۆك ئاپۆ** بینی مرۆڤایەتی له کوردستاندا کەوتۆته ژێر پێوە، سووکایەتییەکی مەزن لەئارادایە، لەناوبردنی مەزن هەیە، ئیدی گەلی کورد لەپلەی مردن دایه... ئەمەی بینی، بۆ ئەوەی ئەم گەله نەمرێت، مرۆڤایەتی نەمرێت، لەرووی فیکری و پراکتیکییەوە چی پێویسته ئەوەی پێشخست و خاوەنداری لێکرد. لەبەر ئەوەی داڕووخان مەزن بوو، بۆیه رابوونیش مەزن بوو، ئیدی رابوونێکی مەزنیش هاتەدی.

لێرەدا بێشانسی **سەرۆك ئاپۆ** و (PKK) لەکوێ دایه؟ لەجیهاندا ئەو ناکۆکییەی سۆڤییەت و ئەمریکا گەیشتبووە پلەی هەرە بڵندی خۆی، پلەی کۆتایی خۆی، ئیدی له جیهاندا تەڤگەری بەمشێوەیه نەمابوو، ئەو کێشەیه (کێشەی گەلانی بندەست) چارەسەر ببوو، تەنیا کێشەی کورد مابوو، هەر کەسێك سوودی خۆی له ناکۆکی نێوان سۆڤییەت و ئەمریکا وەرگرتبوو، زۆر ناکۆکی خۆیان چارەسەر کردبوو، مخابن گەلی کورد زۆر درەنگ مابوو، ئەو ئەرکەی پێویستبوو پێکهاتبایه پێکنەهاتبوو. ئیدی **سەرۆك ئاپۆ** و (PKK) لەسەر پێکهێنانی ئەم ئەرکه راوەستان و خاوەندارێتیان لێکرد. بۆیه مرۆڤ دەتوانێت بڵێت: زۆر بەدرەنگی خاوەندارێتی لەم ئەرکه کرا، ئەو ئەرکەی دەبایه پێکهاتبایه پێکنەهاتبوو. ناچار **سەرۆك ئاپۆ** و (PKK) خستیانه ئەستۆی خۆیانەوە، هەمیش لەکۆتایی شەڕی سارددا، لەکۆتایی تەڤگەری گەلانی ژێردەستدا تەڤگەرێکیان له کوردستاندا پێشخست. بێشانسییەکە خۆی لێرەدایه.

ئیدی ئەو قۆناخه له جیهاندا تەواو ببوو، کۆتایی پێهاتبوو، کەچی له کوردستاندا ئەم قۆناخه تازه دەستپێکردبوو. بێگومان ئەمەش زەحمەتی و دژواری زۆری بۆ **سەرۆك**

ئاپۆ و (PKK) و گەلی کوردیش دروستکرد. بێشانسی گەلی کورد، سەرۆك ئاپۆ و (PKK) لێرەدایە. ئەگەر لەمە زووتر هەندێك كەس خاوەنداریيان لەم ئەرکە بکردبایە، ئەوەندە زۆر و زەحمەتی نەدەهاتە ئاراوە. لەوانەبوو کێشەی گەلی کورد ئاسانتر چارەسەر ببایە، ئەگەر کێشەی گەلی کورد هەروا بەئاسانی چارەسەر نابێت، چونکە کێشەیەکی جیهانییە و پەیوەستە بە ڕەوشی جیهانەوە. ڕەوشی جیهانیش لەو کاتەدا بۆ ئەوەی هەر کەسێك کێشەی خۆی چارەسەر بکات توانستی زۆری دەردەخستەڕوو، چونکە جیهان ببووە دوو بەش؛ بەشێك بۆ ئەوەی خۆی بەهێز بکات دۆستی خۆی دروست دەکرد و هاوکاری دەکرد، ئێمە لەکۆتایی ئەو قۆناخەدا رابووین. بۆیە ئێمە زێدە سوودمان لێی نەبینی. ئیدی جیهان ببووە یەك بەش، لە قۆناخێکی وەهادا ئێمە خواستمان تەڤگەری گەلی کورد و کێشەی گەلی کورد چارەسەر بکەین، ئەو قۆناخەش تەواو ببوو. بۆیە ئەو تەڤگەرەی پێشمانخست لە دەرەوەی قۆناخ پێشکەوت. درەنگ پێشکەوت. بۆیە لەگەڵ قۆناخدا ببووە ناکۆکییەك. ئەمەش زۆری و زەحمەتی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

**لەساڵی (١٩٣٨)وە تا دەرکەوتنی تەڤگەری (PKK) هیچ تەڤگەرێکی کوردان و هیچ سەرهەڵدانێك لەباکوور لەئارادا نەبوو. لەو ماوەیەدا تورکیا خۆیشی لەنێو ئەو دوو جەمسەرییەی سۆڤییەت و ئەمریکادا لایەنگیری کاپیتالیزم بوو، هەر لەو ماوەیەدا زۆر تەڤگەری چەپگەریش لە بەرامبەر ئەو ڕژێمە سەرهەڵدەدەن، لەنێو خودی ڕژێمیشدا ناوە ناوە کودەتا بەرپا دەبوون... واتا تورکیا لەنێو ڕەوشێکی نائارام دابوو. هەرچەندە تورکیا وەکو ڕژێم و دەوڵەت خۆی بەلای جەمسەرێکدا شکاندبۆوە، بەڵام وەکو دیاربوو لەنێو گرژی و ئاڵۆزییەکدا دەژیا. هۆکاری ئەو گرژی و ئاڵۆزییە چیبوو؟**

## ئەو دۆخە چۆن و تاچەند رەنگدانەوەی لەسەر سەرهەڵدانی تەڤگەری (PKK) کرد؟

بێگومان لەشەڕی نێوان ئەمریکا و سۆڤییەتدا، تورکیا لەگەڵ ئەمریکادا بوو. ئەوەی لەدژی رژێم دەربکەوتبایە، بەواتای لەدژی ئەمریکا دەرکەوتووە و ئۆبژێکتیفیش لەگەڵ سۆڤییەتدا پەیوەندی خۆی دەبەست و سۆڤییەتی بەبنەما وەردەگرت. تەنانەت لەدەرکەوتنیدا کاریگەری سۆڤییەتی لەسەر دەبوو. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە هەمیشە لە تورکیا کاتێك جولانەوە و تەڤگەر سەریانهەڵداوە لەنێو رژێمیشدا لەبەرامبەر ئەو جولانەوە و تەڤگەرانە کودەتا بەرپادەبوون، ئەو کودەتایانەش بەردەوام ئەو تەڤگەرانەی سەرکوت دەکرد یان دەیخواست سەرکوتیان بکات و زەبری لێدەوەشاندن، بۆ ئەوەی رژێم بتوانێت خۆی بپارێزێت و بەرژەوەندییەکانی سیستەمی سەرمایەداری بپارێزێت. چونکە ئەرکی رژێمی تورکیا تەنیا خۆپاراستن نەبوو، دەبایە لەدژی سۆڤییەت کاپیتالیزمیش بپارێزێت. بۆیە هەر تەڤگەرێك لەدژی سیستەمی کاپیتالیزم دەربکەوتبایە پێویستبوو رژێم پاکتاوی بکردایە، تاکو بتوانێت ناوخۆی خاوێن بکاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەدژی سۆڤییەت رابوەستێت، ئەو کودەتایانە هەموویان بۆ ئەم مەبەستە بەرپادەبوون. هەرکاتێك کودەتاکانیش بەرپادەبوون ئامانجیان ئەوەبوو تەڤگەرە شۆڕشگێڕییەکان و چەپگەرەکان لاواز و بێکاریگەر و پاکتاویان بکات.

## کەواتە کودەتاکان هەموویان هێزە دەرەکییەکانیان لەپشت بووە؟

بێگومان لەپشت هەموو کودەتاکانەوە پشتیوانی ئەمریکا هەیە و پشتیوانییەکی بەهێزیشە، چونکە تورکیا ئەندامێکی ناتۆ(NATO)یە. ئەرکی ناتۆش دژایەتیکردنی سۆڤییەت بوو، لەناوبردنی سۆڤییەت بوو، پاراستنی سیستەمی کاپیتالیزم و بەرژەوەندییەکانی بوو. لەبنەڕەتدا ناتۆ بۆ ئەم مەبەستە دروست ببوو. تورکیاش

هێزێکی ناتۆ بوو، تورکیا دژایەتی سۆڤییەتی دەکرد و پارێزوانیی لە سیستەمی کاپیتالیزم دەکرد. خودی رژێمی تورکیاش لەنێو ئەو سیستەمەدا بوو، بۆ ئەوەی هەم رژێم و هەم سیستەمی کاپیتالیزم بپارێزێت لەدژی سۆڤییەت رادەوەستا، بۆ ئەوەی لەدژی سۆڤییەت رابوەستێت دەبێت نێوخۆی خاوێن بکاتەوە و خۆی تۆکمە بکات. بۆیە هەر تەڤگەرێکی ئازادیخواز و دیموکراتخواز دەربکەوتبایە هەمووی بەلایەنگری سۆڤییەت حیساب دەکرد و هێرشی دەکردە سەریان و زەبری لێدەوەشاندن. بێگومان ئەمەش کاریگەری لەسەر ئەو تەڤگەرانە دەکرد، ئەو تەڤگەرانەی لەدژی رژێمی تورکیا و سیستەمی سەرمایەداریش سەریانهەڵدەدا زیاتر لەژێر کاریگەری سۆڤییەتدا بوون، نەیاندەتوانی ببنە خاوەن کەسێتی و کارەکتەرێکی ئازاد، چ لەبیرکردنەوە، چ لەرووی رێکخستن و چالاکیدا، هەر کاتێك کودەتا بەرپادەبوو و شاڵاوەکانی کودەتا لەدژی ئەو تەڤگەرانە پێشدەکەوت، ئەو تەڤگەرانەش لاوازدەبوون و بەمەش زیاتر دەکەوتنە ژێر کاریگەری سۆڤییەتەوە. بۆیە نەیاندەتوانی لەدژی رژێم و کاپیتالیزم بەهێز رابوەستن.

رژێمی تورکیا لەسەر نکوڵی و قڕکردنی کورد و لەسەر دووژمنایەتی رەنج و کۆمەڵگای ژێرەوە و سۆسیالیزم ئاوابووە، رژێمێکی بەمشێوەیەیە، بۆیە بەتەواوی لەدژی سۆسیالیزم و سۆڤییەت و تەڤگەری گەلانی ژێردەست و ئازادی و دیموکراسی رادەوەستا.

هەم لەناو تورکیا و هەمیش لە دەرەوەی تورکیا رژێمێکی زۆر زوڵمکاربوو و بەهەموو شێوەیەك زەبروزەنگی بەکاردەهێنا، هەر تەڤگەرێکیش لەدژی ئەو رژێمە سەریهەڵدابایە، ئەوا لەدژی سەرمایەداری دەردەکەوت و بۆ ئازادی و سۆسیالیزم تێدەکۆشان، لەبەر ئەوەی سۆسیالیزمی بنیادنراو هەبوو ئەو سۆسیالیزمەیان بەبنەما وەردەگرت و لەژێر کاریگەری ئەمەدا بوون، چەندە لەدژی رژێم و سیستەمی سەرمایەداری شەڕیان دەکرد، بەڵام نەیاندەتوانی ببنە هێز. رژێمیش تادەهات زەبری لێدەوەشاندن. بۆچی زەبریان بەردەکەوت؟ چونکە بەراستی لەسەر بنەمایەکی راست دروست نەدەبوون و پێشنەدەکەوتن، هەرچەندە لەدژی رژێمیش تێدەکۆشان، بەڵام لەبنەڕەتدا بە کەسێتی و زیهنییەت و چەمك و ئایدیۆلۆژیای رژێمەوە لەدژی رژێم بوون، بۆیە نەیاندەتوانی ببنە هێز، بەمەش رژێم بەئاسانی دەیتوانی زەبریان لێبوەشێنێت، چەندە زەبریشیان

بەردەکەوت لاوازتر دەبوون و زیاتریش لەم چەمکەدا قووڵدەبوونەوە. بۆیە تەڤگەرە چەپڕەو و دیموکراتخوازەکان زێدە نەیاندەتوانی ببنە ئەلتەرناتیف.

کاریگەری ئەو تەڤگەرانە لەسەر کوردستانیش هەبوو. چونکە ئەو سۆسیالیزمەی لە تورکیا دەناسرا سۆسیالیزمی سۆڤییەتی بوو، هەموو ئەو تەڤگەرانەی سەریانهەڵداوە سەرەتا لەژێر کاریگەری سۆڤییەت دابوون، پاشان هەندێکیان کەوتنە ژێر کاریگەری "چین"، هەندێکیشیان کەوتنە ژێر کاریگەری "ئەلبانیا".

سۆسیال دیموکرات و کۆمۆنیزمی ئەوروپا زێدە لە تورکیا بەکاریگەر نەبوون، بۆیە لەنێو کورداندا ئەوانەی لە سۆسیالیزم تێدەگەیشتن لەڕێی سۆسیالیزمی تورکیاوە لە سۆسیالیزم تێدەگەیشتن، لەڕێی چەپی تورکیاوە لە سۆسیالیزم تێدەگەیشتن. چەپەکانی تورکیا لە سۆڤییەت و چین لە سۆسیالیزم تێدەگەیشتن، چەپە کوردەکانیش لە چەپەکانی تورکەوە لە سۆسیالیزم تێدەگەیشتن. بۆیە تەڤگەرێکی سۆسیالیستی بەهێز لە کوردستاندا سەریانهەڵنەدەدا. تەنانەت تەڤگەرێکی نەتەوەیی بەهێزیش سەریهەڵنەدەدا. چونکە وڵاتپارێزیش زۆر لاواز ببوو. واتا نە تەڤگەرێکی نەتەوەیی بەهێز و نە تەڤگەرێکی سۆسیالیستی بەهێز سەریهەڵدەدا.

ئیدی تەڤگەرێکی هەم سۆسیالیست و هەم وڵاتپارێز بە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) سەریهەڵدا. بۆچی سەریهەڵدا؟ چونکە سەرۆك ئاپۆ ئەو وڵاتپارێزییەی کە هەبوو، هەمیش ئەو سۆسیالیزمەی کە هەبوو بەبنەمای وەرنەگرت، هەم لەدژی ئەو سۆسیالیزمەی کە هەبوو راوەستا و خواستی بنچینە و بناخەی سۆسیالیزم تێبگات، هەمیش لەدژی ئەو وڵاتپارێزییەی هەبوو راوەستا. چونکە بینی وڵاتپارێزییەکی لاوازە و لەدواوە ماوە. ئەمەش کێشەی کورد چارەسەر ناکات. چونکە (پ د ك) زۆر لەدواوە بوو و نەیدەتوانی کاریگەری ئەوتۆی هەبێت و گۆڕانکاری بێنێتەدی، زۆر بێ توانست بوو و باوەڕیشی بەخۆیشی نەبوو، زۆر شکلی بوو، زێدە وڵاتپارێزیشی تێدا نەبوو. بۆیە سەرۆك بینی ئەو وڵاتپارێزی و سۆسیالیزمەی لەئارادان ناتوانن کێشەی کورد چارەسەر بکەن. بۆیە هەردووکیانی بەبنەما وەرنەگرت. ئەوەی بەبنچینە وەرگرت کە چۆن بتوانێت هەم خۆیشی و هەم گەل لەژێر کاریگەری ئەو دوو چەمکە رزگار بکات. بۆیە

بە سەرۆك ئاپۆ و (PKK)وە لە کوردستاندا یەکەمین تەڤگەری ولاتپارێز و سۆسیالیست سەریهەڵدا و پێشکەوت.

**ئەو کاتە سۆڤییەت لەکوێی جیهاندا رکابەرێکی ئەمریکا و ئیمپریالیزم هەبووایە هاوکاری دەکرد، بۆ نموونە؛ کوبا بە گوێرەی سۆڤییەت شوێنی هەرە دوورە، کەچی هاوکاری تەڤگەری ئازادیخوازی ئەو ولاتەی دەکرد لەدژی ئەمریکا. بەلام بەتەنیشت ئەووە میللەتێکی ژێردەست هەیە و هیچ هاوکاری و پشتگیرییەکی نەکرد، بۆنموونە؛ هیچ پشتگیری کوردانی لەباکووری کوردستان نەکرد، یاخود بەگشتی هاوکاری هیچ سەرهەڵدان و تەڤگەرێکی کوردی لەبەشەکانی تریشدا نەکرد، بۆچی وەهایە؟ ئەمە سەرنجراکێشە، ئەمە بەهۆی تایبەتمەندێتی کوردستان و گەلی کوردەوەیە یان هۆکاری تر هەیە؟**

لێرەدا هەرچەندە سۆڤییەت بەناوی سۆسیالیزمیشەوە سەریهەڵدابێت، لەبنەڕەتدا لە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت و تەرزیاندا مەسیحیبوون و خۆرئاوایبوونیان بەبنەما وەرگرتبوو. ئیدی بەو شێوەیە سۆسیالیزمیان وەرگرتبوو، ئەگەرنا لەبنچینەدا خۆی سۆڤییەت لە کاپیتالیزم دانەبڕاندبوو، خۆی لە دەسەلاتدارێتی و کۆیلایەتی نەپچڕاندبوو. ئەمە هۆیەك بوو بۆ ئەوەی کە کێشەی کوردان نەبینێت. لەبەر ئەوەی سۆڤییەت وەکو لقێکی کاپیتالیزم چێببوو، خودی کاپیتالیزم کوردستانی ژێردەستە و پارچەکردبوو، ستاتۆیەکی دروستکردبوو کە کوردی تێدا نەبێت، کوردی قڕ دەکرد و نکۆلی لێدەکرد، ئەو ستاتۆیە کاپیتالیزم دروستیکردبوو. ئیدی سۆڤییەت هەرچەندە بەقسە دژی کاپیتالیزم رادەوەستا، لەبنچینەدا لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیادا، لەهەموو

روویەکەوە خۆی لە کاپیتالیزم دانەبڕاندبوو. بۆیە ببووە لقێکی کاپیتالیزم، لەبەر ئەوەی لقێکی ئەو بوو، هیچ کاتێك سۆڤییەت خۆی نزیکی کێشەی کورد نەدەکردەوە. ئەگەر لێی نزیك نەبۆتەوە لەبەر ئەم هۆیە نەیکردووە. چونکە کاپیتالیزم لە سیستەمی خۆیدا کوردی پەسند نەدەکرد و نکۆڵی و قڕکردنی کوردانی بەبناخە وەرگرتبوو، سیستەمی خۆرهەڵاتیش هەر لەسەر ئەمە بنیاد نرابوو، بۆیە نکۆڵی و قڕکردنی کوردان بەبناخە وەردەگیرا. بۆیە سۆڤییەتیش ئەمەی بەبناخە وەردەگرت. ئەگەر سۆڤییەت بەڕاستی خۆی لە سیستەمی کاپیتالیزم دەربخستبایە، لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا و ژیان و ڕێکخستن و کەسایەتی کاپیتالیزم دەربخستبایە، دەبایە کوردی بەبنچینە وەربگرتبایە، ڕابوونی کوردانی بەبنچینە وەربگرتبایە.

مرۆڤ دەبینێت؛ لەم ڕووەوە هیچ هەنگاوێکی نەهاوێشتووە. وەك چۆن کاپیتالیزم بە تاکتیك لە کێشەی کورد نزیکبۆتەوە، ئەوا سۆڤییەتیش جار بەجار بە تاکتیك نزیکی کێشەی کوردان بۆتەوە. بۆ نموونە؛ بەهاوکاری سۆڤییەت **کۆماری مەهابادی** ئاوابوو، کەچی هێشتا ساڵێك نەبوو ئاوا ببوو دەستبەرداری بوو. هەروەها ئەمریکاش دەستی هاوێشتە تەڤگەری **بارزانی** و پاشان دەستبەرداری بوو. واتا هەم ئەمریکا و هەم سۆڤییەتیش بە تاکتیك نزیکبوونەتەوە. ئەو سیستەمەی لە خۆرهەڵاتی ناوین دامەزراوە لەسەر بنەمای پارچەبوون و لەناوبردنی کوردان دامەزراوە. سۆڤییەت و ئەمریکاش ئەمەیان بەبنچینە وەرگرتووە، کامە دەوڵەت لایەنگری سۆڤییەت دەبوو، ئەمریکا دژایەتی دەکرد، کامە دەوڵەتیش لایەنگری ئەمریکا بوو سۆڤییەت دژایەتی دەکرد و تەنگەتاوی دەکرد. ئالێرەدا مەسەلەی کورد وەکو تاکتیك بۆ ئەوان پێویستبوو و دەستیان بۆ درێژ دەکرد، ئیدی کە ئێراق لایەنگری سۆڤییەت بوو، ئەمریکا هاوکاری بارزانی دەکرد، بۆ ئەوەی سۆڤییەت لە ئێراقدا لاواز بکات. کاتێك کە ئێراق لەمیانەی **پەیماننامەی جەزائیردا** لە ئێران و ئەمریکا نزیکبووەوە ئەمریکا یەکسەر دەستبەرداری تەڤگەری **بارزانی** بوو. واتا سەبارەت بەمەسەلەی کورد نزیکبوونەوەی ئەمریکا چۆن بووە ئەوا نزیکبوونەوەی سۆڤییەتیش هەمان شت بووە. چونکە سیستەمی کاپیتالیزم ئەمەی بەبنچینە وەردەگرت. لەبەر ئەوەی سۆڤییەتیش خۆی لەنێو ئەو سیستەمە دەرنەخستبوو، بۆیە خۆی لەمەسەلەی کورد نزیك نەکردەوە. ئەگەر نزیك نەبۆتەوە

لەبەر ئەم خاڵە نزیك نەبۆتەوە. ئەو سیستەمەی جیهانیش تارادەیەك لەسەر ئەو سیستەمەی لە خۆرهەڵاتی ناویندا ئاوا ببوو، ئەویش خۆی ئاوا كردبوو، ئەگەر تۆ دەست بۆ كێشەی كورد درێژبكەیت و نزیكبوونەوەیەكی دیكە بۆ كێشەی كورد بكەیت ئەوا ئەوكاتە بەو واتایە دێت تۆ ئەو سیستەمە تێكدەدەیت و دەبێت تێكیبدەیت. ئەمە لەكاتێكدا سیستەم لەسەر ئەو بنەمایە دروست بووە، بۆیە سۆڤییەت بەمشێوەیە نزیكبۆتەوە، چونكە بەرژەوەندی خۆی لە پشتگیری كورداندا نەدەبینی، لەچیدا بینی؟ لەپاراستنی ئەو ستاتۆیەی بۆ كوردان دەستنیشانكرابوو، بۆیە خۆی نزیك بە كێشەی كورد نەكردەوە.

## ئەو رەوشەی باستان كرد تەڤگەری ئاپۆچی تا چەند بەشێوەیەكی راست شیكردەوە و وەڵامی پێویستی بۆ ئەو رەوشە دایەوە؟

كاتێك كە تەڤگەری ئاپۆچی دەستی بەتێكۆشان كرد، ئەو رەوشەی كە لە جیهان و ناوچەكە و كوردستاندا هەبوو دەبینرا، بەگوێرەی ئەو رەوشەش شیكردنەوە و ستراتیژ و تاكتیكی خۆی پێشدەخست. (PKK) و تەڤگەری ئاپۆچی وەها لەدایك بوو. بەڵام لەلایەكی دیكەشەوە هەر لەسەرەتاوە بەتەدبیر نزیكبۆتەوە، بۆیە خۆی نەخستە ژێر كاریگەری سۆڤییەتەوە. ئەوكاتە هەموو ئەو تەڤگەرانەی دەركەوتن لەبەر ئەوەی سۆڤییەت نوێنەرایەتی ئازادی و دیموكراتی و سۆسیالیزمی دەكرد، بۆیە هەموویان سۆڤییەتیان بەبنەما وەردەگرت، (PKK)ش ئەوەی بەبنەما وەردەگرت. واتا سەرەتا (PKK)ش تەواو لەراستینەی سۆسیالیزم تێنەگەیشتبوو، بەڵام هەندێك لایەنی راستینەی سۆسیالیزمی دەبینی و لەم رووەوە رەخنەی خۆی هەبوو. بۆیە ئەو ناوەندانەی بۆخۆی بەبناخە وەرنەگرت و خواستی لەدەرەوەی ئەو ناوەندانە سۆسیالیزم بۆخۆی بەبناخە وەربگرێت. ئەمەش هەر لەسەرەتاوە بووە تەدبیر بۆ (PKK) و لەو تەڤگەرانەی كە هەشبوون جیاوازتر دەبینرا. بەڵام ئەگەر تۆ بڵێی بەتەواوی خۆی لەو

سۆسیالیزمەی کە هەبوو و لەو ڕەوشەی کە لەئارادا بوو ڕزگار کردبێت، ئەمە ڕاست نییە.

(PKK) لەدەرکەوتنی خۆیدا؛ هەم لەلایەکەوە ئەو سۆسیالیزمەی هەبوو بەبنەما وەرگرت، هەمیش ڕاستینەی خۆرهەڵاتی ناوینی بەبنەما وەرگرت. بۆیە (PKK) ئەو تەڤگەرەیە کەوا لەخۆیدا هەم خۆرهەڵات و هەمیش خۆرئاوای بەبنەما وەرگرتووە. (PKK) بەتەواوی نە تەڤگەرێکی خۆرهەڵاتییە، نە خۆرئاوایشە، بەڵکو سەنتێزێکی خۆرهەڵات و خۆرئاوایە. ئەمە ڕاستینەی (PKK)یە. (PKK) نە بەتەواوی بووە تەڤگەرێکی سۆسیالیزمی بنیادنراو، نە بەتەواویش تەڤگەرێکی خۆرهەڵاتی ناوینی. بەڵکو لە هەردووکیشیاندا هەندێك تایبەتمەندی وەرگرتووە، سەنتێزی هەردووکیانی دروستکرد. (PKK) سەنتێزی هەردووکیانە، بۆیە (PKK) بووە تەڤگەرێکی جودا.

مرۆڤ ئەگەر سەرنج لەو تەڤگەرانە بدات کە لە خۆرهەڵاتی ناویندا دەرکەوتوون یان تەواو خۆرهەڵات بەبنەما وەردەگرن یان تەواو خۆرئاوا بەبنەما وەردەگرن. بەڵام (PKK) هەردووکیانی بەبنەما وەرنەگرت. بەڵکو لەهەردووکیانیشی وەرگرت و سەنتێزی هەردووکیانی دروستکرد، بۆیە جودابوو. ئەمە ڕاستینەی (PKK)یە. ئەمەش پەیوەستە بە ڕاستینەی سەرۆك ئاپۆوە، سەرۆك ئاپۆ ئەو ژینگەیەی دەوروبەری کە لێی لەدایکبووە و تێیدا ژیاوە خستیە ژێر پرسیارەوە، لەمەشدا ئەو شتەی ڕەتیکردەوە و ئەو شتەی بۆخۆی بەبنەما وەرگرتووە، لەسەر ئەو بنەمایەش ئەو هەنگاوانەی هاوێشتوویەتی بەمەوە پەیوەستە. ئەو ژینگەیەی سەرۆك تێیدا مەزن بووە بەتەنیا کورد لێی ناژی، بەڵکو کورد، تورك، ئەرمەنی، ئاشووری و عەرەب هەن، ژینگەیەکی بەمشێوەیەیە. هەروەها زۆر ئایین و ئایینزایش لەو ژینگەیەدا هەن، لە ئیسلامییەتەوە بگرە تا دەگاتە مەسیحییەت. هەروەها ئەو ژینگەیەی ئەوی لێ بوو داگیرکەری بەتەواوی تێیدا جێگیر نەبووە، کاپیتالیزم تێیدا ناژیت، فیوداڵیزم بەتەواوی تێیدا ناژیت، ئەمانە هەمووشیان هەن، بەڵام زۆر بەهای ژیانی نیۆلۆتیکیش تێیدا دەژیت. لەبەر ئەوەی لە ژینگەیەکی وەهادا مەزن بووە، هەروەها ئەو خێزانەی تێیدا لەدایکبووە خێزانێکی هەژارە، لەخێزانیشدا وەکو خێزانەکانی دیکە دەسەڵاتی پیاو (پیاوسالاری) تێدا نییە، زیاتر دەسەڵاتی ژن (دایکسالاری) تێیدا باڵادەستە، واتا خێزان وەکو

خێزانەکانی تر نییە، ژینگە وەکو ژینگەیەکی تر نییە، ئەو کولتوورەی لەوێ هەیە جودایە. زۆر گەل و ئایین و ئایینزا هەن، زۆر تایبەتمەندی گەلان و ئایین و ئایینزاکان هەیە. لەژینگەیەکی وەهادا لەدایکبووە و ژیاوە و مەزن بووە. کاریگەری ئەو ژینگە و خێزانانە لەسەر شێوەگرتنی **سەرۆك ئاپۆ** زۆرە.

ئەگەر لە سەرۆکدا کەسێتی ئازاد و ئیرادەیەکی ئازاد پێشکەوت، زیهنییەتێکی دیکە پێشکەوت ئەوا تاڕادەیەك پەیوەستە بەم راستییەوە. پاشان ئەمە دەبێتە راستینەی (PKK)ش. بۆیە لەتەڤگەری ئاپۆچیدا مرۆڤ کە دەبینێت هەر لەسەرەتای خۆیدا یەك تایبەتمەندی بەتەنیا نابینێت، هەم تایبەتمەندی خۆرهەڵاتی و هەمیش تایبەتمەندی خۆرئاوایی دەبینێت. ئەمە پەیوەستە بەو ژینگەیەوە. چونکە چەندین گەل لەو ژینگەیەدا هەن. **سەرۆك ئاپۆ** هەر بەتەنیا لەژێر کاریگەری کورددا نەبووە. بۆیە هەر بەتەنیا لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراویشدا نەماوە، یان لەژێر کاریگەری ناوچەی خۆرهەڵاتیشدا نەماوە. وەکو چۆن لەو ژینگەیەدا زۆر گەل و ئایین و ئایینزا هەن و تایبەتمەندییە باشەکانیان بەبنەما وەرگرتووە، لە جیهانیشدا زۆر هێز و کولتوور هەن، لەنێو ئەوانیشدا هەرچییەکی باش هەیە وەریگرتووە و بەسەنتێزی کردووە. ئەمە پەیوەستە بەو راستینەیەوە. بۆنموونە؛ ئەگەر **سەرۆك ئاپۆ** لەژینگە و خێزانێکی دیکەدا دەربکەوتبایە، ژینگەیەك کە بەتەواوی کوردی تێدابایە، یان لە خێزانێکدا کە دەسەڵاتی باوکسالاری تێدا باڵادەست بایە ئەوا لەوانەبوو شێوەگرتنی **سەرۆك ئاپۆ** جیاواز تر بووایە لەوەی ئێستای، سەرۆکێکی بەمجۆرە و تەڤگەرێکی بەمجۆرە دەرنەکەوتبایە. پێویستە مرۆڤ ئەو راستییەش ببینێت.

**لەساڵانی حەفتاکاندا کاپیتالیزم هەم لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین و تورکیا بەگشتی و هەمیش لەسەر باکووری کوردستان تا چەند کاریگەری خۆی کردبوو؟ هەروەها رژێمی داگیرکەری تورکیا چەندە کاریگەری خۆی لەسەر باکوور کردبوو؟**

هەم کاپیتالیزم و هەمیش داگیرکەری لە کوردستاندا زۆر پێشکەوتبوو. بەڵام لەو ناوچەیەی سەرۆك تێیدا لەدایك بووە نە داگیرکەری و نە کاپیتالیزم زۆر پێشنەکەوتبوو. بۆیە لەو ناوچەیەدا زۆر گەل و نەتەوە جودا دەژیان و نەتوابوونەوە. ئەگەر داگیرکەری و کاپیتالیزم لەو ناوچەیەدا زۆر پێشبکەوتبایە ئەوا دەتوانەوە. کاتێك مرۆڤ سەرنج دەدات لەوێ زێدە توانەوە رووینەداوە، تواندنەوەی تێکەوتووە، بەڵام تەواو سەرنەکەوتووە، داگیرکەری و کاپیتالیزم تەواو خۆیان جێگیر نەکردووە، کاریگەری خۆیان هەیە، بەڵام کولتووری نیۆلۆتیکیش زۆر بەهێز تێیدا دەژیت، گوندێتی هەیە، نەك گرێدراوی ئاغا و بەگ، بەڵکو گوندێتییەکی کەمێك ئازاد هەیە. چونکە بەتوانستی خۆی دەژیت. بۆیە هەرچەندە کاپیتالیزم و داگیرکەری لە کوردستاندا زۆر بەهێز بووە و هەوڵەکانی تواندنەوە زۆر بەهێز بووە، زۆر گۆڕانکاری ئەنجامداوە، تورکبوونی پێشخستووە و کوردێتی زۆر لاواز کردووە. بەڵام لەو ناوچەیەی کە سەرۆك تێیدا لەدایك بووە نە کاپیتالیزم و نە داگیرکەری زێدە پێشنەکەوتووە، کاریگەریان هەیە، بەڵام سەرەڕای ئەو کاریگەرییەش هێشتا کولتووری گوندێتی زۆر بەهێزە، بۆیە گەلان و ئایین و ئایینزاکان نەتواونەتەوە.

بۆنموونە؛ لەوێ لەناو خێزانیشدا دەسەڵاتدارێتی پیاو زێدە باڵادەست نەبووە، ئەگەر کاریگەری کاپیتالیزم و داگیرکەری لەوێ هەبایە ئەوا لەخێزانیشدا گۆڕانکاری بەدیدەهات. گۆڕانکاری بەسەر ئەو گەلانەشدا دەهات. لەبەر ئەوەی ئەوە رووینەداوە سەرۆك هەموو ئەو تایبەتمەندییانە وەردەگرێت. ئەمە بەگرنگی دەزانم بۆیە من باسی دەکەم.

## بەگشتی ئەو کاتە ئەو مشتومڕەی لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی و مەسەلەی چینایەتی هەبوو چ رەنگدانەوەیەکی لەسەر تەڤگەرەکە هەبوو؟

بێگومان ئەوکاتە گفتوگۆ و مشتومڕی بەمشێوەیە هەبوو، زۆرتریش لەنێو تورکیادا هەبوو، لەنێو رۆشنبیران و خوێندەڤاناندا هەبوو، زیاتریش مەسەلەی چینایەتی بەبنەما وەردەگیرا، بەڵام سەرۆك ئاپۆ شانبەشانی گفتوگۆی مەسەلەی چینایەتی مەسەلەی نەتەوەییشی بەبنچینە وەردەگرت. واتا تەڤگەری (PKK) هیچ کاتێك وەکو تەڤگەرەکانی دیکە نەبووە بەتەڤگەرێکی چینایەتی، بۆیەش وەکو تەڤگەرەکانی دیکە بەرتەسك نەمایەوە، هەرچەندە ناوی خۆی کردە "پارتی کرێکارانی کوردستان"یش، ئەمەش کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو بوو. چونکە ئەو کاتە ئەو پارتیانەی بۆ ئازادی و سۆسیالیزم دامەزران هەموویان یان ناوی خۆیان دەکردە" پارتی کۆمۆنیست"یان"پارتی کرێکاران" لەبەر ئەوەی کاریگەری شۆڕشی ڤێتنامیش هەبوو و لەهەمانکاتدا سۆسیالیزمیشی بەبنەما وەردەگرت، ناوی خۆی کردبووە پارتی کرێکاران. (PKK)ش ئەو ناوەی لەخۆی نا. واتا پارتی کرێکاران گوزارشت لەچی دەکات؟ گوزارشت لەمەسەلەی چینایەتی دەکات. چونکە تۆ ئەگەر گووتت: پارتی کرێکاران، واتا دەبێتە تەڤگەر و رێکخستنی چینێك. بەڵام (PKK) هیچ کاتێك چینی کرێکاری بەتەنیا بەبنەما وەرنەگرتووە. (PKK) هەرچەندە ناوی خۆیشی ئەمە بێت لەسەر ئەو بنەمایەش دامەزرابێت، لەژێر کاریگەری ئەمەشدا دامەزرابێت، هەم لەرامان و بیرکردنەوەدا هەمیش لەپراکتیکی خۆیدا خۆی تەنیا بە کرێکارانەوە سنووردار نەکردووە، بەڵکو هەموو کۆمەڵگای بندەستی بەبنچینە وەرگرتووە، واتا کۆمەڵگای ژێرەوەی بەبنەما وەرگرت، هەموو چینە ژێردەستەکانی بەبنەما وەرگرت، ئەوەی لەژێر زوڵمدان لەرووی ئایینی، رەگەزی و نەتەوەیی، هەمووی بەبنەما وەرگرت. بۆیە نەبووە تەڤگەری تەنیا چینێك. تەنانەت نەبووە تەڤگەری تەنیا گەلێکیش، نەبووە تەڤگەری تەنیا ئایین و ئایینزایەکیش. هەر لەسەرەتاوە بووە تەڤگەرێکی هەموو نەتەوە، ئایین و رەگەزەکان و وەهاش پێشکەوت. ئەمە پەیوەستە بەو شێوەگرتنەی سەرۆك ئاپۆ و ئەو ناوچەیەی لێی بووە. لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیەی لێی بووە وەکو گووتم؛ تەنیا یەك نەتەوە یان یەك ئایین و ئایینزای لێ نییە، بەڵکو هەموو ئایین و نەتەوە و ئایینزا و ئەتنیکێکی تێدایە. ئەمەش کاریگەری لەسەر سەرۆك ئاپۆ کردووە. سەرۆك ئاپۆ هەر لەسەرەتای تەڤگەرەکەوە تەڤگەرێکی رێکخست کە ئازادی بەبنەما وەردەگرێت، کەواتە

بنچینەی هەموو ئایین و ئایینزا و نەتەوە و ئەتنیکێکی بەبنچینە وەرگرتووە. کاتێك ئێمە دەمانگووت کرێکار (کارکەر) تەنیا گوزارشتی لە چینی کرێکار نەدەکرد، ئێمە کە دەمانگووت کارکەر واتا مەبەستمان ئەوەی هەژار، ژێردەست، ئەوەی زوڵمی لەسەر بێت، ئێمە ئەوانەمان بەبنچینە وەرگرت. بۆیە (PKK) وەها بەرتەسك نەمایەوە و نەبووە تەڤگەرێکی مارژیناڵ. بووە تەڤگەرێکی جەماوەری (گەلەری). لەو تەڤگەرەشدا هەموو چین و توێژێك جێی تێداگرت.

لەمێژووی کورداندا دەزانرێت کە چەندە تەڤگەر دەرکەوتوون لە ناوچەیەکدا، یان لە ئایینزایەکدا، یان لە ئایینێکدا، یان لە عەشیرەتێکدا قەتیس ماوە، بەڵام تەڤگەری ئاپۆچی هیچ کاتێك لە ناوچەیەك یان عەشیرەتێك و ئایینێك و ئایینزایەکدا، تەنانەت لە پارچەیەکیشدا قەتیس نەماوە. بەڵکو کەوتە نێو تەواوی کوردستان، لە کوردستاندا چەندە نەتەوە و ئایین و ئایینزا ...هتد هەن کەوتە نێو هەموویانەوە. هەموویان لەنێو (PKK)دا شوێنیان گرت، بۆیە کاریگەری (PKK) بەتەنیا لە باکوور نەمایەوە، بەڵکو کەوتە نێو هەموو پارچەکانی کوردستانیشەوە. تەنانەت کەوتە ناو هەموو خۆرهەڵاتی ناوینیشەوە. ئەمڕۆ لە جیهانیشدا کاریگەری خۆی هەیە، بێگومان ئەمە پەیوەستە بەراستینەی زیهنییەتی تەڤگەرەوە. پەیوەستە بە فەلسەفە و ژیان و شێواز و پراکتیکەکەیەوە.

**واتا ئەوکاتە لەگەڵ سەرهەڵدانی دەستەواژەی "کوردستان ژێردەستە" ئەو شیمانەیەش لەلای تەڤگەری ئاپۆچی سەریهەڵدا کە بەچینی سەردەستی کوردیش رزگاری نابێت، بەڵکو بە چینی ژێردەستە خۆی رزگاری دەبێت...**

وایە، منیش مەبەستم ئەوەبوو. تەڤگەری ئاپۆچی وەکو ئەو پارتیانەی کە هەبوون لەمەسەلەکە نزیك نەبووەوە، واتا کۆمەڵگای ژێردەستی بۆخۆی بەبنەما وەرگرت، وەها نزیکبۆوە. بۆیە تەنها وەکو مەسەلەیەکی چینایەتی یان تەنیا نەتەوایەتی لێی نەڕوانی،

بەڵکو هەم مەسەلەی چینایەتی و هەمیش مەسەلەی نەتەوەیی کردە یەك. مەسەلەی ژێردەستی و سەردەستی کردە بنچینە؛ کێ ژێردەستە و کێ بندەستە؟ واتا چۆن بتوانێت کۆیلایەتی نەهێڵێت ئازادی بەدیبهێنێت؟ چونکە بۆ خۆی ئازادی بەبنچینە وەرگرت، ئەوانەی بە ئازادی نازین، ئیدی بە چ شێوەیەك دەبێت با ببێت، لە کۆیلایەتی دەژین، هەموویانی بۆ خۆی بەبنچینە وەرگرت. بۆیە بووە تەفگەرێکی گەل (گەلەری) چونکە کۆمەڵگای ژێرینی بەبنچینە وەرگرت. تەنیا چینێکی بەبنچینە وەرنەگرت، کەچی لە جیهاندا ئەوانەی ناوی کۆمۆنیست یان کارگەران (کرێکاران)یان هەلگرتبوو بەتەواوی چینایەتیان بەبنەما وەردەگرت، لە چینایەتیشدا هەندێك چینیان بۆ خۆیان بەبنچینە وەرگرتبوو. واتا هیچ کاتێك کۆمەڵگای ژێرەوەیان بەبنچینە وەرنەگرتووە. هەربۆیە نەبوونە تەفگەرێکی ئازادیخواز، نەبوونە تەفگەرێکی دیموکراسی، بۆیە کێشەی ئازادی و دیموکراسی و یەکسانیان چارەسەر نەکرد. خۆیان لەژێر کاریگەری دەسەڵاتدارێتی و کۆیلایەتی رزگار نەکرد.

## سەرنجراکێشە!! هەر لە سەرەتاوە لەدەرەوەی کورداندا لەنێو گەلانی دیکەشدا ملیتان و شۆرشگێڕ تەڤلی (بەشداری) تەڤگەرەکە دەبن؟!

هەڵبەتە، هەر لەسەرەتاوە هێشتا سەرۆك ئاپۆ بەتەنیایە، کێ لەگەڵ سەرۆك ئاپۆ شوێن دەگرێت؟ "کەمال پیر" و "حەقی قەرار"ن، هەردووکیشیان کورد نیین، خەڵکی کوردستانیش نین، بەڵکو تورکن و لە تورکیادا دەژین، بێگومان ئەمە زۆر گرنگە.

هەمیش هەردووكیان بێدوودڵی لەگەڵ سەرۆك ئاپۆدا شوێن دەگرن، هێشتا نە كورد و نە كەسێكی كوردستان لەگەڵ سەرۆك ئاپۆ شوێنگیر نەبووە، بەڵام ئەوان باوەڕی بە سەرۆك دەهێنن. بۆچی؟ ئەو دوو هەڤاڵە لەگەڵ سرۆكدا شوێنگیر دەبن، چونكە لە سەرۆكدا؛ ئازادی خۆیان و ئازادی هەموو گەلان و ئازادی مرۆڤایەتی دەبینن، بۆیە بێ دوودڵی لەگەڵ سەرۆكدا شوێن دەگرن.

بۆ نموونە؛ لەمێژوودا زۆر شۆڕشگێڕ هەن چوون لەنێو هەندێك تەڤگەری گەلانی تردا شوێنیان گرتووە و بۆ ئەو گەلانە شەڕیان كردووە. بەوانە دەڵێن" شۆڕشگێڕی ئەنتەرناسیۆنالیست" واتا ئەوانە نەك تەنها بۆ وڵات و گەلی خۆیان بەڵكو بۆ ئازادی هەموو گەل و وڵاتان شەڕیان كردووە. هەمیش نەك لەوڵاتی خۆیان، بەڵكو چوونەتە دەرەوەی وڵاتی خۆیان و لەنێو تەڤگەری ئەو وڵاتانە شوێنیان گرتووە و بۆ ئازادی و دیموكراسی شەڕیان كردووە. بەڵام ئەوەی "حەقی قەرار" و كەمال پیر بەمشێوەیە نییە، هێشتا تەڤگەرێك لە كوردستان دەرنەكەوتووە، تا لە توركیاوە بێن شوێنی تێدا بگرن، تەنانەت تەڤگەرێك لەگۆڕەپاندا نییە، تەڤگەرێك دەردەكەوێت یان نا؟ ئەمەش دیار نییە، سەرۆك ئاپۆ تەنیایە، ئەوانە هەردووكیان لەگەڵ سەرۆكدا شوێن دەگرن، بۆ ئەوەی تەڤگەرێك ئاوابكەن. بۆیە دۆخی شۆڕشگێڕێتی "حەقی قەرار" و "كەمال پیر" لەدۆخی شۆڕشگێڕێتی ئەنتەرناسیۆنالیش جوداترە. پاشان لە زیندانیشدا كاتێك دادوەر لە "كەمال" پیر دەپرسێ:" تۆ بۆچی لەنێو چەپی تورك شوێنگیر نەبوویت، لەكاتێكدا ئەم هەموو تەڤگەر و گروپە چەپڕەوانە هەن، ئەو هەموو تەڤگەرە كوردیانە هەن تۆ شوێنت تێدا نەگرتووە، كەچی تۆ لەنێو (PKK)دا شوێنگیر بوویت، هۆكاری ئەمە چییە؟" "كەمال پیر"یش دەڵێت:"چونكە من لەو تەڤگەر و گروپانەدا ئازادی و دیموكراسی و سۆسیالیزم و سەركەوتنم نەدیت، بۆیە من لەنێو ئەو تەڤگەرانەدا شوێنم نەگرت. من لەنێو (PKK) و لەگەڵ سەرۆك ئاپۆدا سۆسیالیزم و ئازادی و سەركەوتن و دیموكراسیم بەدیكردووە، بۆیە من شوێنم تێیدا گرتووە" ئەمە ڕاستینەی سەرۆك ئاپۆ و (PKK) بەدیار دەخات. هێشتا سەرۆك ئاپۆ بەتەنیایە، "كەمال پیر" و "حەقی قەرار" بێدوودڵی لەگەڵ سەرۆك ئاپۆدا شوێن دەگرن و دەخوازن پێكەوە لە كوردستاندا تەڤگەرێك پێشبخەن. ئەمە لەكاتێكدایە كە تەنانەت كورد و كوردستان خاوەنداری

لەخۆیان ناکەن، کەچی ئەم دوو هەڤاڵە خاوەنداریێتی لە گەلی کورد و گەلی کوردستان دەکەن. ئەمەش زۆر جودایە. ئەگەر لە سەرۆك ئاپۆدا سۆسیالیزم و ئازادی و دیموکراسی و سەرکەوتن و برایەتی گەلانیان نەبینیایە، هەر لەسەرەتاوە هێشتا هیچ لەئارادا نییە بەمشێوەیە شوێنیان لەگەڵ سەرۆك ئاپۆدا نەدەگرت، ئەمەش بەو واتایەدێت کە سەرۆك ئاپۆ هەر لەسەرەتاوە کەسێتییەکی وەها تەنگ نییە، کەسێتیەکی وەها نییە تەنها کورد و کوردستان بەبنچینە وەربگرێت، بەڵکو کەسێتییەکە بەو رادەیەی کورد و کوردستان بەبنچینە وەردەگرێت هێندەش هەموو گەلان و مرۆڤایەتی بەبنچینە وەردەگرێت، "کەمال پیر" و "حەقی قەرار" ئەو راستییە دەبینن، بۆیە بێدوودڵی لەگەڵیدا شوێندەگرن.

سەرۆك دەڵێت:" من نیو سەعات قسەم لەگەڵیاندا کرد، بەڵام ئەوان بێدوودڵی لەگەڵ مندا شوێنیان گرت، تاوەکو شەهیدیش بوون ئەو پەیوەستبوون و هەڤاڵێتییە بەردەوام بوو" ئەوان لە کەسێتی سەرۆك ئاپۆدا چی دەبینن؟ بێگومان ئازادی هەموو گەلان و گەلی خۆیان و سەرکەوتنی خۆیان دەبینن. بۆیە شوێندەگرن. چونکە وەکو باسم کرد؛ کەسێتی سەرۆك ئاپۆ لەو ناوچەیەی تێیدا لە دایکبوو و دەژیا زۆر ئایین و نەتەوە هەبوون، لە ژینگەیەکی وەهادا مەزن بوو، هەموو گەلانی دەناسی و ئاشنای هەموو ئایینەکان بوو، لەواندا شتی باش و خراپ چیین، هەمووی بینی. ئەم ئاشنابوونەش کاریگەری لەسەر شێوەگرتنی کەسێتی سەرۆك ئاپۆ کرد، پاشان سەرۆك ئەمەی گەیاندە ئاستی زانابوون و هوشیاری و کەسێتی خۆی بەتەواوی لەسەر ئەوە ئاواکرد. لەکەسێتی خۆیدا گوزارشتی لەهەموو گەلان و ئایینەکان دەکرد، گوزارشتی لە ئازادی دەکرد. بۆیە هەردووکیان ئەمەیان بینی و بێدوودڵی لەگەڵیدا شوێنیان گرت.

## تێکۆشانی ئازادی و رزگاری گەلان لەو کاتەدا تاچەند کاریگەری لەسەر کوردستان بەگشتی و ئاوابوونی ئەو تەڤگەرە بەتایبەتی هەبوو؟




ڕێپێوانێکی جەماوەری لەساڵانی حەفتاکاندا

بێگومان تەڤگەرە ئازادیخوازەکانی گەلان کاریگەری مەزنیان لەسەر کوردستان، هەمیش لەسەر دەرکەوتنی تەڤگەری ئاپۆچی هەبوو، بەتایبەتی تەڤگەری گەلانی ڤێتنام، فەلەستین، مۆزەمبیك، ئەریتریا و ئەنگۆلا...هتد هەمووی هەبوون. تەڤگەری هەرە بەناوبانگ و بەرچاویش تەڤگەری گەلی ڤێتنام بوو. ڤێتنام نەك تەنیا لەسەر کوردستان و تەڤگەری ئێمە کاریگەری هەبوو، بەڵکو لەسەر تەواوی جیهان کاریگەری هەبوو، هەموو گەلانی ژێردەست تەڤگەرە چەپڕەو و ئازادیخوازەکان لەژێر کاریگەری تەڤگەری ڤێتنامدا بوون، لاوان لەژێر کاریگەری ڤێتنامدا بوون، بۆ ئەوەی ڤێتنام بەسەر بکەوێت زۆر بزووتنەوەی پرۆتستۆیی لەدژی ئەمریکا پێشدەکەوتن، تا دەهات ئەو بزووتنەوانەش بەهێز و فراوانتر دەبوون. زێدەتریش بزاڤی لاوان لەبرەو دابوون. بۆ نموونە؛ بزاڤی لاوان زۆر بەهێز بوو و لەساڵی (١٩٦٨)دا لە جیهاندا سەریهەڵدا، لەبنچینەدا ئەمە تارادەیەك لەژێر کاریگەری شەڕی ڤێتنامدا بوو. ئەمانە هەمووی کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر کەسێتی **سەرۆك ئاپۆ**دا دروستکرد، هەڵبەتە **سەرۆك ئاپۆ** خۆیشی دەڵێت:" لەلایەکەوە تەڤگەری ڤێتنام، لەلایەکی تریشەوە بزاڤی شۆڕشگێڕی

لاوان لە تورکیا کاریگەری زۆر مەزنیان لەسەر من کرد، من بینیم کەوا گەلی ڤێتنام وەکو ئێمە گەلێکی ژێردەستە و بۆتە دووبەش، هەمیش لەدژی ئەمریکا کە هێزێکی مەزنە سەرپەهەڵداوە و شەڕدەکات. گەلانی ژێردەست و ئازادیخوازانی جیهانیش هەموو لەگەڵ ڤێتنامدا جێدەگرن. بۆچی ئێمە شەڕ نەکەین؟ ئێمەش وەکو گەلی ڤێتنام پارچە پارچە بووین، پێویستە ئێمەش بۆ ئازادی خۆمان شەڕ بکەین". لەم رووەوە ئەمڕۆ ئەو ئەنجامە هەڵدەهێنجرێت، هەروەها لە تورکیاشدا بزاڤی چەپرەوی لاوان هەبوو، بزاڤێکی رادیکاڵ و بەهێز بوو، ئەویش بۆ ئازادی شەڕیان دەکرد، گفتوگۆ لەم بارەیەوە گەرم بوو، چالاکی پرۆتستۆیی، رێپێوان ئەنجام دەدران، سەرۆك ئەمانە هەمووی دەبینێت و گوێبیستی دەبێت، ئەمەش کاریگەری خۆی دروست دەکات. لەسەر ئەو بنەمایەش چۆن دەست بهاوێژێتە کێشەی کورد و چۆن ئەو کێشەیە بخاتەڕوو و بیکاتە رۆژەڤەوە؟ لەم رووەوە دەکەوێتە نێو لێکۆڵینەوە و لێگەڕینەوە. لەمەدا باشتر لەراستی تێدەگات. سەرەتا بە تەنیایە، لەرووی تیۆرییەوە خەریکی لێکۆڵینەوە دەبێت و تێیدا قووڵ دەبێتەوە، چەندە خۆی لەم لێکۆڵینەوەیەدا قووڵتر دەکاتەوە، باشتر لەکێشەی کورد تێدەگات. چونکە لە مێژووی مرۆڤایەتی تێدەگات. لەو مێژووەدا لە تورکیا تێدەگات و لەوێشدا مێژووی کوردان و ئەو ستاتۆ و ژیانەی کورد کە تێیدا دەژیت دەبینێت و تێیدەگات، کە ناکرێت مرۆڤ ئەو ستاتۆ و ژیانە پەسند بکات. لە جیهانیشدا هەموو لەدژی ئەو ستاتۆیە لەشەڕ و تێکۆشان دایە، بۆیە دەڵێت:" پێویستە ئێمەش ئەو شەڕ و تێکۆشانە بکەین". لەسەر ئەو بنەمایە دەست بەکار و خەبات دەکات، ئەو تەڤگەرەش لەسەر ئەو بنەمایە دروست دەبێت.

## ئەوکاتە رەوشی بزاڤی چەپگەر هەم لە باکووری کوردستان و هەمیش لە تورکیا بە چ شێوەیەك بوو؟ هەڵوێستی ئەوان لەبەرامبەر دۆزی کورد و کێشەی کورد چۆن بوو؟

کاتێك هێشتا تەڤگەری ئاپۆچی تازە دەرکەوتبوو؛ هەندێك تەڤگەری دیکەی کوردی هەبوون، هەندێك تەڤگەری چەپی تورکیش هەبوون. چەپی تورك هەم لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراودا بوون، هەمیش لەهەموو روویێکەوە خۆیان لەژێر کاریگەری کەمالیزم رزگار نەکردبوو. هەرچەندە چەپیش بوون، لەوانەیە بەراستی نیازی ئەوانیش باش بووبێت، لەم پێناوەشدا، زۆر خەبات و تێکۆشان و فیداکاریشیان کردووە، دەستگیریش دەکران و دەشکوژران، بەڵام لەبەرامبەر کێشەی کوردان خاوەن هەڵوێستێکی وەها جددی نەبوون. بەگشتی نزیکبوونەوەی تەڤگەری چەپی تورك وەك نزیکبوونەوەی سۆسیالیزمی بنیادنراو و کاپیتالیزم و داگیرکەران بوو، هەمان هەڵوێستیان هەبوو، تاك تاك هەندێك کەس هەبوون باسی کێشەی کوردیان دەکرد و دەیانخواست باشتر لەو کێشەیە تێبگەن، نموونەی ئەوانەش "ماهیر چایان، ئیبراهیم کایپاك کایا، دەنیز گەزمیش، دکتۆر حیکمەت کڤلجملی" هەریەك لەوانە سەرۆکی بزاڤێك بوون. بەڵام ئەوان لەهەموو روویێکەوە لەکێشەی کورد تێنەگەیشتبوون و دەیانخواست لێی تێبگەن، هێدی هێدی باسیشیان لێوەدەکرد. بەڵام زۆر بەکەمی باسیان لێوە دەکرد. بەگشتی کەس باسی لێوە نەدەکرد، تەنانەت دەیانگووت:" کێشەی کوردی چی؟ ئێمە هەموو شۆڕشگێڕ و سۆسیالیستین، ئەگەر ئێمە دەسەڵاتمان خستە دەستی خۆمانەوە، کاتێك کە سۆسیالیزممان سەرخست، هەموو کێشەکان چارەسەر دەبن، ئەوکاتە کێشەی کوردیش چارەسەر دەبێت" نزیکبوونەوەیان لەسەر ئەو بنەمایە بوو. تەنانەت هەندێکیان دەیانگووت:" کێشەی کورد و کوردستانی چی؟! کوردستان وەکو گۆڕستانە، مرۆڤی مردوو چۆن زیندوو دەبێتەوە؟ کێشەی کوردیش نەماوە و مردووە". تەواوی بزاڤە چەپگەرەکانی تورك وەها نزیکی کێشەی کورد دەبوونەوە. بەڵام لە ناویشیاندا وەکو گووتم؛ هەندێك کەس هەبوون لەسەر کێشەی کورد راوەستەیان دەکرد و دەیانخواست لێی تێبگەن. بەڵام تەمەنی ئەوانیش بەشی ئەوەی نەکرد. چونکە دەوڵەت شاڵاوی بردە سەر ئەو بزاڤانە، بەتایبەتی هێرشی کردە سەر سەرۆکی ئەو بزاڤانە، لێرەوە زەبری لەوان دا. بۆیە ئەمەش نەیهێشت ئەوانەی لەسەر کێشەی کورد رادەوەستان بتوانن زیاتر خۆیان قووڵ بکەنەوە.

بۆ نموونە؛ سەرۆك ئاپۆ دەچووە نێو هەندێك گفتوگۆی ئەوانیشەوە و گوێی لێیان دەگرت، بە ئاخاوتنی ئەوانیش کاریگەر دەبوو. سەرۆك دەڵێت:" من گوێبیستی ئاخاوتنەکانی دکتۆر حیکمەت و ماهیر چایان بووم، کاریگەرییان لەسەر من کرد" هەروەها لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیش و هاورێکانی کاتێك بەر لەوەی لەسێدارە بدرێن هاواردەکەن "بژی برایەتی گەلی کورد و تورك" کاریگەری لەسەر سەرۆك دروست دەکات. تەنانەت ماهیر چایان لە گفتوگۆیەکدا دەبێژێت:" پێویستە گەلی کورد خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات، کەس ناتوانێت ئەمە دیاری بکات"، پاشان ئیبراهیم کایپاك کایا سەبارەت بە کێشەی کورد هەندێك شت دەنووسێت، ئەمانە هەمووی کاریگەری خۆیان هەیە، بەڵام ئەو هەڵوێستانە تاکەکەسی بوون، نەببوون بە بزافێك، یان نەببووە چەمکێکی گشتی بزافی چەپگەر. واتا بزافی چەپگەر نەیتوانیبوو هەم خۆی لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو و هەمیش لەژێر کاریگەری کەمالیزم رزگار بکات. ئەگەر تۆ خۆت لەهەردووکیشیان رزگار نەکەیت، ناتوانیت راست لە کێشەی کورد نزیك ببیتەوە. بەگشتی و بەتەواوی نزیکبوونەوەی کەمالیزم بنەمابوو، کە رەتکردنەوەی کورد بوو. هەندێك لایەنیش بەئاشکرا رەتیان نەدەکردەوە و نەیاندەگووت:" کورد نییە" بەڵکو دەیانگووت:" ئێستا کێشەیەکی وەها پێویست نییە باسی لێوە بکرێت، ئەم کێشەیە کێشەیەکی شۆرشە، ئێمەش وا شۆڕش دەکەین، ئەمە لەگەڵ شۆڕشدا چارەسەر دەبێت" وەها نزیك دەبوونەوە. بێگومان ئەم نزیکبوونەوەیەش نزیکبوونەوەی نکۆڵیکردن بوو لە کورد، تەنانەت لە ئەنقەرەدا هێشتا تەڤگەرێکی جودا دروست نەببوو، سەرۆك ئاپۆ لەگەڵ چەپی تورك هەندێك گفتوگۆی دەکرد. ئەوکاتە هێشتا بیرێکی ئێمە نەبوو کە بەناوی کوردستان رێکخستنێك پێشبخەین، سەرۆك ئاپۆ زیاتر دەیخواست کێشەی کورد لە چەپی تورك تێبگەیەنێت. بۆ ئەوەی چەپی تورك لەژێر کاریگەری کەمالیزم و سۆسیالیزمی بنیادنراودا دەربکەون. چونکە تەنیا سەبارەت بەکێشەی کورد بەهەڵەدا نەچووبوون، لە زۆر کێشەی دیکەشدا هەڵە و کەموکورتی ئەوان هەبوو. سەرۆك ئاپۆ دەیخواست لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەوە ئەوان لەراستینەی ئەو کێشانە تێبگەیەنێت، ئەوان لەو هەڵە و کەموکورتیانە رزگاربکات.

بۆ نموونە؛ رۆژێکیان سەرۆکی بزاڤێکی چەپگەری تورك بە سەرۆك ئاپۆ دەڵێت:" ئەوە چییە دەڵێی کورد و کوردستان؟ شتێکی وەها نییە و نەماوە، ئەگەر تۆ دەخوازیت شۆڕشگێڕی بکەیت وەرە ئێمە پێکەوە شۆڕشگێڕی بکەین، بەڵام ئەگەر تۆ دەخوازیت مرۆڤێکی مردوو زیندوو بکەیتەوە، ئەوا مرۆڤی مردوو زیندوو نابێتەوە. بۆیە وزەی خۆت بەفیرۆ مەدە..." نزیکبوونەوەی ئەو کەسانە وەها بوو. هەڵبەتە لەئاکامی ئەو گفتوگۆیانە سەرۆك بینی کە ئەوان راست نزیکی کێشەکە نابنەوە، بەمشێوەیەش کێشەی کورد تێناگەیەنرێت و چارەسەر نابێت. ئەو بزاڤە چەپگەرانەش بەمشێوەیە نابنە هێزێك و ئەنجامگیر نابن. بۆیە ئێمە لەئەنجامی ئەو گفتوگۆیانەدا گەیشتینە ئەو ئەنجامە و بڕیارماندا کە لە کوردستاندا رێکخستنێکی جودا پێشبخەین.

ئەگەر ئەوکاتە چەپی تورك راست نزیکی کێشەی کورد ببایەوە لەوانەبوو ئەو هەنگاوە جودایەمان نەهاوێشتبایە. بەڵام ئێمە زۆر کارمان کرد کە بینیمان نابێت، لەئاکامدا ئێمە ئەو بڕیارەماندا کە تەڤگەرێکی جودا دروست بکەین، واتا نزیکبوونەوەی ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە بوو کە باسمان لێوەکرد.

تەڤگەرە کوردەکانیش دەیانگووت:" کورد هەیە" بەڵام کوردێکی چۆن هەیە؟ کوردستانێکی چۆن هەیە؟ کێشەی خۆی چییە و چ ستاتۆیەکی هەیە و ستاتۆیەکی چۆن دەخوازێت؟ چۆن کوردستان و گەلی کورد لەو ستاتۆیەی هەیە رزگار بکرێت؟ سەبارەت بەو مەسەلانە زێدە خاوەن روانین نەبوون. بۆیە نە لەرووی فیکری و نە لەرووی رێکخستن و پراکتیکییەوە زێدە کاریان نەدەکرد، قووڵبوونەوەیەکیان نەبوو. تەنانەت کاریگەریشیان نەبوو، واتا ئەو تەڤگەرانە هەن یان نیین، زێدە دیار نەبوو، نە لەسەر جڤاکی کورد کاریگەریان هەبوو، نە لەسەر چەپی تورك و نە لەسەر دەوڵەت کاریگەری ئەوتۆیان هەبوو، زیاتر تەڤگەرە چەپەکانی تورك لەسەر کۆمەڵگا و لەسەر کوردیش کاریگەریان هەبوو. تەڤگەرە کوردییەکان کاریگەری ئەوتۆیان نەبوو، چونکە کار و خەباتێکیان نەبوو، بۆیە جددیەتێکی خۆیشیان نەبوو. ئێمە ئەوەمان بینی، بۆیە لەدەرەوەی هەموو ئەو تەڤگەرانەوە خواستمان تەڤگەرێکی دیکە پێشبخەین. بۆیە ئێمە تەڤگەری ئاپۆییمان پێشخست.

بۆ یەکەمین جار سەرۆك ئاپۆ گفتوگۆی لەسەر کێشەی کورد و ئەو ستاتۆیەی کوردی تێیدا دەژی کرد و بەروونی خستیەڕوو و گووتی:" ئەو ستاتۆیەی ئێمەی تێیدا دەژین ستاتۆیەکی داگیرکەرانەیە" واتا وڵاتەکەمان داگیرکراوە، داگیرکەران داگیریان کردووە و توانەوە (ئەسمیلاسیۆن) هەیە، تاڵانی هەیە، لەهەموو رووێکەوە نکۆڵی و لەناوبردنی کوردان هەیە. ئەمەیە ئەو ستاتۆیەی گەلەکەمان تێیدا دەژی و ئەو ستاتۆیەش بۆ ئێمە مردنە، ئێمە ناتوانین ئەو ستاتۆیە پەسند بکەین، پێویستە ئەمە رەتبکەینەوە. کورد ئیرادەی نەماوە، جڤاك و کەسێتی کورد نەماوە، لەهەموو رووێکەوە کەسایەتی دەکوژرێت، پێویستە ئێمە ئیرادەی کوردان بخەینەڕوو، ئیرادە و جڤاك و کەسێتی ئازاد دەربخەینەڕوو. ئیدی لێرەوە دەستی پێکرد، لێرەوە گفتوگۆی پێشخست، هەم لەدژی چەپی تورك، هەمیش لەدژی ئەو بزاڤە کوردیانەی کە هەبوون. بەمەش شەڕێکی ئایدیۆلۆژی و فیکری پێشخست...

لەنێو چەپی تورکدا کەمالیزم و شۆڤێنیزم باڵادەست بوو، بۆیە لەدژی کەمالیزم و شۆڤێنیزم خەباتێکی زۆر دژواری پەرەپێدا. لەنێو بزاڤە کوردییەکانیشدا میللیگەرای سەرەتایی باڵادەست بوو، لەدژی ئەمەش تێکۆشانێکی پێشخست. لە کوردستاندا ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت باڵادەست بوو. شانبەشانی ئەمەش ئایدیۆلۆژیای ئیسلامییەت، ئایینزایی، عەشیرەتی، ناوچەیی، بنەماڵەیی و تەریقەتەکان هەموویان باڵادەست بوون. سەرۆك لەدژی هەر هەموویان شەڕێکی ئایدیۆلۆژیایی بەهێزی برەو پێدا. راستینەی ئەو ئایدیۆلۆژیایانە چییە و گوزارشت لە چی دەکەن، خستیەڕوو و گەلی لێیان تێگەیاند، کادیرانی تێگەیاند. لەسەر ئەو بنەمایە ئەو پێکهاتە و رێکخستنانەی لەسەر ئەو ئایدیۆلۆژیایانە ئاوا بوون، هەموویان لاواز بوون و کاریگەرییان کەم بووەوە، ئایدیۆلۆژیا و رێکخستن و خەباتی ئێمە پێشکەوت، بەمشێوەیە بووینە تەفگەرێك.

**لەساڵانی حەفتاکاندا لە باشووری کوردستان بزاڤێکی میللیگەرایی هەبوو، بەتایبەتی لەنێو ساڵانی (١٩٧٠ـ ١٩٧٤)دا گەیشتبووە ئاستێکی بەرزیش. بەڵام لە (١٩٧٥)دا شکستێکی مەزنیشی خوارد، لێرەدا هەم**

## مەزنبوونی ئەو بزاڤە و هەمیش شکستخواردنی تا چەند کاریگەری و رەنگدانەوەی لەسەر بیر و رامان و گروپە سەرەتاییەکەی تەڤگەری ئاپۆچی کرد، کە ئەوکاتە تازە دەستی بە تێکۆشان دەکرد؟

ئەو تەڤگەرەی باشووری کوردستان زێدە کاریگەری لەسەر باکووری کوردستان نەبوو، لەوانەیە لەنزیك سنووری نێوانیاندا لەنێو گەلدا هەندێك کاریگەری هەبووبێت، بەڵام لە دەرەوەی ئەمە هەم لەنێو گەل و هەمیش لەنێو لاواندا زێدە کاریگەری خۆی نەبوو، ئەمە لەکاتێکدا کە لەباشووردا زۆر بەهێز بوو. کاتێك کە شکستیشی هێنا ئەو کاریگەرییەی کە هەشیبوو نەما. تەنانەت لە باکوور ئەوانەی هێڵی ئەو بزاڤەیان بۆ خۆیان بەبنەما دەگرت، هەر ئەوانیش بەناوی کوردان هەبوون، کە بەو هێڵە خۆیان بە رێکخستە کردبوو، کە خۆیان زۆر مارژینالْ بوون، لەسەر کۆمەڵگا و دەوڵەتی تورك و چەپی تورك و جڤاکی تورك کاریگەری وایان نەبوو. کاتێك ئەو شکستە روویدا، ئیدی بەتەواوی ئەو کاریگەرییەی هەشیبوو نەما. بەڵام بۆ سەرۆك ئاپۆ ئەو شکستانە گوزارشتی لە شتێك کرد؛ لە باشووردا بزاڤێکی هێندە بەهێز بووبێت و زەبرێکی هێندە مەزنیشی بەریکەوێت، رابوونێکی وەها مەزن و کەوتنێکی وەها مەزن، سەرۆك ئاپۆ لەسەر ئەو بنەمایە راوەستەی لەسەر کرد و لێی تێگەیشت کە بۆچی بزاڤێکی هێندە بەهێز لەماوەیەکی کورتدا شکستی هێنا؟ بۆیە ئەو بزاڤەی لە باکوور سەرهەڵبدات چۆن هەوڵبدرێت وەها نەبێت؟! بێگومان لەمەدا هەندێك دەرەنجامی بەدەستخستبوو. واتا بزاڤێك لەسەر هێزی خۆیی خۆی و باوەڕیی خۆی سەرهەڵنەدات و بەپشتیوانی هەندێك هێزی دیکە سەرهەڵبدات بزاڤێکی وەها بێ ئەنجام دەبێت.

لە باشووردا؛ لە بزاڤی بارزانیدا ئەم راستینەیە سەلمێنرابوو. چونکە ئەو بزاڤە لەسەر هێزی خۆیی خۆی سەریهەڵنەدابوو، بەڵکو لەسەر هێزی هەندێك لە دەوڵەتان سەریهەڵدابوو، باوەڕی خۆی بە خۆی و گەلی خۆی نەبوو، زیاتر باوەڕی بە دەرەوە هەبوو، بە هاوکاری و پەیوەندی دەرەوە خەباتی بەڕێوە دەبرد. کاتێك پەیمانی جەزائیر مۆرکرا و ئەو هاوکاری و پەیوەندییە پچڕا، ئەو بزاڤە یەکسەر کەوت، ئەمەش

دەرەنجامێکی زۆر گرنگی بۆ کوردان خستەڕوو. سەرۆك ئاپۆ ئەمەی شیکردەوە و دەرەنجامی لێ هەڵهێنجا. بزافی ئاپۆچیش لەسەر بنەمای ئەو دەرئەنجامانە خۆی ڕێکخست. هەر لەسەرەتای تەفگەرەوە ئەمەی کردە پرەنسیپێك و گووتی:" پێویستە ئەم تەفگەرە لەسەر باوەڕی و هێزی خۆیی خۆی سەرهەڵبدات". تەفگەریش لەسەر ئەو بنەمایە سەریهەڵدا و تا ڕۆژی ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت ئەمەی بۆ خۆی کردە بنەمایەك، بۆیە تا ئێستا شکستی نەهێناوە.

ئەگەر سەرۆك ئاپۆ لەمەدا ئەنجامی بەدەستنەخستبایە و تەفگەری لەسەر ئەو بنەمایە ئاوا نەکردبایە و پێداگری لەسەر ئەو ڕاستییە نەکردبایە، ئەوا ئێستا تەفگەری ئێمەش هەر لە زووەوە وەکو بزافەکەی مەلا مستەفا پاکتاو دەبوو. ئەمە تایبەتمەندی و پرەنسیپێکی بناخەیی و سەرەکی ئەم بزافەمانە. واتا باوەڕ بەدۆستایەتی دەکات و بەها دەداتە دۆستایەتی، بەڵام هەمیشە خۆی و هێزی خۆیی خۆی بەبنچینە وەردەگرێت و باوەڕی بەخۆی و گەلی خۆی دەکات، لەسەر هێڵی خۆی هەنگاو دەهاوێژێت. بۆیە دەتوانێت لەدژی هەموو هێرشەکان و لەیستۆکەکان ڕابوەستێت، هەر لەبەر ئەمەشە گورزی مەزنی بەرناکەوێت. کاتێك کە بزافی ئێمە سەریهەڵدا شکستەکەی مەلا مستەفا کاریگەری خۆی لەوەدا هەبوو کە لەمەودوا بزافەکەی ئێمە چۆن بەردەوام بێت؟. چونکە لەمێژووی کورداندا زۆرجار کوردان ڕابوونە و ڕاپەڕینیان بەرپا کردووە و زەبریان بەرکەوتووە و کۆمەڵکوژ کراون، پاشانیش ئەوانەی ماون دەوڵەت هەموویانی تەسلیم وەرگرتووە و تەنانەت کردوونی بە سیخوڕ و خستوونیەتە خزمەتی خۆیانەوە. بۆ ئەوەی جارێکی دیکە گەلی کورد نەکەوێتە ڕەوشێکی بەمجۆرەوە پێویستە تەفگەر لەو شکستانەوە بەشێوەیەکی مەزن سەرهەڵبداتەوە. واتا پێویستە بۆشاییەك لە مێژووی تێکۆشانی کورددا دروست نەبێت.

هەڵبەتە لە باکوور تا ساڵانی چل ڕاپەڕینەکان بەردەوام ببوون، هەمووشی سەرکوت و کۆمەڵکوژ کرابوون و لەناوبردرابوون. لە ساڵانی چلەکانیش بەدواوە بێدەنگییەك دروست ببوو. توانەوەیەك ئەنجامدرابوو، لە باشووریش بزافێك زەبری بەرکەوتبوو، ئەگەر تۆ زوو نەکەویتەخۆ و ڕۆڵێك نەبینی ئەوا تۆ ناتوانیت ئەو شکست و ئەو بۆشاییەی دروست بووە پڕی بکەیتەوە. ئەمە نەك تەنیا لە باشووردا، بگرە لە

باکووریش تەسلیمییەتێك دروست ببوو، ئەوا ئەو شکستە ئەو دۆخەی خراپتر دەکرد. نزیکبوونەوەی ئەم تەڤگەرە و سەرۆك ئاپۆش ئەوەبوو؛ مادام تەڤگەری کورد لە باشوور زەبری خوارد، ئەوا پێویستە لەباکوور ئەو تەڤگەرە دەست پێبکاتەوە، پێویستە بۆشایی دروست نەبێت. پێویستە ئەو شکستە ببێتە هۆکاری خەبات و تێکۆشان و گوڕدان بە ڕێکخستنی کوردان...

ئیدی بەم نزیکبوونەوە و فیکرەوە تەڤگەر لە باکوورەوە کەوتە جوڵە. چونکە لە مێژوودا؛ لەو ڕووداوانەی کە ڕوویان دابوو، سەرۆك ئاپۆ ئەنجامی لێوە هەڵدەهێنجا و ئەو ئەنجامەشی بۆ خۆی بە بنەما وەرگرت و دەیکردە وانەیەك بۆ خۆی. جا چ لەمێژووی گەلی کورد بێت یان لە مێژووی گەلانی دیکە بێت، چ باش چ خراپ، هەمووی بۆ خۆی کردۆتە ئەزموون. لەسەر ئەو بنەمایەش تەڤگەری پێشخستووە، نەك تەنیا شتی باش دەخاتە خزمەتی تەڤگەرەوە، بەڵکو شتی خراپیش دەخاتە خزمەتی تەڤگەرەوە. چۆن شتی خراپ دەخاتە خزمەتی تەڤگەرەوە، ئەوا شتی خراپیش دەکاتە هۆکارێك بۆ ئەوەی جارێکی دیکە شتی خراپ دووبارە نەبێتەوە و ڕوونەداتەوە. ئەگەر شکستێکیش ڕوویدا ئەوا ئەم شکستە دەکاتە هۆکارێك تاوەکو چیدی شکست ڕوونەداتەوە. بۆ ئەوەی تەڤگەر بەردەوام بکات و بەهێزتر بێت. ئیدی بەم نزیکبوونەوەیە لە شکستی تەڤگەری مەلا مستەفا بارزانیدا، هەم ئەنجام و ئەزموونی لێوەرگرت، هەمیش ئەوەی کردە هۆکارێك بۆ ئەوەی تەڤگەری ئاپۆچی پێشبخات. ئەگەر تەڤگەر بەشێوەیەکی جودا لە باکوور پێشکەوت ئەوا لەبەر ئەمە پێشکەوت، ئەگەر شکست دووبارە نەبووەوە، لەبەر ئەم هۆیەیە.

## لە ساڵانی حەفتاکاندا؛ گروپەکە تازە دەست بە خەبات دەکات...

**ئەوکاتە کۆمەڵگای کوردی، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لەلایەکەوە فیوداڵیزم هەیە و لەلایەکی دیکەشەوە کاپیتالیزم خۆی دەخزێنێتە ناوییەوە، لەو خاڵەدا چۆن لەکۆمەڵگا دەڕوانرا و چۆن**

شیدەکرایەوە؟ هەروەها سیاسەتی نکۆڵی و توانەوە و فڕکردنیش بەڕێوەدەبرا، ئەم سیاسەتە گەیشتبووە چ ئاستێك؟

لەو قۆناخەدا کۆمەڵگای کورد لەهەموو شتێك دەژیا، تەنیا خۆی نەدەژیا و بە ناسنامەی خۆی نەدەژیا، بۆ بەرژەوەندی خۆی نەدەژیا، راستینەی خۆی نەدەژیا، بۆیە لەدەرەوەی خۆی هەموو شتێکی تر دەژیا. بۆ هەموو کەسێك دەژیا و کاری دەکرد و خزمەتی هەموو کەسێکی دەکرد، بەڵام تەنیا خزمەتی خۆی نەدەکرد. لەلایەکەوە دەوڵەت سیاسەتی نکۆڵی و فڕکردنی بەڕێوە دەبرد، لەلایەکی دیکەشەوە کورد خۆیشی نکۆڵی و فڕکردنی خۆی بەڕێوە دەبرد. کاتێك ئەمانە هەردووکیان دەگەیشتنە یەکتر ئەوا یەکتریان تەواو دەکرد، قۆناخی ئەوکاتە بۆ کوردان قۆناخێکی لەناوچوونی زۆر خێرا بوو. لەلایەکەوە فیودالیزمی تێدا بوو، لەلایەکی دیکەشەوە کاپیتالیزم تێیدا بوو، لەلایەکەوە عەشیرەتگەرایی، تەریقەتگەرایی و بنەماڵەگەرایی تێدابوو، لەلایەکی دیکەشەوە فیکری داگیرکەری و رێکخستنی داگیرکەری، کوشت و بڕی هەبوو، توانەوە (ئەسمیلاسیۆن)ی تێدابوو. لەدۆخێکی وەهاشدا کورد باوەڕی بەخۆی نەبوو و دەیگووت:" ئیدی هەموو شتێك تەواو بوو" بەمەش کورد خۆی دووری خۆی دەکەوێتەوە و دەستبەرداری زۆر شتی خۆی دەبێت و شتی داگیرکەران بۆ خۆی بەبنەما وەردەگرێت.

بێگومان ئەوکاتە توانەوە و پەرشوبڵاوی و بێ مۆراڵییەکی مەزن و نکۆڵی لە خۆکردنێك پێشدەکەوت. هەڵبەتە ئەمە خۆی واتای چیبوو؟ ئەمە بێ کەسێتی و بێ رێکخستنی بوو، بێ کەسێتی و بێ رێکخستنی لە برەو دابوو، بەتەواوی دەست لە خۆبەردان و باوەڕ بەخۆنەبوون، دیتنی چارەسەری لە دووژمن و داگیرکەری پەرمیسەندبوو. واتا ئەو رەوشەی گەلی کوردی تێدا دەژیا رەوشێکی بەمشێوەیە بوو، تۆ زێدە شتێکی بەناوی کورد و کوردستانت نەدەبینی. تەنانەت دۆخەکە گەیشتبووە رادەیەك کاتێك تۆ بتگووتبایە کورد و کوردستان، دەیگووت:"ئەمە چییە؟! بۆ هێشتا کورد و کوردستان ماوە؟! هێشتا باوەڕی وەها هەیە کورد و کوردستان مابێت؟!"

وەهایان بە ئێمە دەگووت. مەبەستم کورد خۆی وەهای دەگووت. کاتێك ئێمە تازە گەڕابووینەوە کوردستان و دەستمان بەکار دەکرد دەیانگووت:" هەندێك کەس هاتوون دەڵێن:" کورد و کوردستان هەیە... تۆ بڵێی ئەمە راست بێت؟ شتێکی وەها هەیە؟ ئەمانە شێتن، ئەمانە بێ ئەقڵن" سەرەتا وەهایان پێدەگووتین.

بۆ نموونە؛ من و سەرۆك ئاپۆ چووینە ماڵی سەرۆك لەگوندەکەیان، ئەوکاتە سەرۆك ئاپۆ ئەنقەرە دەیخوێند و تازەش لە زیندان دەرکەوتبوو، ماوەیەك بوو سەردانی ماڵەوەیشی نەکردبوو، ئێوارە لەماڵیان لەسەر خواردن بووین کە باوکی سەرۆك بە سەرۆکی گووت:" پێشان تۆ کۆمۆنیست بوویت، من بیستوومە دەڵێن ئێستا بوویتە کوردپەروەر، ئەمە زۆر مەترسیدارە، دیسان تۆ ببەوە بە کۆمۆنیست باشترە". کاتێك باوکی وەهای گووت، من زۆر سەرم سوڕما، بینیم سەرۆك پێکەنی و گووتی:" باوکی منیش دەزانێت ئەو کۆمۆنیزمەی هەیە مەترسیدار نییە و کوردێتی (کوردایەتی) زۆر مەترسیدارترە". واتا کەسێك باوەڕی نەدەکرد و پێیان سەیر بوو، ئەمەیان بە ئیشی شێتەکان دەزانی، دەیانگووت:" مومکین نییە شتی وەها بێتەئاراوە". هەربۆیە لەسەرەتای دەرکەوتنی ئەو تەڤگەرەدا دەیانگووت:" هەندێك کەس پەیدابوونە بەخۆیان دەڵێن ئاپۆچی، ئەوانە یاندم ئەڵڵا چەتەسی (YANDIM ALLAH ÇETESİ)ن"(١).

واتا ئەوانەی خوا شێتی کردوون، واتا ئەمانە شێتن و ئەقڵیان نییە. نە کورد و نە کوردستان لە گۆڕێدا هەیە، کەچی ئەوانە پەیدابوونە و دەڵێن:" کورد و کوردستان رزگاردەکەین، مەگەر تەنیا مرۆڤی شێت ئەو شتانە بڵێت". دەیانگووت:" ئەو هەموو کەسە رابوون و سەریانهەڵدا، نەیانتوانی هیچ بکەن، ئێوە دەتوانن شت بکەن؟!" تەنانەت باوکی من دەیگووت:" شێخ سەعید رابوو سەریهەڵدا، کەسی وەکو "شێخ سەعید" نەیتوانی هیچ بکات ئێوە دەتوانن شتێك بکەن؟! ئەو شێخ بوو، موریدی هەبوو و گەل پشتیوانی لێدەکرد و توانستی ئەو هەبوو، لەناو گەلدا کاریگەری خۆی هەبوو، ئێوە چیین؟ چەند هەژار و فەقیرێکن، نە لەناو جڤاکدا جێگەی ئێوە هەیە، نە توانستێکیشتان هەیە، کێ گوێ لە ئێوە دەگرێت؟! ئێوە بەخۆتان خۆتان لە ناو دەبەن، ئێمەش لەگەڵ خۆتان لەناو دەبەن، دەست لەو شتانە بەربدەن، ئەمە نابێت..." واتا ئەو رەوشەی کورد تێیدا بوو وەها بوو.

## پەراوێزەكان:

(١) یاندم ئەڵلا چەتەسی؛ دەستەواژەیەك (ئیدیۆمێك)ی توركییە بۆ ئەو كەسانە بەكار دێت كە باكیان بەهیچ شتێك نییە و لەهیچ ناترسن، یان وەك بڵێی خوا شێتی كردووە، بۆ ناپۆچییەكان بەو واتایە بەكاریان دەهێنا كە هیچ شتێكی شەخسی خۆیان نییە جگە لە ئازدی گەل و رزگاری وڵات ئاشقی هیچ شتێك نیین و لەهیچ شتێكیش ناترسن، لەلای خۆمان دەستەواژەی (بەڵای خوا) بەكاردەهێنن، تارادەیەك ئەم ئیدیۆمە هاو واتی ئیدیۆمە توركییەكەیە.

# بەشی سێیەم:

## ڕێگایەك بۆ تێكۆشان...

## ڕێگایەك بۆ ئازادی

## (١٩٧٢ ـ ١٩٧٩)



هەڤاڵ فوئاد ( عەلی حەیدەر قەیتان )

## یەکەمین گرووپی ئەو تەڤگەرە چۆن ئاوا دەبێت و کێ لەم گرووپە سەرەتاییەدا شوێن دەگرێت؟

وەکو گووتم سەرەتا سەرۆك ئاپۆ بەتەنیایە، لەرووی تیۆرییەوە هەندێك لێکۆڵینەوە دەکات و بە هەندێك ئەنجام دەگات. هەڤاڵان **"کەمال پیر"** و **"حەقی قەرار"** دەناسێت، هەردوو هەڤاڵ لە ئەنقەرە، لەگەڕەکی **"سامان پازاڕی"** لەگەڵ سەرۆکدا دەژین. لەو گەڕەکەدا خانوویەك بە کرێ دەگرن و هەرسێکیان پێکەوە دەمێننەوە و دەژین. بەڵام هێشتا گرووپێك یان تەڤگەرێك لەئارادا نییە. سەرۆك زیاتر لە رووی تیۆرییەوە قووڵبوونەوەی خۆی بەردەوام دەکات، ئەو دەرئەنجامەی بەدەستیدەخات دەیداتە هەڤاڵان، **"کەمال پیر"** و **"حەقی قەرار"**یش هاوکاری سەرۆك دەکەن و هەڤاڵێتی لەگەڵدا دەکەن، خزمەتی دەکەن، بەتوانستی خۆیان هاوکاری سەرۆك دەکەن، بۆ ئەوەی سەرۆك خەباتی تیۆری خۆی بەرەو پێشەوە ببات. واتا لە رووی تیۆرییەوە هاوکارییەکی ئەوتۆی سەرۆك ناکەن، بەڵکو سەرۆك بەتەنیا خۆی بەردەوامی بەو لێکۆڵینەوەیە دەدات.

بۆ نموونە؛ لەلایەنی ژیان و گوزەرانەوە، لەرووی دابینکردنی پەرتووکەوە هاوکاری سەرۆك دەكەن. ئیدی سەرۆك لەم لێکۆڵینەوەیەدا خۆی قووڵ دەکاتەوە و دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە لەدەوری ئەم فیکرە و ئەو ئەنجامەی پێیگەیشتووە، گروپێك دابمەزرێنێت. بەم قەناعەتە دەگات. سەرەتا لە نەورۆزی ساڵی (١٩٧٣)دا هەندێك لەو هاورێیانەی بە شەخسی دەیانناسی، واتا هەڤاڵێتییەکی فیکری نییە، بەڵام باوەڕیان پێدەکات و دەبینێت گەنجی دروستن و خوێندکارن، بەوان دەڵێت:"بابەیەکەوە بچینە سەیران". باسی نەورۆز ناکات. چونکە ئەو کاتە کەس زێدە نازانێت نەورۆز چییە! ئیدی دەچنە بەنداوی "**چووبووك**" لە ئەنقەرە، ئەوکاتە بەهارە و خەڵکانێکیش بۆخۆیان دەچنە سەیران... دەڵێت:" با ئێمەش بچین بۆ سەیران" دەچنە بەنداوی "**چووبووك**" و لەوێ دادەنیشن، تا ئەوکاتە ئەو دەرئەنجامانەی لە لێکۆڵینەوە و قووڵبوونەوەی خۆی بەدەستیهێناوە لەگەڵ ئەو گروپە باسی لێوەدەکات. واتا گروپێکی فیکری و رێکخستنی نییە، بەڵکو چەند هاورێ و دۆستێکی شەخسی ئەون لەنێو خوێندکاراندا، دەیانناسێت و باوەڕیان پێدەکات. تا ئەوکاتە زێدە گفتوگۆیەکی فیکری لەم بارەیەوە لەگەڵیاندا نەکردبوو. ئیدی بۆ یەکەمین جار لەم سەیرانەدا بۆ ئەوانی باسدەکات و بەوان دەڵێت:" **کوردستان داگیرکراوە**". کاتێك ئەمەش دەڵێت تامەزرۆی ئەوەشە کە کاردانەوەی ئەوان بزانێت. بێگومان بە تەدبیرەوە باسی لێوە دەکات. چونکە تا ئەو کاتە لەگەڵ ئەواندا سەبارەت بە کورد و کوردستان هیچ قسەیەکی نەکردووە، هیچ گفتوگۆیەکی نەکردووە. بۆیە کاردانەوەی ئەوانیش مەراق دەکات، کە داخوا ئەوان چۆن نزیك دەبنەوە؟ پەسندی دەکەن یان ناکەن؟ هەڤاڵێتی سەرۆك دەکەن یان ناکەن؟ سەرۆك نازانێت. بۆیە بە تەدبیرەوە قسە دەکات و باسی هەموو شتێکیان بۆ ناکات، زۆر بەکورتی باسیان بۆ دەکات و پێیان دەڵێت:"**ستاتۆی کوردستان داگیرکراوە**" واتا بۆ یەکەمین جارە لەگەڵ ئەو هاورێیانەیدا ئەو قسانە دەکات. سەرەتای خەباتی ئەو بزاڤە لەوێوە دەست پێدەکات، هەرچەندە ئەوانە هێشتا گروپێك نین، گروپێکی فیکری نین. بەڵام دەبنە بناخەیەك. من خۆم تەفلی ئەو گفتوگۆیە نەبووم، نازانم کێ بوون. بەڵام یەکێکیان هەڤاڵ فوئاد (عەلی حیدەر قەیتان)بوو. ئەوانی دیکە وا مەزەندە دەکەم کەسیان لەنێو بزاڤی ئێمەدا نین. وا دیارە هەندێکیان نەهاتنە نێو تەڤگەرەوە ئەوەی

هەشبوون پاشان لەگەڵ ئێمەدا بەردەوام نەبوون. ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم وابزانم تەنیا هەڤاڵ "فوئاد" لەنێو ئێمەدا ماوە.

سەرەتای ئەم تەڤگەرە بەم گووتنە "کوردستان داگیرکراوە" دەستی پێکردووە. چونکە بۆ یەکەمین جار سەرۆك سەبارەت بە کوردستان چۆن و چی بیردەکاتەوە، لەگەڵ هەندێك کەسی دیکەی دەرەوەی خۆی باسی دەکات. وەکو گووتیشم؛ بە تەدبیریشەوە قسە دەکات و داخوا چ کاردانەوەیەکیان دەبێت. بێگومان کاردانەوەی ئەوان باشە، خراپ نییە.. واتا روانینێکی زۆریان نییە و هەموویان بە سەرنجەوە گوێی لێدەگرن. هەڵبەتە شتێکی ئەوتۆش لەسەر کوردستان نازانن، ئیدی ئەو قسانە بڵاوناکەنەوە و هەر لەوێ دەمێنێتەوە.

پاشان تا دەهات سەرۆك هێدی هێدی بۆ هەر کەسێك کە دەیانناسێت ئەو فیکرە روونەکاتەوە. سەرەتا گروپبوون وەها دەستپێدەکات و پێشدەکەوێت.

## ئایا مەتریاڵ (سەرچاوە)ی ئەو گروپە لە رووی فیکرییەوە بۆ نموونە پەرتووك، بە تایبەتی سەبارەت بە کورد و کوردستان چیبوون؟. وا دیارە ئەدەبیاتی مارکسیزم ئەوکاتە زۆر بوو، بەڵام سەبارەت بە کورد چ مەتریالێکتان هەبوو و پشتتان بە چ دەبەست؟

بێگومان زەحمەتی هەرە مەزنیش لەمەدا بوو، سەبارەت بە کوردان هیچ پەرتووکێك نەبوو، سەرچاوە نەبوو. سەرۆك ئاپۆ لەهەندێك پەرتووکی کلاسیکی چەپدا لە کێشەی کورد تێگەیشت، نەك وەك ئەوەی لەسەر کوردان هەندێك پەرتووك و مەتریال هەبووبن و ئەوانەی خوێندبێتەوە و لەرێی ئەمەوە لە کێشەی کورد تێگەیشتبێت. لەئاخافتنی پێشتریشدا گووتبووم؛ سەرۆك ئاپۆ دەبینێت کە فیکری سۆسیالیزم کێشەی کورد چارەسەر دەکات، ئیدی هەوڵیدا لەم رووەوە خۆی بەهێز بکات. بەڵام بەناوی سۆسیالیزمەوە زۆر چەمکی لەیەکدی جودا هەبووون، ئەوە دەبینێت کە ئەو چەمکانە هەمووی هی سۆسیالیزم نییە، کەواتە لەدەرەوەی ئەمانەدا سۆسیالیزمی راستەقینە

چییە؟ لەخودی سۆسیالیزم لە سۆسیالیزم تێدەگات. بۆیە بەتەواوی پەرتووکە کلاسیکییەکانی سۆسیالیزم بەبنەما وەردەگرێت، مارکسییەت بۆ خۆی بەبنەما وەردەگرێت. ئەو پەرتووکانە دەخوێنێتەوە.

پەرتووکی مانیفێستۆی کۆمۆنیزم(٤) هەیە، لەو پەرتووکەدا پێشگووتنێك (پێشەکییەك) لەسەر ئیتاڵیا هەیە. سەرۆك ئەو پەرتووکە و ئەو پێشەکییە دەخوێنێتەوە، لەو پێشەکیەدا باس لەوە دەکرێت کە پارچەبوونی ئیتاڵیا چۆن دروست دەبێت و لەسەر چ بنەمایەك ئەو یەکێتیە دێتەدی، لەمیانەی هۆی پارچەبوونی ئیتاڵیا پارچەبوونی کوردستان دەبینێت و یەکێتی کوردستان چۆن دێتەدی، لەمەدا کەمێك لەمەسەلەی کورد تێدەگات. لەلایەکی دیکەشەوە پەرتووکەکانی "لینین" هەیە، پەرتووکی ماق چارەی خۆنووسین، بزاقی نەتەوەیی لە خۆرهەلآتدا، ئەو پەرتووکانە دەخوێنێتەوە. ئەو پەرتووکانە باس لەمەسەلەی نەتەوەیی و مەسەلەی گەلان و گەلی بندەست و ئەو ولآتانەی داگیرکراون دەکات. کە ئەو پەرتووکانە دەخوێنێتەوە لەمەشدا هەندێك لە کێشەی کورد تێدەگات، تا دێت لە مێژووی مرۆڤایەتی تێدەگات، لەرێی ئەو مێژووەشدا مێژووی تورکیا تێدەگات و مێژووی تورکیا دەخوێنێتەوە کە چ مێژوویەکە، لەمەدا چەندە قووڵ دەبێتەوە ئەوەندە لە کێشەی کوردیش تێدەگات. واتا نەك پەرتووك و مەتریال سەبارەت بە کورد هەبێت و بیخوێنێتەوە و شیبکاتەوە و تێیبگات، وەها نییە.

بێگومان بەمشێوەیە تێگەیشتن لە کێشەی کورد راستە زۆر زەحمەتە و هەر کەس ناتوانێت بەمشێوەیە راست لە کێشەی کورد تێبگات. واتا تۆ هەم راست لە سۆسیالیزم تێبگەیت، چونکە بەناوی سۆسیالیزمەوە زۆر چەمکی جیاواز هەن و تێگەیشتن لە راستینەی سۆسیالیزم زۆر زەحمەتە، هەمیش تۆ هیچ مەتریالێکت سەبارەت بە کێشەی کورد لەبەردەستدا نییە هەتا بتوانیت لەراستینەی کورد تێبگەیت. بێگومان ئەمە زۆر دژوارە و هەرکەس ناتوانێت ئەوە بکات. ئیدی سەرۆك ئاپۆ لەبەر ئەوەی لەرێی پەرتووکە کلاسیکییەکانی سۆسیالیزمەوە کەمێك لە راستینەی سۆسیالیزم تێگەیشت، مێژووی بەبنچینە وەرگرت، لەبەر ئەوەی قورسایی خۆی خستە سەر مێژوو، ئەوا لە مێژووی مرۆڤایەتیش تێگەیشت. چونکە مێژوو دەبێتە دایکی هەموو زانستەکانی دیکە.

ئەگەر تۆ باش لە میژوو تیگەیشتیت ئەوا تۆ دەتوانیت لەهەموو زانستەکانی دیکەش تیبگەیت. ئیدی لیرەدا لەبەر ئەوەی چەمکی میژوویی و لیکۆڵینەوەی میژوویی لەلای **سەرۆك ئاپۆ** بەهیزە، بۆیە لە کیشەی کورد تیگەیشت و خستیەڕوو. ئەمەی زۆر بە زەحمەتی و بە رەنجیکی مەزن ئەنجام دا.

**وابزانم ئەو کاتەی تۆ سەرۆك و هەڤاڵان "حەقی قەرار" و "کەمال پیر" دەناسیت هیشتا گروپ تەواو دروست نەبووە...**




**باڵەخانەی کۆلیژی زانستە سیاسییەکان ـ زانکۆی ئەنقەرە**

کاتیك من تەڤلی ئەو گروپە بووم و هەرسیکیانم ناسی، هیشتا گروپیك دروست نەببوو، بەناوی گروپیکەوە تەڤگەریك لەئارادا نەبوو. تەنیا هەندیك کەس هەبوون لەیەکتر نزیك ببوونەوە، بەڵام ئەو کەسانە لەسەر بنەمای تەڤگەریك خۆیان بەریکخستن نەکردبوو، بۆیە تا ساڵی (١٩٧٣) هیچ گروپیك لەئارادا نەبوو. من لەو ماوەیەدا بەشداری ئەو تەڤگەرە بووم. کاتیك من بەشدار بووم وەکو گووتم؛ گروپیکی ئایدیۆلۆژی لەئارادا نەبوو، تەنانەت گروپیکی سیاسیش نەبوو، بەڵکو هەندیك هەڤاڵ هەن و باوەڕیان

بەیەكدی هەیە و وەك گروپێكی زۆر بچووكی شەش حەوت كەسی دەبوون، گفتوگۆیەك لەنێوانیاندا هەبوو، بەڵام خۆی لە گروپێكی سیاسی یان رێكخستنی بەرجەستە نەدەكرد. پاشان هێدی هێدی گروپ دروست بوو و پێشكەوت و بووە گروپێكی ئایدیۆلۆژی. ئەم گروپ خەباتی ئایدیۆلۆژی پێشخست، ئەو خەباتەی قووڵكردەوە. لەئاكامدا خۆی ناساند و بناخەیەكی بۆخۆی دروستكرد، شەرێكی ئایدیۆلۆژی بەرێوەبرد، زۆر ئایدیۆلۆژیای دیكەی شكست پێهێنا و خۆی سەرخست، لەسەر ئەو بنەمایە هێدی هێدی تەڤگەرەكە گەشەی كرد.

## تۆ چۆن و كەی بەشداری ئەو گروپە بوویت؟ لەرێی كێوە سەرۆكتان ناسی؟



**رێبەر ئۆجەلان لەگەڵ هەڤاڵ جەمیل بایكدا**



**هەڤاڵ جومعە ( جەمیل بایك ) لەتافی لاویدا**

من لە ئەنقەرە لە کۆلیژی "زمان، مێژوو، جوگرافیا" لە زانکۆی ئەنقەرە دەمخوێند، لەبەشی زمان و ئەدەبیاتی تورکی بووم، لەوێ لەنێوان ئێمەی خوێندەڤان و فاشیستە تورکەکان بەردەوام شەڕ و پێکدادان دەردەکەوتن. لەو شەڕانەدا من و هەڤاڵ "کەمال پیر" یەکدیمان ناسی، ئەویش شۆڕشگێڕ بوو، منیش شۆڕشگێڕ بووم، بەمشێوەیە یەکدیمان ناسی، بەر لەو پێکداپژانە یەکترمان نەدەناسی، ئیدی لەسەر ئەو بنەمایە بووینە هەڤاڵی یەکتر. واتا هەڤاڵێتییەکی شۆڕشگێڕانە و گشتگیر دروست بوو. چونکە تا ئەوکاتەش لە شۆڕشگێڕێتی خۆمدا ئەندامی هیچ تەڤگەرێك نەبووم، وەکو گەنجێك شۆڕشگێڕیم بۆخۆم بەبنەما وەردەگرت. بەڵام کامە تەڤگەر باشە؟ من ئەوەم دەستنیشان نەکردبوو، لەهیچ تەڤگەرێکدا شوێنگیر نەببووم و پەیوەندیم لەگەڵ هەموو تەڤگەرەکان هەبوو، هەڤاڵێتی من و "**کەمال**"یش هەڤاڵێتییەکی بەو شێوەیە بوو.

پاشان کاتێك کە متمانە و باوەڕی بە من پەیدا بوو، بە سەرۆك ئاپۆ و بە ئەوانیشی گووتبوو، وادیارە ئەوانیش بە هەڤاڵ "کەمال"یان گووتبوو:" تۆ دەتوانیت بیهێنیتەوە ماڵ" ڕۆژێك هەڤاڵ "کەمال" بەمنی گووت:"هەندێك هەڤاڵ هەن، تۆ دەخوازیت ئەو هەڤاڵانەم بناسیت؟ هەڤاڵی منن و باشن و ئەوانیش کوردن" چونکە من پێم گووتبوو:"من کوردم" منیش گووتم:" بەڵێ دەخوازم بیانناسم" ئیدی منی لەگەڵ خۆیدا بردە ئە[illegible]ی سەرۆك و ئەوانی تێدا دەمانەوە. بەمشێوەیە ئەوانم ناسی. واتا هەڤاڵ "کەمال پیر" منی بە سەرۆك ئاپۆ و ئەوان ناساند. کاتێك کە چوومە ئەو ماڵەیان سەرۆك ئاپۆ لەماڵ نەبوو، هەڤاڵ "حەقی قەرار" لەماڵ بوو، لەگەڵ برای هەڤاڵ حەقی"باقی" و "ئیبراهیم خۆجە (ئیبراهیم ئایدن)" خەڵکی دێرسیم بوو، "فەهمی یەڵماز" هەبوو خەڵکی دەریای ڕەش بوو، هەموویان لە ماڵێکدا دەمانەوە. هەر ئەوان هەبوون، کەسی تر نەبوو. پاشان سەرۆك هاتەوە، دوای ئەوەی خواردنمان خوارد هەڤاڵ "کەمال پیر" گووتی:"ئەوە ئەو هەڤاڵەیە کە بۆتانم باسکرد" سەرۆك سەبارەت بە کوردان و کوردستان لەمنی پرسی، تا ئەوکاتەش چەمکی من لەم ڕووەوە وەکو چەمکی چەپی تورك بوو، من دەمگووت:" کە ئێمە شۆڕشمان بەرپاکرد و سۆسیالیزم بەدیهات هەموو کێشەکان چارەسەر دەبن، ئەوکاتە کێشەی کوردیش چارەسەر دەبێت" نزیکبوونەوەی منیش وەهابوو، بینیم سەرۆك پێدەکەنێت، پاشان دەستی بەقسە کرد، نزیکەی چوار ـ پێنج کاتژمێر بەردەوام بوو. ئیدی سەری من تێکەڵ و پێکەڵ بوو، ئەو شتانەی کە من هیچ نەمدەزانی و نەم بیستبوو باسی لێوەکرد. ئیدی شەو درەنگ کەوت، پێویستبوو بگەڕابمایەوە زانکۆ. چونکە لەسەر حیسابی دەوڵەت دەمخوێند، ئەو شوێنەی من بۆی بچوومایە فاشیست زۆر بوون، هەڤاڵان گووتیان:" مەڕۆ، مەترسیدارە" ئیدی منیش نەڕۆیشتمەوە و شەو لەلایان مامەوە. بەیانی گەڕامەوە شوێنی خۆم و لەوێشەوە چوومەوە کۆلێژ.

بێگومان بەیانی هەڤاڵ "کەمال پیر" هاتەوە و یەکترمان بینی و لێی پرسیم:" چۆن بوو؟" منیش هەروا گاڵتەم کرد و گووتم:"باش نەبوو" بینیم هەڤاڵ "کەمال" زۆر عاجز بوو، کە بینیم زۆر عاجز بووە، گووتم:" نا نا زۆر باش بوو". ئەوکاتە گووتی:"منیش هەروا مەزندەم دەکرد" زۆر بەمە دڵخۆش بوو. ئیدی پەیوەندیم

بەمشێوەیە دروست بوو. ئیدی دوای ئەو ئاخافتنەی سەرۆك لەگەڵ ئەو هەڤالانەدا کەوتمە نێو جموجۆڵەوە.

**چ یۆتۆپیایەك لە هزر و خەیاڵی سەرۆك و هەڤالانی سەرەتای گروپی ئایدیۆلۆژیدا هەبوو؟ کە هێشتا نەبۆتە پارتییەك و رێکخستنتان نییە، بەڵام گروپێك خوێندەڤانن، خاوەن چ یۆتۆپیایەك بوون؟**




**شەهید حەقی قەرار لەسەر دیوار نووسیوویەتی "برووخێ داگیرکاری"**

سەرەتا ئێمە خاوەن زانابوونێکی بەهێز نەبووین، ئەزموونێکی ئەوتۆمان نەبوو، توانستی ماددیمان نەبوو... چیمان هەبوو؟ لەهەڤالێتیدا باوەڕیمان بەیەکتر دەکرد، هەمیش باوەڕییەکی پڕ مەزن هەبوو. واتا کاتێك هەڤالێك شتێکی بگووتبایە، یەکسەر باوەڕمان پێیدەکرد و هیچ گفتوگۆمان لەسەری نەدەکرد، باوەڕی هێندە بەهێز بوو لەنێوانماندا. چونکە لەژیان و پراکتیکدا یەکترمان ناسیبوو. بۆیە دووڕوویی و درۆ و

هەڵخەڵەتان و شتی وەها لەنێوانماندا نەبوو، واتا نزیكبوونەوەمان بۆ یەكتر بەتەواوی و لەهەموو شتێكدا بەكراوەیی بوو، هیچ شتێكمان لەیەكتر نەدەشاردەوە. لەبەر ئەوە زۆر بە یەكتر بەباوەڕ بووین، لەسەر هەموو شتێك بە ئاشكرا لەگەڵ یەكتر قسەمان دەكرد، هیچ شتێكمان نەبوو لەیەكتری بشارینەوە، ئێمە چیمان هەبووایە چ باش چ خراپ بە ئاشكرا قسەمان لەسەری دەكرد و هیچمان نەدەشاردەوە و پێویستیمان بە شاردنەوەی هیچ شتێك نەد دەمانگووت:" پێویستە هەموو شتێك هەموو هەڤاڵان بیزانن. چونكە هەڤاڵێتی ئەمەی دەخواست".

لەلایەكی دیكەشەوە؛ ئەو هەڤاڵانەی كە هاتبوونە لای یەكتر هەموویان لە چینێكی هەژارەوە هاتبوون، گوندنشین بوون، لەگوندە هەژارەكانەوە هاتبوون. راستە هەموومان لە زانكۆ دەمانخوێند، بەڵام هەموومان منداڵی خێزانە هەژارەكان بووین. هەڵبەتە توانستی خێزانەكانی ئێمەش زێدە نەبوو كە ئێمە بخەنە بەرخوێندن، بۆیە لەسەر بودجەی دەوڵەت دەمانخوێند، یان بەقەرز كردن لە دەوڵەت دەمانخوێند، تەنانەت ئەمەش بەشی ئێمەی نەدەكرد. بۆیە بۆخۆشمان هەندێك كارمان دەكرد. ئیدی هەر كارێك هەبووایە، كرێكاری و حەماڵیمان دەكرد و بەمەش هەندێك پارەمان بەدەست دەهێنا. ئێمە بەو شێوەیە ئیدارەمان دەكرد و دەژیاین و دەمانخوێند. چونكە توانستی خێزانەكانی ئێمە زۆر كەم بوو، لەبەر ئەوەی هەموو هەڤاڵان لە چینێكی هەژار و گوندی بوون، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا لەیەك نزیكبوونەوەیەكی زۆر بەهێزی دەئافراند. لەیەكتر تێگەیشتن، رێز لەیەكترگرتن، بەیەكتر باوەڕكردن، هەموو شتێك بەیەكەوە ژیانی دەئافراند.

بۆ نموونە؛ ژیانی ئێمە ژیانێكی كۆمین (هەرەوەز)ی بوو. واتا هەرچییەكمان هەبووایە دەماندایە كۆمین و هەڤاڵێك لەسەری رادەوەستا، هەرچییەكمان هەبووایە تەسلیمی ئەومان دەكرد، ئەویش لەنێوانماندا پێداویستییەكانی ئێمەی پێكدەهێنا، واتا كەسمان بە تەنیا شتێكمان نەبوو، ژیانێكی شەخسیمان نەبوو، توانستێكی شەخسیمان نەبوو، هەرچییەكمان هەبووایە، بۆ هەموو هەڤاڵان بوو. تەنانەت جلوبەرگەكانیش هی هەموومان بوو. بۆ نموونە؛ پاڵتۆیەكمان هەبوو، كامە هەڤاڵ بچووبایە دەرەوە ئەو لەبەرخۆی دەكرد. چونكە هەر هەڤاڵێك پاڵتۆیەكی خۆی نەبوو، كێ دەچووە دەرەوە

لەبەرخۆی دەکرد و کە دەگەڕایەوە یەکێکی تر لەبەری دەکرد، واتا توانستی ئێمە زۆر کەم بوو، بەڕادەیەك نەماندەتوانی پێداویستییە سەرەتاییەکانیش دابین بکەین. زۆر بەزەحمەت دەمانتوانی هەندێك لەپێداویستییەکان دابین بکەین. بۆیە هەموومان توانستی خۆمان دەدایە یەکتری. تەنیا بەمشێوەیە دەمانتوانی بژین و بگوزەرێین. چونکە بەهیچ شێوەیەکی تر مومکین نەبوو، هەم گوزەران لە ئەنقەرە زۆر گران بوو، هەمیش بەگوێرەی ئەو گرانییە توانست و ئیمکانییەتیشمان نەبوو، تەنیا بەوەی توانستی خۆمان دەدایە یەکتر تاوەکو بتوانین بژین. واتا هەر لەسەرەتاوە ژیانی ئێمە لەسەر بنەمای کۆمین ئاوابوو، هەموو هەڤالان باوەڕیان زۆر بەیەکتر هەبوو، لە ڕێزگرتندا کەس کەمتەرخەمی نەدەکرد و بێسنوور ڕێزیان لەیەکتر دەگرت. ئەگەر مەترسییەك هەبووایە یان زەحمەتییەك هەبووایە هەر هەڤاڵێك دەیخواست ئەو زۆر و زەحمەتی و مەترسییە بخاتە ئەستۆی خۆیەوە بۆ ئەوەی مەترسییەکە نەچێتە سەر هەڤاڵێکی دیکە، یان لەزەحمەتیدا نەژێت. "ئەگەر مەترسیەك یان زەحمەتیەك هەیە با لەسەر من بێت نەك لەسەر هەڤاڵی من" چەمکێکی بەمشێوەیە لەنێوان هەڤاڵاندا هەبوو.

بۆ نموونە؛ لە بزاڤەکاندا پەیڕەوێك دەنووسرێت و هەر کەسێك ئەمەی پەسند کرد، پەیڕەوی دەکات و لەسەری بەڕێوە دەچن، بەڵام ئێمە شتێکی وەهامان نەبوو، هەرچەندە شتێکی وەهاشمان لە وێنەی پەیڕەوی ناوخۆدا نەبوو، بەڵام وەك بڵێی لەنێوانماندا پەیڕەوێك هەیە و نووسرابێت وەهابوو، هیچ شتێکی نووسراوی بەم چەشنەمان نەبوو، ئێمە لەدڵەوە ئەو پەیڕەوەمان بۆ خۆمان دروست دەکرد، هەر هەڤاڵێکیش ئەمەی پەیڕەو دەکرد بەهوشیارییەوە پەیڕەوی دەکرد. لەوانەیە لەرووی ئەزموون و زانابوونەوە ئەوەندە بەهێز نەببووین، بەڵام باوەڕییەکی زۆر بەهێزمان بە سەرۆك هەبوو. چونکە ئێمە دەمانبینی بەردەوام سەرۆك دەیخوێندەوە، شەو و ڕۆژ دەیخوێندەوە، کاتێك شتێکی دەخوێندەوە و لێی تێدەگەیشت دەهات لەگەڵ ئێمە گفتوگۆی دەکرد، ئەوەی تێدەگەیشت بە ئێمەشی دەدا. واتا بەرەنجێکی مەزن و بە ئێشێکی مەزنەوە بە لێکۆڵینەوەیەکی مەزنەوە هەرشتێك و ئەنجامێکی دەربخستبایە دەیخواست بەئێمەشی بدات و بەئێمەشی دەدا، لەسەر ئەو بنەمایە ئێمەشی

پێشدەخست. ئێمە زیاتر شتی ئامادەکراو و پاککراومان لە سەرۆك وەردەگرت، لێکۆڵینەوەکردن و بەرمنجی خۆمان خۆمان پەروەردە بکەین، شتێکی وەها کەم بوو. زیاتر سەرۆك ئێمەی پەروەردە دەکرد، ئەوەی سەرۆك بە ئێمەی دەدا و وەرماندەگرت و لەنێو کەسانی دیکەدا بلاومان دەکردەوە. بۆ ئەوەی هەندێك هەڤاڵ بۆ خۆمان قازانج بکەین. ئەوەی ئێمە دەمانکرد زیاتر ئەوە بوو، شانبەشانی ئەوەش هەندێك خۆمان پەروەردە دەکرد، پەرتووکمان دەخوێندەوە، بەلام بەشێوەیەکی سیستەماتیك نەبوو. بەلام سەرۆك پڕ بە سیستەم و بەرێکوپێکی دەیخوێندەوە. ئێمە هەم دەچووینە زانکۆ و وانەکانەوە هەمیش کاری دیکەمان دەکرد. بۆیە کات و توانستی ئەوەمان نەبوو پەرتووك بخوێنینەوە و لەرووی ئایدیۆلۆژییەوە خۆمان قووڵبکەینەوە. بۆیە ئێمە زیاتر لە سەرۆکمان وەردەگرت. بەمە خۆمان پەروەردە دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە دەرفەتمان دەبوو خۆمان پەروەردە دەکرد. لەناو ئەو کەسانەی کە باوەڕیمان پێیان دەکرد ئەو فیکرەیەمان بلاودەکردەوە. ئێمە وەها کارمان دەکرد.

بەکورتی هەڤاڵێتییەکی پتەو و تۆکمە لەنێوانماندا هەبوو، رێز و باوەڕییەکی زۆر مەزن هەبوو، هەرشتێك کە شایستەی خۆمان نەدەبینی شایستەی هەڤاڵی خۆشمان نەدەبینی، هەرچییەکمان شایستەی خۆمان ببینیایە شایستەی هەڤاڵی خۆشمان دەبینی، ئەوەی لە ئێمەدا بنچینەبوو ئێمە بەیەکدیمان باوەڕ دەکرد و رێزی یەکترمان دەگرت و بەدروستی لەیەك نزیك دەبووینەوە. هەروەها باوەڕییەکی مەزنیشمان بە سەرۆك و فیکری سەرۆك هەبوو، هەر ئەوەمان هەبوو، هیچ شتێکی دیکەمان نەبوو، ژیانێکی شەخسیمان نەبوو، ژیانی ئێمە بەتەواوی بۆ یەکتر بوو، ئیمکانمان بۆ یەکتر بوو، ئێمە بەمشێوەیە دەژیاین. هەر لەو کاتەوە خۆمان لەخودی خۆمان دەرخستبوو. ئەمەش بە سەرۆك هاتەدی. ئێمە ژیانی سەرۆکمان بینی کە چۆن دەژی، ئێمەش ئەو ژیانەمان بەبنچینە وەرگرت. لەژیانی سەرۆکدا ژیانێکی شەخسی نەبوو، بۆیە ئێمەش ژیانێکی شەخسیمان نەدایە پێش خۆمان. ئەمە هەر لەسەرەتاوە وایکرد ئێمە لە ئێمە دەربخات. بۆیە هیچ کاتێك ژیانێکی شەخسی بۆ ئێمە دروست نەبوو، ئیدی ئەمە بووە پرەنسیپێك لەنێو ئەم تەڤگەرەدا، بووە هێزێك لەنێو تەڤگەردا. واتا ملیتانێتی ئەم

تەڤگەرە لەسەر ئەو بنەمایە پێشکەوت؛ لەسەر دروستبوون و پەیوەستبوون و باوەڕی پێشکەوت.

بێگومان لەو کاتەدا بەقورسی لەکێشەی کورد تێدەگەیشتین، نەماندەزانی کە کێشەیەکی هێندە گران و هێندە مەترسیدارە. ئێمە وەها تێنەدەگەیشتین، بەڵکو وەك هەر کێشەیەکی دیکە دەمانبینی. دواتر ئێمە لەوە تێگەیشتین کە کێشەکە زۆر گران و مەترسیدارە. ئێمە کەی لەوە تێگەیشتین کە زۆر مەترسیدار و گرانە؟ کاتێك کە گروپ دروست بوو و بڕیارمان دا لە ئەنقەرەوە بچینە کوردستان و لەکوردستان پەرە بە تێکۆشان بدەین، ئەو کاتە لەنێو ئێمەدا هەندێك کەس گووتیان:" ئەمە زۆر مەترسیدارە، ئەمە مردنە، پێویستە ئێمە نەچینە کوردستان، ئێمەش وەك هەر رێکخراو و تەڤگەرێکی دیکە با هەر لە ئەنقەرەدا بمێنینەوە، ئەوان چی دەکەن با ئێمەش وابکەین" ئەوکاتە لەمەترسی ئەو کێشەیە تێگەیشتین. تا ئەو کاتە ئێمە تێنەگەیشتبووین کە بەراستی کێشەیەکی پڕ مەترسیدارە، تۆ ئەگەر دەست بهاوێژیتە ئەو کێشەیە ئەوا دەبێت رۆحی خۆت بخەیتە نێو چنگتەوە.

ئێمە لەوە تێنەگەیشتبووین، دوای بڕیاری گەڕانەوەمان لە ئەنقەرەوە بۆ کوردستان لێی تێگەیشتین. چونکە زۆر کەس ترسان و دەستبەرداری تێکۆشان بوون. واتا ئەو کەسانەی باوەڕیان بە پێشکەوتن و سەرکەوتن نەبوو، تەنیا مردنیان دەهاتە بەرچاو. بۆیە هیچ هەنگاوێکیان نەدەهاوێشت. ئەوکاتە تێگەیشتین ئەو مەسەلەیە مەسەلەیەکی پڕگران و خەتەرناکە، ئەوەی کەوتە نێو ئەو مەسەلەیەوە دەبێت بەگوێرەی ئەمە هەڵسوکەوت بکات.

ئیدی ئەم تەڤگەرە هەر لەسەرەتایەوە چەندە پێشکەوت و چەندە گۆڕانکاری دەئافرێنێت و چەندە مەزن دەبێت یۆتۆپیایەکی وەهامان نەبوو. ئەوەی هەمان بوو ئەمە بوو:"مادام هەر کەس بۆ گەل و وڵاتی خۆی خەبات دەکات، ئێمەش گەل و وڵاتێکمان هەیە و پارچە پارچە و ژێردەست بووە، پێویستە ئێمەش خەبات بکەین و وڵاتمان وڵاتێکی بندەستە و پارچە پارچە بووە، پێویستە خاوەنداری لە وڵات و گەلی خۆمان بکەین" تێڕوانینمان بەو شێوەیە بوو. تۆ بڵێی بتوانین خاوەنداری لەمە بکەین یان نا؟ زێدە بیرمان لێی نەدەکردەوە، ئەمە پاشان بەدیهات.

**ئێوە بەرلەوەی بگەڕێنەوە کوردستان لە ئەنقەرە گروپێکی بچووك بوون، باستان لەو پەیوەندییە هەڤاڵێتییەش کرد کە لەنێوانتاندا هەبوو، تا ئەوکاتە لەرووی سیاسییەوە بیرکردنەوەیەکی سیاسی یان راستر بڵێین چالاکی سیاسیتان هەبوو؟ لەبەرامبەرتاندا هیچ هێزێك هەبوو لەدژتاندا چالاکی بنوێنێت؟**

بێگومان بەرلەوەی بچینە کوردستان لە ئەنقەرە چالاکیمان هەبوو. چالاکییەکانمان یەکەمیان: لەنێو خوێندکاراندا بوو لە خوێندنگا و زانکۆدا، ئەو کاتە فاشیستی تورك هەبوون، لەنێوان فاشیستەکان لەلایەك و هێزە چەپ و دیموکراتیخوازەکاندا شەڕ هەبوو، شەڕەکانیش دژواربوون، فاشیستەکان دەیانخواست لەهەموو خوێندنگاکاندا باڵادەستی خۆیان بسەپێنن و نەهێڵن شۆڕشگێڕ و دیموکراتیخوازەکان بچنە خوێندنگاکانەوە، شۆڕشگێڕەکانیش بەرگریان دەکرد. ئیدی شەڕ و پێکدادان دروست دەبوون و دەستبەسەرداگرتن روویدەدا. کێ بکەوتبایە خوێندنگایەکەوە نەیدەهێشت ئەوەی دیکە بکەوێتە ئەو خوێندنگایەوە، واتا زۆر توندوتیژ بوو، بۆیە چالاکییەکانی ئێمەش لەدژی فاشیستەکان لەخوێندنگاکاندا بوو. بێگومان لەناو هەموو تەڤگەرە چەپڕەوەکان و تەڤگەرە کوردییەکانیشدا بەمشێوەیە ناسراین. واتا ئێمە لەناو تەڤگەری چەپەکاندا لەدژی فاشیستەکان شوێنمان گرت، لەدژی فاشیستەکان لە هەموو شوێنێك شەڕمان کرد. هەمیش لە پێشەوە شەڕمان کرد، ئەمە هەم ئێمەی ناساند و هەمیش بیروباوەڕییەکی بەهێزی بۆ ئێمە ئافراند. بۆ نموونە؛ هەموویان ڕێزی ئێمەیان دەگرت. بۆچی؟ چونکە ئێمە لەدژی فاشیستەکان لە پێشی پێشەوە رادەوەستاین، ئێمەیان بە هێزێکی مەزن دەبینی بۆ خۆیان.

شانبەشانی ئەمە لە ئەنقەرە لە گەڕەکی **"ئایدن پاشا، تووزلوچایر و ماماك"**دا چالاکیمان دەکرد. لەو گەڕەکانەدا زیاتر کورد هەن، زۆربەشیان کوردی عەلەوین، فاشیستەکان دەیانخواست لەو گەڕەکانەدا رێکخستنی خۆیان دروست بکەن و کوردان

بترسێنن و بێکاریگەریان بکەن، هەوڵێکی بەمجۆرەیان دەدا. ئێمەش لەو گەڕەکانەدا لەدژی فاشیستەکان تێکۆشاین و خەباتمان کرد و شەڕمان کرد. زیاتریش ئەو تێکۆشانە لەژێر سەرۆکایەتی هەڤاڵ "کەمال پیر"دا بەڕێوەدەچوو. لەو گەڕەکانەدا هەندێك گەنجی ناسیبوو، ڕێکیخستبوون. بەو گەنجانە لەدژی فاشیستەکان خەبات و چالاکی دەکرد و هەموو ئەو گەڕەکانەیان لە فاشیستەکان خاوێن کردەوە. ئەو گەڕەکانە کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی ئێمە، واتا لایەنێکی چالاکییەکانمان ئەمە بوو.

لایەنێکی تریش لە چالاکییەکەمان لەدوای کودەتای سەربازی ئاداری ساڵی (١٩٧١)دا سەربازەکان لەهەموو جێگەیەکدا باڵادەستی فاشیستەکانیان سەپاندبوو. ئیتر هەوڵی ئەوەمان دەدا کە چۆن باڵادەستی ئەوان بشکێنین و باڵادەستی شۆڕشگێڕ و چەپەکان بسەپێنین. لەم ڕووەوە کار و خەباتمان دەکرد. لەناو چەپی تورکیشدا هەندێکیان دەیانخواست ئەمە خراپ بەکار بهێنن، چەپی سەرەکی و تەڤگەرە سەرەکییەکان زەبریان بەرکەوتبوو و دەستگیرکرابوون و لەسێدارە درابوون، شەهیدببوون، بەمەش بۆشاییەك هاتبووە ئاراوە. هەندێکیش فێڵبازیان دەکرد و دەیانخواست ئەو بۆشاییە بۆخۆیان پڕبکەنەوە. زووتر دەستیان هاوێشتبووە نێو گەنجانەوە. چونکە گەنجان بێ ڕێکخستن مابوونەوە، کەسانی نێو تەڤگەرەکانی دیکە هەموویان دەستگیرکرابوون و شەهیدببوون و لەسێدارە درابوون، ئەوەی مابووەوەش لە زیندانەکاندا بوون. ئەوانە لەو بۆشاییەدا سوودیان وەرگرت و دەستیان خستبووە نێو گەنجانەوە و ڕێکخستنیان پێشخستبوو، لەم ڕووەشەوە هەندێك کارمان کرد؛ یەکەم: بۆئەوەی هەموو بزاڤەکانی لاوانی چەپگەر لەژێر کۆنترۆڵی کەسانی دیکەدا نەبێت، هەوڵماندا تا ئەو گەنجانە لەژێر کاریگەری ئەوانە دەربخەین و لەنێو ڕێکخستنی ئەواندا دەربکەوین. بۆ ئەوەی تەڤگەرەکانی گەنج و چەپ کۆببنەوە و ببنە هێزێك و بتوانن لەدژی فاشیستەکاندا ڕابوەستن و باڵادەستی فاشیستەکان بشکێنن.

بۆ نموونە؛ لە کۆلیژی زانستە سیاسییەکاندا، ئەو کۆمەڵەیەی سەرباز و پۆلیسەکان دابوویان بە فاشیستەکان، سەرۆك ئاپۆ کار و خەباتی دەکرد بۆئەوەی ئەو کۆمەڵەیە لەدەست فاشیستەکان دەربکەوێت و بکەوێتە دەست چەپی تورکیا و لەمەشدا بە ئەنجامیش گەیشت، لە دەست فاشیستەکانی دەرخست و تەسلیمی چەپی تورکیای

كردەوە. هەروەها لەدژی لەسێدارەدانی" دەنیز گەزمیش" و هاوڕێكانی و شەهیدبوونی" ماهیر چایان" و هاوڕێكانی سەرۆك لە كۆلیژی زانستە سیاسییەكاندا چالاكی بایكۆتكردنی پێشخست. بەم هۆیەوە كەوتە زیندانەوە، پاشان ئازاد بوو. هەروەها بۆ ئەوەی لاوانی چەپ و دیموكرات هەموویان لەژێر چەتری ڕێكخستنێكدا كۆبكاتەوە و ببێتە هێزێك تاكو بتوانن لەدژی فاشیستەكان لە خوێندنگاكاندا ڕابوەستن "**كۆمەڵەی خوێندكارانی خوێندنی باڵای شۆڕشگێڕ لە ئەنقەرە** (ADYÖD)" دامەزرا، لەوێدا ئێمە كار و خەباتمان دەكرد، لەئەنجامی ئەو كارەدا سەرۆك بووە سەرۆكی نهێنی (ADYÖD). چونكە لەرووی فەرمییەوە بەڕێوەبەرایەتییەك هەبوو، ئێمە ئەو بەڕێوەبەرایەتییەمان فراوان كرد تاكو هەموو لاوانی تێدا كۆبكەینەوە. ئێمە ئەوەمان ئەنجامدا و بووە هێزێكی مەزن. لەسەر ئەو بنەمایە پڕوپاگەندە و ڕێكخستەبوونێكی بەهێز لە زانكۆدا دەستپێكرد، زۆر بەشی زانكۆمان لەژێر كاریگەری فاشیستەكان دەرخست، ئیدی شۆڕشگێڕان باڵادەست بوون.

لەلایەنێكی دیكەشەوە؛ هەوڵمان دەدا كە چۆن بتوانین چەپی تورك و تەنانەت لایەنە كوردییەكانیش بخەینە سەر ڕێی ڕاست و لەژێر كاریگەری كەمالیزم و شۆڤێنیزم و میللیگەرای سەرەتایی دەریانبخەین. بۆچی تەڤگەرە چەپڕەوەكان و كوردییەكان لە كودەتا سەربازییەكان زەبریان بەركەوت؟ هۆكاری ئەم زەبرخواردنە چیبوو؟ هەڵە و كەموكوڕی لەمەدا چیبوو؟ هەروەها بۆ ئەوەی ئەمە دووبارە نەبێتەوە پێویستە چی بكرێت؟ كێشەكە چۆنە؟ لەسەر ئەو مەسەلانە گفتوگۆمان دەكرد و دەمانخواست ئەوانە لەو مەسەلانە تێبگەیەنین و ئەوانە ڕابكێشینە سەر ڕاستەڕێی تێكۆشان. ئیدی كارێكی بەمشێوەیەشمان ئەنجام دەدا...

**بە بەرپابوونی كودەتای (١١)ی ئاداری (١٩٧١) گروپە چەپەكانی وەك گروپی "ماهیر چایان" و گروپی "دەنیز گەزمیش" تەسفیەدەكرێن. لێرەدا كودەتایەكە بەگشتی و تەسفیەبوونی ئەو دوو گروپە بەتایبەتی چ كاریگەرییەكی لەسەر گروپەكەی ئێوە هەبوو؟**




ڕێپێوانی جەماوەری بزاڤە چەپ و شۆڕشگێڕییەکان

هەڵبەتە سەرۆك زیاتر بزاڤەکانی پارتی ـ بەرەیی ـ **ڕزگاری گەلی تورکیا** ( Türkiye Halk Kurtuluş Partisi-Cephesi) **بەڕێبەرایەتی "ماهیر چایان"**(١) و ئەرتەشی ڕزگاری **گەلی تورکیا** (Türkiye Halk Kurtuluş Ordusu ) **بەڕێبەرایەتی "دەنیز گەزمیش"**(٢) و **ئەرتەشی ڕزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی شۆڕشگێڕی تورکیا** (TİİKKO) **بەڕێبەرایەتی " ئیبراهیم کایپاك کایا"**ی(٣) لەهەموو گروپەکانی دیکەی چەپ باشتر دەبینی. چونکە ئەو کاتە زۆر گروپ و بزاڤی دیکەی چەپ هەبوون، زێدەتریش خۆی نزیکی بزاڤەکەی "**ماهیرچایان**" دەبینێت، نەك بەتەواوی ئەوانە بەبنەما وەربگرێت، بەڵام لەهەندێك ڕووەوە هەواداری خۆی بۆیان هەیە، لەهەندێك شتدا خۆی نزیکی ئەوان دەبینێت. چونکە هیچ کاتێك نەبووەتە ئەندامی ئەو بزاڤە، دەخوازێت لەو سێ بزاڤە و هەموو بزاڤە چەپگەرەکانی تریش باشتر تێبگات. مێژووی بزاڤی چەپ مێژوویەکی چۆنە؟ چۆن سەریهەڵداوە؟ چی کردووە؟ چۆن زەبری بەرکەوتووە؟ لەچیدا زەبری خواردووە؟ لەسەر ئەو مەسەلانە بە قووڵی ڕاوەستەی کردبوو و ئەوەی بینیبوو کە دەزگای ئیستخباراتی تورك (میتMİT) زۆر بەهێزە، میتی تورك دەکەوێتە نێو بزاڤەکانەوە؛ یان ئەو بزاڤانە بەتەواوەتی دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و

پووچیان دەکاتەوە و کۆتاییان پێ دەهێنێت، یان ئەگەر نەتوانێت بیانخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە ئەوا پارچە پارچەیان دەکات. بەمەش بێکاریگەریان دەکات و بزافەکان بەگژ یەکتردا دەدات و شەڕی یەکتریان پێدەکات. بەمشێوەیە بێکاریگەریان دەکات. واتا بزافی چەپی تورك هیچ کاتێك نەیتوانیوە پیلانەکانی میت پووچەڵ بکاتەوە و لەنێو گەمارۆ و کۆنترۆڵی میت (MİT)دا دەرنەکەوتووە. بۆیە هەمیشە زەبری بەرکەوتووە. ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە. سەرۆك چۆن بتوانێت ئەو تەڤگەرەی پێشیدەخات نەکەوێتە نێو ئەو رەوشەوە و ئەو هەڵەیەوە. واتا چۆن میت (MİT) نەتوانێت کۆنترۆڵ لەسەر تەڤگەرەکە دروست بکات؟ چی بکات بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات؟ بۆچی بزاڤ و تەڤگەرەکانی دیکە دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی میتەوە؟ دەبینێت هۆکارەکەی تەرز و شێواز و بیرکردنەوەیانە، هەم رامان و بیرکردنەوەیان هۆکارە، چونکە تەواو لە کەمالیزم خۆی دانەبڕیوە، هەمیش ئەو تەرزەی خەباتی پێدەکەن هۆکاری ئەمەیە. کەواتە پێویستە هەم لە رامان و بیرکردنەوەی کەمالیزم خۆیان دابڕن، هەمیش لەتەرزدا تەرزێکی ئەوتۆ بەڕێوە ببەن بۆئەوەی تەڤگەرەکە نەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. ئەو تەرزەی چەپی تورك پەیرەوی دەکات چ تەرزێکە؟ تەنیا بە کۆمەڵە و بە رۆژنامە کار دەکەن، هەموویشی ئاشکران، بۆیە میت (MİT) یەکسەر کۆنترۆڵیان لەسەر دادەنێت. بۆیە پێویستە تا تەڤگەر دروست دەبێت و دەتوانێت لەسەر پێی خۆی رابوەستێت ئەو تەرزە بەڕێوە نەبرێت. سەرۆك دەرئەنجامێکی بەو شێوەیەی دەرخستبوو. بۆیە تەڤگەری ئێمە بەم شێوە و تەرزە دەستی بە خەبات نەکرد. واتا بە دروستکردنی کۆمەڵە و دەرخستنی رۆژنامە دەستی پێ نەکرد، بۆیە تا دەوڵەت تێگەیشتنی تەواوی لەسەر تەڤگەری ئێمە دروست بوو، تەڤگەرەکەمان مەسافەیەکی باشی وەرگرتبوو. واتا رەگی خۆی باش داکوتابوو و کرۆك و بناخەی خۆی تۆکمە کردبوو، پاشان کە میت (MİT) خواستی کۆنترۆڵی خۆی بکات، بەڵام نەیتوانی.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە سەرۆك هەمیشە بەرێزەوە لەو سێ بزاڤانەی باسمان کرد نزیکبووەوە. چونکە کاریگەری ئەوان لەسەر ئەو هەبوو. لەوان هەندێك شت تێگەیشتبوو، بۆیە هەمیشە خۆی قەرزاری ئەو بزاڤانە دەبینی. چونکە خۆی کەسێتییەکی چەپە و لە تەڤگەرێکی چەپ دایە، لەبەرامبەر هەموو تەڤگەرێکی چەپ و

کەسێتییەکی چەپیشدا خۆی بە بەرپرسیار دەزانی، بەرپرسیارێتی خۆیشی هەمیشە پێکدەهێنا. کاتێك "**دەنیز گەزمیش**" و هاورێکانی لەسێدارە دران و "**ماهیر چایان**" و هاورێکانی شەهید بوون، بایکۆتی سیاسی پێشخست، بۆ ئەوەی تەڤگەری چەپڕەو کۆبکرێتەوە زۆر فیداکاری کرد و کەوتە نێو هەوڵدانەوە. هەمیشە خۆی بەرپرسیار بینی و ئەو بەرپرسیارێتییەشی پێکهێنا.

بێگومان لێرەدا هەڤاڵێتی "**حەقی قەرار**" و "**کەمال پیر**"یش رۆڵی مەزنی خۆیان هەیە، لەبەرامبەر ئەوەی کورد نین و کوردستانییش نین و هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ سەرۆك ئاپۆدا شوێنیان گرت، سەرۆك ئاپۆ بەردەوام بەهایەکی مەزنی بەمەدا، لە شەخسی ئەو هەڤالانەدا بەردەوام گەلی تورك و چەپی تورکی بۆ خۆی بەبنەما وەرگرت و بەرێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا دەکرد و خۆی قەرزاربار بینی، ئیدی چی بکات تاوەکو ئەو قەرزە بداتەوە؟ چیبکات ئەو رێزگرتنە لە پراکتیکیشدا پێکبهێنێت، ئەم یەکێتییەی نێوان سەرۆك و "**حەقی قەرار**" و "**کەمال پیر**" گوزارشتی لە یەکێتی نێوان گەلی کورد و تورکیش دەکرد، یەکێتییەك لەسەر بنەمای ئیرادەیەکی ئازاد و دیموکرات ئاوابوو. هەڵبەتە لە چەمکی سەرۆك ئاپۆشدا ئەمە بەبنچینە وەردەگرێت، واتا چۆن یەکێتی گەلان لەسەر بنەمای ئیرادەیەکی ئازاد و دیموکرات ئاوا بکات؟ ئیدی ئەمە لەشەخسی "**حەقی قەرار**" و "**کەمال پیر**"دا پێکهاتبوو، هەمیشە ئەمەی بۆ خۆی بەبناخە وەردەگرت، بەردەوامیش لەهەر هەلومەرجێکدا خواستی بەرپرسیارێتی خۆی لەبەرامبەر گەلی تورکیا و چەپی تورکیا و هێزی ئازادی و دیموکراتی تورکیا پێك بهێنێت. بۆیە خاوەندارێتی لە شەهیدبوونی "**ماهیر چایان**" و ئەوانی دیکە کرد، تەڤگەری ئاپۆچێتی کردە بەردەوامی ئەو تەڤگەرانە، مادام ئەوان هێندە کاریان کرد و کەمێك ئەنجامیشیان بەدەست خستبوو، کاریگەریان لەسەر سەرۆك ئاپۆ هەبوو، بۆ ئەوەی لەمەسەلەی کورد تێبگات و خاوەندارێتی لە گەلی کورد و کوردستان بکات، پێویستە سەرۆك ئاپۆش بەردەوامی بەو تەڤگەرانە بدات، بەمشێوەیە خاوەندارێتی لێکرد و بەرسڤی دایەوە، ئەو شەهیدبوونانەی کردە هۆکاری ئەوەی تەڤگەرێکی ئازادیخواز و دیموکراتیخواز لە کوردستان پێشبخات.

ئەگەر (PKK) لەدایکبوو و بەمشێوەیە پێشکەوت ئەوا هۆکارێکی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. چونکە ئەو شەهیدبوونانەی کردە هۆکارێك تاکو تەفکەری ئازادی و دیموکراتی و سۆسیالیزم نەکوژێتەوە و لەناو نەچێت و لاواز نەبێت و بزێت، وەها بەرسقی دایەوە و بەرپرسیارێتی خۆی بەجێهێنا. بێگومان لەو شەهیدبوونانەش ئەنجامی لێوە هەڵهێنجا. واتا چی "دەنیز گەزمیش" و هەڤاڵانی بەرەو پەتی سێدارە برد؟ چی "ماهیر چایان" و هاورێکانی بەرەو شەهیدبوون برد؟ باش لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم مەسەلانە کرد، لەمەوە ئەو دەرئەنجامەی دەرخست کە پێویستە چارەنووسەکەی تەفکەری ئاپۆچێتی وەکو چارەنووسی ئەو تەفکەرانە نەبێت. چونکە بە لەسێدارەدان و شەهیدبوونی ئەوان ئەو تەفکەرانەش تەسفیەبوون و کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەما، پارچە پارچە بوون، گەلێکیان نەمان و گەلێکیشیان کەوتنە ژێر کاریگەری دەوڵەتەوە، ئەو تەفکەرە هێندە مەزنانە لە گۆڕێدا نەمان، ئیدی چی بکات تاکو رەوشێکی بەو شێوەیە بەسەر بزووتنەوەی ئاپۆچێتیشدا نەیەت؟ لەمەشدا ئەو وانەیەی لێهەڵهێنجا. لەسەر ئەو بنەمایە تەفکەری ئاپۆچێتی پێشخست. ئەم تەفکەرەشی کردە بەردەوامی ئەو تەفکەرانە، نوێنەرایەتی ئەو تەفکەرانەی لە گۆڕەپانی کوردستان و لە نێو گەلی کورددا کرد و ژیاندنی.

**ئەو چالاکییە پرۆتستۆییەی لەدژی لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیش و هاورێکانی شەهیدبوونی "ماهیر چایان" لەساڵی (١٩٧٢) ئەنجام دەدرێت، رۆڵی سەرۆك ئاپۆ لەم چالاکییەدا چییە؟ وەك دەزانرێت بەهۆی ئەم چالاکییەوە دەستگیریش دەکرێت، زیندانیبوونی سەرۆك بۆ یەکەمین جار چ واتایەك دەهات و سەرۆك خۆی چ ئەنجامێکی لێوە دەرخست؟**



شەهید ئیبراهیم کایپاك کایا



شەهید دەنیز گەزمیش



شەهید یوسف ئەسلان



شەهید حوسێن ئینان



**دۆغان فرتنە**

لەو بایکۆتەی کە لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکاندا ئەنجامدرا دوو کەس سەرکێشی ئەم چالاکییە دەکەن، یەکیان **سەرۆك ئاپۆ** بوو، ئەوەی تریشیان "**دۆغان فرتنە**"بوو. "**دۆغان**" گەنجێکی خەلکی ناوچەی "**تراکیا**"یە و هەڤاڵێکی "**ماهیر چایان**"بوو، ئەمانە هەردووکیان ئەو بایکۆتە پێشدەخەن و پێشەنگایەتی ئەو بایکۆتە دەکەن، هەردووکیشیان دەستگیر دەکرێن. لەم چالاکییەدا رۆڵی **سەرۆك ئاپۆ** سەرۆکایەتیکردنی ئەو چالاکییەیە. هەردووکیان نزیکەی حەوت ـ تا هەشت مانگ لە زیندانی "**ماماك**" دەئاخنرێن و دادگایی دەکرێن. پاشان لە ئەنجامی ئەو دادگاییەدا ئازاد دەکرێن. وابزانم باوکی "**دۆغان فرتنە**" ژەنراڵە، ئەمەش لە ئازادکردنیاندا کاریگەری خۆی هەیە. ئەگەر وا نەبایە ئەوکاتە زەحمەت بوو هەردووکیان ئازاد بکەن. ئەگەر "**دۆغان**" بەربدەن و سەرۆك بەر نەدەن ئەوەش نابێت. ناچار بوون هەردووکیان بەربدەن، بەم هۆیەوە ئازادکران.

لەلایەکی دیکەشەوە تاوانی ئەوان تاوانێکی ئەوتۆ نەبوو کەوا سزایەکی گرانیان بەسەردا جێبەجێ بکەن، ئەگەر تەواو سزایان بدابانایە لەوانەبوو بیانخستنایەتە چوارچێوەی "تاوانی رێکخستنی"، ئەوکاتە چوار ـ پێنج ساڵ زیندان دەکران. چونکە

ئەوكاتە سزای ڕێكخستنبوون هەر ئەوەندە بوو، وەكو ئێستا نەبوو. بێگومان پاشان ئەو سزایەیان گران كرد و كردیانە پانزە ـ بیست ساڵ. ئەوكاتە بەمشێوەیە نەبوو، لەبەر ئەوەی تەنیا بایكۆتیش بوو، هەروەها لەبەر ئەوەی باوكی "**دۆغان فرتنە**"یش ژەنراڵ بوو، ناچار بوون حەوت ـ هەشت مانگیان زیندانیكردن، دوای دادگاییكردن ئازادیان كردن، بەمشێوەیە ئازادبوون.

بێگومان سەرۆك ئاپۆیش خۆی دەیگووت و لەم بارەیەوە نووسینیشی هەیە، لەوانەیە ئێوە خوێندبێتانەوە دەڵێت:" كاتێك لە زینداندا بووم زۆر بیرم دەكردەوە من چی بكەم كە جارێكی دیكە نەكەومە زیندانەوە، من چی بكەم بۆ ئەوەی ئەو تەڤگەرەی كە دەستم پێیكرد چارەنووسەكەی وەكو چارەنووسی تەڤگەری "**ماهیر چایان**" و "**دەنیز گەزمیش**" نەبێت". واتا تەڤگەرەكە زەبری بەرنەكەوێت و بەردەوام بكات و بەئامانجی خۆی بگات. سەرۆك دەڵێت:"من لەسەر ئەو مەسەلەیە زۆر بیرم كردەوە" هەروەها دەڵێت:"من لەگەڵ خۆمدا بڕیارم دا كە جارێكی تر هەرگیز نەكەومە زیندانەوە و نەگیرێم و تەڤگەرەكەمان نەكەوێتە ژێر كۆنترۆڵەوە و هەرگیز زەبری بەرنەكەوێت". هەروەها دەڵێت:" لەسەر مەسەلەی كوردستان زۆر بیرم كردەوە و تێیدا قووڵبوومەوە" بۆیە دەڵێت:"لە بنچینەدا من لە زینداندا گەیشتمە ئەنجام و بڕیارم دا بەناوی كورد و كوردستان تەڤگەرێك پێشبخەم" هەروەها دەڵێت:"سوودی ئەم زیندانیبوونە ئەوەبوو" هەڵبەتە دوای ئەوەی لەزیندان دەركەوت هەنگاوی ئاواكردنی ئەو تەڤگەرەی هاوێشت. سوودی ئەو زیندانیكردنەش ئەوەبوو. ئەگەر ئەو بەرخۆدانییەی لە زانكۆ پێشنەخستبایە و دەستگیرنەكرابایە و قووڵبوونەوەیەكی بەو شێوەیە نەژیابایە، باش دووژمنی نەناسیبایە و ئەزموونی لەوە هەڵنەهێنجابایە لەوانەبوو تەڤگەری ئێمەش پێشنەكەوتبایە، ئەگەر پێشبكەوتبایەش لەوانەبوو وەكو تەڤگەرەكانی دیكەی بەسەر بهاتبایە، چی بەسەر ئەو تەڤگەرانە هات هەمان شتیش بەسەر تەڤگەری ئێمەدا بهاتبایە.

## بۆ هەڤاڵانی ئەو كاتە ئەو دەسگیركردنە بە چ واتایەك دەهات؟

ئەوکاتە تەڤگەر یان گروپ لەئارادا نییە و هێشتا سەرۆك بەتەنیایە. بەگشتی وەکو کەسێتییەکی چەپڕەو هەڵسوکەوت دەکات و هیچ گروپێك لەدەوروبەریدا نییە، تەنیا چەند هەڤاڵێکی شەخسی لە زانکۆدا هەیە، واتا هەڤاڵێتییەکی چەپایەتی (چەپڕەوێتی) هەیە.

**دوای ئەوەی گروپ دروست دەبێت و هەندێك پێشدەکەوێت، هەڵگری چ چەمکێکی فەلسەڤی و سیاسی و ئایدیۆلۆژین و بە چ رەنگێك شیکردنەوەی مەسەلەکانیان دەکرد؟**





**کەناری چووبووك**

بێگومان هەر لەسەرەتاوە وەکو ئەمڕۆ لە رووی فەلسەفی و ئایدیۆلۆژی و سیاسی و رێکخستنی و ژیاندا قووڵبونەوەیەکی زۆر لەئارادا نەبوو. سەرەتا وەکو سەرۆکیش دەڵێت:" من گووتم کوردستان داگیرکراوە، من ئەوەم دەستنیشان کرد". دەڵێت:" ئەمەش بۆ من دەستنیشانکردنێکی زۆر مەزن بوو" تەنانەت دەڵێت:"لە کەناری **چووبووك، لەگەڵ هەڤالانم بۆ یەکەمین جار روونمکردەوە** و باسم لێوەی کرد، من زۆر بە زەحمەتی و دژواری روونمکردەوە، زۆر زەحمەتیم بینی" هەروەها دەڵێت:" بیرکردنەوەیەکی وەها نەبوو کە تەڤگەرێکی جودا پێشبخەین، سەرەتا بیرکردنەوەیەکی وەها نەبوو، توانست و زەمینەیەکی وەها زێدە بەهێزیش بۆ ئەوە نەبوو. واتا بە زانابوونێکی سنووردار گەیشتمە هەندێك ئەنجام، ئەنجامی هەرە مەزنیش ئەوەبوو کە کوردستان ستاتۆیەکی داگیرکراوێتی هەیە، مادام داگیرکراوە پێویستە مرۆڤ لەدژی ئەمە رابوەستێت"، دەڵێت:" ئیدی من بەم دوو وشەیە **"کوردستان داگیرکراوە"**دەستم پێکرد.

بێگومان پاشان کە ئەو فیکرەیەی خستە ناو ئەو کەسانەوە بینی کەسەکان ئەم فیکرەیە پەسند دەکەن و لەسەر ئەم فیکرەیە دێنە لای یەکتر. ئیتر ئەم فیکرەیەی قووڵکردەوە و بەهێزتری کرد. بەمەش لە ئەنقەرە سەرۆك لەگەڵ هەڤاڵ **"محەمەد**

خەیری دوورموش"دا پەرتووکی مێژووی داگیرکەری (مێژووی کۆلۆنیالیزم)یان ئامادەکرد، سەرۆك قسەی کرد و هەڤالْ "محەمەد خەیری دوورموش"یش پێیداچووەوە و کردی بە نامیلکەیەك و بڵاوکرایەوە. لە مێژووی تەڤگەری ئێمەدا ئەم نامیلکەیە یەکەم نووسینی ئێمەیە، یەکەمین بەڵگەی تەڤگەرە و تا ئێستاش لە ئەرشیفی تەڤگەردا پارێزراوە. ئەم نامیلکەیە دەبێتە بناخەی هەموو ئەو هەڵسەنگاندن و شیکردنەوانەی کە پاشان دەکرێن. پەرتووکی مانیفێستۆ ـ رێگای شۆڕشی کوردستان لەسەر بنەمای ئەم هەڵسەنگاندنە پێشیخست. پاشان هەندێك پەرتووکی دیکەی لەسەر ئەمە پێشخست و ئەم هەڵسەنگاندنەی فراوان کرد. واتا ئایدیۆلۆژیا و دەستنیشان کردنەکانی ئەم تەڤگەرە هەمووی لەم ئاخافتنەی سەرۆکدا هەیە. لەو نامیلکەیەدا ئەوەی دەستنیشانی کردووە، هەمان ئەو دەستنیشانکردنەیە کە ئێستا لەبەرگرینامەکانی ئەم دواییەیدا هەیە. واتا ئەو دەستنیشانکردنانەی کە لە بەرگرینامەکەدا هەن هەمان ئەو دەستنیشانکردنانەن کە لەو نامیلکەیەدا دیاریکردوون. ئەو هەڵسەنگاندنە بۆ هەموو هەڵسەنگاندنەکانی دواتری ئەم تەڤگەرە بناخە و بنچینەیە. تا ئەوکاتە ئەو لێکۆڵینەوە و لێگەڕینانەی لە رووی تیۆرییەوە ئەنجامی دابوو کردنی بە تیۆری و ئایدیۆلۆژیای ئەم تەڤگەرە. ئەوکاتە قسەی کرد و کرایە نووسین و لەسەر هەڤاڵانیش بڵاوکرایەوە، بۆ ئەوەی هەموو هەڤاڵان پەروەردەی لەسەر ببینن، تاوەکو روانین و فیکری هەموو هەڤاڵان بکاتە یەك. واتا بۆ ئەوەی یەکێتی ئایدیۆلۆژی لە کادیردا بئافرێنێت.

بێگومان پێش ئەوە سەرۆك ئاپۆ هەندێك جڤینی کردبوو، بۆ نموونە؛ لە ئەنقەرە لە "زووری بیناسازان" ی "کۆمەڵەی ئەندازیاران" سیمینارێکی سازکرد. ئەو کاتە هەندێك لە چەپی تورکی بۆ ئەم سیمینارە بانگهێشت کردبوو، ئەو لێکۆڵینەوەیەی کردبووی و ئەو دەرئەنجامەی بەدەستیهێنا بوو لەو سیمینارەدا پێشکەشی کرد. تا ئەو کاتە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی تەنیا دەیدا بە گروپەکە، بەڵام بۆ یەکەمین جار لەو سیمینارەدا ئەو فیکر و دەرئەنجامەی دایە هەر کەس و بڵاویکردەوە. ئەمە لەساڵی (١٩٧٦)دابوو. هەروەها جڤینی دیکەشی کرد، پاشان ئەو نووسینەی کردە نامیلکە.

**تایبەتمەندی سەرەکی کەسێتی ئەو هەڤاڵانەی ئەو گروپەی سەرەتا چی بوو و بەچی دەناسران؟ بەتایبەتی هەڤاڵان "حەقی قەرار" و "کەمال پیر"؟ هەروەها لە رووی پراکتیکییەوە تەڤلیبوونی ئەوان بۆ مەزنکردنی گروپ بە چ رەنگێك بوو؟**

هەڵبەتە رۆڵی هەڤاڵان "کەمال پیر" و "حەقی قەرار" لە چێبوون و پێشخستنی گروپەکەدا خاوەن رۆڵ و پێگەیەکی تایبەتین. چونکە هەردووکیان هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ سەرۆك ئاپۆدا شوێنیان گرتبوو و فیکری سەرۆکیان بەر لەهەموو کەسێك وەرگرتبوو. بۆیەش لەهەر کەس زیاتر سەرۆکان ناسیبوو و باش لێی تێگەیشتبوون. ئەو دوو هەڤاڵە لە هەموو هەڤاڵان زیاتر بەردەوام لە سەرۆك و فیکرەکەی تێدەگەیشتن، لە هەموو هەڤاڵانیش زیاتر لەو قۆناخەدا رۆڵی خۆیان گێڕا، هەم لە تێگەیشتن لە فیکری سەرۆك و هەمیش لە تێگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەو فیکرەیەدا رۆڵی زۆر بەرچاویان بینی. بۆیە لە دروستبوون و پێشکەوتنی گروپدا رۆڵێکی بەمشێوەیان هەیە.

دەتوانم بڵێم؛ لەنێو تەڤگەری ئێمەدا کەسێتی وەکو کەسێتی ئەو هەڤاڵانە ناوا نەبووە، لەوانەیە زۆر هەڤاڵی پڕ بەهێز و بەهادار دروستبوونە، بەڵام تایبەتمەندی ئەو هەڤاڵانە من لەهەڤاڵی دیکەدا نەمبینیوە، هەندێك تایبەتمەندی لەهەڤاڵان بەدیهاتووە، بەڵام هەندێك تایبەتمەندیش تا ئێستا پێکنەهاتووە. هەردوو هەڤاڵیش نەك تەنیا لە هەندێك لایەنەوە بەهێز بوون، بەڵکو مرۆڤ دەتوانێت بڵێت؛ لە هەموو رووێکەوە خۆیان پێشخستبوو و خۆیان پەروەردە کردبوو. واتا شۆڕشگێڕێتی ئەوان شۆڕشگێڕێتییەکی وەها تەنگ نەبوو، تەنیا لەهەندێك رووەوە پێشکەوتوو بن، بەڵکو شۆڕشگێڕێتییەك بوو لەهەموو رووێکەوە پێشکەوتبوو، بێگومان هەندێك تایبەتمەندی ئەوان هەن هەم وەکو یەکن، هەمیش لە یەکتر جودان.

**چۆن؟**

بۆ نموونه؛ هەردوو هەڤاڵ لەپارتیبوونی (PKK)دا و لەئافراندنی کولتوور و ئەخلاقی (PKK)دا رۆڵێکی گرنگ و تایبەتیان هەیە. ئەگەر (PKK) بووه به تەڤگەرێك و پارتییەك و بووه خاوەن ناسنامه و تەرز و کولتوور و ئەخلاقی خۆی، لێرەدا رۆڵی مەزنی هەردوو هەڤاڵ هەیە، پێویسته مرۆڤ بەر له هەموو شتێك ئەم راستییه بڵێت. بۆیه سەرۆك ئاپۆ بۆ هەڤاڵ "حەقی قەرار" دەڵێت:"وەك رۆحێکی شاراوەی من بوو". واتا مەبەستی ئەو کەسه بوو که نوێنەرایەتی سەرۆکی دەکرد، ئەمه راسته. هەروەها بۆ هەڤاڵ "کەمال پیر" دەڵێت:" پێویسته تەڤگەر له رۆحی کەمال پیر تێبگات". چونکه رۆحی "کەمال پیر" رۆحی سەرۆك ئاپۆیه، بەکرداربوونی ئەوه، بۆیه سەرۆك وەها دەڵێت. واتا ئەم دوو هەڤاڵه نەك تەنیا له فیکر و رامانی (PKK) تێگەیشتبوون، بەڵکو لەوەش تێگەیشتبوون که ئەو فیکر و فەلسەفه و رامانه چۆن و به چ شێوەیەك بیخەنه پراکتیکەوه. له بنچینەدا ئەوەی "حەقی" و "کەمال"یان مەزن کرد ئەمه بوو، بۆیه سەرۆك ئاپۆ باس له رۆحی "کەمال" و رۆحی "حەقی قەرار" دەکات بەرۆحی شاراوەی خۆی دەزانێت". لەکەسایەتی هەردوو هەڤاڵیشدا یەکسەر تێگەیشتن و یەکسەر پێکهێنان هەیه. ئەمه له سەرۆك ئاپۆدا بنچینه و بنەمایه. واتا تێگەیشتن و پێکهێنان وەك یەك دەبینێت. یەکێك ناخاته پێش ئەوەی تریانەوه، تۆ هەم تێبگەیت و بیخەیته بواری کردارییەوه، هەمیش بیکەیت و تێبگەیت. ئەوەی له کەسێتی "کەمال" و "حەقی"دا پێکهاتووه ئەمەیه "یەکسەر تێگەیشتن و یەکسەر پێکهێنان". هەڵبەته ئەمه تەرزی سەرۆك ئاپۆیه، تەرزی پراکتیکبوون و خەبات و ژیانی سەرۆك ئاپۆیه. لەو قۆناخەدا ئەوەی ئەمەی له کەسێتی خۆیدا پێکهێناوه ئەو دوو هەڤاڵەن. بۆیه سەرۆك ئاپۆ وەهای لەسەریان گووتووه.

لەم هەڤاڵانەدا بەبێ دوو دڵی به سەرۆك و به تەڤگەر و رێباز باوەڕکردن هەیە، له چ هەلومەرجێکدا دەبێت با ببێت، هیچ کاتێك باوەڕی خۆیان لاواز نەکردووه. بۆ نموونه؛ کاتێك ئێمه له لوبنان بەشداری شەڕی فەلەستین دژ به ئیسرائیلمان دەکرد، دەوڵەت چووبوو له زیندان به هەڤاڵ "کەمال پیر"یان گووتبوو:"هەموو هەڤاڵانی ئێوه کوژراون، ئەوانەی ماویشن ئێمه دەیانگرین و دەیانهێنینەوه" هەڤاڵ "کەمال"یش گووتبووی:" ئێوه درۆ دەکەن" یەکسەر پێهەڵگرتنێکی وەهای کردبوو. بێگومان هیچ زانیارییەکی

ئەوتۆیشی لەبەردەستاندا نەبوو. بۆ نموونە؛ ئەم پڕوپاگەندەیەی دووژمن لەسەر هەڤالانی دیکە کاریگەری کردبوو، کەوتبوونە گومانی ئەوەی تۆ بڵێی ئەمە راست بێت؟ راست نەبێت؟ لەوانەیە راستیش بێت. بەڵام هیچ کاریگەری لەسەر هەڤاڵ "کەمال" نەکردبوو و گووتبووی:" ئێوە درۆ دەکەن"و چووبووە پێش هەموو هەڤالانیش گووتبووی:" ئەوانە درۆ دەکەن، هەڤالان هیچ شەهید نەکەوتوون، لەوانەیە هەندێکیان شەهید بکەون، بەڵام ناتوانن هەموو هەڤالان شەهید بکەن و بیانگرن و بیانهێنن". یەکسەر ئەو پڕوپاگەندەیەی دووژمنی شکاندبوو. ئیتر ئەمە چ دەخاتەڕوو؟ باوەڕییەکی بەهێزیان هەبووە بە تەڤگەر و ئایدیۆلۆژیا و بە هەڤالێتی، هەم لایەنی تێگەیشتنیان زۆر بەهێزە، هەمیش لایەنی پێکهێنانیان زۆر بەهێزە.

هەروەها لەئەواندا لایەنی فیداکاری لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بوو. لە فیداکاریدا بێسنوور بوون، لە جورئەتیاندا، لە باوەڕیاندا، لە پەیوەستبوونیاندا سنوور نەبوو، لە خۆنوێکردنەوە و خۆ پێشخستندا سنوور نەبوو، لە بەها ئافراندن و لە بەها مەزنکردندا سنووریان نەبوو. لە ژیانی ئەواندا، لە کەسێتی ئەواندا، ژیانێکی شەخسی نابینرێت، ژیانی ئەوان بەتەواوی ژیانێکی رێکخستنییە. لەژیانی خۆیاندا بەتەواوی ئازادیان بەبنەما و بنچینە وەرگرتووە. هیچ کاتێك لەگەڵ هەڵە و کەموکوڕی و گرفتدا ناژین، هیچ کاتێك ئەگەر سەریشیان تێدا بچێت ئەوەیان پەسند نەکردووە کە وەها بژین. چوونە سەر کێشە و چارەسەرکردنی کێشەکە بنچینە و بنەمایە، بەها پێشخستن بنەمایە، هەڤالی خۆ پێشخستن و مەزنکردن و بەسەرخستن بنەمایە، لاوازی و کەموکوڕی هەڤالانیان لەدژی هەڤالانی خۆیان بەکارنەدەهێنا، بەڵکو هەوڵدان بۆ رزگارکردنیان بنەمایە. کاتێك مەترسییەك هەبووایە بۆ ئەوەی ئەو مەترسییە نەگاتە هەڤالێکی دیکە ئەوان ئەو مەترسییەیان دەخستە پێش خۆیان. واتا تایبەتمەندێتی ئەوان و کەسێتی ئەوان بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو. هەموو شتێکی خۆیان بە تەواوەتی خستبووە خزمەتی هەڤالێتی و گەل و تەڤگەرەوە.

بۆ نموونە؛ لە روونکردنەوە و تێگەیاندن و قەناعەت پێکردندا زۆر بەهێزبوون. واتا تا مەسەلەیەکیان بەکەسێك بەپەسندکردن و قەناعەت کردن نەدابایە دەستبەرداری نەدەبوون، روونیان دەکردەوە و قەناعەتیان پێدەهێنا، تاوەکو ئەنجامیان وەرنەگرتبایە

دهستبهرداری نهدهبوون. لهژیانی خۆشیاندا زۆر دڵنزم بوون. واتا دهسترۆیی و توانست خواستن و لهسهر توانستهكان ژیانبوون، یان لهسهر دهسترۆیی ژیانبوونیان نهبوو. دهیانگووت:" ئێمه ملیتانین، سهرۆك دهبێژێ ئێمهش ئهنجامی دهدهین، ئێمه سهرۆكمان ههیه، ئێمهش ملیتانی ئهو سهرۆكهین.

بۆ نموونه؛ ههردوو ههڤاڵیش نهفرهتیان له دهسترۆیی دهكرد، نهفرهتیان لهوه دهكرد به مهرج و مهنسهب و دهسترۆیی شۆرشگێری بكرێت. تهڤگهر چ توانستێكی بهوان بدابایه ئهو توانستهیان به بنهما وهردهگرت و پیرۆزیان دهبینی. واتا "ئهو توانسته كهمه، یان بهوه نابێت" شتێكی وههایان نهبوو. هیچ كاتێك شتێكیان لهتهڤگهر نهدهخواستن، ههمیشه چۆن بتوانن توانست بۆ تهڤگهر بئافرێنن و چۆن تهڤگهر مهزن بكهن، ئهمهیان بهبناخه وهردهگرت. بۆ نموونه؛ لهنێو ئێمهدا ئهوهی لهههر كهسێك زیاتر كرێكاری دهكرد و ئێش و زۆر و زهحمهتی دهبینی ههڤاڵ "حهقی قهرار" بوو، لهنێو ئێمهدا ئهوهی دهستپێك له ئهنقهره دهركهوت و چووه "ئهدهنه" و لهوێ خهباتی سیاسی دهكرد و حهماڵێتیشی دهكرد ههڤاڵ "حهقی قهرار" بوو. ههم لهوێ خهباتی دهكرد و ههمیش حهماڵێتی دهكرد، خۆی پێ بهرێوه دهبرد، توانستی ئافراندووه و تهنانهت توانستی زیادیشی بۆ ههڤاڵانی ئهنقهره دهنارد. له ههردوو ههڤاڵانیشدا هیچ كاتێك و بههیچ شێوهیهك ههرگیز كۆیلایهتیان پهسند نهكردووه، جا بهههر شێوهیهك بێت. ههمیشه چهنده كاریان كردبێت خۆیان قهرزارباری تهڤگهر و ههڤاڵێتی بینیوه و ئهمهیان بهبناخه وهرگرتووه.

بۆ نموونه؛ ئێمه بۆ جاری دووهم له زینداندا ههڤاڵ "كهمال پیر"مان رفاندبوو، سهرۆك له سوریاوه گووتی:" بۆ لای منی بنێرن" منیش پێیمگووت:" ئێمه تۆ دهنێرین" گووتی:" من ناچم" گووتم:" ئاخر سهرۆك دهڵێت" گووتی:" من چۆن بچم؟ من دوو جاره كهوتوومهته زیندانهوه، تهڤگهر منی دهرخستووه (لهزیندانهوه منی رفاندووه). من قهرزارباری ئهو تهڤگهرهم و من هیچ شتێكم بۆ ئهو تهڤگهره نهكردووه، من چۆن بچمه دهرهوهی وڵات؟ بۆیه من ناچم" وههای گووت. من گووتم:" سهرۆك داوای كردووه و پێویسته تۆ بچیت، لهوێش پهروهرده دهبینی. وهكو تریش بۆ ئهوهی

سەرنج لەسەر تۆ نەمێنێت و چیدی چاودێریش نەکرێیت، پاشان بگەڕێوە" من وەها قەناعەتم پێیکرد، وەها نەبایە دەرنەدەکەوت بۆ دەرەوەی وڵات.

هەروەها خۆشەویستی هەردوو هەڤاڵ زۆر بەهێز بوو، لەسەر هەموو شتێك رادەوەستان، تەنانەت لەسەر وردەکاریەکانیش. هیچ نەیاندەگووت:" هیچ نییە، شتێك نابێت" بۆ نموونە، لەلای زۆر لە هەڤاڵان ئەم چەمك و لۆژیکە هەبوو. بەڵام هەردوو هەڤاڵ زۆر وردبین و بەسەرنج بوون، تەنانەت سەرنجی بچووکترین وردەکاریان دەدا. شتێك کە زۆر لە هەڤاڵان نەیاندەبینی، ئەوان دەیانبینی.

## بۆ نموونە چۆن؟

بۆ نموونە؛ عەبدولڕەحمان ناوێك هەبوو، لەسەرەتای گروپدا لەنێو ئێمەدا بوو، ئەو کەسە هەڤاڵانی زۆر بێزار دەکرد، نەیدەتوانی لەگەڵ هەڤاڵان بگونجێت. ئێمە دەمانگووت:" ئیتر کەسێتییەکی وەهایە..چی لێبکەین!!" پاشان رۆژێکیان لە ئەنقەرە لەبەشی ناوخۆیی خوێندکاراندا گردبووینەوە، ئەو شوێنە لەدەستی ئێمە دابوو، "عەبدولڕەحمان" گووتی:" ئێمە یان هەنگاوێك دەهاوێژین یان کۆتاییمان پێدێت" گووتمان:" تۆ چ لەئێمە دەخوازیت؟ ئەوەی تۆ دەیڵێیت راست نییە" گووتی:" یان ئەو هەنگاوە دەهاوێژین یان ئێوە دەزانن" هەروەها گووتی:" شەش مانگ نابات ئێوە کۆتاییتان پێدێت" گووتمان:" ئیدی عەبدولڕەحمانە و سەرەڕۆیە و لەخۆیەوە قسە دەکات" کەمال پیر گووتی:" نا، ئەمە شتێك دەزانێت بۆیە وەها قسە دەکات...چونکە دەڵێت:" شەش مانگ نابات!" دیارە شتێك دەزانێت. پێویستە ئەمە روون بکاتەوە؟" گووتمان:" ئیدی وەها قسە دەکات و گوێی مەدەرێ" بەڵام "کەمال" پێداگیری لەسەر ئەمە کرد. بێگومان لەبەر ئەوەی ئێمەی هەڤاڵان گرنگیمان بەمە نەدا، ئەو پێداگیرییەی هەڤاڵ "کەمال" وەها مایەوە. بەراستیش دوای شەش مانگ هەڤاڵ "حەقی" شەهیدکرا، هەوڵی کوشتنی (إغتیال) سەرۆکیان دا، ئەگەرچی سەریش نەکەوت. واتا لەهەموو لایەکەوە هاتنە سەرمان و خواستیان تەسفیەمان بکەن. هەڤاڵ

"کەمال پیر" بەمشێوەیە لەسەر هەر قسە و گووتنێك رادەوەستا و ئەنجامی لێوە هەڵدەهێنجا.

بۆ دموونە؛ هەر دوو هەڤاڵیش نەیاندەخواست هەڤاڵی خۆیان بشکێننەوە، نەك بەو واتایەی چاوی خۆیان لە هەڵە و لاوازی و کەموکورتییەکان دەپۆشی، هیچ کاتێك چاوپۆشیان نەدەکرد. بەڵام ئەو شێوازەی دەیانگرتەبەر ورە و باوەڕی بە هەڤاڵان دەبەخشی، وریابوون لەوەی هەڤاڵانی خۆیان نەشکێننەوە. زۆر بە هەستیارییەوە نزیك دەبوون. واتا شکاندنەوەی مرۆڤێك و لە دەستدانی کەسێکیان پەسند نەدەکرد. هەروەها لە ئاژیتاسیۆنکردندا هەڤاڵ "کەمال پیر" زۆر بەهێز بوو؛ کە دەچووە زۆر شوێن بە تورکی قسەی دەکرد و کوردی نەدەزانی، گوندنشینانیش لە تورکی تێنەدەگەیشتن، دیسانیش گوێیان لەهەڤاڵ "کەمال پیر" دەگرت. کە ئاخافتنی کۆتایی پێدەهات دەیانگووت:" ئێمە ئامادەین لەگەڵتدا بێین" بەمشێوەیە کاریگەری خۆی دەکرد، بە کەسێتی و هەڵسوکەوت و ئاخافتنی خۆی کاریگەری لەسەر مرۆڤ دەکرد. کاتێك مرۆڤ لەگەڵ "کەمال پیر" بژیایە وەك ئەوە وابوو مرۆڤ لەگەڵ سوپایەك بژیێت، ئەو سایکۆلۆژی و باوەڕییەی دەدایە مرۆڤ. چۆن؟ بە ژیان و هەڵسوکەوت و ئاخافتنی خۆی باوەڕی و مۆراڵی بە مرۆڤ دەبەخشی.

کاتێك ئێمە هەڤاڵ "کەمال"مان لە زیندان رفاند، هەندێك کەسی ئاسایی لە زینداندا هەبوون، گوندیبوون، هەڤاڵ "کەمال" زۆر کاریگەری لەسەر ئەوان کردبوو، ئەوانە لەرفاندنی هەڤاڵ "کەمال" لە زینداندا رۆڵێکی پڕ مەزنیان گێڕا. لەبەر ئەوەی جارێکی تریش هەڤاڵ "کەمال" لە زیندان هەڵاتبوو و دەوڵەتیش بەمەی زانیبوو، تەدبیری زۆری وەرگرتبوو تاوەکو جارێکی تر هەڵنەیەت، ئیدی هەڤاڵ "کەمال" نەیدەتوانی زیندان کون بکات و رابکات، هەڤاڵ "کەمال" ئەو کەسانەی قازانج کردبوو، زیندانی بەرێگەی ئەوانەوە کون کردبوو، دەوڵەت هیچ هەستی پێنەکردبوو، هەڤاڵ "کەمال" و ئەو گوندنشینانە هەموویان هەڵهاتن، ئێمە ئەو کەسانەمان گەیاندە ماڵی خۆیان و بینیمان جارێکی تر گەڕانەوە و هاتنەوە لامان. گووتمان:" ئێوە بۆچی گەڕانەوە؟" گووتیان:" ئێمە بێ هەڤاڵ کەمال هەڵناکەین، ئێمە ئیلا و بیلا لەگەڵ هەڤاڵ "کەمال" دەمێنینەوە، لەگەڵ هەڤاڵ "کەمال" شۆڕشگێڕێتی دەکەین".

ئیدی هەردوو هەڤاڵ قسەیان لەگەڵ هەر کەسێك بکردابایە مسۆگەر قازانجیان دەکرد. هەمیش خۆیان پەروەردە دەکرد و خۆیان بەهێز دەکرد. هیچ کاتێك کاتی خۆیان بەفیڕۆ نەدەدا. لەژیانی خۆیاندا بەپلان و بەپرۆگرام دەژیان و کاریان دەکرد و ئەمەیان بەبنچینە وەردەگرت. لەژیانی ئەواندا هیچ کاتێك بێ ڕێکخستنی و بێ پیلانی و هەوەسکاری (کەیفییەت) نەدەبینرا، دیسپلینیان زۆر بەهێز بوو. کەسێتی ئەوان ئەو کەسێتییە بوو کە سەرۆك ئاپۆ دەیخواست بیئافرێنێت. کەسێتییەك بوون بەتەواوی ڕێکخستن و سەرکەوتنیان بەبنچینە وەردەگرت، بێ ڕێکخستنیان پەسند نەدەکرد، هەر دەبووایە کێشە و گرفتەکان چارەسەر ببوونایە، هەر پێویستبوو ئەنجامیان بەدەست بهێنابایە. بۆیە دەچوونە هەر جێگایەك ڕێکخستنیان دەبردە ئەو جێگایە، ئەخلاق و کولتوور و ژیان و کەسێتی و زانابوون و ڕۆحی ڕێکخستنیان دەبردە ئەوێ. لە هەر کوێیەك بوونایە لەوێ هەم کادیران پێشدەکەوتن، هەمیش چالاکی پێشدەکەوت. لە هەمانکاتدا ئەوان کەسی چالاکوانیش بوون. کە دەچوونە هەر شوێنێك لەوێ چالاکیان دەکرد، چالاکیان پێشدەخست و گۆڕانکاریان ئەنجام دەدا، لەوێ ئەنجامیان بەدەستدەخست. هیچ کاتێکیش توانستی مەزنیان لەتەفگەر نەدەخواست، لەوپەڕی بێ توانستیدا شۆڕشگێڕیان کردووە. لەنەبوونی و زۆری و زەحمەتیدا شۆڕشگێڕێتیان کردووە و ڕۆژێك نەیانگووت؛ توانست نییە و زۆری و زەحمەتی هەیە، ئێمە ناتوانین کار بکەین یان وەها کار ناکرێت... ڕۆژێك بێ ورەیی و بێ مۆڕاڵیمان لەوان نەبینی. هەر بۆیە لەشێوەگرتنی (PKK)دا لە پارتیبوونی (PKK)دا، لە کولتوور و ئەخلاقی (PKK)دا، لە کەسێتی (PKK)دا ڕۆڵێکی مەزن و خەباتێکی مەزنی ئەو هەڤاڵانە هەیە. بۆیە سەرۆك ئاپۆ هێندە بەها دەداتە ئەو هەڤاڵانە و دەڵێت:" ئەوانە نوێنەرایەتی ڕۆحی ئەو تەڤگەرەیان دەکرد" هەروەها دەڵێت:" هەمیشە ئەو ڕۆحە بۆ ئێمە پێویستە. چونکە بەڕاستی لەسەر ئەو کەسێتییەی ئەوان (PKK) بنیادنرا و پێشکەوتن بەدیهات و ئەنجامگیر بووە. لەبەر ئەم هۆیەیە سەرۆك وەها باسیان دەکات.

جگە لەو هەڤالانە هەڤالی دیکەش لە گروپدا هەبوون، کە وەکو پێشەنگی گروپ تێکۆشانیان دەکرد نزیکبوونێکی ئەو هەڤالانە بە گشتی لە سەرۆك و نزیکبوونی سەرۆك لەو هەڤالانە چۆن بوو؟ بە چ رەنگێك نزیکی یەکتر دەبوونەوە، واتا سەرۆك بە حوکمی ئەوەی لەوان پێشەوەتر بوو و پێشەنگایەتی ئەو گروپەی دەکرد چۆن لەیەکتر نزیك دەبوونەوە؟



شەهید محەمەد خەیری دوورموش



شەهید مەزلوم دۆغان

بێگومان لەدەرەوەی **"کەمال پیر و حەقی قەرار"**، هەڤاڵی دیکەی وەك **"محەمەد خەیری دورمووش و مەزلوم دۆغان"**یش هەبوون. ئەوانیش لەو قۆناخەدا زۆر کار و خەباتیان کرد؛ لەپێشکەوتنی گروپ و تەڤگەردا لە پارتیبوونی تەڤگەردا، ئەوانیش رۆڵی بەرچاوی خۆیان بینی.

هەڵسوکەوت و نزیکبوونەوەی هەڤاڵان بۆ یەکتری وەکو گووتم؛ بەرۆحێکی هەڤاڵێتییەوە لەیەکتر نزیك دەبوونەوە، یەکێك خۆی مەزن ببینێت و هەڤاڵانی خۆی بچووك ببینێت یان بەدواکەوتوو بیبینێت، یاخود بێ رێزی بەرامبەر بکات... شتی وەها لەئارادا نەبوو. لەنێو ئێمەدا جوداکارییەك نەبوو، وەك؛ ئەو هەڤاڵە لە پێشە و ئەوەی تر لەدواوەیە و بەگوێرەی ئەمەش نزیکبوونەوە بکرێت، شتی بەمجۆرە نەبوو. ئەو هەڤاڵانەی هەر لەسەرەتاوە تەڤلی ئەو گروپەبوون، لە ژیانیشیاندا و لە کاریشیاندا، وەکو یەك بوون. هیچ کاتێك جوداییەکمان نەدەخستە نێوانیانەوە. تەنانەت ئەو هەڤاڵانەی کە تازە تەڤلی ئێمە دەبوون، هێشتا بەتەواوی لەگروپ تێنەگەیشتبوون، زۆر

هەستیاربووین لەوەی کە زۆر بارییان گران نەبێت، زێدە زەحمەتی نەبینن، هەستیاربووین لەوەی بەهەڵە لەشت تێنەگەن، هەستیاربووین لەوەی شێوەگرتنی ئەوان بەراست و دروستی بێت و ئەو زۆری و زەحمەتیانەی ئێمە کێشامان ئەوان نەیکێشن، ئەو تەنگاسیانەی ئێمە بەسەرماندا هاتووە ئەوان بەسەریاندا نەیەت. بۆ ئەوەی شۆڕشگێڕێتی ئەوان باشتر و تۆکمەتر پێشبکەوێت. ئەمە لە گروپدا ئەخلاق و کولتووریکمان بوو، شێوەگرتنی گروپ بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو. تۆ جیاوازیت نەدەبینی لەنێوان هەڤاڵێك کە لەسەرەتاوە تەفلی گروپ بووە و ئەوەیش کە لەدواییدا هاتووە، بەمشێوەیە بوو.

پەیوەندی نێوان سەرۆك و هەڤاڵانی گروپ دیسان لەسەر هەمان بنەمابوو، بەڵام هەموو هەڤاڵانی گروپ هەمیشە لەنێوان خۆیان و سەرۆکدا جیاوازیەکیان دادەنا. ئەمە نەك سەرۆك دەیکرد، بەڵکو هەڤاڵان ئەمەیان دەکرد. واتا هەموو هەڤاڵان بێ شك و بێ نیقاش سەرۆکیان پەسندکردبوو، بێدوودڵی پێی بەباوەڕ بوون؛ سەرۆك چی بڵێت، ئەوا راست دەڵێت، نزیکبوونێکی بەمشێوەیە لەنێو هەموو هەڤاڵاندا هەبوو.

بێگومان ئەمە لەنێو هەڤاڵاندا بەکار و ژیانی سەرۆك دروست ببوو، نەك سەرۆك ئەمەی دەخواست. ئەمە بەخواستی ئەو دروستنەبوو، بەڵکو بەتەواوی بە ژیان و کاری سەرۆك ئەو رێز و حورمەتە، ئەو پەسندکردنە، دروست بوو.

بۆ نموونە؛ لە مێژووی زۆر تەڤگەردا سەرۆکایەتی تەڤگەرەکان یەکسەر هەر لەسەرەتاوە بەمشێوەیە دەرناکەون و پەسند ناکرێن، زۆر کات تێدەپەڕێت تا رێکخستن دروست دەبێت و کار و خەبات دەکرێت، چەندین کۆنگرە ساز دەکرێن، لە ئەنجامی ئەمانەدا ئینجا سەرۆکێك پەسند دەکەن. بەڵام لەئەوەی ئێمەدا بەو شێوەیە نەبوو، هێشتا لە سەرەتادابن و گروپێکی زۆر بچووکین دوو - سێ کەسین لە قۆناخێکی وەهادا سەرۆك وەك سەرۆك پەسند کراوە. بۆچی؟ چونکە ئەوەی خەباتی تیۆری بەڕێوە دەبرد، ئەوەی فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا و توانستی ئەو تەڤگەرەی هەموو پێشخستووە سەرۆك ئاپۆیە، هەمیش بەتەنیا بەخۆی و بە رەنجی خۆی ئەمەی کردووە. هیچ کاتێك ئەمەی نەکردە موڵکی خۆی، بەئێش و رەنج و زەحمەتییەکی مەزنەوە هەرچییەکی ئافراند خواستی بیکاتە موڵکی هەموو هەڤاڵان و هەموو گروپ، خواستی هەموو هەڤاڵان لەسەر ئەوە

بەهێز بکات. چۆن خۆی بەهێز کرد، دەیخواست بەهەمان شێوەش هەموو هەڤاڵان بەهێز بکات، لاوازێتی هەڤاڵانی پەسند نەدەکرد، کەماسی پەسند نەدەکرد، هەموو هەوڵی ئەوە بوو کە چۆن بتوانێت هەڤاڵانی خۆی بەهێز بکات. چونکە دەیزانی سەرکەوتنی خۆی لە بەهێزکردنی هەڤاڵانیدا دەرباز دەبێت، ئەگەر هەڤاڵی خۆی بەهێز نەکات ئەوا چەندە خۆیشی بەهێز بکات بێسوودە. کە هەڤاڵی خۆی بەهێز کرد ئەوا ئەمە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئەو و سەرکەوتنی ئەویش. بۆیە هەم خۆی پەروەردە دەکرد و هەمیش هەڤاڵانی پەروەردە دەکرد، چەندە بۆ خۆی توانست و دەرفەتی دەرەخساند، بەهەمان شێوە بۆ هەڤاڵانیشی توانست و دەرفەتی دەرەخساند، شەو و ڕۆژ دەیخوێندەوە و لێکۆڵینەوەی دەکرد و زێدە نەدەخەوت. هەروەها ژیانێکی زۆر سادە و ساکاری هەبوو، هەڤاڵان ئەمەیان دەبینی، بۆیە سەرۆکیان پەسندکرد، حورمەت و ڕێزیان بۆی هەبوو، نەك لەبەرئەوەی سەرۆك ئەمەی دەخواست. سەرۆك هیچ کاتێك ئەمەی نەدەخواست ئێمە بەو شێوەیە نزیکبوونەوەیەکی جودای بۆ بکەین. تەنانەت بە نزیکبوونەوەی بەمشێوەیە تووڕە و بێزاریش دەبوو، دەیگووت:" من ئاغا نیم، سەرۆك عەشیرەت نیم، ئێوەش کۆیلەی من نین، تا ئێوە بەمشێوەیە لەمن نزیك ببنەوە. لەڕێز و حورمەتیشدا ئەو ڕێز و حورمەتەی لەنێو جڤاکدا هەیە بۆ من مەیکەن، ئەگەر ڕێز و حورمەتتان بۆ من هەیە، هەڤاڵێتی لەگەڵ مندا بکەن، ئەگەر ڕێز و حورمەتی ئێوە بۆ من هەیە، ئەوا ڕێز و حورمەت لەسەر بنەمای هەڤاڵێتییەکی ڕاست و دروست ئاوا دەکرێت، ئەمەش لەسەر بنەمای ئەو فیکرە دەبێت. ئێوە لەم فیکرەدا چەندە خۆتان بەهێز کرد و چەندە خۆتان کردە هێزی چارەسەری بۆ گەل، ئەوکاتە بەڕاستی ڕێز و حورمەتی من دەگرن..." هەر لەو کاتەوە ئەمەی بەبنچینە وەرگرت.

لەم ڕووەوە با بیرەوەرییەکی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە؛ ئێمەماڵێکمان هەبوو بەکرێمان گرتبوو، لەگەڕەکی "حەمیرانجی"، لەپشت بینایەی مەجلیسی تورکیا، ماڵەکە قاتی ژێرەوەی بینایەك بوو، واتا ژێرزەمین بوو، شوێنەکەمان زۆر سارد بوو، توانستی ئەوەشمان نەبوو شوێنێکی تر بەکرێ بگرین، هەر کاتێکیش کە باران دەباری پڕی ئاو دەبوو، شوێنێکی وەها بوو... لەنزیك ئێمە باخچە (پارك)یەك هەبوو، ڕۆژێك خۆرەتاو بوو، هەوا خۆش بوو، خەڵك بۆ خۆیان دانیشتبوون، من و سەرۆکیش بەوێدا تێپەڕین،

من گووتم:" ئەو پارکە لە ئێمەوە نزیکە، ئێمە دەتوانین جار بەجار سوودی لێوەربگرین و لێی دابنیشین". بۆچی وەهام گووت؟ چونکە ژێر زەمینەکەمان زۆر سارد بوو، ئەوێش پارکە و دەرەوەیە و هەوا خۆشە و مرۆڤ دەتوانێت لێرە هەبنیشێت، لەنێو ئەو ژێرزەمینەدا لەسەرمان هەر مردین. بینیم سەرۆك لەمنی روانی و لە پارکەکەی روانی؛ کە خەڵك و گەنج لەوێ دانیشتبوون، پێی گووتم:" پێویستە شۆڕشگێڕی کوردستان وەك راهیبەکان بن" کاتێك کە ئەمەی گووت وەك بڵێی لەپڕ ئاوێکی ساردیان بەسەرمدا کردبێت، من زانیم کە سەرۆك بۆچی وەها دەڵێت، واتا سەرۆك وەها تێگەیشت کە ئێمەش لەوێ وەکو ئەو گەنجانە بژین، ئیدی بینیم ئەو کاتە شیکردنەوەیەکی بۆ من پێشخست و گووتی:" بۆیە گووتم پێویستە مرۆڤ وەکو راهیبەکان بژیت. وەها نەبێت ئەوا شۆڕشگێڕی لە کوردستاندا دروست نابێت، ئەو شۆڕشگێڕییەتەی تۆ لە چەپی تورکدا دەیبینی بەشی چارەسەرکردنی کێشەی کورد ناکات..."

هەرچەندە من وەها بیریشم نەدەکردەوە، مەبەستیشم ئەمە نەبوو، کاتێك بینیم سەرۆك وەها شیکردنەوە دەکات، هەرچەندە وەکو بەسەرداکردنی ئاوێکی ساردیش بوو، بەڵام ئەمە بۆ من بوو بەبنچینە و بنەمایەك. بێگومان کە چووینە ماڵەوە، پێیمگووت:" من بەو مەبەستە گووتم، نەك وەك ئەوان بژین، ژێرزەمینە و ساردە، ئەوێش خۆرەتاوە و پارکێکە. ئێمە دەتوانین جار بەجار بچینە ئەوێ، گفتوگۆ بکەین و لەوێ پەرتووك بخوێنینەوە، بۆیە وەهام گووت". واتا سەرۆك بەمشێوەیە هەستیار بوو؛ لە رۆیشتن و دانیشتندا هەمیشە پەروەردەکردنی هەڤاڵی خۆی بەبنچینە وەردەگرت، بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵەوە، نەکەوێتە ژێر کاریگەری کولتوور و ئەخلاقی سیستەمی باڵادەستەوە، بەڵکو لێی رزگار بکات. ئەمەی بەبنچینە وەردەگرت.

لەژیانی سەرۆك ئاپۆدا پەروەردەکردن و خۆ پەروەردەکردن بنەمابوو، لەسەر خواردندا، لە رۆیشتندا هەمیشە پەروەردە بوو. ئیدی بۆ هەڤاڵی خۆی بە بەرپرسیارێتییەکەوە دەژیا، حورمەتێکی مەزنی نیشان دەدا، بۆیە هێندە لەسەر هەڤاڵان رادەوەستا بۆ ئەوەی لاوازی لە هەڤاڵاندا دەرنەکەوێت، هەڤاڵان لە دەست نەدرێن، تەفکەر و گەل لەدەست نەدرێت. هیچ کاتێك لەدەستدان (بەفیڕۆدان) و لاوازی شایستەی هەڤاڵی خۆی نەدەبینی. تەنیا سەرکەوتنی شایستەی هەڤاڵانی دەبینی. چونکە دووژمن هەمیشە

ژێرکەوتنی کوردی بەبنەما وەردەگرت و بە شایستەی دەزانی و لەم پێناوەشدا کاریدەکرد، بۆیە سەرۆك لەدژی ئەو چەمکەی دووژمن رادەوەستا کە تەنیا دۆڕان و شکستی بەشایستەی کوردان دەبینی. بۆیە هەموو هەوڵێکی ئەوەبوو کە چیبکات تاکو مرۆڤی کورد و هەڤاڵانی خۆی بکاتە هێزی چارەسەری و لەسەرکەوتندا بژین، نەك لەدۆڕاندن و ژێرکەوتن؟ لەژیانی خۆیدا هەمیشە ئەوەی بەبناخە وەردەگرت، بۆیە لەناو هەڤاڵاندا حورمەتێکی مەزن بۆ سەرۆك دروست ببوو، هەڤاڵان کە لە سەرۆکیان دەڕوانی لێیەوە فێر دەبوون و سەرۆکیش فێری دەکردن. ئیدی گرۆك (ناوك)ی ئەم تەڤگەرە و کادیرانی ئەم تەڤگەرە سەرەتا بەمشێوەیە دروست بوو. بۆیە تەڤگەرەکە بە تۆکمەیی دروست بوو و لەسەر ئەو بنەمایە بەڕێوەچوو...

## لەو کاتەدا سەرچاوەی ماددی ۆ مەعنەوی گروپەکە لەکوێوە دەهات؟ ئەو تەنگاسی و زەحمەتیانەی تووشی بوون چۆن چارەسەرتان دەکرد؟

لەسەرەتای ئەو گروپەدا لەرووی سیاسی و رێکخستنییەوە ئەزموونێکمان نەبوو، لەرووی ماددیشەوە هیچ ئیمکان و توانستێکمان نەبوو، ئەم تەڤگەرە خۆی توانستی ماددی و مەعنەوی بۆ خۆی ئافراند. بۆیە ئەگەر ئەمڕۆ لەرووی ماددی و مەعنەوییەوە هێندە بەهێزە و گەیشتۆتە ئاستی بەدەستهێنانی بەهای مەزن، هەموو ئەمانە ئەم تەڤگەرە خۆی بەرەنجی خۆی ئافراندی، بەرەنجێکی مەزن، بەئێش ۆ زەحمەتییەکی مەزن، بە سەبر و لەهەمانکاتدا بە پێداگرییەکی مەزنەوە خوڵقاندی. پێویستە ئەم راستییە باش تێبگەین. ئەم تەڤگەرە هیچ کاتێك ماددییەتی بۆ خۆی بەبنەما وەرنەگرتووە، هەمیشە مەعنەویاتی بەبنچینە وەرگرتووە، ماددییەت بە پەیوەست بە مەعنەویاتەوە لێی نزیکبۆتەوە. بۆیە نەکەوتۆتە هەڵەوە و پیس نەبوو و تێك نەچوو.

کاتێك مرۆڤ لەمێژووی مرۆڤایەتی بڕوانێت؛ ئەوەی هەمیشە مرۆڤی لەسەر ڕێباز هێشتۆتەوە و بەڕێوەی بردووە، ماددییەت نەبووە، بەڵکو لایەنی مەعنەویات بووە،

هەمیشە ماددییەت خراپی و پیسی (گەماری) بۆ مرۆڤایەتی دروستکرووە. مرۆڤ دەتوانێت بێ ماددییەت بژیت، بەڵام ناتوانێت بێ مەعنەویات بژیت، ئەگەر تۆ مەعنەویاتی خۆتت لەدەستدا ئەوا تۆ مرۆڤایەتی خۆتت لەدەست داوە، ئەگەر تۆ ماددییەت لەدەست بدەیت تۆ مرۆڤایەتی خۆت لە دەست نادەیت، لەوانەیە لە مرۆڤایەتیبوونی خۆت هەندێك شت لەدەست بدەیت، بەڵام هەموو مرۆڤایەتی خۆت لەدەست نادەیت. بەڵام ئەگەر مەعنەویاتت لەدەستدا، ئەوا تۆ مرۆڤایەتی خۆت لەدەست دەدەیت. بۆیە مەعنەویات بنەمایە، لەمێژوودا هەمیشە ماددییەت خراپبوونی دروست کردووە. لەمێژوودا؛ بۆ ئەوەی ئەو خراپبوونە لەنێو مرۆڤایەتیدا بسڕنەوە و مرۆڤایەتی دیسان لەسەر بنچینەی خۆی بەڕێوە بچێت، ئەو شێواندن و داڕووخانانەی لە مرۆڤایەتیدا لە ئارادابووە راستیبکەنەوە و سەر لەنوێ بنیادی بنێنەوە و مرۆڤایەتی لەسەر سروشتبوونی خۆی پێشبکەوێت هەمیشە بزوتنەوەی مەعنەوی سەریانهەڵداوە. ئەگەر مرۆڤ لەهەموویان تەفکەرەکانی پێغەمبەران، ئایینەکان، ئایدیۆلۆژیاکان بڕوانێت، ئامانجیان چیبووە؟ ئامانجیان ئەوەبووە کە چۆن بتوانن خراپی و گەماری لەنێو مرۆڤایەتیدا نەهێڵن و بیسڕنەوە، چۆن ژیانێکی باش بۆ مرۆڤایەتی بخوڵقێنن، ئەمەنەیان کردۆتە ئامانجی خۆیان و لەسەر ئەو بنەمایە خەبات و تێکۆشان و شەڕیان کردووە، ئەو تەفکەرانە چەندە توانیویانە ئەو خراپی و خراپیانە نەهێڵن و لەناویبەن هێندە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا شوێنیان گرتووە، بەو رادەیەش مۆرکی خۆیان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە کاروانی مرۆڤایەتی داوە.

بۆ نموونە؛ با بڕوانین ئامانجی یەهودییەت، مەسیحییەت و ئیسلامییەت هەموویان ئەمە بووە، ئامانجی فەلسەفە هەر هەمان شت بووە، زانست هەمان ئامانجی هەبووە، تەنانەت فیودالیزم و کاپیتالیزم و سۆسیالیزم، هەر هەموویان بۆ ئەم مەبەستە دەرکەوتوون. ئەمڕۆ لە جیهاندا سەرجەم ئەو بزاڤانەی هیومانیزم و ژینگەپارێزی و ...هتد دەڵێن: " ئێمە دەخوازین مرۆڤایەتی لەخراپی رزگار بکەین". کەواتە مەعنەویات مرۆڤایەتی بەڕێوە دەبات و لەسەر پێیانی دەهێڵێتەوە، نەك ماددییەت.

ئیدی سەرۆك ئاپۆش هەر لەسەرەتای ئەم تەفکەرەدا مەعنەویاتی بەبنچینە وەرگرت، لەبەر ئەوەی مەعنەویاتی بەبنچینە وەرگرت و فەلسەفەی ئەو تەفکەرەی لەسەر ئەو

بنەمایە پێشخست، کێشە و گرفتی ماددیش چارەسەر کران، لەئاکامدا ماددییەت ئەو تەفگەرەی خراپ نەکرد، هەر کاتێك مەعنەویات لەتەڤگەریشدا لاواز بووبێت، واتا چالاکی ئایدیۆلۆژی لاواز بووە، ئەوا کولتوور و ئەخلاقیش لاوازبووە، گەماری و چەتەگەری و خراپی پێشکەوتووە. بۆیە کادیرانی ئەم تەڤگەرە پێویستە بەردەوام مەعنەویات بەبنەما وەربگرن، نەك ماددییەت. پێویستە بەدوای ماددییەتدا راگەراکە نەگەن، هەمیشە ماددییەت بە مەعنەویاتەوە پەیوەست بکەن، ئەوکاتە ماددییەت خزمەت دەکات و خراپەکاری لێناکەوێتەوە، چونکە ئەگەر تۆ ماددییەتت بەبنەما وەرگرت رۆژ بەرۆژ زیاتر پەیوەستی مادییەت دەبیت، هەر هێندە ماددییەتت بەبنەما وەرگرت ئیدی هەموو خراپییەك بەمرۆڤ دەکات و مرۆڤ لەمرۆڤایەتی دوور دەخاتەوە و دەیکات بە دووژمنی مرۆڤایەتی. ئەگەر تا ئەمڕۆ تەڤگەری (PKK) خاوێن و پاکژ ماوەتەوە و پەیوەستە بە ئامانجەکانی خۆیەوە و هێندەش لەنێو گەلدا شوێنی گرتووە، هۆکارەکەی ئەمەیە.

سەرەتا کێشەی ماددی زۆرجددیمان هەبوو، وەکو گووتم؛ ئەو هەڤالانەی لەگروپدا شوێنی خۆیان دەگرت هەموو کەسی هەژاربوون و توانستی خۆیان و خێزانەکانیان زێدە نەبوو، کەسێکیش توانستی بەئێمە نەدەدا، چونکە کەس ئێمەی نەدەناسی و هەروەها بە ئاسانیش باوەڕیان بە ئێمە نەدەکرد تاکو بڵێن:" مادام ئەوانە بۆ ئێمە کاردەکەن، با ئێمەش توانستێك بەوان بدەین" بۆیە ئێمە لەم رووەوە زۆر تەنگاسیمان کێشا. هەم خۆت بژێنی و خۆت موحتاجی کەسێك نەکەیت و خۆت خراپ و گەمار نەکەیت و هەمیش کاری شۆڕشگێڕی بکەیت، بێگومان ئەمە زۆر زەحمەت بوو، هەر لەسەرەتاوە ملیتانی ئەم تەڤگەرە وەها ژیا و شەڕی کرد و زۆری و زەحمەتی چارەسەر کرد و بەمشێوەیەش پێشکەوت. لەسەر هێزی خۆیی خۆی پێشکەوت و هیچ کاتێك خۆی موحتاجی کەسێکی دیکە نەکرد. لەبەر ئەوەی کێشە و گرفتی ماددی هەبوو خۆی نەفرۆشت و نەکەوتە خزمەتی کەسێکەوە، لەپێناو ماددییەتدا خۆی بەهەمندێك لایەن پەیوەست نەکرد، هەرچەندە کێشەی ماددی خۆیشی هەبووبێت، چارەسەرکردنی لەسەر هێزی خۆیی بەبنچینە وەرگرت. تەنانەت رۆژێکیش نەمانگووت:" کێشەی ماددیمان زۆرە، جا چۆن بژین و چۆن شۆڕشگێڕی بکەین، چۆن ببینە تەڤگەرێك؟ ئیدی

بەمشێوەیە نابێت" هەرگیز وەهامان نەگووت. بەڵكو گووتمان؛ كێشەیەكمان هەیە، پێویستە چارەسەری بكەین. ئێمە چۆن ئەو كێشەیە چارەسەر بكەین؟ ئێمە دەبێت بەهێزی خۆمان چارەسەری بكەین، ئێمە دەبێت خۆمان ماندوو بكەین تاكو ئیمكانییەت بۆ خۆمان دروست دەكەین، ئێمە دەبێت بەتەواوی لەسەر توانستی خۆمان بژین، دەبێت خۆمان موحتاجی كەسێكی دیكە نەكەین.

دەوڵەت دەیزانی كێشەی جددی ماددیمان هەیە؛ ئیدی ئەوكاتە پیلۆت (نەجاتی كایا)یان رۆڵگیر كرد و خستە دەورەوە، دەیانخواست لەرێی "پیلۆت"ەوە زەبر لە تەڤگەر بدەن و تەڤگەر بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، لەنێو تەڤگەریشدا زۆر كادیر تەسفیە بكەن. ئەگەر "پیلۆت"یان خستە ناو تەڤگەرەوە بۆ ئەو مەبەستە بوو. "پیلۆت" دەیبینی ئێمە چەندین رۆژ برسین و هیچمان نییە بیخۆین، دەیگووت:" وەرن با خواردنتان بۆ بكڕم، وەرن با بتانبەمە چێشتخانەوە" ئێمە پەسندمان نەدەكرد، دەمانگووت:" تۆ بۆچی ئێمە دەبەیتە چێشتخانە؟ ئەو پارەیەی دەیدەیتە چێشتخانە با بەخواردنی بدەین و لەماڵەوە خواردن دروست بكەین، هەم خاوێنترە و هەمیش هەرزانترە" ئەویش دەیگووت:" نا پێویست ناكات، جا خواردنێكتان لە چێشتخانە بدەمێ چییە، زۆرە؟ ئێوە لەبەرامبەر هەموو شتێكن" دەیخواست بەمشێوەیە كاریگەریمان لەسەر دروست بكات، دیسان كە دەیزانی كێشەیەكی ماددی جددیمان هەیە رۆژێك گووتی:" ئەو شوێنەی من ئیشی تێدا دەكەم، بیرۆیەكی فرۆكەوانی سڤیلە، پارەیەكی زۆر دێتە ئەوێ، ئێمە دەتوانین بەئاسانی دەستی بەسەردا بگرین، هیچ شەهیدێكیش نادەین، با ئەمە بكەین" ئەمەی بە من و هەڤاڵ "كەمال پیر" گووت. من و هەڤاڵ "كەمال پیر"یش گووتمان:" با بیكەین، مادام پارەیەكی ئەوەندە زۆرە، ئەگەر شەهیدیش بدەین با بیكەین، ئێمە دەچین حەماڵێتی دەكەین، كەچی هێشتا بەشمان ناكات، ئەگەر ئێمە ئەو پارەیە بە دەستبخەین هەم هەڤاڵاندان دەحەسێنەوە، هەمیش دەتوانین زیاتر كار بكەین، ئێمە ئیدی هەم حەماڵێتی ناكەین، هەمیش كاتی خۆمان بەتەواوی تەرخان دەكەین بۆ كار و خەباتی سیاسی و رێكخستنی، زۆر باشتر دەتوانین ئەنجام وەربگرین". ئیدی چووین بە سەرۆكمان گووت. سەرۆك گووتی:" با بمێنێت ئەمە مەكەن" ئێمە زۆر سەرمان سووڕما، گووتمان:" تۆ بڵێی سەرۆك بۆ وا دەڵێت؟!" سەرۆكیش دەزانێت رەوشی ماددیمان زۆر خراپە، هێندە

پاره، که دوازده ملیۆن پارەی تورکی بوو، پارەیەکی گەلێك زۆر بوو. به سەرۆکمان گووت:"ڕەوشمان لەپێش چاوانه، با ئەمه بکەین، ئەگەر شەهیدیش بدەین کێشه نییه، هەر هیچ نەبێت تەڤگەرەکەمان بەسەردەکەوێت" سەرۆك گووتی:" نا" ناچاربووین لەلای سەرۆك دەرچووین، پاشان لەنێوان خۆمان گفتوگۆمان کرد و گووتمان:" کەواته سەرۆك شتێك دەزانێت، بۆیه ئەمه پەسند ناکات، ئەگەرنا بۆچی پەسندی ناکات؟!" بەڵام ئێمه هەرگیز حیسابی ئەوەمان نەدەکرد که "پیلۆت" سیخوڕ بێت، بۆیه سەرۆك پەسندی ناکات. پاشان جارێکی دیکه چووینەوه لای سەرۆك و پێمانگووتەوه، دیسان پەسندی نەکردەوه. کاتێك پەسندی نەکردەوه گووتمان:" ئیدی پێویست ناکات ئەوەنده پێداگری بکەین". بۆیه وازمان لێیهێنا. پاشان بەدیارکەوت که "پیلۆت" دەیەوێت رامانکێشێته ناو ئەو چالاکییەوه و لەو چالاکییەدا هەمووومان تەسفیه بکات. ئەگەر توانی کادیری باشی تەڤگەرەکه تەسفیه بکات، ئەوکاته دەتوانێت تەڤگەرەکەش بەتەواوی بخاته ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوه و پاشان دەوڵەتیشەوه. واتا بەپاره تەڤگەرەکه بکڕێت، لەلایەکەوه تەڤگەرەکه بەپاره بکڕێت و لەلایەکی تریشەوه کادیرەکان لەو چالاکییەدا تەسفیه بکات. بەمەش تەڤگەرەکه بخاته ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتەوه. ئەرکی ئەو ئەمه بوو. سەرۆکیش لەو کەوتۆته گومانەوه، ناتوانێت به ئێمەش بڵێت، دەڵێت:" ئەگەر بەوان بڵێم ئەوانیش بەهەندێك هەڤاڵانی دیکەش دەڵێن، ئەو کاته مەترسیدار دەبێت..." بۆیه بەئێمه ناڵێت، "پیلۆت"یش وا بیردەکاتەوه که ئەگەر بڵێت:" پارەیەکی هێنده مەزنه" ئێمەش دەڵێین:"با بیکەین" لەمه سوود وەردەگرێت و زەبرێکمان لێدەوەشێنێت. چونکه بەڕاستی زۆر له هەڤاڵان بەنۆره حەماڵیمان دەکرد، ئەگەر وا نەبایه نەماندەتوانی بگوزەرێین، ئێمه حەماڵیشمان دەکرد کەچی زۆر بەزەحمەتی دەمانتوانی بگوزەرێنین.

بەبیرم دێتەوه؛ هەتا شەڕی "حیلوان"ی ساڵی (١٩٧٨)، بەبیرم نایەت رۆژێك هەڤاڵان تێر نانیان خواردبێت، ئەمه ڕاستییەکه. ئەم تەڤگەرەمان لەنێو زۆری و زەحمەتییەکی مەزندا پێشخست. بەبیرم دێتەوه؛ هەموو هەڤاڵان حەماڵێتیان کرد و لەخواردنی خۆیان بڕی و خۆیان بەبرسێتی هێشتەوه بۆ ئەوەی پاره کۆبکەینەوه تاکو چەکێك بکڕین. یەکەمین چەکی ئەم تەڤگەره بەمشێوەیه کڕدرا. دیسانیش پارەکەمان بەشی کڕینی

چەكێكی نەكرد، بە قەرز كرپمان، كاتێك ئەو چەكەمان كڕی گووتمان:" ئیدی بووینە خاوەن چەكێك، ئیدی دەتوانین شت بكەین" واتا لە بێ توانستیدا چۆن توانست دروست بكەین؟ ئەوەمان بۆ خۆمان بەبنەما وەرگرت، ئێمە نەمانگووت:" مادام توانستمان نییە، ئیدی نابێت" و دەستبەرداری خەبات نەبووین. ئێمە نەمانگووت:" توانستمان نییە با بچین هەندێك توانست لەهەندێك كەس بخوازین، تاكو توانست بەئێمە بدەن" ئێمە ئەوەمان بەبنەما وەرنەگرت، بەڵكو بەتەواوی لەسەر توانستی خۆمان خەباتمان كرد و رابووین، ئەوەمان بەبنچینە وەرگرت. ئیدی ئەمە ئەو تەفگەرەی پێشخست و ژیاندی...

**لەو قۆناخەدا؛ گروپ هێدی هێدی ئاوا دەبێت و مەزن دەبێت، زۆر كەس بەتایبەتی گەنج تەڤلی گروپ دەبن، ئەو كەس و گەنجانە چۆن پەروەردە دەكرێن و چۆن ئامادە دەكرێن بۆ خەبات؟ ئەو كاتە پەروەردە چۆن بوو و بۆ ئێوە بە چ واتایەك دەهات؟ رۆڵی پەروەردە لە پێشخستنی گروپدا چیبوو؟ هەڤاڵان چۆن نزیكی پەروەردە دەبوونەوە؟ سەرۆك چۆن نزیكی پەروەردە دەبۆوە؟ هەروەها ئەو سەرچاوانەی بۆ پەروەردەكردن بەكارتان دەهێنا چیبوون؟**

لە (PKK)دا پەروەردە ئەركێكی بنچینەییە، ئەوەی راست لەو ئەركە نزیك نەبێتەوە، هیچ كاتێك راست لە ئەركەكانی دیكەیشی نزیك نابێتەوە، ئەوەی لەم ئەركەدا قووڵنەبێتەوە و ئەنجام وەرنەگرێت، ئەوا لە ئەركەكانی دیكەشدا ناتوانێت ئەنجام بەدەستبخات. هەموو ئەركەكان پەیوەستن بە ئەركی پەروەردەوە، وەك پێشینانمان دەڵێن:"چ بچێنیت ئەوە دەدووریتەوە" ئەگەر تۆ شتێكت نەچاند تۆ ناتوانی شتێكیش بدووریتەوە، یان تۆ چیت چاندووە لەوە زیاتر ناتوانیت شتی دیكە بچنیتەوە، ئەمە راستە. بۆ شۆڕشگێڕیش ئەگەر تۆ كەسانی خۆت پەروەردە كرد، تۆ كەسانی خۆت كردە هێزی چارەسەری، ئەوا تۆ دەتوانیت بەم كەسە ئەنجامگیر ببیت. هەموو خراپییەكان

لەنەزانینییەوە دەردەکەوێت، مرۆڤی نەزان خراپی دەکات. ئەگەر تۆ ناخوازیت کەسانی تۆ خراپی بکەن، تۆ ئەو کەسانە پەروەردە بکە و بیانکە بەهێزی چارەسەری. ئەو کاتە ئەو کەسانە خراپی ناکەن، ئەو کاتە ئەو کەسانە خزمەتێکی باشی گەلی خۆیان دەکەن. ئەگەر لەنێو (PKK)دا بۆ هەموو شتێك لێبووردن هەبێت، ئەوا بۆ خۆ پەروەردە نەکردن لێبوردن نییە. چونکە خۆ پەروەردە نەکردن پەسندکردنی ئەو کەسێتییەیە کە دووژمن و داگیرکەران دروستیان کردووە، ژیاندنی ئەو کەسێتییەی دووژمنە لەنێو تەڤگەردا. بۆیە لێبووردنی بۆ نییە و تاوانێکی مەزنە. چونکە داگیرکەر هیچ کاتێك ناخوازێت مرۆڤی کورد پەروەردە ببێت و هوشیار ببێتەوە، زانابێت و ببێتە هێزی چارەسەری، بۆ ئەوەی بتوانێت داگیرکەرێتی خۆی بەئاسانی بەڕێوە ببات. ئەگەر (PKK) دەخوازێت داگیرکەری لە کوردستاندا نەهێڵێت ڕێی ئەمە بە کوێدا تێدەپەڕێت؟ تۆ بتوانیت مرۆڤی خۆت پەروەردە بکەیت و بیکەیتە هێزی چارەسەری. ئەگەر تۆ ئەمەت کرد، ئەوا دەتوانیت لە هەموو ڕوویێکەوە لە داگیرکەری تێبگەیت و لەدژی ڕابوەستیت و خەبات و تێکۆشان بکەیت و ئەنجام وەربگریت. بەشێوەیەکی دیکە ئەمە ناکرێت و نابێت. بەو کەسێتی و کۆمەڵگایەی داگیرکەران دروستیان کردووە تۆ ناتوانیت دژی داگیرکەران ڕابوەستیت، بەمە دژیشی ڕابوەستیت تۆ ناتوانیت ئەنجامگیر ببیت. پاشان ئەوەی بەمشێوەیە سەرهەڵبدات، دیسان دەچێتەوە باوەشی داگیرکەران و لەگەڵ داگیرکەران دەبێتەوە یەك. ئەگەر کەسانێك خیانەت دەکەن لەبەر ئەم هۆیەیە دەکەونە خیانەتەوە، کە دەچن لەگەڵ دووژمن دەبنە یەك لەبەر ئەم هۆیەیە. مرۆڤێك کە لەهەموو ڕوویێکەوە خۆی لە داگیرکەران دابڕاندبێت، هیچ کاتێك ناچێت لەگەڵ داگیرکەران ببێتە یەك. کەسێك بۆ ئەوەی لەگەڵ داگیرکەران نەبێتە یەك خزمەتی ئەو ناکات و لەدژی ڕادەوەستێت و هیچ کاتێك چاوی لەوە نەبێت، پێویستە چیبکات؟ دەبێت ئەو کەسێتییەی داگیرکەران دروستیان کردووە، ئەو کۆمەڵگایەی داگیرکەران فۆرمیلە (شێوە)یان پێداوە تێکیبدات، لەسەر ئەو بنەمایەش کەسێتی و کۆمەڵگای نوێ بنیاد بنێتەوە، ئەوەش بە پەروەردە دێتەدی. بەشداری نەکردن لەپەروەردە پێداگریکردنە لەسەر مانەوەی کەسێتی کۆن، پێداگرییە لەسەر داگیرکەری، پێداگرییە لەسەر

کۆیلایەتی. دەرکەوتن لە کۆیلایەتی و لەژێر داگیرکەری و هەنگاونان بۆ ئازادی تەنیا لەرێی پەروەردەوە دێتەدی. بۆیە پەروەردە زۆر گرنگە.

هەر لەسەرەتاوە؛ ئەم تەڤگەرە پەروەردەی وەك ئەرکێکی بنچینەیی دیاریکرد، خواستی بە پەروەردە ئەو کەسێتییەی داگیرکەران بنیادیان ناوە تێك بدات و لەشوێنیدا کەسێتییەکی نوێ بنیاد بنێتەوە، ئیرادەیەکی نوێ و ئازاد، کەسێتییەکی ئازاد بنیاد بنێت. ئەمەش لە فیکر و رامانەوە دەستپێدەکات. پێویستە دەستپێك لە فیکر و رامانی ئازادی بئافرێنیت، بۆ ئەوەی بتوانیت کەسێکی ئازاد، ئیرادەیەکی ئازاد، لەسەر ئەو بنەمایەش کۆمەڵگایەکی ئازاد بئافرێنیت و ئازادی بهێنیتەدی.

ئیدی (PKK) لە پەروەردەدا ئەمەی بەبنچینە وەرگرت. پەروەردەی خستە پێش هەموو ئەرکەکانی دیکەوە، هەموو ئەرکەکانی دیکەی پەیوەست بەم ئەرکەوە بەڕێوە برد. چەندە لەم ئەرکەدا ئەنجامگیر بوو، هێندەیش لەئەرکەکانی دیکەدا ئەنجامگیر بوو. (PKK) سەرەتا پەروەردەی لەماڵان دەستپێکرد. ئەو ماڵانەی بەکرێمان گرتبوو و تێیدا دەماینەوە و تێیدا دەمانخوێند، لەو ماڵانەدا دەستمان بەپەروەردە کرد، ئەو ماڵانەمان کردە خوێندنگایەك. ئێمە نەمانگووت:" با لەو ماڵانەدا بەحەساوەیی بژین" بەڵکو گووتمان:" ئێمە پێویستە لەو ماڵانەدا پەروەردە بۆ گەلەکەمان بکەین" ئیدی ئەو ماڵانەمان وەك خوێندنگایەك بەکارهێنا. هەقی ئەو ماڵانەمان بەتەواوی دەدا، هیچ کاتێك لەو ماڵانەدا ژیانێکی شەخسی نەژیاین، نەشمانهێشت کەس بۆ شەخسی خۆی تێیدا بژێت، نەمانهێشت کەس ژیانێکی حەساوەی تێدا بژێت، گووتمان:" لەو ماڵانەدا هەر کەسێك تێیدا بژێت و بێتە ئەو ماڵانەوە پێویستە بۆ گەلی خۆی بژێت، بۆ ئازادی بژێت". بۆیەش لەو ماڵانەدا بەرنامەیەکی پەروەردەمان پێشخست، لەسەر ئەو بەرنامەیە هەموو هەڤاڵانی خۆمانمان پەروەردە کرد.

بێگومان بۆ ئەوەی دووژمن هەست بەمە نەکات، زۆر دیقەتمان دەکرد و تەدبیریشمان وەردەگرت. چونکە زۆر لە هەڤاڵان دەهاتن و دەچوون و دەمانەوە و پەروەردەیان دەبینی و گفتوگۆیان دەکرد. هەڵبەتە ماڵێك هێندە گەنج بێن و بچن سەرنج رادەکێشێت. بۆیە دیقەتی تەواویشمان دەکرد، لەو ماڵانەدا هەموو هەڤاڵادمان پەروەردە دەکرد، لەوانەیە ئەوە بۆ ئێمە سەختیش بووبێت. بۆ نموونە؛ ئەگەر جێیەکی گراوە و

ئاشكرا و یاسایی هەبایە، دەتتوانی لەوێ هەم زۆر كەس كۆبكەیتەوە، هەمیش پەروەردەیان بكەیت، بەڵام ئێمە نە توانستێكی وەهامان هەبوو تا شوێنێكی بەمشێوەیە بگرین، نە لەرەوشێكی بەمجۆرەشدا بووین، ئێمە دەمانزانی ئەگەر ئێمە بەمشێوەیە بكەین، دەوڵەتیش زۆر پیاوی خۆی تێدەخزێنێت. چونكە تەڤگەری چەپی تورك، گروپە كوردییەكان، هەموو بەو شێوەیە كاریان كردبوو، بۆیە كەوتبوونە ژێر كۆنترۆڵی دەوڵەتەوە. پێویستبوو ئێمە نەكەوینە ژێر كۆنترۆڵەوە، هەر هیچ نەبێت لەدەستپێكەوە، پێویستە كادیرێكی ساخلەم و تۆكمە ئاوا بكەین، كە ئەگەر پاشان دەوڵەت سیخوڕی خۆیشی تێوەخزاند نەتوانن بمانخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، بۆیە پەروەردەكردنمان لەماڵان بۆ خۆمان بەبنچینە وەرگرت، ئەمە لەهەموو روویێكەوە زۆر زەحمەت و دژواربوو، كە هەم دەوڵەت هەستی پێنەكات، هەمیش پەروەردەكردن لەماڵان ژمارەیەكی كەم كەم پەروەردە دەكەیت، تۆ كە كەم كەم پەروەردە دەكەیت زۆر كاتی تۆیشی دەخوارد، زۆر ماندوویشی دەكردی، بەڵام ئەمە رێگەی هەرە راست بوو. تەنیا بەمشێوەیە دەتوانی بەگوێرەی ئامانجی تەڤگەر كادیر پەروەردە بكەیت و راست پێشیبخەیت و كۆنترۆڵی دووژمنیشی بەسەرەوە نەبێت. ئەگەر ئێمە ئەو شێوازەمان بەبنچینە وەرگرت ئەوا لەبەر ئەم هۆیە بوو. ئەم شێوازە ئەنجامی خۆیشی هەبوو، واتا هەم كادیربوونی ئێمە ساخلەم دروست بوو، هەمیش یەكێتی كادیر و یەكێتی تەڤگەر بنیادنرا، هەمیش دووژمن زێدە هەستی پێنەدەكرد و كۆنترۆڵی دووژمنیش لەسەرمان دروست نەدەبوو. بۆیە تەڤگەر بەمشێوەیە لەسەر بناخەیەكی پتەو و تۆكمە ئاوا بوو، كادیری خۆی بنیادنا و لەسەر بنەمای ئەو كادیرانەش هەنگاوی هاوێشت، هەروەها زێدە زەبریشی بەرنەكەوت و بەرەو هەڵدێر نەچوو و نەكەوتە ژێر كۆنترۆڵی دەوڵەتەوە.

بێگومان هەر هەڤاڵێك پەروەردەی شەخسی خۆیشی دەكرد، هەروەها وەك گروپ بەرنامەی گروپ هەبوو، پەروەردەی بەكۆمەڵ (بەیەكەوە)یان دەبینی. سەرۆكیش پەروەردەی خۆی هەبوو، هەڵبەتە بەردەوام خۆی پەروەردە دەكرد. لەخۆپەروەردە كردنیشدا ئەو دەرئەنجامانەی بەدەستیدەخست دەیدایە هەڤاڵان. بۆ نموونە؛ هەڤاڵانی كۆدەكردەوە و لەگەڵیاندا دەئاخفت و گفتوگۆی دەكرد، هەم شتێكی بیخواستبایە دەیدایە هەڤاڵان، هەمیش شتێكی كەوا لەوانەدا راستیبكردبایەوە راستی دەكردەوە و

دەیخستەڕوو. ئیدی پەروەردەی ئێمە لەو ماڵانەدا بەمشێوەیە پێشکەوت. ئەو ماڵانە هەر یەکەی بووە ئەکادیمیا و خوێندنگایەك، ڕۆڵێکی مەزنی وەهای بینی. ئیدی ئەمە بووە چەمکێك لەنێو ئەم تەڤگەرەدا، ئێمە لەکوێدا شوێن و ئیمکانییەتێکمان هەبووبێت و دەرفەتێکمان بەدەستکەوتبێت ئەو شوێن و توانست و دەرفەتەمان بۆ پەروەردە بەکارهێناوە. ئێمە وەها نزیکبووینەوە. ئەم چەمکەمان لێرەوە وەرگرت. سەرۆك بناخەی ئەو چەمکەی لێرەوە دەستپێکرد و پێشیخست، هەمیشە ماڵەکانی ئێمە لەهەر کوێیەك بووبێت بوونەتە خوێندنگا و شوێنی پەروەردە، شوێنی پەروەردەکردنی کادیر و پێشخستنی کادیر. ئێمە بەخوێندنەوەی پەرتووك، بە گفتوگۆ، چ بەتەنیا و چ بە گروپ گروپ پەروەردەمان پێشخست. یەکێتی کادیران و یەکێتی تەڤگەریش بەساخڵەمی ئاوابوو و لەسەر ئەو بنەمایەش هەر دەهات بەپەروەردە خۆی قووڵتر دەکردەوە و هەنگاوی تۆکمەتری دەهاوێشت و مەزنتری دەکرد و تا ڕۆژی ئەمڕۆش هەر بەردەوامە.

## هێشتا گروپ نەبۆتە پارتییەك و هەڤالانیش هەموویان بەیەکەوە دەژین و خەبات دەکەن، ئەو کێشە و ناکۆکییانەی ئەو کاتە لەنێوان هەڤالاندا دەردەکەوتن چیبوون و چۆن چارەسەر دەکران؟

کێشەکانی ئەو کاتە زێدەتر کێشەی نێو ژیان بوون، واتا کێشەی ئایدیۆلۆژی، ڕێکخستنی و پراکتیکی زێدە نەبوو. چونکە تەڤگەر لەرووی ئایدیۆلۆژی، ڕێکخستنی و پراکتیکدا زۆر بەهێز نەببوو، کادیریش خۆی بەهێز نەببوو، تا کێشەی ئایدیۆلۆژی و ڕێکخستنی دەربکەون. ئەگەر کێشەش هەبووایە کێشەی پەروەردە بوون، ئەم کێشەیە چۆن چارەسەر بکەین؟ چۆن خۆمان پێشبخەین و هەڤالان پێشبخەین، ئەو کێشەیەشمان بەو پەروەردەیەی کە لەماڵان پێشماندەخست چارەسەرمان دەکرد.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ کێشە و گرفتی نێو ژیان دەردەکەوتن. چونکە توانستی مادییمان کەم بوو، زۆر جار نەماندەتوانی پێداویستییەکانمان دابین بکەین. بۆ نموونە؛

دەمانخواست پەروەردە بکەین، پەرتووك پێویستبوو، توانستمان نەبوو پەرتووك بەدەستبخەین. ئەم کێشەیە چۆن چارەسەر بکەین. زێدەتر لەسەر ئەو مەسەلانە گفتوگۆ دەکران یاخود کێشە دەردەکەوت. وەکو گووتم؛ لەبەر ئەوەی کولتوور و ئەخلاقێکمان بۆ خۆمان بەبنچینە وەرگرتبوو، لەمەشدا گوێڕایەڵی یەکتری، ڕێز و حورمەت، بەیەکتر باوەڕکردن، بەهادان بەیەکتری بنەما بوون بۆمان، کێشە و گرفتێکی وەها جددی کە بەخۆیەوە خەریکمان بکات یان ورە و مۆڕاڵ و باوەڕی هەڤاڵان دابەزێنێت و بشکێنێت نەبوو. چونکە هەموو کێشەکانمان بەئاخافتن و گفتوگۆ بەئاسانی چارەسەر دەکرد. ئەگەر کێشەیەك دەربکەوتبایە، بەیەکەوە دادەنیشتین و گفتوگۆمان دەکرد، کێ کەوتۆتە کێماسییەوە و هەڵەی کێ هەیە ڕەخنەمان دەکرد و ئەویش پەسندی دەکرد و کۆتایی پێدەهات. واتا کێشەکان زۆر درێژەی نەدەکێشا و پێداگری زۆر نەدەکرا، کەسی وەها لەسەر کەموکوڕی و هەڵە پێداگری نەدەکرد، ئەگەر یەکێك هەڵەیەکی بکردبایە، خۆی دەیگووت:"ئەو هەڵەیەم کردووە"

## چۆن؟

بۆ نموونە؛ ئێمە هەموومان بەنۆرە دەچووین حەماڵێتیمان دەکرد و کارمان دەکرد. ڕۆژێکیان نۆرەی هەڤاڵ **"حەقی قەرار"** بوو، نۆرەی هەڤاڵێکی تریش بەناوی **"یلماز"** بوو. ئەو هەڤاڵە تازە تەڤلی ئێمە ببوو، هەردووکیان پێکەوە چووبوونە حەماڵێتی. کاتێك لەکار دەگەڕێنەوە ئەو هەڤاڵە نوێیە بەهەڤاڵ **"حەقی قەرار"** دەڵێت:" با دۆندرمەیەك بخۆین" زێدە ڕەوشی بێ توانستی ئێمەش نازانێت. هەڵبەتە هەڤاڵ **"حەقی"**یش بیردەکاتەوە، ئەگەر ئەمە ڕەتبکاتەوە، **"یلماز"** هەڤاڵێکی نوێیە و کار و حەماڵێتی دەکات دڵی چۆتە دۆندرمەیەکەوە، دڵی بشکێنێت باش نییە، بەڵام ئەگەر دۆندرمەیش بکڕن ئەوا بەو پارەییەی کە دەمێنێتەوە دەبێت خواردن بۆ ئێوارە بکڕێت کەم دەبێت و بەشناکات، هەڤاڵانمان هەموو چاوەڕێی ئەو پارەیەن خواردنی پێبکڕن. حیسابی ئەمەش دەکات، لەئاکامدا هەڤاڵ **"حەقی"** دەڵێت:" با بیکڕین" دۆندرمەکە دەکڕن، پاشان بەو هەڤاڵەش دەڵێت:" هەڤاڵ بڕوانە، ئێمە کە هاتووین کار دەکەین بۆ

هەڤاڵان کار دەکەین، ئێستا ئەوان چاوەڕێی ئێمەن، ئەگەر ئێمە ئەو پارەیە نەبەینەوە ماڵ ئەوا برسی دەمێننەوە، خۆ ئەگەر پارەش نەبەین هەڤاڵان هەر هیچ ناڵێن. ئەگەر بشڵێین دۆندرمەمان خواردووە، یان پارە کەم بوو هەر هیچ ناڵێن" بەس ئەخلاقێکی ئێمە هەیە، هەڤاڵ لەماڵ برسین و ئێمەش لێرە دۆندرمە بخۆین باش نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ هەڤاڵێکی نوێیت دڵم نەشکاندی، بۆیە ئێمە کە گەڕاینەوە بەهەڤاڵان دەڵێین:" ئەمڕۆ ئێمە پارەی کارەکەمان وەرنەگرت، سبەی بەو پارەیەی کە نانی پێدەخۆین نان ناخۆین، دەیخەینە شوێنی پارەی دۆندرمەکە و دەیدەینە هەڤاڵان، بە هەڤاڵانیش مەڵێ" ئەو هەڤاڵەش دەڵێت:" منیش ئەمەم نەزانی"، ئێوارە کە گەڕانەوە، بینیمان پارەیان نەهێناوەتەوە، ئێمەش گووتمان:" کێشەیەك نییە" ڕۆژی دواتر پارەیان هێنا. دوای ساڵێك ئەو هەڤاڵە ئەو مەسەلەیەی بەئێمە گووت. گووتمان:" شتێك نابێت، ئەو کاتەش دەتانتوانی ئەو مەسەلەیە بەئێمە بڵێن، دۆندرمەیەکتان خواردووە کەی کێشەیەکە؟ ئێوە کار دەکەن..."

دەتوانم بڵێم؛ کولتوور و ئەخلاقی ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە بوو، بەهەر هەڤاڵێکت بگووتبایە ئەم کەموکوڕی و هەڵەیەت هەیە ڕەتینەدەکردەوە و دەیگووت:" ڕاستە" و ڕەخنەدانی خۆی دەدا، کۆتایی پێدەهات. بۆیە لەنێو هەڤاڵاندا کێشەیەك نەدەهاتە ئاراوە، چونکە هەڤاڵێتییەکی تۆکمە هەبوو، باوەڕ بەیەکتری هەبوو، ڕێز لەیەکتری گرتن هەبوو. ئەگەر کولتوور و ئەخلاقییەتێك هەبێت کێشە و گرفت دەرناکەوێت، ئەگەر هەشبێت چارەسەر دەبێت و خراپەکاری لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت. کێشەکانی ئێمە زێدەتر بەمشێوەیە دەردەکەوتن. واتا زەحمەتییەکانی ژیان هەبوو، لەمەدا کێشەیەك دەرکەوتن، وەکوتر زێدە کێشەیەك لەئارادا نەبوو.

بۆ نموونە؛ پەرتووکمان پێویستبوو، زیاتریش بۆ سەرۆك پێویستمان پێی هەبوو. چونکە شەو و ڕۆژ لێکۆڵینەوەی دەکرد، پارەمان نەبوو پەرتووك بکڕین، دەچووینە پەرتووکخانەکان دانەیەکمان بەپارە دەکڕی و دوو ـ سێیەکیشمان دەدزی. ناچار بووین بەمشێوەیە پێداویستی خۆمان دابین بکەین. چونکە وەکوتر توانستمان نەبوو ئەم هەموو پەرتووکانە بکڕین. تەنانەت ڕۆژێکیان سەرۆك زۆر نەخۆش کەوت، من ترسام لەوەی بمرێت، تا ئەو ڕادەیە نەخۆش کەوتبوو، پێویستبوو بۆ لای دکتۆرمان ببردبایە،

پارەمان نەبوو بۆ لای دکتۆری ببەین، من چوومە زانکۆ گووتم:" بەڵکو بتوانم لەهاوڕێیانی زانکۆم هەندێك پارە وەربگرم، چووم چەندێکیانم بینی، بڕێك پارەم لێوەرگرتن، بەڵام دیسان بەشی چوونە لای دکتۆری نەدەکرد. چیبکەم؟ هەم بە بەرچاومان سەرۆك گران نەخۆش کەوتووە، هەمیش پارە نییە بیبەینە لای دکتۆر، ئیدی شتێك نەبوو بتوانین بیکەین، پاشان سەرۆك دوو ـ سێ ڕۆژ وەها بەگرانی نەخۆش کەوت، پاشان هێدی هێدی چاکبووەوە.

بۆ نموونە؛ جارێکیان سەرۆك لەگەڵ هەڤاڵێك دەبووایە بچووبایە ئەستەنبۆڵ بۆ کارێکی ڕێکخستنی، هەرچی پارەی هەمانبوو دامانێ. لەدەستماندا هیچ پارە نەما، گووتمان:" با بچینە خوێندنگا بگەڕێین لەوانەیە ئەو هەڤاڵانەی لە چەپی تورك دەیانناسین هەبن هەندێك پارەیان لێوەربگرین. واتا کێشەکانی ئێمە بەمشێوەیە بوون. تەنانەت ڕۆژێکیان من و هەڤاڵ فوئاد (علی حەیدەر قەیتان) لەماڵەوە بووین، کەدەی ئەو هەڤاڵە نەخۆشی "گاسترید"ی هەبوو، زۆر ئازاری هەبوو، برسیش بوو، پێم گووت:" وا دەچمە نانەواخانە و نان دێنم و دێمەوە" هەڤاڵ "فوئاد" گووتی:" چۆن دەچیت نە پارە هەیە نە هیچ؟" گووتم:" دەڵێم پێنج لیرەیم پێیە، وردەم لەلا نییە، نانم بدەرێ پاشان پارەکەیت بۆ دێنم" گووتی:" ئەگەر گووتی بێنە بۆت ورد دەکەمەوە، تۆ چی دەڵێیت؟" منیش گووتم:"دەست دەخەمە گیرفانم و دەڵێم وەڵڵا لەماڵەوە لەیادم کردووە" گووتی:" شەرمە وا مەکە" گووتم:" هیچ نابێت" ئیدی چووم و وامگووت، ئەو جوامێرەش نانی دامێ. بەمشێوەیە ئەوەشمان تێپەڕاند. واتا ئەو کێشانەی ئێمە تێیدا دەژیاین وەهابوون، بەڵام ئەو کێشانە لەنێو هەڤاڵاندا بێ حورمەتی دروست نەدەکرد، خراپەکاری لێنەدەکەوتەوە. چونکە کولتوور و ئەخلاقی ئێمە ڕێگەی ئەمەی نەدەدا، لەبەر ئەوەی هەڤاڵێتی و باوەڕییەکی تۆکمە لەنێوانماندا هەبوو، هەر کێشەیەك دەربکەوتبایە بەئاسانی چارەسەرمان دەکرد.

## لە جڤینی کەناری چووبووك بەدواوە دەوڵەت تا چ ئاستێك ئاگاداری هەبوونی گروپێکی بەمشێوەیە بوو کە گروپێکی گەنج هەن و

**لەجموجۆڵ دان؟ ئەگەر بەم گروپەی دەزانی تا چەند زانیاری تەواوی هەبوو؟**

دەوڵەت تا ساڵی (١٩٧٥) دەرهەق بە گروپەکە زێدە زانیاری نەبوو، چونکە بەناوی گروپەکەوە نووسین و شتی تر لەئارادا نەبوو، دوای (١٩٧٥) بە تەفلیبوونی "پیلۆت" دەوڵەت هەستی پێکرد کە شتێك هەیە. چونکە "پیلۆت" بەردەوام زانیاری بە دەوڵەت دەدا، ئیدی وەکوتریش تەفگەرەکە خۆی گەیاندبووە ئاستی گروپێك، لێرە و لەوێ سیمیناری سازدەدا، کۆبوونەوەی ئەنجام دەدا، ئاخافتن و گفتوگۆی دەکرد. لەدەرەوەی ئێمە گروپەکانی دیکە دەیانگووت:" ئاپۆچی پەیدابوونە" سەبارەت بەئێمە قسە و باسیان دەکرد، ئیدی دەوڵەت بەمشێوەیە هەستی پێکرد، بەڵام دەوڵەت هیچ کاتێك سەبارەت بەئێمە زانیاری راستی بەچنگ نەکەوتبوو و لەراستینەی ئێمەش تێنەگەیشتبوو. واتا ئێمەشی وەکو هەر گروپێکی دیکەی چەپی تورك و گروپە کوردییەکانی تر دەبینی، لەوانەیە هەندێك تایبەتمەندی ئێمە هەبن، بەڵام لەبنچینەدا هەروەکو ئەوانی تری لەقەڵەمدەداین و پێی وابوو کە ئێمەش گروپێکین وەك هەر گروپێکی دیکە. بۆچی؟ چونکە سەرۆك بەمشێوەیە زانیاری دەدایە"پیلۆت"، "پیلۆت"یش ئەو زانیارییانەی سەرۆك پێیدەدا دەچوو دەیدا بە دەوڵەت. بۆ نموونە؛ سەرۆك دەیگووت:" ئێمەش هەر لە ئەنقەرە کار دەکەین، وەك هەر تەفگەرێکی دیکە، ئێمە لەبەر ئەوەی توانستمان نییە بۆیە کۆمەڵەیەك بۆ خۆمان ناکەینەوە و رۆژنامەیەك بۆ خۆمان دەرناخەین، ئەگەر ئێمە توانستمان هەبووایە ئەوا ئێمەش وەکو ئەوان کاردەکەین". کاتێك کە سەرۆك وەها قسەی دەکرد، "پیلۆت" دەیگووت:" مادام وایە من ئەو توانستە پەیدا دەکەم". سەرۆك زانیارییەکی وەهای بە "پیلۆت" نەدەدا کە تێبگات ئێمە جیاواز لەوانی دیکە بەنیازین خۆمان بکەینە رێکخستن و دەچینە کوردستان و لەوێ دەست بە کار و تێکۆشان دەکەین... هیچ کاتێك نەیدەهێشت ئەو شتانە بزانێت. ئەو زانیارییەی دەیدا ئەوە بوو کە؛ ئەو تەفگەرانە هەندێك کەموکورییان هەیە، ئێمەش دەخوازین کێماسی ئەو تەفگەرانە نەهێڵین و لەگەڵ ئەو

تەڤگەرانە بەیەکەوە کار دەکەین، سەرۆك وەهای دیاردەکرد و وەهای تێدەگەیاند، بۆیە "پیلۆت"یش تێڕوانینی خۆی بۆ دەوڵەت دەگووت، دەوڵەتیش کە لەراپۆرتەکانی ئەوی دەڕوانی وا تێدەگەیشت کەوا ئەو تەڤگەرە تەڤگەرێکی مەترسیدار نییە.

بۆ نموونە؛ **فاتمە (کەسیرە یلدرم)** لەنێو ئەو تەڤگەرە شوێنی خۆی گرت. باوکی **"فاتمە"** سیخوڕێکی مەزن بوو، دەوڵەتیش بەوە باوەڕی دەکرد. "**پیلۆت**"یش هەبوو، **"فاتمە"**ش هەبوو، خانەوادەی **"فاتمە"** سیخوڕێکی مەزنی دەوڵەتن و خۆیشی بۆ دەوڵەت سەلماندووە، **"فاتمە"**ش کچێکی ئەو خانەوادەیەیە، ئەویش چۆتە ناو تەڤگەرەکەوە، پاشان لەگەڵ سەرۆك زەواجێکیشی کرد. بۆیە دەوڵەت وامەزندەی دەکرد کە ئەم تەڤگەرە زۆر مەترسیدار نییە و دەتوانێت بیخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە، دەوڵەت کەوتە نێو مەزندەیەکی بەمشێوەیەوە.

## واتا هەڵوێستێکی بەرچاوی دەوڵەت لەو کاتەدا لەهەمبەر گروپەکە نەبوو...

بێگومان نەبوو، چونکە سەرۆکیش ئەمەی دیقەت دەکرد. واتا لەرووی فەرمییەتەوە هیچ شتێکی بەدەستەوە نەدەدا. چونکە ئێمە نە رۆژنامەمان دەردەخست و نە کۆمەڵەمان کردبووەوە، ئێمە هەموو پڕوپاگەندەی خۆمان بەدەم (زارەکی) ئەنجام دەدا. هیچ بەڵگەیەك بەدەست دەوڵەتەوە نەبوو تاکو بتوانێت ئێمە لەرێیەوە شیبکاتەوە و لێمان تێبگات، هەندێك زانیاری بەدەست گەیشتبوو و بەگوێرەی ئەو زانیارییانەش زێدە جودایی ئێمە و تەڤگەرەکانی دیکە نابینێت، بۆیە دەوڵەت لەو قۆناخەدا ئێمەی بەخەتەرناك نەدەبینی...

## تا چ کاتێك ئەمە هەر وا بەردەوام بوو...؟



رێبەر ئۆجەلان لەکاتی پێشکەشکردن و تۆمارکردنی شیکردنەوەکانی

تا سەرۆك لەکۆتایی ساڵی (١٩٧٦) لە ئەنقەرە کۆبوونەوەیەکی لەهۆڵی "ژووری بیناسازان" کرد. ئیدی لەو سیمینار و کۆبوونەوەیەدا سەرۆك ئەو ئەنجامانەی لەمیانەی لێکۆڵینەوەکەیدا بەدەستیخستبوو، بۆ دەرەوەی ئێمە باسی لێوەکرد، یەکسەر دوای ئەو سیمینارە سەرۆك لە ئەنقەرە نەمایەوە و هاتە کوردستان، لە شاری ئاگرییەوە دەستیپێکرد تا عەنتاب، سەرەتای (١٩٧٧) بوو، لەهەموو شارەکان جڤینی کرد، دوای تەواوبوونی جڤینەکان دیسان گەڕایەوە ئەنقەرە. ئیدی ئەو کاتە دەوڵەت بینی ئەو زانیارییانەی پێیگەیشتووە ڕاست نین. واتا ئەم تەڤگەرە وەکو تەڤگەرەکانی دیکە نییە، ئەوان جودان و ئێمەش زۆر جودا و پڕ مەترسیدارین. ئەو کاتە لەم مەسەلەیە تێگەیشت، لەو کاتە بەدواوە بڕیاریان دا کەوا هێرش بێننە سەر تەڤگەرەکەمان، سەرەتا بە شەهیدکردنی هەڤاڵ "حەقی قەرار"، دوای ئەمەش هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆکیان دا لە ئەنقەرە، خواستیان تەڤگەرەکە لەناو ببەن، بینیان کە تا ئەو کاتە بەهەڵەدا چوونە، دەوڵەت بینی ئەو پارە و توانستەی لەڕێی پیلۆت (ئەجاتی کایا)وە خەرجیکردووە و خێزانی "فاتمە" و فلان هەمووی بێ ئەنجام بووە، ئەمەیان بینی و بۆیە بڕیاری هێرشکردنیان دا. تەنانەت خواستیان تۆڵە لە"پیلۆت"یش بکەنەوە، دوای ئەوەی بینیان ئەو زانیارییانەی پێیداون هەمووی هەڵەیە، پێیان گووت:" دەبێت خراپییەکانی خۆت

خاوێن بکەیتەوە، ئەگەر تۆ خاوێنی نەکەیەوە ئێمە خاوێنت دەکەینەوە" بۆیە "پیلۆت" کەوتە هەوڵی ئەوەی سەرۆك لەناو ببات، ئیدی هەر بەدوای سەرۆکەوە بوو، هەڵبەتە سەرۆکیش خۆی شاردەوە، پاشانیش چووە دەرەوەی وڵات. ئیدی دەرفەتی کوشتنی نەما، لەگەڵ کودەتای (١٢)ی ئەیلولدا لە ئەدەنە لەژێر ناوی رووداوی ترومبێلەوە تەسفیەیان کرد...

## باشە لەکاتێکدا گروپەکە هەندێك مەزن دەبێت و هەندێك چالاکیش ئەنجام دەدات، هەڵوێستی هێزە چەپگەراکان و هێزە کوردییەکانی ئەو کاتە لەهەمبەری تەڤگەرەکە چیبوو؟

ئەوانەی هەندێك ئێمەیان دەناسی و رێزیان لێدەگرتین، کار و چالاکی ئێمەیان لەبەرامبەر فاشیستەکان بینیبوو، بۆیە رێزیان لێدەگرتین. تەنانەت هەندێکیان لەژێر کاریگەری فیکری ئێمەشدا بوون. بۆ نموونە؛ دەیانگووت" وەرن لە بارەگای کۆمەڵەکانی ئێمەدا بۆ جەماوەری ئێمە سیمینار بدەن، چەمکی خۆتان بۆ خەڵك روونبکەنەوە، هەندێکیان ئەو هەڵوێستەیان هەبوو، هەندێکی تریشیان ئێمەیان بەمەترسیدار دەبینی و لەدژی ئێمە رادەوەستان...

## کامیان زیاتر لەدژی تەڤگەرەکە بوو؟

بۆنموونە؛ لەناو هێزی تورکاندا گروپی رووناکبیران (Aydınlıkçılar )ی دۆغو پەرینچەك (PERİNCEK DOĞU) هەبوو، کە ئێستا لە تورکیادا بەخۆیان دەڵێن "پارتی سۆسیالیست" و کەناڵی ئاسمانی (ULUSAL TV)یان هەیە، ئەوانە و هاوشێوەیان ئێمەیان بەخەتەرناك دەزانی و لەدژی ئێمە رادەوەستان. هەروەها هەندێکیان دەیانخواست دەستبەرداری چەمك و هێڵی فیکری خۆمان ببین و تەڤلی ئەوان ببین. هەندێکیان لەسەر ئەو بنەمایە نزیکدەبوونەوە. بۆ نموونە؛ گروپی رێگای

شۆڕش (DEV_ YOL) هەبوون، بەرپرسیاری ئەوان وەها نزیکدەبووەوە، بەئێمەی دەگووت:" واز بهێنن، چ کورد و کوردستانتانە؟ ئیدی هەردووکیان مردوون و ناژێنەوە، کاری ئێوە پووچە، ئەگەر دەخوازن شۆڕشگێڕی بکەن وەرن با پێکەوە بیکەین..." واتا دەیانخواست ئێمە بۆ ئەمە رابکێشن. گروپەکەی "ئاکتان ئینجە" هەبوو، لەهەموو لایەکەوە پروپاگەندەی ئێمەیان دەکرد، لەگەڵ ئێمەدا جموجۆڵیان دەکرد، دەیانهێشت بۆ جەماوەری ئەوان سیمینار بدەین، ئەوانیش لەناو چەپی تورك وەها نزیکدەبوونەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لەدژی فاشیستەکاندا بە بڕیار بووین و لەهەموو جێیەکدا لەپێشەوە بووین، هەروەها لەکۆکردنەوە و گردکردنەوەی گەنجانی شۆڕشگێڕ لە تورکیادا سەرۆك زۆر کاری کردبوو، بۆیەش هەموویان رێزیان لە ئێمە دەگرت. بۆ نموونە؛ لە کۆلێژی"زمان، مێژوو، جوگرافیا"دا من و هەڤاڵ "کەمال پیر" گووتمان:" کورد و کوردستان هەیە" ئەو هێزانەی چەپی تورك هەموویان هێرشی سەر ئێمەیان کرد، باش بوو ئێمەیان دەناسی، کە لەدژی فاشیستەکان لەپێشەوە بووین، لەم رووەوە هەندێك رێزیان لێدەگرتین، لەئێمەیان نەدا، ئەگەر وا نەبایە لەوانەبوو لە ئێمەشیان بدابایە. گووتیان:" ئەمە چییە؟ ئەمە لەکوێ دەرکەوت؟ هەر ئەمە مابوو؟ شتێکی وەها نییە...؟". واتا لەلایەکەوە رێزی ئێمەیان دەگرت، لەلایەکی دیکەیشەوە هەبوون لەدژی ئێمە رادەوەستان، هەندێکیان دەیانخواست ئێمە رابکێشنە لای خۆیانەوە. بەگشتی نزیکبوونەوەی هەندێك لەچەپەکانی تورك بەمشێوەیە بوو.

گروپە کوردییەکانیش نەیاندەخواست لەگەڵ چەپی تورك جموجۆڵ بکەین، چونکە چەمکی ئەوان چەمکی میللیگەرایی بوو، بەرتەسك و دواکەوتوو بوون. ئەوان چوون بەجودا "کۆمەڵەکانی کولتووری دیموکراتی شۆڕشگێڕ (DDKD)یان دامەزراند. واتا لە (ADYÖD) شوێنیان نەگرت، ئەمە لەکاتێکدا ئێمە دەمانگووت:" پێویستە هەموو شۆڕشگێڕان، دیموکراتیخوازەکان، کورد و تورك لە (ADYÖD)دا گردببینەوە بۆ ئەوەی ببینە هێز، بۆ ئەوەی دەست بەسەرداگرتنی فاشیستەکان بۆ سەر خوێندنگاکان بشکێنین، ئەگەر وەها نەبێت و هەر یەکێك بچێت جودا جودا بمێنێتەوە، ئەوا ئەو هێزەی کە شۆڕشگێڕان هەیانبوو پارچە پارچە دەبوو، بەمەش هیچ کاتێك ناتوانن لەدژی فاشیستەکان رابوەستن، تەنانەت تەواوی ئەو خوێندنگایانەی تێیدا باڵادەست

بوون لەدەستیان دەدا. ئیتر لەوانەبوو نەتوانن بکەونە نێو خوێندنگاکانیشەوە، رەوشێکی بەمجۆرە دەردەکەوت" بۆ ئەوەی رەوشێکی بەمشێوەیە دەرنەکەوێت ئێمە گووتمان:" پێویستە هەموو هێزەکان ببنەیەك و بەیەکەوە لەدژی فاشیستەکان رابوەستن، تاکو بتوانین ئەنجام بەدەستبخەین. ئیدی لە نێو چەپی تورکدا گروپەکەی دۆغو پەرینچەك چوون بەجودا بۆ خۆیان شوێنێکیان کردەوە، گروپە کوردییەکانیش چوون بەجودا بۆ خۆیان کۆمەڵەیەکیان بەناوی (DDKD) کردەوە. ئێمە لەدژی ئەوە بووین، بۆیە ئەوانە بەئێمەیان دەگووت:" ئەوانە کورد نین، هیچ پەیوەندییان بە کوردایەتییەوە نییە.... ئێمە کوردین و بۆ کوردان کاردەکەین، بۆیەش ئێمە رێکخستنێك دادەمەزرێنین... ئێمە لەگەڵ تورك جموجۆڵ ناکەین و لەناو رێکخستنی ئەواندا شوێن ناگرین..." ئەوانیش بەمشێوەیە نزیکدەبوونەوە، ئەوانە دەیانخواست ئێمە لەناو کورداندا گۆشەگیر بکەن، تا ئیرادەی ئێمە بەتەواوی بشکێنن. ئەوانیش وا نزیکدەبوونەوە و بەمشێوەیە لەدژی ئێمە رادەوەستان. ئەو کاتە لەناو کوردان زۆر رێکخراو و رێکخستن لەئارادا نەبوو، هەموویان لە ناو (DDKD) دا جێیان گرتبوو. کەمال بورقای و ئەوانیتریش لەناو پارتییەکی تورکدا بەناوی پارتی سۆسیالیستی تورکیا (TSP)دا شوێنیان گرتبوو. رێکخراوەکانی "ئاڵای رزگاری، رزگاری، پ د ك ی تورکیا، رێگای ئازادی ..." هەموویان لەو کۆمەڵەیەدا شوێنیان گرتبوو و لەدژی ئێمە رادەوەستان. بێگومان ئێمە ئەو کاتە ئەوەمان بە راست نەزانی و دەمانگووت:" بەرژەوەندی تەڤگەری چەپڕەو و دیموکراتخواز، چ کورد بێت یان تورك پێویستە هەموو لەنێو یەك کۆمەڵەدا شوێن بگرن، بۆ ئەوەی بتوانن خۆ بەهێز بکەن. چونکە کودەتای ساڵی (١٩٧١) زەبرێکی کوشندەی لە تەڤگەرە دیموکراتیخواز و چەپڕەوەکان وەشاندبوو، پەرشوبڵاوی کردبوونەوە و ئیرادەی شکاندبوون، هێزە فاشیستەکانیشی پڕ بەهێز کردبوو، لەزۆر جێگەدا باڵادەستێتی فاشیستەکان هەبوو. بۆ نموونە؛ لەهەندێك خوێندنگادا شۆڕشگێڕەکان نەیاندەتوانی هەنگاوێك بهاوێژن. ئەگەر تۆ ئەو هێزانە نەکەیتە یەك هێز، ئەوا تۆ ناتوانیت رێگری لەمە بکەیت، ئیدی ئێمە رێگریمان لەمە کرد. بەراستی تەڤگەرێکی زۆر بەهێز لە ئەنقەرە دروست بوو، کاریگەری خۆیشی لە ئەستەنبوڵ و شوێنی دیکەش دروست بوو، گەنجان هەموویان لەلای یەکتر کۆببوونەوە و رۆحێکی بە

گەنجان بەخشی، ئیرادەیەك ئافرێنرا، لەدژی فاشیستەکاندا گەنجان کەوتنە جموجۆڵەوە، هەم لە خوێندنگا و زانکۆکاندا، هەمیش لەدەرەوەی خوێندنگا و زانکۆکاندا، لە نێو بازاڕەکانیشدا پێکدادان روویدەدا، بەم شەڕە کاریگەری فاشیستەکان شکێنرا، شۆڕشگێڕەکان لەزۆر جێگادا بالادەست بوون. لێرەدا ئیدی تەڤگەری شۆڕشگێڕی خۆی کۆکردەوە، جارێکی دیکە پێشکەوت.

## هەر لەقۆناخی گروپبووندا، هەڵوێستی ئەو کاتەی جڤاکی کوردی بە چ رەنگێك بوو؟ کوردان چۆن لە گروپەکە نزیك دەبوونەوە و چۆن لێی تێدەگەیشتن؟

کاتێك ئێمە تازە لە ئەنقەرەوە چووینە کوردستان بۆ ئەوەی ئێمە دەست بەخەبات بکەین، یەکێك لەوانەی سەرەتا گەڕانەوە کوردستان من و هەڤاڵ "کەمال پیر" بووین، هەردووکمان چووینە شاری عەنتاب، کاتێك چووینە عەنتاب و دەستمان بەخەبات کرد، هەم چەپی تورك ـ هەڵبەتە زیاتر چەپی تورك هەبوون گروپە کوردییەکان زێدە نەبوون ـ هەمیش گەلی کورد دەیانگووت:" دوو کەس هاتوون دەبێژن کورد و کوردستان هەیە" واتا گاڵتەیان پێمان دەکرد، چەپی تورکیش دەیانخواست رێگریمان لێبکەن بۆ ئەوەی کار و خەبات نەکەین و قسە نەکەین. نزیکبوونەوەیان بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو. تەنانەت خەڵکی کورد دەیانگووت:" ئێوە گوناهن دەکوژرێن، دەست لەو کارە بەردەن و بۆخۆتان بچن بخوێنن و خوێندنی خۆتان تەواو بکەن باشترە، بەردەوامی بەژیانی خۆتان بدەن، ئێوە دوای چی کەوتوون؟ ئیشێکی پووچە، ئێوە نەدەتوانن شتێك بکەن و خۆشتان بەخۆڕایی بەکوشت دەدەن... ئێوە گوناهن بچن لەماڵ و حاڵی خۆتان دانیشن و خوێندنی خۆتان بکەن..." ئەو شتانەیان بەئێمە دەگووت و نزیکبوونەوەیان بەو شێوەیە بوو. واتا نە چەپی تورك نە گروپە کوردییەکان، نە گەل کەس باوەڕیان بەوە نەدەکرد کە ئەو تەڤگەرە وەها پێشبکەوێت.

تەنانەت لەناو ئێمەشدا هەندێك لە هەڤاڵان باوەڕیان بەمە نەدەکرد، کاتێك بڕیارماندا بگەڕێینەوە کوردستان، لەترسان لەگروپەکەدا دوو لەسێی گروپەکە دەستیان لەتەڤگەر بەردا. بینیان کە تەڤگەر جددیە و ئیشی گاڵتە نییە، واتا دەخوازێت لە کوردستان هەنگاو بهاوێژێت و خەبات و تێکۆشان بکات، ئەوانە وا مەزنەدەیان نەدەکرد، بەڵکو پێیان وابوو وەکو تەڤگەرەکانی دیکە لە ئەنقەرە دەمێنێتەوە، تەڤگەرێکی نەرم و ریفۆرمیست دەبێت، دەوڵەتیش زێدە هێرش و شاڵاوی ناهێنێتە سەر، ئەوان وەها حیسابیان دەکرد، بەڵام کە بینیان تەڤگەر ناخوازێت لە ئەنقەرە بمێنێتەوە، دەخوازێت لە کوردستاندا کار و خەبات بکات و لەهەموو بەرەیەکەوە شەڕی داگیرکەری بکات، ئەمەیان زۆر بە خەتەرناك بینی، بە مردنیان دەزانی. بۆیە لە کادیراندا دوو لەسەر سێیان دەستیان لە تەڤگەر بەردا و بەئاشکرا گووتیان:" ئێمە ناچینە کوردستان" ئیدی لە سێ بەش تەنیا بەشێکی مایەوە. بێگومان لەو بەشەش هەموو نەهاتنە کوردستان، یەکسەر هەموویمان نەگەڕاندەوە کوردستان. چونکە مەترسیدار بوو، چی دەبێت چی نابێت، دیار نەبوو. بۆیە هەنگاو بە هەنگاو گەڕاینەوە. وا بیرمان کردەوە؛ با ئەوانە سەرەتا بچن، بزانن چ ئەنجامێك لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن، ئەگەر ئەنجامگیربوون، ئەوا پاشان ئەوانی تریش دەتوانن بچنە کوردستان، ئەگەر لەناویشچوون، با هەموو بەیەکەوە لەناو نەچن.

بەو شێوەیە سەرۆك تەدبیری وەهای وەرگرتبوو. بۆیە کادیرێکی زۆر کەم سەرەتا کەوتە کوردستان، ئەوانە دەستیان بەکار کرد، پاشان هەڤاڵانی تریش هێدی هێدی هاتنەوە کوردستان. بێگومان ئەگەر یەکسەر هەمووومان بچووینایە کوردستان، ئەمە پڕ خەتەرناك دەبوو. هەڵبەتە ئێمە هەم یەکسەر هەموو کادیرانمان نەخستە کوردستان، هەمیش ئەو هەرێمانەمان بەبنچینە وەرگرت کە نزیك بە سنووری تورکیان(٥). نەك هەرێمە دوورەکانی دوور بە تورکیا. چونکە ئەمەش مەترسیدار بوو، هەم ئەزموونی ئێمە نەبوو، هەمیش پەیوەندی ئێمە لەو هەرێمانە نەبوو، هەمیش توانستمان نەبوو. هەروەها هەندێك کەس و لایەن هەڕەشەیان لەئێمە کردبوو، وەك **"سیراج بیلگین"** ئەو کەسە ئەوکاتە لە پارتی دیموکراتی کوردستان ـ تورکیا (پ د ك-T)دا بوو. دەیگووت:" نابێت ئێوە بێنە کوردستان، ئەگەر بێنە کوردستان ئێمە قاچتان دەشکێنین". بێگومان

ئەو هەڕەشەیە جددی بوو، بۆیە پێویستبوو حیسابی هەموو ئەو مەسەلانەمان بکردایە و بەگوێرەی ئەمەش هەنگاوی خۆمان بهاوێشتبایە. هەربۆیە لەنزیك سنووری تورکیادا، واتا لەشاری " ٠رسیم"ەوە بگرە تا دەگاتە شارەکانی"ئەلعەزیز" و "عەنتاب" و ئەو شوێنانە، سەرەتا هەنگاومان بۆ ئەو شوێنانە هاوێشت، بۆ ئەوەی بتوانین لەو شوێنانەوە هەنگاو بەهەنگاو بکەوینە نێو هەموو کوردستانەوە. ئێمە هەنگاوێکی بەو شێوەیەمان بەبنەما وەرگرت و لەسەر ئەو بنەمایە کار و خەباتمان پێشخست. بێگومان سەرەتا گەل باوەڕی بە ئێمە نەدەکرد. چونکە زۆر راپەڕین بەرپابووبوون، هەموو راپەڕینەکانیش زەبریان بەرکەوتبوو و ئەوەی لەرابردوودا راپەڕینیشیان بەرپاکردبوو هەموویان شێخ و ئاغا و بەگ و سەرۆك عەشیرەت بوون. خەڵك بینیبوویان کە ئەگەر ئەوانە نەیانتوانی بێت شتێك بکەن، کە لە ئێمەشیان دەروانی هەموو لاوین، نە شێخین و نە ئاغا و نە بەگ، نە لەپشت ئێمەشدا عەشیرەتێك هەیە و نە هێزێکمان هەیە، بۆیە دەیانگووت:" ئەو گەنجانە دەتوانن چی بکەن؟ ناتوانن هیچ بکەن". لەلایەکی دیکەشەوە کورد ئیرادەی شکابوو و ئیدی قۆناخی تەسلیمییەتی پەسند کردبوو، جا چۆن تۆ پەسند بکەن؟ بێگومان پەسندیان نەدەکردین، باوەڕیان پێنەدەکردین. دەیانگووت:" دەست لەو کارانە بەردەن، شێخ سەعید نەیتوانی، سەید رەزا نەیتوانی، شێخ عوبێدوڵڵا نەیتوانی، بارزانی نەیتوانی، ئێوە چۆن دەتوانن راپەڕین ئەنجام بدەن؟ جا ئێوە کێن؟ ئێوە کەسانی دەم رووتن... جا ئێوە کێشەی کورد چارەسەر دەکەن؟ ئێوە خۆتان لەناودەبەن، بڕۆنەوە ماڵی خۆتان و ئیشی خۆتان بکەن..." هەڵبەتە تا ئەو تێڕوانینەی ناو گەلمان شکاند، زۆر و زەحمەتییەکی مەزنمان بینی، بەمەش یەکسەر بێ مۆراڵ نەبووین، باوەڕیمان بەخۆمان لەدەست نەدا، ئەو نزیکبوونەوانەشمان بۆخۆمان کردە هۆکاری ئەوەی زیاتر و زیاتر بە ئیرادە کار و خەبات بکەین، توانیمان بۆ خۆمان پەیوەندی لەنێو خەڵکدا دروست بکەین، توانستمان بۆ خۆمان ئافراند، چالاکیمان ئەنجام دا... هێدی هێدی پێشکەوتین، ئیدی خەڵك بینی کە بەڕاستی هەندێك شت دروست دەبن، ئەو کاتە هێدی هێدی باوەڕیان بە تەڤگەر کرد. شێوازی ژیانی ئێمەیان بینی، ئەخلاقی ئێمەیان بینی، بینیان کە ئێمە بۆ خودی خۆمان هیچ ناژین، لەبنەڕەتدا ئەمە زۆر باوەڕی بەخەڵك بەخشی. هەروەها بینیان تا دێت تەڤگەریش پێشدەکەوێت، چالاکیش پێشدەکەوێت،

ئەنجامیش دەردەکەوێت، هێدی هێدی گەل باوەڕی بە تەڤگەرەکەمان هێنا و بەشداری تێدا دەکرد.

## تا پێش سازدانی جڤینی گەرەکی"دیکمان" چەمکی رێکخستن و رێکخستنبوون، تا چ ئاستێك پەرەیسەندبوو و بەچ شێوەیەك بوو؟

لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا، جڤینی "دیکمان"، کە لەساڵی (١٩٧٦)دا سازدرا، یەکەمین جڤینی فەرمی ئێمەیە. تا ئەو جڤینە کێ دەیخواست کار بکات کاری دەکرد. لە کوردستانیشدا تا پێش ئەم جڤینە هەندێك کار و خەباتمان کردبوو و هەندێك ئەنجامیشمان بەدەستخستبوو، ئیدی ئەوە دەرکەوتبووە روو کە تەڤگەر لە کوردستاندا تا رادەیەك خۆی جێگیر دەکات، تا دێت پێشدەکەوێت، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا کێشە و گرفتی نوێ دەردەخات، پێویستە ئەو پراکتیکەی بەڕێوەچووە و ئەو ئەنجامانەی بەدەستهاتوون، گفتوگۆی لەسەر بکرێت و چارەسەر بکرێت. بۆیە ئەم جڤینە سازدرا. لە مێژووی تەڤگەری ئێمەدا یەکەمین جڤینی فەرمیمانە. تا ئەو جڤینە سەرۆك بە تەنیا ئەو تەڤگەرەی بەڕێوە دەبرد و سەرپەرشتی دەکرد، سەرۆك لەو جڤینەدا گووتی:" ئیدی تەڤگەر پێشدەکەوێت، تا ئێستا من بە تەنیا بەڕێوەم بردووە، نابێت لەمەودوا بەمشێوەیە بێت، پێویستە بەڕێوەبەرایەتییەکی ئەم گروپ و تەڤگەرە هەبێت" لەم جڤینەدا بەڕێوەبەرایەتییەکی گروپ دروست بوو؛ یەکێکیان هەڤاڵ **"حەقی قەرار"** بوو، ئەوەی تریش **"قەمەر ئۆسکان"** بوو، ئەو کەسە پێشتر لەچەپی تورکدا لە ئەرتەشی **رزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی تورکیا** (TİİKKO)دا بوو، لەگەڵ **"ئیبراهیم کایپاك کایا"** بوو، کاتێك کە ئەویش لە (١٩٧٣)دەستگیر دەکرێت، ئەو **"قەمەر ئۆسکان"**ە ئێشکگر (نۆبەتچی) بووە، دوا ئێشکگریش بووە. ئێمەش بۆ رێزگرتن لە **"ئیبراهیم کایپاك کایا"** پەسندمان کرد کە تەڤلی گروپی ئێمە ببێت. ئێمە شوێنیمان کردەوە و گووتمان:" ئەمە شۆڕشگێڕێکە و لەگەڵ **"ئیبراهیم کایپاك کایا"** شوێنی گرتووە، **"ئیبراهیم کایپاك کایا"**ش شەهید بووە و ئەویش ماوە، دەوڵەتیش لەو دەگەڕا،

بەخۆیشی دەیخواست لەگەڵ ئێمەدا بێت، هەڤاڵ "فوئاد" و هەڤالانی دیکەی لەشاری دێرسیم بینیبوو، هەڵبەتە هەڤاڵ "فوئاد" و ئەوان ئەو کەسەیان هێنا، ئێمەش وەها ڕێزمان لێیگ ت و بەهادارمان بینی، هیچ جیاوازییەکیشمان نەخستە نێوان خۆمان و ئەوەوە، دەمانــووت:" ئەمە شۆڕشگێڕێکی دێرینە، هەڤالانی شەهیدبوونە و ئەو بەتەنیا ماوە، با شوێنێکی بدەینێ..."

ئیدی هەڤاڵ "حەقی قەرار" و ئەو "قەمەر ئۆسکان"ەمان کردە یارمەتیدەری سەرۆك. واتا یەکەمین جار بەفەرمی و بەمشێوەیە بەڕێوەبەرایەتی گروپ دروست بوو. ئیدی لەو جڤینەی "دیکمان" بەدواوە کار و خەبات لەژێر سەرپەرشتی و بەرپرسیارێتی ئەو بەڕێوەبەرایەتییەدا بەڕێوە دەچوو. ئەمە داخوازی سەرۆك بوو. بۆیە ئەمە گرنگە. لەو کۆبوونەوەیەدا کێشە و گرفتی ڕێکخستنی گفتوگۆ کرا، لەئەنجامی ئەو گفتوگۆیەدا دەرکەوت کە ئەو کێشانە چۆن چارەسەر ببن، بۆ ئەو مەبەستەش ئەو بەڕێوەبەرایەتییە بۆ گروپ پێکهات. لەبەر ئەوەی تەڤگەر پێشدەکەوێت و دەبێتە گروپێکی ئایدیۆلۆژی و فراوانتر دەبێت و بەرەو گروپێکی سیاسی دەچێت، بۆیە پێویستە بەڕێوەبەرایەتییەکی خۆی هەبێت. ئەگەر بەڕێوەبەرایەتییەکی نەبێت، ئەوا هەر بەتەنیا سەرۆك بەڕێوەی دەبات، ئەمە هەم بۆ سەرۆك و هەمیش بۆ گروپ زەحمەتە.

لەو چوارچێوەیەدا تەڤگەر لەگروپێکی ئایدیۆلۆژییەوە بەرەو گروپێکی سیاسی هەنگاو دەنێت، تەڤگەر مەزن و فراوان دەبێت. پێویستە بەڕێوەبەرایەتییەکی خۆی هەبێت، چونکە ناکرێ سەرۆك بە تەنیا بێت، بۆیە بەڕێوەبەرایەتییەکی گروپمان بەمشێوەیە دروستکرد. پاشان ئەو "قەمەر ئۆسکان"ە کە چووە دێرسیم کاری نەکرد، دەیخواست لەسەر ئەو بەها و توانستەی تەڤگەر پێی دابوو لێی پاڵ بکەوێت و بیخاتە خزمەتی شەخسی خۆیەوە، بیکاتە سەرمایەیەك و لەسەر ئەو بنەمایەش کەوتە نێو هەندێك پەیوەندی شەخسییەوە، بۆ شەخسی خۆی هەندێك توانستی دروست کرد. بێگومان ئێمە ئەوەمان پەسند نەکرد، هەڵبەتە دوای ئەمەش بینیمان کار ناکات و بەشەخسی لەتوانستی تەڤگەر نزیك دەبێتەوە و دەخوازێت بیخاتە خزمەتی شەخسی خۆیەوە و بۆ

شەخسی خۆی و خزمەتی خۆی بەکاری بهێنێت. گووتمان:" ئەمە وانابێت" و پەیوەندی خۆمان لەگەڵیدا بچڕاند...

**جگە لەو بڕیارەی دروستکردنی بەڕێوەبەرایەتییەك بۆ تەڤگەر، چ هەڵسەنگاندنێك بۆ ئەو کار و خەباتە کرا کە تا ئەوکاتە بەڕێوە بردرابوو؟ چ ڕێنماییەکی بۆ دوای جڤین و بۆ خەباتی داهاتووی تەڤگەر هەبوو؟**

هەڵبەتە لەو کۆبوونەوەیەدا تەنیا بەڕێوەبەرایەتی دانەمەزرا، ئەو پراکتیکەی هەبوو هەڵسەنگێندرا، لەو پراکتیکەدا شتی هەڵە و کەموکوڕی چیین؟ شتی باش چیین؟ پێویستە لەمەولا چ پراکتیکێك بەڕێوە ببەین؟ چۆن مەزن و فراوانی بکەین؟ تەڤگەر بەرەو کوێ دەچێت؟ مەترسییەکانی چیین و چۆن دێنە پێش تەڤگەرەوە؟ چۆن بتوانین تەدبیری پێویست وەربگرین؟ هەروەها ڕێنمایی و بڕیاری ئەوە وەرگیرا کە پێویستە بکەوینە نێو هەندێك هەرێم و ناوچەی نوێوە، پێویست دەکات بۆ ئەو شوێنانە کادیر بنێردرێن... ئەمانە هەمووی گفتوگۆیان لەسەر کرا. لەسەر ئەو مەسەلانەش بڕیار دران. دوای ئەو جڤینە کار و خەباتمان بەهێزتر و قووڵتر کردەوە. بۆ نموونە؛ بۆ هەندێك هەرێم و ناوچەی نوێ کادیرمان بۆی نارد، لەو هەرێمانەی هیچ نەچووبووین لەو شوێنانە دەستمان بەخەبات کرد، لەو شوێنانەش هەندێك پێشکەوتن بەدیهاتن.

بۆ ئەوەی پراکتیك بەرەو پێشەوە ببەین و هەندێك هەرێمی نوێ بکەینەوە و خەبات لەهەندێك هەرێمی دیکەی نوێ پێشبخەین ئەم جڤینە گرنگ بوو. هەروەها لەو هەرێمانەی خەباتمان تێیدا کردبوو بڕیارماندا کە بەرەو پێشەوەتری ببەین، لەسەر ئەو مەسەلانە چەندین بڕیارمان وەرگرت. هەروەها هەندێك لە هەڤالانمان بۆ سەر شارەکان دابەشکرد و ئەرکمان پێیان سپارد و هەندێك هەڤاڵی دیکەی نوێشمان ناردە نێو خەباتەوە، هەروەها ئەو هەڤالانەی لە ئەنقەرە مابوونەوە چۆن کار و خەبات بکەن، لە

گەڕەکەکاندا، لەزانکۆکاندا، کاری ئایدیۆلۆژی چۆن بکرێت؟ لەسەر ئەو مەسەلانەش هەندێك بڕیارمان وەرگرت.
بێگومان ئەو بڕیارانە مۆڕالێکی بەهێزتری ئافراند و بیر و باوەڕییەکی تۆکمەی لەنێو هەڤالاندا خولقاند. ئەو قەناعەتە زیاتر بوو کە ئیدی تەڤگەر ئەنجامگیر دەبێت، کار و خەبات ئەنجامی هەیە، ئەمە وای لەکادیران کرد زیاتر خەبات بکەن، زیاتر هەنگاو بهاوێژن. هەڵبەتە هەموو ئەمانە لەئەنجامی ئەو جڤینەدا بەدیهات...

## ئەو چالاکییانەی ئەو کاتە هەڤاڵ کەمال پیر لە گەڕەکی "تووزلوچایر" ئەنجامی دەدا؛ بۆ گروپ بە چ واتایەك دەهات؟ ڕەنگدانەوەی ئەو چالاکییانە لەنێو کۆمەڵگادا چۆن بوو؟

ئەو چالاکییانەی کە هەڤاڵ "کەمال پیر" لە گەڕەکەکانی "تووزلوچایر، ئابدین پاشا، ماماك" بەڕێوەی دەبرد، هەم چالاکی سیاسی بوو، هەمیش چالاکی عەسکەری بوو. گروپەکەمان لەخاوێنکردنەوەی ئەو گەڕەکانە لەفاشیستەکان ڕۆڵی گرنگی هەبوو. شانبەشانی چالاکی عەسکەری، چالاکی سیاسیشی بەڕێوە دەبرد. هەندێك کادیر کە لەو کارەدا بەشدار ببوون، لەرووی چالاکی عەسکەرییەوە ئامادە دەکران، ئەمە زۆر گرنگ بوو. هەمیش تەڤگەر لەگەڵ گەل پەیوەندی خۆی دروست کرد. واتا تەڤگەر لەچوارچێوەی خوێندەڤاناندا دەردەکەوت و خیتابی خەڵکی دەرەوەی خوێندنگا و زانکۆی دەکرد. ڕاستە تەڤگەرەکەمان لەنێو خوێندەڤاناندا دەستی پێکردبوو و کاری دەکرد، بەڵام لەوێشدا خۆی دەرخست. چالاکییەکانی نێو ئەو گەڕەکانە گوزارشتی لەمە دەکرد، ئەمەش بەو واتایە دەهات کە تەڤگەر هەنگاو بۆ نێو گەل دەهاوێژێت و دەخوازێت لەناو گەلدا خەبات بکات و گەل قازانج بکات، خۆی لەچوارچێوەی خوێندکاران و ڕۆشنبیران دەردەخات و ڕێکخستنی گەل بەبنچینە وەردەگرێت. چونکە ئێمە تەڤگەرێکی سۆسیالیست بووین، پێویستبوو گەلمان بەبنچینە وەرگرتبایە، تەنیا بەهەندێك لە خوێندەڤانان تەڤگەر نابێتە تەڤگەرێکی سۆسیالیست، پێویستبوو تا

دەهات خۆی لەم چوارچێوەیه دەربخستبایه... ئیدی لەو گەڕەکانەدا ئەو هەنگاوانەمان دەهاویشت. ئەمە ئامادەکاری بوو بۆچی؟ ئەمە لەهەمانکاتدا ئامادەکردنی کادیران بوو بۆ چوونە کوردستان، لەهەموو رووێکەوە، هەم ئامادەکردنی کادیر بوو بۆ کارکردن لەنێو گەلدا کەبتوانێت ئەزموون وەربگرێت، هەمیش ئامادەکردنی کادیران بوو لەرووی چالاکی نواندنەوە، واتا کار و چالاکی نێو ئەو گەڕەکانە بۆ ئێمە گرنگ بوو، بەو چالاکییانە ئامادەکارییەك کرا، بەو ئامادەکارییەوە کادیران کەوتنە نێو کوردستانەوە. لەبەر ئەوەی لەو گەڕەکانەدا هەندێك ئەزموونی لەرووی چالاکی و خەباتکردن لەنێو گەلدا وەرگرتبوو، ئەو ئەزموونەی لە کوردستانیش پێشخست و سوودی لێوەرگرت. ئەمەش ئەوە دیاردەکات کە تەڤگەری ئاپۆچی هەر لەسەرەتای خەباتکردنییەوە گەلی بەبنچینە وەرگرتووە، هەر تەنیا لەبۆتەی رۆشنبیراندا نەماوەتەوە و جموجۆڵی نەکردووە، هێڵ و رێبازی خۆی بەتەواوی هێڵ و رێبازی گەلە، لەنێو گەلدا ژیانبوون، لەنێو گەلدا خەباتکردن و پێشخستنی ئیرادەی گەلی بەبناخە وەرگرتووە، لەسەر ئەو بناخەیە خۆی کردە تەڤگەرێك و هێشتا لە ئەنقەرە لەنێو خوێندکاران دابوو کادیربوونی خۆی ئافراند، لەو گەڕەکانەشەوە چووە نێو گەلەوە، لەوێشدا خەباتی بەرەو پێشەوە برد. ئەمەش راستینەی ئەم تەڤگەرە نیشان دەدات، کە گەل بەبنچینە وەربگرێت، نەك تەڤگەرێك تەنیا بۆ نوخبەی رۆشنبیران بێت، ئەو چەمك و نزیکبوونەوەیە ئەم تەڤگەرەی لەتەڤگەرێکی رۆشنبیران دەرخست و کردی بە تەڤگەرێکی گەلەری.

## بەر لەوەی ئەم تەڤگەرە بەناوی (PKK)وە بناسرێت، بە چ ناوێك خەباتی دەکرد؟ هەروەها گەل و هێز و لایەنە سیاسییەکان چ ناوێکیان لەو تەڤگەرە نابوو؟

ئێمە بەخۆمان دەگووت:" شۆڕشگێڕانی کوردستان"، ئێمە ئەو ناوەمان بۆخۆمان دانابوو. بەڵام لەدەرەوەی ئێمە زۆر ناویان لەئێمە دەنا؛ هەندێك کەس ئەو ناوەی ئێمە

لەخۆمادمان ناوە پەسندیان دەکرد و ئەوانیش دەیانگووت "شۆڕشگێڕانی کوردستان". هەندێکی تریش بەئێمەیان دەگووت:"رزگاریخوازانی نەتەوەیی ( ULUSAL KURTULUŞÇU) یان "سوپای رزگاریی نەتەوەیی ( ULUSAL KURTULUŞ ORDUSU) هەندێکیش ئەم ناوەیان لەئێمە نابوو. بەڵام ئێمە هیچ کاتێك ئەو ناوەمان لەخۆ نەناوە، هەندێکی تریش دەیانگووت:"یاندم ئەڵلا چەتەسی YANDIM ALLAH ÇETESİ" یان"ئەڵلا چەتەسی ALLAH ÇETESİ " وەهایان دەگووت. هەندێکی تریش دەیانگووت:" ئاپۆچی" هەندێکی تریش بە ئێمەیان دەگووت:"میللییەتچی کوردان" هەندێکی تریش دەیانگووت:" شۆڕشگێڕانی کورد" یان "سۆسیالیستانی کورد" هەر یەکە و ناوێکی لە ئێمە دەنا. لەناو گەلیشدا گەل دەیگووت:" تەلەبە - خوێندکاران". ناوەکانی دیکە زیاتر هێز و لایەنە چەپ و کوردەکان لە ئێمەیان دەنا، بەڵام ئێمە دەمانگووت:" ئێمە شۆڕشگێڕی کوردستانین" بەم ناوە ئێمە دەمناخفین و بەیاننامەمان دەردەخست.

**بەبێ ئەوەی کورد میراسێکی شۆڕشگێڕی و ئەزموونێکی شۆڕشگێڕی هەبووبێت، ئەو تەڤگەرە دەست بە تێکۆشان دەکات. وەکو دیار دەبێت زۆر بە تەڤگەری گەلی ڤێتنام کاریگەر دەبێت، هەڵبەتە مۆدێلی شۆڕشگێڕێتی ڤێتنامیش و تەرزەکەیشی بەشی کوردستانی نەدەکرد، کەواتە شۆڕشگێڕییەکی چۆن و چ بنەمایەك بە بنچینە وەرگیرا؟**

بێگومان لەپێش ئێمەدا ئەزموون و میراس و توانستێکی مەزن لەئارادا نەبوو، تاکو ئەمانە بکەینە بناخەیەك بۆ خۆمان و لەسەر ئەمەش تەڤگەرێك ئاوا بکەین و پێشیبخەین. ئێمە ئەزموونی مێژووی مرۆڤایەتیمان بۆخۆمان بەبنچینە وەرگرت. لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، مرۆڤایەتی چۆن بۆ ئازادی و دیموکراسی شەڕ و خەباتی

کردووە؟ ئەو ئەزموونانەمان بۆخۆمان بەبنچینە وەرگرت، هەروەها لەمێژووی گەلەکەشماندا، ئەگەر لاوازیش بێت، ئەگەر کەمیش بێت، ئەو بەرخۆدانانەی ئەنجام دراون بۆ خۆمان بەبنچینەمان وەرگرت. لەسەر ئەو بنەمایە ئەو تەفگەرەمان پێشخست. بۆیەش پێشخستنی ئەم تەفگەرە زۆر دژوار و سەخت بوو، تەنیا دەبووایە لەسەر هێزی خۆمان رابووەستاینایە، نەماندەتوانی لەهیچ جێگەیەك و لەهیچ هێزێك هاوکاری و پشتیوانییەك وەربگرین، یان هیوایەکی وەهامان هەبێت. هیوامان هەر خۆمان بووین و هێزیشمان هەر خۆمان بووین. پێویستبوو بەتەواوی لەسەر هێز و توانستی خۆمان رابووەستاینایە، بۆیە ئەمەش دژوار و زەحمەت بوو، وەکوتریش رێگەچارەیەکی دیکە نەبوو، یان تۆ دەستت بەتێکۆشان نەکردبایە، ئەگەر تۆ بتگووتبایە:" ئەزموون نییە، توانست نییە، کەسێکیش هاوکاریمان ناکات و ئەمە نابێت". کەس نەیدەتوانی ئەمە هەرگیز پەسند بکات. چونکە رەوشی گەلەکەمان لەپێش چاوان بوو، رۆژ بە رۆژ دەتوایەوە و لەهەڵدێری مەرگ دابوو، لەسەر گەلەکەمان زوڵم و وەحشییەتێکی مەزن، توانەوەیەکی نەتەوەیی مەزن بەرێوەدەچوو، ئەگەر تۆ موداخەلە نەکەیت ئەوا واتای ئەوەیە ئەم گەلە لەبەین دەچێت. ناتوانیت بڵێیت:" توانست و ئەزموون نییە یان کەمە، با دەست بە خەبات نەکەین تا هەندێك توانست و ئەزموون پەیدا دەکەین، چونکە ئەو توانستەمان نییە کاربکەین" واتا هەر رۆژێك تێدەپەرێت زیاتر تەنگ بەگەلەکەمان هەڵدەچنرا و توانای ژیان کەمتر دەبووەوە، پێویستە تۆ رۆژێك زووتر موداخەلەی ئەم رەوشە بکەیت و رێگری لەم رەوشە بکەیت، هەرچەندە توانست و ئەزموونیش کەم بێت، تۆ ناتوانیت ئەمە بکەیتە بیانووی ئەوەی کە موداخەلە نەکەیت، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت ئەم بێ توانستی و بێ ئەزموونییەش بکەیتە بیانووی ئەوەی ئەو موداخەلەیە بکەیت. روانین و چەمکی ئەم تەفگەرە ئەوەبوو، واتا ئەگەر ئەزموون نییە، دەبوو تۆ ئەزموون لەخۆتدا دروست بکەیت، خۆت پێشبخەیت. ئەگەر توانست نییە، توانست بئافرێنیت، ئەگەر زانابوون نییە تۆ دەبێت خۆت زانا بکەیت، ئەگەر تۆ ئەمانەت ئەنجام دا ئەوا تۆ دەتوانیت کێشەکە چارەسەر بکەیت. ئەگەرنا هەر لەخۆیەوە چارەسەر نابێت و کەسیش چارەسەری ناکات. بۆیە ئێمە نەمانگووت:" توانست و ئەزموونمان کەمە ئێمە ناتوانین ئەمە ئەنجام بدەین.." ئێمە نکۆڵیمان لەو

راستییەی خۆمان نەدەکرد، بەڵکو دەمانگووت:" ئەزموون و توانستمان کەمە، بەڵام ئێمە ناچارین و ئەمە ئەرك و کاری ئێمەیە، پێویستە ئەم ئەرکە پێك بهێنین".

بەم چەمك و تێڕوانینەوە دەستمان بەکار و خەبات کرد. بۆیە لەبەر ئەوەی ئەزموون و میراسێکی وەها مەرن ، تۆکمە نەبوو، هەموو شتێکمان بەخۆمان ئافراند. ئێمە زێدە نەماندەزانی چ راستە و چ هەڵەیە، لەپراکتیکدا لەمانە هەمووی تێگەیشتین. واتا هەم ئێمە کارمان دەکرد، هەمیش لەو کارانەماندا شتی باش و خراپ چییە فێردەبووین و خۆمان لەسەر ئەو مەسەلانە پەروەردە دەکرد. ئەم تەفگەرەمان بەتەواوی لەسەر ئەم بنەمایە پێشخست. بێگومان لەبەر ئەوەش بوو ئێمە کەوتینە نێو زەحمەتی و هەڵە و کێماسی زۆرەوە، وەکو تر هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو، مەگەر تۆ تەنیا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە هەوڵت دا و گووتت:" ئەمە کێشەی منە" و خواستت چارەسەری بکەیت، ئیتر لەوێدا راستی و هەڵە دەبینیت، بەمشێوەیە ئەزموون وەردەگریت و توانست دەخوڵقێنیت، ئەگەر تۆ بڵێیت:" ئەزموون و توانستمان کەمە و ئەگەر کار بکەم دەکەومە نێو هەڵەوە" ئەو کاتە تۆ ناتوانیت هیچ هەنگاوێك بهاوێژیت. بۆیە ئێمە هەم کارمان کرد و هەمیش خۆمان خۆمان پەروەردە دەکرد، ئەوەی کە لەپراکتیکیشدا دەرکەوتووە خۆمان لەسەری پەروەردە دەکرد. چەندە هەڵە و کێماسیمان دەکرد، بۆخۆمان دەمانکردە پەروەردەیەك و بەمشێوەیە ئەزموونمان لێی وەرگرت. لەسەر ئەو بنچینەیە تەفگەر پێشکەوت.

بۆ نموونە؛ من ساڵی (١٩٨٠) چوومە سوریا، لەوێندەرێ سەرۆکی پارتییەك بەمنی گووت:" بە ئێوە دەڵێن زێدە سیاسەت نازانن و هەموو هەژارن و گوندنشینن و هەڵەیان زۆرە" گووتم:" کێ ئەو قسەیەی گووتوە راستی گووتوە" بێگومان ئەو باوەڕی نەکرد کە من وەها بڵێم. پێی وابوو من دەڵێم:" شتێکی وەها نییە، کێ وەهای گووتوە درۆیە و هەڵەیە، ئێمە وەها نین.." پێم گووت:" من مەزندە دەکەم کێ ئەوەی بە تۆش گووتوە، ئەوەی ئەو قسەیەشی گووتوە خۆی هیچ کێماسی و هەڵەیەکی نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی پراکتیکی نییە، بۆیە هیچ کێماسی و خەتایەکی نییە، ئێمە کار دەکەین، بۆیەش لەپراکتیکدا هەڵە و کێماسیمان زۆر دەردەکەوێت، ئەی ئێمە چی بکەین؟ لەپێش ئێمەدا ئەزموونێکیش نەبوو، پێویستە هەموو شتێك خۆمان بەخۆمان دروستی بکەین، بۆیە

زۆر كێماسی و هەڵەی ئێمە دەركەوتن، ئێمە لەمەش ناترسین، لەهەڵە و كەموكورییەكانی خۆمان ئەنجام هەڵدەهێنجین و لەسەر ئەو بنەمایەش خۆمان پەروەردە دەكەین و ئەزموون وەردەگرین. مرۆڤی ئێمە گوندین، ئێمە چی بكەین، گەلی ئێمە گەلێكی گوندنشینە، ئێمە بخوازین و نەخوازین هەر ئەمەیە و هەر بەم كەسانە هەموو كار و خەباتی خۆمان دەكەین، كەسێكی دیكە لەئاسمانەوە ناهێنین...". بێگومان من كاتێك وەهام پێی گووت، زۆر شەرمی لەخۆی كرد.

من بۆچی ئەمە باس دەكەم؟ چونكە ئەو كاتە كەسێك نەبوو خۆی لە كێشەی كورد نزیك بكاتەوە، لەوانەیە هەندێك كەس هەبووبن بەناوی كوردەوە هەندێك ئاخافتنیان كردبێت، بەڵام دەترسان لەوەی بكەونە نێو پراكتیكەوە، ئەو هەنگاوەشیان نەهاوێشت. ئێمە بە بەرپرسیارێتییەوە هەڵسوكەوتمان كرد و لەمەش نەترساین. ئێمە گووتمان؛ دەبێت ئێمە ئەم كێشەیە چارەسەر بكەین، ئەگەر هەڵە و كەموكوریشمان هەبێت، دەتوانین لەو هەڵە و كەموكورییانەمان ئەنجامی لێوە دەربخەین و راستی بكەینەوە. ئەگەر ئێمە نەیكەین كەس نایكات. ئەگەر ئەزموون و توانست نییە ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی هیچ هەنگاوێك نەهاوێژین، چونكە كادیرێك بەدانیشتن نابێتە كادیر، نەخاسمە لە كێشەی كورددا؛ ئەگەر تۆ خۆت ماندوو نەكەیت و خۆت نەخەیتە ژێر بەرپرسیارێتییەوە و جددی نەبیت، تۆ ناتوانیت لە كوردستاندا هیچ گۆڕان و پێشكەوتنێك بەدی بهێنیت، دەبێت بەجددییەت و بەرپرسیارێتییەوە خۆت ماندوو بكەیت و خۆت بخەیتە ژێر ئەركەوە. هەڵبەتە دەبێت تۆ هەوڵ بدەیت كە هەڵە و كەموكوریت نەبێت، بەڵام كاتێك كە ئەزموون نەبێت، زانابوون و توانستێكت نەبێت، هەڵەش دەردەكەوێت و كێماسیش دەردەكەوێت، دەبێت مرۆڤ لەمەش نەترسێت، كە تۆ كەموكوری و هەڵەی خۆتت بینی و چاوپۆشیت لێ نەكرد و بۆ خۆت كردت بە ئەزموونێك و هۆكارێك بۆ نەهێشتنی ئەو هەڵە و كێماسیانە، ئەوا ئەو هەڵە و كێماسیانە زێدە زیانی خۆی نابێت و خراپی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت. زۆر نموونەی وا لەپراكتیكی تەڤگەری ئاپۆچیدا روویداوە.

لەوانەیە ئێمە زۆر كەموكوری و هەڵەمان كردبێت، بەڵام ئێمە لە كوردستاندا زۆر گۆڕان و پێشكەوتن و سەركەوتنمان بەدیهێناوە و زۆر بەهای مەزنمان بۆ گەلی كورد

ئافراندووە. ئەوانەی دەیانگووت:" ئەزموون و توانست نییە و مەترسیدارە، با ئەو شتانەمان هەبێت پاشان دەست بۆ کێشەی کورد دەبەین" بۆ ئەم گەلە هیچ شتێکیان نەکردووە.

**وەکو دیار دەبێت ئەو پێوانە شۆڕشگێڕییانەی ئەوکاتە، جا چ پێوانەکانی چەپی تورك بێت، یان ئەوەی ڤێتنام یاخود کلاسیکی کوردستان تێری شۆڕشگێڕی و تێکۆشانی ئەو گروپەی نەدەکرد، بۆ نموونە؛ ئەگەر شۆڕشگێڕێکی ڤێتنامی هاتبایە کوردستان دەیتوانی شۆڕشگێڕییەکی سەرکەوتووانە لە کوردستاندا بکات؟**

کێشەی کورد کێشەیەکی مەزنە و زۆر دژوارە، وەك کێشەی هیچ گەل و وڵاتێکی دیکە نییە. کێشەی کورد کێشەیەکی جیهانییە، کاتێك تۆ دەست بهاوێژییە کێشەی کورد وەك ئەوە وایە دەست بهاوێژیتە کێشەی هەموو جیهانەوە، دەست بهاوێژیتە ناو کێشەی تەواوی مرۆڤایەتی و ئەو سیستەمەی لەجیهاندا لەئارادایە. بۆیە پێویستە تەڤگەرێك، یان پراکتیکێك بەگوێرەی ئەم کێشەیە پێشبکەوێت، ئەگەر ئەو تەڤگەرە لە بیر و راماندا، لەرێکخستن و چالاکی نواندندا بەگوێرەی کێشەکە پێشنەکەوێت، هیچ کاتێك ناتوانێت کێشەکە چارەسەر بکات. ئیدی لەهەر وڵاتێکدا بەگوێرەی هەلومەرجی ئەو وڵاتە، بەگوێرەی کارەکتەری ئەو گەلە، بەگوێرەی ئەو کێشە و وڵات و گەلە، تەڤگەر و شۆڕش پێشکەوتوون، تۆ ناتوانیت سۆڤییەت، ڤێتنام یان شوێنێکی دیکە بۆ خۆت بەبنەما وەربگریت. تۆ دەتوانیت سوود لەئەزموونی هەموویان وەربگریت، ئێمەش سوودمان لەئەزموونی هەموو مرۆڤایەتی وەرگرتووە، بەڵام هیچ کاتێك هیچ وڵاتێك و گەلێکمان بەبنچینە وەرنەگرت. واتا ئەوانە چییان کردووە ئێمەش وەها بکەین و وەها دەتوانین سەربکەوین... هیچ کاتێك نەکەوتینە هەڵەیەکی بەمجۆرەوە. چونکە هەر وڵات و میللەتێك، ئەو هەلومەرجەی تێیدایە، ئەو کێشەیەی تێیدا دەژیت، تایبەتمەندییان، لەیەکتر جودایە.

لێرەدا کێشەی کوردستان نە وەك کێشەی ڤێتنامە، نەوەك کێشەی چین، سۆڤییەت، کوبا، ئەنگۆلا، یان هەر ولاتێکی دیکەی جیهانە. کێشەی کورد کێشەی گەلێکە بۆتە چوار بەش، هەر بەشێکیش لەژێر دەسەلات و داگیرکەری دەولەتێك دایە. هەر یەك لەو دەولەتانەش لە جیهاندا لەگەل هەندێك هێز و دەولەتی دیکەدا پەیوەندی و هاوپەیمانێتیان هەیە، ئەو سیستەمەی لە جیهاندا هەیە ئەو کوردستانی پارچە کردووە و خستوویەتییە ژێردەستی ئەو داگیرکەرانە، لەنێو سیستەمیشدا جێگەی بە کوردستان نەداوە، بەلکو تەواو نکۆلی و قرکردنی بەبنچینە وەرگرتووە، ئیدی گەلێك لەنێو خۆیدا بە بنەمالە، عەشیرەت، ئایین، ئایینزا و ناوچەوە پارچە پارچە بووە، جیهان نکۆلی لێدەکات... خۆیشی خاوەندارێتی لەخۆی ناکات، کێشەکە کێشەیەکی بەمجۆرەیە. کاتێك تۆ دەستت بۆ ئەو کێشەیە برد، وەکو ئەوە وایە تۆ دەست بۆ هەموو کێشەکانی جیهان دەبەیت، تۆ هەموو جیهان دەکەیتە دووژمنی خۆت، ئەم کێشەیە کێشەیەکی هێندە مەزن و قوولە، کێشەیەکی نێودەولەتییە، نەك تەنیا کێشەی ولاتێك و گەلێك بێت، یان تەنیا ناوچەیەك بێت، بەلکو کێشەیەکی نێودەولەتییە. ئەگەر تۆ دەتەوێت ئەو کێشەیە چارەسەر بکەیت، دەبێت بەگوێرەی ئەمە لە بیر و رامان، لە رێکخستنبوون و چالاکی نواندن نزیك ببیتەوە. بۆ ئەوەی بتوانیت راست لە کێشەکە تێبگەیت، راست گفتوگۆی لەسەر بکەیت، بۆ ئەوەی بتوانیت کێشەکە راست چارەسەر بکەیت، دەبێت شێواز و ئافراندنی راست پێشبخەیت، ئەگەر وەها نەبێت، ئەوا ئەو موداخەلەیەی تۆ دەیکەیت، چارەسەرییەك لەگەل خۆیدا ناهێنێت، تەنانەت لەوانەیە کێشەکە قورستر و دژوارتر بکات و کێشەی تریش لەگەل خۆیدا بهێنێت.

هەلبەتە جیاوازی (PKK)ش لەمەدایە. زۆر پارت و رێکخراو لە باکوور بەناوی کوردان بەر لە (PKK) دەرکەوتبوون، ئەو پارت و رێکخراوانە ناویان هەبوو، بەلام شوێنپەنجەی ئەوان هیچ دیار نەبوو، هێشتا تەڤگەری ئاپۆچێتی دەرنەکەوتبوو ئەوانە هەبوون، زۆر ئیمکانیاتی ئەوانیش هەبوو، بەلام ئەوانە هەموویان تەنیا ناویان مایەوە، تا دەهات تەڤگەری ئاپۆچێتی پێشدەکەوت و لەدەرەوەی تەڤگەری ئاپۆچێتی هیچ تەڤگەرێکی دیکە نەما. بۆچی؟ چونکە ئەوانە ئەگەرچی بەناوی کوردیش دەئاخفین، بەلام باش و دروست تێنەگەیشتبوون کە کێشەی کورد چییە، راست لێی

نزیکنەبوونەوە، خۆیان لەکێشەکە تێنەگەیشتبوون جا چۆن دەتوانن کێشەکە چارەسەر بکەن؟!

لەبەر ئەوەی سەرۆك ئاپۆ راست لە کێشەی کورد نزیك بووەوە و راست لێی تێگەیشت و راست گفتوگۆیشی کرد، بۆیە کێشەکەی راست خستەڕوو و هەموو کەسێکی تێگەیاند، پارت و رێکخراوەکانی دیکە هیچیان ئەو کێشەیان دەرنەخستەڕوو لە کەسیشیان تێنەگەیاند. ئەگە راست لە کێشەکە نزیك نەبیتەوە، ئەوا تۆ ناتوانیت ئەو کێشەیە بە پەسندکردنیش بدەیت، تۆ ناتوانیت چارەسەریشی بکەیت. ئیدی (PKK) ئەمەی کرد، جودایی نێوان (PKK) و تەڤگەرەکانی دیکە لێرەدایە. سەرۆك ئاپۆ ئەزموونی هەموو جیهانی بۆخۆی کردە بناخە و لەسەر ئەو ئەزموونانە لە کێشەکە تێگەیشت و کێشەکەی گفتوگۆ کرد و خستیە نێو گفتوگۆکانەوە و لەهەموو روویێکەوە کێشەکەی بەتێگەیاندن دا، بۆیەش بۆ چارەسەری کێشەکە زۆر هەنگاو هاوێشتراون، لەسەر ئەزموونی تەواوی جیهان ئەزموونێك ئافرێنرا، واتا مرۆڤ دەتوانێت بڵێت:" ئێمە لەهەموو روویێکەوە، لە سفرەوە دەستمان پێکرد، لەرووی ئەزموونی سیاسییەوە بیگرە تا دەگاتە توانستی ماددی، هەموو شتەکانمان بە خۆمان ئافراندمان، بەرەنجی خۆمان ئافراندمان، بەرەنج و ئیش و کار و زەحمەتییەکی مەزنەوە هەموو ئەو پێشکەوتن و ئەزموون و ئیمکانیاتەمان خوڵقاند.

لێرەدا بەتەواوی لەسەر هێزی خۆمان رابووین، ئێمە لەهیچ کەسێك هیچ هێزێکمان وەرنەگرت، هیچ هاوکارییەکمان وەرنەگرت، تەنانەت هەر کەس دەیخواست رێگریمان لێ بکات، بۆ ئەوەی ئێمە دەستبەرداری ببین، بەڵام ئێمە پێداگریمان کرد. واتا ئێمە هەم دەستبەرداری نەبووین، هەمیش باوەڕیمان بەخۆمان هێنا و لەسەر هێزی خۆمان رابووین. بێگومان ئەمە زۆر و زەحمەت بوو، مرۆڤی زۆر ئازار دەدا، بەڵام وەکوتر هیچ چارەیەکی دیکە نەبوو. ئەمەش پێشکەوتنی هەرە راستە، پێشکەوتنی راست لەسەر ئەو بنەمایە دێتەدی. هەرچەندە ئێمە زۆر و زەحمەتیمان بینی، بەڵام ئێمە ئەزموون و توانستێکمان بۆخۆمان خوڵقاند. بۆیە لەبەر ئەوەی ئێمە لەسەر هێزی خۆمان رابووین، هەموو توانستێکمان بەخۆمان ئافراند، لەبەر ئەوە بێمنەت بووین، ئێمە نەکەوتینە ژێر

کاریگەری ئەم و ئەوەوە، ئێمە نەکەوتینە خزمەتی هیچ هێزێکەوە، هیچ هێزێکیش نەیتوانی ئێمە تەسلیم بکات.

ئیدی ئەگەر تۆ دەخوازیت لە کوردستاندا کۆیلایەتی نەهێڵیت و ئازادی و دیموکراسی دەستەبەر بکەیت، تەنیا بەمجۆرە دەتوانیت ئەنجامگیر ببیت. کوردستان زۆر خراپ و گەمار کراوە، ئەگەر تۆ نەتوانیت ئەو خراپی و گەمارییە رابماڵیت و خاوێنی نەکەیتەوە، ئەوا تۆ ناتوانیت ئازادی بەدیبهێنیت. ئەمەش بە چ دێتەدی؟ کە تۆ رەخنەیەکی مەزن پێشبخەیت و لەسەر بنەمای ئەو رەخنەیەش رەخنەدانێکی مەزنت پێشخست، ئینجا دەتوانیت ئەو گەماری و خراپییە رابماڵیت و خاوێنی بکەیتەوە، ئەو کاتە دەتوانیت تەڤگەرێکی ئازادیخواز و دیموکراتیخواز بەرەو پێشەوە ببەیت، ئەوەی (PKK) و سەرۆك ئاپۆ ئەنجامیان داوە ئەمەیە.

## ئەو پەیوەندییەی لەنێوان گروپەکە و کۆمەڵەی خوێندکارانی خوێندنی باڵا لە ئەنقەرە (ADYÖD) دا هەبوو چۆن بوو؟ هەروەها بەسوود وەرگرتن لەو رێکخراوە یاساییە، گروپەکە تا چەند توانی کار و خەباتی خۆی بەرەو پێشەوە ببات و خۆی فراوان بکات؟

لەساڵی (١٩٧١)دا لە تورکیا کودەتایەکی سەربازی بەرپا کرا، ئامانجی ئەو کودەتایەش ئەوەبوو کە تەڤگەرە شۆڕشگێڕەکان تەسفیە بکرێن. بۆیە بە ئەنجامگیربوونی کودەتا سەربازییەکە زۆر گرتن و کوشتن و لەسێدارەدان و ئەشکەنجەیان ئەنجام دا و زەبرێکی کوشندەیان لە تەڤگەری شۆڕشگێڕی دا. شانبەشانی ئەمەش فاشیستی تورکی بەهێزکرد و لەهەموو رووێکەوە هاوکاری ئەوانی کرد، چ بەنهێنی و چ بەئاشکرا ئەوەی لەدەستی هات کردی، زۆر هەنگاوی بۆ جێگیرکردنی فاشیستەکان هاوێشت، تەڤگەری چەپی تورك زیاتر تەڤگەرێکی خوێندەڤانان بوو، بۆ ئەوەی تەڤگەری چەپ لە تورکیا تەسفیە بکات لە خوێندنگاکان و زانکۆکاندا فاشیستەکانیان جێگیر کرد و بەهێزیان کردن، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە لەو شوێنانەدا تەڤگەری شۆڕشگێڕی خۆی کۆنەکاتەوە و بەهێز نەبێتەوە.

بەمەش بتوانن دەسەڵاتدارێتی خۆیان پتەو و تۆکمە بکەن و بەڕێوەی ببەن. بەمشێوەیە کودەتا سەربازییەکە گەلێك هەنگاوی هاوێشت، دوای ئەوەی حوکمی عەسکەری هەڵوەشایەوە و جارێکی دیکە حوکمی مەدەنی گەڕایەوە، تەڤگەری شۆڕشگێڕیش کە زەبرێکی جیدی بەرکەوتبوو، ئیرادەی شکابوو، لاواز و پەرشوبڵاو بوو و لە وزە و تاقەتی خۆی کەوتبوو، فاشیستەکانیش زۆر بەهێز ببوون، بۆیە پێویستبوو کە تەڤگەری [illegible]ێڕی کۆبکرایەتەوە سەریەك، بۆ ئەوەی بتوانێت ئیرادەی خۆی و چالاکی خۆی بەهێز بکاتەوە و حاکمییەتی فاشیستەکان بشکێنێت.

لە تورکیادا؛ دوای کودەتایەکە "پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی تورکیا ـTSİP" دامەزرا. ئەم پارتییە لەناو گەنجاندا لەژێرناوی (ADYÖD)دا ڕێکخراوێکی دروست کردبوو، بەتەواوەتی سوودی لەو بۆشاییە وەرگرت کە لە تەڤگەری شۆڕشگێڕیدا هاتبووە ئاراوە و ئەو ڕێکخستنەیان دروست کرد. خۆیشی پارتییەکی چەپ بوو، هەرچەندە ئەو پارتییە سوودی لەو بۆشاییە وەرگرتبوو و دەستی خستبووە نێو خوێندنگا و زانکۆکان و گەنجانەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پراکتیکی ئەو پارتییە نەبوو کەس زێدە باوەڕی پێ نەدەکرد. بۆیە نەیدەتوانی هەموو گەنجان لە دەوروبەری خۆی کۆبکاتەوە. لەنێو گەنجاندا تەنیا بەشێکی زۆر کەمی ڕێکخستە کردبوو. لەبنچینەدا گەنجان لەدەرەوەی ئەم پارتییە لەڕێکخستندا بوون، ئیدی فاشیستەکانیش پڕ بە ڕێکخستن و حاکمییەت بوون. ئەمەش مەترسیدار بوو، پێویستبوو چارەسەرییەك بۆ ئەو دۆخە بدۆزرێتەوە.

لەسەر ئەم بنەمایە سەرۆك ئاپۆ لەنێو خوێندەڤانان و چەپی تورکدا هەوڵ و تەقەللایەکی پێشخست، گووتی:" پێویستە ئەو ڕێکخستن (ڕێکخراو)ەی لەناو گەنجاندا ئاوابووە فراوانتری بکەین، هەم بەڕێوەبەرایەتییەکەی فراوان بکەین، هەمیش لەناو هەموو خوێندنگا و زانکۆکاندا بەڕێوەی ببەین. بۆ ئەوەی هەموو گەنجە چەپڕەوەکان تێیدا کۆبکەینەوە، تا بتوانین لەهەمبەر فاشیستەکان ڕابوەستین. ئەگەر وەها نەبێت ئەوا تەڤگەری گەنجان و چەپڕەوێتی زیاتریش لاواز دەبێت. لەسەر ئەو بنەمایە بەکار و داخوازی سەرۆك ئاپۆ لەهەموو زانکۆ و خوێندنگاکاندا کۆبوونەوە ئەنجام دران، هەموو کەسیش ئەم داخوازییەی پەسند کرد، لەئەنجامی ئەو کۆبوونەوانەدا پاڵێوراوان هەڵبژێردران و هەموو ئەو پاڵێوراوانە لە (ADYÖD)دا کۆبوونەوە، بڕیاریاندا کە

بەڕێوەبەرایەتی (ADYÖD) فراوان بکرێت، بەرادەیەك هەموو ڕێکخراوە چەپڕەوەکانی تورکیا بکەونە نێو بەڕێوەبەرایەتییەکەیەوە و تێیدا بەشداری بکەن. واتا ئەم ڕێکخراوە تەنیا لەدەست گروپێکدا نەبێت، بەڵکو هەرچی تەڤگەری چەپڕەو لە تورکیادا هەن، نوێنەری گەنجەکانیان هەمووی بکەوێتە بەڕێوەبەرایەتییەکەوە. بەمەش ئەم ڕێکخراوە ببێتە ڕێکخراوی گەنجانی هەموو چەپەکانی تورکیا. ئیدی پاڵێوراوان ئەم بڕیارەیان وەرگرت و بەڕێوەبەرایەتییەکە وەها فراوان بوو، لەهەموو ڕێکخراوەکانەوە نوێنەریان کەوتە نێو بەڕێوەبەرایەتییەوە. لەسەر ناوی گروپی ئێمەش سەرۆك ئاپۆ و هەڤاڵ "حەقی قەرار" کەوتنە بەڕێوەبەرایەتییەوە. سەرۆك بووە سەرۆکی (ADYÖD).

لەراستیدا (ADYÖD) ڕێکخراوێکی ئاشکرابوو و بەفەرمی دامەزرابوو، بەڵام ئەو بەڕێوەبەرایەتییە فراوانە لەلای دەوڵەت فەرمی نەبوو.

## هەڵبژاردنی ئەو پاڵێوراوانە لە کام ساڵ بوو؟

لەکۆتایی ساڵی (١٩٧٢)دا ئەو هەڵبژاردنە ئەنجام درا. بەڵام لەفەرمییەتدا هەر بەڕێوەبەرایەتییەکەی پێشان بەڕێوەبەرایەتییەکی فەرمی بوو، لەراستیشدا ئەوەی (ADYÖD)ی بەڕێوەدەبرد ئەو بەڕێوەبەرایەتییە بەرفراوانە بوو، کە تەڤگەری لاوانیشی بەڕێوە دەبرد. سەرۆکی ئەو بەڕێوەبەرایەتییە فراوانەی (ADYÖD)یش سەرۆك ئاپۆ بوو. (ADYÖD) لەهەموو زانکۆ و خوێندنگاکاندا دەستی بەخۆ ڕێکخستن کرد. لەسەر ئەو بنەمایەش یەکێتی هەموو چەپی تورك لەناو گەنجاندا ئاوابوو و بووە هێزێك. بەمەش لەدژی فاشیستەکان ڕاوەستا، لەنێوان فاشیستەکان و تەڤگەری گەنجانی چەپڕەودا زۆر پێکدادان ڕوویاندا، هەم لەخوێندنگاکاندا، هەمیش لەدەرەوەی خوێندنگاکاندا. ئەمەش وایکرد تەڤگەری چەپ هەنگاو بهاوێژێت، تەڤگەری چەپ خۆی کۆکردەوە و بووە هێزێك، فاشیستەکانیش زەبری جددیان بەرکەوت، لەپێشخستنی تەڤگەری گەنجاندا لەلایەن (ADYÖD)وە ڕۆڵێکی پڕ مەزنی سەرۆك هەبوو. لەبنچینەدا سەرۆك ئەو خەباتەی بەڕێوە برد و ئەنجامیش بەدەستهێنرا...

**وەك دەزانرێت؛ ئەو گروپە سەرەتا لە ئەنقەرە دادەمەزرێت، بەتایبەتیش لە کۆلێژی "زانستە سیاسییەکان"دا سەرهەڵدەدات. بۆچی شارێکی تر یان لە کۆلێژێکی دیکە سەریهەڵنەدا؟ وەکو دەگووترێت؛ هەموو پیاوانی دەوڵەتیش لەو کۆلێژەدا دەرکەوتن و مەزن بوون. کەواتە سەرهەڵدانی ئەم گروپە لە ئەنقەرە و لەم کۆلێژەدا بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

راستە، ئەوانەی ئەو تەفکەرەیان ئاواکرد لە ئەنقەرە بوون و خوێندەڤان بوون. ، ئەوانەی لەگروپدا شوێنیان گرتبوو هەمووشیان لە زانکۆدا لەوانەکانیان زیرەك بوون. بۆچی لەزانکۆدا؟ چونکە ئەوکاتە لە تورکیادا بیری نوێ و بیری سۆسیالیستی لە زانکۆدا پەرەیسەند بوو. واتا تۆ لە زانکۆدا لەبیری سۆسیالیزم تێدەگەیشتی، نەتدەتوانی لەشوێنێکی دیکە لێی تێبگەیت. ئەگەر گروپەکە لەنێو خوێندەڤانانی زانکۆدا سەریهەڵدا لەبەر ئەم هۆیە بوو. چونکە ئێمە سەرەتا لە سۆسیالیزم تێگەیشتین، پاشان لەخۆمان و کێشەی کوردیش تێگەیشتین. ئەگەر ئێمە لە سۆسیالیزم تێنەگەیشتباینایە ئەوا لەخۆمان و لە کێشەی کوردیش تێنەدەگەیشتین. سۆسیالیزم لەنێو خوێندەڤاناندا تێگەیشتین، ئەو بیرە لەنێو خوێندەڤاناندا پێشکەوتبوو. بۆیە گروپەکە لە زانکۆدا دروست بوو.

لە تورکیادا "کۆلێژی زانستە سیاسییەکان" گرێدراوی زانکۆی ئەنقەرەیە، ئەو کۆلێژە زۆر کادیری دەوڵەت دروست دەکات، بەڵام ئەم کۆلێژە کەوتبووە دەست تەفکەری چەپڕەوەوە. واتا تەفکەری چەپڕەو لەوێ باڵادەستی خۆی چەسپاندبوو. سەرۆك و هەڤاڵ "فوئاد"یش هەر لەو کۆلێژە دەیانخوێند. تایبەتمەندی ئەو کۆلێژە ئەوەیە کە بە سیاسەتەوە مژوول دەبێت. نەك لە تورکیادا، بەڵکو ئەوەندەی من بیزانم ئەو کاتە لەخۆرهەڵاتی ناویندا هەمووی، تاکە کۆلێژێکی بەمشێوەیە بوو، ئێستا لەوڵاتانی دیکەشدا ئەو کۆلێژە دامەزراوە. واتا کۆلێژێکی زۆر نەوازە بوو، لەوێ ئابووری، سیاسەت،

دیپلۆماسی، سۆسیۆلۆژی لەئاستێکی بەرزدا دەخوێنرا. ئیدی ئەو کۆلێژە پێداویستییەکانی دەوڵەتی لەرووی کادیرەوە پێکدەهێنا. ئەوەی لەو کۆلێژە دەرچووبایە، دەبووە پارێزگار (والی)، قایمقام، ئابووریناس، دیپلۆمات، سیاسەتمەدار. واتا بۆ دەوڵەت کادیری پێدەگەیاند، لەو کۆلێژەدا تەفگەری چەپڕەو زۆر پێشکەوتبوو و بالآدەستی خۆی چەسپاندبوو. هەڵبەتە ئەو وانانەی دەخوێندرێن بەردەوام مرۆڤ بەرەو پێشەوە دەبات و دەیخاتە نێو لێکۆڵینەوە و بیری نوێوە. بۆیە ئەوانەی لەو کۆلێژەدا دەخوێنن کەسێتییەکی داخراو نابن، کۆنەپەرست دەرناچن، بۆ بیری نوێ کراوە دەبن، لە کەسێتی ئەواندا لێکۆڵینەوە و تێخوێندنەوە پڕ بەهێز دەبێت، بە ئاگان لەوەی لە جیهاندا چ روودەدات؟ چ بیرێکی نوێ و سیاسەتێکی نوێ هەیە؟ چونکە وانەکانیان لەسەر ئەو مەسەلانەیە. بۆیە لەو کۆلێژەدا تەفگەری چەپڕەوی پێشکەوت و بالآدەست بوو، سەرۆکیش لەم کۆلێژە دەیخوێند، ئەو گروپەش سەرۆك دروستی کردبوو، گروپەکەش هەموویان لە زانکۆ دەیانخوێند و لەوانەکانی خۆشیاندا زیرەك بوون. هەروەها ئەو چینەی لێشییەوە هاتبوون هەموویان منداڵی هەژار و گوندنشین بوون. بۆیە گروپێکی نەوازە و بەهێز دروستبوو...

## گروپ لە ئەنقەرەوە بەرەو کوردستان دەچێت، بۆچی گروپ دەگەڕێتەوە کوردستان؟ لەگەڕانەوەدا بۆ کوردستان و لەئەنجامی خەباتکردن لە کوردستاندا چ ئەنجامێکی بەدەستخست و لەسەر ئەو دەرئەنجامانە چ هەنگاوێك هاوێشترا؟

بەر لەوەی ئێمە بڕیاری گەڕانەوە بۆ کوردستان بدەین و دەست بەخەبات بکەین، من و سەرۆك چووینە عەنتاب و ئورفە و تا گوندی سەرۆك چووین. بێگومان سەرۆك بە منی نەگووت؛ ئێمە بۆچی دەچین؟ تەنیا گووتی:" من لە زینداندا دەرکەوتووم و لەمێژیشە نەچوومەتە گوند، دەخوازم جارێك بچم، ئەگەر دەخوازیت تۆش وەرە با پێکەوە بچین" منیش ئەو ناوچەیەم هیچ نەبینیبوو، بۆیە گووتم: "باشە با بچین" هەردووکمان

پێکەوە چووین. هەڵبەتە کە چووین سەرۆك لە شارەکانی عەنتاب و ئورفە و خەڵفەتی و گوندەکانی خەڵفەتی هەندێك جڤینی ئەنجامدا، لەگەڵ خوێندەڤانان و مامۆستایان و گوندنشینان. من ئەو کاتە تێگەیشتم کە سەرۆك خەریکی هەندێك لێکۆڵینەوەیە، هەر بۆ ئەم مەبەستەش هاتووە و ئەو جڤینانەش بۆ ئەمە دەکات.

دوای ئەوەی ئێمە لەوێ گەڕاینەوە و چووینە ئەنقەرە، رۆژێکیان سەرۆك لەگەڵ من و هەڤاڵ "کەمال" گفتوگۆی کرد، سەبارەت بەوەی؛ ئایا بچین لە کوردستان دەست بە خەبات بکەین؟ داخوا کاتی ئەوە هاتووە یان نا؟ چ وەختێك مرۆڤ دەست بەو خەباتە بکات باشترە؟ لەسەر ئەو مەسەلانە لەگەڵ هەردووکمان گفتوگۆی کرد. ئێمە تێگەیشتین کە سەرۆك دەخوازێت لە هەڵوێستی ئێمە تێبگات. ئێمە ئەو کاتە گووتمان:" پێویستە بچین لەوێ کار بکەین، ئێمەش بۆ ئەمە ئامادەین بچین لەوێ کار بکەین" سەرۆك گووتی:" ئاخر ئێوە ئێستا لە زانکۆ دەخوێنن، چ لەخوێندنەکانتان دەکەن؟". ئێمەش گووتمان:" بەسە، ئەوەی تا ئێستا خوێندوومانە بەسە، ئێمە ناخوازین چیدی بخوێنین، دەخوازین دەستبەرداری خوێندن ببین، بە تەواوی شۆڕشگێڕی بکەین" دواتر گووتی:" هەلومەرج لە کوردستان زۆر و زەحمەتە و توانستیش نییە، پەیوەندی نییە، مەترسیدارە، ئێوە دەتوانن لەوێ شۆڕشگێڕی بکەن؟" گووتمان:" ئێمە هەموو شتێك دەدەینە بەرچاومان" گووتی:" ئاخر وەها عاتیفی نزیك نەبنەوە، وەکو ئێوە لێی تێگەیشتوون وەها نییە، زۆر گران و بەزەحمەتە، ئەگەر ئەو هەنگاوە بهاوێژرێت، ئەگەری دەرکەوتنی هەندێك شت هەیە و هەندێك شت لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. پێویستە ئێمە هەموو ئەو شتانە بزانین، ئینجا بڕیار بدەین" ئێمەش گووتمان:" ئێمەش بڕیاری خۆمان دەدەین". چونکە سەرۆك کاتێك کە بڕیاری وەربگرتبایە هیچ کاتێك لەخۆیەوە ئەو بڕیارەی وەرنەدەگرت، پێشتر لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرد و گفتوگۆی لەسەر دەکرد، پاشان دەگەیشتە ئەنجام، لەلای خۆیەوە دەگەیشتە ئەنجام و بڕیارێك، بەڵام هیچ کاتێك ئەو ئەنجام و بڕیارەی بەئاشکرا نەدەگووت، هەروەها ئەو بڕیارەی پێیگەیشتووە داخوا چەندە راستە یان راست نییە؟ کوێی ئەم بڕیارە راستە یان راست نییە؟ بۆ ئەوەی لەم مەسەلانەش تێبگات گفتوگۆی دەکرد. کاتێك لەگەڵ من و هەڤاڵ "کەمال" گفتوگۆی کرد، ئێمە لەوە تێگەیشتین کە سەرۆك لەلایەن خۆیەوە

بڕیاری داوه، بەڵام هیچ کاتێك بەئاشکرا بە ئێمەی نەگووت. زێدەتر دەیخواست لەوە تێبگات کە؛ ئێمە چۆن نزیك دەبینەوە؟ ئێمە عاتیفی نزیك دەبینەوە یان بەراست لەم مەسەلەیە نزیك دەبینەوە؟. کاتێك ئێمە گووتمان:" ئێمە ئامادەین" ئیدی سەبارەت بەزۆر لایەنی ئەم مەسەلەیە قسە و گفتوگۆی کرد و شیکردەوە. ئەگەر لەبڕیاری ئێمەدا لایەنی عاتیفی زاڵە، یان لایەنێکی مەسەلەکە روون نەبێت لەلامان، ئێمە ئەوە دەبینین و بڕیاری خۆمان بەمشێوەیە دەدەین، بۆ ئەوەی پاشان ئێمە پەشیمان نەبینەوە و نەڵێین:" ئەو لایەنەمان نەبینبوو و نەزانیبوو..."

کاتێك لەهەموو روویێکەوە مەسەلەکەی باس کرد و خستییە پێش ئێمە و ئێمەش هەر سووربووین لەسەر بڕیاری خۆمان، گووتی:" تەواو، مادام وایە ئێوەش گونجاوی دەبینن، با ئامادەکاری بکەین و ئێوە دەنێرین. بێگومان لە ئەنقەرە تا کۆتایی (١٩٧٥) بەو کار و چالاکییانەی ئەنجامماندابوو گروپێك ئاوا ببوو، ئیدی پێویستبوو ئەو گروپە بچووبایە کوردستان و لە کوردستان دەستی بەخەبات بکردایە. ئەو خەباتەی دەبووایە ئێمە لە ئەنقەرە بمانکردبایە، کردبوومان، هێشتاش شتی بکرابایە هەبوون، بەڵام شتی بنچینەیی لە ئەنقەرە ئەنجامدرابوو، پێویستبوو ئێمە هەنگاو بەرەو کوردستان بهاوێژین، ئەگەر ئێمە دەخوازین ئەم گروپە پێشبکەوێت، کە لە پراکتیکیشدا پێشدەکەوت، ئەمە ئیدی لە ئەنقەرە نەدەبوو، بەڵکو ئەمە لە کوردستاندا بەدیدەهات. بۆیە ئێمە ئەو بڕیارەمان دا. بەڵام کاتێك ئێمە چۆن بکەوینە کوردستان؟ لەکوێوە دەست پێبکەین بۆ ئەوەی ئەنجام بەدەست بخەین و نەکەوینە نێو هەڵە و کێماسی و زەبرمان بەرنەکەوێت؟. لەسەر ئەمەش گفتوگۆمان کرد، بۆیە ئێمە ئەو بازێڕە نزیکانەی سنووری تورکیامان(٦) بەبنچینە وەرگرت. چونکە ئەو بازێڕانە نزیك بە تورکیا بوون، نیو تورکیا نیو کوردستانن، کادیرانیش هەموویان زێدە ئەزموونی خۆیان نییە، لە گەڕەکی"توزلوچایر" هەندێك پراکتیکمان هەیە، هەرچەندە کوردی عەلەویش بن، بەڵام زۆر دووری کورد کەوتبوون. واتا دەمانتوانی ئەو ئەزموونە بۆ ئەو بازێڕانەش سوودی لێ ببینین. بەڵام تۆ یەکسەر بکەویتە کوردستان و بچین لە دیاربەکر و هەکاری و بینگۆل و ئەو شوێنانە دەست پێبکەین زەحمەت بوو، لەوانەبوو ئەو کادیرانە نەتوانن لەناو گەلدا خەبات بکەن و ئیرادەیان بشکێت، ئەمەش مەترسیداربوو.

لەلایەکی دیکەشەوە، "سیراج بیلگین" کە ئەو کاتە سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان ـ تورکیا (پ د ك-T) بوو، هەڕەشەی لێکردبووین و گووتبووی:" ئەگەر بکەونە کوردستان ئێمە قاچتان دەشکێنین" پێویستبوو ئێمەش وریا بین. ئەگەر لەو شوێنەی ئەوان هەندێك کاریگەرییان هەیە ئێمە دەست بەخەبات بکەین، ئەوا زەبرمان بەردەکەوێت، بۆیە پێویستبوو ئێمە هەنگاو بە هەنگاو بکەوینە کوردستانەوە. هەروەها بازێڕەکانی نزیك تورکیا خوێندەڤان و کرێکاری زۆری تێدا بوو... واتا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەندێك پێشکەوتووتر بوون، بۆیە ئێمە دەتوانین بەئاسانی کاری تێدا بکەین و زووش ئەنجام بەدەستبخەین، دەشتوانین لەو بازێڕانەدا زووتر کادیر پەیدا بکەین و پێداویستی تەڤگەر پێك بهێنین. لەو بازێڕانەدا هەنگاو بەهەنگاو پێشبکەوین. ئێمە ئەوەمان بەبنچینە وەرگرت، ئەمەش ڕاست بوو.

هەڵبەتە ڕاستی ئەمەش لە پراکتیکدا دەرکەوتەڕوو، بۆیە لە عەنتابەوە بگرە تا دێرسیم ئەو خەتەمان بەبنچینە وەرگرت، ئێمە سەرەتا چووینە ئەو بازێڕانەوە. بێگومان ئێمە یەکسەر هەموو کادیرانمان نەخستە نێو ئەو بازێڕانەوە، چ دەبێت و چ نابێت دیار نییە، گووتمان:" سەرەتا با هەندێك کادیر بچین، بزانین دەتوانین ئەنجام وەربگرین یان نا، یاخود چ ئەنجامێك دەردەکەوێت؟ مەترسییەکانی چیین؟ با ئەنجامی خەباتەکە دەربکەوێت، بەگوێرەی ئەنجامی ئەو خەباتەش هەنگاوی نوێ دەهاوێژین".

ئیدی لەکۆتایی (١٩٧٥)دا ئەو هەنگاوانەمان هاوێشت، لەساڵی (١٩٧٦) یش کۆبوونەوەمان لەسەر ئەو پراکتیکە لە "دیکمان" سازدا. ئەو هەنگاوانەی ئێمە هاوێشتوومانە چۆنە و چ ئەنجامێکی بەدەستخستووە؟ لەو پراکتیکەدا کێماسی چییە؟ لایەنی باش چییە؟ گفتوگۆمان لەسەر ئەمە کرد. ئیدی ئێمە بڕیارمان وەرگرت کە ئەو هەنگاوەی هاوێشتوومانە بەهێزتر و تۆکمەتری بکەین. چونکە لەم خەبات و پراکتیکەدا بەدیارکەوت کە ئەو هەنگاوەی تەڤگەر لە کوردستاندا هاوێشتوویەتی دەتوانێت بەهێزتری بکات، چونکە ئەو شوێنانەی ئێمە چووین گرووپمان جێگیر کردبوو، ئێمە بۆخۆمان هەندێك پەیوەندی و کادیرمان دروستکردبوو، جەماوەرێکمان ڕێکخستبوو، هەندێك چالاکیمان ئەنجام دابوو، ئەمەش ئەوەی بەدیار خستبوو کە دەتوانین تەڤگەر مەزنتر بکەین و هەنگاوی تریش بهاوێژین، دەتوانین بچینە هەندێك ناوچەی دیکەش و

کادیری بۆ بنێرین و کار و خەباتیان تێدا بکەین و لەسەر ئەو بنەمایەش تەفگەر بەهێزتر بکەین. ئەمە بەروونی دیار ببوو. ئیدی ئەو هەنگاوەمان لە جڤینی "دیکمان"دا گفتوگۆ کرد و لەئەنجامی ئەو جڤینەدا بڕیارمان وەرگرت کە ئەو هەنگاوە بەهێزتر و قووڵتر بکەینەوە. لەسەر بنەمای ئەو بڕیارەش تەفگەرمان لە کوردستاندا بەهێزتر کرد. هەندێك کادیرمان ناردە باژێڕەکانی دیکە، هەڵبەتە ئێمە دەچووینە هەر جێگەیەك پێشکەوتنمان بەدیدەهێنا. سەرەتا چەپی تورك و گروپە کوردییەکانیش دەیانخواست ڕێگریمان لێ بکەن، بۆ ئەوەی نەتوانین لەو شوێنانە کار بکەین، بەڵام ئێمە سووربووین لەسەر خەبات، لەئاکامی ئەو سووربوونە هەموو کەسێکمان دەخستە نێو گفتوگۆوە، هەڵبەتە لەگفتوگۆکانیشدا ئێمە پڕوپاگەندە و ئاژیتاسیۆنی زۆر بەهێزمان دەکرد، کەس نەیدەتوانی لەبەرامبەر ئێمە وەها پڕوپاگەندە بکات. لە گفتوگۆکاندا ئێمە بەسەردەکەوتین، بۆیە زۆربەیان لەنێو ئەو گفتوگۆیانەدا دەکەوتنە ژێر کاریگەری ئێمەوە، ئێمە ئەو ئاستەنگییەی ئەوانمان بەمجۆرە بێکاریگەر دەکرد، ئیدی بەمشێوەیە خەباتمان پێشخست...

**لەو قۆناخەدا؛ تەفگەرەکە یەکەم شەهید دەدات، کە هەڤاڵ "ئایدن گول" بوو، بەدەستی ڕێکخراوی ڕزگاری گەل ( Halkın Kurtuluşu) شەهید دەکەوێت. بۆچی ئەو هەڤاڵەیان شەهید کرد؟ ئەو پەیامەی لەمیانەی ئەو شەهیدکردنەوە بەتەفگەر درا چی بوو؟ هەڤاڵانی گروپەکە چۆن لەو ڕووداوە نزیك بوونەوە...؟**



شەهید ئایدن گول



**شەهید عەلی دۆغان یلدرم**

لەبنچینەدا، لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا یەکەمین جار هەڤاڵ **"عەلی دۆغان یلّدرم"** لەگەڕەکی **"تووزلوچایر"**ی ئەنقەرە کاتێك کە مەشقی فێربوونی دەمانچەی بە هەڤالان دەدا خۆی قەزای کرد و شەهید بوو. ئەمە بەر لە شەهیدبوونی هەڤاڵ **"ئایدن گول"** روویدا. بەڵام لە کوردستاندا یەکەمین شەهیدی ئێمە هەڤاڵ **"ئایدن گول"**ە، کە لەساڵی (١٩٧٦) لە دێرسیمدا ڕێکخراوی **رزگاری گەل** (Halkın Kurtuluşu) شەهیدیان کرد. پێش ئەوەی ئێمە لە دێرسیمدا خەبات بکەین ڕێکخراوی **رزگاری گەل** (Halkın Kurtuluşu) و **ئەرتەشی رزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی تورکیا** (TİİKKO) و هەموو گروپەکانی چەپی تورك هەبوون، یەکەمین جار بەناوی کوردستان ئێمە لەوێدا دەستمان بەخەبات کرد. بێگومان کاتێك ئێمە دەستمان بەخەبات کرد، ئەو تەڤگەرانەی چەپی تورك لاواز دەبوون و لە کورتیان دەدا، **"ئایدن گول"**یش پێشتر هەڤالێکی ڕێکخراوی **"رزگاری گەل"** بوو، کاتێك ئێمە لەوێ دەستمان بەخەبات کرد، لەوان دابڕا و تەڤلی ئێمە بوو.

## ئەوانە چەپ بوون یان فاشیست بوون؟

ئەوانە چەپی تورك بوون. لە دێرسیمدا فاشیستەکان جێگیر نەببوون، هەمووی چەپی تورك بوون، تەڤگەرەکانی کوردانیش لەوێ نەبوو، ئێمە سەرەتا لەوێ دەستمان پێکرد، لەبەر ئەوەی ئێمە سەرەتا دەستمان بەو خەباتە کرد، لە چەپی تورك دادەبڕان و تەڤلی ئێمە دەبوون، "ئایدن گول"یش لەوانە بوو. "ئایدن گول" لەخوێندنگای ئامادەیی دەیخوێند، ئەوانە بینیان کە ئەگەر رێ لەم دابڕانە نەگرن ئەوا دەتوێنەوە و نامێنن، لە گفتوگۆکانیاندا نەیاندەتوانی رێ لەئێمە بگرن، ئێمە لەهەر جێگەیەك گفتوگۆمان دەکرد کاریگەریمان دروست دەکرد و دابڕان لەوان دروست دەبوو و تەڤلی ئێمە دەبوون. کاتێك بینیان بە گفتوگۆ ناتوانن رێگریمان لێ بکەن، خواستیان بە کوشتن رێگریمان لێ بکەن. چونکە تازە تەڤگەری ئێمە کەوتبووە ئەوێ، هێشتا بەتەواوی خۆی لەوێ بەرێکخستن نەکردبوو، هێشتا تەڤگەریش لەوێ بەتەواوی نەناسرابوو، لێرەدا مەگەر بە کوشتنێکی بەمجۆرە بتوانن پێش لە ئێمە بگرن. وادیارە وەها بیریان کردبووەوە، ئیدی لە خوێندنگای ئامادەیی ئەو هەڤاڵەیان شەهیدکرد. بۆ ئەوەی ترس و شڵەژان دروست بکەن و بەمەش حاکمییەتی خۆیان بەردەوام بکەن و کەس تەڤلی ئێمە نەبێت، ئەوەی تەڤلی ئێمەش بووە لەئێمەی دابڕنەوە.

کاتێك کە هەڤاڵ "ئایدن گول" شەهید کەوت من لەگوندی "باڵك کایا"ی سەر بە ناوچەی "خۆزات" ی دێرسیم بووم. ئێمە هەواڵێکمان پێگەیشت کە لەناو شاری دێرسیم هەڤاڵێك لەلایەن رێکخراوی "رزگاری گەل"ەوە شەهیدکراوە، بەڵام نەمانزانی کێیە؟ رووداوەکە چۆن روویداوە ئەوەشمان نەزانی. بۆیە بەرەبەری ئێوارە بەرێکەوتین بۆ ئەوەی بچینە نزیك دێرسیم، بۆ ئەوەی زانیاری وەربگرین و بەگوێرەی ئەمەش ئەگەر رەوشێك هەبێت بتوانین موداخەلە بکەین، بەڵام لەبەر ئەوەی باوبۆران بوو نەمانتوانی بچینە دێرسیمەوە، ئیدی پاشان گەیشتینە دێرسیم... تا ئێمە گەیشتین تەرمەکەیان ناشتبوو، ئەو کاتە تێگەیشتین کە هەڤاڵ "ئایدن گول" شەهید کراوە، هەڤاڵ "ئایدن گول" کادیرێکی زۆر لە پێشەوەی ئێمە نەبوو، تازە تەڤلی ئێمە ببوو، لە ئامادەیی دەیخوێند، بەڵام پێشتر لە ئامادەیی لەرێکخراوی "رزگاری گەل" خەباتی کردووە، لەبەر

ئەوەی بەناوی ئەوان کاریکردووە و پاشان دابڕاوە، بینیان ئەگەر پێشی ئەمە نەگرن لەوانەیە ئەوانیتریش دابڕێن، بۆ ئەمە شەهیدیان کرد.

ئێمە پۆستەری ئەو هەڤاڵەمان لە کوردستان لەو شوێنانەی خەباتمان تێیدا دەکرد بڵاوکردەوە، هەروەها لە تورکیادا لەهەر شوێنێکی کە ئێمەی لێبووین، بڵاومانکردەوە، پۆستەری ئەو هەڤاڵەمان لەدیوار هەڵواسی. لە پۆستەرەکەشدا شیعرێکی "**نووری دێرسیمی**"مان تێدا نووسیبوو، ئەو شیعرە سەبارەت بە دێرسیم نووسیبووی، شیعرەکە بەناوی "**تۆڵەسەندنەوە**"بوو، پارچەیەك لەو شیعرەمان لەسەر پۆستەرەکە نووسیبوو، کاتێك لە خوێندنگا و زۆر شوێندا لە دیوارمان هەڵواسی زۆر کاریگەری خۆی کرد، هەم لەسەر هەڤاڵان و هەوادارانی ئێمە، هەمیش لەسەر رێکخراوەکانی دیکە کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو. ئەمەش خەباتی ئێمەی بەهێزتر کرد.

ئێمە بەو هێرشەی رێکخراوی "**رزگاری گەل**" هەنگاومان بۆ دواوە نەهاوێشت، ئێمە هەم خاوەنداریمان لە شەهیدی خۆمان کرد، هەمیش خواستمان ئەو شەهیدبوونە بکەینە هۆی بەهێزکردنی تەڤگەرەکەمان. چونکە ئامانجی ئەوان ئەوە بوو و دەیانخواست بەو شەهیدکردنە ترس دروست بکەن، بۆ ئەوەی هەنگاو بۆ دواوە بهاوێژین، ئەمە ئامانجی ئەوان بوو، بۆ ئەوەی رێ لە پەرشوبڵاوبوونەوەی خۆیان بگرن. پێویستبوو ئێمەش هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بهاوێژین، تاکو بتوانین ئەنجام وەربگرین، ئەوەی ئێمە کردمان ئەوەبوو، هەم لە دێرسیم هەمیش لەدەرەوەی دێرسیم، کاتێك بەلێبڕاوانە بەرامبەر ئەو هێرشە راوەستاین و ملکەچ نەبووین، پۆستەرەکەی ئەو هەڤاڵەشمان بڵاوکردەوە، بۆ یەکەمین جاریش وشەی "**کوردستان**"مان بڵاوکردەوە. چونکە لەو پارچە شیعرەی کە لەسەر پۆستەرەکە نووسیبوومان وشەی "**کوردستان**" هەبوو، هەموو کەسێك بەمە سەرسام ببوو، تا ئەو کاتە پۆستەرێکی بەمشێوەیە بەدیوارەوە هەڵنەواسرابوو.

بۆ نموونە؛ گرووپی دیکەی کوردان هەبوون، هیچ کاتێك باسی کوردستانیان نەدەکرد، یەکەمین جار ئێمە بەمشێوەیە کوردستانمان خستە گفتوگۆوە، واتا شەهیدبوونی "**ئایدن گول**" گفتوگۆیەکی بەمجۆرەی لەناو هەموو کەسێك پێشخست و ترسێکی شکاند، چونکە ئێمە ئیدی بەئاشکرا خاوەنداریمان لە کوردستان کرد. تا ئەو کاتە، ئەوەی ناوی کوردستانی نەخستبووە سەر زمانی خۆی و دەترسا، بەمە جورئەتی وەرگرت...

**لەسەرەتای تێکۆشانی گروپدا سێ کەسی گوماناوی تەفلی گروپ دەبن کە "عەبدولڕەحمان، نەجاتی کایا و کەسیرە یڵدرم"ن. ئەو کەسانە چۆن تەفلی تەفگەر بوون؟ چ کار و کردەوەیەکیان لەناو گروپدا کرد؟ ئەگەر دەوڵەت ئەوانەی خزاندبێتە ناو گروپەکەوە ئەوا دەیخواست لەرێگەی ئەو کەسانە بە چ ئەنجامێك بگات؟**

پێشتر "کەسیرە یڵدرم" لەناو چەپی تورك دابوو، لەقۆناخی (ADYÖD)دا کە گفتوگۆ دەکرا و پاڵێوراوان بۆ فراوانکردنی بەڕێوەبەرایەتی (ADYÖD) هەڵدەبژێردران، ئیدی لەو قۆناخە ئەو تەفگەری ئێمەی ناسی و پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێمە بەست و خواستی کە تەفلی ئێمە ببێت. ئەو بینی کە گروپی ئێمە بەهێز و زیرەکە، ئەو گروپە ئەو کاری هەڵبژاردنەی پێشخستووە، ئەمە سەرنجی ئەوی راکێشا، بۆیە دەستبەرداری چەپی تورك بوو و خواستی تەفلی ئێمە ببێت.

### لە چ گروپێکی چەپی تورك دابوو؟

لەگروپی رێگای شۆڕش (DEV-YOL)دا بوو. بێگومان کاتێك کە خواستی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێمەدا دروستبکات و تەفلی ئێمە ببێت، ئەمە بووە هۆی ئەوەی زۆر گفتوگۆ بێتەئاراوە. بۆچی؟ چونکە خێزانی "کەسیرە یڵدرم" بەشداری لە کۆمەڵکوژییەکەی (١٩٣٨)ی دێرسیمدا لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا کردبوو. ئەمە دەوڵەتیش دەیزانی و هەموو کەس دەیزانی، بنەماڵەیەکی سیخوڕ (جاسوس) بوو، لە کۆمەڵکوژی گەلی کورددا بەشدار ببوو، ئەویش کچی ئەم بنەماڵەیە بوو، بۆیە ئێمە گووتمان؛ پێویستە بەشداربوونی ئەو کچە پەسند نەکەین، ئەگەر پەسندی بکەین ئەوا زەرەرمەند دەبین. چونکە ئەو کاتە هەر کەسێك دەڵێت:" کچی سیخوڕێکە، کە لە

کۆمەڵکوژی گەلدا بەشدار بووە، ئەم تەڤگەرە چۆن چۆنی ئەو وەها پەسندی دەکات...؟
ئەمە بۆ تەڤگەر مەترسیدارە".
وەکوتریش له کوردستاندا راستییەك هەیە؛ منالّی سیخوڕانیش دەبنە سیخوڕ. ئەمە راستییەکی تورکیاشە... بۆ نموونە؛ منداڵی پۆلیسەکان دەبنەوە پۆلیس، منداڵی ئەفسەرەکان دەبنەوە ئەفسەر. واتا کولتوورێکی بەمجۆرە هەیە، بۆیە ئێمە گووتمان:" لەوانەیە "کەسیرە"یش سیخوڕ بێت" چونکە خێزانەکەی ئەو هەر سیخوڕێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو سیخوڕێکی مەزنیش بوو، بۆیە گووتمان:" پێویست ناکات وەریبگرین".
بێگومان ئەوکاتە نزیکبوونەوەی سەرۆك بۆ ئەم مەسەلەیە جودا بوو، دەیگووت:" ئێمە "کەسیرە" وەك کەسێك لێی ناڕوانین، بەڵکو ئێمە "کەسیرە" لە کوردستاندا وەکو چینێك یان توێژێك لێی دەڕوانین، ئەویش توێژی سیخوڕانە. چونکە لە کوردستاندا توێژێکی بەمجۆرە هەیە، ئەگەر تۆ دەخوازیت لە کوردستاندا ئازادی پێشبخەیت و ئەنجام وەربگریت و کێشەی کورد چارەسەر بکەیت، پێویستە باش لەو چین و توێژە تێبگەیت و بێ کاریگەری بکەیت. ئەگەر تۆ ئەم چینە بێکاریگەر نەکەیت ناتوانیت کێشەی کوردیش چارەسەر بکەیت، ناتوانیت ئازادی بەدیبهێنیت". دووەمینیش سەرۆك دەیگووت:"راستە بنەماڵەی ئەو بەشداریان لە کۆمەڵکوژی کورددا کردووە و سیخوڕن، بەڵام ئێمە ناتوانین مرۆڤێك بەهۆی بنەماڵە و خێزانەکەیەوە تۆمەتبار بکەین، لەوانەیە ئەو کەسە خاوێن و بێ وەی بێت، ئەگەر خێزانەکەی سیخورە بەو واتایە نایەت ئەویش سیخوڕ بێت، لەوانەیە ئەو کەسێکی دروست بێت". سێیەمینیش: سەرۆك دەیگووت:" ئەم خێزانە خێزانێکی کوردە، دووژمن کردوونی بەسیخوڕ و لە کۆمەڵکوژییەکاندا بەشداری پێکردووە و لەدژی کوردان بەکاریهێناوە، ئێمەش دەتوانین کچی ئەو خێزانە لەدژی خودی خێزانەکە و لەدژی دەوڵەتیش بەکار بهێنین. واتا ئێمە پێچەوانەی بکەینەوە، چۆن دەوڵەت خێزانێکی کوردی لەدژی کوردان بەکارهێناوە، ئێمەش پێویستە کوردان ڤازانج بکەینەوە و لەدژی دەوڵەت بیخەینە جموجۆڵەوە، ئەگەر ئێمە توانیمان ئەمە بکەین دەتوانین ئەنجام بە دەستبخەین، ئەگەرنا زەحمەت و دژوارە" لەرووێکی تریشەوە بەراستی "کەسیرە" ژنێکی زیرەك و زاناش بوو، لە ئەنیستۆی باڵای راگەیاندن و چاپەمەنی سە بە زانکۆی ئەنقەرە دەیخوێند. سەرۆك

دەیگووت:" "گەسیرە" ژنێکە، ئەگەر ئەم ژنە دروست بێت و مرۆڤ قازانجی بکات زۆر سوودی خۆی هەیە بۆ تەڤگەر". چونکە سەرۆك تەنانەت هەر لەو کاتەشدا نزیکبوونەوەیەکی جودای بۆ ژن هەبوو، واتا لەسەر مەسەلەی ژن رادەوەستا و بەهای بە ژن دەدا. هەڵبەتە ژنێکی زانای وەك "گەسیرە"ش کەم پەیدا دەبوو، ئەگەر مرۆڤ بتوانێت ئەو ژنە قازانج بکات ئەوا زۆر سوودی بۆ تەڤگەر دەبێت. هەروەها دەیگووت:" ئەگەر ئێمە "گەسیرە" وەربگرین لەوانەیە دەوڵەت هەندێك حیسابات بکات. چونکە خێزانەکەی خێزانێکی سیخوڕە و لەگەڵ دەوڵەتە، لەوانەیە دەوڵەت وا بیر بکاتەوە کە" دەتوانین لەرێگەی ئەو خێزانەوە و لەرێگەی "گەسیرە"وە تەڤگەرەکە بخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە و کاریگەری لەسەر بکەین" ئەگەر ئێمەش ژیربین دەتوانین ئەمە بۆ خۆمان بەکار بهێنین و سوودی لێوەر بگرین". واتا سەرۆك وەها ئایدیۆلۆژی و سیاسی لە مەسەلەکە نزیك دەبووەوە...

ئێمەش (هەڤالان) لەهەموو روویێکەوە لەمەسەلەکە نزیك نەدەبووینەوە، ئێمە دەمانگووت:" خێزانەکەی سیخوڕە، ئەویش کچی ئەو خێزانەیە، لەوانەیە کچی سیخوڕێك هەر سیخوڕ دەربچێت، سیخوڕیش رێز و حورمەتی لەناو کۆمەڵگادا نییە". بێگومان نزیکبوونەوەی سەرۆك نزیکبوونەوەیەکی راست و زانستی بوو، ئەوەی ئێمە نزیکبوونەوەیەکی عاتیفی و بەکاردانەوە بوو، زێدە بەهای خۆی نەبوو. لەئەنجامی ئەو گفتوگۆیانەدا لەبەر ئەوەی باوەڕیشمان بەسەرۆك هەبوو، ئەو هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیەی سەرۆکیش پێشکەوت، لەئەنجامی ئەو هەڵسەنگاندن و شیکردنەوانەدا ئێمەش پەسندمان کرد کە تەڤلی تەڤگەرەکەی ئێمە ببێت و بەمشێوەیە "گەسیرە" تەڤلی ئێمە بوو و لە ناو ئێمەدا جێگەی گرت.

بەڵام "عەبدولڕەحمان" لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکاندا دەیخوێند، لەوێ سەرۆك و هەڤاڵ "فوئاد" و هەڤالانی تری ناسیبوو، پەیوەندی لەگەڵ هەڤالان بەستبوو، بەمشێوەیە پەیوەندی خۆی لەگەڵ تەڤگەر دروستکرد و تەڤلی ئێمە بوو، هەڵبەتە خوێندکارانی ئەو کۆلێژە زۆربەی زۆری چەپ بوون، ئەوەی چەپیش نەبووایە نەیدەتوانی بچێتە وانەکانەوە. ئەویش لەوێ دەیخوێند و هەڤالان دەناسێت و پەیوەندی خۆی دەبەستێت، وەها تەڤلی ئێمە دەبێت.

بەڵام" پیلۆت" لەرێگەی "عەبدولڕەحمان"ەوە ئێمە دەناسێت و ئەو ئەوی تەڤلی تەڤگەر کرد، "عەبدولڕەحمان" بە ئێمەی گووت:" ئەجاتی کایا( پیلۆت) خەڵکی ناوچەی ئێمەیە ـ واتا خەڵکی ئاگرییە ـ لە دەزگای تورك قوشو (TÜRK KUŞU)دا کەدەزگایەکی مەزنی فڕۆکەوانی مەدەنییە، کاردەکات و ئەویش کوردە و کەسێکی باشە و من دەیناسم، دەخوازێت تەڤلی ئێمە ببێت" ئێمەش گووتمان:" مادام وایە با بێت و بیهێنە، ماد! میناسیت و پاکژە دەخوازێت تەڤلی ئێمە ببێت بیهێنە". "پیلۆت"یش لەرێگەی "عەبدولڕەحمان"ەوە تەڤلی ئێمە بوو. بێگومان ئێمە نەماندەزانی "پیلۆت" کێیە و چییە و چ کارەیە؟ ئەوانە هەر سێکیان بەمشێوەیە تەڤلی ئێمە بوون.

"عەبدولڕەحمان" هەمیشە ئاشقی خۆی بوو، خۆی بەبنەما وەردەگرت و زۆر تاکڕەو و خۆپەرست بوو، هیچ کاتێك لەگەڵ هەڤالاندا یەکانگیر نەدەبووە و ژیانێکی شەخسی بۆ خۆی بەبنچینە وەردەگرت، هەر لەخۆیەوە لەسەر زۆر شت و مەسەلە هەڵیدەدایێ و گفتوگۆی بێسەروبەر و پێچەوانەی دەکرد، بۆیە هیچ هەڤاڵێك خۆشینەدەویست، لێی رازی نەبوون، هیچ هەڤاڵێکیش نەیدەخواست لەگەڵ ئەو کار بکات، هەڵبەتە زێدە لەگەڵ ئێمە نەمایەوە، لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٦)دا نزیکەی دوو ساڵێك لەگەڵ ئێمە مایەوە، پەیوەندیمان لەگەڵی پچڕاند. چونکە هیچ هەڤاڵێك نەیدەخواست لەگەڵیدا کار بکات، دەچووە هەر جێگەیەك دەبووە کێشە، ئێمە بینیمان ئیدی نابێت، بۆیە گووتمان:" با پەیوەندی لەگەڵدا بپچڕێنین" ئیدی پەیوەندیمان لەگەڵیدا پچڕاند.

"پیلۆت" دوای ئەوەی تەڤلی ئێمە بوو، زیاتر دەیخواست لەدەوروبەری سەرۆکدا بمێنێتەوە، لە بنەڕەتدا بە سەرۆکەوە خەریك دەبوو، وەکوتریش نەك لەسەر هەموو هەڤالان، بەڵکو بەهەندێك هەڤاڵی دیکەش خەریك دەبوو. بێگومان ئەمە سەرنجڕاکێش بوو، ئێمە نەماندەزانی "پیلۆت" سیخوڕێکە، پاشان کەوتە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانەوە، گووتمان:" تۆ چۆن چوویتە ئەو کۆلێژەوە؟" گووتی:" من کەسێکم خستە شوێنی خۆمەوە بۆ تاقیکردنەوە، بەمشێوەیە لەتاقیکردنەوە سەرکەوتم" ئێمەش باوەڕمان پێیکرد، چونکە شتی وەها روویدەدا، ئێمە بەخۆشمان زۆر جار لەبری کەسانی تر دەکەوتینە تاقیکردنەوەوە و کەسانی تریش لەبری ئێمە دەکەوتنە تاقیکردنەوەوە. ئەو شتانە زۆر روویاندەدا، بۆیە گووتمان:" دەکرێ شتی وا ببێت، بەڵام پاشان دوای

ئەوەی لەرەوشەکە تێگەشتین، ئێمە تێگەشتین کە شتی وەها نییە، بەڵکو هەر ساڵ، دەوڵەت و ئیستخباراتی تورکیا هەندێك سیخوڕی خۆی دەخاتە ناو هەموو خوێندنگا و زانکۆکانەوە، وەك خوێندەڤان دەیانێرێت، بۆ ئەوەی لەناو خوێندەڤاناندا بمێننەوە و بکەونە نێو تەڤگەرەکانەوە، هەمیش کادیری خۆیان پەروەردە دەکەن. لەهەر خوێندنگا و زانکۆیەکدا کۆنتاژان (کۆتا ـ حصة)ی خۆیان هەیە. بۆ نموونە؛ لەهەر ساڵێکدا لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان‌دا بیست کەس لەکادیرانی خۆیان دەخەنە ئەم کۆلێژەوە و وەك خوێندەڤان دەخوێنن، هەم دەبنە کادیر و پرۆفیشناڵ، هەمیش لەوێدا دەکەونە نێو تەڤگەرەکانەوە و لەناویاندا کاری سیخوڕی دەکەن. چونکە سەرنجیشیان ناکەوێتەسەر.

پیلۆت (نەجاتی کایا)یش وەها کەوتە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان‌ەوە، هەمیش لەپلەی یەکەمیندا خستوویانەتە ئەو کۆلێژەوە، نەك بەتاقیکردنەوە و شتی وەها، بەڵکو بە کۆنتاژان (کۆتا ـ حصة) کەوتۆتە کۆلێژەوە. پاشان تێگەیشتین کە "پیلۆت" هێشتا لەناگری لە ناوەندی و ئامادەییدا دەخوێنێت، ئەفسەرێکی تورك کاریگەری لەسەر حەوت زارۆکی کورد دەکات و بەخۆیانەوە پەیوەستیان دەکات و دەیانکاتە سیخوڕ. کاتێك کە ئامادەییش تەواو دەکەن، هەموویان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە ئەنقەرە، خۆیشی دێتە ئەنقەرە، لە ئەنقەرەش لەگەڕەکی "ئەمەك"دا خۆی جێگیر دەکات و هەر حەوتیشیان دەخاتە زانکۆوە. ئیدی "پیلۆت"یش یەکێکە لەو حەوت کەسانە. "پیلۆت" کەوتە ناو ئێمەوە و ئەوانەی دیکەش کەوتوونەتە نێو گروپە چەپەکانی تورکەوە. بێگومان ئێمە پاشان لەو شتانە تێگەیشتین. وەکو گووتم؛ "پیلۆت" زیاتر لەسەر سەرۆك رادەوەستا، کە سەرۆك بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، بۆ ئەوەی هەمیشە زانیاری بەدەست بخات و بیداتە ئیستخبارات و بەگوێرەی فەرمان و رێنمایی ئیستخبارات هەڵسوکەوت بکات. وەکوتریش لەسەر هەندێك هەڤاڵی تری گروپەکە کە دەناسران و لەپێشەوە بوون رادەوەستا، بۆ ئەوەی بیانخاتە نێو هەندێك چالاکییەوە. بەمەش تەسفیەیان بکات و هەموو گروپەکە بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

لەلایەکی تریشەوە، گروپەکەمان لەرووی ماددییەوە لەنێو تەنگاوی دابوو، گوایە لەرێگەی ماددیەوە هەندێك پێداویستی گروپەکە پێك بهێنێت و بەمەش کاریگەری

لەسەر بکات و بیخاتە دەستی خۆیەوە. ئیدی کاری ئەو ئەمە بوو. ئەو جێیەی "پیلۆت" ئیشی تێدا دەکرد و ئەو مووچەیەی وەریدەگرت و ئەو پارەیەی کە خەرجیدەکرد لەگەڵ یەکتردا بەراوردی بکەیت دەبینیت ئەو پارەیەی خەرجی دەکرد پڕ زێدەتر بوو. ئەمەش سەرنجی سەرۆك رادەکێشێت. دووەمینیش؛ سەرۆك دەبینێت کە "پیلۆت" هەر بەسەرۆکەوە خەریکە، نزیکبوونەوەی لەسەرۆك سەرنج ڕادەکێشێت، بەتایبەتی کە بەردەوام دەیگ " تۆ هەر چییەك بڵێیت جێبەجێی دەکەم و ئامادەم" بۆ نموونە؛ سەرۆك دەڵێت:" سەد هەزار بۆ ئێمە پێویستە" ئەویش دەڵێت:" دابینی دەکەم" ئەم هەموو پارەیە لەکوێ دابین دەکات؟ ئەم شتانە هەمووی سەرنجی سەرۆك رادەکێشێت.

بۆ نموونە؛ دەبینێت بەهەندێك هەڤاڵانەوە خەریك و مژوولە، سەرۆك لەمەوە دەکەوێتە گومانەوە، بۆ ئەوەی گومانی خۆی ساق بکات، "پیلۆت"یش کە زۆر پێداگری لەسەر چالاکی و شتی وا دەکات، سەرۆکیش دەڵێت:" باشە، فلانە رۆژ وەرە گەڕەکی "تووزلوچایر" هەموو هەڤاڵانیش لەوێ کۆدەبنەوە، گفتوگۆ دەکەین و بڕیاری چالاکیکردن دەدەین. ئیدی ئێمە چالاکی دەکەین" بێگومان دەڕوا یەکسەر ئەو زانیارییە بەئیستخبارات دەدات، ئەو رۆژە ئەو جێگەیەی کە سەرۆك باسی لێوە کردبوو، ماڵی هەڤاڵ "مستەفا قەرەسوو" بوو، بە سێ ـ چوار ئەڵقەی پۆلیس و ئیستخبارات دەوروبەری ئەو ماڵە دەگرن. سەرۆك هەڤاڵێك بۆ ئەو ماڵە دەنێرێت و پێی دەڵێت:" برۆ بڕوانە لەدەوروبەری ئەو ماڵە چی هەیە؟" ئەو هەڤاڵەش دەچێت و دەبینێت ئەو شوێنە هەمووی تۆق دراوە. ئەو هەڤاڵەش دەگەڕێتەوە و بەسەرۆك دەڵێت:" ئەو شوێنە بە پۆلیسی مەدەنی و نا مەدەنی دەورە دراوە" ئیدی مەسەلەکە ئاشکرا دەبێت و مەسەلەی "پیلۆت" ئاشکرا دەبێت. هەڵبەتە دوای ئەمە سەرۆك و تەڤگەر تەدبیریان وەرگرت. دەوڵەت بە "پیلۆت"ی گووت:" تۆ پێویستە خراپی خۆت خاوێن بکەیتەوە" بۆیە خواستی سەرۆك لەناو ببات، هەر لەهەوڵی ئەمەدا بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی تەدبیرمان وەرگرتبوو، نەیتوانی ئەمە بکات. پاشانیش دەوڵەت "پیلۆت"ی لەکودەتای (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) لە ئەدەنە لەژێر ناوی رووداوی ترومبێلەوە کوشت.



هەڤاڵ مستەفا قەرەسوو

**"كەسیرە"**ش تەڤلی ئێمە بوو، پاشان سەرۆك زەواجی لەگەڵدا كرد، سەرۆك دەیخواست بەڕاستی **"كەسیرە"** قازانج بكات. واتا دەیویست **"كەسیرە"** لەهەموو روویێكەوە بكەوێتە خزمەتی تەڤگەرەوە، بەڵام **"كەسیرە"**ش دەیخواست سەرۆك بخاتە ژێر كۆنترۆڵی خۆیەوە، هەوڵێكی بەمجۆرەی هەبوو. بۆ نموونە؛ **"كەسیرە"** هیچ حیسابێكی بۆ هەڤاڵانی دیكە نەدەكرد و بەهەندی وەرنەدەگرتن و رێزیشی لەوان نەدەگرت، هەموو هەوڵێكی بۆ سەرۆك بوو كە چۆن سەرۆك بخاتە ژێر كۆنترۆڵی خۆیەوە، بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر كۆنترۆڵی خۆیەوە هەموو ئوسلوب و شێوازێكی بەكار دەهێنا، بەڵام بێگومان سەرۆك هیچ كاتێك ئەمەی پەسند نەكرد و نەكەوتە ژێر كۆنترۆڵی **"كەسیرە"**وە. تەنانەت رۆژێكیان لە ئامەد (دیاربەكر) لە ماڵێكدا كە هەڤاڵ **"محەمەد خەیری دورمووش"**یش لەوێ بوو، من و هەڤاڵ **"كەمال"** و سەرۆك و **"كەسیرە"**ش هەبووین. مشتومڕێك لەنێوان سەرۆك و **"كەسیرە"**دا دەركەوت. بینیم زۆر سوكایەتی بە سەرۆك دەكات،

سەرۆكیش لەبەر ئەوەی ئێمە لەوێ بووین زێدە دەنگی نەكرد، لەماڵەكە دەركەوت و چوو، دوای ئەوەی سەرۆك لە ماڵ دەرچوو، هەڤاڵ "محەممەد خەیری" بە "كەسیرە"ی گووت:" تۆ بۆچی وا دەكەیت؟" بینیم وەها هاتەسەر ئەو هەڤاڵە زۆر سەیر بوو، ئەو كاتە بە هەڤاڵ "محەممەد خەیری"م گووت:" پێویست ناكات، لەگەڵ ئەمەدا گفتوگۆ و شتی وا نابێت" من دەركەوتم و چووم. پاشان هەڤاڵ "كەمال پیر"م بینی و پێیم گووت:" ئیدی رەوشی "كەسیرە" زۆر جددییە، ئەم هەموو سوكایەتییە بەسەرۆك دەكات و یاری بە ئەعسابی سەرۆك دەكات، ئێمە پێویستە چارەیەك بۆ ئەمە ببینینەوە" گووتمان:" پێویستە ئێمە سزای ئەو بدەین ـ واتا بیكوژین ـ بەڵام ئەگەر بە سەرۆك بڵێین و بە تەڤگەر بڵێین پەسندی ناكەن، با ئێمە بەبێ ئاگاداری ئەوان ئەمە جێبەجێ بكەین و ئەو بەرپرسیارێتییە پێك بهێنین و ئەم تەڤگەرە و سەرۆك لەو كەسە رزگار بكەین، ئەمە زۆر مەترسیدارە" پاشان هەڤاڵ "كەمال" گووتی:" كاتێك كە ئێمە ئەو كەسەمان تەفلی خۆمان كرد، هەندێك گفتوگۆ دروستبوو، ئێستا ئەگەر ئێمە ئەو شتە بكەین بۆ تەڤگەر باش نابێت، چونكە دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەت هێرش بكاتە سەر تەڤگەرەكەمان و زەرەر لە ئێمە بدات، چونكە ئێمە بەتەواوی خۆمان رێكنەخستووە، بۆیە ناتوانین لەژێر باری ئەمەدا دەربكەوین و با ئێستا وەها بمێنێتەوە" ئیدی ئێمە دەستبەرداری بووین و نەمانكرد. بێگومان ئەو مەسەلەیەمان بەهیچ كەسێك نەگووت...

"كەسیرە"ش بینی ئەو شێوازانەی بەكاری دەهێنێت ئەنجامگیر نابێت، لە كەشوهەوای كۆنگرەی سێیەمدا، خواستی هەندێك تەفلیهەڤی (ئاڵۆزی) و پیلانگێڕی پێشبخات، بۆیە دەستگیركرا و دادگایی كرا، دادگاش سزای لەسێدارەدانی بۆ بڕییەوە. بێگومان سەرۆك هیچ كاتێك لەسێدارەدانی پەسند نەكردووە، بۆیە ئەم بڕیارە پێك نەهات و پێكنەهێنرا. چونكە سەرۆك لەسێدارەدانی بەڕاست نەزانی. ئیدی لە ریزی پارتی دەركرا و بڕیار درا لەچوارچێوەی بەرەی رزگاری نەتەوەیی كوردستان (ERNK)دا كاربكات، تا خۆی دەسەلمێنێت كە كەسێكی دروستە، بۆ ئەو مەبەستەش رەوانەی یۆنانستان كرا، هەڵبەتە لەوێش هەڵات و رۆیشت و لەئێمە دابڕا.

فاتمە (كەسیرە) هیچ كەسێكی بەشداری ئەو تەڤگەرە نەكرد، تەنیا خۆی هات و پاشان كچێكی بە رەگەز یۆگسلاڤ بەناوی "نادیرە"ی بەشدار پێكرد، ئەو كچەش لە توركیا

دەیخوێند. وەکوتر کەسێکی تری تەقلی ئەو تەڤگەرە نەکرد، هیچ کاتێك لەگەڵ ئەو تەڤگەرەشدا نەبووە یەك. بەڵام زۆر زیرەك بوو، توانستی خۆی زۆر بوو، هیچ کاتێکیش ئەو زیرەکی و توانایەی خۆی نەخستە خزمەت تەڤگەرەوە، هیچ کاتێك رێزی هەڤاڵانی نەدەگرت، هەموو شەڕی ئەو لەدژی سەرۆك بوو. واتا دەیخواست سەرۆك تەسلیمی خۆی بکات و بیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، کاتێك بینی ئەمەی بۆ مەیسەر نابێت، خواستی سەرۆك و تەڤگەر خراپ بکات، بۆ ئەمەش هەموو شێواز و رێگایەکی بەکارهێنا، هەڵبەتە تەڤگەر رێگەی ئەوەی لێگرتبوو، لەسەر ئەمە دادگایی کرد، کە بینی ئەمەش سەرناگرێت، لەئەنجامدا دابڕا و رۆیشت.

## ئەو سێ کەسە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبوو؟

ئێمە نازانین پێشتر پەیوەندییان بەیەکەوە هەبوو یان نا، بەڵام لەناو تەڤگەردا پەیوەندییەکی بەرچاویان بەیەکەوە دیارنەبوو. ئەگەر پێشتر پەیوەندییان بەیەکەوە هەبووە یان نا ئێمە ئەو شتە نازانین.

## باسی کەسێکتان کرد بەناوی "قەمەر ئۆسکان". لەدوای رووداوی شەهیدبوونی "ئیبراهیم کایپاك کایا" و هاوڕێکانیدا ئەو" قەمەر ئۆسکان"ە لە پاشماوەی ئەو گروپەدا بەشداری لەگروپەکە دەکات...ئەمە بە چ نیازێکەوە بەشداری گروپەکە دەبێت؟

گروپەکەی "ئیبراهیم کایپاك کایا" بەناوی ئەرتەشی رزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی شۆڕشگێری تورکیا (TİİKKO) بوو، "ئیبراهیم کایپاك کایا" سەرۆکی ئەو تەڤگەرە بوو، لەساڵی (١٩٧٢) دا دەستگیرکرا و لە زیندانی دیاربەکردا بە ئەشکەنجە کووشتیان. ئەو کەسە لەو گروپەدا بوو. کاتێك "ئیبراهیم کایپاك کایا" و هاوڕێکانی لە دێرسیم لەمیانەی ئۆپەراسیۆنێکدا دەستگیرکران، "قەمەر ئۆسکان" ئێشکگر

(نۆبەتچی)ی دوایی بووە. "ئیبراهیم کایپاك کایا"ش بەرلەوەی بکوژرێت لەنووسینێکی خۆیدا دەڵێت:" پێویستە لێپرسینەوە لەگەڵ دوا نۆبەتچی بکرێت" مەبەستیشی "قەمەر"بووە. "قەمەر" ئەو کاتە دەستگیرنەکرا و نەکەوتە دەست دەوڵەتی تورکیاوە. ئیدی کاتێك ئێمە لە دێرسیم دەستمان بەخەبات کرد، لەوێ هەڤالانی ئێمە دەناسێت و پەیوەندی لەگەڵ هەڤالان دەبەستێت.

هەڵبەتە ئەو کاتە (TİİKKO) زەبری بەرکەوتبوو و پەرشوبڵاو ببوو، ئەویش، گوایە دەوڵەت بەدوایدا دەگەڕێت، خۆی شاردبۆوە. ئیدی هەڤالانیش گووتیان:" ئەوە هەڤاڵی ئیبراهیم کایپاك کایا و ئەوانە" ئێمەش ئەومان بەهادار بینی و بەمشێوەیە پەیوەندیمان لەگەڵیدا پێشخست. ئێمە نەمانزانی بوو ئەو کەسە هەمان ئەو کەسە بووە کە دوا نۆبەتچی بووە، هەمان ئەو کەسە بووە کە ئیبراهیم کایپاك کایا دەڵێت:" پێویستە حیسابی لێبپرسن" ئێمە بۆخاتری ئیبراهیم کایپاك کایا بەها و نرخمان پێیدا و تەڤلی خۆمادمان کرد، تەنانەت ئێمە لە کۆبوونەوەکەی "دیکمان"دا لەئاستی بەرپۆمەرایەتیدا ئەرکیشمان پێی سپارد. بەڵام دوای ئەوەی گەڕایەوە دێرسیم هیچ کار و خەباتێکی نەکرد و خواستی پەیوەندی و توانستەکانی تەڤگەرەکە بۆ خزمەتی شەخسی خۆی بەکار بهێنێت. بێگومان ئێمە ئەوەمان پەسند نەکرد و پێمان گووت:" دروست بە، ئێمە ئەم هەموو بەهایە بە تۆ دەدەین، لە ئەخلاقی ئەم تەڤگەرەشدا ئەوە نییە کە تۆ لەسەر حیسابی تەڤگەر ژیانێکی شەخسی بژیت، ئەگەر تۆ دەخوازیت کار بکەیت دەبێت بەگوێرەی ئەم تەڤگەرە و کولتوور و ئەخلاقی ئەم تەڤگەرە کار بکەیت، ئەگەرنا تۆ دەتوانیت لەدەرەوەی ئەم تەڤگەرەدا بمێنیتەوە و دەخوازیت چ بکەیت بیکە" ئێمە بەمشێوەیە پەیوەندیمان لەگەڵیدا پچڕاند...

**لەو قۆناخەدا؛ لەلایەکەوە هەم دەوڵەت هێرش بۆ سەر تەڤگەر دەهێنێت، هەمیش لەلایەکی دیکەوە هێزە چەپگەرەکان، فاشیستەکان، کوردییەکانی وەکو ڕێکخراوەکانی "ستێرکا سۆر، ڕزگاری گەل، (DDKD) و هاوشێوەکانیان هێرش دێننە سەر**

**تەڤگەرەکەتان، بۆچی ئەم هەموو هێرش و دژایەتیکردنە؟ بۆچی هێزە چەپ و کورد و فاشیستەکان و دەوڵەت هەموویان بەیەکەوە هێرش و دژایەتی ئەم تەڤگەرە دەکەن؟**

سەرەتا دەوڵەت بەئاشکرا نەهاتە سەر ئێمە، دەوڵەت چ تاکتیکێکی بەڕێوە برد؟ گروپەکانی چەپی تورك، گروپە کوردییەکان، فاشیستەکان هەر هەموو ئەو گروپانەی لەدژی ئێمە خستە جموجۆڵەوە و پاشان ئاغا و سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان و هەندێك عەشیرەتیان لەدژی ئێمە خستەگەڕ، کاتێك بینی بەمانە ناتوانێت ئەنجام بەدەستبخات، تادێت تەڤگەریش پێشدەکەوێت و مەزن دەبێت، ئیدی ناچاربوو خۆی هێرش بکاتە سەر تەڤگەر، بۆچی سەرەتا خۆی هێرشی نەکرد؟ ئەگەر سەرەتا خۆی هێرشی بکردبایە وەکو ئەوە وابوو هەبوونی تەڤگەری پەسند کردبێت و ڕەوایەتی پێدەدا. بۆیە بەئاشکرا نەدەهاتە سەر تەڤگەرەکەوە، چونکە ئەگەر دەوڵەت هێرش بباتە سەر تەڤگەرێك ئەمە هەر کەس دەڵێت:" کەواتە ئەم تەڤگەرە تەڤگەرێکی بەهێزە، بۆیە دەوڵەت هێرشی دەباتە سەر، ئیدی بەهیچ شێوەیەکی دیکە ناتوانێت ڕێگڕی لەم تەڤگەرە بکات بۆیە دەوڵەت وەها بەئاشکرا و بەهەموو توانست و هێزی خۆیەوە دەستی بەهێرش کردووە". بەمەش ئەم تەڤگەرە لەناو گەلدا زیاتر ڕێزی لێدەگیرێت و بەهێزتری دەکات. دەوڵەتی تورکیا نەیدەخواست بەمشێوەیە تەڤگەر بناسرێت، سەرەتا گووتی:" پێویست ناکات بەهێزی خۆم هێرشی ببەمە سەر، دەتوانم بەرێگەی تەڤگەرەکانەوە؛ چ تورك بن یان کورد، یان گروپە فاشیستەکان بن زەبر لەو تەڤگەرە دەوەشێنم و ڕێ لەپێشکەوتنی دەگرم و تەسفیەی دەکەم". حیساباتێکی وەهای کرد، تاکتیکێکی وەهای پەیڕەو کرد. پاشان بینی ئەمەش بەشی تەسفیەکردن ناکات. ئیدی هەندێك ئاغا و عەشیرەتی کوردیشی خستەگەڕ، بۆ ئەوەی بیانخاتە نێو شەڕی دژ بەئێمەوە. تاکو هەر کەس بکاتە دووژمنی ئەو تەڤگەرە و گۆشەگیر و هەناسەبڕی بکات، بەو شێوەیە بیخنکێنێت و زەبری لێبدات... تاکتیکی بەمجۆرەیشی بەڕێوەبرد.

بۆ نموونە؛ ئەو کاتە لە کونسوڵخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە (چوکورئاوا)دا سیخوڕی ناوەندی ئیستخباراتی ئەمریکی (CIA) هەن و لەوێ کاردەکەن. حوکمی "شاه" لە ئێراندا باڵادەست بوو، لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناویندا ناوەندی (CIA) تاران بوو. هەموو زانیارییەکان لەوێ لە سەفارەتی ئەمریکا لە تاران کۆدەکرایەوە. کاتێك کە حوکمی "شاه" رووخێنرا و شۆڕشی خەڵکی ئێران بەرپابوو، ئەو سەفارەتە لەلایەن ئێرانییەکانەوە دەستی بەسەردا گیرا. ئەو بەڵگانەی لەسەفارەتەکەدا هەبوون هەموویان بڵاوکردەوە. هەم بەنوسخەی ئەسڵی و هەمیش بە وەرگێڕدراوی بڵاوکرانەوە. منیش ئەو بەڵگانەم خوێندەوە، لەو بەڵگانەدا، کونسوڵییەی ئەمریکا لە "ئەدەنە" زانیاری بۆ سەفارەتی ئەمریکا لە"تاران" دەنێرێت... تێیدا چ دەڵێت؟ دەڵێت:" چەپی تورك، گروپە کوردییەکان نە بۆ ئێمە نە بۆ تورکیا مەترسیدار نین. بەڵام تەڤگەرێك هەیە بەناوی "ئاپۆچی" تادێت ئەو تەڤگەرە پێشدەکەوێت و بەهێز دەبێت. ئەمەش زۆر مەترسیدارە، پێویستە لەبەرامبەر ئەو تەڤگەرە هەندێك تەدبیر وەربگیردرێن. یەکەم: پێویستە شەخسی ئاپۆ بەئامانج وەربگیردرێت، بە چ بێزار و توورە دەبێت؟ لەو چوارچێوەیەدا پڕوپاگەندە لەسەر ئاپۆ بکرێت، بۆ ئەوەی کەسێتی ئەو لاواز و ناشیرین بکرێت، تاوەکو لەنێو گەلدا بچووك ببینرێت. دووەم: پێویستە عەشیرەتەکان چەکدار بکرێن و لەدژی ئەو تەڤگەرە بخرێنەگەڕ. سێیەم: پەیوەندی نێوان ئەم تەڤگەرە و تەڤگەرەکانی دیکە خراپ بکرێت. لەنێوانیاندا شەڕ و ئاژاوە بنرێتەوە، کەوا بتوانرێت ئەو تەڤگەرە گۆشەگیر بکرێت و بێکاریگەر ببێت".

هەڵبەتە ئەوەی لەو قۆناخەشدا لەدژی ئێمە پەیڕەو دەکران ئەو شتانە بوون. واتا ئاشکرا بوو کە لەپشت ئەو شتانە هەندێك دەوڵەت هەن. چونکە شەڕی ئێمە و گروپە چەپەکان و کوردییەکان و عەشیرەتەکانی کورد بێ هۆکار نەبوون. هەڵبەتە ئەو کاتەش ئێمە هەڵسەنگاندنی وەهامان دەکرد، واتا دەمانگووت:" لەپشت ئەم هێزانە هەندێك دەوڵەت هەن، هەندێك لەدەزگا ئیستخباراتییەکان هەن، ئەوانە هەر لەخۆڕا ئەو شتانە ناکەن، چونکە هیچ کاتێك لەدژی ئەو هێزانە دەستمان نەدابووە چەك، ئێمە ئامانجێکی وەهامان نەبوو کە ئەوانە لەناو ببەین. ئێمە دەمانخواست لە کوردستان کاربکەین. کاتێك ئێمە دەستمان بە کار کرد بینیمان ئەو هێزانە هەموو هێرشیان بۆهێناین.

لەراستیدا ئێمە شەڕی ئایدیۆلۆژیمان پێشدەخست، لەشەڕی ئایدیۆلۆژیشدا دەیاندۆڕاند، ئەمجارە بینیمان بە چەك هێرشیان کردە سەرمان. ئیدی "ئایدن گول" بەمشێوەیە شەهیدکرا. هەڵبەتە پاشان ئەو هێرشانە بەمشێوەیە بەردەوام بوو. زۆرێك لە هێز و گروپە چەپڕەوەکان و کوردییەکان لەنێوان خۆیاندا لەدژی ئێمە بەرەیەکیان ئاواکرد. **کۆمەڵەکانی کولتووری دیموکراتی شۆڕشگێڕ** (DDKD) و **رزگاریخوازانی نەتەوەیی کوردستان ـ کوك** (KUK) و **رزگاری** (RIZGARİ) و **ئاڵای رزگاری** (ALA RIZGARİ) و **رێگای ئازادی** (ÖZGÜRLÜK YOLU) هەر هەموویان، لەبەرەیەکدا بەناوی **یەکێتی هێزە دیموکراتی و نەتەوەییەکان** (UDG) گەیشتنە یەك و لەدژی ئێمە کاریان کرد. ئیدی **کوك** (KUK) هێرشی ئێمەی کرد، زۆر هەڤاڵی ئێمەیان شەهید کرد. ئەو بەرەیە هاوکاری (KUK)یان کرد. لەشارەکانی "وان" و "دیاربەکر"یشدا **رێگای ئازادی** (ÖZGURLÜK YOLU) و **کۆمەڵەکانی کولتووری دیموکراتی شۆڕشگێڕ** (DDKD) هەڤاڵانیان شەهید دەکرد. واتا لەهەر شوێنێك کە کوك (KUK) هەبوو ئەو شەڕی ئێمەی دەکرد، لەهەر شوێنێکیش کە **رێگای ئازادی** (ÖZGURLÜK YOLU) یان (DDKD) هەبوو ئەوانەش هێرشان دەکردە سەر ئێمە. تەنانەت تا ئەوکاتە پۆلیسێك، سەربازێك، سیخوڕێکیان نەکوشتبوو، کەچی ئەوانە بەدەیان هەڤاڵی ئێمەیان شەهید کرد. لە چەپی تورکیشدا رێکخراوی رزگاری گەل و ئەوانەش گەلێك هەڤاڵی ئێمەیان شەهید کرد. لەلایەکی دیکەشەوە فاشیستەکان هێرشیان دەکردە سەرمان. هەروەها عەشیرەتە کوردییەکان و ئاغاکانیش؛ وەك عەشیرەتی "سلێمانان" و "بوجاق" و ئەوانەش هێرشیان دەکرد، لەبەرامبەر هەموو ئەو هێرشانە تەفگەر خۆی پاراست. ئیدی ناچار بوو خۆی بپارێزێت؛ دەبووایە یان تۆ لەبەرامبەر هەموو ئەوانە شەڕ بکەیت و لەبەرامبەر هێرشی ئەواندا رابوەستیت و خۆت بپارێزیت، یانیش تۆ تەسلیم ببوویتایە، لەهەر دوو بژاردا دەبووایە یەکێکیان بگریتەبەر. بێگومان ئێمە نەماندەتوانی تەسلیم ببین، ئەگەر تەسلیم ببووینایە کۆتاییمان پێدەهات و نەدەماین، پێویستبوو خۆمان بپارێزین. ئیدی ئەگەر لەبەرامبەر ئەو هێزانە بەرگریمان لەخۆمان کرد، لەبەر ئەوە بەرگریمان لەخۆمان کرد، هیچ کاتێك ئێمە دەستمان بە شەڕ نەکردووە و نەمانخواستووە لەبەرامبەر ئەواندا ئێمە شەڕ بکەین. ئەوانە دەستیان

بەشەڕ کرد و شێوازی شەڕیان بەبنەما وەرگرت و خواستیان بەم شێوازە زەبر لەئێمە بدەن و ئیرادەی ئێمە بشکێنن و بمانخنکێنن، ئێمەش لەبەرامبەر ئەوە ناچار بووین خۆمان بپارێزین، ئەگەر ئێمە خۆمان نەپاراستبایە، هەرگیز نەدەتوانرا تەڤگەرەکەمان بەردەوام ببایە و تا ئەمڕۆ هاتبایە. هەر لەو کاتەدا تەڤگەرەکە کۆتایی پێدەهات. هەڵبەتە ئامانجیشیان ئەمە بوو.

بۆ نموونە؛ هەندێك بەرپرسیاری تورکیاش بەگوێری ئەوە لێدوانیان دەدا. ئەو کاتە "حەسەن فەهمی گونەش" وەزیری ناوخۆ بوو، بەئاشکرا لێدوانی دەدا. هەندێك بەرپرسیاری تورکیای ئەو کاتە دەیانگووت:" پێویستە بەو شێوەیە ئەو تەڤگەرە گۆشەگیر بکەین و تەسفیەی بکەین". هەروەها ئەو کاتە "کەمال یاماك" هەبوو بەرپرسیارێکی سەربازی بوو لە ئامەد، ئەو دەیگووت:" ئێمە لەدژی کورد و تەڤگەری کورد نین، ئێمە لەدژی ئاپۆچییەکانین، پێویستە هەموو کەس لەدژی ئاپۆچییەکان رابوەستێت" واتا بەمشێوەیە ئۆرگانیزەشیان دەکرد. ئەم شتانە هەمووی بە بەڵگە و دیکۆمێنتیش هەن و ماون. "حەسەن فەهمی گونەش" دەیگووت:" ئێمە پێویستە هاوکاری ئەوانە بکەین کە لەدژی (PKK) رادەوەستن". لێدوان و قسەی بەمشێوەیان دەکرد. هەڵبەتە لە پراکتیکیشدا ئەوەی دەیانکرد هەر ئەوە بوو، بەڕاستی لەناو ئەم هەموو هێرشەدا زۆری نەمابوو بخنکێین. رەوشێکی وەهابوو. گروپە کوردییەکان، گروپە چەپڕەوەکان، گروپە فاشیستەکان، عەشیرەتەکان و ئاغاکان هەموو کەس هێرشیان دەکردە سەرمان. بێگومان تەڤگەرێك کە لەبەرامبەر هەموویان رادەوەستا هەروا ئاسان نەبوو، زۆر زەحمەت بوو، تۆ هەم لەبەرامبەر ئەو هەموو هێزانە و هەمیش لەبەرامبەر دەوڵەت رابوەستیت زۆر زەحمەت بوو. لەوەدا ئێمە گەلێك شەهیدمان دا و زیانمان زۆر بەرکەوت. لەو قۆناخەدا تا ساڵی (١٩٧٩) نزیکەی سەد هەڤاڵی ئێمە شەهید بوون. تەنانەت دەوڵەتیش هێندە زیانی بەئێمە نەگەیاند بوو. دوای ساڵی (١٩٧٩) بەدواوە هەندێك حەساینەوە. واتا تەڤگەر لەو شەڕانەدا هەندێك خۆی چەسپاند و لەرووی بەجەماوەریبوونەوە گەشەی کرد. ئیدی نەیاندەتوانی بەو هێز و گروپانە رێگری لەئێمە بکەن. ئیدی هێدی هێدی دەوڵەت خۆی کەوتە دەورەوە، بەئاشکرا کەوتەگەڕ.

**ئەو راپۆرتانەی کونسوڵییەی ئەدمنە کەی نووسرابوون؟ چونکە لەدوای شۆڕشی گەلانی ئێران لە (١٩٧٩) بلاوکرانەوە...**

بەتەواوی بیرم نایەتەوە، بەلام لەوانەیە راپۆرتی ساڵی (١٩٧٧) و (١٩٧٨) بن.

**ئەو کاتە هێشتا (PKK) ناوی نەبوو...**

بەڵێ، هێشتا (PKK) دروست نەببوو، چونکە راپۆرتەکە دەڵێت:" ئەو تەڤگەرە ناوی "ئاپۆچی"یە و ئەو ناوەشی لە "ئاپۆ"وە وەرگرتووە".

**لەئەنجامی ئەو هێرشانەدا، رووداوی شەهیدبوونی هەڤاڵ " حەقی قەرار" روودەدات، ئەو رووداوە چۆن روودەدات و کێ لەپشت ئەو رووداوەوە بوو؟ هەروەها بۆچی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بەئامانج دەگیردرێت؟ ئەو هەڵوێستانەی لەنێو تەڤگەردا لەبەرامبەر ئەو رووداوە دەرکەوتنە پێش چیبوون؟ ئەو ئەنجامەی ئەو رووداوە لەگەڵ خۆی هێنای چیبوو؟**



**شەهید حەقی قەرار**

هەڤاڵ **"حەقی قەرار"** لە (١٨)ی گوڵانی (١٩٧٧)دا لە شاری عەنتاب شەهیدکرا، ئەوەی هەڤاڵ **"حەقی قەرار"**یشی شەهید کرد رێکخراوێك هەبوو بەناوی **ستێرکا سۆر** (STÊRKA SOR) ئەو رێکخراوە ئەو هەڤاڵەی شەهید کرد، سەرۆکی ئەو رێکخراوەش ناوی **"عەلائەددین قاپان"** بوو، ئەو کەسە بەرەگەز کورد بوو و پێشتر لەناو رێکخراوێکی چەپی تورك دابوو بەناوی **ئەرتەشی رزگاری گەلی تورکیا** (THKO). **"دەنیز گەزمیش"** سەرۆکی (THKO) بوو، کە لەرێکخراوەکەدا کاری دەکرد دەستگیرکرابوو، لە زینداندا بوو، دوای دەرکەوتنی لە زیندان رێکخراوی **ستێرکا سۆر** (STÊRKA SOR)ی دروستکرد. ئەوەی لە **"ستێرکا سۆر"**دا جێیان دەگرت هەندێك لەو کەسانە بوون کە پێشتر لە **پارتی دیموکراتی کوردستان ـ** تورکیا (پ د ك-T) دابوون، هەندێکیش لە **ئەرتەشی رزگاری گەلی تورکیا** (THKO) کە چەپی تورکیا بوون، هەندێکیش ئەوانە بوون کە بەخۆیان دەگووت:" ئێمە **کاوەچی** (KAWACI)ین، **"ستێرکا سۆر"** لەوانە پێکهاتبوو. بێگومان گروپێکی سیخوڕی بوو. **میت** (MİT)

دروستیکردبوو، بەناوی رێکخراوێکی کوردییەوە دروستیکردبوو، ئامانجیشی بەتەواوی ئەوەبوو کە چۆن بتوانن تەڤگەری ئێمە تەسفیە بکەن، بەتەواوی تەسفیەکردنی ئێمەیان بۆ خۆیان بەئامانج وەرگرتبوو، واتا دەوڵەت دروستیکرد بوو. بەڵام بەناوی کوردایەتی دەیانخواست ئەو ئامانجە بپێکن. بەمشێوەیە خۆیان پەردەپۆش بکەن، تاکو کەس راستینەی ئەوان نەزانێت. "عەلائەددین" کەسێکی بێ کەسێتی بوو، کەسێکی سەرسەری و لومپەن بوو، ئێمە پێشتریش لە ئەنقەرە دەمانناسی. کاتێك هەڤاڵ "حەقی قەرار" سەرەتا لە ئەنقەرە چووە ئەدەنە کار بکات، لەوێش ئەوی بینیبوو، کاتێك هەڤاڵ "حەقی قەرار" دەچێتە عەنتاب دەست بە کار دەکات ئەوانیش دەچنە عەنتاب، گوایە بۆ ئەوەی لەوێ "ستێرکا سۆر" دەست چالاك بکات. لەوێ هەڤاڵ "حەقی قەرار" بە هەڤاڵان دەڵێت:" ئەو "ستێرکا سۆر"ە مەترسیدارە، با هەڤاڵان وریا بن، ئەوە رێکخراوێکی سیخوڕانە، ئامانجی ئەوانیش ئەوەیە کە دەخوازن ئێمە تەسفیە بکەن، با هەڤاڵان خۆیان لەوان بەدوور بگرن و وریا بن، بۆ ئەوەی ئێمە لەدەستی ئەوان زیان نەبینین" بەمشێوەیە هەڤاڵان ئاگادار دەکاتەوە.

ئیدی لەنێو ئێمەدا هەندێك هەڤاڵ لەگەڵ ئەواندا دەکەونە نێو پەیوەندییەوە، گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەن، دوای ئەم گفتوگۆیە دەڵێن:" با کاتێك دابنێین یەکتر ببینینەوە بۆ ئەوەی ئەم گفتوگۆیە بەردەوام بکەین، با هەڤاڵی ئێوەش و هەڤاڵی ئێمەش بێن ئەو کاتە گفتوگۆ بکەین". ئەو هەڤاڵانە دێن بە هەڤاڵ "حەقی قەرار" دەڵێن:" ئێمە کفت (موعد)ێکمان داناوە، لەرۆژی (١٨)ی گوڵان، لەگەڕەکی نووری پازار باشی (NURİ PAZAR BAŞI) لەچاپخانەی فلان...". هەڤاڵ "حەقی قەرار"یش بەوان دەڵێت:" ئێوە هەڵەتان کردووە، ئێوە بۆچی ئەو موعیدەتان داناوە، من بەئێوەم گووتبوو کە لەگەڵ ئەوانە نەکەونە نێو پەیوەندییەوە، ئەوانە مەترسیدارن. ئەوانە دەخوازن ئێمە تەسفیە بکەن، پێویستبوو ئێوە ئەو مەوعیدەتان لەگەڵیاندا دانەنابایە" هەڤاڵان دەڵێن:" تازە موعیدەکەمان داناوە، جا نازانین ئێمە نەچین باش نابێت" هەڤاڵ "حەقی قەرار" دەڵێت:" مادام وایە پێویستە ئێمە بەتەدبیرەوە بچین" هەندێك هەڤاڵ پێشتر بۆ ئەوێ دەنێرێت و دەڵێت:" بچنە ئەو شوێنە و تەدبیر وەربگرن، پاشان ئێمەش دێین" ئەو هەڤاڵانە بە پاسی شارەوانی دەچنە شوێنی موعیدەکە، درەنگ دەگەنە ئەوێ،

هەڤاڵ "حەقی قەرار"یش دەچێتە گەرەکی "خۆش گوردوو" لەوێ ماڵێکی ئێمە هەبوو، دەمانچەی لێبوو، دەخوازێت دەمانچەکە وەربگرێت و لەوێش هەندێك هەڤاڵ لەگەڵ خۆیدا ببات و بچێتە شوێنی موعیدەکە. واتا بەتەدبیرەوە دەچێت، بۆ ئەوەی زەبریان بەرنەکەوێت، دەچێتە ئەو ماڵە نە دەمانچە هەیە نە هەڤاڵان لە ماڵەوەن، ئیدی ئەویش وەها دەچێتە شوێنی موعیدەکە، دەڵێت:" هەر چۆنێك بێت هەڤاڵانی دیکە پێش ئێمە چوونەتە ئەوێ، ئێستا ئەوان تەدبیریان وەرگرتووە، وەکوتریش بێگومان کاتی موعیدەکە رۆژە. ئەو جێیەی موعیدیشیان لێی داناوە شوێنی کوردە عەلەوییەکانە و فاشیستەکانیش لەو ناوە نین، بۆیە مەترسییەکی ئەوتۆش نابێت. ئەگەر مرۆڤ هەندێك تەدبیر وەربگرێت دەتوانرێت رێگیری لە پیلانگێڕییەکان بکات" وادیارە هەڤاڵ "حەقی قەرار" وا بیر دەکاتەوە. ئیدی بەمشێوەیە دەچێتە شوێنی موعیدەکە، بێگومان ئەوان پێشتر چووبوون و خۆیان جێگیر و ئامادەکردبوو، لە گازینۆش پروپاگەندەی ئەوەیان کردبوو و گووتبوویان:" فاشیستەکان ئێستا دێنە ئێرە، ئەو فاشیستانە دەخوازن هێرش بێننە سەر ئەو گازینۆیە و کوشتوبڕی ئەنجام بدەن، ئێمەش تەدبیرمان وەرگرتووە، کە هاتن ئێمە فرسەتی ئەوان نادەین." ئەوانەی لەوێشن دەنگ ناکەن... کاتێك کە هەڤاڵ "حەقی قەرار" دەگاتە ئەوێ ئەوانیش دەڵێن:" ئەوە فاشیستەکەیە و لێی بدەن" یەکسەر ئەوانیش لێی دەدەن، ئیدی ئەو هەڤاڵە هەر لەوێ شەهید دەکەوێت. "بۆزان ئەسلان"ێك هەبوو، گوایە ئەو لەگەڵ هەڤاڵ "حەقی" بوو، ئەویش پێشتر لە رێکخراوی "رزگاری گەل" بوو، لەو رێکخراوە هاتبوو و تەفلی ئێمە ببوو.

واتا شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" ئاشکرایە، ئەوانەی لەدەرەوەی ئێمە "ستێرکا سۆر" و لەناو ئێمەشدا هەندێك پیاوی دەوڵەت هەن. ئەوانە پێکەوە ئەو پیلانگێڕییە دادەنێن و ئەو بڕیارە وەردەگرن، ئەو موعید و موعیدکاریە بۆ ئەو مەبەستەیە و هەر بۆ مەبەستە ئەو شوێنە دیاریدەکەن، ئەو شەهادەتە بەمشێوەیە روودەدات. واتا کەسانی سیخوڕی دەوڵەت لەناو ئێمە و لەدەرەوەی ئێمە پێکەوە ئەو پیلانە ئەنجام دەدەن.

بێگومان شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بۆ ئێمە رووداوێکی گرنگ بوو، زەبرێکی مەزن لەئێمە کەوت، بەم شەهیدبوونە پەیامیان بەئێمە دا، ئەو پەیامە چیبوو؟ "یان ئێوە دەست لەو کارە بەردەدەن یان وەکو حەقی قەرار دەکوژرێن" ئەو پەیامەی

بەئاشكرا بە ئێمەیان دا ئەوە بوو. بۆیە ئەم شەهیدبوونە لەنێو هەندێك لەهەڤاڵان و هەوادارانی ئێمە شڵەژان و ترسێكیشی دروستكرد، ئەوانە دەستیان لەتەڤگەر بەردا و هەڵاتن و لەشاری عەنتابیش نەمان. تەنانەت هەندێكیشیان لەترسان تا ئەوروپا رایانكرد. لەناخی هەندێك لەهەڤاڵانی تریشدا ركوكینێكی مەزن دروستبوو، كە چۆن بتوانن تۆڵەی ئەو هەڤاڵە بكەنەوە. واتا ئەم شەهیدبوونە ئەو دەرئەنجامانەی لەگەڵ خۆیدا هێنا و بەمشێوەیە كاریگەری خۆی كرد.

لە مێژووی تەڤگەری ئێمەدا، تا ئەو كاتە هەڤاڵان "عەلی دۆغان یڵدرم و ئایدن گول"مان بەر لەشەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لێ شەهید بوو، بەڵام شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لەئاستێكی بەرزدا روویدا. هەڤاڵ "حەقی قەرار" هەم هەڤاڵێكی هەرە لەپێشەوەی گروپی سەرەتایی بوو و لەگەڵ سەرۆكدا شوێنی گرتبوو، هەمیش هەڤاڵێك بوو نە كورد و نە خەڵكی كوردستانیش بوو، بەڵكو خەڵكی كەنار دەریای رەش بوو. لەنێو گروپدا یاریدەدەری سەرۆك ئاپۆ بوو، لەجڤینی "دیكمان"دا ئەركێكی وەهای پێسپێردرا، ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی و یاریدەدەری سەرۆك بوو. یەكێك بوو لەو هەڤاڵانەی باش لە سەرۆك تێگەیشتبوو و پێكیدەهێنا، هەڤاڵێكی بەمجۆرە بوو، بۆیە شەهیدبوونی ئەم هەڤاڵە بۆ ئێمە زیانێكی پڕ مەزن بوو. ئەو شەهیدبوونە شەهیدبوونێكی ئاسایی نەبوو. نەك لەبەر ئەوەی هەڤاڵێكی لەو ئاستەدا شەهید كەوت بۆیە زیانێكی مەزن بوو، بەڵكو لەبەر شوێنگەی هەڤاڵ "حەقی" بوو لەنێو تەڤگەردا. "حەقی قەرار" لەنێو ئەم تەڤگەرەدا بەرجەستەی راستییەكی دەكرد، گوزارشتی لە راستییەك دەكرد، لەبەر ئەوە ئەو شەهیدبوونە زۆر گران بوو بۆ ئێمە و زیانێكی مەزن بوو.

بۆچی هەڤاڵ "حەقی قەرار"یان كردە ئامانج؟ بۆچی كە لە "ئەنقەرە" و "ئەدەنە" خەباتی دەكرد نەیانكوشت؟ بۆچی لە "عەنتاب" كوشتیان؟ بێگومان ئەمە بە پیلان و بەرنامە دایانابوو، ئامانجێك لەپشت ئەمەوە هەبوو، لە ئەنقەرە و ئەدەنەش دەیانتوانی شەهیدیان بكردایە. بەڵام ئەگەر لەو شوێنانە شەهیدیان بكردایە ئامانجی ئەوان بەدینەدەهات. پێویستە لە كوردستان بكوژرێت. هەر بۆیە لە "ئەنقەرە" و "ئەدەنە" نەیانكوشت و لە عەنتاب كوشتیان. لەلایەكی دیكەوە بۆچی هەڤاڵێكی دیكەیان بە

ئامانج نەگرت و هەڤاڵ "حەقی" قەراریان کردە ئامانج؟ هەڵبەتە لەپشت ئەمەشدا ئامانجێك هەبوو. چونکە هەڤاڵ "حەقی قەرار" نە کورد بوو و نە خەڵکی کوردستان بوو، بەهەبوونی "حەقی قەرار" و "کەمال پیر" لەگەڵ سەرۆك ئاپۆ سیاسەتی دەوڵەتی تورك کە لەسەر نکۆڵی و قڕکردن بنیادنراوە زەبرێکی مەزنی بەرکەوتبوو، بەتەفلیبوونی ئەم دوو هەڤاڵە بۆ تەڤگەرەکە داگیرکەری زەبرێکی کوشندەی بەرکەوتبوو. چونکە دەوڵەتی تورکیا نکۆڵی لە کورد دەکرد، نەك تەنیا ئەمەش، بەڵکو دەیخواست لەناویشی ببات، هەڤاڵ "حەقی قەرار" و "کەمال پیر"یش خاوەنداریێتی لە کورد و کوردستان دەکەن. ئەمەش بۆ دەوڵەتی تورکیا خیانەتێکی مەزنە، سزای ئەمەش مردنە. چونکە ئەگەر مرۆڤ باش لێکۆڵینەوە لەسەر دەوڵەتی تورکیا بکات، دەبینێت کە بۆ دەوڵەت و دەسەڵات برا برای کوشتووە، نەریت و کولتووری بەمجۆرەیان لەسەردەمی عوسمانییەکاندا هەیە، بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت بۆ دەسەڵاتداریێتی هەموو شتێك رەوایە. تەنانەت برا براش دەکوژێت، یەکتریشیان کوشتووە. کولتوور و نەریتێکی وەهایان هەیە. ئەگەر ئەوانەی بۆ دەوڵەت و دەسەڵات برای خۆیان کوشتبێت بێگومان لەکەسێکی وەکو "حەقی قەرار" هەر هیچ نابوورن. واتا خاوەنداریێتیکردنی ئەوان لە کورد و کوردستان بۆ دەوڵەت خیانەتێکی مەزن بوو، پێویستبوو کە سزا بدرێن. ئەگەر "حەقی قەرار"یان کردە ئامانج لەبەر ئەو هۆیە بوو. بۆچی بە"حەقی" دەستیان پێکرد و لە "کەمال" دەستیان پێنە کرد؟ چونکە "حەقی" لەبەرێوەبەرایەتیدا بوو، یاریدەدەری سەرۆك بوو، وەکوتریش یەکەمین کەس بوو کە لەپراکتیکدا هەنگاوی بۆ دەرەوەی ئەنقەرە هاوێشتبوو و لە ئەنقەرە دەرکەوتبوو، بۆیە "حەقی قەرار"یان کردە ئامانج. "حەقی" ئەو کەسە بوو کە باش لە سەرۆك تێدەگەیشت و پێکیدەهێنا، بۆیە کردبوویانە ئامانجی خۆیان، لە شەخسی هەڤاڵ "حەقی قەرار"دا خواستیان رێگیری لەوە بکەن کە کەس لە تورکیا تەڤلی تەڤگەر ببێت، تاکو تەڤگەر نەبێتە تەڤگەرێکی رەوا، تەڤگەر لەلای تورکیا بناخە و پەیوەندی دروست نەبێت و هاوکاری بەدەستنەخات. چونکە بە تەڤلیبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" و "کەمال پیر" رێی ئەمە کرابۆوە، کە لەناو تورکیا تەڤلیبوون بۆ تەڤگەر دروست دەبوو، ئەمەش بۆ دەوڵەتی تورکیا پڕ مەترسیدار بوو، ئەم رێیە کێ کردبوویەوە؟ ئەو دوو هەڤاڵە کردبوویانەوە، پێویستبوو بەکوشتنی ئەوانەش ئەو رێیە

بگیردرێت و دابخرێت. بۆ ئەوەی لە تورکیادا تەفلیبوون نەبێت، بۆ ئەوەی بەرەی تورکیا پتەو ببێت، تاکو بتوانێت تەفگەری کورد دەمرکێنێتەوە و تەسفیەی بکات. ئیدی لەبەر ئەم هۆیانە هەڤاڵ "حەقی قەرار"یان کردە ئامانجی خۆیان، پێویستبوو لە کوردستان بکوژرێت بۆ ئەوەی بە تورکەکان بڵێن:" بڕوانن حەقی قەرار چوو بۆ کوردان خەبات بکات و لەم پێناوەدا وازی لە خوێندنەکەیشی هێنا، فیداکاری بۆ کوردان کرد. تەنانەت کورد خاوەن لە کورد دەرنەدەکەوت، حەقی خاوەندارێتی لە کورد کرد، کەچی کوردان "حەقی قەرار"یان لە کوردستان کوشت." چونکە پێویستبوو بە دەستی کوردان بکوژرێت. هەر بۆ ئەمەش "عەلائەددین قاپان" و "ستێرکا سۆر"یان ئامادە و دروستکردبوو، پێویستبوو بەدەستی ڕێکخراوێك کە بەناوی کوردان کار دەکات و سەرۆکی ئەم ڕێکخراوەش کورد بێت و گوایە ئەوەی دەشیکوژێت هەر دەبێت کورد بێت، بۆ ئەوەی دەوڵەت بتوانێت پڕوپاگەندەی ئەوە بکات؛ "ئیدی بڕوانن کوردان حەقی قەراریان کوشت، مرۆڤ ناتوانێت خاوەندارێتی لە کوردان بکات، ئەگەر ئێوەش بۆ کوردان خەبات بکەن ئەوا کورد ئێوەش دەکوژێت" بۆیە بە ڕێکخراوێکی گوایە کوردی کوشتیان بۆ ئەوەی بگەنە ئامانجی خۆیان. ئەگەر وا نەبایە بە ڕێکخراوەکانی دیکەش دەیانتوانی "حەقی" بکوژن، بەکەسانی دیکەش دەیانتوانی "حەقی" بکوژن، بەڵام ئەو کاتە نەیاندەتوانی بگەنە ئامانجی خۆیان.

ئەگەر لەدەرەوەی کوردستان بیانکوشتبایە دیسان نەیاندەتوانی بگەنە ئامانجی خۆیان، ناتوانن پڕوپاگەندە بکەن، بۆیە پێویستبوو هەم لە کوردستان و هەمیش بەدەستی کوردان بکوژرێت، بۆ ئەوەی بتوانن هەم لەسەر خێزانەکەیان ڕاوەستە بکەن، هەم لەسەر خەڵکی تورکیا (تورك)یش ڕابوەستن، تاکو تەفلیبوون بۆ ئەم تەفگەرە نەیەتەدی و تورك بکەنە دووژمنی تەفگەرەکە، هەم خانەوادەکەی بکاتە دووژمنی تەفگەرەکە، هەمیش لەشەخسی خانەوادەشدا تورك بکاتە دووژمنی تەفگەرەکە. ئەگەر هەڤاڵ "حەقی قەرار"یان کردە ئامانج بۆ ئەم مەبەستانە کردیانە ئامانجی خۆیان.

بە تیرۆرکردنی هەڤاڵ "حەقی قەرار" خواستیان ئەو پەیوەندییەی لەسەر بنەمای ئازاد و دیموکراتیانە سەرۆك و "حەقی و کەمال" لەنێوان خۆیاندا پێشیانخستبوو تێکیبدەن، چونکە گوایە کورد ئەو پەیوەندییەی پەسند نەکرد. "حەقی قەرار" و

سەرۆك پەیوەندی نێوان كورد و توركیان لەسەر بنەمایەكی نوێ ئاوا كردبوو و پێشیاندەخست، ئەمەش بۆ دەوڵەت زۆر مەترسیدار بوو، ئەگەر سەرۆكیش ئەمە دەكات، بەڵام دەبێت **"حەقی قەرار"** هەرگیز ئەمە نەكات، ئەمە خیانەتێكە و پێویستە بكوژرێت و سزا بدرێت ئەو پەیوەندییەش تێكبدرێت. ئەگەر هەڤاڵ **"حەقی"** بەمشێوەیە كوژرا هۆكار و ئامانج ئەمە بوو.

## شەهیدبوونی هەڤاڵ حەقی قەرار چی لەگەڵ خۆیدا هێنا؟



**مەراسیمی بەخاكسپاردنی شەهیدێك لەساڵانی حەفتاكاندا**

خانەوادەی هەڤاڵ **"حەقی"**یان خستە ناو پڕاواكسیۆنەوە و پێیان گووتن:" بڕوانن كوڕەكەی ئێوە چوو بۆ كوردان ئەم هەموو فیداكارییەی كرد كەچی كوردان كوشتیان" بۆ ئەوەی خانەوادەكەی بكەنە دووژمنی تەڤگەر. بۆ نموونە؛ **باقی قەرار (سلێمان)**ی برای هەڤاڵ **"حەقی قەرار"**یان بەمشێوەیە لەدژی تەڤگەر وروژاند.

هەڵبەتە پاشانیش لەتەڤگەر دابڕا و بووە بەڵا بەسەر تەڤگەرەوە و ڕۆیشت. هەروەها خواستیان بەم شەهادەتە شڵەژان و ترسێك لەناو تەڤگەردا دروست بکەن، بۆ ئەوەی پەرشوبڵاوە بە تەڤگەرەکە بکەن و تەسفیەی بکەن، ئەمە ئامانجیان بوو، چونکە لەئاستی بەرزدا زەبریان وەشاند بوو، تاکو بتوانن پەرشوبڵاوە بە تەڤگەرەکە بکەن. هەڵبەتە دوای ئەو ڕەشەکوژییە خواستیان ئەنجام بەدەست بخەن، ئەمجارەیان لە ئەنقەرە لە گەڕەکی"تورك ئیش بلۆکلەری" هەوڵی کوشتنی سەرۆکیان دا، ئەم هەوڵەیان بێئاکام بوو. ئیدی مرۆڤ دەبینی کە دەخوازن دوای کوشتنی هەڤاڵ "حەقی" و لەناوبردنی سەرۆك دەتوانن بەتەواوی تەڤگەرەکە تەسفیە بکەن. بەمەش بە شەهیدکردنی "حەقی قەرار" قۆناخی تەسفیەکردنی تەڤگەر دەستی پێکرد، بێگومان ئەو قۆناخە تەنیا بەشەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار"دا سنووردار مایەوە، تەڤگەر ئەو پەیامەی وەرگرت کە بینی ئیدی دەوڵەت بە توندی هێرش دێنێتە سەر تەڤگەرەکە و بڕیاری تەسفیەکردنی تەڤگەری داوە، بۆیە تەڤگەریش هەندێك تەدبیری وەرگرت، تاکو ئەو ئامانجانەیان پێکنەیەت.

شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بووە هۆی ئەوەی تەڤگەر بگاتە بڕیارێك، چونکە بینی کە ئیدی دەوڵەت بڕیاری داوە تەڤگەر بە توندوتیژی و تیرۆر و کوشتن تەسفیە بکات، پێویستە تەڤگەریش خۆی بپارێزێت، ئیدی بۆ کوردستان قۆناخێکی نوێ دەستپێدەکات. ئەگەر لە کوردستان دەخوازیت خەبات بکەیت پێویستە تۆ بەر لەهەموو شتێك تەدبیری خۆپاراستن وەربگریت. چونکە ئەگەر تۆ خۆت نەپارێزیت ئەوا ناتوانیت کار و خەباتیش بکەیت؟ ئەی چۆن خۆت بپارێزیت؟ دەوڵەت بە توندوتیژی و کوشتن و تیرۆر دێتە سەر تۆ، تەنیا دەتوانیت بە چەك خۆت بپارێزیت، وەکوتر هیچ ڕێیەکی دیکە نییە، ئیدی لێرەدا تەڤگەر ئەم بڕیارەی دا کە خۆی بە چەك بپارێزێت. چونکە وەکوتر بەهیچ شێوەیەکی دیکە نەدەکرا خۆت بپارێزیت. ئیدی شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بۆ تەڤگەر ئەنجامێکی بەمجۆرەی خستەڕوو و هەڵوێستێکی بەمجۆرەی بۆ خۆی بەبنچینە وەرگرت و پێشیخست. بۆیە "بەرگری ڕەوا" کەوتە ڕۆژەڤی تەڤگەرەوە، بۆ ئەوەی بزانێت چۆن خۆی بپارێزێت و بژیت و بەردەوام ببێت. بەمەش تەڤگەر تێکۆشانی چەکداری دەرخستە پێش، ئەگەر ئەو شەهیدبوونە ڕووی نەدابایە،

ئێمە ئەو هەنگاوەمان نەدەهاوێشت، چونکە تا ڕوودانی ئەم شەهیدکردنە ئێمە بە سیاسی کار و خەباتمان دەکرد، واتا ئامانجێکی وەهامان نەبوو کە ئێمە خەباتێکی عەسکەری بەو شێوەیە پێشبخەین. بەڵام ئەم ڕووداوی شەهیدبوونە بەئێمەی گووت:" ئەگەر ئێوە دەخوازن کاری" سیاسی بکەن ڕێی ئەمە بە خۆپاراستن دەبێت. ئەمەش بە چەك دەگرێت. ئیدی لەمەوە ئێمە دەستمانکرد بە خۆپاراستن، ئەوەشمان بەچەك کرد. ئیدی هەنگاوێکی بەمجۆرەمان هاوێشت، لەبەر ئەوە گرنگ بوو.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەم شەهیدبوونە شەهیدبوونێکی زۆر مەزن بوو، دووژمن دەیخواست ئیرادەمان بشکێنێت و بمانترسێنێت، بەهەندێك کوشتنی دیکەش کە دوای هەڤاڵ "حەقی قەرار" سەرۆکیان کردبووە ئامانجی خۆیان. ئەگەر سەرۆکیشیان بکوشتبایە ئەو کاتە دەگەیشتنە ئامانجی خۆیان، ئەوەی کوشتیان کوشتیان، ئەوەی دیکەشیان تەسلیم دەگرت. ئامانج ئەمە بوو. ئێمە نەماندەتوانی ئەمە پەسند بکەین، ئەمە کۆتایی ئێمە بوو. ئەگەر ئێمە دەخوازین لە تێکۆشان بەردەوام بین، ئەوا پێویستە ئێمە ئیرادەی خۆمان و تەڤگەر بەهێز و تۆکمە بکەین و هەنگاوێك بە تەڤگەر بهاوێژین. وەکوتر نەدەکرا ئێمە لەسەرپێیان ڕابوەستین و کار بکەین، ئیدی ئەم شەهیدبوونە هەنگاوێکی بە تەڤگەر هاوێشت. ئەم هەنگاوە چیبوو؟ هەنگاوی پارتیبوون بوو.

سەرۆك دوای ئەم شەهیدبوون و هێرشکردنە هاتە عەنتاب ئەو کاتە خانوویێکمان لە گەڕەکی خۆش گوردوو (HOŞGÖRDÜ) بەکرێ گرتبوو، لەو خانووەدا شەو و ڕۆژ مایەوە تا بەرنامەی کۆنگرە و پارتیبوونی ئامادە کرد، ڕەشنووسی بەرنامەی پارتی ئامادە کرد. ئێمە ئەو پرۆگرامەمان بڵاوکردەوە، گفتوگۆ و جڤینی باشی لەسەر کرا، بۆ ئەوەی لەسەر ئەو بنەمایە تەڤگەر بکەینە پارتی. سەرۆك بەمشێوەیە بەرسڤی ئەو هێرشەی دایەوە، ئەو شەهیدبوونەی کردە هۆی ئەوەی تەڤگەر لە گرووپێکەوە بگەیەنێتە پارتیبوون. ئەمەش بووە خەتێك و تایبەتمەندییەك و پرەنسیپێك لەنێو ئەم تەڤگەرەدا؛ " پێویستە هەر شەهیدبوونێك ببێتە هۆی ئەوەی تەڤگەر مەزنتر ببێت، بە تەڤگەر هەنگاو بهاوێشترێت" شەهیدبوونێکی مەزن بوو، پێویستبوو ئەنجامەکەیشی مەزن بێت، ئەویش بە پارتیبوون دێتەدی. بۆیە سەرۆك ئەم هەنگاوەی

بە تەڤگەر هاوێشت. پیلانگێڕییەکی مەزن بوو. چونکە ئەم شەهیدبوونە تەنیا لەدەرەوەی ئێمە پێك نەهات، بەڵکو لەناو ئێمەشدا هەندێك کەس هەبوون لەو پیلانگێڕییەدا بەشداربوون؛ کەسانی وەکو بۆزان ئەسلان، قەرجك عەلی، ئەحمەد...هتد ئەوانە زۆربەیان ئەو کەسانەبوون کە لە ڕێکخراوی "رزگاری گەل"ەوە تەڤلی ئێمە ببوون. ئەوانە و "ستێرکا سۆر" پێکەوە ئەم رەشەکوژییەیان ئەنجام دا. بۆیە زۆر گرنگ بوو، پیلانگێڕییەکی مەزن بوو.

لەمێژوودا؛ زۆر جۆر پیلانگێڕی هەیە، توانیویەتی تەڤگەرەکان پەرشوبڵاو بکاتەوە، هەندێك پیلانگێڕیش هەیە پێچەوانە هەڵدەگەڕێتەوە و دەکەوێتە خزمەت تەڤگەرەوە و وا دەکات ئەو تەڤگەرە بەهێزتر و تۆکمەتر ببێت و سەرکەوتن بەدەستبهێنێت.

ئیدی پیلانگێڕی شەهیدکردنی هەڤاڵ "حەقی قەرار" پەرشوبڵاوبوونی دروست نەکرد، بەپێچەوانەوە تەڤگەری مەزنتر کرد. ئەمەش بە هەڵوێست و نزیکبوونەوەی سەرۆك ئاپۆ بەدیهات. ئەگەر سەرۆك ئاپۆ لەئان و ساتی خۆیدا هەنگاوێکی مەزنی بەم تەڤگەرە نەهاوێشتبایە، ئەگەر بۆ بیرەوەری و ڕێزگرتنی ئەو هەڤاڵە رەشنووسی پرۆگرامی نەنووسیبایە و تەڤگەری بەرەو پارتیبوون ئاراستە نەکردبایە، ئەوا ئەو پیلانگێڕییە بەسەردەکەوت و تەڤگەر پەرشوبڵاو دەبوو، چونکە ئامانجی پیلانگێڕییەکە ئەوە بوو.

ئەوانەی لەناو ئێمەدا بەتایبەتی رۆڵیان لەو پیلانگێڕییەدا هەبوو، لەدوای شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بەخۆیان دەگووت:" ئێمە حەقیچیین" بەمەش دەیانخواست تەڤگەریش بخەنە دەستی خۆیانەوە، هەوڵێکی بەمجۆرەیان دا؛ هەم لە کوشتنی هەڤاڵ "حەقی قەرار"دا بەشداربوون، هەمیش ئەو کوشتنەیان بۆ خۆیان دەکردە سەرمایە و دەکەوتنە پشت ناوی هەڤاڵ "حەقی قەرار"ەوە و دەیانگووت:" ئێمە حەقی قەرارچیین" و دەیانخواست بەو شێوەیە تەڤگەر بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، کارێکی بەمجۆرەیان بەڕێوە دەبرد. کاتێك کە تەڤگەر ئەو پیلانگێڕییەی ئاشکرا کرد، بەسەر ئەو پیلانگێڕییەدا چوو ریسوای کرد و حیسابیان لێ خوازرا و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا کرا و سزای ئەو کەسانەی دا. بێگومان بەمەش ئەوانە بێچارە مانەوە و سەرنەکەوتن، رەوشی ئەوان ئاشکرا بوو، بە ترس و شڵەژانەوە لەناو تەڤگەردا هەڵاتن و چوونە ناو گرووپەکانی دیکەوە. بۆ لای ئەوانە چوون کە بەیەکەوە ئەو پیلانگێڕییەیان ئەنجام

دابوو، لەگەڵ ئەوانەدا بوونە یەك و هێرشیان کردە سەر تەڤگەرەکەمان، لە بەرەی (UDG)دا و لەدەرەوەی ئێمەدا دەیانگووت:" ئێمە لەدژی ئاپۆیین و لەدژی ئاپۆچییەکانین" خواستیان بەمجۆرە تەڤگەر تەسفیە بکەن. بێگومان تەڤگەریش چووە سەریان و زەبری لەوانە وەشاند و پەرشوبڵاوەی پێکردن و بێ کاریگەری کردن. بۆیە نە تەڤگەر کەوتە دەست ئەوانەوە و نە تەسفیەش بوو. بەڵکو تەڤگەر هەنگاوێکی بۆ پارتیبوون هاوێشت و بووە پارتی (PKK).

بۆیە لە مێژووی تەڤگەری ئێمەدا شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" پڕ گرنگە. واتا نوێنەرایەتی قۆناخێك دەکات و قۆناخێك لە خۆوە دەگرێت. بۆ ئێمە بووە ئەزموونێکی مەزن لەداهاتوودا. بۆ نموونە؛ کاتێك یەکەمین کۆنگرەی کۆنگرەی گەلی کوردستان لەکۆتایی ساڵی (٢٠٠٢) سازدرا، کە لەئاکامدا دووچاری هەندێك کێشە و گرفت بووین، لەئەزموونی ئەم رووداوە ئەزموونمان وەرگرت و توانیمان لە کێشە و گرفتەکە تێبگەین و چارەسەری بکەین.

ئەگەر شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" رووی نەدابایە و لەو ئەزموونە نەژیابووینایە و تێینەگەیشتینایە ئەوا ئەو کێشەیەی کەوا لە یەکەمین کۆنگرەی کۆنگرەی گەلدا تێیدا ژیاین نەماندەتوانی لێی تێبگەین و تەدبیری پێویست وەربگرین. ئەو کاتە زەبرێکی مەزنیشمان دەخوارد.

## چۆن؟ ئەگەر ئەو مەسەلەیە زیاتر روونبکەنەوە سوودمەندتر دەبێت...

ئەوەی لەیەکەمین کۆنگرەی کۆنگرەی گەلدا روویدا بەتەواوی وەکو پیلانگێڕییەکەی دژ بە هەڤاڵ "حەقی قەرار" بوو، چۆن هەندێك کەس لەناو ئێمەدا لەگەڵ "ستێرکا سۆر" رێککەوتبوون و بەیەکەوە کاریان کردبوو و ئەو رەشەکوژییەیان ئەنجامدابوو، پاشانیش لەپشت ناوی هەڤاڵ "حەقی قەرار"ەوە خۆیان شاردەوە و کاریان دەکرد تاکو راستینەی ئەوان دەرنەکەوێتە روو و هەمیش دەیانخواست تەڤگەر بخەنە دەست

خۆیانەوە، کە تەفگەریشیان خستە دەست خۆیانەوە، زەبر لە تەفگەر بوەشێنن و سەرۆك بێکاریگەر بکەن. کاتێکیش کە ئەم شتەیان بۆ نەچووە سەر و راستینەی ئەوان ئاشکرا بوو، ئەوا هەڵاتن و چوون لەبەرەی دژدا هەوڵیاندا و هێرشیان برد بۆ ئەوەی تەفگەر تەسفیە بکەن، تەفگەریش لەدژی ئەمە راوەستا و نەیهێشت بگەنە ئامانجی خۆیان... هەر هەمان شت، بەڵام لە قۆناخ و زەمەنێکی دیکەدا دیسان هاتەوە پێشمان. ئەویش لە یەکەمین کۆنگرەی کۆنگرەی گەلدا بوو. فەرهاد (عوسمان ئۆجەلان) و بۆتان (نیزامەددین تاش) و تاقمەکەیان دەیانگووت:" ئێمە پەیوەستین بە سەرۆکەوە، ئێمە دەخوازین داخوازی و چەمکی سەرۆك پێکبێنین، بەڵام هەندێك کەس هەن ناهێڵن ئێمە ئەمە پێك بهێنین" ئەم پرۆپاگەندانەیان دەکرد. کەچی ئەمە لەکاتێکدا خۆیان لەدژی سەرۆك بوون، بەڵام دەیانگووت:" ئێمە لەگەڵ سەرۆکین و سەرۆك بەبنچینە وەردەگرین" بەم پرۆپاگەندەیە دەیانخواست راستینەی خۆیان بشارنەوە، بۆ ئەوەی کەس لێیان تێنەگات تاکو بتوانن تەفگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، کە تەفگەریان خستە دەستی خۆیانەوە زەبر لە سەرۆکیش بوەشێنن. چونکە تا تەفگەر نەخەنە دەستی خۆیانەوە ناتوانن زەبر لە سەرۆك بوەشێنن. دەزانن کە گەل و کادیران پەیوەستن بە سەرۆکەوە، ئەگەر سەرەتا لەدژی سەرۆك دەربکەون ئەوا هەر لەسەرەتاوە دەیاندۆڕاند. بۆ ئەوەی ئەنجام بەدەستبخەن پێویستبوو پەیوەستبوونی گەل و کادیران بە سەرۆکەوە ئیستغلال بکەن، خۆیان وا نیشان بدەن کە لەگەڵ سەرۆکن، بۆ ئەوەی بڵێن:" ئێمە دەخوازین خەتی سەرۆك پێکبێنین، بەڵام هەندێك کەس ناهێڵن" بۆ ئەوەی لەبەرامبەر ئەو کەسانەی ئەوان باسیان دەکەن کاردانەوە و رکوکین دروست بکەن، ئەو کاردانەوە و رکوکینانەش بە رێکخستن بکەن. بەمەش بتوانن تەفگەر بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، کە خستیانە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە سەرۆکیش تەسفیە بکەن. ئەوان ئەو پیلانگێڕییەیان بەو شێوەیە بەڕێوە دەبرد. کاتێك راستینەی ئەوان دەرکەوتەڕوو و ئاشکرابوون کە ئەوانە سەرۆك بەبنچینە وەرناگرن، بەڵکو لە بنچینەدا لەدژی سەرۆکن، کە لەمەدا سەرنەکەوتن ئیدی هەڵاتن و چوون لەدەرەوە لە بەرەی دژی ئێمەدا دەستیان بەهێرشکردنە سەر سەرۆك کرد و گووتیان:" ئێمە لەدژی سەرۆك و خەتی سەرۆکین، لە بنچینەدا ئێمە هەر لە کۆنەوە باوەڕمان بە سەرۆك نەبووە، پێشتریش ئێمە لەدژی

سەرۆك و خەتی سەرۆك بوون..." ئیدی دەستیان بەم ئاخافتنانە كرد، لەبەرەی دەرەوەدا دەستیان بە هێرشكردنە سەر تەڤگەر كرد بۆ ئەوەی تەسفیەی بكەن. پێشتر دەیانخواست تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، كاتێك ئەمەیان بۆ مەیسەر نەبوو و سەرنەكەوتن و راستینەی ئەوان دەركەوت، هەڵاتن و ئینجا لە دەرەوەی تەڤگەر هێرشیان دەستپێكرد.

بێگومان تەڤگەر بەئەزموون وەرگرتن لە پیلانگێڕییەكەی دژ بەهەڤاڵ **"حەقی قەرار"** لەو پیلانگێڕییەش تێگەیشت و لەدژی راوەستایەوە. وەك چۆن ئەوانەی هەڤاڵ **"حەقی قەرار"**یان شەهید كرد و پاشان گووتیان:" ئێمە **حەقیچیین**" و لە پشت ناوی **"حەقی"**یەوە خۆیان دەشاردەوە بۆ ئەوەی تەڤگەر بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، **"بۆتان"** و **"فەرهاد"**یش بەهەمان شێوە لەهەوڵی تەسفیەكردنی سەرۆك شوێنیان گرتبوو و دەیانگووت:" ئێمە سەرۆك بەبنچینە وەردەگرین." لەپشت ئەمەش دەیانخواست خۆیان بشارنەوە، بۆ ئەوەی تەڤگەر بخەنە دەست خۆیانەوە، وەك چۆن ئەوانەی رەشەكوژی **"حەقی"**یان كرد و ئاشكرا بوون كە لەو رەشەكوژییەدا رۆڵیان هەبووە هەڵاتن، **"بۆتان"** و **"فەرهاد"**یش بەهەمان شێوە سەرنەكەوتن و راستینەی ئەوان ئاشكرا بوو كە لەدژی سەرۆكین و لە پیلانگێڕی تەسفیەكردنیدا شوێنیان گرتووە. ـئەوانیش هەڵاتن و بە ئاشكرا لەدژی سەرۆك راوەستان. وەك چۆن ئەوانەی تر دەیانگووت:" ئێمە لەدژی ئاپۆ و ئاپۆچییەكانین" ئەوا **"فەرهاد"** و **"بۆتان"**یش دەیانگووت:" لەدژی سەرۆكین و دژی رێبازی ئەوین". ئیدی ئێمە پێشتر لەو پیلانگێڕییەی سەر هەڤاڵ **"حەقی قەرار"** هەندێك ئەنجامامان بەدەست خستبوو، بۆیە من وەكو شەخسێك دەڵێم؛ من یەكسەر لەو پیلانگێڕییەی ئەوان تێگەیشتم، كە ئەوانە هەرچەندە دەڵێن:" ئێمە گرێدراوی سەرۆكین و خەتی سەرۆكیش بەبنچینە وەردەگرین" بەڵام راست نییە، بەڵكو لەبنەڕەتدا ئەوانە لەدژی سەرۆكن و لەدژی رێبازی سەرۆكن، بۆ ئەوەی رێكخستن (تەڤگەر) بخەنە دەستی خۆیانەوە هەموو كەسێك دەخەڵەتێنن و راستی خۆیان دەشارنەوە و خۆ دەخەنە پشت سەرۆك و دەخوازن ئێمە بێكاریگەر بكەن، چونكە تا ئێمە بێكاریگەر نەكەن ناتوانن رێكخستن بخەنە دەستی خۆیانەوە و ناتوانن سەرۆكیش تەسفیە بكەن. لەبەر ئەوەی ئەوانە ئەمەیان دەزانی، بۆیە ئێمەیان بە ئامانج

وەرگرتبوو، مەسەلە و گرفتی ئەوان ئێمە نەبووین، بەڵکو سەرۆك بوو. هەڵبەتە پاشان ئاشکراش بوو کە گرفت ئێمە نین، بەڵکو بۆ ئەوان گرفت سەرۆکە.

ئیدی ئێمە بەمشێوەیە ئەزموونمان لەرابردووی تەفگەرەکەمان وەرگرت. ئێمە لەوێدا پێداگرییمان کرد کە ئەوانە ڕێبازی سەرۆك بەبنچینە وەرناگرن، بەڵکو ئەوانە لە تەسفیەچیین. ئامانجی ئەوان سەرۆکە، ئەمەش بەهاوکاری هەندێك هێزی دەرەوەی ئێمە ئەنجامی دەدەن، ئێمە ئەمەمان ئاشکرا کرد، هەڵبەتە کە ئەمەش ئاشکرا بوو، هەڵاتن و بەئاشکراش گووتیان:" ئامانجی ئێمە سەرۆك و ڕێبازی سەرۆکە، نەك هەر ئێستا بەڵکو پێشتریش ئێمە لەدژی ئەو بووین" بەو شێوەیە راستینەی ئەوان ئاشکرا بوو و بەمشێوەیەش بێکاریگەرمان کردن.

**ئەمە لێکچوواندێکی گرنگە... بۆ نموونە؛ کاتی وەرگرتنی تەرمی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لە خەستەخانەدا، ئەو کاتە وابزانم تێڕوانینی جودا جوداش دەردەکەوێتەڕوو، لە تەسفیەگەرێتی ساڵی (٢٠٠٤)شدا بەهەمان شێوە تێڕوانینی هاوشێوەی ئەو کاتە دەرکەوتنەڕوو، تەنانەت هەمان چەمك بەڵام لە کات و شوێنی جیاواز...**

بێگومان کاتێك هەڤاڵان خواستیان تەرمی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لە نەخۆشخانە وەربگرنەوە، دەوڵەتیش دەیزانی کە هەڤاڵان دەخوازن تەرمەکەی وەربگرنەوە و لەمەشدا بە بڕیارن، دەوڵەت دەیخواست ئەمەش بکاتە هۆی کۆمەڵکوژییەك و زەبرێکی دیکەش لە تەفگەر بوەشێنێت، دەوڵەت نەیدەخواست تەرمەکە تەسلیم بکاتەوە. هەڤاڵانیش سووربوون لەسەر ئەوەی تەرمەکە وەربگرنەوە، بۆیە ناکۆکییەکی مەزن دەرکەوتەڕوو. کەمێك مابوو شەڕێك بێتە ئاراوە. ئەگەر شەڕ بەرپاببایە، ئەوا ئەو کاتە دەوڵەت زەبرێکی مەزنتری لەئێمە دەدا. سەرۆك ئەو کاتە لە مەسەلەکە تێگەیشت، بۆیە

گووتی:" پێویستە ئێمە ئێستا لێرە پێداگری نەکەین، با تەرمەکە لەخەستەخانەکە و لەشار دەربکەوێت و با تەسلیمی خانەوادەکەی بکەنەوە، وەك بڵێی خانەوادەکەی وەریدەگرێت، پاشان ئێمە دەتوانین موداخەلە بکەین و تەرمەکە ببەینە ئەو شوێنەی هەڤاڵ "حەقی" لێی لەدایکبووە، لەوێش دەتوانین میتینگێك سازبدەین، بەمشێوەیە ئەو پیلانگێڕییە پووچەڵ دەکەینەوە" ئەگەر سەرۆك ئەو کاتە موداخەلەی نەکردبایە، بەڕاستیش هەڤالان بەکاردانەوە و هەڵوێستی عاتیفیانە نزیك مەسەلەکە دەبوونەوە و سووربووین لەسەر ئەوەی هەر دەبێت تەرمەکە لە خەستەخانە وەربگرینەوە، دەوڵەتیش تەرمەکەی نەدەدایەوە و دەیخواست بەمە زەبرێك لە هەڤالان و تەڤگەر بدات. ئەو کاتە لەوانەبوو زەبرێکی مەزنمان بخواردبایە، ئیدی سەرۆك لەم لەیستۆکە تێگەیشت و لەیستۆکەکەی تێکدا. خانەوادەکەی تەرمەکەیان وەرگرتەوە، بەڵام کاتێك لەشار دەرچوون هەڤالان خۆیان گەیاندە تەرمەکە و بردیانەوە شوێنی لە دایکبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" لە قەزای "ئوڵوبەی"ی سەر بە پارێزگای ئۆردوو (ORDU) لەوێ مەراسیم و میتینگێکی مەزن ئەنجامدرا و بەمشێوەیە ئەو پیلانگێڕییەش پووچەڵکرایەوە.

هەڵبەتە من لەبەر ئەوە ئەو نموونەیەم هێنایەوە، ئەو پیلانگێڕییە چۆن پووچەڵ کرایەوە؟ چۆن ئێمە ئەو رووداوەمان کردە هۆی هاوێشتنی پێنگاڤێك بۆ تەڤگەرەکەمان و تەڤگەر لە گروپەوە گەیشتە "پارتی"یەك؟ بەهەمان شێوە لەقۆناخی کۆنگرەی یەکەمی کۆنگرەی گەلیشدا ئەو پیلانگێڕییە لەدژی تەڤگەر چنرابوو... تێگەیشتن لەراستینەی ئەو پیلانگێڕییە و ئاشکراکردنی و بێ کاریگەرکردنی و خاوەندارێتیکردن لە تەڤگەر، لەزۆر رووەوە وەکو ئەوەی کاتی شەهیدکردنی هەڤاڵ "حەقی قەرار"بوو، هەڵبەتە هەر لەبەر ئەمەش بوو ئەو نموونەیەم هێنایەوە.

## دوای شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار"، هەڤاڵ "خەلیل چاوغون"یش لە رووداوێکی دیکەدا شەهید دەبێت. ئەو رووداوە

## چۆن و بە چ شێوەیەك روودەدات؟ هەروەها بۆچی ئەو هەڤاڵە بە ئامانج دەگیردرێت؟



شەهید خەلیل چاوغون



شەهید محەمەد قەرەسوونگوور

هەڤاڵ"**خەلیل چاوغون**" خەڵكی "**حیلوان**"بووە عەشیرەتی **سلێمان (سلێمانان)** لەوێ هەیە، ئەو عەشیرەتە لەگەڵ **پارتی بزاڤی نەتەوەپەرست** (MHP) و دەوڵەتدا پەیوەندی خۆیان هەبوو، هاوكاری و پشتیوانی لە دەوڵەتەوە وەردەگرت، بەمەش لە حیلوان بە زۆر و فشار و چەك باڵادەستی خۆیان سەپاندبوو، شار و شارەوانیان خستبووە دەستی خۆیانەوە، لەسەر هەموو گوند و خەڵكی ئەو ناوچەیەدا دەسەڵاتی خۆیان ئاوا كردبوو. هەرچییەكیان دەخواست دەیانكرد، دەوڵەتیش هەر ئەو بوون، یاساش هەر ئەو بوون، بەبێ ئەوان كەس نەیدەتوانی نە لە گوند و نە لە شاریش یەك هەنگاو بهاوێژێت. واتا دەسەڵاتێكی رەهای بەمجۆرەیان هەبوو، زوڵمێكی مەزنیان لەخەڵكی ئەو ناوچەیە دەكرد، چ لە گوندەكان، چ لە شاریش. ئیدی ئێمە كاتێك دەستمان بەخەبات كرد، هەندێك گەنج، خوێندكار، ئەوانەی لەئامادەیی یان لە پەیمانگای پەروەردەیی و هەندێك لە گوندنشین بەشداری تەڤگەر ببوون، یەكێك لەوانەش كە هەر لەسەرەتاوە لەناو تەڤگەردا شوێنی گرتبوو هەڤاڵ "**خەلیل چاوغون**" بوو. لەناو ئەوانەدا ئەوەی

باش لە تەڤگەر تێگەیشتبوو ئەو هەڤاڵە بوو و پێشەنگی ئەوان بوو، واتا هەڤاڵ "خەلیل چاوغون" لەوێ نوێنەرایەتی تەڤگەری دەکرد، هەمووشیان بەو شێوەیە "خەلیل چاوغون"یان پەسند دەکرد. واتا کەسێتی ئەو کەسێتییەکی جددی بوو، بە ڕێکخستنی بوو، خۆی پەروەردە دەکرد و تا دەهات پێشدەکەوت، لەژیانی خۆیشیدا زۆر دڵنزم بوو، زۆر تایبەتمەندی ڕێکخستنی و تەڤگەری لەخۆیدا کۆکردبووەوە و بەرجەستەی کرد بوو، هەر بۆیە هەموو هەڤاڵانی ئەوێش ئەویان پەسند دەکرد و بۆ خۆیان وەك سەرۆکێکی ئەو ناوچەیەیان دەبینی، هەڤاڵ "خەلیل" هەرچییەکی بگووتبایە ئەوان جێبەجێیان دەکرد. بێگومان تەڤگەر لەوێ لەناو خوێندکارانی ئامادەیی و لەناو خەڵکی گوندەکاندا کار و خەباتی دەکرد و هەندێك پەرەیدەسەند. عەشیرەتی "سلێمانان"یش ئەمەیان بینی کە تەڤگەرێك لەوێ پێشدەکەوێت، ئەگەر پێشبکەوێت ئەوا بۆ ئەوان مەترسیدار دەبێت.

چونکە چەندە هوشیاربوونەوە بێتەدی ئەوەندەش کاردانەوە پێشدەکەوێت، ئەمەش بۆ دەسەڵاتدارێتی ئەوان مەترسیداربوو. ئەم ڕاستییەیان بینی، لەو ناوچەیە کێ پێشەنگایەتی و سەرۆکایەتی ئەمە دەکات؟ هەڤاڵ "خەلیل چاوغون" دەیکات، بۆیە هەڤاڵ "خەلیل چاوغون"یان کردە ئامانج بۆ خۆیان. ئیدی کاتێك لە ساڵوەگەڕی شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار"دا، لە حیلوان پۆستەری هەڤاڵ "حەقی قەرار" هەڵدەواسن، "سلێمانان"یش کە دەوڵەت لە پشتیانەوەیە هەوڵدەدەن زەبرێك لە تەڤگەر بوەشێنن، بۆیە بەپێویستیان بینی زەبرێك لە "خەلیل چاوغون" بوەشێنن. ئەگەر زەبریان لە "خەلیل چاوغون" وەشاند و تەسفیەیان کرد ئەوا ترسێکی مەزن دروست دەکەن و دەسەڵاتی خۆیان تۆکمەتر دەکەن، ئەو کاتە تەڤگەر پەرشوبڵاوەی پێدەکرێت و نامێنێت.

بۆیە "سلێمانان" هەڤاڵ "خەلیل چاوغون"یان شەهید کرد. ئەگەر لەم ئاستەدا زەبریان وەشاند بۆ ئەوەبوو ئەنجام بەدەستبخەن، تاکو هەموو کەسێك بترسێت و لەدژی ئەوان کەس سەرهەڵنەدات و تەڤگەریش لەوێ تەسفیە ببێت و لەناو بچێت. بێگومان شەهیدبوونی هەڤاڵ "خەلیل چاوغون" لەدوای شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" شەهیدبوونی هەرە گرنگ بوو، لەوانەیە ئەو هەڤاڵە لەئاستی هەڤاڵ "حەقی قەرار"دا

نەبوویێت، بەڵام شەهیدبوونی هەڤاڵ "خەلیل چاوغون"یش گوزارشتی لە شتێك دەکرد، ئەویش ئەوبوو؛ فیودالی کورد بەپشتیوانی دەوڵەت هێرشی کردۆتە سەر تەفگەر و کوشتنی ئەنجام داوە، لەوێدا دەبایە ئێمە یان لەدژی ئەوان رابوەستینایە، یانیش سەری خۆمان بچەماندایەتەوە. دەوڵەت و "سلێمانان"یش وا مەزندەیان دەکرد کە:" ئەگەر ئێمە زەبرمان لە خەلیل چاوغوندا ئیدی کەس ناتوانێت لەدژی ئێمە رابوەستێت" بەمشێوەیە حیساباتیان دەکرد، هیچ حیسابی ئەوەیان نەکرد کە ئێمە لەدژیان دەوەستینەوە و شەڕ دەکەین و زەبریان لێ دەوەشێنین. هەڵبەتە هیچ کاتێکیش کەس لەدژی ئەوان رانەوەستا بوو و زەبریشیان بەر نەکەوتبوو، زۆر بەخۆیان بەباوەڕ بوون. بێگومان ئەو کاتەی کە هەڤاڵ "خەلیل چاوغون" شەهید بوو، لەرووی عەسکەرییەوە ئامادەکارییەکی وەها جددیمان نەبوو، چەکی ئێمەش نەبوو، کادیری ئێمە رێکخستەبوونێکی وەهای نەبوو کە شەڕی عەسکەری بەڕێوە ببات.

## بیرکردنەوە و رامانێك لەم رووەوە هەبوو...؟

لەم بارەیەوە بیرکردنەوە و رامان هەبوو، بەڵام تا ئەو کاتە تەنیا لەدژی هەندێك کەسی دەوڵەت و سیخوڕ و فاشیست هەندێك چالاکیمان ئەنجام دابوو، ئەمەش زێدە رێکخستەبوونێکی بەهێز و ئیمکانیاتێکی بەهێز ناخوازێت. بەڵام لە حیلوان لەدژی ئێمە عەشیرەتێك بەرێکخستەیی رووبەروومان دەبێتەوە، تەنانەت چینێك لەدژی ئێمە راوەستاوە، چینی فیودالی کورد، هەم عەشیرەتە و هەمیش رێکخستنێکی فیودالییە. واتا لە عەشیرەتیش دەرکەوتووە و بووە بەرێکخستنێکی فیودالی، بووە بە رێکخستنێکی دەوڵەت، هەمووشیان چەکدارن و چەکەکانیشیان چەکی (G1) و کلاشنکۆفن. زۆربەی هەرە زۆری عەشیرەتەکە ئەو چەکیان هەیە و رێکخستەکراون. بۆیە لەدژی ئەوان راوەستان پێویستی بە رێکخستنێکی عەسکەری هەیە. هەروەها بەرەنگاربوونەوەی ئەوانە ئیمکانیاتی عەسکەری پێویستە، ئێمە رێکخستنێکی بەمشێوەیەمان نەبوو، کادیری بەمجۆرەشمان ئامادە نەکردبوو، لەرووی چەك و تەقەمەنیشەوە تەنیا یەك

کلاشنکۆفمان هەبوو، هەموو تەفگەرەکەمان تەنیا یەك کلاشنکۆفی هەبوو، هیچ چەکێکی ترمان نەبوو، ئەو کلاشنکۆفەش ئێمە بەقەرز کڕیبوومان، چونکە پارەی ئێمە بەشی کڕینی ئەو کلاشنکۆفەشی نەدەکرد. واتا لەرووی چەك و تەقەمەنییەوە ئێمە چەکمان نییە، ئەوان هەموویان چەکدارن، هەمووشیان ڕێکخستە کراون و دەوڵەتیان لەپشتە و ڕێکخستەبوونێکی عەسکەرییان هەیە، نەك تەنیا ڕێکخستەیەکی عەسکەری، بەڵکو پەیوەندییان لەگەڵ (MHP)ش هەیە، کە پارتییەکی فاشیستەکانە و ڕێکخستنێکی بەهێزیشە. مەگەر ڕێکخستنێکی عەسکەری بتوانێت لەبەرامبەریدا رابوەستێت. ئێمەش ڕێکخستنێکی وەهامان نەبوو و چەکیشمان نەبوو.

بۆیە ڕەوشێکی زۆر جددی دەرکەوتبووە پێشمان؛ یان دەبایە ئێمە لەدژی ئەوان رابوەستاینایە، یانیش ئەو شەهیدبوونەمان پەسند بکردبایە، ئەگەر ئەو شەهیدبوونەمان بەبێدەنگی پەسند بکردبایە و ئێمە لەدژی **"سلێمانان"** دەرنەکەوتینایە، ئەوا گەل نەك لە حیلوان بەڵکو لەتەواوی کوردستاندا باوەڕی بەئێمە نەدەما و تەفگەر لە حیلوانیش نەدەما. چونکە ئێمە لە پڕوپاگەندە و ئاژیتاسیۆنی خۆماندا لەدژی بەکرێگیراو و خائینان و فیوداڵی کورد رادەوەستاین، چونکە فیوداڵی کورد لە مێژوودا هەمیشە ڕۆڵی بەکرێگیراوێتی و سیخوڕێتیان بینیوە، بۆ بەرژەوەندی خۆیان کورد و کوردستانیان فرۆشتووە، لەگەڵ دووژمن دان. مێژوویێکی بەمجۆرەیان هەیە، بۆیە ئێمە لەدژیان رادەوەستاین. ئێستاش ئەو چینە هێرشی کردۆتە سەر ئێمە و هەڤاڵی ئێمەیان شەهیدکردووە، ئەگەر ئێمە لەدژیان رانەوەستین، کەواتە ئەو پڕوپاگەندانەی ئێمە کردوومانە هەمووی راست نییە و ڤالایە، ئەو کاتەش کەس باوەڕیمان پێناکات و دەڵێن:" بڕوانن عەشیرەتی سلێمانان، **"خەلیل چاوغون"**یان شەهید کرد، کەچی تەفگەر نەیتوانی لەدژی **"سلێمانان"** رابووەستێت". ئەو کاتە کێ بەئێمە باوەڕ دەکات؟! ئێمە زەبرێکی مەزن دەخۆین، بۆیە پێویستبوو بڕیارێکمان وەرگرتبایە.

ئیدی لێرەدا سەرۆك بڕیارێکی مێژوویی وەرگرت، سەرۆك گووتی:" چی دەبێت با ببێت پێویستە ئێمە لەدژی **سلێمانان** رابوەستین، هەمیش دەبێت لەزووترین کاتدا رابوەستین و زەبر لەوان بوەشێنین، ئەگەر ئێمە ئەمە نەکەین، ئەوا لە حیلوان ناتوانین کار و خەبات بکەین و لەتەواوی کوردستانیش کەس باوەڕمان پێناکات و زەبرمان

بەردەکەوێت" بۆیە ئێمە پێویستبوو لەدژی "سلێمانانگ رابوەستینەوە. بەڵام لەلایەکی دیکەوە هیچ چەکێکمان نییە و رێکخستەیەکی عەسکەریشمان نییە، چۆن لەدژیان رابوەستینەوە؟ ئەگەر هەر بەمجۆرە رابوەستین زەبرمان بەردەکەوێت. پێویستە هەرچی زووترە رێکخستنێکی عەسکەری پێشبخەین و هەندێك چەکیش پەیدا بکەین بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لەدژی ئەوان رابوەستین، پێویستە ئەمەش زۆر درەنگ نەکەوێت، چونکە درەنگیش بمێنێت کاریگەری خراپی دەبێت و ئیدی ناتوانین درەنگ بکەوین.

سەرۆك ئەو بڕیارەی وەرگرت و ئەو ئەرکەشی بەهەڤاڵ **"محەمەد قەرەسنگور"** سپارد و گووتی:" پێویستە تۆ لێرە رێکخستنێکی عەسکەری زوو ئاوا بکەیت و لەدژی "سلێمانان" بکەویتە نێو جموجۆڵەوە و پێویستە ئەو زەبرەی ئێمە لەوانیش دەیوەشێنین لەشوێنی خۆیدا بێت و بەکاریگەر بێت و پێویستە ئەنجامگیر بێت و سەرکەوتوو بێت، ئەگەر ئێمە چالاکی بکەین و سەرنەکەوین و زەبرمان بەربکەوێت ئەوا بۆ ئێمە خراپ دەبێت. پێویستە ئێمە زەبرمان بەرنەکەوێت، بەڵکو زەبر بوەشێنین. هەروەها ئێمە زەبرێکی وەهایان لێبدەین کەوا لە "سلێمانان"دا شڵەژان و ترسێك دروست بکات و لەناو گەلیشدا باوەڕییەکی بەهێز دروست بکات، کە بتوانین بەرخۆدانی تەڤگەر لێرەدا پێشبخەین".

ئیدی لەو چوارچێوەدا ئامادەکارییەك ئەنجامدرا، بێگومان ئەو ئامادەکارییە درەنگ کەوت، سەرۆك کە بینی درەنگ دەکەوێت جارێکی دیکە چووە ئورفە و موداخەلەی کرد، هەڤاڵ **محەمەد قەرەسوونگوری** خواست، هەڤاڵ **"کەمال پیر"**یش ئەو کاتە چووە ئەوێ، ئەویشی خواست، ئەو کاتە **"سدقی پایداش"** هەبوو، ولاتپارێزێکی ئەو ناوچەیە بوو، لە عەشیرەتی **"پایداش"** بوو. بەڵام ئەو عەشیرەتگەرایی بەبنەما وەرنەدەگرت، لەگەڵ هەڤاڵان جموجۆڵی دەکرد، ئەویش هات، سەرۆك لەوێ کۆبوونەوەیەکی بۆ ئەوان ئەنجامدا و رەخنەی کردن، منیش ئەو کاتە ئامادە بووم، دوای ئەو رەخنەیە ئەوان گەڕانەوە حیلوان، کاتێك کە دەچوونە حیلوان هەڤاڵ **"کەمال پیر"** گووتی:" ئەگەر سەرۆك جارێکی تر بانگمان بکات ئەوا من نایەم" من پێم گووت:" **هەڤاڵ کەمال** من باش تۆ دەناسم" گووتی:" من بە کامە روو بێمە لای سەرۆك؟ ئەرکێکی بە ئێمە

سپاردووه تا من ئەو ئەرکە پێکنەهێنم ناتوانم بێم، ئەگەر من ئەرکی خۆمم پێکهێنا ئەو کاتە دەتوانم بێم ببینم".

بێگومان لێرەشدا پێویستە مرۆڤ هەڵوێست و نزیکبوونەوەی هەڤاڵ **"کەمال پیر"** بۆ سەرۆك و بۆ ئەرك و بۆ رێکخستن تێبگات، لەلای هەڤاڵ **"کەمال پیر"** ئەرك بۆ ئەوەی مرۆڤ جێبەجێی بکات ئەرکە، ئەرك پیرۆزە، پەیوەستبوون بە سەرۆك، هەڤاڵێتی و تەڤگەر بە ئاخافتن نابێت، بە ئەرك پێکهێنان و لە ئەرکیشدا سەرکەوتن دەبێت. بۆیە هەڤاڵ **"کەمال پیر"** وەها ئاخفی. لێرەدا پێویستە مرۆڤ باش هەڤاڵ **"کەمال پیر"** بناسێت. واتا چۆن لەرێکخستن تێدەگات و چۆن لێی نزیك دەبێتەوە؟ چۆن لەئەرکی رێکخستن نزیك دەبێتەوە؟ لەئەرکدا سەرکەوتن بەبنچینە وەردەگرێت، بۆیە بەمشێوەیە قسەی کرد.

بێگومان ئەوان گەڕانەوە **حیلوان**، پاشان ئەو چالاکییە پێکهات، چالاکییەکی پڕ بەهێز بوو، زەبرێکی مەزن بە **"سلێمانان"** کەوت، هەمیش بەرۆژ و لەنێو بازاڕی **حیلوان**دا لە سەرۆکی ئەم عەشیرەتەیاندا، هەندێکیان مردن و هەندێکی تریشیان بریندار بوون، ئەوانەی بریندار بوون بردیاننە **عەنتاب**، هەواڵیان بۆ هەڤاڵانی **عەنتاب** نارد کە برینداره‌کان بۆ **عەنتاب** رەوانە کراون، ئەو هەڤاڵانەی لە **عەنتاب**یش بوون برینداره‌کان ئەوانەی لەگەڵ برینداره‌کانیشیان بوون لەبەر دەرگای نەخۆشخانە کوشت و بریندار کرد، لە **"سلێمانان"** یەکێکیان هەڵات و چووە ئەدەنە، کە گەیشتە ئەدەنەش لەوێ ئەویش کوژرا. **سلێمانان** کە بینیان دەچنە هەر شوێنێك رزگاریان نابێت. بێگومان سەرۆك عەشیرەتەکەش کوژرا. بۆیە زەبرێکی مەزنیان بەرکەوت و ترسێکی گەورەیان لێنیشت، گەلیش باوەڕییەکی مەزنیان بەتەڤگەر هێنا، ئەو **"سلێمانان"**ەی کە دەیانگووت مرۆڤ ناتوانێت لێیان نزیك ببێتەوە، بینیان کە هەموویان دەکوژرێن، لەبازاڕدا دەکوژرێن، لەدەرەوەی **حیلوان** دەچنە هەر شوێنێك دەکوژرێن، ئەمە باوەڕییەکی مەزنی بە گەل بەخشی. ئەو کاتە گەل هەموو لەدژی **"سلێمانان"** سەریهەڵدا و لەگەڵ تەڤگەر بوو. شەڕی **حیلوان** بەمشێوەیە دەستی پێکرد و بەمشێوەیەش ئەنجامی وەرگرت.

**حیلوان** بەقەزا و گوندەکانییەوە بەتەواوی کەوتە ژێر کاریگەری تەڤگەرەوە، هەموو گەل لەگەڵ تەڤگەر بووە یەك، زۆریش پەوەندییان بەتەڤگەرەوە کرد، پاشان

"سلێمانان" تەسلیم بوون، لە میکرۆفۆنی شارەوانیدا قسەیان کرد و گووتیان:" ئێمە تەسلیم دەبین، تەڤگەر چ لە ئێمە بخوازێت ئێمە جێبەجێی دەکەین" شارەوانیان تەسلیم کرد و چەکی خۆیشیان هەموو تەسلیم کرد.

ئێمە لە حیلوان بەڕێوەبەرایەتییەکمان لەخەڵك (گەل) دروست کرد، هەموو توێژێك لەنێو ئەو بەڕێوەبەرایەتییەدا جێیان تێدا گرت، بووە **"ئەنجوومەنی گەل"** ئیدی ئەو ئەنجوومەنە تەواوی "حیلوان"ی بەڕێوە دەبرد، هەموو بڕیارەکان ئەو ئەنجوومەنە وەریدەگرت، ئیدی دەوڵەت لەوێ ئیفلاسی کرد.

## ئەو رەوشە تا کەی بەردەوامی کرد؟

تا بەرپابوونی کودەتای (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) بەردەوام بوو، گەل خۆی حیلوانی بەڕێوە دەبرد...

## نموونەیەکی "دەسەڵاتی گەل" بوو...؟

بێگومان... بۆیە ئەزموونی حیلوان زۆر گرنگە، هەم لە مێژووی تەڤگەردا هەمیش لە مێژووی گەلدا بۆ یەکەمجار گەلی کورد بەبێ فیوداڵی کورد و بەبێ سەرۆك عەشیرەتی کورد، لەدژی دەوڵەت سەریانهەڵدا و راپەڕین و ئەنجامگیریش بوون. ئەگەر مرۆڤ لە مێژووی گەلی کورد و مێژووی تەڤگەری کورد بڕوانێت ئەوا دەبینێت هەرچی راپەڕینی کورد بەرپابووە گشتیان فیوداڵی کورد و سەرۆك عەشیرەتی کورد سەرۆکایەتی راپەڕینەکەیان کردووە، بۆ بەرژەوەندی خۆیان گەلیشیان دەخستە جموجۆڵ و شەڕەوە، ئەمەشیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان کردووە، نەك بۆ گەل یان بۆ کوردایەتی، بەڵکو کوردایەتیان بۆ خۆیان کردۆتە ئامرازێك... هیچ کاتێکیش ئەنجامگیر نەبوونە. لە حیلوان بەبێ فیوداڵ و سەرۆك عەشیرەت و هەمیش لەدژی ئەوان تەڤگەرێك ناوابوو و ئەو تەڤگەرە بەئەنجام گەیشت. ئەمە لە مێژووی کوردستاندا شتێکی نوێ بوو و کاریگەری زۆر مەزنیشی لەسەر گەل دروست کرد، گەل بینی کە بەبێ فیوداڵ و سەرۆك

عەشیرەتەكانیش دەتوانن سەرهەڵبدەن و راپەڕن. بەرابوونی بەمشێوەیە دەتوانن ئەنجام بەدەست بخەن، تاكو ئێستا رابوون و هیچ ئەنجامێكیان بەدەست نەخستبوو، بەڵام بەم شێوازە رابوون توانیان ئەنجام بەدەست بخەن و لە حیلوان ئەنجامگیر بوون. كەواتە فیودالی كورد و سەرۆك عەشیرەتی كورد سەرناكەون و تەڤگەر بەسەرناخەن، مەگەر تەنیا گەل خۆی راببێت دەتوانێت سەربكەوێت، ئەزموونی حیلوان ئەمەی سەلماند.

هەروەها راستینەی چینی فیودالی كوردی ئاشكرا كرد، ئەوانە لە كوردستاندا چ راستییەكیان هەیە؟ نوێنەرایەتی چی دەكەن؟ ئەمەی لە "گەل" گەیاند، ترسێكی مەزنیان شكاند، گەل زۆر لە فیودالەكان دەترسا، ئەو ترسەی شكاند، ئیدی لەهەموو جێیەك لەدژی زوڵمكارانی كورد، فیودال، ئاغا، سەرۆك عەشیرەتی كورد گەل رابووە سەر پێیان. واتا ئەمە تەڤگەرێكی ئازادیخواز و دیموكراتخوازی لەناو گەلدا پێشخست، هوشیاری و زانایییەكی مەزن و لەسەر ئەو بنەمایەش رێكخستن و كەوتنە جموجوڵی ئاواكرد و پێشخست. ئیدی لەدژی زوڵمی فیودالان گەل رابوو و قەدەری خۆی خستە دەستی خۆیەوە، فیودال و بەكرێگیراوانی كوردیش لەشەخسی "سلێمانان"دا زەبرێكی مەزنیان بەركەوت، ئیدی نەیاندەتوانی وەكو پێشان زوڵم لە گەل بكەن، بینیان كە ئەو قۆناخ و سەردەمە بۆ ئەوان تەواو بوو و بەسەرچوو، تا ئەو كاتە لەبەرامبەر گەل هەرچییەكیان خواستبایە لە ناوچەكەی خۆیان دەیانكرد، هەڵبەتە دەوڵەتیش لەرێگەی ئەوانەوە دەسەڵاتی خۆی بەرێوە دەبرد.

## تەنانەت دەیانگووت؛ ژنهێنانیش دەبایە بە ئیزنی ئەوان بایە...

هەمووشت بە ئیزنی ئەوان بوو، ئیدی ئەو سەردەمە كۆتایی پێهات و تەڤگەرەكەمان قاچێكی دەوڵەتی شكاند و زەبرێكی مەزنی لێوەشاند. چونكە دەوڵەت داگیركەرێتی و دەسەڵاتدارێتی خۆی لەرێی ئەوانەوە بەرێوە دەبرد، بۆیە ئەوانیش هەرچییەكیان بكردایە دەوڵەت چاوپۆشی لێدەكرد. چونكە ئەو چینە بوو قاچی دەوڵەت بوون، ئەوانیش سوودیان لەمە وەردەگرت و هەموو شتێكیان بەبێ یاسا بەرێوە دەبرد، بۆیە گەلیان بەتەواوی ترساند بوو و تەسلیمیان كردبوو... ئیدی كە "سلێمانان" زەبریان

بەرکەوت ئەوانی تر نەیاندەتوانی چیدی بەمشێوەیە هەڵسوکەوت بکەن، هەم فیوداڵان زەبریان بەرکەتبوو، هەمیش دەوڵەت زەبری بەرکەوتبوو، بۆیە لەهەموو شوێنێك سەردەمی گەل دەستی پێکرد، ئیدی گەل باوەڕی بەخۆی دەکرد، ئیرادەی خۆی بەبنچینە وەردەگرت، پێڤاژۆیەکی بەمجۆرە لە ناوچەی ئورفە و دەوروبەری پێڤاژۆیەکی بەمجۆرە پێشکەوت، لەزۆر شوێندا دەوڵەت و فیوداڵیش ئیفلاسیان دەکرد، دەسەڵاتی گەل پێشدەکەوت. ئیدی حیلوان پێڤاژۆیەکی بەمجۆرەی پێشخست و پێشدەخست، بۆیە زۆر گرنگ بوو.

لە مێژووی گەلی کورد و تەڤگەرەکانیدا بۆ یەکەمجار بوو لەهەموو توێژ و چینێکی گەل بەڕێوەبەرایەتییەك ئاوا بکرێت. بۆ نموونە؛ ئێستا هەندێك واتێدەگەن کە سەرۆك ئاپۆ دوای دەستگیرکردنی لە ئیمرالی، کۆنفیدراليزمی دیموکراتی کەشف کردووە و دایهێناوە. ئەمە وانییە ئێمە سەرەتا لە حیلوان‌دا بە پراکتیك کۆنفیدراليزمی دیموکراتی‌مان پێکهێناوە. ئەزموونی حیلوان لەبەر ئەم خاڵەش گرنگە. چونکە لەوێ لەهەموو توێژەکانی نێو گەل بەڕێوەبەرایەتییەك ئاوا بوو، ئەو بەڕێوەبەرایەتییە حیلوانی بەڕێوە دەبرد. واتا کۆنفیدراليزمی دیموکراتی (بەڕێوەبەرایەتی گەل) دروست بوو. نەك ئەمڕۆ سەرۆك ئەمەی کەشف کردبێت، بەڵکو هەر لەدەستپێکی ئەم تەڤگەرەدا ئەمە هەیە. سەرۆك لە مێژوو و پراکتیکی ئەم تەڤگەرەدا ئەنجام و ئەزموونی لێوەرگرتووە و لە بەرگرینامەکانیدا کەیاندی بە"سیستەم" ێك. لەوانەیە پێشان وەکو سیستەمیك نەدەناسرا. چونکە کاریگەری "سۆسیالیزمی بنیادنراو" هەبوو، سەرۆك هزری خۆی لەو کاریگەرییانە خاوێنکردەوە و گەیاندییە سیستەمێك، نەك تازە کەشف کرابێت و تازە لەنێو ئەم تەڤگەرەدا قسەی لەسەر کرابێت. هەرچەندە وەك سیستەم و بە سیستەم تازە قسەی لەسەر دەکرێت، بەڵام لەرووی چەمك و پراکتیکدا هەبووە، لە حیلوان ئەمە پراکتیزە کراوە، بۆیە لەم خاڵەشدا ئەزموونی حیلوان گرنگە.

واتا لە حیلوان دەسەڵاتداریێتی دەوڵەتیش و فیۆداڵانیش تێکشکێنران و لەشوێنیدا "دەسەڵاتی گەل" ئاوابوو. ئیرادەی بەڕێوەبەرایەتی گەل ئاوابوو. ئیدی ئیرادەیەکی خۆجێی ( محلي) لە شارەوانیدا دروست بوو. بەمشێوەیە کۆنفیدراليزم لە حیلوان پێکهات. پێڤاژۆی گەل لەوێ دەستیپێکرد. هەر بۆیە خەڵکی حیلوان لە قەزا و

گوندەکانی هەموویان لەدژی "سلێمانان" لەگەڵ تەفگەر بوون، بۆیە "سلێمانان"یش ناچار تەسلیم بوون، ئیدی ئەمە قۆناخێکی نوێی لە کوردستان دەستپێکرد، بۆیە چالاکییەکەی حیلوان گرنگە. کاتێك کە ئێمە شەڕی حیلوانمان دەستپێکرد وەکو گووتم؛ تەنیا یەك کلاشنکۆفمان هەبوو.

ئێمە بۆ ئەو مەبەستە چووینە"سروج"، چەپی تورك لەوێ هەندێك چەکیان کڕیبوو، قاچاخچییەکان ئەوانیان خەڵەتاندبوو و چەکیان نەدابوونێ، بە ئێمەیان گووت، بۆ ئێمەش چەك پێویستبوو، ئێمە چووین ئەو قاچاخچیانەمان بینی و پێمان گووتن:" ئەو چەکانە هی ئێمەن، پێویستە ئێوە بماندەنەوە، ئەوان ئێمەیان دەناسی، بەمشێوەیە دوو کلاشنکۆفمان لێوەرگرتن، ئەوەمان بە چەپی تورکیش گووت:" ئێمە ئێستا پێویستیمان بەو چەکانە هەیە، ئەگەر ئێوە پەسندی بکەن ئەوا بە قەرز لەئێوەی وەردەگرین و بەکاری دەهێنین و پاشان بۆ ئێوەی دەگەڕێنینەوە" ئەوانیش گووتیان:" تەواو، باشە" هەڵبەتە ئەوان نەیاندەتوانی ئەو چەکانە وەربگرنەوە، ئێمە بەمشێوەیە قسەمان لەگەڵیاندا کرد و ئەو دوو کلاشنکۆفەمان وەرگرت. بەمەش چەکی ئێمە بووە سێ کلاشنکۆف.

ئەم سێ کلاشنکۆفەمان هێنایە حیلوان. بەم سێ کلاشنکۆفە دەستمان بەشەڕی حیلوان کرد. تەنیا سێ کلاشنکۆف، لەبەرامبەر ئێمەشدا عەشیرەتێك هەمووی بە چەکی (G۱) و نارنجۆك خۆیان چەکدار کردبوو. تەنانەت تا ئەو شەڕەش نەماندەزانی نارنجۆك چییە و هیچ بەکارمان نەهێنابوو و لەدەستیشماندا نارنجۆك نەبوو. بەڵام گوندییەکی گوندێکی سەر بەشاری وێرانشار نارنجۆکێکی لەسەر زەوی دۆزیبووەوە، وادیار بوو لە سەرباز و شتی وا کەوتبوو و ماوەیەکی زۆر بوو لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، لەژێر باراندا مابووەوە و ژەنگی گرتبوو و خراپیش ببوو. ئەو گوندییە بەئێمەی گووت:" نارنجۆکێك لەلای من هەیە. دەیدەم بە ئێوە" ئێمەش گووتمان:" باشە بماندەرێ" کاتێك ئێمە ئەو نارنجۆکەمان وەرگرت گووتمان:" ئیدی ئێمە بووینە خاوەن نارنجۆك، دەتوانین هەموو شتێك بکەین" واتا چۆن دەوڵەتێك بۆمبای ئەتۆمی بەدەستدەخات و دەبێتە خاوەن هێزێکی مەزن و ئیدی ناترسێت" بۆ ئێمەش بەهەمان شێوە بووە هێزێکی مەزن. ئەو نارنجۆکە بۆ ئێمە گوزارشتێکی وەهای هەبوو و گووتمان:" ئیدی نارنجۆکێکی ئێمەش

هەیە و دەتوانین هەموو شتێك بكەین" كەچی خۆی یەك دانە نارنجۆكیش بوو، وەكوتریش ئێمە نەماندەزانی نارنجۆك چۆن دەتەقێنرێت. هەر ئەوەندەمان دەزانی دەكوژێت. بەڵام نەماندەزانی چۆن دەتەقێنرێت، هەڤاڵ **"محەممەد قەرەسوونگور"** سەربازی توركیای كردبوو، گووتی:" من دەزانم" دەستی بۆ ئەڵقەكەی برد گووتمان:" ئامان، وریابە، مەترسیدارە..." گووتی:" هیچ نییە، من پەروەردەی ئەوەم بینیوە و دەزانم چۆن دەتەقێنرێت" ئێمە دیسان دەمانگووت:" چ دەبێت و چ نابێت دیار نییە، وریابە، نارنجۆكەكە بتەقێنرێت هەمووان دەكوژێت". ئێمە شەڕمان بەم ئیمكانیاتە و لەم كەش و هەوایەدا دەستپێكرد، بەڵام ئیرادەیەك و سووربوونێك هەبوو، بەمە دەستمان پێكرد و سەركەوتین.

دوای ئەوەی هەڤاڵ **"خەلیل چاوغون"** شەهید كرا، گەل زۆر ترسابوو. من و هەڤاڵ **"كەمال پیر"** كە چووین بۆ حیلوان هیچ ماڵێك نەیدەتوانی ئێمە میوانداری بكات، تەنیا كەسێك ئێمەی بە دزی بردە ماڵی خۆی و بە ئێمەی گووت:" تكا دەكەم، مرۆڤ ناتوانێت لەبەرامبەر سلێمانان رابوەستێت، خەلیل كوژرا ئێوەش خۆتان بە كوشتن نەدەن و ئێمەش بە كوشتن نەدەن، بڕۆن با سلێمانان نەزانن كە ئێوە هاتوونەتە ئێرە..." بێگومان ئێمە بەزۆر قەناعەتمان پێیكرد، ئێمە هەندێك كەسمان بەنهێنی هێنایە ئەو ماڵەوە، بەنهێنی قسەمان لەگەڵیاندا كرد، خواستمان باوەڕییان پێبدەین، چەندە قسەمان لەگەڵیاندا دەكرد، بەڵام زێدە باوەڕیان نەدەكرد، ئیدی لەوێ دەركەوتین و چووین ئەو چەكانە بهێنین، سلێمانان لەبەر ئەوەی خەڵكی قەزاكە هەمووی دەناسن، كە یەكێكی نامۆ و غەوارە (غەریب) بێت و بچێت دەزانن كە كەسێكی غەریب هاتۆتە قەزاكەوە، بینیان كە ئێمە غەریبین یەكسەر بە ترومبێل دوامان كەوتن و تاقیبیان كردین، شوفێری ئەو ترومبێلە ئێمە لێی سوار ببووین لەدژی سلێمانان قسەی زۆر دەكرد، جارێك بینیمان یەكسەر دەنگی خۆی بڕی، گووتمان:"چیبوو؟" گووتی:" سلێمانان بە ترومبێل تاقیبی ئێمە دەكەن" بینیمان بەراستی دوو ترومبێل لەپشتمانەوە دێن، گووتمان:" لەوانەیە ئەوان بن، بازۆ( لێبخوڕە)" گووتی:" ئیدی ناتوانم لێبخوڕم" ئەژنۆی شكا، زۆر ترسا، گووتمان:" باشە ئەگەر هاتن بڵێ:" من ئەوانە ناناسم، ئەوانە میوانن و نەفەرن و لە حیلوانەوە سواربوونە، چیین و چی نین من نازانم، من پارەی

خۆم وەردەگرم و نازانم کێن تۆ وەها بڵێ" من و هەڤاڵ "کەمال"یش لەنێوان خۆماندا ڕێککەوتین کە بڵێین:" ئێمە مامۆستاین لە سیڤەرەکەوە هاتووین و دەچینە ئورفە مووچەی خۆمان وەردەگرین، ئێمە ترومبێلمان تا حیلوان پەیدا کرد، لە حیلوانیش ئەو ترومبێلەمان بینی و لێی سوار بووین و دەچینە ئورفە، ئەگەر باوەڕیان کرد باشە، ئەگەر باوەڕیشیان نەکرد و خواستیان بمانگرن خۆ دەهاوێژینە سەر چەکەکانیان، کە چەکەکانیانمان خستە دەستی خۆمانەوە ئێمە چەندێکیان لێ دەکوژین، ئەوانیش ئێمە دەکوژن". وەکوتر ڕزگار بوون نییە، ئێمە چەکیشمان پێنەبوو، من و هەڤاڵ "کەمال پیر" بووین، "کەمال پیر"یشمان تازە لەزیندانی ئورفە ڕفاندبوو، قاچاخ بوو و ناسنامەیەکی ساختەی پێبوو. بێگومان ترومبێلی یەکەمی "سلێمانان" هات و پێشی ئێمەی گرت و گووتی:" ڕابوەستن" ئێوە لەکوێوە دێن؟" گووتمان:" ئێمە لە سیڤەرەکەوە دێین و دەچینە ئورفە، مامۆستاین" ئێمەیان نەناسی. چونکە پێشتر ئێمەیان نەبینیبوو، هیچ زانیارییەکیان لەسەر ئێمە نەبوو، هەمووشیان چەکدار بوون، چەکی گەویج و کلاشنکۆفیان پێبوو، گووتیان:"بڕۆن" ترومبێلەکەی دیکە هات و لەلای ترومبێلی یەکەم ڕاوەستا، لەنێوان خۆیان مقۆمقۆیەکیان کرد و جارێکی دیکە بەدوامانداهاتن. ئیدی ئێمە گەیشتینە "ئورفە" و ناچار بوون گەڕانەوە و ڕۆیشتن. بەمشێوەیە خۆمان ڕزگار کرد، ئێمە کە چووین بەشۆفێرمان گووت:" لە حیلوان باسی ئەمە مەکە" ئێمە چووین چەکمان هێنا، کە گەڕاینەوە بینیمان شۆفێرەکە گەڕاوەتەوە و هەموو خەڵك پێی زانیوە، ئەو کەمە مۆڕاڵەی دروستیشمان کردبوو ئەویش نەماوە، جارێکی دیکە دەستمان پێیکردەوە. واتا لە هەلومەرجێکی بەمجۆرەدا تەڤگەر دەستی بەشەڕی حیلوان کرد. بێگومان زۆر بە زەحمەتی ئەو شەڕەمان پێشخست، تا زەبری یەکەممان لە "سلێمانان" نەدا گەل باوەڕی بە ئێمە نەدەکرد.

ئێمە لەناو بازاڕ و بەرۆژ و لەپێش چاوی خەڵك بوو لەوان درا، ئەوان لەناو ترومبێلدا بوون و دەگەڕان و دەسوڕانەوە. هەڤاڵانیش لێیان دان، زەبرێکی مەزنیان لێدرا، ئەوەی بریندارش بوو و هەڵاتبووە دەرەوەی حیلوان کوژران، ئەو کاتە گەل باوەڕی بە ئێمە کرد و هەموو گەل ڕابوو و لەگەڵ تەڤگەردا شوێنگیر بوون.

**باست لەوە کرد کە یەك کلاشینکۆفتان هەبوو، ئەو کلاشنکۆفەتان چۆن بەدەستخست؟ هەڵویست و مۆراڵی هەڤالان بۆ ئەم کلاشنکۆفە چیبوو و چۆن بوو؟**

بێگومان ئێمە کە ئەو کلاشنکۆفەمان بە قەرز کڕی، مۆراڵێکی زۆر مەزن و تۆکمەی لەنێو هەڤالان دروست کرد. چونکە هەموو هەڤالان حەماڵێتیان کردبوو و لەدەمی خۆیان گرتبووەوە و بەم پارەیەی پاشەکەوتمان کردبوو کڕیبوومان. کە پارەکەش بەشی نەکرد، لە سروج قاچاخچییەکانمان دەناسی، بەقەرز لێیانمان وەرگرت. ئەو کاتە ئەگەر هەڵە نەبم ئەو چەکەمان بە یازدە هەزار کڕی و مزەللی بوو. ئێمەش تەنیا دە هەزارمان هەبوو، پاشان هەزارەکەی ترمان دایەوە بە قاچاخچییەکە. کاتێك ئەو کلاشنکۆفەمان کڕی و بووینە خاوەن چەك، ئیدی دەمانگووت:" ئێمە چەکمان هەیە و دەتوانین شەڕ بکەین" هەموو هەڤالان وەکو چاوی خۆیان دەیانپاراست بۆ ئەوەی ژەنگ نەگرێت و شوێنێکی خراپ نەبێت و زەبری پێنەکەوێت، کاتێك ئەو کلاشنکۆفەمان لە قاچاخچییەکە وەرگرت بە هەڤاڵ "**کەمال پیر**"مان گووت:" لەلای ئەو قاچاخچییانە باش خۆت لێی فێر بکە" چونکە ئێمە نەماندەزانی بەکاری بهێنین و چۆن کار دەکات و چۆن بیکەینەوە. گووتمان:" تۆ فێر ببە، ئێمەش لە تۆوە فێر دەبین". ئیدی لە قاچاخچییەکە فێر ببوو و چەکەکەی هێنایە ئورفە. پێمان گووت:" با بزانین چۆن بەکار دەهێنرێت و چۆن دەکرێتەوە و خاوێن دەکرێتەوە؟" ئیدی هەڤاڵ "**کەمال پیر**" چەکەکەی کردەوە، کە ویستی پارچەکانی بخاتەوە سەریەك نەیتوانی، کاتێك کە نەیتوانی بیخاتەوە سەریەکتری ئەو چەکە لەدەست ئێمەدا وەك پارچەیەك ئاسنی لێهات. ئیدی گووتمان:" ئەو هەموو رەنجەی دامان و ئەو هەموو پارەیەی ئێمە هەمووی بەفیڕۆ چوو" پێیمان گووت:" بۆچی باش فێر نەبوویت؟" گووتی:" من فێر بووم بەس ناچێتەوە سەر یەك" گووتمان:" ئەگەر بەفشار بیخەیتەوە سەریەك لەوانەیە پارچەیەك یان شوێنێکی بشکێت، ئەمەش نابێت" گووتی:" نا ئیللا دەیخەمەوە سەریەك" گووتمان:" ئاخر بەفشار نابێت، ئەم جارە لەدەستتدا دەشکێت، بۆیە دەستی

لێمەدە" گووتی:" ئێمە ناچارین فێر ببین" ئەویش ڕاستی دەگووت. ئەملا و ئەولا، دیسان پارچەکانی خستەوە سەر یەکتری، خواستی جارێکی تر بیکاتەوە گووتمان:" مەیکەرەوە، ئامان!!، لەوانەیە بشکێت یان خراپ ببێت، با پارەکەمان بەفیڕۆ نەچێت". گووتی:" پێویستە ئێمە فێر ببین"، ئیدی بەمشێوەیە فێربووین کلاشنکۆف چۆن دەکرێتەوە و چۆن بەکار دەهێنرێت. پێشتر چەکمان نەبوو، کەسیش پەروەردەی نەکردبووین، بەمشێوەیە لەکردنەوە و بەکارهێنانی کلاشنکۆف تێگەیشتین. ئەو کلاشنکۆفەمان بەهەموو شارەکانی کوردستاندا دەگەڕاند و بەو کلاشنکۆفە چالاکیمان ئەنجام دەدا، هەڤالانی ئێمەش وا تێگەیشتبوون کە لەهەموو شوێنێك کلاشنکۆفمان هەیە، ئەو گروپانەش کە لەدەرەوەی ئێمەش لەدژی ئێمە بوون هەر وایان دەزانی لەهەموو شوێنێك کلاشنکۆڤ ئێمە هەیە، بێگومان هەمووی هەر یەك کلاشنکۆف بوو، ئێمە هێندە دەمانگەڕاند نەمانهێشت ڕۆژێك بگیردرێت، یان پیس ببێت، تۆ هەرگیز نەتدەبینی پیس بووبێت. هەموو هەڤالانیش وەکو چاوی خۆیان دەیانپاراست.

## دوای سەرکەوتن لە شەڕی حیلوان کە دەسەڵاتی گەل دێتە ئاراوە و گەل مۆڕاڵ وەردەگرێت و پێشکەوتن ڕوودەدات... ئەو هێزە چەپ و کوردانەی کە پێشتر شەڕی تەڤگەریان دەکرد، دوای ئەوەی پراکتیکێکی ئاپۆچییان بینی کە دەسەڵات بۆ ئاپۆچییان نییە، بەڵکو بۆ گەلە، ئەو هێزانە چۆن نزیك دەبوونەوە؟ هەروەها دەوڵەت چۆن نزیك دەبووەوە؟

بێگومان تەڤگەر بە شەڕی حیلوان خۆی باشتر ناساند، پێشکەوتنێك بەدیهات، باوەڕپێیەکی زیاتری بە گەل بەخشی، بۆیە ئەو هێرشەی لەسەر تەڤگەر هەبوو، مەزنتر و زیاتر بوو، دەوڵەت گروپەکانی تری زیاتر دژی ئێمە هاندا. زێدەتریش ئەو گروپانەی کە بەخۆیان دەگووت:" ئێمە کوردین" ئەو گروپانە زیاتر هێرشیان کردە سەر ئێمە،

هەم لەرووی ئایدیۆلۆژییەوە هێرشیان کردە سەرمان و دەیانخواست ناوی تەڤگەرەکەمان بزڕێنن و دەیانگووت:" ئەوانە شەڕ دژی عەشیرەتەکان دەکەن، عەشیرەتەکان بەگژ یەکترەوە دەنێن، خراپکاری دەکەن..." بەمشێوەیە پروپاگەندەیان دەکرد، بەمەش لەنێوان خۆیاندا بەرەیەکیان لەدژی ئێمە بەناوی یەکێتی هێزە دیموکراتی و نەتەوەییەکان (UDG) دامەزراند.. لەژێر ئەو ناوەدا (DDKD، KUK، ڕێگای ئازادی، ئالای رزگاری و ...هتد) نەك لەدژی دەوڵەت، بەڵکو لەدژی ئێمە بە عەسکەری هێرشیان کردە سەر ئێمە، تا ئەو کاتە گروپە کوردییەکان بە عەسکەری هێرشیان نەکردبووە سەر ئێمە، بەڵکو بە پڕوپاگەندە دژی ئێمە بوون، تەنیا گروپەکانی چەپی تورك بە عەسکەری هێرشیان دەکردە سەرمان، بەڵام دوای حیلوان لەبەر ئەوەی شەڕی حیلوان راستینەی ئەوانیشی ئاشکرا کرد، کە چییە و چی نییە؟! لەناو گەلیشدا ئیدی قیمەتیان نەدەما و ریسوا دەبوون و تادەهات لاوازتر دەبوون و پەرشوبڵاوەیان پێدەکرا و بنکەی جەماوەری خۆیشیان لەدەست دەدا، شەڕی حیلوان ئەمەی زیاتر کرد و پێشخست، بۆ ئەوەی بتوانن لەسەر پێیان بمێنن بە عەسکەریش هێرشیان کردە سەر تەڤگەر، ئەو بەرەیان دامەزراند. بەو بەرەیەش لەدژی تەڤگەر هێرشی عەسکەریان ئەنجامدا.

## وابزانم هەر ئەو کاتە بوو کە لە شارەکانی دیلۆك (عەنتاب) و دێرسیم دا لەناو تەڤگەردا گروپێك بەناوی "تێکۆشین" دەردەکەون کە خاوەن مەیلی جودان. ئەو گروپە چۆن و بۆچی دەرکەوتن و خاوەن چ مەیل و چەمك بوون؟ پاشان چییان لێهات؟

ئەوانەی تێکۆشین (TEKOŞİN)یان دروستکرد لەبنەڕەتدا ئەو کەسانە بوون کە پێشتر لەناو چەپی تورکدا کاریان کردبوو، لەناو ئەوانیشدا چەند کوردێکیش هەبوون، ئەوانە دەستبەرداری چەپی تورك بوون و گووتبوویان:" ئێمە بەناوی کوردستان رێکخستنێك پێشدەخەین"، کاتێك خواستبوویان هەنگاوێکی بەمجۆرە بهاوێژن، چەپی تورك بەوانەیان گووتبوو:" ئەگەر ئێوە دەخوازن بۆ کوردستان رێکخستنێك پێشبخەن ئەوا

ڕێكخستنێكی ئاپۆچییەكان هەیە ئەو شتانەی ئێوە دەیڵێن قسەی ئاپۆچییەكانە، ئێوە شتێكی جوداتر لەوان نالێن، بڕۆن تەڤلی ئەوان ببن و لەناو ئەواندا كار بكەن باشترە" ئەوانە گووتبوویان:" نا، ئێمە جودا خۆمان ڕێكخستە دەكەین و ڕێكخستن ئاوا دەكەین". هەندێك لەوانەی "تێكۆشین"یان دروستكرد لەو كەسانە بوون، هەندێكیش ئەوانە بوون كە بەشداریان لەرەشەكوژییەكەی هەڤاڵ "حەقی قەرار" كردبوو، لەناو ئێمەدا بوون، هەندێكیش پیاوی خودی دەوڵەتی توركیا بوون. واتا لەوانە هەموویان گروپی "تێكۆشین" دروستببوو. ئامانجی ئەو گروپەش ئەوە بوو چۆن تەڤگەری ئێمە بخەنە دەستی خۆیانەوە، چۆن توانستی تەڤگەر بكەوێتە دەستیان؟ لەم پێناوەدا هەوڵیان دەدا. كاتێكیش كە ئەم ئامانجانەیان بەدینەهات، ئیدی خواستیان تەڤگەر تەسفیە بكەن و بەمجۆرە خۆیان لەشوێنی تەڤگەر دابنێن. لەمەشدا هەر سەرنەكەوتن و ئەنجامیان بەدەست نەهێنا، كاتێك ئێمە لە حیلوان لەدژی "سلێمانان" شەڕمان دەكرد و هەموومان بەمە خەریك ببووین، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا هەندێك بۆشایی لە دیلۆك و دێرسیمدا دروستكرد، ئەوانیش ئەم هەلەیان قۆستەوە، پێیان وابوو دەتوانن لەو شوێنانە تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. بێگومان هەندێك لەناو ئێمەشدا هەبوون و لەگەڵ ئەوانە لەنێو پەیوەندی دابوون، ئەوانە هەموویان پێكەوە كاریان دەكرد، ئێمە ئەوەمان نەدەزانی، ئەوانەی ناو ئێمە و ئەوانەی لەدەرەوە "تێكۆشین"یان دروستكردبوو پێكەوە كاریان دەكرد. ئێمە ئەو كاتە لە حیلوان بووین. هەواڵمان پێگەیشت كە لە عەنتاب بەناوی "تێكۆشین" كودەتایەك ڕوویداوە و دەستیان بەسەر تەڤگەردا گرتووە. هەموو شتێكی تەڤگەریان خستۆتە دەستی خۆیانەوە. بۆیە ئێمە چووینە عەنتاب بۆ ئەوەی بزانین ئەوە چ مەسەلەیە و چۆن ڕوویداوە و كێن ئەوانەی وایانكردووە. كە چووینە عەنتاب بینیمان كە مەسەلەكە ڕاستە. واتا هەندێك كەس لەناو ئێمەدا لەگەڵ ئەوانەی لەدەرەوەی ئێمە "تێكۆشین"یان دروستكردووە و بەیەكەوە دەستیان بەسەر تەڤگەردا گرتووە، هەموو توانستی تەڤگەریشیان بۆخۆیان بردووە و ئیدی دەڵێن:" تەواو ئاپۆچی لێرە كۆتاییان پێهات" هەندێك لە هەڤاڵانی ئێمە لەبەرامبەر ئەم ڕووداوە شۆك بوونە، نازانن چیبكەن؟! هەڵبەتە ئەو هەڤاڵانەشیان بێكاریگەر كردووە، هەموو شتێكیان خستۆتە دەستی خۆیان، هەر یەكێك بەخۆی بڵێت:" من ئاپۆچیم" تەسفیەی دەكەن.

بۆیە لەنێو کادیران و گەلدا شڵەژان و ترسێك پەیدا بووە، هەر کەسە و چۆتە ماڵی خۆی و بەبێدەنگی لێی دانیشتووە و نازانێت چی بکات؟ لەبەر ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی لەوێ نییە، کەسێکی ئەوتۆش لەوێ نییە ڕێنماییان بکات. ئیدی بەمشێوەیە باڵادەستی خۆیان سەپاند بوو، ئێمە کە چووین بینیمان ڕەوشەکە زۆر مەترسیدارە، بەراستیش تەڤگەر لەوێ تەسفیە بووە و هەموو شتێك کەوتۆتە دەستی "تێکۆشین"ەوە، ئەمەش لەڕێگەی ئەوانەی لەناو ئێمەدا بوون ئەنجامیان داوە، ئەگەر وا نەبایە نەیاندەتوانی وەها بکەن. ئێمە دەستمان بەسازدانی چەندین کۆبوونەوە کرد، هەم لەگەڵ هەڤاڵان، هەمیش لەگەڵ گەل، تا ئەوانەمان تەنگاو کرد، جارێکی دیکە هەموو شتێکی تەڤگەرمان لەدەست ئەوان دەرخستەوە، ئەوانە هەڵاتن، بەمشێوەیە بێ ئەنجام بوون. بێگومان سەرەتا روونمان کردەوە ئەم مەسەلەیە چییە و چ نییە، جڤینمان لەگەڵ هەڤاڵان و گەل ساز کرد. کاتێك کە هەڤاڵان و گەل لە ڕەوشەکە تێگەیشتن و بینیان بەڕێوەبەراتیش هاتۆتە ئێرە و لەمەش هێز و وزەیان وەرگرت، ئیدی دژی ئەوان دەرکەوتن و ئەوان نەیاندەتوانی جموجۆڵ بکەن و بچنە ناو هەڤاڵان و گەلەوە، ڕەوشیان زۆر تەنگ بوو، ناچارمان هەڵاتن. ئەو کاتە چووینە سەریان و هەندێك لەوانەمان سزا دا و هەموو ئیمکانییەتی تەڤگەر؛ لە چەك و هەر چییەك هەبوو جارێکی تر لەدەستیان دەرهێنرایەوە. ئیدی جارێکی تر تەڤگەر کار و خەباتی خۆی لەوێ دەستپێکردەوە. بێگومان کاتێك ئێمە ڕەوشەکەمان لە عەنتاب بینی مەزەندەمان کرد کە هەمان شت لە "دێرسیم"یش ڕوودەدات. کە هێشتا ڕووینەدابوو یەکسەر هەڤاڵانمان نارده ئەوێ و گووتمان:"بڕۆن لەوێش تەدبیری خۆتان وەربگرن، تا دەکرێت زوو بچن. چونکە بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی وەرمانگرتووە ئەوا لە دێرسیمیش هەمان شت ڕوودەدات. ئێمە هەم مەزەندەمان کردبوو، هەمیش زانیاریمان وەرگرتبوو. هێشتا شتێك دیارنەبوو، بەڵام بە هەڤاڵانمان گووت:" زوو بچن و درەنگ نەکەون" بەرلەوەی ئەوان شتێك بکەن ئێوە بچنە ئەوێ، کە گەیشتنە ئەوێ ئەوان ناتوانن کارێك بکەن". ڕێك ئەو کاتەی هەڤاڵان گەیشتنە ئەوێ خواستبوویان لەوێش خۆیان رابگەیەنن و دەست بەسەر تەڤگەردا بگرن، ئەزموونی عەنتاب (دیلۆك)یش هەبوو، هەڤاڵان یەکسەر پێشیان لێگرتن و لەپیلانەکەیاندا سەرنەکەوتن، لەوێش چووینە سەر ئەوان، ئەو ڕێکخستنەمان

پەرشوبلاو کردەوە، چونکە ئێمە هەندێکمان سزا دا، هەندێکیشیان کە ببوونە ئامراز بەدەست ئەوانەوە، کە لە رەوشەکە تێگەیشتن دەستبەرداری ئەوان بوون و گەڕانەوە نێو تەڤگەر، چونکە بینیان ئەمە رێکخستەیەکی شۆڕشگێڕی نییە، ئامانجی خۆیشی ئەوەیە کە ئەم تەڤگەرە بخاتە دەست خۆیەوە و تەسفیەی بکات. لەمە تێگەیشتن و دەستبەرداری بوون، چوونی ئێمە بۆ سەر ئەوان ئەو رێکخستنەی پەرشوبلاوە پێکرد و بەمشێوەیە "تێکۆشین" بێکاریگەر تەسفیە بوو.

بێگومان ئیدی هەندێك لەوانەی بە نهێنی لەگەڵ ئەوانەدا کەوتبوونە نێو پەیوەندییەوە سیخوڕ بوون، ئەمە ئاشکرا بوو، بەتایبەت هەندێك لەوانەی لە رەشەکوژییەکەی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بەشدار بوون، ئەوانە هەمان ئەو کەسانە بوون کە پروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد و دەیانگووت:" ئێمە حەقیجیین" بەمە دەیانخواست تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە ، کاتێك کە لەیستۆکی ئەوان ئاشکرا بوو، هەڵاتن، لەگەڵ "تێکۆشین"دا بەیەکەوە رایانگەیاند کە تەڤگەر تەسفیە دەکەن. بێگومان تەڤگەر ئەو دەرفەتەی بەوان نەدا، هێزێکی ئەوتۆشیان نەبوو کە بتوانن ئەمە ئەنجام بدەن، بەمجۆرە ئەو مەترسییەشمان وەها بێکاریگەر کرد...

## هەنگاوێکی هاوشێوەی هەنگاوەکەی "حیلوان" لە "سیڤەرەك"یش هاوێشترا. ئەو هەنگاوە چۆن هاوێشترا؟ ئەو دەرئەنجامانەی لەگەڵ خۆیدا هێنای چیبوون؟

لە سیڤەرەکدا چەتەی فیوداڵ "محەممەد جەلال بوجاق" باڵادەست بوو، چەتەکانی "بوجاق" تەنیا لە سیڤەرەکدا دەسەڵاتدار نەبوون، بەڵکو لەدەوروبەری سیڤەرەکیش باڵادەست بوون، هەم لە بازێڕ هەم لە قەزاکانی نزیك سیڤەرەك و هەمیش لە گوندەکان بەتەواوی دەسەڵاتدارێتی ئەوان بەڕێوە دەچوو. بەبێ ئەوان نە گەل دەیتوانی هەنگاوێك بهاوێژێت و نە دەوڵەتیش، بەتەواوی بەدەست ئەوانەوە بوو، بەسەدان چەکداری خۆی هەبوو، هەموویشی پیاوکوژ بوون. زۆر کەسیان کوشتبوو. واتا لە سیڤەرەك و

دەوروبەری **سیڤەرەك** گەل زۆر لەوان دەترسا، گەلیان بەتەواوی تەسلیم کردبوو. دەوڵەتیش هەموو شتێکی تەسلیم بەوان کردبوو، بۆیە زوڵمێکی مەزنیان پەیڕەو دەکرد، بێ یاسایيەکی زۆریان بەڕێوە دەبرد، خەڵکیان دەگرت و دەیانکوشت و دادگاییان دەکرد و سزایان دەدان. دەستیان بەسەر موڵك و ماڵی خەڵك دادەگرت. کەسێکیش نەیدەتوانی لەدژی ئەوان رابوەستێت، تەنانەت ئەوانەش کە بەخۆیان دەگووت:" ئێمە شۆڕشگێڕین" وەکو (DDKD، رزگاری، **ئاڵای رزگاری، کاوەجی**) هەموویان لەوێ بوون، هیچیان لەدژی ئەو چەتە فیوداڵە نە ئاخافتنێکیان دەکرد نە کارێکیان دەکرد. کاتێك ئێمە لە **حیلوان** تەڤگەرمان پێشخست، هەم کاریگەری خۆی لەسەر ناوچەکانی دەوروبەری **حیلوان** دروست کرد، هەمیش **"محەممەد جەلال بوجاق"** ئەو مەترسییەی بینی، بۆیە هەوڵیدا بۆ ئەوەی زەبر لە **حیلوان** بدات، ئێمە ئەوەمان دەبینی کە مەترسییەك لە ئارادایە. بۆ ئەوەی ئێمە **حیلوان** بپارێزین، هەمیش رێگیری لەو زوڵمەی کەوا **"محەممەد جەلال بوجاق"** لەسەر گەل دەیکات بکەین، لەدژی ئەو چەتە فیوداڵە دەستمان بە ئامادەکارییەك کرد. ئەگەر ئێمە ئامادەکاریمان نەکردبایە و نەچووینایە سەری مسۆگەر ئەو دەهاتە سەر ئێمە، دەهاتە سەر **حیلوان**... ئێمە ئەزموونی **حیلوان**یشمان هەبوو، چۆن **"سلێمانان"** هێرشیان کردبووە سەر تەڤگەر و زەبریان لە تەڤگەردا بوو، زۆر ئێش و زەحمەتیمان بینی تاکو توانیمان لەدژیان رابوەستین، نەماندەخواست هەڵەیەکی بەمجۆرە لە **سیڤەرەك**یش دووبارە بکەینەوە. بۆیە لەژێر سەرۆکایەتی هەڤاڵ **"محەممەد قەرەسوونگور"**دا بۆ **سیڤەرەك** ئامادەکاریمان کرد، بێگومان کاتێك کە ئامادەکارییەکانمان دەکرد ئەو ئامادەکارییانە زۆر بەزەحمەتی و دژواری ئەنجام دەدرا.

بۆ نموونە؛ لەوێ دۆستێکی زۆر باش هەبوو، من و هەڤاڵ **"محەممەد قەرەسوونگور"** چووینە ماڵی ئەو دۆستە، هەندێك هەڤاڵی دیکەشمان لەگەڵ دابوو. ئەو دۆستە دەیگووت:" هیچ هێزێك ناتوانێت لەدژی **محەممەد جەلال بوجاق** رابوەستێت، ئەگەر ئێوە دەخوازن با بچینە **دیاربەکر** هێرش بکەینە سەر فەیلەقی سوپای تورکیا، من بۆ ئەمە ئامادەم و هەم، بەڵام بۆسەر **محەممەد جەلال بوجاق** من ئامادە نیم و من لەگەڵتدا نیم". هەروەها دەیگووت:" لەسەرەوە خودا و لەخوارەوەش **بوجاق**، مرۆڤ هەرگیز

ناتوانێت لەدژی بوجاق رابوەستێت" تەنانەت دەیگووت:" باوەڕیم زۆر بە ئێوە هەیە، من تکا دەکەم، من ماڵ و منداڵی خۆم هەمووی تەسلیمی ئێوە دەکەم، من دەزانم لەمێژەوە زەرەر ناگاتە خانەوادەی من. من لێرە دەردەکەوم و دەڕۆم". تا ئەو رادەیە دەترسا، ئەو کەسە کەسی هەرە باش و وڵاتپارێز بوو، تەنانەت ئەویش ئەو هێزەی نەدەبینی کەمرۆڤ لەدژی بوجاق رابوەستێت و دەیگووت:" ئەگەر هەر کەسێك لەدژی بوجاق رابوەستێت ئیدی کۆتایی بەو کەسە خۆی دێت"

بۆیە زۆر بەزەحمەتی ئەو ئامادەکارییەمان پێشخست، پێویستبوو سەرەتا زەبر لەخودی بوجاق کەوتبا، بۆ ئەوەی بتوانین ئەنجام بەدەست بخەین. چونکە لەئەزموونی "سلێمانان" ئەوەمان بینیبوو. ئەگەر تۆ زەبرت لە سەرۆکەکە وەشاند و ئەنجامیشت بەدەستخست، ئەوا تۆ دەتوانیت سەرکەوتوو بیت. بۆیە زیاتر لەسەر بوجاق راوەستاین. لەئاکامدا چالاکییەکە ئەنجام درا، بوجاق و هەندێك کەسی خۆی چووبوونە گوندێك. هەڤاڵان زانیارییان وەرگرتبوو، چووبوونە سەر ئەو ماڵەی ئەوان لێی بوون. هەڤاڵان باوەڕیان بەخۆیان هەبوو کە دەتوانن ئەنجام بەدەست بخەن، ئەو نارجۆکەی کە باسم لێیەوەکرد، کە کەسێکی خەڵکی وێرانشار دابووی بە ئێمە، هەڤاڵان هەندێك بەو نارنجۆکە باوەڕ بیبوون. کەوا نارنجۆکەکە دەهاوێژنە ژوورەوە و پاشانیش هێرش دەکەن. بەمشێوەیە دەتوانن ئەنجام بەدەست بخەن.

لەلایەکەوە پشتیان بەم نارنجۆکە قایم کردبوو، لەلایەکی دیکەشەوە کاتێك کە بوجاق چووبووە گوندەکە، هەڤاڵان لە شوێنێکی دیکە بوون. یەکسەر کە هەواڵیان پێگەیشتبوو چووبوونە گوندەکە. واتا زێدە بەپلان و ئامادەکارییەکی مەزنەوە نەچووبوون. چونکە زۆر زەحمەت بوو بوجاق وەها بەدەست بکەوێت، دەرفەتێکی بەمشێوەیە رەخسابوو، هەڤاڵانیش گووتبوویان:" تا هەواڵ بۆ هەڤاڵان دەنێرین و ئامادەکارییەکی باشتر بکرێت، لەوانەیە ئەو لە گوندەکە بڕوات، تا نەچووە با خۆمانی پێبگەیەنین". هەڵبەتە لە ئامادەکارییەکانی هەڤاڵاندا کەموکوڕی هەبوو، واتا لەچالاکی هێرشکردنەکە بۆ سەر بوجاق دا کەموکوڕی هەبوو. هەڤاڵان دەچن و هێرش دەکەن، ئیدی شەڕ دەست پێدەکات. هەڤاڵان نارنجۆکەکە دەهاوێژن، بەڵام ناتەقێتەوە، چونکە نارجۆکەکە خراپ بووە، کۆن بووە. کاتێك کە نارنجۆکەکە نەتەقییەوە، پشتیشیان بەم نارنجۆکە بەستبوو

و پیلانەکەیان لەسەر ئەو نارنجۆکە دارشتبوو. بۆیە پیلانی هەڤالان سەرناگرێت. ئیدی هەڤاڵ "**ساڵح کەندال**"یش دەچێتە ئەو ژوورەی کە "**بوجاق**"ی لێیە، لەو باوەڕە دایە کە نارنجۆکەکە دەتەقێتەوە، کاتێك کە ناتەقێتەوە هەڤاڵ "**ساڵح کەندال**" دەبێتە ئامانج، یەکسەر لەوێ شەهید دەبێت. هەندێك لە پیاوانی "**بوجاق**"یش دەکوژرێن، "**بوجاق**" خۆیشی بریندار دەبێت و خۆی دەخاتە ژێر تەرمەکانەوە، هەڤالان دەڵێن:" وادیارە تەواو بووە". لەبەر ئەوەی هەڤاڵ "**ساڵح کەندال**"یش شەهید بووە و دوو هەڤاڵی دیکەش بریندار ببوون، هەڤالان دەڵێن:" وادیارە **محەمەد جەلال بوجاق** کوژراوە، هیچ دەنگی چەکیش نایەت" تاریکیش بووە. ئیدی هەڤالان بۆ دواوە دەگەڕێنەوە.



شەهید ساڵح کەندال



**شەهید جومعە تاق**

بێگومان شەهیدبوونی هەڤاڵ "**ساڵح کەندال**" شەهیدبوونێکی زۆر گرانە. ئەمەش لەسەر هەڤالان کاریگەری دەبێت، لەپیلانی هەڤالاندا ئەوەیە کە دوای چالاکییەکە بچنە **سیڤەرەك** و بکەونە ناو باژێر و لەناو گەلدا بلاوی بکەنەوە کە "**بوجاق**" بەسزا

گەیەندراوە، ئەگەر بەگوێرەی پیلانەکە هەنگاویان هاوێشتبایە، مەزەندەیان دەکرد کە گەل هەمووی رابیایە سەرپێ، ئێمە ئەنجامان وەردەگرت. لەوانەیە وەکو ئەوەی "سلێمانان"یش درێژەی نەکێشا بایە، چونکە کوشتنی "محەممەد جەلال بوجاق" کاریگەرییەکی پڕ مەزنتری دەکرد، هەژاندنێکی دروست دەکرد، گەلیش رادەبوو، لەوانەبوو نەیانتوانیبایە زێدە بەرگری بکەن.

هەڵبەتە پێش هەفاڵان هەواڵ دەگاتە سیفەرەك و دەڵێن:" محەممەد جەلال بوجاق کوژراوە"خەڵك کە ئەم هەواڵە دەبیستن گشتیان هەڵپەرکێ دەکەن. هەندێك قوربانی سەر دەبڕن و هەندێکی دیکە شایی دەکەن. واتا لە شار و لە گوندەکان دەبێتە شایلۆغان، بەڵام دوای کاتژمێرێك هەواڵێکی دیکە دەگاتە شار و دەڵێن:" محەممەد جەلال بوجاق بریندار بووە و نەکوژراوە". کاتێك ئەو هەواڵە دەگاتە خەڵك بێگومان ئەمجارەیان خەڵك دەترسێت کە "نەمردووە!! داخۆ چییمان بەسەر دێت؟ وا دیلان و هەڵپەرکێشمان کرد" بۆیە هەندێکیان واز لەهەڵپەرکێ دێنن و هەندێکیشیان دەچنە ماڵی "بوجاق" بۆ ئەوەی رێگیری لە کۆمەڵکوژییەکی شیمانەکراو بگرن. بۆ ئەوەی پیاوانی "بوجاق" نەچنە سەریان، ئەمجارەیان رەوشێکی بەمجۆرە لەناکاو دێتەناراوە. بۆیە بەگوێرەی پیلانی ئێمە چالاکییەکە ئەنجامگیر نەبوو، لەبەر ئەوە ئیشی ئێمە لە سیفەرەك کەوتە نێو زەحمەتییەوە. شەڕی سیفەرەك زۆر درێژەی کێشا، هەم درێژەی کێشا و هەمیش بەگوێرەی پیلانەکەی داڕێژرابوو بەڕێوەنەچوو. ئێمە دەمانخواست لەوێ پڕوپاگەندەی چەکداری پێشبخەین و بەمەش ئەنجامگیر ببین، لەسەر ئەو بنەمایەش گەریلا پێشبخەین، گەریلاش لەهەرێمی "بۆتان" جێگیر بکەین. ئامانجی ئێمە ئەوەبوو. واتا کاتێك لەدژی چەتەی "محەممەد جەلال بوجاق" لە سیفەرەك ئەو شەڕەمان پێشخست، بۆ ئەوەبوو؛ یەکەم: حیلوان بپارێزین. دووەمیشیان: کە ئێمە حیلوانێکی نوێ دروست بکەین. سێیەمیشیان: کە تاکتیکی پڕوپاگەندەی چەکداری بگەیەنینە گەریلا و گەریلاش لە "بۆتان" جێگیر بکەین، ئامانج ئەمانە بوو، لە حیلواندا "سلێمانان" گروپێکی چەتەی فیوداڵ بوو، ئێمە زەبرێکمان لێی وەشاند بوو، کاریگەری خۆیشی هەم لەسەر گەل هەمیش لەسەر دەوڵەت و فیوداڵەکان دروست کردبوو، بەڵام فیوداڵی مەزن لەبنچینەدا "محەممەد جەلال بوجاق" بوو. ئەگەر لە کوردستاندا زەبر لەو چەتەیە

وەشێندرا ئەوا ئیدی فیودالییەت نەیدەتوانی بەرگەی مانەوەی بگرتبایە، فیودالەکان زەبرێکی مەزنیان بەردەکەوت. واتا لە دیموکراتیزەبوونی کوردستاندا دەبووە هەنگاوێکی مەزن، گەلیش زیاتر دەکەوتە جموجۆڵەوە، زیاتر باوەڕی بەخۆی دەکرد، ئەمە لە کوردستاندا گۆڕانێکی گەورەشی دروست دەکرد بۆ تەڤگەر، بەڵام ئیدی لەبەر ئەوەی ئەو چالاکییە لەسەرەتادا تەواو ئەنجامگیر نەبوو، وەکوتریش ئەو تاکتیك و پیلانەی پەیوەست بەم چالاکییەوە دابوومانە پێش خۆمان پێشنەکەوت. لەخەتی ئێمەدا لە پێشەنگایەتی شەڕدا هەندێك لادان دروستبوو. هەندێك کێماسی دەرکەوت و ئەو کێماسییەش هەندێك هەڵەی دروست کرد، هەڵبەتە بۆیە شەڕی ئەوێ زۆر درێژەی کێشا، زۆر زەرەر و قوربانیشمان دا. هەم ماددی و هەمیش مەعنەوی قوربانیمان دا، لەوێ ئەو شەڕەی پێشکەوت ببووە شەڕێکی کلاسیك. وەك چۆن لە کوردستاندا لەنێوان عەشیرەتەکاندا شەڕی بەرەیی (سەنگەر لەیەکترگرتن) بەرپا دەبوون، شەڕێکی بەمجۆرە لە سیڤەرەك پێشکەوت، ئەمە خەتی ئێمە نەبوو کە بەمشێوەیە شەڕی سەنگەر پێشبخەین و زۆر کەس بخەینە نێو سەنگەری شەڕەوە و دوو ڕۆژان شەڕی بەرامبەرەکەمان بکەین. ئەمە چەمك و خەتی ئێمە نەبوو بۆ شەڕ. ئەمە چەمك و خەتی کلاسیکی شەڕکردن بوو لەناو کورداندا، ئەگەر تۆ شەڕی سەنگەرت بەڕێوە برد مسۆگەر تۆ ناتوانیت ئەنجامگیر ببیت. چونکە چەتەی "بوجاق" هەموویان پیاوکوژ بوون، شەڕی سەنگەریان کردبوو، شەڕی عەشیرەتەکانی دیکەیان کردبوو. لەم ڕووەوە ئەزموونێکی زۆر مەزنیان هەبوو، چەك و ئیمکانیاتی خۆیان زۆر و زەبەند بوو، هەڵبەتە دەوڵەتیش لەپشت ئەوانەوە بوو، بەڵام ئێمە نە ئیمکانیاتمان هەبوو، نە چەکی باشمان هەبوو، نە ئەزموونێکی شەڕی سەنگەریشمان هەبوو، بۆیە بەگوێرەی ئامانج و پیلانی ئێمە لەوێ شەڕ پێشنەکەوت و درێژەی کێشا و قوربانیمان دا، لە تاکتیکی ئێمەدا دوورکەوتنەوە و هەڵە دەرکەوت. بێگومان پاشان تەڤگەر موداخەلەی ئەمەی کرد، ڕێی لەمە گرت، بەڵام تا ئێمە ڕێمان لەمە گرت زۆر قوربانی و زیادمان لێکەوت. بەگوێرەی پیلانی ئێمە دەبایە ئەوەندە زیانمان لێنەکەوتبایە، ئەوەندە شەڕ درێژەی نەکێشابایە. ئیدی گەیشتە رادەیەك هەموو توانستی تەڤگەرەمان خستە خزمەتی شەڕی سیڤەرەکەوە، کەچی چەمك و تاکتیکی ئێمە لەدەرەوەی ئەمە بوو. لەبەر ئەوەی لە

تاکتیکدا دوورکەوتن و هەڵەیەك روویدا، شەڕ ئەوەندە فراوان بوو و بەرۆژان بەردەوام بوو و بووە شەڕی سەنگەر بەسەنگەر، بۆ ئەمەش نە مرۆڤ بەشی دەکات، نە فیشەك بەشی دەکات. بۆیە بۆ ئێمە زۆر زیانمەندبوو، بۆ ئەوەی رێگیریش لەمە بکەین، بە هەموو ئیمکانیاتی خۆمانەوە کەوتینە جموجۆڵ. واتا هەموو ئیمکانیاتی تەڤگەر کەوتە نێو ئەم شەڕەوە، تاکو توانیمان رێی لەپێش بگرین. هەڵبەتە دوای ئەمەش کودەتای سەربازی (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) رەوشێکی نوێی هێنایە ئاراوە.

ئیدی ئێمە نەماندەتوانی وەك پێشتر لە سیڤەرەك بەردەوامی بە شەڕ بدەین، هەڵبەتە ئەو تاکتیکەی کە پەیڕەویش دەکرا تاکتیکی ئێمە نەبوو. ئێمە دەمانخواست رێی لەپێش بگرین، کە کودەتای (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠)ش روویدا رەوشەکەی گرانتر کرد، پێویستبوو بەتەواوی لەوێ گۆڕانکاریمان بکردبایە. ئەو گۆڕانکارییانەمان کرد و بەمشێوەیە رێگیریمان لە زیانلێکەوتنی زیاتر گرت.

بێگومان چەتەی "بوجاق"یش زۆر زەبریان بەرکەوت، واتا ئەو دەسەڵاتەی ئەوان هەرچەندە بەتەواوی لەناو نەبردرا، بەڵام ئیدی نەیاندەتوانی وەکو رابردوو زوڵم لەخەڵك بکەن، گەل هەناسەیەکی هەڵکێشا، بۆیە لەنێو گەلدا باوەڕی بۆ تەڤگەر تۆکمەتر بوو، زۆر گوندنشین لەگەڵ تەڤگەر شوێنگیر بوون، ئیدی ئەو ترسەی "بوجاق" شکێندرا، گەل لەدژی ئەو راوەستان، ئەوانە نەیاندەتوانی وەکو پێشان بە کەیفی خۆیان چ بخوازن بیکەن. دیسان لەبەر ئەوەی شەڕی سیڤەرەك دوای شەڕی حیلوان پێشکەوت، کاریگەری باشی لەسەر گەلی ناوچەی دیکەش کرد، واتا هەرچەندە شەڕی سیڤەرەك بەگوێرەی تاکتیکی ئێمە بەڕێوە نەچووبێت، زیان و قوربانی ئێمەش هەبوو، بەڵام دەنگدانەوەیەکی مەزنی لە باکووری کوردستان هەبوو، لەسەر گەل کاریگەرییەکی بەهێزی دروست کرد، هوشیاربوونەوەیەکی مەزن، تەڤلیبوونێکی مەزنی هێنایە ئاراوە. واتا تا دەهات تەڤگەری لەرووی جەماوەرییبوونەوە پێشدەکەوت، کاریگەرییەکی بەمجۆرەی دروست کرد...

**لەچوارچێوەی هەر دوو ئەزموونی حیلوان و سیڤەرەكدا كە دەسەڵاتی گەل ئاوا دەبێت، لەلایەكی دیكەشەوە تەڤلیبوونێكی مەزن بۆ تەڤگەر دێتەئاراوە، ئەمە چ كێشە و گرفتێك بۆ تەڤگەر دروست دەكات؟ لەم رووەوە چەمك و تێڕوانینی تەڤگەر لەو كاتەدا چیبوو؟**

هەڵبەتە لەلایەكەوە تەڤگەر لەناو گەلدا بەهێز دەبوو و پێشدەكەوت، باوەڕی گەل بەتەڤگەر تۆكمەتر دەبوو، گەل لەناو تەڤگەردا شوێنگیر دەبوو، لەهەموو رووێكەوە تەڤگەر مەزن دەبوو... لەلایەكی تریشەوە ئەو تاكتیكەی لە سیڤەرەك خستبوومانە پێش خۆمان جێبەجێنەكرا. پێشەنگێتی (كادیرانی پێشەنگ) نەیتوانی ئەو تاكتیكە جێبەجێ بكات، لە تاكتیكدا لادانێك روویدا. ئەو لادانەش كێشەكەی گرانتر كرد، هەروەها هێرشی دەوڵەت، فیوداڵەكان، گروپە كوردییەكان، هەندێك لە گروپەكانی چەپی تورك لەسەر تەڤگەر هەبوو، بۆیە تەڤگەر هەندێك زۆری و سەختی دەچێشت، واتا لەدژی هەموو ئەو هێرشانە چۆن خۆی بپارێزێت؟ ئەو كێشە و گرفتانەی دەركەوتن چۆن چارەسەریان بكات؟ لە سیڤەرەك لە تاكتیكدا دووركەوتنەوەیەك هەبوو و لەگەڵ خۆیدا خراپی دروست دەكرد، چۆن تاكتیك بچەسپێت و رێگیری لەزەرەر و زیان بكرێت؟ لەبەر ئەوەی گەل تەڤلی تەڤگەر دەبێت و تەڤگەر مەزن دەبێت، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا هەندێك كێشە و گرفتی دروست كردبوو. ئیدی پێویستبوو تەڤگەر هەموو ئەو كێشە و گرفتانە چارەسەر بكات. لێرەدا لە كادیران و پێشەنگدا كێشەیەك لەئارادا بوو.

**ئەو كێشەیە چیبوو؟**

هێز و توانای كادیر بەشی ئەوەی نەدەكرد كە پێشەنگایەتی بكات و تەڤگەر بەهێز بكات و بەرەو پێشەوەی ببات و ئەو كێشە و گرفتانەی دەركەوتوون چارەسەریان بكات. گەل پێشەنگی دەخواست، كادیری پێشەنگی دەخواست. بەڵام پێشەنگیش نەیتوانی

ببێتە هێزی چارەسەری، واتا لەهەموو رووێکەوە ئەو پێشکەوتنانەی لەئارادا بوون پێشەنگایەتی کەوتبووە دواوەی ئەو پێشکەوتنانەوە. ئەمە مەترسی خستە سەر تەفگەرەوە لەگەڵ خۆیدا بنبەستبوونێکی دروستکرد، تەنانەت کەمێك مابوو تەفگەر زەبرێکی مەزنی بەربکەوێت. ئیدی تا دەهات هێرش دژی تەفگەریش زیاتر دەبوو. تەفگەر لەرێگەی تەدبیر وەرگرتنەوە نەیتوانی ببێتە بەرسف. ئەمەش بۆ تەفگەر بنبەستبوونی دروستکرد، هەمیش رێی لەبەردەم زەرەر و زیان کردەوە. لەمەشدا تەفگەر زۆر کەوتە زۆری و زەحمەتییەوە.

بێگومان سەرۆك هەموو ئەمانەی بینی، چۆن رێگیری لەم رەوشە بکات؟ ئەگەر رێگیری لەمە نەکات ئەوا مەترسیدارە، ئەو کاتە بینی کە توانستی رێگیریکردن لەم رەوشە مەترسیدارە و ئەو گرفتانە لە وڵاتدا نییە، مەگەر لەدەرەوەی وڵاتدا بتوانرێت هەندێك کەناڵ بکرێتەوە، لەدەرەوە هەندێك ئامادەکاری بکرێت و ئەو ئامادەکارییانە بخاتە وڵات کە مرۆڤ بتوانێت هەم ببێتە بەرسف، هەمیش کێشەکان چارەسەر بکات. بۆ ئەوەی تەفگەر زەبری بەرنەکەوێت و بتوانێت لەسەرپێی خۆی رابوەستێت و لەسەر بناخە و ئامانجی خۆی بەڕێوەبڕوات. ئەو زۆری و زەحمەتییانەی ئێمە لە سیفەرەکدا بینیمان، ئەو زەرەر و زیانەی لێمان کەوت، ئەو هێرشانەی کرانە سەر ئێمە، ئێمەی ناچار کرد چارەسەرییەك بدۆزینەوە، چارەسەریش ئەوە بوو کە مەگەر تەنیا لەدەرەوەی وڵات بێت. بەمجۆرە رێگای دەرەوەی وڵات کەوتە پێش تەفگەرەوە.

سەرۆك ئەو رێگەیەی بەمجۆرە کردەوە، بێگومان وەکوتریش کاتێك شەڕی سیفەرەکمان رێکخست، ئامانجی ئێمە چیبوو؟ ئێمە پارتیبوونمان پێشدەخست، دەمانخواست دامەزراندنی پارتیش لەگەڵ شەڕی سیفەرەك رابگەیەنین. ئامانجێکی بەمجۆرەشمان هەبوو، واتا دەمانخواست بەچالاکی لەسەر "محەممەد جەلال بوجاق" دامەزراندنی پارتی رابگەیەنین. چونکە زۆر بیرمان کردبووەوە؛ ئێمە بەرەو پارتیبوون هەنگاو دەهاوێژین، ئێمە دەبینە پارتی، بەڵام پێویستە پارتییەکی شۆڕشگێڕ خۆی بە چالاکییەك رابگەیەنێت، کەوا کاریگەرییەکی بەهێز لەسەر گەل دروست بکات و باوەڕییەکی تۆکمە بئافرێنێت، ئەمەش زۆر گرنگ بوو.

ئەو کاتە ئێمە حیسابی ئەوەمان کرد، چالاکییەکی چۆن ئەنجام بدەین؟ بەگوێرەی ئایدیۆلۆژیا و فیکر و ئامانجی ئێمە راست بێت. لەدژی دەوڵەت چالاکییەك ئەنجام بدەین باشترە یان لەدژی خائینی کورد و چەتە و فیودالی کورد؟ بێگومان ئێمە ئەوەمان گفتوگۆ کرد، لەئەنجامی ئەم گفتوگۆیانە راگەیاندنی پارتی بە چالاکییەك لەدژی "محەممەد جەلال بوجاق" زۆر راستتر و باشترمان بینی. چونکە رێکخستنی ئێمە تا ئەو کاتە لەو ئاستەدا نەبوو و بەهێز نەبوو کەوا بتوانین لەدژی دەوڵەت بتوانین چالاکییەکی وەها ئەنجام بدەین، کە شایستەی راگەیاندنی پارتی بێت. ئەگەر ئێمە چالاکییەکی بەمجۆرەمان ئەنجام بدابایە، ئەوا ئەو هێرشەی بهاتبایە سەرمان، نەماندەتوانی بەرسڤی بدەینەوە. ئەو کاتە ئێمە زەبرمان بەردەکەوت. بەڵام ئەگەر لەدژی "محەممەد جەلال بوجاق" چالاکییەك ئەنجام بدەین، ئەوا ئەو هێرشانەی پاشان بکرێتە سەرمان دەتوانین وەڵامی بدەینەوە. چونکە ئاستی رێکخستنی ئێمە دەیتوانی وەڵامی هێرشی بەمجۆرە بداتەوە، ئەمە لەلایەك.

لەلایەکی تریشەوە، ئەگەر تۆ دەخوازیت لە کوردستان چالاکی ئەنجام بدرێت ئەوا پێویستە تۆ سەرەتا لەقاچ و ستووندەکانی بدەیت، چونکە لە کوردستان زیاتر قاچەکانی (پەلوپۆکانی) لەخودی دەوڵەت بەهێزترن. ئیدی "محەممەد جەلال بوجاق" قاچێکی بەهێزی دەوڵەتی تورکیا بوو. ئەگەر تۆ زەبرت لەم قاچەی دا و ئەنجامگیر بوویت، ئەوا تۆ قاچێکی دەوڵەتی تورکیات لە کوردستان شکاند. ئەمە بۆ تۆ نەفەسێکی مەزن دەئافرێنێت، توانستی مەزن بۆ کار و خەبات دەخوڵقێنێت. ئێمە کە تەڤگەرێکی سۆسیالیستی بوون، لەدژی فیودالیزم بووین، لەدژی بەکرێگیراوێتی بووین، ئێمە تەنیا لەدژی ئیمپریالیزم و داگیرکەری نەبووین، بەڵکو لەدژی بەکرێگیراوێتی و خیانەتکاری و فیودالیزمیش بووین. ئەگەر تەڤگەرێکی ئازادیخواز و دیموکراتیخواز لە کوردستاندا لەدژی توێژ و چینێکی سیخوڕ و بەکرێگیراو و خائین کە زوڵمکار و رەنجخۆری گەلە و خوێنی گەل دەمژێت چالاکییەك ئەنجام بدات، ئەوا چالاکییەکی راستە. واتا بە گوێرەی کارەکتەر و ئامانجی تەڤگەرە.

بۆیە ئێمە "محەممەد جەلال بوجاق"مان کردە ئامانج و بڕیارمان دا چالاکی لەدژی ئەنجام بدەین. بەم چالاکییەش دامەزراندنی پارتی (PKK) رابگەیەنین. چونکە ئێمە

تەفگەرێکی ریفۆرمیست نەبووین، بەڵکو ئێمە تەفگەرێکی شۆڕشگێڕ و رادیکاڵ بووین، راگەیاندنی دامەزراندنی پارتییش پێویستبوو بەتەرزێکی شۆڕشگێڕانە بووایە. بۆیە ئێمە خواستمان بە چالاکییەکی بەمجۆرە پارتی رابگەیەنین. هەڵبەتە کاتێك چالاکییەکە لەدژی "بوجاق" ئەنجامدرا لە هەموو شوێنێك بەیاننامە (جاڕنامە)ی پارتیبوون و دامەزراندنی پارتیشمان بڵاوکردەوە... بەم چالاکییە هەموو کەس زانی کە پارتی دامەزراوە و پارتی راگەیاندراوە...

## بەر لەوەی ئەو چالاکییە لەدژی بوجاق ئەنجام بدرێت هیچ کاتێك هەڤاڵان و چەتەکانی بوجاق رووبەڕووی یەکتر ببوونەوە؟

بێگومان پێش ئەوەی چالاکییەکە ئەنجام بدرێت ئێمە ئامادەکاریمان دەکرد، لەکاتی ئەو ئامادەکارییانەدا ئەو کاتە هەڤاڵ "جومعە تاق" هەبوو باوکی "جومعە تاق"یش پیاوی "بوجاق" بوو. لە "سیڤەرەك" باخچەیەك هەبوو، ئەو باخچەیە شوێنێکی وەها بوو کە زۆر فەرمانبەر، رۆشنبیر و مامۆستا و خوێندەڤانان و خەڵکی دیکەش دێنە ئەو باخچەیەوە... هەڤاڵ "جومعە تاق"یش دەچێتە ئەو باخچەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ هەندێك کەس پەیوەندی پێشبخات و پڕوپاگەندە بکات. چونکە ئامادەکاریمان بۆ پێشخستنی کار و خەبات دەکرد لە سیڤەرەك. ئەو کاتەش لە سیڤەرەك زێدە هەڤاڵی ئێمە نەبوو. زۆر کەم هەڤاڵمان لەوێ هەبوو، دەتوانم بڵێم؛ نزیکەی دە تا پازدە هەڤاڵ و دۆستی ئێمە هەبوو. ئیدی لەو پارکەدا، کەسانی نێو پارتەکانی دیکەش هاموشۆ دەکەن وەك (DDKD) و رێگای ئازدی و رزگاری و...هتد. کە"محەممەد جەلال بوجاق"یش لەگەڵ پیاوەکانی دەکەونە نێو ئەو پارکەوە، هەموو کەسێك، تەنانەت ئەوانەش کە بەخۆیان دەگووت:" شۆڕشگێڕین، لە فلان تەفگەرین و لەفیسار پارتیین..." هەموویان لەپێشوازیدا لەترسان هەستانە سەرپێ. بێگومان تەنیا هەڤاڵ "جومعە تاق" هەڵناسێت، ئەمەش سەرنج و دیقەتی "بوجاق" و پیاوانی رادەکێشێت، پیاوەکانی "بوجاق" دەخوازن یەکسەر بیکوژن، "بوجاق" ناهێڵێت. چونکە تا ئەو کاتە شتێکی وەها

روویندداوه، لەبەر ئەوە ناهێڵێت، نەك كوشتنی ئەو ناخوازێت، كە چۆتە هەر جێگایەك هەموو كەس لەپێشی هەڵساوە، یەكەمجارە كەسێك بە بەرچاوی خەڵكەوە لەبەری هەڵناستێت. **"محەممەد جەلال بوجاق"** ئەمە دەبینێت و دەخوازێت لەمە تێبگات و بزانێت ئەمە كێیە و بۆچی هەڵناستێت؟ چونكە هەندێك شتیشی بیستبوو، بۆ نموونە شەڕەكەی حیلوانی بیستبوو، هەروەها بیستبووی كە تەفگەر دەخوازێت لە سیڤەرەك هەندێك كار و خەبات بكات و پێشبخات، ئەم شتانە دەبینێت و ئەگەرە مەترسیدارەكان شیمانە دەكات، بۆیە دەخوازێت تێبگات، تا ئەو كاتەش شتێكی وەها لە سیڤەرەك روویندداوە. بێگومان پیاوانی **"بوجاق"** چەند جارێك دەخوازن بیكوژن، **"بوجاق"** ناهێڵێت و دەچێتە بەردەم ئەو مێزەی هەڤاڵ **"جومعە تاق"** لێی دانیشتووە و پێی دەڵێت:" تۆ كێی و خەڵكی كوێی؟ خەڵكی سیڤەرەكیت یان نا؟ تۆ چ دەكەیت لێرە؟ تۆ دەزانی من كێم؟ هەموو خەڵك لەپێش من هەستان تۆ بۆچی هەڵنەستایت و...هتد". هەڤاڵ **"جومعە تاق"**یش دەڵێت:" ئەگەر ئەوان هەستاون بۆ خۆیان هەستاون، بەلام من هەڵناستم". هەروەها دەڵێت:" من تۆش دەناسم تۆ كێی؟ تۆ **محەممەد جەلال بوجاقیت** و منیش خەڵكی ئێرەم و باوكی منیش پیاوی تۆیە. من كوڕی فلانە كەسم. ئەگەر هەموو كەسێك هەستایە سەر پێیان ئەوا بەو واتایە نایەت كە پێویستە منیش هەستمە سەر پێ" **"بوجاق"** دەڵێت:" كەواتە تۆ من دەناسیت و خەڵكی ئێرەشیت، لەپیاوەكانی خۆیشی دەپرسێت:" بەڕاستی خەڵكی ئێرەیە، كوڕی فلانە كەسە؟ پیاوەكانیشی دەڵێن:"راستە وایە" دیسان پیاوەكانی دەخوازن بیكوژن، **"بوجاق"** دەڵێت:" با بگەڕێینەوە و بڕۆین، وەكو ئێوە لەرەوشەكە تێگەیشتوون بەمجۆرە نییە، ئەوەی ئێوە لێی تێگەیشتوون زۆر لەوەش خراپترە، پێویستە ئێمە باش لەرەوشەكە تێبگەین" ئیدی دەردەچن و دەڕۆن. بێگومان ئەوەی لە باخچەكە بوون كە هەموویان رابوونە سەر پێیان دەڵێن:" مسۆگەر **جومعە تاق** دەكوژرێت" كاتێك دەبینن **"جومعە تاق"** لەدژی ئەوان قسەی كرد و لەكاتی قسەكردنی خۆیشیدا رانەبووە سەر پێیان، كەچی نەیانكوشت و رۆیشتن. ئیدی هەموویان لەدەوری هەڤاڵ **"جومعە تاق"** كۆدەبنەوە و پێی دەڵێن:" تۆ بۆچی واتكرد؟ لەوانە بوو تۆیان بكوشتبایە، مرۆڤ چۆن لەپێش **محەممەد جەلال بوجاق** شتی وا دەكات؟!..."

بێگومان هەڤاڵ "جومعە تاق" قسەیان بۆ دەكات و تەنانەت هەندێك قسەی ناشرینیشی لەدەم دەردەچێت. پێیان دەڵێت:" ئێوە بێشەرمەن... ئەگەر محەممەد جەلال بوجاق بۆتە بەڵا بەسەر خەڵكەوە ئەوا ئێوە بەم شێوازەی خۆتان كردووتانە بە بەڵا... باشە ئەمە گەلە و نەزانە و شت نازانێت، خۆ ئێوە هەندێكتان بەخۆتان دەڵێن؛ ئێمە شۆڕشگێڕین و ئێمە تەڤگەری شۆڕشگێڕین و تەنانەت دەشڵێن ئێمە لەدژی فیودالیزمیشین، كەواتە بۆچی لەپێش محەممەد جەلال بوجاق هەڵدەستن؟ بۆچی بوجاق هێندە بەسەر گەلدا مەزن دەكەن؟ ئەگەر لە بنەڕەتدا بوجاق ئاواهی مەزن بووە ئەوا ئێوە مەزنتان كردووە... ئێوە بێشەرمەن و هیچ پەیوەندییەكی ئێوە بە سۆسیالیزم و شۆڕشگێڕی و ولاتپارێزییەوە نییە..." بێگومان كەسیش لەبەرامبەر ئەو هەڤاڵە ناتوانێت قسەیەكیش بكات. هەڵوێستی ئەو هەڤاڵە و ئەو ئاخافتنانەی لەنێو سیڤەرەكدا دەنگێكی مەزنی دایەوە و لەهەموو شوێنێك بڵاوببووەوە. ئیدی ئەمە زۆر خەڵكی ولاتپارێزی لەئێمە نزیك كردەوە. هەندێكیش بەنهێنی پەیوەندییان لەگەڵ بەستین. تا ئەو كاتە نزیكەی دە تا پازدە هەڤاڵمان هەبوو، كەچی دوای ئەم رووداوە زۆر پەیوەندیمان بۆ دروست بوو، زۆر كەسی نێو تەڤگەری دیكە وازیان لەوان هێنا و تەڤلی تەڤگەری ئێمە بوون، ئیدی ئەو تەڤگەرانەی دیكە تەنانەت ناویشیان نەما، هەموویان لەوێ تەسفیەبوون، ئیدی تەڤگەری شۆڕشگێڕی لە سیڤەرەك كەوتە ژێر كۆنترۆڵی ئێمەوە، تەنیا ئێمە و "بوجاق" ماینەوە، ئەو تەڤگەرانەی دیكە هەموویان نەمان.

## بەگشتی ئەو تێكۆشانە چەكدارییەی لە حیلوان و سیڤەرەك بەرێوەچوو بۆ ئەو قەڵەمبازەی كە دواتر لە ئەروە لە (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) ئەنجام درا بەچ واتایەك دەهات و تا چەند رۆڵی لە دەستپێكردنی ئەو قەڵەمبازەدا هەبوو؟ •

لەبنەڕەتدا پراكتیكی حیلوان و سیڤەرەك ئامادەكاری بوو بۆ قەڵەمبازی (١٥)ی ئاب. واتا ئێمە دەمانخواست پروپاگەندەی چەكداری لەوێ ئەنجام بدەین و پێشبخەین، لەمەشەوە

بیگەیەنینە ئاستی گەریلا و گەریلاش لە "بۆتان" جێگیر بکەین و لە "بۆتان" گەریلایی و شەڕی چەکداریش رابگەیەنین. هەرچەندە لە حیلوان و سیفەرەك شەڕمان پێشخست، بەڵام بەفەرمی شەڕی چەکداریمان رانەگەیاندبوو، ئامانجێکی بەمجۆرەمان نەبوو. چونکە ئێمە هێشتا نەگەیشتبووینە رێکخستەبوون (تنظیم)ێکی عەسکەری و گەریلایی کە بتوانین شەڕی گەریلایی رابگەیەنین. لەبنەڕەتدا ئێمە دەمانخواست ئامادەکاری ئەمە لە حیلوان و سیفەرەك پێشبخەین و بگەینە ئاستی تێکۆشانی گەریلایی و لەهەرێمی بۆتان گەریلا جێگیر بکەین و شەڕی گەریلاش لەوێ لە بۆتان رابگەیەنین. ئەگەر شەڕی حیلوان و سیفەرەك نەبایە و ئامانجی بەمشێوەیەمان نەبایە ئەوا نەماندەتوانی قەڵەمبازی (١٥)ی ئاب پێشبخەین، چونکە ئامانجێکی وەهامان هەبوو. لەبنەڕەتیشدا ئەو ئامانجەمان لە حیلوان و سیفەرەك دابووە پێش خۆمان، بەشێوەیەکی روونیش لە سیفەرەکدا خستبوومانە پێش خۆمانەوە. بۆیە سەرۆك ئاپۆ لە سیفەرەکیش ئەرکی بە هەڤاڵ "محەممەد قەرەسوونگور" سپارد کەوا پرووپاگەندەی چەکداری رێکخستە بکات و بەرنامەی ئەوەشی نووسی و دای بە هەڤاڵ "محەممەد قەرەسوونگور" کە رێکخستنێکی پرووپاگەندەی چەکداری لەوێ دامەزرێنێت، بۆ ئەم مەبەستە بەرێوەبەرایەتییەك لە سێ هەڤاڵ پێکهات، پێویستبوو لەژێر بەرپرسیارێتی ئەو بەرێوەبەرایەتییەدا هەندێك یەکینەی پرووپاگەندەی چەکداری پێك بێت کە ئێمە بگەیەنێتە قۆناخی گەریلایی. بەڵام وەکو گووتم؛ ئەو تاکتیکەی کە بۆ سیفەرەك دامانڕشتبوو پێك نەهات، بێگومان ئەو ئامانجەش بەدینەهات و درەنگ کەوت. ئەگەر ئێمە لە (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)دا لە "بۆتان" لە "ئەروە، شەمدینان و چەتاخ" شەڕی چەکداریمان راگەیاند، ئەوا بێگومان درەنگ راگەیاندرا... لە ئەروە و شەمدینان چالاکی ئەنجامدرا، ئەوەی چەتاخ باش ئەنجام نەدرا. ئێمە ئامانجمان ئەوە بوو زۆر زووتر گەریلا بخەینە هەرێمی بۆتان و لەوێ شەڕی گەریلایی رابگەیەنین. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لە سیفەرەك ئەنجامی پێویستمان بەدەست نەهێنا و ئەو پێشکەوتنەی دەمانخواست و پیلانمان کردبوو بەدینەهات، چوونی ئێمە بۆ هەرێمی بۆتان و هەنگاو هاوێشتنی گەریلا و جێگیرکردنی گەریلا لە بۆتانیش درەنگ کەوت. هەربۆیە قەڵەمبازی (١٥)ی ئابیش درەنگ کەوت.

## پێش ئەوەی یەکەمین کۆنگرەی پارتیبوون و دامەزراندنی (PKK) رێکبخەن، تا ئەو کاتە؛ ئەدەبیاتی ئەو تەڤگەرە "رۆژنامە و گۆڤار و نامیلکە و نووسراو..." چی هەبوو؟

تا کۆنگرەی یەکەمینی دامەزراندنی (PKK)، ئێمە زێدە بە شتی نووسراو کارمان نەدەکرد. زیاتر بەزارەکی (بەدەم) کارمان دەکرد. واتا هەر هەڤاڵێك وەکو رۆژنامەیەك وابوو، وەکو رادیۆیەك یان تەلەفزیونێك بوو. ئێمە بەو تەرزە کارمان دەکرد. ئەوە تەرزێکی نوێ بوو، تەرزێکی ئاسان نەبوو و زۆر کار دەخوازێت، خەرجکردنی وزەیەکی زۆر دەخوازێت، مرۆڤ زۆر ماندووش دەکات. بەمشێوەیە ئافراندنی یەکێتی کادیر و تەڤگەریش زۆر زەحمەتە، دروستکردنی یەکێتی گەل و تەڤگەریش زەحمەتە، زۆریش زەحمەتە. بەلام چەندە زەحمەتیش بێت ئەوەمان ئافراند. تا ئەو کاتە رۆژنامە یان گۆڤارێکمان نەبوو، رادیۆ و تەلەفزیۆن و شتێکی بەمجۆرەشمان نەبوو، سەرەرای ئەمەش کادیری ئێمە لەهەموو جێگەیەك وەك یەك دەئاخفین. تەنانەت هەموو کەس دەیگووت:" رۆژنامەیەکیان نییە، هیچ شتێکیان نییە، کەچی هەموویشیان وەك یەك دەئاخفن، قسەکانیان وەك یەکە. ئەمە چۆن دەئافرێنن؟ چۆن بەمجۆرە یەکێتی نێوانیان دروست بووە؟ ئوسلوبیان یەکە و ئاخفتنیشیان وەك یەکە، تەنانەت تەڤگەرەکانی دیکە کە رۆژنامەیان هەبوو نەیاندەتوانی ئەم یەکێتییە دروستبکەن". هەرکەس سەری سورمابوو.

هەروەها لەو قۆناخەدا سەرۆك بە"کاسێت" کاری دەکرد. لە کاسێتدا دەئاخفی و نوسخە (کۆپی)ی ئەو کاسێتانەمان دەنارده بەرێوەبەرایەتی هەموو ناوچەیەك، هەڤاڵان گوێیان لەو کاسێتانە دەگرت و بەگوێرەی ئەمە پروپاگەندەیان دەکرد، ئیدی یەکێتی تەڤگەریش بەمە ئافرێنرا. هەروەها سەرۆك جڤینی بەهەموو کادیران دەکرد. بەمە یەکێتی کادیر و تەڤگەر ئاوا بوو. لەبەر ئەوەی سەرۆك جڤینی بەهەموو کادیران دەکرد و بە کاسێت دەئاخفی و ئەو کاسێتانەش دەگەیشتە دەست هەڤاڵان، گوێیان لێدەگرت و خۆیان لەسەر پەروەردە دەکرد، بەمجۆرە یەکێتی نێوان کادیران دروست بوو. بۆیە

کادیران وەك یەك دەئاخفین، ئیدی ئێمە باوەڕییەکی بەهێزمان بە گەل دەبەخشی، بینیان کە لەهەر شوێنێك هەڤاڵێکی ئێمە هەبێت وەك یەك دەئاخفین، لە ئاخافتنی هەڤالاندا ناکۆکی نابینرێت، ئەمە کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر گەل دروستکرد، بەمە باوەڕی گەل بە تەڤگەر دروست بوو، کە لە تەڤگەرەکانی دیکەیان دەڕوانی؛ هەر کادیرێکیان قسەیەکیان دەکرد، بۆیە زێدە باوەڕیان پێیان نەدەکرد.

ئێمە ئەم تەرزەمان بەهوشیارییەوە پێشخست، تەرزێکی نوێ بوو، دەوڵەتیش فێری تەرزێکی بەمشێوەیە نەببوو، ئەزموونی دەوڵەت جیاواز بوو، لەبەرامبەر تەڤگەرەکانی دیکە و تەرز و شێوازەکانی دیکە ئەزموونی خۆی هەبوو. هەڵبەتە لەبەر ئەوەش بوو نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی خۆیان لەسەر ئێمە دروست بکەن، نەیاندەتوانی لەئێمەش تێبگەن، نەیاندەتوانی تەدبیریش لەبەرامبەر ئێمە وەربگرن. ئەمە هۆکارێك بوو بۆ گرتنەبەری ئەم تەرزە لەلایەن تەڤگەرەکەمانەوە. هەروەها ئێمە نەماندەخواست یەکسەر و زوو بەلگەیەك بدەینە دەست دەوڵەتەوە، بۆیە ئەو تەرزەمان بەڕێوە برد، لەم تەرزەیشدا زۆر سوودمەند بووین و ئەنجامگیریش بووین.

پاشان ئیدی سەرۆك ئاخفی و هەڤاڵ "محەممەد خەیری دوورموش"یش پاکنووسی کرد و کردمانە نامیلکە، ناوی یەکەم نامیلکەشمان "مێژووی کۆلۆنیالیزم"بوو. ئەم نامیلکەیە یەکەمین نووسراوی ئەم تەڤگەرەیە، هەموو نووسراوەکانی ئەم تەڤگەرە سەرچاوەکەی خۆی لەم نامیلکەیەوە وەردەگرت. ئەمە بووە بناخەی هەموو ئەدەبیاتی ئەم تەڤگەرە. ئەم نامیلکەیەمان لە ساڵی (١٩٧٦)دا لەهەموو کوردستان و بەسەر هەموو کادیران بلاوکردەوە. دوای ئەمە نووسراوی دووەمینی تەڤگەر "ڕێگای شۆڕشی کوردستان" بوو. ئەمە دووەمین نووسراوی تەڤگەرەکەمان بوو، کە ئێمە پێی دەڵێین: "مانیفێستۆ" یان " مانیفێستۆی یەکەم". ئەمە خودی سەرۆك نووسی. واتا لەسەر کاسێتیش تۆماری نەکرد، بەلام "مێژووی کۆلۆنیالیزم" لەسەر کاسێت تۆماری کرد و ئاخفی و هەڤاڵ "محەممەد خەیری دوورموش" پاکنووسی کرد. هەرچی "ڕێگای شۆڕشی کوردستان ـ مانیفێستۆ"بوو سەرۆك بەدەستی خۆی نووسی، پاشان دیسان هەڤالان پاکنووسیان کردەوە، بەمجۆرە بووە پەرتووك و بلاومانکردەوە.

بێگومان دەرخستنی پەرتووك یان نامیلكە زۆر زەحمەت بوو، تەنانەت دەرخستنی بەیاننامەیەكیش زۆر زەحمەت بوو، وەكو ئەمڕۆ تەكنیك پێشنكەوتبوو. ئامێرێك هەبوو پێیان دەگووت تەكسیر(ڕۆنیۆ) بەدەست دەسووڕێندرا و نوسخەی زێدە دەكرد. ئێمە بەو ئامێرە بەیاننامە و پەرتووك و نامیلكەمان چاپ دەكرد، ئەو ئامێرەشمان لە خوێندنگایەكی توركیا دزی، بەشەو چووینە خوێندنگایەكەوە و دەرمانخست و لەشوێنێكی شاراوەدا شاردمانەوە. ئیدی هەموو بەیاننامە و پەرتووك و نامیلكەیەكمان بەو ئامێرە دەرخست.

بێگومان پرۆگرامی پارتی پێش كۆنگرەی یەكەمین سەرۆك نووسی. ئەو پرۆگرامەمان پێش كۆنگرە بڵاوكردەوە و گفتوگۆی لەسەر كرا و پاشان كۆنگرە سازدرا. دوای كۆنگرە بەیاننامەی دامەزراندن"جاڕنامەی دامەزراندنی PKK " سەرۆك نووسیبووی و لەگەڵ ڕاگەیاندنی پارتیدا ئەو جاڕنامەیە بڵاوكرایەوە.

سەبارەت بەو شەڕ و خەبات و پراكتیكەی لە ئورفە و حیلوان و ناوچەكانی سەر بە حیلوان و دەوروبەری بەڕێوەمان بردبوو هەڤاڵ "محەممەد خەیری دوورموش" نامیلكەیەكی بچووكی نووسی، بەناوی "با ڕاستەڕێ دابنێین"، بەر لەوەی پارتی دابمەزرێت ئەوانە هەمووی ئەدەبیاتی ئێمە بوون. ئەدەبیاتی ئێمە كەم بوو، زێدە دەوڵەمەند نەبوو.

# بەرەو یەکەمین کۆنگره...

## کەی بەتەواوی بیر لەوە کرایەوە کە کۆنگرەیەکی تەڤگەرەکە ساز بدرێت و ببێتەپارتییەك؟

بێگومان لەدوای شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" سەرۆك یەکسەر هاتە عەنتاب، ئەو کاتە پاییز بوو، وا مەزەندە دەکەم مانگی دە بوو. ئێمە لەگەڕەکی "خۆش گوردوو" خانوویێکمان بەنهێنی بەکرێ گرتبوو، لەوماڵەدا رەشنووسی پرۆگرامی نووسی. تا هەمووی نووسی و تەواویکرد لەو ماڵە دەرنەچوو، پاشان ئەو رەشنووسەی دایە من، گووتی:" ئەمە بگەیەنە هەموو ناوچەکان، با کادیران بیخوێننەوە و گفتوگۆی لەسەر بکەن، تێڕوانین و رەخنە و پێشنیازی خۆیان بنووسن و کۆی بکەنەوە و بۆمنی بێنن، منیش لەبەر چاویان دەگرم و فۆرمیلەی کۆتایی دەدەمێ". بۆیە ئێمە لەهەموو ناوچەکاندا لەناو هەڤاڵاندا بڵاومان کردەوە، بێگومان لەهەموو ناوچەکان هەڤاڵان خوێندیانەوە و گفتوگۆیان لەسەر کرد. هەندێك لەهەڤاڵان دەیانبینی بەرەو پارتیبوونێك دەچین و هەنگاوی بۆ دەنرێت و ئامادەکاری بۆ دەکرێت. چونکە ئەو پرۆگرامەی لەبەر دەستیان دابوو پرۆگرامێك نەبوو بۆ رێکخراوێکی لاوان یان شتێکی تر بێت. لەبەر ئەوەی ئێمە تەڤگەرێکی لاوانیشمان پێشخستبوو. سەرۆك پرۆگرامێکی بۆ لاوانیش نووسیبوو. واتا هەڤاڵان دەیانزانی کە ئەم پرۆگرامە جودایە، پرۆگرامێکی پارتییە، لەوانەیە هەموو هەڤاڵان بەتەواوی لێی تێنەدەگەیشتن، بەڵام هەندێك لەهەڤاڵان لەمە تێدەگەیشتن کە ئامادەکارییەك هەیە و هەنگاوێك هاوێشتراوە. بێگومان ناوی پارتی لە پرۆگرامەکەدا نەبوو، پرۆگرامەکە رەشنووس بوو، بەڵام کە مرۆڤ دەیخوێندەوە دەیبینی کە ئەمە پرۆگرامی پارتییەکە و ناوەرۆکەکەی بۆ پرۆگرامی پارتییەکە. بۆیە لێی تێدەگەیشتن.

بێگومان بەنووسینی ئەم ڕەشنووسە ئەو هەنگاوەمان هاوێشتبوو. هەڵبەتە شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بووە هۆی ئەوەی کە تەڤگەر هەنگاوێك بهاوێژێت. لەراستیدا بۆخۆی تەڤگەرێکی سیاسییە و گروپێکی سیاسی دروستبووە، ئەگەر دوای ئەمە هەنگاو بهاوێژێت ئەوا هەنگاوی پارتیبوون دەهاوێژێت. سەرۆك بۆ بیرەوەری ئەم هەڤاڵە، ئەم هەنگاوەی بەتەڤگەر هاوێشت. ئەگەر (PKK) دامەزرا لەسەر شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" دامەزرا. ئەم شەهیدبوونەی کردە بناخەی پارتیبوون، بۆ ئەوەی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بە نەمری بمێنێتەوە. ئەوە بۆ ئەم مەبەستە بوو. ئەمە نزیکبوونی سەرۆك بوو بۆ شەهیدبوون. بێگومان ئەمە بووە پرەنسیب و تایبەتمەندییەکی ئەم تەڤگەرە. پێویستە هەر شەهیدبوونێك بکەینە هۆی پێشخستنی تەڤگەر و هەنگاوێك بەتەڤگەر بهاوێژین. ئیدی بناخەی ئەم چەمکە بەشەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" هاوێشترا. لەسەر بنەمای ئەم چەمکەش (PKK) دامەزرا. سەرۆك بەمشێوەیە پەیوەستبوون بەبیرەوەری شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار"ی پێکهێنا. ئەم بیرەوەرییە بیرەوەری هەڤاڵێتییە، ڕێزگرتنە، چونکە هەڤاڵ "حەقی قەرار" هەر لەسەرەتاوە بێدوودڵی لەگەڵ سەرۆك شوێنگیر ببوو، هەڤاڵێتییەکی بەهێز و تۆکمە و پەیوەستییەکی تۆکمەی هەبوو، پێویستبوو بۆ ڕێز و بیرەوەری ئەم هەڤاڵە سەرۆك ئەمەی پێکهێنا بایە، ئەویش بەم هەنگاوە پێکهات، ئیدی ئەمە تایبەتمەندی و نزیکبوونەوەی سەرۆك ئاپۆیە بۆ شەهیدبوون. ئەم تایبەتمەندی و نزیکبوونەوەیە پاشان بووە تایبەتمەندی و نزیکبوونەوەی (PKK)یش، هەر شەهیدبوونێك لە (PKK)دا بۆتە هۆیەك بۆ هەنگاو هاوێشتن و لەهەر ڕوویێکەوە تەڤگەر بەهێز و تۆکمە ببێت. ئەگەر ئەم تەڤگەرە چەندە زەبریشی خواردبێت هیچ پەرشوبڵاو نەبووە، ئەمە هۆیەکە. چونکە هەر شەهیدبوونێك و زەبرێك هۆکار بووە بۆ ئەوەی تەڤگەر لەهەموو ڕوویێکەوە مەزن ببێت. ئەمە نەیهێشت دووژمن ئەنجامگیر ببێت، ئەمە هێزێکی مەزنی بۆ تەڤگەر ئافراند. هەر شەهیدبوونێك بۆتە هێزێکی مەزن بۆ ئەم تەڤگەرە. لەسەر ئەو بنەمایە تەڤگەری بەهێز و تۆکمە کردووە و پێشیخستووە. بۆیە دووژمن نەیتوانیوە ئەنجام بەدەستبخات.

سەرۆك ئاپۆ هەم لە مێژووی کورددا هەمیش لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چەمکێکی نوێ و نزیکبوونەوەیەکی نوێی بۆ شەهید و شەهیدبوون پێشخست. مرۆڤ چۆن لەشەهید نزیك ببێتەوە؟ پەیوەستبوون بەشەهیدەوە پێویستە چۆن بێت؟ ئیدی ئەو چەمکەی پێشخست. ئەمەش چەمکێکی نوێ بوو. ئەم چەمکە، نەك هەر تەنیا بە (PKK)، بەڵکو بە کوردانیشی بەقازانجکردنی مەزن دا.

## ئەو ئامادەکارییانەی بۆ سازدانی کۆنگرە کرا چۆن و بە چ شێوەیەك ئەنجامدرا ؟

دوای ئەوەی پرۆگرامەکە بڵاوکرایەوە؛ بۆ ئەوەی ئێمە بەفەرمی بگەینە ئاستی پارتی (پارتیبوون)، لەهەموو شوێنێکدا گفتوگۆی لەسەر کرا، لەدەرەوەی ئەمەشدا سەرۆك ئاپۆ خۆیشی هەندێك جڤینی لە ناوچەکان کرد، بۆ ئەوەی تێگەیشتنی باش لە پرۆگرام هەبێت، بۆ ئەوەی تێگەیشتنی باش لەسەر ئەو هەنگاوە هەبێت کە دەهاوێشترێت. شانبەشانی ئەمەش هەندێك جڤینیشی بۆ ئەو کادیرانەی سەرەتا تەڤلی ببوون دەکرا، لەو جڤینانەدا لەسەر مەسەلەی رێکخستن زۆر گفتوگۆ کرا.

جڤین (کۆبوونەوە)ێکی شاری ئەلازغ (ئەلعەزیز)مان هەیە، ئەم جڤینە لە مێژووی تەڤگەرەکەماندا جڤینێکی گرنگە. دوای ئەوەی سەرۆك پرۆگرامەکەی نووسی و ئێمە بڵاومانکردەوە و لەهەر شوێنێك گفتوگۆی لەسەر کرا، ئیدی دوای ئەمە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە چییە؟ بۆ مەسەلەی رێکخستن چ بیر دەکاتەوە؟ لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو مەسەلانەمان هەڵسەنگاند و لەسەری راوەستاین. بۆ ئەو هەنگاوەی دەیهاوێژین تا چەند تێگەیشتن هەیە؟ بەراستی ئەو هەنگاوە دەهاوێژین یان نا؟ چۆن لەم هەنگاوە نزیك دەبینەوە؟ ئیدی ئەمانە هەمووی گفتوگۆی لەسەر کرا، ئەو کۆبوونەوەیەمان لەماڵی "ئایتەکین توغلوك" سازدا، هێشتا کۆبوونەوە لەنیوەیدا بوو، هەندێك زانیاریمان وەرگرت کە لەوانەیە پۆلیس پێی زانیبێت و هێرش بکاتە سەر کۆبوونەوەکە. ئێمە

یەکسەر شوێنی کۆبوونەوەکەمان گۆڕی و چووینە دەرەوەی شار، لەوێ کۆبوونەوەکەمان تەواو کرد.

بێگومان ئەو کۆبوونەوەیە گرنگ بوو. بۆ نموونە؛ لەم جڤینەدا "عەلی چەتینەر" و "شاهین دوەمز" و ئەوانە کە هەموویان سێ چوار کەس بوون گووتیان:" هێشتا زووە ئێمە هەنگاوی پارتیبوون بهاوێژین، پێویستە ئێمە بەرێگەی رێکخستنی گەنجان کار بکەین تا ماوەیەك، پاشان هەنگاوی پارتیبوون بهاوێژین". ئەمەیان بەراست نەدەزانی و سووریش بوون لەسەر رای خۆیان. بێگومان سەرۆك و هەڤالان "محەممەد خەیری و مەزلوم دۆغان" و هەڤالانی دیکەش دەیانگووت:" پێویستە ئێمە پارتیبوون پێشبخەین. ئیدی تەڤگەر گەیشتۆتە ئەو قۆناخە، ئەگەر ئەم هەنگاوە نەهاوێژین تەڤگەر پێشناکەوێت، ئیدی دەوڵەتیش هێرشمان بۆ دێنێت. شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" و پاشان هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆك کە لە ئەنقەرە ئەنجامیاندا، لەهەموو روویێکەوە هێرش بۆ سەر تەڤگەر بەهێز دەبێت، ئیدی هەنگاوێك کە پێویستە بهاوێژرێت هەنگاوی پارتیبوونە. بۆیە پێویستە ئەم هەنگاوە بهاوێژین و رێکخستەبوونی خۆمان پێشبخەین، تاکو بتوانین لەدژی ئەو هێرشانە رابوەستین..." هەندێك هەڤاڵیش هەرچەندە بەقووڵی و بەتەواوی لەمەسەلەی پارتیبوون تێنەدەگەیشتن، بەڵام لەگەڵ چەمکی سەرۆك بوون و لەدژی ئەوان بوون.

بۆیە لەم کۆبوونەوەیەدا زیاتر ئەو ئەنجامە دەرکەوت کە پێویستە هەنگاوی پارتیبوون بهاوێژین. ئەمە گرنگ بوو، بەگشتیش نزیکبوون و مەیلی کادیرانیش لەناوچەکاندا هەمان شێوە بوو، کە لەئەنجامی ئەو گفتوگۆیانەی لەسەر رەشنووسی پرۆگرامەکەدا کرابوو. ئیدی لەسەر بنەمای ئەو کۆبوونەوەیە لەناو کادیراندا گفتوگۆ سەبارەت بە پرۆگرام، تێگەیشتن لەچەمکی پارتی، رێکخستەبوونی پارتی، زیاتر ئەنجامدرا. واتا ئەم کۆبوونەوەیە رۆڵێکی بەمجۆرەی بینی.

سەرۆك بەخۆیشی دوای ئەم کۆبوونەوەیە لەهەندێك ناوچەدا کۆبوونەوەی ئەنجام دا، بۆ ئەوەی کادیر شۆڕشگێڕێتی ئەماتۆریانەی سەردەمی گروپ دەرباز ببێت، بۆ ئەوەی ئەگەر سبەینێ هەنگاوێکمان بەرەو پارتیبوون هاوێشت ئەو هەنگاوە زەبری بەرنەکەوێت، چونکە ئەو شۆڕشگێڕێتییەی لەئارادا هەبوو شۆڕشگێڕێتییەکی پارتیبوون

نییە، بەڵکو هی قۆناخی گروپە و بەدڵە. واتا نەك ئەو شۆڕشگێڕێتییەی بەرێسا و پەیڕەو و پرۆگرام ئاوا بووبێت، بەڵکو شۆڕشگێڕێتییەکی بەدڵە، هەر کەسێك لەکوێ کاردەکات ئەوا دەیکات، زێدە ناچاربوونێك نییە، شۆڕشگێڕێتییەکی پرۆفشیۆناڵی زێدە نییە. هەرچەندە هەندێك لە هەڤاڵان بە پرۆفیشناڵی خەبات دەکەن، بەڵام هەموو کەسێك بە پرۆفیشناڵی کار ناکات، واتا شۆڕشگێڕێتییەکی قۆناخی گروپ هەیە، ئەماتۆرە، پڕ پۆلەتیك (سیاسی) نییە، زۆر ئایدیۆلۆژیك نییە، زۆر پرۆفیشناڵ و رەسمی نییە، بەگوێرەی پەیڕەو و پرۆگرام بەرێوە ناچێت. بێگومان شۆڕشگێڕێتی پارتیبوون لەهەموو رووێکەوە جودایە، پێویستە خۆی لەو تەنگبوون و ئاماتۆریە دەربخات و خۆی زیاتر رەسمی و پرۆفیشناڵ بکات، ئیدی نەك بەگوێرەی دڵی خۆی، بەڵکو بەگوێرەی ئامانج و رێباز و تاکتیك و ژیانی تەڤگەر بژیت و کاربکات، بۆیە زۆر جیاوازە. سەرۆك دەیخواست کادیر لە شۆڕشگێڕێتی ئاماتۆری رزگار بکات و بەرەو شۆڕشگێڕێتی پرۆفیشناڵی ببات، لەم رووەوە دەیخواست هەنگاو بە کادیر بهاوێژێت، کادیر زیاتر قووڵ بکاتەوە و چڕوپڕی بکات، بۆ ئەوەی مەسەلەی پارتی و رێکخستەکردنی پارتی و ئەرك و بەرپرسیارێتی پارتی باش تێبگات، کە ئەگەر سبەی پارتیمان دامەزراند لەتەڤگەردا تەنگەتاوی نەبێت، بۆ ئەم مەبەستە ئەو کۆبوونەوانەی ساز دەدا، چونکە ئەزموونێکی پارتیبوونمان نەبوو. هیچ کادیرێکی ئێمە تێیدا نەژیابوو، بۆیە مەسەلەی پارتیبوونیشمان نەدەزانی، رێکخستەبوونی پارتی چییە و چ لە مرۆڤ دەخوازێت، رەسمییەت و رێساکانی پارتیبوون چیین؟ وەکوتریش ئەگەر پارتی دامەزرا دووژمن زۆر جیاوازتر هێرشی دەکاتە سەر، پێویستە ئەمانە هەموو تێبگەیەنرێت و بزانرێت. لەبەر ئەوەی ئەزموونێکی بەمجۆرە نەبوو، سەرۆك دەیخواست ئەوە لە کادیر تێبگەیەنێت، تاکو کادیر ئەو هەنگاوە بهاوێژێت و لەسەر ئەم بنەمایەش پارتیبوون ئاوا بکات و بە تۆکمەیی ئاوای بکات.

پاشان لەناو شاری ئامەددا، لەگەڕەکی ئۆفیس کۆبوونەوەیەکی فراوانترمان سازدا، چونکە دوای کۆبوونەوەکەی ئەلعەزیز لەسەر بنەمای ئەو کۆبوونەوەیە کار و خەباتمان کرد، لەسەر ئەو بنەمایەش ئەو کۆبوونەوەیەمان لە ئامەد سازدا. کۆبوونەوەکەی ئەلعەزیز بەرتەسك بوو، مەسەلەی رێکخستنیمان بە گروپێکی بەرتەسك گفتوگۆ کرد، واتا زیاتر

کادیرە لەپێشەکان بوون. بەڵام کۆبوونەوەکەی **ئامەد** کە لە گەڕەکی **ئۆفیس** سازدرا کادیران زیاتر تەڤلی بوون، بۆ نموونە؛ لەهەر ناوچەیەك سێ یان چوار یان پێنج کادیرمان تەڤلی کۆبوونەوەکە کرد. ئیدی دەمانەوێت بڕیار لەسەر سازدانی کۆنگرەیەك (کۆنگرەی یەکەمین) بدەین. لەو کۆبوونەوەیە هەندێك کەس هەبوون لەدژی ئێمە دەرکەوتن، واتا نەیاندەخواست تەڤگەر بڕیارێکی بەمجۆرە بدات و بکەوێتە ئامادەکاری بۆ سازدانی کۆنگرەیەك، هەندێك کادیر کە لە **ماردین**ەوە هاتبوون، هەبوون، لەناو پارتییە کوردییەکانەوە هاتبوون، ئەوانە نەیاندەخواست بڕیارێکی وەها بگرین، لەناو ئێمەشدا **"عەلی چەتینەر"** و **"شاهین دونمەز"** و ئەوانەش نەیاندەخواست، بەڵام گروپێگی بەژمارە زۆر نەبوون، ژمارەی هەرە زۆر بڕیاری وەرگرت کە ئێمە کۆنگرە ساز بدەین.



**شەهید سەیفەددین زووغورلوو**

## کێ زیاتر بەو ئامادەکارییانەوە خەریك بوو؟

لەو کۆبوونەوەیەی ئامەد بڕیاری ئەوەمان وەرگرت و ئەرکمان بە سەرۆك سپارد کە ئەو دەستنیشانی بکات؛ کێ تەفلی کۆنگرە ببێت؟ چۆن بێینە شوێنی کۆنگرە و لەکوێ کۆنگرە سازبدرێت؟ هەموو ئەو ئەرکانەمان بە سەرۆك سپارد. سەرۆك لەگەڵ کامە هەڤاڵ ئەو ئامادەکارییانە بکات، خۆی ئەو هەڤاڵانەی دەستەی ئامادەکاری دەستنیشان بکات، بۆچی ئەو ئەرکەمان تەنیا بە سەرۆك سپارد؟ بۆ ئەوەی دووژمن بەمە نەزانێت، نهێنیبوونی ئەم کارە بپارێزرێت، چونکە ئەگەر ئەم ئەرکە بەزۆر هەڤاڵ بسپێردرێت لەوانەیە دووژمن هەستی پێبکات و ئەمەش مەترسی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت و لەوانەیە لەناوبردنیش رووبدات. پێویستبوو کۆنگرە بەسەلامەتی ساز بدرێت. بۆیە ئێمە زۆر وریا و بەدیقەت بووین، لەبەر ئەوە لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو ئەرکەمان بە سەرۆك سپارد و گووتمان:" تۆ کامە هەڤاڵ گونجاو دەبینیت دەتوانیت لەگەڵ ئەو هەڤاڵانە ئامادەکاری پێك بهێنیت". ئیدی لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو بڕیارەمان بەبنچینە وەرگرت، واتا بڕیاری ئەوەی کە ئێمە بچینە کۆنگرە، ئامادەکاری کۆنگرەش سەرۆك بەرێوەی ببات، کات و شوێن و چوون و هاتن هەمووی سەرۆك دەستنیشانی بکات.

سەرۆکیش لەگەڵ هەڤاڵان "مەزلوم دۆغان و سەیفەددین زووغورلو" کە ئەو کاتە لە ئامەد بوون، هەموو ئەو ئامادەکارییانەی ئەنجام دا. هەڤاڵانی دیکە کەسیان لەو ئامادەکارییەدا شوێنگیر نەبوون. هەموو هەڤاڵانی دیکە چوون لە ناوچەکاندا بە کار و خەباتەوە خەریك بوون. واتا کۆنگرە کەی و چۆن و لەکوێ سازدەدرێت، کەس نەیدەزانی. سەرۆك بڕیاری دابوو لەگوندی فیس لەماڵی هەڤاڵ "سەیفەددین زووغورلو " کۆنگرە سازبدرێت، ئەوەشیان دەستنیشان کردبوو کە کەی هەڤاڵان بێن و چۆن بێن...؟ هەواڵی بۆ هەر ناوچەیەك دەنارد کە فلان و فلان هەڤاڵ بێنە فلانە جێگە، هەڤاڵانیش کە دەهاتنە شوێنی دیاریکراو، هەڤاڵ "مەزلوم دۆغان" و "سەیفەددین زووغورلو " ئەوانیان دەگواستەوە شوێنی کۆنگرە. واتا ناو و نیشانی شوێنی کۆنگرەیان

بە کەس نەگووتبوو. چونکە لەوانەبوو لەهاتندا گرتن روویدابایە، ئەگەر بزانن ئەوا شوێنی کۆنگرە ئاشکرا دەبێت، بۆیە هیچ کەسێك شوێنی کۆنگرەی نەدەزانی. بۆ نموونە؛ هەڤالان کە دەهاتنە **ئامەد** نەیاندەزانی کۆنگرە لە **ئامەدە** یان لەشوێنێکی دیکەیە، کەس نەیدەزانی لەکوێیە؟ تەدبیرێکی بەمجۆرە وەرگیرابوو. هەموو هەڤالان بەمشێوەیە کۆبوونەوە و بۆ شوێنی کۆنگرە نێردران. لە کۆتاییدا سەرۆك و من و وابزانم **فاتمە (کەسیرە)** یان هەڤاڵ "**ساکینە جانسز**" بوو، مابووین، هەڤاڵ "**سەیفەددین زووغورلو**" بە ترومبێلێك ئێمەی بردە شوێنی کۆنگرە.

ئیدی کۆنگرەی یەکەم لەسەر ئەو بنەمایە و ئەو ئامادەکارییانە پێشکەوت...

## کەش و هەوا (ئاتمۆسفێر) ی یەکەمین کۆنگرە چۆن بوو؟ بەشداربووانی کۆنگرە لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە بە چ شێوەیەك بوو؟



ئەو خانووەی کەوا لەگوندی "فیس"دا یەکەمین کۆنگرەی (PKK) تێدا سازدرا

كە كۆنگرە دەستپێكرد، بەتەواوی بەیادم نایەتەوە (٢٢) یان (٢٣) هەڤاڵ بووین، لەدەرەوەی ئەو هەڤاڵانە دەبووایە هەڤاڵ "**كەمال پیر**" و "**محەممەد قەرەسوونگور**"یش تەڤلی كۆنگرە ببوونایە، هەڤاڵ "**كەمال پیر**" لەبەر ئەوەی لە زینداندا بوو، بۆیە تەڤلی كۆنگرە نەبوو، هەڤاڵ "**محەممەد قەرەسوونگور**"یش خەریكی خەباتی سیڤەرەك بوو، ئەمەش بۆ ئێمە گرنگە. واتا كاتێك هەنگاوی پارتیبوون و ئەو ئامادەكارییانەی لەم رووەوە دەمانكرد، شانبەشانی ئەمەش خەبات و شەڕی **سیڤەرەك**مان پێشدەخست. چونكە ئێمە دامەزراندنی پارتیمان بەچالاكی لەسەر "**محەممەد جەلال بوجاق**" رادەگەیاند. بۆیە دەبووایە ئامادەكارییەكان تەواو ببایە، بەمەش هەڤاڵ "**محەممەد قەرەسوونگور**" تەڤلی كۆنگرە نەبوو. ئەو ئامادەكارییەكانی بەڕێوە دەبرد. لەدەرەوەی ئەم دوو هەڤاڵە هەموو ئەو هەڤاڵانەی دەستنیشان كرابوون تەڤلی بوون، ژمارەی هەڤاڵانیش (٢٢) تا (٢٣) كەس دەبوون، ژمارەی هەڤاڵانی كچ كەم بوو، وابزانم دوو یان سێ كەس بوون.

بێگومان كۆنگرە دوو رۆژ بەردەوام بوو، لەماڵی هەڤاڵ "**سەیفەددین زووغورلو**" ئەنجامدرا و تەواو بوو. دایك و باوكی هەڤاڵ "**سەیفەددین زووغورلو**"یش نەیاندەزانی كە ئێمە كۆنگرە لەماڵی ئەوان سازدەدەین، هەڤاڵ "**سەیفەددین زووغورلو**" بە دایك و باوكی خۆی گووتبوو: "ئەوانە هەڤاڵی منن لە خوێندنگا، من دەعوەتم كردوون دوو - سێ رۆژ لێرە دەمێننەوە، بۆخومان خواردن دەخۆین و قسە دەكەین و پاشانیش هەر كەس دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی". بەمشێوەیە بە خانەوادەكەی گووتبوو، تەنانەت پاش كۆنگرەش دوای كاتێكی دوور و درێژ خانەوادەكەی نەیزانیبوو ئەوە كۆنگرە بوو و كۆنگرەی دامەزراندنی (PKK) لەوێ سازدراوە، پاشان بەماوەیەكی زۆر ئینجا تێگەیشتن، دوای ئەوەی كە هەر كەس زانی ئەوانیش پێیان زانی. بەراستی زۆر بەنهێنی ئامادەكارییەكان ئەنجامدرا بوون، بۆیە بەبێ مەترسی و بەسەركەوتوویی تەواو بوو.

## رۆژەڤی كۆنگرە چی بوو؟

ڕۆژمێی کۆنگرە لەلایەن سەرۆکەوە ئامادەکرابوو، پێشنیازی کرد و پەسند کرا. کۆنگرەش کۆنگرەی یەکەمین بوو و بۆ دامەزراندنی (PKK) بوو، بۆیە زێدە فرە ڕۆژمێ نەبوو، پێویستبوو پرۆگرام بخوێندرێتەوە و پەسند بکرێت، هەروەها بەڕێوەبەرایەتییەك بۆ پارتی هەڵبژێردرێت. لەلایەکی دیکەوە دامەزراندنی پارتی چۆن ڕابگەیەنرێت، دوای ڕاگەیاندنی پارتی چ ڕوودەدات، ڕەوشی سیاسی چییە؟ زیاتر لەسەر ئەو مەسەلانە گفتوگۆ کرا، هەروەها گفتوگۆ لەسەر ڕەوشی کادیر و مەسەلەی ڕێکخستن کرا. ئەمانە ڕۆژمێی سەرەکی کۆنگرە بوون. لە کۆنگرەدا بە قورسایی سەرۆك ئاپۆ قسە و هەڵسەنگاندنی کرد، هەڤالانیش هەڵسەنگاندنیان دەکرد، بەڵام کەم بوو و زیاتر گوێیان دەگرت.

چونکە هەندێك لەئێمە هیچ کۆنگرەیەکیشی نەدیبوو، بەتەواوی نەشماندەزانی کۆنگرەش چییە؟ لەوانەیە هەندێکیان پەرتووکیان خوێندبێتەوە کە باسی لە کۆنگرەی حزبەکان کردبێت، کە چ لە کۆنگرەدا گفتوگۆ دەکرێت و چۆن گفتوگۆ دەکرێت و...هتد. بێگومان هەموو شتێکیش لە پەرتووکەکان نانووسرێت، واتا هەندێك لە هەڤالان لەرووی تیۆرییەوە سەبارەت بەوەی کۆنگرەی حزبی چییە زانیارییان هەبوو. ئیدی پارتی چییە و کۆنگرەی پارتی چییە و چ دەخوازێت، زێدە کەس زانیاری و ئەزموونی نەبوو، بۆیە هەمووومان بەجۆش و خرۆش بووین، جۆش و خرۆشێکی مەزن هەبوو، زیاتریش هەڤالان دەیانخواست تێبگەن، بۆیە کەم قسەیان دەکرد و زیاتر گوێیان لەشیکردنەوەکانی سەرۆك دەگرت و دەیانخواست لێی تێبگەن، لە کۆنگرە و پارتی و پارتیبوون تێبگەن، لەخۆیان تێبگەن. بێگومان هەندێك لە هەڤالانیش قسەیان دەکرد، وەك هەڤالان **"محەممەد خەیری دوورموش، مەزلوم دۆغان"** هەندێك هەڤالی دیکەش قسەیان دەکرد و تەفلی گفتوگۆیەکان دەبوون. وەکو گووتم؛ جۆش و خرۆشێکی مەزن لەناخی هەڤالاندا هەبوو. چونکە ئێمە هەم دەبینە پارتی، هەمیش بەشداری کۆنگرە بووین، ئەمەش جۆش و خرۆشێکی هێنابووە ئاراوە.

## ئەو چەمك و مەیلانەی لەنێو كۆنگرەدا دەركەوتن چیبوون؟ چ بڕیار و ڕێنماییەك لە كۆنگرەوە دەرچوو؟

مرۆڤ دەتوانێت بڵێت لە كۆنگرەدا سێ مەیل و چەمك هەبوون، ئەو مەیلەی كەوا سەرۆك نوێنەرایەتی دەكرد كە هەمان مەیل مۆركی خۆی لەسەر كۆنگرە بەجێهێشتبوو، واتا بەوپەڕی هوشیارییەوە لە پارتیبوون و لە كۆنگرەدا دەژیان، بۆیە بەشداربوونی خۆیان بۆ كۆنگرە زۆر بەهێز بوو، لەسەرووی هەموویانەوە سەرۆك. مەیلی دووەمیش ئەو هەڤاڵانە بوون تێڕوانینی سەرۆكیان بەبناخە وەردەگرت و تەڤلیشی دەبوون، بەڵام هەڵسەنگاندن و بەشداربوونیان كەم بوو، زیاتر دەیانخواست تێبگەن، بەڵام بەتەواوەتی تەڤلی ئاخافتنەكانی سەرۆك دەبوون، لەگەڵ هەر بڕیارێكیدا بوون كە سەرۆك دەیخواست لە كۆنگرە بیدات، بەڵام زۆر بەهوشیارییەوە نەبوو، چونكە ئەگەر زۆر بەهوشیارییەوە بووایە ئەوا تەڤلیبوونی خۆیان زیاتر دەكرد، لەبەر ئەوە تەڤلیبوونی ئەوان لاواز بوو، ئەمەش مەیلێك بوو لەنێو كۆنگرەدا.

ژمارەیەكی زۆر بچووكیش خاوەن مەیلێكی دیكە بوون، ئەو مەیلە چ بوو؟ ئەوانە بوون كە لە كۆبوونەوەكانی دیكەشدا لەدژی دامەزراندنی پارتی بوون و نەیاندەخواست تەڤگەر ببێتە پارتی. كەسانی بەمجۆرە زێدە تەڤلیبوونی خۆیان ئەنجام نەدەدا، ئەوانیش هەر دوو ـ سێ كەس دەبوون **"شاهین دونمەز، عەلی چەتینەر"** و یەك دوو كەسی تریش هەبوو، زێدە نەبوون. ئەوانە بە ئەنقەست تەڤلی گفتوگۆكان نەدەبوون. ئیدی كۆنگرە بە سەلامەتی و جۆش و خرۆشەوە تەواو بوو.

كاتێك كە كۆنگرە بەرەو تەواو بوون دەچوو، ئیدی دەست بەهەڵبژاردن كرا تاكو بەڕێوەبەرایەتییەك بۆ پارتی هەڵبژێردرێت. سەرۆك پێش هەڵبژاردنەكە ئاخافتنێكی پێشكەش كرد و تێیدا گووتی:" من ئەو تەڤگەرەم تاكو ئێستا هێناوە، باش و خراپ، هەر هەڤاڵێك ئامادەبێت سەرۆكایەتی تەڤگەر بكات من ئامادەم سەرۆكایەتی ئەم تەڤگەرە تەسلیم بەو بكەم". بێگومان كەس دەرنەكەوت كە ئەم ئەركە لەئەستۆی خۆی بگرێت. جا ئەركێكی هێندە مەزن كێ دەتوانێت لەئەستۆی خۆی بگرێت، تا ئەو كاتە

سەرۆك لەئەستۆی خۆی گرتبوو. واتا لە رووی ئایدیۆلۆژییەوە تا دەگاتە لایەنی ڕێکخستنی کەس لە سەرۆك ئاست بەرزتر و بەهێزتر نەبوو. بۆیە کەس خۆی بۆ ئەم ئەرکە ئامادە نەبینی. سەرۆکیش گووتی:" مادام کەس خاوەنداریێتی لێناکات و لە ئەستۆی مندا دەیهێڵنەوە کەواتە دەبێت منیش دیقەت بکەن و بەبنچینە وەربگرن، واتا ئێمە ئیدی دەکەوینە قۆناخێکی نوێوە، ئیدی ئەو شۆڕشگێڕێتییەی لەمەودوا بیکەین وەکو کە لەرابردوودا دەمانکرد نابێت، ئیتر نابێت هەر کەس بە کەیفی دڵی خۆی کاربکات، بەڵکو دەبێت بەگوێرەی پێداویستی پارتی کاربکەین..."

لەئاخافتنی خۆیدا باسی ئەو قۆناخەی کرد کە لەدوای خۆمان بەجێمانهێشتووە قۆناخێکی چۆن بوو؟ ملیتانێتی ئەو قۆناخەی داهاتوو دەبێت چۆن بێت؟ هەروەها ئاماژەی بەوەش دا کە پێویستە باش لەو مەسەلەیە تێبگەین کە ئەو هەنگاوەی بۆ پارتیبوون هاوێشتوومانە بە چ واتایەك دێت و چۆن ملیتانێتی پارتیبوون جودایە و ئەرکی جیاوازترە، چونکە ئەو قۆناخەی تێیداین زۆر جیاواز و قووڵ و چڕوپڕ ترە. ئیدی پێویستە کەس بە شۆڕشگێڕێتی رابردوو لە پارتیبوون نزیك نەبێتەوە، بۆ ئەوەی هەنگاوی پارتیبوون بەبێ کێشە پێشبکەوێت و زەبرمان بەرنەکەوێت... ئیدی لەسەر ئەو مەسەلانە ئاخافتنی کرد. چونکە سەرۆك دەیبینی کادیری هەرە لەپێش کە لەکۆنگرەشدا ئامادەن هەرچەندە لەسەر پرۆگرام گفتوگۆ کراوە و چەندین کۆبوونەوەمان ئەنجام داوە، هێشتاش لەمیانەی بەشداریکردنی لە گفتوگۆکانی نێو کۆنگرەدا دەیبینی کە بەتەواوی لەپارتیبوون تێگەیشتن بەدینەهاتووە، بۆیە ئەم ئاخافتنانەی کرد. پاشان گووتی:" ئەوەی دەخوازێت بۆ کۆمیتەی ناوەندی خۆی پێشنیاز بکات دەتوانێت خۆی پێشنیاز بکات، کامە هەڤاڵیش گونجاو دەبینن دەتوانن پێشنیازی بکەن". ئێمە ئەوەمان دەستنیشان کرد کە کۆمیتەی ناوەندی ئێمە حەوت کەس بێت، سەرۆك گووتی:" بەگوێرەی ئەمەش پێشنیاز بکەن، هەم دەتوانن خۆتان خۆتان پێشنیاز بکەن و هەمیش دەتوانن هەڤاڵانی دیکەش پێشنیاز بکەن.

## بە سەرۆكەوە حەوت كەس لە كۆمیتەی ناوەندییدا دەبێت یان سەرۆك جودابوو؟

بە سەرۆكەوە حەوت كەس لە كۆمیتەی ناوەندی بن، سەرۆك جودا و كۆمیتەی ناوەندیش جودا نەبوو. سەرۆكیش لەناویدا كۆمیتەی ناوەندی حەوت كەس بن، ئەو كاتەش لە سیستەمی ئێمەدا سەرۆكمان جودا نەكردبووەوە، سەرۆكیش لەو كۆمیتەی ناوەندییەدا ئەندامێكە، بەمشێوەیە بوو.

بێگومان "شاهین دوەمەز" هەستا خۆی پێشنیاز كرد و گووتی:" من ئامادەم و دەخوازم ببمە ئەندامی كۆمیتەی ناوەندی". سەرۆك تارادەیەك "شاهین دوەمەز"ی دەناسی، بۆیە پێیگووت:" بەراستی تۆ ئامادەی ئەم ئەركە پێك بهێنیت؟ ئەركێكی زەحمەتە، چڕوپڕ و زۆر مەترسیدارە، زۆر شت لەمرۆڤ دەخوازێت، تۆ دەتوانیت لەژێر باری ئەم ئەركەدا دەربكەویت؟". "شاهین" گووتی:" من خۆم ئامادە دەبینم" بێگومان سەرۆكیش هیچی نەگووت، بینی كە هەڤالانی تریش لە كۆنگرەدا شتێك نالێن، گووتی:" باشە مادام خۆت گونجاو دەبینیت"، ئیدی ناوی ئەویشی نووسی، هەڤالانی دیكەش هەڤالانی تریان پێشنیاز دەكرد. بۆ نموونە هەندێك لەهەڤالان هەڤاڵ "مەزلوم دۆغان"یان پێشنیاز كرد، سەرۆك گووتی:" تۆ ئامادەی بۆ ئەم ئەركە؟" هەڤاڵ "مەزلوم دۆغان" گووتی:" من خۆم پێشنیاز نەكردووە، هەڤالان منیان پێشنیاز كردووە، مادام هەڤالان پێشنیازیان كردووە ناتوانم رەتیبكەمەوە". چونكە كولتوور و چەمكێكی ئێمە هەبوو كە ئەگەر تەڤگەر یان هەڤالان ئەركێكی بەكەسێك سپارد، پێویستە ئەو ئەركە پێكبێنێت. بێگومان بۆیە هەڤاڵ "مەزلوم"یش ئەو ئاخافتنەی كرد، دیسان نەریت و كولتوورێكی ئێمە هەبوو كە كەسمان خۆی خۆی پێشنیاز نەدەكرد، هەمیشە هەڤالان هەڤالێكیان پێشنیاز دەكرد، هیچ كاتێك كەسێك شەخسی خۆی پێشنیاز نەدەكرد، نەریت و كولتوورێكی بەمجۆرەمان هەبوو. هەڵبەتە ئیدی "شاهین دوەمەز" لەدەرەوەی نەریت و كولتووری ئێمە هەڵسوكەوتی كرد، كاتێك كە خۆی خۆی پێشنیاز كرد سەرنجی سەرۆك و هەمووشمانی راكێشا، بەلام پێویستبوو ئێمە ئەوەمان رەخنە بكردبایە، واتا سەرۆك و

هەموو هەڤالانیش دەیانزانی کە "شاهین دۆنمەز" ناتوانێت ئەم ئەرکە پێکبێنێت، هەر کەس دەیزانی کە لە کەسێتی "شاهین دۆنمەز"دا تایبەتمەندی دەسەڵاتخوازێتی زۆر بەهێزە، کەسێتی ئەو کەسێتییەکی ناجێگیرە و تەفلیهەڤە (تێکەڵ و پێکەڵە)، لە کەسێتی ئەودا سەرەڕۆیی (لومپەنیزم) هەیە و ناکەوێتەوە ناو ڕێکخستن و دیسپلینەوە، جددییەتی نییە، کەسێتییەکە دووژمن وێرانی کردووە، تایبەتمەندی کەمالیزمیشی تێدا بەهێزە...هتد. هەر بۆیە سەرۆك پێی گووت:" بەراستی ئامادەی بۆ ئەم ئەرکە؟" سەرۆك چاوەڕێی ڕای هەڤالان بوو لەم بارەیەوە، هەڤالانیش دەنگی خۆیان نەکرد، بۆیە سەرۆکیش هیچی نەگووت.

بێگومان لێرەدا ئێمە هەڵەیەکی مەزنمان کرد، ئێمە هەمووشمان دەمانزانی کە "شاهین دۆنمەز" شایستەی ئەو ئەرکە نییە، کەچی کەسمان دەنگمان نەکرد. پاشان "شاهین دۆنمەز" بووە بەڵایەکی مەزن بەسەر تەڤگەرەوە، زەبرێکی مەزنی لەتەڤگەر دا. کاتێك کە دەستگیر کرا بەرخۆدانی نەکرد و تەسلیم بوو، هەرچییەکی تەڤگەری دەزانی تەسلیمی دووژمنی کرد. ئەمەش تەخریباتێکی مەزنی بۆ ئێمە دروست کرد. هۆکاری ئەوەی ئەو تەخریباتانەمان بەسەردا هات ئەوا دەتوانم بڵێم لەم خاڵەوە دەستی پێکرد، لەم هەڵەیەوە دەستی پێکرد.

لە ئاکامی هەڵبژاردندا حەوت هەڤاڵ بۆ کۆمیتەی ناوەندی دەستنیشان کران، لەوانە یەکێکیان سەرۆك بوو، "محەمەد قەرەسوونگور، من (جەمیل بایك)، مەزلوم دۆغان، محەمەد خەیری دوورموش، باقی قەرار (برای حەقی قەرار) یەکێکیشیان ئەو "شاهین دۆنمەز"ە بوو. ئیدی ئەو حەوت کەسە بوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (PKK).

پاشان لەناو کۆمیتەی ناوەندیدا دەستەی کارگێڕییشمان هەڵبژارد، هەڤاڵ "محەمەد قەرەسوونگور"یشمان گونجاو بینیبوو کە لەدەستەی کارگێڕیدا بێت، بەڵام ئەو هەڤاڵە ئەمەی پەسند نەکرد و گووتی:" هەڤالانی لەمن باشتر هەن ئەو ئەرکە پێکبێنن، کە هەڤالان منیان شایستە بینیوە شتێکی باشە، بەڵام من خۆم شایستە نابینم، من هەڤاڵی دیکە شایستە دەبینم". ئەو هەڤاڵە خۆی لە کۆنگرەدا ئامادە نەبووبوو، بۆیە کە کۆمیتەی ناوەندی و دەستەی کارگێڕی هەڵبژێردران ئاگای لێنەبوو، تەنانەت خۆیشی پێشنیازی کردبوو کە کێ بکەوێتە شوێنی ئەو، ئێمەش گووتمان:" مادام وایە هەڤاڵێکی ترمان

دەستنیشان کرد، بۆ دەستەی کارگێڕیش سەرۆك و من و ئەو "شاهین"ە بووین، واتا دەستەی کارگێڕی لە سێ کەس پێکهاتبوو، ئیدی بەمشێوەیە کۆنگرە تەواو بوو.

پێویستبوو بەیاننامەی ڕاگەیاندن ئامادە کرابایە، ئامادەکاری سیفەرەك تەواو بکرابایە و بەو چالاکییەش ئێمە (PKK) ڕابگەیەنین. تا ئەو کاتەش پارتی لەهەموو شوێنێك ڕێکخستە بکرێت و ڕێکخستنی پارتی دروست ببێت، ئیدی بۆ ڕێکخستەبوون دەستمان بەخەبات کرد. بۆ ڕێکخستنی پارتیش کۆمیتەیەکمان دروستکرد "کۆمیتەی ڕێکخستنی پارتی" من لەو کۆمیتەیەشدا بووم، بۆ ئەوەی بتوانین بەخێرایی پارتی ڕێکخستە بکەین. سەرۆکیش ئامادەکاری نووسینی بەیاننامەی دامەزراندنی پارتی دەکرد. دەتوانم بۆ کۆنگرەی یەکەم ئاماژە بەو شتانە بکەم.

**خاڵێك سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت؛ شاهین دونمەز دەناسرێت، کەسێتی ئەو و تایبەتمەندێتییەکانی و مەسەلەی دەسەڵاتخوازێتی و خۆ بەبنچینە وەرگرتن و لومپەنیزمی ئەو...هتد. بەڵام بۆچی سەرۆك یان ئەو کۆمیتەیەی بۆ ئامادەکاری کۆنگرە پێکهێنرابوو شاهین دونمەزیان کردە ئەندامی کۆنگرە، پێشتریش تێڕوانینی ئەو لە کۆبوونەوەکاندا دیار بوو کە دژی پارتیبوونە، کەچی دیسانیش سەرۆك و کۆمیتەی ئامادەکار شاهین دونمەز وەك ئەندامی بەشدار لە کۆنگرە دەستنیشان دەکات و پاشانیش دەبێت بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و ئەندامی دەستەی کارگێڕی...**

ڕاستە، ڕاستینەی "شاهین دونمەز" بەمجۆرە بوو، بەڵام لەپراکتیکیشدا کاری دەکرد، بۆ ئەوەی خۆی بە پەسندکردن بدات زۆر کاری دەکرد. وەکوتریش تواناکاری خۆی هەبوو کە پێشبکەوێت. چونکە لە زانکۆش خوێندبووی، واتا توانستێکی وەهاشی هەبوو.

لەلایەکی تریشەوە چەمکێکی سەرۆك هەبوو کە کەسێك بڵێت:" من دەتوانم فلاَن کار بکەم" سەرۆك نەیدەگووت:"نا ناتوانیت" و "نابێت" هیچ کاتێکیش ئەمەی نەگووتووە. دەیخواست راستینەی ئەو بەو بناسێنێت، لەو کۆنگرەیشدا خواستی راستینەی ئەو بەو بناسێنێت، بەلاَم کاتێك کە "شاهین دونمەز" سوور بوو، ئەویش گووتی:"مادام تۆ خۆت ئامادە دەبینیت و دەخوازیت، شتێکی من بیلێم نییە". ئەمە نزیکبوونەوەی سەرۆك بوو، واتا هەڤاڵێك بیگووتبایە دەتوانم ئەو کارە بکەم، سەرۆك نەیدەگووت:" نا" دەیگووت:" مادام تۆ خۆت ئامادە دەبینیت فەرموو بیکە".

## ئەمە نزیکبوونەوەیەکی دیموکراتیانەیە...؟

بێگومان کەسێك بڵێت:" من دەتوانم ئەو کارە بکەم" تۆ ناتوانیت بڵێیت:" تۆ ناتوانیت بیکەیت"، وەکوتریش سەرۆك بۆچی ئەو چەمکەی بەبنەما وەرگرت؟ چونکە چەمکی دیموکراتیانەی بەبنەما و بناخە وەردەگرت. ئەمە هۆکارێك بوو. هۆکارێکی تریش ئەوە بوو کە داگیرکەران هەمیشە بەخەڵکی ئێمەیان گووتبوو:" ئێوە ناتوانن شتێك بکەن، ناتوانن ئەنجام بەدەست بخەن". ئەو چەمکەیان بەساڵان خستبووە نێو مێشکی گەلی ئێمەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی ئێمە باوەڕ بەخۆی نەکات. سەرۆکیش دەیخواست ئەم چەمکە لەخەڵکی ئێمەدا بشکێنێت، تەنانەت ئەو هەڤاڵانەی کە لاواز بوون و نەیاندەتوانی کارێك بکەن، سەرۆك دەیخواست و هەوڵیدەدا و باوەڕی بەوان بدات، مۆراڵ و ورەی بەوان دەبەخشی، بۆ ئەوەی باوەڕی بەخۆیان بکەن و بتوانن هەنگاو بهاوێژن. دەیگووت:" ئێوە دەتوانن بیکەن"، واتا ئەم ئوسلوب و نزیکبوونەوەیەی پەیڕەو دەکرد، تاکو بەم هەڤاڵانە هەنگاو بهاوێژێت، بۆ ئەوەی ئەو شتەی دووژمن بەساڵان خستبوویە مێشکی خەڵك، ئەویش بتوانێت لە مێشکی خەڵك دەریبخات، دووژمن و داگیرکەران گووتبوویان:" تۆ ناتوانیت هیچ بکەیت". ئەگەر تۆش هەر پێی بڵێیت:" تۆ ناتوانیت، تۆ ناتوانیت..." ئەو کەسە ناتوانێت هیچ هەنگاوێك بهاوێژێت. پێویستە تۆ پێی بڵێیت:" تۆ دەتوانیت بیکەیت" و هێز و وزە و مۆراڵی بدەیتێ، تاکو ئەو کەسە هەنگاو بهاوێژێت و باوەڕی لەلا دروست ببێت. چونکە سەرۆك ئەم تێڕوانینەی بەبنەما

وەردەگرت، كە "شاهین دونمەز" گووتی:" من دەتوانم و ئامادەم و بەخۆم باوەڕم" نەیخواست بیشكێنێتەوە و گووتی:" مادام تۆ دەڵێیت من دەتوانم، فەرموو بیكە". هەڵبەتە پاشانیش سەرۆك دەیخواست ڕەوشی ئەو و لاوازییەكانی بناسێت و هەمیش لەناو كار و جڤینەكاندا خۆی لە لاوازییەكانی ڕزگار بكات و هەنگاو بەرەو پێشەوە بهاوێژێت، سەرۆك بەمجۆرە لە "شاهین دونمەز" نزیكبووەوە. بەمە زۆر وزە و مۆڕاڵیشی وەرگرت و جورئەتیشی وەرگرت، لە پراكتیكدا هەنگاویشی دەهاوێشت. هۆی ئەوەی سەرۆك ڕەوشی "شاهین دونمەز"ی دەزانی و ڕێگیری لێنەكرد لەبەر ئەم هۆیانە بوو.

سەرۆك نزیكبوونەوەیەكی بۆ مرۆڤەكان هەبوو، دەیگووت:" ئەگەر لە (٩٩٪)ی خراپ بووبێت و لە (١٪)ی باش بێت ئەوا پێویستە مرۆڤ ئەو (١٪) بەبنەما وەربگرێت و ئەو (١٪) بەهێز بكات، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت لایەنی خراپەی ئەو كەسە كەم بكاتەوە". نزیكبوونەوەی سەرۆك بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بووە؛ سەبارەت بە "شاهین دونمەز"یش هەمان ئەو نزیكبوونەوەیەی بەبنەما وەرگرت...

## چەند هەڤاڵێكی كچ بەشداری كۆنگرە ببوون، بەڵام كەسیان لە كۆمیتەی ناوەندیدا شوێنگیر نەبوون، خۆیان نەیاندەخواست یان هۆكاری دیكە هەبوو؟


هەڤاڵ عەباس( دوران کاڵکان )




ئەو کاتە هەڤاڵانی کچ زۆر بێ ئەزموون بوون و تازە بوون لە پراکتیکدا، بۆ خۆیشیان خۆیان بەگونجاو نەدەبینی، هەڤاڵانیش کەس ئەوانیان پێشنیاز نەکرد، بۆیە هەڤاڵانی کچ نەبوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییەوە...

## لە کۆنگرەدا ناو و ئاڵا و سیمبۆلی پارتی چۆن گفتوگۆی لەسەر کرا؟ بەتایبەتی ناوی (PKK).

لە کۆنگرەدا هەندێك گفتوگۆ کرا و هەندێك پێشنیاز کران، ئەو کاتە ئێمە بەتەواوی بڕیارمان لەسەر نەدا. ئەو مەسەلانەمان بۆ سەرۆك بەجێهێشت و گووتمان:" با پێشنیازی زیاتر وەربگرێت و پاشان لەناو ئەو پێشنیازانەدا ناوێکی گونجاو و ئارمێکی گونجاو دەستنیشان بکات". ئیدی لەناو پێشنیازەکاندا هەم بۆ ناو و هەمیش بۆ ئارم ئەو ناوەی دەزانرێت **پارتیا کارکەرێن کوردستان** (PKK) و ئەو ئارمەی دەزانرێ؛ **زەمینەیەکی سوور، لەناوەڕاستیدا چەکوش و داسێك** دەستنیشان کران، ناوی (PKK) وابزانم پێشنیازی هەڤاڵان "**مەزلوم دۆغان**" و "**فەرهاد کورتای**" بوو. هەڤاڵ "**فەرهاد کورتای**" خەڵکی شاری **ماردین** بوو، ئەندازیار بوو لە زیندانی **دیاربەکردا** شەهید بوو.

ئەوان ناوی (PKK)یان پێشنیاز کردبوو و بەمشێوەیە ئەو ناوە پەسندکرا. لەدەرەوەی ناوی (PKK) چەندین ناوی دیکەش پێشنیاز کران، بەڵام ئەم ناوەیان پەسندکرا، هەڵبەتە ئەوەی ئارمیش "چەکوش و داس" بوو، لەدەرەوەی ئەم ئارمە ئارمی دیکەش پێشنیاز کرابوو، بەڵام ئەمەیان پەسند کرا. چونکە تەڤگەری ئێمەش ئەو کاتە لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراودا بوو. لە جیهاندا هەموو ئەو تەڤگەرانەی بۆ ئازادی و سۆسیالیزم و دیموکراتییەت شەڕیان دەکرد زۆربەیان ئەو ئارمەیان بەبنچینە وەردەگرت، ئێمەش لەژێر ئەو کاریگەرییانەدا بووین، بۆیە ئەو ئارمەمان پەسند کرد.

## پارتی دادەمەزرێت، کاریگەری دامەزراندنی پارتی لەسەر هەڤاڵان و گەل چۆن بوو؟ دەنگدانەوەیەکی چۆنی هەبوو؟

بێگومان کە کۆنگرە سازدرا و دەستمان بە رێکخستەکردنی پارتی کرد کاریگەری زۆر بەهێزی لەسەر کادیران کرد و جۆش و خرۆشێکی مەزنی بەخشی و ئیدی ئێمە بووینە پارتی و هەر کەسێکیش خۆی بە پارتی دەزانی. بێگومان ئەمە هێز و وزەی بە هەڤاڵان بەخشی و بەم دڵخۆشییەوە زیاتر کەوتینە نێو کار و خەباتەوە. بەڵام بێگومان هێشتا لە شۆڕشگێڕێتی سەردەمی بەر لە پارتیبووندا دەژیان و پارتێتی نەدەژیان، هەر بۆیەش تەواو لە پارتیبوون تێنەدەگەیشتین، ئیدی خۆمان بەئەندامی پارتی دەبینی. بەڵام لەبنەڕەتدا لەزۆر رووەوە دووری پارتیبوون بووین. واتا لەهەموو رووێکەوە لە شۆڕشگێڕێتی سەردەمی گروپدا دەژیاین و شۆڕشگێڕی ئەماتۆر بووین. رەوشی کادیر بەمجۆرە بوو، بەڵام مۆراڵ و جۆشێکی بەهێزی بە کادیر بەخشیبوو. چونکە هەر کەس خۆی بە ئەندامی پارتی دەزانی، بۆیە بەجۆشەوە کاری دەکرد، بەڵام بە کەسێتی ئاماتۆرییەوە.

بێگومان کاریگەری لەسەر گەلیش هەبوو، لەبنەڕەتدا کە دامەزراندنی پارتیمان راگەیاند کاریگەری خۆی کرد، بێگومان بەر لەوە گەل نەیزانیبوو کە هەنگاوێکی بەمجۆرەمان هاوێشووە.

## کە کۆنگرە کۆتایی هات، دامەزراندنی پارتی کەی راگەیەنرا...؟

هەڵبەتە لەهەمان رۆژدا دامەزراندنی پارتی رانەگەیەندرا. چونکە هێشتا رێکخستەبوونمان تۆکمە نەکردبوو، ئەگەر ئێمە رایبگەیەنین، بێ رێکخستنی هەیە، دەوڵەت هێرشمان بۆ بێنێت و زەبرێکی مەزن دەخۆین. بۆیە پێویستبوو کە رێکخستەبوونێك بەدیبێنین، هەڵبەتە بەچالاکی سیفەرەك دەمانخواست رایبگەیەنین، هێشتا ئامادەکاری ئەنجامدانی ئەو چالاکییە تەواو نەببوو، بۆیە ئێمە رامانندەگەیاند، ئیدی پاشان رامانگەیاند.

بێگومان گەل کاتێك کە دامەزراندنی پارتی راگەیەنرا، ئەو کاتە پێی زانی کە پارتی دامەزراوە، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆر بەهێزی لەسەر گەل دروست کرد، گەل زیاتر باوەڕی بە تەڤگەر کرد، زیاتر خۆی تەڤلی تەڤگەر کرد، لەزۆر شوێندا تەڤگەر زۆر فراوان و مەزن و بەهێز بوو، ئیدی گەل بەهێزبوونی خۆی دەبینی. چونکە پارتی خۆی دامەزرا، تاکو ئەو کاتە لە کوردستاندا گەلی کورد ناوی پارتییەکی بۆ خودی خۆی نەبیستبوو، ئەو پارتییانەی هەبوون هەمووی پارتی دەوڵەت بوون، هی کوردانیش نەبوون، هی دەوڵەت بوو هی تورکیا بوون. بەناوی کورد و کوردستان هیچ پارتییەك نەبوو و کورد نەیبیستبوو، یەکەمینجار بە راگەیاندنی دامەزرانی (PKK) بینی کەوا پارتییەك بەناوی کورد و کوردستان دامەزراوە، لەبەر ئەمە زۆر کاریگەری خۆی لەسەر گەل کرد، واتا بینیان کە پارتی ئەوان دامەزراوە، ئیدی خاوەنێکی ئەوان هەیە، تا ئەو کاتە خۆی بێخاوەن دەبینی، خۆیان بێ رێکخستن و بێ هێز دەبینی، بەڵام بە لەدایکبوونی (PKK) ئیدی خۆی بە هێز و توانا بینی، بینی کە ئەویش هێزێکە و ئیدی پارتی ئەویش هەیە. لەبنچینەدا ئەو کاریگەرییەی خۆی لەسەر گەل کرد، گەلیش زیاتر خۆی لەتەڤگەر نزیك کردەوە و تێیدا بەشداربوو، بۆیە تەڤگەر لەهەموو شوێنێکدا بەم هەنگاوە بەهێز و فراوانتر بوو. لەمێژووی گەلەکەماندا یەکەمینجار بوو بەناوی ئەوەوە پارتییەك دروست ببێت. پارتییەك کە بە چالاکییەك خۆی رابگەیەنێت، هەمیش بە چالاکی دژ بە "**محەمەد جەلال بوجاق**" خۆی رابگەیەنێت. چونکە گەلی کورد چەندە

بەدەستی داگیرکەران زوڵمی چەشتبوو، بەو رادەیەش بەدەست خائین و سیخوڕ و دەسەڵاتداری کوردیش زوڵمی بینیبوو، لەبنەڕەتیشدا ئەو زوڵمەی دووژمن و دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان دەیانکرد بەدەستی ئەو خائینانەوە دەیانکرد. دەوڵەت لەهەندێك شوێندا خۆی دەدایە پێش، لەزۆر شتیشدا خۆی لەدواوە دەشاردەوە و چینی خائینی کوردی دەدایە پێش، هەموو زوڵم و تاوانی بەدەستی ئەوان دەکرد، بۆیە ئەو زوڵم و تالانی و کوشتنانەی ئەوان دەیانکرد گەل چاك دەیبینی، چونکە بە بەرچاوی گەلدا دەیانکرد، لەراستیدا دەوڵەتی بەمە دەیخواست کاردانەوە و رك لەبەرامبەر ئەوان بێت، نەك لەبەرامبەر دەوڵەت، واتا تاکتیکی بەمجۆرەی بەڕێوەدەبرد، کوردی لەدژی کورد بەکاردەهێنا، کوردی بە کورد بەکوشت دەدا، بۆیە گووتنێکیان هەیە دەڵێت:" سەگ سەگە، چ سپی چ رەش جیاوازیان نییە، سەگ بە سەگ بە کوشت بدە" ئەو تاکتیکەیان دژ بە کورد بەڕێوە دەبرد.

ئیدی کاتێك لەدژی "محەمەد جەلال بوجاق" ئەو چالاکییە ئەنجامدرا و لەگەڵ چالاکییەکەدا پارتی راگەیەنرا، کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر گەل کرد، باوەڕییەکی بەهێزی بە گەل بەخشی، بۆیە گەل بە پارتی باوەڕی کرد و لەهەموو شوێنێك کەوتنە نێو جموجۆڵەوە و لەزۆر شوێندا گوێڕایەڵی پارتی بوو و لەنێو رێکخستنی پارتیدا شوێنی گرت، پارتی چی دەخواست یەکسەر پێکیدەهێنا، کاریگەرییەکی بەمجۆرەی کردە سەر گەل.

بۆیە لەدایکبوونی (PKK) لەدایکبوونێکی مێژوویی بوو، لە مێژووی گەلی کورددا لاپەڕەیەکی نوێ بوو، هەنگاوێکی نوێ بوو، یەکەمین جار بوو پارتییەك بەناوی ئەوانەوە دابمەزرێت و رابگەیەنرێت. ئیدی گەلی کوردیش بووە خاوەن پارتی خۆی. تا ئەو کاتە پارتییەکیان نەبوو، بەناوی کورد و کوردستان رێکخستنێك نەبوو و تێیدا بەشدار نەبوون، تەنیا لە رێکخستنەکانی دەوڵەتی تورکیا بەشدار ببوون، ئەو رێکخستنانەی کەوا تەسفیەی گەلی کوردیان ئەنجام دەدا، واتا ئەو رێکخستنانەی پێشتر گەلی کورد تێیدا شوێنیان دەگرت تەسفیەی گەلی کوردیان دەکرد. بۆیە لەدایکبوونی (PKK) مێژوویی بوو و لاپەڕەیەکی نوێ بوو بۆ گەلی کورد.

ئیدی بە لەدایکبوونی (PKK) و راگەیاندنی دامەزرانی (PKK)، قۆناخێك لە کوردستان کۆتایی پێهات و قۆناخێکی نوێ سەریهەڵدا و دەستیپێکرد. پێشتر مێژوو، نەك لەسەر قاچەکانی، بەڵکو لەسەر سەری خۆی بەڕێوە دەچوو و سەراونخون ببووەوە، بەم لەدایکبوونە ئیدی مێژوو گەڕێندرایەوە سەر قاچەکانی خۆی. بۆیە لەدایکبوون و راگەیاندنی دامەزرانی (PKK) پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکانی دوو قات زیاتر کرد، ئیدی کاریگەرییەکی بەمجۆرەی کرد.

## کاریگەری دامەزرانی پارتی لەسەر دەوڵەت و هێزەکانی دیکە چۆن بوو؟ بۆ ئەوان بە چ واتایەك دەهات؟



**دیمەنێك لە کۆمەڵکوژییەکەی مەرعەش**

دەوڵەت بەگرتنی **"شاهین دونمەز"** و خیانەتی ئەو تێگەیشتبوو کە ئێمە کۆنگرەمان سازداوە و بووین بە پارتییەك، تا بەر لەگرتنی **"شاهین دونمەز"** دەوڵەت نەیدەزانی و

هیچ زانیارییەکی نەبوو. بەڵام بەم گرتنەی "شاهین دونمەز" کە دانی بەهەموو شتێکدا نابوو و هەموو شتێکی تەسلیم بە دەوڵەت کردبوو، بەبێ ئەشکەنجەکردن دانی بەهەموو شتێکدا نابوو، دەوڵەت بووە خاوەنی زانیاری. هەڵبەتە دەوڵەت سەرەتا باوەڕی پێنەکردبوو، گووتبووی:" ئەمە درۆ دەکات ئێمە دەخڵەتێنێت" بەوجۆرە مەزەندەی نەدەکرد کەوا "شاهین" بەبێ ئەشکەنجەکردن تەسلیم ببێت، چونکە ئەو قسانەی "شاهین" کردبووی هیچ تەحەمولیان نەدەکرد، هەندێك شت کە "شاهین" دانی پێدا نابوو دەوڵەت هیچ زانیارییەکی لەسەر نەبوو و نەیدەزانی، بۆیە دەوڵەت دەیگووت:" ئەمە درۆ دەکات" و باوەڕیان پێینەکرد. وەکوتریش لەئاستیکی وەهادا خیانەتێکی بەوجۆرەیان هیچ باوەڕ نەدەکرد. چونکە کادیری ئەم تەفگەرەیان بەجۆرێکی تر ناسیبوو، بۆیە سەرەتا پێی باوەڕ ناکەن، پاشان باوەڕیان پێکردبوو. تا ئەو کاتەش تەفگەر هەندێك تەدبیری بۆ خۆی وەرگرتبوو.

دەتوانم بڵێم؛ پێش ئەوەی ئێمە دامەزراندنی پارتی رابگەیەنین دەوڵەت دەیزانی کە ئێمە کۆنگرەمان سازداوە و پارتیمان دامەزراندووە و رێکخستنێکی پارتی هەیە و دەخوازین بە چالاکی بەسەر "بوجاق"دا پارتی رابگەیەنین. "شاهین" بەتەواوی نەیدەزانی، بەڵام مەزەندەی دەکرد کە پارتی بە چالاکی بەسەر "بوجاق"دا خۆی رادەگەیەنێت، ئەمەی باس کردبوو. بۆیە دەوڵەت دەیزانی چۆن رێگیری لەمە بکات، دەیخواست تەدبیری ئەمە وەربگرێت و لەسەر ئەمەش سوور بوو، بەڵام ئێمەش لەسەر بڕیاری خۆمان سووربووین.

ئەمە راستینەی ئەم تەفگەرەیە، ئەگەر تەفگەر هەرچییەکی داوەتە پێش خۆی تێیدا سووربووە و پێکیهێناوە، جا چ درەنگ بێت یان لەکاتی خۆیدا بێت، ئەمە تایبەتمەندییەکی ئەم تەفگەرەیە. لەبەر ئەوەی خاوەن تایبەتمەندییەکی بەمشێوەیەیە، گەلیش ئەمە دەزانێت، بۆیە گەل باوەڕی بەم تەفگەرە کرد. واتا تەفگەری ئاپۆچی هەرچییەك بڵێت راست دەبێژێت و پێکیدەهێنێت. ئیدی قەناعەتێکی بەمجۆرە لەنێو گەلدا دروست بووە. چونکە لەژیان و پراکتیکی (PKK)دا ئەمەی بینیوە، کە (PKK) نەتوانێت شتێك بکات نابێژێت، کە دەئاخفێت کەواتە دەیکات، کە کردی ئینجا قسە

دەكات. ئیدی ئەمە باوەڕییەكی بەهێزی بە گەل بەخشی، بەمشێوەیە (PKK) لەناو گەلدا ناسرا.

من لەئاخافتنی خۆشمدا گووتم؛ بۆ نموونە ئێمە دەمانخواست لە سیفەرەك بگەینە گەریلا و گەریلاش لەهەرێمی "بۆتان" پێك بێنین، هەرچەندە لە سیفەرەك ئەو ئامانجانەی بۆخۆمان دانابوو بەتەواوی پێكنەهات، دیسانیش دەستبەرداری نەبووین، درەنگیش بێت ئێمە دیسان ئەو ئامانجەمان پێكهێنا.

لەمەسەلەی راگەیاندنی دامەزرانی (PKK)شدا هەرچەندە "شاهین دودمەز" خیانەتیشی كرد، دیسانیش ئێمە سووربووین لەسەر ئەوەی بەچالاكی بەسەر "بوجاق"دا پارتی رابگەیەنین. ئیدی ئەوە تایبەتمەندییەكی ئەم تەڤگەرەیە، دەوڵەت چەندە خواستی رێگیریش لەمە بكات بەڵام نەیتوانی. كاتێك پارتی راگەیەنرا، ئەمە بۆ دەوڵەتیش شتێكی نوێ بوو، چۆن بۆ گەلی كورد و تەنانەت كادیری تەڤگەر راگەیاندنی دامەزرانی (PKK) گوزارشتی لەشتێكی نوێ دەكرد، بۆ دەوڵەتی توركیاش گوزارشتی لەشتێكی نوێ كرد، چونكە تا ئەو كاتە بەناوی كورد و كوردستان هیچ پارتییەك دروست نەببوو، بەمشێوەیەش خۆی رانەگەیاندبوو، هەر پارتییەكیش كە دروست بووبێت بەشاراوەیی خۆی هێشتۆتەوە و بەمشێوەیە خۆی رانەگەیاندبوو، كەسێك نەیدەزانی ئەو پارتییانە هەن یان نا، بەناوی پارتییەكان كار و خەباتیان نەدەكرد. هەبوون پارتی بوون، بەڵام رێكخستن و چالاكی و خەباتیان نەبوو، كەسێك پێی نەزانیبوو كە هەن، ئێستا (PKK) بە چالاكییەك خۆی بۆ دونیا رادەگەیەنێت، ئەمە یەكەمین جارە شتی وەها ئەنجام بدرێت. ئەمە بۆ دەوڵەتی توركیا زۆر گرنگ بوو، كەواتە ئیدی كورد بەئاشكرا و بەناوی خۆی خۆی رادەگەیەنێت و خاوەندارێتی لەچارەنووسی خۆی دەكات و ئیدی چارەنووسی خۆیان دەخەنەوە دەستی خۆیان.

كەواتە راگەیاندنی دامەزرانی (PKK) بەو واتایە دەهات كە؛ ئێمە ئیدی ئەو ژیانە پەسند ناكەین، ئیدی لەهەموو رووێكەوە داگیركەری رەتدەكەینەوە، ئێمە پەیوەندی خۆمان لەگەڵ داگیركەری دەپچڕێنین. ئەمە راگەیاندنی ئەوە بوو، بۆیە بۆ دەوڵەت ئەمە پڕ گرنگ بوو...

لەبەرامبەر ئەو هەنگاوەی کە تەڤگەر بۆ بوون بە پارتی هاوێشتبووی، دەوڵەتیش هەنگاوی هاوێشت؛ لە (٢٤)ی مانگی دوازدەی (١٩٧٨)دا **"کۆمەڵکوژی مەرعەش"**ی ئەنجام دا. ئەم کۆمەڵکوژییە وەڵامێك بوو بۆ پارتیبوونی ئێمە. بەر لەوەی ئێمە پارتی رابگەیەنین **کۆمەڵکوژی مەرعەش** ئەنجام درا. بۆچی؟ چونکە **"شاهین دونمەز"** زانیاری بەدەوڵەت دابوو، کە ئێمە کۆنگرەمان سازداوە و بووین بە پارتییەك و رێکخستنی پارتی پێشدەخەین و خۆیشی بە چالاکییەك گوزارشت لەم دامەزراندنە دەکات. ئیدی دەوڵەت دەیخواست رێگیری لەمە بکات، هەم لە **سیڤەرەك** هاوکاری **"محەممەد جەلال بوجاق"**ی دەکرد، هەمیش بەچڕوپڕی هێرشی دەکردە سەر ئێمە، تەڤگەرەکانی دیکەی لەدژی ئێمە هاندەدا و شەڕی لەدژی ئێمەی پێدەکردن. لەلایەکی دیکەشەوە **کۆمەڵکوژی** مەرعەشی ئەنجام دا، بۆیە بەمە بەرسڤێکی دا بە سازدانی کۆنگرە و رێکخستەبوونی پارتی.

دەوڵەت بە شەهیدکردنی هەڤاڵ **"حەقی قەرار"** پەیامێکی بۆ کادیران دا "دەستبەردەن، ئەگەر دەستبەرنەدەن هەمووتان وەکو **حەقی قەرار** دەکوژین...". بەڵام بە **کۆمەڵکوژی** مەرعەش پەیامێکی بۆ گەل دا "پێویستە ئێوە لەم تەڤگەرەدا بەشدار نەبن، ئەگەر شوێن بگرن ئەوا دەتانکوژین و کۆمەڵکوژتان دەکەین، پێویستە ئێوە دووری ئەم تەڤگەرە رابوەستن". پەیامێکی بەمشێوەیەی بە گەل دا. ئێمە ئەو پەیامەمان وەرگرت. سەرۆك ئەو کۆمەڵکوژییەی مەرعەشی شیکردەوە و پاشان وەك نامیلکەیەکیش بڵاوکرایەوە، ناوی نامیلکەکەش **"سەبارەت بە کۆمەڵکوژی مەرعەش"**بوو.

ئەم کۆمەڵکوژییە گوزارشت لەچی دەکات؟ بۆچی لەو کاتەدا ئەنجام درا؟ ئەو کۆمەڵکوژییە چی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت؟ ئەو مەسەلانەی هەموو لەو نامیلکەیەدا شیکردەوە، یەکەمجار لەسەرتاپای تورکیا و کوردستاندا سەرۆك ئەو کۆمەڵکوژییەی شیکردەوە و لێی تێگەیشت و ئامانجەکەی بینی، ئەو نامیلکەیەمان لەسەر کادیران بڵاوکردەوە، بۆ ئەوەی کادیران لە پێڤاژۆیەکە (قۆناخەکە) تێبگەن، دووژمن چۆن دێتە سەر تەڤگەر و ئەو هەنگاوەی دەگرێت بهاوێژێت چ هەنگاوێکە؟ کە دەخوازن کودەتایەکی سەربازی ئەنجام بدەن. چونکە ئیدی ئەو تەدبیرانەی تاکو ئەو کاتە دەوڵەت وەریگرتبوو هیچ ئەنجامێکی بۆ ئەم تەڤگەرە نەبوو، ئیتر دەوڵەت دەیخواست بەئاشکرا و

بەهەموو هێزی خۆیەوە هێرش بكاتە سەر تەفگەر، تا ئەو كاتە سەرەتا بەدزییەوە هێرشی بردە سەر تەفگەر، زیاتریش هەندێك گروپی ناردە سەر تەفگەر، كە ئەنجامی بەدەستنەخست، هەندێك گروپی دیكەیشی لەگەڵ گروپەكانی دیكە ناردە سەر تەفگەر، گروپە چەپڕەوەكان، گروپە كوردییەكان، فیوداڵی كورد... كە بینی بەمەش ئەنجام بەدەستناخات، بە نیوە نهێنی و نیوە ئاشكرا لەهەندێك ناوچەدا هاتە سەر تەفگەر، ئیدی ئەو تاكتیكەی بەڕێوە دەبرد، كە بینی بەمەش ناتوانێت ڕێگیری لەپێشكەوتن و مەزنبوونی تەفگەر بكات، ئیتر بەئاشكرا و بەهەموو هێزێكی خۆیەوە دەیخواست هێرش بكاتە سەر تەفگەر، بە كۆمەڵكوژی مەرعەش ئەم پێڤاژۆیە دەستپێكرد. ئەمە ئامادەكاری بوو بۆ ئەنجامدانی كودەتای سەربازی (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠). سەرۆك ئەمەی دەستنیشانكرد، ئیتر هەڵوێستی دەوڵەت لەسەر ئەو بنەمایە بوو. چونكە بینی ئیتر مەسەلەی (PKK) وەكو ڕابردوو چارەسەر نابێت، بە لەدایكبوون و ڕاگەیاندنی دامەزرانی (PKK) ئیدی لە كوردستاندا ڕەوشێكی نوێ پێشدەكەوێت و كورد بە ئاشكرا خۆیان ڕادەگەیەنن، كە شەڕ و كار و خەبات دەكەن. دەوڵەتیش بەمشێوە ئامادەكاری خۆی پێشخست و بەو جۆرە وەڵامی ئێمەی دایەوە، ئێمە خواستمان كە لە سیڤەرەك تەفگەر بگەیەنینە گەریلا، دەوڵەتیش خواستی بە كۆمەڵكوژی مەرعەش بگاتە كودەتای سەربازی. ئیدی لەنێوان ئێمە و دەوڵەتدا شەڕێكی بەمجۆرە پێشكەوت.

بێگومان ڕاگەیاندنی دامەزرانی (PKK) لەچوارچێوەی كورد و توركیادا نەمایەوە، بەڵكو بەڕاگەیاندنی دامەزرانی (PKK) دەنگی كوردان گەیشتە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیش. تا ئەو كاتە جیهان چی لەبارەی كوردەوە دەزانی؟ وایاندەزانی كە كورد و كوردستان لە توركیادا مردووە، كێشەیەكی بەمجۆرە نەماوە، بەڵام بە ڕاگەیاندنی دامەزرانی (PKK) بینیان كە كورد نەمردووە و دەڵێت:" من هەم" ئەو كاتە لەهەندێك دەزگای ڕاگەیاندندا ئەو مەسەلەیە باسكرا و ئاماژەی پێدرا، كەواتە كورد هەنگاو دەهاوێژێت تاكو بۆخۆی كار و خەبات بكات، كەواتە نەمردوون، بەڕاگەیاندنی لەدایكبوونی (PKK) ئەم ڕاستییە ئاشكرابوو. بۆیە ڕاگەیاندنی دامەزرانی (PKK) تەنیا ڕاگەیاندنێكی ئاسایی و سادە نەبوو، بەڵكو موداخەلەیەك بوو سەر مێژوو، ئەو مێژووەی كەوا نكوڵی لە كورد دەكرد و لەناوی دەبرد، (PKK) موداخەلەی ئەمە بوو، بەئاشكرا ڕاگەیاندنی ئەمە بوو كە

ئیدی:" من ئەو مێژووە رەتدەكەمەوە، من ئەو ژیانە رەتدەكەمەوە، من هەم، یان بەئازادی دەژیم یان ناژیم" ئەو پەیامەی دایە هەر كەس...

**وەكو باستان كرد، بەر لە رۆژانی كودەتای (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠)، رەوشێكی گرژ و ئاڵۆز لەئارا دابوو، لەدوای دامەزراندنی (PKK)وە كۆمەڵكوژی مەرعەش روودەدات، هەروەها باسی ئەوەشتان كرد كە سەرۆك ئەو كۆمەڵكوژییەی شیكردەوە و هەڵیسەنگاند و پێشبینی روودانی كودەتایەكیشی كرد، ئەو كاتە تەڤگەر و سەرۆك چ تەدبیرێك وەردەگرن؟ هەروەها تا چەند ئەو شیكردنەوە و مەزەندە و هەڵسەنگاندن و پێشبینیانە بوونە موڵكی گەل و هێز و لایەنەكانی دیكە؟**

بێگومان ئەو كاتە رەوشێكی پڕ دژوار هەبوو، چەپەكان و فاشیستەكان شەڕیان لەدژی یەكتر دەكرد، ناكۆكییەكان زۆر بەهێز بوون، لەلایەكی دیكەشەوە تەڤگەری كورد لەپێشكەوتن دابوو، لەنێوان كورد و دەوڵەتی توركیادا ناكۆكی بەهێزتر دەبوو، لە توركیادا لەنێوان چەپ و فاشیستەكانیشدا ناكۆكییەكان بەهێزتر دەبوون، كێشە و گرفتە سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتییەكان زۆر بوون.

هەروەها لەهەرێمەكەدا هەندێك گۆڕان و پێشكەوتن روویاندەدا، لە خۆرهەڵاتی ناوین و جیهاندا، سۆڤییەت موداخەلەی ئەفغانستانی كردبوو، لە ئێراندا رژێمی "شاهەنشاه" كەوتبوو و شۆڕشێكی جەماوەری بەرپا ببوو، لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناویندا ناكۆكی نێوان سۆڤییەت و ئەمریكا هەبوو، هەندێك دەوڵەت لەگەڵ سۆڤییەت و هەندێكی تریش لەگەڵ ئەمریكادا سەنگەربەند ببوون، ئەو پێشكەوتن و ئاڵوگۆڕانەش كاریگەری خۆیان لەسەر توركیا دەكرد، چونكە توركیا دەوڵەتێكی ناتۆ (NATO) بوو، ئەركی ناتۆش ئەوە بوو كە سیستەمی سەرمایەداری و بەرژەوەندییەكانی بپارێزێت، ئەو رەوشەی

لەناوچەکە و جیهاندا هەبوو، ئەو رەوشەی تورکیای تێدا دەگوزەرا چی دەخواست؟ پێویستبوو تورکیا بتوانێت هەم سیستەمی سەرمایەداری و هەم ئەو رژێمەی لەتورکیا باڵادەست بوو بیانپارێزێت، هەر بۆیە کودەتای سەربازیان هەنگاو بەهەنگاو ئەنجام دەدا. رەوشێکی بەمجۆرە هەبوو، بەڵام زێدە لەلایەن هیچ کەسێکەوە شیندەکرایەوە و نەدەبینرا. سەرۆك ئەمەی بینی، تەنانەت بە کۆمەڵکوژی مەرعەش ئەم رەوشە بەتەواوی روونبۆوە کە بەرەو کوێ دەچێت، سەرۆك خواستی هەم کادیر و تەفگەر بۆ ئەمە ئامادە بکات، هەمیش ئەم رەوشە لە چەپی تورکیش بگەیەنێت، بۆیە شانبەشانی ئەمە سەرۆك سەبارەت بە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت نامیلکەیەکی دەرخست بەناوی "ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت چیین و چۆن سەریانهەڵداوە؟" بۆ ئەوەی پێداویستی کادیر لەرووی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنییەوە دابین بکات، چونکە ئێمە پارتیمان دامەزراند بوو و رێکخستنی پارتی و خەباتی پارتی هەبوو، رەوشی کادیران هەبوو، لە چەندین رووەوە کادیر لە ئەماتۆری و سەرەتاییبووندا دەژیا و نەدەبووە بەرسف. یاخود کێشە و گرفتی بۆ رێکخستەبوون و خەباتی پارتی دروست دەکرد، مەترسی دروست دەکرد، بۆ ئەوەی پێداویستی کادیران لەم رووەوە دابین بکات، سەبارەت بە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت ئەو نامیلکەیەی دەرخست، ئەو نامیلکەیەشمان بڵاوکردەوە، لەسەر کۆمەڵکوژی مەرعەشیش نامیلکەیەکی نووسی و بڵاومانکردەوە، بۆ ئەوەی هەم کادیران پەروەردە بکرێن و ئامادە بکرێن بۆ هەر پێشکەوتن و پێشهاتێك و بۆ هەر ئەرکێك، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو کێشە و گرفتانەی تێیدا دەژین چارەسەریان بکەین.

لەلایەکی دیکەشەوە سەرۆك دەیخواست بەرپرسیارێتی خۆی لەبەرامبەر چەپی تورك و گەلی تورکیا پێکبهێنێت، سەرۆك هەمیشە و لەهەر هەلومەرجێکدا ئەوەی بەبنچینە وەردەگرت. بۆ ئەم مەبەستە سەرۆك منی ناردە ئەنقەرە و پێی گووتم: " برۆ چەپی تورك ببینە و قسەیان لەگەڵدا بکە و پێیان بڵێ کە لە تورکیادا وا خەریکە کودەتایەکی سەربازی روودەدات، ئەمەش زۆر مەترسیدارە، پێویستە مرۆڤ بەخێرایی تەدبیر وەربگرێت... پێویستە هەموو هێزە چەپ و دیموکراتیخوازەکان لەچوارچێوەی بەرەیەکی دیموکراتیدا کۆببنەوە، ئەگەر رێککەوتن ئەنجام نەدرێت، ئەوا هەموو تەڤگەرەکان زەبریان بەردەکەوێت" سەرۆك بە منی گووت، ئەمە مەسەلەیەکیان کە

پێویست دەکات لەگەڵیاندا قسەی لەسەر بکەیت، دووەمیش: ئەزموونەکەی ساڵی (١٩٧١) هەبوو، کە کودەتا سەربازییەکە زەبرێکی مەزنی لە چەپ دابوو. کادیرانی پێشەوە (پێشەنگ) هەموویان دەستگیر کرابوون، لەسێدارە درابوون، کوژرابوون، تەڤگەرەکان پەرشوبڵاو ببوون، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە پێڤاژۆیەکی بەهەمان شێوە ڕوونەداتەوە پێیان بڵێ:" با هەر تەڤگەرێك هەندێك لە کادیرانی کۆمیتە ناوەندی خۆی ڕەوانەی دەرەوەی تورکیا بکات، ئەوانەی کە دەمێننەوە ئەگەر زەبریشیان بەربکەوێت ئەوا ئەوانەی دەرەوە دەتوانن بەردەوامی بە تەڤگەرەکەیان بدەن، لەساڵی (١٩٧١)دا لەبەر ئەوەی تەدبیرێکی بەمجۆرە وەرنەگیرابوو، هەموو کادیرانی پێشەنگ شەهید بوون. هەر بۆیە ئەو تەڤگەرانە زەبری کوشندەیان خوارد و نەیانتوانی بەخێرایی خۆیان کۆبکەنەوە، ئەگەر جارێکی دیکە ڕەوشێکی بەمجۆرە دەربکەوێت ئیدی ناتوانن خۆیان کۆبکەنەوە سەریەك، ئەمەش پڕ مەترسیدار دەبێت، ئەگەر لە تورکیا چەپی تورکیا و تەڤگەری چەپی دیموکراتی زەبریان بەربکەوێت ئەوا کاری ئێمەش زۆر دژوار دەکات. بۆ ئەوەی ئەمە ڕوونەدات و تەڤگەری ئێمەش زەبری زۆر مەزنی بەرنەکەوێت، پێویستە تەڤگەری چەپی تورکیاش زەبری بەرنەکەوێت...". بەمنی گووت:" لەسەر ئەم مەسەلانە قسەیان لەگەڵدا بکە و چ ئەنجامێکی دەبێت وەرە بەگوێرەی ئەوەش ئەو کاتە هەڵسەنگاندنی خۆمان دەکەین، بەگوێرەی ئەمەش چ بڕیارێك پێویست بێت وەریدەگرین و چ هەنگاوێکیش پێویست بێت دەیهاوێژین"

بێگومان من چوومە ئەنقەرە و هەندێك هێزی چەپی تورکیام بینی، لەم بارەیەوە گفتوگۆم لەگەڵیاندا کرد، ئەوان مەزندە و پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کە کودەتایەك ڕوویدات، وەکوتریش دەیانگووت:" ئەگەر کودەتایەکیش ڕووبدات ئەوا ئێمە ئامادەین لەدژی ڕابوەستین، بۆ ئێمە گرنگ نییە". هەر بۆیەش ئەو پێشنیازەی ئێمەیان زێدە بەجددی وەرنەگرت. هەم بۆ ئەوەی ڕێککەوتن ئەنجام بدەین، هەمیش هەندێك کادیری خۆیان بۆ دەرەوە ڕەوانە بکەن، ئەمانەیان بەجددی وەرنەگرت. کاتێك کە بینیم هەوای ئەوان جودایە و قاچیان لە هەوایە و پێشکەوتن و ئاڵوگۆڕەکان تاقیب ناکەن و لێی تێناگەن و بەمشێوەیە پێداگریش لەسەر هەڵوێستی خۆیان دەکەن، منیش گەڕامەوە. من بە سەرۆکم گووت:" ڕەوشی ئەوان بەمشێوەیە"، سەرۆك گووتی:" مادام وایە

ئێمە ئەو تەدبیرەی پێویستە بۆخۆمان وەردەگرین، ئێمە ئەرکی خۆمان پێکهێنا، کە ئەوان پێکی ناهێنن ئێمە چیبکەین؟ شتێکی ئێمە بیکەین نییە. با ئێمە بۆخۆمان چ تەدبیرێك پێویستە وەریبگرین".

ڕێك ئەو کاتە "شاهین دونمەز" لەشاری ئەلعەزیز دەستگیر کرابوو، کاتێك کە من دەچوومە ئەنقەرە سەرەتا چوومە "ئەلعەزیز" لەوێ هەڤالانم بینی، پاشان چوومە ئەنقەرە، لە ئەنقەرە نزیکەی مانگێك مامەوە، کە گەڕامەوە دیسان لەڕێی خۆمدا چوومەوە ئەلعەزیز، چونکە ترومبێل بۆ هاتن و چوون تا ئەلعەزیز هەبوو، بۆیە من چوومە ئەلعەزیز، لەوێ سەردانی هەڤالانیشم کرد، لەبنەمادا من پێویستبوو بچوومایە ئامەد (دیاربکر)، چونکە سەرۆك لەوێ بوو. من بلێتم بڕی و هاتمە ئەلعەزیز، لەبەر ئەوەی بلێتم بۆ ئامەد دەستنەکەوت، بۆیە چوومە لای هەڤالانی ئەلعەزیز بۆ ئەوەی ئەوانیش ببینم و پاشان بلێتی ئامەد پەیدا بکەم و بچمە ئامەد. بێگومان من نەمدەزانی کەوا لە ئەلعەزیز هەڤالان گیراون، من چوومە گەڕەکی "فوزی چەخماخ"، لەوێ هەندێك دۆست و هەواداری خۆمانم بینی و بەمنیان گووت:" تۆ لێرە لە چ دەگەڕێیت؟ هەموو هەڤالان گیراون، پۆلیس وا هەموو شوێنێك دەگەڕێت و دەپشکنێت" وامزانی گاڵتە دەکەن، کەچی بینیم بەراستیانە و گاڵتە ناکەن و زۆربەی هەرە زۆریان گیراون، کاتێك کە بینیم هەندێکیان گیراون، لەڕەوشی هەندێك هەڤاڵم پرسی زانیم کە هەندێك لە هەڤالانیش نەگیرابوون، گووتم؛ با هەم ئەوان ببینم و لە ڕەوشەکە تێبگەم و هەمیش تەدبیری پێویست وەربگرین، پاشان دەچمەوە ئامەد. هەڵبەتە بلێتیش نەبوو، گووتم؛ تا ئەو کاتە بلێتیش پەیدا دەکەم و بەرەو ئامەد بەڕێدەکەوم، ئەنجامی ئەو جڤینانەی کەوا لەگەڵ هێزە چەپڕەوەکاندا ئەنجامم دابوو بە سەرۆك دەڵێم".

ئەو هەڤالانەی نەگیرابوون بەشەو ئەوانم بینی و قسەم لەگەڵیاندا کرد، بینیم ڕەوش زۆر جدیە، هێشتا نەمانزانی بوو کە "شاهین دونمەز" تەسلیم بووە، بەڵام لەشێوەی گرتن و هێرشەکانی دووژمن تێگەیشتم کە تەسلیمییەتێك و خیانەتێك هەیە، هەڵبەتە ئەمەش مەگەر هەر "شاهین" بیکردبایە. واتا من لەشێوەی هێرشکردنی دووژمن دەرکم بەوەکرد کە "شاهین" ئەو زانیارییانەی داوە و تەسلیم بووە. منیش لەوێ گیرام، بەڵام لەبەر ئەوەی ناسنامەی من ساختە بوو، دیاریش نەبوو کە ساختەیە، ناسنامەی ئەنقەرە

بوو، بۆیە من دوو سێ سەعات لەدەست ئەواندا مامەوە، پاشان منیان بەردا، من زانیم کە پاشان دەمناسنەوە، بۆیە منیش یەکسەر لەوێ دەرکەوتم و نەمامەوە، دوای کاتژمێرێك کە منیان بەردا هەستیان بە من کرد، بەدوامدا هاتبوون و لەهەموو شوێنێك دەگەڕێن و دەرگاکانی ماڵەکان دەگرن و ئۆپەراسیۆنی مەزن دەکەن. بێگومان ئەو کاتە من لە ئەلعەزیز دەرچووبووم، کە دەرچووم، گومانم هەبوو، گووتم؛ لەوانەیە بە ئەنقەست منیان بەردا بێت، بۆ ئەوەی تاقیبم بکەن تاکو سەرۆك و هەڤاڵانی دیکەش بگرن، بۆیە یەکسەر نەچوومە ئامەد، چوومە چەند شوێنێکی دیکە، وابیرم کردەوە کە ئەگەر تاقیبم دەکەن با شوێنی خۆم ونبکەم، پاشان دەچمە ئامەد. کە چوومە ئامەد بە سەرۆکم گووت:" رەوش بەمجۆرەیە، پێویستە تەدبیر وەربگرین، وادیارە شاهین تەسلیم بووە و خیانەتێکی مەزن لەئارادایە" ئێمە تەدبیرمان وەرگرت، هەڵبەتە پاشان دەرکەوت کە "شاهین" خیانەتێکی مەزنی کردووە، ئەو ماڵەی کە سەرۆك لە ئامەد لێی دەمایەوە ئەدرەسی ئەو ماڵەشی داوە بە دووژمن. بەڵام وەکو گووتم؛ سەرەتا باوەڕیان پێی نەکردووە، پاشان باوەڕیان پێیکردبوو، بەمەش درەنگ کەوتبوون، تا ئەو کاتەش تەدبیر وەرگیرابوو، "شاهین" پۆلیس دێنێتە ئەو ماڵەی کە سەرۆك لێی دەمایەوە، دەبینێت کە کەسی تێدا نییە. واتا ئەگەر وانەبایە ئەو کاتە سەرۆکیش دەگیرا و تەڤگەریش گورزێکی کوشندەی بەر دەکەوت.

# کۆچی مەزن

# بەرەو دەرەوەی وڵات...

**ئەو کاتە بڕیاری چوونە دەرەوەی وڵات دەدرێت و سەرۆك بەرەو دەرەوەی وڵات دەکەوێتەڕێ و بەرەو باشووری رۆژئاوای کوردستان (سوریا) دەچێت و پاشان دەچێتە لوبنان، بێگومان ئەو بڕیارە بەگوێرەی ئەو رەوشە وەردەگیردرێت، وەك تاکتیکی "هەنگاوێك بۆ دواوە و دوو هەنگاو بۆ پێشەوە" وایە، بەڵام بۆچی سوریا و لوبنان، لەکاتێکدا ئەو کاتە رەوشی باشووری کوردستان هەبوو، شەڕ هەبوو، هەندێك جوڵانەوە هەبوون، هەروەها رەوشی ئەو کاتەی ئێران هەبوو، ئەرمەنستان لەسەر سنووری تورکیا هەبوو، بەگشتی وڵاتانی دیکەی سەر سنووری تورکیا هەبوو. ئەو کاتە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی رەوشەکە چۆن بوو بۆ هەڵبژاردنی لوبنان و کامپی فەلەستینییەکان لەوێ؟**

لەگەڵ خیانەتەکەی "شاهین" دەوڵەت لەهەموو رووێکەوە هێرش و شاڵاوی دەهێنایە سەر تەڤگەرەکەمان، چونکە هەموو زانیارییەکی بە دەوڵەت دابوو، لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانە هەموو رێکخستنەکان و کادیرانی ئێمە ئاشکرا ببوون، بۆیە هەندێك لە هەڤاڵانیش گیران، شەڕی سیڤەرەکیش بەگوێرەی تاکتیك بەڕێوە نەدەچوو، لەوێ

ڕەوشێکی دژوار هەبوو، بە **"کۆمەڵکوژی مەرعەش"**یش پەیامی دەوڵەت ئاشکرا و ڕوون بوو، ئیدی لە تورکیادا کودەتایەکی سەربازی ڕوودەدات و وا لەبەر دەرگایە. ئامانجی بنچینەیی ئەو کودەتایە ئێمەین. دەخوازن **تەڤگەری** (PKK) تەسفیە بکەن. ئەمە لەلایەن ئێمەوە یەکلایی ببۆوە، ئێمە چۆن لەدژی ئەمە ڕابوەستین و خۆبپارێزین؟ چۆن ئەو تەخریباتانەی تێیدا دەگوزەراین بتوانین بەلاوەی بنێین؟ ئێمە گفتوگۆمان لەسەر ئەو مەسەلانە کرد. سەرۆك بینی کە بەو توانستەی کە لەبەر دەستمان دایە و ئەو ڕەوشەی تێیدا دەژین مومکین نییە بتوانین ڕێگیری لە مەترسییەکان بکەین، ئەمە تەنیا لەدەرەوەی وڵات دەبێت، بەڵام لەدەرەوەی وڵاتیش هیچ پەیوەندییەکی ئێمە نییە، کەسیش ناناسین، ئێمە چۆن ئەو توانست و دەرفەتە بئافرێنین؟ ئەمە زۆر زەحمەتە.

هەڤاڵ **"ئەدهەم ئەکچان"** هەبوو، خەڵکی سروج بوو، سەرۆك گووتی:" لەوانەیە ئەو هەڤاڵە خزم و کەسوکاریان لە سوریا هەبێت" سەرۆك قسەی لەگەڵ ئەو هەڤاڵە کرد، ئەویش گووتی:" ڕاستە هەندێك خزم و کەسوکارم لەوێ لە **"کوبانێ"** هەیە". هەڵبەتە **" کوبانێ "** و **"سروج"**یش دراوسێی یەکترن و سنوور لەنێوانیاندا هەیە، زۆر خێزان لەم لان و زۆریش لەو لان و هەموو خزمی یەکترن، لەناوچەکانی دیکەش خزمایەتی بەمشێوەیە هەیە. ئەگەر ئێمە سوریامان دایەپێش خۆمان لەبەر ئەم هۆیە بوو دامانە پێشخۆمان، چونکە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ هیچ وڵاتێك نەبوو، کەسمان نەدەناسی، تەنیا ئەوە بوو هەندێك هەڤاڵی ئێمە خزمیان لە سوریا هەبوو، ئێمە ئەوەمان دەزانی کە سنوور دروست بوو خزم و کەسوکاریان لەوبەر سنوور هەیە و هاتن و چوونیش هەیە. ئیدی گووتمان ئەگەر توانستی دەرچوون هەبێت تەنیا ئەو ڕێیە هەیە و دەتوانین ئەو دەرگایە بکەینەوە، وەکوتر مومکین نابێت. هەڤاڵ **"ئەدهەم"** گووتی:" خزمی من لەوێ هەن" بێگومان ڕەوشی ئەو خزمانەی ئەو چییە و چی نییە؟ ئایا سەرۆك دەتوانێت لەلایان بمێنێتەوە و بیحەوێننەوە و بیشارنەوە؟ ئێمە ئەوەشمان نەدەزانی.

هەڤاڵ **"ئەدهەم"** گووتی:" ئێمە دەتوانین بچین، خزمی ئێمە باشن و خراپ نین، هەڵبەتە ئێمە ڕەوشی سەرۆك نابێژین، ئێمە دەڵێین: ئەویش خزمی خۆمانە، بەمشێوەیە دەچین. ئیدی بزانین چۆن دەبێت؟" وەکوتریش توانست نەبوو، ئیدی ئێمە

ئەوەمان بەمشێوەیە پەسند کرد، ئەگەر سەرۆك بەرەو سوریا رۆیشت لەبەر ئەم هۆیە بوو، وەکوتر توانستی ئێمە نەبوو.

تەنیا من و هەڤاڵ عەباس (دوران کالکان) دەمانزانی کە سەرۆك لەگەڵ هەڤاڵ "ئەدهەم" دەچنە سوریا، وەکوتر کەس ئاگای لێنەبوو. ئێمە ئەوەمان بەشاراوەیی هێشتەوە تا سەرۆك گەیشتە ئەوێ و پاشانیش هەر بەشاراوەیی مایەوە، کەسێك نەیدەزانی کەوا سەرۆك چووە بۆ کوبانێ.

بێگومان کاتێك ئێمە سەرۆکمان رەوانەی کوبانێ کرد، بڕیاری ئەو چوونەمان لە ئورفە وەرگرت. واتا ئێمە لەبازێڕی ئورفە کۆبوونەوەیەکمان سازکرد، هەرسێکمان سەرۆك و هەڤاڵ "عەباس" و من بووین، ئێمە ئەو بڕیارەمان وەرگرت، ئیدی سەرۆك و هەڤاڵ "ئەدهەم" چوون و دەبووایە بە قاچاخ سنووریان دەرباز بکردبایە، ئەو کاتە قاچاخچێتی هەبوو، قاچاخچی پارەیان بە سەربازەکان دەدا و بەمشێوەیە دەرباز دەبوون. ئیدی بەمشێوەیە دەرباز بوون. بێگومان ئێمە دڵنیا نەبووین لەکاتی دەربازبووندا چی روودەدات؟ داخوا بەساخی دەرباز دەبن یا نا؟. بێگومان تا چوون و دەرباز بوون ئێمە لەسەر ئاگربووین، کە چوون و گەیشتنە ئەوبەر سنوور و تەلەفۆنیان کرد، ئیدی گووتمان:"باشە" چونکە بەساخی گەیشتن. ئیدی ئێمە دەتوانین کار بکەین، ئەگەر ئێمەش بگیرێین مادام سەرۆك ساخە، دەتوانێت کێشەکان چارەسەر بکات، هەموو ترسی ئێمە ئەوە بوو کە سەرۆك نەگیرێت، بەمشێوەیە چوونە دەرەوەی سەرۆك بەڕێوە چوو، ئیدی چووبوون لە سنووردا پارەیان بە سەربازێك دابوو و بەمشێوەیە دەرباز ببوون و گەیشتنە کۆبانی.

## لە کۆبانی سەرۆك چۆن خۆی گەیاندبووە لای فەلەستینییەکان؟

هەڵبەتە کە سەرەتا چوونە ئەوێ، سەرۆك ئەوەی بەبنەما وەرگرتبوو کە چۆن بتوانێت ئەو خێزانە قازانج بکات، کە ئەو خێزانەی قازانج کرد لەرێگەی ئەو خێزانەوە چووە شام (دیمەشق) و لەوێش چووە لای فەلەستینیەکان لە بەیروت بەمشێوەیە سەرۆك ئەو رێگەیەی کردەوە، بەرێگەی پەیوەندی ئەو خێزانەوە ئەو کەناڵەی کردەوە، بە توانستی

ئەم ماڵە گەیشتە شام و چووە لای فەلەستینیەکان و بەتوانستی فەلەستینیەکانیش چووە لوبنان، کە ناوەندی تەڤگەرە فەلەستینیەکان لەوێ ببینێت و قسەیان لەگەڵدا بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بۆ ئێمە شوێن دابین بکات و بەڵێن وەربگرێت کە ئێمە بتوانین هەندێك کادیر رەوانەی ئەوێ بکەین و لەوێ پەروەردەیان بکەین، تاکو بتوانین بەم کادیرانە موداخەلە بکەین و ئەو کێشە و گرفتانەی تێیدا دەژین بتوانین چارەسەریان بکەین. ئەمە بۆ ئەوە بوو.

سەرۆك چووە کوبانێ ، پاشان هەواڵی بۆ ئێمە نارد و گووتی:" هەندێك هەڤاڵ بنێرن" بێگومان کاتێك کە گووتی هەڤاڵ بنێرن، سەرەتا گروپێکی بچووکی خواست، پاشان گووتی:"(٢٥٠) کەس بنێرن" فەرمانێکی بەمشێوەیەی نارد، کاتێك ئەو فەرمانەی بۆ ئێمە نارد ئێمە گووتمان:" سەرۆك چۆن لە کاتێکی وەها زوودا ئەم هەموو توانستەی لەدەرەوە ئافراند کە وەها (٢٥٠) کەس دەخوازێت؟! چونکە جێگیرکردن و گوزەراندنی ئەم هەموو هەڤاڵە لەدەرەوە زەحمەتە". پەیوەندی ئێمەش وەها نەبوو، ئێمە گووتمان:" چۆن وەها زوو ئەم پەیوەندییە و ئەو توانستەی ئافراند؟" ئێمە سەرمان سوورما. وەکوتریش گووتمان:"(٢٥٠) کادیر و هەمیش کادیری پێشەوە بنێرین چۆن کێشەی رێکخستن لێرە چارەسەر بکەین؟" گووتمان:" ئەمە راست نییە" چونکە زۆر هەڤاڵیش گیرابوون، گووتمان بەو هەڤاڵانەی ماون دەتوانین رێگیری لەتەخریبات بکەین و دەتوانین کێشەی رێکخستنیش چارەسەر بکەین". من و هەڤاڵ "عەباس" قەناعەتێکی وەهامان هەبوو، تەنانەت ئێمە لەم رووەوە هەندێك کاریشمان کردبوو و هەندێك ئەنجامیشمان بەدەستخستبوو و دەمانگووت:" ئیدی دەتوانین ئەنجام بەدەستبخەین". بۆیە ئێمە داخوازی سەرۆکمان پێکنەهێنا، ئێمە (٢٥٠) کەسمان نەنارد، ئێمە ژمارەیەکی کەمی هەڤاڵانمان نارد. بێگومان ئێمە هەڵەیەکی مەزنمان کرد، ئەو هەڵەیەش پاشان بۆ ئێمە بووە هۆکاری ئەوەی کە زەرەر و زیانی مەزنمان بەربکەوێت.

ئەگەر ئەو کاتە داخوازی سەرۆکمان جێبەجێ بکردایە و هەڤاڵانمان رەوانەبکردایە ئەوا ئەو هەڤاڵانەی مابوون و پاشان لەمیانەی کودەتای (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) دەستگیرکران، دەستگیر نەدەکران، نەدەکەوتنە دەست دووژمنەوە و ئەوەندە دوور و درێژ لە زینداندا

نەدەمانەوە و ئەوەندە ئەشکەنجەشیان نەدەبینی. لەوانەبوو رەوشی تەڤگەریش وەها نەبایە.

ئیدی ئێمە هەڵەیەکی مەزنمان کرد. بۆچی؟ چونکە ئێمە دەمانگووت:" ئەگەر ئێمە ئەو ژمارە زۆرە بنێرین ئەوا لە وڵات بۆشایی دروست دەبێت، ئەو کاتەش ئێمە ناتوانین رێ لەبەردەم تەخریباتەکان بگرین و بەلاومیان بنێین. ئەگەر لەدەست ئێمەدا ئەو کادیرانە هەبن ئەوا دەتوانین تەخریباتەکان بەلاوە بنێین، بەڵام سەرۆك لەو قەناعەتەدا نەبوو. واتا دەیبینی کە پێویستە تەدبیری ریشەیی (بنچینەیی) وەربگرین، پێویستە موداخەلەی ریشەیی بکەین، ئێمە بەقووڵی لەوە تێنەگەیشتبووین، ئێمە دەمانگووت:" ئێمە بەهەندێك تەدبیر دەتوانین رێ لەم تەخریباتانە بگرین و دیسان کێشەکانمان چارەسەر بکەین و خەبات بەهێز بکەینەوە و درێژەی پێبدەین" پاشان بەدەرکەوت کە ئەوەی سەرۆك راست بوو، ئەوەی ئێمە بەهەڵە دەرچوو، بۆیە ئەو خەتایەمان کرد.

## سەرۆك چۆن توانستی ئەوەی ئافراند کە بتوانێت جێگە و گوزەران بۆ (٢٥٠) کادیر دابین بکات تاکو پەروەردە ببینن؟

سەرۆك چووبووە لای فەلەستینیەکان و داوای لەوان کردبوو کە هەندێك لە هەڤاڵان لەلای ئەوان پەروەردە ببینن، فەلەستینییەکان زێدە نەیاندەخواست ئەو توانستە بەئێمە بدەن، چونکە ئێمە هیچ ناناسن، سەرۆك چۆتە لایان و قسەی بۆیان کردووە و گووتوویەتی:" ئێمە تەڤگەرێکی بەمشێوەیەین، بەمە زانیارییان لەسەر ئێمە پەیدا کرد، پێشتر هیچ زانیارییەکی راستیان لەسەر ئێمە نەبوو، پێشتر ئەو زانیارییانەی سەبارەت بەئێمە بەوانیان دابوو، هەمووی هەڵە بوو. وەك گوایە" ئێمە تەڤگەرێکی شۆڕشگێڕ نین، بەڵکو تەڤگەرێکی گرێدراوی ئەمریکاین، گرێدراوی ئیسرائیلین، گرێدراوی میت (MİT)ی تورکیاین. یان گوایە ئێمە لەدژی شۆڕشگێڕانین و شۆڕشگێڕان دەکوژین... واتا لەسەر ئەو بنەمایانە زانیارییان لەسەر ئێمە بەوان دابوو، بۆیە فەلەستینییەکان راستینەی ئێمەیان نەدەناسی، تا ئەو کاتە هیچ هەڤاڵێکی ئێمەیان نەبینیبوو، یەکەمجار

سەرۆكیان بینی و سەرۆك قسەی بۆیان كرد بوو، بەڵام ئەوان زۆر زانیاری و نامەیان لەبەر دەست دایە، كە لەلایەن ئەو پارتیانە بۆیان ناردراوە كە پێیان باوەڕ دەكەن و پەیوەندییان لەگەڵیاندا هەیە. بۆیە بەم زانیارییانەی بەدەستیان گەیشتووە هەڵسوكەوت دەكەن و ناخوازن توانست بە ئێمە بدەن، ناتوانن بەئاشكرا بڵێن:" ئێمە ناخوازین"، بەڵام چونكە سەرۆك زۆر پێداگری دەكات و دەڵێت:" ئێمە چۆن بیانهێنین؟ لە سوریادا كێشەی "ئیخوانی موسلیمین" پەرەیسەندووە، بێ ناسنامە و بێ هیچ شتێك ئێمە چۆن بیانهێنین؟ ئێوە هاوكاریمان بكەن، ناسنامە و توانست بەئێمە بدەن تا بتوانین لە سنووری سوریا تا لوبنان هەڤاڵان دەرباز بكەین" ئەوانیش دەڵێن:" وەڵڵا ناتوانین، ئەگەر ئێوە خۆتان دەتوانن بیانهێنن ئەوا بیانهێنن" ئەوانە لەو قەناعەتەدا بوون كە ئێمە ناتوانین كەسێك بهێنینە لای ئەوان. بۆیە دەڵێن:" ئەگەر دەتوانن بیانهێنن بۆ ئێرە بیانهێنن. سەرۆك دەبینێت كە هیچ چارەیەكی دیكە نییە، دەڵێت:" باشە" ئیدی دەگەڕێتەوە شام و لەوێش بۆ كوبانێ و لە كوبانێ هەواڵی بۆ ئێمە نارد گووتی:" هەڤاڵان بنێرن"، لەبەر ئەوەی كە ئێمە دوودڵ بووین، واتا ئێمە توانستمان نییە، چ زوو سەرۆك ئەو توانستەی دابین كردووە؟ لەوانەیە ئەگەر هەڤاڵان بچنە ئەوێ پەرێشان ببن و بگیرێن، لەوانەیە تەسلیمی توركیا بكرێنەوە، هەروەها دەمانگووت:" ئەگەر هەڤاڵان بنێرین، لێرە بۆشایی دروست بێت" بەڵام ئێمە دیسانیش گروپێكمان نارد.

سەرۆك لەوێ هەندێك پەروەردەی ئەو گروپەی كرد و هەندێك لەو گروپەی رەوانەی لای ئێمەی كردەوە و لەرێگەی ئەو گروپەدا هەندێك زانیاری و تەعلیماتی بۆ ئێمە ناردبوو، كە ئێمە هەندێك تەدبیر وەربگرین و هەندێك هەڤاڵی دیكەش دەربچن.

بێگومان ئەو گروپەی ناردبوونی گیرابوون و نەگەیشتنە لای ئێمە. بۆیە ئەو تەعلیماتانە پێك نەهاتن. ئەو تەدبیرانەش وەرنەگیردران، واتا ئەو موداخەلەیە بەمشێوەیە بێ ئەنجام بوو. من ئەو كاتە دوو جاران چوومە لای سەرۆك، لە دوای ئەوەی سەرۆك دەرچووبوو، دوو جاران چووم و هاتم. لەجاری دووەمدا سەرۆك گووتی:" بڕۆن لەوێ كۆمیتەیەكی ناوەندی كاتیی (لجنە مركزیە مؤقتە) دروست بكەن و ئەو هەڤاڵانەی كۆمیتەی ناوەندی كە نەگیراون با هەموویان بێن و دەركەون". وەكوتر

گووتی:" هەندێك هەڤاڵی دیکەش دەتوانن دەربخەن". من چووم و هەڤاڵ "عەباس"م بینی و بەیەکەوە هەڵسەنگاندنمان کرد و بەگوێرەی ئەو تەعلیماتەی سەرۆك داویەتی، کە چۆن کۆمیتەیەکی ناوەندی کاتیی لە هەڤالان دروست بکەین؟ چۆن لەناوچە و هەرێمەکاندا دیسان هەندێك کۆمیتەی رێکخستنی ئاوا بکەین؟ ئەو هەڤالانەی کە ئاشکرا بوونە چ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و چ هەڤالانی دیکە و کادیری پێشەوە چۆن دەریانبخەین و بۆ لای سەرۆك رەوانەیان بکەین، قسەمان لەسەر ئەو تەدبیرانە کرد. وا دامانناببوو کۆبوونەوەی دوایی بکەین و ئێمەش بەرێبکەوین، سەرەتا من دەرچووومایە و پاشان هەڤاڵ "عەباس"یش دەرچووبایە. ئیدی ئەو هەنگاوەمان پێشخست.

لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە؛ لەچەمکی ئەو تەڤگەرەدا گوایە "توانست کەمە و ئەو شتە نابێت" چەمکێکی بەمشێوەیە نییە، بەڵکو ئەگەر توانستێکی زۆر بچووکیش هەبێت، ئەوا توانستێکە و توانستێکی مەزنیشە. ئەگەر تۆ راست لەو توانستە نزیك ببیتەوە و ماف تەواو بەم توانستە بدەیت، ئەوا دەتوانیت لەم توانستەدا توانستێکی پڕ مەزن دروست بکەیت، نزیکبوونەوەی ئەم تەڤگەرە لەسەر ئەو بنەمایەیە، کاتێك کە سەرۆك چووە دەرەوە، چووە سوریا توانستێکی وەها مەزنی لەبەر دەستدا نەبوو، سەرۆك نەیگووت:" بەم توانستە کار ناکرێت". تەنیا یەك خێزان هەبوو، ئەو خێزانەش چۆنە؟ ئەویش دیار نەبوو، بەڵام توانستەکە هەر ئەوە بوو، سەرۆك ئەمەی وەك توانستێك بینی و راست لێی نزیکبووەوە و ماف ئەو توانستەی دا و بەم توانستە زۆر توانستی مەزنی خوڵقاند. بەرێگەی خێزانێك هەزاران خێزانی لەتەڤگەر نزیك کردەوە، بەرێگەی پەیوەندییەکی وەها سادەوە پەیوەندییەکی زۆر مەزنی لە خۆرهەڵاتی ناوین لەگەڵ تەڤگەرە فەلەستینییەکان و سوریا ئاوا کرد، لەوێ تەڤگەر زۆر سوودمەند بوو، ئیدی ئەمە راستینەی سەرۆك و راستینەی ئەم تەڤگەرەیە، ئەو تەرزەی ئەم تەڤگەرە بەبنەمای وەردەگرێت، بەمشێوەیە، پراکتیکبوونی ئەم تەڤگەرە لەسەر ئەو بنەمایەیە، واتا چۆن ئەو توانستەی لەبەر دەستدایە مەزنی بکات و توانستی دیکەی لێ بئافرێنێت، ئەمە بەبنەما وەردەگرێت و دەیکات بەبناخە بۆ توانستی خۆی. تەڤگەر بەم چەمك و تەرزەوە کار و خەبات دەکات. ئیدی ئەگەر مرۆڤ بەمشێوەیە کار بکات ئەوا دەتوانێت ئەنجامی مەزنیش بەدەستبخات. هەروەها راستییەکی دیکەی سەرۆك و

ئەم تەڤگەرە هەیە، ئەویش چییە؟ هیچ کاتێك نالێت:" ئەو کەسە وایە و ئەم وایە، خواستوویەتی قازانجی بکات، لەسەر ئەمە پێداگری کردووە، ئەگەر ئەو کەسە هی تۆ نییە و خواستت بیکەیت بەهی خۆت، کە کردت بەهی خۆت تۆ دەتوانیت پێشکەوتن و سەرکەوتن ئەنجام بدەیت. ئەگەر تۆ گووتت:" ئەمە هی من نییە" ئەوا تۆ ناتوانیت ئەو قازانج بکەیت، کە تۆ قازانجیشت نەکرد تۆ ناتوانیت تەڤگەر مەزن بکەیت و بیگەیەنیت بەسەرکەوتن. بێگومان کە کەسێك هی تۆ نەبێت و تۆ قازانجی بکەیت زۆر زەحمەتە، بەڵام کە تۆ قازانجیشت کرد ئەوا قازانجی دەکەیت و ئەنجام بەدەست دەخەیت، ئەگەر تۆ گووتت:" ئەمە هی فلان پارتییە" و بەوەی دیکەشت گووت:" ئەویش هی ڤیسار پارتییە، ئەمەش هی دەوڵەتە..." زێدە کەست بۆ نامێنێتەوە کە رێکخستەی بکەیت، زیاتریش ئەوانەی ناخوازن کار بکەن، ناخوازن خۆیان ماندوو بکەن ئەم بەهانە و بیانووانە بۆ خۆیان دروست دەکەن. کەسی بەمجۆرە تەنیا ئەوەی هەیە بەبنەما وەردەگرێت و لەسەر هی ئامادە و حازر دەخوازن کار بکەن. کەسی بەمجۆرە توانستی ئامادەش ناپارێزیت. ئەم چەمکە شتێك نائافرێنێت و ئەوەی هەشە کۆتایی پێدێنێت. ئەگەر تۆ دەخوازیت ئەوەی هەیە بمێنێت و بیپارێزیت و بەفیڕۆی نەدەیت رێگەی ئەمە بەکوێدا دەرباز دەبێت؟ تۆ هی نوێ تەڤلی بکەیت، کە هی نوێ تەڤلی بکەیت دەتوانیت ئەوەی کۆنیش بپارێزیت، تۆ دەتوانیت تەڤگەر بەمشێوەیە مەزن بکەیت، ئەگەر وەها نەبێت تۆ هیچ کاتێك ناتوانیت تەڤگەر بەرەو پێشەوە ببەیت و بیگەیەنیتە سەرکەوتن.

ئیدی سەرۆك ئاپۆ بەم چەمکە لە سوریا و لوبنان کاری کرد، کە هەر کەسێکی بینی خواستی پەیوەندی لەگەڵدا ببەستێت و کاریگەری لەسەر دروست بکات و بۆ خۆی بیکاتە دۆست. لەمەدا پێداگری کرد. لەناو گەلی کوردیشدا وەها کاری دەکرد، لەناو عەرەبیشدا وەها کاری دەکرد. ئیدی ئەمە ئەنجامی بەدەستهێنا. لەو گۆڕەپانەدا توانست بۆ تەڤگەر بەمشێوەیە خوڵقێنرا، بەم تەرز و چەمکە بەدیهات.

بە مانەوەی رێبەر ئاپۆ و هەڤالان لە لوبنان و لەلای فەلەستینییەکان، هەڵوێست و نزیکبوونەوەی تەڤگەرە فەلەستینییەکان لەبەرامبەر تەڤگەر چۆن بوو، لەکاتێکدا کە پێشتر باك (تحفظ)یان لەبەرامبەر تەڤگەر هەبووە. چونکە وەك دەزانرێت ئەو کاتە هەندێك هێز و لایەنی باشوور بەوە تاوانبار دەکران کە پەیوەندییان لەگەڵ ئیسرائیل هەیە، ئەمە چۆن و تا چەند رەنگدانەوەی خۆی لەسەر پەیوەندی تەڤگەر بەو تەڤگەرە فەلەستینییانەوە کرد؟ هەروەها رێبەر ئاپۆ چۆن و تا چەند ئەو پەیوەندییە و ئەو دەرفەتەی خستۆتە خزمەتی تەڤگەری ئازادیخوازی کوردەوە؟



شەهید ئەدهەم ئاکچان

کاتێك کە سەرۆك چووە لای فەلەستینییەکان لە لوبنان، هەروا بەئاسانی پەیوەندی لەگەڵ فەلەستینییەکان پێشنەکەوت، زۆر بەزەحمەتی پێشکەوت. ئەمەش هۆکاری خۆی هەبوو. هۆکاری یەکەم: لەبەر ئەوەی تەڤگەری "مەلا مستەفا" پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەمریکا و ئیسرائیل هەبوو. فەلەستینییەکانیش لەبەر ئەوە باوەڕیان بە کوردان نەدەکرد و نەیاندەخواست پەیوەندی لەگەڵ کوردان پێشبخەن. واتا بەگومان لە کوردان نزیك دەبوونەوە، چونکە لەنێوان ئیسرائیلییەکان و فەلەستینییەکاندا ناکۆکییەکی مەزن هەبوو، تەڤگەری "مەلا مستەفا بارزانی"یش پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل و ئەمریکادا بەستووە، فەلەستینییەکان کوردانیان بەدۆستی ئیسرائیلی و ئەمریکایی دەبینی و بەم چاوە سەیری هەموو کوردانیان دەکرد، هەر بۆیەش زێدە باوەڕیان بە کوردان نەدەکرد و نەیاندەخواست پەیوەندی لەگەڵدا پێشبخەن. بێگومان نەیاندەزانی لەناو تەڤگەری کوردانداا چی هەیە؟ واتا کوردانیان بەرێگەی "مەلا مستەفا" و (پ د ك) ناسیبوو و لەم روانگەیەوە سەیری هەموو کوردیشیان دەکرد. ئیدی ئەمە بۆخۆی ئاستەنگێکی مەزن بوو.

بێگومان سەرۆك تا کێشەی کورد و (PKK)ی بەوان ناساند کاتێکی زۆری خایاند. پاشان فەلەستینییەکان بینیان کە کورد هەمووی وەك (پ د ك) نین، سەرۆك پەیوەندی نێوان کورد و فەلەستینییەکان و هەموو عەرەبەکانی لەسەر بناخەیەکی نوێ دروست کردەوە، لەناو عەرەبدا شوێنێکی تایبەتی بۆ کوردان ئاواکرد، بۆ دیپلۆماسییەتی کورد و پەیوەندی کورد دەرگایەکی نوێی کردەوە، گۆڕەپانی خۆرهەڵاتی ناوین بۆ کوردان داخرابوو، نەیاندەتوانی دیپلۆماسی و پەیوەندی خۆیان پێشبخەن. ئیدی سەرۆك ئاپۆ ئەو رێگەیەی بۆ کوردان کردەوە، ئەو سەنگەرەی خستە خزمەتی کوردان. شانبەشانی ئەمە زۆر زانیاری نا راستیان سەبارەت بە تەڤگەری (PKK) بە فەلەستینییەکان دابوو، گوایە (PKK) تەڤگەرێکی وەها شۆڕشگێڕ نییە و تەڤگەرێکە گرێدراوی ئەمریکایە، گرێدراوی تورکیایە، لەدژی شۆڕشگێڕان رادەوەستێت و شەڕ دەکات، ئەمەش ئاستەنگێکی مەزنی دروست کرد لەبەردەم پێشکەوتنی پەیوەندییەکان لەگەڵ فەلەستینییەکان، لەبەر ئەم هۆیەش بوو فەلەستینییەکان بەگومان نزیك دەبوونەوە. سەرۆك تاکو توانی راستینەی تەڤگەری (PKK)ی بەوان ناساند و تا قەناعەتی پێکردن

کە ئەو زانیارییانەی لەسەر (PKK) بەوان دراوە ڕاست نین کاتێکی زۆری خایاند. لەپاشاندا بینیان کە ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە تەڤگەری (PKK) بەوان دراوە ڕاست نین، لەهەڵوێست و نزیکبوونەوە و هەڵسەنگاندنەکانی سەرۆکدا، هەروەها پاشان لە کامپەکانیان هەڤاڵانیان بینی، ژیان و کاری هەڤاڵانیان بینی، بینیان کە ئەو زانیارییانە هەمووی هەڵەن، هەڵوێست و نزیکبوونەوەمیان بۆ کوردان هەڵەیە، کە هەموو کورد وەکو (پ د ك) نین و وەکو ئەویش بیرناکەنەوە. پاشان خۆیان بە سەرۆکیان گووتبوو:" بمانبەخشن، ئێمە ئێوەمان بەمشێوەیە نەناسیبوو، فەرموو بڕوانن ئەوەندە نامە و زانیاری لەسەر ئێوە هەیە، ئێمە پێشتر ئێوەمان نەدەناسی، بۆیە نەماندەخواست زێدە پەیوەندی لەگەڵ ئێوە پێشبخەین، بەگومان لەئێوە نزیك دەبووینەوە، بەڵام ئێمە بینیمان کە وانییە". تەنانەت لەم ڕووەوە داوای لێبوردنیان کرد، پەیوەندی ئێمە و فەلەستینییەکان و عەرەبەکان بەزەحمەت پێشکەوت، تاکو پێشکەوت زۆر ئاستەنگی دەهاتە پێش ئێمە...

## ئەو هێز و لایەنە کوردییانەی لەوێ بوون و بیرۆی خۆیان لە لوبنان و سوریا هەبوو، چۆن لەمانەوەی سەرۆك و هەڤاڵان لە لوبنان نزیك دەبوونەوە و لێیان دەڕوانی؟

ئەوانەی سەرەتا ڕاست لەئێمە نزیك دەبوونەوە و هاوکاری ئێمەیان دەکرد کەم بوون. پاشان تەڤگەر پەیوەندییەکانی خۆی پێشخست و لەوێ خۆی بەهێز کرد. ئینجا پارتە کوردییەکان لەتەڤگەر نزیك بوونەوە. سەرەتا وەها نەبوو، کاتێك کە سەرۆك دەرباز ی سوریا ببوو، پارتی چەپی کورد لەوێ هەبوو، کەمێك هاوکاری سەرۆکیان کردبوو و دۆستایەتیان کردبوو، لەدەرەوەی ئەو پارتییە، ئەوانی دیکە نە تەڤگەریان دەناسی و نە نزیکبوونەوەیەکی ڕاستیشیان هەبوو، چونکە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ پارتەکانی دیکەی کورد لە باکوور و باشوور هەبوو. ئەمانیش سەبارەت بە (PKK) زانیاری ناڕاستیان بەوان دابوو، پەیوەندییان لەگەڵ ئەوان بەهێز بوو. بۆیە ڕاست (PKK)یان نەدەناسی،

نەیاندەخواست لە (PKK)ش نزیك ببنەوە. تەنیا پارتی چەپی كورد لە سوریا سەرەتا پەیوەندییان لەگەڵ هەڤاڵان بەستبوو، بەگوێرەی توانستی خۆیان هاوكاری هەڤاڵانیان كردبوو، لە لوبناندا پارتی و ڕێكخستنەكانی كورد زێدە بەهێز نەبوون. دیسان هەندێك گروپی بچووك بچووك هەبوون، یەكێك لەو گروپانە گروپێكی بچووك سەرەتا هاوكاری ئێمەیان كرد. لەوێ كەسێك هەبوو ناوی "حەسەن" بوو، رابیتەیەكیان هەبوو ڕێكخراوێكی بچووك بوو و هەندێك پەیوەندیشیان لەگەڵ فەلەستینییەكان هەبوو، ئەوانە لە لوبنان بۆ دابینكردنی خانوو و ناسینی لوبنان و تەڤگەرە فەلەستینییەكان و وەرگێڕی كردن بۆ ئێمە هەندێك هاوكاریان كردین. واتا هاوكاری ئەوان و هی پارتی چەپی كورد لە سوریاش هاوكارییەكی وەها مەزن نەبوو، نە لەرووی ماددی و نە لەرووی سیاسییەوە هاوكارییەكی مەزنیان نەكردین، چونكە خۆشیان توانستێكی مەزنیان نەبوو. واتا زێدەتر هاوكاری ئەوان ئەوە بوو كە ئەو شوێنەی هەڤاڵان نەیاندەناسی بەهەڤاڵانیان دەناساند، لەجێگیركردنی هەڤاڵاندا هاوكارییان دەكردین، وەك وەرگێڕ هاوكارییان دەكردین، سەبارەت بە گەل و تەڤگەرەكان زانیارییان بەئێمە دەدا، لەم لایەنانەوە هاوكارییان دەكردین...

## گەلەكەمان هەم لە باشووری رۆژئاوا و هەمیش لە لوبنان لەگەڵ چوونی سەرۆك و هەڤاڵان بۆ ئەوێ چۆن تەڤگەر دەناسن و پەیوەندی خۆیان لەگەڵ تەڤگەری (PKK) پێشدەخەن؟ تا چەند لەناو تەڤگەردا شوێنگیر دەبن و دەبنە هێزێكی سەرەكی بۆ تەڤگەر...؟

كاتێك سەرۆك چووە ئەو گۆڕەپانە، چ سوریا چ لوبنان چەندە پەیوەندی لەگەڵ پارت و تەڤگەرەكانی ئەوێ بەبنچینە وەردەگرت، ئەوەندەش لەناو گەلدا پەیوەندی پێشخستن و ئاواكردنی ڕێكخستنیشی بەبنچینە وەردەگرت، ئەگەر لەناو گەلدا كاری ڕێكخستنی پێشنەكەوتبایە، ئەوا مومكین نەبوو ئەوەندە دوور و درێژ لەو گۆڕەپانەدا بژیاینایە.

هەندێك كەس واتێدەگەن كە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت، پارت و تەڤگەرەكان و بەتوانست و هاوكاری ئەوانەوە ئێمە توانیمان لەوێ بژین و خەباتی خۆمان بەردەوام بكەین. ئەمە راست نییە، ئێمە چەندە لەگەڵ دەوڵەت و پارتی و تەڤگەرەكانی ئەوێ پەیوەندیمان پێشخست، لەبنەڕەتدا ئێمە زیاتر پەیوەندیمان لەگەڵ گەلەكەمان بەبناخە وەردەگرت. ئێمە دەمانزانی كە ئەگەر لەگەڵ گەلی خۆمان پەیوەندییەكی بەهێز نەبەستین و پێشنەخەین و گەل هوشیار نەكەینەوە و رێكخستەی نەكەین و رۆحی ئەو گەلە ڤازانج نەكەین و خۆمان لەناو گەلدا جێگیر نەكەین ئەوا ئێمە ناتوانین لەوێ بژین، ئەگەر لەوێش بژین ناتوانین بەسەربەخۆیی لەوێ بژین، ناتوانین ئازادی و سەربەخۆیی خۆمان، هەر لە ئایدیۆلۆژیاوە تا دەگاتە رێكخستنی بپارێزین. بۆیە ئێمە هوشیاركردنەوە و رێكخستەكردنی گەلی خۆمان لەوێ بەبنچینە وەرگرت. ئیدی ئەگەر بەها و پێگەی تەڤگەری (PKK) لەناو دەوڵەتەكان و پارتی و تەڤگەرەكاندا دروست بوو بەمە دروست بوو، ئەگەر ئێمە ئەو كارەمان بەبناخە وەرنەگرتبایە كەسێك ڤیمەتی نەدەدایە تەڤگەرەكەمان، ئەمە راستییەكی ئەم تەڤگەرەیە.

بێگومان كاتێك ئێمە تازە كەوتبووینە ئەم گۆڕەپانەوە وەكو گووتم؛ سەرۆك بەرێگەی خێزانێكەوە دەستیپێكرد و بە هەزاران خێزانی رێكخست، ئەمەی بەگرنگ دەزانی، ئەمە تەرز و رێبازی ئەم تەڤگەرەیە. رێبازی سەرۆك ئاپۆ بەتەواوی گەل بەبناخە وەردەگرێت، هوشیاركردنەوەی گەل، رێكخستەكردنی گەل، هێزی گەل لەهەموو رووێكەوە بەبنچینە وەردەگرێت. یەكێك گەل بەبنچینە وەرنەگرێت و لەناو گەلدا نەژیت و لەهەموو رووێكەوە گەل مەزن نەكات و بەسەرینەخات ناتوانێت ببێتە (PKK)یی. چونكە رێبازی (PKK) بەتەواوی ئەمە بەبنچینە وەردەگرێت. بۆیە ئێمە بچینە هەر جێگەیەك لەوێ پەیوەندی بەستن لەگەڵ گەل، جێگیربوون لەناو گەلدا، ڤازانجكردنی رۆحی گەل، ئاوێتەبوون لەگەڵ گەل لەهەموو رووێكەوە و پشتبەستن بەتوانستی گەل بەبنچینە وەردەگرین، ئەمە راستینەی ئەم تەڤگەرەیە، بۆیە كاتێك سەرۆكیش چووە ئەم گۆڕەپانە، نەك تەنیا پێشخستنی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت و پارتەكان و تەڤگەرەكانی بەبنچینە وەرگرتبێت، بەڵكو بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندییانە راست پێشبكەوێت و فشار و گوشاری مەزن لەسەر تەڤگەر دروست نەكەن و تەڤگەر

بتوانێت ئازادی و سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت، سەرۆك ڕێكخستەكردنی گەلی بەبنچینە وەرگرت. لەئاكامی ئەمەدا گەل قازانج كرا و لەوێ پەیوەندییەكان پێشكەوتن و هێندە دوور و درێژ لەم گۆڕەپانەدا ژیاین و تەڤگەرمان بەتوانستی ئەوێ مەزن كرد و بەرەو پێشەوە برد. ئەگەر وەها نەبایە، مومكین نەبوو بمانتوانیبایە لەو گۆڕەپانەدا هێندە كارمان بكردبایە و هێندە توانستمان بۆ تەڤگەر بئافراندبایە.

## پەراوێزەکان:

(١) ماهیر چایان: سەرۆکی بەرەی - پارتی - رزگاری گەلی تورکیا ( Türkiye Halk Kurtuluş Partisi-Cephesi) بوو. لە پێناو رزگارکردنی دەنیز گەزمیش و هاورێکانی لە لەسێدارەدان چوار تەکنیکاری ئینگلیزی دەرفێنن، هێزەکانی دەوڵەتیش لەبەرامبەر ئەوەدا دەست بە ئۆپەراسیۆنێکی گەورە دەکەن، لەئاکامدا لە(٣١)ی ئاداری(١٩٧٢)دا لەگەڵ نۆ لە هاورێکانی لە قزڵدەرە شەهید دەکرێن و هەر چوار تەکنیکارە ئینگلیزەکەش دەکوژرێن.

(٢) دەنیز گەزمیش: پێشەنگی ئەرتەشی رزگاری گەلی تورکیا ( Türkiye Halk Kurtuluş Ordusu) بوو. لەگەڵ دوو لە هاورێ سەرکردەکانی "یوسف ئەسڵان و حوسێن ئینان"دەستگیرکران و لە (٦)ی گوڵانی (١٩٧٢) لەزیندانی "ماماك" لەسێدارە دەدرێن.

(٣) ئیبراهیم کایپاك کایا: سەرۆکی ئارتەشی رزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی شۆرشگێری تورکیا (TİİKKO) بوو. لەئاکامی شەڕ و پێکدادانێکدا لە هەرێمی دێرسیم ساڵی (١٩٧٣) دا دەستگیرکرا و لە زیندانی دیاربەکردا لەژێر ئەشکەنجەدا لە (١٨)ی گوڵانی (١٩٧٣)دا شەهید دەکرێت.

(٤) پەرتووکی مانیفێستۆی کۆمۆنیزم پەرتووکی هەرە سەرەکی فیکری کۆمۆنیستییە. ئەم پەرتووکە لەنووسینی کارڵ مارکس و فریدیك ئەنگلسە.

(٥) مەبەستی سنووری نێوان باکووری کوردستان و تورکیایە، کە بە لای باکوردا شارەکانی عەنتاب، مەرعەش، مەلاتیا، سیواس ئەرزنجان، ئەلعەزیز تا دەگاتە دێرسیم دەگرێتەوە.

(٦) مەبەستی سنووری نێوان باکووری کوردستان و تورکیایە.

با بگەڕێینەوە سەر ڕەوشی ئەو کاتەی تورکیا؛ لە (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠)دا کودەتایەکی سەربازی ڕوودەدات، بۆچی ئەو کودەتایە بەرپا بوو و چی لەگەڵ خۆیدا هێنا و چی برد؟ هەروەها چ کاریگەرییەکی لەسەر تێکۆشانی تەڤگەری (PKK) کرد؟



ڕێبەر ئۆجەلان لە لوبناندا

ئەو کودەتایەی کە لە (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) ڕوویدا زۆر هۆکاری بەرپابوونی هەبوو؟ بەڵام ئامانجی بنەڕەتی ئەو کودەتایە تەسفیەکردنی تەڤگەری ئازادیخوازی گەلی کورد بوو، ئەمەی بەبنچینە وەرگرتبوو؛ ئەگەر ئەو تەڤگەرە تەسفیە نەکات ئەوا ناگاتە

ئامانجی خۆی. ئەو کودەتایە بەدەستی ئەمریکا ئەنجام درا، بۆ ئەوەی بتوانێت تورکیا بە سەلامەتی بهێڵێتەوە. چونکە لە ئێران حوکمی"شا" رووخابوو و ئەمریکا گورزێکی کوشندەی بەرکەوتبوو، لە ئەفغانستاندا سۆڤییەت تێکەوتبوو، ئەمە بۆ ئەمریکا گورز و کودەتا بوو. لە خۆرهەڵاتی ناویندا بەرەی لایەنگری سۆڤییەت بەهێز ببوو، لە تورکیاشدا تەڤگەری چەپی تورك و تەڤگەری ئازادیخوازی گەلی کوردستان لەنێو پێشکەوتنێکی مەزن دابوون و کێشەی جددی لەئارادا بوون. ئەگەر رێگری لەمانە نەکات ئەوا لەوانەیە تورکیاش لەدەستی دەربچێت، ئەو کاتە ئەمریکا و سیستەم (سیستەمی سەرمایەداری) زەبرێکی مەزنی بەردەکەوت، بۆ ئەوەی سیستەم زەبری بەرنەکەوێت، بۆ ئەوەی ئەو زەبرەی لە سیستەمیش کەوتووە بێکاریگەری بکات کودەتایەکی سەربازیان لە تورکیا پێشخست.

## دیارە ئامانجی ئەو کودەتایە فرە رەهەند بوو...

ئامانجی ئەو کودەتایە ئەوە بوو کە تەڤگەری ئازادیخوازی گەلی کوردستان تەسفیە بکات، تەڤگەری شۆڕشگێڕی چەپ لە تورکیا تەسفیە بکات، تاکو بتوانێت کێشە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی تورکیا پەردەپۆش بکات، تاکو بتوانێت ئەو بۆشاییەی بەرووخانی "شا" دروست بووە پڕبکاتەوە، بۆ ئەوەی کاریگەری شۆڕشی خەڵکی ئێران لەناوچەکەدا پێشنەکەوێت. هەروەها تاکو بتوانن لەدژی سۆڤییەت تەڤگەری ئیسلامی پێشبخەن. چونکە ئەو کاتە ستراتیژییەکی ئەمریکا هەبوو، دەیانگووت:" دروستکردنی پشتێنەی سەوز (الحزام الاخضر) لە باشووری سۆڤییەت" واتا لە باشوورەوە سۆڤییەت گەمارۆ بدەن، بۆ ئەوەی نەهێڵن سۆڤییەت زیاتر لە باشووردا پەلبهاوێژێت و بێتە خوارەوەتر و بگاتە خۆرهەڵاتی ناوین و ناوچەکانی دیکە، بۆ ئەوەی بتوانن کاریگەری سۆڤییەت کەمتر بکەنەوە و تەنگاوی بکەن و نەهێڵن سۆڤییەت زیاتر هەنگاو بهاوێژێت، ئیدی بەمەش بتوانن لە خۆرهەڵاتی ناویندا تەڤگەری چەپ و دیموکراتیخواز دابمرکێننەوە... دەیانخواست ئەمانە هەمووی بەدەستی تورکیا ئەنجام بدەن، تورکیاش لەلایەکەوە لەدژی شۆڕشگێڕان لەناو تورکیادا دەستیکرد بە گرتن و کوشتن، یاساکانی

خۆی گۆڕی، ئەشکەنجەی دژواری پەرەپێدا بۆ ئەوەی بتوانێت ئەنجامگیر ببێت و ناوخۆی ساخڵەم بکات، تاکو بتوانێت ئەو رۆڵەی لەلایەن ناتۆ و سیستەمی سەرمایەداری پێدراوە لەناوچەکەدا جێبەجێی بکات. بۆیە کودەتای (١٢)ی ئەیلول ئەشکەنجەی دژواری پێشخست، رەشبگیری و رەشەکوژی بەرفراوانی ئەنجامدا، پەرەیان بە لەسێدارەدان دا. واتا هەرچی کەسێکی دیموکراتیخواز و سۆسیالیست بووایە دەخرایە زیندانەوە، زۆر رێکخراو و رێکخستنی مەدەنی هەبوون، هەموویان داخران، پارتییەکان هەموویان داخران، وەحشیەتێکی مەزنیان پێشخست. ئەنجامی بنچینەییش تەسفیەکردنی تەڤگەری (PKK) بوو. بۆیە لە کوردستاندا وەحشیەتێکی زۆر مەزنتریان پەیرەو کرد، وەك بڵێی سەر لەنوێ سەربازییانە کوردستانیان داگیرکردبێتەوە وابوو، زۆر رەشەکوژی و رەشبگیری و ئەشکەنجە و تالانیان پەیرەو کرد، بۆ ئەوەی بتوانن بەتەواوی ئیرادەی گەل تێکبشکێنن و تەسلیمی وەربگرن.

بێگومان تەڤگەر پەیوەندی خۆی لەدەرەوە دروست کردبوو، هەندێك کادیری خۆی رەوانەی دەرەوە کردبوو، دەوڵەت بەمەی نەزانیبوو. پاشان دەوڵەت هەستی بەمە کرد، کاتێك کە گروپی هەڤاڵ "کەمال پیر" و ئەوان گەڕانەوە و هەڤاڵ "کەمال پیر" و ئەوان دەستگیر کران و هەندێك بەڵگە کەوتە دەست دووژمن، ئەو کاتە زانیان کە تەڤگەر پەیوەندی خۆی لەگەڵ خۆرهەڵاتی ناوین و فەلەستینییەکان پێشخستووە و گروپ چووە و پەروەردەی بینیوە و گەڕاوەتەوە و ئامادەکارییەك دەکات بۆ ئەوەی شەڕێکی گەریلایی ئەنجام بدات، ئەو کاتە لەمەسەلەکە تێگەیشتن و ئەمەیان زۆر بە مەترسیدار بینی، بۆیە یەکسەر کودەتای سەربازیان پێکهێنا.

لەبنچینەدا لەوانە بوو کودەتایەکە هەندێك درەنگتر روویدابایە، بەڵام کاتێك ئەو زانیارییانە کەوتە دەستی ئەوان، کودەتایان زووتر ئەنجام دا. چونکە ئەگەر درەنگتر بمێنن، ئەوا ئەو گروپەی پەروەردەی بینیوە و گەڕاوەتەوە لەوانەیە گەریلا رێکبخات و شەڕی گەریلایی دەستپێبکات. ئەو کاتەش پڕ درەنگ دەمێنن. بۆیە پێویستبوو یەکسەر موداخەلە بکەن و نەهێڵن شەڕی گەریلایی رێکخستە بکرێت و کودەتایان هێنایە پێشەوە و زۆر کەسیان دەستگیر کرد. لەبنەڕەتدا زۆربەی کادیرانی ئێمە کە دەستگیرکرابوون پێش کودەتاکە دەستگیر کرابوون، لەکودەتای (١٢)ی ئەیلولدا ئێمە

لەرووی کادیرەوە زێدە زەرەرمان نەبینی. چونکە ئەوەی گیرابوو ئەوا گیرابوو، ئەوانەی تریشمان دەرخستبووە دەرەوە. بۆیە دەستگیرکردنی هەڤالانی ئێمە دوای (١٢)ی ئەیلول کەم بوو.

بێگومان ژمارەیەکی زۆر کادیر لە زینداندا بوو، دەوڵەت خواستی کەوا لە زینداندا ئەو کادیرانە هەمووی تەسلیم وەربگرێت، ئەگەر هەموویان تەسلیم وەربگرێت، ئەوا تەڤگەر زەبرێکی مەزنی بەردەکەوێت و زێدە لەدژی ئەوان بەرخۆدان نامێنێت. بۆیە دەیخواست ئیرادەی ئەوانەی لە زیندانان بشکێنێت و تەسلیم بکات و لە شەخسی زیندانییەکانیشدا هەم تەڤگەر و هەمیش گەل تەسلیم بکات.

بەڵام زیندانیانی زیندانی ئامەد (دیاربەکر) لەدژی حوکمی(١٢)ی ئەیلول بەرخۆدانێکی مەزنیان پێشخست و نەیانهێشت ئەو حوکمە لە زینداندا ئەنجام بەدەستبخات. زیندانی ئامەد بووە قەڵای بەرخۆدان، ئیدی بەم بەرخۆدانە حوکمی (١٢)ی ئەیلول گورزێکی مەزنی بەرکەوت. یەکەمجار لەم زیندانەدا زەبری بەرکەوت و بێ ئەنجام مایەوە. بەڵام لە زیندانەکانی دیکەدا و لەدەرەوەی زیندانەکاندا بەئاسانی بەرنامەی خۆی بەڕێوە دەبرد، هەنگاوی دەهاوێشت و ئەنجامی بەدەست دەهێنا. تاکە شوێنێك کە ئەنجامی بەدەستنەخستبوو و دەیخواست تێیدا ئەنجامگیر ببێت و بەرنامەی خۆی تەواو بکات زیندانی ئامەد بوو. لەوێ ئەشکەنجەیەکی مەزنی بەڕێوە برد، تا ئەشکەنجەیشی مەزنتر دەکرد (PKK)ش بەرخۆدانی لە زیندانی ئامەد مەزنتر دەکرد. لەئاکامی ئەمەدا بەرخۆدانی (PKK) بەسەرکەوت، ئیدی بۆیە حوکمی(١٢)ی ئەیلول لەوێ گورزێکی مەزنی بەرکەوت.

لەلایەکەوە؛ حوکمی (١٢)ی ئەیلول هەوڵی دەدا لە تورکیا و لە کوردستان تەڤگەرەکان پەرشوبڵاوە پێبکات و تەسلیمیان بکات. بۆ ئەمەش هەموو شتێکیان گۆڕی، دەستووریشیان گۆڕی و دەستکاریان کرد و یاسای نوێیان دەرخست، پەرشوبڵاومیان بە ڕێکخستنەکان کرد، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە تەڤگەری کورد و چەپی تورکیش توانست و دەرفەتی خۆ ڕێکخستەکردنیان نەمێنێت. ئیدی سیاسەتێکی بەمجۆرەیان بەڕێوە دەبرد، بۆ ئەوان ناوەوە گرنگ بوو، ئەگەر بتوانن لەناوەوە ئەنجامگیر ببن ئەوا دەتوانن بەئاسانی لەدەرەوەش ئەنجامگیر ببن.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ سیاسەتێکی دیکەیان لەبەرامبەر ئەو شۆڕشگێڕانەی چووبوونە دەرەوەی تورکیا و کوردستان بەڕێوەدەبرد، ئەویش لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپادا پیلانێکیان دارشت کە چۆن ئەو کادیر و شۆڕشگێڕانەی چوونەتە دەرەوە رایانکێشنە ئەورووپا و لە ئەورووپاشدا مالّیی (دەستەمۆ)یان بکەن و رۆحی شۆڕشگێڕانەیان بکوژن، بۆ ئەوەی نەبنە مەترسی بۆ رژێمی تورکیا. ئەم ئەرکانەیان دابوو بە ژەنەراڵێکی تورك بەناوی "حەیدەر سالّتك"، ئەو ژەنەراڵە چووبووە ئەورووپا و لەسەر ئەم مەسەلەیە راوەستا و لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئەورووپا کارێکی بەمجۆرەیان بەڕێوەبرد، بۆ ئەوەی بتوانن تەڤگەری شۆڕشگێری لە تورکیا و کوردستان بەتەواوی تەسفیە بکەن و بێکاریگەریان بکەن، کارێکی بەمجۆرەیان بەڕێوە دەبرد...

**وا دیارە لە زیندانی ئامەددا دوو خەت بەڕێوە دەچوو"بەرخۆدان" و "تەسلیمییەت"، لەنێوان هەردوو خەتدا زیندان دەبێتە گۆڕەپانی یەکلاییبوونەوە و سەرکەوتن...لێرەدا ئەو بەرخۆدانەی بە هەڤاڵ مەزلوم دۆغان دەستیپێکرد و بەدوایدا زنجیرەیەك بەرخۆدانی دیکەش پێشدەکەوێت، چۆن شرۆڤە دەکەن و چ کاریگەرییەکی بەسەر خەبات و تێکۆشانی (PKK) و گەلی کورد دەبێت...؟**



کادیرانی (PKK) لەزینداندا لەکاتی دادگاییکردندا



کادیرانی (PKK) لەزینداندا

بێگومان لە زیندانی ئامەددا شەڕێکی مەزن بەڕێوە چوو، لەوێ هەم خیانەتی مەزن، هەمیش بەرخۆدانی مەزن روویدا... دەوڵەت هەندێك کەسیان تەسلیم کردبوو، وەك: "شاهین دونمەز" و "یڵدرم مەرکیت" و...هتد، بەرێگەی ئەوانەوە دەوڵەت دەیخواست بەتەواوی بەرخۆدان تێکبشکێنێت و تەسلیمییەت و خیانەت بالادەست بکات. "شاهین دونمەز" و "یڵدرم مەرکیت" هەر تەنیا دەستبەرداری تەڤگەر نەبوون و هەر تەنیا تەسلیم نەببوون و هەر تەنیاش خیانەتیان نەکردبوو، شانبەشانی ئەمە بەشدارییان لە ئەشکەنجەدانی هەڤالانیش دەکرد و ئەشکەنجەیان لەسەر هەڤالان بەڕێوە دەبرد، بۆ ئەوەی بتوانن بەرێگەی ئەوانەوە ئیرادەی هەڤالان بشکێنن. کە دەوڵەت و جەللادەکانی دەوڵەت ئەشکەنجەی هەڤالان بکەن زێدە کاریگەری خۆی نابێت، بەلام کاتێك کە هەڤالی خۆت و لەگەڵ خۆت دابوو خیانەتت لێدەکات و ئەشکەنجەت دەدات، داقورتاندنی ئەمە پڕ زەحمەت و مەترسیدارە. ئیدی دەوڵەتی تورکیا سیاسەتی خۆی لەو زیندانەدا هەمووی بە سەرپەرشتی ئەفسەرێکی تورك بەناوی "ئەسەد ئۆکتای یڵدران" بەڕێوە دەبرد، ئەو ئەفسەرەش "شاهین" و "یڵدرم"ی لەدژی هەڤالان بەکاردەهێنا. بەتایبەتی بەدەستی ئەوان ئەشکەنجەیان لە هەڤالان دەکرد، بۆیە زۆر زەحمەت بوو.

لەبەر ئەمەش بوو لەو زیندانەدا لەدژی ئەو خیانەتە و وەحشیەتە بەرخۆدانێکی مەزنیش کرا. لەوێ؛" یان تەسلیم ببیت یان بەرخۆدان بکەیت". ملیتانی (PKK) نەیدەتوانی تەسلیمییەت و خیانەت پەسند بکات، پێویستبوو لەدژی تەسلیمییەت و خیانەت و ئەشکەنجە بەرخۆدانیان بکردبایە و ئەم بەرخۆدانەیان بەسەر خستبایە.

ئیدی هەڤالان "**مەزلوم دۆغان، کەمال پیر، محەممەد خەیری دوورموش، فەرهاد کورتای** و...هتد" ئەو ئەرکە مێژووییەیان جێبەجێکرد. چونکە بینیان کە ئەگەر لەدژی ئەم وەحشیەتە رانەوەستن و ئەو تەسلیمییەتە نەشکێنن، ئەوا هەم تەڤگەر و هەم گەلیش و هەمیش خۆیان زەبرێکی مەزنیان بەردەکەوێت. بینیان کە توانستی خۆشیان زێدە نییە کە لەدژی ئەو تەسلیمییەتە رابوەستن، تەنیا گیانیان هەیە، وەکوتر هیچ شتێکی دیکەیان نییە، ئیدی بەگیانی خۆیان لەدژی ئەو تەسلیمییەت و خیانەتە راوەستاون. ئەگەر هەڤاڵ "**مەزلوم دۆغان**" لەیەکەم رۆژی نەورۆزی ساڵی (١٩٨٢)خۆی سووتاند، ئەگەر هەڤالان" **"فەرهاد" کورتای، ئەشرەف ئانیك، مەحموود زەنگین، ئەجمی ئۆنەر**"

لە شەوی (١٨)ی (٥)ی ساڵی (١٩٨٢)دا خۆیان سووتاند، ئەگەر پاشان هەڤاڵان " **کەماڵ پیر، محەمەد خەیری دوورموش ، عاکف یڵماز، عەلی چیچەك**" لەرۆژی (١٤)ی تەممورزی ساڵی (١٩٨٢)دا مانگرتن لەخواردنیان تا مردن دەستپێکرد، ئەمە هەمووی لەپێناو ئەوە بوو کە بتوانن لەوێ بەرخۆدان پێشبخەن و سەربخەن و نەهێڵن کە تەسلیمیەت باڵادەست ببێت، لەم پێناوەدا بوو. بۆیە ئەرکێکی مێژووییان خستە پێش خۆیان و جێبەجێیان کرد.

کاتێك کە ئەو چالاکییانەیان پێشخست تەعلیماتیان لە کەس وەرنەگرت، رێنماییان لە کەس وەرنەگرت، توانستی ئەوەش نەبوو کە تەعلیمات و رێنمایی وەربگرن. چونکە پەیوەندییان لەگەڵ پارتی پچڕابوو، دووژمن نەیدەهێشت کە نە لەگەڵ لەدەرەوە پەیوەندی ببەستن و نە لەدەرەوەش پەیوەندییان لەگەڵ ببەسترێت، هەموو پەیوەندییەك بەتەواوی پچڕابوو. هەڵبەتە بەمشێوەیە دەیانخواست ئیرادەیان بشکێنن و تەسلیمیان بکرن. ئیدی ئەم هەڤاڵانە ئەو مەترسییەیان بینی و لەدژی ئەو مەترسییە چۆن رابوەستن، پێداویستی تەڤگەر لەوێ چییە؟ پێداویستی گەل لەوێ چییە؟ ئەوەیان دەستنیشانکرد، بۆ ئەوەی ئەو پێداویستییانە جێبەجێ بکەن ئەرکیان خستە پێش خۆیانەوە و ئەو ئەرکەیان پێکهێنا. ئەگەر ئەو چالاکییانەیان پێشخست بۆ ئەم مەبەستە بوو، بۆ ئەوەی بتوانن پێداویستی تەڤگەر پێکبێنن و ئامانجی تەڤگەر بەدیبێت و ئامانجی داگیرکەران نەیەتەدی.

لەبنەڕەتدا ئەو چالاکییانە ئەنجامی مەزنیان بەدەستخست، ئەوە ملیتانێتی (PKK) بوو لەپراکتیکدا، پێکهێنانی راستینەی سەرۆك ئاپۆ و رێبازی (PKK)بوو، هەڵبەتە لەبەر ئەمەش بوو لەوێ بەرخۆدانێکی مەزن پێشکەوت، لەوێ ئەو تەسلیمییەتەی کەوا دووژمن خستبوویە پێش گەلی کورد پووچەڵ بووەوە. لەوێ کودەتای (١٢)ی ئەیلول گورزێکی کوشندەی بەرکەوت. پرۆگرامی (١٢)ی ئەیلول لەوێ گورزی بەرکەوت و ئیدی بووە هۆکاری ئەوەی ئەو کودەتایە تێك بچێت و ئەنجامگیر نەبێت.

بۆیە بەرخۆدانی ئەو هەڤاڵانە بەرخۆدانێکی مێژووییە، حوکمی فاشیستی سەرەتا لە زیندانی ئامەد گورزی بەرکەوت. پاشان دوای ئەمە نەیتوانی خۆی کۆبکاتەوە سەریەك؛ تا دەهات کودەتای (١٢)ی ئەیلول هەنگاوی بۆدواوە هاوێشت، ئەم چالاکییانە جارێکی

دیکە ڕێی پێشکەوتنی دیموکراسییەت و حوکمی مەدەنی لە تورکیا کردەوە، بۆیە بەرخۆدانێکی مێژوویی بوو و ڕۆڵێکی مەزنی بینی. ئەو بەرخۆدانە ڕاستینەی ملیتانێتی (PKK)ی لەهەموو ڕوویەکەوە خستەڕوو، هەندێك پێوانەی خستەڕوو. ئیدی پێویستە ملیتانێتی لەسەر ئەو پێوەرانە پێشبکەوێت، بە پێوانەی لەمە ژێرتر و نزمتر ملیتانێتی نابێت هەبێت، لەبەر ئەمە " مەزلوم، فەرهاد، کەمال و خەیری" و هەڤالانی دیکە هەم لەناو (PKK)دا و هەمیش لەناو گەلی کورددا جێگەیەکی مەزنیان گرت، گەل و تەڤگەریش ئەو پێوانانەی ئەو هەڤالانە ئافراندیان بەبنەما وەرگرت، ئەو پێوانانە نوێ بوون، پێوانەی مەزن بوون، ئەگەر تۆ ئەو پێوانانەت بەبنەما وەرگرت، ئەوا تۆ دەتوانیت لەدژی خیانەت و تەسلیمییەت و داگیرکەریدا بەرخۆدان بەرەو پێشەوە ببەیت و بەهێزی بکەیت و ئەنجامگیر ببیت، ئیدی بە بەرخۆدانی ئەو هەڤالانە مێژوویێکی نوێ نووسرایەوە، مێژووی بەرخۆدان نووسرایەوە.

بۆ هەر تەڤگەرێك زیندانەکان گرنگن، ڕاستینەی هەر تەڤگەرێك لە زیندانەکاندا ئاشکرا دەبێت، ڕاستینەی کادیر لە زینداندا ئاشکرا دەبێت، ئەگەر تەڤگەرێك لە زیندانەکاندا بەرخۆدانی بەهێزکرد، ئەوا هەر کەس بەو تەڤگەرە باوەڕ دەکات، ئەگەر تەڤگەرێك خۆی لە زیندانەکاندا نەسەلمێنێت و بەرخۆدانی مەزن پێشنەخات، ناتوانێت بیر و باوەڕی خۆی بە گەل ببەخشێت، ناتوانێت دڵی گەل قازانج بکات، ئەگەر (PKK) لە زیندانی ئامەددا بەرخۆدانێکی وەها مەزنی نەکردایە، گورزێکی مەزنی لە داگیرکەری نەخستبایە، باوەڕییەکی بۆ گەل نە ئافراندبایە، هیچ کاتێك گەل باوەڕی بە (PKK) نەدەکرد و (PKK)ش هێندە پێشنەدەکەوت. ئەگەر ئەو بەرخۆدانە پێشنەکەوتبایە و لەشوێنیدا تەسلیمییەت پێشبکەوتبایە، هیچ کاتێك قەڵەمبازی (PKK)ی ئاب، ئەو بەرخۆدانە مەزنەش پێشنەدەکەوت. لەوانەبوو تەڤگەر هەر لەوێ زەبرێکی مەزنی خواردبایە و کۆتایی پێهاتبایە و تێکچووبایە.

ئیدی لە تەواوی زیندانەکانی تورکیا و باکووری کوردستان و لەژێر وەحشییەتێکی مەزندا هەموو زیندانەکان تەسلیم بوون، هەموو ڕێکخستن و لایەنەکان تەسلیم بوون، تەنیا (PKK) تەسلیم نەبوو، زیندانی ئامەد تەسلیم نەبوو، بەرخۆدانێکی مەزنی نواند و ئەنجامگیربوو، ئەمە کاریگەری لەسەر هەموو زیندانەکانی دیکەش کرد. پاشان

زیندانەکانی دیکەش کەوتنە نێو بەرخۆدانەوە، ئەمە کاریگەرییەکی لەسەر گەل کرد، وایکرد گەلیش بەرخۆدان بکات. ئیدی بەرخۆدانەکانی "مەزلوم، فەرهاد، خەیری، کەمال" و هەڤاڵەکانی دیکە بووە هۆی ئەوەی لەنێو زیندانەکان و دەرەوەی زیندانەکاندا بەرخۆدان پێشبکەوێت و تەسلیمییەت روونەدات. تا ئەو کاتە تەسلیمییەت و خیانەتکاری روویدەدا و کودەتای (١٢)ی ئەیلول بەئاسانی بەرنامەی خۆی بەڕێوەدەبرد. لەو باوەڕەش دابوو کە دەتوانێت بەئاسانی ئەنجام بەدەستبخات. ئیدی بەرخۆدانی"مەزلوم، خەیری، کەمال و فەرهاد" و هەڤاڵەکانی دیکە گورزێکی مەزنی لەو کودەتایە دا و رێگیری لەسەرکەوتنی کرد، ئەو پێڤاژۆیەی پێچەوانە کردەوە. تا ئەو کاتە تەسلیمییەت پێشدەکەوت، لەوێ کە بەرخۆدان دەستپێکرد و لە زیندانەکانی دیکە و لەنێو گەلدا بەرخۆدان پێشکەوت، باوەڕییەك بە تەڤگەر پێشکەوت، کەسەکان باوەڕییان بەخۆیان هێنا کە دەتوانن لەدژی حوکمی فاشیستی رابوەستن. هەر بۆیە حوکمی فاشیستی تا دەهات بۆ دواوە گەڕایەوە و ناچار بوو رێگەی حوکمی مەدەنی کردەوە. ئەگەر ئەم بەرخۆدانە نەبووایە مومکین نەبوو رێگیری لەسەرکەوتنی ئەم کودەتایە بکرێت.

## وەکو باست کرد؛ لەدوای بەرخۆدانەکەی هەڤاڵ مەزلوم دۆغان هەڤاڵان "فەرهاد کورتای، ئەشرەف ئانیك، مەحمود زەنگین، ئەجمی ئۆنەر" بەشێوەیەکی دیکە درێژە بە بەرخۆدان دەدەن، بەیەکەوە گڕ لەجەستەی خۆیان بەردەدەن...ئەو پەیامەی هەڤاڵ فەرهاد کورتای و هەڤاڵانی بە چالاکییەکەی خۆیان بەخشیان چیبوو؟

لەبنەڕەتدا پەیامی بەرخۆدان هەڤاڵ "مەزلوم" بەخشی، لە نەورۆزدا دژی ئەو زوڵم و وەحشییەتەی ئاگری لەجەستەی خۆی بەردا، سەرۆکایەتی بەرخۆدانی کرد. هەڤاڵ "مەزلوم دۆغان" ئەندامی کۆمیتە ناوەندی بوو، بەو چالاکییە پێشەنگایەتی بەرخۆدانی کرد و لەخۆیەوە دەستپێکرد. هەڵبەتە پێشەنگایەتیش هەر ئەمەیە، واتا

نەیگووت:" با هەڤاڵێکی دیکە خۆی بسووتێنێت یان چالاکییەك ئەنجام بدات" ئەگەر بەهەر هەڤاڵێکی بگووتبایە ئەو هەڤاڵەش ئەوەی دەکرد. بەڵام بەخۆی و لەخۆیەوە دەستیپێکرد، بۆچی لەخۆیەوە دەستیپێکرد؟ چونکە ئەو وەحشییەتەی لەسەر ئەو ئەنجام دەدرا زۆر مەزن بوو، ئەگەر هەمان ئەو چالاکییەی هەڤاڵ "مەزڵوم" ئەنجامی دابوو هەڤاڵێکی دیکە ئەنجامی بدابایە و بیانگووتبایە ئەو چالاکییەی ئەنجام داوە، ئەوا ئەوەندە کاریگەری خۆی لەسەر کادیر نەدەبوو، ئەگەر هەڤاڵ "مەزڵوم" خۆی ئەو چالاکییەی ئەنجام دا، بۆ ئەوەبوو کە کاریگەرییەك لەسەر هەموو کادیران لەدژی تەسلیمییەت دروست ببێت و بەرخۆدان بەهێزەوە ئەنجام بدرێت، بۆیە چالاکییەکەی لەخۆیەوە دەستپێکرد. ئەمە لەبەر ئەو هۆیە بوو. هەروەها کولتوورێکی ئەم تەڤگەرە هەبوو، لە کولتووری ئەم تەڤگەرەدا، بەرپرسیارێتی تۆ چەندە مەزن بێت دەبێت پراکتیکی تۆش هێندە مەزن بێت، ئەمە کولتوور و ئەخلاقێکی ئەم تەڤگەرە بوو، لەوێش بەرپرسیار هەڤاڵان "مەزڵوم دۆغان، کەمال و خەیری" بوون. چونکە ئەوانە هەڤاڵی مەرکەزی بوون، پێویستبوو بەرخۆدان لەوێ لەژێر بەرپرسیارێتی ئەو هەڤاڵانەدا پێشبکەوتبایە، بەرپرسیارێتیش ئەمە دەخوازێت، پێویستە ئەوانە لەهەر کەسێکی دیکە زیاتر لەدژی ئەو زوڵم و ئەشکەنجە و وەحشییەتە رابوەستن، لەپراکتیکیشدا پێشەنگایەتی بکەن، بۆ ئەوەی کادیران ئەمە ببینن و هێز و وزە وەربگرن، تاکو کادیرانیش بتوانن بەرخۆدان بکەن. هەڵبەتە ئەو هەڤاڵانە لە زینداندا لەهەموو بەرخۆدانەکاندا بەشدارییان تێدا کرد، هەر بۆیە کادیرانیش لەدژی ئەو وەحشییەتەی بەرێوە دەبردرا تەسلیم نەبوون و بەردەوام لەنێو بەرخۆداندا مانەوە، بەڵام داگیرکەر ئەشکەنجە و زوڵم و وەحشییەتێکی وەهایان پێشخست، ئیدی ئیرادەی مرۆڤ نەیدەتوانی تەحەمووڵی بکات، لە ئاستێکی وەهادا وەحشییەتیان ئەنجام دەدا، لەدژی ئەمە مەگەر تەنیا لە ئاستێکی پێشەنگیدا تۆ بتوانیت لەدژی رابوەستیت، ئینجا دەتوانیت رێ لەپێش ئەو وەحشییەتە بگریت، ئەگەرنا زەحمەت بوو تۆ بتوانیت رێ لەپێش ئەو وەحشییەتەدا بگریت، ئیدی لەبەر ئەوەبوو هەڤاڵ "مەزڵوم دۆغان" بۆ خۆی ئەو چالاکییەی ئەنجام دا.

بێگومان کاتێك هەڤاڵ "مەزڵوم" ئەو چالاکییەی ئەنجام دا کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر هەڤالان کرد. هەر بۆیە هەڤاڵ "فەرهاد کورتای" و هەڤالانی دیکە بەدوایدا چالاکییەکەیان ئەنجام دا. تاوەکو ئەو بەرخۆدانە بەهێزتر و بۆ پێشەوەتری ببەن، هەر بۆیە هەر چوار هەڤاڵیش خۆیان سووتاند.

کاتێك ئەو چالاکییە ئەنجام درا هەڤاڵ "کەمال پیر" دەڵێت:" لەبنەڕەتدا ئەو چالاکییەی کە ئەو هەڤالانە ئەنجامیان دا دەبووایە ئێمە ئەنجامامان دابایە" لێرەدا بەمشێوەیە رەخنەدانی خۆیشی دەدات، بەرەخنەدان لەئەرك نزیك دەبێتەوە، دەڵێت:" ئێمە درەنگ ماوین" هەر بۆیە هەڤالان "کەمال پیر، محەمەد خەیری، عاکف یلماز و عەلی چیچەك"یش دەست بەچالاکی دەکەن. بەمەش بڕیاربوونێکی مەزن، ئیرادەیەکی مەزن دەردەکەوێتە روو، دەوڵەت دەبینێت کە چەندە وەحشییەتێکی مەزنی ئەنجام دا و لەئاستی هەرە بەرزدا بەڕێوە برد، وەحشییەتی لەمە ئاست بەرزتر نییە برێوەی ببات، کەچی بەرخۆدانێکی بەهێزی لێکەوتەوە و ئەو وەحشییەتەی پووچەڵکردەوە.

دەوڵەت بینی کە ئیدی ناتوانێت شتێکی دیکە ئەنجام بدات، ئەو وەحشییەتەی ئەنجامی بدابایە ئەنجامی دا، کەچی بەرخۆدانێکی مەزن لەدژی ئەمە پێشکەوت. بێگومان کە هەڤالان بەدوای یەکدا خۆیان سووتاند و کەوتنە چالاکی مانگرتنی بێکۆتاییەوە، وەك بچنە ئاهەنگ بەرەو مەرگ دەچوون، دەوڵەت زۆر لەمە ترسا و پەیامێکی وەرگرت، چونکە ئەگەر یەکێك بەمجۆرە خۆی بسووتێنێت و گیانی خۆی فیدا بکات، ئەوا دەتوانێت هەموو شتێك ئەنجام بدات، دەوڵەت بینی کە هەرچی وەحشییەت و ئەشکەنجە هەیە ئیرادەیان ناشکێنێت. تەواو بە پێچەوانەی ئەمە ئەو وەحشییەتە دەبێتە هۆی ئەوەی بەرخۆدان مەزنتر ببێت، دەوڵەت ئەمەی بینی، ئەوەی بیکردبایە ئەوا کردی، ئیدی شتێکی دیکە لەبەرامبەر هەڤالان پەیڕەو بکات نەمابوو، بەلام بەرخودان بەهێزەوە ئەنجام درا، بۆیە هیوای دەوڵەت شکا.

ئیدی ئەمە راستینەی (PKK) بوو ژیا، چونکە لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای (PKK)دا ئەشکەنجە چەندە دژوار بێت، وەحشییەت چەندە مەزن بێت، پێویستە ببێتە هۆی بەرخۆدانی مەزن، ئیدی لە زیندانی ئامەددا هەڤالان "مەزڵوم، خەیری، کەمال و فەرهاد" و هەڤالانی دیکە ئەمەیان پێکهێنا، واتا ئەو ئەشکەنجە و زوڵم و وەحشییەتەی

لەبەرامبەریان دەگرێت، نەیانکردە بەهانەیەك کەوا دەستبەرداری لە پارتی و گەل بکەن، حەسانەوەیان نەدایە پێش خۆیان... بەڵکو ئەمەیان کردە هۆی ئەوەی وەحشییەت و ئەشکەنجە لەگۆڕ بنێن و مرۆڤایەتی هەستێننە سەرپێیان، ئیدی لەبەر ئەمە بەرخۆدانێکی مەزن پێشکەوت و کودەتای (١٢)ی ئەیلول لەوێ گورزێکی مەزنی بەرکەوت...

# دەرچوون لەگێژاوی خۆرهەلاتی ناوین... گەڕانەوە بۆ وڵات

لەساڵی(١٩٨١)دا بۆ جاری یەکەم بوو کۆنفرانسێکی (PKK) سازدەکرێت، دوای ئەوەی هەندێك هەفاڵ لە دەرەوەی وڵات پەروەردە دەبینن و سەرۆکیش لە دەرەوەی وڵاتە، زۆربەی هەڤاڵانیش لە زیندان دان و بەرخۆدان دەکەن، لەرەوشێکی بەمجۆرەدا کۆنفرانس سازدەدرێت. ئەم کۆنفرانسە لەمێژووی (PKK)دا شوێنگەیەکی چۆن دەگرێت؟ هەروەها ئەو چەمك و بڕیارانەی لەو کۆنفرانسەدا وەردەگیرێن چ کاریگەرییەکی لەسەر خەبات و تێکۆشانی تەڤگەری (PKK) دەکات؟



شه‌هید عه‌لی چیچه‌ك



شه‌هید عاكف یلماز

وه‌ك ده‌زانرێت؛ یه‌كه‌مین كۆنفرانسی (PKK) له‌ لوبنان له‌ كامپی به‌ره‌ی دیموكراتی **رزگاری فه‌له‌ستین** (الجبهة الديمقراطية لتحرير فلسطين)(١) سازدرا، پاشان ئێمه‌ ئه‌و شوێنه‌مان

کردە " ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز". بێگومان سازدانی ئەم کۆنفرانسە لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا شوێنگە و رۆڵێکی مەزنی خۆی هەیە.
لەمێژوودا زۆر تەڤگەر هیجرەت (کۆچ) یان کردووە، چوونەتە دەرەوەی وڵات، بۆ ئەوەی هەندێك ئامانج بەدیبهێنن، بەڵام ئەو تەڤگەرانە جارێکی دیکە نەگەڕاونەتەوە وڵات و تەسفیە بوونە، لەدەرەوە ماونەتەوە و مارژینالّ بوونە، بێکاریگەر ماونەتەوە، ئەوەی لەدەرەوە مارژینالّ و پەناهەندە نەبووە و جارێکی دیکە گەڕاونەتەوە وڵات، هەم بەردەوام بوونە و هەمیش ئەنجامیان بەدیهێناوە. بۆچی چوونە دەرەوە و هیجرەت روویداوە؟ ئەگەر تەنگەتاوی و مەترسی مەزن لەئارادا بن هیجرەتیش روودەدات، بۆ ئەوەی رێگیری لەپێش ئەو تەنگەتاوی و مەترسیانە بکرێت هیجرەتیش روودەدات. لەمێژوودا زۆر نموونەی بەمجۆرە هەن. بۆ نموونە "حەزرەتی محەمەد"یش هیجرەتی کردووە. بۆچی؟ چونکە رووبەڕووی مەترسییەکی مەزن بۆتەوە، بۆ ئەوەی رێگیری لەم مەترسییە بکات و بتوانێت بەردەوامی بە تەڤگەرەکەی خۆی بدات هیجرەتی کردووە. ئەو هیجرەتەش ئەنجامگیر بووە. ئیدی ئیسلامییەتی بەسەرخستووە. ئەگەر ئەو هیجرەتە نەبووایە ئەوا "حەزرەتی محەمەد"یش نەدەما و ئیسلامییەتیش کۆتایی پێدەهات، کەواتە هیجرەت بۆ ئەمە گرنگە.
کاتێك کە سەرۆکیش چووە دەرەوە هەنگاوێکی بەمجۆرەی هاوێشت، تەڤگەر زۆر تەنگاو ببوو، کێشەی مەزنی تەڤگەر هەبوو، نەیدەتوانی لە وڵات چارەسەریان بکات، زێدە پێداگریکردن لەسەر مانەوە لە وڵات، لەوانەبوو تەڤگەر تەسفیە ببایە. ئیدی بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات، سەرۆك ئەو هەنگاوەی هاوێشت، کاتێك ئەو هەنگاوەیشی هاوێشت لەسەر توانستێك نەیهاوێشت، توانست زێدە نەبوو، وەکو ئەوە وابوو تۆ لەشەوە زەنگێکدا هەنگاو بهاوێژیت، کۆتاییەکەی چ دەبێت دیار نییە. واتا لەوانەبوو لەم دەرکەوتنەدا جارێکی دیکەش گەڕانەوە نەبێت، لەم دەرکەوتنەدا لەناویش بچێت، یان لەدوای دەرکەوتنندا مرۆڤ ببێتە پەناهەندەش... واتا هەموو شتێك مومکین بوو، ئیدی سەرۆك بۆ ئەوەی هەم لەناو نەچێت هەمیش مارژینالّ نەبێت، هەم نەبێتە پەناهەندە، هەمیش بتوانێت بۆ تەڤگەر توانست بئافرێنێت و تەڤگەر لەو توانستانە سوودمەند بێت و بتوانێت جارێکی دیکە خۆی کۆبکاتەوە سەریەك، تاکو بتوانێت کێشەکانی خۆی

له وڵات چارەسەر بكات ئەو هەنگاوەی هاوێشت و لەسەر بنەمای ئەو ئامانجانە هەمیشە بەهەستیارییەوە هەنگاوی هاوێشت.

لەئاكامی ئەوەدا ئێمە گەیشتینە كۆنفرانسی یەكەم. ئیدی گرنگێتی كۆبوونەوە لە كۆنفرانسی یەكەم چیبوو؟ بەو مانایە دەهات كە ئەو هەنگاوەی ئێمە لە هیجرەتدا هاوێشتبوومان ئیدی گەشتبووە كۆتایی. هیجرەت تەواو ببوو، ئیدی پێویستبوو گەڕانەوە بۆ وڵات ئەنجام بدرێت. بۆیە ئەو هەنگاوەی بۆ دەرەوەی وڵات ئەنجام درابوو ئەنجامێكی باشی دابوو، مەترسی رووینەدەدا. لەم هەنگاوەدا زۆر توانستمان بەدەستخستبوو، تەڤگەر چەندین كێشەی خۆی چارەسەر كردبوو و خۆی كۆكردبووەوە سەریەك. ئیدی لەكۆنفراسەكەدا رووی خۆی دەدایە وڵات، تاكو هەنگاوێك لە وڵاتدا بهاوێژێت. بۆیە ئەم كۆنفرانسە كۆنفرانسێكی مێژوویی بوو و رۆڵێكی گرنگی مێژوویی پێكهێنا.

لەم كۆنفرانسەدا دەركەوت كە ئەو شتەی لەمێژوودا بەسەر زۆر تەڤگەردا هاتووە بەسەر ئەم تەڤگەرە نەهاتووە، كۆنفرانسەكە گوزارشتی لەمە دەكرد. بێگومان تا سازدانی كۆنفرانسەكە زۆر خەبات كرابوون لەرووی سیاسی، ئایدیۆلۆژی، عەسكەری، رێكخستنی، دیپلۆماسییەوە. لەئاكامی ئەو خەباتانەدا یەكلایی بوونەوەیەك و بە بڕیاربوونێك و پێشكەوتنێك لە كادیراندا بەدیهاتبوو. چەمكە هەڵەكان هەمووی بەلاوە نرابوو، كادیر خۆی كۆكردبۆوە سەریەك، تەڤگەریش خۆی كۆكردبۆوە سەریەك. لەسەر ئەو بنەمایە كۆنفرانس سازدرا.

لەو كاتەوەی ئێمە دەركەوتبووینە دەرەوەی وڵات تا سازدانی كۆنفرانسەكە تەڤگەر لەناوخۆیدا لەنێو زۆر كێشەدا دەژیا. چونكە كاتێك كادیرانمان بۆ دەرەوە دەرخست، لە كادیراندا چەندین چەمك هەبوو، پەرشوبڵاوییەك لەئارا دابوو، لە هەندێكیاندا ئیرادە شكابوو، هەندێكیان واتێدەگەیشتن كە ئیدی ئێمە ناگەڕێینەوە وڵات، گەڕانەوە بۆ وڵات مومكین نییە. چونكە كودەتای (١٢)ی ئەیلولیش روویدا بوو، هەندێكیان دەیانگووت:" وەحشییەتێكی مەزن لە توركیادا هەیە، تەڤگەرەكان هەموویان زەبریان بەركەوتووە، بۆیە ئیدی زەحمەتە ئێمە بگەڕێینەوە وڵات" لە هەندێكیاندا ئەم چەمكە هەبوو، ئیدی ئێمە هەر لە دەرەوە دەمێنینەوە... لەهەندێكیشیاندا كاتێك لەژێر زوڵمی دەوڵەتی

توركیـادا دەركەوتنــە دەرەوەی وڵات، لــەنێو پراكتیكێكــی پــڕ دژواردا دەركــەوتبوون، گووتیان:" ئیدی بۆ خۆمان لێرە هەناسەیەك هەڵدەمژین" بـەمجۆرە دەستیان لـەخۆیان بەردا" و دەیانگووت:" ئیدی مەترسی نەماوە و لەژێر ئەو پراكتیكە دژوارە دەركەوتین، با هەنـدێك بۆخۆمـان بحەسـێینەوە" چـەمكێكی بـەمجۆرە لەهەنـدێكیانـدا هـەبوو، بۆیـە ژیانبوون لەسەر ئەو توانستەی هەیە و بیرنەكردنەوە لەهیچ شتێكی دیكە، هەبوو.

ئیدی لەهەندێكی تریاندا ئەوە هەبوو كە دەیانگووت:" لوبنانیش مەترسیدارە" چونكە ئەو كاتە لە لوبنانیش شەڕ هەبوو، مەترسیدار بـوو، رێكخستنە شۆڕشگێڕەكانی توركیـا هەموویان روویان لە ئـەوروپا كردبـوو، لـەناو ئێمەشدا هەنـدێك هـەبوون دەیـانگووت:" لوبنان مەترسیدارە، ئێمە لێـرە چیبكەین؟ ئێمـە ئیـدی نـاتوانین بچینەوە وڵاتـیش، بـا ئێمـەش بـچینە ئــەوروپا، تــا لــە توركیــادا رەوش دەگۆڕدرێــت". هەنــدێكیان ئەمــەیان بەبنـچینە وەردەگـرت. هەنـدێكی تـریش دەیـانگووت:" ئێمـە دەركەوتووینەتـە دەرەوەی وڵات و پەروەردەیەك دەبینین و دیسان دەگەڕێینـەوە وڵات و كـار و خـەباتی خۆمـان لـە وڵات بـەردەوام دەكـەین، ئێمـە زێـدە لێـرە (لوبنـان) نامێنینـەوە" لـە هەندێكیانـدا ئـەم چەمكە هەبوو. لە هەندێكی تریشدا ئەوە هەبوو دەیانگووت:" دەوڵەت ئەوەندە زوڵم و ئەشكەنجە دەكات و لە زیندانەكاندا وەحـشییەت بەرێوە دەچێت، بـا هەنـدێك فڕۆكـەی توركیا بڕفێنین یان هەندێك سەفیر و كونـسوڵخانەی توركیـا بارمتـە بگـرین، بـۆ ئـەوەی بتـوانین رێگـیری لـەو وەحـشییەت و لـەو لەسـێدارەدانە بكـەین و هـەڤاڵان لەمـە رزگـار بكـەین " چـونكە ئـەو كاتــە دەسـت بـە لەسـێدارەدان كرابـوو، بـۆ هـەڤاڵانیش بڕیـاری لەسێدارەدانیان دەدا، بەمەش لەسێدارەدان زۆر پێشدەكەوت. هەنـدێك كـادیریش كـە لـە هەڵوێـست و نزیكبوونــەوەی فەلەســتینییەكانیان دەڕوانــی، بــە كاردانــەوە (ردفعــل) هەڵسوكەوتیان دەكـرد و دەیـانگووت:" ئێمـە بۆچـی هاتووینەتـە ئێـرە؟ رەوشـی دەرەوە چییە؟ ئـەو پەیوەندییانـە چـۆن دروسـتبووە؟ ئـەو توانـستە چـۆن ئـافرێنراوە؟ مـرۆڤ پێویستە چۆن لێی نزیك ببێتەوە؟ لەو مەسەلانە تێنەدەگەیشتن، زۆر شتیان لەدەرەوەی چەمكی خۆیان دەبینی و بە كاردانەوە نزیك دەبوونەوە.

هەروەها زۆر لایەن و رێكخستن دەیانخواست لـەو رەوشـەی ئێمـە تێیـدا دەژیـاین سـوود وەربگرن و لەسەر ئێمە فشار دروست بكەن بۆ ئەوەی دەستبەرداری ئازادی خۆمان ببین

و بکەوینە خزمەتی ئەوانەوە. لەناو فەلەستینییەکانیشدا هەندێکیان دەیانخواست ئێمە بکەنە عەسکەری خۆیان و بۆ خۆیان بمانخەنە نێوشەڕی خۆیانەوە، هەندێك لەنێو تەڤگەری فەلەستینی لەسەر ئێمە لەگەڵ تورکیا پەیوەندییان دەبەست و وەك ئەوەی ئێمە ببینە کاڵای بازرگانیکردن بازرگانییان بەئێمە دەکرد. هەوڵیان دەدا هەندێك توانست لە تورکیا بەدەستبخەن. تورکیاش بەوانی دەگووت:" پێویستە ئێوە نەهێڵن ئەوانە جارێکی دیکە بگەڕێنەوە تورکیا". ئەوانیش دەیانگووت:" پێویستە ئێوەش دان بەئێمەدا بنێن و رێگە بدەن نووسینگە لە تورکیادا بکەینەوە..." بەمشێوەیە لەسەر ئێمە سەودا و مامەڵەیان دەکرد.

لەلایەکی دیکەوە؛ تورکیا هەندێك سیخوڕی خۆی ناردبووە لوبنان بۆ ئەوەی لەکامپەکاندا زەبر لە ئێمە بوەشێنن. بۆیە لەنێو کادیراندا زۆر چەمکی هەڵە هەبوو، ئیرادە لاواز ببوو یان شکابوو، یان بەگوێرەی خۆیان ژیانکردن هەبوو.

بێگومان سەرۆك لەبەرامبەر هەموو ئەو چەمکانەدا شەڕی کرد، ئەو چەمکە هەڵانەی هەموو خستەڕوو و تێیگەیاندن و کادیرانی بۆ لای چەمکی تەڤگەر راکێشا و جارێکی دیکە رووی کادیرانی ئاراستەی تەڤگەر کردەوە، بۆ لای کولتوور و ئەخلاق و ژیان و ئامانج و ئایدیۆلۆژیای تەڤگەر ئاراستگیر کردەوە. بێگومان هەروا ئاسان نەبوو، ئەمە نزیکەی ساڵ و نیوێکی خایاند، هەڵبەتە هەموو کادیرانی ئێمە لە کامپی فەلەستینییەکاندا بوون. کەس لەدەرەوەی ئەو کامپەدا نەبوو. لەو کامپەدا خوولی پەروەردەیی کرایەوە و لەئاکامی ئەو پەروەردەیەدا ئەو چەمکە هەڵانە راستکرانەوە و لەکادیراندا یەکێتییەك دروست بوو و خۆ کۆکردنەوەیەك بەدیهات. لەسەر بنەمای ئەمە ئەو کۆنفرانسە سازدرا.

بێگومان ئەو کاتە لەناو ئێمەدا "سەمیر" هەبوو، "سەمیر" رەوشی کادیرانی دەبینی کە ئیرادەیان شکاوە، هەریەکە و لەرەوشێکدا دەژین و پەرشوبڵاوییەك هەیە، هەر کەس بەگوێرەی خۆی نزیکبوونەوەیەکی هەیە، ئەوەی دەبینی و دەیخواست ئەمە قووڵتر بکاتەوە، کادیران هەموو بەرەو ئەورووپا ئاراستەگیر بکات. واتا بێ باوەڕی دروست دەکرد، خیتابی سۆزی کادیرانی دەکرد، توانستی تەڤگەر هەرچییەك هەبێت دەیخواست هەمووی بخاتە خزمەتی ژیانی شەخسییانەوە. لەو چوارچێوەیەدا دەیگووت:" ماڵی

پارتی دەریایە، ئەوەی نـەیخوات بـەرازە". لەلایـەکی دیکـەوە هـەوڵی دەدا کە پەیوەنـدی نێوان ئێمە و فەلەستینییەکان تێکبدات، بۆ ئەوەی تەڤگەر نەتوانێت لەوێ بـژیت و کـار و خەباتێك بکات، بۆ ئەوەی ناچار ببێت روو لە ئەوروپا بکات، ئـەویش ئـەو هەوڵانـەی دەدا.

ئیدی سـەرۆك لـەدژی هـەوڵ و تەقـەللاکانی ئـەویش کادیرانی بـەهێز کـرد، کادیرانی لەرووی چەمکەوە بەهێز دەکرد. بەمشێوەیە چـەمکەکانی "سـەمیر" نەیـدەتوانی لەسـەر کادیران بەکاریگـەر ببێـت و بەتـەواوی لـەژێر کاریگـەری ئـەودا دەرکـەوت، لەکادیرانـدا کۆمبوونێك (گردبوونەوەیەك) بەدیهات، لەسەر ئەو بنەمایە کۆنفرانسەکە سازدرا.

کەسێك باوەڕی نەدەکرد کە (PKK) لەکاتێکی وەهادا ئەم کۆنفرانـسە سـازبدات. چـونکە ئەو ماوەیە (١٩٨١) پێڤاژۆیەکی وەهابوو کە تەڤگەری شۆڕشگێڕی لـە تورکیا و کوردستان بەتەواوی لەتەسفیەبوون دابوون، پێڤاژۆیەکی وەها بوو، بۆیە کەسێك بـاوەڕی نـەدەکرد کـە لـە قۆنـاخێکی وەهـادا خـۆی کۆبکاتـەوە و کـۆنفرانس سازبدات و بڕیـاری مێـژوویی وەربگرێـت و رێ لـە تەسـفیەبوون بگرێـت و پێڤاژۆیـەکی دیکـە دەسـتپێبکات. بێگومـان ئەمـە بەخـەباتێکی ناسـایی ئـەنجام درا، سـەرۆك بەشـەو و رۆژ لەسـەر ئەمـە راوەسـتا، لـەئاکامی ئەمـەدا ئـەوە بـەدیهات. ئەمـە لەکاتێکـدا هـەموو تەڤگـەرە شۆڕشـگێڕییەکانی تورك و کورد پەرشوبڵاوەیان پێدەکرا و دەتوانەوە، تەنیا (PKK) لەم پێڤاژۆیـەدا خـۆی کۆکردەوە و گەیشتە کۆنفرانسێك.

کاتێك کە ئاکامی کۆنفرانسەکە بـە بـەلاغێك راگەیـەنرا، هـەموو کـەس سـەری سووڕما؛ چۆن (PKK) لە پێڤاژۆیەکی وەهادا کۆنفرانسێك سازدەکات؟ تۆبڵێی ئەمە راسـت بێـت؟ ئەمــە مــومکین نییــە. چــونکە کەســێك بــاوەڕی نــەدەکرد، لەبــەر ئــەوەی هــەموو لەتەسفیەبوون دابوون، ئەوەی تەنیا لەنێو تەسفیەبووندا نەبوو (PKK) بوو، کە ئەوەی رێی لە تەسفیەبوون گرت (PKK) بوو. بۆیە ئەمە زۆر گرنگە.

بێگومـان کاتێـك کـە کۆنفرانـسەکە سـازدرا، گروپێکـی وەکـو "سـەمیر" و "داوود" هـەبوو، دەیانخواسـت کۆنفرانـسەکە بـێ ئـەنجام تـەواو ببێـت، کۆنفرانـسەکە هـیچ بڕیارێـك وەرنـەگرێت. لـە کۆنفرانـسەکەدا زیـاتر پەرشـوڵاوی بێتـە کایـەوە و تەڤگـەر و کـادیران بەرەو ئەوروپا ئاراستەگیر ببن. هەموو هەوڵێکیان لەم پێناوە بوو، ئەوان وا حیساباتیان

دەكرد كە دەتوانن ئەنجامیش بەدەستبخەن، ئەو پێشكەوتنەی لە كادیراندا بەدیهاتبوو نەیاندەبینی و نەیاندەزانی. ئەوانە چۆن لە كادیران تێگەیشتبوون؟ وا تێگەیشتبوون كەوا كادیران كاتێك لە وڵات دەركەوتوون، چۆن دەژیان و بیریان دەكردەوە هەر بەهەمان شێوە ماونەتەوە. ئەمە لەكاتێكدا سەرۆك لەمیانەی پەروەردەوە كادیرانی لەو رەوشە رزگار كردبوو، ئیدی كادیران روویان لە وڵات بوو، شتێكی تر دەژیان، لە كادیران و لە رێكخستنندا خۆ كۆكردنەوەیەكی تۆكمە بەدیهاتبوو. بێگومان ئەوانە زێدە ئەمەیان نەدەزانی، ئەوانە وا تێدەگەیشتن كە دەتوانن لە كۆنفرانسەكەدا كاریگەری لەسەر رەوتی كۆنفرانسەكە بكەن و وەكو دەیانەوێت لە كۆنفرانسەكەدا بڕیار وەربگرن، بۆیە لە كۆنفرانسدا هەندێك لەوانە هەستان و ئاخفین، زیاتر "داوود"یان دەرخستەپێش. حیساباتیان ئەوەبوو كە؛" با "داوود" بئاخفێت بزانین كاریگەری خۆی چۆن دەبێت و كاردانەوەكان چۆن دەبن؟" ئەوا بەگوێرەی ئەمەش تاكتیك پەیرەو بكەن. كاتێك كە "داوود" ئاخفی و سەرۆك و كادیران زۆر بەهێز چوونە سەر "داوود" ئەو كاتە ئەوانە تێگەیشتن كە كادیران وەكو ئەوان لێی تێگەیشتوون وەها نین، لە كادیراندا گۆڕانكارییەكی مەزن بەدیهاتووە. بۆیە نەیانتوانی لەكۆنفرانسدا هیچ كاریگەرییەكیان هەبێت و هیچ ئەنجامێكیان بەدەستنەخست، هەڵبەتە لەبەر ئەوە هەنگاویان بەرەو دواوە هاوێشت و تاكتیكی خۆیان گۆڕی، بۆ ئەوەی بتوانن لەدوای كۆنفرانسەوە كار بكەن. چونكە بینیان كە ئەو شتەی دەیانخواست لەكۆنفرانسەكەدا ئەنجامی بدەن، زەمینەی نەماوە، ئەگەر زۆر پێداگریش بكەن، ئەوا بەتەواوی خۆیان ئاشكرا دەكەن و زەبریان بەردەكەوێت. ئیدی بۆ ئەوەی نەكەونە رەوشێكی بەمجۆرەوە خۆیان بۆ دواوە كشاندەوە و خۆیان شاردەوە.

بێگومان لەكۆنفرانسەكەدا زۆربەی كادیران گوێیان بەقسە و هەڵوێستەكانی "سەمیر" و "داوود" نەدا، بەڵكو گوێیان لە قسە و شیكردنەوەكانی سەرۆك دەگرت، بەڵام چەمكێكی وەها ملیتانیش لەئارادا نەبوو، واتا بە قووڵایی لە كەشی كۆنفرانسەكە نەدەژیان، تەڤلیبوونێكی وەها تۆكمەیان بۆ كۆنفرانسەكە نەبوو، زیاتر تەڤلی ئاخافتنەكانی سەرۆك و ئەو بڕیارانەی سەرۆك دەیخواست لە كۆنفرانسەكە وەربگیردرێت دەبوون. بەڵام تەڤلیبوونێكی زێدە بەهوشیاری و داناییەكی بەهێز نەبوو. بێگومان زێدەتر

فورسایی سەرۆك لە کۆنفرانسەکەدا هەبوو، سەرۆك هەڵسەنگاندن و ئاخافتنی گرنگی کرد. مرۆڤ دەتوانێت بڵێت سەرۆك مۆرکی خۆی لە کۆنفرانسەکە دا. ئەو چەمك و رۆحەی دەیخواست لە کۆنفرانسەکەدا بیچەسپێنێت، چەسپی و باڵادەستی کرد. ئەو کۆکردنەوەیەی کە لەمیانەی پەروەردەوە بەدیهاتبوو لە کۆنفرانسەکەدا قووڵتر و بەهێزتر بوو. بۆیە کۆنفرانسەکە بەسەرکەوتوویی تەواو بوو.

کۆنفرانسەکە زۆر بڕیاری مێژوویی وەرگرت. ئەم کۆنفرانسە ئەرکی کۆنگرەیەکی جێبەجێ کرد. ناوی کۆنفرانس بوو، بەڵام لەبنەڕەتدا ئەرکی کۆنگرەیەکی پێکهینا. واتا بڕیاربوون و سافیبوونێکی تۆکمەی لەنێو کادیراندا خوڵقاند، بۆیە لە پەروەردەدا کە کۆکردنەوەیەك بەدیهاتبوو، بەکۆنفرانسەکەش قووڵتر و بەهێزتر بوو، ئیدی لەم کۆنفرانسەدا بڕیار درا کە رێکخستن رووی لە وڵات بێت و موداخەلە لە وڵات ئەنجام بدات.

تا ئەو کاتە زیندانییەکان نوێنەرایەتی تەڤگەر و بەرخۆدانیان دەکرد، ئیدی زیندانەکان رۆڵی خۆیان تەواو دەکرد، پێویستە تەڤگەر لەدەرەوە موداخەلە بکات، ئەگەر زۆر درەنگ بمێنێت ئەوا مەترسیدارە. چونکە ئیدی زیندان ئەوەی دەبووایە ئەنجامی بدابایە ئەنجامی دابوو، لەمە زیاتر شتێکی تر نەبوو بیکات، پێویستە ئیدی لە دەرەوەی زینداندا گەریلا بکەوتبایە دەورەوە. ئیدی کۆنفرانسەکە ئەمەی دەستنیشانکرد، کۆنفرانسەکە ئەو رۆحەی ئافراند، بۆیە ئاراستەی رێکخستنی دایە وڵات و بەتەواوی رێگەی لە پەناهەندەیی و مەترسییەکانی گرت، ئەمە گرنگ بوو. ئەو مەترسییانەی لەو هەنگاوەدا هەبوو، بەم کۆنفرانسە تەڤگەر رێی لێگرت و بەلاوەی نا. ئەو هەنگاوەی لە دەرەوەدا هاوێشترا بەم کۆنفرانسە گەیشتە لوتکە. لەبەر ئەوە کۆنفرانسەکە گرنگ بوو...

**ئیدی تەڤگەر ئەو بڕیارە دەدات کە بەرەو وڵات بگەڕێتەوە، بەڵام ئەو گەڕانەوەیە چۆن ئەنجام دەدرێت؟ پێم وایە ئەو کاتە (١٩٨٢ - ١٩٨٤) زیاتر لەباشووری رۆژئاوای کوردستانەوە بەرەو باشووری**

کوردستان و لەوێشەوە بەرەو باکووری کوردستاندا تێدەپەڕین. لەسەر ئەو سنوورانەش هێزەکانی باشوور هەبوون؛ وەکو (پ د ك، حزبی شیوعی ئێراق، ی ن ك...هتد)، کەواتە چ ئاستەنگییەك و زەحمەتییەك لەبەردەم گەڕانەوەی یەکینە و گروپەکانی کادیران هەبوو بۆ باکووری وڵات؟



پۆستەرێك بۆ بیرەوەری بەرخۆدانەکەی شەهید مەزلووم دۆغان




پۆستەرێك بۆ هاندانی تێكۆشانی چەكداری لەساڵانی هەشتاكاندا

دوای كۆنفرانسەكە یەكسەر دەست بە گەڕانەوە بۆ وڵات نەكرا. سەرۆك ئەو بڕیارەی لەمیانەی كۆنفرانسەكەدا وەرگرت و رووی رێكخستن و كادیرانی كردە وڵات. بەڵام دوای كۆنفرانسەكە یەكسەر گەڕانەوە بۆ وڵات دەستیپێنەكرد. چونكە پێویستبوو كادیران لەسەر بڕیار و رێنماییەكانی كۆنفرانسەكە قووڵ بكرایەوە، ئەو ئامادەكارییانەی هەبوون دەبایە تۆكمە و بەهێزتر بكرابایە. وەكوتریش پێوست بوو هەندێك تەدبیریش

وەربگیرابایە، لەسەر ئەو بنەمایەش گەڕانەوە بۆ وڵات ئەنجام بدرابایە، بۆ ئەوەی لە گەڕانەوە بۆ وڵات زێدە کێشە و گرفت دەرنەکەوێت. ئەم تەدبیرانە لەم پێناوە دابوو، هەر بۆیە دوای کۆنفرانسەکە کادیران دیسان لەسەر رۆحی کۆنفرانسەکە و بڕیار و راسپاردەکانی کۆنفرانسەکە پەروەردە کرانەوە، بۆ ئەوەی کادیران بە ئامادەکارییەکی باشترەوە بچنەوە وڵات و بتوانن ببنە وەڵام. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە؛ هەوڵدەدرا بۆ ئەوەی هەندێك تەدبیر وەربگیردرێت. بۆ نموونە؛ هەوڵدەدرا هەندێك کەناڵ بکرێتەوە، چونکە زۆربەی کادیران دەبایە بکەوتبانایە هەرێمی بۆتانەوە. ئێمە هیچمان ئەو هەرێمەشمان نەدەناسی، هیچ پەیوەندییەکی ئێمەش لە بۆتان نەبوو، کاریگەری (پ د ك)ش لەسەر ئەو هەرێمە هەبوو، رێکخستنی (پ د ك) لەوێ هەبوو، پێویستبوو پەیوەندی خۆمان لەگەڵ (پ د ك) پێشبخەین، بۆ ئەوەی لەچوونی ئێمە بۆ ئەو هەرێمە رووبەرووی مەترسی نەبینەوە. چونکە پێشتر رووداوی تر روویدا بوو، "عەلی عەسکەری"(٢) و هاوڕێکانیشی چووبوونە ئەوێ، (پ د ك) ئەوانەی لەناوبردبوو، ئەگەر ئێمەش بەبێ (پ د ك) بچینە ئەو هەرێمەوە لەوانەیە ئێمەش رووبەڕووی مەترسییەکی بەمجۆرە ببینەوە. بۆیە پێویستبوو پەیوەندی لەگەڵ (پ د ك) دا پێشبخەین، بۆ ئەوەی بتوانین بەبێ کێشە بچینە ئەو هەرێمەوە. دووەمینیش؛ ئێمە ئەو هەرێمە هیچ ناناسین، هیچ پەیوەندییەکی ئێمە لەوێ نییە، جوگرافیاکەشی ناناسین، تایبەتمەندی خەڵکەکەشی ناناسین، پێویستە لەم رووەشەوە هەندێك تەدبیر وەربگرین، بۆ ئەوەی بەچوونمان بۆ ئەو هەرێمە رووبەڕووی هیچ مەترسییەك نەبینەوە، لەبەر ئەم خاڵەش تەدبیر وەرگرتن گرنگ بوو.

ئیدی دوای کۆنفرانسەکە سەرۆك زیاتر لەسەر ئەو مەسەلانە راوەستا. کاتێك ئێمە کادیرمان لە وڵات دەرخستبوو، بەتەواوی وڵاتمان چۆل نەکردبوو، ئێمە هەندێك کادیرمان هێشتبووەوە، بۆ ئەوەی ئێمە بە بەردەوامی لەگەڵ ناوەوەی وڵات لەنێو پەیوەندی دابین، هەروەها دوای ئەوەی لەدەرەوەی وڵات ئامادەکارییەکانمان بۆ گەڕانەوە بۆ وڵات تەواو کرد، هەر کاتێك بخوازین کادیران بگەڕێنینەوە وڵات رووبەرووی مەترسی نەبینەوە. بۆ ئەمەش هەندێك کەناڵمان پێویستبوو، بۆیە هەندێك تیممان لەناوەوەی وڵات هێشتبۆوە، ئەو تیمانەمان هەم لەگەڵ هەڤاڵانی ناو زینداندا

پەیوەندییان بەڕێوە دەبرد، هەمیش لەگەڵ خەڵك پەیوەندییان دەبەست، هەمیش کەناڵەکانیان بە کراوەیی دەهێشتەوە، بەڵام لەناوچەی بۆتان زێدە کەناڵێکی ئەوتۆمان نەبوو، پەیوەندییمان زێدە نەبوو، ئەمەش بۆ ئێمە کێشەیەکی جددی بوو، ئیدی پێویستبوو توانستی ئەوەشمان دابین بکردبایە، تا ئەو توانستانە دابین بوون، کادیرانمان جارێکی دیکە لە پەروەردەی عەسکەری و ئایدیۆلۆژی و سیاسی قووڵترکردەوە. لەکۆنگرەی دووەمیشدا ئەمە کامڵ بوو.

لەدوای کۆنگرەی دووەمەوە، گەڕانەوە بۆ وڵات دەستپێکرد. واتا ئەو بڕیارەی کۆنفراسی یەکەم وەرگیرتبوو کۆنگرەی دووەمیش خستییە پراکتیکەوە. ئیدی بەمشێوەیە گەڕانەوە بۆ وڵات دەستپێکرد. بێگومان ئەو کادیرانە دوو سێ ساڵ بوو لە وڵات دوور بوون، لە وڵاتیش زۆر گۆڕانکاری روویدا بوو، کاتێك ئەو کادیرانە بچنەوە وڵات پێویستە لەسەر سنوورەکان جێگیر بکرێن و زێدە تەنگاو نەکرێن و زەبریان بەرنەکەوێت، تا بتوانن خۆیان بگونجێنن. هەر بۆیە لە هەرێمی بۆتاندا جێگیربوون، زێدەتریش لەسەر سنوور جێگیربوون، هەم لای باشوور و هەمیش لای باکوور، بەبنچینە وەرگیردرا. ئیدی ئەگەر لەگەڵ (پ د ك)ش پەیوەندی و رێککەوتن ئەنجام بدرێت ئەوا ئەو کاتە کێشە لەلایەن (پ د ك) شەوە دەرناکەوێت. ئەو کادیرانە دەتوانن لەوێ خۆیان جێگیر بکەن، دەتوانن لە بۆتان تاکتیکی پڕوپاگەندەی چەکداری پێشبخەن، لەسەر ئەو بنەمایەش تەڤگەر دەتوانێت بناخەی گەریلایی دابڕێژێت و گەریلاش لەسەر ئەو بناخە خۆی رێکخستە بکات و چالاکییەکانی خۆی پەرە پێبدات. ئیدی ئەمانە هەمووی پلانرێژی بۆکرا... لەسەر ئەو ئامادەکاری و پلانرێژیانە هەنگاوی گەڕانەوە بەرەو وڵات لەدوای کۆنگرەی دووەمینەوە دەستپێکرد.

**ئەو کاتە لەنێوان هەر دوو رژێمی ئێراق و تورکیادا رێککەوتنێك مۆر دەکرێت، بەگوێرەی ئەم رێککەوتنەش ئەو مافەیان بەیەکتر دەدا کە چەندین کیلۆمەتر بچنە ناو خاکی یەکترەوە. هەر ئەو کاتەش یەکینەکانی گەریلا لەسەر سنوور بوون. ئەو رێککەوتنەی**

## نێوان ئێراق و تورکیا تا چەند کاریگەری لەسەر جموجۆڵ و چالاکییەکانی گەریلادا هەبوو؟

راستە، لەنێوان ئێراق و تورکیادا پەیمانێکی بەمجۆرە هەبوو، بەڵام ئێراق لەنێو شەڕ دابوو لەگەڵ ئێراندا، بۆیە لەسەر سنوورەکان بۆشاییەکی مەزن هەبوو و زۆر هێزی لەسەر سنوور کشاندبووەوە، سنوور بە لای باشووردا بۆشایی زۆری تێدا هەبوو، بۆیە ئەم پەیمانە زێدە کاریگەری ئەوتۆی نەبوو. چونکە هێزی ئێراق لەسەر سنوور زێدە نەبوو، لەهەندێك شوێنیشدا هەر هیچ نەبوو، لەهەندێك شوێنی تریشدا لەدووری سنوور هەبوو، بۆیە تورکیا بەتەنیا لەسنووری خۆی نەیدەتوانی ئەنجام بەدەستبخات، تورکیا لەم رووەوە هەندێك ئۆپەراسیۆنیشی کردبوو، بەڵام ئۆپەراسیۆنەکانی ئەوان بێ ئەنجام دەمایەوە. چونکە ئێراق نەیدەتوانی بە عەسکەری هاوکاری تورکیا بکات. لەبەر ئەوەی هەموو عەسکەر و هێزی خۆی کشاندبووەوە بۆ شەڕی دژی ئێران.
بێگومان ئەو کاتە هەڤاڵان "محەمەد قەرەسوونگور" و "مەعسوم قۆرقماز" و "حەسەن"یشمان ناردبوو. بۆ ئەوەی لەسەر سنوور هەم بە لای رۆژهەڵاتی کوردستان و هەمیش بە لای باشووری کوردستان ئامادەکاری بکەن. ئەگەر کاتێك ئێمە گروپەکانمان لە لوبنان نارد ئەوان لەسەر ئەو سنوورانەدا جێگیریان بکەن، بۆ ئەوەی زێدە تووشی کێشە و گرفت نەبن، ئێمە ئەو تەدبیرەشمان وەرگرتبوو، پێشتر ئەو هەڤاڵانەمان ناردبوو، بۆ ئەوەی هەم جوگرافیاکە بناسن، هەم سنوورەکان بناسن، هەمیش پەیوەندی لەگەڵ حیزبەکانی رۆژهەڵات و باشوور پێشبخەن، بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لەسەر ئەو بنەمایە هەڤاڵان گروپ گروپ رەوانە بکەین. ئەو هەڤاڵانە هەندێك ئامادەکارییان کردبوو.

## لەو ساڵەدا (١٩٨٢) لە باشووری لوبناندا شەڕ بەرپا هەبوو، ئەو کاتە (PKK)ش وەك تەڤگەرێکی ئازادیخواز لەوێ لەبەرەی فەلەستینییەکاندا جێدەگرێت و بەرخۆدان دەکات و چەندین

شـەهیدیش لـەم پێنـاوە دەدات، ئـەو رووداوەی شـەڕ بەگـشتی و هەبوونی (PKK) لەناو ئەو شەڕەدا و ئەو بەرخۆدانەی ئەنجام درا لەسەر چ بنەمایەك بوو و چ ئەنجامێكی لەگەڵ خۆیدا هێنا...؟



SERXWEBÛN

JI SERXWEBÛN Û AZADİYÊ BI RÛMETTIR TIŞTEK NÎNE

PARTİMİZİN ENTERNASYONALİST DAYANIŞMASININ
SEMBOLÜ OLAN
DİRENİŞ ŞEHİTLERİMİZİ SAYGI İLE ANIYORU

لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەی سەرخۆبوون ــ حوزەیرانی 1984




پۆستەری شەهیدانی (PKK) لە بەیروت لەبەرامبەر هێرشەکانی ئیسرائیل

بێگومان کاتێك چووینە لای فەلەستینییەکان، هەرچەندە سەرەتا فەلەستینییەکان باوەڕییان بە ئێمە نەدەکرد و بەگومان لێمان نزیك دەبوونەوە، هەر بۆیەش زێدە توانستیان نەدەدایە ئێمە، تەنانەت هەندێك جار بێ ڕێزیشیان لەبەرامبەرمان دەنواند.

بەڵام ئێمە چەمك و نزیكبوونەوەیەكی خۆمان سەبارەت بە كێشەی گەلی فەلەستین هەبوو، چونكە گەلی فەلەستینیش وەكو گەلی ئێمە ژێردەستە بوو، لەسەر ئەو گەلەش زۆر زوڵم و ئەشكەنجە و كۆمەڵكوژی بەڕێوەبرابوو و بەڕێوە دەبرا. واتا كێشەی فەلەستینییەكان و كێشەی گەلی كورد لەهەندێك رووەوە لەیەك نزیك بوون. هەڵبەتە تەواو وەك یەك نیین، بەڵام لە هەندێك رووەوە وەك یەكترن، ئێمەش چووبووینە لای ئەوان و بە توانستی ئەوان دەژیان و پەروەردەی خۆمان دەكرد و بۆ گەلی خۆمان دەمانخواست بەرپرسیارێتی خۆمان پێكبهێنین. بۆیە ئێمە بەڕێزەوە لەوان نزیك دەبووینەوە، ئەمە ئەخلاق و چەمكی ئەم تەڤگەرە بووە، ئەم تەڤگەرە بەها دەداتە دۆستایەتی، واتا لە چەمك و تێروانینی سەرۆك ئاپۆدا ئەگەر یەكێك دۆستایەتیت لەگەڵدا بكات ئەوا تۆش دۆستایەتی زیاتری لەگەڵدا بكە. ئەمە چەمكێك بوو، هەمیشە رێز لە دۆستایەتی گرتن، لە دۆستایەتیدا بەرپرسیارێتی پێكهێنان بنەما بوو.

ئیدی لەبەر ئەوەی ئێمە لەگەڵ ئەوان بووین، میوانی ئەوان بووین، بەتوانستی ئەوان ئێمە پەروەردەی خۆمان پێشدەخست، هەرچەندە لەنزیكبوونەوەی ئەواندا هەڵەش هەبێت، ئێمە هیچ كاتێك بەكاردانەوە هەڵسوكەوتمان نەدەكرد و بەهەڵە لەوان نزیك نەبووینەوە، هەمیشە بە بەرپرسیارێتییەوە هەڵسوكەوتمان دەكرد، تەنانەت ئێمە بە ئەوانیشمان گووت:" تاكو ئێمە لێرە بین هەرچی ئەركێك بكەوێتە سەرشانی ئێمە جێبەجێی دەكەین، نەك ئێوە ئەمە دەخوازن، ئێوە بخوازن یان نەخوازن ئێمە جێبەجێی دەكەین. ئەمە چەمكی ئێمەیە، تەنانەت كاتێك هەندێك لەوان بەهەڵە لەئێمە نزیك دەبوونەوە ئێمە بەوانمان دەگووت:" پێویستە ئێوە وەها بەهەڵە لەئێمە نزیك نەبنەوە، بەهەڵەش لەئێمە تێنەگەن، ئەگەر ئێوە ئێمە وەكو تەڤگەرێكی سەربەخۆ نەبینن و بەمشێوەیە لەئێمە نزیك نەبنەوە، ئەوا ئێمە لێرەش نامێنینەوە، وەك چۆن ئێوە بۆ گەلی خۆتان شەڕ و خەبات دەكەن و بەرپرسیارێتییەكتان هەیە، ئێمەش بەرپرسیارێتییەكمان بەرامبەر بە گەلی خۆمان هەیە، ئێمە لەم پێناوەدا هاتووین، ئێوە پێویستە ئەم راستییە بزانن و بەگوێرەی ئەمە لەئێمە نزیك ببنەوە".

بۆیە هەتا ئێمە لەوێ بووین چەندە كاری خۆمانمان پێكدەهێنا ئەوەندەش كاری ئەوانمان پێك دەهێنا، هەر بۆیە كاتێك لەو چەمكەی ئێمەیان روانی، كاریگەرییەكی

مـەزن لەسـەر ئـەوان دروسـت ببـوو، جددییـەتی ئێمـەیان بـینی، هەڵبەتـە پاشـان بەجددییەت لەئێمە نزیك دەبوونـەوە و باوەڕیشیان بەئێمـە دەكـرد و بـەهایان بەئێمـە دەدا. كاتێك كە شەڕ دەركەوت بەڕاستی ئێمە لە ئامادەكاری كۆنگرەی دووەمین دابووین. ئێمە دەمانخواست كۆنگرە ئەنجام بدەین و كادیران رەوانەی وڵات بكەینەوە، ئێمە لـەنێو ئامادەكارییەكی وەها دابـووین، شـەڕیش دەستی پێكرد. بەمـەش رووبـەرووی رەوشـێكی نوێ بووینەوە، ئایا بەشداری لەم شەڕەدا بكەین یان نا؟ ئەگەر ئێمە لەم شەڕەدا بەشدار بـبین، ئـەوا ئەمـە شـەڕە و لەوانەیـە زەبریـشمان بەربكـەوێت، ئەگـەر ئێمـە زەبریـشمان بەربكەوێت ئـەوا قـەدەری میللـەتێك گرێـدراوی ئـەم تەفكەرەیـە. ئەگـەر لـەم شەڕەشـدا بەشدار نـەبین، ئـەوا لـەرۆژانی تەنگدا ئێمـە هاتینـە لای فەلەستینییەكان و لـە كامپـی ئەواندا دەژیاین، بەتوانستی ئەوان پەروەردەمان دەبینـی و ئامادەكاریمان پێشخستبوو، بۆ ئەوەی بتوانین ئەركی خۆمان بۆ گەلی خۆمان پێك بێنین. لەسـەر ئـەوان مەترسییەكی مەزن لە ئارادابوو، شەڕێكی مەزن پێشكەوتبوو، لەرەوشێكی بەمجۆرەشدا، ئەگـەر لەگـەڵ ئەواندا جێنەگرین كارێكی ئەخلاقیانە نـەدەبوو، لـەدەرەوەی فەلـسەفە و ئایـدیۆلۆژیا و ئەخلاق و كولتووری ئێمـە بـوو. بۆیـە بـۆ ئێمـە بڕیـار وەرگـرتن زۆر دژوار و زەحمـەت بوو.

ئیـدی سـەرۆك ئـەو كاتـە بـەبێ دوو دڵـی بڕیـاری وەرگـرت و گـووتی:" پێویـستە ئێمـە لەگەڵ گەلی فەلەستیندا بین، ئـەوان لـەرۆژێكی زۆر تەنگـەتاو دان، پێویـستە لـەرۆژێكی وەهـادا ئێمـە لەگـەڵ ئەوانـدا بـین و دۆسـتایەتی خۆمـان بـسەلمێنین، هـەڤاڵێتی و شۆڕشگێڕێتی خۆمـان بـسەلمێنین" هـەروەها گـووتی:" هەڵوێـستی هـەرە راسـتیش بـۆ (PKK) ئەمەیە" بەم چەمكە ئێمە لەو شەڕەدا بەشداربووین.

بێگومان ئێمە لەو شەڕەدا شەهیدمان دا، دیلمان دا، تەنانەت ئەگەر هەندێك تەدبیرمان وەرنەگرتبایە شەهید و دیلی زیاتریشمان دەدا، ئەگەر زێدە شەهید و دیلمـان نـەدا ئـەوا هۆكارێكی سەرەكی ئەوەبوو كە گەلی لوبنان هاوكاری ئێمەیان كرد. چونكە لـەناو گـەلی لوبنانیـشدا ئێمـە كاریگەرییـەكی بـەهێزمان دروسـتكردبوو، گـەلی لوبنـان ئێمـەیان دەناسی، باوەڕییەكی بەهێزیان بەئێمـە هـەبوو. كاتێك ئێمە لەگەڵ فەلەستینییەكاندا بـووین، كامپـەكانی فەلەسـتینییەكانیش لـەناو باخـچەی لوبنانییەكانـدا بـوو، ئێمـە

زەرەرمان لە شتومەك و باخچەی گەل نەدەدا ، بۆیە گەل دەیانگووت:" با كەسانی (PKK)یی بێن لە باخچەی ئێمەدا بمێننەوە، یان لەنزیك لە باخچەكاندا بمێننەوە، چونكە ئەوان دەیپارێزن" بۆیە كاتێك كە شەڕیش دەركەوت گەلی لوبنان خاوەنداری لەئێمە كرد و ئێمەیان پاراست، هەڤاڵانی ئێمە زمانی عەرەبیان نەدەزانی و ڕێگاوبانیان نەدەناسی، گەلی لوبنان هاوكاری هەڤاڵانیان كرد، بەمشێوەیە، زۆر لە هەڤاڵانیان گەیاندە شوێنی هەڤاڵان. بۆیە ئەگەر ئێمە زەبری مەزنمان بەرنەكەوت لەبەر ئەم هۆیە بوو .

ئێمە لەم شەڕەدا تا كۆتایی شەڕەكە بەشداربووین، من خۆشم لەم شەڕەدا تا كۆتایی بەشدار بووم، لەكاتی گەمارۆدانی بەیروتدا تا كۆتاییەكەی هەر لەوێ بووم، كاتێك كە ئەمریكییەكان و ئیسرائیلییەكان ڕێككەوتن كەوا؛ دەبێت فەلەستینییەكان لە لوبنان دەربچن، ئێمەش لەناو ئەوانەدا هاتین و دەركەوتین.

زۆر لە هەڤاڵان لەم شەڕەدا قارەمانێتی مەزنیشیان نواند، قارەمانێتی و بەرخۆدانی هەڤاڵان لە" قەڵای شەقیف، قەڵای سەلاحەددینی ئەیوبی " هەروەها لەشارەكانی"سەیدا، سور، ئەلدامور، بەیروت و حەسبایا..." لەلایەن فەلەستینییەكانەوە دەزانرێت.

دوای ئەوەی فەلەستینی و ئیسرائیلییەكان بەیەكەوە ڕێككەوتن و دیلەكانیان گۆڕیەوە، لەناو ئەوانیشدا دیلی ئێمەش هەبوو، دیلەكانی ئێمەش بەمشێوەیە ئازادكران.

لەبەر ئەوەی هەڤاڵان بەگشتی بەشداری ئەو شەڕە ببوون، سەرۆك و هەڤاڵان سازدانی دووەمین كۆنگرەیان دواخستبوو، لەكۆتایی شەڕەكەدا كۆنگرەش سازدرا. ئیدی دوای كۆنگرەی دووەم ئەو بڕیارەی لە یەكەمین كۆنفرانسدا وەرمانگرتبوو جێبەجێمان كرد. بێگومان لەبەر ئەوەی ئێمە بەشداری ئەو شەڕەمان كرد و شەهید و دیلمان دا و تا كۆتایی بەشداری شەڕەكە بووین و گەلێك لە هەڤاڵانیش قارەمانێتی مەزنیان نواندبوو، ئەمە كاریگەرییەكی زۆر مەزنی لەسەر گەلی عەرەب كرد، (PKK)ی باشتر ناساند، گەلی كوردی باشتر ناساند. ئیدی بەمەش (PKK) بۆ كوردان ڕێزێكی مەزنی لەناو عەرەبەكاندا بەدەستهێنا، ڕێگەی خەباتی دیپلۆماسی لەناو جیهانی عەرەباندا زیاتر كردەوە و بەهێزی كرد، ئەگەر لە خۆرهەڵاتی ناوین و لەناو عەرەباندا ڕێزێكی مەزنی

کوردان دروستبوو و باوەڕیی بە کوردان دروستبوو، کورد توانیان لەوێ چالاکی دیپلۆماسی پێشبخەن، ئەوا ئەمە پەیوەستە بەخەبات و هەڵوەستەی (PKK)وە، هەڵوەستەی بەرخۆدانڤانیانەی (PKK) لە شەڕی (١٩٨٢)دا کاریگەرییەکی زۆر مەزنی کرد...

**بەڵام ئەو کاتە تورکیا هەم لەگەڵ ئیسرائیلییەکان، هەمیش لەگەڵ فەلەستینییەکان ـ وا مەزندە دەکەم لەگەڵ بزووتنەوەی ئەلفەتح دا ـ ڕێککەوتن و پەیماننامە مۆر دەکات. ئەو کاتە ئەو هەڵوەستە و بەرخۆدانەی (PKK) تا چەند کاریگەری لەسەر ئەم ڕێککەوتن و پەیماننامانە هەیە؟ یان بڵێین؛ ئایا ئەو ڕێککەوتن و پەیماننامانەی تورکیا لەگەڵ ئیسرائیلییەکان و هەندێك لە فەلەسینییەکان مۆری دەکات، تا چەند ڕەنگدانەوە و کاریگەری لەسەر خەبات و تێکۆشانی ئەو سەردەمەی (PKK)دا هەبوو؟ تاچەندیش توانیان بەم ڕێککەوتن و پەیماننامانە ئەنجام بەدەستبخەن؟**

ڕاستە تورکیا هەم لەگەڵ تەڤگەری فەلەستینییەکان و هەمیش لەگەڵ ئیسرائیلییەکان پەیوەندی خۆی هەبوو، پەیوەندی تورکیا لەگەڵ فەلەستینییەکان لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی (منظمة التحریر الفلسطینیة) هەبوو، "ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی"ش زیاتر بەدەست " ئەلفەتح "وە بوو. تورکیا دەیخواست هەم بە پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل و هەمیش لەگەڵ ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی زەبر لە (PKK) بوەشێنێت. نەك تەنها لە شەڕی (١٩٨٢)دا خواستی زەبرمان لێبوەشێنێت، تەنانەت بەر لە شەڕیش دەیخواست و هەوڵیدەدا کە زەبرمان لێبدات. لەم پێناوەدا تەنانەت تورکیا لەوێ سوودی لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ "ئیستخباراتی ئێراقی"ش

وەردەگرت. چونکە پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ "ئیستخباراتی ئێراقی"دا هەبوو، "ئیستخباراتی ئێراقی"ش لە لوبنان زۆر بەهێز بوو، هەم لەناو تەفگەرە فەلەستینییەکان و هەمیش لەناو "حرکة الکتائب"دا. بۆیە تورکیا سوودی لە "ئیستخباراتی ئێراقی" وەردەگرت و دەیخواست زەبرمان لێبوەشێنێت.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ تورکیا خۆیشی ئیستخباراتی خۆی لەوێ جێگیر کردبوو، تەنانەت ئەو کاتە "عوسمان باسمان " هەبوو، سەردەمانێك لە بەغداد سەفیری تورکیا بوو، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ "ئیستخباراتی ئێراقی" هەبوو، ئەویان ناردبووە لوبنان. هەروەها هەندێك لەوانەی لەنێو ئیستخباراتی تورکیا (MİT) دا بەتایبەت لەسەر (PKK) رادەوەستان بۆ لوبنانیان ناردبوو، هەروەها ئەوانەی لەنێوان میت (MİT) و (CIA)دا پەیوەندییان رێکدەخست بۆ لوبنانیان نارد بوو. هەڵبەتە بەمشێوەیە لە لوبنان چالاکییەکی سیخوڕی پڕ بەهێزیان لەدژی ئێمە بەرێوە دەبرد. تەنانەت " بەرەی دیموکراتی رزگاری فەلەستینی ـ الجبهة الدیمقراطیة لتحریر فلسطین"ی "نایف حواتمة " بەئێمەیان گووت:" ئاگاداری خۆتان بن، تورکیا لەدژی ئێوە چالاکییەکی سیخوڕی بەهێز بەرێوە دەبات، تەنانەت لەناو فەلەستینییەکانیشدا دەستیان هەیە، ئێمە ئەوانمان ئاگادار کردۆتەوە کە کاری خراپ لەبەرامبەر ئێوە نەکەن، بەڵام دیسانیش ئێمە تەدبیر وەردەگرین و ئێوەش بەتەدبیر بن". بەمشێوەیە ئێمەشیان ئاگادار کردەوە و خۆشیان تەدبیریان وەرگرت. تەنانەت دەتوانم بڵێم؛ بەر لە دەستپێکردنی شەڕ لە (١٩٨٢)دا بەرپرسیاری ئیستخباراتی ئێراقی لەوێ پەیوەندی خۆی لەگەڵ هەندێك کەس و گروپ هەبوو، دەیانخواست لە رێگەی ئەو گروپانەوە ئێمە لەناو ببەن، تەنانەت ئێمەشیان گرت، ئەگەر زوو هەواڵ نەگەیشتبایە" بەرەی دیموکراتی رزگاری فەلەستینی" و ئەوانیش زوو موداخەلەیان نەکردبایە، هەروەها بەرەی تێکۆشان (جبهة النضال) موداخەلەی نەکردبایە، لەوانەبوو ئێمەیان بکوشتبایە، من خۆشم لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەدا بووم؛ ئێمەیان گرت و بردیانین بۆ شوێنێك بۆ ئەوەی بمانکوژن، بەڵام هەواڵ گەیشتە بەرەی دیموکراتی رزگاری فەلەستینی و بەرەی تێکۆشان (جبهة النضال) ئەوان یەکسەر هەندێك هێزی چەکداری خۆیان ناردە ئەو شوێنەی کە ئێمەیان گەمارۆ دابوو، هاتنە ئەو شوێنە و ئێمەیان رزگارکرد.

ئیدی لەوێ بەر لە شەڕیش ڕووبەڕووی مەترسی لەمجۆرە ببووینەوە، ئەوەی من باسی دەکەم ڕێك لەناو شەڕدا ئێمەیان گرت، چونکە هەرکەس بەگوێرەی شەڕ جموجۆڵی دەکرد، زۆر تێکەڵی و پێکەڵی و ئاڵۆزیش هەبوو، ڕێك لەدۆخێکی وەهادا خواستیان زەبرێکی مەزنمان لێبدەن. من و چەند هەڤاڵێك کە دەگەڕاینەوە ماڵ دەستگیرکراین، چونکە پێشتر ماڵی ئێمەیان دەستنیشان کردبوو، چووبوون کەوتبوونە ماڵ، دەرگای باڵەخانەکەش داخرابوو، بەڵام پاسەوانی باڵەخانەکە بە پارە دەخەڵەتێنن و دەکەونە ماڵ، ئێمەش لەدەرەوە دەهاتینەوە چووینە ژوورەوە، یەکسەر ئێمەیان گرت، کە ئێمەیان برد لەوێ دۆستێکی ئێمە هەبوو، یەکسەر هەواڵ دەداتە فەلەستینییەکان و خۆیشی تاقیب دەکات، بۆ ئەوەی بزانێت ئێمە بەرەو کوێ دەبەن. ئیدی فەلەستینییەکان گەیشتنە ئەو شوێنە و بەمشێوەیە ئێمەیان ڕزگارکرد. ئیدی ئەگەر فەلەستینییەکان درەنگ گەیشتبوونایە ئەوێ ئەوا ئێمە دەکوژراین و لەناو شەڕیش دایە، کێ کوشتیانن؟ دیار نەبوو و کەسیش نەیدەزانی. بێگومان ئێمە حاڵەتی بەمشێوەیەمان بەسەر هاتبوو. تورکیا ئەو کاتە لە زیندانی ئامەددا پڕوپاگەندەیەکی بۆ هەڤاڵانی نێو زیندان بڵاوکردبووەوە، گوایە؛" هەموو لە شەڕدا کوژراون، ئیسرائیلیش هەندێکی گرتوون، ئەوانەی کە دەستگیریش کراون تەسلیمی ئێمەی دەکەنەوە" تەنانەت سەبارەت بە سەرۆکیش گووتبوویان:" ئیسرائیل ئەویشی گرتووە و تەسلیمی ئێمەی دەکەنەوە" بەمە دەیانخواست ئیرادەی هەڤاڵان لە زیندانەدا بشکێنن. ئیدی ئەو کاتە وەکو پێشتر باسم لێیەوە کردبوو، هەڤاڵ "کەمال پیر" هەستابوو و گووتبووی:" ئێوە درۆ دەکەن، هەڤاڵان شەهید نەبوونە و نەگیراون و ئێوەش ناتوانن هەڤاڵان تەسلیم وەربگرن.... ئێوە درۆ دەکەن" ئەمە جورئەتێکی مەزنی دابووە هەڤاڵان، ئەگەر هەڤاڵ "کەمال پیر" باوەڕییەکی بەهێزی بەتەڤگەر نەبایە لەوانەبوو ئەو پڕوپاگەندانە کاریگەری لەسەر هەڤاڵان بکردبایە و ئەنجامگیریش ببوونایە. تەنانەت هەندێك لە هەڤاڵان بەم پڕوپاگەندانە کەوتبوونە نێو دوودڵیشەوە و گووتبووشیان:" لەوانەیە ڕاستیش بێت... چونکە شەڕ و شۆڕە و هەڤاڵانیش لەوێن، لەوانەیە زەبریان بەرکەوتبێت" واتا کەوتبوونە نێو ئەو دوودڵییەوە، بەڵام ئاخافتن و هەڵوێستی هەڤاڵ "کەمال" ئەو دوودڵییەی شکاندبوو. بێگومان ئەمەش کەسێتی هەڤاڵ "کەمال پیر" نیشان دەدات،

پەیوەستبوونی ئەو نیشان دەدات، لە هەلومەرجی هەرە خراپدا نیشانی دەدات کە چۆن شۆڕشگێڕێتی پێکدێت؟ لە چ کاتێکدا تۆ چ بکەی و چ هەنگاوێك بهاوێژیت و چ قسەیەك بکەیت و چ هەڵوێستێك بنوێنیت؟ ئەمانە بەدیار دەخات. ئیدی پێویستە مرۆڤ ببینێت کە لە "کەمال پیر"دا ملیتانێتی (PKK) چۆن بەرجەستە بووە.

بێگومان تورکیا لەم شەڕەدا بەراستی هەوڵیدا زەبرێکمان لێبوەشێنێت. هەوڵیدا ئەو هەڤاڵانەی بە ئەسیری کەوتبوونە دەست ئیسرائیلەوە تەسلیمیان وەربگرێتەوە. پاشان کە لە نێوان ئیسرائیل و فەلەستینییەکاندا رێککەوتن ئەنجامدرا و چوونە جەزائیر و ئەوانەی دیل کراون لەوێ بگۆڕدرێنەوە، خواستیان لەوێ وەریانبگرێتەوە. لەسەر ئەمە لەگەڵ " ئەلفەتح "دا قسەی کردبوو. خواستیان ئەو پیلانگێڕییە دابرێژن... لەوێ زۆر پیلانگێڕیمان لەدژدا کرا، بەڵام یەك لەو پیلانگێڕییانەش ئەنجامگیر نەبوون. هەم هەندێك لە دۆستانی ئێمە لەناو تەڤگەری فەلەستیندا نەیانهێشت ئەنجامگیر ببێت، هەمیش ئەو کار و خەباتەی ئێمە کردبوومان نەیانهێشت ئەو پیلانگێڕییانە جێبەجێ ببن. ئەگەر تورکیا لەمەدا ئەنجامگیر نەبوو، ئەوا لەبەر ئەو هۆیانە بوو کە ئاماژەم پێدان.

## واتا ئەو هەڤاڵانە تەسلیمی تورکیا نەکرانەوە ...

نەخێر تەسلیم نەکرانەوە... ئەو هەڤاڵە دیل (ئەسیر)انە لەگەڵ دیلە فەلەستینییەکانی دیکە رەوانەی جەزائیر کران. پاشان فەلەستینییەکان هەموو دیلەکانیان گروپ گروپ هێنایەوە سوریا، ئێمە گووتمان:" هەڤاڵانی ئێمەش بێننەوە سوریا". بێگومان بۆ ئەوەی بیانهێننە سوریا لەگەڵ دەوڵەتی سوریادا رێککەوتنیان دەکرد. هەڤاڵان دەهێنن، بەڵام بە سوریایان نەگووتووە، سوریاش هەر لەفرۆکەخانەدا ئەو هەڤاڵانەی پەسند نەکرد. بۆیە ناچاربوون جارێکی دیکە بگەڕێنەوە جەزائیر، ئەو کاتە فرۆکەش لەوێوە بۆ یۆنانستان و لە یۆنانستانیشەوە بۆ جەزائیر دەچوو، ئیدی جەزائیریش کە جارێك لێی دەرچووبوو پەسندی نەدەکرد بگەڕێنەوە... بەمشێوەیە هەڤاڵان بێ جێگە و رێگە دەمانەوە و ئیدی تەسلیمی تورکیایان دەکردنەوە. پیلانێکی بەمجۆرە لەئارادا بوو. ئێمە بەو هەڤاڵانەمان

گووت:" ئێوە لە یۆنانستان لە فرۆکەخانە رابکەن و لەوێ داوای پەناهەندەیی بکەن" ئەوانیش لە یۆنانستان داوای پەناهەندەیی دەکەن و بەمشێوەیە رزگاریان دەبێت. ئەگەر وەها نەبووایە ئەوانە تەسلیمی تورکیایان دەکردنەوە...

# پشت لەپەناهەندەیی... روو لە نیشتمانێکی داگیرکراو...!!

دوای ئەوەی ساڵی (١٩٨٢) شەڕ تەواو دەبێت، دووەمین کۆنگرەش سازدەدرێت، وەکو باستان کرد بۆ پراکتیزەکردنی ئەو بڕیارانەی لەکۆنفرانسی یەکەم وەردەگیرێن کۆنگرەی دووەم دەگاتە بڕیاری پراکتیزەکردن. بەگشتی ئەتمۆسفێری ناو دووەمین کۆنگرە چۆن بوو؟ چەمك و مەیلە هەرە بەرچاوەکان، بڕیارە هەرە گرنگەکانی کۆنگرە چیبوون؟ هەروەها دووەمین کۆنگرە بۆ (PKK) بە چ واتایەك دەهات؟



**رێبه‌ر ئۆجه‌لان و كادیران له‌ كامپی په‌روه‌رده‌یی له‌ لوبنان**

من خۆم ته‌ڤلی دووه‌مین كۆنگره‌ نه‌بووم، من ئه‌و كاته‌ له‌نێو شه‌ڕدا بووم، له‌نێو گه‌مارۆی به‌یروتدا بووم، سه‌رۆك گووتی:" وه‌ره‌ به‌شداری كۆنگره‌ ببه‌..." منیش گووتم:" من ناتوانم هه‌ڤالان له‌نێو شه‌ڕدا به‌جێبهێڵم و بێم بۆ كۆنگره‌، ئه‌گه‌ر هه‌ڤالان بمێننه‌وه‌ ئه‌وا منیش ده‌مێنمه‌وه‌، ئه‌گه‌ر ئه‌وانیش بێن ئه‌وا منیش دێم" بۆیه‌ من ته‌ڤلی كۆنگره‌ نه‌بووم. كۆنگره‌ له‌ كۆتایی شه‌ڕی نێوان فه‌له‌ستین و ئیسرائیل دا سازدرا، تا ئێمه‌ له‌ گه‌مارۆی به‌یروت ده‌رچووین، له‌رێی كه‌شتییه‌وه‌ له‌ناو فه‌له‌ستینییه‌كانه‌وه‌ چووینه‌ سوریا، چونكه‌ له‌ كامپه‌كاندا ئێمه‌یان ده‌ستگیركرد، بۆیه‌ ئێمه‌ به‌ كۆنگره‌كه‌ رانه‌گه‌یشتین، ئیدی به‌مشێوه‌یه‌ كۆنگره‌ ته‌واو بوو.

پاشان كه‌ هاتم زانیاریم ده‌رباره‌ی كۆنگره‌ وه‌رگرت. له‌بنه‌ڕه‌تدا ئه‌و كۆنگره‌یه‌ له‌سه‌ر بنه‌مای بیره‌وه‌ری شه‌هیدبوونی هه‌ڤالان" **مه‌زلوم و كه‌مال، خه‌یری**" و هه‌ڤالانی دیكه‌ی زیندان و هه‌روه‌ها له‌سه‌ر بنه‌مای ئه‌نجامه‌كانی شه‌ڕی نێوان ئیسرائیل ـ فه‌له‌ستین و بڕیاره‌كانی كۆنفرانسی یه‌كه‌م سازدرابوو. ئه‌و بڕیاره‌ی یه‌كه‌مین كۆنفرانس وه‌ریگرتبوو كۆنگره‌ی دووه‌م به‌فه‌رمی كرد و خستیه‌ پراكتیكه‌وه‌. واتا له‌ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مه‌ بڕیاری

دیکەی وەرنەگرت، ئەو بڕیارەی وەرگیردرابوو بەفەرمیکرد و خستییە پراکتیکەوە. لەبنەڕەتدا ڕۆڵی ئەو کۆنگرەیە نەمەبوو.

بێگومان "سەمیر" و "داوود" و ئەوان، کە لە کۆنفرانسی یەکەمدا ئەنجامیان وەرنەگرتبوو، لەبنجینەدا هەموو هەوڵ و کاری خۆیان بۆ دوای کۆنفرانسەکە هێشتبووەوە، دوای کۆنفرانسەکە قورساییان دابووە سەر ئەوروپا، قورساییان دابووە سەر زیندانەکانی تورکیا. بۆ ئەوەی بتوانن ئەوروپا و زیندانەکان بخەنە دەستی خۆیانەوە. لەسەر ئەو بنەمایەش بتوانن کۆنگرە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، ئامادەکارییەکانی ئەوان لەسەر ئەم بنەمایە بوو.

کە شەڕی (١٩٨٢)ش ڕوویدا، ئەوان حیساباتی ئەوەیان کردبوو کە ئێمە لەو شەڕەدا زەبریشمان بەردەکەوێت، ئەو کاتە بە ئاسانی دەتوانن پارتی بخەنە دەستی خۆیانەوە. هەڵبەتە کاتێك کە ئێمە لە شەڕدا بووین، ڕاگەیاندنەکانی تورکیاش لەسەر تەڤگەر دەیاننووسی و پڕوپاگەندەیەکی مەزنیان لەدژی تەڤگەر دەکرد؛ کە گوایە تەڤگەر گورزی بەرکەوتووە، "سەمیر" و "داوود" و "باقی" و ئەوانی تریش ئەو چالاکییانەی خۆیان لە ئەوروپا بەهێز کردبوو. تەنانەت بەیاننامەیەکیشیان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی خۆیان ڕابگەیەنن و بڵێن:" ئێمە نوێنەرایەتی تەڤگەر دەکەین، ئێمە تەڤگەرین" واتا ئامادەکارییەکی بەو شێوەیان کردبوو، بەگوێرەی مەزندەی خۆیان لەرێگەی" حوسێن یڵدرم، شاهین دوجمەز، یڵدرم مەرکیت" و ئەوانی دیکە دەستیان خستبووە نێو زیندانەوە، هەوڵیان دەدا لەگەڵ ئەوانەی کەوا لەناو خیانەت دان بتوانن خیانەتکاری زاڵ بکەن و زیندانییەکان بێکاریگەر بکەن و زیندان بخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. هەروەها لە ئەوروپا هەوڵیان دابوو و کاریان کردبوو و حیسابیان کردبوو کە ئەوروپاش بەدەستی ئەوانەوەیە. ئەوەی دەمێنێتەوە خۆرهەڵاتی ناوین (سوریا ـ لوبنان )ە. ئەگەر لە خۆرهەڵاتی ناوین تەڤگەر گورزی بەربکەوێت، ئەوا سەرۆکیش لاواز دەبێت و بەمەش دەتوانن بەئاسانی جموجۆڵ بکەن. بەیاننامەیەکی بەمجۆرەیان ئامادەکردبوو. کاتێك کە بینیان ئێمە لە شەڕدا زەبرێکی ئەوتۆمان بەرنەکەوتووە، ڕاستە ئێمە هەندێك شەهید و دیلمان داوە بەڵام زۆر کەم بووە. تەنانەت تەڤگەر زەبری بەرنەکەوتووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەڤگەر لەو دۆخە و لەو شەڕ و شۆڕەدا

ئیعتبارێکی مەزنتری بۆ خۆی خوڵقاندووە، توانستی زۆر مەزنتری بۆ خۆی ئافراندووە، ئەو کاتە ئەو بەیاننامەیە بڵاوناکەنەوە و ئەو هەنگاوە ناهاوێژن و دەڵێن:" با ئێمە بچینە کۆنگرە و لە کۆنگرەدا بەئەنجام بگەین. ئەگەر ئێمە نەچینە کۆنگرە و هەروا خۆمان رابگەیەنین، ئەو کاتە ناتوانین ئەنجام بەدەست بخەین" ئیدی بەم ئامادەکاری و بەم مەیلەوە بەشداری لە دووەمین کۆنگرە دەکەن.

بێگومان ئەو کاتە "داوود" دەستگیر کرابوو، چونکە هەندێك هەڤاڵی شەهید کردبوو و زانیاری هەڵەی سەبارەت بەو هەڤاڵانەی بە رێکخستن دابوو. بۆیە لەسەر ئەو بنەمایە لێکۆڵینەوە (تحقیق) لەگەڵیدا کرا و دەستگیرکرا. "سەمیر" و "باقی"یش چەند هەڤاڵێك لەگەڵ خۆیاندا دەبەن و دەچنە لای سەرۆك تاکو لەگەڵ سەرۆك قسە بکەن و بڵێن:" یان ئەو ئێمە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەستنیشان دەکەین و دەبێت تۆش پەسندی بکەیت، تۆش دەکەینە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، یان ئەگەر ئەمە پەسند ناکەیت ئەوا ئێمە رێکخستن پارچە دەکەین ..." بۆ ئەوەی بەم هەڕەشەکردنە بتوانن هەموو شتێك بە سەرۆك بە پەسندکردن بدەن و سەرۆك بێکاریگەر بکەن و تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. تاکتیکێکی بەمجۆرەیان لەپێش خۆیان دانابوو. ئەوانە دەچنە لای سەرۆك و دەڵێن:" دەمانەوێت لەگەڵتدا هەندێك قسە بکەین" سەرۆکیش دەڵێت:" قسەیەك کەوا من لەگەڵ ئێوەدا بیکەم نییە، ئێمە وا بەرەو کۆنگرە دەچین و لەنێو کەشی کۆنگرە داین، هەرچییەکی دەخوازن بئاخفن لە کۆنگرەدا دەتوانن بئاخفن و باسی بکەن، با هەر کەسێکیش لە قسەی ئێوە تێبگات کە چییە و چی نییە؟ شتی هەرە راستیش ئەمەیە. ئیدی بەرپرسیارێتی منیش کۆتایی هاتووە. چونکە وا بەرەو کۆنگرە دەچین، شتێك کە ئێوە بەجودا لەگەڵ مندا بئاخفن نییە..."

بێگومان سەرۆك لە تاکتیکی ئەوان تێدەگات. ئەو هەڤاڵانەی کە لەگەڵ "سەمیر" دەچنە لای سەرۆك، سەرۆك ئەوان وریا دەکاتەوە. بێگومان ئەو هەڤاڵانە تا ئەو کاتە نازانن کە "سەمیر" دەخوازێت چی بکات، کاتێك کە سەرۆك بەمشێوەیە قسە دەکات ئەو کاتە تێدەگەن کە هەڵەیان کردووە، بەمەش دەستبەرداری "سەمیر" دەبن. ئەو تاکتیکەی "سەمیر" هەر لە هەنگاوی یەکەمدا لەوێ ژێر دەکەوێت.

دووەمینیش؛ حیسابی ئەوان لەسەر "داوود"ە، کە "داوود" بخەنە پێش و بیدەنە ئاخافتن، بەڵام "داوود"یش لەبەر ئەوەی دەستگیرکراوە و لەژێر لێکۆڵینەوە دایە، ناچار دەبن خۆیان دەربکەونە پێش و بئاخفن. کاتێك لە کۆنگرەدا قسە دەکەن، هەڤاڵ عەباس (دوران کاڵکان) رادەبێ و وەڵامی ئەوان دەداتەوە. فاتمە (کەسیرە)ش ئەو کاتە هەندێك قسە دەکات. "فاتمە" خۆی وانیشان دەدات کە گوایە لەگەڵ سەرۆك و ئەوانە دایە و پارتی دەپارێزێت. بەڵام لەبنەمادا دەخوازێت ناکۆکی نێوان هەڤاڵ "عەباس" و "سەمیر" بەهێز بکات، ئەویش حیساباتێکی وەها بەرێوە دەبات.

بێگومان هەڤاڵ "عەباس" رەخنەی "فاتمە"ش دەکات. سەرۆك سەرەتا دەنگ ناکات و دەڵێت:" با هەر کەس قسەی خۆی بکات و بەدیار بکەوێت، هەرکەس بیر لەچی دەکاتەوە و دەخوازێت چیبکات..." ئیدی "سەمیر" و "فاتمە" قسە دەکەن، هەڤاڵ "عەباس"یش لەدژی ئەوان قسە دەکات، ئیدی کەمێك شتەکان زەلال و ئاشکرا دەبن.

دوای ئەمە سەرۆك لە کۆنگرەکەدا قسە دەکات، لە ئاکامی ئاخافتنی سەرۆکدا؛ هەم ئەو تاکتیکەی "سەمیر" بەرێوەی دەبات و هەمیش ئەو تاکتیکەی "فاتمە" بەرێوەی دەبات زەبریان بەردەکەوێت و پووچەڵ دەبنەوە، راستینەی ئەوان ئاشکرا دەبێت. بۆیە ناتوانن لە کۆنگرەدا ئاڵۆزی و ئاژاوە بنێنەوە و پارچەبوون دروست بکەن، ناتوانن هەرەشە و گورەشە بکەن و تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە راستینەی ئەوانە بەتەواوی دەردەکەوێت و راستینەی سەرۆك و رێبازی پارتی لە کۆنگرەدا زاڵ دەبێت.

هەموو تەقەللای ئەوان چییە؟ تەقەللای ئەوان هەمووی ئەوەیە کە ئەو بڕیارەی لە یەکەمین کۆنفرانس وەرگیراوە، دووەمین کۆنگرە بەفەرمی نەکات و نەیخاتە پراکتیکەوە. تەنانەت "سەمیر" ئەو کاتە دەڵێت:" هەر کەسێك بچێتە هەکاری، بچێتە هەرێمی بۆتان ئەوا دەمرێت" دەخوازێت ترسێك دروست بکات، بۆ ئەوەی بڕیارێکی وەها دەرنەچێت، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر کار و تەقەللا دەدات. بێگومان کۆنگرە بڕیاری کۆنفراس پەسند دەکات و دەیخاتە پراکتیکەوە. بۆیە نیاز و تەقەللا و پیلان و تاکتیکەکانی "سەمیر" و ئەوان هەمووی پووچەڵ دەبێتەوە.

لەم کۆنگرەیەدا تەدبیرێکیش وەردەگیردرێت، ئەو تەدبیرەش ئەوەبوو؛ لەکۆنگرەدا ئەو کۆمیتە ناوەندییەی لەکۆنگرە هەڵدەبژێردرێت بە کۆمیتەیەکی ناوەندی کاتیی لەقەڵەم

دا، بەڵام تا ساڵێك با كار بكات، دوای ساڵێك دەستنیشان بكرێت كە كێ ببێتە ئەندامێكی فەرمی كۆمیتەی ناوەندی و كێش نەبێتە ئەندام. بۆ ئەمەش كۆنگرە دەسترۆیی ئەم دەستنیشانكردنەشی دایە سەرۆك. واتا سەرۆك سەیری كار و پراكتیك و چەمكی ئەو ئەندامانە بكات كە كێ گونجاوە و كێ گونجاو نییە، ئەو بڕیار بدات. كۆنگرە تەدبیرێكی بەمجۆرەی وەرگرت. بۆچی كۆنگرە تەدبیرێكی بەمجۆرە وەردەگرێت؟ چونكە دەبینرێت كە رەوشی هەندێك لەو ئەندامانەی كۆمیتەی ناوەندی روون و زەلال نییە، بۆیە ئەم تەدبیرە وەردەگیردرێت. واتا بۆ ئەوەی لەسەر پارتی مەترسییەك دروست نەبێت. بۆ نموونە؛ "سەمیر" و ئەوانی تر لە كۆنگرەوە هەنگاو بەرەو دواوە دەنێن، چونكە دەبینن ئیدی ناتوانن ئەنجام بەدەستبخەن، واز لە تەقەللای خۆیان دەهێنن و هەنگاو بۆ دواوە دەنێن و ناچار خۆیان وەها نیشان دەدەن كە تەقلی بڕیاری كۆنگرە دەبن. بێگومان كۆنگرە دڵنیا نییە لەوەی تا چەند لەمەدا راستگۆن یان نا. بۆیە بەئیحتیات (تەدبیر) لێیان نزیك دەبێتەوە. لەسەر ئەو بنەمایە كۆنگرە بڕیار دەدات:" هەركەسێك كە ببێتە ئەندامی كۆمیتە ناوەندی ئەندامێتیان لە كۆمیتەی ناوەندی دا كاتییە، تا ساڵێك ئەنجامدانی كار و پراكتیك، دوای ساڵێك سەرۆك بڕیار دەدات كە كێ بەفەرمی ببێتە ئەندامی كۆمیتەی ناوەندی و كێش نابێتە ئەندام". ئیدی ئەم تەدبیرە وەردەگرێت. ئەو تەدبیرە تەدبیرێكی لەجێی خۆی دایە.

بێگومان لە مێژووی هیچ حزبێكدا مرۆڤ ئەمە نابینێت، بەڵام لە مێژووی (PKK)دا مرۆڤ ئەمە دەبینێت. بۆچی (PKK) تەدبیری بەمجۆرە وەردەگرێت؟ چونكە (PKK) بەتەواوی بەرژەوەندی گەل بەبنچینە وەردەگرێت، رەنجی گەل بەبنەما وەردەگرێت، بۆ ئەوەی كەس یاری پێنەكات، بۆ ئەوەی ئەو رەنجە بەفیڕۆ نەچێت. (PKK) سەركەوتنی گەل بەبنەما وەردەگرێت، لەپێناو سەركەوتنی گەل و پاراستنی رەنج و بەدیهێنانی ئامانجەكانی گەلدا چ پێویست بێت ئەوە بەبنەما وەردەگرێت، بۆیە تەدبیری وەهاش وەردەگرێت. ئەگەر (PKK) لەدووەمین كۆنگرەدا تەدبیری وەرگرت بۆ ئەو مەبەستە بوو. واتا بۆ ئەوەی كەس دەسترۆیی (صلاحية) لەدژی تەڤگەر و لەدژی رەنج بەهەڵە بەكار نەهێنێت. ئەمە بۆ مەبەستێكی وەها بوو. لەبەر ئەوە بڕیارێكی لەجێی خۆیدا بوو.

ئیدی دوای کۆنگرە، ئەو کۆمیتەی ناوەندییەی کە لە کۆنگرەدا هەڵبژێردرا کۆبووەوە، رێك ئەو کاتە من گەیشتم. چونکە ئەو کاتە لە کامپەکان دەرکەوتین و گەیشتینە هەفالان، من تەفلی کۆبوونەوە بووم، لەکۆبوونەوەکەشدا ئەو بڕیارەی کۆنگرەمان بەبنەما وەرگرت و ئێمە هەندێك گفتوگۆمان کرد، ئەرك و کارەکانمان لەناو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و هەندێك لە هەفالانی دەرەوەی کۆمیتەی ناوەندی دابەشکرد، هەروەها ئێمە دەستڕۆییمان بەتەواوی دایە سەرۆك، بۆ ئەوەی سەرۆك بتوانێت کار بکات، دوو هەفالیش وەك یاریدەدەری سەرۆك دەستنیشان کران. ئەرك و کارەکانمان بەوجۆرە لەناو کۆمیتەی ناوەندی دابەش کرد. پیلاننامەیەکیشمان بۆ ماوەی ساڵێك دارشت، بۆ ئەوەی تەفگەر بتوانێت گروپەکان لە لوبنانەوە رەوانەی وڵات بکات و لە وڵاتدا جێگیری بکات و پلانرێژی ئەوەش کرا کە چ کارێك بکرێت بۆ سەنگەربەندی تەفگەر لە لوبنانەوە تادەگاتە هەرێمی بۆتان، گواستنەوەی گروپەکان چۆن ئەنجام بدرێت، ئەو تاکتیکەی بەرێوەی دەبەین تاکەی بەردەوام بێت. لەسەر ئەو بنەمایە پیلاننامەیەك دارێژرا. ئەو کاتە گووتبوومان کە؛" کەمتر لە شەش مانگ تا ساڵێك پێویستە جێگیربوون (تمرکز) تەواو ببێت و تاکتیکی پروپاگەندەی چەکداری بەرێوە بچێت، لەپێناو پەیرەوکردنی ئەو تاکتیکە چ ئەرکێك لەئەستۆ بێت پێویستە جێبەجێ بکرێت، لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین دەربازی گەریلایی ببین و شەڕی گەریلایی دەست پێبکەین و رایبگەیەنین. ئیدی پیلاننامەیەکی بەمجۆرە دارێژرا و ئەرکی پێکهێنانی ئەو پیلاننامەیەمان لە پراکتیکدا بۆ دەستڕۆیی سەرۆك هێشتەوە و دابوومانە دەستی ئەو. لەسەر ئەو بنەمایە هەموو ئەرکسپاردن و سەنگەربەندی و پراکتیکێکمان پێشخست...

**یەکەم گروپ کە دەگەڕێتەوە وڵات، وا مەزەندە دەکەم بە فەرماندەیی هەفاڵ شاهین کلاوز دەبێت، بەڵام ئەو گروپە لە گەڕانەوەیاندا بۆ وڵات هەموویان شەهید دەبن. ئەو شەهیدبوونە چۆن روودەدات؟ پاشانیش چ تەدبیرێك وەردەگیردرێت بۆ ئەوەی یەکینەکانی دیکەی گەریلا بەسەلامەتی دەربازی وڵات ببن؟**

بێگومان لەدەرکەوتن بۆ دەرەوەی وڵات، لەژیانبوون لەدەرەوە، لە گەڕانەوەشدا بۆ وڵات ئەگەر بە بەرپرسیارێتی و بەهوشیاری و بەجددی هەڵسوکەوتمان نەکردبایە، لەوانەبوو، قوربانی زۆر گران و مەزنمان دابایە. لەلایەنی بیر و رامانەوە بگرە تا دەگاتە لایەنە رێکخستنی و پراکتیکییەکەی، ئەو تەدبیرانەی پێویستبوو، وەربگیردرێن، هەموویمان وەرگرتبوو، بۆیە ئێمە زێدە زیان و قوربانیمان نەدا. ئەو زیان و قوربانیانەی ئێمە داومانە، ئاساین، بەگوێرەی ئەو دۆخ و توانستانەی لەئارا دابوون، زێدە و گران نین.

بێگومان ئێمە هەموو هەوڵێکمان ئەوەبوو کە هیچ زیان و قوربانییەك نەدەین، ئەمەش مومکین نییە، لەبەر ئەوەی ئێمە کار و خەباتمان دەکرد، زیان و قوربانیمان دەدا. واتا تۆ هێندە کەس لە وڵات دەربخەیت و بە وڵاتاندا دەربازیان بکەیت و لە دۆخی شەڕدا بژیت و لەناو بێ ئیمکانییەتیدا بیت، هەروەها بە وڵاتان و سنوورەکاندا تێبپەڕیت و بیانگەڕێنیتەوە وڵات، بێگومان ئەمە هەروا ئاسان نەبوو. کاتێك ئێمە دەستمان بەناردنەوەی گروپەکان کرد بۆ وڵات لەو جموجۆڵەماندا هەندێك قوربانیمان دا، گروپی هەڤاڵ "شاهین کلاوز" و گروپی هەڤاڵ "فەرحان" شەهیدبوون. واتا نزیکەی یازدە هەڤاڵمان شەهید بوون، لەدەربازکردنی هەموو گروپەکان بۆ وڵات، هەشت هەڤاڵ لەگەڵ گروپی هەڤاڵ "شاهین کلاوز" بوو لە"چەمی هیزل"دا کاتێك دەپەڕینەوە لای باشووری مەزن، کەوتبوونە بۆسەوە، ئیتر ئەو هەڤاڵانە لە "چەمی هیزل"دا شەهیدبوون. واتا هەندێکیان لە کەنار چەمەکە و هەندێکیشیان لەناو چەمەکەدا لە بۆسەیەکدا تورکیا لەو هەڤاڵانەی دا، ئیدی ئەم گروپە هەمووی بەفیشەکی تورکیا شەهید بوون، بێگومان لەگەڵ ئەو گروپەدا کەسێك هەبوو ناوی "عومەری لالێ"بوو ئەو کەسە پیاوی (پ د ك) بوو، هەمیش قاچاخچی بوو، ئەو چاوساخی بۆ هەڤاڵان دەکرد. بێگومان ئەو کەسە رزگاری بوو، نە گیرا و نە کوژرا، کەچی هەڤاڵانی گروپەکە هەمووی شەهید بوون، ئێمە زۆر لەسەر ئەو رووداوەش راوەستاین؛ ئایا ئەو کەسە ئەو گروپەی خستۆتە بۆسەوە و بەکوشتنی داون، یان بەرێکەوت ئەو کەسە رزگاری بووە؟ تەواو دیار نەبوو، بەڵام گومانی ئەوە هەبوو کە ئەو کەسە ئەو گروپەی بەکوشتن دابێت. هەروەها ئەو کاتە هەندێك زانیاری تر هەبوو؛ کە "پارتی گەل"ی "سامی عەبدولڕەحمان" کە ئەو کاتە لە (پ د ك) جودا ببووەوە و دەگووترا کە ئەو پارتییە ئیخباریان لەسەر ئەو گروپەمان

کردووه و بەکوشتنیان داون، ئێمە زۆر لەسەر ئەو مەسەلەیە راوەستاین، بۆ ئەوەی بزانین کە کامیان راستە؟ بێگومان بەتەواوی نەمانتوانی دەستنیشانی بکەین. ئەو گروپە بەمجۆرە هەموویان شەهیدبوون، بێگومان هەشت هەڤاڵ بوون، بۆ ئێمە زیانێکی مەزن بوو، هەشت هەڤاڵ بەوجۆرە پێکەوە شەهید ببن. هەروەها پاشان هەڤاڵێك بەتەنیا کە لەسەر سنووری باکوور رابەرێتی (دەلیلی) دەکرد، کەوتە بۆسەوە و شەهید بوو، دوو هەڤاڵیش یەکێکیان هەڤاڵ "فەرحان" بوو و هەڤاڵێکی دیکە گروپەکانی لەسەر سنوور دەرباز دەکرد شەهیدبوون. بەمجۆرە لەم قۆناخەدا یازدە شەهیدمان دا.

**ئیدی دوای ئەوەی هەندێك لە هەڤاڵان دەگەنە وڵات و لەسەر سنوور کامپ دروست دەکەن و ئامادەکاری بۆ تێکۆشانی چەکداری دەکەن. لەو ئامادەکارییانەوە تا دەگاتە هەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) واتا ساڵانی (٨٢ و ٨٣ و٨٤) ئەو ئامادەکارییانە چۆن ئەنجام دەدرا؟ ئەو مەیل و نزیکبوونەوانەی ئەو کاتە دەردەکەوتن چیبوون؟ رۆڵی هەڤاڵ "عەگید" (مەعسوم قۆرقماز) لەو ئامادەکارییانە چیبوو؟ بەگشتی وێڕای ئاستەنگی و زەحمەتییەکان ئەو ئامادەکارییانە دەگاتە چ ئاستێك لەناو وڵاتدا؟**

تا هەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) ئەو گروپانەی ئێمە لەدەرەوە بۆ ناو وڵات ناردبوومان و بەسەلامەتی گەیشتبوون، هەموویان جێگیربوون... هەندێك لە باشووری کوردستان و هەندێکی تریش لە باکووری کوردستان، هەر تەنیا لەسەر سنوورەکان نا، بەڵکو هەندێك لە گروپەکانی ئێمە چووبوونە ناو هەرێمی بۆتانەوە. واتا لەدەرەوەی شەهیدبوونی گروپی هەڤاڵ "شاهین کلاوز"، ئەوانەی باسم لێیانەوە کرد، تەواوی گروپەکانی دیکەمان بەساخی گەیاندبووە وڵات و جێگیریشمان کردبوون. ئیدی هەڤاڵان چووبوونە هەرێمی بۆتان و هەرێمەکەیان ناسی بوو، پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکی ئەوێ

پێشخستبوو، ئەركی پڕوپاگەندەی چەكداریش بەدیهاتبوو، پێویستبوو ئیدی دەربازی گەریلایی ببووینایە، بەڵام ئەمە تا دەهات درەنگتر دەكەوت. بۆچی درەنگ دەكەوت؟ ئەو كاتە بەڕێوەبەرایەتی پراكتیكی لە وڵات هەمیشە هەنگاوەكانی بۆ دواوە رادەكێشا. بە چ بیانوویەك؟ ئیتر دەیانگووت:" ئامادەكاری تەواو نەبووە، پێویستە ئەو كادیرانە بە پەروەردەیەكی دیكەشدا تێبپەڕن، وەها نەبێت ئێمە ناتوانین هەنگاوی گەریلایبوون بهاوێژین.." بەم بیانووانە ئەو هەموو هەنگاوانەی هاوێشترابوون بۆ دواوەی دەگەڕاندەوە.

بۆ نموونە؛ ئەو كادیرانەی كە لە باكوور خۆیان جێگیركرد بوو، هەموویان راكێشایەوە بۆ باشوور، بۆ ئەوەی لەوێ پەروەردەیەكی دیكە ببینن. ئەمە لەكاتێكدا ئەو كادیرانە لە لوبنان پەروەردەیان بینی بوو، پەروەردەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، رێكخستنی و عەسكەریان بینیبوو، گرفتی پەروەردەییان نەبوو، گرفتی كادیران ئەوەبوو كە تۆ لەپراكتیكدا زیاتر بەرەو پێشەوەی ببەیت، گرفت ئەوەبوو ئەو بڕیارەی تەڤگەر وەریگرتبوو پێویستبوو بكەوێتە پراكتیكەوە، بۆیەش پێویستبوو، خەباتی پڕوپاگەندەی چەكداری تەواو ببایە و هەنگاوی گەریلایی پێشكەوتبایە. ئەركیش هەر ئەوەبوو، گرفتیش هەر ئەوەبوو. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی پراكتیكی ئەو كاتە ئەمەی نەخستبووە پێش خۆی و ئەو هەنگاوەی نەهاوێشت. لەنێو بێ بڕیارییەكدا بوو، مەسەلەكە ئەوەبوو، بەڵام ئەمەشی بە ئاشكرا نەدەگووت. ئەی چی دەگووت؟ دەیگووت:" كادیر هێشتا ئامادە نییە كە شەڕی گەریلایی پەرەپێبدات. بۆیە پێویستە ئەمانە بە پەروەردەیەكی نوێدا دەرباز بكەینەوە، ئامادەیان بكەین تاكو بتوانین ئەو هەنگاوە بهاوێژین..."

بێگومان سەرۆك ئەمەی پەسند نەكرد و رەخنەی كرد. ئەو كاتە بەڕێوەبەرایەتی پراكتیكی هەمیشە تەڤگەری رادەكێشایە باشوور و رایدەكێشایە ژێر كۆنترۆڵی (پ د ك)وە. (پ د ك)ش دەیخواست تەڤگەر لە باشوور بهێڵێتەوە و لەژێر كۆنترۆڵ و چاودێری خۆیدا بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو هەموو كادیرانە بكاتە چەكداری خۆی و بیخاتە نێو شەڕەوە و بەگوێرەی ئامانجی خۆی بەكاریان بهێنێت. بۆ ئەوەی ئێمە بۆ باكوور هەنگاو نەهاوێژین و لەژێر كۆنترۆڵی ئەواندا دەرنەكەوین و نەبینە تەڤگەرێك. (پ د ك) وەها نزیك دەبووەوە. تەنانەت لەهەرێمی "حەفتانین"دا گروپەكانی ئێمەیان خستبووە ناو

گروپەکانی خۆیانەوە لەدژی ڕژێمی سەددام خستبوویانە نێو جموجۆڵەوە. ئەو کاتە "سادق عومەر" بە هەڤاڵانیشی گووتبوو:"حەیفە و گوناهە، بۆچی ئەو هەڤاڵانە دەخەنە خزمەتی (پ د ك)وە؟ ئێوە هەڵەیەکی مەزن دەکەن"بەمشێوەیە رەخنەی هەڤاڵانی کردبوو. ئاگاداری کردبوونەوە. هەڵبەتە ئەمە مەترسییەکی مەزن بوو. سەرۆك لەبەر ئەمە رەخنەی بەڕێوەبەرایەتی پراکتیکی دەکرد. بۆیە دەیگووت:" ئەو کارەی ئێمە پێشمانخستووە ئێوە بەرەو دواوەی دەگەڕێننەوە و پووچەڵی دەکەنەوە، هەر تەنیا پووچەڵی ناکەنەوە، تەنانەت تەڤگەر دەخەنە ژێر کۆنترۆڵی (پ د ك)شەوە، ئەمە مەترسیدارە و پێویستە ئێوە ئەمە نەکەن، پێویستە ئێوە هێزەکانمان لە باکوور جێگیر بکەن. ئێوە پێویستە لە باکوور شەڕی گەریلایی پێشبخەن، لەبەر ئەمە بوو بەڕێوەبەرایەتی پراکتیکی ئەو کاتەی رەخنە دەکرد و دەهاتە سەر بەڕێوەبەرایەتی.

بێگومان ئەو کاتە هەڤاڵ عەگید (مەعسوم قۆرقماز) زێدەتر لە باکوور دابوو، لەنێو ئامادەکاری جێگیر کردنی گەریلا دابوو، دەیخواست گەریلا بەرەو پێشەوە ببات. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی پراکتیکی نەیدەخواست ئەو هەنگاوە بهاوێژێت، دەترسا، دەیگووت:" ئەگەر ئێمە ئەو هەنگاوە بهاوێژین تۆبڵێی (عجباً) چیمان بەسەر دێت؟" دەوڵەتی تورکیا و سوپای تورکیایان زۆر مەزن دەبینی. هەروەها مەترسی (پ د ك)یان هەبوو دەیانگووت:" ئەگەر ئێمە هەنگاو بهاوێژین ئەوا لەوانەیە (پ د ك)ش هێرشمان بکاتە سەر. ئەو کاتە ئێمە چیبکەین؟ لەهەرێمی بۆتانیشدا هەندێك پەیوەندی (پ د ك) هەیە، لەوانەیە (پ د ك) و تورکیا پێکەوە ئەو هەرێمە لەسەر ئێمە دابخەن، ئەو کاتەش ئێمە زەبرمان بەردەکەوێت." لەبنچینەدا لەنێو ئەو ترسەدابوون، بۆیە نەیانەدەخواست ئەو هەنگاوە بهاوێژن. بەڵام وا نیشانیان دەدا کە گوایە؛" کادیران هێشتا ئامادە نین کە ئێمە هەنگاوێکی بەمجۆرە بهاوێژین، پێویستە ئێمە کادیران ئامادە بکەین." بەمشێوەیە کادیران تەنانەت ئەوانەش کە لە باکوور جێگیر ببوون، هەموویان رادەکێشنە باشوور.

بۆ ئەوەی ئەمە بە سەرۆك بە پەسندکردن بدەن کۆبوونەوەیەکیش سازدەکەن، لەگەڵ ئەنجامی ئەو کۆبوونەوەیەدا هەڤاڵ "عەباس" و ئەوان هاتبوونە گۆڕەپانی سەرۆکایەتی. بێگومان کاتێك بەو ئاکامەی کۆبوونەوەکە هاتبوون، سەرۆك رێگەی نەدا هەڤاڵ

"عەباس" و ئەوان ئەو چەمك و مەیلە بەویش بە پەسندكردن بدەن، سەرۆك ڕێگیری لەمە كرد.

هەڵبەتە ئەو كاتە لەوێش كۆبوونەوەیەكی ناوەندی لە شام لەسەرەتای ساڵی (١٩٨٤)دا سازدرا. لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا ئەو كۆبوونەوەیە كۆبوونەوەیەكی زۆر گرنگە. پاشان كۆنگرەی سێیەمین سازدرا ئەو شتەی لەكۆنگرەی سێیەمیندا قسە و باسی لەسەر كراوە و ڕەخنە كراوە و بڕیاری لەسەر دراوە هەمووی لەو كۆبوونەوەیەدا سەرۆك باسی كردبوو. لەو كۆبوونەوەیەدا ڕەخنەی زۆر بەهێز پێشكەوت، لەسەر كۆمیتەی ناوەندی و بەڕێوەبەرایەتی و هەر هەڤاڵێكیش، سەرۆك هەم ڕەوشی كۆمیتەی ناوەندی، هەم بەڕێوەبەرایەتی و هەر هەڤاڵێكیشی هەڵسەنگاند. لەو كۆبوونەوەیەشدا ڕەخنەدان پێشكەوت. هەروەها ئەو پراكتیكەی لە وڵاتدا بەڕێوەچووە و هەڵوێستی بەڕێوەبەرایەتی پراكتیكی ڕەخنەكران، جارێكی تر سەرۆك زۆر بەروونی و ئاشكرایی ئەو هەنگاوەی كە پێویستە بهاوێژرێت خستیەوە پێش تەڤگەر، هەمیش جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە پێویستە ئیدی دوا نەخرێت.

هەر لەو كۆبوونەوەیەدا سەرۆك هەڵسەنگاندنی سۆسیالیزمی بنیادنراو (الاشتراكية المشيدة)ی كرد. پارتە كۆمۆنیستەكانی هەڵسەنگاند و ڕەخنەی زۆر بەهێزی لەسەر ئەوان پێشخست. سەرۆك گووتی: "ئەو پارتە كۆمۆنیستانە هەرچەندە بەخۆیان دەڵێن پارتی كۆمۆنیست، هەر تەنیا ناوی ئەوان كۆمۆنیستە، بەڵام دوورن لە كۆمۆنیزمەوە، یان پێویستە خۆیان سەرلەنوێ بنیادبنێنەوە، یانیش با خۆیان هەڵبوەشێننەوە، ئیتر ئەمانە نوێنەرایەتی سۆسیالیزم ناكەن، بەڵكو بۆ خۆیان كۆسپێكی مەزنن لەبەردەم سۆسیالیزم". ڕەخنەی وەها مەزنی ئاراستە كردوون.

لەلایەنی ڕێكخستنیشەوە سەرۆك چەمكی نوێی لەناو (PKK)دا پێشخست. واتا لەم كۆبوونەوەیەدا كەمێك (PKK)ی لەژێر كاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو دوورخستەوە، بۆیە ئەم كۆبوونەوەیە گرنگە. سەرۆك هەڵسەنگاندنی وەها بەهێزی پێشخست، لەرووی ڕەوشی سیاسییەوە، سەبارەت بە سۆسیالیزم، ڕێكخستن و بەڕێوەبەرایەتی ڕێكخستن، سەبارەت بە تاك بە تاكی هەڤاڵان، بۆیە ئەو ئەركەی كە كۆنگرەیەك جێبەجێی بكات ئەو كۆبوونەوەیە جێبەجێی كرد.

تا ئەو كاتە من لە سوریا بووم، دوای ئەم كۆبوونەوەیە منیش هاتمە وڵات، ئیدی لەدوای ئەم كۆبوونەوەیە هەموو هەوڵێكمان بۆ ئەوە بوو كە بتوانین گەریلایی پێشبخەین و ئەو هەنگاوە بهاوێژین، بۆ ئەوەی ئێمە تفەنگەر لەژێر كاریگەری و كۆنترۆڵی (پ د ك)دا نەهێڵین و لەسەر ئایدیۆلۆژیا و ئامانجی خۆی هەنگاو بهاوێژێت و ئەو پیلاننامەیەی لەپێش خۆیدا دایناوە جێبەجێی بكات.

ئێمە كە هاتین هەندێك كۆبوونەوەمان ئەنجام دا، پێویستبوو ئەو هەنگاوەمان هاوێشتبایە، بەڵام دیسان درەنگ كەوت، سەرۆكیش تەعلیماتی نارد و رەخنەی ئەمەی كرد و هەندێك هەڤاڵی نارد وەك هەڤاڵ "فوئاد" و چەند هەڤاڵێكی دیكە. لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەدا تەعلیماتی نوێی ناردبوو. ئێمە ئەو كاتە لەسەر ئەو تەعلیماتەی سەرۆك كۆبوونەوەیەكمان لە "لۆلان" سازدا، بڕیاری هەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)مان لەو كۆبوونەوەیە وەرگرت، ئەو كاتە هەڤاڵ "عەگید" لە باكوور بوو، بۆیە تەڤلی ئەو كۆبوونەوەیە نەبوو، هەڤاڵانی كۆمیتەی ناوەندی ئێمە شەش یان حەوت هەڤاڵ دەبووین، لەو كۆبوونەوەیە ئامادەبووین، تەعلیماتی سەرۆكمان تێدا خوێندەوە و گفتوگۆمان لەسەری كرد و لەوێدا بڕیارمان وەرگرت كە لە (١٤)ی تەمموزی (١٩٨٤)دا لە ناوچەكانی "ئەروە، شەمدینان، چەتاخ"جولانەوەی چەكداری گەریلا بەفەرمی بەناوی تفەنگەرەوە رابگەیەنین. بەڵام ئێمە بینیمان كە كات زۆر كەمە. چونكە لەمانگی حوزەیرانی هەمان ساڵدا ئەو كۆبوونەوەیەمان سازدابوو، پێڕاناگەین ئامادەكارییەكان تا (١٤)ی تەمموز تەواو بكەین. بۆیە ئێمە گووتمان (١٥)ی ئاب هێزی رزگاری كوردستان (HRK ) و تێكۆشانی گەریلایی رابگەیەنین، ئەو بڕیارە و ئەو رێكەوتەمان لەوێ دەستنیشانكرد.

ئێمە بۆچی (١٤)ی تەمموزمان بەبنچینە وەردەگرت؟ چونكە لە (١٤)ی تەمموزدا رۆژی دەستپێكردنی چالاكییەكەی هەڤاڵان " محەمەد خەیری دوورموش، كەمال پیر، عاكف پەڵماز و عەلی جیچەك"بوو، ئێمە دەمانخواست (HRK) لەو رێكەوتەدا رابگەیەنین، لەو رێكەوتەدا چالاكی سەر شارۆچكەكانی"ئەروە، شەمدینان، چەتاخ" دەستپێبكەین. بۆ ئەوەی ئێمە ئەو چالاكییەی زیندانی ئامەد بكەینە بناخەی ئەو هەڵمەتە. بەمەش ئەم شۆڕشگێڕە مەزنانە، ئەو هەڤاڵە مەزنانە بەنەمری بهێڵینەوە، ئەمە بۆ بیرەوەری ئەوان

بوو. ئەمە کولتوور و تایبەتمەندی ئەم تەڤگەرە بوو، هەر شەهیدبوونێکی مەزن پێویستە ببێتە قۆناخێکی نوێ، هەر شەهیدبوونێکی مەزن ببێتە هەڵمەتێکی نوێ. چونکە شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار" بووە هۆی ئەوەی کە (PKK) دابمەزرێت، شەهیدبوونی هەڤالان "مەزلوم، خەیری و کەمال" و ئەوانی دیکەش پێویستبوو ببایە هۆی راگەیاندنی تێکۆشانی گەریلایی، لەبەر ئەوە ئەم رێکەوتەمان بەبنچینە وەرگرت. بەڵام لەبەر ئەوەی کات کەم بوو و بەشی نەدەکرد، ئێمە رێکەوتی (١٥)ی ئابمان کردە بڕیار. ئامادەکارییەکان لەسەر ئەو بنەمایە ئەنجامدران. ئیدی بەمشێوەیە لەسەر ئەو ئامادەکاریانە هەڵمەتی (١٥)ی ئابمان راگەیاند و ئەنجامماندا...

**لەدوای بەرپابوونی کودەتای (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) و چوونە دەرەوەی وڵات، تەڤگەری (PKK) هەرچەندە لەدەرەوەی وڵاتیش دەمێنێتەوە؛ بەڵام لەلایەکەوە ئامادەکاری بۆ گەڕانەوەی وڵات و ئەنجامدانی هەڵمەتێکی گەریلایی دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە لەپێناو بەرەنگاربوونەوەی فاشیزمدا، کە کودەتاکە پێشیخستبوو، بانگەوازی بۆ ئاواکردنی بەرەیەکی دژە فاشیزم دەکات و لەم پێناوەدا هەوڵ دەدات. بۆچی ئەم بەرەیە؟ هێز و لایەنە چەپ و دیموکراتیخواز و کوردییەکان تا چەند وەڵامی ئەو بانگەوازییەیان دایەوە و کاریان بۆ کرد؟ ئەو پرۆژەیەی "بەرەی دژە فاشیزم" گەیشتە چ ئاستێك؟**

پێش کودەتای (١٢)ی ئەیلول وەك چۆن ئێمە ئەوەمان بینی و پێشبینیمان کرد لە تورکیادا حوکمێکی فاشیستی و عەسکەرتاری پێشدەکەوێت، ئەو کاتە خواستمان لەدژی ئەم کودەتا شیمانەکراوە، رێککەوتن پێشبخەین، هەرچەندە لەم پێناوەشدا کارمان کرد و

ئەنجامگیریش نەبوو، بەلام دوای ئەوەی کودەتا سەربازییەکە روویدا، لەدژی حوکمی فاشیستی ئەو هەلویست و نزیکبوونەوەیەی بەر لە کودەتاکە دەمانویست پێشیبخەین دیسان خواستمان بەهێزتر پێشیبخەین. چونکە بەر لە کودەتای (١٢)ی ئەیلول کەسێك باوەری نەدەکرد کە حوکمێکی فاشیستی و عەسکەرتاری پێشدەکەوێت، بەلام ئەوە روویدا و ئەو حوکمە فاشیستییە زۆر بەدژواری هێرشی هێنایە سەر گەل و تەڤگەرەکان، هەر تەنها دژ بەتەڤگەرە شۆرشگێرییەکان نا، بەلکو دژ بەتەڤگەرە لیبرالییەکانیش و دژی هەموویان هێرشی برد. تەنانەت پارتەکانی "**ئەجەوید**" و "**دیمیرەل**"شیان داخست و ئەوانیشیان خستە زیندانەوە، ئەو پارتانە پارتی دەولەتیش بوون، حوکمی فاشیستی هەموو شتێکی دابووە پێشخۆی و رایدەمالی، بە توندوتیژی، تیرۆر، گرتن، کوشتن، ئەشکەنجەدان، گرتنی پارتەکان و دامودەزگاکان بێسنوور پەیرەو دەکرد. بۆیە ئێمە خواستمان کەوا لەدژی حوکمی فاشیستی هەم لەئاستی تورکیا و هەمیش لەئاستی کوردستاندا رێککەوتن و بەرە پێشبخەین. ئێمە هەم لەگەل تەڤگەرەکانی چەپی تورك و هەمیش لەگەل هەندێك لەلایەنە کوردییەکان لەسەر ئەو بنەمایە پەیوەندیمان پێشخست و کەوتینە جموجۆلەوە.

لەگەل لایەنە کوردییەکان ئێمە هەندێ کۆبوونەوەمان ساز دا، بۆ ئەوەی بەرەیەکی نەتەوەیی لەدژی داگیرکەری فاشیست پێشبخەین، بەلام پێشنەکەوت. بۆچی پێشنەکەوت؟ ئەو پارتە کوردییانە نەیاندەخواست لەگەل ئێمە بەرەیەك ئاوا بکەن، لەدژی ئێمە رادەوەستان، لەبری ئەوەی لەدژی حوکمی فاشیستی رابوەستن لەدژی ئێمە رادەوەستان. بەر لەکودەتای (١٢)ی ئەیلولیش وەهایان کرد و لەدوای کودەتاکەش هەر لەسەر ئەو سیاسەتەی خۆیان بەردەوام بوون. دەیانگووت:" ئێمە لەگەل (PKK) هیچ رێککەوتن و بەرەیەك سازنادەین، باوەریمان بە (PKK) نییە، (PKK) خراپی دەکات و زەرەر دەداتە گەل" ئێمەش بەوانمان گووت:" بەمشێوەیە ئێوە ناتوانن (PKK) لاواز بکەن و ناشتوانن خۆتان ببنە خاوەن هێز، ئەگەر وەکو ئێوە دەلێن (PKK) خراپە و زەرەر دەداتە گەل پێویستە ئێوە لە (PKK) زۆر باشتر کار لەدژی داگیرکەری فاشیست پێشبخەن، ئەو کاتە ئەگەر راستن و خراپییەکی (PKK) هەبێت، دەتوانن بێکاریگەری بکەن و دەتوانن خۆشتان بەهێز بکەن و باوەری گەل بۆ خۆتان قازانج بکەن، رێی ئەمە

بەوە دەرباز دەبێت". هەروەها پێمانگووتن:" مادام ئێوە هێندە پێداگیری دەکەن و ناخوازن لەگەڵ ئێمە بەرمیەك سازبدەن ئێوە لەنێوان خۆتاندا قسە بکەن، کامەتان باوەڕیتان بەوی تر هەیە دەتوانن بەرمیەك لەنێوان خۆتاندا ساز بکەن، ئەگەر ئێوە لەئێمە بخوازن کە ئێمەش بکەوینە نێو ئەو بەرمیەوە دیسان ئێمە دەکەوینە نێو ئەو بەرمیەوە، ئەگەر ناخوازن لەگەڵ ئێمە رێککەوتن ئەنجام بدەن، ئێمە هەر رازین، ئەگەر ئێوە هیچ رێککەوتنێکیش لەگەڵ ئێمەدا نەکەن، ئەگەر ئێوە لەدژی حوکمی داگیرکەری فاشیست لەپراکتیکدا بەرمیەك ئاوا بکەن، ئەوا ئێمە دیسان پشتیوانی ئێوە دەکەین و هاوکاریتان دەکەین". ئێمە هەموو رێیەکمان خستبووە پێش ئەوانەوە، بۆیە ناچار بوون گووتیان:" ئێمە سەرەتا لەنێوان خۆماندا قسە و باسی لەسەر دەکەین، ئەگەر ئێمە گەیشتینە ئەنجامێك ئەوا پاشان بەئێوەش رادەگەیەنین" ئێمەش گووتمان:" باشە، ئێمە چاوەڕێی هەواڵی ئێوەین، ئێوە چۆنتان پێ باشە ئێمە وادەکەین" لەنێوان خۆیاندا ئاخفین و ئاخفین و ئاخفین... لەئاکامدا نە بۆخۆیان بەرمیەکیان ئاواکرد، نە هەواڵێکیان بۆ ئێمە رەوانە کرد، ئیدی بەمشێوەیە بێ ئاکام مایەوە. هەڵبەتە خۆیان نیازێکی وەهایان نەبوو، کەوا لەدژی داگیرکەری فاشیست شەڕێك و پراکتیکێك و خەباتێك پێشبخەن. هەر بۆیە نەیاندەخواست بەرمیەك ئاوا بکرێت. ئەوانە دەیانزانی کەوا ئەگەر بەردەوامی بەو کۆبوونەوانە بدەن، ئەوا ئێمە ئەوان ناچار دەکەین کە ئەو هەنگاوە بهاوێژن، ئەوان ئەمەیان دەزانی. بۆیە نەیاندەخواست بەرە ئاوا بکرێت و هەنگاوی وەها پراکتیکی بهاوێژن، ئیدی لەهەندێك بیانوو دەگەڕان و دەیانگووت:" ئێمە لەگەڵ (PKK)دا ناخوازین بەرمیەك ئاوا بکەین". بێگومان ئەگەر (PKK) نەبێت دەتوانن بۆ خۆیان وا ئیدارە بکەن و بیگوزەرێنن و کاتی خۆیان دەرباز بکەن. بەڵام لەگەڵ (PKK)دا ئاخافتن و پەیوەندی و کۆبوونەوە هەبێت و هەر کۆبوونەوەیەك (PKK) تێیبکەوێت مسۆگەر (PKK) دەخوازێت ئەنجامێك بەدەست بخات، ناهێڵێت هەروا کۆبوونەوە سازبدرێت و هیچ ئەنجامێکیش نەبێت، ئەوان ئەمەیان دەزانی. هۆیەك ئەوەبوو کە نەیاندەخواست ئەو کۆبوونەوانە وەها بەردەوام بکەن.

دووەمیش؛ ئەوانە لە (PKK) دەترسان. چونکە چ کار و خەباتێکیان نەبوو، بەر لەکودەتای (١٢)ی ئەیلولیش نەبوون، دوای کودەتاکەش خەبات و کار زۆر زەحمەتر ببوو،

پێویستبوو زۆر بەجورئەتەوە هەنگاویان بهاوێشتبایە. هێز و توانست و جورئەتێکی وەهاشیان نەبوو، دەترسان و دەیانگووت:" ئەگەر ئێمە لەگەڵ (PKK)دا کارێکی بەمجۆرە پێشبخەین، ئەوا ئێمە بەتەواوی دەتوێینەوە". بۆیە نەیاندەخواست لەگەڵ (PKK)دا بەرە یان رێککەوتنێك ئەنجام بدەن. هۆکاری سەرەکی ئەمە بوو. نەك وەکو ئەوان بانگەشەیان بۆی دەکرد، کە گوایە (PKK) زەرەر دەداتە گەل، زەرەر دەداتە خەبات بۆیە لەگەڵ (PKK) ناخوازن کار بکەن. ئەمانە هەمووی بیانوو بوو.

لەڕاستیدا ئەوانە باوەڕیان بەخۆیان نەبوو، دەترسان لەوەی لەگەڵ (PKK)دا کار بکەن. ئەگەر بیکەن ئەوا دەتوێنەوە و دەکەونە خزمەتی (PKK)وە. چونکە هیچ شتێکی خۆیان نەبوو، نە لە بیر و راماندا نە لەپراکتیکدا، تاکو بەرخۆدانێك و خەباتێك لەدژی داگیرکەری فاشیست پێشبخەن. دەیانزانی ئەگەر لەگەڵ (PKK)دا هەنگاو بهاوێژن ئەوا (PKK) بەوان هەنگاو دەداتە هاوێشتن. نەیاندەخواست زیانی خۆیان تێکبدەن، بۆیە لەئاستی کوردستاندا هیچ بەرەیەك دروست نەبوو، هیچ رێککەوتنێکیش بەدینەهات، نە لەنێوان ئێمە و ئەواندا، نە لەنێوان خۆیاندا، هیچ بەرە و رێککەوتنێکیان ئەنجام نەدا. گووتمان:" ئێوە خۆتان لەناو خۆتاندا ئەنجامی بدەن" دیسان هەر ئەنجامیان نەدا. ئیدی ئاشکرابوو کە هیچ نیازێکی ئەوان نییە. زێدەتر کێ وەهای کرد؟ زێدەتر پارتی سۆسیالیست (PSK) و کوك (KUK) و (DDKD) و ئاڵای رزگاری (ALA RIZGARÎ) ئاڵای رزگاری و ئەوانە بوون. ئەوانە ئەو کۆبوونەوانەیان بێئەنجام هێشتەوە. پاشان لەنێوان ئەوانیشدا هیچ رێککەوتن و بەرەیەك دروست نەبوو.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ لەگەڵ گروپەکانی چەپی تورکیش هەوڵماندا و هەندێك کۆبوونەوەمان ئەنجامدا، بۆ ئەوەی بەرەیەك لەدژی فاشیزم پێشبخەین. لەمەدا هەندێك ئەنجامامان بەدەستخست، بەرەیەك دروستبوو. لەو بەرەیەدا هەندێك لە لایەنەکانی چەپی تورك بەشداریان تێدا کرد، لەسەر ئەو بنەمایەش هەندێك هەنگاو هاوێشتران، رۆژنامەیەکی هاوبەش دەرچوو، لە ئەورووپا کۆمیتەی هاوبەش دروستکران و بەیەکەوە لەدژی حوکمی فاشیستی هەندێك رێپێوان و چالاکی پرۆتستۆیی ئەنجامدران.

بەڵام لەبنەڕەتدا ئامانجی ئێمە ئەوەبوو کە ئێمە دەمانخواست لەناو تورکیادا کارێکی وەها هاوبەش پێشبکەوێت، وەکو چۆن ئێمە بۆ کوردستان ئامادەکاری تێکۆشانی

گەریلاییمان دەکرد و هەوڵمان دەدا کەوا گەریلایی پێشبخەین و بەرەیەکی بەرفراوان ساز بکەین و خەباتێکی بەهێز پێشبخەین. لەئاستی تورکیاشدا ئێمە دەمانخواست هەم بەرەیەك و هەمیش گەریلایەکی گرێدراوی ئەو بەرەیە پێشبخەین. بەمە ئێمە دەتوانین رێگیری لەزوڵم و ئەشکەنجە و کوشتن و لەسێدارە و حوکمی فاشیستی بکەین. ئێمە دەمانگووت:" بەمە ئێمە جارێکی دیکە رێی ئازادی و دیموکراتی لە تورکیا دەکەینەوە، بەمە دەتوانین رێ لە تەسفیەبوونی تەفگەری شۆڕشگێڕی بگرین، کە تەفگەری شۆڕشگێڕی خۆی کۆبکاتەوە و بەخۆی باوەڕ بکات و باوەڕی بە گەل ببەخشێت، گەلیش دژی حوکمی فاشیستی رابوەستێت.

ئێمە دەمانزانی کە ئەگەر لەئاستی تورکیادا بەرەیەك لە تورکیا پێشبخەین لەژێر چەتری ئەو بەرەیەدا گەریلایی و خەباتی گەریلایی پێشنەخەین ئەوا لە کوردستاندا پڕ زەحمەتی دەبینین. واتا لە کوردستاندا ئێمە چەندە بەهێز بین و تێکۆشان بەرز بکەینەوە، ئەگەر ئەو تێکۆشانە قاچی تورکیای نەبێت و پێشنەکەوێت و بەهێز نەبێت، ئەوا شۆڕشی ئێمە تەنیا لەسەر قاچێك بەرێوە دەچێت، ئەو کاتە دەوڵەتی داگیرکەری تورکیا بەهەموو هێزی خۆیەوە دێتە سەر کوردستان و دێتە سەر ئێمە. هەروەها تەخریباتێکی مەزنیش لە کوردستاندا روودەدات، شەڕێکی مەزن و درێژخایەن لە کوردستان روودەدات و بەردەوام دەبێت، زوو بە زووش کێشەی کورد چارەسەر ناکرێت و ئەنجامگیریش نابێت. ئەگەر ئێمە دەخوازین هەم تەخریبات روونەدات و شەڕ درێژە نەکێشێت و بەڕاستی کێشەی کورد چارەسەر ببێت، پێویستە تەفگەری شۆڕشگێڕی و دیموکراتی لە تورکیا بەهێز ببێت، کە دەوڵەتی تورکیا بخاتە نێو زەحمەتییەوە و فشاری بۆ بهێنێت و ببێتە هێزێك بۆ کوردستان. لەسەر ئەو بنەمایەش بتوانرێت دەوڵەتی داگیرکەر تەنگەتاو بکات و ناچاری بکات بۆ چارەسەری کێشەی کورد هەنگاو بهاوێژێت. ئەگەر وەها نەبێت ئەوا زۆر زەحمەت دەبێت.

بێگومان ئەو بەرەیە ئەگەر لاوازیش بێت بەرەو پێشەوەمان برد، ئێمە خواستمان ئەوانەی لەو بەرەیەدا بەشدارن بەیەکەوە ئامادەکاری بۆ تێکۆشانی گەریلایی بکەین و لەگەڵ ئەواندا هەندێك هێز بنێرینە خاکی تورکیا، لەوێش گەریلایی پێشبخەین. لەم کارەدا رێکخراوی **رێگای شۆڕشگێڕ** (DEV-YOL) ئەو هەنگاوەی نەهاوێشت، هەم

هەنگاوی نەهاوێشت، هەمیش دەستبەرداری خەبات بوو و ئەوروپای دایە پێشخۆی و لە ئەورووپاش ژیان و گوزەرانی دایە پێشخۆی. تەنانەت پاشان هەوڵی دا بەرەش تێك بدات، کارێکی بەمجۆرەشی کرد. ئیدی کاتێك وەهابوو بەرە پەیوەندی خۆی لەگەڵ (DEV-YOL)دا پچڕی. گووتمان:" با جارێکی دیکە بەرە سەر لەنوێ پێشبخەینەوە" بەشێوەیەکی دیکە پێشمانخست، بەڵام لەبەر ئەوەی رێکخراوەکانی دیکە، زێدە هێزی خۆیان نەبوو، ئەو بەرەیە نەیتوانی ئەو هەنگاوە بهاوێژێت، هەموو بارەکە لەناستی تورکیاشدا کەوتە سەر ئەستۆی ئێمە. کەچی ئێمەش دەمانخواست چەپی تورك بخەینە جموجۆڵەوە. ئەوان هەندێك بارەکە بخەنە سەر ئەستۆی خۆیان. باری ئێمە لە کوردستان بۆخۆی گران بوو، ئەگەر باری تورکیاش بخەینە ئەستۆی خۆمان ئەوا بۆ ئێمە پڕ زێدە دەبوو. لەم رووەوە چەندەها کاریشمان کرد، ئەو تەڤگەرانەی چەپی تورك زێدە ئەو هەنگاوەیان نەهاوێشت و زێدە ئەو هێزەیان لەخۆیاندا نەدەبینی. بۆیە ئەو بەرەیە زێدە پێشنەکەوت و لەناستی تورکیاشدا گەریلایی زێدە پێشنەکەوت. بەمەش باری ئێمە لە کوردستاندا گرانتر بوو...

**لەساڵەکانی نێوان (١٩٨٠ ـ ١٩٨٣)دا رێبەر ئاپۆ لەرووی فیکری و فەلسەفی و ئایدیۆلۆژی و سیاسیدا هەوڵ و خەباتێکی مەزنی ئەنجامدا، بەتایبەتی سەبارەت بە؛ پرسی کەسێتی، چەمکی زەبروزەنگ لە کوردستاندا، سەبارەت بەرێکخستن و رێکخستەبوون، چەندین شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی گرنگی ئەنجامدا، ئەو قۆناخە لەرووی فیکری و ئایدیۆلۆژییەوە چ پێگەیەکی لەمێژووی تێکۆشانی تەڤگەری (PKK) و سەرۆك هەیە و مرۆڤ چۆن هەڵیدەسەنگێنێت؟**

من لەناخافتنی خۆشمدا گووتبووم؛ هێشتا لە ئەنقەرە بووین سەرۆك پەرتووکی "مێژووی کۆلۆنیالیزم"ی نووسی. ئەوە وەك نامیلکەیەك بلاوکرایەوە. پاشان رەشنووسی پرۆگرامی بۆ پارتیبوون (دامەزراندنی پارتی) نووسی. پاشان "رێگای شۆڕشی کوردستان ـ مانیفێستۆ"ی نووسی، هەروەها بەناوی "سەبارەت بەکۆمەڵکوژی مەرعەش" نامیلکەیەکی دیکەی نووسی. ئەو پەرتووك و نامیلکانە بەر لەوەی لەوڵات دەربکەوین نووسیبوونی. لەپێناو دابینکردنی پێداویستییەکانی کادیران ئەو هەڵسەنگاندنانەی نووسیبوو. دوای ئەوەی چووینە دەرەوەی وڵات، کێشە و گرفتەکانی کادیر زۆر زۆربوون. چونکە تەڤگەر زەبرێکی مەزنی خواردبوو، کەمێك مابوو تەڤگەر تەسفیە ببێت، دووژمن هێرشی کردبووە سەر زۆر لە رێکخستنەکانی ئێمە و دەستگیر کرابوون، کادیران کەوتبوونە زیندانەکانەوە. لەبەر ئەوەی پارتی لەرووی رێکخستنەوە زەبری بەرکەوتبوو، ئەوا لەرووی پێشەنگیدا زۆری و زەحمەتی دەبینی لەوەی کادیران پێشەنگایەتی تەڤگەر بکەن، بۆیە لە تەڤگەردا بنبەستی هاتبووە ئاراوە، گرفتی جددی دەرکەوتبوون، پێویستبوو هەموو ئەو گرفتانە چارەسەر ببانایە، لە سیفەرەك لە شەڕدا تاکتیك بەرێوە نەچووبوو، لەدەرەوەی تاکتیکدا جموجۆڵێك بەرێوەچوو بوو. ئەمەش لەرووی ماددی و مەعنەوییەوە زەرەری لەئێمە دابوو، ئامانجەکانی تەڤگەر زۆر لەژێر مەترسی دابوون، لەپێشەنگی و لە کادیراندا کێشە و گرفت هەبوون، کاتێك کە ئێمە چووینە دەرەوەی وڵات بەم هۆیەوە هەندێك کێشەی دەرەوە دەرکەوت، ئەمەش کاریگەری لەسەر تەڤگەر و کادیران کردبوو. بۆیە کادیران لەنێو کێشەی جددیدا دەژیان، رێکخستن لەنێو کێشەی جددیدا بوو، بۆیە پێویستبوو ئەمانە هەمووی چارەسەر بکرابانایە.

ئیدی سەرۆك بۆ ئەوەی ئەو کێشە و گرفتە فەلسەفی، ئایدیۆلۆژی، سیاسی، رێکخستنی، عەسکەری، سۆسیۆلۆژی، کولتووری و سایکۆلۆژییەکان چارەسەر بکات و کادیران لەسەر ئەو بنەمایە پەروەردە بکات، کە کادیر بەهێز و تۆکمە بکات، رۆحی رێکخستنی لەنێو ئەواندا پتەو ببێت، کولتوور و ئەخلاق و ئایدیۆلۆژیا و تەرزی رێکخستنی لەواندا بەهێز و تۆکمە بکات، هەندێك پەرتووکی نووسی، ئەو پەرتووکانەی دەریخست، هەر هەمووی بەگوێرەی پێداویستی رێکخستن و کادیربوون، کە کادیر پەروەردە بکرێت،

لەنێوان کادیر و ڕێکخستندا یەکێتی دروست بکات، بۆ ئەوەی ئیرادە، بیر و باوەڕی و زانایی و هوشیاریان بەهێز بکات، زەلالی و بە بڕیاربوون تۆکمە ببێت، تاکو بتوانرێت پراکتیکێکی بەهێزیش بێتە ئاراوە و پێشبخرێت. ئەو پەرتووکانە هەموو بۆ ئەو مەبەستە لەچاپ دران.

سەبارەت بە مەسەلەی ڕێکخستن پەرتووکێکی دەرخست بەناوی "سەبارەت بە ڕێکخستن" لەو پەرتووکەدا هەموو کێشە و گرفتە ڕێکخستنییەکانی تاوتوێ کردووە و تیشکی خستۆتە سەر ئەوەی؛ خەت و ڕێبازی ڕێکخستنی ئەم تەفگەرە چییە و لەسەر چ بنەمایەکە. ئەمەش بۆ ئەوەی کادیران لەرووی خەت و ڕێبازی ڕێکخستنییەوە قووڵ بکاتەوە. چونکە لە کادیر و لە مرۆڤی کوردیشدا، هەم لە بیر و ڕاماندا و هەمیش لە پراکتیکدا، لەنێو لاوازییەکی جددیدا بوو، بەتەواوی لەڕێکخستن تێنەدەگەیشت، زێدە لەنێو ڕێکخستندا نەژیابوو، بۆ لای هەموو شتێك دەچوو، بەڵام بۆ لای ڕێکخستن نەدەچوو، کە پێتدەگووت:" وەرە نێو ڕێکخستنەوە" وەك ئەوە وابوو پێی بڵێی:"وەرە نێو زیندانەوە". ڕێکخستن بۆ مرۆڤی کورد تا ئەو ڕادەیە سەخت بوو. چونکە بەبێ ڕێکخستن ژیابوو، بەبێ بەرپرسیارێتی ژیابوو. بێگومان ژیانی ڕێکخستنی ئەمانە هەمووی پەسند ناکات، بۆیە لێرەدا مرۆڤی کورد زۆری و زەحمەتییەکی مەزنی دەبینی، ئەمە لەکاتێکدا بۆ مرۆڤی کورد ڕێکخستن (ڕێکخستەبوون) هەموو شتێك بوو، ئەگەر لە ڕێکخستن تێنەگات و کەسێتییەکی ڕێکخستنی لەخۆیدا بنیاد نەنێت ئەوا ناتوانێت هیچ شتێك بکات، هێزی ئەو لەڕێکخستن دایە، لاوازی مرۆڤی کوردیش هەر لەمە دایە، ئەگەر تۆ دەخوازیت مرۆڤی کورد بەهێز بکەیت و کۆمەڵگای کوردی لە لاوازییەکانی ڕزگار بکەیت، ئەوا تۆ دەبێت ئەو لە بێ ڕێکخستنی ڕزگار بکەیت و ڕێکخستەی بکەیت و لە ڕێکخستندا قووڵی بکەیتەوە. لەبەر ئەم هۆیە ئەو پەرتووکەی نووسی و کادیرانی لەسەر پەروەردە کرا.

هەروەها پێویستبوو کە خەت و ڕێبازی سەربازی تەفگەری زەلال و یەکلایی کردبایەوە، واتا پێویست بوو ئەوە روون ببێتەوە کە ئێمە دەخوازین چ خەت و ڕێبازێکی سەربازی لە کوردستاندا بەڕێوە ببەین؟ زەبروزەنگ چییە و ڕۆڵی زەبروزەنگ لەمێژوودا چییە؟ بۆیە سەرۆك لەژێر ناوی "ڕۆڵی زەبروزەنگ لە کوردستاندا" پەرتووکێکی نووسی.

ئەمەش دەستنیشانکردنی خەت و ڕێبازی سەربازی تەفگەر بوو لە کوردستاندا. لەدووتوێی ئەو پەرتووکەدا باسی لەوە کردبوو کە تەفگەر دەخوازێت چ ڕێبازێکی سەربازی لە کوردستاندا بەڕێوە ببات؟ ئەو ڕێبازە بە ڕێکخستنێکی چۆن و تاکتیکێکی چۆن بەڕێوە دەچێت؟ لەو پەرتووکەدا لەسەر ئەو مەسەلانە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی کردبوو. چونکە ئەمەش زۆر گرنگ بوو. لە کوردستاندا گەلی کورد بۆ دەوڵەتی تورك شەڕی کردبوو، لە "قوبرس" شەڕی کردبوو، بەڵام بۆ خودی خۆی شەڕێکی ئەوتۆی نەکردبوو، هەروەها شەڕی نێوان عەشیرەتەکان و نێوان فیوداڵەکان ڕوویدا بوو، شەڕی نێوان ئایینزاکان ڕوویدا بوو، لەو شەڕانەشدا هەمووی زەبری بەرکەوتبوو و شکستی هێنابوو. دوای ئەو شکستانەش لەکۆمەڵگادا ئیرادەی شکێنرابوو. تەسلیمییەت ڕوویدابوو، سیخوڕی تەشەنەی سەندبوو. ئێمەش لە "سیفەرەك" شەڕێکمان بەڕێوە بردبوو، هەڵبەتە ئەو شەڕەی ئێمە لەوێ بەڕێوەمان بردبوو، هەمان شێوازی ئەو شەڕەبوو کە کۆمەڵگا بەڕێوەی بردبوو. واتا کۆمەڵگا چۆن لە شەڕ تێدەگات و چۆن شەڕ بەڕێوە دەبات و لەسەر چ بنەمایەك شەڕ دەکات، هەمان ئەو چەمکە لە شەڕەکەی سیفەرەك دا زاڵ ببوو. ئەمەش کێشەیەکی جددی بوو. چونکە کولتووڕێك لەناو گەلەکەماندا باڵادەست بوو، ئەویش کولتووری شەڕی سەنگەران بوو. هەڵبەتە لەم شێوازەی شەڕیشدا هیچ کاتێك کورد سەرنەکەوتبوو. تەنانەت نەیتوانیبوو کێشە عەشیرەتییەکانیش چارەسەر بکات... ئیدی پێویستبوو کادیران باش لەو کولتووره تێبگەیەنرێت، هەروەها لەوەش تێبگەیەنرێت کە ئێمە شەڕێکی چۆن و ڕێبازێکی سەربازی چۆن بەبنەما وەردەگرین و دەخوازین لەسەر کامە ڕێباز شەڕ بەڕێوە ببەین؟ هەروەها ڕێکخستەکردنی ئەو شەڕە بەگوێرەی ئەم ڕێبازە چۆن دەبێت؟ لەو پەرتووکەدا سەرۆك لەسەر ئەو مەسەلانە هەمووی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی قووڵی کردووە، تێیدا ڕێبازی سەربازی و ڕێکخستنی و کێشەکانی تاوتوێ کردووە. لەسەر ئەو پەرتووکە پەروەردە بەڕێوەچوو.

هەروەها مەسەلەی ڕێککەوتن و بەرە و هاوپەیمانێتی هەبوو، لەسەر ئەو مەسەلانە سەرۆك پەرتووکێکی بەناوی "کێشەی نەتەوەیی و شێوازی چارەسەری" نووسی. لەم پەرتووکەدا باس لەوە کراوە کە کێشەی نەتەوەیی چییە و چۆن چارەسەر دەکرێت؟

ڕێبازی ئێمە بۆ بەرە و ڕێككەوتن چییە؟ ئێمە چۆن لەمەسەلەی بەرە و ڕێككەوتن تێدەگەین و لەسەر چ بنەمایەك بەرە و هاوپەیمانێتی پێشدەخەین؟ دەتوانین بە بەرە چ كێشەیەك چارەسەر بكەین؟ لەو پەرتووكەدا سەرۆك ئەو مەسەلانەی شیكردەوە و كادیران لەسەر ئەمە پەروەردە كران.

هەروەها لەسەر مەسەلەی كەسێتی ڕاوەستا و پەرتووكێكی بەناوی "پرسی كەسێتی لە كوردستاندا" نووسی. واتا لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە بگرە تا دەگاتە مەسەلەی سۆسیۆلۆژی و سایكۆلۆژی شیكردنەوەی سەبارەت بە پرسی كەسێتی كردووە. چونكە ئەو كەسێتییەی كە لە كوردستاندا دروست ببوو، كەسێتییەكی ئازاد و دیموكراتیخواز نەبوو، كەسێتییەك نەبوو كە بەرخۆدان بەبنەما وەربگرێت، داگیركەران كەسێتییەكی كۆیلەیان لە كورددا دروستكردبوو، كەسێتییەكی دروستكرد بوو كە لەهەموو ڕوویەكەوە نكۆڵی لەخۆی دەكرد و خۆی لەناودەبرد. واتا بەناوی كورد زێدە شتێكی تری تێدا نەدەژیا، كەسێتییەك بوو كەوا لەهەموو ڕوویەكەوە تەسلیم وەرگیرابوو، كەوتبووە خزمەتی داگیركەرانەوە، كەسێتییەكی بەمجۆرە بوو، پێویستبوو تۆ تێی بگەیەنیت كە ئەم كەسێتییە كەسێتی كێیە و چۆن دروستبووە؟ ئەگەر كێشەكەی بەم كەسێتییە چارەسەر نابێت كەواتە بە كەسێتییەكی چۆن چارەسەر دەبێت و چارەسەركردنی ئەو كێشەیە چ كەسێتییەكی پێویستە؟ لەو پەرتووكەدا ئەو مەسەلانەی بەچڕوپڕی شیكردەوە. چونكە ئەو كەسێتییەی داگیركەران دروستیان كردووە ناتوانێت لەدژی داگیركەران ڕابووەستێت، ئەگەر لەدژیشی ڕابووەستێت ئەوا ناتوانێت تا كۆتایی بەردەوام بێت، ئەمە لەزۆر ڕووەوە خزمەتی داگیركەری دەكات و لەدواییشدا لەگەڵ داگیركەری دەبێتەوە یەك، كێشەی كەسێتی لە كوردستاندا كێشەیەكی بنچینەیی بوو. چونكە كۆمەڵگای كورد لەزۆر ڕووەوە داگیركەری دەژیا، واتا میللەتێك لەبەرچاوان هەیە، بەڵام دەژیت یان دەمرێت؟ بۆخۆی دەژیت و كار دەكات یان لەدژی خۆی كاردەكات، دیار نەبوو؟ تاك و جڤاكی كورد لەدۆخێكی بەم جۆرەدا بوو، لەنێوان ژیان و مردندا بوو، واتا كە تۆ لێی دەڕوانی وا دەزانیت ساخە، بەڵام كە بەوردی لێی دەكۆڵییەوە دەبینیت وەك تەرمێك وایە، كۆمەڵگا لە دۆخێكی وەهادابوو، تێیدا نە بەرخۆدان نە شێلگیری و نە بانگەشەیەك هەیە، نە ڕەتكردنەوەیەك هەیە، بەڵكو بەتەواوی و لەهەموو ڕوویەكەوە

داگیرکەری پەسند کردووە و پێیەوە دەژیت و خۆی بەپارچەیەکی ئەو دەبینێت، تەنانەت لەهەندێك شوێندا لە تورك زیاتر ببووە تورك و بۆ تورك کار و خەبات و پڕوپاگەندەی دەکرد، کەوتبووە دۆخێکی وەهاوە. ئیدی ئەمە جڤاك و کەسێتی کورد نییە، تۆ ناتوانیت لەودا کوردایەتی بچێنیت، پێویستە تۆ ئەو جڤاك و کەسێتییە تێك بدەیت، ئەگەر تۆ تێکت نەدا ئەوا ناتوانیت کەسێتییەکی نوێ سەرلەنوێ بنیاد بنێیتەوە، کە نەشتتوانی کەسێتییەکی نوێ بنیاد بنێیتەوە ئەوا ناتوانیت لەدژی داگیرکەری رابووەستیت و شەڕی ئازادی، دیموکراتی، عەدالەت و یەکسانی پێشبخەیت و سەرکەوتن بەدەست بهێنیت، ئەمە مومکین نابێت.

هەڵبەتە یەکێك لەخاڵەکانی گەورەیی سەرۆك ئاپۆ لەمەدایە. یەکێك لەو نوێگەرییانەی لەنێو تەڤگەری شۆڕشگێڕیدا ئەنجامیدا لەو بوارە دایە، لەمەسەلەی کەسێتی دایە، هیچ کەسێك هێندەی سەرۆك ئاپۆ لەسەر مەسەلەی کەسێتی رانەوەستاوە و هێندە کەسێتی شینەکردۆتەوە، هێندە گۆڕانی لەکەسێتی بەبنچینە وەرنەگرتووە. کاتێك کە سەرۆك لەسەر مەسەلەی کەسێتی راوەستەی کرد ئەوا لەسەر مەسەلەی جڤاك راوەستەی دەکرد. واتا نەك لەسەر هەندێك کەس راوەستەی کردبێت، یان تەنیا لەسەر ئەندامی تەڤگەر راوەستە بکات، وەها نییە، بەڵکو لەشەخسی تەڤگەردا و لەکەسەکاندا کۆمەڵگایەکی شیکردەوە، خواستی کۆمەڵگایەك بنیاد بنێتەوە. لەشەخسی (PKK)دا هەم مێژوو، هەم جڤاکی شیکردەوە و چارەسەری ئەوەی پێشخست. واتا کاتێك کە مەسەلەی کەسێتی تاوتوێ دەکرد و راوەستەی لەسەر کرد، ئەوا تەواوی کۆمەڵگای کوردی تاوتوێ کرد و راوەستەی لەسەر کرد، شیکردنەوەی ئەم کۆمەڵگایەی کرد، شیکردنەوەی مێژوو و مێژووی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگای کرد. هەر بۆیەشە کەسێتییەکی زۆر بەهێزی پێشخست، کەسێتییەك بەتەواوی لەخۆی دەردەکەوێت و لەخۆیدا گشتگیرییەتی بنیاد دەنێت، بەتەواوی بۆ ئازادی و دیموکراسی دەژیت و ژیانی خۆی بەگوێرەی ئەمە رێکدەخات، لەدەرەوەی ئەمە ژیان لەخۆی حەرام دەکات، تەنانەت مردنیکیش لەدەرەوەی ئەمە لەخۆی حەرام دەکات، ئەمە ئافراندنێکی زۆر مەزن بوو.

لەمێژوودا هیچ سەرۆك و هیچ تەڤگەرێك هێندە شەخس و کۆمەڵگای شینەکردۆتەوە، ئافراندنێکی هێندە مەزنیان نەکردبوو. ئیدی یەکێك لەجیاوازییەکانی سەرۆکیش

لەمەدایە، یەکێك لەخاڵەکانی بەشداری (مشارکة) سەرۆك بۆ تەفگەری شۆڕشگێڕی و بۆ سۆسیالیزم لەمە دایە. واتا بە شیکردنەوەی تاك و کۆمەڵگا و بنیادنانی کۆمەڵگایەکی نوێ و کەسێتییەکی نوێ دەستیپێکرد، ئەمەش شتێکی نوێ بوو لە تەفگەری شۆڕشگێڕی و لە سۆسیالیزمدا. بۆیە ئەم تەفگەرە لە تەفگەرەکانی دیکە جوداتر پێشکەوت، مەسەلەی کەسێتی کردە مەسەلەیەکی بنچینەیی. کاتێك کە کۆمەڵگای لە شەخسی (PKK) و شەخسی ملیتانی (PKK)ی تاوتوێکرد و ئەو کۆمەڵگایەی پێ شیکردەوە، لەلایەنی ئایدیۆلۆژی، فەلسەفی، سیاسی، رێکخستنی، سەربازی، سۆسیۆلۆژی، سایکۆلۆژی، کولتووری و لەهەموو لایەنێکییەوە لێی نزیك بووەوە و راوەستەی لەسەر کرد و شیکردەوە. ئیدی بۆیە رابوونی گەلی کورد و مرۆڤی کوردیش رابوونێکی هێندە مەزن بوو، رابوونێك بوو هیچ کەسێك مەزنەندەی بۆ نەدەکرد. ئەمە بەم شیکردنەوەیە ئافرێنرا، بە چارەسەرکردنی پرسی (کێشەی) کەسێتی بەدیهات.

هەر لەهەمان پێڤاژۆدا سەرۆك سەبارەت بە مێژووی کوردستان پەرتووکێکی نووسی، زیاتر لەسەر هەردوو سەدەی هەژدە و نۆزدە راوەستەی کرد و وەکو پەرتووکێك دەریخست.

هەروەها لەسەر تەسفیەگەرێتی پەرتووکێکی نووسی، تەسفیەگەرێتی لەمێژوودا چیبوو؟ زەمینەی تەسفیەگەرێتی لە کوردستاندا چییە؟ بۆچی هەمیشە لە کوردستاندا خیانەت روودەدات؟ هۆکار چییە؟ هۆکاری ئایدیۆلۆژی، سیاسی، فەلسەفی، مێژوویی و کولتووری دەرکەوتنی خیانەت لە کوردستاندا چییە؟ ئەو مەسەلانەی شیکردەوە. چونکە لەمێژووی کوردستاندا هەمیشە خیانەت هەیە، واتا چەندە بەرخۆدان هەیە ئەوەندەش خیانەت هەیە. تەنانەت هەمیشە گێلی و نەفامی (غەفلەت) و خیانەتێکی مەزن لەئارادا بووە، وەك دەڵێن:" کورد گەلێکە لەمێژوودا خیانەتی خۆی لەهی هەموو گەلانی دیکە مەزنترە" شیکردنەوەیەکی بەمشێوەیە لەلایەن کەسانی بیانی کە لەمێژووی گەلی کوردیان کۆڵیوەتەوە، کراوە. لە لێکۆڵینەوەیاندا بینیویانە کە خیانەتی زۆر مەزن لەنێو کورداندا هەبووە، واتا لەو دووژمنایەتییەی لەدەرەوە لەبەرامبەر کورد کراوە زیاتر، لەنێو خودی گەلی کورددا کورد دووژمنایەتی کوردی کردووە، ئەوانە گەیشتوونەتە ئەنجامێکی بەمجۆرە، بەڵام ئەمە چۆن روویداوە؟ زێدە بەزانستی

شیکردنەومیان لەسەر نەکردووە. بەڵام سەرۆك ئەمەی بەزانستی شیکردۆتەوە. واتا بناخە و رەگی غەفڵەت و خیانەت و تەسفیەگەرێتی لە کوردستان چییە، ئەمەی شیکردەوە، بۆ ئەوەی کادیر لەسەر ئەم مەسەلەیەش پەروەردە بکات، تاکو کادیر زووبەزوویی نەکەوێتە ئەم دۆخەوە، بۆ ئەوەی کەس یاری بە کادیر نەکات، کادیر یاری بە خودی خۆی بە بەهاکانی تەڤگەر و گەل نەکات، بۆ ئەوەی بتوانێت کەسێتییەکی بەهێز و تۆکمە و رۆحێکی بەرخۆدانی مەزن لە خودی خۆیدا بەرجەستە بکات. بەمەش بتوانێت کێشەی کورد چارەسەر بکات. چونکە کە تۆ دەست بۆ کێشەی کورد ببەیت، ئەوا زۆر هێز هەن لەسەر کوردستان رادەوەستن و بەرژەوەندی ئەوان لە کوردستان هەیە، بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی ئەوان تێك نەچێت زۆر یاری بەسەر تەڤگەرەکانەوە دەکەن و هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ ئەوەی ئەو تەڤگەرانە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە و پەرشوبڵاوەیان پێبکەن بکەونە ژێر کاریگەرییانەوە و بیانخەنە خزمەتی خۆیانەوە، لەم پێناوەشدا زۆر کۆشش دەکەن. هەروەها چینی باڵادەست و خائینی کوردیش هەیە، ئەو چینە زۆر پیلانگێڕی و لەیستۆك دەکەن...

سەرۆك لەسەر هەموو ئەو مەسەلانە هەڵوەستەی کرد، بۆ ئەوەی ئەمانە هەمووی بە کادیران بناسێنێت و کادیر نەکەوێتە ناو ئەو لەیستۆکانەوە، هەم خۆی و هەم کەسیش نەکاتە قوربانی، ئەو شتەی گەل لەمێژوودا بەسەریهاتووە جارێکی دیکە بەسەریدا دووپات نەبێتەوە. لەم رووەوە شیکردنەومیەکی قووڵ و فراوانی کرد و کردی بە پەرتووك و خستییە بەردەم کادیرانەوە و کادیرانیش پەروەردەیان لەسەر ئەو پەرتووکانە بینی. لەئەنجامی ئەمەشدا لە کادیراندا یەکێتی هزر و پراکتیك بەدیهات، لەرێکخستندا یەکێتی بەدیهات، ئەو کێشە و گرفتانەی کادیر و رێکخستن تێیدا دەژیان چارەسەرکران. ئیدی رێکخستن لەسەر ئەو بنەمایە جارێکی دیکە رووی لە وڵات کردەوە و ئەو هەنگاوە مێژووییەی لە وڵات هاوێشت.

**هەر سەبارەت بە مەسەلەی تەسفیەگەرێتییەوە؛ وابزانم هەر ئەو کاتە بوو کە دەوڵەتانی ئەوروپا بۆ ئەوەی کێشەی کورد، کە خۆشیان**

**ڕۆڵیان لەدەرکەوتنی ئەو کێشەیەدا هەیە، لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندا دەرنەکەوێت تەڤگەریش بەبێ ئیزنی ئەوان سەرهەڵنەدات لەشەخسی کەسانی وەك سەمیر و جەعفەر و ئەواندا دەخوازن جارێکی دیکە ئەو تەڤگەرە، کە بەبێ پرسی ئەوان دەرکەوتووە، بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە... وابزانم هەر هەمان ئەو ماوەیە بوو...**

هەڵبەتە من لەئاخافتنی خۆشمدا گووتم؛ حوکمی فاشیستی لە تورکیادا، هەر تەنیا لە تورکیا و لە کوردستاندا نەدەهاتە سەر تەڤگەری شۆڕشگێڕی و دیموکراسی، تەنانەت لەدەرەوەی تورکیاش هێرشی دەهێنایە سەر ئەو تەڤگەرانە، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەوانەی چوونەتە دەرەوەی وڵات بکاتە پەناهەندە و ئەو ڕێکخستنانە جارێکی دیکە روو لەوڵات نەکەنەوە و نەگەڕێنەوە و لەدەرەوە بمێننەوە و بتوێنەوە و کۆتاییان پێبێت. بۆیە یەکێك لەو ژەنراڵانەی کەوا لە کودەتای (١٢)ی ئەیلول بەشدار ببوو "حەیدەر سالتك" چووە ئەوروپا و لەوێ مایەوە. ژەنراڵەکانی دیکە لە تورکیا کاریان دەکرد و ئەویش لەوێ کاری دەکرد، لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی ئەوروپا بەهەماهەنگی کاریان دەکرد، بۆ ئەوەی بتوانن تەڤگەرەکانی چەپی تورکیا و گروپە کوردییەکان لەخۆرهەڵاتی ناوینەوە رابکێشێنە نێو زەمینەی ئەورووپاوە. چونکە ئەگەر ئەو تەڤگەرانە لەخۆرهەڵاتی ناویندا بمێننەوە ئەوا ناچار دەبن روو لەوڵاتەکەی خۆیان بکەنەوە، ناچارن تێکۆشان بۆ خۆیان بەبنەما وەربگرن. لەخۆرهەڵاتی ناویندا ئەگەر تۆ توانیت خۆت رێکخستە بکەیت و هێزی سەربازی خۆت دروست بکەیت ئەوا دەتوانیت خۆت بپارێزیت و کاربکەیت و بژیت، ئەو کاتە هەرکەس دان بەهەبوونی تۆدا دەنێت و قەدرت دەگرێت. ئەمە راستییەکی خۆرهەڵاتی ناوینە.. ئەگەرنا ناتوانیت لەخۆرهەڵاتی ناویندا بژیت و کەس تۆی قەبوڵ نییە، ئەگەر تۆ هێزێکی بەرخۆدانڤانی تۆکمە نەبیت ئەوا کەس رێزت لێناگرێت و شوێنت بۆ ناکاتەوە و پەسندت ناکات. ئەوەی لێرەدا بژێت ناچارە ئەم

هەنگاوە بهاوێژێت. ئیدی بۆ ئەوەی ئەو تەڤگەرانە لەخۆرهەلاتی ناوین نەژیێن و ئەوانەش کە چوونەتە ئەورووپاش نەبنە مەترسییەك بەسەریانەوە، پێویست دەکات ئەوانیش رابکێشینە ئەورووپا، ئیدی بۆیە ژەنراڵێکی تورك "حەیدەر سالتك" لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپا بەهەماهەنگی کارێکی وەهایان بەڕێوە دەبرد، تاکو ئەو کادیر و رێکخستنانەی لەخۆرهەلاتی ناوینن رایانبکێشێنە ئەورووپا؟ لە ئەورووپاش هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ ئەوەی ماڵیی (ترويض)یان بکەن، گەوهەری شۆڕشگێڕێتی و رۆحی شۆڕشگێڕێتی ئەوان بکوژن و رایانبکێشنە خەتێکی تەسلیمکاری و لە شۆڕشگێڕێتی و کار و خەبات بەدووریان بخەنەوە، بۆ ئەوەی چیدی مەترسی دروست نەکەن. ئیدی وڵاتانی ئەورووپا و ئەو ژەنراڵەی تورك بەیەکەوە کارێکی وەهایان بەڕێوە دەبرد. بەمەش زۆر تەڤگەریان لەخۆرهەلاتی ناویندا راکێشایە ئەورووپا. ئەوانەی رایانکێشانە ئەورووپاش و ئەوانەش کە هەر خۆیان چووبوون بۆ ئەورووپا تەربیەیان کردن و پەرشوبڵاومیان پێکردن. ئیدی هەرکەسە و ژیانێکی شەخسی دایە پێشخۆی، بۆ ئەمەش دەوڵەتانی ئەورووپا توانستی بەوان بەخشی، بۆ ئەوەی لەژیانی رێکخستنی و کاری سیاسی دووربکەونەوە، تەنیا ژیانێکی شەخسی بۆ خۆیان بەبنەما وەرگرن و بتوێنەوە و کۆتاییان پێبێت. بۆیە هەم سیاسەتێکی وەهایان پراکتیزە کرد و هەمیش دەرفەت زەمینەیان بۆ ئەمە پێشخست. ئیدی زۆر گروپ و تەڤگەریان بەم سیاسەت و ئیمکانییەت بەخشینە تواندەوە.

بێگومان خواستیان بەهەمان شێوە دەست بۆ ئێمەش ببەن و ئێمەش رابکێشنە هەمان زەمینەوە، دەیانخواست ئەمەش بەرێگەی "سەمیر" ئەنجام بدەن. لەرێکخراوی رێگای شۆڕشگێڕ (DEV-YOL)دا کەسێك بەناوی "تانەر ئەکچەم" هەبوو، ئەو کەسە پەیوەندی لەگەڵ "سەمیر" دروست کردبوو، بەرێگەی "سەمیر"ەوە دەیخواست تەڤگەری ئێمەش رابکێشێتە هەمان زەمینەوە. ئەمە چۆن ئەنجام بدات؟ مەگەر بتوانن پەیوەندی ئێمە لەگەڵ فەلەستینییەکان تێکبدەن، بۆیە "سەمیر" هەموو هەوڵێکی ئەوەبوو ئەو پەیوەندییە تێکبدات، کە تێکیشچوو ئێمە ناتوانین لەم زەمینەیەدا بمێنینەوە. لەو دۆخەشدا نەمانەدەتوانی بگەڕێینەوە کوردستانیش، ئەو کاتە رێگای ئەورووپاش کراوەتەوە، کەواتە دەبێت روو لە ئەورووپا بکەین. واتا بەمشێوەیە رێگەی مردنیان بۆ

ئێمە دەكردەوە. ئیدی سەرۆك ئاپۆ نەیهێشت ئەو پیلان و كارەی كەوا ئەوروپا و ژەنراڵەكەی تورك بەرێگەی "تانەر ئەكچەم" و "سەمیر" دەخوازن بەسەر ئێمەی دابسەپێنن، سەر بگرێت، ئەو پیلانەی بێكاریگەر كرد. بۆیە تەڤگەری ئێمە ڕووی لە ئەوروپا نەكرد، لە لوبنان و لەگەڵ فەلەستینییەكاندا مایەوە و لەنێو شەڕدا مایەوە و ئامادەكاری خۆی كرد و ڕووی لە وڵات كرد و گەڕایەوە وڵات...

لەكاتی ئامادەكاری بۆ هەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)دا، لەباشووری كوردستانیشدا لەساڵی (١٩٨٣)دا شەڕی براكوژی نێوان حزبەكانی باشوور لەپەرەسەندن دابوو. بێگومان ئەو شەڕانە زۆر زەرەر و قوربانی لێكەوتەوە، ئەو كاتە تەڤگەری (PKK) هەڤاڵان "محەمەد قەرەسوونگور، ئیبراهیم بیلگین" و چەند هەڤاڵێكی دیكە دەنێرێت بۆ ئەوەی وەك ناوبژیوانێك ئەو شەڕە رابوەستێنێت و ئاشتەواییەك لەنێوان حزبەكان بێتە ئاراوە، بەڵام كاتێك ئەو هەڤاڵانە خەریكی ناوبژیوانین لەنێوان ئەو حزبانەدا شەهید دەكرێن. بێگومان ئێستاشی لەگەڵدا بێت هیچ یەكێك لەو حزبانە ئاشكرای ناكەن كە بەڕاستی كێ ئەو هەڤاڵانەی شەهیدكردووە و هەریەكەیان دەیخەنە ئەستۆی ئەویتریانەوە. ئەوەی لێرەدا بپرسین ئەوەیە چەمكی "یەكێتی نەتەوەیی" لەلای تەڤگەری (PKK) بە چ واتایەك دێت و ئەو كاتە چۆن و بە چ شێوەیەك هەوڵی بۆ دەدرا؟ هەروەها بەگوێرەی زانیاری تەڤگەری (PKK) ئەم ڕووداوە چۆن ڕوودەدات؟

## شەهیدبوونی ئەو هەڤاڵانە تا چەند کاریگەری لەسەر ئامادەکارییەکانی هەڵمەتی تێکۆشانی چەکداری (١٥)ی ئاب دەکات..؟

ئەو کاتە لە شامدا هەم پەیوەندی ئێمە لەگەڵ (ی ن ك)و هەمیش لەگەڵ (پ د ك) هەبوو، هەمیش لەگەڵ حزبی شیوعی ئێراقی (حشع) هەبوو، ئێمە دەمانخواست کە نێوانی ئەو هێزانەش باش ببێت، لەم پێناوەشدا هەوڵمان دەدا. هیچ کاتێك ئێمە یەکێکیان بە باش و ئەوەی ترمان بەخراپ نەدەبینی، یەکێکیمان نزیکی خۆمان نەدەکردەوە و ئەویتر لەخۆمان بەدوور نەدەگرت، ئێمە لەگەڵ هەمووشیاندا پەیوەندیمان پێشدەخست. لەو پەیوەندییانەشدا هەوڵمان دەدا کەوا بتوانین ناکۆکی نێوانیان هێدی هێدی نەهێڵین. کاتێك کە شەڕ لە نێوان "بەرەی جود" و "بەرەی جەوقەد"(٢)دا بەرپابوو، ئێمە پێشنیازمان بۆ هەر دوو لا کرد کە ئێمە ببینە واسیتە و ناوبژیوان لە نێوانیاندا، کە ئەو شەڕانە رابووەستن، هەردوولاشیان ئەم پێشنیازەیان پەسندکرد. لەسەر ئەو بنەمایە ئێمە هەواڵمان بۆ ئەو هەڤاڵانەی کە لە وڵات بوون نارد و پێمانگووتن:" ئێمە لەگەڵ هەر دوو لایان قسەمان کردووە و هەر دوو لایان ئەوەیان پەسندکردووە کە ئێمە بکەوینە نێوانیانەوە و ناوبژیوان بین، با هەڤاڵان بچنە نێوانیانەوە" لەسەر ئەو بنەمایە هەڤاڵان **"محەمەد قەرەسوونگور، ئیبراهیم بیلگین، ئازاد و فوئاد"**، ئەم دوو هەڤاڵەی دوایان پاشان لە ئاگری شەهید بوون. ئەو چوار هەڤاڵە چوون لەگەڵ هەموو لایەنەکان دیدار ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی بکەونە نێوانیانەوە و ئەو شەڕە رابوەستێت و ئاشتی بەرقەرار بێت. ئیدی کە چووبوون (پ د ك)یان بینیبوو، پاشان چووبوون" **حزبی شیوعی ئێراق**"یشیان بینیبوو، بەڕێدەکەون بۆ ئەوەی بچن (ی ن ك)ش ببینن، کاتێك کە دەچن (ی ن ك) ببینن ئەو کاتە شەڕێك لەنێوان (ی ن ك) و حزبی شیوعی روودەدات، لەو شەڕەدا هەڤاڵان **"محەمەد قەرەسونگوور و ئیبراهیم بیلگین"** شەهید دەکرێن و هەڤاڵان **"فوئاد" و ئازاد"**یش بە دیلی دەکەونە دەستی (ی ن ك). (ی ن ك) بەو هەڤاڵانە دەڵێت:" ئێمە نەمانزانی کە ئێوەن، لێمان ببوورن" ئیدی ئەو هەڤاڵە هەردوو هەڤاڵە شەهیدەکە لەگەڵ گوندنشینانیدا بەیەکەوە

دەنێژن. لەبناری چیای قەندیلدا "شێخ عومەر" هەیە، ئێستاش لەژیاندا ماوە، ئەو هەڤاڵانە بەخاك دەسپێرێت، (ی ن ك) هەردوو هەڤاڵەکەی تریش بەردەدات. پاشان ئەو هەڤاڵانە هاتن و گەیشتنەوە هەڤاڵان.

بێگومان تاکو ئێستا روون نەبووەتەوە ئەو هەڤاڵانە چۆن شەهید کەوتوون؛ بە ئەنقەست شەهیدیان کردوون یان بەنەزانی شەهیدیان کردوون. هێشتا دیار نییە، بەتەواوی نازانین، بەڵام بێگومان هەمووشیان دەیانزانی کەوا ئەوانە هەڤاڵن و هاتوون تاکو لەنێوان ئەو حزبانەدا بۆ ئاشتی کار بکەن، هەموویان ئەمەیان دەزانی، هەڤاڵان لەگەڵ (پ د ك) و حزبی شیوعی ئێراقی دیداریان ئەنجام دابوو و دەچوونە لای (ی ن ك) لەکاتی چوونیاندا شەڕێك لەنێوان ئەو حزبانە روودەدات. رێك لەکاتی ئەو شەڕانەدا شەهید بوون، دوو هەڤاڵیش کە شەهید نەببوون بە دیل گیرابوون و کەوتبوونە دەست (ی ن ك)وە. واتا بەدیار دەکەوێت کە ئەوانە بە گوللەی (ی ن ك) شەهید بوون. چونکە لە دیلبوونی ئەو دوو هەڤاڵەدا ئەمە بەدیار دەکەوێت، لەئاخافتنی هەردوو هەڤاڵیشدا هەر ئەمە بەدیار دەکەوت. واتا بە گوللەی (ی ن ك) شەهید کەوتوون، ئیدی ئەمە بە ئەنقەست بووە یان نا؟ ئێمە ئەوە نازانین.

ئەو کاتە هەر یەك لە (پ د ك) و (ی ن ك) دەیانخواست ئێمە ببینە تەرەف (لایەن) لە شەڕانەی نێوانیاندا. بێگومان هیچ کاتێك ئەمەمان پەسند نەکرد. چونکە ئێمە دەمانخواست ئاشتی لەنێوانیاندا فەراهەم بکەین، نەك ئێمە ببینە تەرەفێك، هەر لەبەر ئەمەش بوو ئەو شەهیدانەمان دا، ئەو هەڤاڵانە لە پێناو ئاشتی نەتەوەیی شەهید کەوتبوون، لەم پێناوەدا ئەو شەهیدانە درابوو، ئەخاسمە دوای ئەو شەهیدبوونە هیچ نەمانـدەتوانی ببینە تەرەف، (ی ن ك) و (پ د ك) وەها لەمەسەلەکە نزیك دەبوونەوە، دەیانخواست ئێمە بکەنە تەرەف. بێگومان ئەوەمان هەرگیز پەسند نەکرد.

لەسەر ئەو رووداوە سەرۆك هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیەکی پێشخست و نامیلکەیەکی نووسی، بۆ ئەوەی ئەو شەهیدبوونە بکاتە هۆی ئاشتی و یەکێتی نەتەوەیی، هەڵسەنگاندنەکە لەسەر ئەو بنەمایە بوو. هەڵبەتە نزیکبوونەوەی سەرۆك بۆ شەهید و شەهیدبوون بەمجۆرە بوو، هەر شەهیدبوونێك پێویستە ببێتە هۆی بەهێزکردنی رێکخستن و کار و خەبات و تۆکمەکردنی یەکێتی نەتەوەیی، بەمجۆرە مامەڵەی لەگەڵ

شەهیدبوون و شەهیدان کردووە، لەنێو (PKK)شدا هەروا نزیك دەبۆوە، بەهەمان شێوە لە شەهیدبوونی هەڤاڵ "**محەمەد قەرەسوونگور**"یش نزیك بووەوە، خواستی کە یەکێتی نەتەوەیی لەسەر ئەو شەهیدبوونە پێشبکەوێت، ئەو شەهیدبوونە ببێتە هۆی بەدیهاتنی ئەمە، ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە کارمان دەکرد. بێگومان ئێمە هەرچەندە هەوڵیشماندا بەئەنجام نەگەیشتین. چونکە ئەگەر لایەنەکان نیازی ئاشتییان نەبێت، نیازی یەکێتی نەتەوەییان نەبێت تۆ چەندە کاردەکەیت بیکە، کاری تاکلایەنە ئەنجام نادات، ئەوەی ئێمەش کاری تاکلایەنە بوو... لەنێوان (ی ن ك) و (پ د ك)شدا کێشەی جددی هەبوو، کێشەی مێژوویی هەبوو، زۆر شەڕی یەکتریان کردبوو، لەیەکتریان کوشتبوو، کێشەی نێوانیان مەزن بوو، بۆیە لەپێناوی چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان هەنگاویان نەهاوێشت، لەبەر ئەوە ئێمە هەرچەندە هەوڵماندا و کارمانکرد کە ئاشتی لەنێوانیاندا بێتەدی و یەکێتییەکی نەتەوەیی تۆکمە بێتەکایەوە، بەڵام زێدە ئەنجامگیر نەبوو.

چەمکی ئێمە بۆ یەکێتی نەتەوەیی لە پەرتووکی "**کێشەی رزگاری نەتەوەیی و رێگای چارەسەری**"دا دەستنیشانمان کردبوو، نەك تەنیا بە تیۆری دەستنیشانمان کردبوو، بەڵکو بە پراکتیکیش خواستمان لە باکووردا هەموو باڵەکانی تەڤگەری کورد لەبەرەیەکدا بەیەکەوە بێنینە لای یەك لەم پێناوەدا زۆر کارمان کرد، بەڵام بە ئەنجام نەگەیشت. لەباشووریشدا لەنێوان (ی ن ك) و (پ د ك)دا شەڕ هەبوو، ئێمە هەڤاڵان "**محەمەد قەرەسوونگور**" و هەڤاڵانی دیکەمان نارد بۆ ئەوەی بکەوێتە نێوانیانەوە و شەڕی نێوانیان رابووەستێت و یەکێتی نەتەوەیی بێتەدی، ئەمەش هەر ئەنجامگیر نەبوو، ئەمانە هەموو بەدیار دەخەن کە بە چ شێوەیەك لە چەمکی یەکێتی نەتەوەیی نزیك دەبینەوە، ئێمە هیچ کاتێك خۆمان تەنیا لەبەرامبەر بەشێکی کوردستان بە بەرپرسیار نەبینیوە، هیچ کاتێك نەمانگووت:" تەنیا بەشێك کوردستانە و کارمان بە بەشەکانی ترەوە نییە..."ئێمە هەمیشە کوردستانمان بە هەرچوار پارچەکەیەوە بینیوە، هەموو هەوڵێکمان بۆ ئەوە بووە لەنێوان هەر چوار پارچەکەدا یەکێتییەك ئاوا بکەین و لەهەر شوێن و بەشێکدا تەڤگەری نەتەوەیی و شۆڕشگێڕی بەهێز و تۆکمە ببێت. ئێمە ئەوەمان بەبنەما وەرگرتووە، ئەگەر تەڤگەر هەبێت ئەوا ئێمە بەهێزی بکەین،

ئەگەر نەبێت ئێمە تەڤگەرێك لەوێ پێشبخەین. ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە کارمان کرد و بەمشێوەیە لە مەسەلەی نەتەوەیی نزیك بووینەتەوە. ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە کارمان کردووە کە ناسنامەیەکی کورد، رۆحێکی کورد، یەکێتییەکی کورد، هۆشیارییەکی کورد بنیاد بنێین، لەنێوان لایەنەکانی تەڤگەری کورددا دووژمنایەتی و شەڕ نەبێت و هەموو کەسێك بۆ نەتەوەیی دیموکراتی کار و خەبات بکات، لەنێوان هەموو لایەنەکاندا پەیوەندی و رێککەوتن و هاوپەیمانێتی هەبێت، بۆ ئەوەی بەیەکەوە کار بکەین. ئەو ناخۆشییەی لەنێوان کورداندا هەیە نەهێڵین و کولتوورێکی دیموکراتییانە بئافرێنین و یەکدی پەسند بکەین، هەر کەسێك بەحزب و ژیان و کاری خۆی بەسەربەستی کار بکات، هەم هەر کەس و کاری خۆیان بکات و هەمیش هەموویان بەیەکەوە کار بکەن و هێزی خۆیان لەدژی داگیرکەری بخەنەگەڕ. واتا هیچ کاتێك ئێمە خۆمان وەك تەڤگەری تەنیا بەشێکی کوردستان نەبینیوە، بەڵکو خۆمان بە تەڤگەری تەواوی کوردستان بینیوە. ئێمە هەمیشە ئەوەمان بەبنچینە وەرگرتووە و وەها نزیك بووینەتەوە، بۆ ئەوەی تەڤگەری ئازادی لەتەواوی کوردستاندا پێشبخەین و بلاوی بکەینەوە و ئاستی هوشیاری و زانایی بەرزبکەینەوە و جموجۆڵ دروست بکەین، یەکێتی تەڤگەری کورد و یەکێتی گەلی کورد بئافرێنین...

# ئەو گوللەیەی هەمیشە نەمرە...

پاش هەموو ئامادەكارییەكان، ئیدی لە (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)دا قەڵەمبازی تێكۆشانی چەكداری دەهاوێژرێت. ئەو قەڵەمبازە چۆن و بە چ شێوەیەك ئەنجام دەدرێت؟ كاریگەری خۆی لەسەر تەڤگەری (PKK)، گەلی كوردستان، دووژمن چی دەبێت؟ هەروەها لەئاستی ناوچەكە و نێودەوڵەتیدا چ دەنگدانەوەیەكی دەبێت؟



شەهید ئەردال



شەهید بەدران

( محەمەد سەڤگات )

لەبنەڕەتدا ئامادەكارییەكانی هەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤) هەم لەئاستی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ڕێكخستنی، هەمیش بە پراكتیك سەرۆك ئاپۆ ئەنجامی دا. بەئامادەكارییەكانی سەرۆك ئاپۆ ئەو هەڵمەتە مێژووییە ئەنجام درا. پێكهێنانی ئەم هەڵمەتە لەپراكتیكدا هەڤاڵ "عەگید" ڕۆڵێكی مەزنی تێدا بینی، هەڤاڵان "ئەردال، بەدران، گوزلیكلی عەلی" و هەڤاڵانی دیكە لەگەڵ هەڤاڵ "عەگید" ڕۆڵێكی مەزنیان گێڕا و لەپراكتیكدا جێبەجێیان كرد. دوای ڕەنجی سەرۆك ڕەنجی ئەو هەڤاڵانەی تێدایە.

ئەم هەڵمەتە هەڵمەتێك بوو؛ دەبووایە زووتر ئەنجام بدرایە، بەڵام درەنگ كەوتبوو، دەبووایە بەگوێرەی ئامادەكاری و پیلاننامەی تەڤگەر زووتر پێكبهاتبایە، لەبەر ئەوەی بەگوێرەی ئەو ئەركەی بەڕێوەبەرایەتی پراكتیكی لەئەستۆی خۆی گرتبوو هەنگاوی نەهاوێشت، بۆیە درەنگ كەوت، هۆكارەكەشی ئەمەبوو...

ئەو هەڵمەتە لەسەر بنەمای بە بیرهێنانەوە و یادەوەری شەهیدبوونی هەڤاڵان "مەزلوم دۆغان، محەممەد خەیری دوورمووش، كەمال پیر" ئەنجامدرا. لەبناخەی ئەو هەڵمەتەدا ئەمە هەیە، ئەو شەهیدبوونە ببووە هۆیەك كەوا هەڵمەتی (١٥)ی ئاب ئەنجام بدەین. بەم هەڵمەتەش خواستمان ئەو هەڤاڵانە هەر بەنەمری بهێڵینەوە، ئیدی بەم هەڵمەتە هەر بەنەمری مانەوە. شەهیدبوونی ئەو هەڤاڵانە وایكرد تەڤگەر هەڵمەتی (١٥)ی ئاب ئەنجام بدات، بەمەش لەمێژووی كوردستاندا قەڵەمبازێكی نوێی هاوێشت، لاپەڕەیەكی نوێی كردەوە، ئەو شەهیدبوونە لەو ئاستەدا بەم هەڵمەتە هاتەژیاندن، ڕۆحی "كەمال پیر، محەممەد خەیری دوورموش و مەزلوم دۆغان" بووە ڕۆحی هەڵمەتی (١٥)ی ئاب، لەسەر ئەم ڕۆحە ئەو هەموو هەنگاوە هاوێشترا.

بێگومان كاتێك بڕیاری پێكهێنانی هەڵمەتی (١٥)ی ئابمان دا، بڕیارماندا لەسێ شوێن" ئەروە، شەمزینان، چەتاخ"دا چالاكی ئەنجام بدرێت. وەك یەك و لەیەك كاتدا ئەنجام بدرێت. پێویستبوو بە سەركەوتوویی پێكهاتبایە و تا ساتی ئەنجامدانی چالاكییەكان بەشاراوەیی ئامادەكاری بۆ بكرێت و كەس پێی نەزانێت، بۆ ئەوەی پووچەڵ نەكرێتەوە و بەسەركەوتوویی ئەنجامگیر ببێت. هەروەها لەگەڵ ئەنجامدانی ئەو چالاكییە لە (١٥)ی ئابدا پێویستبوو هێزی ڕزگاری كوردستان (HRK)یش ڕابگەیەندرێت. (HRK) هێزی

سەربازی ئێمە بوو. ئیدی پێویستبوو بەم ناوە هەموو خەباتی سەربازی ئێمە پێشبکەوێت.

ئیدی بەم چالاکییە ئێمە تێکۆشانی گەریلاییمان رادەگەیاند و دەربازی شەڕی گەریلایی دەبووین. ئەمە لە چ کاتێکدا ئەنجام دەدرا؟ لەکاتێکدا کە لە تورکیا حوکمی فاشیستی و عەسکەرتاری هەبوو، بەرنامەی خۆی لەهەموو روویێکەوە بەڕێوە دەبرد، بە بەرخۆدانی هەڤالان "مەزلوم، خەیری، کەمال" و هەڤالانی دیکە ئەو حوکمە زەبرێکی مەزنی خواردبوو، بە هەڵمەتی (١٥)ی ئابیش پێویستبوو ئەو گورز وەشاندنە زیاتر ببووایە و ببووایە گورزی مردنی حوکمی فاشیستی و داگیرکەری. رێك لەو دۆخەدا ئێمە هەڵمەتی (١٥)ی ئابمان پێشخست.

تا ئەو کاتە دەنگی بەرخۆدانی زیندانی ئامەد هەبوو، وەکوتر زێدە دەنگێکی دیکە نەبوو، دونیا نەیدەزانی لە تورکیادا چی روودەدات و چی روونادات. هەر کەسێك وا تێدەگەیشت کە حوکمی (١٢)ی ئەیلول بەرنامەی خۆی بەڕێوە دەبات و سەریشدەکەوێت، کەسێك چاوەڕێی نەدەکرد لەدژی ئەو رژێمە وەها هەڵمەتێکی بەهێز، بەرخۆدانێکی مەزن پێشبکەوێت، نە زانیاری کەسێك هەبوو نە کەسێکیش لە هەلومەرجێکی وەهادا مەزەندەی شتێکی بەمجۆرەی دەکرد. لە تورکیادا تەڤگەری چەپڕەوی بەتەواوی تەسفیە ببوو، زیندانەکان هەمووی تەسلیم ببوون، هیچ رێکخستنێك نەمابوو، هەم لەتەڤگەری شۆڕشگێڕێتیدا، تەسفیەبوونێك لەئارادابوو هەمیش لەگەڵیدا ئیرادەیان شکێنرابوو. واتا بەرخۆدانێك لەئاستی تورکیادا نەبوو، بەتەواوی حوکمی فاشیستی زاڵ ببوو، هەر بۆیەش کەس باوەڕی نەدەکرد کە بەرخۆدانی و هەڵمەتێکی بەهێز و مەزن بێتەئاراوە، گرتن و ئەشکەنجە و کوشتن و زوڵمی مەزن هەبوو، لەسێدارەدان لەپەرەسەندن دابوو، سیاسەت هەمووی قەدەغە کرابوو، لەدۆخێکی بەمجۆرەدا قەڵەمبازی (١٥) ئاب ئەنجامدرا.

هەر بۆیە ئەم هەڵمەتە زۆر بەهێزەوە دەنگدانەوەی دا، لەسەر هەڤالانی ئێمەش کاریگەری خۆی هەبوو، لەسەر زیندانەکان، گەل، لەسەر رژێم و لەسەر رای گشتی دەرەوەش کاریگەری خۆی کرد. واتا هەموو کەسێك خواستی لەوە تێبگات کە ئەمە چییە و چی روودەدات؟ لەبەر ئەوەی زانیاری هیچ کەسێك نەبوو، کەسیش شیمانەی

نەدەکرد کە لەدۆخێکی وەهادا هەڵمەتێکی بەمجۆرە ئەنجام بدرێت. کاتێك کە ئەنجامیش درا هەر کەس شۆك بوو، خواستیان تێبگەن کە ئەمە چییە و چی نییە؟ هەموو کەسێك بەگوێرەی خۆی گفتوگۆی لەسەر ئەم هەڵمەتە دەکرد، کەسێك زێدە لەم هەڵمەتە تێنەگەیشت، بۆیە تاکو شیانکردەوە و لێی تێگەیشتن کاتێکی زۆری برد.

ئەم هەڵمەتە قەڵەمبازێکی مەزن و مێژوویی بوو، لەمێژووی تەڤگەری ئێمە و گەلی کوردا هەڵمەتێکی نوێ بوو. ئیدی مێژوویێکی نوێ دەستپێکرد، ئەو مێژووی کۆیلایەتییەش کۆتایی پێهات. چونکە ئێمە موداخەلەیەکی مەزنمان ئەنجام دا. لەگەڵ هەڵمەتی (١٥)ی ئابدا گەلی کورد لەجیهاندا خۆی راگەیاند کە؛ ئیدی کۆیلایەتی رەتدەکاتەوە، یان بە ئازادی دەژیت یان هیچ ناژیت، ئەوە راگەیاندنی ئەم بڕیارەبوو. بۆیە راگەیاندنی بڕیارێکی مەزن بوو، ئەو مێژووەی لەسەر سەری خۆی (سەراوژێر) بەرێوە دەچوو، خرایەوە سەر قاچی خۆی، ئیدی گەلی کورد لەهەموو روویێکەوە جڵەوی مێژووی خۆی خستەوە دەستی خۆی و دەیگووت:" من خاوەن مێژووی خۆمم، خۆم مێژووی خۆم دەنووسمەوە، ئیدی کەس ناتوانێت بەناوی من مێژوو بنووسێتەوە، مێژوویێکی رەش بنووسێتەوە. قەڵەمبازی (١٥) ئاب راگەیاندنی ئەمە بوو... (١٥)ی ئاب تاکو ئێستاش بەشێوەیەکی راست تێگەیشتن بۆی نەبووە، هەر کەس وا تێدەگات کەوا تەنیا هەڵمەتێکی عەسکەرییە، کەچی وەها نییە، لایەن و رەهەندی عەسکەری خۆی هەیە، بەڵام رەهەندی عەسکەری دوای هەموو رەهەند و لایەنەکانی دیکەی دێت. (١٥)ی ئاب هەڵمەتێکی سیاسی، ئایدیۆلۆژی، رێکخستنی، کولتووری، ئەخلاقی و عەسکەرییە... هەڵمەتی ژیانێکی نوێیە. واتا شەرکردنی داگیرکەرییە لەهەموو روویێکەوە، رەهەندە ئایدیۆلۆژی، سیاسی، کولتووری، ئەخلاقی و رێکخستنییەکەی لەپێش رەهەندە عەسکەرییەکەیەتی. (١٥)ی ئاب موداخەلەکردنی مێژوویێکە لەهەموو روویێکەوە. بۆیە هەر تەنها موداخەلەیەکی عەسکەری، یان چالاکییەکی عەسکەری نییە. وەکو گووتم؛ لایەن و رەهەندە عەسکەرییەکەی لەهەموو رەهەند و لایەنەکانی دیکەی ئەم هەڵمەتە کەمتر و لاوازتر و لەدواوەترە. لەبنەڕەتدا زیاتر لایەنی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، فەلسەفی، رێکخستنی، کولتووری، ئەخلاقی و دیموکراتی بەهێزترە، هەڵمەتێکی ئازادی و

دیموكراسییە، لەهەموو رووێكەوە خۆ دابڕاندن و پچڕاندنە لەكۆیلایەتی و دەسەڵاتداریێتی داگیركەری، رابوونە لەسەر خۆهێزی (القوة الذاتية) و باوەڕ بەخۆكردنە.

هەندێك كەس دەڵێن:" یەكەمین گوللە" راستە یەكەمین گوللەیە. لەبنەمادا؛ لە (١٥)ی ئابدا (PKK) گوللەی لەخۆی دا، واتا لەكوردانی دا. بۆ ئەوەی كورد لەكۆیلایەتی دەربكەوێت، بۆ ئەوەی ئەو ژیانە رێكبكاتەوە. ئیدی (١٥)ی ئاب ئیرادەی ئەم رابوونەیە، لەبنچینەدا كورد بە (١٥)ی ئاب رابووە سەر پێیان. واتا (١٥)ی ئاب هۆشیاركردنەوە و هەستاندنە سەر پێی گەلی كوردە، هەم لەبیر و راماندا و هەمیش لەدڵدا تێكدان و نەهێشتنی ئەو ترس و سەنگەرەی داگیركەرییە كە دەوڵەت لەئەقڵ و هۆشی كورداندا دروستی كردبوو، (١٥)ی ئاب بەو واتایە دێت. ئیدی لەگەڵ (١٥)ی ئابدا گەلی كورد ئەو پەردەی هەبوو شكاندنی، ئەو ژیانەی تێیدا دەژیا رەتیكردەوە، مەودا (مسافة)یەكی خستە نێوان خۆی و داگیركەرییەوە، گووتی:" ئیدی من لەهەموو رووێكەوە داگیركەری رەتدەكەمەوە و پەسندی ناكەم، ئەو ژیانەی كە شایستەی منیان بینیوە رەتیدەكەمەوە، ئیدی خۆم ژیان بۆخۆم دەستنیشان دەكەم، خۆم بۆخۆم ژیانێك هەڵدەبژێرم. ئیدی (١٥)ی ئاب گوزارشت لەمانە دەكات... لەهەموو رووێكەوە خۆ ئازادكردن بەبناخە وەردەگرێت، بۆیە (١٥)ی ئاب هەڵمەتێكی ئازادی و دیموكراتییە.

(١٥)ی ئاب حوكمی فاشیستی هەژاند. بۆیە كە هەڵمەتی (١٥)ی ئاب دەستیپێكرد، لەسێدارەدان هەمووی راوەستا، ئەگەر (١٥)ی ئاب نەبایە لەسێدارەدانێكی زۆر پراكتیزە دەكرا، بەڵام بەهەڵمەتی (١٥)ی ئاب هەموو لەسێدارەدانێك راوەستا، هەروەها ئەشكەنجەدان زۆر كەم بووەوە، رێگای سیاسەت كرایەوە، رێگای دیموكراسییەت لە توركیادا كرایەوە، ئەو رێكخراو و پارتی و سەندیكایانەی داخرابوون سەر لەنوێ كرانەوە، حوكمی فاشیستی ناچاربوو جارێكی دیكە بیانكاتەوە، هەر خۆی دایخستبوو، هەر خۆیشی كردینەوە، "سلێمان دیمیرەل" و "بوڵەند ئەجەوید" و ئەوانە هەموویان لە زینداندا دەركەوتن و دەستیان بەكاری سیاسی كردەوە. ئەگەر پاشان بوون بە سەرۆك كۆمار و سەرۆك وەزیران ئەوا (PKK) ئەوانی كردە سەرۆك كۆمار و سەرۆك وەزیران. ئەگەر هەڵمەتی (١٥)ی ئاب نەبووایە، ئەوا ئەو دەرگایانەی زیندان بۆ ئەوان نەدەكرایەوە و ئەو پارتییانە جارێكی دیكە رێگەی كاری سیاسییان پێنەدەدرا.

بۆیە (١٥)ی ئاب هەڵمەتێكی دیموكراتی مەزنە، چونكە رێگەی دیموكراتی و دیموكراتیزەبوونی كردەوە، رێگای ئازادی كردەوە، چونكە حوكمی فاشیستی ترسا لەوەی كە ئەگەر كاریگەری ئەو هەڵمەتە لە توركیاشدا هەبێت ئەوا گەلی تورك، هێزە لیبراڵ و دیموكراتیخوازەكان و هەر كەسێك كە لەدژی حوكمی فاشیستە لەگەڵ هەڵمەتی (١٥)ی ئابدا دەبێتە یەك، بۆ ئەوەی نەبنە یەك، بۆ ئەوەی بەرەی توركی (لای توركیا) بەساخی بمێنێتەوە و لەدەستیان نەڕوات و لەدژی كوردان بەكاریان بهێنن، ئەوا ئەو لەسێدارەدانانەیان راوەستاند، رێگای كاری سیاسییان كردەوە، زۆر كەسیان لە زیندانیشدا ئازاد كرد، جارێكی دیكە دەرفەتیان پێدان كە دەست بەكاری خۆیان بكەنەوە، بۆ ئەوەی گەلی توركیا لەگەڵ كوردان و (PKK) نەبنە یەك. ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو... بۆ ئەوەی بەرەی توركیا بۆ خۆیان ساخڵەم بكەن. چونكە (١٥)ی ئاب جورئەت و بیر و باوەڕییەكی بە گەل بەخشی، نەك تەنیا گەلی كورد، بەڵكو گەلی توركیش بینی كە شۆڕشگێڕێتی هێشتا نەمردووە. ئەمەی بینی، ئەگەر مرۆڤ سوور بێت لەسەر بەرخۆدان ئەوا دەكرێ سەرهەڵدان سەرهەڵبداتەوە. ئیدی ئەمە ئیرادەیەكی بۆ چەپی توركیا ئافراند، جەماوەر و باوەڕی و موراڵی پێدان. چەپی توركیا لەدۆخی تەسفیەبووندا بوو، لەمە جورئەتی وەرگرت، كە دەتوانێت خۆی كۆبكاتەوە، بەمجۆرە هەندێك هەنگاوی هاوێشت.

ـ ئاب لەسەر گەلی كورد كاریگەرییەكی زۆر مەزنی كرد، چونكە لەمێژووی گەلی كورددا یەكەمجار بوو كە گەلی كورد بەئامادەكاری و بەرێكخستنی و بەئیرادە و بەبڕیارەوە شەڕێكی گەریلایی رابگەیەنێت. ئەمە لەمێژووی كورداندا یەكەمجار بوو، ئەمەش ـوڕاڵ و باوەڕییەكی بەهێزی دایە گەل، كە دەتوانێت لەدژی داگیركەری فاشیستی تورك تێبكۆشێت، بۆیە هەر ئەو كاتە لە زۆر شوێندا خەڵك و جەماوەر چوونە سەر چیاكان، چوون بۆ ئەوەی شەڕیش بكەن، ئەو هەڵمەتە باوەڕییەكی وەهای ئافراند. لە كوردستاندا رێگری لەسێدارەدان كرد، وەها نەبایە زۆر لە هەڤاڵانیان لەسێدارە دەدا، رێی لەپێش ئەو ئەشكەنجە و وەحشییەتە گرت، مۆڕاڵ و باوەڕی و ئیرادەیەكی تۆكمەی ئافراند، ئەو ترسە مەزنەی كە لەنێو گەلی كورددا هەبوو شكاندی و بەتەواوی

نەیهێشت، لەدژی داگیرکەری لەهەموو رووێکەوە پێهەلگرتنی پێشخست و کاریگەرییەکی مەزنی کرد.

لەجیهانیشدا؛ هەر کەس دەیگووت:" حوکمی فاشیست بەرنامەی خۆی بەڕێوە دەبات و سەردەکەوێت، کەچی ئەو کاتەی کە پێیان وابوو ئیدی حوکمی فاشیستی ئەنجامگیر دەبێت، کەچی تەڤگەرێکی بەهێز سەریهەڵدا. بینیان کە کوردان دەبێژن:" ئیدی ئێمە هەین و بە ئیرادەیەکی تۆکمەوە دەچینە سەر شانۆی ژیان" ئەمەیان بینی. زۆر کەس دەیانگووت:" تەمەنی ئەو تەڤگەرە زێدە نابێت.." ئیدی دەیانگووت؛ تەمەنی بیست و چوار کاتژمێرە... چل و هەشت کاتژمێرە... نازانم چەندە... بەڵام پاشان بینیان کە وەکو ئەوان مەزەندەی بۆ دەکەن وەها نییە و تەڤگەرێکی ساتەوەختی نییە، بینیان کە تەڤگەرێکی ئازادی و دیموکراسیی رەگداکوتاوە و بەردەوامی خۆی هەیە، تا دێت هەنگاویش دەهاوێژێت، ئەمەش باوەرییەکی مەزنی بە کەس و هێزە دیموکراتیخواز و سۆسیالیستەکان بەخشی. لەبەرەی داگیرکەرانیشدا تا دەهات ترسیان زیاتر دەبوو... کاریگەری هەڵمەتی (١٥)ی ئاب بەمجۆرە بوو.

**لەو چوارچێوەیەدا؛ ئەمرۆ مرۆڤ رۆڵی فەرماندارێتی هەڤاڵ "عەگید"، ئەو کەسێتییەی لەپراکتیکدا ئەو هەڵمەتەی بەسەرکەوتن گەیاند، چۆن هەڵدەسەنگێنن؟ لەکاتێکدا لەسایەی حوکمی فاشیستی و عەسکەرتاریدا هەموو شتێك لەژێر ترس و تۆقیندا بوو، فاشیزم تا ئەو رادەیە لە تەشەنەسەندن دابوو، کەسێتی هەڤاڵ "عەگید" وەك فەرماندەیەك دەرکەوتەروو... پێشتر کورد خاوەنی کەسێتی فەرماندەیی بەمجۆرە نەبوو. واتا لەشەخسی هەڤاڵ "عەگید"دا فەرماندارێتی کوردان دەئافرێت... مرۆڤ چۆن ئەمە هەڵدەسەنگێنێت؟**

کاتێك کە مرۆڤ دەبێژێت (١٥)ی ئاب، دوای سەرۆك ئاپۆ، هەڤاڵ عەگید (مەعسوم قۆرقماز) بەبیری مرۆڤدا دێت. بۆچی؟ چونکە لەپراکتیدا ئەو ئەو هەڵمەتەی پێکهێنا و هەمیش بەسەرکەوتوویی پێکیهێنا، بۆیە رەنجێکی مەزنی تێدا هەیە و (١٥)ی ئاب بە هەڤاڵ "عەگید" دەناسرێت. چونکە خودی خۆی بەشداری چالاکییەکەی "ئەروه" بوو، ئەو چالاکییەش بەسەرکەوتوویی دەرباز بوو. لەبەر ئەوە (١٥)ی ئاب بە هەڤاڵ "عەگید" دەناسرێت، بەر لەو هەڵمەتەش لەپێڤاژۆی پڕوپاگەندەی چەکداریشدا هەڵمەتی پڕوپاگەندەی چەکداری لە هەرێمی بۆتان پێشخست. لەپێکهێنانی ئەرکی ئەو هەڵمەتەدا، لە پێشخستنی ئامادەکاری بۆ تێکۆشانی گەریلاییدا رۆڵێکی تایبەتی ئەو هەڤاڵە هەیە، بۆیە لەهەڵمەتی (١٥)ی ئابدا رۆڵی خۆی لەهەموو کەسێك زیاتر بینی. ئەگەر پێش ئەوە رۆڵی خۆی نەگێڕابایە ئەوا لەو هەڵمەتەشدا رۆڵێکی وەها مەزنی نەدەبینی.

لەژیانی هەڤاڵ "عەگید"دا هەمیشە ئەرك بەبنچینە وەرگرتن و تەواو مافدان بەو ئەرکەی لەئەستۆی دایە، هەیە. هەر ئەرکێکی دابێتە پێشخۆی سەرکەوتنی لەو ئەرکەدا بەبنەما وەرگرتووە، تا ئەنجامی بەدەستخستووە ئینجا دەستبەرداری بووە. لەبەر ئەمە · ـڤاڵ "عەگید" ئەو ئەرکەی تەڤگەر پێی سپاردبوو هەمیشە بۆ خۆی بەپیرۆزی ی و پێداگری لەسەر دەکرد تا سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا، ئەمەیە کەسێتی هەڤاڵ عەگید".

هەڤاڵ "عەگید" رێبازی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنی و عەسکەری ئەم تەڤگەرەی بۆ خۆی بەبنەمە وەردەگرت، خۆی تێدا قووڵدەکردەوە، هەروەها نوێی دەکردەوە، بەتەواوی بەگوێرەی پێداویستی رێباز دەژیا، رێبازی تەڤگەر پێویستی بە چ هەیە، ئەوەی دەستنیشان دەکرد و دەیدایە پێشخۆی و دەیخواست ئەوە جێبەجێ بکات و لەمەشدا پێداگری دەکرد، کەسێتی ملیتانێتی ئەم تەڤگەرەی بەبنەما وەردەگرت، لەژیان و پراکتیکی خۆیدا جێبەجێی دەکرد، کەسێتییەکی وەها بوو.

چونکە ملیتانێتی ئەم تەڤگەرە بەتەواوی لەسەر دەستنیشانکردنی پێداویستییەکانی ئەم تەڤگەرە و خستنەپێشخۆی ئەو پێداویستییە و دابینکردنی ئەو پێداویستییە

بنیادنراوە. ملیتانێتی ئەم تەڤگەرە بەتەواوی لەسەر ئەو بنچینەیەیە، ئەگەر تۆ ملیتانێتییەکی وەها بەبنچینە وەربگریت، ئەوا ملیتانێتییەکی مەزنە، ملیتانێتییەکە بەردەوام پێشکەوتن و سەرکەوتن بەدیدەهێنێت. لەو ملیتانێتییەدا زێدە بەفیڕۆدان (خەسارکردن) نییە، یەکێك ئەو ملیتانییەی لەخۆیدا ئاواکرد بێت ئەوا خۆی بۆ خۆی ئەرك و تەعلیمات دروست دەکات. کەسێکی بەمجۆرە هەرگیز لەئامانجی ڕێکخستن دوور ناکەوێتەوە، لەڕێباز و تاکتیك و ئەرکی ڕێکخستن دوور ناکەوێتەوە، بۆ کەسێتی وەها تەعلیمات هەبێت یان نەبێت، چاودێری هەبێت یان نەبێت، ئەوا خۆی بۆ خۆی چاودێری ئەرك و تەعلیماتیش دەکات. هەر بۆیە ملیتانێتی بەمجۆرە بەردەوام سەرکەوتن و پێشکەوتن دێنێتە ئاراوە، ئیدی کەسێتی هەڤاڵ "عەگید" کەسێتییەکی بەمجۆرە بوو، بەرجەستەکردنی ملیتانێتی تەڤگەری (PKK)ی لەکەسێتی خۆیدا بەبنەما وەرگرتبوو. ئەوەی هەڤاڵ "عەگید" کردی ئەمەیە، هیچ کاتێك هەڤاڵ "عەگید" بە ئەمر و تەعلیمات و چاودێریکردن تێکۆشانی گەریلایی پێشنەخست و چالاکی ئەنجام نەدا، بەڵکو هەوڵی دەدا تێبگات کە کێشەی گەریلا و گەریلایی چییە و چۆن چارەسەری بکات؟ چۆن گەریلایی و شەڕ مەزن بکات، پێداویستی کار و تەڤگەر چۆن پێك بێنێت؟ هەمیشە ئەوەی بۆ خۆی بەبنەما وەرگرت و لەسەر ئەمە پێداگری کرد و لێی تێگەیشت و هەنگاوی بۆ هاوێشت، لەبەر ئەوەش بوو هەنگاوەکانی هەنگاوی پێشکەوتن و سەرکەوتن بوو و بەردەوام ژیان و بەهای قازانج کرد. ملیتانێتی (PKK)ی لەژیان و پراکتیکدا پێکهێنا، ئەوەی "عەگید"ی کردە "عەگید" ئەمەیە، "عەگید" وەها بووە "عەگید". چونکە ئەگەر تۆ بەتەعلیمات و ئەمر و چاودێریکردنەوە کار و خەبات بکەیت زێدە هونەری تێدا نییە، ئەمە هەر کەس دەتوانێت بیکات، کەسێکی نا ڕێکخستنیش تۆ کاری پێ بسپێریت کەمێك دەیکات. ملیتانێکی تەڤگەریش ئەگەر تەڤگەر ئەرکێکی پێ بسپێرێت ئەوا مسۆگەر دەیکات، تەنانەت کەسێکی نا ملیتانیش ئەگەر تەڤگەر ئەرکی پێ بسپێرێت دەیکات. ملیتانێتی جودایە، ملیتانێتی بە ئەمر و تەعلیمات و چاودێریکردن نابێت، بە توانستدان نابێت، ملیتانێتی ئەوەیە کە بەتەواوی خۆی بەئامانجەوە کلیل دەدات، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجەش پێك بهێنێت پێداویستی ئەو ئامانجەش دەستنیشان دەکات و دەیداتە پێشخۆی و پێکیدەهێنێت. هەمیشە توانست و

ئیمکانییەت پێشدەخات، ملیتانێتی وەها دێتەدی. یەکێك ملیتانییەکی وەهای بەبنچینە وەرگرت، دەتوانێت ملیتانێتی ئەم تەفگەرە لەخۆیدا بەرجەستە بکات. چونکە ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفەی ئەم تەفگەرە ملیتانێتییەکی بەمجۆرە دەخوازێت. "عەگید" ئەو ملیتانێتییەی لەخۆیدا بەرجەستەکرد. بەو ملیتانێتییە ژیا و خەباتی کرد.

بۆیە لەپراکتیکی هەڤاڵ "عەگید"دا بەردەوام ڕێکخستن و گەریلا بەرەو پێشەوە دەچوو. ئیدی ئەمە چی بوو؟ سەرۆك و ڕێبازی سەرۆك باش تێگەیشتن و باش بەرجەستەکردنی بوو. بۆیە بووە ڕۆحی سەرۆك، بۆیە سەرۆك بەهایەکی مەزنی بەو هەڤاڵە دەدا. چونکە لەو هەڤاڵەدا تەڤگەر هەمیشە هەرچییەکی دەدایە دەستی ئەوا پێشیخست و مەزنی کرد و گەیاندییە سەرکەوتن، هیچ کاتێك لەشەخسی ئەو هەڤاڵەدا شت بەفیڕۆ نەدەچوو، یان کەم نەدەبوو... ئیدی ئەمە ملیتانێتی ئایدیۆلۆژیای ئەم تەفگەرەبوو، لەپراکتیدا بەرجەستەکردنی ئەمە بوو، لەکەسێتی هەڤاڵ "عەگید"دا کەیفییەت (میزاجییەت) نەبوو، ژیانێکی تاکڕەوێتی نەبوو، یاری بە بەهایەکان نەدەکرد، بەتەواوی ژیانێکی ڕێکخستنی هەبوو، تێیدا دیسپلین و پێوانە و جددییەت و بەرپرسیارێتی و هوشیاری و دانایی هەبوو، بە کێماسی و هەڵەوە نەدەژیا، بەڵکو بێ دوودڵی ڕەخنەی کەماسی و هەڵەکانی دەکرد و بەلاوەیانی دەنا، بەردەوام شەرڤان و کادیرانی پێشدەخست و مەزنی دەکردن و نەیدەهێشت بەکێماسی و لاوازی بژین، بەهای گەل و تەفگەری دەخستە خزمەتی تەفگەر و گەلەوە، بەمەش تەفگەری پێ مەزن دەکرد، هیچ کاتێك بۆ خۆی یەکاری نەدەهێنا، هیچ کاتێك ژیانێکی شەخسی نەدایە پێشخۆی، لەدژی کۆنەپەرستی و میللیگەرایی و داگیرکەری تێکۆشانی دەکرد و ڕەتیدەکردنەوە، ژیانی خۆی بەتەواوی خستبووە خزمەتی ئازادی و لەپێناو ئازادی ژیا و لەپێناو ئازادیشدا شەهیدبوو، لەدەرەوەی ئەمە هیچ ژیان و مردنێکی دیکەی پەسند نەدەکرد، لەژیانی خۆیدا زۆر سادە بوو، سادەبوونی بەبنەما وەردەگرت، بە توانستێکی کەم و هەیی خەباتی دەکرد و دەژیا، بەو توانستە کەمە توانستی مەزنتر و بەهێزتری دەردەخست و بەبنەمای وەردەگرت، هەمیشە لەخۆیدا هوشیاری و دانایی و زانستبوونی پێشدەخست و خۆی لەڕووی سیاسی و ڕێکخستنی و عەسکەری و فیکری و ئایدیۆلۆژییدا بەهێزتر دەکرد، ئیدی لەهەموو ڕوویێکەوە خۆی بەهێز دەکرد و نوێی دەکردەوە،

هەمیشە رێباز و تەفکەر و پێداویستی تەفکەری بۆ خۆی بەبنەما وەردەگرت، هەروەها ئیمکانییەتی تەفکەریشی بۆ پێداویستی رێباز دەخستەگەڕ.

لە کەسێتی هەڤاڵ "عەگید"دا فیداکاری و جوونەتێکی مەزن هەبوو، هەموو ژیانی خۆی لەگەڵ هەڤاڵانی دەگوزەراند، چ لەکاتی مەترسیدا، چ لەکاتی هەبوونی ئیمکانییەتدا و چ لەکاتی بێ ئیمکانییەتیشدا، هیچ کاتێك خۆی لەدەرەوەی هەڤاڵانیدا و لەسەر هەڤاڵانیدا نەدەبینی، هەرچییەکی بۆ خۆی بەشایستە بینیبایە بۆ هەڤاڵانی خۆیشی بەشایستە دەبینی، هەرچییەکی بۆ هەڤاڵان بەشایستە دەزانی بۆ خۆیشی بەشایستەی دەزانی، کەسێکی وەها بوو، لەهەموو رووێکەوە رێباز و رۆحی سەرۆکایەتی بەبنەما وەرگرتبوو، لەخۆیدا بەرجەستەی کردبوو. هەر بۆیە لەپراکتیدا کاری مەزنی ئەنجام دەدا، سەرۆکیش بەردەوام بەها و رێزی دەدایە هەڤاڵ "عەگید".

کاتێك کە شەهید بوو سەرۆك ئاپۆ گووتی:" من لایەکی خۆم لەدەست دا، بۆ بیرەوەری ئەو هەڤاڵەش مەزنکردنی سوپا (ئارتەش)ی گەریلا و شەڕی گەریلایی بەبنەما وەرگرت، بۆ ئەوەی ئەو هەڤاڵەش هەر لەنەمریدا بمێنێتەوە. بەمجۆرە لەشەهیدبوونی هەڤاڵ "عەگید" نزیکبووەوە. بە شەهیدبوونی هەڤاڵ "عەگید" بەسوپابوون (بەئارتەشبوون)ی گەریلای پێشخست، بەمشێوەیە وەڵامی شەهیدبوونی هەڤاڵ "عەگید"ی دایەوە...

**بەگوێرەی ئەو پلانسازییەی ئەو کاتە هەبوو، پێویستبوو لەگەڵ هەڵمەتی (١٥)ی ئابدا، بەرەی رزگاری نەتەوەیی کوردستان (ERNK)ش رابگەیەندرێت، بەڵام وەکو دیار دەبێت لەو کاتەدا ئەو بەرەیە رانەگەیەنرێت. بۆچی ئەو بەرەیە لەو کاتەدا راناگەیەنرێت؟**

کاتێك ئێمە لە(١٥)ی ئابدا هێزا رزگاریا کوردستان (HRK)مان راگەیاند، دەبوایە ئەنیا رزگاریا نەتەوا کوردستان (ERNK)ش راگەیەنرابایە، ئێمە گەریلامان راگەیاند و

دەربازی قۆناخی گەریلایی دەبووین، پێویستبوو بەرە (ERNK)ش رابگەیەنرایە و (HRK)ش ببایە هێزی ئەو بەرەیە. پێویستبوو لەژێر چەتری بەرەدا پێشبکەوتبایە. ئێمە بڕیارێکی وەهامان وەرگرتبوو، دەبووایە ئامادەکارییەکانیش لەسەر ئەو بنەمایە پێشبکەوتبایە، ئامادەکارییەکانیش دەبووایە تا (١٥)ی ئاب تەواو ببووایە، ئێمە ئەرکی ئامادەکردنی بەلاغی دامەزراندنی (ERNK)مان بە فاتمە (کەسیرە یڵدرم) سپارد بوو، کە پێویستبوو "فاتمە" ئامادەکاری بکردایە، "فاتمە" خۆی ئەمەی خواست و گووتی:" دەخوازم من ئەو بەلاغە ئامادە بکەم" نەك تەنیا وەك بەیاننامەیەك بوو، بەڵکو پێویستبوو وەکو جاڕنامەیەك ئامادە بکرایە. واتا وەك نامیلکەیەکی بچووك ئامادەمان بکردایە، بەڵام "فاتمە" ئەمەی ئەنجام نەدا. ئەو خۆی ئەرکی ئامادەکردنی دابووە سەر ئەستۆی خۆی و کەچی خۆیشی پێکینەهێنا، لەبەر ئەوەی پێکینەهێنا، ئێمەش ناچاربووین تەنیا (HRK)مان راگەیاند. بۆیە (ERNK) رانەگەیەنرا، کەچی دەبووایە ئەو بەرەیەشمانە ئەو کاتە راگەیاندبایە.

بۆیە راگەیاندنی (ERNK) مایەوە، تا لە یەکەم رۆژی نەورۆزی (١٩٨٥)دا راگەیەندرا. کاتێك بۆ ئەمە ئامادەکاری تەواو نەببوو، ئەو جاڕنامەیە رانەگەیەندرا. چونکە هەر تەنیا جاڕنامە نەبوو، پێویستبوو هەندێك کادیریش بۆ ئەم بەرەیە ئامادە بکرایە، هەندێ کۆبوونەوە لەم پێناوەدا ساز بدرایە، بۆ ئەوەی کە (ERNK)مان راگەیاند ئەوا دەست بەکاری رێکخستنی خۆی بکات، لەم رووەوە ئەو ئامادەکارییەشی بۆ نەکرابوو. بەمشێوەیە ئەگەر تۆ (ERNK) رابەگەیەنیت زێدە واتای خۆی نەدەبوو، بەڵام سەرەڕای ئەمەش لەبنەڕەتدا ئێمە دەمانتوانی هەر رابگەیەنین، رانەگەیاندنی (ERNK) لەو کاتەدا خەتایەك بوو، چونکە ئێمە دەمانتوانی بەو شێوەیەش رابگەیەنین، ئێمە گووتمان:" ئامادەکارییەکانی نەکراوە با بمێنێت تا ئەو ئامادەکارییانە تەواو دەبن. پاشان ئێمە رایبگییەنین" بۆیە ئێمە نەورۆزی ساڵی (١٩٨٥)مان گونجاو بینی کە لە نەورۆزدا رابگەیەنین...

**دوای ڕاگەیاندنی هەڵمەتی (١٥)ی ئاب هەڵوێستی دەوروبەری تورکیا، هێزە چەپڕەوەکانی تورکیا، هێزە کوردییەکان لە باکوور و باشووری کوردستان لەبەرامبەر ئەو هەڵمەتە چی بوو؟ چۆن هەڵمەتی (١٥)ی ئابیان هەڵدەسەنگاند؟**

پارتەکانی کورد هیچ یەکێکیان لەو هەڵمەتە تێنەگەیشتن و باوەڕیشیان بەو هەڵمەتە نەبوو، ئیدی هەندێکیان دەیانگووت:" ئەشقیاکان (یاخیبووەکان) ئەو چالاکییەیان ئەنجامداوە" هەندێکی تر دەیانگووت:"(PKK) ئەنجامی داوە، بەڵام ناتوانێت بەردەوامی پێبدات" واتا ئەو هەڵمەتەیان پەسند نەکرد و لەدژی ڕاوەستان، دەیانخواست کاریگەرییەکەی بشکێنن. چونکە نەیاندەتوانی ئەو هەڵمەتە داقورتێنن، لەبەر ئەوەی ئەو هەڵمەتە زەبرێکی مەزنیشی لەوان دابوو، هەر خۆیان بێهێز ببوون و نیازێکی ئەوتۆیان نەبوو کار و خەباتێك بکەن، (١٥)ی ئابیش کاتێك ئەنجامدرا، زەبرێکی مەزنی لەچەمکەکانی ئەوان دا، وەك بڵێی مردنی ئەوانی لەگەڵ خۆیدا هێنابێت، بۆیە نەیانتوانی پەسندی بکەن و دایقورتێنن. هەر بۆیەش لەدژی ئەو هەڵمەتە ڕاوەستان، هەندێکیان بەکارێکی بێ بەهایان لەقەڵەم دەدا و هەندێکی تریش بەکارێکی بچووکیان دەزانی، هەندێکی تریش دەیانگووت:" ئەم هەڵمەتە بەردەوام نابێت". هەبوون دەیانگووت:" ئەمە کۆمەڵکوژی کوردان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت" هەشبوون دەیانگووت:" ئەوا ئەو هەڵمەتە ئەنجامدرا و ئیدی کۆتایی پێهێنرا، ئیدی (PKK) کۆتایی بەخۆی دێنێت".

لەباشووریشدا (پ د ك) زۆر تووڕە ببوو، چونکە بەبێ ئەوان ئەو هەڵمەتە ئەنجامدرابوو، دوای هەڵمەتەکە گووتیان:" ڕێککەوتنێکی نێوان ئێمە هەبوو، ئێوە ئێمەتان هیچ ئاگادارنەکردەوە، ئێوە بۆ ئەو هەڵمەتەتان دەستپێکرد؟ پێویستبوو ئێوە بەئێمەتان بگووتبایە، ئەگەر بەئێمەتان بگووتبایە لەوانەبوو ئێمە هێزمان دابایە ئێوە!!" واتا بەمشێوەیە تووڕەبوونی خۆیان نیشان دا، پاشانیش تا دەهات پەیوەندیان لەگەڵ ئێمە لاواز دەکرد و دەیچڕاند، لەبەرامبەریشدا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی

تورکیادا بەهێز دەکرد. تەنانەت ئێمەیان لەباشوور قەدەخەکرد و گووتیان:" پێویستە ئێوە لەباشوور نەمێنن، لەهەر کوێیەك ئێوە ببینین قبوڵی ناکەین" تەنانەت نەیانهێشت ئێمە لەباشووردا بژین و کامپ بکەینەوە، لەهەر کوێیەك هێزەکانی ئێمەیان ببینایە دەچوونە سەریان، نزیکبوونەوەیەکی وەهایان نیشاندەدا. لەباکوور هەندێك پەیوەندی خۆیان هەبوو، بانگیانکردن و قسەیان لەگەڵ کردن، ئەوانیش چوون چەکیان وەرگرت لەدژی ئێمە بوونە چەتە (جاش). واتا نزیکبوونەوەی (پ د ك) بۆ هەڵمەتی (١٥)ی ئاب وەهابوو. دیاربوو کە نەیاندەخواست هەڵمەتێکی لەمجۆرە پێشبکەوێت. لەباکووردا خەباتێکی بەمجۆرە پێشبکەوێت، بەمە تووڕەبوو، تووڕەبوونی خۆیشی بەمشێوەیە نیشان دا.

هەڵبەتە لەباکووریش ئەو پارتانەی کە هەبوون هیچ هێزێکیان نەبوو، دژی ئێمە دەئاخفین و ئاخافتنی ئەوانیش زێدە کاریگەری خۆی نەبوو، نەیاندەتوانی ئاستەنگی بۆ ئێمەش دروست بکەن، (١٥)ی ئاب راستینەی ئەوانیشی زیاتر دەرخستەڕوو، وەکو گووتم؛ زەبری کۆتایی لەوان دا، ئیدی ئەوان هەن یان نین؟ کەسێك نەیدەهێنایە بیری خۆیشی...

## پەراوێزەکان:

(١) بەرەی دیموکراتی رزگاری فەلەستین (الجبهة الديمقراطية لتحرير فلسطين): بزووتنەوەیەکی چەکداری شۆڕشگێڕی بوون و یەکێك بوو لە رێکخراوە سەرەکییەکانی ناو رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینی. پێشتر ناوی بەرەی گەلەری دیموکراتی رزگاری فەلەستین بوو، پاشان ناوی خۆی گۆڕی و بووە بەرەی دیموکراتی گەلەری رزگاری فەلەستین تا دواجار ناوی خۆی کردە بەرەی دیموکراتی رزگاری فەلەستین. نایف حەواتمە ئەمینداری ئەو بەرەیە بووە.

(٢) مەبەستی لە کارەساتی هەکارییە کە لەساڵی (١٩٧٧)دا روویدا، لەو کارەساتەدا سەدان پێشمەرگەی (ی ن ك) بەدەستی "قیادەی موەقەتە" و " عەشیرەتە بەکرێگیراوەکانی باکوور" و بەهۆی سەرما و بەفرەوە شەهید بوو. لەنێو شەهیدەکاندا عەلی عەسکەری و دکتۆر خالیدیش هەبوو...

(٣) بەرەی جود (جبهة الوطنية الديمقراطية) بەرەیەکی هێزە کوردییەکانی باشوور بوو بەسەرکردایەتی (پ د ك) و بەرەی جەوقەد (جبهة الوطنية القومية الديمقراطية) بەرەیەکی هێزە کوردی و ئێراقییەکان بوو بەسەرکردایەتی (ی ن ك). ئەو دوو بەرەیە لەسەرەتای هەشتاکان دروست بوون و شەڕ و پێدادانێکی زۆر لەنێوانیاندا روویدا...

# بەرەو سوپاییبوون... جەماوەرییبوون!!

**دوای شەهیدبوونی هەڤاڵ "عەگید" لە (٢٨)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٦)، سێیەمین کۆنگرەی (PKK) سازدەدرێت. ئەو کۆنگرەیە لەمێژووی تەڤگەردا چ شوێنگەیەکی هەیە؟ بەگشتی راسپاردە و بڕیارەکانی کۆنگرە چیبوون؟ هەروەها ئەو مەیل و چەمکانەی لەنێو کۆنگرەدا دەرکەوتنەڕوو چیبوون؟**

سێیەمین کۆنگرەی (PKK) لەمێژووی ئێمەدا شوێنگەیەکی زۆر گرنگی هەیە. ئێمە خەباتمان بەڕێوە بردبوو، لەو خەباتەدا زۆر هەڵە و کەموکوڕی دەرکەوتبوون. هەروەها لەساڵی (١٩٨٥)دا زۆر زەبریشمان بەرکەوتبوو، تەنانەت کەمێك مابوو تەڤگەری گەریلایی زەبرێکی مەزن بخوات، لەرەوشێکی وەهادا دەژیاین. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا کۆنگرەی سێیەمین سازدرا، هەر کەسە و حیساباتی خۆی لەسەر ئەو کۆنگرەیە دەکرد، دەیانگووت:" لەم کۆنگرەیەدا تەڤگەر پارچە دەبێت، ئیدی ئەم تەڤگەرە ناتوانێت خۆی کۆبکاتەوە و لەخەباتدا بەردەوام ببێت" هەندێك کەسیش ئامادەکاری ئەوەیان دەکرد کەوا میراسی ئەو تەڤگەرە بخەنە دەستی خۆیانەوە.
دەوڵەتی تورکیا ئامادەکاری ئەوەی دەکرد کەوا لەکاتی ئەنجامدانی کۆنگرەدا زەبر لەتەڤگەر بوەشێنێت، کە بەتەواوی تەڤگەر تەسفیە بکات و ئەنجامگیر ببێت. چونکە لەبەرەی گەریلادا؛ هێرشێکی مەزنی تورکیا لەسەر گەریلا بەڕێوە دەچوو. ئێمە زۆر قوربانیمان دەدا، دەوڵەت لەو قەناعەتەدا بوو کە ئیدی دەتوانێت گەریلا بێکاریگەر بکات، پێویستبوو گورز لەکۆنگرە بوەشێنێت و کۆنگرەش تەسفیە بکات، بۆ ئەوەی تەڤگەر بەتەواوی تەسفیە ببێت، ئامادەکاری بۆ ئەوە دەکرد، کە جێی کۆنگرە

دەستنیشان بکات، بۆ ئەم مەبەستە چەندین تیمی تایبەتیشی ناردبوو، بۆ ئەوەی کۆمەڵکوژی و کوشتار و کوشتن (اغتیال)یش ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی بتوانن پەلاماری شوێنی کۆنگرە بدەن و کۆمەڵکوژییەك ئەنجام بدەن و بەمجۆرە تەڤگەر تەسفیە ببێت، بۆ ئەو مەبەستە زۆر هەوڵیان دەدا.

ئێران، هەندێك لە هەڤالانی ئێمەی گرتبوو، سەودا و مامەڵەی لەگەڵ تورکیا لەسەر ئەو هەڤالانە دەکرد و دەیخواست لەسەر ئەمە هەم پەیوەندی خۆی لەگەڵ تورکیادا باش بکات، هەمیش دەیخواست زەبرێکیش لەتەڤگەر بوەشێنێت، ئەویش لەنێو ئامادەکارییەکی وەهادا بوو و بۆ ئەو مەبەستەش کاری دەکرد.

سوریا، دەیبینی کە ئێمە لەولاتدا، لەبەرەی گەریلادا، هەندێك زەبرمان بەردەکەوێت، کێشەی رێکخستنیشمان هەیە، دەیخواست فشار و گوشاری خۆی لەسەر تەڤگەر زیاتر بکات. دەیگووت:" تەڤگەر کێشەی قورسی خۆی هەیە و بێهێز بووە، بۆیە دەتوانم تەڤگەر بێ ئیرادە بکەم و بیخەمە خزمەتی خۆمەوە" ئەویش لەنێو حیساباتێکی وەهادا بوون. بۆیە فشار و هەرەشەی لەسەر تەڤگەر بەرێوە دەبرد. تەنانەت ئەو کاتە سەرۆکیشی دەستگیر کرد، واتا خواستیان تەڤگەر بترسێنن و تەسلیمی بکەن، ئەوەش حیساباتی ئەوان بوو.

هەندێك پارتی کوردیش دەیانگووت:" ئیدی (PKK) کۆتایی پێدێت و سازدانی کۆنگرەش ناتوانێت ئەوان رزگار بکات، ئێمەش ئەو بەها و میراسەی (PKK) ئافراندوویەتی بۆ خۆمان گلیدەدەینەوە و لەسەری دەژین و خۆمانی پێ بەهێز دەکەین، ئەوانەش لەنێو ئەو حیساباتانەدا بوون.

بێگومان لەناو ئێمەشدا حیساباتی "فاتمە" هەبوو، حیساباتی "کۆر جەمال"، "تەرزی جەمال"، سەلیم خۆجە (سەلاحەددین چەلیك) و ئەوانە هەبوو، ئەوانەش دەیانخواست حیساباتی خۆیان بەرێوەبەن.

بۆیە مەقۆمەقۆی زۆر لەسەر ئەوە دەکرا کە؛ ئایا ئەو کۆنگرەیە سازدەدرێت؟ ئەگەر کۆنگرە سازبدرێت چۆن سازدەدرێت؟ لەکوێ و کەی سازدەدرێت؟ دەتوانێت کێشەکان چارەسەر بکات یان نا؟ سەردەکەوێت یان نا؟ بەم کۆنگرەیە کۆتایی ئەم تەڤگەرە چی دەبێت؟ گفتوگۆ لەسەر ئەو مەسەلانە زۆر دەکرا. بۆ زۆربەی ئەو هێز و کەسانەش دیار

نەبوو، کە کۆتایی ئەم تەڤگەرە چی دەبێت! سەرۆکیش لەهەموو ئەو مەسەلانە تێدەگەیشت و دەیبینی بۆ ئەوەی کۆنگرە کۆببێتەوە کێشەکانی تەڤگەر چارەسەر بین، بۆ ئەوەی ئەو کۆنگرەیەش ببێتە هۆی پێشکەوتنی تەڤگەر، نەك هەر تەنیا کێشەکان چارەسەر بکات و مەترسییەکان نەهێڵێت، بەڵکو هەم چارەسەریان بکات و هەمیش ببێتە هۆی دەستپێکردنی هەڵمەتێکی مەزن. سەرۆکیش حیساباتی خۆی بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش کار و خەباتی دەکرد. ئیدی کۆنگرەی سێیەمین لەدۆخێکی وەهادا کۆبووەوە و کاری خۆی دەستپێکرد.

بێگومان سەرۆك بەرلەوەی کۆنگرە دەست پێبکات هەندێك تەدبیری وەرگرتبوو، لە کادیران و ئەندامانی کۆنگرەدا قووڵبوونەوەیەکی پێشخستبوو، زۆر کێشەی تەڤگەری پێش سازدانی کۆنگرە چارەسەر کردبوو. لەسەر بنەمای ئەو تەدبیرانە بەفەرمی کۆنگرە سازدرا، ئەگەر وەها نەبایە لەوانەبوو کۆنگرە بەزەحمەت ئەنجام بدرایە، ئیدی ئەو هیوایەی کە زۆر لە هێز و لایەنەکان چاوەڕێی بوون لەوانەبوو پێکبهاتبایە، یان لەهەندێك رووەوە پێکهاتبایە. ئەگەر ئەو هیوایەیان پێکنەهات ئەوا لەبەر ئەوەبوو کە سەرۆك بەرلەوەی کۆنگرە دەست پێبکات پەروەردەیەکی قووڵ و فراوانی پێشخست، رەخنە و رەخنەدان و گفتوگۆیەکی چڕوپڕی پێشخست، کەش و هەوایەکی گونجاوی ئافراند. بەمەش گەلێك کێشەی چارەسەر کرد. لەسەر ئەو بنەمایەش کۆنگرە بەفەرمی سازدرا، بەمەش کۆنگرە سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

سەرۆك بۆ کۆنگرەی سێیەمین شیکردنەوەیەکی فراوانی کرد، هەم شیکردنەوەیەك بوو لەسەر مێژوو، هەمیش لەسەر کۆمەڵگا. ئیدی لەبەر ئەوە سەرۆك گووتی:" ئەوەی لێرەدا شیدەکرێتەوە و چارەسەر دەکرێت هەنووکە نییە مێژووە، شەخس نییە چین و جڤاکە". ئەمە شیکردنەوەیەکی مێژوویی بەهێز بوو. بۆیە بەم شیکردنەوەیە کێشەکانی (PKK) چارەسەربوو، کێشەی کۆمەڵگای کورد، مرۆڤی کورد چارەسەر بوو، کێشەی مێژوو چارەسەر بوو.

بەئەنجامدانی سێیەمین کۆنگرە؛ ئەم تەڤگەرە مێژوویێکی لەدوای خۆی بەجێهێشت، سەردەمێکی نوێی لەمێژووی خۆیدا کردەوە و دەستیپێکرد، تا ئەو کۆنگرەیە لەنێو تەڤگەردا زێدەتر مەسەلە رێکخستنییەکان گفتوگۆی لەسەر دەکرا، واتا (PKK) چۆن بە

ناسنامەی خۆی بگات؟ (PKK) چۆن لەهەموو لایەکەوە زەلال و روون ببێت؟ ئەو کارانەی سەرۆك بەڕێوەی دەبرد لەسەر ئەو بنەمایە بوو. ئیدی (PKK) بەو کۆنگرەیە و بەو شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنانەی کران و بەو بڕیارانەی لەکۆنگرەکەدا دران گەیشتە ناسنامەی خۆی و ناسنامەکەی لەهەموو روویێکەوە زەلال بوو. ئیدی پێویستبوو ملیتانێتی (PKK) لەسەر بنەمای ناسنامەی (PKK) پێشبکەوتبایە، ئیدی ئەو شیکردنەوەیەی کەوا سەرۆك بە سازدانی کۆنگرە دەستپێکرد و لەدوای کۆنگرەش قووڵتری کردەوە و بەهێزتری کرد هەمووی بۆ ئەم مەبەستە بوو. ئەو شیکردنەوەیە شیکردنەوەی کۆمەڵگای کورد، مێژووی کورد بوو. لەسەر ئەو بنەمایەش شیکردنەوەی کەسێتی کورد بوو، شیکردنەوەی رۆژگار و سەردەمیش بوو. ئیدی ئەگەر تۆ باش لەمێژوو و کۆمەڵگا تێنەگەیشتیت ئەوا تۆ ناتوانیت کێشە مێژووییەکان و جڤاکییەکانیش چارەسەر بکەیت.

کێشەی کورد کێشەیەکی زۆر مەزن بوو، هەم لەرووی جڤاکی و هەمیش لەرووی مێژووییەوە، کێشەیەکی هێندە مەزنی مێژوویی و جڤاکی، ئەگەر تۆ لەمێژوو و کۆمەڵگا باش تێگەیشتیت و باش شیتکردنەوە و راست هەڵسەنگاند ئەو کاتە تۆ دەتوانێت کێشەی کورد چارەسەر بکەیت، کێشەی رێکخستنی، کێشەی کادیرێتی چارەسەر بکەیت. سەرۆك بە کۆنگرەی سێیەمەوە پێڤاژۆیەکی بەمجۆرەی پێشخست. بۆیە ئەو کۆنگرەیە گرنگ بوو.

بێگومان سەرۆك لەو کۆنگرەیەدا، چەمك و مەیلەکانی "کەمالیستی، چەپە بۆرژوازی بچووك، کوردی فیوداڵ ـ ئەرستۆکرات، گوندێتی، خەتی ناوەڕاست"ی هەموو شیکردەوە، زێدەتریش چووە سەر چەمك و مەیلەکانی بۆرژوازی بچووك، کەمالیست، فیوداڵ ـ ئەرستۆکرات. چونکە ئەو چەمك و مەیلانە بۆ رێکخستن، گەریلا، پێشەنگایەتی، ئازادی و دیموکراسی کێشەی دروستکرد بوو، سەرۆکایەتی ئەمەی خستەڕوو و لە کادیر و تەڤگەری گەیاند کە ئەو چەمك و مەیلانە چین، ئەو خراپەکارییانەی ئەو چەمك و مەیلانە ئەنجامیان داوە خستییەڕوو و بەتێگەیشتنی دا. چونکە ئەگەر تۆ راستینەی ئەو چەمك و مەیلانە شینەکەیتەوە و بەتێگەیشتنی نەدەیت، ئەوا ناتوانیت تەڤگەر و کادیران لەو چەمك و مەیلانە رزگار بکەیت، ناتوانیت

تەڤگەر لەسەر بناخە و ئامانجی بنچینەیی خۆی بەهێز بکەیت و بەڕێوەی ببەیت، بۆیە لەکۆنگرەی سێیەمیندا رەخنە و رەخنەدان بەشێوەیەکی مەزن و فراوان بەڕێوەچوو، حیساب پرسین (لێپرسینەوە) و حیسابدانێکی بەهێز پێشکەوت. ئیدی بەمە ئەو کێشانە چارەسەر بوون و کۆنگرەش سەرکەوت.

ئەو کۆنگرەیە لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا بووە بناخەی هەڵمەتێکی نوێ. هەرکەس دەیگووت:" ئیدی (PKK) تەسفیە دەبێت، کۆنگرەش ئەو تەسفیەبوونە فەرمی دەکات" بەڵام هەر کەسیش بینی کە ئەمە رووینەدا، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە روویدا، هەر چاوەڕێی تەسفیەبوون بوون، کەچی لەکۆنگرە تەڤگەر بەهێزەوە دەرکەوت و هەڵمەتێکی نوێی دەستپێکرد. بێگومان ئەمە بەکار و هەوڵی سەرۆك هاتەدی. چونکە سەرۆك راستینەی مێژوو و جڤاکی شیکردەوە، ئەو کێشانەی لەوێدا دەردەکەوێت و لەرێکخستندا باسی لێوە دەکرێت، کە هەر هەمووی لەشەخسەکاندا گوزارشتی لێدەکرێت و لەپێڤاژۆیەکاندا گوزارشتی لێدەکرێت، دەریخستەڕوو کە گرێدراوی مێژوو و کۆمەڵگایە. ئەگەر تۆ راست گفتوگۆت لەسەر کۆمەڵگا و مێژوو نەکرد و لەراستینەی مێژوو و کۆمەڵگا تێنەگەیشتیت، لایەنە زیندووەکانی و لایەنە مردووەکانیشت نەخستەڕوو، ئەوا تۆ ناتوانیت رەنگدانەوەی ئەمە لەناو رێکخستن و کادیراندا تێبگەیت و نەیهێڵیت. ئیدی لەبەر ئەوەی سەرۆك مێژوو و کۆمەڵگای بەبنچینە وەرگرت، ئەوا ئەوەیشی شیکردەوە کە راستینەی مێژوو و کۆمەڵگا چیین؟ لایەنە زیندووەکانیان و لایەنە مردووەکانیان چیین؟ رەنگدانەوەیان لەنێو رێکخستن و کادیراندا چییە؟ دەگرێ لەپراکتیکدا چ ئەنجامێك بەدەستبخرێت؟ هەموو ئەمانەی شیکردەوە و بەتێگەیاندنی دا، بۆیە ئەو تەڤگەرەی لە پەلوپۆ کەوتبوو و بەرەو تەسفیەبوون دەچوو، لەوێدا رابووە سەرپێی خۆی و بووە هۆی هەڵمەتێکی نوێ...

**لەو کۆنگرەیەدا یەکێك لەو بڕیارانەی دەدرێت بەسوپابوون (بەئارتەشبوون)ە. ئەو بڕیارە چۆن رەنگدانەوەی خۆی لەپراکتیکدا دەبێت؟ لەبنەڕەتدا ئەو بڕیارە بۆچی وەرگیرا؟**

یەکێك لەو بڕیارە گرنگانەی سێیەمین کۆنگرە وەریگرت ئەوە بوو کە بەسوپابوون (بەئارتەشبوون)ی گەریلا ئاوا بکرێت. تا ئەو کاتە هێزی رزگاری کوردستان (HRK) هەبوو، ئەمە ڕێکخستنێکی گەریلایی نەبوو، ڕێکخستنێك بوو بۆ پڕوپاگەندەی چەکداری بوو، ئەو ڕێکخستەبوونە زێدەتر بۆ ئەوە بوو کە بناخەی گەریلا دابنێت. ئیدی لەگەڵ هەڵمەتی (١٥)ی ئابدا ئێمە ئەو هەنگاوەمان هاوێشتبوو، هەنگاوی گەریلامان هاوێشتبوو. بۆیە ئەم ڕێکخستەیەی قۆناخی پڕوپاگەندەی چەکداری بەرتەسك بوو و لەدواوە بوو و نەدەبووە وەڵام. پێویستبوو لەڕێکخستەبوونی پڕوپاگەندەی چەکدارییەوە دەربازی ڕێکخستەبوونی گەریلا ببین. ئیدی کۆنگرە ئەم بڕیارەی وەرگرت. بۆیە ناوی (HRK) گۆڕدرا و ناوی ئارتەشی رزگاریخوازی گەلی کوردستان (ARGK) پەسندکرا. ئەمە هەر تەنیا ناو گۆڕینێك نەبوو، ئەمە بۆ بەئارتەشبوونی گەریلا بڕیار وەرگرتن و هەنگاو هاوێشتن بوو. بەگوێرەی ئەمەش گۆڕینی ڕێکخستەبوونی عەسکەری بوو، لەم ڕووەوە هاوێشتنی هەنگاوێك بوو. بڕیاردانی ئەمە بوو، چونکە هەڤاڵ عەگید (مەعسوم قۆرقماز) شەهید ببوو، بۆ بیرەوەری ئەم هەڤاڵە پێویستبوو وەك هەڤاڵانی دیکە بە پێنگاڤ (هەڵمەت)ێك وەڵامی شەهیدبوونەکەی بدرێتەوە، مەگەر ئەویش بەڕێکخستەکردنی گەریلا و پێشخستنی لەئاستی بەسوپابوون (بەئارتەشبوون)دا تۆ دەتوانیت بیرەوەری ئەو هەڤاڵە بەرز رابگریت. چونکە نزیکبوونەوەی سەرۆك بۆ شەهیدبوون بەمجۆرە بوو. هەڤاڵ "عەگید" وەك کەسێتییەکی عەسکەری، کەسێتییەکی گەریلایی دەناسرا. هەڵبەتە هەر تەنیا کەسێتییەکی گەریلایی و عەسکەری نەبوو، بەڵکو کەسێتییەکی پارتیش بوو، لەو قۆناخەدا ئاواکردن و پێشخستنی سوپای گەریلا و پێشخستنی شەڕی گەریلایی ئەرکێکی سەرەکی بوو، ئەرکێکی سەرەکی پارتیش بوو، هەڤاڵ "عەگید"یش ئەو ئەرکەی جێبەجێ کردبوو، زۆر بەشکۆدارییەوە جێبەجێی کردبوو و لەم پێناوەشدا شەهید ببوو. ئیدی بۆ بیرەوەری ئەو هەڤاڵەش پێویستبوو ئەو ئەرکەی کە پارتی و بەسوپابوونی گەریلا بەهێز بکات لەکۆنگرەدا بووە بڕیار. ئەگەر ئەو بڕیارە وەرگیرا ئەوا هۆکارێکیشی بۆ بەردەوامی بیرەوەری ئەم شەهیدبوونە بوو، بۆ ئەوەی

به‌سوپاییبوونی گه‌ریلا پێشبخه‌ین، بڕیار له‌سه‌ر یاسای به‌ سه‌ربازیکردن (تجنید العسكري)یش درا. ئه‌مه‌ش زیاتر پێشنیازی خه‌ڵك (گه‌ل) بوو، گه‌ل ئه‌مه‌ی پێشنیاز کردبوو، بۆیه‌ کۆنگره‌ش ئه‌و پێشنیازه‌ی گه‌لی کرده‌ بڕیارێك بۆ به‌سوپاییبوونی گه‌ریلا.

## چۆن پێشنیازی خه‌ڵك بوو؟

له‌هه‌رێمی بۆتان هه‌ڤالان چووبوونه‌ هه‌ندێك له‌گونده‌کانی ئه‌و هه‌رێمه‌، گوندنشینان گووتبوویان:" ئێوه‌ یاسایه‌کی به‌مجۆره‌ و بڕیارێکی وه‌ها وه‌ربگرن، وه‌رن گه‌نجانی ئێمه‌ ببه‌ن، ئێمه‌ ده‌نگ ناکه‌ین. چونکه‌ ئه‌رته‌شی ده‌وڵه‌تی تورکیا یاسای ده‌رخستووه‌ و سه‌ربازی کردۆته‌ ناچاری و دێتو گه‌نجه‌کانمان ده‌بات، ئێمه‌ ناتوانین ده‌نگی خۆشمان بکه‌ین، ئێوه‌ش وه‌رن یاسایه‌کی عه‌سکه‌ری به‌مجۆره‌ ده‌ربخه‌ن و وه‌رن گه‌نجه‌کانمان ببه‌ن، مه‌گه‌ر ئێوه‌ به‌مجۆره‌ بتوانن هێزی گه‌ریلا زۆر بکه‌ن، وه‌کوتریش ئه‌گه‌ر ئێوه‌ وه‌هاتان کرد ئێمه‌ ده‌توانین به‌رگری له‌خۆشمان بکه‌ین، چونکه‌ ده‌وڵه‌ت دێتو ده‌ڵێت؛ بۆچی ده‌هێڵن منداڵه‌کانی ئێوه‌ ببه‌ن؟ ئه‌گه‌ر ئێوه‌ بێنو به‌یاسای عه‌سکه‌ری منداڵه‌کانمان ببه‌ن، ئێمه‌ش ده‌ڵێین؛ چیبکه‌ین دێن و به‌زۆره‌ملێیی ده‌یانبه‌ن و ده‌یانکه‌نه‌ عه‌سکه‌ر، ئێمه‌ چیبکه‌ین؟ ناتوانین و هێزی ئه‌وه‌مان نییه‌ ڕێگریان لێبکه‌ین، ئه‌و کاته‌ ده‌توانین به‌مشێوه‌یه‌ به‌رگری له‌خۆمان بکه‌ین، ئه‌گه‌رنا ده‌وڵه‌ت ده‌مانگرێت و ئه‌شکه‌نجه‌ و ئازارمان ده‌دات و ده‌مانخاته‌ زیندانه‌کانه‌وه‌. بۆیه‌ پێویسته‌ ئێوه‌ ته‌دبیرێکی به‌مجۆره‌ وه‌ربگرن..." ئه‌و پێشنیازه‌ ماقووڵ بوو، ئیدی گوندنیشنه‌کان گووتبوویان:" بڕوانن به‌زۆرملێیی زارۆکی ئێمه‌ ده‌به‌ن و ده‌یانکه‌ن به‌عه‌سکه‌ری تورکی، ئێوه‌ش بۆچی نایانبه‌ن و نایانکه‌ن به‌ عه‌سکه‌ری کوردی" بۆیه‌ ئه‌و یاسای سه‌ربازیکردنه‌ له‌کۆنگره‌دا بووه‌ بڕیار. ئیدی له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ی ئێمه‌ چۆن گه‌ریلا و سوپای گه‌ریلا مه‌زن بکه‌ین و پێشیبخه‌ین و شه‌ڕی گه‌ریلا چۆن به‌هێز بکه‌ین؟ کۆنگره‌ی سێیه‌م ئه‌و بڕیاره‌ی وه‌رگرت، (ARGK) بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ ناوابوو...

**لەدوای سێیەمین کۆنگرەوە؛ ئەو چەمك و مەیلانەی لەنێو کۆنگرەدا دەرکەوتبوون، پاشان لەپراکتیکدا چۆن رەنگدانەوەی خۆی دەبێت، هەم لەناو گەریلا و هەمیش لەناو رێکخستن و گەلدا؟**

دوای ئەوەی لەسێیەمین کۆنگرەدا "کەسیرە" هەموو شێوازەکانی بێ ئەنجام مایەوە و بینی کە بەمشێوەیە ناتوانێت بەردەوام ببێت و باڵادەستی خۆی لەسەر تەڤگەر و سەرۆك بسەپێنێت. تا ئەو کاتە زۆر کێشە و گرفتیشی بۆ تەڤگەر و سەرۆك دروست کردبوو، دەیزانی لەم کۆنگرەیەدا ئەمە دەبێتە کۆتایی ئەو هەڵسوکەوتانەی. واتا یان "کەسیرە" دەستبەرداری ئەو رەفتارانەی خۆی ببێت و خۆی تەڤلی تەڤگەر بکات و لەگەڵ تەڤگەردا ببێتەیەك و بکەوێتە ژێر فەرمانی تەڤگەر و بەگوێرەی تەڤگەر بەرێوەبچێت، یانیش ئیدی تەڤگەر لەگەڵ "کەسیرە"دا بەرێوە ناچێت. ئیدی "کەسیرە" لەمە تێبگەیشتبوو، لەبەر ئەوە لەو قۆناخەدا "کەسیرە" دوا کارتی خۆی خستەڕوو، ئیتر دەستی بەهەوڵدانەکانی خۆی کردەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەبەرامبەر سەرۆك هەندێك رکوکینە و کاردانەوە دروست بکات و بتوانێت سەرۆك بێکاریگەر بکات. بەمەش دەیخواست کە سەرۆك و رێکخستن نەتوانن رێ لەو رەفتار و هەڵسوکەوتانەی بگرن. "کەسیرە" دەیبینی کە تەڤگەر (رێکخستن) بە چ رەوشێکی زۆر و زەحمەتیدا تێپەر دەبێت؛ لەلایەکەوە گەریلا زۆر قوربانی دەبەخشێت و هەڤاڵ "عەگید" شەهیدبووە، لەلایەکی دیکەشەوە چەندین حیسابات لەسەر کۆنگرە لەئارا دایە... هەموو ئەمانەی دەبینی، وای مەزندە دەکرد کە؛" سەرۆك و رێکخستن لەنێو زۆری و زەحمەتییەکی مەزن دان، ئەگەر من هەندێك هەرەشە و گورەشە بکەم، رکوکین و کاردانەوە زیاتر بکەم، ئەوا دەتوانم رێگیری لەوە بکەم کە رێکخستن و سەرۆك رەخنەم بکەن" لەنێو حیساباتێکی بەمجۆرەدا بوو، بۆیە کێشە و گرفتەکانی نێو کادیراندا قووڵ دەکردەوە، دەیخواست هەندێك لە کادیران بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و لەدژی سەرۆك و رێکخستن بەکاریان بێنێت. رەفتارێکی بەمجۆرەی دەکرد. هەم سەرۆك و هەمیش بەرێوەبەرایەتی رێکخستن "کەسیرە"ی ئاگادار کردەوە کە دەستبەرداری ئەو کارەی ببێت و چیدی

نەیکات. ئەویش هەر پێداگری لەسەر رەفتارەکانی خۆی دەکرد، بۆیە وەکو پێشتر ئاماژەم پێی دا؛ دەستگیرکرا و کەوتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. لەئاکامی لێکۆڵینەوەکەدا دادگایی کرا، بڕیاری لەسێدارەدانی لەسەر درا. بێگومان سەرۆك ئەو بڕیارەی پەسند نەکرد، سەرۆك هەمیشە لەدژی هەر لەسێدارەدانێك بوو و هیچ کاتێك سزای لەسێدارەدانی پەسند نەکردووە. بۆیە دادگا بڕیاری دا لەئەندامێتی پارتی بکەوێت و لەناستی "بەرە"دا کار بکات و لەویشدا خۆی بسەلمێنێت. ئیدی دوای ئەو دادگاییە رەوانەی یۆنانستان کرا بۆ ئەوەی لەوێ لە بەرە (ERNK) دا کاربکات. هەڵبەتە پاشان لەوێش هەڵات و رۆیشت...

"سەلاحەددین چەلیك" هەبوو، هێشتا لە وڵات بوو ئیرادەی خۆی شکابوو، خواستبووی تەسلیمی دەوڵەت ببێت، لەگەڵ هەندێك پیاوی دەوڵەت کەوتبووە نێو پەیوەندییەوە، تاکو لەنێوان ئەو و دەوڵەتدا ببنە نێوبەینکار (ناوبژیوان) بۆ ئەوەی بچێت تەسلیم ببێتەوە. هەڤاڵان ئەومیان زانی و رێگیریان لێکرد و ناردیانە "گۆڕەپانی سەرۆکایەتی". تەڤگەر ئەرك ودەسترۆیی پێدابوو، کەچی ئەرك و دەسترۆییەکەی بەهەڵە بەکارهێنا بوو و تەخریباتی مەزنی کردبوو. بۆ نموونە؛ لەنێوان ئێمە و حزبی شیوعی ئێراقی لە "حەفتانین"دا شەڕی بەرپابببوو، دەیتوانی رێگیری لەو شەڕە بکات، هەرچەندە حزبی شیوعی دەیانخواست شەڕ بکەن و هەندێك پراواکسیۆنیشیان دەکرد، بەڵام دەیتوانی رێ لەم شەڕە بگرێت، ئەو رێگیری لەمە نەکرد بوو و ئەویش وەکو ئەوان وەڵامی دابووەوە و ببووە هۆی ئەوەی شەڕەکە تەشەنە بسەنێت، ئیدی شەڕەکە زۆر تەشەنەی سەندبوو و هەڤاڵانیشی لەوێ بەجێهێشتبوو و چووبووە ناوچەی بۆتان، واتا هەڵاتبوو و چووبوو، وەك بڵێی کەشوهەوای شەڕی دروستکردبوو و تەشەنەی پێدابوو، ئەو پراواکسیۆنەی لەئارادا بوو ئەویش زیاتر فراوانتری کردبوو، کە شەڕیش دەستپێکرد بوو، بەرپرسیارێتی خۆیشی هاوێشتبووە سەر هەندێك کەسی تر و هەڵاتبوو و رۆیشتبوو... هەڵبەتە رۆیشتنی خۆیشی بۆ ئەوە بوو تاکو بچێت و تەسلیمی دەوڵەت ببێتەوە. هەڤاڵ "عەباس" و ئەوان تەدبیری ئەومیان وەرگرتبوو و گرتبوویان و هێنابوویان و ناردبوویانە "گۆڕەپانی سەرۆکایەتی"، لەوێش دادگایی کرابوو و ئەویش بڕیاری سزای لەسێدارەدانی بەسەردا درا. سەرۆك ئەمەی پەسند نەکرد، ئەویش لەئەندامێتی پارتی

کەوت و تەفگەر لەئاستی "بەرە"دا ئەرکی پێسپارد، بۆ ئەوەی خۆی بسەلمێنێت، ئەویشیان بەمجۆرە نارده ئەوروپا، پاشان ئەویش دوای ماوەیەك لە ئەوروپا هەڵات و چوو.

ئەوەی زۆر زێده لەکۆنگرەی سێیەمیندا ئاڵۆزی و گرفتی دروست کردبوو "فاتمە" و "سەلاحەددین چەلیك" بوون. بەڵام لەدەرەوەی ئەوانەشدا هەندێك کێشە و ئاڵۆزی دیکە هەبوون، ئەو کێشە و گرفتانە چیبوون؟ سەرۆك لەبەرامبەر ئەو پراکتیکەی کە بەڕێوە بردراوە زێدەتر هەڤاڵ "عەباس" و ئەوانی بەرپرسیار دەبینی و رەخنەی دەکردن. نزیکبوونەوەی هەڤاڵ "عەباس" چیبوو؟ ئەو دەیگووت:" من ئەرکی خۆم بەجێگەیاندووە، ئەوانیتر ئەرکی خۆیان بەجێنەگەیاندووە، لێرەدا کێماسی من زێده نییە..." سەرۆکیش ئەمەی پەسند نەدەکرد، پێیگووت:" تۆ چۆن بەرپرسیارێکی؟! بەرپرسیارێتی خۆت بەجێگەیاندووە و ئەوانی دیکە بەجێیان نەگەیاندووە؟! تۆ خۆت راست دەبینی؟ ئەمە پەسند ناکرێت". بێگومان هەڤاڵ "عەباس" بەمشێوەیە خۆی راست دەبینی. واتا پێی وابوو؛ ئەگەر هەڵەیەك هەیە من هەموو هەوڵێکم دا راستی بکەمەوە و رێگری لێبکەم، بەڵام خەتای ئەوانیتر بوو راستنەکرایەوە. سەرۆك ئەو کاتە گووتی:" مادام ئەوان وەکو تۆ نەدەبوون تۆ وەکو ئەوان ببوویتایە و خۆت لەوان دانەبڕاندبایە" چونکە هەڤاڵ "عەباس" خۆی لەوان دابڕاندبوو و بەکاردانەوە (ردفعل) هەڵسوکەوتی کردبوو، ئیدی سەرۆك ئەمەی رەخنەکرد، ئەگەر تۆ خۆت لەوان دابڕاند و جوداکردەوە، ئەوا تۆ ناتوانیت کاریگەری لەسەر ئەوان دروست بکەیت، ئەگەر تۆ خۆت لەوان بەدوور نەگرتبایە و کاریگەریت لەسەر ئەوان بکردبایە، دەتتوانی هەڵەکان راست بکەیتەوە. لەم خاڵەدا سەرۆك هەڤاڵ "عەباس"ی رەخنە کرد.

"کۆر جەمال" و "تەرزی جەمال" و ئەوان چ ئەنجامێکیان لەرەوشی "کەسیرە" و "سەلاحەددین" و هەڤاڵ "عەباس" و ئەوان دەرخستبوو؟ ئەوانەش وا حیساباتیان دەکرد و دەیانگووت:" ئەوانەی لە بەڕێوەبەرایەتی دان رەخنە گران، هەندێکیان لەپارتیش وەدرنران (ئەندامێتیان لێسەندرایەوە) ئیدی دەرفەت بۆ ئێمە رەخساوە تاکو بتوانین خۆمان بکەینە ئەندامی کۆمیتە ناوەندی..." ئەوانەش لەنێو حیساباتێکی وەها دابوون. "کەسیرە" کەمێك ئەو چەمك و مەیلانەیشی وروژاندبوو و ختووکەی دابوون.

بۆیە "کۆر جەمال" و "تەرزی جەمال" و ئەوان ئەوەیان بۆخۆیان کردبووە ئامانج و دەیانگووت:" ئەوانە ئیدی بێکاریگەر بوون، ئێمە دەتوانین کۆمیتەی ناوەندی بخەینە دەستی خۆمانەوە"، بەپراکتیکیش لەنێو ئامادەکارییەکی بەمجۆرەدا بوون.

بێگومان فەرهاد (عوسمان ئۆجەلان)یش دەیبینی کە "کۆر جەمال" و "تەرزی جەمال" لەنێو ئامادەکارییەکی بەمجۆرە دان، ئەویش وا بیری کردۆتەوە کە؛" ئەوە مافی منە، چونکە من برای سەرۆکم" ئەویش بۆیە لەدژی "کۆر جەمال" و "تەرزی جەمال" رادەوەستێت، بۆ ئەوەی ئەوان بێکارگەر بکات و خۆی ببێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەگوێرەی خۆی کۆمیتیەکی ناوەندی دروست بکات، ئەویش دەکەوێتە نێو ئامادەکارییەکی بەمجۆرەوە، "کەسیرە" هەندێك ئەویش دەوروژێنێت، بۆیە ئەویش وا باوەڕ دەکات کە ببێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی...

کاتێك کە سەرۆك دەبینێت هەر کەسە و لەنێو حیساباتێکی وەهادایە سەرۆك دەچێتە توند رەخنە لەوان دەگرێت و دەڵێت:" هێشتا من نەمردووم، منیش هەم ئەگەر ئێوە دەخوازن شت بکەن، ئەمە چۆن دەبێت؟" لەلایەکی دیکەشەوە ئەو شتانەی ئەوانە دەخوازن بیکەن بەئاشکرا نایکەن، بەڵکو بەنهێنی و پیلانگێڕی دەیکەن. چۆن ئەم بێکاریگەر بکەن و شوێنی ئەو بگرێت؟

ئیدی ئەو کاتە کەسێتییە نەعلەتکراوەکەی کورد لەهەر لایەکەوە دەردەکەوێت و خۆی دەکاتە رۆژمەڤ و وێردی سەرزمان. هەر کەس "سەرکەوتنی خۆی لەژێرکەوتنی هەڤاڵی خۆیدا دەبینێت" بێگومان ئەوە ئەو زیهنییەت و کەسێتییەیە کە داگیرکەران لەکەسێتی کوردیان دروستکردووە، دووژمن لەبیر دەکات و یەکتری دەخۆن، سەرکەوتنی خۆی لە سەرکەوتنی هەڤاڵ و دراوسێ و کەسی نزیکی خۆی و دەوروبەری خۆیدا نابینێت، بەڵکو لەژێرکەوتنی ئەواندا دەبینێت. ئیتر ئەو کەسێتییە لەهەموو روویەکەوە بەهێز ببوو و دەرکەوتبووە پێش. بێگومان ئەمە مەترسیدار بوو، بۆیە سەرۆك ئەمەی بە مەترسی دەبینی و رەخنەی توندی ئەوجۆرە کەسێتییەی کرد، ئەو کاتە زیاتریش رەخنەی سەر "فەرهاد"ی کرد، بەئاشکرا پێیگووت:" تۆ کەریت" تەنانەت ئەو وشەیەشی بەکارهێنا. ئەو ئاخافتنە لەتەعلیماتدا و لەئەرشیفی پارتیشدا ماوە و پارێزراوە.

بێگومان **"فەرهاد"** دەیخواست لەنێو پارتیدا چەمکێکی تازەش پێشبخات. ئەو چەمکە چیبوو؟ گوایە "برای سەرۆکە، پێویستە بەم پەیوەندی برایەتییە بۆ خۆی شوێنگەیەك دروستبکات" ئەمە لەکاتێکدا، تا ئەو کاتە **"فەرهاد"** هەر کادیرێکی ئاساییە، نە ئەندامی **کۆمیتەی ناوەندی**یە و نە لەوەش نزیکە ببێتە ئەندامی **کۆمیتەی ناوەندی**!!. تەنانەت نازانێت کۆمیتەی ناوەندیش چییە؟ بەڵام لەم کەشوهەوایەدا هەندێك کەس کەوتنە ژێر کورسی ئەو و چەمك و مەیلی دەسەڵاتخوازێتی ئەویان ختووکە دا، چەمکی باوی نێو کۆمەڵگایان لەکەسێتی ئەودا وروژاند و ئەویش باوەڕی کرد و پێی وابوو کە بەڕاستی دەبێتە ئەندامی **کۆمیتەی ناوەندی** و بۆ خۆی وا بیری دەکردەوە کە؛"منیش بەگوێرەی خۆم لەئاستی ئەندامێمی کۆمیتەی ناوەندیم، من برای سەرۆکیشم، ئەگەر من بمەوێت هەنگاوێکی وەها بهاوێژم پێویستە سەرۆکیش لەمەدا هاوکاری من بکات" حیساباتێکی وەهای دەکرد و وا مەزەندەی دەکرد کەوا؛" ئەگەر من لەدژی **"کۆر جەمال"** و **"تەرزی جەمال"** و ئەوان رابوەستم، ئەوا پێویستە ببمە کۆمیتەی ناوەندیش، کە ماق منە، پێویستە سەرۆکیش پشتیوانی لەمن بکات" بەم چەمکە هەڵسوکەوتی دەکرد. بێگومان کاتێك کە سەرۆك بەمجۆرە لەمەسەلەکە نزیك نەبووەوە و زۆر بەتوندی رەخنەی کرد، ئیدی **"فەرهاد"**یش کە تێگەیشت سەرۆك بەگوێرەی چەمکی برا برایی و خزم خزمێنەی ئەو هەڵسوکەوت ناکات و تەنانەت دژی ئەو جۆرە چەمکانەشە، هەنگاوی بۆ دواوە هەڵنا.

ئیتر لەبنەڕەتدا، کاردانەوە و رکوکینی **"فەرهاد"** بۆ سەرۆك و دووژمنایەتی ئەو بۆ سەرۆك لەو کاتەوە دەستپێدەکات. گوایە ئەگەر سەرۆك رەخنەی توندی ئەوی نەکردبایە و رێی لەو نەگرتبایە، تەنانەت بەگوێرەی ئەو دەبووایە سەرۆك هاوکاری **"فەرهاد"**ی بکردبایە و ببووایە ئەندامی **کۆمیتەی ناوەندی** و لەنێو پارتیدا باڵادەستی خۆی بکات. ئەگەر باڵادەستی خۆی لەنێو پارتیدا بەدەستنەهێنا، ئەوا سەرۆك نەیهێشت. "فەرهاد" لەو کاتەوە وا بیری کردۆتەوە کە؛" لەبەر ئەوەی برای سەرۆکم ئەوا ئەو پەیوەندییە بووە بە ئاستەنگ لەبەردەممدا". کەچی ئەو دەیخواست سەرۆك نەك هەر ببێتە کۆسپ و ئاستەنگ، بەڵکو دەبووایە لەهەموو رووێکەوە ببێتە هاوکاری بۆ ئەو و **"فەرهاد"** هەرچییەك بکات ئەوا دەبێت سەرۆك پشتیوانی لێبکات. سەرۆك

هیچ کاتێك نە برا، نە خێزان و نە کەسوکاری بەبنەما وەرنەگرت، بەڵکو رەخنەی توندی لەسەر هەموو ئەو جۆرە پەیوەندییانە هەبوو و هەموو ئەو پەیوەندییانەشی رەتکردەوە. "فەرهاد"یش بەمە زۆر تووڕە بوو، ئیدی کاردانەوەی "فەرهاد" لەدژی سەرۆك لەمەوە دەستیپێکرد و لەو ڕێکەوتە بەدواوە تادەهات ئەو کاردانەوەیە بووە دووژمنایەتی. کێشە و گرفتی "فەرهاد" لێرەوە دەستیپێکرد.

"فەرهاد" دەیویست پەیوەندی بنەماڵەیی لەگەڵ سەرۆك لەنێو تەڤگەردا پێشبخات، سەرۆکیش ئەوەی زۆر مەترسیدار بینی و رەخنەی زۆری کرد، "فەرهاد"یش کە زانی وەکو ئەو بیری لێدەکاتەوە وەها نییە بێدەنگ بوو و سەری خۆی نزم کرد. کاتێك کە سەرۆك رەخنەی توندی لە "فەرهاد" گرت، "کۆر جەمال" و "تەرزی جەمال"یش ئەمەیان کردە بیانوویەك بۆ خۆیان و سوودیان لەمەش بینی و دژی تەڤگەر هەنگاویان هاوێشت، بۆ ئەوەی بتوانن حیساباتی خۆیان پێکبێنن. بیرکردنەوەی ئەوانیش وەهابوو کە گوایە؛"فیکر و چەمکی سۆسیالیستی لە کوردستاندا زێدە پێشناکەوێت و زەحمەتە، چونکە کوردستان زۆر لەدواوەیە، چەمکی بۆرژوازی بچووکیش ئیفلاسی کرد ـ کە هەڤاڵ "عەباس" و ئەوان بوون ـ کێ دەمێنێتەوە؟ گوندیی (لادێی) دەمێنێتەوە، کەواتە سەردەم سەردەمی گوندییەکانە" هەڵبەتە خۆشیان گوندیی دەبینین، بۆیە وا مەزەندە دەکەن کە؛ مادام سۆسیالیزم پێشناکەوێت و بۆرژوازی بچووك ئیفلاسی کرد، ئەوا ئەوان دەتوانن باڵادەستێتی خۆیان پێکبێنن. هەڵبەتە وەهاشیان دەگووت:" ئیدی بۆرژوازی بچووك ئیفلاسی کرد، چەمکی سۆسیالیزمیش سەرناگرێت، سەردەم سەردەمی گوندییەکانە" بەم چەمکە نزیك دەبوونەوە، دەخوازن چەمکێکی بەمشێوەیە لەنێو پارتیدا بڵاوبکەنەوە. بێگومان ئەو چەمکە بەتەواوی لەدژی پارتییە و لەدژی ڕێبازی تەڤگەرە. هەڵبەتە ئەو کاتە ئەمە بەئاشکرا پێشناخەن، بەڵام ئەوەی لەرۆحی ئەواندا دەژیت ئەمەیە، کەچی خۆشیان وانیشان دەدەن کەوا لەسەر خەتی سەرۆك بەڕێوە دەچن و ئەو خەتە بەبنەما وەردەگرن و جێبەجێی دەکەن، خۆیان وانیشان دەدەن. ئەو شتانە لەقۆناخی کۆنگرەدا لەئارادا بوو.

ئیدی لە کۆنگرەدا "کۆر جەمال" و "تەرزی جەمال" ئەو چەمکەی خۆیان بەشاراوەیی دەکردە رۆژەڤ، بەڵام کە دەستڕۆیشیان لەپارتی وەرگرت، خواستیان ئەو دەستڕۆییە

بەکاربهێنن، بۆ ئەوەی بتوانن بەگوێرەی خۆیان لەنێو کۆمیتەی ناوەندیدا چەمکی گوندێتی خۆیان لەنێو لەکادیراندا، لەئەرکسپارندا بالادەست بکەن. دەستیان بەم کارە کرد...

**لەسێیەمین کۆنگرەوە تا سالانی(١٩٨٧ ـ ١٩٨٨ ـ ١٩٩٠)دا لەو ماوەیەدا چەمکی چەتەگەرێتی لەنێو سوپای (ARGK)دا وەك مەیلێك لە پراکتیکدا دەردەکەوێتەڕوو، ئەو چەمکی چەتەگەرێتییە، یان وەك پێی دەگووترێت"چوار چەتە" رەگ و ریشەی خۆی لەکوێوە دێت؟ ئەو زەرەر و زیانانەی لەتەڤگەریدا چیبوون؟ پاشان کێ سەرکێشی ئەو چەمکەی دەکرد و ئاکامی ئەوانە بەچی گەیشت؟**

لەبنەڕەتدا ئەو چەمکی چەتەگەرێتییە لەچەمکی گوندێتییەوە دەرچوو. لەبنەمادا "کۆر جەمال" نوێنەرایەتی ئەو چەمکەی دەکرد و پەرەیپێدەدا و دەیویست بیکاتە چەمکی هەر کەس و هەولێدەدا تیۆریزەیشی بکات، لەناو رێکخستندا تارادەیەکی بەرچاو بلاویشی کردەوە، لەسەر ئەو کادیرانەی لە دواوەن و زێدە کەسانی نا ئایدیۆلۆژی و نا رێکخستنین و لەنێو گوندێتی خۆیان دەژین، لەسەر ئەوانە تارادەیەکیش کاریگەری خۆی کرد. هەلبەتە ئەو کادیرانەشی دەدایەپێش، خواستی ئەو جۆرە کادیرانە بالادەست بکات و بەتەواوی تەڤگەر بکاتە تەڤگەرێکی گوندێتی. ئیدی ئەو چەمکی چەتەگەرێتی لەنێو تەڤگەردا بەهێز کرد. ئەوەی نوێنەرایەتی ئەو چەمکەی دەکرد کێ بوون؟ **"کۆر جەمال، هۆگر، تۆپال مەتین و پەرماکسز زەکی (شەمدین ساکیك)"** بوون، **"هۆگر و مەتین و شەمدین"**یش پەروەردەی دەستی **"کۆر جەمال"** بوون. **"کۆر جەمال"** ئەوانی دەرخستە پێش، دەسترۆیی و شتی وای بەوانە بەخشی و بەخۆیەوە پەیوەستی کردن و چەمکی خۆیشی لە کەسێتی ئەواندا چاند،

لەرێگەی ئەوانیشەوە چەمکی چەتەگەرێتی خۆیشی لەپراکتیکدا و لەناو تەڤگەردا پێشخست.

چەمکی چەتەگەرێتی ساڵی (١٩٨٧) دەستپێکرد و لەناو تەڤگەر و لەناو گەریلادا پێشکەوت. هەرچەندە ئەو چەمکە ئەو چوار کەسە لەپراکتیکدا پێشیانخست و بەهێزیان کرد، بەڵام لەبنچینەشدا **ئەبوبەکر (خەلیل ئەتاج)** و **بۆتان (نیزامەددین تاش)** ئەو خەتەی ئەوانیان دەپاراست، ئەوانە بوونە هۆی ئەوەی خەتی چەتەگەرێتی، رێکخستنکردنی چەتەگەرێتی ئەوەندە پێشبکەوێت و ئەوەندە تەخریبات لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. لەبنەمادا، لەژێر بەرپرسیارێتی ئەواندا ئەو خەتە و ئەو هەموو تەخریباتانە روویدا. لە **هەرێمی بۆتان ـ ماردین**دا(١) تا ساڵی (١٩٩٠) بەرپرسیاری سیاسی **بۆتان (نیزامەددین تاش)** بوو، بەرپرسیاری عەسکەریش **ئەبوبەکر (خەلیل ئەتاج)** بوو. ئەو پراکتیکەی لە **ماردین** و **بۆتان** و دەوروبەری لەدژی گوندەکان، لەدژی کەسانی سڤیل پێشکەوت لەژێر ناوی گوایە:" ئەوانە سیخوڕن، چەتەن و جاشن" تەسفیەکردنی ئەو کەسانە هەمووی لەژێر بەرپرسیارێتی "**نیزامەددین تاش**" و "**خەلیل ئەتاج**"دا روویدا. ئەو کاتە بەتالیۆنێکی سەرەکی ئێمە هەبوو، "**هۆگر، شەمدین ساکیك** و **تۆپاڵ مەتین**"یش لەو بەتالیۆنەدا فەرماندەی تیپ و فەرماندەی کەرت بوون. ئەو بەتالیۆنەش لەژێر بەرپرسیارێتی "**ئەبوبەکر**" دابوو و فەرماندەی ئەو بەتالیۆنەش هەر "**ئەبوبەکر**" بوو. ئەو چالاکییانە؛ لەوانەیە لەپرکتیکدا "**شەمدین ساکیك، هۆگر** و **مەتین**" ئەنجامیان دابێت، بەڵام هەمووی لەژێر بەرپرسیارێتی "**ئەبوبەکر**" و "**بۆتان**"دا ئەنجام دراون. تەنانەت "**ئەبوبەکر**" و "**بۆتان**" خۆشیان تەڤلی هەندێك لەو پراکتیکانە بوون، ئەو تەخریباتە و ئەو خەتەی چەتەگەرێتی بەمشێوەیە تەشەنەی سەند.

"**کۆر جەمال**" نوێنەرایەتی چەمکی چەتەگەرێتی دەکرد و لەساڵی (١٩٨٦ ـ ١٩٨٧)یشدا ئەو چەمکەی لە "**هۆگر** و **مەتین** و **شەمدین ساکیك**"یش چاند. هەڵبەتە بەم هۆیەوە "**کۆر جەمال**" گیرا و دادگایی کرا و سزا درا. ئەو چەمکە "**هۆگر** و **مەتین** و **شەمدین**" وەریانگرتبوو و لەپراکتیکدا بەردەوام بوون لە بڵاوکردنەوە و پێکهێنانیدا، "**ئەبوبەکر**" و "**بۆتان**"یش ئەو چەمکە و ئەو کەسانەیان دەپاراست پەردەپۆش دەکرد و ئەو

پراکتیکانەیان تەشەنە پێدەدا. ئەگەر "بۆتان" و "ئەبوبەکر" چەمکی چەتەگەرێتییان پەسند نەکردبایە و لەدژی ئەو چەمکە رابوەستانایە، ئەوا "مەتین و هۆگر و شەمدین ساکیك" نەیاندەتوانی ئەو چەمکە و ئەو پراکتیکە تەشەنە پێبدەن، ئەو کاتە هێندە تەخریباتیش رووی نەدەدا. ئەمە گورزێکی کوشندەی لەتەڤگەر دا، پێشەنگایەتی و گەریلایەتی خراپ کرد، فەرماندەیی و شەرڤانێتی شێواند، ئەو کارەی سەرۆك بەرێوەی دەبرد هەمووی ڤالا دەرخست، تەڤگەری بەپێچەوانەی راستینەی خۆی نیشاندا. ئەگەر پاشان تەڤگەر بە "تیرۆریزم" تۆمەتبار کرا و سەرۆك بە "تیرۆریزم" تۆمەتبار کرا، هۆکارەکەی ئەو پراکتیکی چەتەگەرییەیە. بەرپرسیاری سەرەکی ئەو پراکتیکەش "بۆتان" و "ئەبوبەکر"ن. "هۆگر و مەتین و شەمدین ساکیك" و ئەوانە لەپراکتیکدا ئەو چەمکەیان پێکدەهێنا. "ئەبوبەکر" پاشان چووە ئەیالەت (هەرێم)ی گارزان ئەو چەمکە و ئەو پراکتیکەی لەوێش بڵاوکردەوە و پێشیخست و بەهێزی کرد، "شەمدین ساکیك"یش چووە ئامەد و ئەرزروم و ئەو شوێنانە ئەو چەمك و پراکتیکەی پێشخست و بەردەوامی پێدا.

تا پێش ئەوەی "کۆر جەمال" و چەتەکانی دیکە، ئەو چەمکە چەتەگەرێتییە لەناو تەڤگەری ئێمەدا پێشبخەن و بڵاویبکەنەوە و پرەنسیپی تەڤگەر تێك بدەن، تا ئەو کاتە تەڤگەری ئێمە زۆر خاوێن و پاك بوو، چەمکی وەك فیوداڵێتی، پیلانگێرێتی، تەسفیەگەرێتی و.... شتی بەمجۆرە زێدە لەناو تەڤگەردا نەبوو. ئیدی ئەمە لەو چوار چەتەیەوە دەستیپێکرد و تەڤگەریان پیسکرد، لەزۆر رووەوە تەڤگەریان لەبناخەی خۆی دەرخست، لەمەش دووژمن زۆر سوودمەند بوو، ئەمە تەخریباتێکی مەزنی لەناو تەڤگەردا دروستکرد. هەربۆیە تەڤگەر رەخنەی زۆری لە "کۆر جەمال" گرت و سزای دا، دوای ئەمەش رەخنەی لەو کەسانەش گرت کە نوێنەرایەتی ئەو چەمکە دەکەن.

سەرۆك بینی کە ئەو چالاکییانەی لە (١٩٨٧)دا لەدژی گوندەکاندا، بە بیانووی ئەوەی گوایە "چەتە و سیخوڕن" روودەدەن، هیچ پەیوەندییەکی خۆی بەخەتی تەڤگەرەوە نییە، ئەو چالاکییانە تەخریباتێکی مەزن دروست دەکەن و دووژمنیش سوودێکی مەزنی لەمە دەبینێ... سەرۆك زۆر رەخنەی لەمە گرت. ئێمەش لەسەر ئەو بنەمایە لە (١٩٨٨)دا کۆبوونەوەیەکمان لەچیای "پیرۆ" سازکرد و ئێمەش رەخنەی ئەو چەمکەمان

کرد. لەئەنجامی ئەو کۆبوونەیەوەدا من چوومە گۆڕەپانی سەرۆکایەتی. سەرۆك بڕیاریدا ئەوانە هەمووی رابکێشێتە لای خۆی لە ئەکادیمیا. ئیدی "بۆتان، مەتین، شەمدین، ساری باران" و هەرکەسێك کە خاوەنی ئەم چەمکەن و نوێنەرایەتی دەکەن، خواستی بچنە ئەکادیمیا لای سەرۆك. داوای "بۆتان"یشی کرد، تەنیا "ئەبوبەکر" لەنێو ئەوانەدا مایەوە. سەرۆك لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٨) و سەرەتای (١٩٨٩)دا تەواوی ئەو شیکردنەوانەی پێشیخستبوو لەسەر چەتەگەرێتی و سوپایبوون و فەرماندارێتی بوون. سەرۆك لەمیانەی ئەو شیکردنەوانەدا خواستی چەمکی چەتەگەرێتی بەتەواوی لەناو تەڤگەردا مەحکوم بکات و خەتی تەڤگەر لە گەریلادا و لەپێشەنگایەتیدا باڵادەست بکات.

ئیدی ئەو کاتە "بۆتان" و ئەوانە گووتیان:" ئیتر ئێمە تێگەیشتین" و بەڵێنیان دا کە ئەو چەمکە لەنێو تەڤگەردا نەهێڵن، بۆ ئەمەش دەرفەت و شانسێکی خواست، سەرۆك ئەو دەرفەتەی بە "بۆتان" دا و "بۆتان"ی رەوانەی وڵات کردەوە، بۆ ئەوەی لەوڵاتدا کۆنفرانسێك سازبکەن و لەو کۆنفرانسەشدا ئەو چەمکە بەتەواوی مەحکوم بکەن، هەر کەسێکیش ئەو چەمکەی پێشخستبوو بکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوە و سزای ئەوانیش چییە بەدادگا دەستنیشان بکرێت. سەرۆك ئەوانەی دیکەشی لە ئەکادیمیا هێشتەوە. تەنیا "بۆتان"ی نارد. چونکە "بۆتان" بەڵێنی دا. ئامانجی سەرۆك چیبوو؟ ئەو کۆنفرانسە لە وڵات سازبدرێت و بەو کۆنفرانسە خەتی چەتەگەرێتی نەهێڵێت، لە گۆڕەپانی ئەکادیمیاشدا دەیخواست لەرێگەی پەروەردەوە کادیران بەتەواوی لەو چەمکە دوور بخاتەوە، تاکو بتوانێت ئەنجامگیر ببێت.

بێگومان چەتەکان "شەمدین، مەتین، ساری باران، هۆگر و بۆتان" بینیان کە سەرۆك زۆر بەجددی دەچێتە سەر ئەو چەمکە و سەر ئەوان. واتا سەرۆك بەبڕیارە بۆ ئەوەی لێپرسینەوە لەگەڵ نوێنەرانی ئەو خەتە بکات. ئەوانە چییان کرد؟ ئەوانە هەوڵیان دا بۆ ئەوەی سەرۆك ڤاڵا دەربخەن و خۆیان باڵادەست بکەن. لەلایەکەوە راستینەی خۆیان شاردەوە بۆ ئەوەی سەرۆك و تەڤگەر بخەڵەتێنن، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو کارەی سەرۆك بەئەنجامی گەیاندووە هەوڵیاندا بەتەواوی ڤاڵای دەربخەن، ئەمەیان بەبنەما وەرگرت.

لە وڵات، لەچیای **تەحتەڕەش**(٢) دا کۆنفرانسێك سازدرا، کۆنفرانسەکە لەژێر بەرپرسیارێتی"**ئەبوبەکر**" و "**بۆتان**" ئەنجامدرا، پێویستبوو لەو کۆنفرانسەدا چەتەگەرێتی مەحکوم بکرێت و خەتی تەفگەر بالآدەست ببێت. ئەوانەی خەتی چەتەگەریشیان پێشخستووە و تەخریباتیان ئەنجامداوە حیسابیان لێبپرسن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەن، کەچی "**بۆتان**" و "**ئەبوبەکر**"چییان کرد؟ چوون "**هۆگر**"یان خەڵات کرد. واتا خەتی چەتەگەرێتییان خەڵات کرد، چونکە"**هۆگر**" باش نوێنەرایەتی چەتەگەرێتی کردبوو، لەبری ئەوەی مەحکومیان بکردبایە و حیسابیان لێی بپرسیایە، تەواو بەپێچەوانەی ئەمە خەڵاتیان کرد، گوایە "**هۆگر**" سەرکەوتووە، بۆچی خەڵاتیان دا بە"**هۆگر**"؟ چونکە ئەوان لە کەسی "**هۆگر**"دا خەڵاتیان دا بەخودی خۆیان !!. لەوانەیە نەیانتوانیبێت بیدەن بەخۆیان، دایان بە "**هۆگر**"، خەڵاتکردنی "**هۆگر**" خەڵاتکردنی خەتی چەتەگەرێتییە. هەڵبەتە ئەوەی لەدژی چەتەگەرێتی بێت خەڵات نادا بە "**هۆگر**". کەواتە ئەوانە لەبنچینەدا خۆیان نوێنەرایەتی ئەو چەمکەیان دەکرد، بۆیە خەڵات دەدەن بە "**هۆگر**"، ئەمە بەو واتایە دەهات.

بۆیە ئەو کۆنفرانسە ئەو ئامادەکارییانەی سەرۆك کردبووی بەتەواوی پووچەڵیان کردەوە کە لەماوەی چەندین مانگدا سەرۆك پێشیخست و "**بۆتان**"ی نارد بۆ وڵات، کە لەوڵاتدا ببێت بەهێز و وزەیەك، کەچی هەموو ئەو ئامادەکارییانەی سەرۆکیان فاڵا دەرخست. خواستیان لەو کۆنفرانسەدا بەتەواوی خەتی چەتەگەرێتی زاڵ بکەن. خەڵاتکردنی "**هۆگر**" بەو واتایە دەهات. بێگومان کاتێك کە سەرۆك سەبارەت بە کۆنفرانسەکە زانیاری پێگەیشت، ئەو کۆنفرانسەی ڕەتکردەوە و گووتی:" ئێمە چەتەگەرێتی پەسند ناکەین" کاتێك کە بینیان سەرۆك لەدژی ئەم خەتە بەبڕیار و شێلگیرانە رادەوەستێت و تەسلیمی ئەو خەتەیان نابێت. ئیتر بیریان لەوە کردەوە کە سەرۆك لەناو ببەنز ئەمجارە ئەو حیساباتانەیان کرد. ئیدی سەرەتا لەگۆڕەپانی ئەکادیمیا (**لەدۆڵی بیقاع**)دا هەڤاڵ **حەمزە (حەسەن بینداڵ)**یان شەهید کرد. هەڤاڵ "**حەسەن بینداڵ**" هەم پارێزوانی یەکەمی سەرۆك بوو (بەرپرسیاری دەستەی پاراستنی سەرۆك بوو)، هەمیش "**نامەبەر**"ی سەرۆك بوو، ئەو هەڤاڵەیان کوشت و ویستیان بیخەنە چوارچێوەی رووداوی لەدەست دەرچوون (قەزاو قەدەر)ەوە. بەڵام هەندێك

همڤالْ ئەو تاوانەیان بینیبوو، یەکسەر دەچن بە سەرۆك دەڵێن:" ئەمە قەزا نییە، بەڵکو بەدەستی فلان و فیسار کوژراوە، ئێمە بەچاوی خۆمان بینیمان کە سێرە (نیشان)یان لێگرت و کوشتیان" سەرۆك دەڵێت:" مادام وایە ئەوانە یەکسەر بگرن و بیانخەنە ژێر لێکۆڵینەوەوە" ئیتر ئەگەر هەڤالان ئەو تاوانەیان نەبینیبایە و بەسەرۆکیان نەگووتبایە و سەرۆکیش ئەو تەدبیرانەی وەرنەگرتبایە، ئەوا لەهەنگاوی دووەمیشدا سەرۆکیان تەسفیە دەکرد. چونکە پێویستبوو سەرەتا لێپرسراوی دەستەی پاراستنی سەرۆك بکوژن، پاشان خۆیان بگەیەننە سەرۆکیش، بۆ ئەم مەبەستەش "حەسەن بیندال"یان کردە ئامانج، ئەگەر ئەو کاتە سەرۆك تەسفیە نەبوو، ئەوا لەبەر ئەمە بوو. ئەو کاتە لەراگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورکیاش نووسرا کە "ئاپۆ کوژراوە"، پاشان کە بینیان نەکوژراوە گووتیان:" لێپرسراوی دەستەی پاراستنی ئەو کوژراوە". ئەمە راست بوو، مەسەلەکەش بەو شێوەیە بوو. خواستیان سەرۆك تەسفیە بکەن، چونکە بینیان کەوا ئەگەر سەرۆك تەسفیە نەکەن، ئەوا ناتوانن خەتی خۆیان زاڵ بکەن. سەرۆکیش دەخوازێت لێپرسینەوە لەگەڵ خاوەنی ئەو چەمکە بکات و حیسابی لێ بخوازێت، لەبەر ئەو هۆیە خواستیان سەرۆك تەسفیە بکەن. ئیدی سەرۆك تەدبیری وەرگرت، ئەو هەوڵی تەسفیەکردنە ئەنجامگیر نەبوو. دوایی سەرۆك سەرکۆنەی ئەو خەتە و نوێنەرانی ئەو خەتەی کرد. "مەتین" سزادرا، پاشان "ساری باران" و "هۆگر" هەڵاتن، "شەمدین"یش کەوتە ژێر لێکۆڵینەوەوە، چەندین جار کەوتە ژێر لێکۆڵینەوەوە، بەمشێوەیە رێ لەتەشەنەکردنی ئەم خەتە گیرا. بەڵام بەتەواوی کاریگەرییەکە بەلاوە نەنرا. پاشان دیسان سەرکۆنە و رەخنەی "بۆتان" و ئەوان کرا، پێش کۆنگرەی چوارەمین "بۆتان" و "ئەبوبەکر" و ئەوانەمان هەموویان بێ ئەرك کرد، لەبەر ئەوەی چەتەگەرێتیان پێشخستبوو، راستینەی گەریلا و خەتی تەفگەریان شێواندبوو، تەخریباتیان ئەنجام دابوو، بۆیە ئەرکمان لەهەموویان وەرگرتەوە و کەوتنە ژێر لێکۆڵینەوەوە، بەمجۆرە کۆنگرەی چوارەممان سازدا، ئەو چەمکەی "چەتەگەرێتی فیودالێتی - پیلانگێڕ"مان مەحکوم کرد. بۆیە ئێمە بۆ پارێزوانانی گوند (جاشەکان) بەیاننامەمان دەرکرد و بانگەوازیمان لەوان کرد کە؛ چیدی دووژمنایەتی ئێمە نەکەن. بەمشێوەیە کە چەتەگەرێتی ناوخۆییمان هەندێك

بێهێز کرد، چەتەگەرێتی دەرەوەی ئێمەش بێهێز بوو. ئیدی تەڤگەر هەندێك هەناسەی هەڵمژی. بۆیە ئەگەر ئێمە رەخنە و سەرکۆنەی چەتەگەرێتیمان نەکردبایە، ئەوا مسۆگەر ئەو پێشکەوتنانە روویان نەدەدا کە لەساڵی (١٩٩٠) بەدواوە ئەنجامدران، نەك هەر ئەمە، بەڵکو تەڤگەر بەتەواوی دەکەوتە دەست چەتەکانەوە. بەمشێوەیە تەڤگەر کۆتایی پێدەهات و تەخریباتێکی مەزنیش رووی دەدا...

## ئەو چەمکەی چەتەگەرێتی و ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەو خەتە چەتەگەرێتییەیان دەکرد هیچ پەیوەندییەکان لەگەڵ جۆرەکانی دیکەی تەسفیەگەرێتی هەبوو لەدەرەوە...؟

پەیوەندییان هەبوو یان نەبوو ئەمە زێدە گرنگ نییە، هەڵبەتە بناخەی ئەو چەتەگەرێتییە و ئەو کولتوورەی چەتەگەرێتی لە کوردستاندا بەهێزە، لەپشت جێگیرکردنی ئەو کولتوورەش خودی دەوڵەتی تورکیا هەیە. هەمیشە ئەو کولتوورەی بەزیندوویی هێشتۆتەوە و هانیدەدات و بەهێزی دەکات. ئەگەر لەجڤاکی کورددا چەتەگەرێتی و ئەشقیایەتی (یاخیگەرێتی) بەهێزە ئەوا ئەمە پەیوەستە بەو راستییەوە. ئەوەی لەنێو پارتیشدا پێکهاتبوو رەنگدانەوە و ئاکامی ئەمە بوو. هەر هەمان کولتوورە و جارێکی دیکە لەنێو پارتیدا زیندوو ببووەوە.

هەڵبەتە خودی "کۆر جەمال" بەرلەوەی بێتە ریزەکانی ئێمەوە خۆی ئەشقیا (یاخی) بوو، چەند کەسێکی کوشتبوو، لەناوچەی "سێرت" و "ماردین" لە چیا دەژیا. تەنگەتاویش ببوو، تەنانەت نەیدەتوانی وەکو پێشان ئەشقیایەتیش بکات. ئیدی دەوڵەتیش کەوتبووە جموجۆڵەوە، چونکە تەڤگەری ئێمە هەبوو، نەیدەتوانی بەردەوامی بە ئەشقیایەتی خۆی بدات و بژیت. ئەشقیایەتی ئیعتباری خۆیشی نەمابوو، چونکە تەڤگەری شۆرشگێری سەریهەڵدابوو، لەناو گەلدا ئیعتباری شۆرشگێران پەیدا ببوو، بۆیە ئەویش تەڤلی ئێمە ببوو. ئەو کولتوور و چەمك و شێوە ژیانەی چەتەگەرێتی زۆر بەهێز لەودا هەبوو. پارتیمان زۆر راوەستەی لەسەر کرد و توانستی

پێدا، هەنگاوی دەهاوێشت، هەندێك هەنگاویشی لەم رووەوە هاوێشت. بەڵام بەتەواوی خۆی لەو کولتووره رزگار نەکردبوو. کاتێك دەستڕۆیی و بەرپرسیارێتیشی کەوتەدەست، جارێکی دیکە ئەو کولتووره لەودا زیندوو بۆوە و گوزارشتی لێکردەوە. واتا "کۆر جەمال" چەمك و کولتووری چەتەگەرێتی لەناو تەڤگەردا لەبەر ئەم هۆیە پەرەپێدا، چونکە بناخە و رەگێکی ئەو کولتوورەی تێدا هەبوو. مرۆڤی کوردیش لەم کولتووره بەدوور نییە. داگیرکەران ئەو کولتوورەیان بەکۆمەڵگاداوە، ئەو کولتووره لەناو کۆمەڵگادا بەهێزە. بۆیە "**کۆر جەمال**"یش خیتابی ئەو کولتووره و کەسێتییەی دەکرد. لەگێدا ئەمەی بینی خیتابی ئەوانی کرد و ئەوانی دەدایەپێش. زێدەتریش لە "**شەمدین ساکیك، تۆپاڵ مەتین و هۆگر**"دا بینی و ئەوانەی دەرخستەپێش و ئەوانەش دەستڕۆیی و توانستیان لە "**کۆرجەمال**" وەرگرت و چەمکی "**کۆر جەمال**"یان بۆ خۆیان بەبنەما وەرگرت...

## لەساڵی (١٩٨٨)دا تەڤگەری کورد لەباشووردا دووچاری شکستێکی مەزن هات، ئەو کاتە هەڵوێست و نزیکبوونەوەی تەڤگەری (PKK) لەبەرامبەر ئەو شکستە و هێزەکانی باشوور و ئەو کۆچبەرییەی ئەو کاتە لەئاکامی پرۆسەکانی ئەنفالدا روویاندەدا چیبوو و ئەو ڕانە چۆن شیدەکرانەوە...؟

کاتێك کە ئاگربەستی نێوان ئێراق ـ ئێران دروست بوو، ئەو کاتە ئێمە مەزەندەی ئەوەمان دەکرد کە رژێمی ئێراق هێرشێکی مەزن بکاتە سەر باشووری کوردستان. بۆیە ئێمە لەنێو خۆماندا لەسەر ئەو بابەتە چەند کۆبوونەوەیەکمان سازدا، بۆ ئەوەی بزانین دەتوانین چیبکەین؟ ئەگەر هێرشێکی مەزن بکرێتە سەر باشوور ئایا بەرخۆدان دەکرێت یان نا؟ ئەگەر ببێت باشە و ئێمەش دەتوانین پشتگیری لێبکەین، ئەگەر بەرخۆدان نەکرێت لەوانەیە گەل لەباشوور کۆچبەری باکوور ببێت، پێویستە ئێمەش بەگوێرەی ئەمە تەدبیری خۆمان وەربگرین، ئەگەر ئەو خەڵکە کۆچبەر ببێت ئەوا پێویستە هاوکاریان بکرێت و پەرێشان نەبن و داڵدە بدرێن. وەکوتریش ئەگەر هاتنێکی

بەمجۆرە و شکستێکی بەمجۆرە روویدات ئەوا کاریگەری خۆی لەسەر کوردی باکووریش دەکات، کاریگەری لەسەر ئەو بەرخۆدانەی کەوا لەباکووریش هەیە دەکات. بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی خراپ لەسەر گەل و تەڤگەر دروست نەبێت، پێویستە ئێمە گەل و کادیران بۆ ئەو ئەگەرە ئامادە بکەین، کۆبوونەوە لەگەڵیاندا سازبدەین. بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکی وەها روویدا، ئاگادار بن و بزانن و لێی تێبگەن و واتای بدەنێ، تاوەکو لەگەڵ خۆیدا شکستێك دروست نەکات. هەروەها بیرمان لەوەش کردەوە کە داخوا مرۆڤ دەتوانێت هاوکاری ئەوانە بکات کە بەرخۆدانی دەکەن و جارێکی دیکە بەرخودانی پێشیبخات؟ لەو کۆبوونەوەیەی خۆماندا لەسەر هەموو ئەگەرەکان راوەستەمان کرد و گفتوگۆمان لەسەر ئەم بابەتانە کرد.

ئێمە لەو کۆبوونەوانەی خۆماندا گەیشتینە هەندێك بڕیار. لەسەر بنەمای ئەو بڕیارانە هەڤالان لە هەرێمی بۆتاندا دەستیان بەسازدانی کۆبوونەوە بۆ خەڵك کرد و بۆیان باس کردن کە؛ ئیدی شەڕی ئێران ـ ئێراق راوەستاوە، لەوانەیە رژێمی ئێراق هێرش بکاتە سەر باشوور، لەوانەیە بەرخۆدانیش سەرنەکەوێت و کۆچڕەوی خەڵکی باشوور روویدات. ئیدی ئەگەر کۆچکردنێکی بەمجۆرە روویدات ئەوا پێویستە گەل هاوکاری برای خۆی بکات، خاوەندارێتی لێبکات، پێویستە ئەمە کاریگەرییەکی خراپ دروست نەکات، ئێمە چیبکەین بۆ ئەوەی بتوانین ئەمە بکەینە هۆکاری بەرخۆدانی مەزن لەباکوور، تەنانەت لەباشووریش بتوانین بەرخۆدانێك پێشبخەین. لەسەر ئەو مەسەلانە ئێمە هەندێك کۆبوونەوەمان لەناو گەلدا سازکرد. بێگومان ئەو کۆبوونەوانە کاریگەری خۆی لەسەر گەل دەکرد، واتا ئێمە گەلمان هەندێك ئامادە دەکرد، بۆ داهاتوو.

ئێمە چووینە ناوچەی "ئولودەرە" گووتمان دەربازی باشووریش دەبین، بۆ ئەوەی هەندێك پێشمەرگەش ببینین، هەندێك خەڵکی گوندیشمان دەناسی لەباشووردا و پەیوەندیمان لەگەڵیاندا هەبوو، گووتمان:" با ئەوانە ببینین بزانین ئەوانە چۆن بیر دەکەنەوە؟ لەرەوشێکی وەهادا بەرخۆدانی دەکەن یان نا؟ لەئێمە چی دەخوازن؟ هەروەها بەوان دەڵێین کە؛ ئێمەش لەهەموو روویێکەوە لەپشتیوانی ئێوە داین... کاتێك ئێمە لەناوچەی "حەفتانین" دەربازی باشوور بووین، ئێمە هەڤالانمان نارده لای ئەو گوندنشینانەی دەمانناسین، هەڤالان چوون و گەڕانەوە و گووتیان:" لەو گوندانە

عەسكەری ئێراقی هەیە" ئێمە سەرەتا باوەڕمان نەدەكرد. هەڤاڵان كۆنسەرڤە (معلبات)ی عەسكەری ئێراقیان هێنا، ئەو كاتە ئێمە كەوتینە دوودڵییەوە. بۆیە گووتمان:" با تەدبیری خۆمان وەربگرین، چونكە شەو بوو، با تا سبەی ڕاوەستین بەیانی لەدۆخەكە تێدەگەین. چونكە گووتیان:" ئاگریشیان لەگوند بەرداوە و دەیسووتێنن" بووە سبەی سەیرمان كرد بەراستی عەسكەری ئێراقی هەموو شوێنێكی گرتووە. واتا ئەو كاتە تێگەیشتین، كە هێرش كراوە و بەرخۆدانیش زێدە نەكراوە و خەڵكیش دەربازی لای باكوور بوونە. ئێمە ئەو كاتە زانیمان كە هێرش كراوە. بێگومان ئەو ڕۆژە ماینەوە، عەسكەری ڕژێمی سەددام تادەهات لەئێمە نزیك دەبوونەوە، ئێمەیان بینی، تەنانەت لەنێوانی ئێمە و ئەواندا شەڕێكی بچووكیش روویدا، ڕۆژی دوایی كە دەربازی لای باكوور بووینەوە، كە خەڵكمان لەوێ بینی بەئێمەیان گووت:" پێشمەرگە و گەل هەموو هاتوون و دەربازی باكوور بوونە" ئیدی شتێكی كە ئێمە پێمان بكرابایە زێدە نەمابوو، گووتمان:" تۆ بڵێی كەسانێك هەبن بخوازن بەرخۆدان بكەن؟ ئەگەر هەبن ئەوا ئێمە دەتوانین هاوكارییان بكەین" ئێمە كەسی بەمجۆرەشمان نەبینی. ئەو كاتە هەندێك كوڕی گەنجمان بینی، خەڵكی هەرێمی بادینان بوون، ئەوانە دەیانگووت:" ئێمە دەخوازین بەرخۆدانێك پێشبخەین" بەڵام نەیاندەخواست ئەو كاتە تەڤگەرێك بەناوی باشوور ئاوا بكەن، ئەوان دەیانگووت:" ئێمە دەتوانین تەڤلی (PKK) ببین و لە باكووردا بكەین، پاشان لەباشوور بەناوی (PKK)وە دەتوانین بەرخۆدانێك پێشبخەین" ئێمە ئەو گەنجانەمان وەرگرت، گووتمان؛ ئەوانە ئومێدێكن، با لەناو ئێمەدا هەندێك لەئێمە تێبگەن، پاشان مرۆڤ دەتوانێت ڕوویان بداتە باشوور و پێیان بڵێت كەوا ئێمە تەڤگەرێكیی دەتوانین لەباشووریش كار و خەباتێك پێشبخەین، ئەوا باش دەبێت، چونكە بەمشێوەیە لەباشوور خەبات نەكرێت باش نابێت، بە ساڵانە لەباشوور گەلەكەمان شەڕی كردووە و ڕەنجی مەزنی داوە، بە كۆمەڵكوژی و ئەشكەنجەی مەزندا تێپەڕیوە، ئەگەر باشوور هەروا بەبێ تەڤگەرێكی بەخۆدانڤانی بهێڵێتەوە، باش نابێت. بۆیە ئامانجمان ئەوەبوو ئەو گەنجانە بۆ باشوور ئامادە بكەین. ئێمە هەڵوێست و نزیكبوونەوەیەكی بەمشێوەیەمان لەو گەنجانە كرد.

بێگومان ئەو کاتە؛ ڕێك لەدۆخێکی بەمجۆرەدا، لە ئەوروپا "حوسێن یلدرم" و ئەوان لەدژی تەڤگەر دەستیان بەجموجۆڵێکی تەسفیەگەرێتی کرد، "حوسێن یلدرم" و ئەوانە خۆیان ڕاگەیاند کە گوایە" ئێمە نوێنەرایەتی PKKدەکەین، ئێمە PKKین" واتا دیاربوو کە؛ نەك تەنیا تەڤگەری کورد لەباشوور تەسفیە بکەن، بەڵکو دەخوازن لەباکووریش تەڤگەری کورد تەسفیە بکەن، پیلانێکی وەها هاوبەش دارێژرابوو، وەك کۆنسێپتێکی هاوبەش دایانڕشتبوو. ئەوانە چ حیساباتێك دەکەن؟ وا مەزندەیان دەکرد کە؛" ئەگەر تەڤگەر لەباشووردا شکست بهێنێت، ئەوا لەڕووی مۆراڵەوە کاریگەری لەسەر باکووریش دەکات، ڕێك لەو کاتەدا ئەگەر زەبریشمان لە (PKK)دا، ئەوا دەتوانین تەڤگەری باکووریش تەسفیە بکەین." کۆنسێپتێکی بەمجۆرەیان بەڕێوەدەبرد. بۆیە دەوڵەتی تورکیا هەم ئۆپەراسیۆنی سەربازی مەزن و فراوانتری کرد، هەمیش لە ئەوروپا "حوسێن یلدرم" و ئەوانە جموجۆڵێکیان لەدژی سەرۆك و تەڤگەر دەستپێکرد، بەمشێوەیە تەڤگەر پارچە پارچە بکەن و تەسفیەی بکەن.

بێگومان ئێمە لەدژی ئەوەش ڕاوەستاین، ئەو جموجۆڵەی "حوسێن یلدرم" و ئەوانە دەیانخواست پەرەی پێبدەن و تەڤگەر پارچە پارچە بکەن و تەسفیەی بکەن، لەدژی ئەوەش ڕاوەستاین و بێکاریگەرمان کردن. ئەمەش وایکرد شکستەکەی باشوور و جموجۆڵەکەی "حوسێن یلدرم" و ئەوانەش زێدە ئەنجامگیر نەبێت و تەڤگەریش گورزی بەرنەکەوت.

ئیدی ئەگەر پێشتر مەزندەمان نەکردبایە و لەم ڕووەوە ئامادەکاریمان نەکردبایە ئەوا لەوانەبوو کاریگەری خراپی دروست بکردبایە، لەوانەبوو (PKK)ش لەباکوور گورزی بەرکەوتبایە. تەنانەت لەبەر ئەوەی پێشتر لەناو گەلدا کۆبوونەوەمان سازدابوو، کەمێك لەڕووی سایکۆلۆژییەوە گەلمان ئامادە کردبوو، کاتێك لەباشووردا ئەو شکستە ڕوویدا و میللەت و پێشمەرگە دەربازی باکوور بوون. گەل باوەڕی زیاتری بەتەڤگەر کرد، بۆیە دەیانگووت:" پێش دوو سێ مانگ ئەوەیان بە ئێمە گووت و ئێمە زێدە ئەو شیمانەیەمان دانەدەنا و باوەڕمان نەدەکرد، بەڵام قسە و مەزندەکەیان ڕاست دەرچوو، کەواتە پێشهاتەکان دەبینن، پێویستە مرۆڤ بە (PKK) باوەڕ بکات، هەرچییەك دەبێژێت ڕاست دەبێژێت" بۆیە باوەڕی گەل بە (PKK) تۆکمە و بەهێزتر بوو...

# هەمیشە روو لە وڵات...

**باستان لەتەسفیەگەرێتی کرد لە ئەوروپا، لەسەرەتای تێکۆشانی تەڤگەرەوە تاوەکو ساڵانی نەوەدەکان، خەبات و تێکۆشانی (PKK) بەگشتی لە گۆرەپانی ئەوروپا چۆن بوو و لە چ ئاستێك دابوو؟ گەلەکەمان لە پەناهەندەیی لە ئەوروپادا گەیشتە چ ئاستێکی هوشیاری و رێکخستنی و تێکۆشان؟. هەم لەبەرامبەر دووژمن و هەمیش لەبەرامبەر ئەو جموجۆڵە تەسفیەگەرییەی لە ئەوروپا بەرێوە دەچوو چۆن هەڵوێستی نیشان دەدا...؟**

کار و چالاکی ئێمە لە ئەوروپادا سەرەتا خۆی بۆخۆی پێشکەوت، ئەو خەباتەی ئێمە لە باکوور پێشماندەخست کاریگەری لەسەر گەلەکەمان لە ئەوروپاش کردبوو، هەندێك لەو کەسانەی ئەم تەڤگەرەیان باش دەبینی و خۆیان نزیك بەم تەڤگەرە دەزانی، لەوێ لەژێر ناوی تەڤگەرەوە هەر بۆخۆیان دەستیان بە کار و خەبات کردبوو. واتا هیچ پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا نەبوو، کار و چالاکییەکی وەها رێکخستنی نەبوو، کادیرانی ئێمە لەوێ نەبوون و کەسیشمان نەناردبوو، هەندێك کەسی وڵاتپارێز لەژێر کاریگەری تەڤگەردا بوون، کە لە باکووردا تەڤگەر جموجۆڵ و خەباتی دەکرد، ئەوانیش بەخۆیان بەناوی تەڤگەرەوە دەستیان بەخەبات کردبوو. ئێمە نەماندەزانی کار و خەباتێکی بەمشێوەیە دەکرێت، تا ساڵی (١٩٧٩) کە سەرۆك چووە گۆرەپانی لوبنان، کاتێك کە

سەرۆك لەكۆتایی (١٩٧٩)دا چووە لوبنان لای فەلەستینییەكان، لەوێ هەندێك توانستی ئافراند و هەندێك لەكادیرانی ناردە ئەورووپا، ئەو كاتە سەرۆك بیستبووی كە لە ئەورووپا هەندێك كار و خەباتی وەها هەیە، خواستبووی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا ببەستێت، ئەو كاتە كادیرێكی ئێمە هەبوو، لەشەڕدا لەگەڵ توركیا بریندار ببوو، ئەومان بەقاچاخی دەرخستبووە گۆڕەپانی لوبنان، سەرۆك ئەوی ناردە ئەورووپا، كە هەم لەوێ برینداری خۆی باش تیمار بكات، هەمیش لەوێ بەو كار و خەباتەی بەناوی تەڤگەرەوە دەكرێت پەیوەندیدار ببێت و ئیدی ئەو خەباتە لەژێر چاودێری تەڤگەردا پێشبكەوێت. چونكە بەناوی ئێمە شت لەوێ دەكرێت ئێمە نازانین چ دەكرێت و تا چەند راستە؟ بۆیە خواستمان پەیوەندییان لەگەڵ ببەستین. ئەو كاتە پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەو وڵاتپارێزانە دروست بوو. ساڵی (١٩٨٠) بۆ یەكەمجار هەڤاڵێكمان ناردە ئەورووپا و لەوێ دەستمان بەكار كرد. كاتێك ئەو هەڤاڵە چوو لەوێ هەندێك زەمینەی خەباتكردن دروستببوو، بەڵام زێدە رێكخستەكراو نەبوو، لەهەموو رووێكیشەوە تەڤگەریان نەدەناسی. بەگشتی، بە پراكتیك كەمێكیان ناسیبوو، بەمشێوەیە هەوادارییان بۆ تەڤگەر دروستببوو، خۆیان بەخۆیان بەناوی تەڤگەرەوە كاریان دەكرد. ئیدی موداخەلەی تەڤگەر بۆ ئەورووپا وەها كرا و كار و چالاكی ئێمە بەرێكخستنی پێشكەوت، سەرەتا لەوێ بەخەباتی كولتووری دەست بەكار و چالاكی كرا. ئەو كار و چالاكییە كولتوورییە تەڤگەری لەوێ فراوانكرد و بووە بناخەی خەبات لەوێ. كار و چالاكی ئێمە لە ئەورووپا لەسەر بناخەی خەباتی كولتووری پێشكەوت، بووە خەباتێكی كولتووری، زەمینەی ئەو خەباتەش هەبوو و بەهێز بوو، بۆیە ئێمە لەو زمینەیەوە دەستمان پێكرد و تەڤگەر لەوێدا شوێنگیر بوو و پێشكەوتنێك بەدیهات. ئیدی پاشان لەسەر ئەو زەمینەیە كار و خەباتی رێكخستنی، سیاسی، دیپلۆماسی پێشكەوت، تادەهات ئەو كار و خەباتە فراوانتر بوو.

بێگومان پێش ئێمە چەپی تورك لەوێ بەهێز بوون، پارتە كوردییەكانی باكوور لەوێ بەهێز بوون، بەتایبەتی "پارتی سۆسیالیست"ەكەی كەمال بورقای. هەڵبەتە ئەمانە تادەهات بێهێز دەبوون و ئێمەش لەوێ بەهێز دەبووین، پەیوەندی نێوان كار و خەباتی ئەورووپا بەكار و خەباتی وڵاتیش دروستبوو، كار و خەباتی ئەورووپا بەتەواوی رووی لە

وڵات کرد. لەسەر ئەو بنەمایە ئەو کار و خەباتە تادەهات پێشکەوت و بەهێزتر بوو. هەر کاتێك کار و خەباتی ئەوروپامان کەمێك رووی خۆی لەوڵات وەرگەڕاند بێت، کێشەی تێکەوتووە، تەسفیەگەرێتی تێکەوتووە، هەر کاتێك کار و خەباتی ئەوروپامان رووی لەوڵات کردبێت ئەوا زۆر زیاتر تەڤگەر بەهێز بووە و توانستی تەڤگەر زیاتر بووە و تەڤگەر پێشکەوتووە.

ئێمە هەمیشە ئەو کار و خەباتەی ئەوروپامان بە وڵاتەوە پەیوەست کردووە، ئاراستەکەیمان هەمیشە رووەو وڵات کردووە. هەم بۆ ئەوەی هێز و وزە لە وڵات وەربگرێت، هەمیش ئەو پێشکەوتنەی لەوێ بەدیهاتوون، ئەو توانستەی لەوێ ئافرێنراون بکەوێتە خزمەتی وڵات و تەڤگەرەوە. بەمشێوەیە یەکتر تەواو بکەن. دیالیکتیکێکی بەمجۆرەمان لەگەڵ ئەو خەباتەی ئەوروپا دروستکرد، بۆیە ئەو خەباتە تادەهات تۆکمە و بەهێزتر دەبوو، هەم لە وڵات هێز و وزەی وەرگرت، هەمیش هێز و وزەی بە وڵاتیش بەخشی.

بێگومان لەو خەباتەدا هەندێك جار کێشە و گرفت دەرکەوتوون. کێشەی "سەمیر" و "داوود" و "باقی" و ئەوانە دروستبوو، خواستیان کەوا کار و خەباتی ئەوروپا بخەنە دەستی خۆیانەوە، بەمەش تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. تەڤگەریش موداخەلەی ئەوەی کرد و ئەوەی بێکاریگەر کرد، کە جموجوڵێکی بەتەواوی تەسفیەگەری بوو. ئەو جموجوڵانەیان بەمەبەستی ئەوە بوو کە تەڤگەر بەتەواوی رابکێشنە ئەوروپا و لە ئەوروپاشدا بیتوێننەوە و بیکەن بەتەڤگەرێکی پەناهەندە، وەك چەپی تورك و پارتە کوردییەکانی دیکە. سەرۆك و پارتی لەدژی ئەمە راوەستان، هەرچەندە لەساڵانی (١٩٨٢-١٩٨٣)دا هەندێك تەخریباتیشیان کردبێت، بەڵام ئەو جموجوڵە تەسفیەگەراییەی تەسفیەکرد.

دوای ئەوە "**حوسێن یڵدرم، کەسیرە، جەعفەر (عەلی چەتینەر)**" و ئەوانە لە ئەوروپا جارێکی دیکە گرفتیان بۆ تەڤگەر دروستکرد، تەنانەت ئەو کاتە "**حوسێن یڵدرم**" راشیکەیاند و گووتی:" ئێمە (PKK)ین و ئاپۆشمان لە (PKK) دەرکردووە" لێدوانێکی بەمجۆرەیشی دا، تەخریباتێکی وەها مەزنی کردبوو، لەگەڵ ئیستخباراتەکانی ئەوروپا ئەو کارەیان پێشدەخست، ئامانجیان ئەوە بوو کەوا ئەو هەڤاڵانەی پەیوەستی (PKK)ن

بەگرتنیان بدەن و بەگرتنیشیان دابوون. هەڤالان "عەباس" و "فوئاد"یان بەگرتن دابوو، بۆ ئەوەی بۆشاییەك دروست ببێت لەبەڕێوەبەرایەتیدا و بەمەش بتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. تاكتیكێكی بەمجۆرەیان لەگەڵ دەزگا ئیستخباراتییەكانی ئەوروپا، بە فورسایی لەگەڵ ئیستخباراتی ئەڵمانیا پەیڕەو كردبوو. هەڤالان دەستگیر كرابوون لەسەر ئەو بانگەشەیەی "حوسێن یڵدرم" و ئەوان كە گووتبوویان:" ئیدی ئێمە (PKK)ین" واتا حیسابیان كردبوو كەوا ئەوروپا بەتەواوی لەژێر كۆنترۆڵی ئەوان دایە، دەتوانن خۆیان رابگەیەنن، دەوڵەتیش لەپشت ئەوان دایە، هەڵبەتە لەگەڵ دەزگا ئیستخباراتییەكانی دەوڵەتانی ئەوروپا پێكەوە ئەو كارەیان كرد. بۆیە "حوسێن یڵدرم" و ئەوان بەبێ ترس و حیساب دەركەوتن. دەیانگووت:" ئیدی دەتوانین ئاپۆ بێكاریگەر بكەین" بەراستیش تەخریباتێكی مەزنیان دروستكردبوو.

بێگومان سەرۆكیش لەدژی ئەوان گەلی خستە تەڤگەر و جموجۆڵەوە. كاتێك كە گەلی خستە جموجۆڵەوە، ئەوانە هەڵاتن و رۆیشتن. ئیدی دیسان كار و خەباتی ئەوروپا لەژێر كۆنترۆڵی ئەوان دەركەوت و كەوتەوە دەست تەڤگەر. لە ئەوروپادا بۆ ئەوەی تەڤگەر تەنگەتاو بكەن، ناوی تەڤگەر بزڕێنن، دەوڵەتی تورك و دەزگا ئیستخباراتییەكانی هەندێك دەوڵەتی دیكە پێكەوە كاریان كرد، ئیدی سەرەتا "ئۆلف پالمە"یان كوشت و خستیانە ئەستۆی (PKK)وە. بۆچی "ئۆلف پالمە"یان كوشت؟ چونكە بەراستی "ئۆلف پالمە" دۆستایەتی بۆ تەڤگەری كوردی دەكرد، بۆ (PKK)ش دۆستایەتی دەكرد، تەنانەت لەوانەبوو سەرۆك چووبایە سوێدیش، سوێد دەیخواست ئیقامەش بداتە سەرۆك و پەناهەندەیی سەرۆكیشی پەسند بكردبایە، چونكە قسە لەگەڵ سوێد كرابوو، سوێد گووتبووی:" دەكرێت وابكرێت" بۆ ئەمە تەنانەت ئێمە وێنەی سەرۆكیشمان ناردبووە سوێد. واتا بەمجۆرە پەیوەندییەكی باش پێشدەكەوت. لەئاستی جیهانیشدا "ئۆلف پالمە" دۆستی تەڤگەرەكانی گەلانی ژێردەست بوو، زۆر هاوكاری و دۆستایەتی ئەو تەڤگەرانەی دەكرد، سەبارەت بەمەسەلەی ڤێتنامیش لەدژی ئەمریكا رادەوەستا، سەبارەت بە مەسەلەی باشووری ئەفریقیاش لەدژی دەسەڵاتی فاشیست و ئاپارتاید راوەستا. واتا خاوەنی هەڵوێستی دیموكراتیانە بوو، بۆیە ببووە ئامانجی پیلانگێڕان، لەبەر ئەوەی لەدژی ئەمریكا رادەوەستا، لەدژی فرۆشتنی چەك بوو

لەلایەن هەندێك دەوڵەتەوە، پاشانیش پەیوەندی و دۆستایەتی خۆی بۆ کوردان و بۆ (PKK) پێشدەخست، هەندێك دەوڵەت ئەمەیان بەمەترسی دەبینی و بۆخۆیان کردیانە ئامانج و "ئۆلف پالمە"یان کوشت، کە کوشتنیشیان خستیانە ئەستۆی (PKK)ەوە. بەساڵان ئەو تاوانە وەك لەکەیەك بە (PKK)وە لکێنرا. بەمەش هەنگاوێکیان لەدژی (PKK) هاوێشت، مەبەستیان لەو هەنگاوەش ئەوەبوو کە بتوانن (PKK) لە ئەوروپا وەك رێکخراوێکی "تیرۆریست" رابگەیەنن و رێ لەپێش (PKK) بگرن، رێ لەپێش تەڤگەری ئازادیخواز بگرن، لەدوای کوشتنی "ئۆلف پالمە"وە، ئەڵمانیا بەرێگەی "حوسێن یلدرم، جەعفەر (عەلی چەتینەر)" و ئەوانەوە دادگایی هەڤالانی لە دادگایی دۆسلدۆرف ئەنجام دا. هەڤالان "عەباس" و "فوئاد" و ئەوان دەستگیرکران و بەگرتنیان دان، بۆ ئەوەی هەم بۆشاییەك لە بەڕێوەبەرایەتی تەڤگەر دروست بکەن و بەمەش تەڤگەر بخەنە دەست خۆیانەوە، هەمیش بەم دادگاییە ئەو هەنگاوەی بە کوشتنی "ئۆلف پالمە" هاوێشتبوویان زیاتر بەهێز و تۆکمە بکەن و بەرەو پێشەوەتری ببەن. چونکە هەرچەندە کوشتنی "ئۆلف پالمە"یان خستبووە ئەستۆی (PKK)وە، بەڵام بەتەواوی نەیاندەتوانی بیکەنە ماڵ بەسەر (PKK)وە، چونکە هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو. خواستیان بە دادگایی دۆسلدۆرف هەنگاوێکی یاسایی زۆر تۆکمەتر بهاوێژن، گوایە بەشێوەیەکی حقوقیش بەڕێوەی دەبەن، بۆ ئەوەی هەم تاوان و رەشەکوژی "ئۆلف پالمە" بەتەواوی بکەنە ماڵ بەسەر (PKK)وە، هەمیش هەموو تەڤگەر بەتەواوی لە ئەوروپا بکەنە "تیرۆریست" و لەوێ تەڤگەر زیاتر تەنگەتاو بکەن. ئامانجی دادگایی دۆسلدۆرف ئەمە بوو.

هەڵبەتە ئەو کاتە لەجیهاندا جەمسەری سۆڤییەتیش پەرشوبڵاو ببوو، سۆسیالیزمیش گورزێکی کوشندەی بەرکەوتبوو و بێ ئیعتبار هێڵرابووەوە، رێك ئەو دادگاییەیان لەو قۆناخەدا بەڕێوەبرد. واتا بەم دادگاییە دەیانخواست زەبرێکی مەزن لە (PKK) بدەن، کەوا ئیدی (PKK) نەتوانێت لەئاستی نێودەوڵەتیدا پەیوەندی ببەستێت و کار و جموجۆڵ بکات، بۆ ئەوەی بتوانن لەرووی حقوقیشەوە (PKK) وەك تەڤگەرێکی "تیرۆریست" رابگەیەنن لەجیهاندا، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك (PKK) بەمشێوەیە بناسێت و تاکو کەس لە (PKK) نزیك نەبێتەوە و بەمەش زەبرێك لە (PKK)

بومشێنن. بێگومان هەرچەندە خواستیان ئەمە لەمیانەی دادگایی دۆسلدۆرف جێبەجێ بکەن، بەڵام نەیانتوانی ئەنجامگیر ببن. زۆر هەوڵیان دا، بەڵام لەرووی حقوقییەوە خۆیان زۆر تەنگەناو بوون. چونکە هەڤاڵان بەرخۆدانێکی مەزن و بەرگرییەکی مەزنیان کرد، راستی ئەو دادگاییە چییە و چی نییە و ئەو دادگاییە بۆچی سازدراوە و ئەو دەستگیرکردنانە بۆچی ئەنجامدراون؟ هەڤاڵان هەموو ئەو مەسەلانەیان باسکرد و روونیان کردەوە. پاشان دەوڵەتی ئەڵمانیا نەیدەتوانی خۆی لەو دادگاییە رزگار بکات، کەوتە نێو دۆخێکی بەمجۆرەوە، لەمەسەلەی "ئۆلف پالمە"شدا هەرچییەکیان کرد نەیانتوانی ئەو تاوانە لەسەر (PKK) ساخ بکەنەوە. تەنانەت کەوتنە نێو بنبەستیشەوە. دەیانخواست لە دادگایی دۆسلدۆرفدا ئەو بنەستییە نەهێڵن، بەڵام دادگایی دۆسلدۆرف خۆیشی کەوتە نێو بنبەستییەوە. بێگومان ئەمە ناحەقییەکی مەزن بوو کەوا بەرامبەر بە (PKK) ئەنجام دەدرا، زوڵمێکی مەزن بوو. بۆچی ئەو زوڵمەیان دەکرد؟ چونکە (PKK) تەڤگەرێکی سەربەخۆ بوو، تەڤگەری گەلی کوردی زوڵمێکراو بوو، لەبەرامبەر زوڵمێکی مەزن لەنێو تێکۆشان و بەرخۆداندا بوو، لەبەر ئەوەی نەدەکەوتە خزمەتی هیچ کەسێکەوە، راستینەی گەلی کوردی دەردەخستەڕوو، ئەو زوڵمەی لەسەر کورد بەڕێوە دەچێت دەستی کێی تێدا هەیە، ئاشکرای دەکرد، هەم راستینەی کوردستان و هەمیش راستینەی زۆر دەوڵەتی ئاشکرا دەکرد، ئەوانەی لەمەدا زەرەرمەند دەبوون نەیاندەخواست کەوا (PKK) ئەو راستییانە زیاتر بخاتەڕوو، دەیانخواست رێ لەپێش ئەمە بگرن و گورزی لێبومشێنن، بۆ ئەم مەبەستەش زۆر هەوڵیان دەدا. بەڵام بێئاکام بوون.

ئەو سیستەمەی کوردستانی پارچە پارچە کرد و خستییە بن خزمەتی داگیرکەرانەوە، لەبنچینەدا ئەو سیستەمە بەرپرسیار بوو لەهەموو ئەو کۆمەڵکوژی و ئەشکەنجە و چەوسانەوە و لەناوبردنەی لەدژی کوردان بەڕێوە دەچێت. ئیدی (PKK) بەتیکۆشانی خۆی راستینەی ئەو سیستەمەی ئاشکرا کرد، ئەمەش بۆ سیستەم مەترسیدار بوو، سیستەمیش نەیدەخواست راستینەی ئەو بەرپرسیارێتییەی ئاشکرا بکرێت. بۆیە دەهاتە سەر (PKK)، ئەو کوشتنەی "ئۆلف پالمە" و دادگایی دۆسلدۆرف هەموو بۆ ئەم

مەبەستە بوو. دادگایی دۆسلدۆرفیش بێ ئەنجام مایەوە، هەڤالان دادگاییەکەیان قازانج کرد، بۆیە نەیانتوانی تەڤگەر مەحکوم بکەن.

دوای ئەمە کاتێك کە ئەمریکا موداخەلەی کەنداو و ئێراقی کرد، لەساڵی (١٩٩١)دا لە ئەمسادا **"حیکمەت چەتین"**ی وەزیری کاری دەرەوەی تورکیا و **"مام جەلال"** کۆبوونەوەیەکیان سازکرد، ئیدی لەئاکامی ئەو کۆبوونەوەیەدا رێککەوتن، کەوا تورکیا دان بە پەرلەمانی باشووردا ـ کە پاشان ئاوادەکرێت ـ بنێت، دان بەستاتۆی باشووردا بنێت، باشووریش (PKK) وەك **"تیرۆریست"** رابگەیەنێت. لەسەر ئەم بنەمایە رێککەوتن.

ئیدی ئەوانە (PKK)یان بۆخۆیان بەمەترسیدار بینی، بۆیە پێکەوە هەوڵیاندا کە (PKK) بێکاریگەر بکەن، چۆن بێکاریگەری بکەن؟ ئەگەر (PKK)یان وەك تەڤگەرێکی "تیرۆریست" راگەیاند ئەو کاتە دەتوانن(PKK)ش بێکاریگەر بکەن و بەرژەوەندییەکانی خۆشیان بپارێزن. لەسەر ئەو بنەمایە لەگەڵ یەکتر رێککەوتن. لەئاکامی ئەوەدا **"مام جەلال"** دوای ئەوەی لە ئەمسا **"حیکمەت چەتین"**ی بینی و گووتی:"PKK تیرۆریستە". بێگومان ئەمە بۆ (PKK) گورزێکی کوشندە بوو، چونکە ئەوروپا هەرموو شتێکی دەکرد بۆ ئەوەی (PKK) بە "تیرۆریزم" مەحکوم بکات، بەڵام نەیتوانی ئەمە بکات، ئەگەر کوردێك دەربکەوێت و بڵێت:"PKK تیرۆریستە" ئەوا بۆ راگەیاندنی ئەوەی کە "PKKتیرۆریستە" دەبێتە هەنگاوێکی مەزن. ئەو کاتە دەتوانن هەر کەسێکیش قەناعەت پێبێنن. چونکە ئەوە کورد خۆی وادەڵێت:"PKK تیرۆریستە" بۆیە ئەو ئاخافتنەی **"مام جەلال"** هەنگاوێکی مەزن بوو بۆ ئەوەی (PKK) لە هەموو ئەوروپا بەتیرۆریست رابگەیەنرێت. لەبنەڕەتیشدا سوودیان لەو لێدوانە وەرگرت، بۆ ئەوەی بتوانن (PKK) بە "تیرۆریست" رابگەیەنن. ئەمە لەبنچینەدا ئامانج و داخوازی دەوڵەتی تورکیا بوو، دەوڵەتی تورکیا بینی کەوا تادێت تەڤگەری (PKK) مەزن دەبێت، چۆن رێگیری لەمە بکات؟ بە ئیمکانییەتی خۆی نەیدەتوانی ئەمە بکات. ئیدی لەگەڵ (ی ن ك) و (پ د ك) پەیوەندی خۆیان دروستکرد، لەسەر ئەو بنەمایەی پێکەوە (PKK) بێکاریگەر بکەن رێککەوتنیان ئەنجام دا، تاکو بتوانن پێکەوە لەدژی (PKK) رابوەستن. تاکتیکی تورکیا چیبوو؟ تاکتیکی تورکیا ئەمە بوو:" بە (ی ن ك و پ د ك) هێرش و

پەلاماری (PKK) دەدەم، بەرێگەی ئەوانەوە گورز لە (PKK) دەوەشێنم، کە گورزم لە (PKK) وەشاند، ئەوا دەتوانم بەئاسانی کۆنترۆڵی خۆم لەسەر (ی ن ك) و (پ د ك) بکەم و تەواوی تەڤگەری کوردان بێکاریگەر دەکەم". حیسابی دەوڵەتی تورکیا وەها بوو. (ی ن ك) و ( پ د ك)ش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ تورکیا دروستکرد، چونکە تورکیا دەخوازێت گورز لە (PKK) بوەشێنێت، بۆ ئەوەی گورز لە (PKK) بوەشێنێت هاوکاری (ی ن ك) و (پ د ك)ی کرد، رێگەی تورکیای بۆ ئەوان کردەوە، **پاسەپۆرتی سووریان** بەوان دا، رێگەی دونیایان بۆ کردنەوە، پشتیوانی سیاسی لەوان کرد، بە عەسکەری و ئابووری هاوکاری کردن، (ی ن ك) و (پ د ك)ش لەو پەیوەندی و هاوکارییە زۆر سوودمەند بوون و خۆیان پێ بەهێز کرد. هەر کە تورکیا دەیخواست (PKK) تەسفیە بکات بۆی ئەنجامگیر نەدەبوو، کە نەدەبوو، زیاتر و زیاتر هاوکاری (ی ن ك) و (پ د ك)ی دەکرد، (ی ن ك) و (پ د ك)ش بەمە رۆژ بەرۆژ بەهێز دەبوون و ئیبراز دەبوون.

لێرەدا تورکیا نەگەیشتە هەموو ئامانجەکانی خۆی، بەڵام گەیشتە هەندێك لە ئامانجەکانی؛ (PKK)یان لەجیهاندا بە"تیرۆریست" راگەیاند و بە پەسندکردن دا، لەمەدا گەیشتنە ئامانجی خۆی. چونکە تورکیاش دەیگووت:" من لەدژی کوردان نیم، بەڵام (PKK) تیرۆریستە، من لەدژی تیرۆریزم شەڕ دەکەم". (ی ن ك) و (پ د ك)ش دەیانگووت:" (PKK) کورد نییە تیرۆریستە، ئێمە لەدژی تیرۆریزمین، ئیدی پەیوەندی ئێمە و تورکیا باشە..." ئەو قسانەیان دەکرد. ئەمە چی لەگەڵ خۆیدا هێنا؟ ئەمە هاوکاری دەوڵەتی تورکیای کرد کە تورکیا تێزی خۆی بۆ "تیرۆریزم" بە دونیا بەپەسندکردن بدات، بە ئەوروپا بە پەسندکردن بدات. ئەگەر لە ئەوروپا زۆر دەوڵەت تێزی تورکیای پەسندکرد، بەمجۆرە بە پەسندکردن درا، ئەگەر وا نەبووایە، ئەوا تورکیا خۆی پارچە پارچە بکردبایە، زێدە نەیدەتوانی تێزی خۆی بە پەسندکردن بدات. ئەگەر توانی بە پەسندکردنی بدات لێرەدا رۆڵی (ی ن ك) و (پ د ك) مەزن بوو. چونکە ئەوانە کورد بوون و بەناوی کوردەوە دەئاخفین. لەساڵی (١٩٩١)دا لەبەر ئەوەی کە بەمشێوەیە رێککەوتن و **"مام جەلال"** ئەو قسەیەی کرد، ئەو قسەیە قسەیەکی راست نەبوو، ئاخفتنێکی هەڵەبوو، هەڵەیەکی مەزن و مێژوویی بوو، ئەمە گورزێکی کوشندەی لە تەڤگەری کورد دا. ئەگەر **"مام جەلال"** ئەو قسەیەی نەکردبایە، هیچ کاتێك تورکیا

نەیدەتوانی (PKK) لەدونیادا بە"تیرۆریست" لەقەڵەم بدات. دەتوانم ئەمە بەڕاشکاوی بڵێم...

**ئەو کاتە؛ پەیوەندی تەسفیەگەرێتی حوسێن یڵدرم و ئەوانە لەگەڵ ئەو تەسفیەگەرانەی کە لەنێو گەریلادا لەنێو جموجۆڵدا بوو هەبوو؟ بۆ نموونە کەسانی وەك" تەرزی جەمال، کۆر جەمال و ... هتد"**

بێگومان لەزەمینەی کۆنگرەی سێیەمیندا، "تەرزی جەمال، کۆر جەمال و حوسێن یڵدرم" و ئەوانە پێکەوە هەندێك حیساباتیان کردبوو کە ئەگەر "کۆر جەمال" بێتە وڵات، لە وڵاتیشدا باڵادەستێتی خۆی لەسەر گەریلا بسەپێنێت، ئەگەر هەندێك ناستەنگیش هەبن ئەوا ئەو ناستەنگیانە لەپێش خۆیدا نەهێڵێت، ئەگەر "تەرزی جەمال"یش لە گۆڕەپانی لوبنان لە ئەکادیمیادا دەمێنێتەوە، ئەویش لەوێ لەسەر کادیران باڵادەستی خۆی دروست بکات، ئەگەر"حوسێن یڵدرم" و ئەوانەش لە ئەوروپا بن، ئەوا هەموویان یەکتر تەواو دەکەن. بێگومان ئەوانە پیلانێکی هاوبەشی بەمجۆرەیان بەڕێوە برد. تەنانەت کاتێك کە "حوسێن یڵدرم" دەچێتە ئەوروپا و لەدژی سەرۆك دەست بەکار دەبێت، چی دەڵێت؟ بۆ شەخسی من دەڵێت:" لە وڵات جومعە هەیە، هەڤاڵێکی نازانم کۆنە و پاکە و دڵسۆزە لەوانەیە ئەویش سەرۆك تەسفیەی بکات، سەرۆك ناخوازێت کەس لەناو تەڤگەردا بەمجۆرە پێشبکەوێت، بۆ ئەوەی بەردەوام کۆنترۆڵی خۆی لەسەر تەڤگەر دروستبکات، زۆر کەس بێکاریگەر و تەسفیە دەکات و تەنانەت ونیان دەکات. ئیدی لەوڵاتیش جومعە هەیە، لەناو تەڤگەردا دەناسرێت و کاریگەری خۆیشی هەیە، لەوانەیە سەرۆك ئەویش لەناو ببات" تەنانەت حوسێن یڵدرم ناخفتنێکی بەمجۆرە دەکات.

بۆچی ئاخفتنێکی بەمجۆرە دەکات؟ چونکە دیارە کە پێشتر ئەوانە لەنێو خۆیاندا قسەوباسیان لەسەر کردووە، کاتێك کە "کۆر جەمال" لە وڵات دەیخواست تەڤگەر بخاتە

ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، حیسابات دەکەن، لەوانەیە من (جومعە) لەدژی ئەمە رابوەستم، کە لەدژی ئەمە راوەستام من تەسفیە بکەن و پاشان بڵێن:" سەرۆك ئەوی تەسفیە کردووە" بۆیە هەر پێشتر ئەو پڕوپاگەندەیە دەکەن. بۆیە ئەگەر منیان تەسفیە کرد، ئەوا تۆمەتەکە دەخەنە ئەستۆی سەرۆك و بڵێن:" سەرۆك جومعەی لەناوبرد". ئیدی پیلانێکی بەمجۆرەیان بەڕێوە دەبرد.

هەڵبەتە **"کۆر جەماڵ"**یش پیلان و لەیستۆکی بەمجۆرەشی کرد. بەڵام لەبەر ئەوەی لە پیلان و لەیستۆکەکەی ئەو تێگەیشتم، ئەو پیلان و لەیستۆکانە سەرنەکەوتن، واتا ئەو لەیستۆکەمان تێکدا.

## یەکێك لەو زیندانییانەی کە لەسەرەتای نەوەدەکان تورکیا سەربەستی کرد "محەمەد شەنەر" بوو، کە لە زینداندا دەرکەوت و خاوەن زۆر چەمك و مەیلی دەرەوەی تەڤگەر بوو، کرۆکی ئەو مەیل و چەمکانە چیبوون؟

لێرەدا دەوڵەتی تورکیا ئەزموونێکی مەزنی خۆی لەسەر تەسفیەکردنی تەڤگەرەکان لەنێو زینداندا هەیە. لەبنەڕەتدا دەوڵەتی تورکیا هەموو تەڤگەرەکانی لە زینداندا تەسفیە کردووە، جا چ تەڤگەری کوردان بێت یان چەپی تورك و دیموکراتیخواز بن. دەوڵەتی تورکیا لە زیندانەکاندا ئەنجامی باشی بەدەستخستووە، بۆیە ئەزموونێکی زۆر بەهێزی لەم بارەیەوە هەیە. خواستی لە زیندانی ئامەددا تەڤگەری ئێمەش تەسلیم وەربگرێت. هەر لەم پێناوەشدا زوڵمێکی مەزنی لە زینداندا بەڕێوەبرد. لەمێژووی رابردووشدا هەموو تەڤگەرەکانی بەمجۆرە لە زیندانەکاندا تەسلیم وەرگرتبوو و ئیرادەیانی شکاندبوو، تەنانەت زۆر لەوانەیان داڕووخاندبوو و کردبوونی بە سیخوڕ و بەدەستی ئەو سیخوڕانە تەسفیەی کردبوون، بۆیە لە کودەتای (١٢)ی ئەیلولیشدا ئەو

تاكتیكەیان بەڕێوە برد. لەوێدا زۆر ئەنجامیشیان بەدەستخستبوو. تەنیا لەبەرامبەر تەڤگەری ئێمەدا نەیانتوانیبوو ئەنجام بەدەستبخەن.

هەر بۆیە لە زیندانی ئامەددا بەوەحشییەتێكی مەزن هاتنە سەر تەڤگەری ئێمە، دەیانگووت:" چۆن دەبێت لەسەر هەموو تەڤگەرەكان ئەنجامگیر ببین و تەسلیمیان بكەین و ئیرادەیان بشكێنین، لەكادیرانی ئەو تەڤگەرانەدا چەمكی هەڵە لەناویاندا پێشدەخەین و ئێمە بەدەستی ئەوان تەڤگەرەكان پارچە پارچە دەكەین، بۆچی لەبەرامبەر (PKK)دا ئەمە نابێت؟" بۆیە زۆر بە وەحشییەتەوە دەهاتنە سەر هەڤالان، بۆ ئەوەی ئەمە جێبەجێ بكەن، ئەو شتەی لە تەڤگەرەكانی دیكەدا جێبەجێیان كردووە لەسەر (PKK)ش جێبەجێی بكەن. بێگومان تەڤگەر لەبەرامبەر ئەمە بەرخۆدانێكی مەزنی پێشخست، ئەوان دەیانخواست ئیرادەی بشكێنن و تەسلیمی وەربگرن، هەڤالانیش ئیرادەی خۆیان بەهێز و تۆكمەتر دەكرد و ئاستی بەرخۆدانیان بەرزتر دەكردەوە.

بێگومان لێرەدا تەڤگەر بەسەركەوت، بەڵام لەكادیرانی زینداندا سێ بەش دروستبوون. یەكەمینیان؛ كە بەتەواوی تەسلیم ببوو و كەوتە خزمەتی دەوڵەتی توركیاوە و لەگەڵ دەوڵەتدا بەشداری ئەشكەنجەدانی هەڤالانیان دەكرد، كەسانی وەك: "**شاهین دونمەز، یڵدرم مەركیت**" و ئەوانە بوون...

دووەمینیشیان؛ ئەو كادیرانە بوون كە كەمێك ئیرادەیان شكاو و بێهێز ببوو، دەستبەرداری تەڤگەر نەبوون و بەتەواوی نەكەوتنە خزمەتی دووژمنەوە، بەڵام لەژێر ئەو زوڵم و ئەشكەنجەیەدا زۆر ئیرادەیان لاواز ببوو، ئیدی نەیانتوانی لەدژی ئەو وەحشییەتە بەرخۆدان بكەن، دەستبەرداری بەرخۆدان بوون، بەڵام بەتەواویش تەسلیمی داگیركەرانیش نەبوون، دیسان هەر لەگەڵ تەڤگەر دابوون...

بەشێكی دیكەی كادیرانیش هەبوون كە هەڤالانی وەك "**مەزڵوم دۆغان، محەمەد خەیری دوورموش، كەمال پیر، فەرهاد كۆرتای**" و ئەوانە نوێنەرایەتیان دەكرد، ئەو هەڤالانە لەدژی ئەو وەحشییەتە راوەستان و بەردەوام لەهەوڵی ئەوە دابوون كە چۆن ئیرادە بەهێزتر بكەن؟ چۆن بتوانن بەرخۆدان بەرزتر بكەنەوە؟ چۆن ئیرادەی داگیركەران بشكێنن؟ ئەو هەڤالانەش ئەمەیان بەبنچینە وەردەگرت. بۆیە لە زیندانی ئامەددا، هەم بەرخۆدانی مەزن، هەمیش خیانەتی مەزن روویدا. واتا هەم بەرخۆدانەكە

مەزن بوو، هەمیش خیانەتەکە. هەڵبەتە ئەمە لەهەمانکاتدا مێژووی گەلی کوردیشە، مێژووی (PKK)شە، واتا لایەکی خۆی هەمیشە بەرخۆدانە و لایەکەی تریشی خیانەتە. خیانەتیش مەزنە و بەرخۆدانیش مەزنە، لەمێژووی کوردیشدا وایە، لەمێژووی (PKK)شدا وایە، لە **زینندانی ئامەدیشدا** هەر وایە.

لەم رووەوە؛ چەمکێکی سەرۆك ئاپۆ لەم بارەیەوە هەیە کە دەڵێت:" چەندە خیانەت مەزن بێت، پێویستە بەرخۆدان زۆر لەوە مەزنتر ببێت"، سەرۆك ئەم چەمکەی لە (PKK)دا زۆر بەهێز کرد. بۆیە دەیگووت:" بۆ ئەوەی بتوانیت سەرکەوتن بەدیبهێنیت؛ چەندە داڕووخان مەزن بێت، ئەوا پێویستە رابوونیش هێندە مەزن و زۆر لەوەش مەزنتر ببێت". سەرۆك تەڤگەری (PKK) و ملیتانێتی (PKK)ی لەسەر ئەو بناخەیە پێشخست، گەلی کوردی لەسەر ئەو بناخەیە پێشخست. ئەمە راستییەکی سەرۆکە، ئەمە تایبەتمەندێتی و تەرز و پرەنسیپ و چەمکێکی سەرۆکە.

لەبنەڕەتدا داگیرکەران دەیانخواست پێشەنگایەتی و رێبەرایەتی لە زینداندا تەسلیم وەرگرن، چونکە ئەوەی لەبنچینەدا نوێنەرایەتی تەڤگەری دەکرد ئەو بوو، ئەوەی ئیرادە و بەرخۆدانی بەهێزتر دەکرد و نەیدەهێشت تەڤگەر لە زینداندا تەسلیم ببێت پێشەنگەکانی تەڤگەر بوون، واتا هەڤالان **"مەزلوم، کەمال و خەیری"** بوون. ئەگەر توانیان ئیرادەی ئەوان بشکێنن و تەسلیمیان وەربگرن، ئەوا مسۆگەر تەڤگەر لە زینداندا تەسلیم وەردەگرن، کە تەڤگەریشیان لە زینداندا تەسلیم وەرگرت، ئەوا دەتوانن لەدەرەوەی زیندانیشدا ئیرادەی تەڤگەر بشکێنن، دەتوانن ئیرادەی گەل بشکێنن. چونکە لەبەرامبەر هەموو تەڤگەرەکاندا ئەو ئەنجامەیان بەدەستخستبوو؛ لە زیندانەکاندا ئیرادەیان شکاندبوون و تەسلیمیان وەرگرتبوون، پاشان بەو کادیرانەی تەسلیمیش ببوون لەدەرەوەی زیندان ئەو تەڤگەرانەیان پارچە پارچە کردبوو و تەسلیمیان کردبوون. ئیدی دەیانخواست لە (PKK)شدا ئەمە پێکبێنن، هەڤالان **"کەمال، خەیری، مەزلوم"** و ئەوانەی دیکە لەدژی ئەمە راوەستان، نەیانهێشت ئەمە ئەنجامگیر ببێت. مەزنێتی ئەو هەڤالانەش لەمەدایە، بۆ یەکەمجار ئەو تاکتیکەی دەوڵەتی تورکیا لەسەر تەڤگەرەکان پەیڕەوی کردووە و ئەنجامی بەدەستخستووە پووچەڵ دەبێتەوە، ئەو

هەڤاڵانە نەیانهێشت ئەو تاکتیکە لەسەر (PKK) پێك بێت و پەیڕەو بکرێت، بەمەش گورزێکی مەزنیان لەو تاکتیکە دا. ئەمە زۆر گرنگ بوو.

مرۆڤ دەتوانێت بڵێت:" لەمێژووی زیندانەکاندا، لە تورکیا و لە کوردستاندا، بۆ یەکەمجار (PKK) بە ساخی دەرچوو. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی لە زیندانەکاندا بەساخی دەرچوو، بەرخۆدانی خۆیشی لەناوەوە و دەرەوەی زیندانیشدا لەسەر ئەو بناخەیە بەرەو پێشەوە برد و بەهێزی کرد.

بێگومان کاتێك کە ڕێبەرانی بەرخۆدانی (PKK) لە زینداندا بەو چالاکییانەیان شەهید بوون، لەوێدا بۆشاییەك دروستبوو، ئیدی "**محەممەد شەنەر و سەلیم چروك کایا**" و هاو شێوەکانیان خواستیان ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە، دەوڵەتیش خواستی بەرێگەی "**محەممەد شەنەر**"ەوە تەڤگەر لە زیندانەکاندا بەتەواوی بخاتە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆیەوە، ئەگەر دوای ئەوەی پێشەنگەکانی تەڤگەر لە زینداندا شەهیدبوون و "**محەممەد شەنەر**" بالادەست ببێت ئەوا دەتوانن لەرێگەی "**محەممەد شەنەر**"ەوە ئەو بەرخۆدانە دیسان بشکێنن و تەسفیەی بکەن. هەروەها دەتوانن لەرێگەی "**محەممەد شەنەر**" و ئەوانەوە لەدەرەوەش تەسفیە پێشبخەن. دەوڵەت لەرێگەی "**محەممەد شەنەر**"ەوە هەنگاوێکی بەمجۆرەی هاوێشت. بێگومان "**محەممەد شەنەر**" چۆن خۆی نیشاندەدا؟ واخۆی نیشان دەدا کەوا کادیرێکە هەمیشە بەرخۆدانی بەبنەما وەرگرتووە و پەیوەستە ئگەرەوە. بۆ نموونە؛ درەنگ بەشداری لەچالاکی مانگرتنەکان دەکرد، واتا خۆی ماندوو و پەرێشان نەدەکرد و بەمشێوەیە فێڵبازی دەکرد. بەتایبەتی لەدوا چالاکی بەرخۆدانی "**کەمال پیر**" و "**خەیری دوورموش**" و ئەواندا، واتا لە چالاکی مانگرتنی تا مردندا دەبینێت کەوا "**کەمال، خەیری**" و ئەوان بەبڕیارن کە تا کۆتایی ئەم چالاکییە بەردەوام بکەن، بۆ ئەویش لەکۆتایی چالاکییەکە بەشداری تێدا دەکات، بۆ ئەوەی کە ئەوان شەهیدبوون، خۆی بکاتە سەرۆکی ئەو بەرخۆدانە، بۆ ئەوەی هەر کەسێك بەمجۆرەی لەقەڵەم بدات، ئیدی گوایە لەگەڵ ئەواندا بوو و ئەوان شەهیدبوونە و ئەویش ماوەتەوە، ئیدی سەرۆکی بەرخۆدانە، پێویستە هەموو کەسێك ڕێزی لێبگرێت... ئیدی دەتوانێت لە زینداندا تەڤگەر بەتەواوی بخاتە دەستی خۆیەوە، ڕاستینەی ئەویش کەس نازانێت، بەیانیش کە لە زیندان دەرچوو، گوایە بەرخۆدانی

کردووه، هەمیش نوێنەرایەتی میراسی "**خەیری و کەمال**"ی کردووه، بەمەش لەناو تەفگەردا چ لە زیندان و چ لەدەرەوەشدا شوێنگەیەکی باش بۆ خۆی بگرێت، کە بتوانێت تەفگەر کۆنترۆڵ بکات، هەروەها تەفگەریش لەژێر کۆنترۆڵی سەرۆکدا دەربخات، واتا رۆڵێکی بەمجۆرەیان بە "**محەممەد شەنەر**" دابوو لە زینداندا.

کاتێك کە "**محەممەد شەنەر**" لە باتماندا دەستگیرکرا ئەرشیفی (PKK) لەو ناوچەیە کەوتە دەست دەوڵەتەوە. شوێنی ئەرشیفیش تەنیا "**محەممەد شەنەر**" دەیزانی، وەکوتر کەسیتر نەیدەزانی. بێگومان "**محەممەد شەنەر**" ئەوەی لە هەڤالان شاردبووەوە، هەڤالان نەیانزانیبوو کە ئەو ئەرشیفە چۆن کەوتۆتە دەست دەوڵەت؟ تەنانەت "**محەممەد شەنەر**" وەها دیاری کردبوو کە ئەو جێی ئەرشیفی نەزانیوە. بێگومان ئێمە دەمانزانی کە تەنیا "**محەممەد شەنەر**" جێی ئەرشیف دەزانێت، هەڤالانی زیندان ئەوەیان نەدەزانی. ئیدی دەیخواست لەمە سوود وەربگرێت؛ کە گرتنی ئەرشیف بخاتە ئەستۆی هەندێك لە هەڤالانی دیکەوە و کەس لەرەوشی ئەو تێنەگات. هەروەها لەدەرەوەی بەگرتدانی ئەرشیف، خۆیشی هەموو زانیارییەکی بە دەوڵەت دابوو، بەڵام خۆی چۆن نیشان دابوو؟ خۆی وا نیشان دابوو کە هیچ زانیارییەکی بە دەوڵەت نەداوە، ئەرشیفی نەداوەتە دەست دەوڵەت و بەرخۆدانی کردووە، وەها خۆی نیشان دابوو، تا کاتێکی زۆریش هەڤالان رەوشی ئەویان نەزانیبوو. چونکە پەیوەندی هەڤالانی زیندان لەگەڵ دەرەوە نەبوو، بۆ ئەوەی بتوانن رەوشی ئەو لەهەڤالان بشارنەوە، خێزانی ئەویش بەردەوام لەگەڵ دەوڵەتدا لەنێو پەیوەندیدا بوو. بۆ نموونە؛ ئەو زانیاریانەی کە هەڤالان دەخوازن لە زیندانەوە بۆ ئێمەی بنێرن "**محەممەد شەنەر**" دەڵێت:"بیدەنە دایکی من، ژنیشە زێدە نایپشکنن، من دەیدەمە دایکم، دەتوانێت بە هەڤالانی بگەیەنێت". بەمشێوەیە زۆر زانیاری دەگاتە دەستی دەوڵەت و ناگاتە پارتی. ئەو زانیاریانەی بەدەستی ئێمە دەگات، بەدەستی دەوڵەت دەگات، ئینجا دەگاتە دەستی پارتی. واتا "**محەممەد شەنەر**" میکانیزمێکی بەمشێوەیەی دروستکردبوو. هەروەها لە زیندانی ئامەددا هەڤالان تونێلیان لە زیندانەوە دروستکردبوو، بۆ ئەوەی لە زیندانەوە رابکەن، "**محەممەد شەنەر**" ئەو تونێلەی بەرێگەی دایکی خۆی ئاشکرا کرد. بۆیە ئەو هەوڵی هەڵاتنەش ئەنجامگیر نەبوو. ئیدی "**محەممەد شەنەر**" و خانەوادەکەی لەگەڵ

دەوڵەت بوون، دەوڵەت دەیخواست دوای شەهیدبوونی سەرۆکایەتی بەرخۆدانی زیندان ئەو بکات بەسەرۆکی ئەو بەرخۆدانە و وەك قارەمانێك دەربکەوێتەڕوو، کە لە زیندانیش چووە دەرەوە لەتەڤگەردا شوێنێکی تایبەت بگرێت، بۆ ئەوەی بەرێگەی ئەوەوە لەدژی سەرۆك جموجۆڵێك پەرەپێبدەن و بەمەش تەڤگەر لەژێر کۆنترۆڵی سەرۆك دەربخەن. ئەو رۆڵەی بە "**محەمەد شەنەر**"یان دابوو، ئەمە بوو.

هەڵبەتە کەسانی وەکو "**سەلیم چروك کایا**"ش لەزینداندا هەبوون، "**سەلیم چروك کایا**" و ئەوان بەرخۆدانیان نەکردبوو و تەسلیم ببوون، ئێمە ئەمەمان دەزانی. ئیدی "**محەمەد شەنەر**" و ئەوانەی هاوشێوەی خۆی بوون، هەمووی کردبووە ئەکیبێك (گروپێك)؛ هەم بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی زیندان بکات، هەمیش کە دەرکەوتنە دەرەوەی زیندان ئەو ئەکیبە بتوانێت لەناو تەڤگەردا کۆنترۆڵێك دروستبکات. "**محەمەد شەنەر**" کاتێك کە لە زینداندا دەرچوو خواستی ئەمە بکات، خواستی رۆڵێکی بەمجۆرە بگێرێت و تەڤگەر بخاتە دەستی خۆیەوە.

بۆ نموونە؛ ئێمە ئامادەکاریمان بۆ کۆنگرەی چوارەم دەکرد، کاتێك خواستمان کۆنگرە بەفەرمی دەستپێبکەین ئەو کاتە "**بۆتان**" و "**ئەبوبەکر**" و ئەوانەمان هەموو بەهۆی پراکتیکی خۆیانەوە بێ ئەرك کردبوو (ئەرکمان لەوان ستاندبووەوە) و خستبوومانئنە ژێر لێکۆڵینەوەوە. چونکە پراکتیکی چەتەگەرییان بەڕێوە بردبوو و تەخریباتێکی ن ئەنجام دابوو، رەخنەی تەڤگەر بۆ ئەوان هەبوو، دۆخی ئەوان دۆخی لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە بوو، بۆیە ئەوانمان بێ ئەرك کرد و خستمانئنە ژێر لێکۆڵینەوەوە. "**محەمەد شەنەر**" دەچێت و بەوان دەڵێت:" ناحەقی لەئێوە کراوە، هەر کەسێك لە-وێنی ئێوە بووایە هەروەکو ئێومیان دەکرد، پراکتیکی ئێوە پراکتیکێکی باشە. پارتی و سەرۆك ناحەقی لەئێوە دەکەن" واتا دەخوازێت ئەوانە لەدژی سەرۆك و لەدژی تەڤگەر بخاتە جموجۆڵەوە. دەخوازێت ئەوانەش بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەکۆنگرەدا قورسایی خۆی دروست بکات و کۆنگرە بخاتە دەستی خۆیەوە، ئامادەکارییەکی بەمجۆرەی کردبوو.

لەدەرەوەی ئەمەشەوە، هەندێك کەسی ئامادە کردبوو و دەیخواست ئەوانەش تەڤلی کۆنگرە بکات، لەکۆنگرەشدا قورسایی خۆی دروستبکات و کۆنگرە کۆنترۆڵ بکات. دەهات

چی بەمن دەگووت؟ بۆ "بۆتان" و "ئەبوبەکر" و ئەوان دەیگووت:" ئەوانە هەموویان بکوژ (قاتل)ن، ئەوانە زۆر تاوانی قورسیان کردووە، تەخریباتیان کردووە، یاریان بە ئایدیۆلۆژیا و تاکتیك و ژیان و بەهای پارتی کردووە، خەڵکیان کوشتووە، پێویستە ئەوانە هەموو دادگایی بکرێن و لەسێدارە بدرێن..." سەبارەت بەوانیش لای ئێمە وەهای دەگووت. واتا بۆ ئەوەی ئەو کارەی بەرێوەی دەبات من پێی نەزانم، بۆ ئەوەی بەئاسانی کار و پیلانی خۆی بەرێوە ببات ئەو قسانەی دەکرد.

لەبنەڕەتدا ئامانجی سەرەکی "محەممەد شەنەر" ئەوەبوو کە چۆن بتوانێت سەرۆك بێکاریگەر بکات. بۆ ئەمەش "محەممەد شەنەر" لە سوریا رێکخستەبوونێکیشی لەگەڵ هەندێك لەکەسانی ئیستخباراتی سوریا پێکهێنابوو، تەنانەت خواستبوویان کەوا ژەهر بدەنە سەرۆکیش، بەمشێوەیە سەرۆك تەسفیە بکەن و بیکوژن. بێگومان پارتی تەدبیری وەرگرتبوو، بۆیە ئەم پیلانەیان سەرینەگرت. ئەمجارەیان خواستی لەکۆنگرەدا ئەنجام بەدەستبخات. ئەمەش ئەنجامگیر نەبوو.

هەڵبەتە ئێمە دەرهەق بە "شەنەر" لێکۆڵینەوەیەکمان ئەنجام دا، هەم لەسەر پراکتیکی ئەو لە زینداندا، هەمیش لەسەر پراکتیکی ئەو لە گۆڕەپانی لوبناندا، ئێمە ئەومان دادگایی کرد، هەڵبەتە دوای ئەمە هەڵات و رۆیشت. ئێمە ئەوەمان خستبووە ژێر لێکۆڵینەوەوە، بۆ ئەوەی رەوشی ئەو یەکلایی و زەلال بکەین. ئیدی ئەو کاتە هەڵات. لەراستیدا ئەویان رفاند!!، کەسێك هەبوو لەناو ئێمەدا ناوی"فایەق"بوو، ئەویش لە زیندانەوە دەرکەوتبوو، ئەو "فایەق"ە چۆن خۆی نیشان دەدا؟ واخۆی نیشان دەدا کە دژی "محەممەد شەنەر"ە تەنانەت لەدژی "محەممەد شەنەر" ئاخافتنی خراپیشی دەکرد، دەیگووت:"محەممەد شەنەر" مەترسیدارە و پیاوی دەوڵەتە" بۆ ئەوەی تەڤگەر باوەڕی و متمانەی پێبکات. بەراستیش ئێمە کەمێك باوەڕیشمان پێیکرد، بەڵام ئەوەی "محەممەد شەنەر"ی لەژێر لێکۆڵینەوە رفاندبوو هەر ئەو "فایق"ە بوو، هەڵاتن و چوونە لای (پ د ك). لەلای (پ د ك) و بەرێی (پ د ك)ەوە خواستیان لەدژی تەڤگەر هەندێك جموجۆڵ بکەن. بێگومان نەیانتوانی، چونکە ئەو هێزەی نەبوو. تەنانەت "محەممەد شەنەر" چوو بەناوی "PKK ـ ڤەژین" بەیاننامەیەکیشی دەرخست، گوایە دەیەوێت لەدژی (PKK) رابوەستێت. بێگومان نەیدەتوانی و هێزێکی ئەوتۆی نەبوو، هێزی ئەو هەمووی دەوڵەت

بوو، هەڵبەتە لەناو تەڤگەردا هێزێکی خۆی نەبوو. ئەو مەترسییەی "محەممەد شەنەر"یش بەمشێوەیە بەلاوە نرا...

## لەساڵی (۱۹۹۰)دا دووەمین کۆنفرانسی تەڤگەر سازدەکرێت.. شوێنگەی ئەو کۆنفرانسە لەمێژووی تەڤگەردا چییە؟ رێنمایی و بڕیارە هەرە گرنگەکانی ئەو کۆنفرانسە چیبوون؟

دووەمین کۆنفرانس لە **گۆڕەپانی سەرۆکایەتی** لە لوبنان سازدرا، لەو کۆنفرانسەدا سەبارەت بەو پراکتیکەی کە لە وڵاتدا بەڕێوە براوە، چییە و چۆنە؟ لەسەر ئەو پراکتیکە راوەستە کرا، لەو پراکتیکەدا خەتێکی چەتەگەری دەرکەوتبوو، لەسەر ئەو مەسەلەیە راوەستەی کردبوو و ئەو خەتەی مەحکوم کردبوو، بۆ ئەوەی خەتی چەتەگەرێتی لەناو گەریلادا، لەناو پێشەنگایەتی گەریلادا بێکاریگەر بکات. لەبنەڕەتدا و بەقورسایی لەسەر ئەو مەسەلەیە راوەستابوو و بڕیاری لەسەر وەرگیرابوو. بێگومان دووەمین کۆنفرانس رۆڵێکی بەمجۆرەی هەیە، رۆڵی سەرەکی ئەم کۆنفرانسە ئەوە بوو؛ کە چۆن پراکتیکی چەتەگەرێتی و خەتی چەتەگەرێتی بخاتەڕوو و بناسرێت و مەحکومی بکات و بێکاریگەری بکات. لەبنەمادا کۆنفرانسەکە ئەم رۆڵەی دەبینی و ئەو رۆڵەشی گێڕا. هەندێك لەبڕیارەکانی ئەو کۆنفرانسە لە پراکتیکدا جێبەجێکران، بەمەش تەخریباتی چەتەگەرێتی هەندێك کەم بووەوە. هەرچەندە نەتوانرا بەتەواوی چەمکی چەتەگەری لەناو ببات. بەڵام رێی لەبەردەم گرت، هەندێك لەتەخریباتەکانی نەهێشت...

## لە کامپی دۆڵی بیقاع لە لوبناندا، لە چوارچێوەی ئەو پیلانگێڕییانەی بەڕێوە دەبران، وەکو باستانکرد هەڤاڵ حەمزە (حەسەن بیندال) لەژێر ناوی رووداوێکی لەدەست دەرچوو (قەزا)دا

شەهید دەكرێت. پیلانگێڕان بۆ بەتایبەتی ئەو هەڤاڵەیان بەئامانج گرت و چ ئامانجێكیان لەپشت كوشتنی ئەودا هەبوو؟



شەهید حەمزە (حەسەن بیندال)

هەڤاڵ "حەسەن بیندال" هاوگوندی سەرۆك ئاپۆ بوو، لەگوندەكەیاندا هەمیشە لەنێوان خانەوادەی سەرۆك و خانەوادەی هەڤاڵ "حەسەن بیندال"دا ناكۆكی و دووژمنایەتییەك هەبوو، وەك هەر دووژمنایەتییەك كە لە گونددا لەنێوان دوو خانەوادە روودەدات. دایكی سەرۆك بەردەوام بە سەرۆك ـ كە ئەو كاتە هێشتا منداڵ بوو ـ دەڵێت:" ئەو خانەوادەیە دووژمنمانە، پێویستە تۆش وەك دووژمن بیبینی، منداڵی ئەوان وەك دووژمن ببینی و خۆت لەو خانەوادە و منداڵەكانیان نەدەیت" هەمیشە دەخوازێت بیرۆكەی دووژمنایەتیكردنی ئەو خانەوادەیە لەسەری سەرۆكدا

بهێڵێتەوە و بەهێزی بکات. بەڵام سەرۆك ئاخافتنی دایکی بۆخۆی هیچ بەبنچینە وەرناگرێت، تەواو بەپێچەوانەی ئەو هەڵسوکەوت دەکات، ئەو خانەوادەیە بەدووژمن نازانێت و منداڵی ئەوانیش بە دووژمن حیساب ناکات، تەنانەت لەگەڵ "حەسەن بیندال"یشدا پەیوەندی دروست دەکات و هاورێیەتی لەگەڵدا دەکات. ئیدی رۆژێك داپیرەی سەرۆك دەبینێت کە سەرۆك لەگەڵ "حەسەن بیندال"دا هاورێیەتی دەکات، داپیرەشی بەدایکی سەرۆك دەڵێت:" کورەکەت لەگەڵ منداڵی دووژمندا هەڤاڵێتی دەکات" دەخوازێت دایکی سەرۆك لەبەرامبەر سەرۆك بوروژێنێت. دایکی سەرۆکیش سەرۆك دەگرێت و حەپسی دەکات و دەخوازێت لێی بدات و پێی دەڵێت:" بۆچی لەگەڵ منداڵی دووژمنی ئێمە پەیوەندی دەبەستیت؟" بەڵام نە ئاخافتن و نە ئەو تەدبیرەی وەریدەگرن ناتوانن رێ لەبەردەم هەڤاڵێتی نێوان سەرۆك و "حەسەن بیندال" بگرن. ئیتر سەرۆك پەیوەندی خۆی لەگەڵ "حەسەن بیندال"دا پێشدەخات و بەهێزی دەکات. واتا هێشتا لەگوند بوون و لەمنداڵێتیدا سەرۆك لەدژی ئەو چەمکەی بەگشتی لەناو کورداندا لەئارادایە، چەمکە باوەکان، رەتدەکاتەوە. لەشەخسی "حەسەن بیندال"دا یەکێتی گوند و یەکێتی کورد بەبنچینە وەردەگرێت، لەدژی پارچەبوون رادەوەستێت. چونکە پارچەبوون خەتی داگیرکەرێتییە. داگیرکەران گەلی کوردیان پارچە پارچە کردووە، بێ هێزی کردووە، ئیرادەی شکاندووە، تەسلیمی وەرگرتووە و لەسەر ئەمەش دەسەڵاتدارێتی خۆی تۆکمە و پێشخستووە، خەتی داگیرکەران ئەوەیە، کە چۆن بتوانن وابکەن دوو کورد نەگەنە یەکتر، کە گەیشتنە یەکتریش نەتوانن بەیەکەوە بژین و کاربکەن، ئەمەیە خەتی داگیرکەران. ئیدی سەرۆك ئەو خەتە رەتدەکاتەوە، بەڵکو هەموو هەوڵدانی بۆ ئەوەیە کە چۆن بتوانێت کوردان بگەیەنێتە یەکتری؟ چۆن بتوانێت ئەو کوردانەی گەیشتنە یەکتریش بتوانن بەیەکەوە بژین و کاربکەن؟ ئەگەر تۆ توانیت ئەمە ئەنجام بدەیت و پێشیبخەیت ئەوا دەتوانیت سیاسەتی داگیرکەران لە کوردستاندا تێك بدەیت، دەتوانیت ئازادی، دیموکراسی پێشبخەیت، رێی ئازادی و دیموکراسی، رێی سەرکەوتن لە یەکێتی گەلی کورددا دەرباز دەبێت. هەڵبەتە داگیرکەران ئەو یەکێتییەی خراپ کردووە و کوردانی پارچە پارچە کردووە و تێکیبەرداون، بۆیە کوردان یەکتر دەخۆن، دەستبەرداری دووژمن بوونە و خۆخۆرن، ئیدی سەرۆك لەگوند

ئەم سیاسەتە رەتدەكاتەوە، لەدژی ئەمە رادەوەستێت، چونكە دەبینێت لەنێوان خێزانی ئەو و خێزانی "حەسەن بیندال"دا ناكۆكییەكی ئەوتۆ لەئارادا نییە، ناكۆكییەكی ساختەیە، نە خزمەتی ئەم خێزانە دەكات و نە خزمەتی ئەوەی تر دەكات. بۆیە ئەوە رەتدەكاتەوە، بەڵكو چۆن بتوانێت دۆستایەتی دروستبكات، ئەمە بەبنچینە وەردەگرێت. بۆیەش هەڤاڵێتی خۆی لەگونددا، لەناو هەموو منداڵەكانی گونددا، زیاتر لەگەڵ "حەسەن بیندال"دا پێشدەخات و زیاتر ئەو دەكاتە هاوڕێ و هەڤاڵی خۆی. واتا ئەوەی كە گوایە دووژمنی خانەوادەكەیانە هەڤاڵێتی لەگەڵدا پێشدەخات. ئەگەر لەگەڵ "حەسەن بیندال" هەڤاڵێتی پێشخست، ئەوا مسۆگەر دەتوانێت لەگەڵ منداڵەكانی دیكەی گوند و گوندەكانی دیكەشدا هەڤاڵێتییەكی تۆكمەتر پێشبخات.

ئەمە گرنگە، چونكە ئەمە پاشان لەشەخسی سەرۆكدا دەبێتە تایبەتمەندییەك و خەتێك، هەمیشە لەئاواكردنی یەكێتی كوردانەدا، لەپێشخستنی هەڤاڵێتیدا لەپێشخستنی كادیران و تەڤگەردا، ئەمە بۆخۆی بەبنچینە وەردەگرێت و زیاتر قووڵی دەكاتەوە. ئیدی لەگەڵ "حەسەن بیندال"دا بەمشێوەیە پەیوەندی خۆی دەبەستێت، پاشان ئەو پەیوەندییەی دەبێتە پەیوەندییەكی سیاسیش.

سەرۆك لەبەر ئەوەی هەر لەگوندەوە هەڤاڵێتییەكی تۆكمەی لەگەڵ هەڤاڵ "حەسەن بیندال"دا هەبوو، باوەڕی پێدەكرد، بۆیە هەم كردبووی بە پارێزوانی خۆی و هەمیش بە تەتەر (نامەبەر)ی خۆیشی، بەها و رۆڵێكی بەمجۆرەی پێدابوو. هەڵبەتە هەڤاڵ "حەسەن بیندال"یش بەهایەكی مەزنی دەدایە سەرۆك، هەڤاڵێتییەك كە هەر لەمنداڵییەوە لەگوند لەنێوانیاندا هەبوو، باش یەكتریان دەناسی، سەرۆك باشی دەناسی، ئەویش بەهای مەزنی دەدایە سەرۆك، هیچ شتێك نەمابوو بۆ سەرۆكی نەكردبێت، لەم پێناوەشدا فیداكارییەكی مەزنی دەنواند، بۆیە سەرۆكیش لەنزیك خۆی دەیهێشتەوە. ئەو گروپی چەتەگەرانە بۆ ئەوەی سەرۆك بێكاریگەر بكەن، پێویستبوو پێشتر "حەسەن بیندال" بێكاریگەر بكەن، تاكو بتوانن خۆیان بگەیەننە سەرۆك، ئیدی بۆ ئەم مەبەستە "حەسەن بیندال"یان كردە ئامانج و بەئەنقەست و بەپیلان ئەو هەڤاڵەیان تەسفیە كرد، بۆ ئەوەی لەهەنگاوی دووەمیشدا خۆیان بگەیەننە سەرۆك و تەسفیەی بكەن. بۆ ئەم مەبەستە هەڤاڵ "حەسەن بیندال"یان شەهیدكرد.

# ڕۆحی سەرهەڵدان لەجوگرافیای گێژاوەکاندا...

**لەساڵی (١٩٩٠)دا؛ خۆرهەڵاتی ناوین ئاڵوگۆڕی گەرم بەخۆیەوە دەبینێت و دەبێتە سەرەتای زۆر گۆڕان و وەرچەرخانی مەزن، لەلایەك سوپای ئێراق وڵاتی کوێت داگیر دەکات. لەلایەکی دیکەشەوە بەگشتی لەخۆرهەڵاتی ناویندا شەڕ و پێکدادان لەئارادان، لەدۆخێکی وەهادا چوارەمین کۆنگرە (PKK) سازدەکرێت. خوێندنەوەی کۆنگرەی چوارەم بۆ ئەو ڕەوشەی ئەو کاتە لەئارادا بوو چیبوو و چۆن شیدەکردەوە؟ هەروەها کەشوهەوای نێو کۆنگرە چۆن بوو؟ بەگشتیش ئەو چەمك و مەیلانەی دەرکەوتن، ئەو ڕاسپاردە و بڕیارە سەرەکییانەی لە چوارەمین کۆنگرەدا وەرگیران چیبوون؟**

لەساڵانی (١٩٨٩ ـ ١٩٩٠)دا لەباکووردا سەرهەڵدانی گەل پێشکەوت، چوارەمین کۆنگرەش لەسەر بنەمای ئەو سەرهەڵدانانە سازدرا، سەرەتا سەرهەڵدان لە "نسێبین"دا دەستپێکرد، سێزدە چواردە هەڤاڵ لەچیای "باگۆك" شەهیدبوون، گەل تەرمی ئەو هەڤاڵانەیان بەرزکردەوە و خاوەندارێتیان لێکرد و دەوڵەت پەلاماری گەلی دا و گەلیش

لەدژی دەوڵەت دەستی بە سەرهەڵدان کرد، سەرهەڵدانێکی مەزن بەرپا بوو، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە پاشان لەزۆر شوێنی دیکە سەرهەڵدان پێشبکەوێت، لەناوچەی "جزیرە" و ناوچەکانی دیکە سەرهەڵدان بەرپابوو، ئەو سەرهەڵدانانە باوەڕی و مۆڕاڵێکی بەهێزی ئافراند و ئیرادەی گەلی بەهێزتر کرد، یەکێتی تەڤگەر و گەلی زیاتر تۆکمە و پێشخست، بەم سەرهەڵدانانە (PKK) لە کوردستاندا زەمینەی جەماوەریبوونی خۆی بەهێزتر کرد، ئیدی کاتێك کە کۆنگرەی چوارەم سازدرا لەسەر بنەمای بەرپابوونی ئەو سەرهەڵدانانە ئەنجامدرا.

بێگومان لەبەر ئەوەی ئەو سەرهەڵدانانە هەڵگیرسابوون، هوشیاری و باوەڕییەکی مەزن بەدیهاتبوو، تەڤلیبوونیش بۆ ریزی گەریلا زیاتر ببوو، تەڤگەری گەریلاش تۆکمە و بەهێزتر دەبوو و پێشدەکەوت. دیاربوو کەوا ئەگەر زەمینەی سەرهەڵدانەکان و تەڤگەری گەل زیاتر پەرەبسێنێت ئەوا گەریلا بەهێزتر دەکات، گەریلاش سەرهەڵدانەکان بەهێزتر دەکات. ئەمە لەهەموو روویێکەوە تەڤگەر پێشدەخات، ئیدی تەڤگەر لەتەواوی کوردستان بەرەو پێشەوە دەبات. ئەمە دەبینرا کە تەڤگەر تادەهات لەناو گەلدا بەهێزتر دەبوو، هەمیش لەبەشەکانی دیکەی کوردستانیشدا بەهێز دەبوو. ئیدی پێڤاژۆیەکە بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕۆیشت. ئەمە گرنگ بوو.

بێگومان چەمکی چەتەگەرێتی، هەندێك خراپیشی لەناو گەلدا کردبوو، لەژێر ناوی کوشتنی "جاش و سیخوڕ"دا، هەروەها بە سەرەڕۆیی و بەبێ پلان پەلاماری هەندێك لەگوندی جاشەکان درابوو، لەو پەلامارەدا هەندێك جاشیش کوژران، بەڵام لەگەڵ ئەو جاشانەشدا هەندێك کەس کە جاشیش نەبوون کوژران، تەنانەت هەندێك ژن و منداڵیش کوژرا بوون. ئەمە لەگەڵ خۆیدا کاریگەری خراپی دروست کردبوو. ئەگەر رێ لەبەردەم ئەمە نەگیرێت ئەوا زەرەر لەتەڤگەریش دەدات. بۆیە پێویستبوو رێ لەبەردەم ئەو پراکتیکە چەتەگەرییەش بگیرێت و ئەو تەخریباتەی لەگەڵ خۆیشیدا هێناویێتی بسڕێتەوە و بەلاوە بنرێت. ئەگەر بێتو ئەمجۆرە پراکتیك و تەخریباتە نەهێڵرێت ئەوا گەریلا و سەرهەڵدان بەهێزتر دەبن، تەڤگەر لەهەموو روویێکەوە تۆکمە دەبێت و پێشدەکەوێت، ئیدی کۆنگرەی چوارەم لەسەر زەمینەیەکی بەمشێوەیە سازدرا.

دەوڵەتی تورکیش هەوڵی دەدا؛ چەمکی چەتەگەریێتی لە کۆنگرەدا بەسەربخات؟ ئەوانیش وەها کاریان دەکرد. چەمکی چەتەگەریێتی لەسەر چ بنەمایەك پێشدەکەوێت؟ لەسەر چەمکی فیودالێ ـ لیبرال پێشدەکەوێت، ئەم دوو خەتە لەناو تەڤگەردا دەبووە زەمینە بۆ تەشەنەسەندنی چەتەگەریێتی. بۆیە پێویست دەکات ئەو چەمکانە بەهێز بکەن، تاکو چەمکی چەتەگەریێتی لەکۆنگرەدا بەهێز ببێت و باڵادەستی خۆی بسەپێنێت... چۆن ئێمە ئامادەکاری کۆنگرەمان دەکرد دەوڵەتیش ئامادەکاری دەستێوەردانی کۆنگرەی دەکرد. دەوڵەتیش لەرێگەی "**محەممەد شەنەر**"ەوە ئامادەکاری ئەمەی دەکرد، تاکو "**محەممەد شەنەر**" بتوانێت باڵادەستێتی خۆی لەکۆنگرەدا بنوێنێت. ئێمە لەوە تێگەیشتین و دەمانبینی. ئیدی پێویستبوو کە رێ لەبەردەم ئەمەش بگرین، بۆ ئەوەی کۆنگرە بتوانێت رۆڵی خۆی بگێرێت و بەسەرکەوتوویی ئەنجامبدرێت و بارودۆخەکە بەرەو پێشەوە ببات.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ ئێراق موداخەلەی کوێتی کردبوو، لەئاستی نێودەوڵەتیدا، ئەمریکا مودخەلەیەکی پێشدەخست، هەرچەندە موداخەلەکەی ئەمریکا بە بەهانەی داگیرکردنی کوێت لەلایەن ئێراقەوە بوو. بەڵام لەبنەڕەتدا ئەمە ئەسڵی مەسەلەکە نەبوو، بەڵکو ئەمریکا دەیخواست موداخەلەیەکی مەزن بۆ خۆرهەڵاتی ناوین پێشبخات، بۆ ئەوەی بتوانێت باڵادەستێتی خۆی لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین دروستبکات. بۆ ئەم مەبەستە بوو، چونکە سۆڤییەت تێکدەچوو، ئەمریکا دەیخواست لێی سوودمەند ببێت و باڵادەستێتی خۆی لەدونیادا دروستبکات. وەکوتریش بەتێکچوونی سۆڤییەت کێشە و گرفتی سەرمایەداری و ئەمریکا زۆر زیاتر ببوو، پێویستبوو کە کێشەی سەرمایەداریش چارەسەر بکات تاکو بتوانێت هەم بۆ ئەوەی سیستەم بەردەوام ببێت و هەمیش سەرۆك خۆی بۆ سیستەم بەردەوام بکات. چونکە بە پەرشوبڵاوبوونی سۆڤییەت، ئەوروپا دەیخواست خۆی لەژێر کۆنترۆڵی ئەمریکا دەربخات، ئەوروپا و ژاپۆنیش بە ئابووری و بە پەترۆڵ پەیوەستی خۆرهەڵاتی ناوینن. ئەگەر ئەمریکا ئەو وزەیەی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، ئەوا ئەوروپا و ژاپۆنیش ناتوانن خۆیان لە ئەمریکا بپچڕێنن و ببنە هێزێکی مەزن، دیسان ناچاری ئەمریکا دەبنەوە، ئەو کاتە ئەمریکا دەتوانێت هەم باڵادەستێتی خۆی بسەپێنێت، هەمیش کێشە و گرفتەکانی سەرمایەداری چارەسەر

بکات، بۆیە خۆرهەڵاتی ناوینی بۆ خۆی بەبنچینە وەرگرت و موداخەلەی لەسەر ئێراق پێشخست.

ئیدی کۆنگرەی چوارەم لەرەوشێکی وەهاشدا سازدرا. بێگومان ئەو جەنگەی کەنداو هەم بۆ کۆنگرە دەرفەتێکی دەرەخساند، هەمیش مەترسی دەخستە سەر کۆنگرەوە. پێویستبوو کۆنگرە سازبدرابایە، بەر لەوەی دەستێوەردان ئەنجامبدرێت، چونکە دەستێوەردان لەرۆژەڤدا بوو، دۆخەکە دۆخێکی شەڕ بوو، تورکیاش ئامادەکاری دەکرد، چونکە "تۆرگۆت ئۆزاڵ"یش ئەو کاتە دەیخواست تورکیا بکەوێتە ناو ئێراقەوە، دەیخواست لەسەر ئەو بنەمایە لەگەڵ ئەمریکادا پەیوەندی خۆی پێشبخات، دەکەوێتە ئێراق یان نا دیار نەبوو، رەوشێکی وەها هەستیار و جەنگ هەبوو، مەترسیداریش بوو، بۆیە پێویست بوو کۆنگرە زووتر کۆببێتەوە، بەر لەوەی شەڕ بەرپا ببێت، بتوانێت رەوشەکە هەڵبسەنگێنێت و بڕیار وەربگرێت کە ئەگەر رەوشێکی شەڕ دەرکەوت، تەڤگەر بتوانێت بەئامادەکارییەوە بکەوێتە ناو شەڕەوە و لەژێر مەترسیدا نەبێت. تەنانەت ئەگەر دەرفەتیش رەخسا بتوانێت لەو دەرفەتانەدا توانستی خۆی بئافرێنێت. کۆنگرە لەرەوشێکی بەوجۆرەدا و لەسەر ئەو زەمینە و ئاڵوگۆڕانەدا سازدرا. واتا زەمینەیەکی خراپ نەبوو، لەدۆخی جەنگدا بوو، پێویستبوو تەڤگەر بگەیشتبایە بڕیاری تۆکمە و بەهێز.

بۆ ئەوەی کۆنگرە بەساخی و بەسەرکەوتوویی سازبدرێت، سەرۆك زۆر ئامادەکاری کردبوو، لەسەر ئەو ئامادەکارییانە کۆنگرە سازدرا. کاتێك کە ئێمە کەوتینە کۆنگرەوە ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی کەوا لەوڵاتدا پراکتیکی بەڕێوە دەبرد، ئێمە لەئەرکمان وەرگرتبوون. بۆچی؟ چونکە لەژێر بەرپرسیارێتی ئەو بەڕێوەبەرایەتییەدا. لێرەدا چەتەگەرێتی تەشەنەی سەندبوو، چەتەگەرێتیش زۆر خراپی کردبوو، پێویستبوو ئەو کەسانەی لەو پراکتیك و خراپیانە بەرپرسیارن حیساب و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت. لەبەر ئەمە ئەوانەمان بێ ئەرك کرد و ئەوانمان خستەژێر لێکۆڵینەوەوە. بەرپرسیاریش ئەو کاتە "بۆتان" و "ئەبوبەکر" و "شەمدین" بوون و ئەوانەمان خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە، بۆ ئەوەی کۆنگرە لەسەر بنەمای ئاکامی ئەو لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوانە بگاتە ئامانجی خۆی. چونکە ئەگەر تۆ دەخوازیت کۆنگرەی چوارەم بگاتە

ئامانجی خۆی، پێویستە کۆنگرە چەمکی فیوداڵ - پیلانگێڕی - لیبرال و تەخریباتەکانی روونبکاتەوە و حیسابی ئەوە بپرسێت، تاکو کۆنگرە لەسەر خەتی خۆی پێکبێت و ئەو ئامانجەشی کە کۆنگرە لەپێش خۆی دانابوو پێی بگات. ئەگەر وانەبایە ئەوا ئەگەر کۆنگرەش سازبدرابایە بێسوود بوو.

لەبنەڕەتدا ئامانجی کۆنگرەی چوارەم ئەوەبوو کە چەمکی فیوداڵی - پیلانگێڕی - لیبرال و تەخریباتەکانی و بەرپرسیارەکانی دەربخاتەڕوو و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت، بۆ ئەوەی بتوانرێت کۆنگرە لەسەر خەتی تەڤگەر سازبدرێت، ئەگەر ئەمە ئەنجامدرا ئەوا کۆنگرە بەئامانجی خۆی دەگات. ئەو لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوانەمان بۆ ئەو مەبەستە پێشخست، لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوانەمان پێشخست، ئەوا توانیمان راستینەی ئەو خەتە و تەخریباتەکانیانمان ئاشکرا کرد. بەمشێوەیە کەوتینە کۆنگرەوە. بۆیە کۆنگرە بە سەلامەتی و سەرکەوتوویی ئەنجامدرا.

"**محەممەد شەنەر**" لەکۆنگرەدا یاری خۆی دەکرد، خیتابی چەمکەکانی "فیوداڵی پیلانگێڕ" و "لیبرال"یشی دەکرد. بۆ ئەوەی هەردوو ئەو چەمکانەش بخاتە خزمەتی خۆیەوە، تاکو بتوانێت ئەنجامگیر ببێت. بێگومان ئێمە لەکۆنگرەدا رەوشی "**محەممەد شەنەر**"یشمان ئاشکرا کرد، ئەو گەمانەی دەشیکرد ئاشکرا کرا، بۆیە "**محەممەد شەنەر**" نەیدەتوانی باڵادەستی خۆی لەسەر کۆنگرە بنوێنێت، بەپێچەوانەوە کۆنگرە باڵادەستی خۆی لەسەر "**محەممەد شەنەر**" نواند، لە کەشوهەوای نێو کۆنگرەدا رەخنەدان لە "**محەممەد شەنەر**" خواسترا. گووترا: "یان تۆ رەخنەدانی خۆت دەدەیت یان ناتوانیت لە کۆنگرەدا بمێنیتەوە...". ئیدی "**محەممەد شەنەر**" بینی کە لەکۆنگرەدا رەوشی ئەو ئاشکرا بووە و ناتوانێت شتێك بکات، هەموو بەشداربووانی کۆنگرەش لەسەر خەتی تەڤگەر و لەسەر خەتی کۆنگرە کۆبوونەتەوە، بۆیە شتێکی ئەو بیکات نەماوە، لەبەر ئەوە هەنگاوی بۆ دواوە هاوێشت و رەخنەی خۆیشی دا، بۆ ئەوەی بتوانێت لەکۆنگرەدا و لەنێو تەڤگەردا بمێنێتەوە. بەو ئامانجەی حیساباتی خۆی لەدوای کۆنگرە بێنێتەدی، ئیدی ئیفلاسی کرد. زۆر پێداگریشی بکردایەات دەکەوتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. ئیدی نەیتوانی شتێك بکات. مەگەر لەدوای کۆنگرەوە حیساباتی خۆی بکات، ئەویش کەوتە رەوشێکی بەمجۆرەوە.

لێرەدا كۆنگرە چەمكەكانی "فیودالی پیلانگێڕ" و "لیبرال"ی دەرخستە روو و ریسوای كرد و لەسەر ئەو بنەمایەش چەتەگەرێتی و ئەو پراكتیكەی دەركەوتبوو ریسوا بوو. بۆ ئەوەی ئەو تەخریباتانە بەلاوە بنرێت بڕیاردرا كە بۆ گەل بەیاننامەیەك دەربخرێت و داوای لێبوردن لە گەل بكرێت، هەمیش بۆ جاشەكانیش بەیاننامەیەك دەربخرێت و خیتابی ئەوان بكرێت؛ بۆ ئەوەی چیدی تەخریبات نەكەن، تەنانەت بۆ ئەو خراپەكارییانەی كە خەتی چەتەگەرێتی ئەنجامی دابوو، لەسەر ئەمەش لەسەر ناوی رێكخستن رەخنەدانی خۆمان دا و گووتمان؛ ئەوەی كراوە هێڵی تێكۆشانی ئێمە نییە، هەرچەندە بەناوی ئێمەشەوە روویداوە، بەلام ئەمە رێبازی ئێمە نییە و لەگەڵ رێبازی ئێمەدا یەكانگیر نابێتەوە. ئەمەش كاریگەرییەكی ئیجابیانەی لەسەر جاشەكان كرد و لەتوندوتیژی خاویكرنەوە، وەكو رابردوو تەفگەریان بۆ خۆیان بەمەترسیدار نەدەبینی، شانبەشانی دەوڵەت بەتوندی نەدەهاتنە سەر تەڤگەر، لەمەش تەڤگەر سوودی بینی، ئەو داوای لێبوردنەی بۆ گەل كردمان باوەڕی بە گەل بەخشی، بینیان كە ئەو نزیكبوونەوانەی كرابوو هی تەڤگەر نییە، ئەگەر بەناوی تەڤگەریشەوە كرابن، بەلام هی تەڤگەر نین و تەڤگەر مەحكومیان دەكات و لێپرسینەوە لەسەر ئەو كارانە دەكات، ئەمەش باوەڕی زیاتری بە گەل بەخشی.

لەلایەكی دیكەوە؛ یەكێك لەو خاڵانەی كەوا لەكۆنگرەدا راوەستەمان لەسەریكرد ئەوەبوو كە چۆن بتوانین گەریلا لەرووی چەندایەتیی و چۆنایەتییەوە مەزن بكەین؟ چۆن ئەو ناوچانەی كەوا گەریلا تێی نەكەوتووە ئێمە گەریلای تێدا جێگیر بكەین؟ چۆن ئەو سەرهەڵدانانەی هەڵگیرساون مەزن و بەرفراوانتریان بكەین؟ بۆ ئەوەی یەكدی تەواو بكەن چۆن بتوانین پەیوەندی نێوان گەریلا و ئەو سەرهەڵدانانە بەهێز بكەین؟ لەسەر ئەو مەسەلانە بڕیارمان وەرگرت. ئیدی بڕیارماندا كەوا ئەو هەرێم (ئەیالەت)انەی كەوا گەریلا هیچ نەچووە گەریلای تێدا جێگیر بكەین، تاكو بتوانین لەتەواوی باكووری كوردستاندا تەڤگەری گەریلا پێشبخەین. هەندێك هەرێم و گۆڕەپان بۆ ئێمە سەرەكی بوون، بەلام ئەوەی كە سەرەكیش نەبوو، پێویستبوو گەریلای بۆ بنێرین، بڕیارمان لەسەر ئەمە وەرگرت. هەڵبەتە دوای كۆنگرەش ئەو هەنگاوانەمان هاوێشت.

سەبارەت بە باشووری کوردستانیش؛ ئێمە دەمانبینی کەوا سەددام گورزی بەردەکەوێت، تەنانەت لەوانەیە رژێمی سەددام بەتەواوی بڕووخێت. بۆیە باوەری ئێمە وابوو کە پێویستە لەباشووردا گەل ئامادە بکرێت، ئێمە لەم رووەوە بڕیاریشمان وەرگرت. چونکە پێمان وابوو کەوا رژێمی سەددام گورزی بەردەکەوێت، بۆیە پێویستە گەل بخەینە نێو جموجۆڵ و تەفگەرەوە، تەنانەت ئەگەر پێویستبوو لەباشووردا هێزی گەریلاش بخەینە جموجۆڵەوە و هاوکاری گەل بکەین تاکو گەلەکەمان لەباشووردا بتوانێت لەم دۆخە سوودمەند بێت و خۆی رزگار بکات. سەرۆکیش لە"راپۆرتی سیاسی" خۆیدا هەڵسەنگاندنی لەم بارەیەوە کردبوو، پێویستبوو لەپراکتیکیشدا بۆ ئەم مەبەستە تەدبیریشمان وەرگرتبایە و بڕیارمان وەرگرتبایە. ئێمە لەم رووەوە هەندێك بڕیاریشمان وەرگرت. ئیدی کۆنگرە بەمجۆرە کۆتایی پێهات.

دوای کۆنگرە؛ لەسەر بڕیارەکانی کۆنگرە دەستمان بەهەنگاو هاوێشتن کرد. لەباکووردا، لەهەندێك لەو هەرێمانەی کە نوێبوون و پێویستبوو هێزەکانمان تێیدا جێگیر ببن، بۆ ئەو مەبەستە هەندێك هێزمان ئامادەکرد و بەرەو ئەو گۆڕەپانانەمان ناردن. ئێمە دەستمان بە بەلاوەنانی شوێنەوارەکانی ئەو خراپەکاریانە کرد روویدابوو. بەقورسایی ئێمە بە باکوورەوە مژوول بووین، بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوانە بهاوێژین تاکو بتوانین لەسەر باشووریش راوەستە بکەین. چونکە ئەو هەڤاڵانەی تەڤلی کۆنگرە ببوون پێویستبوو بچنە هەرێم و گۆڕەپانەکانی خەبات، کۆبوونەوەمان لەگەڵ ئەو هەڤاڵانە سازدا، ئەو هێزانەی کە بۆ ناوچە و هەرێمەکان دەچوون ئەوانەمان ئامادەکرد و هەموویانمان خستنە جموجۆڵەوە.

هەر لەدوای کۆنگرەوە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی "محەممەد شەنەر، ساری باران، فایەق" هەبوو، لەلایەکەوە بەمەوە مژوول بووین. لەلایەکی دیکەشەوە هەندێك هەڤاڵمان لەباشوور خستە نێو جموجۆڵەوە، پێشتر پەیوەندی ئێمە لەباشوور لەگەڵ هەندێك کەس هەبوو، وەك"سادق عومەر". ئێمە هەڤاڵانمان ناردە لای ئەوان، بۆ ئەوەی ئەوان ئامادەکاری بکەن، چونکە ئێمە دەمانگووت کە:" موداخەلە لەسەر ئێراق دەکرێت، ئەگەر موداخەلە کرا لەوانەیە رژێمی سەددام بەتەواوی لەناوبچێت و بڕووخێت. کە موداخەلەکە دەستیپێکرد، پێویستە ئەوانیش ئامادەبن بۆ ئەوەی بتوانن لەهەندێك

ناوچەدا لەدژی رژێمی ئێراق بکەونە نێو جموجوڵەوە، کە لەوانەیە بتوانن گەلیش بخەنە نێو سەرهەڵدانەوە، بەمەش دەتوانن هەندێك ناوچەی باشووری کوردستانیش رزگار بکەن، ئەگەر ئەمەش بێتەدی ئەوا دەتوانن سەرتاپای باشووری کوردستانیش رزگاربکەین" لەسەر ئەو بنەمایە گووتمان:"با هەڤالان لەگەڵیاندا قسە بکەن" هەڤالان چوون قسەیان لەگەڵدا کردن، ئەوانەش هەندێك ئامادەکاری بەمجۆرەیان پێشخست، هەندێك هەڤاڵیشیان لە ئێمە خواست، ئێمەش هەندێك لە هەڤاڵانیشمان بەچەکەوە بەنهێنی نارده لای ئەوان.

کاتێك کە بینیمان موداخەلەی سەر کوێت بوو و ئێراق لە کوێت گورزی بەردەکەوێت و هێزی خۆی دەکشێنێتەوە، ئەو کاتە بە "سادق عومەر" و ئەوانمان گووت:" بکەونە نێو جموجوڵەوە". "سادق عومەر" و ئەوانیش لە "دەرکار" و ئەو ناوچەیە دەستیانکرد بە دەرخستنی هێزەکانی ئێراق، ئیدی جموجوڵێکی بەمجۆرە لەو ناوچەیە دەستپێکرد. هەڵبەتە زۆر درێژەی نەکێشا لەباشوور لەزۆر ناوچەدا سەرهەڵدان بەرپابوو و سەرکەوتن بەدەستهات و رژێمی ئێراق لەباشووردا نەما...

**ئەو کاتە هەم لەباکوور و هەمیش لەباشووردا سەرهەڵدانی گەل هەبوو، وەکو ئێوە باستانکرد گەل و گەریلا لە سەرهەڵدانەکاندا یەکتر تەواو دەکەن، ئەو کاتە ئاسۆییەکی چۆن بۆ کێشەی کورد هەم لەباکوور و هەمیش لەباشوور دەبینرا؟ چونکە سەرۆك ئاپۆ لە"راپۆرتی سیاسی" پێشکەشکراوی کۆنگرەی چوارەمدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر گەلی کورد لەباشوور بتوانن یەکێتی خۆیان پێکبێنن ئەوا دەرفەتی ئەوە دێتەدی کە ستاتۆیەکی سەربەخۆش ئاوا بکەن، لەمەش کەمتر، ئەگەر ئەمەش نەبێت دەتوانن**

**ستاتۆیەکی فیدراڵیش بۆخۆیان ئاوابکەن... کەواتە ئەو کاتە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنێکی بەرفراوان بۆ ڕەوشەکە هەیە...**

هەڵبەتە هەم لەباکوور خەبات و تێکۆشان مەزن ببوو، هەمیش لەباشوور سەرهەڵدان لەپێشکەوتن دابوو، لەزۆر ناوچەی باشووری کوردستاندا دەوڵەت نەمابوو، هێزەکانی دەوڵەت تەسفیە کرابوو، ئەو شەڕ و سەرهەڵدانانەی باکوور و شەڕی گەریلا باوەڕپیەکی بەهێزی دەدایە باشوور، لەباشووریش ئەو سەرهەڵدانانەی بەرپابوون کاریگەری خۆی لەسەر باکوور دەکرد، بەمشێوەیە یەکدیان تەواو دەکرد. بۆیە هەم باکوور و هەم باشوور لەنێو پێشکەوتن دابوون. لەو قۆناخەدا تەڤگەری (PKK) کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر تەواوی کوردستان دەکرد. ئیدی تەڤگەری کورد لەباکوور لەپەرەسەندن دابوو، لەبەشەکانی دیکەشدا ڕۆڵی خۆی دەبینی و پێشدەکەوت. ئەو کاتە ئێمە دەمانخواست کەوا لەنێوان باکوور و باشووردا پەیوەندی و ڕێککەوتنێك بەرەو پێشەوە ببەین، ئەو پێڤاژۆیەی پێشکەوتووە زیاتر بەرەو پێشەوەی ببەین. چونکە دەرفەت و توانستی ئەوە دەرکەوتبووە پێش و یەکدیان تەواو دەکرد و یەکدیان بەهێز دەکرد، هەم باکوور هەمیش باشوور لەپێشکەوتن دابوون. بێگومان (PKK) لەباکوور و باشووریش ڕۆڵێکی مەزنی دەبینی، تادەهات (PKK)ش لەپێشکەوتن دابوو. چونکە (PKK) لەباشووریشدا گەلی هوشیار دەکردەوە، ڕێکخستنی خۆی پێشدەخست، ئەمە هەم داگیرکەران بەمەترسیان دەبینی، هەم ئەمریکاش بە مەترسی دەبینی، بینیان ئەگەر ڕێ لەبەردەم ئەو پێشکەوتنە نەگیرێت ئەوا حاکمیەتی (PKK) دێتە ئاراوە. ئەگەر (PKK)ش باڵادەست بێت ئەوا بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و داگیرکەران تێکدەدات.

لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا ئەمریکا ڕێگەی لەبەردەم ڕژێمی سەددام کردەوە، ڕژێمی سەددامیش هێرشی بردەوە سەر باشوور، گەل و هێز و لایەنەکانی باشوور بۆ ئەم هێرشە ئامادە نەبوون و مەزندەی ئەوەشیان نەدەکرد کە هێرشێکی بەمجۆرە ڕوو‌بدات، چونکە زۆر باوەڕیان بە ئەمریکا هەبوو، دەیانگووت:" ئەمریکا ڕێگە بە سەددام نادات جارێکی دیکە سەددام بێتەوە سەرمان. لەلایەکی دیکەشەوە هێزەکانی باشوور سەرخۆش

ببوون، چونکە راپەرین بەرپابببوو و سەرکەوتببوون، دەوڵەتی ئێراق لەباشوور نەمابوو، بۆیە لەنێو سەرخۆشییەك دابوون. ئیدی خۆیان رێکخستە نەدەکرد، گەلیان رێکخستە نەدەکرد، گەلیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر هێرشێکی ئێراق ئامادە نەدەکرد، چونکە ئەو سەرهەڵدانەی بەرپاببوو و ئەو ئەنجامانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی بەشێوەیەکی رێکخستەیی بەدینەهاتبوو، بەهێزی حزبەکانیش دروست نەببوو، لەوانەیە رۆڵی هەندێك حزب هەبووبێت، بەڵام لەبنەڕەتدا گەل خۆی رابوو، جاشەکانی باشوور رابوون، بەو شێوەیە راپەڕین بەئەنجام گەیشتبوو. ئەگەر ئەمریکا موداخەلەی مەسەلەی کوێتی نەکردبایە و گورزی لە رژێمی سەددام نەدابایە، باوەڕی و متمانەی بەکوردان نەبەخشیبایە، ئەوا مەزەندە ناکەم کورد لەباشوور و حزبەکانی باشوور هیچ کاتێك هەنگاوێکی بەمجۆرەیان هاوێشتبایە، نەشیاندەهاوێشت. هەڵبەتە دوای شکستی ساڵی (١٩٨٨) هێز و لایەنەکان لەباشوور نەمابوون، ئیرادەیان شکابوو، ئەگەر موداخەلەی ئەمریکا نەبووایە، ئەمریکا باوەڕی بەئەوان نەدابایە، مومکین نەبوو ئەو حزبانە جارێکی دیکە لەباشوور کار و خەباتیان بکردبایە، ئیدی دەرفەتێکی مێژوویی رەخسا و گەل راپەڕی. هەروەها ئەو هێزانە بەهەرزانی ئەنجامێکیان بەدەستخستبوو، لەبەر ئەمە راپەڕینەکە زێدە رێکخستنی نەبوو، گەلیان رێکخستە نەکردبوو، لەنێو سەرخۆشییەك دابوون. کاتێك کە رژێمی سەددام هێرشی کرد، لەبەر ئەوەی ئامادە نەبوون، شۆك بوون. بۆیە دەستبەرداری هەموو شتێك بوون و لەهەوڵی ئەوەدابوون چۆن خۆیان رزگار بکەن. هەندێکیان چوونە ئێران و هەندێکیش چوونە تورکیا، هەندێکیش لەسەر سنوورەکان خۆیان جێگیرکرد و گیرسانەوە، ئەو کاتە هێزەکانی سوپای ئێراق پەیتا پەیتا بەدوای کۆچی گەلدا شاڵاویان دەهێنا و تاقیبیان دەکرد و دەیانخواست گورزێکی مەزن لە گەلیش بدەن، چونکە تورکیاش سنووری داخستبوو، ئێمە ئەو کاتە لەهەندێك شوێن جێگیر بووین بۆ ئەوەی بتوانین گەل بپارێزین. بۆ نموونە؛ ناوچەی "حەفتانین" و "چوقورجە" و ئەو شوێنانەمان گرت، هەندێك لەو جێگایانەمان گرت و نەمانهێشت سوپا بێت و خۆی بگەیەنێتە گەل. تەنانەت سوپای ئێراق هەندێك سەنگەریشی لەناوچەکەدا دروستکردبوو، ئێمە هێرشی سەر ئەو سەنگەرانەشمان کرد و نەمانهێشت و هەندێك سەربازی ئێراقیشمان بە دیل گرت. ئەو سەربازانەی کە بەدیلیشمان گرتبوون

لەوێ تەسلیمی گەلان کردن، ئەمەش مۆڕاڵێکی مەزنی دایە گەل. بینی کەوا (PKK) خاوەنداریێتی لە گەل دەکات و ناهێڵێت سوپای ئێراقی بێت گەل بگرێت و بیبات و بیکوژێت، ئەمەش لەناو گەلەکەمان لەباشوور ڕێز و حورمەتێکی مەزنی بۆ (PKK) دروستکرد. بۆیە تا دەهات (PKK) لەناو گەلەکەماندا لەباشوور بەهێز دەبوو. ئەمەش بۆ ئەمریکا و تورکیا مەترسیدار بوو، پێویستە ڕێ لەبەردەم ئەمە بگیردرێت، ئیدی پاشان لەسەر ئەو بنەمایە ئەمریکا و تورکیا دەستبەکار بوون کە؛ چۆن بتوانن کاریگەری (PKK) لەباشوور کەم بکەنەوە و ڕێگیری لە (PKK) بکەن، چۆن لەبەرامبەر (PKK)دا بتوانن هێزەکانی دیکە بەهێز بکەن. ئەوانە ئەمەیان بەبنچینە وەرگرت.

ئیدی پاشان ڕێککەوتنی نێوان تورکیا و (پ د ك ـ ی ن ك) پێشکەوت، پەیوەندی نێوان ئەمریکا و (پ د ك ـ ی ن ك)ش پێشکەوت و بەهێزتر بوو، هەمووشیان کاریان بۆ ئەوە دەکرد کە (PKK) لەباشوور کاری ڕێکخستنی خۆی نەکات، تەنانەت هەوڵیاندەدا ڕێگیری لەو ڕێکخستنەش بکەن کە لەباشووردا پێشیخستبوو، خستیانە ژێر فشار و گوشارەوە، بۆ ئەوەی بێکاریگەری بکەن. ئەمەش وایکرد پەیوەندی نێوان باکوور و باشوور بەهێز ببێت، ئەمە ڕێگیری لەهەندێك پەرسەندن کرد. لەکاتێکدا لەدژی ئەوە نەبووین کە (پ د ك ـ ی ن ك) پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئەمریکا و تورکیا دروستبکردبایە، بەڵام ئەگەر پەیوەندی خۆیان لەگەڵ (PKK) و باکووریشدا دروستبکردبایە، ئەوا دووژمنایەتی نێوان (PKK) و ئەوان نەدەهاتە ئاراوە، (PKK) نەیدەخواست (پ د ك ـ ی ن ك) لەناو ببات، (PKK) ئامانجێکی بەمجۆرەشی نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە (PKK) دەیخواست پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەوانیشدا باش و تۆکمە بکات، دەیخواست لەگەڵ گەلەکەشمان لەباشوور پەیوەندی خۆی باش و تۆکمە بکات، دەیخواست لەباشووردا گەل هوشیار بکاتەوە، ڕێکخستەی بکات. چونکە ئەو بێ ڕێکخستنییەی هەبوو (PKK) بە مەترسیداری دەبینی، چونکە (پ د ك ـ ی ن ك) گەلیان ڕێکنەخستبوو، کاتێك کە ڕژێمی سەددام هێرشی کرد شۆکێکی مەزن و مەترسییەکی مەزن هاتەئاراوە، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە مەترسییەکی بەمجۆرە ڕوونەداتەوە (PKK) دەیخواست لەباشووردا کاربکات و ڕێکخستنی خۆی مەزن بکات، گەل ڕێکخستە و هوشیار بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە کاریدەکرد، نەك بۆ ئەوەی (پ د ك ـ ی ن ك) لەناو ببات. (PKK) هیچ کاتێك ئامانجێکی

وەهای نەبووە، دەیخواست پەیوەندی نێوان باکوور و باشوور بەهێز بکات، دەیخواست تەڤگەری باکوور بخاتە خزمەتی باشوور و تەڤگەری باشووریش بخاتە خزمەتی باکوورەوە، یەکێتی باکوور و باشوور بەرەو پێشەوە ببات، بۆ ئەوەی یەکێتی کوردان و تەڤگەری ئازادی و دیموکراسی بەرەو پێشەوە ببات، بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر بکات. (PKK) ئەمانەی بەبنەما وەرگرتبوو، بەڵام دەوڵەتی داگیرکەر و ئەمریکا خەت و ڕێبازی (PKK)یان بەمەترسی دەبینی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان و نەیاندەخواست پەیوەندی (PKK) لەگەڵ خەڵکی باشوور و (پ د ك ـ ی ن ك) پێشبکەوێت و دەیانگووت:" ئەگەر پێشبکەوێت ئەوا (PKK) لەباشووردا باڵادەست دەبێت، ئەمەش بۆ ئێمە مەترسیدارە، پێویستە ئێمە ڕێگیری لەمە بکەین، هەموو کارێکی خۆیان لەسەر ئەو بنەمایە پێشخست، (پ د ك ـ ی ن ك)شیان لەدژی (PKK) خستە جموجۆڵەوە. بۆ ئەوەی بتوانن کاریگەری (PKK) لەباشوور بشکێنن، ئیدی لەبەر ئەمە، ئەو ئامانجەی ئێمە لەپێش خۆمان دامانئابوو پێشنەکەوت...

**لەو قۆناخەدا؛ لەسەرەتای نەوەدەکاندا کۆنفرانسێکی زیندانییەکان سازدەدرێت. ئەمەش جاری یەکەم بوو کۆنفرانسێکی بەمجۆرە سازبدرێت، ئەو کۆنفرانسە بە چ ئامانجێك سازکرا و چ ئەنجامێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا؟**

کۆنفرانسی زیندانییەکان لە **"ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز"** سازکرا، تەواوی ئەو هەڤاڵانەی کە لە زیندان دەرچووبوون بەشدارییان لەو کۆنفرانسەدا کرد. کۆنفرانسەکە راوەستەی لەسەر ئەوە دەکرد کە کێشە و گرفتی ئەو هەڤاڵانەی لە زینداندا دەرچوون و ئەوانەش کە لە زینداندا ماون چییە؟ ئەو کۆنفرانسە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە و گرفتانە بوو. چونکە لە زیندانەکاندا زۆر کادیری ئێمە هەبوو، هەندێکیش لە زیندان دەرکەوتبوون، چ ئەوانەی دەرکەوتبوون و چ ئەوانەش کە لە زیندانەکاندا مابوون، لەهەموو ڕوویێکەوە لەچەمکی پارتی بەدوور کەوتبوونەوە، کاریگەری داگیرکەران لەسەر

زیندانەکان دروستببوو، هەندێك چەمك و تایبەتمەندی تەشەنەی سەندبوو، ئەمەش کادیرانی لەهەندێك رووەوە لاواز کردبوو.

ئیدی ئێمە چیبکەین بۆ ئەوەی ئەو چەمکە چەوتانەی لەنێو کادیرانی زینداندا تەشەنەی کردووە بەلاوەی بنێین و نەیهێڵین؟ ئێمە چۆن یەکێتی نێوان ئەو کادیرانە و پارتی دروست بکەینەوە؟ بۆ ئەوەی بتوانین ئەو کادیرانە بخەینەوە خزمەت تەفگەر، ئەمە زۆر گرنگ بوو. چونکە زۆر لە کادیران لە زیندان دەرکەوتبوون و بەرخۆدانێکی مەزنیان لە زیندانەکاندا کردبوو و شەهیدبوون روویدابوو، گەلێك ئێشن و ئەشکەنجەیان بینیبوو. لەقۆناخێکدا لە زیندانەکاندا نوێنەرایەتی تەڤگەریان کردبوو، رەنجێکی مەزنیشیان هەبوو، لەهەمانکاتیشدا چەندین کێشە و گرفتیان هەبوو. ئەوانەی کە دەردەکەوتن نەیاندەتوانی خۆیان لەگەڵ پارتی ئاوێتە بکەن و بگونجێنن و یەکێتی خۆیان لەگەڵ پارتیدا بێننەدی. تەنانەت گوزارشتیان لەهەندێك چەمکی مەترسیداریش دەکرد، بۆیە پێویستبوو ئەو گرفتانەیان چارەسەر بکەن و لەگەڵ پارتیدا خۆیان بگونجێنن تاکو بتوانن رۆڵی خۆیان بگێڕن. ئەم کۆنفرانسەش بۆ ئەو مەبەستە بوو.

بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی باش هەبێت دەتوانم نموونەیەکیش لەم بارەیەوە بهێنمەوە؛ هەندێك لەهەڤاڵان لەزیندان دەرکەوتبوون، من لەچیای "گابار"ەوە بەبێتەل (لاسلکي) قسەم لەگەڵیاندا کرد، ئەو هەڤاڵانە دەیانگووت:" ئەگەر ئێمە بەم حاڵەی خۆمانەوە بچینە نێو سوپای تورکەوە دەتوانین سوپای تورکیاش تێك بدەین" من پێمگووتن:" کەواتە ئێوە خۆتان بەمشێوەیە دەدوێن و راستینەی خۆتان دەبینن، پێویستە ئێوە کێشەکانی خۆتان لەرێگەی پارتییەوە چارەسەر بکەن، ئیدی پارتی تێك مەدەن" بۆچی؟ چونکە لە زیندانەکاندا لەژێر وەحشیەتێکی مەزندا دەژیان، بەردەوام و رۆژانە سوپای تورك لەکاتێکی دیاریکراودا هەڵیاندەستاندن و کۆبوونەوەی بەیانیان و ئێواران (تعداد)یان پێدەکردن و رێسا سەربازییەکان بەوان جێبەجێ دەکرد. لەبەر ئەوەی دووژمن لەزینداندا بەزۆر ئەمانەی بەوان دەکرد، کاردانەوە و رکوکینێکی ئەوان لەبەرامبەر یاسا و رێسای سەربازی نێو هێزی گەریلاش دروستببوو، ئەمەش چەمکێکی هەڵەی لەلای ئەوان پێشدەخست. کاتێك کە چوونە ئەکادیمیاش لەدژی دیسپلین رادەوەستان. ئەمە لەکاتێکدا دیسپلینی نێو ئەکادیمیا دیسپلینی پارتی بوو، هی ئەوان

خۆیان بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی سوپای رژێمی تورکیا دیسپلینێکی بەگوێرەی خۆی لەسەر ئەوان سەپاندبوو، ئەوانیش بەردەوام لەدژی ئەوە راوەستابوون. ئیدی راوەستان لەدژی دیسپلین لەئەواندا بەرجەستە ببوو، نەدەهاتنە نێو دیسپلین و ژیانی رێکخستنەوە، لەدژی رێساکان بوون. نەك دەیانخواست لەدژی رێساکان رابوەستن، بەڵام لە زینداندا تایبەتمەندی و چەمکێکی وەهایان تێدا دروستببوو.

بێگومان ئەمەش مەترسیدار بوو، بۆیە نەیاندەتوانی لەگەڵ پارتی ببنەیەك و بگونجێن، لەبەر ئەوە لەنێوان ئەو کادیرانە و پارتیدا کێشە و گرفت دەهاتەئاراوە. هەروەها دیسان لەنێو زیندانەکاندا لەنێوان چوار دیواردا مابوونەوە، ئەمەش دونیایەکی بەرتەسکە، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەپارتی دابڕابوون، کاتێك کە هەندێك لەوان کەوتنە زیندانەوە، هێشتا پارتی دروست نەببوو، هێشتا هەر لەقۆناخی گروپدا بووین، بەڵام کە لەزیندان دەرکەوتن بینیان پارتی دروستبووە و پێشکەوتووە، شەڕ و تێکۆشان مەزن بووە، تەفگەر مەزن بووە، کێشە و گرفتی پارتی جودایە، کێشە و گرفتی ئەوان لە زینداندا جودابوو، لە زینداندا هەموویان هەڤاڵن پێکەوەن و ئارادەیەکیش کێشە و گرفتەکانیشیان هەر وەك یەك بوو، بەڵام کاتێك کە لە زینداندا دەرکەوتنە دەرەوە دەبینن کەوا کێشەی پارتی هەیە، کێشەی گەل هەیە، جیاواز جیاواز کێشە و گرفت رووبەڕوویان دەبێتەوە، ئاستی هەموو کادیرێك وەك یەك نییە، ئاستی گەل وەك کادیر نییە. بەڵام لە زینداندا ئاستی هەموویان ئارادەیەکی زۆر وەك یەك بووە. بۆیە لەنێو چەندین کێشە و گرفتدا دەژیان. ئیدی پێویستبوو سەرتاپای ئەو کێشە و گرفتانە چارەسەر بکرانایە، بۆ ئەوەی ئەو کادیرانە زۆری و زەحمەتی نەبینن و لەگەڵ پارتیدا ببنە یەك و بگونجێن و تەفلیبوونێکی راست ئەنجام بدەن و بتوانن هەنگاو بەهەنگاو بکەونە نێو پراکتیکەوە و بتوانن رۆڵی خۆیان ببینن. لەبنچینەدا ئەو کۆنفرانسە بۆ ئەو مەبەستە سازدرا.

لەلایەکی دیکەوە؛ بەرخۆدانێکی مەزن و خیانەتێکی مەزنیش لە زینداندا ئەنجامدرابوو، هەبوون تەسلیم ببوون، هەبوون تەسلیم نەببوون، بەڵام لەرووی چەمکەوە لەژێر کاریگەری دووژمندا بوون، بۆیە پێویستبوو ئەو پراکتیکە هەمووی شیبکرێتەوە، راستینەی زیندانەکان ئاشکرا ببووایە. هەروەها وەکو باسم کرد

داگیرکەران هەمیشە لە زیندانەکاندا تەڤگەرەکانیان تەسلیم دەکرد. پێویستبوو کادیرانی زیندان باش لەو راستینەیە تێگەیشتبانایە، بۆ ئەوەی ئەو کادیرانە بۆ تەڤگەر نەبنە مەترسی و بتوانرێت لەو چەمکانەیان رزگار بکرێن کە دووژمن تێیدا چاندوون، بۆ ئەوەی مەترسی دروست نەکەن.

بۆ نموونە؛ تا ئەو کاتە هەندێك هەبوون لە زیندانەکاندا ساختەکاریان کردبوو، وەك "محەممەد شەنەر"، "سەلیم چروك کایا" پێویستبوو رەوشی ئەوانیش ئاشکرا ببووایە.

کۆنفرانسەکە لەسەر ئەو مەسەلانە راوەستەی کرد. بێگومان بۆ یەکەمجار ئەم تەڤگەرە کۆنفرانسی زیندانییەکانی سازدا، بەرلەوە هیچ تەڤگەرێك کۆنفرانسی بەمجۆرەی ئەنجام نەداوە و بەگرنگیان نەزانیوە. ئەم تەڤگەرە بۆ یەکەمجار ئەو هەنگاوەی هاوێشت، چونکە باش لەرەوشی زیندانەکان تێگەیشتبوو کە چۆن بەرخۆدانەکان بخاتە خزمەتی تەڤگەرەوە؟ چۆنیش بتوانێت ئەو مەترسییانەی دروستیشی دەکات بێکاریگەرییان بکات؟ تەڤگەر ئەم پێداویستییەی بینی، بۆیە ئەو کۆنفرانسەی ساز دا، ئاکامی ئەو کۆنفرانسەشی ناردە زیندانەکان، بۆ ئەوەی کادیر لە زیندانەکاندا لەسەر ئەو بنەمایە پەروەردە ببینێت و لەخۆی تێبگات و کێماسی و کێشە و گرفتەکانی خۆی چارەسەر بکات. ئیدی بەم کۆنفرانسە ئەو چەمکە چەوتانەی لەنێو کادیرانی زینداندا هەبوو نەهێڵران. بۆیە زیندان کەوتە خزمەت تەڤگەرەوە، وەکو تەڤگەرەکانی دیکە، زیندانەکان تەسفیەی نەکرد و مەترسییەکی مەزنی بۆ دروست نەکرد.

**پرسیارێك دەبووایە زووتر بمپرسیبایە، دوای ئەوەی تەڤگەر لەگروپەوە دەگاتە قۆناخی پارتیبوون، خەباتی راگەیاندنی و چاپەمەنی "رۆژنامە، گۆڤار و ...هتد" چۆن دەستپێکرد و برەوی پێدرا؟**




پۆستەرێك سەبارەت بە تێكۆشانی ئازادیخوازانەی ژنانی كوردستان

خەباتی رۆژنامەوانی ئێمە بە یەكەمین كۆنفرانس (ساڵی ١٩٨١) دەست پێدەكات. لەكۆنفرانسی یەكەمدا ئەو بڕیارەمان وەرگرت كە ئێمە رۆژنامەی "**سەرخۆبوون**SERXWEBÛN" لەئەوروپا دەربخەین، لەئاكامی ئەو بڕیارەدا هەڤاڵان كاریان كرد، "**سەرخۆبوون**" لەئەوروپا دەرچوو، یەكەمین رۆژنامەی ئەم تەڤگەرە "**سەرخۆبوون**"ە. رۆژنامەیەكی ئایدیۆلۆژی بوو، هەڵبەتە ئێمە بڕیارێكی وەهامان

دەرخستبوو کە ڕۆژنامەکە ئایدیۆلۆژی بێت، "سەرخۆبوون" ڕۆڵێکی بەمحۆرەی لەئەستۆ گرت. پێش ئەمە؛ لەوڵاتدا ئێمە ئامادەکاری ئەوەمان دەکرد کە ڕێکخستەیەکی ڕاگەیاندنی دابمەزرێنین. دەستەیەکی بەڕێوەبەرایەتیشمان بۆ ئەم مەبەستە ئاواکرد، لە هەڤاڵ "مەزلوم دۆغان" و هەڤاڵ "فوئاد" و "کەسیرە" پێکدەهات. ئەو بەڕێوەبەرایەتییە هەوڵیان دەدا کە لەوڵاتدا ڕۆژنامەیەك دەربخەین، گۆڤار و نامیلکە دەربخەین، ئەمەش بەرێکخستن دروست دەبوو، واتا ڕێکخستنێکی ڕاگەیاندنی پێویستبوو، بەڕێوەبەرایەتی و کادیر و ڕێکخستنی خۆی دەویست، ئێمە کارێکی وەهامان دابووە پێش خۆمان. بەلام ئەو کارە زێدە پێشنەکەوت. چونکە لەو کۆمیتەیەدا هەڤاڵ "مەزلوم دۆغان" دەستگیرکرا و ئەو کارە ئەنجام نەدرا، هەڵبەتە دەوڵەتیش هاتە سەر تەڤگەر و گرتنی هەڤالان ڕوویدا، ئێمە بینیمان کە ناتوانین ڕێکخستەبوونێکی بەمجۆرە پێشبخەین. بۆیە هەستاین بلاوکراوەیەك (نشرة ـ BÜLTEN)مان دەرخست، زیاتر هەواڵی تێدا بلاودەکرایەوە، هەروەها هەندێك هەڵسەنگاندنی ئایدیۆلۆژی تێدابوو، سەبارەت بەو هەڵە و کێماسییانەی لەپراکتیکدا دەردەکەوین هەڵسەنگاندن و وتار بنووسرێت، هەروەها ڕێنمایی ئەوەیشی تێدا بێت کە پێویستە مرۆڤ لەم ڕووەوە چ هەنگاوێك بهاوێژێت؟ لەسەر ئەمە هەندێك هەڵسەنگاندنی ئایدیۆلۆژیش بکرێت. بلاوکراوەیەکی بەمجۆرەمان دەرخست. بەتەواوی بەبیرم نایەتەوە چەند ژمارەمان لێی دەرخست، ئیدی هەندێك ژمارەمان دەرخست و بلاومان کردەوە. بۆیە ئەو ڕێکخستەیە "کۆمیتەی ڕاگەیاندن" لەو ئاستەدا مایەوە. بەسازدانی یەکەمین کۆنفرانسی پارتی سەرلەنوێ ئەو کارە ڕێکخرایەوە و دەست بەکاری ڕاگەیاندن کرا و پێشکەوت.

پەراوێزەکان:

(١) ئەو کاتە بەگوێرەی نەخشەی سەربازی (ARGK) هەرێمی "ماردین" یش سەر بەهەرێمی بۆتان بوو، واتا لەرووی نەخشەی سەربازییەوە بە یەك ئەیالەت ـ هەرێم ـ دادەنرا.

(٢) چیای تەحتەرەش: چیایەکە لەهەرێمی بەهتوشەباب لەپارێزگای هەکاری باکووری کوردستان.

# بەشی شەشەم:

# زەمەنی پیلانگێڕییە مەزنەکان...
# گەڕانەوەی مێژووە شوومەکە!!
# (١٩٩١ ـ ١٩٩٨)

**لەسـالَی (١٩٩١)دا لەلایـەن هـەڤالان و کـادیرانی باشـووری کوردستانەوە، کە لەنێو تێکۆشانی (PKK)دا بوون، "پارتی ئازادی کوردسـتان (PAK) دادەمـەزرێت، ئـەو پارتییـە بـە چ ئامانجێـك دادەمـەزرێت؟ کاردانـەوە و هەڵوێـستی هێـز و لایەنـەکانی باشـوور لەبەرامبەر ئەو پارتییە چیبوو؟ هـەروەها (PAK) چ ئـەنجامێکی لێکەوتەوە؟**

پـارتی ئـازادی کوردسـتان (PAK) لـەو هەڤالانـە دروسـتبوو کـە دوای شکـستی (١٩٨٨)ی باشووری کوردستان تەڤلی ئێمە ببوون. وەکو گووتم؛ دوای سالَی (١٩٨٨) هەنـدێك کوڕی گەنجی باشوور تەڤلی ئێمە بـوون، بـۆ ئـەوەی لـەنێو (PKK)دا خـەبات و خزمـەتی گـەل بکـەن. ئێمـە ئـەو کاتـە بەئـەوانمان گـووت:" ئەگـەر دەخـوازن تەڤگـەرێك بـۆ باشـوور پێشبخەن دەتوانن پێشیبخەن، ئێمەش دەتـوانین هاوکاریتـان بکـەین". ئـەوان ئـەو کاتـە ڕێکخستنێك و خەباتێکیان بۆ باشوور زێدە بەگونجاو نـەدەبینی، بۆیـە ئـەو هـەنگاوەیان نەهاوێشت و گووتیان:" ئێمە دەخوازین لەناو (PKK)دا کار بکەین" ئێمەش گووتمـان:" دەتوانن کار و خـەبات بکـەن". کاتێك لەسالَی (١٩٩١)دا ڕەوشـی نـوێی باشـوور دەرکـەوت، لەنزیکبوونەوەی ئەو هەڤالانەشدا ئەوە هەبوو کـە دەخـوازن بـۆ باشـوور پارتییـەك یـان ڕێکخستنێك پێشبخەن، ئێمەش ئەوەمان بە گونجاو بینی، چونکە ئێمـە دەمـانبینی کـەوا لەباشـووردا بۆشـاییەکی مـەزن هەیـە، هەرچـەندە چـەندین پـارتیش هـەن، بـەلاَم پێداویـستییەکی بـەمجۆرە هەیـە. بـۆ نموونـە؛ لەگـەلّ هێرشـی ڕژێمـی سـەددامدا ئـەو پارتییانـە هـیچ بـەرخۆدانێکی ئـەوتۆیان نـەکرد. واتـا ئێمـە بینیمـان پێداویـستییەکی بەمجۆرە هەیە، لەوانەیە مەترسییەکی بەمجۆرە دووبارە ببێتەوە، پێویـستە مـرۆڤ گـەل بـێ ڕێکخـستن نەهێڵێتـەوە، دیـاریش بـوو ئـەو ڕێکخـستنانەی کـە هەشـبوون، گـەلیان ڕێکنەخستبوو، باوەڕییان نەداوەتە گەل، بۆیە پێداویستی بە پارتییەکی بەمجۆرە هەیـە،

ئیدی (PAK) بەمشێوەیە دروستبوو، ئەو هەڤالانە وایان دەخواست و ئێمەش بەگونجاومان بینی، ئەو هەنگاوە بەو شێوەیە هاوێشترا. ئامانجی (PAK) چیبوو؟ نەك ( پ د ك ـ ی ن ك) تەسفیە بكات، بۆ ئەو مەبەستە دانەمەزرابوو، هیچ كاتێك ئامانجێكی وەهاشمان نەبووە، ئامانجی (PAK) ئەوە بوو كە ئەو بۆشاییەی لەباشووردا هەیە پڕبكاتەوە، ڕێگری لەو مەترسییانە بكات كە ئەگەری ڕوودانیان هەیە، گەل هوشیار و دانا بكات و بیكاتە هێز، تاكو گەلەكەمان لەباشووردا بتوانێت لەسەر پێی خۆی ڕابوەستێت. هەرچەندە گەلیش ڕاببوو، بەڵام لەسەر ڕێكخستن و هێزی خۆی ڕانەببوو، بەڵكو لەسەر هێزی ئەمریكا ڕاببوو، ئەمریكاش كە خۆی دابووە لایەك ڕژێمی سەددام كەوتبووەوە كوردستان. ئەمەش لەپێش چاوان بوو. ئیدی بۆ ئەوەی جارێكی دیكە ڕەوشێكی بەمجۆرە ڕوونەداتەوە پێویستە گەل ڕێكخستە و پەروەردە بكرابایە، گەل بەهێز بكرابایە. دامەزراندنی (PAK) بۆ ئەم مەبەستە بوو.

بێگومان لەبەر ئەوەی (PKK) لەپشت (PAK) بوو، (PAK) فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای (PKK)ی بەبنچینە وەردەگرت. شێوازی ئەوی بە بنەما وەرگرت. ئەمەش ( پ د ك ـ ی ن ك) بۆخۆیان بەمەترسیداریان دەزانی، ئەمریكا بەمەترسی دەزانی، توركیا بەمەترسی دەزانی. چونكە تەڤگەری (PKK) لە كوردستاندا نوێنەرایەتی خەت و فەلسەفە و تەرزێكی نوێی دەكرد. (PKK) بەتەواوی لەسەر هێزی گەلی كورد ڕادەبوو، باوەڕی بەهێزی خۆیی خۆی دەكرد و ئەوەی بەبنچینە وەردەگرت، بەتەواوی ئیرادەیەكی ئازاد، كۆمەڵگایەكی ئازاد، كەسێتییەكی ئازادی بەبنچینە وەردەگرت، ئازادی، دیموكراسی و یەكسانی بەبناخە وەردەگرت، دەیخواست دەسەڵاتدارێتی بەهەر شێوەیەك دەبێت با ببێت نەهێڵێت، كۆیلایەتی نەهێڵێت، خەت و ڕێبازێكی بەمجۆرەی بەڕێوە دەبرد. بۆیە ئیرادەیەكی ئازادی گەلی كوردی پێشدەخست، كەسێتی و كۆمەڵگایەكی ئازاد، ڕێكخستنێكی ئازادی پێشدەخست. ئەمەش خەتێكی نوێ بوو.

بێگومان خەتێكی دیكەش لە كوردستاندا هەبوو كە ( پ د ك ـ ی ن ك) نوێنەرایەتیان دەكرد، خەتێكی چۆن بوو؟ باوەڕیان زێدە بەخۆیان و هێزی خۆیان نەبوو، لەسەر هێزی خۆیان ڕانەدەبوون، باوەڕی خۆیان بەهەندێك هێزی دەرەوە هەبوو، ئەگەر هەندێك هێز هاوكاری ئەوانیان كرد دەتوانن كاربكەن، دەتوانن لە كوردستاندا كێشەی كورد

(کێشەی نەتەوەیی) بدەنە پێش خۆیان، ئەگەر هاوکاریش نەبێت ئەوا ناتوانن. بۆیە باوەڕیان بە خۆیان و گەلی خۆیان نەدەکرد. بێگومان ئەمەش بۆ گەلی کورد هەمیشە مەترسی دروست دەکرد.

بۆ نموونە؛ لەسەردەمی ڕێککەوتنی جەزائیری (١٩٧٥) دا ئەوە دەرکەوتە ڕوو. لەسەرهەڵدان و کۆڕەوەکەی ساڵی (١٩٩١) دا بەدەرکەوت. ئەمەش خەتێك بوو، واتا خەتێك کە ئازادی بەبناخە وەرنەدەگرت، خەتێك کە دیموکراسی و یەکسانی بەبناخە وەرنەدەگرت. خەتێکی میللیگەرایی بوو، هەمیش میللیگەراییەکی بەرتەسك و دواکەوتوو بوو. واتا ئەم خەتە کێشەی کوردی لەهەموو ڕوویێکەوە دەرنەدەخستەڕوو و چارەسەریشی نەدەکرد و زێدەتریش ئۆتۆنۆمی (حوکمی زاتی) بۆ خۆی بەبنچینە وەردەگرت. ئیدی ئەو خەتە خاوەن تەفگەرێکی وەها نەبوو کە سەربەخۆیی بەبناخە وەربگرێت. (PKK) تەفگەرێك بوو سەربەخۆیی بەبناخە وەردەگرت، پێشخستنی تەفگەر لەهەموو بەشەکانی کوردستانی بەبنچینە وەردەگرت، یەکێتی گەلی کوردی بەبنچینە وەردەگرت، بەڵام خەتی ( پ د ك ـ ی ن ك) و ئەوانە نەك تەواوی پارچەکانی کوردستان، بەڵکو تەنیا بەشی باشووریان بۆ خۆیان بەبناخە وەردەگرت، واتا کوردستانیان تەنیا لەباشووردا دەبینی. فیکر و ڕامانێکی وەهایان نەبوو کەوا لەهەموو بەشەکان تەفگەرێك ئاوا بکەن، ڕۆحێکی نەتەوەیی بئافرێنن، یەکێتی گەلی کورد بخولقێنن، لەسەر هێزی خۆیی کورد ڕابوونێك لەنێو کوردانەدا ئەنجام بدەن، ئەو شتانەیان نەدایە پێش خۆیان. ئەمەش خەتێك و ڕێبازێك بوو. (پ د ك ـ ی ن ك) خۆپەچڕاندن و دابڕاندن و خۆرزگار کردن و خۆ خستنە دەرەوەی ئەو سیستەمەی لەدونیادا هەیە، بەبنچینەیان وەرنەدەگرت، دەیانخواست کێشەی کورد لەنێو ئەو سیستەمەدا چارەسەر بکەن. بەڵام (PKK) و خەتی (PKK) دەیانخواست لەدەرەوەی ئەو سیستەمە باڵادەستەی جیهان کێشەی کورد چارەسەر بکەن، بۆیە دابڕان لەو سیستەمەی بەبناخە وەردەگرت. لەدەرەوەی ئەو سیستەمە پێشخستنی سیستەمێکی دیکە وەك ئەلتەرناتیفی ئەو سیستەمەی هەیە بەبنچینە وەردەگرت، (PKK) دەیخواست کورد لەو سیستەمەی کاپیتالیزم دەربخات و بیکاتە هێزی ئەلتەرناتیفی ئەو سیستەمە، بیکاتە پێشەنگی ئەو سیستەمە نوێیە، دەیخواست کورد بۆ خۆی و بۆ گەلانی دیکە بکاتە هێز.

ئەمەش لەهەموو رووێکەوە خەتێکی نوێ بوو. بۆیە لەنێوان خەتی (پ د ك ــ ی ن ك) و خەتی (PKK) دا جودایی هەبوو، بێگومان (پ د ك ــ ی ن ك) نەیاندەخواست خەتی (PKK) پێشبکەوێت و سەربکەوێت، دەیانخواست خەتی خۆیان لە کوردستاندا بالادەست بکەن. ئەمریکاش دەیخواست خەتی ( پ د ک ی ن ك) بالادەست بکات. چونکە ئەو خەتەی بۆخۆی بەمەترسی نەدەزانی، وەك ئەلتەرناتیفێکی نەدەبینی. تەنانەت ئەو خەتە کوردی لەگەڵ ئەمریکا دەگردە یەك و دەیخستە خزمەتی ئەو سیستەمەوە. بێگومان خەتی (PKK) کوردی لەو سیستەمە بالادەستە دەردەخست و لەدژی ئەو سیستەمەی دەکردە هێزێك و دەیکردە پێشەنگی سیستەمێکی نوێ. ئیدی بۆیە (PAK)یان بەمەترسی دەبینی، دەیانگووت:"پێویستە (PAK) لەباشووردا خۆی رێکخستە نەکات و پێشنەکەوێت. چونکە ئەگەر پێشبکەوێت ( پ د ك ـ ی ن ك) لاواز دەبێت، ئەمریکاش لاواز دەبێت". ئیدی بۆ ئەوەی لاواز نەبن و مەترسی لەسەریان دروست نەبێت پێویستە رێگیری لە (PAK) بکرێت، نەیانتوانی بە ئایدیۆلۆژی و سیاسی بێنە سەر (PAK)، بۆ ئەوەی گورز لە (PAK) بوەشێنن؛ هەندێك پروپاگەندەیان دەکرد، دەیانگووت گوایە:"(PAK) لەدژی ئێمە دروستبووە، دەخوازێت ئێمە تەسفیە بکات، (PAK) رێکخستنێکی ئێراقە و پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێراق و رژێمی سەددام و موخابەراتی سەددام هەیە...." بەو پروپاگەندانە دەیانخواست رکوکین و کاردانەوەی گەل و هەر کەسێك بۆ (PAK) دروست بکەن. چونکە رژێمی سەددام و موخابەرات و پارتی بەعس زوڵمێکی مەزنیان لەخەڵکی باشوور کردبوو، گەل لەباشوور و هەموو کەسێك لەو رژێمە زەبری خواردبوو، کاردانەوە و رکوکینێکی مەزنی لەبەرامبەر ئەو رژێمە هەبوو، دووژمنایەتییەکی مەزنی ئەو رژێمەی دەکرد، بۆیە ئەگەر بڵێن:"(PAK) پەیوەندی خۆی لەگەڵ رژێمی سەددام و بەعس هەیە"و گوایە:" (PAK) رێگەی "ئیبراهیم خەلیل"ی گرتووە و ناهێڵێت ئازووقە بێتە باشوور، تەنیا لەو رێگەیەوە توانست و هاوکارییان بۆدێت، (PAK) ناهێڵێت ئەوەش بێت، بەمشێوەیە هاوکاری رژێمی سەددام دەکات، دەخوازێت ئێمە لەناو ببات...". بێگومان جەماوەر بەمجۆرە دەبێتە دووژمنی (PAK)، ئەو پروپاگەندەیان بەو مەبەستە پێشدەخست، بەئەنقەست (PAK) یان بەپێچەوانەی راستینەی خۆی نیشان دەدا، بۆ ئەوەی گەل خۆی لە (PAK) نزیك

نەکاتەوە، ئەو کاریگەرییەی دروستیش بووە بتوانن نەیهێڵن، بۆ ئەوەی بەئاسانی پەلاماری (PAK) بدەن و تەسفیەی بکەن، تاکو بتوانن باڵادەستێتی خۆیان بسەلمێنن. ئەو پروپاگەندانەیان بۆ ئەو مەبەستە بوو.

**لەساڵی (١٩٩٢) دا هەڵبژاردنی گشتی لەباشووری کوردستان ئەنجام درا و پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستانی ئێراق دامەزرا. بەڵام شتی سەرنجڕاکێش بڕیاری یەکەمی ئەو پەرلەمان و حکومەتە بڕیاری شەڕکردن بوو لەدژی (PKK). پەرلەمان و حکومەت بۆ باشوور دامەزرابوو و هەموو گەلیش پشتگیری لێکرد بۆ ئەوەی بتوانن ببنە خاوەن پەرلەمان و حکومەتی خۆیان. بەڵام شەڕ لەگەڵ (PKK) هەڵدەگیرسێت و نزیکەی (٤٠) رۆژ بەردەوام دەبێت، کە ئەو شەڕە بە "شەڕی خیانەت" دەناسرێت. لەراستیدا ئەو شەڕە پێویستی بە شرۆڤە و لێکۆڵینەوەیەکی مەزن هەیە. رۆڵی (پ د ك ـ ی ن ك) و دەوڵەتە هەرێمییەکان و جیهان لەم شەڕەدا چیبوو؟ ئەم بڕیارەی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم بۆچی درا و ئەو شەڕە چ دەرئەنجامێکی لێکەوتەوە؟**

راستە کە پەرلەمانی باشووری کوردستان دامەزرا، ئاخافتن و قسەی سەرەتایان لەدژی (PKK) بوو، ئەمە هەڵەیەکی مەزن بوو. تەنانەت خەتایەکی مێژوویی بوو. بۆچی ئەو هەڵەیان کرد و بەسەر هەر کەسێکیشیان داسەپاند؟ پەرلەمان ئەو بڕیارەی هەر لەخۆیەوە وەرنەگرت، هەندێك دەوڵەت ئەو بڕیارەیان بەسەر پەرلەماندا سەپاند، لە پەرلەمانیشدا بەقورسایی ( پ د ك ـ ی ن ك) هەبوون، (پ د ك ـ ی ن ك) ش بەرێگەی پەرلەمانەوە ئەو بڕیارەیان وەرگرت. ئەمە شتێکی ئاشکرایە. بۆچی؟ چونکە بەنهێنی

دیدار ئەنجامدرابوو و ڕێککەوتنیان کردبوو. ئەگەر ( پ د ك ـ ی ن ك) و پەرلەمانی باشووری کوردستان لەدژی (PKK) بڕیار وەربگرێت و لەدژی (PKK) ڕابوەستێت، ئەوا ئەوانیش دان بە پەرلەماندا دەنێن و دان بە ( پ د ک ـ ی ن ك) دا دەنێن و پەیوەندی لەگەڵ ئەواندا پێشدەخەن و توانست بەوان دەدەن. ئەگەر پەرلەمان بڕیارێکی بەمجۆرەی وەرگرت و لەسەر بنەمای ئەو بڕیارەش شەڕی (١٩٩٢) "شەڕی خیانەت"یان ئەنجام دا، بۆ ئەم مەبەستە ئەنجامیان دا. نەك گوایە (PKK) بەراستی دژی باشوور و پەرلەمانی باشوور و (پ د ك ـ ی ن ك) بوو، تەنانەت هیچ حیسابیان بۆ ئەوە نەکرد کە (PKK) لە ڕۆژگاری هەرە دژوار و پڕ لەتەنگاسیدا خزمەتی ئەوانی کرد. لەدژی ڕژێمی سەددام سەرەتا لەناوچەی "دەرکار" لە بادینان (PKK) بەرێگەی "سادق عومەر" و هەندێك کەسی دیکەوە ڕاپەڕینی بەرپاکرد. کاتێك کە ئێمە لەو ناوچەیە هەندێك مۆلگەی هێزەکانی ڕژێمی بەعسمان هەڵتەکاند و چووینە زاخۆ، حزب و لایەنەکانی دیکە یەکێکیشیان لەگۆڕەپانەکەدا نەبوون. هەروەها کاتێك کە ڕژێمی سەددام هێرشی کرد و خەڵك هەموو بەرەو سنوورەکان کۆڕەویان کرد، ئەوەی لە "حەفتانین" ڕێی لەهێزەکانی ڕژێمی سەددام گرت، هەروەها ئەوەی لەرێی "باتوفە ـ زاخۆ"دا چەندین سەرباز و ئەفسەری هێزەکانی ڕژێمی "سەددام"ی بەدیلگرت و ئەوەی مۆلگەکانی ئەو هێزەی لە "هێرێ" و دەوروبەری هەڵتەکاند هەمووی (PKK) بوو، ئەوەی گەلی پاراست و ئەوەی لە باکوور میللەتی ڕێکخست بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی باشوور ئازووقە کۆبکاتەوە دیسان هەر (PKK) بوو، (PKK) ئەوانەی ئەنجامدا، (PKK) هیچ کاتێك لەدژی پەرلەمان و ( پ د ک ـ ی ن ك) ڕانەوەستا، هیچ کاتێك پەیوەندی لەگەڵ ئێراقیشدا نەبوو. ئەوانیش دەیانزانی کە پەیوەندییەکی بەمجۆرەمان نییە. (PKK) هیچ کاتێك پەیوەندییەکانی خۆی لەدژی کوردان بەڕێوە نەبردووە. هەرچی پەیوەندی دروست کردبێت خستوویەتییە خزمەتی کوردانەوە. ئەمەش ڕاستییەکە کەس ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە (PKK) پەیوەندی لەدژی کوردان پێشخستووە، یان ئەو پەیوەندییەی دروست بووە لەدژی کوردان بووە، کەس ناتوانێت شتێکی وەها بڵێت.

مەسەلەکە چیبوو؟ مەسەلەکە بەتەواوی ئەوە بوو چۆن بتوانن ڕێگیری لە (PKK) بکەن؟ چونکە (PKK) لەتەواوی کوردستاندا ڕۆحێکی دەئافراند، یەکێتییەکی دەئافراند

و پێشکەوتن و گۆڕانی بەدیدەهێنا، ئیرادەیەکی سەربەخۆی دەئافراند، تا دەهات خەتی (PKK) پێشدەکەوت، ئەمەش بۆ دەوڵەتانی داگیرکەر مەترسی بوو، ( پ د ك ـ ی ن ك) و سیستەمی سەرمایەداری بۆخۆیان بەمەترسیان دەبینی. لەبەر ئەمە لەهەوڵی ئەوە دابوون کە چۆن بتوانن رێ لەمە بگرن؟ چونکە پێشکەوتنی (PKK) هەڕەشەی لە هاوسەنگییەکانی کوردستان و ناوچەکە دەکرد کە ئاوابوو. هاوسەنگییەکەی بەتەواوی بە لای (PKK) و گەلی کورددا دەبرد، هاوسەنگییەکانی بەلای ئازادی و دیموکراسی دەبرد. لەمەشدا زۆر لایەن زەرەرمەند دەبوون، سیستەمی سەرمایەداری بالادەست زەرەری دەبینی، ئەوانەی لەناوچەکەدا لەسەر ئەو سیستەمە دەژیان زەرەریان دەبینی. بۆیە (PKK) بۆ ئەوان مەترسییەکی مەزنی دروست دەکرد و پێویستبوو رێگیری لێبکەن. ئیدی ئەگەر پەرلەمان ئەو بڕیارەی وەرگرت بۆ ئەم مەبەستە وەریگرت، ئەو بڕیارە سەرەتای ئامادەکردنی زەمینەی شەڕی (١٩٩٢) بوو. هەڵبەتە شەڕی (١٩٩٢) یان لەسەر بنەمای ئەو بڕیارە ئەنجام دا.

بۆ ئەوەی ئێمە رێ لە بەرپابوونی ئەو شەڕە بگرین، ئێمە کۆبوونەوەشمان لەگەڵ حکومەتی هەرێم ئەنجامدا. لەنێوان ئێمە و حکومەتی هەرێم، ئەو کاتە "د. فوئاد مەعسوم" سەرۆکی حکومەت بوو، گەیشتینە رێککەوتنێك و دەرئەنجامێك کەوا:" ئێمە لەگەڵ یەکتردا شەڕ نەکەین، نەهێڵین داگیرکەران لەیستۆك و پیلان لەدژی هەردوولا سازبکەن، هەروەها لەنێوان باشوور و باکووردا، لەنێوان ئێمە و ( پ د ك ـ ی ن ك) و پەرلەمان و حکومەتی هەرێمدا، هیچ ناکۆکییەك دەرنەکەوێت، بەڵکو هاوکاری یەکتر بکەین، موداخەلەی کاروباری ناوخۆیی یەکتر نەکەین..." لەسەر ئەو مەسەلانە گفتوگۆ دروستبوو و رێککەوتن ئەنجامدرا. ئێمە بەو رێککەوتنە باوەڕمان کرد و گووتمان:" ئیدی گەیشتینە ئەنجام و رێککەوتن، ئیتر هیچ مەترسییەك روونادات. هەربۆیە ئێمە هیچ حیسابی هاتنەئارای شەڕمان نەدەکرد. ئێمە وەها مەزندەمان نەدەکرد کەوا (پ د ك ـ ی ن ك) لەگەڵ تورکیا پێکەوە هێرش بێننە سەرئێمە. ئێمە هەموو تەرکیزی خۆمان خستبووە سەر پێشخستنی خەبات لەدژی تورکیا، ئێمە لەباشووریشدا خەباتمان دەکرد کە چۆن باشوور بەهێز بکەین، کە باشوور بتوانێت لەسەر پێی خۆی رابوەستێت و ئەگەر مەترسییەکیش رووبدات بتوانێت خۆی بپارێزێت. کەچی بینیمان لەیەککاتدا (پ

د ك ـ ی ن ك) و توركیا بەیەكەوە هێرشیان هێنایە سەر ئێمە. ئیدی "شەڕی خیانەت" بەمجۆرە دەستیپێكرد.

ئەو كاتە لە سێ شوێندا "خواكورك، چوقورجە، حەفتانین" هێزی ئێمە لەباشووردا هەبوو، هێزەكانی ئێمەش بەقورسایی لەباكوور بوون، ئەو هێزانەشمان لەباشوور بوون پەروەردەمان دەكردن و بۆ باكوور ئامادەمان دەكردن. هەروەها بۆ پاراستنی باشوور وەك هێزێكی یەدەك لەباشوور جێگیرمان كردبوو. واتا ئەگەر مەترسییەك بۆ سەر باشوور دروستبوو، دیسان هێرشێكی وەكو ئەوەی رابردوو لەلایەن ئێراقەوە یان توركیاوە رووبدات بتوانین هاوكاری خەڵكی باشوور بكەین، بۆ ئەم مەبەستە بوو. لەراستیدا ئەمە دەشزانرا. بەڵام دەوڵەتی توركیا و ئەمریكا، (پ د ك ـ ی ن ك)یان ناچاری ئەو شەڕە كرد، ئەوانیش ئەو هەنگاوەیان لەبەر ئەم هۆیە هاوێشت.

ئەو شەڕە سەرەتای پیلانگێڕییەكی نێودەوڵەتی بوو كەوا لەپراكتیكدا جێبەجێ دەبوو، بۆیە شەڕی (١٩٩٢) شەڕێكی هەروا ئاسان نەبوو، ئەوە موداخەلەی هێزە نێودەوڵەتییەكان بوو بۆ سەر (PKK). چونكە (PKK) لەهەموو روویێكەوە لە كوردستاندا پێشدەكەوت. ئەم پێشكەوتنەش هەڕەشەی لەبەرژەوەندی زۆر هێز و لایەن دەكرد، هەڕەشەی لە هاوسەنگییەكان دەكرد، پێویستبوو رێگیری لێبكرێت. بەو شەڕە دەیانخواست ئیرادەی (PKK) بشكێنن و (PKK) تەسلیمیان ببێت. بۆ ئەوەی بتوانن رێ لەو مەترسییانە بگرن كە (PKK) بۆ ئەوانی دروستدەكات، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو خەتەی ( پ د ك ـ ی ن ك) نوێنەرایەتی دەكات باڵادەست بكەن. ئامانجی ئەو شەڕە ئەوە بوو.

ئەوانە وا حیسابیان دەكرد كە دەتوانن ئیرادەی ئێمە بشكێنن و ئێمە تەسلیم بگرن. بەڵام نەیانتوانی ئیرادەی ئێمە بشكێنن، بەڵكو بەپێچەوانەوە بەو شەڕە ئیرادەی ئێمە بەهێزتر بوو. بەڵام لەو شەڕەدا لەبەرەی "خواكورك" دا كە فەرهاد (عوسمان ئۆجەلان) بەرپرسیاری بوو، بەرگری نەكرد، سەرەتا هەندێك بەرگری كرد، پاشان تەسلیم بوو، تەنانەت بەبێ ئاگاداری تەفكەر و سەرۆك دەستبەرداری شەڕەكە بوو و چوو لەگەڵ (پ د ك ـ ی ن ك)ش دانیشت و بەناوی (PKK) وە رێككەوتنێكیشی واژۆ كرد. لەو رێككەوتنەدا (PKK) یان تەسلیم وەرگرت. بەگوێرەی ئەو رێككەوتنە؛ پێویستە هەموو هێزەكانی

(PKK) لەباشووردا بچێتە "زەڵێ". "زەڵێ"ش زۆر دوورە لەسنووری تورکیا. واتا دەیانخواست ئەو هێزانەمان هەموو ببەنە "زەڵێ" و لەوێش تەسلیمیان وەربگرن، ئامانجی ئەوان ئەوە بوو، ئەوەی کەوا نەیانتوانیبوو بەشەڕ بیکەن، خواستیان بەو رێککەوتنە بیکەن، خواستیان ئەمەش بەرێگەی "فەرهاد" بەئەنجام بگەن.

لەبنەڕەتدا شەڕی ساڵی (١٩٩٢) لە "حەفتانین" روویدا. چونکە "چوقورجە"ش لەدەرەوەی شەڕ مایەوە و هیچ نەکەوتە شەڕەوە، "خواکورك"یش کەمێك شەڕی کرد و تەسلیم بوو، هەموو قورساییەکەی شەڕی (١٩٩٢) کەوتە سەر "حەفتانین". لەبنچینەشدا شەڕەکە لەو ناوچەیە بوو.

ئیدی کاتێك "فەرهاد" بەناوی (PKK) وە چوو ئەو رێککەوتنەی ئیمزا کرد، سەرۆك ئەو کاتە گووتی:" ئیتر ئێوە شەڕ لەبەرەی "حەفتانین" رابوەستێنن" بەمجۆرە شەڕ لە"حەفتانین" راوەستا.

لێرەدا بەو شەڕە موداخەلەیەکی مەزن بۆ سەر (PKK) کرا، گورزیان لە تەڤگەری (PKK)دا. هەرچەندە ئیرادەی (PKK) یان نەشکاند و تەسلیمیان وەرنەگرت، بەڵام رێیان لەبەردەم پێشکەوتنی گرت. بەم موداخەلەیە نەیانهێشت کە تەڤگەری (PKK) بەهێزتر ببێت، ئەگەر ئەو موداخەلەیە نەبووایە، ئەوا تەڤگەری (PKK) زیاتر بەهێز دەبوو، لەوانەیە رەوشی گەلی کورد و تەڤگەری کورد وەکو ئەمڕۆ نەبووایە، چونکە تا ئەو کاتە دەوڵەتی تورکیا نەیتوانیبوو رێگیری لەبەردەم مەزنبوون و پێشکەوتنی تەڤگەری (PKK) دا بکات، هێزەکەی ئەو بەشی ئەمەی نەدەکرد. ئیدی دەوڵەتی تورکیا لەهەموو روویێکەوە ئیفلاسی کردبوو، تادەهات سەرهەڵدان و گەریلا بەهێز دەبوو و کاریگەریشی لەسەر پارچەکانی دیکە دەکرد و رابوون و هوشیاربوونەوەیەکی مەزنی پێشدەخست. واتا (PKK) تەڤگەری بەرەو چارەسەری دەبرد. ئیدی نەیانهێشت تەڤگەر بەرەو چارەسەری بچێت، رێگەیان لەبەردەمدا گرت. نەیانهێشت کەوا تەڤگەر هەم لەرووی گەریلا و هەمیش لەرووی سەرهەڵدانەکانەوە مەزن ببێت و بەمەش چارەسەری پێشبکەوێت، ئەمە گورزێکی مەزن بوو.

لەلایەکی دیکەوە؛ بەم هەنگاوە تورکیا ناکۆکی مەزنی خستە نێوان باکوور و باشوورەوە، نێوان (PKK) و (پ د ك ـ ی ن ك) بۆ ئەوەی کورد یەك نەبن. چونکە (PKK) دەیخواست

باكوور و باشوور بكاتە یەك، دەیخواست لەگەڵ (پ د ك ــ ی ن ك) و خەڵكی باشوور پەیوەندییەكی تۆكمە پێشبخات. ئیدی بەم شەڕە ڕێگریان لەبەدیهێنانی ئەمە كرد، دووژمنایەتیان خستە نێوان خودی تەڤگەری كوردەوە، بۆ ئەوەی تەڤگەری كورد بەهێز نەبێت و سەرنەكەوێت. بەمشێوەیە ڕێیان لەبەردەم چارەسەری گرت. ئەگەر ئەو شەڕە نەبایە و پەیوەندییەكی بەهێز پێشبكەوتبایە، ئەوا باشوور و باكوور یەكدیان تەواو بەهێز دەكرد، چۆن لە باكووردا گەریلا سەرهەڵدانی بەهێز دەكرد و سەرهەڵدانیش گەریلای بەهێز دەكرد، دەوڵەت بەرەو ئیفلاسبوون دەچوو، بەهەمان شێوەش خەباتی باكوور باشووری پێشدەخست و دەبووە هێز و مۆراڵێكی مەزن بۆی، خەباتی باشووریش بۆ باكوور دەبووە هێز و مۆراڵێكی مەزن. ئەمە كاریگەری لەسەر ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای كوردستانیش دەكرد. واتا تەواوی كوردستان دەكەوتە سەرڕێی چارەسەری. ئیدی پێویستبوو ڕێگریان لەوانە بكردبایە، بەو شەڕەی (١٩٩٢) ڕێگری لەمانە كرا.

وەكوتریش ڕێیان لەبەردەم خەتی (PKK) گرت، بۆ ئەوەی (PKK) لە كوردستاندا حاكمییەتی خۆی دروست نەكات، ئەمە بووە گورزێكی كوشندە. لەم ڕووەوە گورزێكی مەزنیان لە (PKK)دا. بەڵام نەیانتوانی ئیرادەی بشكێنن، ئیرادەی (PKK) نەشكا و بەهێزتر بوو. دەیانگووت:" (PKK) ناتوانێت شەڕ بكات، ئێمە تەسلیمی دەگرین" بەڵام (PKK) شەڕی كرد و بەرگری كرد و بەرخۆدانی نواند. بەڵام "فەرهاد" تەسلیم بوو. خواستیان بەرێگەی "فەرهاد" ــ بەو ڕێككەوتنەی كە "فەرهاد" كردبووی ــ هەموو هێزەكانی ئێمە بۆ "زەلێ" رابكێشن و دەستبەسەری بكەن. ئەمەش بكەنە كارتێكی فشارخستنە سەر تەڤگەر و سەرۆكیش بێكاریگەر بكەن و تەڤگەر لەژێر كاریگەری سەرۆك دەربخەن و بیخەنە ژێر كۆنترۆڵی "فەرهاد"ەوە و بەرێگەی "فەرهاد"یشەوە بەتەواوی بیخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە. پیلانێكی بەمجۆرە بەرێوەبرا.

لەبنەڕەتدا "فەرهاد" لەساڵی (١٩٩١) بەدواوە باوەڕی بە سۆسیالیزم نەمابوو، كاتێك لەجیهاندا بلۆكی سۆسیالیستی هەڵوەشایەوە، باوەڕی بە سۆسیالیزم نەما، بەشەڕی (١٩٩٢)ش باوەڕی بەگەریلا، (PKK)، سەرۆك و گەل نەمابوو، بەتەواوی كۆتایی پێهاتبوو. ئیدی چارەسەری لەسیستەمی سەرمایەداریدا دەبینی، لەبەكرێگیراوێتیدا دەبینی، چارەسەری لە هێڵی "تاڵەبانی" و "بارزانی"دا دەبینی، لە ئەمریكادا دەبینی، باوەڕی

خۆی بە خودی خۆیشی لەدەستدابوو، باوەڕی خۆی بە سەرۆك و گەل و تەفگەریش لەدەست دابوو. هەرلەبەر ئەوەش بوو لە "خواكورك" شەڕ و بەرخۆدانی نەكرد و چوو ئەو ڕێككەوتنە تەسلیمكاریەشی بەناوی تەفگەرەوە مۆر كرد. بەبێ ئاگاداری تەفگەر ئەمەی ئەنجامدا.

ئیدی ( پ د ك ـ ی ن ك)ش بینیان كە "فەرهاد" باوەڕی بە سەرۆك و گەل و (PKK) نەماوە، پێیانگووت:" كەواتە ڕاستە چارەسەری لەنێمە دایە، تۆ ڕاست بیر دەكەیتەوە". لێرەدا خواستیان كەوا "فەرهاد" لەدژی سەرۆك ئاپۆ بەكاربهێنن، كە سەرۆك بێكاریگەر بكەن و تەفگەر لەژێر كۆنترۆڵی دەربخەن، لەرێگەی "فەرهاد"ەوە تەفگەر بەتەواوی بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، بەمشێوەیە تەسفیەی بكەن. بێگومان "فەرهاد"یش بەمشێوەیە لەدژی سەرۆك دەركەوت. "فەرهاد" ئەو هێزەی نەبوو وەها لەدژی سەرۆك دەربكەوێت، كاتێك كە سەرۆك ڕەخنەی لە "فەرهاد" دەگرت و بەسەریدا دەچوو، "فەرهاد" لە "زەلێ" هەڵات و چووە ئێرانەوە، چوو لە ئێران داوای پەنابەرێتی سیاسی كرد، كەوتە ڕەوشێكی بەمجۆرەوە. چونكە هێشتا لەكۆنگرەی سێیەمدا لە (١٩٨٦)دا كاردانەوە و ركوكینێكی بۆ سەرۆك دروستبىبوو، گوایە سەرۆك ڕێی لێگرتووە و هاوكاری نەكردووە. ئەو پێی وابوو برایەتی ئەو لەگەڵ سەرۆك بۆتە ئاستەنگییەكی مەزن لەپێش ئەودا. ئیدی "فەرهاد" هەر لەو كاتەوە لەدژی سەرۆك ڕاوەستابوو و كاردانەوەی "فەرهاد" بۆ سەرۆك پەرەیسەند، ئەو كاردانەوەیە پاشان لە "زەلێ" بووە دووژمنایەتی. لەبەر ئەوەی باوەڕی خۆی بە سۆسیالیزمیش نەمابوو، سۆسیالیزمیش پەرشوبلاو ببوو. شەڕی (١٩٩٢)ش شەڕێكی قورس بوو، بەمەش ئیرادەی خۆی شكاند و بەتەواوی باوەڕی بەتەفگەر نەما، كاردانەوەی خۆیشی بۆ سەرۆك هەبوو، ئیدی ئەو هێزانەی كەوتنە پشت "فەرهاد" و پێیانگووت:" تۆ زانای و ماف خۆتە، ئەوەی تۆ ڕاستە، ئاپۆ هەڵەیە و ماف خۆتە و ...هتد" ئەمەی بۆ خۆی وەك هێز بینی، بەمە ئەو كاردانەوەیەی لەدژی سەرۆك هەیبوو، گەیاندییە ئاستی دووژمنایەتی. بۆیە بەئاشكرا دژایەتی سەرۆكی كرد و خواستی سەرۆك بێكاریگەر بكات. ئەگەرنا هێزێكی خۆی نەبوو، كە سەرۆك ڕەخنەی كرد و ئەوان بینیان ناتوانێت لەدژی سەرۆك ڕابوەستێت، ئەو هێزانەی لەپشت ئەویش

بوون نەیانتوانی ئەو بپارێزن. بۆیە هەڵات و چووە ئێران و داوای پەنابەرێتی سیاسی لە ئێران کرد.

بەراستی شەڕی (١٩٩٢) شەڕێکی گران بوو، لەناکاو و بێ ئامادەکاری هێرشیان کردە سەر ئێمە. لەپێش چاوان تورکیا و ( پ د ك ـ ی ن ك) پێکەوە هێرشیان کرد، بەڵام لەپشت ئەو شەڕەدا سیستەمی سەرمایەداری هەبوو، ناتۆ (NATO) هەبوو. لەبنەڕەتدا ئەوانە لەدژی ئێمە شەڕیان بەرپاکرد، خواستیان کەوا گورز لەتەڤگەر بدەن، گورز لەخەتی ئەو تەڤگەرە بدەن، بۆ ئەوەی ئەم تەڤگەرە بێکاریگەر بکەن و نەبێتە مەترسی بۆیان. راستی مەسەلەکە بەمجۆرە بوو. واتا موداخەلەی نێودەوڵەتی و پیلانگێری نێودەوڵەتی لەبنەڕەتدا لە (١٩٩٢)وە دەستیپێکرد، لەو شەڕەدا هەندێك هەنگاویان هاوێشت و هەندێك ئەنجامیان بەدەستخست، بەڵام بەتەواوی ئەنجامگیر نەبوون، ئیدی رێیان پەرەسەندنی تەڤگەر گرت، لەمەدا ئەنجامگیربوون و نەیانهێشت تەڤگەر مەزنتر ببێت و بەرەو چارەسەری بچێت و رێیان لەپێش چارەسەری گرت. لەبەر ئەمە دەتوانین بڵێین؛ (پ د ك ـ ی ن ك) رۆڵێکی خراپیان بینی...

# بێریتان

# ئەدرەسێکی نوێی بەرخۆدان...

**لـــەو شـــەڕەدا لەشەخـــسی بـــەرخۆدانی "حـــەفتانین"دا و لـــە "خواکورك"یشدا لە شەخسی هـەڤاڵ بێریتـان (گوڵنـاز قـەرەتاش)دا بـەرخۆدان دەگاتـە لوتکەی خۆی. لەراسـتیدا مـرۆڤ دەتوانێـت ئـەو بەرخۆدانە وەك خەت و ڕێبازێك ببینێت، لەنێو ئەو شەڕە گـران و مەزنـەدا لەبەرامبـەر ئـەو هـەموو هێـز و لایەنانـەدا، بـەرخۆدانی هەڤاڵ "بێریتـان" هـەم بۆ تێکۆشـانی بەرخۆدانڤانانـەی تەڤگـەری (PKK) بەگـشتی و هـەمیش بـۆ تێکۆشـانی ئـازادی ژنـان چـۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

بێگومان لەبەرەی "خواکورك"دا لەبنـەمادا هـەڤاڵ "بێریتـان" نوێنەرایـەتی تەڤگـەری دەکرد، ئەو هەڤاڵە خەتی تەڤگەری لەکەسێتی خۆی و پراکتیکی خۆیدا بەرجەستە کرد و خیانەتی پەسند نەکرد و تەسلیم نەبوو، لەدژی خیانـەت و تەسـلیمییەت ڕاوەسـتا، تـا دوا گوللە شەڕی کرد، کە گوللەیشی پێنەما خۆی لەسەر زنارێك هاوێشت و خۆی پارچـە پارچە کرد، بەڵام خۆی تەسلیمی ئەوان نەکرد. ئەوەی لە شەخسی هەڤاڵ "بێریتـان"دا پێکهات چیبوو؟ ملیتانێتی (PKK) بوو، لـە شەخـسی ئـەودا کەسـێتی ملیتـانێتی (PKK) بەرجەسـتەبوو. ملیتـانێتی "بێریتـان" ملیتـانێتی (PKK) یـە، ملیتانێتییـەکی چـۆنە؟

ملیتانییەکە ئازادی بۆخۆی بەبنەما وەرگرتووە، بەتەواوی بۆ ئازادی دەژیت، ئەو ملیتانێتییە کە هەموو شێوە کۆیلایەتییەك و دەسەڵاتدارێتییەك رەتدەکاتەوە، لەدەرەوەی ئازادی شتێکی دیکە پەسندناکات و هەموو شتێکی دیکە رەتدەکاتەوە. تەرخانکردنی ژیانی خۆی بەتەواوی بۆ ئازادی، ئەگەر بشمرێت تەنیا بۆ ئازادی بمرێت، لەدەرەوەی ئەمە هیچ شێوە ژیان و مردنێکی دیکە پەسندناکات، ژیان و مردن بە ئازادی و بۆ ئازادی و لەخزمەتی ئازادی بێت، ئەمەیە ملیتانێتی (PKK). ئیدی هەڤاڵ "بێریتان" ئەو ملیتانێتییەی لە پراکتیکدا بەرجەستە کرد. ژیانی خۆی بەتەواوی بۆ ئازادی رێکخستبوو. بۆ پێداویستی ئازادی رێکخستەی کردبوو، بەتەواوی بۆ ئەمە دەژیا و تێدەکۆشا. ئیدی کە مردنیشی دایە پێشخۆی، بۆ ئەم مەبەستە مردنی دایە پێشخۆی. مردنێك کە خزمەتی ئازادی نەدەکرد پەسندی نەدەکرد. پێویستە مردنیش بخەیتە خزمەت ئازادییەوە. ئەوەی لەکەسێتی "بێریتان" و پراکتیکی ئەودا بەرجەستە بوو ئەمەبوو. چونکە ئەو ملیتانێتییەی سەرۆك ئاپۆ لە (PKK) و جڤاکی کورددا پێشیخستبوو ملیتانێتییەکە بەتەواوی هەموو شێوە کۆیلایەتی و دەسەڵاتدارێتییەك رەتدەکاتەوە و ئازادی بەبناخە وەردەگرێت، ئەوەی کە بۆ ئازادی دەژیت و بۆ ئازادی دەمرێت. سەرۆك ملیتانێتییەکی بەمجۆرەی پێشخست. لەو ملیتانێتییەدا بەکرێگیراوێتی و خیانەت و تەسلیمییەت نییە، بەڵکو بۆ ئازادی پێداگری لەسەر بەرخۆدان بنچینەییە. بۆیە ئەم ملیتانێتییە هیچ هێزێك ناتوانێت تەسلیمی وەربگرێت و کۆنترۆڵی لەسەر دروستبکات، کۆنترۆڵ ناکرێت. لەو ملیتانێتییەدا بەتەواوی کەسێتییەکی ئازاد و ئیرادەیەکی ئازاد هەیە، کەس ناتوانێت کۆنترۆڵی کەسێتی و ئیرادەکەی بکات. ملیتانێتییەکی بەمجۆرە ملیتانێتییەکی پڕ بەهێزە، هیچ هێزێك ناتوانێت لەپێش ئەو ملیتانێتییە رابوەستێت. نە هێزێکی سیاسی و نە هێزێکی عەسکەری ناتوانێت لەبەردەم ملیتانێتییەکی بەمجۆرەدا بەرگەبگرێت.

لەجیهاندا ملیتانێتییەکی بەمجۆرە زۆر کەمە و تەنیا لەتاکە تاکەی هەندێك کەسدا بەرجەستە بووە، سەرۆك ئەوەی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا لەهەندێك کەسدا بەرجەستە بووە لە (PKK)دا بەتەواوی بەرجەستەی کرد و هەوڵیداوە لە جڤاکی کورددا بەرجەستەی بکات. بۆیە ملیتانێتییەکی پڕ مەزن بەرجەستەبووە، ملیتانێتییەکی

ئەوتۆیە تەنیا سەرکەوتن بەبناخە وەردەگرێت، سەرکەوتن و پێشکەوتن بەدیدەهێنێت، ملیتانێتییەکی بەمجۆرە کەس ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات و تەسلیمییەتی پێ بەپەسندکردن بدات و بۆ لای خیانەتی رابکێشێت. ئیدی کاتێك کە "بێریتان" فیشەکەکانی تەواو دەبێت و پێشمەرگەکان پێی دەڵێن:"تەسلیم ببە و هیچت لێناکەین" بەڵام ئەو تەسلیمییەتی پەسند نەکرد، خیانەتی پەسند نەکرد، بەکرێگیراوێتی پەسند نەکرد، گووتیان:" تەسلیم ببە هیچت لێناکەین" وەڵامی ئەو هەڤاڵە خۆهاوێشتن بوو لەسەر زنارێك و خۆی پارچە پارچە کرد. ئیدی ملیتانێتی (PKK) ملیتانێتییەکی بەمجۆرەیە و لەپێناو ئازادیدا ئەگەر پێویست بێت خۆی پارچە پارچە دەکات، "بێریتان" ئەمەی بەرجەستە کرد و جێبەجێی کرد.

"بێریتان" کچە کوردێك بوو، هەمیش کچێکی دێرسیمی بوو. واتا لە کوردستاندا و لە "دێرسیم"دا کچێکی بەمجۆرە دەربکەوێت ئەمە پڕ گرنگە. بۆچی گرنگە؟ چونکە ئەمە رابوونی گەلی کورد و ژنی کورد بوو. گەلی کورد پڕ داڕووخا بوو، داگیرکەران زۆر دایانڕووخاند بوو، ئیدی لەدوا پلەی داڕووخانی خۆیدا بوو، ژنی کوردیش بەهەمان شێوە داڕووخا بوو، ئیدی لەدوا پلەی داڕووخانی خۆیدا بوو، بەڵام لە کەسێتی هەڤاڵ "بێریتان"دا هەم گەلی کورد و هەمیش ژنی کورد هەستایە سەرپێیان، هەمیش زۆر بەهێزەوە هەستایە سەرپێ، لەم رابوونەیدا هیچ سنوورێکی نەناسی، لەرابووندا بێسنوورێتی(اللامحدودیة)ی بەبناخە وەرگرتبوو، هیچ دەسەڵاتێکی لەسەر خۆی پەسند نەدەکرد، هیچ هەژموون و باڵادەستێتی و کۆیلایەتییەکی پەسند نەدەکرد. بۆیە بەهیچ شێوەیەك بەکرێگیراوێتی و تەسلیمییەت و خیانەتێکی پەسند نەدەکرد" یان بەئازادی دەژین یانیش هیچ ناژین" ئەمەی بەبنچینە وەردەگرت و جێبەجێی دەکرد. ئیدی هەڤاڵ "بێریتان" ملیتانێتی (PKK)ی وەها لەخۆیدا بەرجەستەکرد. کەسێك بەهەڤاڵ "بێریتان"ی نەگووت:"برۆ ملیتانێتییەکی وەها پێکبهێنە و پاشانیش خۆت وەها پارچە پارچە بکە". "بێریتان" هێزی (PKK)ی وەرگرتبوو، لەئازادیدا ژیابوو و لەخۆیدا ئیرادەی (PKK)ی ئافراندبوو، ئەو ئیرادەیەش بە تەواوی ئازادی بەبناخە وەردەگرێت، بۆیە لەدژی هەموو جۆرە تەسلیمییەت و خیانەت و بەکرێگیراوییەك راوەستا و پێداگری لەسەر ئازادی کرد، لەبەر ئەوەی هەڤاڵ "بێریتان" ئەو کەسێتییەی لەخۆیدا

ئافراندبوو، بۆیە ئەمەی بەبناخە وەرگرت، چونکە کەسێتی "بێریتان" کەسێتییەکە بەتەواوی ئازادی بەبناخە وەردەگرێت و پێداگری لەسەر دەکات و بۆی دەژیت و بۆی دەمرێت، لەدەرەوەی ئەمە بیر لەشتێکی دیکە ناکاتەوە و بەشێوەیەکی دیکە ناژیت و شتێکی دیکەش شایستەی خۆی نابینێت. ئیدی "بێریتان" ئەمەی بەرجەستە کرد، بۆیە سەرۆك ئاپۆ گووتی:" خەتی مـن خەتی شەهید بێریتانە" واتا خەتێکە بەرخۆدان، ئازادی، دیموکراسی، سەرکەوتن و یەکسانی بەبنەما وەردەگرێت. خەتێکە کۆیلایەتی، بالادەستی، تەسلیمییەت، خیانەت و بەکرێگیراوێتی رەتدەکاتەوە. بۆیە سەرۆك بەهایەکی مەزنی بە "بێریتان" دا. ئیدی لە کەسێتی "بێریتان" دا، ملیتانێتی (PKK) و تەرز و بەپراکتیکبوونی ئەو بەدیهات. بۆیە کاریگەرییەکی مەزنی خۆی کرد. تەنانەت ئەو پێشمەرگەیەی خواستی "بێریتان" تەسلیم بگرێت، کە بینی تەسلیم نەبوو و خۆی بەمشێوەیە پارچە پارچە کرد، کەوتە ژێر کاریگەری ئەو هەڵوێستەی "بێریتان"ەوە. تەنانەت ئەو پێشمەرگەیە و هەندێك لە پێشمەرگەکانی تر نەفرەتیان لەخۆیان کرد، ئەمە دەزانرێت وباسدەکرێت...

لەساڵی (١٩٩٠) بەدواوە، بەتایبەتی دوای سەرهەڵدانەکان لە تورکیا و باکووری کوردستاندا لەژێر ناوی بکەری نادیار (فاعیلی مەجهول) بە هەزاران کەسی سیاسی و رۆشنبیر و وڵاتپارێز دەکوژرێن. لەلایەکی دیکەشەوە پیلانگێرییەك بەناوی "پیلانی ئەشرەف بەدلیسی" کە ژەنراڵێکی سوپای تورکیا بوو، ئەو کاتە وەك پیلان و کۆنسێپتێك دەردەکەوێتەڕوو، لەو کاتەدا چوارچێوەی ئەو تاوانانەی لەژێر ناوی "بکەری نادیار" ئەنجامدەدران و ئەو پیلان و کۆنسێپتەی "ئەشرەف بەدلیسی" دایڕشتبوو چ سیاسەتێك لەبەرامبەر تەڤگەری کورد و گەلی کورد بەڕێوە دەچوو؟ ئەو دەرئەنجامانەی کەوا لەگەڵ خۆیدا

## هێنای چیبوو؟ بۆچی لەو کاتەدا ئەم هەموو شالاوە لەدژی گەلی کورد و تەڤگەر ئەنجامدەدرێت؟

دەوڵەتی تورکیا بەشەڕی (١٩٩٢) دەیخواست زەبرێکی مەزن لەتەڤگەر بدات. بۆیە ئەگەر لەباشووردا ئەنجام بەدەستبخات، لەسەر ئەو بنەمایەش لەباکوور هەنگاوی دووەم بهاوێژێت و بەمەش پیلانی خۆی دژ بەتەڤگەر تەواو بکات. بۆیە لەباکوور هەڵمەتێکی لەدژی تەڤگەر دەستپێکردبوو، بە کۆمەڵکوژی رووبەڕووی گەل و گەریلا دەبۆوە، دەوڵەت لەبەرامبەر سەرهەڵدانەکاندا کۆمەڵکوژی ئەنجامدەدا، ئەوەی بەشداری لەسەرهەڵدانەکان دەکرد دەستگیری دەکرد و دەیکوشت، ئەشکەنجە و کۆمەڵکوژی مەزنیان بەڕێوە دەبرد. ئۆپەراسیۆنی مەزنیان لەسەر گەریلا دەکرد و بەرفراوانیان دەکرد، بەمە دەیانخواست ئامادەکاری بۆ شەڕی (١٩٩٢) بکەن، لەباشووردا گورز لەتەڤگەر بوەشێنێت، لەباکووریشدا ئەوەی دەستپێکردووە بەردەوامی بکات و تەواو ئەنجامگیر ببێت. سیاسەتێکی بەمجۆرەی بەڕێوە دەبرد. ئیدی لەبەر ئەوەی لەباکوور لەزۆر هەرێمدا لەگوندەکان و شارەکاندا کۆمەڵکوژییان لەبەرامبەر گەل ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی سەرهەڵدانەکان دابمرکێننەوە و رێگیری لە پەرەسەندنی سەرهەڵدانەکان بکەن و گەل بترسێنن، لەناو گەلدا، ئەوانەی پێشەنگایەتی سەرهەڵدانەکانیان دەکرد، دەیانکردنە ئامانجی خۆیان، تاکو ئەوانە هەموویان تەسفیە بکەن. بەمەش گەل بێ پێشەنگ و بێ رێکخستن بهێڵنەوە و رێگیری لە گەورەبوونی سەرهەڵدانەکان بکەن. ئەگەر توانیان رێگیری لەسەرهەڵدانەکان بکەن، ئەوا دەتوانن گەریلا و تەڤگەریش تەنگەتاو بکەن، چونکە سەرهەڵدانەکان لەهەموو روویێکەوە گەریلای بەهێز دەکرد، هەم تەڤلیبوون بۆ ریزەکانی گەریلا زیاتربوو، هەمیش لەبەر ئەوەی سەرهەڵدانەکان لە گوند و شارەکان پێشدەکەوت، گۆڕەپانی جموجۆڵکردنی گەریلای فراوانتر دەکرد، چونکە دەوڵەت ناچاردەبوو هەندێك هێزی خۆی لەشارەکاندا جێگیر بکات بۆ ئەوەی رێ لەپێش سەرهەڵدانەکان بگرێت، بەمەش نەیدەتوانی بەهەموو هێزی خۆیەوە بێتە سەر گەریلا، گەریلاش سوودی لەمە دەبینی و جموجۆڵی خۆی زۆر بەهێز دەکرد، ئیدی بۆ ئەوەی

هەم رێ لەپێش تەفلیبوون بۆ ریزەکانی گەریلا بگرێت. هەمیش گۆڕەپانی جموجۆڵەکانی گەریلا بەرتەسك بکەنەوە، تاکو بتوانن گەریلا بخەنە ژێر کۆنترۆڵەوە و گورزی لێبوەشێنن، قورسایی خستە سەر گەل، هەوڵیان دەدا کە چۆن بتوانن رێگیری لەسەرهەڵدانەکان بکەن، چۆن رێکخستنی ناو گەل پەرشوبلاوە پێبکەن، بۆیە بەزۆری گەلیان کردە ئامانج، هەم بەخۆیان و هەم بە جاشەکان، هەم رێکخراوە چەکدارییە نهێنییەکانی وەك "حزبوڵڵا"، هێرشیان دەکردە سەر گەل، گوایە "حزبوڵڵا" رێکخستنێکی ئیسلامییە و بۆ کوردان خەبات دەکات، کەچی رێکخستنێکی بەمجۆرە نەبوو و لەبنەڕەتدا دەوڵەت خۆی رێکخستنێکی بەناوی "حزبوڵڵا" دروستکرد، بەرێی ئەو رێکخستنەوە کوشتن و کۆمەڵکوژی ئەنجامدەدا، کە لەرووی حقوقی و سیاسییەوە تورکیا تەنگەتاو نەبێت و هیچ بەرپرسیارێتییەك نەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەتەوە، دەوڵەتی تورکیا لەوجۆرە تاکتیکانەدا زۆر زیرەکە. هەم کاریگەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە تورکیا بشکێنێت و پووچەڵی بکاتەوە، چونکە ئێرانیش دەیخواست شۆڕشی ئیسلامی لە تورکیادا پێشبخات. رێکخستنەکانی سەر بە ئێرانیش لەنێو تورکیادا هەبوون، هەم ئەو رێکخستنانەی ئێران پووچەڵ بکاتەوە و هەمیش بەم ناوە گورز لەتەفگەر و گەلی کورد بوەشێنێت و هیچ بەرپرسیارێتییەکیشی نەکەوێتە ئەستۆ. تاکتیکێکی بەمجۆرەی بەڕێوە دەبرد، هەڵبەتە هەرخۆیان کۆمەڵکوژییەکانیان ئەنجام دەدا، هەم بەئاشکرا و هەمیش بە نهێنی.

تورکیا لەم تاکتیکەی خۆیدا و لەکرداری "بکەری نادیار"دا هەم رێکخستەبوونی خۆی تۆکمەیە و هەمیش پراکتیکی خۆی بەهێزە، بۆیە لەم رووەوە ئەزموونێکی گەورەی هەیە، زۆر شت دەکات و کەسیش نازانێت کێ دەیکات و چۆن ئەنجام دەدرێت؟ هیچ شوێن پەنجەیەکی لەسەر تاوانەکە نامێنێت. لەم رووەوە رێکخراوێکی "کۆنترا گەریلا"ی نهێنییان هەیە، ئەو رێکخراوە هەموو ئەو تاوانانە ئۆرگانیزە دەکات و بە چەندین ناوی جیاوازەوە ئەو تاوانانەش ئەنجام دەدات. ئامانجی ئەوەیە کە رێ لەپێش تەفگەر بگرن و گورزی لێبوەشێنن. بۆیە لەو قۆناخەدا ئەو تاوانانەیان پەرەپێدەدا.

کاتێك کە سەرۆك بینی وا پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی لەدژی تەفگەری (PKK) دادەڕێژرێت. چونکە لەشەڕی خیانەتی (١٩٩٢)دا ئەو راستییە ئاشکرابوو. نەك تەنیا

هێرش و پەلاماری دەوڵەتی تورکیا لەسەر تەڤگەر هەبوو، بەڵکو ناتۆ (NATO) و هێزی نێودەوڵەتیشی خستبووە نێو جموجۆڵەوە و موداخەلەی کردبوو، وادیاریش بوو کە موداخەلەکە بەهێزتر و پەرەسەندووتریش بکەن. ئەمەش مەترسیدار بوو. سەرۆك بینی کە ئەگەر بەو شێوەیە تەڤگەر بەردەوام ببێت ئەوا گورزی بەردەکەوێت، بۆیە سەرۆك خواستی گۆڕانکارییەك لە تاکتیکدا بکات. واتا بۆ ئەوەی رێگیری لە مەترسییەکان بکات و تەڤگەر نەکەوێتە نێو تەنگەتاوییەوە، ئەمە لەلایەك. لەلایەکی دیکەشەوە؛ تا ئەو کاتە ئێمە کێشەی کوردمان لەهەموو رووێکەوە دەرخستبووە روو و کێشەکە بۆ چارەسەری پێگەیشتبوو، بۆ ئەوەی کێشەی کورد بکەوێتە سەر راستەڕێی سیاسی و چارەسەر ببێت، دۆخ و توانستی ئەمە دروستببوو. بۆیە سەرۆك خواستی ئیدی تەڤگەر بخاتە سەر رێی سیاسیش، تاکو بەمەش رێگەی دیالۆگ و چارەسەری بکاتەوە. ئیدی لەم پێناوەدا لەساڵی (١٩٩٣)دا ئاگربەستی خستە رۆژەڤەوە. بێگومان لەناو دەوڵەتیشدا هەندێك دەوروبەر دەیانخواست ئاگربەستێك بکرێت، ئەو داخوازییەیان بەرێگەی "جەلال تالەبانی" گەیاندبووە سەرۆك. سەرۆکیش بینی کە هەندێك داخوازی بەمجۆرەش هەیە، کێشەکەش دەرکەوتۆتەڕوو و پێگەیشتووە، بۆ ئەوەی بکەوێتە سەررێی چارەسەری رەوشەکە گونجاوە. هەروەها هێرش و پەلاماری پڕ چڕوپڕ و مەترسیداریش لەئارادایە، بۆ ئەوەی ئەمەش پووچەڵ بکرێتەوە، بۆ ئەوەی شەڕ دژوارتر نەبێت و تەڤگەریش بکەوێتە سەررێی چارەسەری سیاسییانەوە، ئەوا لەساڵی (١٩٩٣)دا ئاگربەستی خستە رۆژەڤەوە. بەمەش خواستی ئیدی کێشەی کورد بەرێی سیاسی چارەسەر بکات...

# با چەکەکان بێدەنگ بن...!!

**لەو قۆناخەی کەوا ئاگربەستی یەکلایەنە رادەگەیەنرێت "تۆرگوت ئۆزال" ی سەرۆك کۆمار کە لایەنگری ئاگربەستەکە بوو بەشێوەیەکی پڕ گوماناوی دەمرێت، یان بڵێین دەکوژرێت. لەلایەکی دیکەشەوە زۆر گێرەشێوێنی (پراواکسیۆن)یش هەم لەنێو ریزەکانی گەریلادا و هەمیش لەنێو ریزی دەوڵەتدا روودەدات. بەڵام وەك دیار دەبێت ئەو مردنە گوماناوییەی "ئۆزال" و ئەو کارە گێرەشێوێنییانە پەیوەندییان بەدۆخی ئاگربەستەکەوە هەیە. ئیدی وەك بڵێی ئاگربەستەکە بەکرداری تێکدەچێت، کەواتە تێکچوونی دۆخی ئاگربەستەکە لەبەرژەوەندی کێدا بوو؟ بۆچی یەکەمین ئەزموونی ئاگربەست دەگاتە ئەو ئاکامە؟ لەرەوشێکی وەهادا خودی ئاگربەست بەچ واتایەك دێت؟**

بێگومان لە تورکیادا "تۆرگوت ئۆزال" لەهەمموو کەسێك زیاتر لەدژی ئێمە شەڕی کردبوو. کاتێك کە سەرۆك وەزیرانیش بوو لەهەمموو لایەکەوە پەلامار و هێرشی دەهێنایە سەر تەڤگەرەکەمان و خواستی گورزێك لەتەڤگەر بدات. بەڵام بینی کە بە سەربازی ناتوانێت ئەنجام بەدەستبخات. واتا چەندە شەڕیش مەزن دەکەن، بەڵام ئەنجام ناگرن، ئەو شەڕە تادێت بۆ تورکیا گران و دژوارتر دەبێت و رۆژ بەرۆژ تورکیا وێران

دەكات، بۆیە كاتێك كە بووە سەرۆك كۆماریش خواستی هەڵوێستێكی نوێ بۆ كێشەی كورد پێشبخات.

"تۆرگۆت ئۆزال" ئەو راستییەی بینیبوو كە؛" لەمێژوودا نكۆڵی لە كورد كراوە و لەناوبردراوە، كورد رابووە سەرهەڵدانی بەرپا كردووە و گورزی بەركەوتووە و شكاوە و دیسان سەریهەڵداوەتەوە و بەمشێوەیە هاتووە، واتا نە كورد سەركەوتنی بەدەستهێناوە نە دەوڵەتی توركیاش بەتەواوی تەسفیەی كردوون و ئەنجامگیر بووە..." ئۆزال لەوە تێگەیشت كە بەمشێوەیە ئەو كێشەیە چارەسەر نابێت، تادێت ئەو كێشەیە بۆ توركیا وێرانكاری مەزنتر دێنێت. بۆیە دەیخواست مامەڵەیەكی نوێ پێشبخات. بۆ نموونە؛ دەیگووت:"با كێشەی كورد گفتوگۆی لەسەر بكرێت، تەنانەت با لەسەر فیدراسیۆن (فیدراڵی)یش گفتوگۆ بكرێت" ئەمە لە توركیادا لەرووی فەرمییەوە یەكەمجار بوو گوزارشتی لێدەكرا. تا دەكاتە "ئۆزال" هیچ كەس و دەزگایەكی نێو دەوڵەت نەیدەگووت:" كێشەی كورد هەیە" كەس نەیدەگووت:"با ئەو كێشەیە چارەسەر ببێت، با گفتوگۆی لەسەر بكرێت". یەكەمجار "ئۆزال" گووتی:" ئەو كێشەیە هەیە، با گفتوگۆیشی لەسەر بكرێت، تەنانەت با لەسەر فیدرالیزمیش گفتوگۆ بكەین" ئەمەش مامەڵەیەكی نوێ بوو. "ئۆزال" لەلایەكەوە؛ دەیخواست ئەو گفتوگۆیە بخاتە ناو توركیا و ناو سیاسەت و دەزگاكانی دەوڵەتەوە، بۆ ئەوەی بزانێت كاردانەوەی چیدەبێت؟ دەیخواست لەمەش تێبگات.

لەلایەكی دیكەشەوە، پەیوەندی خۆی لەگەڵ هێزەكانی باشووری كوردستانیش پێشخستبوو، ئەوەبوو خواستیان بەهاوكاری ( پ د ك ـ ی ن ك) گورزێك لە (PKK)ش بدەن، دیسان نەیانتوانی تەسفیەی بكەن. واتا بینیان ئەگەر بەو شێوەیە بەردەوام بكات ئەوا ناتوانن ئەنجام بگرن. بۆیە "تۆرگۆت ئۆزال" نزیكبوونەوەیەكی نوێی پێشخست، بۆئەمەش بەرێگەی "جەلال تاڵەبانی" و هەندێك رۆژنامەوانەوە هەواڵی بۆ سەرۆك نارد كە "ئەگەر ئاگربەستێك بكرێت ئەوا ئێمە دەكرێ بتوانین رێی دیالۆگ بكەینەوە" گووتبووی:" ئەگەر ئاگربەستێك بكرێت ئەوا منیش هەندێك هەنگاو دەهاوێژم" تەنانەت گووتبووی:" من هەندێك لەژەنراڵەكانم قەناعەت پێهێناوە و دەتوانم

قەناعەتیش بەوان بهێنم" "ئەشرەف بدلیسی"ش لەگەڵ "تۆرگۆت ئۆزال" جموجۆڵیان دەکرد. لەبنچینەدا ئەو سیاسەتە لەلایەن "تۆرگۆت ئۆزال"ەوە لە تورکیادا پێشخرا.

بێگومان سەرۆکیش وەڵامی ئەوەی دایەوە. وەکو گووتم؛ ئامانجی ئێمە ئەوە بوو بەشەڕ کێشەی کورد دەربخەینەڕوو و بیناسێنین و بەهەر کەسێك بەپەسندکردنی بدەین. ئەمەش تاڕادەیەك بەدیهاتبوو. واتا ئەوەی پێویستبوو بەشەڕ بکرابایە کرا، ئیدی پێویستبوو کێشەکە بکەوتبایە سەر راستەڕێی سیاسی و چارەسەر ببایە، ئێمەش لەنێو لێگەڕین و لێکۆڵینەوەی وەهادا بووین، کاتێك کە "تۆرگوت ئۆزال" بەرێگەی "جەلال تاڵەبانی" و هەندێك لە رۆژنامەوانانەوە ئەو هەواڵەی نارد، سەرۆکیش لەسەر ئەو بنەمایە ئاگربەستی پێشخست، بۆ ئەوەی رێی دیالۆگ و سیاسەت و دیموکراسییەتبکرێتەوە و کێشەکە بکەوێتە سەر رێی چارەسەری.

بێگومان لەنێو دەوڵەتدا ئەوانەی لەدژی ئەو سیاسەتەی "ئۆزال" بوون بەهێز بوون. واتا ئەوانەی دەیانخواست رێی دیالۆگ بکەنەوە لاواز و کەم بوون. ئەوانەی سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردنیان بەبنچینە وەردەگرت، بەهێزتر و باڵادەستتریش بوون. لەهەلومەرجێکی بەمجۆرەدا ئاگربەست راگەیەنرا، بۆیەش ئەوانەی سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردنیان بەبنچینە وەردەگرت هەوڵیان دەدا ئاگربەستەکە تێك بدەن.

لەناو ئێمەشدا "شەمدین ساکیك" پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا هەبوو. بێگومان ئێمە ئەمانزانی بوو. ئەوانە پێکەوە هەوڵیاندا بۆ ئەوەی ئەو ئاگربەستە تێك بدەن. ئیدی کەسێکی نێو "کۆنترا گەریلا" هەیە نازناوی پەشیل (مەحموود یڵدرم)ە . لەنێو دەوڵەتدا ئەو کەسە و لەنێو ئێمەشدا "شەمدین ساکیك" پێکەوە هەوڵیان دەدا، کە چۆن ئەو دۆخی ئاگربەستە تێك بدەن؟ هەڵبەتە لەلایەکەوە ئەوانەی سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردنیان بەبناخە وەردەگرت ئۆپەراسیۆنەکانیان دژ بەگەریلا بەردەوام دەکرد. واتا دەیانخواست ئێمە بوروژێنن (تحریض) و کاردانەوە نیشان بدەین، بۆ ئەوەی ئاگربەستەکە کۆتایی پێبێت. لەلایەکی دیکەشەوە؛ وادیارە راوەستەیان لەسەر "تۆرگۆت ئۆزال" و "ئەشرەف بدلیسی" کردووە کە چۆن بتوانن ئەوانە لەناوببن!! ئامادەکارییان بۆ ئەو هەنگاوانەش کردووە.

ئیدی لەو کاتەدا لەشاری "بینگۆل" کە سی و سێ سەرباز بەمۆڵەت دەگەڕێنەوە، "پەشیل" و "شەمدین ساکیك" پێکەوە ئەو پیلانە دادەڕێژن "پەشیل" بە "شەمدین ساکیك" رادەگەیەنێت "شەمدین ساکیك"یش دەچێت و ڕێیان پێدەگرێت و ئەو سەربازانە دەکوژێت. کاتێك کە ئەو کارە گێرەشێوێنی (پراواکسیۆن)ە ئەنجام درا، ئیدی ئاگربەستەکە تێکچوو. ئەگەر تێکیشچوو لەناو ئێمەدا "شەمدین ساکیك" و لەدەرەوەی ئێمەشدا ئەو کەسەی بەناوی دەوڵەتەوە جموجۆڵی کردووە پەشیل تاوانبارن و رۆڵێکی مەترسیداریان بینی.

ئیدی دیسان قۆناخی شەڕ دەستی پێکردەوە. واتا ئەو قۆناخە شێوێنرا و پووچەڵکرایەوە. "شەمدین ساکیك" وا زانیاریی بەئێمە دابوو کە گوایە سوپای دەوڵەتی تورکیا ئۆپەراسیۆنی دەستپێکردووە، لەئاکامدا شەڕ دەرکەوتووە و لەشەڕدا ئەو سەربازانە کوژراون. "شەمدین" زانیاری هەڵەی بەئێمە دابوو.

هەڵبەتە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك ئینجا لەسەر ئەو مەسەلەیە راوەستەمان کرد، کە ڕووداوەکە چۆن بووە و چۆن نەبووە. ئەو کاتە گووتمان:" تا ئێمە لەراستی مەسەلەکە تێنەگەین لەم بارەیەوە هیچ بەیاننامە و لێدوانێك نادەین" پاشان کە بینیمان هیچ شەڕێك لەوێ ڕووینەداوە، بەڵکو ئەو سەربازانە بەمۆڵەت دەگەڕێنەوە و بەبێ چەك سواری ترومبێل بوونە و "پەشیل" و ئەوانیش زانیارییان بە "شەمدین"داوە. هەڵبەتە پێکەوە ئەو پیلانەیان داڕشتووە، وەك بڵێی ئەو پیلانە پێك بێت و ئەو قۆناخە تێکبدرێت، لەناو دەوڵەتدا ئەوانەی نکۆڵی و قرکردن بەبنەما وەردەگرن ئەو دۆخە گێرەشێوێنییەیان ئامادەکردووە. واتا بە ئەنقەست سەربازی بێ چەکیان خستووەتە نێو ترومبێلەوە و زانیاریشیان بە "شەمدین"داوە، "شەمدین"و ئەوانیش چوونە و پێش ئەوانیان گرتووە، بۆسەیان داناوەتەوە و هەموویان لەترومبێل داگرتووە و بردوویانن و کوشتوویانن. ڕووداوەکە بەمجۆرەیە.

ئیدی تا ئێمە لەراستییەکان تێگەیشتین، قۆناخەکە شێوێنرابوو و پراواکە کرابوو. هەڵبەتە دەوڵەت لەهەموو لایەکەوە کەوتبووە نێو هێرشێکی مەزنەوە. بەمجۆرە ئەو قۆناخە تێکچوو. بێگومان ئەوانەی نکۆڵی و قرکردنیان بەبنەما وەردەگرت "تۆرگۆت ئۆزال" و "ئەشرەف بدلیسی" و ئەوانەشیان هەموو تەسفیە کرد، ئەمان تۆڵەی خۆیان

لەوان کردەوە. چونکە ئەمە بەخیانەت تێدەگەیشتن، ئەو نزیکبوونەوە و خەتەی "تۆرگۆت" و ئەوان پێشیاندەخست بەخیانەتیان دەزانی و لەم چوارچێوەیەدا مامەڵەیان لەگەڵدا کردن. بۆیە ئەوانیان تەواو تەسفیە کرد...

**لەگەڵ بەرزبوونەوەی تێکۆشانی تەڤگەری (PKK)، بەتایبەتی تێکۆشانی چەکداری؛ گەلی کورد لەباکووری کورستان و تورکیادا دەرفەتی خەباتی سیاسی بۆ دەرەخسێت و دەگاتە ئیرادەیەکی سیاسی سەربەخۆ، تەنانەت لەقۆناخی پارتی رەنجی گەل (HEP)دا کورد دەبنە پەرلەمانتاریش، بەڵام وەکو دیاریش دەبێت ئاتمۆسفێرێکی ئەوتۆ لەئارادا نییە کە کوردان وەك نوێنەرایەتی لە پەرلەمان دابقورتێنێت، ئەو سەرەتایە چۆن هەڵدەسەنگێنرێت، لەکاتێکدا کورد دەکەونە پەرلەمانەوە بەڵام پاشان دەستگیریش دەکرێن...؟!!**

ئەو کاتە وەك چۆن تەڤگەر ئەزموونێکی ئاگربەستی نەبوو، بەهەمان شێوە ئەزموونێکی پەرلەمانیشی نەبوو، تازە لەنێو ئەو ئەزموونەدا دەژیا. بێگومان ئەو نزیکبوون و سیاسەتە فەرمییەی دەوڵەتی تورکیا کاریگەری خۆی لەسەر ئێمەش هەبوو، ئێمەش نەماندەتوانی هەروا زووبەزووی باوەڕ بەدەوڵەتی تورکیا بکەین، چونکە لەمێژوودا هەمیشە کوردان هەنگاویان هاوێشتووە و نیازێکی باشیان نیشانداوە، کەچی لەهەمووشیاندا زەبری بەرکەوتووە. ئەگەر مرۆڤ لەمێژوو بڕوانێت دەتوانێت ئەم راستییە ببینێت. ئەم بڕوایە لەلای کوردان و لەلای ئێمەش دروستببوو کە؛ مرۆڤ ناتوانێت زووبەزووی باوەڕ بە تورکیا بکات. بۆچی؟ چونکە وەك دەڵێن؛ لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا فێڵ و لەیستۆك زۆرن، لە دەوڵەتی تورکیاشدا بەهەمان شێوە

فێڵ و پیلانگێڕی زۆر زۆرن، ئەمەش راستە. تەنانەت بۆ دەسەڵات برا برای خۆی کوشتووە، مێژوویێکی بەمجۆرە هەیە. هەر بۆیەش ئێمە نەماندەتوانی زووبەزوو باوەڕ بەتورکیا بکەین، تەنانەت نەماندەتوانی هەروا باوەڕ بە هەڵوێست و نزیکبوونەوەکەی "تۆرگۆت ئۆزال"یش بکەین، هەرچەندە ئەو هەنگاوەی ئاگربەستیشمان هاوێشت، لە مەسەلەی (HEP) دا ئەو هەنگاوەمان هاوێشت بۆ پەرلەمان، هەمیشە بەتەدبیرەوە هەنگاومان دەهاوێشت. تۆبڵێی کۆتاییەکەی چۆن بێت؟ داخوا چ بەسەر ئێمەدا دێت؟ هەمیشە بیرمان لەو مەسەلانە دەکردەوە. ئێمە ناحەق نەبووین. چونکە لەمێژوودا هەمیشە کوردان هەر رێککەوتنێکیان لەگەڵ تورکان کردووە، ئەم رێککەوتنە لەئاکامدا لەدژی کوردان بەکارهێنراوە. نەك هەر ئاگربەست یان ئاشتی بەدینەهاتووە، تەنانەت ئاکامەکەی بەپیلانگێڕی و کۆمەڵکوژی تەواو بووە. هەربۆیە ئەمەش کاریگەری لەسەر ئێمە هەبوو. هەرچەندە ئێمە ئاگربەستمان راگەیاندبوو، دەمانگووت:" تۆ بڵێی بەڕاستی دەوڵەتی تورکیا ئەمە پەسند بکات؟ تا چەند مەسەلەی کورد پەسند دەکات و تا چەند دەخوازن رێی دیالۆگ بکەنەوە؟" ئێمە بەتەواوی باوەڕیمان پێی نەبوو. ئێمە دەمانگووت:" ئەوانە دەخوازن کات قازانج بکەن و ئێمە خاوبکەنەوە و گورزمان لێبوەشێنن". چونکە ئێمە گووتبوومان پێویستە ئۆپەراسیۆنەکان رابوەستن، ئۆپەراسیۆنەکانیش رانەدەوەستان. ئێمەش دەمانگووت:"داخوا ئەوانە بەم ئاگربەستە ئێمە دەخەنە نێو تەڵەیەکەوە و گورزمان لێبدەن؟ ئەمە وایدەکرد کە ئێمەش زێدە پێداگری لەسەر ئاگربەست نەکەین. ئەمە کەشوهەوا و ئاتمۆسفێرێکی وەهای دروستدەکرد.

بێگومان ئەمە پاشان دەرکەوت کە کێماسی ئێمەیە. راستە کە راستینەی دەوڵەتی تورکیا وەهایە، لەنزیکبوونەوەکانی خۆیشیدا هەمیشە پیلانگێڕی بەبنچینە وەردەگرت، بەڵام ئەگەر وەهاش بێت، دیسان پێویستە ئێمە بەتەدبیر نزیك ببینەوە، بەڵام لەرووی ئاگربەستیشەوە پێویستبوو ئێمە زیاتر پێداگریمان بکردبایە، ئێمە کە بینیمان ئەوانە زێدە رێز لەئاگربەستەکە ناگرن و دەخوازن ئاگربەستەکە پێشێل بکەن، ئێمەش زێدە پێداگریمان لەسەر نەکرد. بێگومان ئەوە خەتای ئێمە بوو، پێویستبوو کە ئێمە پێداگریمان بکردبایە. کەچی ئەگەر ئێمە ئەو کاتە پێداگریمان بکردبایە ئەوا لەوانەبوو

هەندێك هەنگاو بۆ دیالۆگ پێشکەوتبایە، لەوانەیە رەوشەکە وەکو پاشان پەرەیسەند بەو شێوەیە پەرەی نەسەندبایە، ئیدی ئەمە لەبێ ئەزموونی ئێمەوە سەرچاوەی گرتبوو.

لەمەسەلەی پەرلەمانتارەکانیشدا وەهابوو، بۆ نموونە؛ بۆ یەکەمجار گروپێکمان خستە نێو پەرلەمانەوە، گروپێکی بەهێز بوو. بێگومان دەوڵەت دەیخواست بەرێگەی **پارتی گەلی سۆسیالیست** (SHP) ئەو هەنگاوەی ئێمە پووچەڵ بکاتەوە، واتا رێکخستنی پارتی رەنجی گەل (HEP) بەرێگەی (SHP) وە بیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و دەوڵەت بتوانێت کەناڵیزەی بکات و بەدەوڵەتەوە پەیوەستی بکات و بەمشێوەیە پووچەڵی بکاتەوە. چونکە ئەو هەنگاوە گرنگ بوو. واتا هەم هەنگاوی گەریلا و هەم هەنگاوی سیاسی یەکدیان تەواو دەکرد. تەڤگەری دەکردە تەڤگەرێکی سیاسی و کێشەی کوردی لەهەموو رووێکەوە دەردەخستە روو و چارەسەری دەهێنایە پێشەوە، ئەگەر ئەو هەنگاوە پووچەڵ بکرێتەوە تەنیا بەهەنگاوی گەریلا ناتوانرێت چارەسەری پێشبخەین. دەوڵەت ئەمەی دەزانی، وەك چۆن دەیخواست ئاگربەستەکە پووچەڵ بکاتەوە. واتا لەهەردوو لاوە کاری دەکرد، تا هەردوو هەنگاوەکە بێکاریگەر بکات. ئیدی لەبەر ئەوەی ئەزموونی ئێمە زێدە نەبوو، ئێمە نەمانتوانی هەوڵدانەکەی ئەوان پووچەڵ بکەینەوە. لێرەدا ئێمە کەوتینە خەتاوە و ئەوان سەرکەوتن. واتا ئەو هەنگاوەی هەم لەرووی گەریلاوە هەمیش لەرووی سیاسییەوە هاوێشتمان دەیانخواست تێکیبدەن، خراپیشیان کرد. نەك لەبەر ئەوەی ئەوان پڕ زیرەك بوون، راستە ئەزموونی بەهێزیان لەمبارەیەوە هەبوو و توانستی خۆشیان زۆربوو، بەڵام ئێمەش بێ ئەزموونیمان هەبوو و سوودیان لەمەدا بینی و بۆیە ئەو هەنگاوانەیان تێکدا و سەرکەوتن.

**دوای تەواوبوونی شەڕی (١٩٩٢) نزیکەی هەزار و چوارسەد گەریلا دەنێردرێتە کامپی زەڵێ. وەك بڵێی لە زەڵێ سیاسەتێك بۆ توانەوەی کادیران بەرێوە دەچێت، ئەوەی ئەو کاتە (١٩٩٢ ــ ١٩٩٤) لەوێ دەبینرا شتێکی جودا لە ژیان و پێوانەی شۆڕشگێڕێتی بوو. ئەمە**

**سیاسەتێکی بۆداڕێژراو بوو یان ڕەنگدانەوەی دۆخی دوای شەڕی (١٩٩٢) بوو؟ چونکە زۆربەیان لەنێو شکستێکدا دەژیان و جۆرە بێئومێدی و دەست لەبەرخۆدانێك دیاربوو و ڕەنگدانەوەی خۆی لەسەر سایکۆلۆژیای کادیرانیشدا هەبوو؟ ئەمە چۆن شرۆڤە دەکرێت؟ چونکە دوای ئەوەی موداخەلەی ڕێکخستن و تەڤگەر لەسەر ڕەوشی ئەو کامپە دێتەئاراوە، زۆر فشار و هێرشی ئاسمانی زۆر چڕوپڕ لەسەر ئەو کامپە دەکرێت...**

بێگومان لەو کامپەدا شتی بەئەنقەست و داڕێژراو بەڕێوە دەبرا، کە "فەرهاد" بەئەنقەست پەرەیپێدەدا. چونکە خۆی لەدژی سەرۆك و خەتی سەرۆك بوو. بۆیە دەیخواست خەتێکی دیکە لەوێ پێشبخات، دەیخواست ئەو کادیرانە لەخەتی تەڤگەر دەربخات و بیانکاتە کادیری شەخسی خۆی. لەوێ خەتێکی دیکە بەو کادیرانە پێشبخات و بەمەش لەنێو هەموو پارتیدا زاڵی بکات و پارتی بەتەواوی بخاتە سەر ئەو خەتەوە. "فەرهاد" هەوڵدانێکی بەئەنقەست و بۆداڕێژراوی لەوێ بەڕێوە دەبرد، شەڕێکی بەمجۆرەی لەدژی خەتی سەرۆك پێشدەخست. زێدەتریش سوودی لەچیدا دەبینی؟ ئەو کاتە شەڕێکی مەزن ڕوویدابوو، تەنانەت تا ئەو شەڕە تەڤگەر گورزی بەرنەکەوتبوو. بێگومان لەو شەڕەدا ئەوەی کادیران مەزنەدەیان نەدەکرد ڕووبەڕوویان بووەوە. ڕێککەوتن، خیانەت و تەسلیمبوون ڕوویدا، لەوێوە ڕەوانەی "زەڵێ" کرابوون، ئەو کادیرانە هەم لەنێو شەڕێکی مەزندا دەرکەوتبوون، هەمیش لەسنووری باکووری کوردستان دوور کەوتبوونەوە، شوێنێکە هیچ نایناسێت. ئەو ڕەفتار و هەڵسوکەوتانەی (پ د ك ـ ی ن ك) لەگەڵیاندا کردبوویان بەچاوی خۆیان بینیان، بێگومان لەم ڕووەوە بەهەژانێکدا تێپەڕببوون، لەهەندێکیاندا ئیرادە شکابوو، لەهەندێکی تریان لەوانەیە ئیرادەیان نەشکا بووبێت، بەڵام دوودڵییەك دروستببوو. واتا بۆچی هاتوونەتە "زەڵێ" و لەوێ چیبکەن و کۆتاییەکەی چیدەبێت؟ بۆیە دوودڵییەك لەئارادا بوو، شکانێك هەبوو.

ئیدی "فەرهاد" دەیخواست لەو دۆخەی کادیراندا چەمکی خۆی پێشبخات. لەمەشدا سوودی وەرگرت.

بۆیە لەوێ ژیانێکی شەخسی پێشخست، خیتابی سۆزی ئەوانی دەکرد، داخوازییە شەخسییەکانی ئەوانی پێکدەهێنا و توانستی تەفکەری بۆ ئەمە خەرجکرد. بەمەش خواستی ژیانێکی جودا لەژیانی شۆڕشگێڕێتی لەوێ پەرە پێبدات، کەسێتییەکی جودا لەوێ دروست بکات، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو کادیرانە بەتەواوی لە پارتی دووربخاتەوە و ڕێکخستەیەکی دیکە لەناو تەفکەردا پێشبخات، بەمەش پارتی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بۆیە لە "زەلێ"دا پەرشوبڵاوییەك لەکادیراندا پەرەیسەند، چەمك و لێکەڕینی جودا جودای دەرەوەی تەفکەر دەرکەوتن.

بۆ نموونە؛ لەهەندێکیاندا نە باوەڕی بەتەفکەر و نە بەخودی خۆیشیان نەما بوو، لەهەندێکی تریشدا لەوانەیە باوەڕیان بەتەفکەر مابووبێت، بەڵام دوودڵیش هەبوو لەوەی کەوا داخوا کۆتایی ئەوان چیدەبێت؟ واتا هاتوونەتە زەڵێ کە وەك نیمچە زیندانێك وایە، داخوا لەوێدا دەردەکەون یان دەرناکەون؟ چۆن دەربکەون و چیبکەن؟ نەیاندەزانی. بۆیە لەنێو بێ باوەڕی و دوودڵیدا دەژیان. بێگومان کادیرانی پەیوەست بەتەفکەریش هەبوون. واتا ئەو هەڤاڵانە لەدژی ئەو چەمك و شێوە ژیانەی کەوا "فەرهاد" پەرەی پێدەدات رادەوەستان، بەڵام "فەرهاد" خۆی زاڵکردبوو، بۆیە لە زەڵێ زۆر تەخریبات و لادان لەو کادیرانەدا روویدا، "فەرهاد" دەیخواست ئەمە لەنێو تەواوی پارتیدا تەشەنە پێبکات، بۆ ئەوەی لەنێو تەواوی پارتیشدا تەشەنەی پێبکات، پێویستە ئەمە سەرەتا لە "زەلێ"دا پێشبخات و ئەنجامگیر ببێت و بەم کادیرانەش لەنێو تەواوی پارتیدا بڵاوی بکاتەوە. بەمشێوەیە پارتی لەسەر خەتی سەرۆك لابدات و سەرۆك بێکاریگەر بکات و لەسەر خەتێکی دیکە پارتی بخاتە دەستی خۆیەوە. "فەرهاد" لەنێو هەوڵدانێکی بەمجۆرەدا بوو...

**لە (١٩٩٤/٥/٢)دا لەنێوان ( پ د ك ـ ی ن ك) دا شەڕ و پێکدادان دەستپێدەکات، هەروەها لەنێوان (ی ن ك) و بزووتنەوەی ئیسلامیش**

**شەڕ و پێکدادان روودەدات. بەدەستپێکردنی ئەو شەڕ و پێکدادانە باشووری کوردستان دەکەوێتە نێو رەوشێکی زۆر مەترسیدارەوە. لێرەدا بەگشتی ئەو شەڕ و پێکدادانانە کاریگەری لەسەر تێکۆشانی نەتەوەیی - دیموکراتی چیبوو؟ هەروەها هەڵویستی (PKK) لەبەرامبەر ئەو شەڕ و پێکدادانانە چیبوو؟ (PKK) ئەو رەوشەی چۆن شرۆڤە دەکرد و چ نزیکبوونەوەیەکی پێشدەخست..؟**

کاتێك کە لەنێوان پارتەکانی باشووردا شەڕ بەرپا بوو، ئێمە ئەو شەڕەمان بەراست نەزانی. ئەو شەڕانە هەڵبوون، ئەمە دینامیکییەتی نەتەوەیی تێکدەشکاند و بە گەلی کوردی دەدۆڕاند، هەرچەندە ئەو شەڕانە لەباشوور روویدەدا، بەلام باشووریش پارچەیەکی کوردستانە، لەم بەشەشدا هەرچییەك روویدابایە کاریگەری خۆی لەسەر بەشەکانی دیکەی کوردستانیش دەکرد، کاریگەری خراپیشی دروستدەکرد و کاریگەری باشیشی دروستدەکرد. کاتێك ئەو پارتیانە لەناوخۆیاندا شەڕیان دەکرد؛ هەم دینامیکی نەتەوەیی خراپ دەبوو، هەمیش کاریگەری خراپی لەسەر گەل لەهەموو بەشەکاندا دروستدەکرد، باوەڕی گەل دەشکا، بۆیە کاریگەری خراپی هەبوو.

ئێمە ئەو شەڕەمان بەدەرفەتێك و هەلێك بۆ خۆمان نەزانی، ئێمە نەماندەگووت:" ئەو پارتیانە پێشتر لەدژی ئێمە رێککەوتبوون و لەگەڵ تورکیا پێکەوە هاتوونەتە سەر ئێمە و گورزێکی مەزنیان لەئێمە داوە، ئێستاش لەگەڵ یەکتردا شەڕدەکەن و با ئێمەش لەمە سوودمەند ببین" ئێمە وەها نزیك نەبووینەوە و هیچ کاتێك هەڵویستی وەهامان بەراست نەزانی. ئەوەمان نە لە بەرژەوەندی (PKK)دا بینی و نە لە بەرژەوەندی گەلی کورددا بینی. چونکە چەمکی ئێمە لەدژی ئەمە بوو، پێویستبوو دینامیکییەتی گەلی کورد وەها تێکنەشکێنرا بایە، هەڵبەتە دووژمن هەوڵ دەدات ئەو دینامیکییەتە تێك بشکێنێت، ئەگەر ئێمە خۆشمان هەوڵماندا تێکی بشکێنین ئەوا بۆ کوردان مەرگهێن و مەرگەساتە. ئەرکی ئێمە ئەوە نییە دینامیکییەتی کوردان تێك بشکێنین، بەڵکو

پێویستە ئەو دینامیکییەتە دەربخەینەڕوو و بەهێزی بکەین. ئەمە بوو ئەرکی سەرەکی ئێمە، بۆیە ئێمە لەدژی ئەو شەڕە راوەستاین و هیچ کاتێك نەبووینە لایەنێکی ئەو شەڕە.

بۆ نموونە؛ سەرەتا شەڕی نێوان (ی ن ك) و بزووتنەوەی ئیسلامی بەرپابوو، ئێمە نە هاوکاری بزووتنەوە و نە هاوکاری (ی ن ك)شمان کرد، واتا ئێمە نەبووینە تەرەف و لایەنگری هیچ لایەکیان، ئێمە نەبووینە لایەنگری (ی ن ك) لەدژی بزوتنەوەی ئیسلامی یان نەبووینە لایەنگری بزوتنەوەی ئیسلامی لەدژی (ی ن ك). کێ تەنگەتاو دەبوو دەهاتە لای ئێمە، ئێمەش ئەوانمان دەپاراست و لەم رووەوە هاوکاریمان دەکرد. بۆ نموونە کاتێك ئیسلامییەکان "قەڵادزێ"یان خستە دەستی خۆیانەوە، (ی ن ك)ییەکان تەنگەتاو بوون و هاتنە لای ئێمە و ئێمە ئەوانمان پاراست، ئەگەر وا نەبووایە ئیسلامییەکان ئەوانیان بگرتبایە دەیانکوشتن، ئێمە ئەوانمان پاراست. پاشان (ی ن ك) هێرشی بۆ سەر ئیسلامییەکان برد، هەندێك لە ئیسلامییەکانیش تەنگەتاو بوون و هاتنە لای ئێمە، ئێمە ئەوانیشمان پاراست، واتا نزیکبوونەوەی ئێمە لەسەر ئەو بنچینەیە بوو. بۆ نموونە؛ پاشان کاتێك کە لەنێوان (ی ن ك) و (پ د ك) شەڕ بەرپا بوو. لەو شەڕەشدا ئێمە نەبووینە لایەنگیر. بۆ نموونە؛ لەناوچەی بادینان (ی ن ك)ییەکان لاواز بوون و نەیاندەتوانی خۆیان بپاراستبایە، ئێمە خاوەنداریێتیمان لەوان کرد، زۆر کەسی (ی ن ك)یی هاتنە لای ئێمە و ئێمەش پاراستمانن و پێداویستییەکانی ئەوانمان پێکهێنا، تەنانەت خواستیان کە بچنە سلێمانی ئێمە هاوکاری ئەوانمان کرد و ئەوانمان گەیاندە سلێمانی. هەر بۆنموونە؛ (پ د ك) وا تێگەیشت کە ئێمە تەرەفگیری (ی ن ك) دەبین، ئێمە هیچ کاتێك لەو شەڕانەدا لایەنگیر و تەرەفگیری (ی ن ك) نەبووین. ئێمەش لەگەڵ (پ د ك) پەیوەندیمان بەست و گووتمان:" ئێمە لەو شەڕانەدا لایەنگیر نین، نە لەگەڵ ئێوە و نە لەگەڵ (ی ن ك)، ئێمە ئەو شەڕە بەڕاست نازانین". تەنانەت ئەو کاتە (پ د ك) زۆر مەمنوونیش بوو، مەزەندەی هەڵوێستێکی بەمجۆرەیان لە ئێمە نەدەکرد. تەنانەت بەگوێرەی رێککەوتنەکەی دوای شەڕی (١٩٩٢) دەبووایە دەستبەسەر چەکەکانی هەڤاڵان نەگرن، کەچی دەستیان بەسەر چەکی هەڤاڵانیشدا گرتبوو و نەیاندابوونەوە.

ئەو كاتە دوای ئەوەی زانیان كە تەرەفی (ی ن ك)مان نەگرتووە هەندێك لەو چەكانەیان داینەوە. واتا تا ئەو رادەیە لەهەڵوێستی ئێمە مەمنوون بوون.

ئەو شەڕانەمان بەراست نەدەزانی، هەوڵماندەدا كەوا ئەو شەڕانە رۆژێك زووتر رابوەستن، چیدی دینامیك و وزە و توانستی كورد تێك نەدرێت و بەفیڕۆ نەچێت و بەهەڵە بەكار نەهێنرێت. چونكە نەك تەنیا باشوور زەرەرمەند دەبوو، بەڵكو هەموو كوردستان زەرەرمەند دەبوو. ئیدی لەباشوور بۆ كوردان ستاتۆیەك دروستببوو، پەرلەمان و حكومەت دامەزرابوو، ئەمەش هیوایەكی دەبەخشی، ئەگەر كوردیش لەنێوان خۆیاندا شەڕ بكەن ئەوا پارچەبوونی زیاتر روودەدات، ئەمەش ئەو هیوا و ئاواتەی گەلی كوردی دەشكاند، كاریگەرییەكی خراپی دروست دەكرد، بۆیە ئێمە دەمانخواست رێ لەپێش ئەم شەڕە بگیردرێت، لەم پێناوەشدا هەوڵمان دەدا...

**لەساڵی (١٩٩٥)دا پێنجەمین كۆنگرەی (PKK) سازدەدرێت خاڵی هەرە سەرنجڕاكێش لەو كۆنگرەیەدا ئەو شرۆڤە و شیكردنەوە فەلسەفی و ئایدیۆلۆژییە بوو كە سەرۆك بۆ ئەو كۆنگرەیە پێشیخست. پێنجەمین كۆنگرە لەمێژووی تەڤگەری (PKK)دا خاوەن چ شوێنگەیەكە؟ رۆژەڤی سەرەكی كۆنگرە چیبوو؟ ئەو مەیل و چەمكانەی لەنێو كۆنگرەدا دەركەوتنەپێش چیبوون؟ هەروەها بڕیار و راسپاردەی هەرە گرنگی ئەو كۆنگرەیە چیبوو؟ پێم وایە تا ئەو كاتە ئەمە دووەمین كۆنگرە بوو كە سەرۆك خۆی تێیدا ئامادە نەبوو...**

سەرۆك لەكۆنگرەی چوارەم و پێنجەمیشدا نەیتوانی بەكرداری ئامادەی ئەو دوو كۆنگرەیە ببێت. بەڵام هەردوو كۆنگرەكەش سەرۆك ئامادەكاری بۆ كرد و لەسەر ئەو

ئامادەكارییانەش هەردوو كۆنگرە لەوڵات سازدران. هە -ەندە بەجەستە بەشداری لەو دوو كۆنگرەیە نەكرد، بەڵام لە ئامادەكردن و پێشخستن و ڕێكخستنی كۆنگرە و سەرخستنی كۆنگرەدا ڕەنجی سەرۆك تێیدا مەزن و سەرەكییە.

لێرەدا كاتێك كە كۆنگرەی پێنجەم كۆبۆوە، دەوڵەتی توركیا هێرشێكی مەزنی بۆ سەر تەڤگەر و گەل پێشخستبوو، زۆر گوندی چۆڵ و وێرانی كردبوو و سووتاندبووی، زۆر كەسی وڵاتپارێزی بە چەندین شێوە و بیانووەوە كوشتبوو، قۆناخی بكەری نادیار زۆر پەرەیسەندبوو، هەروەها زۆر ئۆپەراسیۆنی مەزنی لەسەر گەریلا ئەنجام دابوو. لەسەر گەل زۆر شێوازی كوشتنی بەڕێوە بردبوو، بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان گەریلا و گەل، گەریلا و سەرهەڵدانەكان و شارەكان بپچڕێنن، بەمەش بتوانن گورز لە گەریلا بوەشێنن، بە كۆنسێپتێكی ئەوتۆ شەڕیان بەرفراوان كردبوو كە پێیاندەگووت؛ شەڕی سەرتاسەری (TOPYEKÜN SAVAŞ) تەواوی توانستی توركیایان خستە خزمەتی شەڕەوە، بۆ ئەوەی گورز لەتەڤگەر بوەشێنن و ئەنجام بگرن. بۆیە شەڕ زۆر مەزن و دژوار بوو، دەوڵەتی توركیا بێسنوور ئەشكەنجە، كوشتن، گرتن، تاڵانی، سووتان و كۆمەڵكوژییان بەڕێوە دەبرد، تەڤگەریش لەبەرامبەر ئەمە بەرگری لەخۆكردنی بەبنچینە وەرگرت، شەڕێكی بەرخۆدانی و خۆپاراستنی بەبناخە وەرگرت. ڕێك لەنێو قۆناخێكی بەمجۆرەدا پێنجەمین كۆنگرە سازدرا.

لەلایەكی تریشەوە؛ سیستەمی سۆڤییەت پەرشوبڵاو ببوو، سۆسیالیزمی بونیانراو (سۆسیالیزمی ڕیئال) بەتەواوی گورزی بەركەوتبوو، ئیعتباری سۆسیالیزم داكەوتبوو و كەوتبووە ژێر پێیانەوە، ئیدی ڕەوشێكی نوێ لەجیهاندا هاتبووە ئاراوە، لەڕەوشێكی وەهادا كۆنگرە سازدرا. سەرۆك دەیخواست هەندێك گۆڕانكاری ئەنجام بدات. هەندێك گۆڕانكاری خستبووە پێش كۆنگرەوە. چونكە دەیبینی ئەگەر كۆنگرە ئەو گۆڕانكارییانە لەناو تەڤگەردا نەكات، ئەوا تەڤگەر دەكەوێتە نێو كێشە و گرفتی مەزنەوە، دەكەوێتە نێو بنبەستبوونەوە، ئەگەر ئەو گۆڕانكارییانە ئەنجام بدرێن ئەوا تەڤگەر دەتوانێت نەكەوێتە نێو ئەو كێشە و گرفتانەوە، دەتوانێت لەسەر ئامانجەكانی خۆیشی پێشبكەوێت، بۆیە سەرۆك ئەو كۆنگرەیەی بە زۆر گرنگ دەزانی.

بێگومان لەو کۆنگرەیەدا هەندێك گۆڕانکاری ئەنجامدرا، بەڵام گۆڕانکاری شکلی کران، گۆڕانکاری سەرەکی ئەنجام نەدرا، واتا ئەو گۆڕانکارییانەی کە سەرۆك لەبەردەم کۆنگرەی دانابوو ئەنجام نەدرا. بۆچی؟ چونکە کۆنگرە بەتەواوی لەو گۆڕانکارییانەی سەرۆك دەیخواست تێنەگەیشت، لەبەر ئەوەی تێنەگەیشتن گۆڕانکارییەکانیش شکلی و رووکەشیانە بوون. کەچی ئەو گۆڕانکارییانەی کە سەرۆك بە کۆنگرەی سپارد بوو، گۆڕانکاری بنچینەیی بوون. هەڵبەتە سەرۆك بە ئاگربەستی (١٩٩٣) دەستی بە پرۆسەی گۆڕانکاری لەنێو تەڤگەردا کردبوو. لەسەر ئەو بنەمایەش هەندێك هەنگاوی هاوێشتبوو و دەیخواست بە کۆنگرەی پێنجەم ئەو هەنگاوانە بەرەو پێشەوەتری ببات و قووڵتری بکاتەوە. بێگومان کۆنگرە لەمە تێنەگەیشت، بۆیە ئەو گۆڕانکارییانەی کە سەرۆك پێی سپاردبوو ئەنجامی نەدا، بەڵکو هەندێك گۆڕانکاری شکلی ئەنجام دا. وەك؛ گۆڕانکاری لەئاڵادا کرد، لەپەیڕەوی ناوخۆی پارتیدا هەندێك گۆڕانکاری کرد. بەڵام گۆڕانکارییەکە هەر لەو سنوورەدا مایەوە.

سەرۆك دەیخواست گۆڕانکاری لە پارتیدا، لەپەیڕەو و پرۆگرامدا، پەیوەست بەمەش لەتاکتیکدا ئەنجام بدرێت. چونکە دەیخواست لەرووی ئایدیۆلۆژی و سیاسییەوە، بەگوێرەی ئەمەش لەرووی رێکخستنی و پراکتیکەوە گۆڕانکاری بکرێت. ئەو راپۆرتە سیاسییەی پێشکەشی کۆنگرەی کردبوو، لەهەندێك رووی ئایدیۆلۆژی و سیاسیدا، تەنانەت هەندێك لەرووی رێکخستنییەوە گۆڕانکاری نوێی پێشخستبوو، پێویستبوو بەگوێرەی ئەمە گۆڕانکارییەکە لەکۆنگرەدا لەرووی رێکخستنی و تاکتیکیشەوە تەواو ببایە. ئیدی ئەوەی نەکرا ئەمە بوو. تەنیا ئاڵامان گۆڕی، پێشتر ئاڵای ئێمە چەکوش و داس بوو، گۆڕیمان و کردمان بە مەشخەڵ. هەروەها سەرۆك لەپەیڕەودا بۆ ئەندامێتی لەپارتیدا هەندێك پێوانەی پێشخستبوو، ئەو پێوانانەی کەوا حزبە بەلشەفیکەکان دایاننابوو، ئەوانەی هەڵگرت و پێوانەی دیکەی بۆ ئەندامێتی پێشدەخست، پێویستبوو پەیڕەو لەسەر ئەو بنەمایە گۆڕانکاری تێدا بکرابایە. بێگومان لەم رووەوە هەندێك هەنگاو هاوێشتران، بەڵام بەتەواوی هەنگاوی پێویست نەهاوێشترا، دەبووایە گۆڕانکاری لەپرۆگرامیش ببایە، چونکە رەوشی جیهان گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، هەڵبەتە شتی نێو پرۆگرام پێشتر جێبەجێمان کردبوو، لەگەڵ رووخانی سۆڤییەتیش هەندێك شت

لەرەوشی جیهاندا گۆڕابوو، بۆیە پێویستبوو لە پرۆگرامیشدا هەندێك گۆڕانكاری بكرابایە، ئێمە لەم رووەشەوە زێدە هەنگاومان نەهاوێشت. بۆیە گۆڕانكارییەكی كەم ئەمجام درا، بەرووكەشی ئەنجام درا، بەقوولی و ریشەیی ئەنجام نەدرا، ئیدی لەبەر ئەوەی ئەمە ئەنجام نەدرا، ئەو كۆنگرەیە زێدە رۆڵی خۆی بەتەواوی نەگێڕا. كەچی سەرۆك دەیخواست بەم كۆنگرەیە گۆڕانكارییەكی وەها ئەنجام بدات كە قۆناخێك بەرەو پێشەوە ببات، بۆ ئەوەی رێ لەپێش مەترسی و بنبەستبوونەكان بگرێت. لەبەر ئەوەی ئەمە ئەنجام نەدرا ئەو كۆنگرەیە رێی لەبەردەم بنبەستبوونەكان نەكردەوە، نەبووە هۆی دەستپێكردنی قۆناخێكی نوێ، هەڵمەتێكی نوێ، رێگیری لەتەخریباتیش نەگرت و رێی لەبەردەم چارەسەریش نەكردەوە. بۆیە رۆڵێكی زۆر كەمی گێڕا، رۆڵی سەرەكی خۆی نەگێڕا.

لەكۆنگرەی پێنجەمدا پێویستبوو چ ئەركێكی دیكە لەئەستۆ بگرێت؟ پێویستبوو كۆنگرە گفتوگۆی لەسەر ئەو دووركەوتنەوەیە بكردبایە كەوا لە پێشەنگی و خەت و تاكتیكی پارتی و گەریلادا لەئارادا بوو ، كۆنگرە تەڤگەری هێنابایەوە سەرخەتی خۆی و لەسەر ئەو خەتەش دوای كۆنگرە پراكتیك بەرێوەچووبایە. چونكە لەپێشەنگیدا و لەخەتی پارتی و لەخەتی گەریلاییدا تەخریباتێكی مەزن روویدابوو، ئەو تەخریباتە هەر تەنیا لەناو پارتیدا تەشەنەی نەكردبوو، بەڵكو لەناو گەلیشدا تەشەنەی كردبوو، رەنگدانەوەی خۆی لەسەر هەموو پراكتیك هەبوو. بۆیە هەم گەریلا و هەم پارتی لەزۆر رووەوە لەبناخەی خۆیان دوور كەوتبوونەوە، ئیدی پێویستبوو كۆنگرەی پێنجەم باش گفتوگۆی لەسەر ئەوە بكردبایە كەوا چۆن جارێكی دیكە پارتی و گەریلا لەسەر بناخە و خەتی خۆی جێگیر بكاتەوە؟ پێویستبوو تەدبیری ئەمەی وەربگرتبایە، بۆیە لە كۆنگرەی پێنجەمیندا فەرهاد (عوسمان ئۆجەلان) و بۆتان (نیزامەددین تاش) كەوتنە ژێر لێكۆڵینەوەوە، "فەرهاد" لەسەر هێڵی پارتی كەوتە ژێر لێكۆڵینەوەوە، چونكە زۆر یاری بە هێڵی پارتی كردبوو، دەیخواست هێڵێكی لیبرالی بەكرێگیراو لەنێو پارتیدا پێشبخات، یاری بەئایدیۆلۆژیای پارتی، بەسیاسیەتی پارتی كردبوو، بۆیەش لەنێو پارتی و كادیراندا لەرێلادانێكی بەرچاوی بلاوكردبووەوە، بەتایبەتی لە "زەڵێ"، كە پاشان رەنگدانەوەی خۆی لەنێو هەموو پارتیدا كردبوو. چونكە هەندێك لەو كادیرانە لە

"زەڵێ"وە چوونە گۆڕەپان و ناوچەکانی دیکەی تێکۆشان و ئەو چەمکانەی ئەوێیان لەگەڵ خۆیاندا بردە ئەو گۆڕەپان و ناوچانە. بۆیە بەمشێوەیە لەپارتی و خەتی پارتیدا، لە ئایدیۆلۆژیا و رێکخستنیدا تەخریبات و لەرێلادانێك روویدا. ئیدی "فەرهاد" لەسەر ئەو بنەمایە کەوتە ژێر لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەوە، لەئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەشدا دادگایی کرا و دادگاش بڕیاری لەسێدارەدانی دا، لەشەخسی "فەرهاد"دا لێپرسینەوە و دادگایی هێڵی پارتی پێشکەوت.

"بۆتان"یش لەخەتی عەسکەری و گەریلاییدا خراپەکاری زۆر کردبوو، یاری بە پێشەنگایەتی و فەرماندارێتی گەریلایی کردبوو، بۆیە لەئارتەشبوونی گەریلادا تەخریباتێکی زۆر روویدابوو، هەم لە فەرماندارێتیدا و هەمیش لە شەرڤانێتیدا، ئەو خەباتەی کەوا سەرۆك پێشیخستبوو پووچەڵی کردبووەوە. هەڵبەتە وەکو باسیشم لێیەوە کرد؛ پێشتر پووچەڵی کردبۆوە، ئەو شانسەی کەوا پێشتر وەریگرتبوو، دیسان خراپی بەکارهێنابوو و دیسانیش تەخریباتێکی مەزنی ئەنجام دابوو. ئەو خەتەی ئەو لەنێو گەریلادا بەرێوەی بردبوو و تەواو خەتی لیبرال بوو. بۆیە لە گەریلادا پەرشوبلاوی دروستکردبوو، چەتەگەرێتی بەهێزتر کردبوو، تەخریباتێکی مەزن روویدا بوو. ئیدی "بۆتان"یشمان لەبەر ئەم هۆیە خستبووە ژێر لێکۆڵینەوەوە و دادگایی کرا، ئەویش بڕیاری لەسێدارەدانی بەسەردا درا. لەشەخسی هەردووکیاندا، ئەو تەخریباتانەی لەرووی خەتەوە کرابوو لێپرسینەوەی لەسەر کرا و دادگایی کرا.

لەم رووەوە کۆنگرەی پێنجەم هەنگاوێکی بەو شێوەیەی هاوێشت، بێگومان سەرۆك هیچ کاتێك لەسێدارەدانی پەسند نەدەکرد و بەراستیشی نەدەزانی و لەدژی لەسێدارەدان بوو. بۆیە ئەو بڕیاری لەسێدارەدانەی پەسند نەدەکرد و جێبەجێی نەدەکرد.

"فەرهاد" بەتەواوی بێ ئەرك کرا، تا کۆتایی ساڵی (١٩٩٦). سەرۆك ئەوی بەتەواوی لەدەرەوەی ئەرك هێشتەوە. "فەرهاد" لەکۆتایی (١٩٩٦)دا راپۆرتێکی بۆ رێکخستن نووسی، ئێمە ئەو کاتە خەریکی سازدانی کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی بووین، ئەو راپۆرتەی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە نارد، کە پێشنیازی کردبوو تەفکەر لەدەرهەق بەرەوشی ئەودا بڕیارێکی نوێ وەربگرێت. لەو راپۆرتەدا دەیگووت:" من هەڵەم، من لەکێماسی خۆم تێگەیشتم، سەرۆك راستە، پارتی راستە"بەو واتایەی خەتی پارتی پەسند دەکات و

گوایە خەتی خۆی مەحکوم دەکرد و دەستبەرداری ئەو هێڵەی خۆی دەبوو. بۆیە ئێمەش گووتمان:" مادام ئەمە بەبنەما وەردەگرێت، ئێمە دەتوانین ئەو بڕیارەی سەبارەت بەو وەرگیراوە لابەین و رێیەکی بۆ بکەینەوە و دەرفەتێکی بدەینێ، بۆ ئەوەی بتوانێت کاربکات و خزمەت بکات. سەرۆکیش ئەو بڕیارەی ئێمەی پەسند کرد گووتی:" مادام وەهایە با بچێتە باشوور، لەوێدا با کاری سیاسی بکات و خۆی بسەلمێنێت" ئیدی بەمشێوەیە ئەو مەسەلەیەی ئەومان براندەوە.

بۆ "بۆتان"یش؛ ئێمە ئەرکی ئەومان بەرتەسك کردەوە، بەرپرسیارێتی بەرزمان پێینەدا. چونکە تەخریباتی مەزنی ئەنجام دابوو، بەتەواوی ئەرکی ئەومان سنووردار کردبوو، دەرفەتێکمان پێیدا و پێیمانگووت:" کاربکە". چونکە خۆیشی ئەوەی دەخواست و دەیگووت:" من تێگەیشتم، ئەمجارەیان داخوازی و پێداویستی خەت بەبنچینە وەردەگرم و جێبەجێی دەکەم" ئێمەش دەرفەتێکی بەمجۆرەمان پێیدا. بەڵام لەئاستی لێپرسراوێتیدا نا. ئیدی ئێمە لێپرسراوێتیمان لەدەستی وەرگرت و دەرفەتمان لەپراکتیکدا پێیدا و گووتمان:" بابیبنین و بزانین چەندە راستگۆیە". لەساڵی (١٩٩٦)دا سەرۆك بانگی لای خۆی کرد، بۆ ئەوەی پەروەردە ببینێت، چونکە لەدوای کۆنگرەی پێنجەمەوە تا ئەو کاتەی چووە ئەکادیمیا لای سەرۆك، زێدە لێپرسراوێتییەکی لەدەست نەبوو، بەڵکو هەندێك لەپراکتیکدا کاری دەکرد، بۆیە سەرۆك بانگی لای خۆی کرد تاکو زیاتر لەرەوشی ئەو تێبگات. لەلای سەرۆك و لەنێو پەروەردە دابوو، سەرۆك زۆر بەسەریداچوو بوو و رەخنەی لێگرتبوو و لێپرسینەوەی لەگەڵدا کردبوو، ئەویش رەخنەدانی خۆی دا و دەرفەتێکی تری لە سەرۆك خواست، سەرۆك گووتی:" ئیدی ئەمە دوا دەرفەتە، ئێمە هەرچی کارێکمان کرد تۆ هەموویت پووچەڵ کردەوە، رەنجی ئێمەت بەفیڕۆ دا، تۆ ئارتەشبوونی ئێمەت پووچەڵ کردەوە، دیسانیش تۆ مادام دەرفەتێکی تر دەخوازیت، ئێمە ئەو دەرفەتە دەدەینە تۆ، بەڵام ئیدی ئەمە دوا دەرفەتە بەتۆی دەدەین".

لەپایزی (١٩٩٦)دا رەوانەی ئەیالەت (هەرێم)ی زاگرۆسی کرد، لەوێ بەرپرسیارێتیشی پێدا. لەوێ دوو سێ مانگ مایەوە، جارێکی دیکە هەمان چەمك و پراکتیکی خۆی دووبارە کردەوە. بۆیە سەرۆك ئەرکی لەزاگرۆس لێوەرگرتەوە و لەریزی گەریلا

دەریکرد و گووتی:" ئیدی پێویستە ئەمە لەریزی گەریلادا نەمێنێت"، هەروەها گووتی:" هێندە ساڵە بۆ ئەوەی ئێمە گەریلا بەرەو پێشەوە ببەین کارێکی مەزنمان ئەنجام دا، کەچی کاری ئێمەی هەموو پووچەڵ کردەوە"، گەلێك جار دەیگووت:" من نەمزانی، دەرفەتم بدەنێ" ئێمە دەرفەتمان پێیدا، تا ئێمە دەرفەتمان پێیدەدا، ئەو دیسان دوای ئەو دەرفەتە هێڵ و چەمکی خۆی بەردەوام کرد و لەسەر تەخریبات بەردەوام بوو. ئیدی دیاربوو ئەو بۆ گەریلایەتی نابێت، ئەگەر ئەمە لەریزی گەریلادا بمێنێتەوە ئەوا سوپایبوون (ئارتەشیبوون) و فەرمانداریبوونی ئێمە لەسەر راستەرێی خۆیدا پێشناکەوێت و ناشتوانین خۆمان لەچەتەگەرێتی و تەخریباتیش رزگار بکەین. ئەمە خزمەتی چەتەگەرێتی دەکات، خزمەتی دەوڵەت دەکات، بۆیە پێویستە پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئارتەشی ئێمەدا نەمێنێت" ئیدی لە سوپا (ئارتەش) دەریکرد و ئەویشی نارده باشوور لای "فەرهاد" و گووتی:" بابچێت لەوێ بمێنێت و کاری سیاسی بکات، ئیدی بە کەڵکی کاری عەسکەری نایەت..." دەبووایە لەو ناوچەیە کاری سیاسی بکەن"، پەیوەندی نێوان "فەرهاد" و "بۆتان" لەکاتی لێپرسینەوە و دادگایی و لەکاتی کۆنگرەی پێنجەمدا زیاتر بوو. لەوێشدا ئەو پەیوەندییەی نێوانیان بەهێزتر و قووڵتر بووەوە، پەیوەندی ئەوان لەسەر چ بنەمایەك بوو؟ پەیوەندی ئەوان لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی پارتی و سەرۆك بوو. واتا کاردانەوە و رکوکینێك لەهەردووکیاندا لەدژی سەرۆك و پارتی پەرەیسەند. بۆچی؟ چونکە سەرۆك و پارتی بەسەر ئەواندا چووە، لێپرسینەوە و دادگایی کردوون و سزای داون". گوایە پێویستە ئەمە نەبووایە، واتا چۆن بژین و چۆن کار بکەن پێویستە پەسند بکرێت، پارتیش ئەوەی پەسند نەدەکرد و حیسابی لەوان پرسی، بۆیە کاردانەوەیەکی مەزنیان لەبەرامبەر ئەمە دروستببوو، ئەو کاردانەوەیان لەناو یەکتردا قووڵکردەوە، لەسەر ئەو بنەمایەش لەدژی پارتی و سەرۆك رێککەوتن. ئەو رێککەوتنەشیان گەیاندە ئاستی دووژمنایەتی و دەبێت تۆڵەی خۆیان لەسەرۆك و پارتی بکەنەوە. کاتێك کە سەرۆك بەکرداری (راستەوخۆ) تەفگەری بەرێوە دەبرد ئەو دەرفەتەیان نەدەبینی و نەیاندەتوانی ئەو دووژمنایەتییەی خۆیان بەئاشکرا بکەن. "فەرهاد" ئەو ئەزموونەی هەبوو، بۆیە بەئاشکرا نەیانتوانی لەدژی سەرۆك

رابوەستن، بەڵكو دەیانخواست بەشاراوەیی ئەو كاردانەوە و دووژمنایەتییەی خۆیان لەدژی سەرۆك و پارتی پێشبخەن.

بێگومان ئەو كاتە پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ (ی ن ك) پێشخست، هەڵبەتە پێشتر پەیوەندی "فەرهاد" لەگەڵ (ی ن ك) هەبوو، ئەم پەیوەندییەیان بەهێزتر كرد، لەگەڵ (ی ن ك) پێكەوە رێككەوتنێكیان ئەنجامدا بەناوی (باكوور- باشوور) كە پێكەوە لەدژی (پ د ك) شەڕ بكەن و بەمەش (پ د ك) بێكاریگەر بكەن. گوایە لەژێر ئەو ناوە باكوور و باشووریش بكەنە یەك. چونكە ئەو كاتە شەڕی نێوان ئێمە و (پ د ك) ش هەبوو، هەروەها (پ د ك) و توركیا پێكەوە هێرشیان دەهێنایە سەر ئێمە، ئێمەش لەبەرامبەر ئەو هێرشەیان لەنێو بەرگریكردن دابووین، (ی ن ك) بینی كە (پ د ك) زەبری بەردەكەوێت، كێشەی نێوان (پ د ك) و (ی ن ك)ش بەهێز ببوو، (ی ن ك) خواستی بەم رێككەوتنە هێزی (PKK) و خۆی بكاتە یەك و گورز لە (پ د ك) بوەشێنێت و بەمەش باڵادەستێتی خۆی دروستبكات و تۆڵەی خۆی بكاتەوە، ئەمە حیساباتی (ی ن ك) بوو، ئەگەر ئەمە بكات دەتوانێت ئەنجام بەدەستبخات و دەتوانن "فەرهاد" و "بۆتان" لەنێو تەڤگەردا زاڵ بكەن، تەنانەت دەتوانن بەرێگەی ئەوان (PKK)ش بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە... وادیارە حیساباتێكی لەمجۆرە بەڕێوە دەبرا، "فەرهاد" و "بۆتان"یش ؟؟ دانەوەی خۆیان لەبەرامبەر پارتی و سەرۆك هەبوو، دەیانخواست تۆڵەی خۆیان بكەنەوە، بەڵام هێزی خۆیان بەشی ئەمەی نەدەكرد، خواستیان سوود لەم شەڕە وەربگرن، ئەگەر لەگەڵ (ی ن ك) رێككەوتنیان كرد و ئەو رێككەوتنە ئەنجامگیر بوو، ئەوا دەتوانن بەم رێككەوتنە و بەهاوكاری (ی ن ك)ش خۆیان لەنێو (PKK)دا زاڵ بكەن، دەتوانن (PKK)ش بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، بەو حیساباتانەوە كاریان دەكرد.

بێگومان ئەو حیساباتانە سەرینەگرت. بۆچی؟ چونكە لەكاتی شەڕدا توركیا لەگەڵ (پ د ك) موداخەلەی ناوچەكانی ژێر كۆنترۆڵی (ی ن ك)یشی كرد، كاتێك كە موداخەلەیشی كرد، (ی ن ك) هێزی خۆی كشاندەوە و هێزی ئێمەش زۆری نەمابوو لە حاجی ئۆمەران لەناو بچێت. ئەو رێككەوتنەی گوایە رێككەوتنی نێوان باكوور و باشوور بوو "فەرهاد" لەگەڵ (ی ن ك) و ئەوان ئەنجامیان دابوو، لەهەوادا مایەوە....

**لەساڵی (١٩٩٥)دا لەچوارچێوەی ڕێنماییەکانی تێکۆشانی نەتەوەیی و دیموکراسی لەباشووری کوردستاندا، ڕێکخراوی "یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان (YNDK) دادەمەزرێت و هەڤاڵ دکتۆر سیروان (کاوە عەلی) سکرتێری گشتی (YNDK) بوو، وەکو درێژەپێدەری خەباتی پارتی ئازادی کوردستان (PAK) تێکۆشانی خۆی دەستپێدەکات. لەلایەکی دیکەشەوە؛ تێکۆشانی (PKK) لەباشووری کوردستاندا زیاتر تێکۆشانی فیکری، ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ڕێکخستنی بەرێوە دەچوو، وەك؛ خەباتی ڕۆژنامەوانی، ڕاگەیاندنی و کولتووری، واتا خەباتی مەدەنی قورسایی زیاتری پێدراوە. لەو چوارچێوەیەدا، ئەمڕۆ هەم ئەو شێوازانەی خەبات بەگشتی و هەم خەبات و ئەزموونی (YNDK) بەتایبەت چۆن هەڵدەسەنگێرێت؟**

ئێمە لە چ ڕەوشێکدا (YNDK)مان پێشخست؟ ئەو کاتە لەنێوان (ی ن ك) و (پ د ك) دا ناکۆکی و شەڕ لەئارادا هەبوو، لەنێوان (ی ن ك) و ئیسلامییەکان شەڕ لەئارادا بوو. لەباشووردا پارچەبوونێك لەپەرەسەندن دابوو، دینامیکییەت و وزە و توانستی گەلی کورد بەو شەڕانە تێکدەدرا، پەیوەندی ئێمە لەگەڵ هەموو ئەو پارت و ڕێکخراوانەشدا هەبوو، بۆ ئەو مەبەستە (YNDK)مان پێشخست کەوا لەڕێگەی (YNDK)ەوە ڕێ لەپێش ئەو شەڕە و ئەو وێرانکارییانە بگرین، بۆ ئەوەی لەباشوور سیاسەتێکی نوێ و کولتوورێکی سیاسی نوێ پێشبخەین. ئامانجی بنچینەیی ئێمە ئەوە بوو. هەر بۆیە کاتێك کە (YNDK)مان دامەزراند هەر تەنیا لەکادیرانی ئێمە، کە ئایدیۆلۆژیای ئێمە بەبنەما وەردەگرن، دانەمەزرا. (YNDK) ڕێکخستنێکی وەها ئایدیۆلۆژی نەبوو، زیاتر

ڕێکخستنێکی سیاسی بوو، بەڵام (PAK) بەتەواوی ڕێکخستنێکی ئایدیۆلۆژی بوو، ئەوەی کە لە (PAK)دا زیاتر جێی خۆی دەگرت ئەو کەسانە بوون کە تەڤگەری (PKK)یان بەبنچینە وەردەگرت. لەنێو (YNDK)دا ئەوانەی (PKK)یان پەسند دەکرد هەبوون، هەمیش هەندێك کەسی (ی ن ك)یی و (پ د ك)ییش هەبوون. واتا (YNDK) وەك کوالسیۆنێك وابوو، واتا پارتییەکی کادیریی و ئایدیۆلۆژی نەبوو، بەڵکو زیاتر ڕێکخستنێکی سیاسی بوو. هەموو کەسێك دەیتوانی لەنێو (YNDK)دا جێی خۆی بگرێت و جێی خۆیشیان تێیداگرت. بەمە ئێمە دەمانخواست ناکۆکی نێوان (پ د ك) و (ی ن ك) بەمشێوەیە نەرم بکەین، ئەگەر دەکرێ بتوانین لەیەکتریان نزیك بکەینەوە، بۆ ئەوەی ئەو ناکۆکی و شەڕانەی نێوانیان بەلاوە بنرێت. دامەزراندنی (YNDK) بۆ ئەو مەبەستە بوو.

بێگومان هەم (ی ن ك) و هەمیش (پ د ك) خواستیان ئەو ڕێکخستنە بخەنە دەستی خۆیانەوە و بۆ ئەوەی بیپووکێننەوە و تێکیبدەن، نزیکبوونەوەیەکی بەمجۆرەیان دەکرد. هەڵبەتە پاشانیش هەر وایانلێکرد. بۆیە ئەو هەنگاوە ئەنجامگیر نەبوو. (پ د ك) "دکتۆر سیروان"یشی شەهید کرد. گووتیان:" وامانزانیوە ئەوانیش پێشمەرگەی (ی ن ك)ن و نەمانزانی هەڤاڵی ئێوەن، بۆیە شەهید کردنی دکتۆر سیروان بەنەزانی ..ەویداوە" بێگومان ئەمە ڕاست نەبوو. واتا ئەو شوێنەی ڕووداوەکەی لێی ڕوویدا ..انزانی کە هەڤاڵانی ئێمەی لێیە، ئەو جێگەیە کاتی خۆی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی (ی ن ك) بوو، هەڤاڵان لەوێ پەروەردەیان دەبینی. لەساڵی (١٩٩٦)دا لەنێوان (پ د ك) و (ی ن ك)دا شەڕ ڕوویدا، (پ د ك) و سوپای ڕژێمی ئێراق پێکەوە لە (٣١)ی ئابدا هێرشیان کرد و کەوتنە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی (ی ن ك) و (ی ن ك)یان لە باشوور وەدەرنا. هەرچەندە ئەو کاتە ڕەوشێکی وەها ئاڵۆز هەبوو، بەڵام (پ د ك)ش دەیزانی ئەو جێگەیە ئێمە تێیداین، بەڵام وا دیاریان کرد کە نەیانزانیوە. لەڕاستیدا وانەبوو، خۆی لەبەر ئەوەی "دکتۆر سیروان" سەرۆکی ئەو تەڤگەرە بوو، شەهید کرا.

هەڵبەتە دوای ئەوەش هەم کەسانی (ی ن ك)یی و هەمیش کەسانی (پ د ك)یی نەك چۆن بەیەکەوە کار بکەن نا، بەڵکو چۆن یەکتر تەسفیە بکەن؟ و (YNDK) بەدەست کامیانەوە بێت؟ ئەمەیان بەبنەما وەرگرت. بۆیە ئەو کارە پووچەڵ کرایەوە. پاشانیش

ئێمە دەستبەرداری (YNDK) بووین. چونکە بینیمان ئیدی خزمەت ناکات. (پ د ك) ئەوەی کەسانی خۆی بوو جودای کردەوە و لەدەستی خۆیدا هێشتیەوە و تا ئێستاش بەو ناوە بەردەوامی پێدەدەن...

ئێمە لەباشووردا چیمان بەبناخە وەردەگرت؟ ئێمە هەوڵمان دەدا لەباشووردا تەڤگەرێکی سیاسی و کولتووری پێشبخەین، ئەو ڕێکخستەبوونەی لەباشووردا ئێمە داماندەمەزراند بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو، ئێمە هیچ کاتێك ڕێکخستنێکی عەسکەریمان لەباشووردا دانەمەزراند، نە لەکاتی (PAK) و نە لەکاتی (YNDK)دا و نە دواتریش، هیچ ڕێکخستنێکی عەسکەریمان دانەمەزراند، هەمووی ڕێکخستنی سیاسی بوو، ئێمە کاری ئایدیۆلۆژی و سیاسی و فەلسەڤی و کولتووریمان پێشخست. واتا چیبکەین بۆ ئەوەی لەنێو کۆمەڵگادا هوشیاری و زانایی بەهێزتر بکەین؟ چیبکەین بۆ ئەوەی لەنێو کۆمەڵگادا دیموکراتیزەبوون بەرەو پێشەوە ببەین، لەسیاسەتدا دیموکراتیبوون پێشبخەین. چونکە باشوور پێویستی بەمە بوو، هەم لەسیاسەتدا و هەمیش لەنێو کۆمەڵگادا ئەگەر دیموکراتیزەبوون بەهێز نەکەین، ئەوا لەباشووردا دیموکراتی و ئازادی پێشناکەوێت، لێرەدا ئەگەر دیموکراتی و ئازادیش پێشنەکەوێت ئەوا ئەگەر تۆ دەوڵەتیش دابمەزرێنیت بێ ئەنجامە و فالآیە.

ئیدی هەموو هەنگاوەکانی ئێمە لەباشووردا لە ڕێگەی (PAK) و (YNDK) ش و دوای ئەمەش کە پێشمانخستووە، هەموو ئامانجەکەی ئەوە بووە کە ئێمە چیبکەین بۆ ئەوەی گەلەکەمان هوشیار بکەینەوە؟. ئێمە چۆن تەرزێکی سیاسی نوێ بەرەو پێشەوە ببەین؟ ئێمە چۆن بتوانین لەسیاسەتدا دیموکراتیزەبوون بەدیبێت، هەموو کەسێك بەئازادی گوزارشت لەناسنامەی خۆی بکات؟ چونکە لەباشووردا گەلێك پارتی و لایەن هەن. لەبنەڕەتدا تەنیا دوو پارتی ئازادی بۆخۆیان بە ڕەوا دەبینن، بۆ پارتییەکانی دیکە ئازادی نییە، پارتییەکانی دیکە هیچ یەکێکیان ناتوانن بەناسنامەی خۆیان و بەئازادی خۆیان ڕێکخستە بکەن و گوزارشت لەخۆیان بکەن. بۆیەش ناتوانن ناسنامەی خۆیان هەبێت. ئەمە ڕەوشێکی جددی بوو و ئێستاش جددییە، ئیدی پێویستبوو ئەمە نەبایە، هەر پارتیك چ فیکرێك بەبنەما وەردەگرێت؟ دەخوازێت بەکامە تەرز سیاسەت بکات؟ پێویستبوو هەر کەس بەئازادی گوزارشتی لەخۆی بکردبایە.

لەنێو کۆمەڵگادا پێویستبوو دیموکراتیزەبوون پێشبکەوتبایە. چونکە مەسەلە و پێوانە عەشیرەتی و بنەماڵەییەکان و چەمکی فیوداڵێتی زۆر بەهێز بوو، هەروەها لەمەسەلەی ژندا، هیچ مافێکی ژن نەبوو، خۆکوشتن و کوشتن، سزادان پەرمیسەند بوو، هیچ ئیرادەیەکی ژن لەئارادا نەبوو. بۆیە ئێمە دەمانخواست لەنێو کۆمەڵگادا دیموکراتیزەبوون پێشبکەوێت، لەبەر ئەوەش دەمانخواست زێدەتر کاری رۆژنامەوانی، کولتووری پێشبخەین. دەمانخواست پارتییەك پێشبخەین کە ئازادی و دیموکراسی بەبنچینە وەرگرێت و گەشەی پێبدات. بەڵام ( پ د ک ـ ی ن ك) ئەمەیان بۆخۆیان بەراست نەدەبینی و نەیاندەخواست لەسیاسەت و کۆمەڵگادا دیموکراتیزە بوون پێشبکەوێت و پەرەبسەنێت. دەیانخواست دەسەڵاتدارێتی خۆیان بپارێزن و هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بێت و بەگوێرەی ئەوان بێت. ئێمەش دەمانخواست هەموو شتێك هەر بەگوێرەی ئەوان و داخوازی ئەوان نەبێت. واتا زۆر رەنگ و جۆر هەبن، بۆ ئەوەی دیموکراتی پێشبکەوێت. ئەوانیش ئەمەیان پەسند نەدەکرد، نەیاندەخواست دەسەڵاتی ئەوان بکەوێتە مەترسییەوە. بۆیەش چەندە ئێمە دەمانخواست کاری سیاسی و کولتووری پێشبخەین ئەوان رێگیریان لێدەکرد، یان بە پیاوانی خۆیان پووچەڵیان دەکردەوە و دەیانخستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، یانیش بە توندوتیژی بڵاوەیان پێدەکرد. بۆیە بەمشێوەیە نەیانهێشت ئەو کارە پێشبکەوێت...

# شۆڕشێك لەئاسمانەوە...!!

هەر لەساڵی (١٩٩٥)دا لەئاکامی بەرزبوونەوەی تێکۆشانی ئازادیخوازی گەلەکەمان، جاری یەکەم بوو لەمێژووی گەلاندا گەلێکی ژێردەست و بێ دەوڵەت و بێ ستاتۆ دەبێتە خاوەن میدیایەکی جیهانی. ئەگەر مرۆڤ ئەو کاتە بهێنێتەوە یادی خۆی؛ تەنانەت زۆربەی دەوڵەتانی خۆرهەلاتی ناوینیش خاوەن میدیایەکی جیهانی نەبوون. لەدۆخێکی وەهادا کەناڵی ئاسمانی (MEDTV) دەکرێتەوە، پاشانیش زۆر سازی و دەزگای نەتەوەیی تریش پێشدەکەوێت، وەك؛ پەرلەمانی کوردستان لەدەرەوەی وڵات (PKDW) و هاوشێوەی ئەمە، هەڵبەتە ئەو کاتە (ERNK) و (ARGK)ش هەبوو وەك سازی و دەزگای نەتەوەیی. دەکرێ مرۆڤ ئەمە وەك بەشێك لەتێکۆشانی نەتەوەیی و گەیشتن بسەقۆناخی نەتەوەییبوون لێکبداتەوە. ئەو دامودەزگا نەتەوەییانە بەگشتی و کەناڵی ئاسمانی (MEDTV) بەتایبەتی لەسەر چ بنەما و باوەڕی و ئیرادەیەك هەوڵی بنیادنانیان درا، بەراستیش دەکرێ کردنەوەی (MEDTV)

**بۆ گەلی کوردستان وەك شۆڕشێکی دووەم ناوزەد بکرێت، لێرەدا ئەو هەنگاوانە چۆن هەڵدەسەنگێنرێت و چی لەگەڵ خۆیاندا هێناوە؟**

(PKK) هەر تەنیا خۆی ڕێکخستە نەدەکرد، بەڵکو چەندە خۆی ڕێکخستە دەکرد، لەهەمانکاتدا کۆمەڵگاشی ڕێکخستە دەکرد. ئامانجی (PKK)ش ئەوە بوو. چونکە داگیرکەران لە کوردستان شتێکیان بەناوی کورد و کوردستان نەهێشتبوو. ئەگەر تۆ دەخوازیت لە کوردستاندا ئازادی و دیموکراسی پێشبخەیت، ئەوا پێویستە گەل لەهەموو ڕوویەکەوە بەرێکخستن بکەیت، چونکە بەناوی کورد و کوردستان هیچ ڕێکخستنێك لەئارادا نەمابوو. گەل بەرێکخستنکردن، واتا پێشخستنی دامودەزگای نەتەوەیی، ئەمە ئەرکی بنچینەیی (PKK) بوو. هەڵبەتە گەل نەیدەتوانی خۆی بەخۆی ڕێکخستە بکات، لەناو گەلدا هیچ چین و توێژێکیش نەیدەتوانی خۆی بەرێکخستن بکات، مەگەر تەنیا (PKK) بیتوانیبایە ئەمەی بکردبایە. (PKK) چەندە خۆی بەرێکخستن کرد، ئەوەندەش خواستی کۆمەڵگاش بەرێکخستن بکات. چەندە ڕێکخستنی پارتی پێشخست، ئەوا ئەوەندەش ڕێکخستنی نەتەوەیشی پێشخست، ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی پێشخست. چونکە دەیزانی ئەگەر ئەو ڕێکخستنانە بەرەو پێشەوە نەبات، ئەوا ناتوانێت گەل ڕێکخستە بکات و ئیرادەیەکی بەهێزی گەل بئافرێنێت و خەبات و تێکۆشانێکی تۆکمە گەشە پێبدات، ناتوانێت لە کوردستاندا ئازادی فەراهەم بکات، ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو. ئەگەر تۆ دەخوازیت لە کوردستاندا ئازادی و دیموکراسی سەقامگیر بکەیت، پێویستە لەهەموو ڕوویەکەوە لەدژی داگیرکەران ڕابوەستیت، ئەوەی داگیرکەران تێکیاندا و تەفر و تونایان کردووە، تۆ سەرلەنوێ بنیادی بنێیتەوە. ئەو کاتە تۆ دەتوانیت کوردستان ئازاد بکەیت. بۆیەش مرۆڤ دەتوانێت لەفیکری (PKK)وە بگرە تادەگاتە پراکتیکەکەی ئەو ڕاستییە ببینێت.

هیچ کاتێك (PKK) خۆی لەچوارچێوەی پارتییەك سنووردار نەکردووە، (PKK) هەمیشە لەچوارچێوەی نەتەوەییدا هەڵسوکەوتی کردووە و نەتەوەییبوون و ڕێکخستنی نەتەوەیی بەبنەماگرتووە، بۆیە (PKK) ڕۆحێکی نەتەوەیی و یەکێتییەکی نەتەوەیی

ئاواكرد و بەبناخەی وەرگرت. ئەو فیكرەی بڵاوكردەوە، لەسەر ئەو فیكرەش پراكتیكی پێشخست، دامودەزگای پێشخست، سەرجەم ئەو رێكخستنانەی ئاوایكردووە لەسەر بنەمای نەتەوەیی بنیادنراوە، ئەو سوپایەی كە گەریلا ئاوای كردووە لەسەر بنەمای هەر چوارپارچە و بۆ هەر چوارپارچە ئاوای كردووە، هەمیشە ئەو ئارتەشەی گەریلای خستە خزمەتی هەر چوار پارچەوە. ئەو بەرمیەی ئاوایكرد لەسەر بنەمای نەتەوەیی ئاوایكرد، لەسەر هەموو پارچەكان و لەهەموو چین و توێژەكان و بۆ خزمەتی هەر چوار پارچە ئاوایكرد، هەر هەنگاوێكی لەرێكخستندا پێشخست بێت ئەوا لەسەر بنەمای نەتەوەیی و دیموكراتی پێشیخستووە. هەر بۆیە لەتەواوی كوردستاندا هوشیاربوونەوە و یەكێتی و رابوونێكی مەزن بەدیهات. لەمێژووی كوردستاندا بۆ یەكەمجار (PKK) ئەمەی بەدیهێنا و پێشخست.

شانبەشانی ئەمانە هەوڵیدا چۆن بتوانێت ئەنجوومەنێكی نەتەوەیی بۆ تەواوی كوردان، بۆ هەموو كوردستان ئاوابكات؟ لەو چوارچێوەیەشدا هەنگاوی هاوێشت. لەو هەنگاوەدا ئەو ئەنجامانەی دەركەوت، لەسەر بنەمای ئەو ئەنجامەش دەزگای نەتەوەیی بنیادنا.

ئیدی (PKK) بەگوێرەی پێداویستییە نەتەوەیی و دیموكراتییەكانی گەلی كوردستان هەنگاوی هاوێشتووە، پێداویستی گەلی كورد چییە، پێداویستی نەتەوەیی ـ دیموكراتی چییە؟ هەمیشە ئەو پرسیارەی كردووە و خواستوویەتی وەڵامیشی بداتەوە. (PKK) هیچ كاتێك تەنیا پێداویستییەكانی خۆی بەبنەما وەرنەگرت، چەندە پێداویستییەكانی خۆی بەبنەما وەرگرتووە ئەوەندەش پێداویستییە نەتەوەییەكانیشی بەبنەما وەرگرتووە، هەمیشە خواستوویەتی ئەو پێداویستییانە پێك بێنێت، بۆیە ئەو دامودەزگا نەتەوەیی و دیموكراتیانەی پێشخست.

بێگومان لەو چوارچێوەیەدا، لەساڵی (١٩٩٥)دا كەناڵی ئاسمانی (MEDTV)ی كردەوە، ئەمە لەمێژووی گەلی كورددا هەنگاوێكی گرنگ و جێگەیەكی تایبەتی هەیە، كورد دەوڵەتی نەبوو، لەجیهانیشدا زۆر دەوڵەت هەبوون كە كەناڵێكی تەلەفزیۆنی وەهایان نەبوو، تەنیا هەندێك دەوڵەت كەناڵی وەهایان كردبۆوە، كەسێك باوەڕی نەدەكرد كە بەناوی كوردەوە تەلەفزیۆنێكی وەها پێشبكەوێت. تەنانەت لە مێژووی تەڤگەرە

شۆڕشگێڕەکانیشدا شتێکی بەمجۆرە نەبوو، لەمێژووی گەلانی ژێردەستیشدا شتێکی وەها نەبوو، بۆیەکەمجار بوو لەمێژووی تەفگەرە شۆڕشگێڕییەکان و تەفگەری گەلانی ژێردەستەدا هەنگاوێکی بەمجۆرە و توانستێکی بەمجۆرە (PKK) ئافراندی و پێشیخست. بەمەش بۆ خەبات و شۆڕش توانستی مەزنی دایە دەستی گەلی کورد و دایە دەستی تەفگەرە شۆڕشگێڕییەکانەوە، دایە دەستی تەفگەرەکانی گەلانی ژێردەستە و چینە ژێردەستەکانەوە. ئەمە دەسکەوتێکی نوێ بوو، بەشداربوونێکی نوێ بوو بۆ تەفگەری شۆڕشگێڕی...

(PKK) تەفگەرێکی وەها نییە کەوا تەنیا ستاتۆیەك بەبنەما وەربگرێت، یەکێك لەجیاوازییەکانی (PKK) لەگەڵ تەفگەرەکانی دیکە لەمەدایە. (PKK) هەمیشە لەدژی ستاتۆیە و هەمیشە بەدوای شتی نوێدا دەگەڕێت و غاردەدات، شتێك کەوا گەلان و مرۆڤایەتی بە سەرکەوتن دەگەیەنێت و پێشدەخات و مەزنی دەکات. تەفگەرێکی وەهایە و بەردەوام ئەمە بەبنچینە وەردەگرێت. بۆیە لە ئایدیۆلۆژیای خۆیدا هەر شتێك کە بەکەڵك نایەت و نابێتە وەڵام بەلاوەی دەنێت و دەیداتە لایەکەوە. لەئایدیۆلۆژیای ئەودا هەمیشە نوێبوونەوە و راوەستان لەدژی ستاتۆ بنەمایە، ئەم تەفگەرە لەسەر ئەو راستییە ئاوا بووە. ئەمە کارەکتەر و تایبەتمەندی ئەو تەفگەرەیە. لێرەدا (PKK) لەتەفگەرەکانی دیکە جودا دەبێتەوە، ستاتۆپارێز نییە و ستاتۆ بەبنەمای وەرناگرێت. بۆیە لەشێوەگرتنی (PKK)دا، لەپێشکەوتن و پراکتیك و هەنگاوەکانی ئەودا زۆر شت دەبینی کەوا لەدەرەوەی ئەو شتانەیە کە تەفگەرەکانی دیکە کردوویانە. ئیدی ئەوە سەرچاوەی خۆی لەم خاڵەوە وەردەگرێت کە باسم لێیەوە کرد، واتا لەکارەکتەری (PKK)وە سەرچاوە دەگرێت.

(PKK) هیچ کاتێك نەیگووت:" فلان گەل ئەوەی بەبنەما وەرگرتووە کەواتە منیش هەمان شت بەبنەما وەردەگرم." بەڵکو شتێك کەهەموو کەسێك کردبێتی، (PKK) نەیداوەتە پێش خۆیەوە، بەڵکو شتێك کە کەس بیری لێ نەکردۆتەوە ئەو بیری لێکردۆتەوە. جیاوازی (PKK) لەمەدایە. لەبنەڕەتدا ئەوەی ئەمە بەبنچینە وەربگرێت دەبێتە تەفگەرێکی شۆڕشگێڕی، نوێبوونەوە و سەرکەوتن بەدیدێنێت، تەفگەرێکی بەمشێوەیە هیچ کاتێك نابێتە تەفگەرێکی کۆنەپارێز (ستاتۆپارێز).

ئیدی (PKK) تەڤگەرێکە وەك رووبار هەمیشە شەپۆڵ دەدات و دەهەڕكێت و خۆی نوێدەكاتەوە و پێشدەكەوێت. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیاكەیەوە وەردەگرێت. بۆیە كەس ناتوانێت بە لۆژیكی باو و لەئارادا راست لە (PKK) تێبگات، چونكە (PKK) بەگوێرەی ئەو لۆژیكە باوەی هەیە ئاوا نەبووە و بەڕێوە ناچێت و كارناكات، بەڵكو لەدەرەوەی ئەو زیهنییەت و لۆژیكەی هەیە ئاوابووە و بەڕێوەدەچێت و كاردەكات، بۆیە ئەو زیهنییەتەی لەئارادایە ناتوانێت لە (PKK) تێبگات. ئەگەر لە (PKK) تێناگەن هۆكارەكەی ئەمەیە، ئەگەر هەر شتێك كە هەر كەسێك لەپێش خۆی داناوە تۆش لەپێش خۆتی دابنێیت و هەر شتێك كە هەركەس دەیكات تۆش بیكەیت، هەر كەسێك بیر لەچی دەكاتەوە تۆش بەهەمان شێوە بیری لێبكەیتەوە، ئەوا هیچ نوێبوونەوەیەك و جوداییەكی تۆ نامێنێتەوە و ئەوەی تۆ دەیكەیت هەر كەسێك دەتوانێت بیكات.

سەرۆكێك، تەڤگەرێك كە پێشەنگایەتی دەكەن ناتوانن بەمشێوەیە بیربكەنەوە و كاربكەن. بۆیە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) لەوانەیە هەندێك شتی خۆیان وەك سەرۆكەكانی دیكە و پارتەكانی دیكە بێت، وەكو ئەوان بیریان كردبێتەوە و وەكو ئەوانیشی كردبێت. بەڵام لەزۆر شتدا وەكو ئەوان بیریان لێنەكردۆتەوە و وەكو ئەوانیش كاریان نەكردووە، بەتەواوی لەدەرەوەی ئەوان بیریان كردۆتەوە و كاریان كردووە. بۆیە زۆرجار ئەقڵی هەموو كەسێكی تەقلیهەڤ (ئاڵۆز) كردووە، ئیدی كە خواستوویانە لە (PKK) تێبگەن نەیانتوانیوە لێی تێبگەن. بۆیە زۆر كەس گووتوویانە:" ئەوانە شێتن" هەموو ئەمانە سەرچاوەی خۆی لەمەوە وەردەگرێت.

لەساڵی (١٩٩٥)یشدا كاتێك كە تەلەفزیۆنی (MEDTV)مان كردەوە كەس بیری لەشتێكی بەمجۆرە نەدەكردەوە، نە لەتەڤگەری شۆڕشگێڕی جیهاندا، نە لە تەڤگەرەكانی گەلانی ژێردەستەدا، نە لە تەڤگەرە ئازادیخواز و دیموكراتیخوازەكاندا كەسێك بیری لەشتێكی بەمجۆرە نەدەكردەوە، ئیدی بۆ یەكەمجار سەرۆك ئاپۆ وەها بیری لێكردەوە و ئەو تەلەفزیۆنەی پێشخست. كاتێك كە ئەو تەلەفزیۆنە دامەزرا و كرایەوە كاریگەرییەكی مەزنی لەسەر كوردان كرد، كاریگەری لەسەر تەڤگەرە شۆڕشگێڕییەكانی جیهانیش كرد. واتا گەلی كورد و تەڤگەرە شۆڕشگێڕەكانیش گەیشتنە ئامراز و

تەکنیکێکی نوێ، توانستێکی نوێ و سەنگەرێکی نوێ. کەسێك بیری لەمە نەدەکردەوە، سەرۆك ئاپۆ بیری لێکردەوە و بەو تەکتیك و توانستە گەیشت.
بۆیە ئەمە هەنگاوێکی گرنگ بوو. واتا کردنەوەی کەناڵی تەلەفزیۆنی (MEDTV) بەشداریبوونێك بوو لەتەڤگەری شۆڕشگێڕییدا، ئەمە بەشداریبوونی تەڤگەری (PKK)یە، بەشداریبوونی سەرۆك ئاپۆیە لەمەسەلەی ئافراندنی تاکتیکی نوێدا...

**لەچوارچێوەی ئەو پیلانگێڕییانەی لەساڵی (١٩٩١) بەدواوە لەدژی تەڤگەری ئازادیخوازی گەلەکەمان بەڕێوە دەچێت، لەساڵی (١٩٩٥)دا زۆر جموجۆڵی دیپلۆماسی لەم رووەوە پێشدەکەوێت کە لەئاکامدا "پەیمانی دبلن" مۆردەکرێت. رێك لەدوای ئەو رێککەوتنەش شەڕی نێوان (پ د ك) و (PKK) روودەدات. ناوەرۆکی ئەو رێککەوتنە چییە و لەسەر چ بنەمایەك ئەنجامدەدرێت؟ ئەو شەڕەی لەو ساڵەدا روودەدات تاچەند پەیوەندی بەم رێککەوتنەوە هەیە؟ هەروەها پاشان سەرۆك ئاپۆ لەکۆتایی ئەو ساڵەدا ئاگربەست رادەگەیەنێت، سەبارەت بەو ئاگربەستەش دەڵێت:" هەم لەبەرامبەر تورکیا، هەم لەبەرامبەر (پ د ك)، هەمیش لەبەرامبەر ئێوە ـ کە مەبەستی لەهەڤاڵانی بەڕێوەبەرایەتی پراکتیکییە ـــ من ئاگربەست رادەگەیەنم". مرۆڤ ئەمە چۆن لێکدەداتەوە؟**

دەوڵەتی تورکیا لەشەڕی (١٩٩٢)دا خۆی لەباشووردا جێگیرکرد، پەیوەندی خۆی لەگەڵ (ی ن ك) و (پ د ك) بەهێزتر کرد، هەم هێزی سەربازی و هەمیش هێزی ئیستخباراتی خۆی خستە باشوورەوە و بۆخۆی زەمینەیەکی دروستکرد. هەمیش دەیخواست لەنێوان ئێمە و (پ د ك) و (ی ن ك) دا شەڕ بەرپا بکات، بۆ ئەوەی تەڤگەری کورد یەکگرتوو نەبێت و

بەردەوام دووژمنایەتی لەنێوانیاندا هەبێت، کورد لەدژی کوردبێت و بەمەش مەترسی بۆ ئەوان دروست نەبێت. چونکە تورکیا پارچەی هەرە مەزنی کوردستانی لەدەست خۆیدا هێشتۆتەوە. کاتێك کە تۆ باسی کێشەی کوردت کرد، لەبنەڕەتدا دەبێتە کێشەی تورکیا، لەبنەمادا تورکیا کێشەی کورد بەکێشەی خودی خۆی دەزانێت، بۆچی؟ چونکە پارچەی گەورەی کوردستان لەدەست ئەو دایە، بۆیە لەهەر کوێیەك بەناوی کوردەوە هەرشتێك دروست ببێت ئەوا تورکیا لەدژی رادەوەستێت. چونکە دەڵێت:" ئەمە لەدژی من دروستبووە" بۆیەش ناهێڵێت تەڤگەری کورد هەناسە بدات و کێشەی کورد چارەسەر ببێت. تورکیا بەردەوام لەم پێناوەدا کاریکردووە، بەردەوام خواستوویەتی لەنێوان باکوور و باشوور شەڕ هەبێت، لەناو خودی باشووردا شەڕ هەبێت، بۆ ئەوەی کورد کورد تەسفیە بکات و یەکگرتوو نەبن و نەبنە هێز، تاکو ئەویش دەسەڵاتدارێتی خۆی بەئاسانی بەڕێوە ببات.

لەساڵی (١٩٩٥)دا تورکیا لەدژی ئێمە ئۆپەراسیۆنێکی مەزنی لەباشوور پێشخست کە پێی دەڵێن ئۆپەراسیۆنی پۆڵایین (ÇELİK OPERASYONU)، خواستی زەبرێکی مەزنمان لێبوەشێنێت. ئێمە تازە کۆنگرەی پێنجەممان سازدابوو، خواستی بەم ئۆپەراسیۆنە وەڵامی کۆنگرە بداتەوە، بۆ ئەوەی بەتەواوی کۆنگرە بێکاریگەر بکات و تا بتوانێت زەبرمان لێبدات. بێگومان ئەو ئۆپەراسیۆنەی لەباشوور ئەنجامیدا، هەم ئەمریکا ئاگادار بوو، هەم رژێمی ئێراق ئاگادار بوو، هەمیش (پ د ك) و (ی ن ك) و ئەوان لێی ئاگاداربوون. واتا بەبێ ئاگاداری ئەوانە ئەو ئۆپەراسیۆنە ئەنجام نەدەدرا، هەروەها ئەو پارتانەی باشوور لەو ئۆپەراسیۆنەشدا جێی خۆیان تێداگرت. چونکە لە تورکیا هاوکاری ماددی و مەعنەوییان وەردەگرت و بەمەش خۆیان گەورە دەکرد. ئەگەر لەباشووردا (پ د ك) و (ی ن ك) هێندە بەهێزبوون، کە لەباشووردا حکومەتێك دامەزرا، دەوڵەتێك دامەزرا، ئەوا ئەوە تەنیا بەرمنجی (پ د ك) و (ی ن ك) دروستنەبوو، بەڵکو شانبەشانی ئەمە بەخەباتی (PKK) و بەهاوکاری ئەمریکا دروستبوو. ئەگەر خەباتی (PKK) نەبایە، (PKK) تورکیای مەجبوری (پ د ك) و (ی ن ك) نەکردبایە، ئەگەر (پ د ك) و (ی ن ك) ش بۆ ئەوەی (PKK) تەسفیە ببێت هاوکارییان وەرنەگرتبایە و بەو هاوکارییە مەزن نەبوونایە، هەروەها ئەمریکاش هاوکاری (پ د ك) و (ی ن ك)ی

نەكردبایە. ئەوا هیچ كاتێك (پ د ك) و (ی ن ك) هێندە مەزن نەدەبوون، هێندەش لەباشوور نەدەبوونە هێز، ئەو حكومەت و دەوڵەتەش لەباشوور دروست نەدەبوو. پێویستە ئەو راستییە هەر كەسێك باش ببینێت، كە ئەوەی لەباشووردا دروستبووە خەبات و رەنجی (PKK)یشی تێدایە، پێویستە هەم پارتەكانی باشوور، هەموو تاكێكی گەلەكەشمان ئەو راستییە بزانێت. ئەگەر (PKK) نەبایە، بۆچی پێش (PKK) توركیا پەیوەندی خۆی لەگەڵ (پ د ك) و (ی ن ك) خۆش نەدەكرد و توانستی بەوان نەدەدا و رێگەی ئەنقەرەی لەوان نەدەكردەوە و پاسپۆرتی سووریان پێنەدەدا و رێگەی دونیای بۆئەوان نەدەكردەوە، چەك و ئازووقە و پارەی بەوان نەدەدا؟! ئەمانە هەمووی بۆئەوە بوو كە (PKK) لەجیهاندا گۆشەگیر بكەن و زەبر لە (PKK) بدەن و بێكاریگەری بكەن. ئەگەر توركیا ئەو ئیمكانییاتانەی دایە (پ د ك) و (ی ن ك) بۆ ئەو مەبەستە بوو. (پ د ك) و (ی ن ك) لەسەر ئەو توانستانە مەزن بوون. (PKK) هەنگاوێكی چەوتی زۆر گەورەی بەتوركیا هاوێشت. ئەگەر توركیا ئەو كاتە هاوكاری (پ د ك) و (ی ن ك)ی كرد و پەرلەمانی باشووری پەسندكرد و لەسەر ئەو بنەمایەش لەباشووردا حكومەت دامەزرا، ئەوا هەموو ئەو هەنگاوانە (PKK) بەتوركیای هاوێشت. هەنگاوی وەها چەوتی هاوێشت بۆ ئەوەی گوایە (PKK) تەسفیە بكات، چەندە ئەو هەنگاوەی هاوێشت نەیدەتوانی (PKK) تەسفیە بكات، هەنگاوی زیاتری لەم رووەوە دەهاوێشت، بەمەش هاوكاری زیاتری (پ د ك) و (ی ن ك)ی دەكرد. بۆیە بەم هاوكارییە (پ د ك) و (ی ن ك) زۆر بەهێزتر دەبوون و بوونە حكومەت. راستی مەسەلەكە وەهایە، ئەمرۆ توركیاش دان بەم هەڵە مەزنەی خۆیدا دەنێت، دەڵێت:" ئێمە خواستمان كەوا كورد بەكورد بێكاریگەر بكەین، بەمشێوەیە خۆمان لەو بەلایە رزگار بكەین، بەڵام بەداخەوە ئێمە هەڵەی زۆر گەورەمان كرد" دەڵێت:" ئێمە بەدەستی خۆمان دەوڵەتی كوردمان ئاواكرد. ئەو هەڵەیەش بەهۆی (PKK)وە تێیكەوتین... ئێمە خواستمان (PKK) تەسفیە بكەین، چەندە ئێمە دەمانخواست تەسفیەی بكەین، زیاتر هاوكاری باكووری ئێراقمان كرد، ئیدی بەمشێوەیە باكووری ئێراق(١) بووە دەوڵەت و بۆی دەرچوون"، ئێستا خۆیان دان بەمەدا دەنێن. سەرۆك كاتێك دەستگیركرا گووتی:" لەوانەیە شەخسی من زەرەر بكەم، بەڵام من كوردانم بەقازانج گەیاند" ئەمە زۆر راستە. (PKK) و سەرۆك قازانجی

مەزنیان بەکوردان گەیاند. ئەگەر ئەمڕۆ لەباشووردا ستاتۆیەکی کوردان دروستبووە ئەوا لێرەدا رۆڵێکی مەزنی (PKK) هەیە. ئەو دەوڵەتەی بەدەستی تورکیا بەدروستکردن دا، تورکیای خستە هەڵەوە و هەنگاوی هەڵەی بە تورکیا هاوێشت، لە ئەنجامی ئەو هەنگاوە هەڵانەی تورکیاوە (پ د ك) و (ی ن ك) مەزن بوون و ئەو ستاتۆیە دروستبوو. پێویستە هەر کەسێك ئەو راستییە بزانێت.

ئیدی لەساڵی (١٩٩٥)دا کاتێك تورکیا "**ئۆپەراسیۆنی پۆلایین**"ی ئەنجامدا، هەم بە رازیبوونی ئێراق و ئەمریکا بوو، هەمیش بەئاگاداری (پ د ك) و (ی ن ك) ئەو ئۆپەراسیۆنەی ئەنجام دا. (پ د ك) بەنهێنی لەو ئۆپەراسیۆنە جێی گرت، ئیدی ئەگەر لەساڵی (١٩٩٥)دا لەنێوان ئێمە و (پ د ك)دا شەڕ دەرکەوت، لەبەر ئەم هۆیە بوو. هەڵبەتە "**رێککەوتنی دبلن**"یش ئەو ئامانجەی هەبوو. واتا دەیانخواست (PKK) لەباشوور تەسفیە بکەن، تەنانەت نەك هەر لە باشووردا، بەڵکو (PKK) بەتەواوی تەسفیە بکەن، سەرەتاش لەباشووردا دەستیان پێکرد. ئەگەر لەنێوان ئێمە و (پ د ك) شەڕ بەرپا بوو و پاشان لەنێوان ئێمە و (ی ن ك) شدا شەڕ روویدا هەمووی تورکیا و ناتۆ (NATO) لەپشتییانەوە بوون، کە دەیانخواست (PKK) تەسفیە بکەن، بۆیە ئەو شەڕانە هەمووی روویاندا. ئێمە لەشەڕ هەڵدەهاتین و نەماندەخواست شەڕ بکەین، چونکە ئێمە ئەو شەڕانەمان نە لە بەرژەوەندی خۆماندا و نە لەبەرژەوەندی ئەو پارتانەشدا دەبینی، لەبەرژەوەندی گەلەکەشماندا نەدەبینی، ئێمە دەمانخواست هەموو وزە و توانستی خۆمان لەدژی دووژمن بخەینەگەڕ، بەڵام هەرچییەکمان دەکرد و دەکرد نەماندەتوانی یەخەی خۆمان لەوان رزگار بکەین... بۆیە ئەو شەڕانە روویان دەدا، لەو شەڕانەشدا ئێمە و ئەو پارتانە و گەلی کوردستانیش زۆر زەرەرمان پێگەیشت، ئەمەش راستییەکە، ئەو کاتە پارتییەکانی باشوور دەیانگووت:" ئێمە ناچارین، هیچ توانستمان نییە، تەنیا رێگەمان بەسەر تورکیاوەیە. ئێمە ناتوانین بۆخاتری (PKK) پەیوەندی خۆمان لەگەڵ تورکیا خراپ بکەین و ئەو دەرگایە بەرووی خۆماندا دابخەین" ئەوان بەمشێوەیە بیانوویان دەهێنایەوە و روونکردنەوەیان دەدا. ئێمە هیچ کاتێك لەدژی پەیوەندییەکانی ئەوان نەبووین، بەڵام ئێمە لەدژی ئەو پەیوەندییانە بووین کە لەسەر حیسابی ئێمە

لەگەڵ داگیرکەران پەرەیان پێدەدا و لەسەر بنەمای دووژمنایەتی و شەڕ و تەسفیەکردنی ئێمە بەڕێوەیان دەبرد.

## ئەو ئاگربەستەی رادەگەیەنرێت هەم لەبەرامبەر تورکیا و هەمیش لەبەرامبەر (پ د ك) و هەم وەك سەرۆك ئاپۆش ئەو کاتە گووتەنی؛ لەبەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی پراکتیکیش ئاگربەست راگەیەنرا. ئەو ئاگربەستە هەمەلایەن و فرە رەهەندەی (١٩٩٥) چۆن لێکدەدرێتەوە؟

راستە سەرۆك دووەمین ئاگربەستی راگەیاند هەم لەبەرامبەر تورکیا و (پ د ك) و هەمیش لەبەرامبەر ئەو کادیرانەی نێو (PKK) کەوا چەتەگەرێتییان بەبنەما وەردەگرت. ئاگربەستێکی بەمجۆرەی راگەیاند. بۆچی لەبەرامبەر تورکیا ئاگربەستی راگەیاند؟ چونکە سەرۆك نەیدەخواست شەڕ بەردەوام ببێت، بەڵکو دەیخواست ئیدی کێشەی کورد بەرێگەی دیالۆگ و ئاشتی و دیموکراتیانە چارەسەر بکات. بۆ ئەو مەبەستە جارێکی دیکە ئاگربەستی راگەیاندەوە. لەنێو تورکیاشدا هەندێك دەیانخواست سەرۆك ئاگربەست رابگەیەنێت، بۆ ئەوەی کێشەی کورد بەرێگەی دیالۆگ چارەسەر بکرێت. سەرۆك رێزی لەم داخوازییەش گرت و بەهای پێدەدا. بۆیە لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٥)دا ئەو ئاگربەستەی راگەیاند.

سەبارەت بەو ئاگربەستەی لەبەرامبەر (پ د ك)ش راگەیەنرا ئەوەبوو، ئەو کاتە شەڕێکی مەزن لەنێوانماندا بەرپابوو، سەرۆك نەیدەخواست لەوە زیاتر بەردەوام ببێت. لەئاکامی ئەو ئاگربەستەدا رێککەوتنێکیش لەنێوانماندا بەدیهات. ئێمە شەڕمان راگرت، نەك هەر تەنیا ئەو شەڕەمان راگرت، بەڵکو خواستمان راگرتنی ئەو شەڕە بکەینە هۆی ئەوەی پەیوەندی لەنێوانماندا پێشبکەوێت و ئەو تەخریباتانەی شەڕەکەش نەهێڵین و یەکێتییەکی تۆکمە لەنێوانماندا پێشبخەین. هەروەها کولتوورێکی نوێش لەنێو کورداندا پێشبخەین، ئەمە بکەینە هۆکارێك بۆ نەهێشتنی شەڕ لەنێو کورداندا، کولتوورێکی وەها پێشبخەین کە بڵێین:" ئیدی بڕوانن شەڕێکی مەزن لەنێوانیاندا

بەرپابوو، بەڵام ئێستا بەیەکەوە کاردەکەن چیتر شەڕ لەدژی یەکتر ناکەن..." ئێمە هەوڵمان بۆئەوە دەدا.

بێگومان دەوڵەتی تورکیا نەیدەخواست کەوا ئەمە پێشبکەوێت، هەمیشە دەیخواست (پ د ك) و ئەوانی دیکە بوروژێنێت، ئێمە بوروژێنێت، بۆ ئەوەی هیچ کاتێك پەیوەندی لەنێوانماندا پێشنەکەوێت، گێرەشێوێنی (پراواکسیۆن)یان دەکرد، بۆیە سەرۆك گووتی:" ئەو ئاگربەستە بۆ (پ د ك)ش رادەگەیەنم" واتا بۆ ئەوەی نەکەونە نێو گێرەشێوێنییەکانی تورکیاوە، بۆ ئەوەی ئیتر شەڕ روونەداتەوە و هەموو کێشەکان بە ئاشتی چارەسەر بکرێت. چونکە ئێمە لەوە دەترساین کە ئەو گێرەشێوێنییانەی تورکیا سەربگرێت. لەبەر ئەوەی لەهەندێك ناوچەشدا هەندێك کێشە لەنێوانماندا دەرکەوتبوو و (پ د ك) تەنگەناوی دەکردین، ئێمە دەترساین دیسان قۆناخێکی دیکەی شەڕ دەستپێدەکاتەوە، سەرۆك بۆ ئەوەی رێگیری لە هاتنەئارای دۆخێکی وەها بکات ئەو ئاگربەستەی راگەیاند.

هەروەها سەرۆك گووتی:"من لەبەرامبەر (PKK) و کادیرانی (PKK)ش ئاگربەست رادەگەیەنم" بۆچی وەهای گووت؟ چونکە لەناو (PKK)شدا هەندێك کادیر هەبوون وەك "شەمدین ساکیك" و ئەوانە کە پێفازۆییەکەیان پووچەڵ دەکردەوە. سەرۆك دەیخواست رەوشەکە بەلای دیالۆگی سیاسی رابکێشێت، ئەوانەش تێکیان دەدا، هەموو ئەو هەوڵ و کارانەی سەرۆك پێشیدەخست ئەوان پووچەڵیان دەکردەوە، هەموو ئەو رەنجەیان دەخستە خزمەتی دووژمنەوە، ئەمەش مەترسی بۆ سەر تەڤگەر دروست دەکرد، ئیدی بۆیە لەبەرامبەر ئەوانەش سەرۆك شەڕێکی پێشدەخست، لەو شەڕەدا گووتی:" من بۆ ئێوەش ئاگربەست رادەگەیەنم" واتا ئیدی دەستبەرداری ئەو کار و رەفتارە خراپانەی خۆتان ببن، بەمشێوەیە چەتەگەرێتی نەکەن، دەستپێکردنی قۆناخێکی نوێ پووچەڵ نەکەنەوە، رەنجی من بەفیڕۆ مەدەن" ئەوە بۆ ئەم مەبەستەبوو. بێگومان ئەو هەنگاوە هەنگاوێکی مێژوویی بوو، بەداخەوە، هەرچەندە سەرۆك خواستی ئەو هەنگاوە بهاوێژێت، بەڵام زێدە ئەنجامگیر نەبوو، تورکیاش لەبەرامبەر ئەو ئاگربەستە هەنگاوی نەهاوێشت، ئەو چەتانەی ناو ئێمەش کەسانی وەك "ساکیك" دەستبەرداری کار و رەفتاری چەتەگەرێتی خۆیان نەبوون، بەڵکو زیاتر

پێداگریان لەسەر دەکرد و دەیانخواست قووڵتریشی بکەنەوە. خواستمان لەگەڵ (پ د ک)ش پەیوەندییەکی تۆکمە پێشبخەین. بەڵام (پ د ک) نەهاتە نێو پەیوەندییەکی وەهاوە، بەردەوام مەسافەیەکی لەنێوانماندا هێشتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو مەسافەیەی هێشتبۆوە، هەڵبەتە لەساڵی (١٩٩٧)دا جارێکی دیکە لەگەڵ تورکیا پێکەوە هاتنە سەر ئێمە. سەرۆك دەیخواست رێ لەبەردەم ئەو رووداوانە بگرێت و بۆ ئەوەی جارێکی دیکە شەڕ لەنێوانماندا روونەداتەوە و یەکێتییەکی بەهێز لەنێوانماندا پێشبکەوێت و کولتوورێکی تۆکمە لەنێوانماندا پەرەی پێبدرێت، بۆ ئەوەی هەموو توانستی کوردان بکەوێتە خزمەتی کێشەی کورد و چارەسەر کردنییەوە.

# ساڵی ١٩٩٦

# ئەو ساڵەی هەموو مێژووی لەخۆیدا چڕکردەوە...!!

لە(٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٦)دا پیلانگێڕییەك لەبەرامبەر سەرۆك ئاپۆ پێشدەکەوێت، کە لە "شام" دا ترومبێلێکی بۆمبڕێژکراو لەنزیك ئەو شوێنەی مەزەندە دەکرا لەوێ بێت، تەقییەوە. ئەو پیلانە مەزنە لەلایەن چ لایەنێکەوە بەرنامەڕێژ کرا و جێبەجێ کرا؟ ئەو کاتە باس لەهەبوونی "دەستی کوردان"یش لەو پیلانگێڕییەدا دەکرا، کە دەستی کوردانیش لەنێو ئەو مەسەلەیەدا هەبووبێت، مەزەندەیەکی وەها دەکرا. ئەو پیلانگێڕییە تا چەند پەیوەندی بەپیلانگێڕییەکانی پێش و دوای ئەو پیلانگێڕییەوە هەیە؟ ئایا دەکرێت ئەو پیلانگێڕییە وەك ئەڵقەیەکی نێوان چەندین پیلانگێڕی دیکەی ئەنجامدراو لەقەڵەم بدرێت؟

بێگومان ئەو هەوڵی تیرۆرکردنە کە لە (٦)ی ئایاری (١٩٩٦)دا ئەنجامدرا، وەك پیلانگێڕییەك زۆر هێز و لایەن جێگەی خۆیان تێداگرتبوو، دەوڵەتی تورکیا، دەوڵەتی ئیسرائیل، لەناو دەوڵەتی سوریاشدا هەندێك کەس هەبوون، لەناو کوردانداا هەندێك

کەس و لایەن هەن. ئەو پیلانگێڕییە بەمجۆرە داڕێژرابوو، دەیانخواست بەم پیلانگێڕییە چیبکەن؟ دەیانخواست سەرۆك لەناوببەن و ئەمەش بکەنە هۆکاری شەڕێکی مەزن و گشتگیر لەنێوان ئێمە و تورکیادا، واتا ئەوانەی لەو پیلانگێڕییەدا بەشداربببوون دەیانخواست بەم ئامانجە بگەن. لە تورکیاشدا ئەوانەی لەگەڵ هێز و لایەنەکانی دیکەدا پێکەوە ئەنجامیاندا دەیانخواست بەمشێوەیە سەرۆك بکوژن و لەسەر ئەمەش گوایە سیاسەت دەکەن و دەسەڵاتداریێتی خۆیان بەهێز دەکەن، ئەمەش حیساباتی ئەوان بوو.

لەبنەڕەتدا ئەو پیلانگێڕییە کەسانی وەك **"تانسۆ چیلەر، دۆغان گۆرەش و محەمەد ئاغار"** دایانڕشتبوو، ئەوانە ئەو کەسانەبوون کەوا لەبنەمادا شەڕێکی قرێژیان لەدژی (PKK) بەڕێوە دەبرد و لەو شەڕەشدا سوودمەند بوون، تورکیا بەم شەڕە زەرەرمەند دەبوو، کوردان زەرەرمەند دەبوون، بەڵام ئەوانە قازانجیان دەکرد و پێی سوودمەند دەبوون، هەم لەرووی سیاسی و هەمیش لەرووی ماددییەوە، رانتخۆر (غەنیمەتخۆر)ی ئەو شەڕەبوون و بەو غەنیمەیەی دەستیان کەوتبوو، دەیانخواست سەرۆك بکوژن، ئەم کوشتنەش بۆخۆیان بکەنە سەرمایەك و لەرێگەیەوە شوێنگەی خۆیان لەدەسەڵاتدا بەهێزتر بکەن و بەتەواوی دەسەڵاتداریێتی خۆیان لەسەر تورکیا بسەپێنن.

ئەوانی دیکەش دەیانخواست بەم کوشتنە شەڕی نێوان (PKK) و تورکیا دژوارتر و ،نتر ببێت. چونکە هەموو کەس لەسەر ئەو شەڕە سیاسەتیان دەکرد، بەرژەوەندی ئەوان لەمەدابوو. بۆچی؟ چونکە لەو قۆناخەدا لەنێوان ئێمە و هەندێك دەوروبەری نێو تورکیادا هەندێك پەیوەندی پێشدەکەوت...

بۆ نموونە؛ لەگەڵ **"ئەحمەددین ئەربەکان"** و ئەوان هەندێك پەیوەندی پێشدەکەوت، ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوانماندا هەبوو، بەراستەوخۆ نەبوو، بەڵکو بەرێگەی هەندێك کەناڵەوە ئەو نامانە دەهاتن و دەچوون. ئیدی ئەوانەی کەوا بەشداری پیلانگێڕییەکە ببوون بەمەیانزانی، ئەوانە بینیان کەوا سەرۆك ئیدی دەخوازێت مەسەلەکە لەچوارچێوەی شەڕ دەربخات و بەرێگەی سیاسی کێشەی کورد چارەسەر بکات و پێداگری لەسەر ئەمە دەکات. چونکە لە (١٩٩٥)دا ئاگربەستی راگەیاندبوو، هەرچەندە ئاگربەستەکە ئەنجامگیریش نەبوو، بەڵام سەرۆك پێداگری لەسەر ئەو ئاگربەستە

دەكرد و لەساڵی (١٩٩٦)یشدا كاتێك لەنێوان ئێمە و "ئەربەكان" پەیوەندی دورستبوو و نامە دەهات و دەچوو، ئەو هێزانە بینیان كە سەرۆك سوورە لەسەر رێگەچارەی ئاشتیانە و ئیدی ناخوازێت شەڕ بەردەوام ببێت و دەخوازێت رێگەی ئاشتی و دیالۆگ بكاتەوە. ئەگەر كێشەی كورد بكەوێتە سەر راستەڕێی دیالۆگ و ئاشتی ئەوانەی كە لەسەر شەڕی (PKK) و توركیا سیاسەت دەكەن و بەرژەوەندییان لەو شەڕەدا هەیە، ئەوا ئەو توانستە هەمووی لەدەست دەدەن، بۆیە نەیاندەخواست شەڕ رابوەستێت و كۆتایی پێبێت. لەبەر ئەوە خواستیان سەرۆك لەناوببەن بۆ ئەوەی ئەو پێڤاژۆیەی ئاشتی و دیالۆگ كەدەستی پێكردبوو پێشنەكەوێت، بەڵكو شەڕ زیاتریش دژوار ببێت، ئەو كاتە هەم توركیا لاوازدەبێت، هەمیش دەتوانن زۆر سازش بە توركیا بكەن. بۆ ئەم مەبەستە ئەو پیلانگێڕییەیان لەو كاتەدا ئەنجامدا.

لەو پیلانگێڕییەدا زۆر هێز و لایەن بەشداربوون، لە ئیستخباراتی یۆنانستانەوە بگرە تادەگاتە ئیستخباراتەكانی توركیا و ئیسرائیل و هەندێك كەسانی ناو ئیستخباراتی سوریا و كەسانی كورد بەشدار ببوون. ئەوانە هەموویان هەبوون. چونكە سوریاش لەسەر ئەو شەڕە دەژیا، ئیسرائیل و یۆنانستانیش لەسەر ئەو شەڕە دەژیان، هەندێك لە كوردانیش لەسەر ئەو شەڕە دەژیان. ئیدی ئەگەر شەڕ رابوەستایە ئەوانە هەموویان زەرەرمەند دەبوون. بۆیە بەگوێرەی ئەوانە پێویستە شەڕ رانەوەستێت. ئەمەش چۆن دەبێت؟ كاتێك كە سەرۆك بكوژرێت ئیدی شەڕ راناوەستێت. چونكە دەبینن كەوا سەرۆك لەسەر تەڤگەر باڵادەستە و تەڤگەر بەرەو ئاشتی و دیالۆگ دەبات، ئەگەر سەرۆك لەناوببەن ئەوا دەتوانن رێگیری لەمە بكەن. ئەو پیلانە بۆ ئەو مەبەستە بوو. واتا پیلانێكی مەزن بوو.

بەڵام ئەو پیلانگێڕییە سەرنەكەوت. بۆچی سەرنەكەوت؟ چونكە ئەوەی بۆمبایەكەی دەتەقاندەوە مەفرەزەیەكی دەوریەی سوریای بینیبوو بۆیە پەلەی كردبوو و بەتەواوی ئامانجی خۆی نەپێكابوو... ئیدی ئەگەر ئەو پیلانگێڕییە ئامانجی خۆی بپێكابایە و ئێمە شەڕمان مەزن بكردبایە ئەوا ئەو هێز و لایەنانە لەو شەڕەدا زۆر سوودمەند دەبوون، ئەوانەی كە دەیانخواست گورز لە (PKK) بدەن، بەم پیلانگێڕییە دەیانخواست ئیرادەی تەڤگەر بشكێنن. چونكە كە سەرۆكیان لەناوبرد دەتوانن لەسەر ئەمە هێرشێكی

مەزنیش بكەنە سەر گەریلا، كە ئامادەكارییەكی بەمجۆرەشیان هەبوو. واتا لەپیلاننامەی ئەواندا ئەوە بوو كە زەبریان لەسەرۆك دا ئەوا هەژاندنێك لەسەر گەل و گەریلا و (PKK) دروستدەكات، ئۆپەراسیۆنێكی مەزنیشیان ئەنجامدابوو. بۆ ئەوەی بەو ئۆپەراسیۆنەش زەبر لە (PKK) و گەریلا بدەن، بەمشێوەیە (PKK) تەسفیە بكەن.

ئیدی لەبەر ئەوەی ئەمە بەدینەهات، ئەوا ئەو ئۆپەراسیۆنانەی كەوا ئامادەیان كردبوو درەنگیان خست. ئۆپەراسیۆنەكەش بۆ پاییزی (١٩٩٦) ئامادەیان كردبوو، كە بەتەواوی زەبرێكی كوشندە لەتەفكەر بدەن. لەبەر ئەوەی ئەو پیلانگێڕییانە لەسەر سەرۆك پووچەڵ بووەوە، ئەوا ئۆپەراسیۆنی پاییزی (١٩٩٦)شیان نەكرد، ئیدی بۆ ساڵی (١٩٩٧) بەچڕوپڕی كەوتنە نێو ئامادەكارییەوە، ئەمجارە خواستیان بەتاكتیكی نوێ جێبەجێی بكەن...

لەراستیدا ساڵی (١٩٩٦) ساڵێكی زۆر ئاڵۆز بوو، لەلایەكەوە ئەو كاتە دەگووترا كەوا (ی ن ك) پەیوەندی خۆی لەگەڵ توركیا بەهێزتر كردووە و هەوڵیدەدا لەرێی "شەمزینان"ەوە رێیەكی گومركی بۆ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆی بكاتەوە، لەلایەكی دیكەوە (پ د ك) بەهاوكاری سوپای رژێمی ئێراق لە (٣١)ی ئابدا (ی ن ك)یان لە هەولێر و سلێمانی و زۆربەی ناوچەكانی باشوور وەدەرنا. لەلایەكی دیكەشەوە؛ پیلانگێڕییەك بۆ تیرۆركردنی سەرۆك ئاپۆ و تەسفیەكردنی (PKK) ئەنجام درا... بێگومان ئەو كاتە هێزە هاوپەیمانەكان هەرێمی كوردستانیان دەپاراست، كەچی سوپای رژێمی ئێراق تەواوی سنووری هەرێمی كوردستانی پارێزراو (خەتی ٣٦) ی بەزاند... ئەو كاتە ئەو رووداو و ئاڵۆزییانەی ساڵی (١٩٩٦) چۆن لێكدەدرایەوە...؟

بێگومـان ساڵی (١٩٩٦) بـۆ کـوردان ساڵێکی ئـاڵۆز بـوو، چۆن تورکیـا دەیخواست زەبـر لـە سەرۆك بوەشێنێت، هەندێکیش دەیانخواست شەڕ لەنێوان ئێمـە و تورکیادا بـە گورتر بکەن، لەنێراقیـشدا رژێمـی بـەعس و (پ د ك) لـەدژی (ی ن ك) هەڵمـەتێکیان کـرد، (ی ن ك)ش دەیخواست پەیوەندی خۆی لەگەڵ تورکیـادا دروستبکات و دەروازەیـەکی ئـابووری بۆخـۆی بکاتـەوە. لەهەمانکاتـدا پەیوەنـدی خـۆی لەگـەڵ ئێرانـدا بـەهێزتر دەکـرد و دەیخواسـت بەپـشتیوانی ئـەو دوو دەوڵەتـە دەسـەڵاتی (پ د ك) سـنووردار بکـات و ئـەو رێگایـە بۆخـۆی بکاتـەوە. (پ د ك)ش ئـەوەی بـینی، ئەگـەر ئـەو پەیوەندییـەی (ی ن ك) لەگەڵ تورکیا پێشبکەوێت ئەوا بۆ (پ د ك) باش نابێت، بۆ رژێمی ئێراقیش باش نابێت، رژێمی ئێراق و (پ د ك) کاریـان بـۆ ئـەوە دەکـرد کە بتـوانن رێگیری لەمـە بکەن. بۆیـە هێرشیان کرد و (ی ن ك)یان لەشاری هەولێر وەدەرنا. واتـا بـۆ کـوردان بارودۆخێکی زۆر مەترسیدار بوو؛ هەرکەس و لایەنێك دەیخواست لەسەر حیسابی کوردان حیساباتی خۆی پێشبخات.

بۆنموونـە؛ ئـەمریکاش دەیتـوانی نەیهێـشتبایە سـوپای رژێمـی ئێـراق بکەوێتـە نـاو هەولێرەوە، بەڵام ئەو دەرگایەی بۆکردەوە و رێگەی بە ئێراق دا کە بکەوێتە هەولێرەوە و (پ د ك) و ئێـراق پێکـەوە جموجـوڵ بکـەن. بەمـەش (ی ن ك)ی تەنگـەتاو کـرد. پاشـان دیـسان (ی ن ك)یـان هێنایـەوە باشـوور. واتـا ئـەمریکا بـەم تاکتیکـەی خواسـتی کـوردان بەتەواوی بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیـەوە. ئەمـە بـۆ ئـەو مەبەستە بـوو. ساڵێك بـوو بـۆ کوردان پڕ لەمەترسی بوو. ئەو کاتە هەندێك لەو مەترسیانە کوردانیشی دەرباز دەکرد، واتـا دەسـتی ئـەمریکا، ئیـسرائیل، یۆنانـستان، ئێـران، ئێـراق، تورکیـا، سـوریا و هـەموو لایـەنێکی تێـدابوو. ئەگـەر ئـەم هـەموو دەسـتانەی تێـدا بێـت ئـەوا مـسۆگەر مەترسییەکانیش مەزن دەبن...

**لەسـاڵی (١٩٩٦ ـــ ١٩٩٧)دا تـەڤلیبوونێکی زۆر و بـەرفراوانی خـەڵکی باشوور، بەتایبەتی گەنجان، بۆ ناو ریزەکانی (PKK) هەبوو، هەر**

**لـەو کاتەشـدا ئۆپەراسـیۆنێکی مـەزن لـە (١٤)ی گـوڵانی (١٩٩٧)دا لەباشـوور دژی (PKK) ئەنجامـدەدرێت، لەهەولێریـشدا لـە (١٦)ی گوڵانی (١٩٩٧) دا کۆمەڵکوژییـەکی گـەورەش روودەدات. ئیـدی دوای ئەمە شەڕ زۆر فراوانتر دەبێت.. لێرەدا دەکرێت چ هەڵسەنگاندنێك بۆ رووداو و ئاڵوگۆڕەکانی ساڵی (١٩٩٧)دا بکرێت؟ هەم تەفلبوونێکی بەرفراوانی کچ و کوڕانی باشوور بۆ ناو ریزەکـانی (PKK) هەیـە، هەمیش شەڕ و قەتلوعام و ئۆپەراسیۆنی مەزنیش لەئارادان...!!**

بۆچی لەساڵی (١٩٩٧) لـە باشـووردا تـەفلیبوونێکی بـەهێز بـۆ (PKK) هاتـەئاراوە؟ لەبـەر ئـەوەی (PKK) وەکـو ئومێـدێك بینـرا. بۆیـە تـەفلیبوونێکی وەهـا هاتـە ئـاراوە. بۆچـی (PKK) لەهەموو کاتێك زیـاتر ئـەو کاتـە بـووە ئومێـدێك؟ چونکە (ی ن ك) و (پ د ك) و ئیسلامییەکان لەگەڵ یەکتردا شەڕیان کرد و پارچەبوونێکیان دروستکرد، باشـوور لـەناو خۆیـدا ببـوو بـە دوو کەرتــەوە، حکومــەت ببـوو بـەدوو حکومەتـەوە. ئیـدی (پ د ك) پەیوەندی لەگەڵ ئێراق سازدا و بەیەکەوە هاتنەسەر (ی ن ك) و (ی ن ك)یـان لـە هـەولێر وەدەرنـا. ئەمانـە هـەمووی لـەناو گەلـدا بـێ باوەڕییـەکی مـەزنی لەبەرامبـەر پارتـەکانی باشوور دروست کرد. بۆیە (PKK)یان وەکو ئومێدێك بینی. چونکە بینیان کەوا (PKK) هێــڵ و رێبــازێکی ســەربەخۆ بەبناخــە وەردەگرێــت، (PKK) بــەهیچ شــێوەیەك بەکرێگیراوێتی بۆ داگیرکەران و هێزەکانی دیکە ناکات و لەگەڵ داگیرکەراندا نابێتە یەك و هێرش ناباتە سەر کوردان.

بۆ نموونە؛ لەنێوان (PKK) و ئـەو هێزانەشـدا چـەندین جـار شـەڕ روویـدا، بـەڵام هـیچ کاتێـك (PKK) پەیوەنـدی لەگـەڵ داگیرکـەران دروسـتنەکرد و بـەهاوکاری داگیرکـەران هێرشی نەبردە سەر پارت و هێزێکی دیکەی کورد. کەچی لەشەڕی نێوان ئـەو پارتانـەی باشـووردا لـەنێوان خۆیانـدا و لـەدژی (PKK)دا هەمیـشە بەئاشـکرا پەیوەنـدی لەگـەڵ داگیرکـەران دروسـت دەکـەن و هەمیـشە بەیەکـەوە هێـرش و جموجـۆڵ دەکـەن. تـەنیا

(PKK) ئەمەی نەکرد. خەڵکی باشوور ئەمەی بینی، بینیان کە (PKK) خەمت و ڕێبازێکی سەربەخۆ و ئازاد بەبناخە وەردەگرێت و بەهێزی خۆی جموجۆڵ دەکات، بەڵام پارتەکانی دیکە خاوەن ئازادی خۆیان نین، بە بەردەوامیش دەکەونە خزمەت داگیرکەرانەوە و لەگەڵ داگیرکەراندا جموجۆڵ دەکەن و دێنە سەر کوردان. هەر بۆیە (PKK)یان بۆخۆیان وەك ئومێدێك بینی و بەرەو (PKK) هاتن و ئەو تەڤلیبوونە هاتە ئاراوە...

ئەوانەی تەڤلی (PKK)بوون؛ لە (PKK)دا ڕاستینەی خۆیان، ئازادی خۆیان، بەرژەوەندی و کەسێتی خۆیان بینیەوە و داهاتووی خۆیان بینی. بۆیە ئەو تەڤلیبوونە بەرفراوانە دروستبوو، هۆکارەکەی ئەمە بوو. بێگومان لەساڵی (١٩٩٧)دا جارێکی دیکە دەوڵەتی تورکیا و (پ د ك) بەیەکەوە هاتنەسەر (PKK) و لە هەولێریشدا زۆر گرتن و کوشتن ڕوویدا، کۆمەڵکوژییەکی مەزن لەوێ ڕوویدا. ئەو کاتە (PKK) پەیوەندی خۆی هەم لەگەڵ (ی ن ك) و هەمیش لەگەڵ (پ د ك)دا هەبوو. (پ د ك) لە هەولێر بەبێ ئەوەی شەڕ ببێت هاتەسەر (PKK) و زۆر هەڤاڵ و دۆستیان شەهیدکرد و ئەوانەی دیکەشیان دەستگیرکرد و بردیانن. گەل ئەمەی بەچاوی خۆی بینی. لە هەولێر ئەوەی کرد، نە شەڕ نە شتێکی دیکە لەئارادا نەبوو، پەیوەندیمان پێکەوە هەبوو، واتا ناحەقییەك و بێبەختییەکی مەزنی کرد. پاشان ئەوەشیان بینی کە ئەو هێزانە لەگەڵ تورکیا پێکەوە هێرشیان کردە سەرمان. ئیدی کاردانەوەی خەڵك لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا بەو تەڤلیبوونەی خۆیان گوزارشتیان لێکرد و دەریانبڕی.

بێگومان ئەگەر تەڤلیبوونەکانی ساڵی (١٩٩٧) ئەوەندە زۆر و بەرفراوان بوو، هۆکارێکیشی ئەمە بوو. واتا خەڵك بینی کە (پ د ك) و تورکیا بەیەکەوە جموجۆڵ دەکەن و ئەو خەڵکەش خواستیان لەگەڵ (PKK) جموجۆڵ بکەن. واتا خواستیان پشتیوانی لە (PKK) بکەن و خواستیان کە (PKK) لاواز نەبێت. چونکە بینیان کە (پ د ك) و تورکیا دەخوازن گورز لە (PKK) بوەشێنن، ئەگەر گورزیش لە (PKK) بوەشێنرێت ئەوا گورز لەئومێدی ئەوان و داهاتووی ئەوان دەوەشێنرێت. ئیدی بۆ ئەوەی ئومێدی ئەوان نەکوژێتەوە تەڤلی ڕیزەکانی گەریلا بوون تاکو (PKK) لاواز نەبێت، ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو. بێگومان ئەم تەڤلیبوونەی (١٩٩٧) زۆر واتادار بوو و بەهایەکی پڕ مەزنی

خۆی هەیە، ئەمە هەڵوێستێکە و هەڵوێستێکی ولاتپارێزییە، هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕییە لەدژی خیانەت و داگیرکەری.

لێرەدا شەڕی (١٩٩٧) گرنگە، ئەو هێرشەی لەبەهاری (١٩٩٧) لەدژی (PKK) ئەنجام درا، لەبنەڕەتدا دەبووایە لەکۆتایی ساڵی (١٩٩٦)دا ئەنجام بدرابایە. ئەمە ئەگەر ئەو پیلانگێڕییەی لەبەرامبەر سەرۆك ئەنجامدرا ئەنجامگیر ببووایە. بەلام لەبەر ئەوەی ئەنجامگیر نەبوو، ئەوا ئەو ئۆپەراسیۆنەیان بۆ بەهاری (١٩٩٧) درەنگ خست، بۆ ئەوەی ئۆپەراسیۆنێکی بەهێزتر و مەزنتر ئەنجام بدەن، تاکو بتوانن ئەنجام بگرن. چونکە ئەو ئۆپەراسیۆنەی بۆ کۆتایی ساڵی (١٩٩٦) ئامادەیان کردبوو و حیسابیان بۆکردبوو دەیانخواست یەکسەر لەدوای کوشتن و لەناوبردنی سەرۆك ئەنجامی بدەن. ئەوانە دەیانگووت:" ئەگەر ئاپۆ لەناوچوو ئەوا ئیرادەی گەریلا تێکدەشکێت، ئەگەر هێرشی بۆبکەین ئەوا زێدە بەرخۆدانی ناکەن و دەتوانین گورزیان لێبوەشێنین..." کاتێك کە بینیان سەرۆکیان نەکوشتووە، بەو ئامادەکارییەی کە کردبوویان نەیاندەتوانی هێرش بکەن و ئەنجامگیر ببن، بۆیە پێویستبوو بە ئامادەکارییەکی بەهێزترەوە هێرش بکەن، ئینجا دەتوانن ئەنجام بگرن.

ئیدی ئۆپەراسیۆنی بەهاری (١٩٩٧)یان لەسەر ئەو بنەمایە ئەنجام دا. ئەو ئۆپەراسیۆنەش ئۆپەراسیۆنێکی پڕ مەزن بوو، لەگەڵ (پ د ك) پێکەوە هاتنە سەرمان، ئۆپەراسیۆنێکی زۆر مەزنیان ئامادەکردبوو، دەیانخواست زەبرێکی مەزن لە گەریلا بدەن، کە لەسەر ئەو بنەمایە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی بەڕێوە ببەن. چونکە بینیان "هەموو شێوازێکیان گرتەبەر کەچی ئەنجامگیر نابن، تا سەرۆکیش بێکاریگەر نەکەن ناتوانن ئەنجامگیر ببن" چونکە کە "شاهین دونەمز" لەشاری ئەلعەزیز دەستگیرکرا و تەسلیم بوو و خیانەتی کرد. ئەو کاتە(٢) چی گووتبوو؟ گووتبووی:" ئەگەر ئێوە ئاپۆ نەگرن و تەسفیەی نەکەن، هەرکێیەك بگرن و چەندەشیان بگرن هیچ ئەنجامێکی خۆی نییە، تا ئاپۆ ساخ بێت و لەدەرەوە بێت دەتوانێت دە (PKK)ی تر ئاوا بکاتەوە".

هەروەها دیسان کە لەساڵی (١٩٩٨)دا "شەمدین ساکیك" هەڵات و خیانەتی کرد ئەویش هەمان شتی گووتبوو و گووتبووی:" ئێوە تا ئاپۆ لە شام دەرنەخەن و بێکاریگەری نەکەن ناتوانن ئەنجام بەدەستبخەن" ئیدی دەوڵەت هەموو شێوازێکی بەکارهێنا بۆ

ئەوەی ئەنجام بەدەستبخات، بینیان کە نابێت، ئیدی لەبنەڕەتدا سەرۆکیان کردە ئامانج. ئەو قۆناخەیان بەتەقینەوەکەی (٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٩٦) دەستیان پێکرد، بۆ ئەوەی سەرۆك لەناوببەن و بە ئۆپەراسیۆنی (١٩٩٦) گورز لە گەریلا بوەشێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەنجامگیر نەبوون ئەمجارەیان لەسەر گەریلا دەستیان پێکرد، بۆ ئەوەی گورز لە گەریلا بدەن و بتوانن فشار لەسەر سوریا زیاتر بکەن، فشار لەسەر سەرۆك زیاتر بکەن. چونکە ئەگەر گەریلا بەهێزتر ببێت و شەڕ و بەرخۆدانیان بەهێز و دوژوار ببێت ئەوا لەوانەیە نەتوانن سوریا زۆر تەنگەتاو بکەن. لەبەر ئەوەی ئەگەر گورزیان لە گەریلا و تەفگەردا ئەوا دەتوانن فشاریش بۆ سەر سوریا زیاتر بکەن. ئەمەیان بەبنچینە وەرگرت. لەبەر ئەوەی ئۆپەراسیۆنی ساڵی (١٩٩٧) زۆر گرنگ بوو. واتا دەیانخواست پیلانگێڕی نێودەوڵەتی ئەمجارەیان بەو ئۆپەراسیۆنە و بە تاکتیکی دیکە، پێشبخەن. بۆیە بەهەموو هێزێکی خۆیانەوە هاتنەسەر تەفگەر تاکو گورزی لێ بوەشێنن. تەفگەریش لەبەرامبەر ئەمە بەرخۆدانێکی بەهێزی پێشخست و ئامانجی ئەوان بەدینەهات.

لەساڵی (١٩٩٧)دا "بۆتان" و "فەرهاد" لەگەڵ (ی ن ك) لەژێر ناوی ڕێککەوتنی "باکوور - باشوور" ڕێککەوتنێکیان ئەنجام دا، بۆ ئەوەی بتوانن تەفگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. بێگومان ئەمەش بەدینەهات. چونکە لەحیساباتی ئەواندا؛ "موداخەلەی تورکیا بۆ هەرێمی ژێر دەسەڵاتی (ی ن ك) نابێت، ئەگەر (ی ن ك) و (PKK) پێکەوە لەو هەرێمەدا بەرەیەکی شەڕ بکەنەوە، ئەوا دەتوانن زەبر لە (پ د ك) بوەشێنن. هەڵبەتە لە هەرێمی بادینانیش شەڕی ئێمە و (پ د ك) هەیە، لەوێش زەبری بەردەکەوێت، ئەو کاتە دەتوانن لەباشووردا بەتەواوی (پ د ك) بێکاریگەر بکەن". (ی ن ك) ئەمەی بۆخۆی بەبنچینە وەردەگرت. ئەگەر لەمەشدا ئەنجامگیر بوو ئەوا دەتوانێت "فەرهاد"یش بەسەر (PKK)دا زاڵ بکات و (PKK)ش بخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە، ئەو شتەی لە "زەلێ" بەئەنجام نەگەیشت، ئەوا دەتوانن ئەو کاتە بەئەنجامی بگەیەنن. حیساباتی "فەرهاد" و "بۆتان"یش ئەمە بوو. بەرێگەی (ی ن ك)وە بەسەر (پ د ك)دا سەرکەون و کە سەریشکەوتن ئەو کاتە بڵێن:" ئەوا ئێمە شەڕمان کرد و زەبرمان لە (پ د ك) دا ماف خۆمانە لەنێو (PKK)دا زاڵ ببین" گوایە بەهاوکاری (ی ن ك)ش ئەو قورساییەی خۆیان

نیشان بدەن، بەمەش (PKK) دەخەنە دەستی خۆیانەوە. ئیدی حیساباتی بەمجۆرەیان لەسەر شەڕی (١٩٩٧) هەبوو. بێگومان بە شەڕی (١٩٩٧) نە داخوازی تورکیا بەدیهات، نە داخوازی (پ د ك) بەدیهات، نە داخوازی (ی ن ك) و "فەرهاد" و "بۆتان"یش بەدیهات. داخوازی هیچ یەكێكیان بەدینەهات. كاتێك كە بینیان بەمجۆرەش ئەنجام بەدەست ناخەن، ئیدی "رێككەوتنی واشنتۆن" یان پێشخست. رێككەوتنی واشنتۆن بۆ تەسفیەكردنی سەرۆك و (PKK)یە. هەڵبەتە هەر دوای ئەو رێككەوتنە بە بیست رۆژ، پیلانگێڕی نێودەوڵەتی دەستپێكرد و وەدەرنانی سەرۆكیان لە سوریا خستە رۆژەڤەوە...

## ئەو پراكتیكە چەتەگەرێتییەی كە شەمدین ساكیك لە "زاپ"دا بەڕێوەی دەبرد، ئەگەر "شەمدین" كاراكتەرێكی وەها چەتەگەرێتی هەبوو بێت، دیارە ئەویش ئەو كاتە حیساباتێكی خۆی هەبووە...

هەڵبەتە دەوڵەت دەیخواست كە خەتی "شەمدین" لەسەر گەریلا زاڵ بكات. "شەمدین"یش لەم پێناوەدا كاری كرد. واتا هەوڵیدەدا سەرۆك بێكاریگەر بكات و تەڤگەر بخاتە ژێر كۆنترۆڵی خۆیەوە. "شەمدین" بۆ ئەم مەبەستە كاریكرد. "شەمدین" لە "زاپ" ئەو كار و هەوڵدانانەی خۆی گەیاندبووە ئاستێك لەناو تەڤگەردا دەكەوتە جموجۆڵەوە و لەدەرەوەشدا لەنێو جموجۆڵ دابوو. هەڵبەتە یەكتریان تەواو دەكرد.
بەڵام سەرۆك موداخەلەی "ناوەندی بڕیارگەی زاپ"ی كرد، موداخەلەی "شەمدین ساكیك"ی كرد، ئەو موداخەلەیە قاچی دەوڵەتی لەناو تەڤگەردا شكاند و بێكاریگەری كرد، ئەگەر سەرۆك ئەو موداخەلەیەی بۆ ناوەندی بڕیارگەی زاپ پێشنەخستبایە، ئەوا دەوڵەت و "شەمدین"پێكەوە قۆناخێكی وەهایان دەست پێدەكرد كە سەرۆك بێكاریگەر بكەن و تەڤگەر بەتەواوی لەژێر كۆنترۆڵی سەرۆك و لەسەر ئەو رێباز و خەتە دەربخەن. "شەمدین" دەیخواست خەتی چەتەگەرێتی لەنێو گەریلادا و لە كۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی پارتیدا زاڵ بكات. بۆ ئەو مەبەستە زۆر تەرز و شێوازیشی بەڕێوە

دەبرد. بۆیە هەندێك كەسی بە ڕێگەی توانستی مادییەوە یان پلە و پایە دان بەهەندێكی تریان بۆ لای خۆیانی ڕاكێشابوو، هەروەها ترسی لەسەر ئەو هەڤاڵانە دروستكردبوو كەوا پەیوەستی ڕێباز و خەتی تەڤگەرن و هەڕەشە و گوڕەشەی لێیان كردبوو، واتا ئەوان بترسێنێت و بێكاریگەریان بكات و هەموو شتێك بخاتە دەستی خۆیەوە. ئەگەر توانی لە ناوەندی بڕیارگەی زاپ بەڕێوەبەرایەتی تەواو بێكاریگەر بكات و تەڤگەری لەوێ خستە دەستی خۆیەوە، ئەوا بەدوایدا دەچووە لای سەرۆك و پێی دەگووت:" ئیدی تۆ تەواو، پێویستە هەموو شتێك تەسلیمی من بكەیت" بۆ ئەم مەبەستە ئەكیب (تیم)ێكیشی دروست كردبوو. بەڵام سەرۆك موداخەلەی ئەوەی كرد و نەیهێشت "شەمدین" تەڤگەر بەتەواوی بخاتە دەستی خۆیەوە و لەژێر كۆنترۆڵ و فشاری ئەودا بێت. دەوڵەتیش هیوای بە "شەمدین" هەبوو كە "شەمدین"خۆی و خەتی چەتەگەرێتی خۆی زاڵ بكات. بۆیە لەپێناو ئەوەی "شەمدین" ئەمە بكات، دەوڵەت لەهەموو ڕوویێكەوە هێزی پێدەدا، تا دەهاتیش فشار و گوشاری خۆی لەسەر تەڤگەر و سەرۆك چڕوپڕتر دەكرد، بۆ ئەوەی سەرۆك نەتوانێت كار بكات و "شەمدین" بەئاسانی باڵادەستێتی خۆی لەناو تەڤگەردا دروستبكات. ئیدی سەرۆك ئەمەی بینی و موداخەلەی كرد و "شەمدین"ی بێكاریگەر كرد، بەمەش ئەو خەتە چەتەگەرێتییە نەیتوانی باڵادەستێتی خۆی لەنێو تەڤگەردا دروست بكات و خۆی زاڵ بكات. ئەگەر ئەمە ڕوویدابایە، ئەوا زۆر مەترسیدار بوو، ئەمە كۆتایی بەتەڤگەر دەهێنا. سەرۆك نەیهێشت ئەمە ڕووبدات..

**لەساڵی (١٩٩٧)دا ئەو كاتە "فەرهاد" و "بۆتان" بەرپرسیاری خەباتی باشوور بوون. ئایا ئەوانە ئەگەری ڕوودانی هێرشێكی وەها بۆ سەر دامودەزگاكانی تەڤگەر لەهەولێر دەكەن؟ ئەگەر ئەو ئەگەرە دەبینن بۆچی هیچ تەدبیرێك وەرناگرن؟ ئەو كاتە لەهەموو ڕوویێكەوە هێرش هەیە و تەنانەت لەبەرامبەر سەرۆك ئاپۆش هەوڵێكی كوشتن**

**دراوە و سەركەوتوو نەبووە... یان لەم رووەوە بێ تەدبیرییەك هەیە... چونكە (١٤)ی گوڵان ئۆپەراسیۆنی توركیا بۆ سەر باشوور دەستی پێكردبوو، كەچی لە (١٦)ی گوڵاندا كۆمەڵكوژییەكە لەهەولێر روودەدات...**

ئێمە نازانین كەوا تاچەندە ئەمەیان بەئەنقەست كردووە یان نا، لەم رووەوە ناتوانم شتێك بڵێم، بەڵام بیانخواستبایە دەیانتوانی ئەو هەڤاڵانەیان لەوێ دەرخستبایە. تەنانەت بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی هەیە، گوایە (پ د ك) رێگەی داوە كە هەڤاڵان دەربخەن، ئەوانە بەئەنقەست هەڤاڵانیان دەرنەخستووە" بێگومان "فەرهاد" و "بۆتان"یش دەیانگووت:" ئێمە هەندێك لەهەڤاڵانمان دەرخست و هەندێكیشمان دەرنەخست و گووتمان؛ ئێمە بەرخۆدان دەكەین و شەڕ دەكەین، بۆیە ئێمە ئەو هەڤاڵانەمان دەرنەخست" ئەوان وەهایان دەگووت. وادیارە بەئەنقەست دەریاننەخستوون، ئەگەر بیانخواستبایە دەیانتوانی لەوێ دەریانبخستنایە، ئەو توانستەش هەبوو. چونكە كە هەندێك لە هەڤاڵانیان دەرخستبوو (پ د ك) رێی پێدابوون. ئەگەر رێی پێیان نەدابایە نەیاندەتوانی ئەوانیش دەربخەن. وادیارە بەئەنقەست دەریاننەخستوون. بەگوێرەی ئەوان روونیان دەكردەوە دەیانگووت:" ئێمە ئەوانەمان بۆ بەرخۆدانكردن دەرنەخست" بێگومان ئەمە تاچەند راستە؟ یان بەئەنقەست ئەو هەڤاڵانە لەوێ بمێننەوە بۆ لەناوبردنیان بووە و ئەمەیان بەبنچینە وەرگرتووە بۆ ئەوەی (پ د ك) ئەوان لەناو ببات كە شەڕی نێوان ئێمە و (پ د ك) دژوارتر ببێت، هەڵبەتە ئەوان لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی (ی ن ك) دابوون، ناكۆكی نێوان (پ د ك) و (ی ن ك) هەبوو، بۆ ئەوەی بتوانن سوود لەمە وەربگرن، (ی ن ك)ش سوودمەند ببێت "فەرهاد" و "بۆتان"یش سوودمەند ببن... بێگومان ئێمە نازانین مەسەلەكە چۆنە. لەوانەیە ئەگەری وەهاش هەبووبێت، بەڵام ناتوانم سەدا سەد بڵێم كە بەمشێوەیەیە. واتا بۆچی وەهایان كرد من نازانم...

# (PKK)

## زایەڵەی ئازادی ژنانی میزۆپۆتامیایە

**وەك دەزانرێت تێکۆشانی ئازادیخوازانەی ژن لەنێو تەڤگەری (PKK)دا بە چەندین قۆناخدا تێپەڕیوە؛ سەرەتا یەکێتی ژنانی وڵاتپارێزی کوردستان (YJWK) و پاشان یەکێتی ئازادی ژنانی کوردستان (YAJK) و دواتریش قۆناخی بەپارتیبوونی ژنان دێتە ئاراوە کە سەرەتا پارتی ژنانی کرێکاری کوردستان (PJKK) ئاوادەکرێت و پاشانیش پارتی ژنی ئازاد (PJA) و ئەمڕۆش پارتی ئازادی ژنانی کوردستان (PAJK) و کۆما ژنانی بڵند (KJB) دادەمەزرێن. لێرەدا شرۆڤەی سەرۆك ئاپۆ و هەوڵ و تێکۆشانەکانی بۆ بەرەو پێشەوەبردنی تێکۆشانی ئازادی ژنان و بەرێکخستەکردنی ژنان لەنێو تەڤگەردا و هەمیش لەنێو گەلدا چۆن هەڵدەسەنگێرێت؟**

سەرۆك ئاپۆ هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی تێکۆشانی ئەم تەڤگەرەدا سەبارەت بە ژن نزیکبوونەوەیەکی نوێی پێشدەخست، لەوانەیە ئەو نزیکبوونەوەیە لەدەستپێکدا زۆر قووڵ نەبووبێت، بەڵام ئەو کاتەی کە گفتوگۆمان لەسەر ئەوە دەکرد کەوا ئایا "کەسیرە" وەربگرین و تەڤلی ریزەکانی خۆمانی بکەین یان نا؟ ئەو کاتە لەو گفتوگۆیانەدا نزیکبوونەوەیەکی سەرۆك سەبارەت بە ژن و تێکۆشانی ئازادی هەبوو، واتا لەناو هەموو هەڤالاندا نزیکبوونەوەیەکی جودای پێشدەخست. تادەهات سەرۆك نزیکبوونەوە و

چەمكی خۆی بۆ ژن هەم بەرفراوانتر كرد و هەمیش قووڵتری كردەوە و گەیاندییە ئاستی فیكرێك و ئایدیۆلۆژییەك. لەسەر ئەو بنەمایە تەڤگەری ئازادی ژنیش لەنێو تەڤگەردا پێشخرا. تاكو كۆنگرەی سێیەمینی (PKK) رێكخستنێكی ژنان لەناو تەڤگەردا نەبوو، بەڵام لەسێیەمین كۆنگرەدا لەناو تەڤگەردا هەنگاوێك هاوێشترا بۆ ئەوەی تەڤگەری ژنیش ئاوا بكرێت. لەسەرەتادا ئەم تەڤگەرەی ژن لە ئەورووپادا دروست بوو، ئەو هەنگاوە لە ئەورووپادا هاوێشترا، پاشان لەناو ریزەكانی گەریلا هەمان هەنگاو هاوێشترا. دوای كۆنگرەی پێنجەمین تەڤگەری ژن خۆی لەنێو ریزەكانی گەریلادا بەرێكخستن كرد و بۆخۆی كۆنفرانسێكی سازدا. بەم كۆنفرانسە خواستی رێكخستنی خۆی لەناو ریزەكانی گەریلادا دروست بكات. دواتر دیسان بە هاوكاری سەرۆك، لەناو ریزەكانی گەریلادا "سوپای ژن" دامەزرا. واتا پەیوەست بەتەڤگەری ژنەوە "سوپای ژن" و رێكخستنی ئەو پێشخرا. لەدوای كۆنگرەی شەشەمینیشەوە، پارتیبوونی ژن لەناو تەڤگەردا پێشكەوت. واتا لەتەڤگەرێكەوە دەستیپێكرد و لەناو تەڤگەردا خۆی كردە تەڤگەرێك و سوپابوونی خۆی ئاواكرد و لەسەر ئەو بنەمایەش دواتر پارتیبوونی خۆیشی تا ئەو قۆناخە هات.

سەرۆك ئاپۆ بۆچی هێندە قورسایی خستە سەر خەبات و تێكۆشانی ژن؟ چونكە بینی كە كێشەی كورد پەیوەستە بە كێشەی ژنەوە. ئەگەر تۆ كێشەی ژن چارەسەر نەكەیت ئەوا ناتوانیت كێشەی كوردیش چارەسەر بكەین. كاتێك سەرۆك خواستی كێشەی كورد چارەسەر بكات بینی كە ئەمە پەیوەستە بە ژنەوە، كاتێك خواستی كێشەی مرۆڤایەتی چارەسەر بكات دیسان ئەو كێشەیەش پەیوەستە بە ژنەوە، ئەم راستییەی بینی. بۆیە ژن و تێكۆشانی ژنی بەبنچینە وەرگرت. لە لێكۆڵینەوە تیۆرییەكانی خۆیدا، لە قووڵبوونەوەی خۆیدا بۆ ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفە بینی كە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بۆ یەكەمجار ئەوەی كە بەكۆیلەكراوە ژنە، دوای ئەوەی ئازادی ژن لەژن سەندراوەتەوە و كۆیلەكراوە، هەموو جۆرە كۆیلایەتی و دەسەڵاتدارێتییەك پێشكەوتووە. واتا بناخەی هەموو دەسەڵاتدارێتییەكان، لەناویشیدا دەوڵەت، لەسەر بنەمای كۆیلەكردنی ژن پێشكەوتووە، ئەگەر تۆ دەخوازیت كێشە مرۆڤایەتییەكان چارەسەر بكەین، پێویستە تۆ كێشەی ژن دەربخەیتە روو و چارەسەری بكەیت، بۆ ئەوەی بتوانیت كێشەكانی دیكە

چارەسەر بکەیت. چونکە سەرچاوەی هەموو کێشەکان لەکێشەی ژنەوە هاتووە، کۆیلایەتی و دەسەڵاتدارێتی لەسەر کۆیلەکردنی ژن پێشکەوتووە. مەسەلەی چینایەتی دوای ئەمە دەرکەوتووە، هەموو مەسەلەکانی دەوڵەت پاشان دەرکەوتوون.

لەبەرچی لەمێژوودا؛ زۆر تەفکەر دەرکەوتوون، کە بۆ ئازادی و دیموکراسی و عەدالەت شەڕ و خەباتیان کردووە و زۆر هەنگاویشیان هاوێشتووە، بەڵام لەئاکامدا کێشەی ئازادی و دیموکراسی و عەدالەت و یەکسانیان چارەسەر نەکردووە؟ سەرۆك بینی هۆی بنەڕەتی نزیکبوونەوەی ئەو تەفکەرانەیە لە ژن. بۆیە نەیانتوانیوە ئەو کێشانە چارەسەر بکەن. چونکە کەسیان لە کێشەی ژن تێنەگەیشتوون، بۆیە لە کێشە کۆمەڵایەتییەکان و لەمێژوو و کۆمەڵگاش تێنەگەیشتوون، لەبنچینەدا لە کۆیلایەتی و دەسەڵاتدارێتی تێنەگەیشتوون. ئەوەی لەمانە تێنەگات ناتوانێت کێشەی ئازادی و دیموکراتی و عەدالەت و یەکسانیش چارەسەر بکات. هەروەها سەرۆك ئاپۆ بینی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ئەوەی هەرە زێدە کەوتووە ژنە، واتا لە ژن کەوتووتر نییە، سەرۆك بینی کە لەسەر رەنج و کار زۆر لێکۆڵینەوە کراوە، بەڵام لەسەر رەنجی دایك هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ نەکراوە. ئەمە لەکاتێکدا رەنجی دایك لەهەموو رەنجێك مەزنترە. تۆ وەرە هەموو رەنجەکان شیبکەوە، ئەگەر رەنجی دایك شینەکەیتەوە ئەوا چۆن دەتوانیت شەڕی رەنج بەرەو پێشەوە ببەیت؟ شەڕێك کە بۆ رەنج پێشبخەیت کەم بێنێتەوە. لەمێژوودا لەپێناو رەنجدا زۆر شەڕ روویانداوە، بەڵام لەئاکامدا رەنج سەرنەکەوتووە. واتا گووتوویانە:" رەنج پیرۆزە" و خواستوویانە کە رێزی لێبگرن، بەڵام هیچ کاتێك بەتەواوی رێزی لێنەگیراوە. بۆچی؟ چونکە لەمەسەلەی رەنجدا تەنیا رەنجی چینایەتی لەبەرچاو گیراوە و تاوتوێکراوە. بەڵام رەنجی دایك چییە؟ کەس لەسەر ئەم بابەتە راوەستەی نەکردووە.

ئیدی چەندە سەرۆك دەیخواست کێشەی کورد چارەسەر بکات، چونکە کێشەی کورد کێشەیەکی نێودەوڵەتی و نێونەتەوەییە، بینی کە لە کوردستاندا هەر تەنیا کێشەیەکی نەتەوەیی نییە، بەڵکو کێشەیەکی مرۆڤایەتیش هەیە، چەندە دەخوازیت لە کێشەی کورد تێبگەیت و چارەسەر بکەیت و بخوازیت ئازادی و دیموکراسی و عەدالەت و یەکسانی پێشبخەیت، ئەوا پێویستە تۆ باش لەمێژوو تێبگەیت، باش لە کۆمەڵگا

تێبگەیت، باش لە دونیا و لە کێشەی مرۆڤایەتی تێبگەیت. چونکە کێشەی کورد پەیوەستە بە کێشەی مرۆڤایەتییەوە و ئاوێتەی یەکتربوونە. سەرۆك چەندە خواستی لەکێشەی کورد تێبگات و خۆی تێدا قووڵ کردەوە، هێندەی ئەمەش خواستی لەکێشەی مرۆڤایەتی تێبگات و خۆی تێدا قوولکردەوە. چەندە خواستی کێشەی کورد چارەسەر بکات، لەپێناودا دەستی بۆ کێشە مرۆڤایەتییەکانیش برد، تاکو کێشە مرۆڤایەتییەکانیش چارەسەر دەبێت؟ چونکە کێشەی کورد و کێشە مرۆڤایەتییەکان لە زۆر رووەوە تێکەڵاوی یەکتربوونە و گرێدراوی یەکترن.

بۆیە ئەو سەرۆکایەتییەی سەرۆکیش لە کوردستاندا پێشیخستووە سەرۆکایەتییەکی نوێ بوو، لە زیهنییەت و بیر و راماندا، لەتەرزی سیاسەتدا، بەتەواوی سەرۆکایەتییەکی نوێ بوو، لەو سەرۆکایەتییە باوەی هەبوو جودا بوو، بۆیە سەرۆك ئاپۆ لە کوردستاندا کۆمەڵگای ژێرەوە (خوارەوە)ی بەبناخە وەرگرت. واتا گەل، خەڵکی هەژار و نەدار، ژێردەستە و زوڵملێکراوانی بەبناخە وەرگرت، خواستی رابوون لە گەلدا بێنێتەدی. واتا دەستی بۆ کۆمەڵگای سەرەوە (ژورەوە) نەبرد. هەموو کەس لەسەرەوە دەستی بۆ مەسەلەکان برد، بەڵام سەرۆك ئاپۆ لەژێرەوە و لە رەگوریشەوە دەستی بۆ مەسەلەکان برد، بۆچی؟ چونکە بە زیهنییەتێکی نوێ لە گەلی کورد و کێشەی کورد نزیکبووەوە، کاتێك لەبناخە و بنەڕەتەوە دەستی بۆ کۆمەڵگای ژێرەوە برد، بینی کەوا لە کۆمەڵگای ژێرەوەدا ژن هەرە کەوتووە و لەخوارەوەی هەموویان دایە. چەندە گەلی کورد لەلایەن سیستەمی داگیرکەری و سەرمایەدارییەوە دارزێندراوە و داڕووخێندراوە، زۆر خراپیش داڕووخێندراوە، بینی کە لەناو ئەمەشدا ژن زۆر زیاتر داڕووخاوە ترە، ئەگەر تۆ بخوازیت رابوون لە گەلی کورد دا ئەنجام بدەیت ئەوا پێویستە تۆ لەژنەوە دەست پێبکەیت و رابوونی تێدا ئەنجام بدەیت. چونکە تۆ ئەوەی هەرە کەوتوون خستتە سەرپێ، ئەوا ئەوانەی دیکەش رادەبن. ئەوەی هەرە کەوتووە رابوونی زۆر زەحمەتترە، بەڵام کە رابوونیشی ئەنجامدا ئەوا زۆر بەمەزنی رادەبێت.

لەمێژووشدا؛ سەرەتا ژن داڕووخێنراوە و کەوتووە، لەسەر کۆیلایەتی ژن هەموو شێوە کۆیلایەتی و دەسەڵاتدارێتییەك ئاواکراوە و پێشخراوە. واتا لەبناخەی کێشە مرۆڤایەتییەکاندا، هەروەها لەبناخەی کێشەی کوردیشدا کێشەی ژن هەیە. ئەگەر تۆ

لەو کێشەیە تێگەیشتیت و خواستت ئەو کێشەیە چارەسەر بکەیت، ئەوا ئەو کاتە دەتوانیت کێشەکانی دیکەش چارەسەر بکەیت. ئەگەر تۆ لەو کێشەیە تێگەیشتیت و خواستت چارەسەری بکەیت، ئەوا دەتوانیت لەکێشەکانی دیکەش تێبگەیت و چارەسەریان بکەیت. ئەگەر تۆ ژنت راگردە سەرپێ ئەوا تۆ دەتوانیت کۆمەڵگا رابکەیتە سەرپێ.

سەرۆك بینی هەموو کێشەکان گرێدراوی ئەو کێشەیەن، لەو کێشەیەدا بوونەتە گرێ و کلیل دراون، دەبێت ئەو گرێیە بکەیتەوە، ئەگەر تۆ ئەو گرێیەت کردەوە ئەوا گرێیەکانی دیکەش دەبنەوە. پاشان ئەزموونی سۆڤییەتیش هەبوو، هەرچەندە هەندێك هەنگاویش لەوێ هاوێشترابن، بەڵام لەوێدا کێشەکە هەر ماوە و لەئارادایە. بۆ دەوونە بینی؛ کە لە سۆڤییەت و سۆسیالیزمی بنیادنراودا کێشەی ژن چارەسەر نەکراوە، پەیوەست بەمەوە تێگەیشتن لەکێشەکانی دیکە بەدینەهاتووە، لەبەر ئەوەشە لەنێو کێشەکاندا دەژین. سەرۆك ئەزموونی لەهەموو ئەمانە وەرگرت و باش لەمێژوو و کۆمەڵگا تێگەیشت، لەوە تێگەیشت کە چۆن لەمێژوو و کۆمەڵگادا دوورکەوتنەوە لەبنچینە و بناخە هاتۆتە ئاراوە و چۆن دەستیپێکردووە؟ لەرێلادان لەکوێوە دەستی پێکردووە؟ بینی کە لەکۆیلایەتی ژنەوە دەستی پێکردووە. بۆیە مرۆڤایەتی لەزۆر رووەوە لە بنچینە و بناخەی خۆی دوور کەوتۆتەوە. کەواتە چۆن بتوانرێت مرۆڤایەتی ـچینە و بناخەی خۆی نزیك ببێتەوە و بگەرێتەوە سەر ئەو بنچینە و بناخەیە و لەسەر ئەو بنەمایەش پێشبکەوێت. ئیدی ئەگەر تێگەیشتن لەکێشەی ژن هەبێت و چارەسەر بکرێت، مرۆڤایەتی دەتوانێت بگەرێتەوە بۆ بنچینە و بناخەی خۆی و جارێکی دیکە هەنگاو بهاوێژێتەوە. لەبەر ئەم هۆیانە سەرۆك هێندە راوەستەی لەسەر کێشەی ژن کرد. لەمێژووی گەلی کوردیشدا زۆر تەڤگەر و راپەڕین شکستیان خواردووە، یەکێك لەهۆیەکانی ئەم شکستە ژنە، چونکە ژن هەم دەرفەتی بەشداریکردنی لەو تەڤگەر و راپەڕینانە پێنەدراوە و لەنێو چوار دیواردا دیل کراوە، هەمیش لەکاتی راپەڕین و سەرهەڵدانەکاندا داگیرکەران ژنانی کوردیان دەستگیرکردووە و گووتوویانە:" ئەوا ژنانی ئێوەمان دەستگیرکردووە، ئەگەر ئێوە تەسلیم نەبن ئەوا ئێمە هەموو خراپییەك لەبەرامبەریاندا دەکەین". بۆنموونە؛ رابەر و سەرکردەی زۆر لەتەڤگەر و

راپەڕینەکان یان ئەوانەی لەو تەڤگەر و راپەڕینانـەدا بەشـداربوونە بـەم هۆکارە وازیـان لە راپەڕین و تێکۆشان هێناوە و گەڕاونەتەوە و تەسلیم بوونەتەوە.

هەروەها سەرۆك بینی کە لە کۆمـەڵگای کورددا، مـرۆڤ هێـشتا خـۆی نەناسـیوە و لـەژێر نـاوی زەواج (هاوسـەرگیری)یـدا، لـەژێر نـاوی پێکـەوەنانی خێزانـدا ئـەو کەسـانە ژیـانی خۆیـان دەدۆڕێـنن، ژیـانی ئـەوان دەبێتـە ژەهـر. بۆیـەش کۆمـەڵگای کـورد لەلایەکـەوە، کۆمەڵگایەکـە لـەژێر دەسـەڵات و زوڵمـی داگیرکـەران دایـە و لـەنێو ئەشـکەنجە و کۆمەڵکوژییدا دەژیت، ئەمەش لەزۆر رووەوە تاکی کورد وێران دەکات و تێك دەشکێنێت، لەلایەکی دیکەشەوە لەنێو کۆمەڵگاشدا هێشتا کەسەکان خۆیان و ژیانی خۆیان نەناسیوە کەچی لەژێر ناوی هاوسەرگیری و خێزان پێکەوەناندا دەخزێنرێنە نێو تەنگوچەڵەمەوە و ژیانیان دەکرێتە ژەهر، بۆیـە بـەهۆی کێـشەکانی نێـو ئـەو کۆمەڵگایـەوە کەسـێتییەکی بەهێز و تۆکمە دەرناکەوێت. ئەمەش ئەو تەخریباتانەی داگیرکەران کردوویانـە قـووڵتر دەکاتەوە. ئەگەر کێشەی گەلی کورد هێندە قووڵ بۆتەوە و نەخۆشییەکانی مرۆڤی کورد هێنـدە زۆر و مـەزنن، یـەکێك لـەهۆکارەکان چـۆنێتی نزیکبوونەوەیـە لـە ژن و خێـزان. ئەگەر سەرۆك هێندە لەسەر مەسەلەی ژن راوەستەی کرد لەبەر ئەم هۆیانە بوو.

ئاسـتی ئـازادی و دیموکراسـی هەر کۆمەڵگایـەك پابەنـدە بەئاسـتی ئـازادی ژنـەوە. واتـا لەکۆمـەڵگادا ئاسـتی ژن تێیـدا لەهەمانکاتـدا ئاسـتی ئـازادی و دیموکراسیـشە، ئەگـەر تـۆ دەخوازیت کۆمەڵگایەکی ئـازاد و دیمـوکرات ئـاوا بکـەیت و کۆمەڵگایـەك خـۆی لەهـەموو نەخۆشییەکانی خۆی رزگار کردبێت، ئاوا بکەیت، ئەوا ئەمـە لەسـەر بنـەمای ئـازادی ژن دێتەدی. ئیدی ئەگـەر سـەرۆك ئـاپۆ لەچارەسـەرکردنی کێـشەی کورددا ژنـی بەبنـچینە وەرگـرت ئـەوا لەبـەر ئـەم هۆیانـە بەبنـچینەی وەرگـرت. واتـا لـە کوردسـتاندا تـەواوی کۆمــەڵگا داڕووخــاوە، لــەناو ئــەو کۆمەڵگایەشــدا ژن لەهــەموویان داڕووخــاوترە و کـەوتووترە، داگیرکـەران گـەلی کوردیـان کۆیلـەکردووە، لـەژێر زوڵمێکـی هێنـدە مەزنـدا دەژیت، ژنی کوردیش هەم لەژێر دەسەڵاتدارێتی پیـاو و هـەمیش لـەژێر دەسـەڵاتدارێتی داگیرکەراندا کە بەسەر کۆمەڵگادا خۆی سەپاندووە، دەژیـت. واتـا ئـەو دەسـەڵاتدارێتی و زوڵم و چەوسانەوەیەی لەسەر ژن هەیە دوو قاتە، ئەگەر تۆ دەخوازیـت لـە کوردسـتاندا کۆیلایـەتی و دەسـەڵاتدارێتی نـەهێڵیت و ئـازادی و دیموکراسـی فەراهـەم بکـەیت، ئـەوا

دەبێت تۆ دەست بۆ کێشەی ژن ببەیت. چونکە کەس لەژن زوڵملێکراوتر و چەوساوەتر نییە، زوڵم و ئەشکەنجەی هەرە مەزن لەسەر ژن پێکدێت. تەفگەرێك کە ئازادی، دیموکراسی، عەدالەت و یەکسانی بۆ خۆی بە ئامانج و بنچینە وەردەگرێت، ئەگەر توانی لەو خاڵەوە دەستپێبکات ئەوا بەراستی دەتوانێت بەو ئامانجانەی بگات و بیهێنێتەدی. ئەگەر لە ژنەوە دەستی پێنەکرد، چەندە بڵێت؛ من تەفگەرێکی ئازادیخواز و دیموکراتیخواز و دادپەروەر و یەکسانیخوازم و دەخوازم لە کوردستاندا ئەمانە سەقامگیر بکەم ئەمە راست نییە.

مرۆڤ ئەگەر لەمێژووش بڕوانێت هەر تەفگەرێك کەوا کۆمەڵگای خوارەوەی بەبنەما وەرگرتبێت و لەو کۆمەڵگایەشدا هی هەرە کەوتووی بەبناخە وەرگرتووە، ئەوا زۆر بەهێز و تۆکمەییەوە سەریانهەڵداوە و کاریگەری سەدان ساڵەی خۆیان بەجێهێشتووە. بۆنموونە؛ تەفگەری حەزرەتی مەسیح بۆچی هێندە مەزن سەریهەڵدا؟ چونکە عیسا لەناو کۆمەڵگادا کۆمەڵگای هەرە خوارەوەی بۆخۆی بەبنەما وەرگرتووە، ئەوانەی لەدەستپێکەوە لەدەوروبەری عیسا کۆبوونەتەوە هەر هەموویان کەسانی هەرە کەوتوو بوون، تەنانەت ئەوانەی خاوەندارێتی لەتەرمی عیساش دەکەن ژنن و ژنانی زۆر کەوتووشن. هەربۆیە تەفگەری عیسا هێندە بەهێز سەریهەڵدا و کاریگەرییەکەیشی هێندە بەهێزە. ئەگەر مرۆڤ لە تەفگەری "حەزرەتی محەمەد" بڕوانێت ئەویش لەسەرەتادا بەمشێوەیە، هەر بۆیە وەك تەفگەرێکی مەزن سەریهەڵدا و کاریگەری مەزنی خۆی کردووە. بێگومان رابوونە سەرپێی کەسی هەرەکەوتوو زۆر دژوارە، هەروا بەئاسانی هەڵناستێتە سەرپێ. بەڵام کە جارێکیش رابوو، هەروا زوو بەزوویی تێکناشکێت. ئیدی ئەگەر ئەو تەفگەرەی سەرۆك ئاپۆ لە کوردستاندا ئاوای کرد، کە هێندە بەمەزنی و بەهێزەوە رابووە و جیهان هەمووی هێرشی بۆدێنێت کەچی هیچ شکست ناهێنێت، هۆکارەکەی ئەمەیە. ئەمە پابەندە بەو راستییەوە...

## لە (٣٠)ی حوزەیرانی (١٩٩٦)دا لەبەرامبەر ئەو پیلانگێڕییەی کە لە (٦)ی ئایاری هەمان ساڵدا لەدژی سەرۆك ئۆجەلان لە شام ئەنجام درا

**هەڤاڵ زیلان (زەینەب کناجی) چالاکییەکی گیانبازی لەشاری دێرسیم لەدژی سوپای تورکیا ئەنجام دەدات، پێشتریش چەندین چالاکی گیانبازی دیکە ئەنجامدراوە؛ وەك لەساڵی (١٩٩٠)دا لە ئامەد کچە خوێندکاری زانکۆ "زەکیە ئەلکان" لە نەورۆزدا ئاگر لەجەستەی خۆی بەردەدات، لەساڵی (١٩٩٤)یش لە ئەڵمانیا هەڤالان "بێریڤان" و "رووناهی" لەدژی سیاسەتی زوڵمکارانەی ئەڵمانیا ئاگریان لەجەستەی خۆیان بەردا، هەروەها پاشان هەڤاڵ "سەما یوجە" لە(١٩٩٨) لەدژی زوڵمی داگیرکەری و خەتی تەسلیمکاری لە زینداندا گڕی لەجەستەی خۆی بەردا، ئیدی پاشانیش لەئاستی هەرە بڵنددا هەوڵدان بۆ پێشەنگایەتیکردنی ژن لەتێکۆشاندا لەپەرەسەندندا بووە. مرۆڤ لەکەسێتی هەڤاڵ "زیلان"دا چۆن رۆڵی تەڤگەری ژن لەنێو تەواوی تەڤگەری ئازادیخوازی کورددا هەڵدەسەنگێنێت؟**

مرۆڤ ئەگەر باش لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی (PKK) بکات؛ دەبینێت کە لەدەستپێکدا تەنیا پیاو بەشدار ئەم تەڤگەرە دەبن، زیاتر لەنێو پیاواندا باوەڕییەکی بەهێز بۆ سەرۆك ئاپۆ پێشدەکەوێت، زۆربەیان بۆ سەرۆك ئاپۆ خۆیان فیداکردووە و بوونەتە فیدایی، بەلام مرۆڤ دەبینێت تا تەڤگەر پەرەدەسەنێت بەشداری ژنیش بۆ تەڤگەر پێشکەوتووە، شانبەشانی پیاو لەناو ژنانیشدا ئەوانەی سەرۆکیان بۆخۆیان بەبنچینە وەرگرتووە و چارەنووسی خۆیان لەگەڵیدا کردۆتە یەك و لەپێناو تەڤگەر و سەرۆکدا خۆیان فیداکردووە، لەزیادبووندا بووە، دەبینرێت تادێت لەژنیشدا بەهێز دەبێت و تەنانەت لەژندا زیاتر پێشدەکەوێت... بۆچی؟ چونکە ژن بینی کە سەرۆك ئاپۆ

بەهایەکی زۆر بەژن دەدات، ئەمە نەك تەنیا لەناو تەفگەردا ئەو بەهایەی بە ژن دا، تەنانەت لەناو کۆمەڵگاشدا بەهای بە ژن دا، چونکە سەرۆك کێشەی ژنی تەنیا لەچوارچێوەی ئەو ژنانە نەبینی کە لەناو تەفگەردا لەتێکۆشان دان، بەڵکو کێشەی ژنی چ لەناو تەفگەر و چ لەناو کۆمەڵگادا بینی و بەشێوەیەکی گشتگیرانە تاوتوێی کرد و لێیتێگەیشت. بۆیەش تەنیا خیتابی کادیرانی نەدەکرد، بەڵکو خیتابی ژنانی ناو کۆمەڵگاشی کرد، سەرۆك ئەو خیتابکردنە و ئەو خەبات و پەروەردەکردنەی ژنانی زیاتر پێشخست و قووڵتری کردەوە، بۆ ئەوەی ژن زیاتر خۆی بناسێت و کێشەکەی خۆی بناسێت و خاوەندارێتی لەخودی خۆی بکات، هەوڵ و خەباتێکی مەزنی پێشخست. بە پروپاگەندەوە بگرە تا دەگاتە کۆبوونەوە سازدان و شیکردنەوە، لەهەموو روویێکەوە هاوکاری ژنی کردووە، بۆ ئەوەی ژن لەراستینەی خۆی و هێزی خۆی تێبگات و لەو رەوشەی تێیکەوتووە تێبگات بزانێت چۆن خۆی لێی رزگار بکات، کە خۆی لێی رزگارکرد دەتوانێت ببێت بەچی؟ ئەمانە هەمووی خستە بەردەم ژنەوە. چەندە سەرۆك ئەو هەوڵ و خەباتەی خۆی پێشخست، لەناو ژنانیشدا سەرۆك زیاتر بەبنچینە وەرگیردرا. هەم لەناو کۆمەڵگادا و هەمیش لەتەفگەردا پابەندبوونی ژنان لە پیاوان زیاتر بوو بۆ سەرۆك.

بۆیە هەم بە هەزاران ژن تەفلی تەفگەر بوون، هەمیش لەناو کۆمەڵگادا ژنان کەوتنە نێو چالاکی نواندنەوە، لەتەواوی سەرهەڵدانەکاندا ژن پێشەنگایەتی کردووە، ئەمە هەر کەسێك بینی. هەر کەسێکیش شاگەشکە دەبوو لەوەی کە لەنێو جڤاکێکی وەکو جڤاکی کوردیدا چۆن ژنان هێندە لەرابوون و پێشکەوتن دان. ئەو کۆمەڵگایەی کەوا ژن تێیدا نەیدەتوانی بچێتە ماڵی دراوسێکەی، کەچی ئێستا بەشداری لە سەرهەڵدانەکان دەکات و پێشەنگایەتی بۆ سەرهەڵدانەکان دەکات، بەهەزارانیش دەرکەوتوونەتە سەر چیاکان و شەڕیش دەکەن. ئەمە پەیوەست بەچییەوە هاتەدی؟ پەیوەست بەخەباتی سەرۆك هاتەدی. سەرۆك بیر و باوەڕییەکی مەزنی بەژن بەخشی، لەسەر ئەو بنەمایەش ژن مۆراڵ و باوەڕی وەرگرت و هوشیاری و دانایی و ئیرادەی بەدیهات. بەمشێوەیە ژن رابوو، ئەو باوەڕی و هێز و داناییەی تەنیا لە سەرۆکدا بینی. بەر لە سەرۆك کەسێکی دیکە بەمشێوە و ئاستە دەستی بۆ کێشەی ژن نەبردووە، کەسێك شتێکی بەژن نەدابوو، رێزی

لە ژن نەگرتبوو. ئەو زیهنییەتەی کەوا سیستەمی کۆمەڵگا و پیاوسالاری بەسەر ژنانیدا سەپاندبوو ژنان پەسندیان کردبوو. هەڵبەتە لەو زیهنییەتەشدا خودی ژن و ژیان و ناسنامە و ئیرادەی ژنی تێدا نەبوو، بەتەواوی پێویستبوو کۆیلایەتی بکات و جی لێبخوازرێت جێبەجێی بکات. ئیدی ئەمە بە سەرۆك ئاپۆ گۆڕدرا.

سەرۆك ئاپۆ زیهنییەتێکی دیکەی خستە بەردەم ژنانەوە، بۆیە دونیای ئەوان و رۆح و ئەقڵی ژنانی کردەوە، ژنان کەمێك خۆیان ناسی، بۆیە سەرۆکیان بۆخۆیان بەبنەما وەرگرت، تادەهات ژن باوەڕی بەخۆی و سەرۆك بەهێزتر بوو، چەندە سەرۆك تەفکەری ژن و باوەڕی و ئیرادەی ژنی بەهێزتر دەکرد، ژنیش سەرۆکی بەهێزتر دەکرد. ئیدی ئەو پێشکەوتن و پەیوەستبوونە بەمشێوەیە هاتەئاراوە. بۆیەش تا دەهات ژن لە بەها و نرخی سەرۆك تێگەیشت و چارەنووسی خۆی و سەرۆکی کردەیەك. چونکە هەموو هێز و وزەی لەو وەردەگرت. بۆیە کاتێك کە سەرۆك هەر ئەرکێکی بە ژن دەسپارد ژن [illegible] دوودڵی جێبەجێی دەکرد، کاتێك بۆ سەرۆك و تەفکەر مەترسی هاتەپێشەوە [illegible] بەر لە پیاو لەمە تێگەیشت و خاوەنداریێتی لە سەرۆك و تەفکەر کرد. هەمیشە لەم پێناوەدا گیانی خۆیان بەخشی.

لێرەوە زۆر ژن چالاکی بەمشێوەیە ئەنجام دا، لەنێو ئەواندا چالاکییەکەی "زەینەب کناجی" زۆر گرنگە، چونکە خواستیان سەرۆك لە شام لەناو ببەن، هەوڵێکی تیرۆریستیان ئەنجامدا، بۆمبایەکی مەزنیان تەقاندەوە، بۆ ئەوەی لەناوی ببەن. ئیدی "زەینەب کناجی" دوای ئەمە ئەو چالاکییەی لە دێرسیم ئەنجامدا. کەسێك بە زیلان (زەینەب کناجی)ی ئەگووت:" برۆ ئەو چالاکییە ئەنجام بدە" خۆی لەگەڵ خۆیدا کەوتە گفتوگۆوە و خۆی گەیشتە دەرئەنجامێك و لەسەر ئەو بنەمایەش بڕیاری دا و چوو ئەو چالاکییەشی ئەنجام دا. بۆچی؟ چونکە بینی کە دەخوازن سەرۆك ئاپۆ لەناوببەن، لەناوبردنی سەرۆك ئاپۆ بە لەناوبردنی خۆی و لەناوبردنی ژنانی بینی. چونکە هەموو هێز و وزەی خۆی لە سەرۆك ئاپۆ بینی و لەو وەریگرتبوو. کاتێك کە سەرۆك ئاپۆ لەناوبچێت ئەوا بەو واتایە دێت ئەو لەناودەچێت، بە لەناوچوونی ئەو جێیەی کە هێزی لێوەرگرتووە ئەوا ئەو بێهێزتر دەبێت. وەك چۆن منداڵێکی ساوا شیری دایکی دەخوات و پێی دەژیت و بەهێز دەبێت سەرچاوەی هەموو هێزی خۆی

ئەومیە، ئەگەر تۆ ئەو منداڵە لە شیری دایکی و لە دایکی بەدوور بخەیتەوە ئەوا دەمرێت. ئیدی سەرۆك بۆ ژنیش بەهەمان شێوە بوو. ئەو هەوڵی تیرۆرکردنەی سەرۆك بۆ ژن گوزارشتی لەمە دەکرد. "زەینەب کناجی" لەمە تێگەیشت کە:" مادام ئێوە دەخوازن ئێمە لەناوببەن ئێمەش ئێوە لەناو دەبەین" زەینەب کناجی بەچالاکییەکەی ئەو پەیامەی دا... هەروەها بۆ گەل و ژن و گەریلا چ پەیامێکی دا؟ گووتی:"بڕوانن سەرۆکی ئێمە لەناودەبەن، واتا ئێمە لەناودەبەن، تا ئەو رادەیە هێرشمان بۆ دێنن، پێویستە ئێمە لەبەرامبەر ئەم هێرشە بەهێز رابوەستین، مرۆڤ ناتوانێت بە هەڵسوکەوتی سادە لەبەرامبەر ئەو هێرشە رابوەستێت. واتا ئەو چالاکییەی تۆ ئەنجامی بدەیت پێویستە بەگوێرەی ئەو هەوڵی لەناوبردنە بێت کە دەدرێت، تاکو بتوانێت رێگری لەو هەوڵی فرکردنە بکرێت و بێکاریگەری بکات و رایبوەستێنێت" ئیدی بۆ ئەو مەبەستە ئەو چالاکییەی ئەنجامدا، تاکو هەر کەسێك ببینێت کە هەوڵێکی لەناوبردن لەئارادایە و پێویستە هەموو کەس لەدژی رابوەستێت و بیشکێنێت". بۆ دووژمنیش ئەو پەیامەی دا و گووتی:" ئەگەر تۆ دەخوازیت من لەناوببەیت منیش تۆ لەناودەبەم، تۆ ماڤ ژیان بۆ من نەهێڵێت و ئەوەی بە هۆیەوە پێی دەژیم لێمی بستێنیت، ئەو کاتە منیش ژیان لە تۆ حەرام دەکەم" ئیدی "زیلان" ئەو چالاکییەی بۆ ئەم مەبەستە ئەنجام دا.

"زیلان" بۆ سەرۆك ئاپۆ خۆی پارچە پارچە کرد، تەنانەت تاڵەمووێکی خۆیشی نەهێشتەوە. واتا لەو ئاستەدا ئەو چالاکییەی ئەنجامدا، چالاکییەکی مەزنی ئەنجام دا. من وامەزندە دەکەم یەکەمجارە لەکۆمەڵگای کورددا ژنێکی کورد بۆ ئازادی و دیموکراسی خۆی پارچە پارچە بکات، تا ئەو کاتە هیچ ژنێکی کورد شتێکی بەمجۆرەی نەکردبوو، ئیدی ئەگەر لەمێژووی کورد و مێژووی ژنی کورددا "زیلان" دەرکەوت و چالاکییەکی وەهای ئەنجام دا بۆ ئەو مەبەستە ئەو چالاکییەی ئەنجام دا. چونکە سەرۆك ئاپۆ ژنی کردە خاوەن هێز و توانا، ئەو هێز و توانای ژن بوو، ئەگەر ئەویش لەناوبچێت ئەوا هێز و توانای ژن لەناو دەچێت. "زیلان" بەپابەندبوونی خۆی بەئازادی و دیموکراسی و سەرۆك ئەو چالاکییەی بەمجۆرە ئەنجام دا. ئەو چالاکییە گوزارشت لەمە دەکات.

هەروەها چالاکییەکەی "زیلان" گوزارشت لە ملیتانێتی ئەم تەڤگەرە و ملیتانێتی ژن لەنێو ئەم تەڤگەرە دەکات. چونکە ملیتانێتی ئەم تەڤگەرە نەك بە فەرمان و تەعلیمات وەرگرتن و چاودێریکردن دەبێت، بەڵکو بەتەواوی بەدڵ دەبێت، بەتەواوی بە پێکهێنانی ئەو ئامانجەی لەپێشخۆی داینـاوە و پێداویستییەکانی ئەو ئامانجانە دابین دەکات و دەستنیـشانی دەکـات و پێـداگری لەسـەر پێکهێنـانی دەکـات. ملیتـانێتی ئـەو تەڤگـەرە بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایەیە. ئیدی "زیـلان" بـینی کـە مەترسییەکی مـەزن لەسـەر تەڤگـەر هەیـە و ئەمەشـی دەستنیـشان کـرد، لەبەرامبـەر ئەمـە چـۆن رابوەسـتێت و لەدۆخێکی وەهادا پێداویستی تەڤگەر بـە چ هەیـە و چ دەخوازێـت؟ ئیـدی چالاکییەکی بـەمجۆرەی دەستنیـشانکرد. چـوو ئـەو چالاکییەشـی ئـەنجام دا. "زیـلان" بەمـە بـووە "زیـلان". هـەم ملیتـانێتی ئـەو تەڤگـەرەی بەشـێوەیەکی راسـت لەشەخـسی خۆیـدا بەرجەستەکرد، هەمیش لەمێژووی کورد و مێژووی ژنی کورددا بۆیەکەمجار بـۆ ئـازادی و دیموکراسی مەرگی خۆی دایە پێشخۆی. واتـا لـەم پێنـاوەدا خـۆی فیـداکرد و بەمـەش "زیلان" بووە "زیلان". لەبەر ئەمە چالاکییەکەی گرنگە.

مرۆڤ لە چالاکییەکەی "زیلان"دا چ دەبینێت؟ هەڵبەتە بەرلەوەی چالاکییەکە ئـەنجام بـدات چـەند نامەیەکیـشی لـەم بارەیـەوە نووسیبوو، لەیـەك لـەو نامانەیـدا بـۆ سـەرۆك دەنووسێت:"خۆزگە لەگیانم شیرینتر هەبووایە تـاکو ئەویـشم فیـدا بکردبایـە" هـەروەها دەڵێت:"تەنیا گیانی من هەیە ئەویش دەبەخشم، خۆزگە لەوەشم زیـاتر هەبووایـە تـاکو بمبەخشیبایە" واتا نزیکبوونەوەی خۆی بەمشێوەیەیە بۆ سەرۆك و بۆ ژن و گەلی کورد و مرۆڤایەتی، لەنامەکەی خۆیدا گوزارشتی لێدەکات. واتـا سـەرۆك بـۆ ژن و گـەلی کـورد هەموو شتێکە. بۆیەش هەرچییەکی خۆی هەبێت دەیدات، ئەمە گوزارشت لەو راستییە دەکات. ئەمـە پێشخـستنی کولتـوورێکی نـوێ، کۆمەڵگایـەکی نـوێ، کەسـێتییەکی نـوێ، سیاسەتێکی نوێ، پراکتیکبوونێکی نوێ، بەها و پێوانەیەکی نوێیە لە کوردستاندا، بۆیـە "زیلان" هێندە مەزن بوو لە کوردستانـدا. هەڵبەتە لەنامەیـەکی خۆشیـدا دەڵێت:" مـن ئەڤینـداری ژیـانم، مـن دەخـوازم بەمـەزنی بـژیم، مـن دەخـوازم ببمـە خـاوەن ژیـانێکی مەزن". ئیدی بەم چالاکییەی خۆی بووە خاوەن ژیانێکی مەزن. ئەو ژیانـەی کـەوا پیـاو و داگیرکەران بەسەر ژنان و تەواوی گەلی کوردیانـدا سـەپاندبوو، رەتکـردەوە و گـووتی:"

ئەم ژیانە ژیان نییە"، گووتی:" پێویستە گەلی کورد و ژنی کورد ئەو ژیانە رەتبکەنەوە، چونکە لەو ژیانەدا هەموو رۆژ مردن هەیە، مرۆڤ ناتوانێت بەمە بڵێت ژیان. ئێمە دەخوازین بەراستی بژین، ژیانێکی مەزن بژین، ژیانی مەزن چییە؟ ئەو ژیانەی شایستەیە بە مرۆڤ، ئەو ژیانەیە کە لەسەر بنەمای گەوهەری مرۆڤ و کارەکتەری مرۆڤ دەگوزەرێت. واتا ژیانێکە بەتەواوی لەسەر بنەمای ئازادی و دیموکراسی و یەکسانی و دادپەروەری و ئاشتی ئاواکراوە، لەدەرەوەی ئەمە بە ژیان دانانرێت، ژیانێکی سووك و چەوتە". ئیدی بۆیە هەڤاڵ "زیلان" گووتی:" من دەخوازم ببمە خاوەن ژیانێکی مەزن، ژیانێکی راست". ئەو ژیانەی لەئارادایە چییە و گوزارشت لەچی دەکات؟ دەستنیشانی کرد، هەروەها ئەو ژیانەشی دەستنیشان کرد کە بۆ گەلی کورد و ژن و مرۆڤایەتی پێویستە. بۆیە "زیلان" مەزن ئافرا، هەر کەس دەخوازێت لە "زیلان" تێبگات و "زیلان" بۆخۆی بەبنەما وەربگرێت. ئیدی ئەگەر کەسێتی "زیلان" و هاوشێوەی "زیلان" پەیدابوون، ئەمە کێ بنیادنا؟ ئەمە سەرۆك ئاپۆ بنیادنا، سەرۆك ئاپۆ لە کوردستاندا کەسێتی ژنێکی نوێی بنیادنا. ئیدی ئەگەر ئەمرۆ ژن هێندە پابەندبوونی خۆیان بە سەرۆکەوە نیشان دەدەن و ئەگەر دەڵێن:"بۆ ئێمە ژیان بەبێ سەرۆك پێویست نییە" یان دەڵێن:"بێ سەرۆك ژیان نابێت" لەبەر ئەم هۆیەیە.

**دوای ئەو هەموو شەڕ و شۆڕانەی نێوان (پ د ك) و (ی ن ك) لەساڵی (١٩٩٨)دا لە واشنتۆن بەئامادەبوون و چاودێری ئەمریکا پەیمانێك لەنێوانیاندا بەناوی "رێککەوتنی واشنتۆن" مۆر دەکرێت. بەڵام ئەوەی سەرنجراکێشە واباس دەکرێت کە چەندین مادده و بەند سەبارەت بە (PKK)ش هەبوو، لەم رووەوە بەگشتی مرۆڤ ئەو رێککەوتنە چۆن هەڵدەسەنگێنێت؟! پاشان ئەو گۆڕان و پێشکەوتنانەی ئەو رێککەوتنە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت چین و چ**

## لێکدانەوەیەکیان بۆ دەکرێت؟ چ پەیوەندییەك لەنێوان ئەو ڕێککەوتنە و پیلانگێڕی نێودەوڵەتی هەیە کە پاشان ئەنجام درا؟

لە کوردستاندا تا بەر لەدەرکەوتنی سەرۆك ئاپۆ و (PKK)، خەتێك بەڕێوە دەچوو، ئەو خەتەی بەڕێوە دەبرا خەتێکی میللیگەرایی بوو، هەمیش میللیگەرا (میللییەتەچی) ییەکی بەرتەسك و دواکەوتوو بوو، لەسەر هێزی خۆیی خۆی تەڤگەرێکی پێشنەدەخست، باوەڕی بەخۆی نەبوو، بەتەواویش چارەسەری لەخۆی و گەلی خۆیدا نەدەبینی، بەڵکو لەهێزی دەرەکیدا دەبینی، باوەڕی بەهێزی دەرەوەی خۆی هەبوو، بۆیەش هەر لەسەرەتای دەرکەوتنیدا هێزی دەرەوەی بەبنەما وەرگرتووە، بەمەش تەڤگەرێکی بەکرێگیراوی بەرەو پێشەوە برد. واتا ئەو تەڤگەرەی پێشیخست تەڤگەرێکی سەربەخۆ نەبوو، بەڵکو بەتەواوی گرێدراوی هێزی دەرەکی بوو، چونکە باوەڕی بەخۆی نەدەکرد و لەسەر هێزی خۆیی خۆی ڕانەدەبوو، بۆیە دەرەوەی خۆی بەبنچینە وەردەگرت. لەبەر ئەوەش هەر لەسەرەتاوە کەوتە ژێر کۆنترۆڵەوە. لە کوردستاندا تەڤگەرێکی وەها هەبوو. ئەو تەڤگەرەی لەئارادا بوو کۆمەڵگای سەرەوەی بەبنچینە وەردەگرت؟ واتا لەناو کۆمەڵگای کورددا باڵادەستانی کوردی بەبنەما وەردەگرت، چینی سەردەستی بەبنەما وەردەگرت. هیچ کاتێك کۆمەڵگای خوارەوەی بۆخۆی بەبنەما وەرنەگرتبوو، بۆیە بەتەواوی خەتێکی میللیگەرایی بەکرێگیراو بوو، میللیگەراییەکی بەرتەسك و لاواز و دواکەوتوو بوو، نەیدەتوانی کێشەی کورد دەربخاتەڕوو و لەهەموو کەسێك تێبگەیەنێت، نەیدەتوانی کێشەی کوردیش بەرەو چارەسەری ببات.

سەرۆك ئاپۆ و (PKK) لە کوردستاندا هێڵێکی جیاوازیان لەمە داهێنا، هێڵێکی نوێ، زیهنییەتێکی نوێی پێشخست، بەتەواوی کۆمەڵگای ژێرەوەی بەبنەما وەرگرت، گەلی بەبنەما وەرگرت، هەر لەسەرەتاوە خواستی ڕابوون لە گەلدا ئەنجام بدات و لەسەر ئەو بنەمایەش تەڤگەرێك پێشبخات و کێشەی کورد چارەسەر بکات، ئەو تەڤگەرەی پێشیخست بەتەواوی لەسەر هێزی خۆیی خۆی و هێزی گەلی خۆی بوو، واتا باوەڕی بەخۆی و بە گەلی خۆی هێنا و لەسەر ئەو بنەمایە تەڤگەری خۆی پێشخست،

بەتەواوی لەسەر هێزی خۆیی خۆی پێشیخست. بۆیەش خەتێك كە ئازادیخوازی و سەربەخۆبوونی بەبنەما وەرگرت پێشخست. سەرۆك خواستی لە كوردستاندا ئازادی، دیموكراسی، عەدالەت و یەكسانی پێشبخات، خواستی لەسەر ئەو بنەمایەش كۆمەڵگایەك بنیاد بنێت، هەڵبەتە بۆیەش كۆمەڵگای ژێرەوەی بەبنەما وەرگرت، رابوونی لەسەر هێزی خۆیی خۆی بەبنەما وەرگرت. لە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت و رێكخستن و كاردا بەتەواوی خەت و رێبازێكی سەربەخۆی بەبنەما وەرگرت. ئیدی لەبەر ئەوەی زیهنییەتێكی نوێ و لەسەر ئەو زیهنییەتەش سەرۆكایەتییەكی نوێ، پارتییەكی نوێ، خەباتێكی نوێ، ئەخلاق و كولتوورێكی نوێ، كەسێتی و كۆمەڵگایەكی نوێی خستە پێشخۆی ئەوا لە كوردستاندا هەژاندنێكی دروستكرد، تا دەهات ئەم تەڤگەرە لەناو گەلدا مەزن دەبوو، كاریگەرییەكی بەهێزی كرد و گەلی خستە نێو جموجۆڵەوە. ئەم خەتە راستینەی ئەو خەتەی پێشتر لە كوردستانیش بەرێوە دەچوو خستەڕوو، چونكە تا تەڤگەری (PKK) و سەرۆك ئاپۆ دەرنەكەوتبوو، هەر كەسێك كێشەی كوردی تەنیا بە (پ د ك) و ئەوان دەناسی، بەو خەتەیان دەناسی. بەناوی كوردان تەنیا ئەو خەتە هەبوو، لەبەر ئەمە هەر كوردێك بەناوی كوردبوونەوە بەشداری تێدا دەكرد. بەڵام كە سەرۆك زیهنییەت و تەڤگەرێكی نوێی لە كوردستاندا پێشخست، بەتەواوی لەسەر هێزی گەل و كۆمەڵگای ژێرەوەی پێشخست، ئەمە هەم لەسەر گەل كاریگەری مەزنی خۆی كرد و رابوونێكی مەزنی ئافراند، هەمیش راستینەی خەتی میللیگەراییشی دەرخستەڕوو و بە تێگەیاندنی دا، كە هێزی ئەو چییە و چی نییە؟ ئەو شتەی لەژێر ناوی كورد و كوردستان ئەنجامی داوە چییە و چی نییە؟ بەراستی توانیویەتی چەندە كێشەی كورد بناسێنێت و بەتێگەیاندنی بدات؟ چەندە چارەسەری پێشخستووە؟ ئایا دەتوانێت چارەسەری بكات یان نا؟ هەموو ئەمانەی خستەڕوو و بە تێگەیاندنی دا. بۆیە تادەهات سەرۆك و (PKK) لەناو دڵی گەلی كورددا شوێنێكی مەزنی گرت، كاریگەرییەكی مەزنی خۆی كرد، تا دەهات ئەم تەڤگەرە مەزن بوو و خەتەكەی دیكە لاواز بوو، رێكخستنی ئەو لاواز بوو، لەزۆر شوێندا باڵادەستێتی ئەو خەتە نەما و دۆڕاندی، تا بەر لەدەركەوتنی (PKK)، ئەو خەتە لەهەموو كوردستاندا خۆی رێكخستبوو، باڵادەست ببوو، لەدەرەوەش ئەو خەتە هەبوو، ئەوانەی لەدەرەوەش بوون ئەو خەتەیان بەبنچینە

وەردەگرت. لەهەموو بەشەکانی کوردستان هەموو کەسێك ئەو خەتەیان بەبنەما وەردەگرت، بەڵام بەدەرکەوتن و پێشکەوتنی (PKK) کاریگەری ئەو خەتە هەم لەدەرەوە و هەمیش لەناوەوە تا دەهات کەم و لاواز بووەوە، کەمێك مابوو تەواوی کوردستان لەژێر کاریگەری ئەو خەتە دەربکەوێت. بێگومان ئەمەش مەترسییەکی مەزن بوو بۆیان، چونکە خەت و رێبازی سەرۆك ئاپۆ کوردێکی ئازاد، ئیرادەیەکی ئازادی لە کوردستان پێشدەخست، لەهەموو رووێکەوە کوردێکی نوێی دەئافراند، کوردێك کە بەتەواوی ئازادی بەبناخە وەردەگرێت، بەکرێگیراویەتی رەتدەکاتەوە، تەسلیمییەت و خیانەت رەتدەکاتەوە، ئەگەر بژێت پێویستە بۆ ئازادی بژێت، ئەگەر بشمرێت هەر پێویستە بۆ ئازادی بمرێت، کوردێکی بەمجۆرە و ئیرادەیەکی بەمجۆرە لەکوردانـدا پێشکەوت. ئیدی ئەمە پێشکەوتن و ئیرادەیەکی مەزنی دەئافراند، ئەمە کوردی لەنێو سیستەمی سەرمایەداریدا دەردەخست، ئەمەش بۆ سیستەمی سەرمایەداری و ئەوانەی لەو سیستەمەدا دەژین مەترسی دروست دەکرد، سیستەمی سەرمایەداری تا ئەو کاتە لە کوردستاندا زۆر توانست و ئیمکانییەتی بۆخۆی ئاوا کردبوو، کوردستان کەوتبووە خزمەتی ئەوانەوە، زیاتریش کاریان دەکرد بۆ ئەوەی لەهەموو رووێکەوە کوردستان تالان بکەن. بەڵام سەرۆك ئاپۆ لەبەر ئەوەی لە کوردستاندا ئیرادەیەکی بەهێزی دەرخستەڕوو، ئەو ئیرادەیە پرۆژە و جموجۆڵی ئەوانی لە کوردستاندا هەموو خستە ژێر مەترسییەوە، کەمێك مابوو کوردستان بەتەواوی لەژێر دەستی داگیرکەران، دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان و بەکرێگیراوە کوردەکاندا دەربکەوێت، ئەوانەش هەموویان ئەم تەڤگەرەیان بۆخۆیان بەمەترسی زانی. ئیدی چی بکەن بۆ ئەوەی رێگری لەم تەڤگەرە بکەن، بەرادەیەك بۆ ئەوان مەترسی دروست نەکات؟ ئەو سیستەمەی ئەوان دایانڕشتووە، ئەوانەی لەنێو ئەو سیستەمەدا دەژین لەنێو مەترسیدا دەژین، لەم پێناوەدا بەزۆر شێوە تەدبیریان وەرگرت، بەڵام ئەو تەدبیرانە زۆر نەیانتوانی رێ لە پێشکەوتنەکانی (PKK) بگرن، بۆیە بڕیاریان دا کە موداخەلەیەکی مەزن بکەن، ئیدی بەشەڕی (١٩٩٢)دا موداخەلەیەکی مەزنیان بۆ سەر (PKK) کرد، بۆ ئەوەی پێشکەوتنی (PKK) رابوەستێنن، ئامانجی ئەو شەڕە ئەوە بوو، چونکە کاتێك کە تەڤگەر گەیشتە ساڵی (١٩٩٢) هەم لەرووی گەریلاوە، هەم لەرووی سەرهەڵدانەکانەوە، هەم لەرووی

سیاسی، سەربازی و هەموو رووێکەوە لە پێشکەوتندا بوو و بەتەواوی کوردی لەدەوروبەری خۆی گەیاندبووە یەك. ئەمەش هەموو ئەو هاوسەنگییانەی لەئارادا بوون دەخستە مەترسییەوە، بەرژەوەندی زۆر لایەنی دەخستە مەترسییەوە، پێویستبوو رێگری لەبەردەم ئەو پێشکەوتنە بکردبایە، بۆیە خواستیان بە شەڕی (١٩٩٢) رێ لەپێش ئەمە بگرن، ئەگەر بتوانرێت ئیرادەشی بشکێنن بۆ ئەوەی بتوانن ئەم تەڤگەرە بەتەواوی بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، تاکو بتوانن مەترسییەکانی ئەم تەڤگەرە نەهێڵن. بێگومان بەم موداخەلەیە رێیان لەپێش پێشکەوتنی گرت، ئەمە راستە. ئەگەر ئەو موداخەلەیە نەبووایە ئەوا ئەو پێشکەوتنانەی ئەم تەڤگەرە لە کوردستاندا بەدیدەهێنا بەهێزتریشی دەکرد و هەندێك ئەنجامیشی بەدەستدەهێنا، لەوانەبوو چارەنووسی کورد وەکو ئەمڕۆ تێیدا دەژی وانەبایە. ئەم موداخەلەیە رێی لەپێش ئەمە گرت، زەرەرێکی مەزنی لەتەڤگەردا، لەمەدا هەر تەنیا (PKK) زەرەری نەکرد، تەڤگەری کورد بەتەواوی زەرەری بینی، لەهەموو بەشەکان زەرەری بینی. دوای ئەمە زۆر هەوڵ و تەقەللایان دا کەوا تەڤگەر بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، نەیانتوانی بەم ئامانجە بگەن، تەنانەت هەوڵیان دا پارچەبوون لەتەڤگەردا دروست بکەن، نەیانتوانی ئەمەش بکەن، سەرۆك ئاپۆ هەموو تاکتیکەکانی ئەوانی پووچەڵ کردەوە، تەنانەت بینیان تاکو سەرۆك بێکاریگەر نەکەن ناتوانن لە کوردستاندا بە ئامانجەکانی خۆیان بگەن. رێککەوتنی واشنتۆن پەیمانی ئەوەیان دا کە؛ چی بکەن تاکو سەرۆك بێکاریگەر بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن زەبر لەم تەڤگەرە بدەن و ئەو رێبازە بێکاریگەر بکەن، بۆ ئەوەی ئەو مەترسییەی ئەم تەڤگەرە دروستی دەکات، لەمەودوا دروستی نەکات. ئیدی بە پەیمانی واشنتۆن ئەو بڕیارەیان دا و ئەو پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییەیان ئەنجام دا. لەساڵی (١٩٩٢)شدا پیلانگێڕییەکە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی بوو، بەڵام چوارچێوەکەی بەرتەسك بوو، بەڵام ئەوەی ساڵی (١٩٩٨) لەگەڵ رێککەوتنی واشنتۆن چوارچێوەکەی فراوانتر و قووڵتر کرایەوە، بۆ ئەوەی ئامانجی خۆیان بەتەواوی جێبەجێ بکەن. بەشەڕی (١٩٩٢) رێیان لەپێش پێشکەوتنەکان گرت، بە رێککەوتنی واشنتۆن و بەو پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییەی ئەنجامیان دا و سەرۆکیان دەستگیرکرد، بە بەدیلکردنی سەرۆك ئاپۆ زەبرێکی مەزنیان لەتەڤگەر دا، خواستیان بەم زەبرە تەڤگەر بێکاریگەر

بکەن و کوردان بەتەواوی لەژێر کاریگەری ئەم خەتە دەربخەن، بۆ ئەوەی خەتێك کە خزمەتی سیستەمی سەرمایەداری دەکات لە کوردستاندا بالادەست بکەن و بەرژەوەندییەکانی خۆیان بپارێزن.
بێگومان لێرەدا زمبرێکیان لەتەفگەر دا، سەرۆکیان بەدیلگرت، دوای ئەمەش خواستیان تەفگەر تەسلیم وەربگرن، ئەگەر ئەمە نەبێت، پارچەی بکەن، ئەمەشیان بۆ نەچووە سەر. ئێستا(٣) بەشێوەیەکی دیکە پیلانگێرییەك رێکخستە دەکەن و دەخوازن زمبرێکی دیکە لەتەفگەر بدەن، بۆ ئەوەی تەفگەر بەتەواوی لەهێزی چارەسەری دەربخەن، ئەو هەنگاوەی کە بە شەری (١٩٩٢) و رێککەوتنی واشنتۆن پێشیان خستبوو ئێستا دەخوازن تەواوی بکەن. واتا تەفگەر لەهێزی چارەسەری دەربخەن و کاریگەری ئەم خەتە لەناو گەلدا نەهێڵن. دەخوازن ئەو خەتەی کەوا (ی ن ك) و (پ د ك)ش نوێنەرایەتی دەکەن، بیکەنە خەتی هەموو کوردان، دەخوازن ئەو کوردەی لەژێر کاریگەری سەرۆك ئاپۆ و (PKK) دان دەربخەن و بەرەو (ی ن ك) و (پ د ك) ئاراستەیان بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن بەمە تەواوی کوردان بخەنە خزمەتی سیستەمی سەرمایەدارییەوە، چونکە ئەو خەتەی سەرۆك ئاپۆ نوێنەرایەتی دەکات کوردان لەژێر سیستەمی سەرمایەداری دەردەخات و دەیکاتە هێزێکی ئەلتەرناتیفی ئەو سیستەمە، کوردان هەم بۆ کوردان دەکاتە هێز، هەمیش دەخوازێت بۆ گەلانی ناوچەکە بکاتە هێز. سەرۆك ئاپۆ دەخوازێت کوردان بکاتە هێزی ئاواکردنی سیستەمی نوێ، بکاتە ئەلتەرناتیفێك، واتا سیستەمێك کە تێکۆشانی دیموکراسی، ئازادی رەگەزی و هاوسەنگی ئیکۆلۆژی بەبناخە وەردەگرێت، کۆمەڵگایەك ئاوابکات کە شارستانییەتێکی دیموکراتی بەبناخە وەردەگرێت.
بێگومان سیستەمی سەرمایەداریش ناخوازێت هیچ ئەلتەرناتیفێکی خۆی هەبێت، ئەخاسمە دوای ئەوەی سۆفییەتی تەسفیەکرد، ناخوازێت هیچ ئەلتەرناتیفێکی دیکە پێشبکەوێت، هەر یەکێك بخوازێت ئەلتەرناتیفێك پێشبخات دایدەپلۆسێت. واتە ئەگەر ئەوەندە هاتنەسەر سەرۆك ئاپۆ و (PKK)، ئەوا لەبەر ئەم هۆیە بوو، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە ئێستاش هەر هێرش و پەلامار دێننە سەرمان....

**پێش ئەوەی سەرۆك ئۆجەلان لە خۆرهەلاتی ناوین دەربکەوێت؛ جارێکی دیکە لە (١٩٩٨)دا ئاگربەستێك رادەگەیەنێت، ئایا راگەیاندنی ئەو ئاگربەستە لەئەنجامی دەرککردن بوو بەئەگەری روودانی ئەو پیلانگێرییە نێودەوڵەتییەی کە پاشان لەبەرامبەر سەرۆك ئوجەلان و تەڤگەردا دەگاتە ئاستی هەرە مەترسیداری خۆی؟ هەروەها بۆچی ئەو ئاگربەستەش وەك هەردوو ئاگربەستەکەی رابردوو هیچ وەلامێکی ئەرێنی (ئیجابی) وەرنەگرت...؟**

کاتێك سەرۆك ئاپۆ و (PKK) بە خەبات و تێکۆشان کێشەی کوردیان لەهەموو رووێکەوە دەرخستەروو و توانست و دەرفەتی ئەوەیان رەخساند کە بەرێگەری دیموکراسی و سیاسی چارەسەر بکرێت، سەرۆك ئاپۆ ئاگربەستی پێشخست، لەساڵی (١٩٩٣)دا ئاگربەستی راگەیاند، بەلام پەسند نەکرا و وەلامیان نەدایەوە و گێرەشێوێنی (پرۆڤۆکاسیۆن)یان ئەنجام دا، لەساڵی (١٩٩٥)یشدا دیسان ئاگربەستی راگەیاند و دیسانیش وەلامیان نەدایەوە. هەروەها لەساڵی (١٩٩٨)یش بۆ جاری سێیەم ئاگربەستی راگەیاندەوە، دیسان وەلامیان نەدایەوە، چەندە سەرۆك ئاپۆ لەسەر چارەسەری پێداگری دەکرد کە کێشەی کورد بەرێگەی سیاسی و دیموکراتیانە چارەسەر بکرێت، ئەوا دەوڵەتی تورکیاش زیاتر پێداگری لەسەر شەڕ و بەشەڕ تەسفیەکردنی دەکرد. بێگومان ئەمە تەنیا هێزی دەوڵەتی تورکیا و داخوازی دەوڵەتی تورکیا نییە، ئێمە ئەوە باش دەزانین، لەبەر ئەوەی ئێمە بەساڵانە شەڕمان لەگەڵ تورکیا کردووە، ئەگەر تورکیا لەشەڕدا لەسەر پێی خۆی مایەوە، بەهۆی بەهێزی تورکیاوە نەبوو، هیچ کاتێك هێزی تورکیا بەشی ئەوەی نەکردووە، بەلکو ناتۆ (NATO) لەهەموو رووێکەوە لەپشت تورکیا راوەستاوە، لەبەر ئەوە تورکیا لەم شەڕەدا نەکەوت و لەسەر پێی خۆی مایەوە. هەروەها ئەگەر تورکیا بۆ چارەسەری هەنگاوی نەهاوێشت، نەك لەبەر ئەوەی تورکیا نەیدەخواست هەنگاو

بهاوێژێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی ناتۆ نەیدەخواست، سیستەمی سەرمایەداری نەیدەخواست تورکیا کێشەی کورد بەرێگەی سیاسی و دیموکراتییانە چارەسەر بکات.

لەناو تورکیادا هەندێك دەوروبەر هەبوون دەیانخواست کە کێشەی کورد بەرێگەی سیاسی و دیموکراتی چارەسەر بکرێت. هەڵبەتە سەرۆك ئاپۆش بەردەوام ئەو ئاگربەستانەی پێشخست بۆ ئەوەی ئەوانەی دەخوازن کێشەی کورد چارەسەر بکرێت بەهێز ببن و دەستڕۆیی و دەستپێشخەریان زیاتر ببێت. تاکو کێشەکە بکەوێتە سەر ڕاستەرێی چارەسەری.

له تورکیادا بەردەوام دوو بەش هەن، یەکەمیان؛ دەخوازن بە زەبروزەنگ و سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردن کێشەکە چارەسەر بکەن و ئەمە بەبنچینە وەردەگرن، دووەمیشیان؛ دەڵێت:" ئیدی ئەو سیاسەتە سەرناگرێت و پێویستە ئێمە دان بەهەبوونی کوردان بنێین و کێشەی کورد بەرێگەی سیاسی چارەسەر بکەین". لە تورکیادا تاکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەوانەی کە دەخوازن کێشەی کورد بەرێگەی سیاسی چارەسەر بکەن لاوازن، بەڵام ئەوەی نکۆڵی و قڕکردن و زەبروزەنگ بەبنەما وەردەگرن بەهێزن و باڵادەستن. هێزی ئەوان لەوەوە نەهاتووە کە لەنێو تورکیادا بەهێز و باڵادەستن، ئەمە لایەکی مەسەلەکەیە، لەبنەڕەتدا بۆ ئەوەی بتوانن لە تورکیاشدا باڵادەستی و بەهێزیی خۆیان بەرێوە ببەن، هێز لەسیستەمی سەرمایەداری و ناتۆ وەردەگرن، ئەوانەن کە لە تورکیا بەهێزیان دەکەن، لەبنەڕەتدا ئەوە سیستەمی سەرمایەداری و ناتۆیە کە ناهێڵێت سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردن لە تورکیادا لاواز ببێت، ناهێڵێت کێشەی کورد چارەسەر بکرێت.

## بەڵام بۆچی ناهێڵێت؟

ئەمە دوو هۆکاری سەرەکی خۆی هەیە، یەکەمینیان: ئەگەر ئەمرۆ کێشەی کورد لە باکوور چارەسەر بکرێت، ئەوا پێویستە بە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) چارەسەر بکرێت، چونکە وەکوتر هیچ هێزێکی دیکە نییە. کاتێك کێشەی کورد لەگەڵ سەرۆك ئاپۆ و (PKK) چارەسەر بکرێت، ئەو کاتە خەتی سەرۆك ئاپۆ باڵادەست دەبێت، نەك تەنیا لە

باکوور، بەلکو لەپارچەکانی دیکەشدا بالادەست دەبێت. چونکە باکوور بەشی هەرە سەرەکییە، وەکوتریش لەبەشەکانی دیکەشدا کاریگەری و رێکخستنی ئەو خەتە هەیە. ئەگەر ئەو خەتە لە باکووردا بگاتە چارەسەری، ئەوا ئەمە لەسەر پارچەکانی دیکەش کاریگەری خۆی دەکات. ئەگەر ئەم خەتە بالادەست ببێت، ئەوا کورد دەبێتە خاوەن ئیرادەیەکی سەربەخۆ و ئیدی کورد ناکەوێتە خزمەتی سیستەمی سەرمایەدارییەوە و سیستەم کورد لەدەست دەدات و بەم لەدەستدانەش تەنیا کوردی لەدەست ناچێت، بەلکو ناوچەیەك لەدەست دەدات. بۆ ئەوان ئەمەش گرنگە، چونکە لەستراتیژی خۆیاندا کوردێکی بێ ئیرادە بەبنچینە وەردەگرن، ئەگەر بە (PKK) کێشەکە چارەسەر ببێت، ئەوا ئەو کوردەی ئەوان دەیانەوێت نابێت، ئەو کاتە زەبرێکی مەزن دەخۆن. بۆیە ناخوازن کێشەکە چارەسەر ببێت.

دووەمینیشیان: ئەمرۆ چارەسەری کێشەکە لە تورکیادا ناکەوێتە خزمەتی سیستەمی سەرمایەدارییەوە. بۆچی؟ چونکە لاوازی تورکیا کێشەی کوردە، ئەوەی بخوازێت تورکیا تەنگاو بکات و سازشی پێبکات، دەخوازێت ئەو کێشەیە هیچ چارەسەر نەبێت. چونکە دەزانن کە کێشەکە چارەسەر نەبوو ئەوا شەڕەکە بەردەوام دەبێت، کە شەڕیش بەردەوام ببێت، دەزانن کە تورکیا بەتەنیا و بەهێزی خۆی ناتوانێت ئەو شەڕە بەڕێوە ببات، بۆیە مەحتاجی ئەورووپا و ئەمریکا دەبێت، ئەو کاتە ئەورووپا و ئەمریکاش بەئاسانی دەتوانن رازییەکانی خۆیان بە تورکیا بە پەسندکردن بدەن. دەتوانن بەئاسانی تورکیا بۆ لای خۆیان رابکێشنە ئەو خاڵەی کە دەخوازن رایبکێشن. ئەگەر کێشەکە چارەسەر بکرێت، ئەو کاتە ناتوانن فشار بێننە سەر تورکیا، هەڕەشە و شانتاژ بکەن، ناتوانن تورکیاش تەنگاو بکەن و رایبکێشنە لای ئامانجەکانی خۆیان. چونکە ئەو کاتە تورکیا زێدە موحتاجی ئەوان نابێت، تەنانەت لەوانەیە تورکیا بکەوێتە نێو رەوشێکی نوێ و ببێتە هێزێکی سەرکێش لەناوچەکەدا. واتە بۆ ئەوەی تورکیا لەژێر کۆنترۆڵی ئەوان دەرنەکەوێت، تاکو بتوانن هەموو شتێکی خۆیان بە تورکیا بەپەسندکردن بدەن، ناخوازن کێشەکە چارەسەر ببێت. ئەگەر لەو ئاگربەستانەدا ئەنجام بەدەست نەهاتووە و هەموو جارێك پووچەڵ کراوەتەوە لەپشت ئەمە ئەورووپا، ئەمریکا و ناتۆ هەیە. چونکە بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی خۆیان لەمەدایە. ناخوازن کێشەکە چارەسەر ببێت،

بۆیە لەگەڵ سیاسەتی نکۆڵی و فڕکردندا شوێن دەگرن، بۆ ئەوەی بەردەوام شەڕ هەبێت، کە هەم تورکیا لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندا بمێنێتەوە، هەمیش کورد لەشەڕدا لاواز ببن، بۆ ئەوەی بتوانن لە کوردستانیشدا خەتی خۆیان و دەسەڵاتی خۆیان زاڵ بکەن، هەر کاتێك کە سەرۆك ئاپۆ خواستبێتی کێشەکە بخاتە سەر ڕاستەڕێی دیالۆگ و سیاسی و دیموکراتی بۆ ئەوەی چارەسەر ببێت، هەم لەناو تورکیادا و هەمیش لەدەرەوەی تورکیادا پراواکسیۆن ئەنجام دراوە، ئەوانەی کە لەنێو تورکیادا پراواکسیۆن دەکەن ئەوانەن کە ئەوروپا و ئەمریکا بەبنچینە وەردەگرن، ئەوانەن کە پەیوەندییان لەگەڵ ئەواندا هەیە، ئەوانەن کە بەرژەوەندی و چارەنووسی خۆیان لەگەڵ ئەواندا کردۆتە یەك، پێکەوە ناهێڵن ئەو ئاگربەستە ببێتە ئاگربەستی دوولایەنە و کێشەکە بکەوێتە سەر ڕێی چارەسەری، هەر کاتێك ئێمە خواستوومانە کێشەکە بکەوێتە سەر ڕێگەی دیالۆگ و زەمینەی چارەسەری پێشبکەوێت، ئەوانیش خواستوویانە ئەمە لەدژی تەفگەر بەکاربهێنن، بۆ ئەوەی زەبر لە تەفگەر بوەشێنن. ساڵی (١٩٩٢) وەها بوو، ساڵی (١٩٩٥)یش هەر بەمشێوەیە بوو، ئەوەی ساڵی (١٩٩٨)یش هەروا بوو.

هەڵبەتە ئەو کاتە ڕێککەوتنی واشنتۆنیان پێشخستبوو بۆ ئەوەی زەبرێکی مەزن لە تەفگەر بدەن، بۆیە بەرلەوە لە تورکیادا هەندێك دەوروبەر ئاگربەستیان دەخواست، سەرۆکیش بۆ ئەوەی دەستی ئەوان بەهێز بکات. دەشبینی کە زۆر بەفراوانی دێنە سەر تەفگەریش، بۆ ئەوەی ڕێگیری لەمە بکات ئاگربەستی ڕاگەیاند، جارێکی دیکەش ئەوان خواستیان سوود لەمە وەربگرن، ئەو پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییە ئەنجام دەدەن، بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانتر ئەنجامگیر ببن. ئیدی ئەوانیش بەمشێوەیە کاریان کرد. بۆیەش ئەوانەی لە تورکیا ئاگربەستیان دەخواست، ئەوانەی چارەسەرییان دەخواست، بێکاریگەریان کردن و ئەو ئاگربەستەی ساڵی (١٩٩٨)شیان بەتەواوی بێئەنجام هێشتەوە، پیلانگێڕی نێودەوڵەتییان پێشخست، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو ئامانجەی لەپێش خۆیان داناوە جێبەجێی بکەن، بەمەش ئەو ئامانجانەیان جێبەجێکرد.

## پەراوێزەكان:

(١) مەبەستیان لە **"باكووری ئێراق"** باشووری كوردستانە.

(٢) مەبەستی لەساڵی (١٩٧٩)یە كە شاهین دودمەز لەمانگی پێنجی ئەو ساڵە دەستگیر كرا و تەسلیم بوو.

(٣) مەبەستی كاتی سازدانی ئەم دیدارەیە.

# بەشی حەوتەم:

# کاروانی رۆما...لوتکەی پیلانگێڕی

# (١٩٩٨ ـ ١٩٩٩)

## بەرەو ئەو جوگرافیایەی

## نەدەبینێ، نەدەبیستێ، نەدەئاخفێ...!!

**هەر لەساڵی (١٩٩٨)دا تورکیا هەڕەشەیەکی زۆری لە سوریا کرد، ئەو کاتە سەرۆك ئۆجەلانیش لە "شام" دەرکەوت بۆ دەرەوەی خۆرهەڵاتی ناوین. مرۆڤ لێرەدا ئەوە بپرسێت رووداوی دەرکەوتنی سەرۆك ئۆجەلان لەسەر چ بنەمایەك بوو و چۆن دەرکەوت؟ ئەگەر ئەو کاتە سەرۆك هاتبایە چیاکانی کوردستان چ دەبوو؟**

.هەڵبەتە لێرەدا بۆ ئەوەی سەرۆك لە سوریاوە دەربکەوێت زۆر هێز و لایەن کاریان کرد. تەڤگەری ئێمە هەر لەکاتی خیانەتی **"شاهین دونمەز"** و پاشانیش **"شەمدین ساکیك"** چییان گووتبوو؟ گووتبوویان:" ئەگەر **ئاپۆ** بێکاریگەر نەکەن ناتوانن (PKK) بێکاریگەر و تەسفیە بکەن. دەوڵەتی تورکیا و سیستەمی سەرمایەداریش بۆ ئەوەی ئەو تەڤگەرە بێکاریگەر بکەن زۆر هەوڵ و تەقەللایان دەدا، لەکۆتاییدا؛ بەکرێگیراوانی کورد، خائینانی ناو ئێمە، دەوڵەتە داگیرکەرەکان و سەرمایەدارەکان **هەموویان گەیشتنە** ئەنجامێك کە بەراستی تا **سەرۆك ئاپۆ** بێکاریگەر نەکەن ناتوانن ئەنجامگیر ببن. **سەرۆك ئاپۆ** هەموو ئەو هەنگاوانەی ئەوان دەیهاوێژن پووچەڵی دەکاتەوە، بەپێچەوانەی هەڵدەگەڕێنێتەوە. بۆیە ناتوانن بگەنە ئەنجام. ئیدی **هەموویان گەیشتنە** ئەو ئەنجامەی کە سەرۆك بێکاریگەر بکەن. پیلانگێڕییان لەسەر ئەو بنەمایە پێشخست. بێگومان بەرلەوەی سەرۆك لە سوریا دەربخەن، هەندێك زەمینەی ئەوەیان رەخساند، لەسەر ئەو بنەمایەش فشاریان بۆ سەر سوریا هێنا. ئیدی تورکیا هێزەکانی خۆی هێنایە سەر سنوور و هەڕەشەیان لە سوریا کرد و گووتیان:" یان تۆ **ئاپۆ** لە سوریا دەردەکەیت و تەسلیمی ئێمەی دەکەیتەوە، یانیش ئەگەر تۆ دەریناکەیت ئەوا ئێمە شەڕ لەبەرامبەر تۆدا دەکەین". بێگومان لەپشت تورکیا کێ هەبوو؟ ئەمریکا، ئینگلیز، ئیسرائیل، سیستەمی سەرمایەداری هەمووی، بەم هێزەوە تورکیا هاتە سەر سوریا. ئەگەر وەها نەبایە، تورکیا نەیدەتوانی ئەو هەڕەشەیە بکات، هەڵبەتە کاتێك تورکیا ئەو

هەڕەشەیەی دەکرد کەشتییە سەربازییەکانی ئەمریکا - هاوپەیمانەکانی زۆر بەئاشکرا لە دەریای سپیدا بۆ چاوترساندن مانۆڕیان دەکرد، کاتێك کە ڕەوشێکی وەها دەرکەوت، بێگومان سوریا پڕ تەنگەتاو بوو.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ ئیسرائیل هەڕەشەی لێدەکرد. ئیدی سوریا نەیدەتوانی ڕووبەڕووی ئەمانە هەمووی ببێتەوە، سەرۆکیش بینی کە ڕەوشی سوریا لەمەترسی دایە، بۆیە سەرۆك نەیخواست بەهۆی ئەوەوە سوریا زەبری بەربکەوێت، ئەمەی بەراست نەدەزانی و بەشتێکی نەخلاقیشی نەبینی، بۆچی؟ چونکە سوریا بەساڵان میوانداری سەرۆکی کردبوو، لەوانەیە توانستێکی پێنەدابێت، لەوانەیە هەندێك کەس لەنێو سوریادا بەهەڵە مامەڵەیان لەگەڵ سەرۆکیش کردبێت، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە بەشێك لەناو دەوڵەتی سوریادا هەبوون دەرفەتی ئەمەیان دا کە سەرۆك لەوێ وەك میوان بمێنێتەوە، دەرفەتێکی وەهان دا، چاوپۆشیان لەمانەوەی سەرۆك کرد لەوێ. هەڵبەتە ئەمە هاوکارییەکی مەزن بوو بۆ ئێمە. هەرچەندە لەڕووی ترەوە هاوکاری ئێمەیان نەدەکرد، بەڵام دەرفەت بەمانەوەی ئێمە لەوێ بۆ ئێمە هاوکارییەکی مەزن بوو.

ئەخلاقێکی سەرۆك هەیە؛ ئەگەر یەکێك دۆستایەتی بکات ئەوا ڕێزی لەو دۆستایەتییە دەگرت، مادام سوریا میوانداریتی ئەوی کردبوو، ئەمڕۆش لەسەر سوریا مەترسی هەیە، بەهۆی سەرۆکەوە دێنە سەر سوریا، سەرۆك لەڕووی ئەخلاقییەوە نەیدەتوانی ئەمەی پەسند بکردبایە، ئەگەر مەترسییەك لەئارادا هەبێت با بۆ ئەو بێت، ئەمە لە فەلسەفەی سەرۆکدا بنەمایە، سەرۆك ئەگەر مەترسییەك لەئارادا بێت هیچ کاتێك نەیدەخواست ئەو مەترسییە بگاتە هەڤاڵانی خۆی یان دۆستی خۆی، بەهایەکی مەزنی بە دۆستایەتی و هەڤاڵێتی دەدا، ئەگەر مەترسی هەبێت با بێتە سەر ئەو، ئیدی لەمەسەلەی سوریاشدا نەیدەخواست سوریا زەبری بەربکەوێت و بکەوێتە زەحمەتییەوە و کێشەی بۆ دروست ببێت، ئەخلاق و فەلسەفەی سەرۆك ئەمەی پەسند نەدەکرد، لەبەر خاتری دۆستایەتی گووتی:" من دەتوانم لێرە دەربکەوم".

هەڵبەتە لە سوریاشدا هەندێك کەس دەیانخواست سەرۆك لەوێ دەربکەوێت، ئەوانەی دۆستایەتیان دەکرد نەیاندەخواست. بەڵام ڕەوشیش لەبەرچاو بوو و نەیاندەتوانی

شتێکیش بکەن، هەرچەندە بەدڵی ئەوانیش نەبووبێت. بەڵام دەیانگووت:" دەربچۆ". بەمشێوەیە سەرۆك لە سوریا دەرچوو، ئیدی بۆ ئەوەی سەرۆك لە سوریا دەربچەن، هەم لەناو سوریادا هەندێکیان کاریان کرد، هەم لەگۆڕەپانی عەرەبدا، میسر هەوڵیدا، لەگۆڕەپانی کورددا، هەندێك لە بەکرێگیراوان و خائینەکانی کورد کاریان کرد، ناتۆ هەوڵیدا، دەوڵەتەکانی ئەمریکا، ئەوروپا ئەوانەی لەناوخۆدان. تورکیا هەوڵیدا، لەئەنجامی هەموو ئەمانەدا سەرۆك لە سوریا دەرکەوت.

هەڵبەتە پیلانگێڕییەکەیان لەسەر ئەو بنەمایە پێشخستبوو کە سەرۆك لە سوریا دەربخەن، بۆ ئەوەی دەریشی بکەن، یۆنانستانیان بەکارهێنا، چونکە لە یۆنانستان هەندێك کەس هەبوون، هەم لەئاستی حکومەت هەمیش لەئاستی پەرلەماندا، گوایە دۆستایەتیان لەگەڵ (PKK) دەکرد، تەنانەت پەرلەمانی یۆنانستان بڕیارێکی وەرگرتبوو، نزیکەی بەدەنگی زۆرینەیان بانگهێشتی (دەعوەت) سەرۆکیان کردبوو بۆ ئەوەی بچێتە یۆنانستان، هەندێکیان بەتایبەتی چووبوون بە سەرۆکیان گووتبوو کە:" ئێمە دەخوازین تۆ بێیتە یۆنانستان" ئەوانە، بەر لەو فشار و هەڕەشانە، ئەو زەمینەیەیان خۆش کردبوو، کاتێك کە فشار و گوشار بۆ سەر سوریا بێنن ڕێی سوریا بکرێتەوە، چونکە سەرۆك ڕێز و بەها بەدۆستایەتی دەدات، لەگەڵ یۆنانستانیش دۆستایەتییەك هەیە، خواستوویانە بچێتە یۆنانستان، ئێستاش کە فشار و هەڕەشەیەك لەسەر سوریا هەیە، سەرۆك دەردەچێت، ئەوا ئەگەری هەرە زۆر بەرەو یۆنانستان دەچێت، ڕێك لەرەوشێکی وەهادا هەندێکیان گووتیان:" وەرە یۆنانستان" سەرۆك دەچێتە ئەوێ.

ئیدی کە هەڕەشە لەسەر سوریا زیاتر دەبێت و هەندێك لەو یۆنانیانەش دەکەونە نێو جموجۆڵەوە و بە سەرۆك دەڵێن:" وەرە یۆنانستان" سەرۆکیش بەدۆستایەتی یۆنانستان باوەڕ دەکات و لە سوریا دەردەکەوێت و دەچێتە یۆنانستان. کاتێك کە دەچێتە یۆنانستان هەر لەفرۆکەخانەدا دەڵێن:" پێویستە لێرە نەمێنیتەوە" ئەوەی کە دەبووایە پێشوازی لە سەرۆك بکات نایەتە پێشوازییەکە و کەسێکی تریش نایەتە پێشوازییەوە، ئیستخباراتی یۆنانستان دەچێت سەرۆك دەبینێت. ئیدی سەرۆك ناچار دەبێت بچێتە روسیا، پاشان لەگەڵ روسیاش دیدار ئەنجام دەدەن، روسیاش رادەکێشنە نێو ئەو

پیلانگێڕییەوە، هەندێك سازشی ئابووری لەبەرامبەر روسیا دەکەن. ئامانج چییە؟ ئامانج ئەوەیە کە نەهێڵن سەرۆك لەهیچ جێگەیەك رابوەستێت یان بمێنێتەوە. گرنگ دەرکەوتنی بوو، سەرۆك لە روسیاش دەرچوو و هەموو دەرگاکانیان گرت. پیلانگێڕییەکە لەسەر ئەو بنەمایە داڕێژرابوو. بۆیە لە روسیاش چووە رۆما و لە رۆماش نەیانهێشت لەوێ بمێنێتەوە، خواستی بچێتە شوێنێکی دیکە دیسان نەیانهێشت بچێت، جارێکی دیکە روسیایان خستە دەورەوە. بێگومان لەناو ئێمەشدا کەسانێك خزمەتی ئەو پیلانگێڕییەیان کرد. سەرۆك جارێکی دیکە چووەوە روسیا، لەوێش هەموو دەرگاکانیان گرتبوو، هەموو رێییەکیان گرتبوو، تەنیا رێی "گینیا"یان کردبووەوە، رەوانەی"گینیا"یان کرد، بۆ ئەوەی لەوێش دەستگیری بکەن و بیبەنە تورکیا هەر بەو شێوەیەشیان کرد.

لەم پیلانگێڕییەدا؛ لەناو ئێمەشدا هەندێك کەس بوونە ئامراز، واتا لە پیلاگێڕییەکە تێنەگێشتبوون، گوایە لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە لەنێو پەیوەندی دابوون، گوایە ئەو دەوڵەتانە دۆستایەتیان دەکرد و بەڵێنیان دەدا، هەڤاڵانیش لەرەوشەکە تێنەدەگەیشتن و بەگوێرەی گفت و بەڵێنەکانی ئەوان هەڵسوکەوتیان دەکرد. بەمشێوەیە کەوتنە خزمەتی پیلانگێڕییەوە.

لەم پیلانگێڕییەدا میسر رۆڵێکی مەزنی بینی، میسر چوو بە سوریای گووت:" ئەگەر بۆ ئاپۆ لەنێوان ئێوە و تورکیا شەڕ دەربکەوێت، ئێمە لەگەڵ ئێوەدا نابین، ئاپۆ دەربکەن بابچێت، بۆچی لەبەر شەخسێك عەرەب بکەوێتە شەڕەوە؟" وایان بە سوریا گووتبوو:" ئێوە بەتەنیان، ئێمە پشتیوانی ئێوە ناکەین" وەکوتریش گووتبوویان:" نەك هەر تورکیا، بەڵکو ئەمریکا، ئیسرائیل و ئینگلیز هەموویان لەدژی ئێوەن. ئیدی ناتوانن رووبەڕووی هەموویان ببنەوە"، سوریاش بینی کە بەتەنیا دەمێنێتەوە، ئیدی ئەم فشارهێنانە میسر کردی، بۆ ئەوەی سوریا سەرۆك دەربکات. لەناو سوریاشدا هەندێك ئەو فشارەیان کرد. بۆ نموونە؛ "عەبدولحەلیم خەددام" پاشان هەندێك شتی ئاشکرا کرد و گووتی:" ئێمە ئەو بڕیارەمان لەنێو پارتی بەعسدا وەرگرت و بردمان بۆ لای "حافز ئەسەد" و بە "حافز ئەسەد"مان بەپەسند کردن دا"، واتا ئەو بڕیارە "حافز ئەسەد" وەرینەگرتبوو، ئەوان ئەو بڕیارەیان داوە و بەوێشیان بە پەسندکردن داوە،

چۆن بە پەسندكردنیان داوە؟ گووتیان:" بڕوانە عەرەب لەگەڵ ئێمە شوێن ناگرن، ئیدی ئەمریكا، ئسرائیل و توركیا و هەموویان دێنە سەر ئێمە، بۆچی ئێمە بۆ ئاپۆ خۆمان بخەینە ژێر مەترسییەوە؟ پێویستە تۆ ئەم بڕیارەمان پەسند بكەیت" كاتێك كە "ئەسەد"یش دەبینێت لەنێو سوریاشدا هەندێك ئەمە دەخوازن كە سەرۆك ئاپۆ دەربكەوێت، وەكوتریش "عەبدولحەلیم خەددام" ئەوەش دەڵێت:" ئێمە بینیمان كە ئاپۆ تادێت لەهەموو بەشەكانی كوردستاندا كاریگەری لەسەر كوردان دەكات، لەناو كورداندا رێكخستن پێشدەخات، ئێمە بینیمان نەك تەنیا بۆ توركیا مەترسیدارە، بەڵكو بۆ ئێمەش مەترسیدارە"، وەها دەڵێت:" بۆیە پێویستە خۆمان لە ئاپۆ رزگار بكەین". لەناوخۆشیاندا هەن كە دەخوازن سەرۆك لە سوریا دەربكەن، هەڵبەتە لەو رەوشەدا فشاری مەزن هەیە و هەڕەشەی توركیا و ئیسرائیل و ئەمریكا لەئارادایە، لەناكامی ئەمەدا سوریا، ئەوانەی دۆستایەتیان دەكردین، ئیدی نەیاندەتوانی دۆستایەتیمان بكەن. دیسان كاتێك كە "عەبدولحەلیم خەددام" لە سوریا دەركەوت و پاشان چووە فەڕەنسا وا نیشانی دەدا كە ئەو سەرۆك ئاپۆی لەسوریا دەرخستووە، ئەگەر بڕیاریان وەرگرتبوو ئەو پێی وەرگرتبوون، ئەگەر بە "حافز ئەسەد"یان بە پەسندكردن دابوو رۆڵی ئەو هەیە، تەنانەت دەڵێت:" من چووم بە ئاپۆشم گووت تۆ كەسێكی زانایت، توركیا دەخوازێت بكەوێتە سوریاوە، دێتە سوریا یان نا؟ سەرۆك گووتوویەتی دەكەوێتە سوریا، بۆ ئەوەی سوریا زەرەر نەبینێت من دەتوانم دەربكەوم" دەڵێت:" من قسەم لەگەڵیدا كرد"، واتا" من قەناعەتم پێیكرد" بەو هەوایەوە قسە دەكات. بەمەش رۆڵی خۆی لەدەرخستنی سەرۆك لە سوریادا نیشان دەدات.

یۆنانستان، روسیا، ئەڵمانیا، فەڕەنسا، هۆڵەندا، ئینگلتەرا، كینیا، میسر، ئەمریكا و هەموو ئەمانە لەو پیلانگێڕییەدا شوێنیان گرت. ئەمریكا هەموو ئەو وڵاتانەی لەنێو پیلانگێڕییەكەدا ئۆرگانیزە كرد، لەوانەیە بیرۆكە و پیلاننامەی ئەو پیلانگێڕییە ئینگلتەرا داڕشتبێت. بەڵام لەپراكتیكدا ئەمریكا رێكخستەی كردووە و كۆردیناسیۆنێتی و سەرپەرشتی پێكهێنانی ئەوەی كردووە.

بێگومان ئیسرائیل بە هاوكاری ئیستخباراتیی خۆی لەگەڵ توركیا و بە هەڕەشكردنی بۆ سەر سوریا رۆڵێكی مەزنی بینی.

لە ئەوروپادا پێشتر ئەڵمانیا بڕیاری ئەوەی دابوو کە ئەگەر سەرۆك بچێتە ئەوروپا دەستگیری بکات، کە سەرۆك چووە ئیتاڵیا، ئەوا ئەڵمانیا ئەو بڕیارەی خۆی خستە لایەکەوە، بۆ ئەوەی پیلانگێڕییەکە بەڕێوە بچێت. ئیتاڵیا خواستی کێشەی کورد بباتە یەکێتی ئەوروپا، کە لەسەر ئەو بنەمایە یەکێتی ئەوروپا ڕێیەکی چارەسەری پێشبخات، ئەڵمانیا، ئیتاڵیای بەتەنیا هێشتەوە و ڕێگیری لێکرد. نوێنەری فەرەنسا چووە ڕۆما و ئیفادەی لەسەر سەرۆك وەرگرت و دەستی بەسەر پاسپۆرتی سەرۆکدا گرت، ئینگلتەرا هەڕەشەی هەموو ئەو شوێنانەی کرد کە سەرۆك بچێت.

کاتێك کە سەرۆك لە ڕۆما بوو (پ د ك) و "بارزانی" دۆسیەیان دەنارد، بۆ ئەوەی ئەوروپا سەرۆك پەسند نەکات، دۆسییەی وەهایان دەنارد کە سەرۆك تیرۆریستە و لەدژی کوردانە. ئیدی ئەم پیلانگێڕییە بەمشێوەیە جێبەجێکرا.

سەرۆك بەمجۆرە دەستگیرکرا و تەسلیمی تورکیایان کردەوە. خواستیان بەمە هەم سەرۆك بێکاریگەر بکەن و گەل و تەڤگەریش لەژێر کاریگەری سەرۆك دەربخەن، گەل و تەڤگەر بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، هەمیش خواستیان شەڕێکی بێ کۆتایی لەنێوان کورد و تورکیا بەرپا بکەن و بەمەش هەم تورکیا و هەمیش کوردان مەجبوری خۆیان بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن سیاسەتی خۆیان بەڕێوە ببەن. واتا هەر هێز و لایەنێك خواستی ئەنجامی خۆی لەڕێگەی ئەو پیلانگێڕییەوە پێك بهێنێت و بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی خۆی بێنێتەدی. بۆیە هەر هەموویان لەم پیلانگێڕییەدا بەشدار بوون. بێگومان ئامانجی هەر یەکەیان جودا جودا بوو و وەك یەك نەبوون...

**ئەو کاتەی کە سەرۆك ئاپۆ دەچێتە ڕۆما ڕابوونێکی مەزنی گەل، کە نموونەی لەمێژوودا نەبوو، ڕوویدا، ڕابوونێکی گەلەری جەماوەری بوو. ئەمەش وایکرد کە دۆزی کوردان بگاتە ئاستێکی نێودەوڵەتی و ڕۆژەڤی هەموو جیهان. بەڵام خاڵی هەرە سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە ئەوروپا لەدۆخێکی وەهادا نابێتە فاکتەرێك بۆ چارەسەری کێشەی**

**کورد، ئەمە لەچییەوە دێت؟ وادیارە تا ئەو ساتە و ئێستاش تێیدا دەژین سیاسەتێکی دووڕوویانەی سەیریان هەیە، لەلایەکەوە بە تورکیا دەڵێن؛ پێویستە دیموکراتیزەبوون ئەنجام بدەیت، لەلایەکی دیکەش ناهێڵن ئەمە ئەنجام بدرێت و کێشەی کورد چارەسەر ببێت، ئەمە لەچییەوە دێت...؟**

ڕاستە، ئەگەر ئەورووپا بەشداری لە پیلانگێڕییەکە نەکردبایە و خوازیار بووایە کێشەی کورد چارەسەر ببێت، ئەو پیلانگێڕییە پێك نەدەهات و کێشەی کوردیش چارەسەر دەبوو. بۆ نموونە؛ سەرۆك ئاپۆ لە "شام"ەوە ڕووی لەچیا نەکرد، دەیتوانی بهاتبایە چیا، لەوانەبوو ئەگەر هاتبایە چیا ئەو پیلانگێڕییەش پووچەڵ بکرابایەوە، بەڵام شەڕێکی مەزنیش بەرپا دەبوو، قەتلوعامی مەزن ڕوویدەدا، سەرۆك هەم لەبەر ئەم هۆیە نەهاتە چیا، هەمیش کە چووە ئەورووپا تاوەکو کێشەی کورد بخاتە سەر ڕاستەڕێی چارەسەری و شەڕ بەردەوام نەبێت و کۆمەڵکوژی ڕوونەدات، بۆچی؟ چونکە ئەورووپا پێشتر چی دەگووت؟ دەیگووت:" ئەگەر ئێوە شەڕ ڕابوەستێنن ئێمە دەتوانین هەوڵ بدەین و کار لەسەر تورکیا بکەین و دەتوانین تورکیا ڕازی بکەین کە کێشەی کورد لەڕێی سیاسی و دیموکراتییانەوە چارەسەر بکرێت. بەڵام لەبەر ئەوەی شەڕ لەئارادایە ئێمە ناتوانین ئەم ڕۆڵە بگێڕین". تەنانەت بۆ ئەمەش دەیانخواست سەرۆك بچێتە ئەورپا، هەواڵی وەهاشیان دەنارد. ئەگەر سەرۆك نەهاتە چیا هۆکارێك لە هۆکارەکانیش ئەمە بوو. هەڵبەتە سەرۆکیش دەیخواست کە کێشەکە بەدیالۆگ چارەسەر ببێت، مادام ئەورووپاش هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەکی وەهای هەیە، بۆیە بەرەو ئەورووپا چوو، بەڵام پاشان ئاشکرابوو کە ئەورووپا بۆ ئەوەی پیلانگێڕی ئەنجام بدات وەها مامەڵەی کردووە. چونکە ئەگەر ڕاستگۆ بوونایە و نیازێکی بەوجۆرەیان هەبووایە، ئەوا سەرۆك چووە ئەورووپا، کاتێك کە چووە ئەورووپاش بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر ببێت پرۆژەیەکی چارەسەریشی ڕاگەیاند، پرۆژەیەکی زۆر ماقووڵیش بوو، ئەورووپا نەك هەر گفتوگۆی لەسەر ئەم پرۆژەیە نەکرد و شوێنیشی نەدا بەسەرۆك، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەشداری

له پیلانگێڕییەکەش کرد، ئەمەش ئەمەی سەلماند کە ئەوروپا ناخوازێت کێشەکە چارەسەر ببێت، ئەوروپا بۆ ئەوەی سەرۆك لە ئەوروپا دەربخات و ئامانجەکانی ئەو پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییە بێتەدی ڕۆڵی خۆی دەبینی.

چوونی سەرۆك بۆ ئەوروپا هۆکارێکی دیکەشی هەبوو، لەبنەڕەتدا خاوەنی سەرەکی کێشەی کورد ئەوروپا بوو، چونکە ئەوروپا کوردستانی بەش بەش و پارچە پارچە کردبوو، ستاتۆیەکی لە خۆرهەڵاتی ناوین دروستکردبوو، لەو ستاتۆیەی کە دروستیشی کردبوو شوێنی بە کوردان نەدابوو. واتا کوردانی لەدەرەوەی ستاتۆیەکە هێشتبووەوە و پارچە پارچەشی کردبوو و بە "لۆزان"یش ئەو پارچەکردنەی خستبوو سەر بناخەیەکی حقوقیشەوە، بەمەش کوردانی تەسلیمی دەوڵەتە داگیرکەرەکان کردبوو، لەبەر ئەوەی ئەو ستاتۆیەی دروستیکردبوو تێیدا شوێنی بە کوردان نەدابوو، نکۆڵیان لە کوردان کردبوو، بۆیەش ئەو سیاسەتەی لەسەر کوردان پەیڕەو دەکرا سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردن بوو، خاوەنی ئەو سیاسەتەش لەبنەڕەتدا ئەوروپایە. چونکە ئەوەی ستاتۆیەکی بەمرەنگەی لە خۆرهەڵاتی ناوین دروستکردبوو ئەو بوو، ئەوەی لەو ستاتۆیەشدا شوێنی بەکوردان نەدابوو هەر ئەو بوو. ئەگەر کوردانیان پەسند بکردبایە ئەوا لەو ستاتۆیەدا شوێنیان بە کوردان دەدا. واتا ئەوەی نکۆڵی لە کورد کردووە و لەسەر کوردان سیاسەتی لەناوبردنی بەڕێوە بردووە لەبنەڕەتدا ئەوروپایە. دەوڵەتانی داگیرکاریش ئەو سیاسەتەیان لەپراکتیکدا بەڕێوە بردووە. خاوەنی ئەو سیاسەتە دەوڵەتانی داگیرکەر نین، بەڵکو لەبنەڕەتدا ئەوروپایە. بۆیە خاوەنی کێشەی کوردیش هەر ئەوروپایە. ئەوروپا لەبەرامبەر ئەو سیاسەتەی لەدژی کوردانیش بەڕێوە براوە بەرپرسیارە، لەبەرامبەر هەموو ئەو کۆمەڵکوژی و ئەشکەنجە و چەوسانەوەیەی بەسەر کورداندا هاتووە بەرپرسیارە، هەر تەنیا دەوڵەتانی داگیرکەر بەرپرسیار نین. دەوڵەتانی داگیرکەر ئەو سیاسەتەی ئەوروپا دایڕشتووە و بە "لۆزان"یش کردی بە سیاسەتێکی فەرمی، لەپراکتیکدا جێبەجێیان کردووە. بۆیە پێکەوە بەرپرسیارن لەو کۆمەڵکوژی و چەوسانەوەیەی لەدژی کوردان پەیڕەو کراوە. ڕاستی مەسەلەکە وەهایە. ئەگەر سەرۆکیش چووە ئەوروپا هۆکارێکیشی ئەمە بوو. چونکە کێشەی کورد ئەگەر ئەوروپا پەسندی کرد ئەوا چارەسەر دەکرێت. ئەگەر ئەوروپا کورد پەسند نەکات و چارەسەری

کێشەی کورد پەسند نەکات، ئەوا کێشەی کوردیش چارەسەر نابێت. ئەوروپا دەیگووت:" تۆ وەرە ئەوروپا و دەستبەرداری شەڕی چەکداریش ببە، ئێمە دەتوانین کێشەکە چارەسەر بکەین" سەرۆك بۆ ئەمە چووە ئەوروپا. ئەوروپا بەشداری لە پیلانگێڕییەکەدا کردبوو، بۆ ئەوەی رۆڵی خۆی لەنێو پیلانگێڕییەکەدا پێك بهێنێت بەو جۆرە نزیك دەبووەوە. هەڵبەتە لەقۆناحی پیلانگێڕییەکەشدا ئەو راستییە ئاشکرا بوو کە ئەوروپا ناخوازێت ئەو بەرپرسیارێتییە مێژوویی و سیاسی و ئەخلاقییەی خۆی پێك بێنێت. لێرەدا ئەوروپا بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی و سیاسی و ئەخلاقیی لەبەرامبەر کوردان هەیە. ئەمە دەرفەتێك بوو کە سەرۆك چووە ئەوروپا و ئەو پرۆژەیەی راگەیاند بۆ ئەوەی کێشەی کورد بەرێگەی سیاسی چارەسەر بکرێت، ئەمە بۆ ئەووپا دەرفەتێکی مەزن بوو، ئەوروپا دەیتوانی خۆی لەو تاوانەی خۆی پاك بکاتەوە. واتا ئەو کێشەیەی خۆی دەریخستووە دەیتوانی چارەسەریشی بکردبایە، بەمەش دەیتوانی خۆی بە عەفوکردن دابایە و تاوانی خۆی پاك بکردبایەوە. بەڵام ئەوروپا پێداگری لەسەر درێژەدان بە تاوانەکەی خۆی کرد، بۆیە بەشداری لەپیلانگێڕییەکەدا کرد. بەمەش تاوانەکەی خۆی لەبەرامبەر کوردان زۆر قورستر کرد...

ئاشکرا بوو کە ئەوروپا ناخوازێت کێشەی کورد چارەسەر ببێت، بەڵکو دەخوازێت هەر شەڕ هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت هەمیشە بەردەوامی بەو ستاتۆیە بدات و بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەکانی خۆی بەردەوام بکات. ئەوروپا ئەوەندە باسی دیموکراتی و ئازادی و ماڤ مرۆڤ و "ماڤ سێ نەوە"دەکات ئاشکرا بوو کە هیچی راست نین. ئەگەر ئەوانە راست بووایە ئەوا ئەمڕۆ لە جیهاندا هیچ گەلێك نییە بەقەد گەلی کورد زیاتر پێویستی بە ئازادی و دیموکراسی و ماڤ مرۆڤ هەبێت. ئەو گەلە هێندە گەلێکی مەزن، هێندە لەنێو کۆمەڵکوژی و چەوسانەوە و ئازاردا ژیاوە، تەنانەت زمانەکەی قەدەخە کراوە. مادام هێندە دیموکراسی و ماڤ مرۆڤ و ئازادی بەبناخە وەردەگرن، ئەوا ئەو کاتە پێویستە بۆ کوردانیش ئەمەیان بەبناخە وەرگرتبایە، ئیدی ساختەکاری و دووڕوویی ئەوروپا بەو پیلانگێڕییە ئاشکرا بوو، کە ئەوروپا بۆ کوردان نە حقوق، نە عەدالەت، نە دیموکراسی و نە ئازادی بەبناخە وەرناگرێت، کە مەسەلەی کورد هاتەپێش هەموو ئەو شتانە رادەوەستێنن. لەدەرەوەی حقوق و عەدالەت و ماڤ مرۆڤ و دیموکراسی و ئازادی

لە کوردان دەڕوانن، ئەمە راستینەی ئەوروپا دەخاتەڕوو، بۆچی ئەوروپا وەها نزیك دەبێتەوە؟ چونکە لەبەرامبەر کوردان زۆر تاوانبارە، ئەوەی لەبنەڕەتدا نکۆڵی و قڕکردنی پێشخستووە ئەوروپایە، لەسەر ئەو سیاسەتەش زۆر کۆمەڵکوژی مەزن لەسەر کوردان ئەنجام دراوە، ئەو بەرپرسیاری ئەمەیە. بە چەکی ئەوان هەڵەبجە کیمیاباران کرا و کۆمەڵکوژی ئەنجام درا، واتا ئەگەر ئەوروپا راستگۆ بن و دان بەوەدا بنێن و بڵێن:" ئێمە گوناهبارین لەو رەوشەی کورد تێیکەوتووە و ئێمە رێگەی ئەوەمان داوە، چونکە ئێمە ئەو ستاتۆیەمان لە خۆرهەڵاتی ناوین دروستکرد و تێیدا جێگەمان بەکوردان نەدا و نکۆڵیمان لەکوردان کرد و پارچەمان کردن و تەسلیمی ئەو داگیرکەرانەمان کردن، ئەوانیش لەسەر ئەو بنەمایە ئەو سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردنەیان بەڕێوە بردووە، ئێمە لەمەدا بەرپرسیارین و دەخوازین تاوانی خۆمان بسڕینەوە، بۆیەش ئێمە دەخوازین کێشەی کورد چارەسەر ببێت و... ". دەیانتوانی وەها بکەن. بەڵام جورئەتیان نیشان نەدا و ئەو دەرفەتەشیان بەکارنەهێنا. مەسەلەی ئەوان تەنیا مەسەلەی جورئەتکردن یان نەکردن نییە، بەڵکو بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانیان ئەمە دەخوازێت. ئەوروپا بەتەواوی بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری بۆخۆی بەبنەما وەردەگرێت، ئەگەر بەرژەوەندی سیاسی و ئابوورییان لە کۆمەڵکوژی کوردانda بێت، ئەوا ئەوان ئەمە بەبنەما وەردەگرن، بۆ ئەوان دیموکراسی، ئازادی و مافی مرۆڤ گرنگ نییە، ئەو کاتە با بڵێین ئەوروپا دەڵێت:" لەبەر ئەوەی ئەمریکا فشارێکی زۆری بۆهێناین ئێمەش نەماندەتوانی... " لەوانەیە بیانوویەکی بەمجۆرە بدۆزنەوە و بخوازن راستینەی خۆیان بشارنەوە. ئەمە راستیش نییە. بەس با بڵێین وایە، دادگای ئەوان (دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا) بڕیارێکی دا کە دادگایی سەرۆك ئاپۆ لە ئیمرالی راست پێك نەهاتووە و پێویستە سەرلەنوێ دادگایی بکرێتەوە، کەچی کۆنسەی ئەوروپا گووتی:" پێویست ناکات سەرلەنوێ دادگایی بکرێتەوە" و گووتی:" ئەو بڕیارەی تورکیا وەریگرتووە راستە" هەروەها گووتی:" ئەگەر دادگاییش بکرێتەوە دیسان ئەو بڕیارە دەدرێتەوە، بۆیەش ئەو بڕیارە لەشوێنی خۆیدایە و پێویست ناکات دادگایی بکرێتەوە". کەچی ئەمەش دەرفەتێك بوو بۆ ئەوەی تاوانەکانی خۆیان بسڕنەوە و خەتا و هەڵەکانی خۆیان بەلاوە بنێن. بەڵام بەم بڕیارەیان ئاشکرا بوو کە بەئەنقەست ناخوازن

کێشەی کورد چارەسەر ببێت. بۆیەش خاوەنداریێتی لەتاوانەکانی خۆیان دەکەن و ئەوەی لەبەرامبەر کوردان کردوویانە خاوەنداریێتی لێدەکەن و پێداگریشی لەسەر دەکەن، گرنگێتی ئەو بڕیارە ئەمەیە. چونکە سەرۆك ئاپۆ چەندین ئاگربەستی ڕاگەیاندووە.

ئێستاش(١) جارێکی دیکە ئاگربەستی ڕاگەیاندەوە، ئەو ئاگربەستانە کاریگەری خۆی لەسەر هەندێك دەوروبەر کردووە. بۆ ئەمەش چەندین کۆنفرانسی وەك "**کۆنفرانسی تورکیا لە ئاشتی خۆی دەگەڕێت**" سازدران. دەوڵەتی تورکیا دەخوازێت ئاگربەستەکە پووچەڵ بکاتەوە و دەخوازێت کۆمەڵکوژی نوێ پێشبخات، ڕێك لەو کەشوهەوایەدا، ئەو بڕیارەی خودی دادگای ئەوان وەریگرتووە دەڵێت:" پێویست ناکات دادگایی بکرێتەوە"، هەمیش زۆر بەئاشکرایی لەگەڵ سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردن دایە و پێداگریشی لەسەر دەکات و خاوەنداریێتی لەسیاسەت و تاوانەکانی خۆی دەکات. ئەمانە هەمووی بەدیار دەخات کە ئەوروپا ناخوازێت کێشەکە چارەسەر ببێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەخوازێت کێشەکە بەردەوام ببێت و شەڕ و کۆمەڵکوژی بەردەوام بکات.

بۆیە ئەوروپا ڕۆڵێکی زۆر خراپ لەبەرامبەر کوردان دەگێڕێت. پێویستە کوردان باش لەو ڕاستییە تێبگەن. ئەوروپا لەبەرامبەر کوردان تاوانبارە و پێداگریش لەسەر تاوانەکانی دەکات و تادێت تاوانەکانی خۆیشی مەزن و قووڵتر دەکاتەوە و پێویستە کورد ئەمە ببینن، پێویستە کورد بەئاشکرا لەدژی سیاسەتی ئەوروپا ڕابوەستن، بۆ ئەوەی ئەوروپا دەستبەرداری ئەو سیاسەتەی ببێت کە لەدژی کوردان پەیڕەوی دەکات. داوای لێبوردن لە کوردان بکات و داوا بکات کورد لێی ببورن و لێی خۆش بن. ئەوەش مەگەر تەنیا بەوە دەبێت کە کێشەکە پەسند بکات و هەوڵ و تەقەللا بدات بۆ ئەوەی چارەسەر ببێت و لەم ڕووەوە ئەگەر ڕۆڵی خۆی ببینێ ئەوا دەتوانێت خۆی لە تاوانەکانی پاك بکاتەوە و خۆی بەعەفوکردن بدات، ئەگەر وەها نەبێت ئەوا پێویستە هەروا زوو بەزوویی لەتاوانەکانی ئەوروپا نەبووردرێت.

ئەمرۆش(٢) دیسان ئەمریکا بەگوێرەی هەلومەرجی خەریکە ئێستا پیلانگێڕییەك ڕێك دەخات، قاچ (پایە)ی ئەوروپای ئەو پیلانگێڕییەی تەواو کردووە و کەوتۆتە جموجۆڵەوە، سەرەتا ئەڵمانیا هێرشی کرد، پاشان یەکێتی ئەوروپا بڕیاری دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا لەدادگاییکردنی سەرۆك پێکنەهێنا، پاشان ئەمجارەیان دادگایی ماف

مرۆڤی ئەوروپا سەبارەت بەوەی رێژەی (٪١٠)ی بەنداوی هەڵبژاردن لەتورکیا پێشێلکردنی ماق مرۆڤی تێدا نییە و بۆ ئارامی تورکیا ئەو بڕیارە وەرگیراوە و لەجێی خۆی دایە(٣) ئیدی پاشانیش فەرەنسا و بەلژیکا هێرشیان هێنایە سەرمان.(٤) ئەمانە هەمووی کێ ئۆرگانیزەی دەکات؟ ئەمریکا ئۆرگانیزەی دەکات، ئەڵمانیاش لە ئەوروپا جێبەجێی دەکات. ئەوەی ئەمە لە ئەوروپادا پێك دێنێت ئەڵمانیایە، ئێستا ئەڵمانیا لەیەکێتی ئەوروپادا بەرپرسیاری خوولی شەش مانگەی یەکێتی ئەوروپایە، ئەڵمانیا ئەمانە لە ئەوروپادا ئۆرگانیزە دەکات، واتا قاچی یەکەمی پیلانگێڕی لە ئەوروپادا ئەڵمانیایە، ئەو لەپراکتیکدا هەمووی جێبەجێ دەکات. ئەڵمانیا ساڵی (١٩٩٦) بەبڕیاری ناتۆ (NATO) ئەرکی پێ سپێردرا کەوا لەبەرامبەر (PKK) تورکیا بپارێزێت، لەو رێکەوتە بەدواوە هەمیشە لەگەڵ تورکیایە بۆ دژایەتیکردنی (PKK) و تەفگەری کوردان. هەروەها ئەڵمانیا لە مێژوویێکی کۆنەوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا هەبووە و هەیە، ئەو پەیوەندییەش پەیوەندییەکی بەهێز و تۆکمەیە، لەسەر بنەمای بەرژەوەندی سیاسی و ئابوورییە، بۆ ئەوەی ئەمە بپارێزێت لەدژی (PKK) و کورد رادەوەستێت. ئەڵمانیا دەخوازێت هەم لە ئەڵمانیا و هەمیش لەتەواوی ئەوروپا کوردان بتوێنێتەوە و بیانخاتە خزمەتی خۆیانەوە، چونکە (PKK) ناهێڵێت کورد لەوێ بتوێتەوە و بکەوێتە خزمەتی ئەوانەوە، (PKK) کوردی لەسەر بنەمای نەتەوەیی و ـراتی پەروەردە کردووە و دەیژێنێت و دەیخاتەوە خزمەتی خودی کوردەوە و بەرەو کوردستانیش ئاراستەیان دەکات و دەیانخاتەوە خزمەتی کوردستان. بۆ ئەمەش پەلاماری (PKK) دەدەن.

وەکوتریش؛ لەمێژوودا ئەڵمانیا بەردەوام لەدژی ئازادی و دیموکراسی راوەستاوە، ئەوەی لەجیهاندا جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیشی بەرپاکرد ئەڵمانیا بوو. ئەوەی لەنێو خۆیدا سۆسیالیستەکانی دەگرت و دەیکوشت ئەڵمانیا بوو، ئەوەی لەدژی جولەکە کۆمەڵکوژییان ئەنجام دا ئەڵمانیا بوو، ئەوەی لەدژی سیستەمی سۆڤییەت راوەستا و لە پەرشوبڵاوکردنی سۆڤییەتیشدا لەدوای ئەمریکا ئەرکی خۆی جێبەجێ کردبێت لە ئەوروپادا ئەڵمانیا بوو، ئەوەی هاوکاری "ئیتحاد و تەرقییەکان"ی(٥) کرد تاکو کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان ئەنجام بدەن ئەڵمانیا بوو، ئەوەی فیکری فاشیزمی دا بە

تورکیا و پشتیوانی لەم فیکرمیە کرد لە تورکیادا ئەڵمانیا بوو، بۆیە ئەڵمانیا لەدژی (PKK) و سەرۆك ئاپۆش رادەوەستێت... هەر تەنیا بەخۆی دژایەتی ناکات، ئیدی بەناوی ناتۆ و سەرمایەداریشەوە لە ئەوروپا ئەو ئەرکە پێك دێنێت. لەهەموو دووژمنایەتییەکاندا ئەڵمانیا هەنگاوی یەکەم دەهاوێژێت، پاشان ئەوانەی دیکە هەنگاو دەهاوێژن یان پێیان بەهاوێشتن دەدات. لەساڵی (١٩٩٢)یشدا ئەڵمانیا هاتەسەر تەفگەر و (PKK)ی بەتیرۆریست راگەیاند، پاشان یەکسەر فەرەنساش هاتەسەر تەفگەر و ئەویش بەتیرۆریست رایگەیاند. ئەمرۆش(٦) سەرەتا ئەڵمانیا هاتەسەر تەفگەر پاشان فەرەنساش هاتە سەر تەفگەر. ئیدی ئەمە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتییە، لە هەلومەرجێکی نوێدا بەڕێوە دەبرێت، کۆردیناتۆری ئەمریکا ئەمە کۆردینە دەکات، بەمجۆرە قاچی ئەوروپای ئەو پیلانگێڕییەی دروستکرد و خستییە جموجۆڵەوە.

ئێستاش لەسەر قاج (پایە)ی ئێراق رادەوەستێت. قاچی ئێراقیش لەبنەڕەتدا کێیە؟ (ی ن ك) و (پ د ك)ن. ئێستا لەسەر ئەو قاچە راوەستە دەکەن و دەخوازن ئەو قاچەش بخەنە جموجۆڵەوە بۆ ئەوەی بتوانن پیلانگێڕییەکە بگەیەننە ئامانج، تاکو (PKK) لەهێزی چارەسەری دەربخەن و کوردان لەژێر کاریگەری (PKK) دەربخەن و بیخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. ئیدی "راڵستۆن" هات و"مەسعود بارزانی" بینی و قسەی لەگەڵدا کرد. "راڵستۆن" لە تورکیادا گووتی:" من لەو باوەڕەدام کە دەتوانم قەناعەت بە مەسعود بارزانی بهێنم، من بە مەسعود بارزانیم گووتووە:" (PKK) بۆ ئێوە مەترسیدارە، بۆ ئێراق و تورکیا مەترسیدارە، لەو باوەڕەش دام کە من قەناعەتی پێبێنم و پێی بەپەسند کردن بدەم..." پاشان "نێچیرڤان بارزانی" چووە ئەمریکا، "عەبدوڵلا گویل"یش لە تورکیاوە چووە ئەمریکا... ئێستا(٧) هەردووکیان لەم رۆژانە بە سەرۆکایەتی ئەمریکا یەکتر دەبینن، بەمەش دەخوازن نێوانی تورکیا و (ی ن ك ـ پ د ك) باش بکەن، کە قاچی پیلانگێڕی لە ئێراقیش بخەنە نێو جموجۆڵەوە، بۆ ئەوەی بتوانن زەبر لەتەفگەر بوەشێنن و کوردان لەژێر کاریگەری تەفگەر دەربخەن و بەتەواوی بیخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. ئێستا پیلانگێڕی ئەمجارەیان بەو شێوەیە رێکخست. لە تورکیادا بەتەواوی فاشیزم پێشدەخەن و پشتیوانیان لێدەکەن، فاشیزمیش بەتەواوی کورد و (PKK)ی کردۆتە ئامانجی خۆی، دەخوازێت کۆمەڵکوژی ئەنجام بدات.

لەدەرەوەش ئەمریکا پیلانگێڕی نێودەوڵەتی ئۆرگانیزە دەکات، هەردوو قاچی ئەوروپا و ئێراق دروست دەکات، ئەو قاچانە (پایە)یانەش دەخاتە خزمەتی تورکیاوە، فاشیزمی تورکیاش سوود لەمە وەردەگرێت و جورئەتی زیاتر وەردەگرێت و دەڵێت:" من دەتوانم کۆمەڵکوژیش ئەنجام بدەم و ئەنجامگیریش ببم". هەر بۆیەش خۆی لەئاشتی و چارەسەرکردنی کێشەکە نزیك ناکاتەوە. ئەگەر خۆی نزیك ناکاتەوە ئەو هێزە لە ئەمریکا و ئەڵمانیا وەردەگرێت.

**هێشتا پێویست دەکات لەسەر رۆڵی یەکە بەیەکەی ئەو دەوڵەتانە لە پیلانگێڕی نێودەوڵەتی (١٥)ی شوباتی (١٩٩٩) زیاتر شرۆڤە بکرێت. چونکە زۆرێك لەو دەوڵەتانە خۆیان دژی یەکتریشن، یۆنانستان دژی تورکیایە، تورکیا کێشەی لەگەڵ سوریا هەیە، روسیا و ئەمریکا دژی یەکترن. بەڵام وەکو دیار دەبێت لەچوارچێوەی ئەو پیلانگێڕییەدا سەودا و مامەڵە و رێککەوتنێکی گەورە و هەمە لایەن هەیە... لەلایەکی دیکەشەوە، لەو کاتەوە تاکو ئێستا لە تورکیادا هەندێك لێدوان دەدرێت، لەو لێدوانانەدا بەدیار دەکەوێت کە تورکیا لەم پیلانگێڕییەدا زێدە رۆڵێکی وەهای نەبوو، وەك بڵێی تەنیا لە چاوەڕوانی دەستگیرکردنەکە دابووبێت، ئەگەرنا زێدە رۆڵێکی چالاکی لەسەرکەوتنی پیلانگێڕییەکەدا نەبینیبێت، تەنانەت زۆر لە لێپرسراوە گەورەکانی ناو دەوڵەتیش ئاگایان لەپیلانگێڕییەکی وەها نەبووە، کە سەرۆك دەستگیر دەکرێت. مرۆڤ ئەمە چۆن هەڵدەسەنگێنێت...؟**




**نەخشەی دەرکەوتنی رێبەر ئۆجەلان لەرۆژهەلاتی ناوینەوە بۆ ئەورووپا**

رۆڵی تورکیا لەو پیلانگێرییەدا زۆر کەمە، وەك چۆن لەفیلمێکدا هەندێك ئەکتەر رۆڵێکی زۆر سادەیان دەدەنێ، پێی دەڵێن" **فیگوران**" واتا ئەو رۆڵەی بە تورکیای دەدەن ئەمەیە. بۆ نموونە کاتێك ئەو پیلانگێرییە پێکهات و سەرۆکیان بەدیلگرت و تەسلیمی تورکیایان کردەوە "**بوڵەند ئەجەوید**" سەرۆك وەزیران بوو، تاکو مردیش دەیگووت:" من نازانم بۆچی **ئۆجەلان**یان تەسلیمی ئێمە کردەوە؟!" تامردنیش هەر ئەو قسەیەی دەکرد. ئەمەش ئەوە بەدیار دەخات کە رۆڵی تورکیا لە پیلانگێرییەکەدا زۆر کەمە. لەبنەڕەتدا رۆڵی هەندێك دەوڵەت سەرەکییە، یەکەمیان: ئەمریکایە، کە هەموو ئەو پیلانگێرییەی ئۆرگانیزە کردووە لەپرکتیکدا، بە سەرۆکایەتی ئەمریکا هەموو هەنگاوەکانی پیلانگێرییەکە و دەوڵەتەکان ئۆرگانیزە کران و پیلانگێرییەکە پێکهات، ئەگەر وەها نەبایە هیچ هێزێك نەیدەتوانی ئەم پیلانگێرییە جێبەجێ بکات. رۆڵی

ئینگلتەراش سەرەکییە، ئەوەی بیرۆکەی ئەو پیلانگێڕییەی پێشخستبوو و لەسەر ئەو بیرۆکەیەش پیلاننامەی داڕشتبوو ئینگلتەرایە، بۆیە رۆڵێکی سەرەکی لەم پیلانگێڕییەدا هەیە، لەدژی کوردان، ئەخاسمە لەدژی ئەو کوردانەی ئیرادەی ئازادی بەبناخە وەردەگرن، ئەوەی سیاسەت دەستنیشان دەکات و دایدەڕێژێت ئینگلتەرایە. ئەمریکا ئەو سیاسەتەی ئینگلتەرا دەستنیشانی کردووە جێبەجێی دەکات. ئەمەیە رۆڵی ئەمریکا. چونکە لە گۆڕەپانی کوردستاندا ئەوەی باش لە کێشەی کورد تێدەگات و ئەزموونێکی تۆکمەی هەیە ئینگلیزن. بۆیە ئینگلتەرا هەموو سیاسەتەکان لەدژی کوردان دەستنیشان دەکات و پێشیدەخات، ئەوەی لەپراکتیکیشدا جێبەجێی دەکات و رێکیدەخات و سەرپەرشتی دەکات، ئەمریکایە.

هەروەها ئیسرائیلیش یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە رۆڵێکی سەرەکی بینیوە، هەم لەرووی ئیستخباراتی و هەم زیاترکردنی فشار و گوشار بۆ سەر سوریا هاوکاری تورکیای کردووە و جورئەتی بە تورکیا داوە. میسریش رۆڵێکی سەرەکی بینیوە، گۆڕەپانی عەرەبی بەتەواوی هان دا کە لەگەڵ سوریا نەبن، بۆ ئەوەی پیلانگێڕییەکە پێك بێت، لەم رووە رۆڵێکی سەرەکی بینی. یۆنانستانیش رۆڵێکی سەرەکی بینی کە سەرۆك لە سوریا دەربخەن و بتوانن لەپراکتیکدا پیلانگێڕییەکە جێبەجێ بکەن. چونکە ئەگەر یۆنانستان رۆڵێکی وەهای وەرنەگرتبایە، دیسان ئەو پیلانگێڕییە سەرینەدەگرت، واتا رۆڵێکی سەرەکی بینی لەسەرکەوتنی پیلاگێڕییەکە. ئەڵمانیاش رۆڵێکی سەرەکی بینی لە پراکتیزەکردنی پیلانگێڕییەکەدا. ئەگەر ئەڵمانیا کاتێك کە سەرۆك چووە ئیتاڵیا بیگووتبایە:" من وەك بڕیارم داوە دەستگیری دەکەم" چونکە پێشتر بڕیارێکی وەهای هەبوو، ئەوا ئەو پیلانگێڕییە پێکنەدەهات. هەروەها "ماسیمۆ دالیما"ی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتەی ئیتاڵیا خواستی لەگەڵ ئەڵمانیادا پێکەوە کێشەی کورد بکەنە رۆژەڤی یەکێتی ئەورووپا، ئەڵمانیا خاوەندارێتی لێنەکرد، لەمەشدا ئەڵمانیا رۆڵێکی نێگەتیڤ و سەرەکی بینی.

هەروەها کوردە وابەستەکانیش رۆڵێکی سەرەکیان لەو پیلانگێڕییەدا بینی. وەك دەزانرێت؛ پیلانگێڕی نێودەوڵەتی بەرێگەی رێککەوتنی واشنتۆنەوە کەوتە واری فەرمییەتەوە. لەو رێککەوتنەدا (ی ن ك) و (پ د ك) هەن. ئەگەر (ی ن ك) و (پ د ك) لەو

ڕێککەوتنەدا بەشدار نەبوونایە و ڕێی پیلانگێڕییان نەکردایەوە و پەسندیان نەکردبایە، دیسان ئەو پیلانگێڕییە جێبەجێ نەدەبوو. چونکە (ی ن ك) و (پ د ك) چەندە موحتاجی ئەمریکا بوون، ئەمریکاش ئەوەندە موحتاجی (ی ن ك) و (پ د ك) بوو. چونکە لەڕێگەی ئەوانەوە دەکەوتنە ئێراقەوە، ئەگەر ئەوان ئەو پیلانگێڕییەیان پەسند نەکردبایە، ئەوا ئەمریکا و ئینگلتەرا نەیاندەتوانی ئەو پیلانگێڕییە ئەنجام بدەن. ئەگەر هەڵوێستێکی وڵاتپارێزی و ئەخلاقییان وەرگرتبایە ئەوا ئەو پیلانگێڕییە ئەنجام نەدەدرا. چونکە ئەمریکا و ئینگلتەرا موحتاجی کوردان بوون، بەبێ کوردان نەیاندەتوانی موداخەلەی سەر ئێراق بکەن. ئەگەر ئەو دەوڵەتانە بڕیاری پێکهاتنی پیلانگێڕییان وەرگرت، ئەوا ئەو جورئەتەیان لە (ی ن ك) و (پ د ك) وەرگرت. (ی ن ك) و (پ د ك)ش بۆ بەرژەوەندی حیزبایەتی تەنگی خۆیان، ڕێگرتن لە پێشکەوتنی (PKK) و بێکاریگەرکردنی سەرۆك ئاپۆیان لە بەرژەوەندی خۆیاندا بینی؛ ئیدی ئەگەر سەرۆك دەستگیر بکرێت و بێکاریگەر ببێت و تەفگەر تەسفیە بکرێت ئەوا کوردستان بۆ ئەوان دەمێنێتەوە، حیساباتێکی وەهایان کرد. واتا حیساباتێکی نەتەوەییان نەکرد، حیساباتێکی ئینسانیانەیان نەکرد، بەڵکو حیساباتیان بەگوێرەی بەرژەوەندی تەنگی حزبایەتی خۆیان و بۆ خودی خۆیان کرد. بۆیە هاندەربوون بۆ پێکهێنانی ئەو پیلانگێڕییە. کاتێك کە سەرۆك لە ڕۆماش بوو، زۆر بەئاشکرا دۆسیەیان دەنارد بۆ ئەوەی ئەورووپا سەرۆك پەسند نەکات، مامەڵەیان لەگەڵیدا وەك مامەڵەکردن لەگەڵ تیرۆریستێك بێت. ڕۆڵێکی وەها سەرەکییان بینی، ئەگەر پیلانگێڕی سەریگرت ئەوا بەمشێوەیە سەریگرت. ئەگەر وەها نەبووایە، ئەو پیلانگێڕییە سەرینەدەگرت.

ڕوسیا، کینیا ڕۆڵیان کەمترە... بۆ نموونە؛ ئیتاڵیا وەك دەوڵەت زێدە ڕۆڵێکی وەهای نییە. بەڵام بێگومان لەناو دەوڵەتدا بەشێك ڕۆڵیان تێدا هەیە، کە لەگەڵ ئەمریکا و ئینگلتەرادا شوێنیان گرت.

ئەگەر مرۆڤ بڕوانێت ئەو دەوڵەتانەی لەنێوان خۆشیاندا کێشە و گرفتیان هەیە، هەندێکیشیان لەهەندێك ڕووەوە لەیەکترەوە نزیکن، لەهەندێك لای دیکەشەوە لەسەر هەندێك مەسەلە لەدژی یەکتر ڕادەوەستن. بەڵام لەو پیلانگێڕییەدا هەر هەموویان ڕۆڵی سەرەکی یان لاوەکیان وەرگرت. ئەمە بەتەواوی ئەمریکا ئۆرگانیزەی دەکرد،

ئەگەر وەها نەبووایە ئەم هەموو دەوڵەتانە کە بەرژەوەندییەکانیان لەئەوانی دیکە جیاوازترە و بەرژەوەندییان لەیەکتر جوداترە نەیاندەتوانی هەموویان بەمشێوەیە لەم پیلانگێڕییەدا، بگەیشتبنایە لای یەکتر. ئەمە ئەمریکا هەموویانی بۆ لای یەك کۆکردەوە. هەموو هێزی سیاسی، دیپلۆماسی، ئابووری و ئیستخباراتی خۆی بەکارهێنا لەئاکامی ئەوەدا پیلانگێڕییەکی هێندە فراوان ئەنجامدرا. ئیدی هەر لایەنە و بەرژەوەندییەکی لەم پیلانگێڕییەدا هەبوو و بەدەستیانهێنا. یۆنانستان بۆ کێشەی دوورگەکانی "قوبرس" و "ئەگە" هەندێك سوودی وەرگرت. هەروەها روسیا بۆ خەتی "گازی شین" و بۆ مەسەلەی چیچانستان سوودمەند بوو. دەوڵەتانی دیکەش هەن کە بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان سوودیان وەرگرت. واتا سەودا و مامەڵەی سیاسی و ئابووری بوو، هەندێك لەمە تورکیا دای، هەندێکیش ئەمریکا و ئینگلتەرا و ئەوان دایان، لەئاکامی ئەوەدا ئەم هەموو دەوڵەتانە بەشداریان لەم پیلانگێڕییەدا کرد. ئیدی بەمجۆرە پیلانگێڕی نێودەوڵەتی (١٥)ی شوباتی (١٩٩٩) پێکهات.

پێش ئەوەی سەرۆك ئاپۆ بەم پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییە دەستگیر بکرێت لەئاخافتنێکی خۆیدا دەڵێت:" من لەپارتی ئێوە وازدەهێنم" هەمیش لەو لێدوانانەی کە لەمیانەی بەشداریکردنی لەبەرنامەی تەلەفزیۆنیدا یان لەرێی شیکردنەوەکانی جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە "پێویستە (PKK) خۆی بگۆڕێت" هەروەها لە دەستگیرکردنیشی گووتی:" هەڤاڵێتی لاواز و دۆستایەتی ساختە بوونە فاکتەرێك بۆ ئەنجامگیربوونی پیلانگێڕییەکە" ئەگەر مرۆڤ ئەمانە هەمووی بێنێتە لای یەك دەکرێ لەو گووتانەدا چی تێبگەین...؟

سەرۆك بەگوێرەی زیهنییەت و فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای خۆی تەفگەرێکی لە کوردستان پێشدەخست و پێداگریشی لەسەر ئەو پێشخستنە دەکرد، هەرچەندە خواستی بەگوێرەی زیهنییەتی خۆی تەفگەرێك و میللەتێك پێشبخات، لەهەندێك رووەوە توانی پێشیان بخات، بەڵام لەهەندێك رووی تریشەوە پێشنەکەوت. تەنانەت هەندێك شتی پێچەوانەی زیهنییەتی سەرۆکیش دەرکەوت. سەرۆك کاتێك بەگوێرەی ئەو زیهنییەتە (PKK)ی ئاواکرد، خواستی بەتەواوی بەگوێرەی ئەو زیهنییەتە ملیتانێتی ئەو پارتییە ئاوا بکات و پراکتیکەکەی پێشبخات. لەم رووەوە هەرچەندە هەندێك هەنگاویش هاوێشتران، بەڵام لەهەندێك هەنگاویشدا هەم هەڵە و چەوتی دەرکەوت و هەمیش هەنگاوی کەم و نیوەچڵ هاوێشتران. لەوانەیە ئەمە تا هەڵمەتی (١٥)ی ئاب زێدە مەترسی دروست نەکردبێت، بەڵام دوای ئەوەی سەرۆك ئاپۆ هەنگاوی دووەمی بە پارتیبوونی لەچوارچێوەی هەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)ی هاوێشت، ئەوا خواستی لەمیانەی ئەو هەڵمەتەدا ئەو هەنگاوانەی نەهاوێشتراون بیهاوێژێت، یان نیوەچڵن تەواویان بکات، یان بەهەڵە هاوێشتراون راستیان بکاتەوە، بۆ ئەوەی پارتیبوونێکی بەهێز و تۆکمە پێشبکەوێت.

نیدی یەکێك لەئامانجەکانی هەڵمەتی (١٥)ی ئابیش ئەمەبوو. ئەمە لەمێژووی (PKK) و پرۆسەی بەپارتیبووندا پێی دەگووترێت هەڵمەتی دووەمی بەپارتیبوون، هەڵمەتی یەکەم بەدامەزراندنی (PKK) هاوێشترا، هەڵمەتی دووەمیش بەهەڵمەتی (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)دا هاوێشترا. تا هەڵمەتی (١٥)ی ئاب ـ واتا هەڵمەتی دووەمی پارتیبوون ـ لە پارتیبووندا هەندێك هەڵە و کەموکوڕی هەبوون، بەڵام زێدە کێشە و گرفتەکان مەزن نەبوون. بەمەش خواستی ئەو کێشە و گرفتانەی لەئاراش دان چارەسەرییان بکات. بەڵام دوای ئەم هەڵمەتە ئەو کێشانەی دەبایە چارەسەر ببوونایە چارەسەر نەبوون، بەڵکو مەزن و قووڵتریش بوونەوە. لەپارتیبووندا ئەو چەمکە هەڵە و بەکەموکوڕییانە زیاتر تەشەنەیان سەند.

نیدی لێرەدا چەتەگەرێتی تەشەنەی کرد، ئەو چەتەگەرێتییە زەرەری لەپارتی و گەریلا و گەل دا، دووژمنیش زۆر سوودی لەمە بینی. ئەمەی لەدژی تەڤگەر بەکارهێنا و نەیهێشت تەڤگەر بەئامانجەکانی خۆی بگات. سەرۆك خواستی کەوا چەمك و

پراکتیکی چەتەگەریێتی نەهێڵێت، بۆ ئەوەی تەڤگەر بەتەواوی لەسەر زیهنییەت و ڕاستەڕێی خۆی بەرەو پێشەوە بچێت. ئەو زیهنییەتەی چەتەگەریێتی پێشدەخست، دژی پارتی و گەریلا و گەل تەخریباتی دەکرد، بەمەش ئەو زەمینەیەی ئاوادەکرد کە دووژمن لێیەوە سوودمەند دەبوو. ئەمەش نەیدەهێشت تەڤگەر بگاتە ئامانجەکانی خۆی، خواستی ئەمە نەهێڵێت و لەم پێناوەشدا زۆر هەوڵیدا و کاری کرد.

چەتەگەریێتی بۆچی هێندە بەهێز بوو و توانی ئەو هەموو تەخریباتە بکات؟ هۆکارێك لە هۆکارەکانی ئەمە، ئەو کادیرانەی کۆمیتەی ناوەندی بوون کە دەبووایە ڕۆڵی خۆیان بگێڕابایە، بەتەواوی ڕۆڵی خۆیان نەبینی. واتا لەگەڵ زیهنییەتی سەرۆك ئاپۆدا بەتەواوی نەبوونە یەك، ئەرکی ئەم زیهنییەتەی لە پراکتیکدا بەتەواوی پێکنەهێنا، ئیدی لێرەدا هەڤاڵێتی لاواز (نیوەچڵ) دەرکەوت. ئەگەر سەرۆك دەڵێت:" هەڤاڵێتی لاواز" لەبەر ئەم هۆیەیە وادەڵێت. واتا هەڤاڵێتییەك کە بەتەواوی ئەرکی خۆی پێکنەهێناوە. هەڤاڵێتی لەگەڵ سەرۆك دەکات و هەڤاڵێتی لەگەڵ ئەو زیهنییەتەشدا دەکات و لەسەر ئەو بنەمایەش دەژیت و تێدەکۆشێت. بەڵام ئەو زیهنییەتە بەتەواوی لەپراکتیکدا پێکناهێنێت. بۆیە ناتوانێت چەتەگەریێتی بێکاریگەر بکات. ئەو کارەی کە سەرۆك لەدژی چەتەگەریێتی پێشیخستووە، ئەو شەڕەی لەدژی چەتەگەریێتی بەرپای کردووە، ناتوانێت بەتەواوی شوێنی خۆی تێدا بگرێت و بەتەواوی لەگەڵ ئەو هەوڵ و ڕەنجە خۆی ناکاتە یەك. بۆیە ئەو کارەی کەوا سەرۆك لەدژی چەتەگەریێتی دەیکرد، لەوانەیە لەهەندێك لایەنەوە ڕێگیری لێکرد بێت و تەخریباتەکەی کەمتر کردبێتەوە، بەڵام بەتەواوی نەیتوانی ئەو زیهنییەتەی چەتەگەریێتی لەناو پارتی و گەریلا تەواو بێکاریگەر بکات. ئیدی پیلانگێڕی لەمەدا سوودمەند بوو، بۆیە دەڵێت:" هەڤاڵێتی نیوەچڵ".

لەلایەکی دیکەشەوە ئاماژە بە"دۆستی ساختە"دەکات، دۆستە ساختەکان بۆ ئەوەی پیلانگێڕی پێکبێت کاریان کرد، هەڤاڵێتی (نیوەچڵ)یش بەتەواوی خاوەنداریێتی لەئەرك و بەرپرسیاریێتی نەکرد و نەیتوانی ئەو زەمینەیە نەهێڵێت کەوا پیلانگێڕیێتی تێیدا پێشدەکەوێت و بەتەواوی سەرۆکی کردۆتە ئامانجی خۆی. بۆیە دەڵێت:" هەڤاڵێتی

نیوەچڵ" ئیدی دەڵێت:"پیلانگێڕێتی لەسەر هەڤاڵێتی نیوەچڵ و دۆستایەتی ساختە پێشکەوت".

سەرۆك ئاپۆ بۆچی گووتی:" من لە (PKK) وازدێنم"؟ چونکە ئەو (PKK)یەی دەیخواست ئاوای بکات بەتەواوی ئاوانەبوو، لەم پێناوەدا هەموو هێز و توانای خۆی خستەگەڕ، بۆخۆی ڕۆژێك ژیانێکی شەخسی نەژیا، ژیانی خۆی بەتەواوی بۆ ئەوە تەرخانکرد کە ئەو (PKK)یەی دەیخوازێت، ئەو گەریلایەتییەی دەیخوازێت، ئەو خەباتەی دەیخوازێت پێشیبخات، بۆ ئەم مەبەستە ژیا، بۆیە ژیانی شەخسی لەخۆی حەرام کرد، بەم تێکۆشانەی زۆر هەنگاویشی پێشخست، بەڵام ئەو ئامانجەی لەپێش خۆی دانابوو بەتەواوی پێکنەهات. چونکە چەتەگەرێتی نەیهێشت پێکبێت. چەتەگەرێتی لەهەندێك ڕوومەوە (PKK)ی لە (PKK)یبوون دەرخست و چەمکی خۆیشی بەناوی (PKK)وە بڵاوکردەوە. بەمەش گورزێکی کوشندەی لە (PKK) وەشاند...

## ئایا مرۆڤ دەتوانێت هەموو شتێك بخاتە ئەستۆی چەتەگەرێتییەوە؟

بێگومان ئەمە ڕوویێکی مەسەلەکەیە... هەڵبەتە دووژمنیش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەوڵ و تەقەللای خۆی هەیە. وەکوتریش ئەو کادیرانە هەن کە بەرپرسیارێتی خۆیان پێکنەهێناوە. هەربۆیە چەتەگەرێتی لەهەموو ئەمانە سوودمەند بوو و ئەو تەخریباتانەی ئەنجام دا. بۆیە نەیهێشت سەرۆك ئەو (PKK) و گەریلایەتی و خەباتەی دەیخوازێت بەتەواوی و لەهەموو ڕوویێکەوە بالادەست بکات. سەرۆك زۆر هەوڵی دا کەوا تەڤگەر لەسەر بناخەی ڕەسەنی خۆی بەهێز بکات و بەڕێوەی ببات. بەڵام ئەمە بەتەواوەتی بەدینەهات. تەنانەت لەهەندێك ڕوومەوە بەپێچەوانە کەوتەوە. چەندە بەشەو و ڕۆژ هەوڵ و ڕەنجی دا کە ڕێگیری لەچەتەگەرێتی بکات و ئەو شتانەی لەدەرەوەی (PKK)ن و زەرەر لە (PKK) دەدەن و ئەو شتانەی (PKK) لەڕاستینەی (PKK) دوور دەخاتەوە نەهێڵێت، بینی کەهێزی خۆی بەشی ئەمە ناکات. واتا لێرەدا بەتەنیا دەمێنێتەوە، بینی بەمشێوەیە چەندە کاریش بکات ناتوانێت بەئامانجەکانی

خۆی بگات. چەندە خواستی ئەو کادیرانەی پەیوەستی تەڤگەرن لەمە تێبگەن و رۆڵی خۆیان بەتەواوی ببینن و لەگەڵ هەوڵ و رەنجی سەرۆك خۆی بکاتە یەك، بینی چەندە لەم پێناوەدا کاردەکات، کادیرانی پابەندی تەڤگەریش ناتوانن بەتەواوی لەمە تێبگەن و بەتەواوی خۆیان لەگەڵ هەوڵی سەرۆك بکەنە یەك. بۆیەش هەوڵ و رەنجی سەرۆك وەها دەمێنێتەوە و یان ئەنجام بەدەست ناخات یان بەنیوەچڵی دەمێنێتەوە، لەهەندێك رووەوە ئەنجام دەدات و لەهەندێك رووی تریشەوە ئەنجام نادات، بەمەش ناتوانێت رێ لەپێش تەخریباتەکان بگرێت.

هەڵبەتە پیلانگێڕییش لەجێبەجێکردن دایە، بێگومان لەدۆخێکی وەهادا هەوڵی سەرۆك سنووردار دەمێنێتەوە، ئەو خەتی چەتەگەرێتییە، (PKK) لە (PKK)یبوون دوور دەخاتەوە، (PKK) لە (PKK)دا دەکاتە کەمینە، لەدۆخێکی وەهادا چەتەگەرێتی زیاتر بەهێز دەبێت، چونکە پیلانگێڕی دەخوازێت تەڤگەر و گەل لەو خەت و رێبازە دەربخات. سەرۆك ئەم مەترسییەی بینی، بۆیە گووتی:" من لە (PKK) ئیستقالە دەکەم" بەمەش خواستی کادیرانی پابەند بە (PKK) بهەژێنێت و ئەو مەترسییە لەکادیران تێبگەیەنێت، بۆ ئەوەی ئەو کادیرانە خاوەندارێتی لەخەت و رێبازی تەڤگەر بکەن، بۆ ئەوەی کادیر لەوپەڕی هێزەوە لەدژی پیلانگێڕێتی رابوەستێت، تاکو ئەو زەمینەیەش نەهێڵێت کە پیلانگێڕێتی لێیەوە سوودمەند ببێت، ئەو زەمینەیە وشك بکات، چونکە بینی وەکوتر سەرەڕای هەموو هەوڵ و رەنجەکانی ئەنجام بەدەست ناخات، کادیر ناهەژێنێت و لەگەڵ رەنجی سەرۆك نابێتەیەك. چونکە دەیزانی کادیران بەسۆزداری پابەندن بە سەرۆکەوە، گەلیش پابەندە بە سەرۆکەوە، ئەگەر سەرۆك لەدۆخێکی وەها پیلانگێڕانەدا بڵێت:"من لە (PKK) ئیستقالە دەکەم". ئەوا هەژاندنێك لەسەر گەل و کادیران دروست دەکات، لەوانەیە ئەو کاتە کادیران و گەل بتوانن لەدژی پیلانگێڕی رابوەستن و لەدژی ئەو زەمینەیەی کە پیلانگێڕان دەتوانن لێیەوە سوودمەند بن، رابوەستن. بەمشێوەیەش ئەو کاتە دەتوانێت ئەنجامگیر ببێت. لەبەر ئەوە بوو سەرۆك وەهای گووت. واتا نەك دەیخواست لە (PKK) ئیستقالە بکات و لێی دەربچێت، چونکە رەنجێکی مەزنی لەنێو ئەم پارتییەدا هەیە و سەرۆك هەروا رەنج ناداتە لایەکەوە، نەخاسمە رەنجێکی وەها مەزنیش، ئومێدێکی وەها مەزن بەلاوە نانێت.

ئەو بەتەواوی بۆ ئەوەی جددییەتی رەوشەکە بەتێگەیاندن بدات، ئەوەی گووت. بێگومان ئەمە واتایەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی خۆی هەبوو...

**لەساتی قۆناخی پیلانگێڕییەکەدا، رێك کاتێك کە سەرۆك دەستگیرکرا (PKK) لەنێو شەشەمین کۆنگرەی خۆی دابوو. پێش کۆنگرەش ئەو پەیام و رێنماییانەی سەرۆك ئاپۆ لەرێگەی بەشداربوونی لەبەرنامەکانی تەلەفزیۆنەوە یان بەشێوازی دیکە دەیدا هەمووی زیاتر لەخاڵێکدا چڕ دەبووەوە کە" پێویستە (PKK) خۆی بگۆڕێت" ئیدی بە (PKK)یەکی بەمجۆرە کار و سەرکەوتن نابێت، بەڵام رێك لەدۆخێکی وەهادا لە (١٥)ی شوباتی (١٩٩٩)دا سەرۆك ئاپۆ دەستگیر دەکەن و تەسلیمی تورکیای دەکەنەوە. بەمەش پیلانگێڕی نێودەوڵەتی دەگاتە خاڵێکی ئەنجامگیر. لەو قۆناخەدا شەشەمین کۆنگرە سازدەدرێت. لەدۆخێکی وەهادا؛ کۆنگرە چۆن بەرێوە دەچێت و بەردەوام دەکات و چۆن بەئەنجام دەگات؟ کەشوهەوای نێو کۆنگرە چۆن بوو؟**

سەرۆك ئاپۆ نەك لە شەشەمین کۆنگرەدا، بەڵکو لەبنەڕەتدا لە پێنجەمین کۆنگرەوە، پرۆسەی گۆڕانکاری خستە بەردەم تەڤگەر، بەڵام ئەو گۆڕانکارییەی سەرۆك خستبوویە پێش پێنجەمین کۆنگرەوە، کۆنگرە بەتەواوی لێی تێنەگەیشت و جێبەجێی نەکرد، هەندێك گۆڕانکاری کەمی ئەنجام دا. چونکە تەڤگەر ئەو کاتە بۆ گۆڕانکاری ئامادە نەبوو، سەرۆك ئەو گۆڕانکارییانەی خستە بەردەم پێنجەمین کۆنگرەوە بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لەتەڤگەردا ئەنجام بدات، شەشەمین کۆنگرە بینی کە کەمێکی پێکهاتووە، خواستی لەو کۆنگرەیەدا ئەنجامی بدات و تەواوی بکات. بۆیە زیاتر قورسایی خستە

گۆڕانكاری، بۆ ئەوەی گۆڕانكاری ئەنجام بدرێت. نەك لەبەر ئەوەی پیلانگێڕی و دۆخی پیلانگێڕێتی هەبوو و خواستی گۆڕانكاری بكات تاكو پیلانگێڕییەكە پووچەڵ بكاتەوە. هەڵبەتە سەرۆك هەر لەپێنجەمین كۆنگرەدا لەساڵی (١٩٩٥)دا ئەو مەترسییانەی بینیبوو، هەر لەو كاتەوە و لەهەلومەرجی ئەو كاتەدا گۆڕانكاری بەپێویست زانیبوو، چونكە زانی كە تەڤگەر بەوجۆرە ناتوانێت بەئامانج بگات. هەڵبەتە تادەهات مەترسییەكانیش مەزنتر دەبوون، هەم لەدەرەوە مەترسییەكان مەزن دەبوون، هەمیش ئەو زەمینەیەی كەوا پیلانگێڕان لەناوەوە سوودی لێ دەبینن، لەئارادایە. ئەو چەمكانەی چەتەگەرێتی تەخریباتی دەكرد، هەم ناهێڵێت تەڤگەر لەسەر بناخەی خۆی بگاتە ئامانجەكانی، هەمیش لەدەرەوە سوود لەو دۆخە وەردەگرن كە چەتەگەرێتی لەناوەوە دروستی كردبوو، دەخوازن ئەو زەمینەیەش بەهێزتر بكەن بۆ ئەوەی زیاتر بێنە سەر تەڤگەر. سەرۆك ئەو كاتە بینیبووی، ئیدی خواستی بە پێنجەمین كۆنگرە رێگیری لێبكات، هەرچەندە لە پێنجەمین كۆنگرەدا هەندێك هەنگاوی گۆڕانكاری هاوێشتران، بەڵام ئەو هەنگاوە تێری ئەمەی نەدەكرد، ئەمەش رێی لەبەردەم پیلانگێڕی و چەتەگەریش نەگرت. بۆیە هەم پیلانگێڕێتی پەرەیسەند، هەمیش چەتەگەرێتی تەخریباتی مەزنتری كرد. بۆیە سەرۆك هەم گووتی:" من لە (PKK) ئیستقالە دەدەم"، و هەمیش گووتی:" پێویستە (PKK) لە شەشەمین كۆنگرەدا گۆڕانكاری بكات، بەمشێوەیە نابێت".

هەڵبەتە شەشەمین كۆنگرە لەدۆخی پیلانگێڕێتیدا ئەنجام دەدرا، سەرۆك نەیدەخواست هەروا یەكسەر كۆنگرە سازبدرێت و كۆتایی پێبێت، بەڵكو دەیخواست بەردەوام بكات و كۆبوونەوەكانی بەردەوامی پێبدرێت، بۆ ئەوەی بەشداربووانی كۆنگرە و تەواوی تەڤگەر چاودێری ئەو رەوشە جدیە بكەن كە لەئارادا بوو، تاكو بتوانێت بەگوێرەی ئەمە هەنگاو بهاوێژن. ئەگەر بكرێ رێگیری لە پیلانگێڕییەكە بكرێت، ئەگەر پیلانگێڕییەكە ئەنجامیش درا ئەوا تەڤگەر بەگوێرەی ئەوە بڕیار وەربگرێت و زەبری بەرنەكەوێت، بۆیە سەرۆك دەیخواست كۆبوونەوەكانی كۆنگرە بەردەوام ببێت، هەر تەنیا مەسەلەی گۆڕانكاری نەبوو، بەڵكو هەم هەنگاوی گۆڕانكاری هەبوو، هەمیش پیلانگێڕییەكی بەرچاو لەئارادا بوو، پێویستە تەڤگەر رووبەڕووی پیلانگێڕێتی ببێتەوە، ئەگەر بكرێ

بتوانێت پووچەڵی بکاتەوە، ئەگەر پووچەڵیش نەکرایەوە و پیلانگێڕییەکە ئەنجام درا ئەوا زەبری بەرنەکەوێت و تەدبیری پێویست وەربگرێت.

بێگومان سەرۆك چەندە لەم رووەوە هەوڵی دەدا، پیلانگێڕانیش بەهەمان شێوە کاریان دەکرد، بۆ ئەوەی پیلانگێڕییەکە بەئەنجام بگەیەنن. لەناو ئێمەشدا ئەو گروپەی چەتە سوودیان لەو دۆخە وەردەگرت. چونکە دەیانبینی پیلانگێڕییەك لەئارادایە و سەرۆك وەکو رابردوو ناتوانێت موداخەلە بکات، تادێت توانستی سەرۆك تەنگەتاو دەبێت، ئەوانیش ئەمەیان تەواو بەدەرفەت زانی و خواستیان لەدۆخێکی وەهادا بۆخۆیان هەنگاو بهاوێژن، بۆیە ئالۆزیشیان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی کۆنگرە لەسەر رۆژەڤی خۆی بەڕێوە نەچێت و لەرۆژەڤدا لەرێلادان و دوورکەتنەوە دروست ببێت، بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانن هەنگاو بهاوێژن، ئەوانەش ئەو حیساباتانەیان دەکرد، ئیدی ئەمەش پیلانگێڕییەکەی لەناوەوەی تەڤگەردا تەواو دەکرد. ئەمەش نەیدەهێشت کۆنگرە لەسەر پیلانگێڕییەکە راوەستە بکات و لەدژی پیلانگێڕی تەدبیر وەربگرێت. هەڵبەتە ئامانجی ئەوانیش ئەوە بوو، کە کۆنگرە نەتوانێت بە ساخی گفتوگۆ بکات و بڕیار وەربگرێت، بۆیە هەوڵیان دەدا ئالۆزی دروست بکەن، تاکو بتوانن هەنگاو بهاوێژن.

بۆ نموونە "د. سلێمان" و ئەوان زۆر بەئاشکرا ئەو هەنگاوەیان دەهاوێشت، "فەرهاد" و "بۆتان"یش هەوڵیان دەدا ئەوانەی کە پاشان هەڵاتن زیاتر بوروژێنن و ئەو زەمینەیە بەهێزتر بکەن؟ چۆن بەهانە بدەنە دەستی ئەوان، ئەوانیش وەها نزیك دەبوونەوە. بێگومان لەبنەڕەتدا "بۆتان" لەگەڵ ئەوان بوو و لەگەڵ گروپی "د. سلێمان" و ئەوان بوو، ئێمە ئەوەمان نەدەزانی. واتا ئەوەی لەبەرچاومان بوو "د. سلێمان" و ئەوان بوون. لەبنەڕەتدا ئەوەی ئەو گروپەی دەخستە جموجۆڵەوە "بۆتان" بوو. "بۆتان" لەو کۆنگرەیەشدا و لە حەفتەمین کۆنگرە و هەشتەمین کۆنگرەشدا دوای ئەوەش بەشاراوەیی زۆر شتی کرد، تا کۆتاییش خۆی شاردەوە، پاشان راستینەی ئەو ئاشکرا کرا، کە لەبنەڕەتدا لەناو پارتیدا ئەوەی چەتەگەرێتی پێشدەخات و بەهێزی دەکات و بەردەوام گروپی چەتەگەرێتی دەوروژێنێت و لەپشتیان رادەوەستێت و ئەوەی هەنگاو بەوان دەهاوێژێت دەرکەوت کە "بۆتان" ە. بۆیە ئیدی لە شەشەمین کۆنگرەدا ئەو گروپەی چەتەگەرێتی خواستی لەدۆخی پیلانگێڕێتیدا سوودمەند ببێت و هەنگاو

بهاوێژێت و تەنانەت خواستی بالأدەستێتی خۆیشی لەناو پارتیدا دروست بکات. هەرچەندە ئەمەیان بۆ نەچووەسەر و ڕێگیری لێکرا، چونکە بەتەواوی خۆی ڕێکخستە نەکردبوو، ئەوان دەیانخواست لەکۆنگرەدا هەنگاوی خۆ ڕێکخستە کردن بهاوێژن و خۆیان بەهێز بکەن، پاشانیش بالأدەستی خۆیان لەسەر پارتی دروست بکەن و پارتی بخەنە ژێرکێفی خۆیانەوە. بەڵام ڕێی لەپێش گیرا. شەشەمین کۆنگرە بەمشێوەیە سازدرا.

لەلایەکەوە؛ ئەو گروپەی چەتەگەرێتی سەرنج (ترکیز)ی کۆنگرەی پەرشوبڵاو دەکردەوە، بۆ ئەوەی کۆنگرە نەتوانێت لەسەر ڕۆژەڤی خۆی ڕاوەستە بکات و بەڕێوە بچێت. لەلایەکی دیکەشەوە؛ "کانی یڵماز" هەبوو، ئەو زانیاری هەڵەی بە کۆنگرە دا، کە گوایە" سەرۆك لەژێر مەترسیدا نییە، سەرۆك لەشوێنی ساخڵەم دایە" چونکە ئەو لە ئەورووپا هاتبوو و زانیاری بە کۆنگرە ڕاگەیاند و کۆنگرەش بەو زانیارییانە باوەڕی کرد، کاتێك کە سەرۆکیش لە کینیا دەستگیرکرا کۆنگرە هێشتا تەواو نەببوو، کەچی ئەویش دەیگووت:" سەرۆك لە یۆنانستانە" بۆیە ئێمە واماندەزانی سەرۆك لە یۆنانستانە، کاتێك کە گووتیان:" لە کینیا دەستگیرکراوە و تەسلیمی تورکیایان کردۆتەوە" ئێمە هەموو لەشوێنی خۆماندا وشك بووین، ئاشکرابوو کە ئەو زانیارییانەی داویەتی هەڵەبووە، ئەو کاتە هەندێك لەهەڤاڵانیش گووتیان:"ئەوە ئێمەی هەڵخەڵەتاندووە" و تەنانەت خواستیان بیکوژن، لەوانەیە زۆر کەس ئاگاداری ئەمە نەبێت، بەڵام ئێمە نەمانهێشت ئەوە ڕووبدات، ئێمە ڕێمان لەوە گرت. ئەو کاتەش ئێمە بە ئەومان گووت:" تۆ گووتت لە یۆنانستانە، کەچی لە کینیا دەرچوو، ئەمە چۆن بوو؟" دەیگووت:" کە من هاتم لە یۆنانستان بوو، من قسەم لەگەڵیدا کرد، سەرۆك لەوێ بوو و مەسەلەکە چارەسەر ببوو، هەڵبەتە لەبەر ئەمە من هاتم بۆ ئێرە، وادیارە لەدوای من دەریانخستووە و بۆ کینیایان ناردووە، ئەو کاتە ڕەوشێکی وەها لەئارادا نەبوو، دوای من ئەمە ڕوویداوە، من هیچ زانیارییەکم لەسەر ئەو شتانە نییە". ئیدی مەسەلەکەی وەها ڕوونکردەوە. ئێمەش گووتمان:" لەوانەیە وابێت" واتا ئەو ئێمە وا تێگەیشتبووین کە بەئەنقەست ناخەڵەتێنێت، بەڵکو لەوانەیە ئەو چووبێتە یۆنانستان و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجام دابێت و چاوپێکەوتنەکە باش دەربازبووە و سەرۆکیش چۆتە یۆنانستان.

چونکە گووتی:" سەرۆك هات و گەیشتە یۆنانستان و ئێستا لە یۆنانستانە، ئیدی لەوێش دەمێنێتەوە، هەندێك کەسیش بەڵێنیان داوە". گووتمان لەوانەیە ئەویان هەڵخەڵەتاند بێت، بەڵام پاشان ئاشکرابوو کە ئەو زانیاری هەڵەی بە ئێمە و کۆنگرە داوە، بەئەنقەستیش ئەوەی کردووە، بۆ ئەوەی کۆنگرە زێدە گفتوگۆی لەسەر نەکات و تەدبیر وەرنەگیردرێت و کۆنگرەش واتێبگات کە زێدە مەترسی لەئارادا نییە. هەڵبەتە وەهایشی لێهات. بۆیە کۆنگرە بەتەواوی لەرەوشەکە تێنەگەیشتبوو، لەو لەیستۆکەی ئەنجام دەدرا تێنەگەیشت. بۆیەش ئەو بڕیارەی پێویستبوو وەرگیرابایە و ئەو تەدبیرانەی کە پێویستبوو بدرابایە نەیتوانی وەریبگرێت. کاتێکیش کە پیلانگێڕی جێبەجێکرا و سەرۆك دەستگیرکرا و تەسلیمی تورکیاشیان کردەوە، ئیدی لەوێ ئێمە کۆتاییمان بە کۆنگرە هێنا و یەکسەر هەڵبژاردنی بەڕێوەبەرایەتیمان هێنایە پێشەوە، تاگو ئێمە بەڕێوەبەرایەتییەك هەڵبژێرین و یەکسەر بکەوینە نێو پراکتیك و جموجۆڵەوە، بۆ ئەوەی بتوانین چالاکی عەسکەری بەهێز بکەین. ئێمە بڕیارمان لەسەر ئەوە وەرگرت، بەمشێوەیە کۆنگرە کۆتایی پێهات.

بێگومان دوای کۆنگرە هەندێك کێشەی دیکەش دەرکەوتنەڕوو، زێدەتریش کێشەی ژن بوو. بۆچی ئەو کێشەیە دەرکەوتەڕوو؟ چونکە بڕیارێکی کۆنگرە پەسندکرا کە؛ پێویستە ژن پارتییەکی خۆی دروست بکات. ئەمەش هەنگاوێکی زۆر بەهێز بوو لەئاستی ڕێکخستنیی ژندا، ئەمە داخوازی سەرۆك و داخوازی کۆنگرەش بوو، ئەو بڕیارە وەرگیرا، پێویستبوو دوای کۆنگرەش ژنان کۆنگرەی خۆیان سازبدەن و خۆ بکەنە پارتییەك و وەك پارتییەك خۆیان رابگەیەنن. بێگومان کۆنگرەشیان سازدا و بڕیاری پارتیبوونیشیان دا. بێگومان تا ئەو کاتە سەرۆك راوەستەی لەسەر مەسەلەی ژن و تەڤگەری ژن و پەروەردەی ژن دەکرد، لەبەر ئەوەی سەرۆك لەسەر ئەو کارە راوەستەی دەکرد، کۆمیتەی ناوەندی زێدە راوەستەی لەسەر تەڤگەری ژن نەدەکرد. واتا ئەو ئەرکەی بەئەرکی خۆی نەدەزانی، دەیگووت:" سەرۆك ئەو ئەرکە بەڕێوە دەبات، با ئەو بەڕێوەی ببات، ئەگەر ئێمەش بخوازین ئەو ئەرکە پێك بێنین ئەوا لەوانەیە ئێمە بۆ سەرۆك و بۆ ژنیش کێشە و گرفت دروست بکەین". کۆمیتەی ناوەندی نەیدەخواست لەسەر ئەو ئەرکە راوەستە بکات و ئەو ئەرکەی بە سەرۆك سپاردبوو. تا ئەو کاتەی

سەرۆك بە دیلگیرا ژن تەنیا سەرۆکی بە موخاتەب دەبینی و ئەوەی لەهەموو روویێکەوە هاوکاری ژنی دەکرد سەرۆك بوو، ئەوەی هێز و وزە بەژن دەدات سەرۆك بوو. بەڵام کاتێك کە سەرۆك دەستگیر کرا، ئیدی کۆمیتەی ناوەندی ناچاربوو لەسەر هەموو کار و خەباتی ژنیش رابوەستێت، ئەو ئەرکەی سەرۆك بۆ ژن جێبەجێی دەکرد، ئیدی پێویستبوو کۆمیتەی ناوەندی جێبەجێی بکات. بێگومان کۆمیتەی ناوەندی ئەو کاتە لەسایکۆلۆژیای ژن تێنەگەیشت، واتا ژن لە چ سایکۆلۆژیایەکدا دەژیت، لەمەدا کەوتە نێو خەتاوە. خەتایەکە چی بوو؟ پێویستبوو کۆمیتەی ناوەندی لەوە تێگەیشتبایە کە تاکو ئێستا لەسەر خەباتی ژن راوەستەی نەکردووە و بۆ ژن هێز و وزەیەکی پێنەداوە، هەمووی سەرۆك ئەنجامی داوە، کاتێك کە سەرۆك دەستگیر کرا، ژن لەنێو سایکۆلۆژیایەکی بەمجۆرەدا دەژیا وەك بڵێت:" تاکو ئێستا ئەو کۆمیتەی ناوەندییە لەسەر ئێمە و خەباتی ئێمە راوەستەی نەدەکرد، کەچی بە دەستگیرکردنی سەرۆك لەسەر ئێمە راوەستە دەکات، لەوانەیە کۆمیتەی ناوەندی بخوازێت ئێمە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە". ئیدی ئێمە بەتەواوی لەم سایکۆلۆژیایە تێنەگەیشتین. لەمەدا کۆمیتەی ناوەندی کەوتە نێو هەڵەوە. بێگومان یەکسەر دوای دەستگیرکردنی سەرۆك، کۆمیتەی ناوەندی خواستی ئەو ئەرکەی کەوا سەرۆك بۆ ژن بەرێوەی دەبرد، پێکی بێنێت، بەڵام ژن کاردانەوەی نیشان دا، لە کاردانەوەکەشدا مافدار بوو؛ کاردانەوەیەکی وەهای نیشان دا:" تاکو ئێستا بۆچی لەسەر ئێمە راوەستەی نەدەکرد، بۆچی ئێستا راوەستەمان لەسەر دەکات؟". چونکە سەرۆك لە ژندا ئیرادەیەکی ئافراند بوو، ژن لەوە دەترسا کە کۆمیتەی ناوەندی ئەو ئیرادە ئازادە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. بۆیە کاردانەوەی نیشان دا. ئیدی کۆمیتەی ناوەندیش لەوە تێنەگەیشت و بە پێداگرییەوە خواستی ژن بخاتە سەر راستەرێی تەفگەرەوە، چونکە پیلانگێری لەئارادایە و دەخوازێت رێکخستن پارچە پارچە بکات و پەرشوبڵاوەی پێبکات، ژنیش باش لەدۆخی پیلاگێرێتی تێنەگەیشتبوو، تەفگەر چۆن بتوانێت لەبەرامبەر پیلانگێرییەکە رابوەستێت؟ ژن مەترسییەکانی سەر تەفگەری نەبینیبوو، تەنیا ئیرادەی خۆی بەبنەما وەردەگرت، واتا لەهەموو روویێکەوە لەگەڵ تەفگەردا خۆی نەدەکردە یەك، ئەمەش مەترسی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، بۆیە کۆمیتەی ناوەندی دەیخواست رێگیری لەو مەترسییە بکات، بۆیە

دەیخواست ژن لەهەموو رووێکەوە لەگەڵ تەڤگەر رابوەستێت. ژنیش تازە هەنگاوی پارتیبوونی هاوێشتبوو، دەیخواست هەندێك بەخۆیەوە خەریك ببێت، ئەمەش لەدۆخی پیلانگێرێتیدا مەترسی دروست دەکرد و کەمێك دوورکەوتنەوەی دەهێنایە ئاراوە، کۆمیتەی ناوەندیش دەیخواست رێ لەمە بگرێت، ئیدی ئەو نزیکبوونەوانە کێشە و گرفتی نایەوە. هەم لە بەرێوەبەرایەتی ژن هەڵە هەبوو، هەم لە کۆمیتەی ناوەندیدا هەڵە هەبوو، هەڵەی کۆمیتەی ناوەندی ئەوەبوو کە لە سایکۆلۆژیای ژن تێنەدەگەیشت، هەڵەکەی ژنیش لەوە دابوو؛ پیلانگێری و ئامانجی پیلانگێرێتی چییە لێی تێنەگەیشت، رۆڵی خۆی لەدۆخێکی وەهادا چییە تێنەگەیشت. بۆیە هەڵوێستەکەی کەمێك جیاوازی پێشخست، بەناوی ئیرادەی ئازادەوە.

ئەو گروپەی چەتەگەرێتی خواستی ئەو کێشەیەش بۆ خۆی بەکاربهێنێت، تاکو بتوانێت لەنێوان تەڤگەر و ژندا پارچەبوونێك دروست بکات. بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵ و تەقەللای زۆری دا، بە نهێنی هەڤالانی کچی وروژاند، لەناو ئەوانیشدا هەندێك هەبوون لەگەڵیاندا لەنێو پەیوەندیدا بوون، هەڤالانی ژنیان لەدژی تەڤگەر دەوروژاند، خواستیان بەتەواوی پچڕانێك دروست بکەن، ئەمەش لەو دۆخەدا کێشەیەکی مەزنی دروستکرد، بۆ ئەوەی ئێمە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەین ئێمە چووینە سەر کێشەکە و لەمەشدا هەندێك کەموکوڕی دەرکەوت. لەئاکامدا ئەگەر بەگوێرەی داخوازی تەڤگەر و تەڤگەری ژنیش نەبووبێت، بەڵام ئەو کێشەیە کەمێك چارەسەر بوو، واتا هەڵوێستی تەڤگەر و ژن بووە یەك هەڵوێست...

**بە دەستگیرکردنی سەرۆك ئاپۆ ئیدی تەواوی خەباتی دیپلۆماسی ئەم تەڤگەرە مرۆڤ دەخاتە نێو بیرکردنەوە و رامانەوە، ئەو پەیوەندییە دیپلۆماسییانەی تا ئەو کاتە بەرێوە چووبوون چۆن بووە و لەسەر چ بنەمایەك بەرێوە چووە تارادەیەك ئەو خەباتە دیپلۆماسییەی ئەنجام درابوو کەوتە ژێر پرسیارەوە. کەواتە مرۆڤ**

**دەتوانێت بڵێت جۆر و شێوازەکانی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانیش یەکێك لەو هۆکارانەی ئەنجامگیربوونی پیلانگێڕییە کە بوو...؟**

ئەمە هۆکارێکی سەرەکی نییە، بەڵام هەڵبەتە لە کار و خەباتی دیپلۆماسیدا ئەوە بەدیار کەوت کەوا دیپلۆماسییەکی تۆکمە بەڕێوە نەبراوە. وەکوتریش هەندێك لەوانەی کەوا کاری دیپلۆماسییان دەکرد کەوتبوونە خزمەتی دەوڵەتەکانەوە، هەمیش ئەو دەوڵەتانەی پیلانگێڕییەکە بەڕێوە دەبەن. بۆیە ئەو زانیارییانەی بەئێمەیان دەدا بەدیارکەوت کەوا هەندێك لەو زانیارییانە ڕاست نین. بێگومان لەبنەڕەتدا دوای ئەوەی پیلانگێڕییەکە ئەنجامگیر بوو، ئەو کاتە وەك کۆمیتەی ناوەندی تەڤگەر ئێمە لەو مەسەلەیە تێگەیشتین، هەڵبەتە تەڤگەر چووەسەر ئەو مەسەلەیە و خواستی حیساب و لێپرسینەوەش لەگەڵ هەندێکیاندا بکات، بۆیە ئەوانە هەڵاتن، ئەوانەی کە زیاتر تاوانبارن، کە بەئەنقەست پارتییان هەڵخەڵەتاندووە، ئەوانە سیخوڕییان کردبوو، ئەوانەی هەڵاتن... بۆ نموونە؛ هەندێکیش لەوانە سیخوڕێتییان نەکردبوو، بەڵام لەنزیکبوونەوەی ئەو دەوڵەتانە تێنەگەیشتبوون، بۆیەش هەڵخەڵەتێنرابوون، ئەوانەش بەمجۆرە خزمەتی پیلانگێڕێتییان کردبوو.

بۆنموونە؛ "عاکف حەسەن"ێك هەبوو لەکاری دیپلۆماسیدا، ئاشکرا بوو کەوا پەیوەندی لەگەڵ دەزگای ئیستخباراتی فەرەنسی و دەزگای ئیستخباراتی ئەمریکی (CIA)یەوە هەبووە و کەوتۆتە خزمەتی ئەوانەوە. "ئەمین"ێك هەبوو لە ئەڵمانیا، دەرکەوت کەوا کەوتۆتە خزمەتی دەزگای ئیستخباراتی ئەڵمانییەوە. "ماهیر"ێك هەبوو لە ڕوسیا، دەرکەوت کەوا هەم کەوتۆتە خزمەتی دەزگای ئیستخباراتی ڕوسییەوە، هەم خزمەتی مافیای ڕوسیاوە. واتا ئەو دەزگا ئیستخبارتییانە ئەوانەیان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئەوانیشەوە پیلانگێڕێتی بەڕێوە ببەن. واتا کەسانی بەمجۆرە بەتەواوی کەوتبوونە خزمەتی دەزگا ئیستخباراتییەکانەوە.

هەندێك هەڤاڵیش هەبوون، ئەوانە نەکەوتبوونە خزمەتی دەزگا ئیستخباراتییەکانەوە، بەڕاستیش نیازی ئەوان پاك و دروستبووە و بۆ تەڤگەر کاریان کردووە و دیپلۆماسییان

کردووە، بەڵام ئاستی تێگەیشتنی ئەوان بەشی ئەوەی نەکردبوو کە تێبگەن ئەو پەیوەندییانەی پێشدەکەون پەیوەندییەکی چۆنن؟ بەنیازپاکی خۆیان کەوتبوونە خزمەتی پیلانگێڕێتییەوە.

بۆنموونە؛ ئەوانە زۆر زانیارییان بە سەرۆك دابوو. سەرۆکیش لەبەر ئەوەی ئەوانە هەڤاڵن و بەوان باوەڕ دەکات و بەگوێرەی ئەمەش هەڵسوکەوت دەکات، پاشان سەرۆك دەبینێت کە ئەو زانیارییانەی بەویان داوە راست نین، هەڵبەتە ئیدی لە سوریا دەرکەوتووە و پیلانگێڕێتی لە جێبەجێ بوون دایە و رێگیری لێکردنی زەحمەتە. واتا تاکو سەرۆك لە سوریا دەرنەچوو بوو سەرۆکیش تەواو هەستی پێنەکردبوو، هەڵبەتە کۆمیتەی ناوەندیش هەستی پێنەکرد بوو، سەرۆك دوای ئەوەی لە سوریا دەرکەوت، ئینجا پێی زانی، کۆمیتەی ناوەندیش دوای ئەوەی سەرۆك دەستگیرکرا، دوای ئەوەی پەیوەندی سەرۆك لە زیندانەوە لەگەڵ تەڤگەر دروستبوو و ئەو زانیاری و هەڵسەنگاندنانەی پێشیخست ئەو کاتە کۆمیتەی ناوەندیش تێگەیشت کە کاری دیپلۆماسی چۆن بەڕێوە چووە!!. واتا دیپلۆماسییەکی راست بەڕێوە نەبراوە، بەناوی دیپلۆماسییەوە ئەو کارەی بەڕێوە چووە، بەشێکی کەوتۆتە خزمەتی تەڤگەرەوە و بەشێکیشی کەوتۆتە خزمەتی پیلانگێڕییەوە، ئەمە روون بووەوە.

واتا کاری دیپلۆماسی لە پێکهێنانی پیلانگێڕییدا زێدە رۆڵێکی نییە، بەڵام ئەگەر کەمیش بێت رۆڵێکی بینیوە. مرۆڤ دەتوانێت ئەمە بەئاسانی بڵێت. بۆیە ئەو کارە دیپلۆماسییەی تا ئەو کاتە بەڕێوە چووبوو، ئێمە موداخەلەمان کرد و خواستمان راستی بکەینەوە، ئیدی لەمەدا ئەوانەی کەوا بەئەنقەست سیخوڕییان کردووە هەڵاتن، ئەوانەی دیکەش بینیان کە بەنەزانییەوە کەوتوونەتە خزمەتی پیلانگێڕێتییەکەوە لەواندا هەستی خۆتاوانبار بینین پێشکەوت، هەڵبەتە لەهەندێکی دیکەشیاندا شکستیش روویدا، ئێمە خواستمان کە سەرلەنوێ کاری دیپلۆماسی لەسەر بنەمایەکی نوێ پێشبخەین.

## بەدەستگیرکردنی سەرۆك ئاپۆ رەوشی بەڕێوەبەرایەتی و تەڤگەر و کادیران و هەڵوێستی گەل چۆن بوو؟ هەروەها ئەو مەیلانەی دوای

## ئەو دەستگیرکردنە دەرکەوتنە ڕوو چیبوون؟ ئەو ئەگەرانەی ئەو کاتە تەڤگەر شیمانەی دەکرد چیبوو؟

بێگومان کەسێك باوەڕی نەدەکرد کە بە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی سەرۆك ئاپۆ دەستگیر بکرێت و تەسلیم بە تورکیا بکرێتەوە. کاتێك کە ئەو پیلانگێڕییە بەوجۆرە پێکهات کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هەموو کەسێك کرد، ئەو کاریگەرییەی لەسەر گەل دروستبوو، ئەوە بوو، داخوا تەڤگەر بەردەوام دەبێت یان نا؟ دوودڵییەکی بەمجۆرە لەهەندێك لەخەڵکدا دروستبوو، لەزۆربەی خەڵکدا لەدژی پیلانگێڕی ڕاوەستان و خاوەندارێتییان لە سەرۆك و تەڤگەر کرد. دەتوانم بڵێم لەهەموو بەشەکانی کوردستان و لەدەرەوەی وڵات گەل لەدژی پیلانگێڕی ڕابووە سەرپێیان، زۆر سەرهەڵدان و چالاکی ئەنجام دران، تەنانەت لەرۆژهەلاتی کوردستاندا نزیکەی پەنجا کەس لەخەڵك شەهید بوون، سەرهەڵدانێکی مەزن بەرپابوو. کەسێکیش وەها باوەڕی نەدەکرد کە بە دەستگیرکردنی سەرۆك گەل بەمشێوەیە ڕاببێتە سەرپێیان. تەنانەت ئەو کاتە"مادلین ئۆلبرایت"ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا گووتی:" ئێمە وەها مەزندەمان نەدەکرد...!!" بەگوێرەی ئەوان ئەگەر سەرۆك دەستگیر بکرێت ئەوا ئیدی ئیرادەی گەل و ئیرادەی تەڤگەر دەشکێت و بەئاسانی ئەنجامگیر دەبن، مەزندەیەکی وەهایان هەبوو، کاتێك کە لەتەواوی کوردستان گەل ڕابووە سەرپێیان. ئەوانیش شۆك بوون، بۆیە دەیگووت:" ئێمە مەزندەمان نەدەکرد ئەنجامی بەو شێوەیە دەربکەوێتە ڕوو". لەهەموو شوێنێك گەل هەموو شتێکی خستە بەرچاو و ڕابوونە سەرپێیان. واتا لەئاستێکی زۆر بەرزدا گەل خاوەندارێتی لە سەرۆك و تەڤگەر کرد، خاوەندارێتی لەخۆی کرد. لەناو گەلدا زۆر کەسی ولاتپارێز بۆ سەرۆك خۆیان سووتاند، هەم بەرلەوەی دەستگیریش بکرێت، هەمیش دوای ئەوەی دەستگیرکرا، بەدەیان کەس خۆیان سووتاند.

مرۆڤ ئەگەر لەمێژوو بڕوانێت، دەبینێت کە؛ ئەم هەموو سەرۆکە دەرکەوتوون، چەندین پێغەمبەر دەرکەوتوون، کەسانێك کەوا لەزانستدا هەنگاوی مەزنیان هاوێشتووە دەرکەوتوون، هیچ کاتێك بۆ یەکێك لەوانە کەسێك خۆی نەسووتاند، لەرووداوی

دەستگیرکردنی سەرۆکدا تاکو ئێستا نزیکەی (٨٥) کەس خۆیان سووتاندووە. ئەمە شتێکە هەرگیز رووی نەداوە، شتێکە لەمێژوودا هیچ روووینەداوە.

بۆچی ئەو هەموو کەسە خۆیان سووتاند...؟ بەمە هەم پابەندبوونی خۆیان بۆ سەرۆك نیشان دا، هەم پیلانگێڕییان لەخۆیاندا سووتاند و تواندیانەوە، هەمیش پەیامێکی بەهێزیان بە پیلانگێڕان دا؛ " ئەگەر دان بەئێمەدا نەنێن و دان بەئیرادەی ئێمەدا نەنێن و بەمشێوەیە بێنە سەر ئێمە و پیلانگێڕێتی لەسەر ئێمە بەردەوام بکەن، چۆن ئێمە خۆمان دەسووتێنین ئەوا ئێوەش دەسووتێنین" ئەو پەیامەیان بە پیلانگێڕان دا. لەقۆناخی پیلانگێڕییەکەدا، چ بەرلەوەی سەرۆك دەستگیر بکرێت و چ لەدوای دەستگیرکردنەکەش زۆر کەسی وڵاتپارێز خۆیان کردە تۆپێك ئاگر، ئەو چالاکییەی ئەوان گوزارشت لەمە دەکات، خەڵکی ئێمە گووتیان:" ئێوەی پیلانگێڕ و هیچ کەسێکی تریش ناتوانێت خۆرمان تاریك بکەن" چونکە سەرۆکیان بۆخۆیان وەك "خۆر" دەبینی و بۆ خۆیان بەسەرچاوەی رووناکیان دەبینی، بۆ خۆیان وەك سەرچاوەی هێزیان دەبینی. پیلانگێڕان دەیانخواست سەرچاوەی رووناکی، هێز و وزە، زانایبوون و هوشیاری، باوەڕی و مۆراڵی ئەو گەلە لەناو ببەن. بۆیە گەل لەدەوروبەری سەرۆك بووە پەرژینێکی ئاگر، خواستی بەمجۆرە خۆی بپارێزێت، خاوەندارێتی کردن لە سەرۆك خاوەندارێتی کردن بوو لەخۆی، بۆیە گەل هێندە خۆی کردە تۆپێك ئاگر، هێندە خۆی دەسووتاند، هێندە لەهەموو شوێنێك رابووە سەرپێیان.

لەمێژووی گەلی کورددا، دەتوانم بڵێم:" ئەمە هەنگاو و قەڵەمبازێکی نوێ بوو، کولتوورێکی نوێ بوو، ئەخلاقێکی نوێ بوو، ئیدی ئەوەی کە سەرۆك بەساڵان لەناو کۆمەڵگای کورددا چاندبووی بەمشێوەیە بەرهەم و ئەنجامی خۆی دەدا. بێگومان لەناو گەلدا لەشتێکی دیکەشدا دوودڵی هەبوو، واتا سەرۆك دەستگیر کرا، ئایا تەفگەر لەسەر پێیان دەمێنێتەوە یان نا؟ دوودڵییەکی وەهایان هەبوو، چونکە گەل هەموو شتێکی خۆی خستبووە ناو ئەو تەڤگەرەوە، چارەنووسی خۆی بەم تەڤگەرەوە پەیوەست کردبوو، پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی مەزن لەدژی ئەم تەڤگەرە بەڕێوە دەچوو، ئیحساسی گەل بەهێز بوو و لەوە تێدەگەیشت کەوا یاری بەچارەنووسی ئەو دەکرێت، دەخوازن هەموو رەنجی ئەو گەلە بسڕنەوە و بەرخۆدانی ئەو گەلە دابمرکێننەوە.

دەخوازن جارێکی دیکە دڵ و مێشکی ئەوان سڕبکەن و رەشی بکەن. ئیدی بۆیە دوودڵییەك لەئارادا بوو، داخوا لەدژی ئەو پیلانگێڕییە کە سەرۆکیش تێیدا دیل کەوتووە، تەڤگەر هەڵوێست چی دەبێت، دەمێنێتەوە و بەرخۆدان دەکات یان نامێنێتەوە و تەسلیم دەبێت؟ ئایا ئەگەر بخوازێت بمێنێتەوە دەتوانێت یان ناتوانێت؟ هێزی خۆی بەشی ئەمە دەکات؟ دڵەڕاوکێیەکی وەها هەبوو، ئیدی ئەو رابوونەی گەل، بۆ ئەوە بوو تاکو هێز و وزە بە تەڤگەر بدات، تاکو تەڤگەر بتوانێت لەدژی پیلانگێڕییەکە رابوەستێت، کە باوەڕی، مۆراڵ و پشتگیری گەل ببینێت و بتوانێت لەدژی پیلانگێڕییەکە رابوەستێت. بۆیە ئەو رابوونە رابوونێکی مێژوویی بوو.

هەروەها دوای دیلکردنی سەرۆك لەکوردستاندا گەلێك گەنج و لاو تەڤلی تەڤگەر بوون، ئەمەش بووە وەڵامێك بۆ پیلانگێڕان. واتا لاوان بینیان کە پیلانگێڕێتی دەخوازێت ئیرادەی تەڤگەر و گەل بشکێنێت، بینیان لەدژی ئەمەش تەڤگەر و گەل لەبەرخۆدان دایە، لاوان خاوەندارێتیان لە تەڤگەر و گەل کرد. بۆیە تەڤلیبوونێکی مەزن هاتە ئاراوە، بەسەدان لاو تەڤلی بوون، ئیدی ئەو تەڤلیبوونە بووە وەڵامێك بۆ پیلانگێڕی، لاوان بەم تەڤلیبوونەی خۆیان لەبەرامبەر پیلانگێڕێتیدا نەیانهێشت پیلانگێڕێتی سەربکەوێت و بەئامانجەکانی خۆی بگات، تەڤلی تەڤگەر و گەریلا دەبوون، گەریلایان بەهێزتر کرد، پیلانگێڕێتییان کردە هۆی شکاندنی خودی پیلانگێڕییەکە، کردیانە هۆکاری مەزنکردنی تەڤگەر و هێزەکانی گەریلا، تاکو بەرخۆدان مەزن بکەن، لاوان بەمشێوەیە هەڵوستەیان لەبەرامبەر پیلانگێڕێتی کرد. هەر لەباشووری خۆرئاوای کوردستاندا، یەکسەر دوای پیلانگێڕییەکە نزیکەی هەزار گەنج تەڤلی ریزەکانی تەڤگەر و گەریلا بوون، ئەمەش وەڵامێکی بەهێز بوو، چۆن لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا کە کەسێك مەزەندەی نەدەکرد، گەل رابووە سەرپێیان و نزیکەی پەنجا شەهیدی دا و سەرهەڵدانێکی بەهێزی پێشخست. لەباشووری خۆرئاواشدا نزیکەی هەزار گەنج تەڤلی ریزەکانی گەریلا بوون، بەتەڤلیبوونی خۆیان وەڵامێکی دژبەرانەی پیلانگێڕێتییان دایەوە. ئەو تەڤلیبوونەی لاوان لەدژی پیلانگێڕان بەرخۆدانێك بوو، وەڵامێك بوو. لەبەشەکانی دیکەی کوردستانیشدا تەڤلیبوون هەبوو، بەڵام بەقورسایی لەو بەشەدا تەڤلیبوون پێشکەوت، بۆچی؟ چونکە سەرۆك ساڵەهای ساڵ لە سوریا مابووەوە،

چووبووه نێو گەلەکەمان لە باشووری خۆرئاوای کوردستان و لەناو گەلدا خەباتی کردبوو، بەسەدان کەسی ولاتپارێز لەنزیکەوە سەرۆکیان ناسیبوو، خەبات و رەنج و کەسێتی ئەویان ناسیبوو و بەمەش خۆی ناسیبوو، بۆیە بەمشێوەیە خاوەندارێتی لە رەنجی سەرۆك کرد، چونکە لەرێگەی سەرۆکەوە باشووری خۆرئاوای کوردستان راببووە سەرپێیان، کاتێك کە سەرۆك بە پیلانگێرییەك دەستگیرکرا، باشووری رۆژئاوای کوردستانیش بەتەڤلیبوونی خۆی خاوەندارێتی لەسەرۆك کرد و بەوپەڕی هێزەوە لەدژی پیلانگێرێتی راوەستا.

بێگومان لەناو دۆستەکانی تەڤگەریشدا دوودڵییەك هەبوو؛ ئایا تەڤگەر لەبەرامبەر پیلانگێرێتی خۆی دەپارێزێت یان نا؟ بەردەوام دەکات یان نا؟ لەنێو زۆربەشیاندا دوودڵییەکی وەها روویدا.

دەستگیرکردنی سەرۆك کاریگەری لەسەر تەڤگەریش کرد، بە کادیر و شەرڤانیشەوە، هەندێکیان دەیانگووت:" ئیدی سەرۆك دەستگیر کراوە، پیلانگێرییەکی نێودەوڵەتی مەزن لەسەر ئێمە بەڕێوە دەچێت... ئیدی هەموو شتێك کۆتاییهات، ئێمە ناتوانین لەدژی پیلانگێڕی رابوەستین و هەنگاو بهاوێژین، ئیدی پیلانگێڕی ئێمەی هەموو کردۆتە ئامانج و دەخوازن هەموومان تەسفیە بکەن و بمانکوژن، پێویستە ئێمە هەر چۆنێك بێت گیانی خۆمان رزگار بکەین". چەمکێکی بەمجۆرە لەلای هەندێك لەکادیران و شەرڤاناندا هەبوو. زیاتریش گروپی چەتە ئەو چەمکەی پەرەپێدەدا، دەیبینی کە بەدەستگیر کردنی سەرۆك ئاپۆ هەموو کەسێك شۆك بووە، دەیخواست سوود لەو دۆخە وەربگرێت، بێباوەڕی و بێ مۆڕاڵی تەشەنە پێبدات، بۆ ئەوەی پەرشوبلاوی لەنێو تەڤگەردا پێشبخات. کاری ئەوانە بەتەواوی ئەوەبووە کە چۆن مۆڕاڵ و باوەڕی لە کادیران و شەرڤاناندا بشکێنن و وابکەن کە دەستبەرداری تەڤگەر ببن، دەیانخواست وەها شڵەژانێك بخەنە نێو تەڤگەرەوە، بخەنە نێو کادیران و شەرڤانانەوە. بێگومان تەڤگەر لەدژی ئەمە راوەستا و نەیهێشت ئەوانە زێدە تەخریبات دروست بکەن.

لەلایەکی دیکەوە؛ لەنێو کادیران و شەرڤاناندا دوودڵییەك هەبوو، وەك چۆن لەناو گەل و دۆستاندا دوودڵییەك هەبوو؛ داخوا تەڤگەر دەتوانێت خۆی بپارێزێت؟ بەردەوام بکات یان نا؟ واتا لەنێوان تەڤگەر و پیلانگێڕێتیدا مابوونەوە، داخوا تەڤگەر سەردەکەوێت

یان پیلانگێڕێتی سەردەکەوێت؟ ئەمەش بێ باوەڕ... و بێ مۆڕاڵییەکی لەکادیراندا دروستکردبوو، تا ماوەیەکی دوور و درێژیش نەیتوانی خۆی لەژێر ئەو کاریگەرییە رزگار بکردبایە. تەڤگەر لەدژی ئەمەش راوەستا و هەوڵیدا کە بۆ ئەوەی ئەو کاریگەرییە بشکێنێت و باوەڕی و مۆڕاڵ و رۆحی ئەوان بەهێز بکات. ئیدی بەخەباتی بێوچان ئەو کاریگەرییەش سڕایەوە، لەکادیراندا باوەڕی و مۆڕاڵ بەهێز کرایەوە.

لەناو بەشێکی تەڤگەریشدا پیلانگێڕییەکە بووە هۆی ئەوەی لەدژی پیلانگێڕییەکە بەهێزتر رابوەستێت و بەپێویستی دەبینی کە تەڤگەر بەهەموو هێز و توانایەکییەوە لەدژی پیلانگێڕی رابوەستێت. مادام پیلانگێڕییەکە دەخوازێت ئێمە تەسفیە بکات، پێویستە ئێمەش ئەوە بکەینە هۆی بەرخۆدانێکی بەهێز و تۆکمە. چونکە ئێمە ئەوە لە سەرۆك ئاپۆ تێگەیشتبووین؛ پێویستە خودی پیلانگێڕییەکە بکاتە فاکتەری پووچەڵ کردنەوەی پیلانگێڕی و تەڤگەر بەهێز بکات. هەر خیانەتێك پێویستە ببێتە فاکتەری ئەوەی خیانەت بنبڕ بکەیت و تەڤگەر بەهێزتر بکەیت. ئێمە ئەوەمان لە سەرۆك ئاپۆ وەرگرتبوو و لێی فێر ببووین و تێگەیشتبووین. شۆڕشگێڕێتی ئەم تەڤگەرە بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو، چونکە کاتی خۆی هەڤاڵ **"حەقی قەرار"**یش بە پیلانگێڕییەك شەهید کرا، سەرۆك ئاپۆ ئەو پیلانگێڕییەی وەرگەڕاندە هاوێشتنی پێنگاڤ (هەنگاو)ێکی مێژوویی مەزن کە پارتیبوونی تەڤگەر بوو.

بۆیە پێویستبوو پیلانگێڕی نێودەوڵەتیش ببوایە هۆی ئەوەی ئێمە پیلانگێڕییەکە پووچەڵ بکەینەوە و تەڤگەر بەهێز بکەین و لەئامانجی خۆی دوور نەکەوێتەوە و لەسەر بناخەی خۆی بەڕێوە بچێت. نزیکبوونەوەی هەندێك لەکادیرانیش لەسەر ئەو بنەمایە بوو. ئیدی بە دەستگیرکردنی سەرۆك تەڤگەر و گەل کێشەیەکی بەمجۆرە ژیا. چونکە تەڤگەریش مەزەندەی ئەوەی نەدەکرد کە بەمشێوەیە پیلانگێڕییەکی وەها ئەنجام بدرێت و سەرۆك دەستگیر بکرێت. هەم تەڤگەر و هەمیش گەل بەبێ ئامادەکاریی رووبەڕووی ئەو پیلانگێڕییە ببوونەوە. کەچی سەرۆك بەرلەوە دەیخواست تەڤگەر و گەلیش بۆ رۆژێکی وەها ئامادەبکات، هەرچەندە خواستی ئامادەشیان بکات، تەڤگەر و گەل زێدە باوەڕی نەدەکرد کە گەلەکۆمەیەکی وەها لەدۆخێکی وەها ئەنجام دەدرێت. بۆیە گەل و تەڤگەریش کاتێك ئەو پیلانگێڕییە پێکهات بێ ئامادەکاری بوون،

لەبەرئەوە شۆكێكی مەزنیان دەربازكرد، بەهۆی ئەو شۆكەوە بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ نەیاندەتوانی دەربازی بكەن. ئیدی لێرەدا پیلانگێڕییەكە دەیخواست ئەنجامگیر ببێت.
كاتێك كە پیلانگێڕان سەرۆكیان دەستگیركرد و لە ئیمرالی زیندانیان كرد، پڕوپاگەندەیەكی زۆریشیان كرد:" ئیدی تەواو، وەرن تەسلیم ببنەوە" ئەو پڕوپاگەندانەیان دەكرد. لەلایەكی دیكەشەوە ئەمریكا، ئینگلتەرا و ئیسرائیل بەرێی هەندێك كەناڵەوە پەیامیان بۆ ئێمە (بەرێوەبەرایەتی تەڤگەر) دەنارد، دەیانگووت:" ئێوە پێویستە دەستبەرداری لە سەرۆك ئاپۆ بكەن، ئیدی ئاپۆ تەواو، پێویستە ئێوە سەرۆكێكی نوێ بۆخۆتان دەستنیشان بكەن و ئەو گۆڕانكارییانەی ئێمە دەیخوازین ئەنجامی بدەن، ئەو كاتە شانسی ژیانتان بۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر ئێوە وەها نەكەن ئەوا تا شەش مانگی دیكە ئێمە ئێوە تەسفیە دەكەین..." بەوانە دەیانخواست ئێمە بترسێنن و تەسلیممان وەربگرن، ئامانجی ئەوان لەناردنی ئەو پەیامانە ئەوە بوو، بۆ ئەوەی تەڤگەر و ئەو جەماوەرەی لەژێر كاریگەری تەڤگەر دایە بەتەواوی بخەنە خزمەتی خۆیانەوە، ئەو تەڤگەرە لەناو ببەن، ئەو كوردەی سەرۆك ئاپۆ ئافراندی لەناوی ببەن، كوردێكی وەها دروست بكەن كە شەو و رۆژ لەخزمەتی ئەواندا بێت. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵ و تەقەللایان دەدا، چونكە دەیانزانی بە دەستگیركردنی سەرۆك هەندێك دوودڵی و بێباوەڕی و شۆكبوون هەم لەناو گەل و هەمیش لەناو كادیرانی تەڤگەردا، لەئارادایە، ئیدی چیبكەن بۆ ئەوەی ئەمە بگەیەننە رادەی تەسفیەكردن و تەسلیم وەرگرتن؟ لەم پێناوەدا كاریان دەكرد و ئەو پڕوپاگەندە و پەیام ناردنەشیان لەچوارچێوەی ئەو مەبەستە دابوو، بۆ ئەوەی تەڤگەر نەتوانێت رووبەڕووی ئەو پڕوپاگەندانە ببێتەوە و خۆی بپارێزێت و پووچەڵیان بكاتەوە، خواستیان ئەو توانستەی لەدەست تەڤگەریشدا بوو نەهێڵن، خواستیان دەرگای كەناڵی راگەیاندن لەسەر تەڤگەر دابخەن. بۆ ئەوەی یەكلایەنە پڕوپاگەندەی خۆیان پێشبخەن، تاكو بەئاسانی ئەنجام بەدەستبخەن.
بێگومان تەڤگەر هەوڵیدا كە بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بپارێزێت و ئەو شۆكبوونەی لەئارادایە دەربازی بكات، ئەو دوودڵییەی كەوا هەیە بەلاوەی بنێت و پیلانگێڕییەكە بكاتە فاكتەری پووچەڵ كردنەوەی خودی پیلانگێڕییەكە. تەڤگەر راوەستەی لەسەر ئەمە كرد. چونكە زۆر هێز و لایەن دەستیان دەخستە ناو تەڤگەرەوە، بۆ ئەوەی یان

تەڤگەر بەتەواوی بخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە، ئەگەر ئەمەشیان پێنەکرێت ئەوا پارچە پارچەی بکەن و هەندێك لەو پارچانە بخەنە ژێر کاریکەری خۆیانەوە. لەم رووەوە هەندێك مواخەلەی وەهایشیان کرد. ئەمە مەترسییەکی مەزنی بۆ تەڤگەر دروست دەکرد، پێویستبوو تەڤگەر هەم لەدژی ئەو موداخەلانە راوەستابایە، بۆ ئەوەی بتوانێت یەکێتی خۆی بپارێزێت، هەمیش پێویستبوو لەدژی پیلانگێڕییەکە رابوەستابایە و باوەڕی و مۆراڵی لەناو خۆی و گەلدا بەهێز و تۆکمە بکردبایە، بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر مەترسییەوە. بۆیە ئەو کاتە بەڕێوەبەرایەتی تەڤگەر هەم بۆ دەرەوە و هەمیش بۆ ناوخۆی خۆی لەدژی ئەو چەمك و دەستێوەردانانەی دەخوازێت تەڤگەر پارچە بکات و تەسفیەی بکات راوەستا، لەدژی دوودڵی و بێ باوەڕی راوەستا، هەموو تەرکیزی بەڕێوەبەرایەتی لەسەر ئەوە بوو کە؛ بتوانێت یەکێتی تەڤگەر بپارێزێت و تەڤگەر لەو چەمك و دەستێوەردانانەی تەسفیەگەران رزگار بکات و ئاستی شەڕ بەرزتر بکاتەوە، تەڤگەر لەسەر ئەمە راوەستەی دەکرد.

بێگومان چەمکی چەتەگەریێتی و ئەوانەش کە نوێنەرایەتی ئەو چەمکەیان دەکرد (د. سلێمان و زەکی بچووك و ئەوانە) خواستیان لەو دۆخەدا هەڵمەتێك دژ بە تەڤگەر بکەن، لە شەشەمین کۆنگرەدا خواستیان ئەمە بەڕێوە ببەن، بەڵام نەیانتوانی، ئەمجارە خواستیان دوودڵی و بێباوەڕی بەهێز بکەن و تەڤگەر بەرەو تەسفیەبوون ببەن، تەڤگەر بەسەریاندا چوو، بینیان کە ناتوانن شتێك بکەن، هەڵاتن. پاشان خواستیان لەدەرەوە و بەهاوکاری هەندێك هێز و لایەن، جا چ دەوڵەت بن یان پارتی و رێکخراو بن، زەبرێك لەتەڤگەر بدەن، بێگومان تەڤگەر بەباوەڕییەوە لەدژی ئەمە راوەستا و نەیانتوانی تەخریباتێکی مەزن بکەن. ئەوەی لەبنەڕەتدا ئەو گروپەی دەخستە جموجۆڵەوە "بۆتان" بوو، "بۆتان" هەتا کۆتایی بەشاراوەیی ئەمەی دەکرد، کاتێك کە بینی ئەو گروپە ناتوانێت زەبر لەتەڤگەر بدات، واتا ناتوانێت تەڤگەر بخاتە دەستی خۆیەوە، خۆی شاردەوە. ئەو "د.سلێمان" و "زەکی بچووك"ی خستبووە جوڵەوە، ئەوانەش شکستیان هێنا و هەڵاتن و چوونە لای (ی ن ك). خواستیان بەهاوکاری (ی ن ك) هەندێك هێرش بکەن و زەبر لەتەڤگەر بوەشێنن، لەم پێناوەشدا زۆر هەوڵیاندا دیسان بێ ئەنجام مانەوە. تەنانەت دوای ئەمە "زەکی بچووك" گووتبووی: "بۆتانیش لەگەڵ ئێمە بوو،

بۆتان خۆی ئێمەی خستە جموجوڵەوە، ئێمە هاتین (هەڵاتین) کەچی ئەو نەهات"، بێگومان "بۆتان" خۆی شاردبووەوە، چونکە بینیان سەرنەکەوتوون، لەبەرئەوە خۆی شاردەوە. ئەگەرنا ئەویش لەناو پیلانگێڕییەکە دابوو، هەمیشە ئەوانەی پیلانگێڕی ئەنجام دەدەن تاکو پیلانگێڕییەکە سەرنەکەوێت خۆیان ئاشکرا ناکەن.

بۆ نموونە؛ لەزۆر پیلانگێڕییدا، ئەوانەی پیلانگێڕییەکە بەڕێوە دەبەن دیار نین، بەڵام پاشان خۆیان ئاشکرا دەکەن. واتا کە پیلانگێڕییەکەیان سەرکەوت خۆیان لەپشت پەردەوە ئاشکرا دەکەن، هەڵبەتە کە سەرکەوتنیشیان بەدەستنەهێنا خۆیان ئاشکرا ناکەن و خۆیان دەشارنەوە، بۆ ئەوەی بتوانن بەشێوازێکی دیکە پیلانگێڕێتی خۆیان بەردەوام بکەن، "بۆتان"یش وەهای دەکرد. ئیدی بۆیە "زەکی بچووك" ئەو ئاخافتنەی کردبوو، گووتبوی:" ئێمەی خستە جموجوڵەوە ئێمە هاتین و دەبووایە خۆیشی هاتبایە کەچی نەهات". بێگومان وایە، چونکە ئەو پیلانگێڕییەی "بۆتان" پەرەی پێدەدا بێئەنجام مابووەوە، بۆیە ئەو کاتە هەڵنەهاتبوو و خۆی لەناو تەڤگەردا شاردبووەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت سەرلەنوێ پیلانگێڕێتی دیکە پەرە پێبدات، ئەزموونیش لەو پیلانگێڕییەی تری وەربگرێت کەئەنجامی داوە و تێیدا سەرنەکەوتووە، تاکو بتوانێت سەرلەنوێ پیلانگێڕێتییەکی دیکە ئەنجام بدات. بۆیە هەڵنەهاتبوو.

دوای دەستگیرکردنی سەرۆك؛ "فەرهاد" و "بۆتان" ڕەوشەکەیان بۆخۆیان بەدەرفەتێکی مەزن زانی؛ تا ئەو کاتە لەدژی سەرۆك کاریان دەکرد، دووژمنایەتیان دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرۆك باڵادەست بوو نەیاندەتوانی بەئاشکرا ئەمە بکەن. کە سەرۆك دەستگیرکرا ئەمەیان بۆخۆیان بە هەلێك زانی، پیلانگێڕەکانیش پەیامیان دەنارد و دەیانگووت:" ئاپۆ کۆتاییهات، سەرۆکێکی نوێ بۆخوتان دەستنیشان بکەن" زۆر بەئاشکرا خیتابی "فەرهاد"یان دەکرد، کەوا بکەوێتە نێو جموجوڵەوە و ئەوان پشتیوانی لێدەکەن، کاتێك ئەو پەیامانەشیان وەرگرت، بە دەستگیرکردنی سەرۆکیش بۆشاییەك دروست ببوو، ئەو ئاڵۆزییەش لەئارادا بوو، ئەو چەمکانە تەشەنەیان سەندبوو، ئەو دوودڵیانەی هەبوون، ئەو موداخەلانەی لەسەر تەڤگەر دەکران، بەمانە هەمووی خواستیان دەرفەت وەربگرن کە تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، ئیدی کەوتنە نێو هەڵپەی ئەمەوە.

کاتێك کە سەرۆك دەستگیرکرا من مەزندەی ئەوەم دەکرد کە ئێمە بکەوینە نێو کێشە و گرفتی بەمجۆرەوە. بۆچی؟ چونکە هێشتا لە "زەڵێ" ئەو کاتە سەرۆك بەکردار لەسەر تەڤگەر بوو، تەڤگەر بەهێز بوو "فەرهاد" بەهاوکاری هەندێك پارتی و دەوڵەت لەدژی سەرۆك راوەستا و خواستی تەڤگەر بخاتە نێو دەستی خۆیەوە. ئەوەی لەهەلومەرجی ئەو کاتەدا ئەو هەنگاوەی لەدژی سەرۆك و تەڤگەر هاوێشتبێت، ئەوا مرۆڤ دەزانێت کەوا بە دەستگیرکردنی سەرۆك ئەو هەنگاوەی لە "زەڵێ" هاوێشتبووی دیسان دەیهاوێژێتەوە. هەڵبەتە پەیامیشیان دەنارد کە "سەرۆکێکی نوێ بۆخۆتان دەستنیشان بکەن". لەناو ئەو تەڤگەرەشدا ئەوەی زۆر خواستبێتی تەڤگەر بخاتە دەستی خۆیەوە و خۆی بکاتە سەرۆکێك کێ بوو؟ "فەرهاد" بوو. لەدەرەوەی ئەو کەسی دیکە نەبوو. بۆیە "فەرهاد" کە ئەو پەیامانەشی وەرگرت تەواو دەکەوێتە جموجۆڵەوە، بۆیە ئێمە مەزندەیەکی وەهامان لەسەر ئەو هەبوو، بەڵام ئایا ئێمە دەتوانین رێی لەبەردەم بگرین؟ بۆ دۆخی ئەو کاتە ئەمە زەحمەت بوو، بەڵام ئایا دەتوانین ئەمە دوابخەین؟ ئەوە دەکرا ببووایە. چونکە "فەرهاد" و "بۆتان" و ئەوان هێشتا باش خۆیان رێکخستە نەکردبوو، پێداویستی ئەوانیش بە کات هەبوو، ئەگەر ئێمە کەمێك توانست یان دەرفەت بەوان بدەین و واتێبگەن کە:" لەپێش ئێمە هیچ کۆسپ و ناستەنگێك لەئارادا نەماوە، ئێمە دەتوانین بەئاسانی خۆمان بەرێکخستن بکەین" ئەوا ئەوان لەناو تەڤگەردا دەمێننەوە و هەنگاو دەهاوێژن و بەلایەنی کەم لەو کاتەدا کێشە و گرفتی مەزن دروست ناکەن. ئەمە بۆ ئێمەش گرنگ بوو. بۆ ئێمەش کات پێویستبوو. بۆ ئەوان تاکو بتوانن خۆیان رێکبخەن کات پێویستبوو، بۆ ئێمەش کات پێویستبوو، چونکە لەو دۆخەدا ئەگەر ئەوانە کێشە و گرفتمان بۆ دەرنەخەن، تاکو بتوانین بەهەموو توانست و هێزی خۆمانەوە لەدژی دەستێوەردانەکە (پیلانگێرییەکە) رابوەستین، بۆ ئەوەی بتوانین پووچەڵی بکەینەوە و یەکێتی تەڤگەر بپارێزین... بۆیە لێرەدا من گەیشتمە ئەنجامێك؛ ئەگەر رێگەیان بۆ بکەینەوە، ئەوا "فەرهاد" دەڵێت:" رێم بۆکراوەتەوە و هیچ ئاستەنگێکم لەبەردەمدا نییە، من دەتوانم بەئاسانی خۆم رێکبخەم، دەتوانم تەڤگەر بخەمە دەستی خۆمەوە" ئەو کاتە لەناو تەڤگەردا دەمێنێتەوە و تەڤگەر سوودی لێوەردەگرێت. ئەو موداخەلانەی لەدەرەوە لەسەر تەڤگەر دروست دەبن، تەڤگەر

دەتوانێت كەمیان بكاتەوە و لاوازیان بكات و یەكێتی تەڤگەر بپارێزێت، "فەرهاد" ناتوانێت زێدە مەترسی دروست بكات. چونكە "فەرهاد" ناوی زڕابوو، بەپراكتیكی خۆی لە "زەلێ" بەرلەوە و دوای ئەوە ئەو شتانەی كردوویەتی لەناو تەڤگەردا ناوی زڕابوو، تەنانەت كەمێك لەناو گەلیشدا ناوی زڕابوو، بۆیە "فەرهاد" نەیدەتوانی مەترسی دروست بكات، لەوانەیە هەندێك تەخریباتی بكردبایە، تەڤگەر دەیتوانی ئەو تەخریباتانەی نەهێڵایە. بەم حیساباتە من نزیكبوومەوە، نزیكبوونەوەیەكی بەمشێوەیەم پێشخست. ئەمە دەهاتە حیساباتی "فەرهاد"یش. چونكە بۆ ئەو كات پێویستبوو تاكو بتوانێت خۆی رێكخستە بكات. ئەگەر دوای دەستگیركردنی سەرۆك بكەوتبایەتە جموجۆڵەوە ئەوا نەیدەتوانی ئەنجامیش بەدەستبخات، بۆ ئەوەی تەڤگەر بخاتە دەستی خۆیەوە پێویستبوو خۆی رێكبخات. لەلایەكی دیكەشەوە باوەڕی و متمانەیەكیش بە كادیران بدات، كە گوایە خاوەنداریێتی لەتەڤگەر دەكات و لەدژی پیلانگێڕیێتی رادەوەستێت، تاكو بتوانێت بەئاسانی كاریگەرییان لەسەر بكات و بەئاسانیش تەڤگەر بخاتە دەستی خۆیەوە. ئیدی دوای پیلانگێڕییەكە كێشەیەكی بەمجۆرەمان لەپێش بوو. "فەرهاد" نەیدەتوانی ببێتە مەترسی، لەبنەڕەتدا مەترسی سەرەكی "بۆتان" دروستی دەكرد. چونكە رەوشی "بۆتان" لەناو تەڤگەردا كەمێك دەزانرا و تێگەیشتن لەبارمیەوە هەبوو، بەڵام لەناو گەلدا نەدەزانرا، كادیرانی تەڤگەریش بەتەواوی رەوشی "بۆتان"یان نەدەزانی. ساڵی (١٩٨٨) سەرۆك رەخنەی زۆری كردبوو، لەكۆنگرەی چوارەمدا ئێمە رەخنەیمان كردبوو، لە پێنجەمین كۆنگرەشدا ئێمە دیسان رەخنەیمان كردبوو، لەساڵی (١٩٩٧)دا سەرۆكایەتی بەتەواوی لەگەریلای دوورخستەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش هەموو كادیران بەتەواوی رەوشی ئەویان نەدەزانی، واتا شتی گشتیان دەزانی، ئەو جموجۆڵانەی لەدوای دەستگیركردنی سەرۆك بەڕێوەی دەبرد زێدە كەسێك نەیدەزانی، نەخاسمە لەناو گەلدا هیچ نەدەزانرا، بۆیە ئەوەی مەترسی دروستدەكرد، "بۆتان" و گروپەكەی ئەوبوو. ئەوانە (فەرهاد و بۆتان) لەدژی تەڤگەر رێكدەكەون، چونكە خۆیان یەك گروپ نەبوون، بەڵام موحتاجی یەكتربوون و یەكێكیان بێ ئەومیتریان نەیدەتوانی لەدژی تەڤگەر هەنگاو بهاوێژێت. ئیدی ئەوانە رێككەوتنێكی بەمجۆرەیان لەگەڵ یەكتر كرد، بۆ ئەوەی بتوانن لەدوای دەستگیركردنی سەرۆك تەڤگەر

بخەنە دەستی خۆیانەوە، لەسەر ئەو بنەمایە کاریان کرد، تا لەکۆتاییدا رەوشی ئەوانیش ئاشکرابوو، لەدوای دەستگیرکردنی سەرۆك ئەو کێشانەی تەڤگەر تێیدا دەژیا ئەو کێشانە بوون.

**پەراوێزەكان:**

(١) مەبەستی كاتی سازدانی ئەو دیدارمیە.

(٢) مەبەستی كاتی سازدانی ئەم دیدارمیە.

(٣) رێژەی (١٠٪): ئەو رێژمیە وەك ماددمیەكی یاسایە لەدەستووری توركیا كە هەر پارتێكی سیاسی دەبێت ئەو رێژمیەی دەنگ بەدەست بێنێت تا بتوانێت بكەوێتە پەرلەمانەوە. ئەم ماددمیە زیاتر لەدژی پارتە كوردییەكان دانراوە.

(٤) مەبەستی ئەو هەڵمەتی دەستگیركردنانەیە كە لەكۆتایی ساڵی (٢٠٠٦) و سەرەتای ساڵی (٢٠٠٧) دا سەرەتا ئەڵمانیا و پاشان فەرەنسا و بەلژیكا لە ئەوروپا دژ بە چالاكوانان و سیاسەتمەدارانی كورد لەو وڵاتانە بەرێوەی دەبەن، هەروەها لەبەرامبەر دەزگا و كۆمەڵە كوردییەكانی نێو ئەو وڵاتانەدا هەڵمەتی پشكنین و چاوسووركردنەوەیان پەیرەوكردووە)

(٥) ئیتحاد و تەرقییەكان: سەرەتا بەناوی ئیتحادی عوسمانی وەك رێخستنێكی نهێنی لەدژی دەسەڵاتی عەبدولحەمیدی دووەم لە (٢١)ی مایسی ساڵی (١٨٨٩) لە ئەستەنبۆل دامەزرا. لە (١٨)ی تشرینی یەكەم تا (٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٠٨) یەكەم كۆنگرەی ئیتحاد و تەرەقی سازدەدرێت و وەك پارتییەك خۆی دەناسێنێت. ئتیحاد و تەرەقی خاوەن بیرێكی تۆرانی شۆڤێنیستی بوون. ئەو كاتە دەوڵەتی ئەڵمانیا بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لەناو ئیمبراتۆری عوسمانی تۆكمەتر بكات، هاوكاری پشتیوانییەكی زۆری ئیتحادییەكانی كرد، سەركردە باڵاكانی ئیتحاد و تەرەقی " ئەنوەر پاشا، جەمال پاشا و تەلعەت پاشا"بوون. ئیتحاد و تەرەقیچییەكان رۆڵێكی سەرەكیان لە كۆمەڵكوژییەكانی دژ بە ئەرمەنییەكان و كوردەكان هەبوو. ئێستاش لەسەر هەمان رێچكەی ئیتحاد و تەرەقیچییەكان دژ بە گەلی كورد و گەلانی دیكەی توركیا سیاسەتی تۆرانی و شۆڤێنییەتی خۆیان بەرێوە دەبەن، بەوانە دەگووترێت ئیتحاد و تەرەقیچییە نوێیەكان.

(٦) مەبەستی كاتی ئەنجامدانی ئەم دیدارمیە.

(٧) مەبەستی كاتی ئەنجامدانی ئەم دیدارمیە.

# بەشی هەشتەم:

# ژانی گۆڕانکاری... بەرەو پارادیگمایەکی نوێ

# (۲۰۰۰ ـ ۲۰۰۳)

# ئیمرالی...
# ئەو دوورگەیەی خۆری
# لێوەهەڵدێ...!!

**دەستپێکردنی قۆناخی دادگایی ئیمرالی و ئەو هەڵوێستەی کەوا سەرۆك ئاپۆ لەمیانەی بەرگرینامەکەی یەکەمیدا (مانیفێستۆی چارەسەری دیموکراتیانەی کێشەی کورد) لەدادگایی ئیمرالی دەردەبڕێت لەناو ئەو هەموو هێرش و پیلانگێڕی و موداخەلە و کێشە و گرفتانەدا ئەو کاتە تەڤگەر چۆن لەو دادگاییە و لەو هەڵوێستەی سەرۆك ئاپۆ نواندی دەیڕوانی...؟**

کاتێك کە دادگایی ئیمرالی دەستپێکرد، سەرۆك لەوێ زێدە بەرگرییەکی وەهای لەخۆی نەکرد، هەڵبەتە دۆخێکی وەهاش نەبوو کە بەرگری لەخۆی بکات. لەژێر هێرشێکی تیرۆریستیانەدا ئەو دادگاییکردنە ئەنجام درا، واتا لەرووی ئایدیۆلۆژی و سیاسییدا لینجکردنێکیان پێشخست. بەم کەشوهەوایەش خواستیان دۆخی بەرگری لەخۆکردن نەهێڵنەوە، بۆیە دۆخێکی بەرگری لەخۆکردنیان بۆ سەرۆك نەهێشتەوە کەوا بەرگری لەخۆی بکات. سەرۆك لەو دۆخەدا نەیدەتوانی بەرگری لەخۆی بکات، خواستی

لەدادگایی ئیمرالیدا رێگەی چارەسەری بداتە پێش دەوڵەتی تورکیا، ئەو لەمیستۆکانەی ئەنجام دەدرێن تێیبگەیەنێت، ئەگەر تورکیا بەراستی دەخوازێت نەیەتە ئەو لەمیستۆکانەوە، ئەگەر دەخوازێت زەرەر نەبینێت گووتی:" ئەمە رێگەکەیەتی" لەوێ رێی چارەسەری خستەپێش تورکیا. ئەوەی سەرۆك لەوێ کردی ئەمە بوو. بۆیە لەو دادگاییەدا بەرگری لەخۆکردنی پێشنەخست، ئەگەر نیازێکی تورکیا هەیە کە کێشەی کورد چارەسەر بکات، ئەگەر ناخوازێت لەنێو کێشەی مەزندا بژیت و نەیەتە لەمیستۆکی پیلانگێڕییەکەوە. گووتی:" ئەوا ئەمەیە رێگەکەی" و ئەو رێگەیەی دەستنیشان کرد، ئەوەی لەو دادگاییەدا کردی ئەمە بوو.

ئەگەر دۆخ و هەلومەرجی بەرگری لەخۆکردن هەبووایە، بەو شێوەیە تیرۆر و "لینجکردن"یان بەرێوە نەبردبایە، سەرۆك ئەو بەرگرینامانەی پاشان بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپای پێشیخست ئەوا لەو دادگاییەشدا پێشیدەخست. بەڵام ئەو دەرفەتەیان پێنەدا. واتا خواستیان گوایە بەو دادگاییە سەرۆك بەتەواوی و بەسیاسی بکوژن. هەڵبەتە بەر لەوەش کەمپینێکی ناوزڕاندنی بەهێزیان بەرێوەبرد، گوایە لەرووی حقوقییەوە ئەمەش تەواو بکەن، ئەو دادگاییەی ئەنجامدرا دادگایی نەبوو، بەڵکو ئەو لینج و تیرۆرەی بەرێوەیان برد خواستیان لەرووی حقوقییەوە تەواوی بکەن، ئەوە سیناریۆیەك بوو، سیناریۆیەکە نووسرابووەوە، دەیانخواست ئەو سیناریۆیە جێبەجێ بکەن. ئەوەی لەو دادگاییەدا روویدا ئەمەبوو.

بێگومان هەموو کەسێك مەزەندەی جیاوازی دەکرد؛ "ئیتر یان وەك هەڤاڵان محەممەد خەیری دوورموش و کەمال پیر و ئەوان لەرەوشەکە نزیك دەبێتەوە" یان "زۆر جیاوازتر نزیك دەبێتەوە" بێگومان لەوێ نەدەکرا ئەمە ببایە، سەرۆك نەیدەتوانی وەك هەڤاڵان "محەممەد خەیری دوورموش و کەمال پیر" نزیك ببایەوە. چونکە پیلانگێڕییەکی زۆر مەزن هەبوو، پێویستبوو رێگیری لێبکردبایە، ئەوەی پیلانگێڕان دەیانخواست لە ئیمرالی پێیبگەن چیبوو؟ دەیانویست سەرۆك تەسلیم ببێت، ئەگەر تەسلیمیش نەبێت بکەوێتە نێو بەرخۆدانێکی وشك و قەباوە، بەمشێوەیە دەتوانن کۆتایی بە سەرۆك بهێنن، واتا یان بە تەسلیمی بیکوژن یاخود بەجەستەیی بیکوژن. هەڵبەتە هەر دوو شێوازەکەش وەك یەك بوو. بێگومان سەرۆك لەو ئامانجانەی

پیلانگێڕییەکە تێگەیشت، بۆیە نەهاتە ئەو لەیستۆکەوە. واتا لەو دادگاییەدا؛ ئەرکێکی چۆن پێك بێنێت؟ مێژوو ئەرکێکی چۆن لە سەرۆك دەخوازێت؟ بەرژەوەندی گەلی کورد و تەڤگەر چ لەسەرۆك دەخوازێت؟ بەرژەوەندی گەلان چ دەخوازێت، ئەوەی دایە پێشخۆی. لەبەر ئەوەی مەزندەی هیچ کەسێك لەوێ پێك نەهات، بۆیە هەر کەسێکیش شۆك بوون. سەرۆك لەهەنگاوی یەکەمدا لەدادگایی ئیمرالیدا بەمشێوەیە پیلانگێڕییەکەی پووچەڵ کردەوە. واتا ئەوانە دەیانخواست بەو دادگاییە هەم ئامانجەکانی خۆیان بپێکن و هەمیش گوایە بەرێگەی حقوقی جێبەجێی بکەن. سەرۆك نەکەوتە ئەو لەیستۆکەوە...

**هەر پەیوەست بەقۆناخی ئیمرالییەوە؛ لەکاتی دەستگیرکردنی تاکو ئێستاش تاکە رێگەی پەیوەندی نێوان سەرۆك ئاپۆ لەگەڵ گەل و تەڤگەر بەگشتی تەنیا پارێزەران بووە. بەڵام وەکو دیار دەبێت لەرێگەی پارێزەرانیشەوە هەندێك لەیستۆك بەرێوە دەبردرا. بۆنموونە پارێزەر "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" هەبوو، ئەو پارێزەرە چۆن بوو بە پارێزەری سەرۆك ئاپۆ و دەیخواست چ لەیستۆکێك ئەنجام بدات و بۆ چ ئامانجێك ئەنجامی دەدا؟ پێم وایە ئەو کاتە ئەو تاکە کەسێك بوو کە ببووە پارێزەری سەرۆك ئاپۆ...**

بێگومان لەدەستپێکدا زۆر زەحمەتی هەبوو بۆ دروستکردنی پەیوەندی و تەماس لەنێوان سەرۆك و تەڤگەردا، بۆچی؟ چونکە ئەو کاتە بەناوی پارێزەرێتییەوە "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" کەوتە ناو مەسەلەکەوە و نەیاندەهێشت پارێزەرانی دیکە بکەونە مەسەلەکەوە. ئەو پارێزەرانەی دەیانخواست بکەونە نێو مەسەلەکەوە، پەسندیان نەدەکردن و دەیانترساندن و هەڕەشەیان لێدەکردن. "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا هەبوو، بۆیە دەیانخواست لەرێگەی "ئەحمەد

زەکی ئۆخچی ئۆغلو"وە بالادەستی خۆیان بەسەر دۆخەکە بسەپێنن و دۆخەکە بەتەواوی بەلای خۆیاندا بشکێننەوە، بۆ ئەوەی بتوانن لەنێوان سەرۆك و تەڤگەردا هەم پچڕاندنێك دروست بکەن، هەمیش گرفت و ئالۆزییەکیش بنێنەوە و ناکۆکییەك دروست بکەن. چونکە ئامانجی پیلانگێڕان چیبوو؟ پەیوەندی نێوان سەرۆك و گەل و تەڤگەر بپچڕێنن، بۆ ئەوەی تەڤگەر و گەل لەژێر کاریگەری سەرۆك دەربخەن و بیخەنە خزمەتی خۆیانەوە، ئیدی هەر لەسەرەتای قۆناخی ئیمرالیدا "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" کەوتە نێو مەسەلەکەوە. "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" لەیستۆکی ئەنجام دەدا، ئەوەی سەرۆك لەلای ئەو باسی دەکرد ئەو نەیدەخواست بیگەیەنێتە تەڤگەر، دەیخواست شتی بەپێچەوانەی ئەمە بگەیەنێتە تەڤگەر، ئەوەی تەڤگەریش بەپێچەوانە بگەیەنێتە سەرۆك. بەمجۆرە ناکۆکی بنێتەوە و باوەڕی و متمانە نەهێڵێت و لەدژی یەکتر دەریانبخات، لەیستۆکی بەمجۆرەی دەکرد. لەلایەکی دیکەشەوە؛ دەیخواست سەرۆك بترسێنێت و رایبکێشێتە نێو بەرخۆدانێکی قەبەوە، بەمەش لەناوببرێت. سەرۆك بینی کە "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" لەیستۆکی وەها دەکات. پێشتریش ئەوی دەناسی، بۆیە لەیستۆکەکەی ئەو بەسەرنەکەوت. ئیدی سەرۆك ئەوی وەك پارێزەری خۆی پەسند نەکرد، کە بینی وەها لەیستۆك و پیلان دەگێڕێت، هێدی هێدی ئەوەی لەدەور دەرخست و پارێزەرانی دیکە کەوتنە دەورەوە (ناو مەسەلەکەوە). تا ئەو کاتەی پارێزەرانی دیکە کەوتنە دەورەوە، لە پەیوەندی نێوان ئێمە و سەرۆکدا زۆر کێشە و زۆری و زەحمەتی دەرکەوت. "ئەحمەد زەکی ئۆخچی ئۆغلو" لەیستۆکی پڕ خراپی ئەنجام دەدا، هەوڵی دەدا سەرۆك و تەڤگەر بهێنێتە دۆخی دژایەتیکردنی یەکتر و سەرۆك بخاتە نێو بەرخۆدانێکی قەبەوە و بەرەو لەناوبردنی ببات.

لەبەر ئەوەی سەرۆك پێشتر ئەو کەسەی دەناسی و برای ئەوی دەناسی، لەو لەیستۆکانەی کەوا ئەو لەو پیلانگێڕییەدا دەیکرد، دەیزانی و تێدەگەیشت، بۆیە رێگەی نەدا ئەو لەیستۆکانە بەسەر بکەوێت.

**هەر لەو قۆناخەدا دوو هەنگاوی مەزن هاوێشتران؛ یەکەمینیان کشاندنەوەی هێزەکان بوو لەباکوورەوە بۆ سەر سنوور، دووەمینیشیان ناردنی دوو گروپ بوو، بەناوی گروپی ئاشتی و نیازپاکی بۆ تورکیا. ئەو دوو هەنگاوە چۆن و بە چ ئامانجێك هاوێشتران؟ ئەو کێشانەی لەمیانەی هاوێشتنی ئەو دوو هەنگاوەدا دەرکەوتن چیبوون؟ هەروەها هەر دوو هەنگاو چ ئەنجامێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا؟**

هەر کەس واتێدەگەیشت گوایە:" دوای ئەوەی سەرۆك هاتە ئیمرالی گۆڕانکاری لەتەڤگەردا ئەنجام دا، ئەو گۆڕانکارییەش بەئیرادەی خۆی پێشینەخست، بەڵکو دەوڵەتی تورکیا فشاری دروست کردووە و گوایە لەئاکامی ئەو فشارانەدا سەرۆك ئاپۆ ئەو گۆڕانکاریيانەی ئەنجام داوە، ئامانجیش لەو گۆڕانکارییەدا ئەوە بووە کە دەوڵەتی تورکیا بەرێگەی سەرۆك ئاپۆ هەموو ئەو دەستکەوتانەی (PKK) بەدەستیهێناوە تەسفیە بکات و هەموو شتێك لەناوببات و تەڤگەر بەتەواوی بخاتە خزمەتی دەوڵەتەوە" پڕوپاگەندەی بەمشێوەیەیان زۆر دەکرد. ئەمە بوختانێکی زۆر مەزن بوو، ئەوانەی ئەو پڕوپاگەندانەیان دەکرد دووژمنایەتییەکی زۆر مەزنیان بۆ سەرۆك دەکرد و دەیانخواست بەمشێوەیە تۆڵە لە سەرۆك بکەنەوە. چونکە سەرۆك ڕاستینەی ئەوانی ئاشکرا کردبوو و گەلی لەوان ئاگادار کردبووەوە، بۆیەش ئیفلاسیان کردبوو، تا ئەو کاتەی ڕاستینەی ئەوان ئاشکرا نەببوو، بەناوی کوردایەتییەوە بازرگانییەکی مەزنیان دەکرد و لەسەر ئەمە دەژیان. بەڵام سەرۆك ئاپۆ ڕاستینەی ئەوانی دەرخستەڕوو و بەمەش ئیفلاسیان کرد، ئیدی نەیاندەتوانی چیتر بەناوی کوردایەتییەوە بازرگانی بکەن. ئیدی کاتێك کە سەرۆك دەستگیرکرا ئەمەیان بۆخۆیان بە هەلێك زانی و خواستیان تۆڵەی خۆیان بستێننەوە. بۆیە دەستیان بەو پڕوپاگەندانە کرد، بۆ ئەوەی ئاڵۆزی لەسەر گەل دروستبکەن و سەری کادیرانیش تێکەڵ و پێکەڵ بکەن. بەمەش

نەك تۆڵەی خۆیان دەکردەوە، تەنانەت کەوتبوونە خزمەتی پیلانگێڕییەوە و داخوازییەکانی پیلانگێڕێتیان پێك دەهێنا، ئیدی بێ ویژدانییەکی مەزن، بوختان و دووژمنایەتییەکی مەزنیان دەکرد، مەگەر کەسێك بێویژدان بێت، دڵی خۆی ڕەش کردبێت، ئەمەی بکردبایە. هەر کەسێکیش دەزانێت کە ئەوەی نەتەوایەتی لە کوردستاندا پێشخست، ئەوەی یەکێتی گەلی کورد، دڵ و ڕۆحێکی یەکگرتووانەی بۆ گەلی کورد ئافراند، ئەوەی کوردێکی نوێی خوڵقاند سەرۆك ئاپۆ بوو، ئەوەی ڕێزی بۆ گەلی کورد دروستکرد سەرۆك ئاپۆ بوو، ئەوەی کێشەی کوردی خستە ناوەندی سیاسەتی جیهانەوە سەرۆك ئاپۆ بوو، بەسەرۆك ئاپۆوە کوردان ڕابوونە سەرپێیان و بوونە ئیرادەیەکی مەزن، ئەوەی بۆ گەلی کورد بەدەستیهێناوە مەگەر کەسێکی بێویژدان بتوانێت نکۆڵی لێبکات، کەسێك کەوا خاوەن ویژدان بێت، ناتوانێت هەروەها بووختان بکات و دووژمنایەتی بکات.

سەرۆك ئاپۆ هەر لە ساڵی (١٩٩٣)وە دەستی بە گۆڕانکاری لەنێو تەڤگەردا کرد. ئەمە هەر کەسێکیش دەیزانێت کە ئەو گۆڕانگارییانەی لەساڵی (١٩٩٣)وە دەستیپێکرد بوو خواستی لە پێنجەمین کۆنگرەدا قووڵ و فراوانتری بکاتەوە. ئەمانە هەمووی بەڵگەدارن و بە دیکۆمێنت ماون و پارێزراون. تەڤگەر هەندێك هەنگاوی بۆ گۆڕانکاری و خۆنوێکردنەوە هاوێشت، بەگوێرەی داخوازی سەرۆك هەنگاوی نەهاوێشت، لە شەشەمین کۆنگرەدا خواستی تەواوی بکات، پیلانگێڕییەکە نەیهێشت ئەمە پێکبێت.

هەڵبەتە پیلانگێڕان بینیان کەوا سەرۆك ئاپۆ خەریکە نوێبوونەوەیەکی مەزن لە تەڤگەردا ئەنجام دەدات، پاککردنەوەیەك لە تەڤگەردا دێنێتەدی، ئەگەر ئەمە ئەنجام بدرێت، ئەوا پیلانگێڕی سەرناکەوێت. سەرۆك هەم نوێبونەوەی لە تەڤگەردا ئەنجام دەدا، هەمیش تەڤگەری دەخستە سەر ڕاستەڕێی سیاسی و دیموکراتییەوە، ئەگەر تەڤگەریش بکەوێتە سەر ئەو ڕێگەیە ئەوا مسۆگەر پیلانگێڕی پووچەڵ دەبێتەوە. هەڵبەتە بۆیە پیلانگێڕییان ئەنجام دا، بۆ ئەوەی بتوانن ڕێگیری لەمە بکەن. تاکو هەم ڕێی دیالۆگ نەکرێتەوە و کێشەکە نەکەوێتە سەرڕێی سیاسی و دیموکراتی و چارەسەر نەبێت، چونکە لەگەڵ حیساباتی ئەوان یەکانگیر نابێتەوە، هەمیش لەتەڤگەردا ئەو

فووڵبوونەوە و نوێبوونەوەیەی سەرۆك كردوویەتی پێشنەكەوێت، بۆ ئەوەی تەفگەر سەرنەكەوێت و ئامانجی خۆی پێكنەهێنێت.

كاتێك كە سەرۆك دەستگیركرا گووتی:" ئەو كارەی من لەپێش خۆمم دانابوو بەنیوەچڵی مایەوە، هەندێكیانم پێكهێناوە و هەندێكیشم پێكنەهێناوە" ئەمانەش هەمووی بەڵگەدارن. ئیدی ئەو كارەی لەنیوەدا ماوەتەوە، لە ئیمرالی تەواوی كرد. ئەوەی لە ئیمرالی كردی ئەوەبوو، نەك پێڤاژۆیەك لە ئیمرالی دەستپێكرد بێت و وەك بانگەشەی بۆ دەكەن، گوایە بەداخوازی دەوڵەتی توركیا دەستی پێكردبێت. ئەمە بووختان (ئیفترا) و چەواشەكارییەكی مەزنە و بەئەنقەست ئەو بووختان و چەواشەكارییانەیان كرد، هەموو ئەمانە بە بەڵگەوە هەن. ئەگەر مرۆڤ مێژووی (PKK) لێكۆڵینەوە بكات ئەوا دەتوانێت ئەمانە ببینێت.

سەرۆك ئاپۆ كاتێك لەساڵی (١٩٩٨)دا ئاگربەستی راگەیاند، ئەو كاتە لەتەلەفزیۆندا ئاخفیبوو، چەند رۆژێك پێش ئێستا(١) جارێكی دیكە بەبۆنەی راگەیاندنی پێنجەمین ئاگربەستەوە هەمان ئەو ئاخافتنانەی ساڵی (١٩٩٨)كردبووی بیستمانەوە، كەچی لە توركیادا زۆر كەس و كەناڵی راگەیاندنی گووتبوویان:" ئاپۆ لە ئیمرالییەوە قسە دەكات و كاسێتەكەیشی بۆ تەلەفزیۆن دەنێردرێت و بڵاوی دەكەنەوە، ئەمە چۆن وا دەبێت؟" واتا وەها تێگەیشتن كە ئەو ئاخافتنانە تازە كراوە، كەچی تازە نەكراون، بەڵكو لەساڵی (١٩٩٨)دا كراوە. ئەمە چ بەدیار دەخات؟ ئەوە بەدیار دەخات كەوا سەرۆك گۆڕانكاری و نوێبوونەوەی لە ئیمرالییەوە دەستی پێنەكردووە. كاتێك كە ئەو شێواندن و چەواشەكارییانە دەكران و لەناو ئێمەشدا هەندێك كەس ئەو شێواندن و چەواشەكارییەیان بۆخۆیان بەبنەما وەرگرت، سەرۆك گووتی:" من فیكری خۆمم نەگۆڕیوە، بەڵكو لەفیكری مندا هەڵاوێردكردن و فووڵبوونەوە هەیە" راستییەكەشی هەر وەهایە، ئەو كارەی كە لەساڵی (١٩٩٣)وە دەستپێكرد، لە "ئیمرالی" تەواوی كرد، ئەوەی لە ئیمرالی ئەنجامی دا ئەوەیە. پێویستە ئەم راستییە وەهای لێی تێبگەین.

سەرۆك هەر لەساڵی (١٩٩٦)دا بیری لەوە دەكردەوە كە هێزەكانی گەریلا بۆ باشوور بكشێنێتەوە، بۆچی؟ چونكە ئەو كاتە "نەجمەددین ئەربەكان" لە توركیا سەرۆك وەزیران بوو، هەندێك نامەی بۆ ئێمە نارد، ئێمەش وەڵامی ئەو نامانەمان دایەوە،

راستەوخۆ نەبوون، ناراستەوخۆ بوون، ئەو کاتە من لەلای سەرۆك بووم، ئێمە گفتوگۆمان کرد، ئایا "ئەریەکان" دەتوانێت هەنگاو بهاوێژێت؟ تا چەند شێلگیر و جددیه؟ ئایا بۆ ئەوەی هەنگاو بهاوێژێت و جورئەتی پێبدەین بۆ ئەوەی کێشەکە بکەوێتە سەرڕێی چارەسەرییەوە و بۆ ئەوەی شەڕ و پێکدادان و گێرەشێوێنی (پراواکسیۆن) روونەداتەوە، ئایا دەتوانین هێزەکانی گەریلا بۆ باشوور بکێشنینەوە؟ چونکە لەساڵی (١٩٩٣)دا پراواکسیۆنێك ئەنجامدرا، پێڤاژۆی ئاگربەستەکە شێوێندرا، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ئەمە دووپات نەبێتەوە، ئایا دەتوانین هێزەکانمان بۆ سەر سنوور بکشێنینەوە. چونکە ئێمە دەمانزانی ئەوەی لە تورکیا خوازیاری چارەسەری نین بەهێزن و پراواکسیۆن دەکەن، لەوانەیە لەناو ئێمەشدا کەسانی وەك "شەمدین ساکیك" پراواکسیۆن بکەنەوە، بۆ ئەوەی رێگیری لەمە بکرێت ئەو کاتە بیرمان لێی کردەوە و گفتوگۆمان لەسەری کرد. ئەو کاتە سەرۆك گووتی:" ئێمە دەتوانین هێزەکانمان بکشێنینەوە" واتا ئەو بیرکردنەوەیە هەر لەو کاتەوە لەئارادا بوو، چونکە سەرۆك ئیدی نەیدەخواست شەڕ پێشبکەوێت، چونکە ئەوەی بەشەڕ چارەسەر بکرابایە نەمابوو، ئەو شتەی بەشەڕ چارەسەر بکرابایە چارەسەر کرابوو، ئەوەی دیکە پێویستبوو بەرێگەی سیاسی و دیالۆگ و دیموکراتییانە چارەسەر بکرێت. بەڵام تورکیا نەکەوتە سەر ئەو رێگایەوە. کاتێك کە سەرۆك لە ئیمراڵی گووتی:" با شەڕ رابوەستێت و با هێزەکانمان بۆ باشوور بکشێنەوە" ئەو بڕیارەی لە ئیمراڵییەوە نەدابوو، بەڵکو هەر لەساڵی (١٩٩٦)وە گفتوگۆ و تاوتوێی دەکرد. کاتێك کە پیلانگێڕیش بەمشێوەیە پێکهات، سەرۆك باش لەئامانجەکانی پیلانگێڕییەکەش تێگەیشتبوو؛ کە دەخوازن شەڕێکی مەزن لەنێوان (PKK) و تورکیا بەرپابکەن، چونکە ئەمە مەترسیدار بوو، پێویستبوو پیلانگێڕییەکە پووچەڵ بکرێتەوە، ئیدی مادام ئەوان دەخوازن شەڕ و کۆمەڵکوژییەکی مەزن پێشبخەن، ئەوا پێویستە ئەمە پووچەڵ بکرێتەوە، رێگای ئەمە چییە؟ ئەگەر شەڕی راوەستاند و هێزەکانی بۆ باشوور کشاندەوە ئەوا هەوڵ و داخوازی ئەوان پووچەڵ دەبێتەوە و بەمشێوەیە رێگیری لە سەرکەوتنی پیلانگێڕییەکە دەکرێت. بۆیە سەرۆك ئەمەی پێشخست. لەبەر ئەوەش تەفگەر ئەمەی پەسندکرد. ئیدی بەمە رێی لەپێش ئەگەر روودانی کۆمەڵکوژییەك بەسەر کورداندا گرت، رێی لەبەردەم تەخریبات گرت،

بۆ ئەوەی پیلانگێڕییەکە پووچەڵ بکرێتەوە و ئەگەر بکرێت دۆخەکە بەرەو چارەسەری بچێت، چونکە سەرۆك لە ئیمراڵی‌ش ڕێی چارەسەری خستە بەردەم تورکیاوە، گووتی:" ئەمەیە ڕێی چارەسەری" لەسەر ئەو بنەمایەش بۆ ئەوەی بتوانێت تورکیاش رابکێشێتە سەر ئەو ڕێگایەوە ئەم هەنگاوەی هاوێشت، نەك تورکیا ئەمەی دەخواست، بەڵکو سەرۆك خواستی بەم هەنگاوە تورکیا رابکێشێتە سەر راستەڕێی چارەسەری. لە تورکیادا ئەوانەی لەسەر سیاسەت باڵادەستن ئەوانەن کە نکۆڵی و قڕکردن بەبنچینە وەردەگرن، بۆیەش شەڕ بەبنەما وەردەگرن. ئەوانە دەیانخواست سوود لەدەستگیرکردنی سەرۆکیش وەربگرن و زەبر لە تەڤگەر بوەشێنن. واتا لەچوارچێوەی ئامانجەکانی پیلانگێڕییدا دەخولانەوە و کاریان دەکرد. سەرۆك لەدادگایی ئیمراڵی‌دا هەوڵی دا زەمینەی چارەسەری پێشبخات، لەسەر ئەو بنەمایەش شەڕی راوەستاند، هێزەکانی گەریلایشی بۆ باشوور کشاندەوە، بۆ ئەوەی زەمینەی چارەسەری بەهێز بکات، بۆ ئەوەی تورکیا بۆ سەر ئەو ڕێگایە رابکێشێت و بەمجۆرە پیلانگێڕییەکەش پووچەڵ بکاتەوە، بۆ ئەوەی شەڕ و تەخریبات و کۆمەڵکوژی مەزن روونەدات. ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو.

دوای ئەوەش بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوەی هاوێشتوویەتی بەهێزتر بکات و زەمینە و توانستی چارەسەری تۆکمەتر بکات سەرۆك گووتی:" با گرووپی ئاشتیش بێن " لەسەر ئەو بنەمایەش گرووپێك لە ئەورووپا و گرووپێکیش لەناو گەریلا لە چیادا بۆ تورکیامان نارد، بەنامەوە رەوانەی تورکیامان کردن. لەگەڵ ئەواندا نامەمان بۆ سەرۆك کۆمار، سەرۆك وەزیران، سەرۆکی فەرماندەری سوپا، پەرلەمان و حکومەتی تورکیا رەوانە کرد، بۆ ئەوەی بتوانین تورکیا رابکێشینە سەرڕێی چارەسەری، چونکە لەمەدا سوود و بەرژەوەندی کوردیش و تورکیاشی تێدا هەبوو، ئەوانەی پیلانگێڕییەکەیان ئەنجام دابوو نەیاندەخواست چارەسەری پێشبکەوێت. دەیانخواست شەڕ پەرەبسێنێت. ئیدی سەرۆك بۆ ئەوەی پیلانگێڕێتی و ئامانجەکانی پیلانگێڕێتی پووچەڵ بکاتەوە هەموو ئەو هەنگاوانەی هاوێشت، تاکو تورکیاش رابکێشێتە زەمینەی چارەسەری، نەك تورکیا خواستبێتی سەرۆك رابکێشێتە خەتی خۆیەوە، پێویستە ئەم راستییە وەکو خۆی لێی تێبگەین، بەو شێوەیە بێویژدانی نەکرێت.

ئەو هەنگاوەی سەرۆك دوای دەستگیرکردنی خۆی هاوێشتی هەمووی لەساڵی (١٩٩٦)دا پێکەوە گفتوگۆمان لەسەر کردووە، تەنانەت ئەو کاتە من لەدژی ئەوەش راوەستام، من ئەو کاتە گووتم:" ئەگەر ئێمە هێزەکانی گەریلا بکشێنینەوە لەوانەیە زەبریشمان بەرکەوێت، چونکە ئەگەر تۆ گەریلا بکێشنیتەوە، پاشان ئەگەر چارەسەری پێشنەکەوێت، ئەوا دەبێت جارێکی دیکە بیخەیتەوە ناو باکوور و جێگیرکردنەوەیان زۆر زەحمەتە، ئەمە لەگەڵ خۆیدا بۆشاییەکی مەزنیش دێنێتە ئاراوە، لەوانەیە زەبریشمان بەرکەوێت. وەك دەڵێن؛ پیلان و لەپستۆکی عوسمانییەکان زۆرە، مێژووی تورکیا هەمووی لەپستۆك و پیلانگێڕییە..." سەرۆکیش دەیگووت:" راستە، بەڵام پێویستە ئێمە کێشەکە بخەینە سەر راستەڕێی چارەسەری و دیالۆگەوە، واتا هەتا کۆتایی هەر بەشەڕ نابێت، ئەو شەڕەی کە کردمان ئەوە کردمان، ئەو شتەی پێویستبوو بەشەڕ چارەسەری بکەین ئەوا چارەسەرمان کرد، ئیدی پێویستە ئێمە تەڤگەرەکەمان بخەینە سەر ئەو رێگەیەوە" ئیدی "ئەربەکان"یش هەندێك نامەی دەنارد، دەیخواست لەئێمە تێبگات کە ئێمە دەخوازین چی بکەین و چی نەکەین، هەندێك تێڕوانینی ئەوانیش هەبوو. بۆیە سەرۆك دەیگووت:" ئەگەر ئیحتمالێکی کەمیش بێت ئەوا لەوانەیە مرۆڤ بتوانێت هەندێك هەنگاو بە "ئەربەکان" و تورکیا بهاوێژێت. بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوانە بهاوێژن، ئێمە دەتوانین هەندێك جورئەت بەئەوان بدەین، بۆ نموونە؛ گەریلا بکشێنینەوە، تەنانەت ئەگەر پێویست بکات چەند گروپێکیش بنێرین، بۆ ئەوەی باوەڕی و متمانە دروست ببێت، ئێمە ئەو کاتە ساڵی (١٩٩٦) لەسەر ئەو مەسەلانە گفتوگۆمان دەکرد، ئیدی کە پیلانگێڕیش پێکهات و سەرۆك لەئامانجی پیلانگێڕانیش تێگەیشت، کە دەخوازن رێی چارەسەری دابخەن و شەڕ و پێکدادان بەهێز بکەن، ئەو شتەی کەوا سەرۆك لەساڵی (١٩٩٦)دا دەیخواست جێبەجێی بکات، ئەوا لەقۆناخی دوای دەستگیرکردنیشدا خستیە رۆژەڤەوە، ئەگەر خستیە پراکتیکەوە بۆ ئەو مەبەستە خستیە پراکتیکەوە.

بێگومان ئەمە هەندێك کاریگەری لەسەر تورکیا کرد، کەشوهەوا و زەمینەیەکی رەخساند. سەرۆك گەلی کورد و تەڤگەری هەموو ئامادەکرد بۆ ئەوەی کێشەکە بکەوێتە سەرڕێی سیاسی و چارەسەری، هەندێك کاریگەری لەسەر دەوڵەتیش کرد. بەڵام دەوڵەت

ئەو هەنگاوەی نەهاوێشت، ئەو زەمینەیەی کە سەرۆك بۆ دەوڵەتیشی ئامادەکرد دەوڵەت سوودی لێنەبینی نەشیخواست سوودی لێ وەربگرێت. بۆچی؟ چونکە پیلانگێڕان نەیانهێشت دەوڵەت لەم ڕووەوە هەنگاو بهاوێژێت، ئەگەر دەوڵەت هەنگاوی نەهاوێشت ئەوا لەبەر ئەم هۆیە هەنگاوی نەهاوێشت. دوای ڕووداوەکەی (١١)ی ئەیلولی (٢٠٠١) کە لە ئەمریکا ڕوویدا، ئەمریکا لەدژی تیرۆریزم سیاسەتێکی پێشخست، ئەوانەی لە تورکیاشدا لەدژی چارەسەری رادەوەستان، گووتیان:" ئەمە بۆ ئێمە دەرفەت و هەلێکە، پێویست ناکات هەنگاو بۆ چارەسەری بهاوێژین. ئێمە دەتوانین لەو دۆخ و کەشوهەوایەدا سوود وەربگرین، زەبر لە (PKK) بوەشێنین. بۆیە هەنگاوی چارەسەریان نەهاوێشت. لەبەر ئەمە هەرچەندە سەرۆك ئەو هەنگاوانەی هاوێشت و زەمینەی ئامادەکرد، دەوڵەت ئەو هەنگاوەی نەهاوێشت.

## لەو دوو هەنگاوەی هاوێشترا، هەم کشاندنەوەی هێزەکان و هەمیش ناردنی دوو گروپی ئاشتی و نیازپاکی، لەکاتی پراکتیزەکردنیدا چ کێشە و گرفتێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا...؟

کاتێك تەڤگەر ئەو هەنگاوانەی هاوێشت، هەم لەناو تەڤگەردا هەندێك کەس لەدژی ئەو هەنگاوانە رادەوەستان، هەمیش لەدەرەوەی تەڤگەر، ئەوانەی دووژمنایەتی ئەو تەڤگەرەیان دەکرد، خواستیان هەندێك کێشە و گرفت بۆ تەڤگەر دروست بکەن. ئەوانەی لەدەرەوەی ئێمە بوون دەیانگووت:" ئیدی (PKK) تەسلیم دەبێت، بۆچی شەڕ ناکات؟ بۆچی گروپ لەنێو گەریلا و ئەوروپا دەنێرێت بۆ تورکیا؟ ئەمە تەسلیمییەتە، ئیدی ئاپۆ کەوتۆتە خزمەتی سوپای تورکیاوە، تەڤگەر تەسفیە دەکات، پێویستە شەڕ بکەن". ئەوانە ئەمجارە بەمشێوەیە پڕوپاگەندەیان دەکرد، کاتێکیش کە ئێمە شەڕمان کرد هەر هەمان ئەو کەس و لایەنانە دەیانگووت:" بۆچی شەڕ دەکەن؟ بەمە ڕێی دیالۆگ و چارەسەری دادەخەن و ناهێڵن کێشەی کورد بکەوێتە سەرڕێی چارەسەرییەوە" کاتێکیش کە ئێمە شەڕمان راوەستاند و گروپمان ناردە تورکیا و

هێزەکانیشمان کشاندەوە، ئەمجارەیان دەیانگووت:" بۆچی شەڕ ناکەن؟ ئیدی ئەمە تەسلیمییەتە". واتا تەڤگەر هەر شتێکی بکردبایە، ئەوان بەراستیان نەدەزانی، بەگوێرەی ئەوان ئەم تەڤگەرە هەرچییەك بکات هەر هەڵەیە. بۆخۆشیان شتێکیان نەکردووە و ناشیکەن. مادام هەڵەیە تۆ وەرە راستی بکەوە، ئەمەشیان نەدەکرد، ئیدی یەك ئامانجیان بەبنەما وەرگرتووە ئەویش دووژمنایەتی کردنی ئەم تەڤگەرەیە.

لەناو ئێمەشدا، هەندێك کەس لەنێو دوودڵی دابوون، واتا ئەگەر تەڤگەر ئەم هەنگاوانەش بهاوێژێت، ئەوا دەوڵەت هەر هەنگاو ناهاوێژێت. تەنانەت لەمەش سوود وەردەگرن و زەبرمان لێدەوەشێنن، ئەو هەڤاڵانە لەدژی ئەو هەنگاوانە نەبوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی باوەڕییان بە تورکیا نەبوو، دەیانگووت:" تورکیا سوود لەو هەنگاوانە وەردەگرێت و زەبرمان لێدەوشێنێت. بۆیە ئەو هەنگاوانە نەهاوێژرێن باشترە. چونکە گەرەنتییەکی خۆی نییە، تاکلایەنە ئەو هەنگاوانە دەهاوێژین، ئەگەر تورکیا هەنگاوێکی بهاوێشتبایە ئەوا ئەو هەنگاوانەی ئێمەش لەشوێنی خۆیدایە" هەندێکی دیکەش دەیانگووت:" ئەو هەنگاوانە مسۆگەر هەڵەن، پێویستە ئێمە بەردەوامی بەشەڕ بدەین". واتا تورکیا ئاشتی ناکات و دەستبەرداری شەڕ نابێت، کەواتە بۆچی ئێمە ئەو هەنگاوانە بهاوێژین؟ با ئێمە شەڕی خۆمان بەردەوام بکەین، پێویستە ئێمە گەریلا بۆ باشوور نەکشێنینەوە و گرووپی ئاشتیش نەنێرین. هەندێك هەڤاڵیش تێڕوانینی وەهایان هەبوو و وەهایان بەراست دەزانی.

بێگومان ئەو هەڤاڵانە زێدە لەپیلانگێڕی و ئامانج و تاکتیکەکانی پیلانگێڕییەکە تێنەدەگەیشتن. واتا نیازی ئەو هەڤاڵانە پاك و دروست بوو، بەڵام چۆن لەدژی پیلانگێڕی رابوەستین و چۆن بتوانین ئەنجام بەدەست بخەین؟ لەوە تێنەدەگەیشتن و دەیانخواست بەشەڕ لەدژی پیلانگێڕییەکە رابوەستین. هەڵبەتە ئەمەش پیلانگێڕییەکەی پووچەڵ نەدەکردەوە، ئەوەی لێشی تێنەگەشتبوون ئەمەبوو.

بۆ نموونە؛ ئەوانە بەئاشکرا لەدژی کشاندنەوەی هێزەکان و ناردنی گرووپی ئاشتی رادەوەستان. تەنانەت نەیاندەخواست هێزەکانیشمان بکشێنەوە، ئەوانە گوتیان:" ئێمە ناکشێینەوە" نەیانخواست تەعلیماتی تەڤگەر پێکبهێنن. بۆ نموونە؛ لە دێرسیم و ئامەد و ئەو ناوچانە، ئەوانەی لەدژی هاوێشتنی ئەو هەنگاوانە بوون دەیانخواست لەوێ

هێزەكانمان نەكشێنەوە. ئیدی تەڤگەر لەسەر ئەمە راوەستەی كرد و رەخنەی ئەو هەڵوێستانەیانی كرد و روونكردنەوەی دا، لەئاكامدا تەڤگەر بەو شێوەیە ئەو ئاستەنگییەی دەرباز كرد.

## ئەو ئاڵوگۆڕانەی لەدوای پیلانگێڕییەكە لەناو تەڤگەردا روویاندا و ئەو چەمكانەی سەریانهەڵدا چۆن رەنگدانەوەی خۆی لەناو ئەندام و كادیرانی ناو زیندانەكانی باكوور و توركیا دایەوە؟

لەناو زیندانەكانیشدا چەندین چەمك و نزیكبوونەوە سەریانهەڵدا؛ یەكێكیان ئەو چەمكە بوو كە خەتی تەڤگەری بەبنچینە وەردەگرت، هەڵبەتە لە زیندانەكاندا بەقورسایی ئەوان بوون و بالادەستیش هەر ئەوان بوون. ئەو هەنگاوانەی كە سەرۆك دەیهاوێشت ئەوان دەیانخواست لێی تێبگەن و بەگوێرەی ئەمەش هەنگاو بهاوێژن، لە زینداندا زۆربەی كادیران، دەتوانم بڵێم (٩٥٪) كادیرانی نێو زیندانەكان ئەو خەتەیان بەبنەما وەردەگرت. چەمكەكانی دیكەش هەبوون؛ كە یەكێكیان لەشەخسی "محەمەد جان یوجە"دا دەركەوتبوو، ئەوانە نزیكەی دە كەسێك دەبوون لە زیندانەكان، ئەوانە سۆسیالیزمی بنیادنراویان بەبنچینە وەردەگرت، واتا لەدژی ئەو هەنگاوانە رادەوەستان كە تەڤگەر دەیهاوێشت و رەتیان دەكردەوە. ئەوان دەیانگووت:" سەرۆك و (PKK) لەخەت و ئامانجی خۆیان دوور كەوتوونەتەوە، پێویستە ئەو خەتەی رابردوو بەرێوە بچێت". ئەو گروپە خاوەنداریێتییان لەو چەمكە دەكرد. واتا ئەو نوێبوونەوانەی كەوا سەرۆك لە تەڤگەردا پێشیدەخست ئەوانە رەتیان دەكردەوە. بۆچی؟ چونكە زیهنییەت و چەمكی سۆسیالیزمی بنیادنراویان بۆخۆیان بەبنەما وەردەگرت. سەرۆكیش بەتەواوی تەڤگەری لە سۆسیالیزمی بنیادنراو پاك دەكردەوە، كەچی ئەوان پێداگرییان لەسەر زیهنییەتی سۆسیالیزمی بنیادنراو دەكرد. بۆیە دژایەتی سەرۆك و تەڤگەریان دەكرد. ئەوانە بەتەواوی دۆگماتیزمیان بۆخۆیان بەبنەما وەردەگرت.

گروپێکی تریش لە زینداندا هەبوو، "فەرحان" ناوێك سەرکێشی ئەو گروپەی دەکرد، ئەوانەش گروپێکی بچووك بوون، نزیکەی (٢٥) کەس دەبوون ئەوانیش سەبارەت بەو نوێبوونەوەیەی کەوا سەرۆك لەتەڤگەردا پێشیدەخست، دەیانگووت:" ئێمە لەگەڵ ئەو نوێبوونەوانە داین" بەڵام ئەوەشیان بۆخۆیان دەکرد بە بیانوویێك کە تەڤگەر لەخەتی خۆی دەربخەن. تاکو خەتێکی دیکە پێشبخەن، بەتەواوی خەتێکی لیبرالییانە پێشبخەن، واتا لەژێر ناوی گۆڕانکاری و نوێبوونەوەدا پێویستە تەڤگەر دەستبەرداری مێژووی خۆی ببێت. دەستبەرداری لە رەنجی خۆی بکات، دەستبەرداری لەهەموو شتێکی خۆی ببێت. ئەوانەش دەیانخواست نوێبوونەوەی وەها پێشبخەن. بێگومان ئەمە خەتێکی نکۆڵیکارانە بوو، خەتێك بوو بەناوی گۆڕان و نوێبوونەوەوە نکۆڵیکردنی بەبنەما وەردەگرت. بێگومان تەڤگەر لەدژی هەردوو خەتیش راوەستا. یەکێکیان نوێبوونەوە رەتدەکاتەوە، ئەوەی تریشیان بەناوی نوێبوونەوەوە تەڤگەر و مێژووەکەی و بەهاکانی و پرەنسیپەکانی خەتی رەتدەکردەوە و خەتێکی دیکە لەپێش خۆی دادەنێت. بۆیە هەردووکیشیان نکۆڵیکردنیان بەبنچینە وەردەگرت.

تەڤگەر لەدژی هەردوو ئەو چەمکەش راوەستا و مەحکومی کرد و ئەو تەخریباتانەی هەر دوو گروپ دەیانخواست ئەنجامگیر نەبوون. هەڵبەتە هێزێکی ئەوتۆشیان نەبوو، هەم ژمارەی خۆیان پڕ کەم بوو، هەمیش لەرووی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنیدا توانستێکی بەهێزیان نەبوو، لەناو تەڤگەریشدا کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو. لە زیندانیشدا هەر کەس پراکتیکی ئەوانەیان دەزانی، هەم لە زینداندا و هەمیش لەدەرەوە دەزانرا. هەڵبەتە کە "محەممەد جان یوجە" دەستگیر کرابوو، تەسلیم ببوو. هەڤاڵان و هەڤاڵ "مستەفا قەرسو" و ئەوان بۆ ئەوەی لەسەر تەڤگەر نەبێتە بەڵا و دووژمن لەدژی تەڤگەر بەکاری نەهێنێت، هاوکاریان کردبوو و لەشوێنی تەسلیمکارانیان دەرخستبوو و خستبوویانە نێو هەڤاڵانەوە، بۆ ئەوەی بیپارێزن. رەوشی ئەو وەهابوو.

سەبارەت بە"فەرحان"یش؛ سەرۆك لەکاتی خۆیدا لە ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز قاوی دابوو (دەریکردبوو). لەمێژووی ئەم تەڤگەرەدا سەرۆك دوو کەسی لەناو تەڤگەر دەرکردووە، هەروا زوو بەزوویی کەسێکی وەدەرنەدەنا. چونکە سەرۆك دەیگووت:" ئەگەر کەسێك سەدا یەك (٪١) باشەی هەبێت بۆ ئێمە ئەو لەسەدا یەك (٪١)ە بەبنچینە

و بەبنەمای وەردەگرین" نزیکبوونەوەی خۆی بۆ کەسەکان لەسەر ئەو بنەمایە بوو. واتا باوەڕییەکی بەهێزی بە مرۆڤەکان، کەسەکان هەبوو، کەسێك چەندە بێهێز و نەزانیش بێت مرۆڤ دەتوانێت بیکاتە کەسێکی تێگەیشتوو.

سەرۆك دەیگووت:" لە کوردستاندا کەسێك لە من لاوازتر و نەزانتر و ترسنۆکتر نەبوو، ئەگەر من لەخۆمدا ئەو هێز و کەسێتی و پێشکەوتنەم ئافراند، ئەوا هەر مرۆڤێکی کورد دەتوانێت بەو شێوەیە خۆی بئافرێنێت". باوەڕی بەمە هەبووە و فەلسەفەی خۆی ئەمەیە، هەر مرۆڤێك دەتوانێت ببێتە هێزێکی مەزن، لەمرۆڤ بەهێزتر نییە، چونکە هەموو شتێك ئەقڵی مرۆڤ دروستی دەکات، شتێك نییە لەدەست مرۆڤ دەربچێت، بەو نزیکبوونەوەیە لەمرۆڤ نزیکبووەوە، بۆیە سەرۆك مرۆڤی بەهێز دەکرد و دەیخستە سەر پێی خۆی. ئیدی سەرۆك نزیکبوونەوەی خۆی لەسەر ئەو بنەمایە بوو، بۆیە زوو بەزوو مرۆڤێکی بەلاوە نەدەنا. بەڵام تەنیا دوو مرۆڤی بەلاوە ناوە، کە یەکێکیان ئەو "فەرحان"ە بوو، چووبوو لە زیندان دیسان پەیوەندی لەگەڵ هەڤاڵاندا دروستکردبووەوە، رەخنەدانی خۆی دابوو، هەڤاڵانی زیندانیش لە "زیندانی ئەستەنبۆڵ" رەوشی ئەویان نەزانیبوو و پەسندیان کردبووەوە. ئیدی یەکێك لەوانەی کێشە و گرفتی دەنایەوە ئەوبوو. "فەرحان" خیتابی چی دەکرد؟ خیتابی کەسە لاواز و بێ وزە و تواناکانی دەکرد، کەسێك باوەڕی و مۆڕاڵی خۆی کەم بێت یان تێنەگەیشتوو بێت. هەڵبەتە بۆیە چەمکێکی تەواو لیبرالی بەبنەما وەردەگرت. ئیدی لەو زیندانەدا هەندێك کەسی وەهای لەدەوری خۆی کۆکردبووەوە، نزیکەی (٢٠ تا ٢٥ )کەس دەبوون. ئەو کەسانەی کە لە زینداندا بەرگەیان نەگرتبوو، ئەوەی نیوە تەسلیم بووبێت و باوەڕی خۆی شکابووبێت، ئەوجۆرە کەسانەی لەدەوری خۆی کۆکردبۆوە. ئەو نوێبوونەوانەی کە لەنێو تەڤگەردا بەدیهاتبوو بۆخۆی دەکردە دەمامکێك. بۆیە نەیانتوانی زێدە کاریگەری خۆیان دروست بکەن، چونکە هێزێکی ئەوتۆی خۆیان نەبوو.

**لەو قۆناخە و لەدۆخێکی وەهادا، لەلایەك مەیل و چەمکی نکۆڵیکردن، رەتکردنەوە و دوودڵی دەهێنا. لەلایەکی دیکەشەوە**

**سووربوون و شێلگیری بۆ پرۆسەی گۆڕان و نوێبوونەوە و گۆڕانکاری ستراتیژی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، لەدۆخێکی وەهادا حەوتەمین کۆنگرەی (PKK) کە کۆنگرەیەکی ئاوارتە بوو، سازدەدرێت... ئەو چەمك و مەیلانە چۆن لەناو کۆنگرەدا رەنگ دەدەنەوە؟ تا چەند و چۆن گۆڕانکاری ستراتیژی لە کۆنگرەدا خۆی بەرۆژەڤ دەکات؟ لەم رووەوە کۆنگرە چ گۆڕانکارییەکی سەرەکی ئەنجام دەدات و چ رێنمایی و بڕیار و ئاکامێك لەگەڵ خۆیدا دێنێت؟**

کاتێك حەوتەمین کۆنگرە سازدرا هێشتا کاریگەری پیلانگێڕییەکە لەسەر تەڤگەر مابوو. لەناو تەڤگەردا گرووپی چەتەگەرێتی "د. سلێمان" و "زەکی بچووك" سەریهەڵدا، هەڵبەتە سەرۆکی ئەو گرووپەش "بۆتان" بوو. بەڵام "بۆتان" خۆی نیشان نەدەدا و وا خۆی نیشاندەدا کە لەگەڵ تەڤگەر دایە، واتا ساختەکاری بەو شێوەیەی دەکرد، ئەو گرووپە چەتەیە بێباوەڕیی بۆخۆی بەبنەما وەرگرتبوو و بەمەش خیتابی کادیرانی دەکرد، ئەو دوودڵییەی لەکادیراندا هەبوو بۆخۆی بەبناخە وەردەگرت، کە چۆن بتوانن ئەو دوودڵییە قووڵتر بکەنەوە و بیگەیننە بێباوەڕێتی؟ چۆن بتوانن ئەوانە لەتەڤگەر دابڕێنن؟ ئەمەیان بۆ خۆیان بەبنەما وەردەگرت. بۆیە خیتابی سۆز و غەریزە و لاوازی ئەوانیان دەکرد. کێ کێشەی شەخسی خۆی هەیە، کێ لەگەڵ رێکخستندا کێشە و گرفتی هەیە، کێ بۆ ئەو قۆناخە و لەبەرامبەر ئەو قۆناخەدا دوودڵی خۆی هەیە، کێ لە بێباوەڕیدا دەژیت؟ کێ دەخوازێت ژیانێکی شەخسی بۆخۆی بژیت؟ خیتابی هەموو ئەوانەیان دەکرد. دەیانخواست ئەو چەمك و مەیلانەی لەدژی رێکخستنن و ناکەونە ناو رێکخستنەوە بەهێز بکەن، لەسەر ئەو بنەمایەش تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. بێگومان ئەوانە هێز و توانستی خۆیان لە پیلانگێڕییەکە و هێزە دەرەکییەکان وەردەگرت. دەیانبینی هێزە دەرەکییەکان دێنەسەر تەڤگەر، دەیانخواست سوود لەمە وەربگرن، تەنانەت هەندێکیان پەیوەندیشیان لەگەڵ ئەو هێزانەدا هەبوو. لەرێگەی

ئەوانەوە دەیانخواست لەنێو تەڤگەردا ئەنجامگیر ببن. لەو باوەڕەشدا بوون کە ئەنجامگیر دەبن. هەرچی کێشە و گرفتی نێو تەڤگەر هەبوو لەدژی تەڤگەر بەکاریان دەهێنا و بەمەش دەیانخواست بەسەر تەڤگەردا زاڵ ببن.

بۆ نموونە؛ ئەو کێشەیەی ژن کە لەدوای شەشەمین کۆنگرە دەرکەوتبوو، دەیانخواست بۆ خۆیان بکەنە بنەمایەك، بەمەش خیتابی هەڤاڵانی کچیان دەکرد، گوایە" ناحەقی لەنێوە کراوە، ئێوە راستن، ئێوە راستبوون و تەڤگەر هەڵەبوو، بەرێوەبەرایەتی تەڤگەر هەڵەبوو، ناحەقی لەنێوە کراوە..." تاکو بەمە هەڤاڵانی کچ لەدژی تەڤگەر بوروژێنن. ئەو کادیرانەی ئەو کاتە لەنێو دوودڵی و بێباوەڕیدا دەژیان خیتابی ئەوانەیان دەکرد، بۆ ئەوەی ئەوانە بخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە، تا بتوانن بێ بڕیاری ئەوان قووڵتر بکەنەوە. بەهەندێکیان گووتبوو:" ئیدی پێویستە بۆخۆمان بژین... تاکو ئێستا خەباتمان کرد، ئێستاش پیلانگێڕی هەیە، سەرۆکیش دەستگیرکرا و ئیدی شتێك نەماوە ئێمە بیکەین، پێویستە ژیانی شەخسی خۆمان بەبنچینە وەربگرین"، ئیدی خیتابی ئەو جۆرە کەسانەیان دەکرد.

هەروەها ئەو کاتە "ناسر" هەبوو، مەیل و چەمکەکانی ئەویش هەبوو، کە بەتەواوی نارێکخستنی (ئانارشیزم)ی بەبنەما وەردەگرت، لەدژی چەمکەکانی تەڤگەر رادەوەستا، "ناسر" دەیگووت:" ئەو رەخنە و رەخنەدانە چییە؟ ئیدی پێویست ناکات، هەرکەسێك چۆنی دەوێت با وەها بژیت و چۆنی دەیەوێت کاربکات با وەها کاربکات" ئەمەش لەگەڵ حیساباتی هەندێك کەسدا یەکانگیر دەبووەوە. ئیدی گروپی چەتەگەرێتی دەیخواست بەتەواوی سوود لەو مەیل و چەمکە وەربگرێت و حیساباتی خۆی پێشبخات. واتا هەرچی کێشەی کادیران هەبوو، هەرچی کێشەی کادیران و رێکخستن هەبوو هەموویان بۆخۆیان دەکردە زەمینەیەك و لەسەر ئەو بنەمایەش بتوانن لەدژی تەڤگەر رێککەوتنێك دروستبکەن، تاکو بتوانن لەکۆنگرەدا ئەنجام بەدەست بخەن. ئەوانە وا حیساباتییان دەکرد کە دەتوانن ئەنجامگیریش ببن. دەیانگووت:" ئیدی گروپێکی بچووك هەیە کە تەڤگەر بەبنەما وەردەگرێت، ئەوانەی دیکە دەتوانین هەموویان بەئاسانی رێکخستە بکەین" لەسەر ئەو بناخەیە حیساباتی خۆیان پێشخستبوو.

بێگومان کاتێك ئێمە کەوتینە کۆنگرەوە، بینیمان هەوایەکی وەها دروستبووە و لەسەر ئەو بنەمایە کاریان کردووە و ئامادەکارییان کردووە و دەشخوازن لەکۆنگرەدا ئەنجام بەدەست بخەن. تا سازدانی حەوتەمین کۆنگرە، ئەو نوێبوونەوەیەی سەرۆك لە تەڤگەردا پێشیخستووە، هێشتا تەڤگەر و کادیران بەتەواوی لێی تێنەگەیشتبوون. لەمەشدا زێدە یەکلایی بوونەوەیەك بەدینەهاتبوو، سەرۆك لەسەر چ بنەمایەك گۆڕانکاری و نوێبوونەوەی ئەنجام دەدا و قووڵی دەکردەوە؟ ئەو کاتە هەندێك ئاخافتنی سەرۆك لەرێگەی پارێزەرانییەوە دەهاتن و دەگەیشتنە تەڤگەر. بەڵام ئەمە بەتەواوی تێگەیشتن لێی بەدینەهاتبوو، بۆیە هەندێك کەسیش بەگوێرەی خۆیان لێی تێدەگەیشتن. ئیدی گۆڕانکارییەکی چۆن لەکۆنگرەدا ئەنجام دەدرێت؟ یەکلایی نەببوو هەرکەسێك دەیخواست بەگوێرەی خۆی گۆڕانکاری ئەنجام بدات. ئیدی ئەو گروپە چەتەگەرییەی "د. سلێمان" و ئەوان بینیبوویان کە لەنێو کادیراندا یەکلایی بوونەوەیەك نییە. ئەگەر خیتابی ئەوجۆرە کادیرانە بکەن ئەوا دەتوانن بەشداربووانی کۆنگرە بخەنە سەرپێیان، دەتوانن کۆنگرەش بخەنە دەستی خۆیانەوە، کاتێك کە کۆنگرە دەستپێیکرد، کە هەندێك ئاخافتن کران ئەمە زانرا. واتا ئەوانە خیتابی سۆز و غەریزە و نارێکخستنی دەکەن و لەژێر ناوی گۆڕانکارییدا بەتەواوی بەگوێرەی هەرکەسێك واتایەك بە گۆڕانکاری دەدەن و بەتەواوی بێ رێکخستنی و پەرشوبڵاوی پێشدەخەن، ئەمە کاریگەری خۆیشی هەیە. بۆیە من ئەو کاتە هەڵسام قسەم کرد و گووتم:" لێرەدا رۆحی "سەمیر" دەگەڕێت و دەسووڕێت، من ئەوە دەبینم..." کاتێك من ئەو قسەیەم کرد، کاریگەرییەکی خۆی لەسەر کۆنگرە کرد. ئەو هەوا و ئاتمۆسفێرەی تا ئەو کاتە دروستکرابوو، گۆڕا. واتا بەشدارانی کۆنگرە تێگەیشتن کە گروپی چەتەگەرێتی دەخوازێت چی بکات...؟ چونکە راستینەی ئەوان ئاشکرا بوو، تا ئەو کاتە بەشدارانی کۆنگرە زێدە نەیاندەزانی کە ئەو گروپە دەخوازن چیبکەن؟! بەقورسایی لەکۆنگرەدا بەشدارانی کۆنگرە وریابوونەوە. بۆیە لەسەر خەتی سەرۆك کۆکردنەوەیەك لەکۆنگرەدا بەدیهات. کاتێك کە ئەمەیان بینی، ئیدی زانیان کە ناتوانن ئاڵۆزی لەناو کۆنگرەدا دروستبکەن، ناتوانن هەروا خیتابی سۆز و غەریزەی هەموو کەسێك بکەن، خۆیان بۆ دواوە کشاندەوە. ئەو تاکتیکەی کە "سەمیر" لەناو کادیراندا کە لە گۆڕەپانی

فەلەستینییەکاندا بووین لەیەکەمین کۆنفرانس و دووەمین کۆنگرە بەڕێوەی دەبرد، ئەوانەش هەمان شتیان بەڕێوە دەبرد. چونکە "سەمیر"یش سوودی لە کەموکوڕی و هەڵەکان و کێشەکانی کادیر لەناو ڕێکخستندا وەردەگرت. ئەو شێوازەی بەڕێوەی دەبرد هەمان شێواز بوو. واتا کێشەکانی کادیر چۆن لەناو ڕێکخستندا قووڵ بکاتەوە؟ چۆن داخوازییە شەخسییەکانیان زیاتر بوروژێنێت و ختووکەیان بدات؟ ئەوانیش وەکو "سەمیر" خیتابی ئەو شتانەیان دەکرد، خیتابی مەیلەکانی ئەوانیان دەکرد. ئەوانەش هەمان شتیان دەکرد، لەبەر ئەوەش بوو من گووتم:" لێرەدا ڕۆحی "سەمیر" دەگەڕێت...!!". ئیدی لەئاکامی ئەوەدا لەکۆنگرە کۆکردنەوەیەك هاتە ئاراوە، کۆنگرە نەکەوتە مەترسییەوە و بەسەرکەوت.

ئەوان وا حیسابیان دەکرد کە لەکۆنگرەدا ئەنجامگیر دەبن و تەفگەر دەخەنە دەستی خۆیانەوە. هەڵبەتە لەپشت ئەوانیشدا چەندین دەوڵەت و پارتی هەبوون، بۆیە وا مەزەندەیان دەکرد کەوا بەئاسانی دەتوانن ئەنجام بەدەسبخەن...

## لەم ڕووەوە؛ هێزە دەرەکییەکان چ ئومێد و چاوەڕوانییەکیان لەئاکامی کۆنگرە هەبوو...؟

بەڵێ، ئومێد و چاوەڕوانی هێزە دەرەکییەکانیش هەبوو، واتا ئەوانیش وا حیسابیان دەکرد کە بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی ئەو گروپە بەوانیان داوە، دەیانگووت:" بەئاسانی ئەو کۆنگرەیە دەخەنە دەستی خۆیانەوە". ئەوان چاوەڕوانییەکی بەو شێوەیەیان هەبوو. بێگومان چاوەڕوانییەکانی ئەوانیش بێهودە بوو و پووچەڵ بووەوە. وەکو ئەوان مەزەندەیان دەکرد کۆنگرە وەها ئەنجام نەدرا، بەڵکو کۆنگرە کەمێك لەسەر ئەو ڕۆژهڤانەی کەوا سەرۆك دیاری کردبوو سازدرا، لەوانەیە بە قووڵیش لەو نوێبوونەوەیەی کەوا سەرۆك لەناو تەفگەردا پێشیدەخست بەتەواوی تێگەیشتن بەدی نەهاتبێت. بەڵام لەسەر ئەو بنەمایە کۆنگرە بەڕێوەچوو و ئەنجام درا. ئیدی لە کۆنگرەدا هەندێك گۆڕانکاری ئەنجام درا. ئەو گروپە چەتەگەرییە دەیانخواست بەو

كۆنگرەیە تەڤگەر بەتەواوی لەمێژوو و رەگی خۆی دابڕێنن. ئامانجێكی وەهایان هەبوو. بێگومان ئەمە رووینەدا. واتا لەژێر ناوی گۆڕانكارییدا دەیانخواست ئەمە ئەنجام بدەن، رێ لەپێش ئەمە گیرا. كۆنگرە هەندێك گۆڕانكاری كرد و خستییە بەردەم خۆی. وەك مەسەلەی (ERNK) و (ARGK) و (PKK) گەلێك هەنگاو هاوێشتران. بێگومان لێرەدا هەندێك هەڵە و كێماسیش روویان دا. ئەو هەڵە و كەموكورپیانە چیبوون؟ یەكێك لەوانە، هەڵوەشاندنەوەی (ERNK) بوو، ئەمە هەڵەیەكی مەزن بوو. ئەو هەڵەیە پاشان سەرۆك بینی و خواستی بە دامەزراندنی كۆنگرەی گەلی كوردستان (كۆنگرا گەل KONGRA GEL) ئەم هەڵەیە راست بكاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە كۆنگرەی گەلی پێشخست. یەكێك لەهەڵە مەزنەكانی حەوتەمین كۆنگرە ئەو خاڵەدا بوو. ئەمە لەكاتێكدا سەرۆك ئەو نوێبوونەوەیەی پێشیدەخست لەسەر چ بنەمایەك بوو؟ لەسەر ئەو بنەمایە بوو كە دەبووایە تەڤگەر بكەوێتە سەررێی دیالۆگ و رێی سیاسی و دیموكراتییانە بۆخۆی بناخە وەربگرێت. ئەمەش مەگەر لەسەر گەل و رێكخستنی گەل پێشبكەوێت. واتا ئیدی تاكتیك گەریلا نییە، تاكتیك بزاڤی گەلە، سەرهەڵدانە، بەرخۆدانی گەلە، رێكخستنی گەلە، چالاكی گەلە، گەلیش بەبێ رێكخستن ناتوانێت خۆی بكاتە هێزێك و بكەوێتە نێو چالاكی نواندنەوە. (ERNK) رێكخستنی گەل بوو، ئەو ستراتیژی و تاكتیكەی كەوا سەرۆك پێشیدەخست نەك لەسەر گەریلا، بەڵكو لەسەر بنەمای گەل پێشیدەخست. پێویست دەكات تۆش رێكخستن و رێكخستەبوونی گەل بەهێز بكەیت، چالاكییەكانی گەل بەهێز بكەیت. ئێمە چیمان كرد؟ ئێمە رێكخستنی گەلمان خستە لایەكەوە. لەمەدا هەڵەی مەزنمان ئەنجام دا. لەبەر ئەوەی رێكخستنی گەل (ERNK)مان هەڵوەشاندەوە و گەلمان بەبێ رێكخستن هێشتەوە، بۆیە سەرهەڵدانی گەل پێشنەكەوت، لەبەر ئەوەی سەرهەڵدانیش پێشنەكەوت، قۆناخی چارەسەریش پێشنەكەوت، بەگوێرەی ئەمەش ستراتیژ و تاكتیك و رێكخستەبوون و چالاكیش پێشنەكەوت. ئیدی ئەمەش نەكەوتە خزمەتی ئەو خەبات و هەوڵدانانەی كە سەرۆك دەیكرد بۆ ئەوەی رێی چارەسەری بكاتەوە و بەهێزی بكات. ئەگەر توركیا بۆ چارەسەری هەنگاوی نەهاوێشت یەكێك لە هۆكارەكانی ئەوەبوو كە بزاڤی گەل پێشنەكەوت تاكو فشار بخاتە سەر توركیا و ناچاری هەنگاو هاویشتنی بكات. بۆیە

قۆناخی چارەسەری پێشنەکەوت. ئەگەر سەرهەڵدان پێشبکەوتبایە، لەوانەبوو تورکیاش هەندێك هەنگاوی بهاوێشتبایە، ئەوەی هەنگاوی بە تورکیا هاوێشتبایە ئەمەبوو، ئەوەی قۆناخی چارەسەری پێشخستبایە ئەمەبوو، ئەویش پێشنەکەوت. بۆچی؟ چونکە ئێمە رێکخستنی گەل (ERNK)مان نەهێشت و هەڵمانوەشاندەوە، بۆیە سەرهەڵدان پێشنەکەوت و قۆناخی چارەسەری پێشنەکەوت. ئێمە بەمە هەڵەی هەرە مەزنمان کرد.
لەچوارچێوەی پرۆسەی نوێبوونەوە و گۆڕانکارییدا هەندێك هەنگاوی چەوتیشمان هاوێشت. ئیدی ئەمە لە تەڤگەردا ناهاوسەنگییەکی دروستکرد. واتا پیلانگێڕان سەرەتا دەیانخواست تەڤگەر نوێبوونەوە لەخۆیدا ئەنجام نەدات، بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانی زەبر لەتەڤگەر بوەشێنن. کاتێك کە بینیان سەرۆك سوورە و نوێبوونەوە هەر پێشدەخات، ئەمجارە هەوڵیاندا تێگەیشتنی راست لەو نوێبوونەوەیە بەدینەیەت، بەڵکو تێگەیشتنی هەڵە لەسەر ئەو نوێبونەوەیە بکرێت و بەهەڵەش پراکتیزە بکرێت. ئیدی بەمشێوەیە زەبر لەتەڤگەر بوەشێنن.
وەك چۆن لە سۆڤییەتدا کاتێك کە "گۆرباتشۆف" دەستی بە نوێکردنەوە کرد و ئەوانە کاریان دەکرد کە ئەو نوێبوونەوەیەیان لەدژی خودی سۆڤییەت بەکارهێنا و بەمەش سۆڤییەتیان پەرشوبلاوە پێکرد، بۆ تەڤگەری ئێمەش خواستیان هەمان شت بکەن، خواستیان سوود لە هەڵەکانی ئێمەش وەربگرن، تاکو بتوانن ئەو قۆناخە پێچەوانە بکەنەوە، کە لەبری نوێبوونەوە پەرشوبلاوی دروست بکەن. بۆیە ئێمە لەو قۆناخەدا لەنێو مەترسی بەمجۆرەدا دەژیاین، چونکە لەژێر پیلانگێڕی و هێرش و موداخەلەیەکی مەزن داین و سەرۆکیش دەستگیرکراوە، تۆ بێیتو نوێبوونەوە پێشبخەیت، ئەمە هەروا ئاسان نییە. واتا لەوانەبوو ئەو نوێبوونەوەیە وەك سۆڤییەت تەڤگەریش تێك بدات و هەڵیوەشێنێتەوە. ئەو مەترسییە لەئارادا هەبوو، ئیدی ئێمەش کارمان دەکرد کە نەکەوینە نێو رەوش و دۆخێکی وەك ئەوەی سۆڤییەت و رووبەڕووی وەها رەوش و دۆخێك نەبینەوە.
ئێمە لەنێو مەترسی و زەحمەتی وەهادا دەژیاین، هەم لەژێر پیلانگێڕییەکەدا ئەو نوێبوونەوەیە ئەنجام دەدرێت، کە مەترسیدارە، هەمیش ئەو نوێبوونەوەیەی سەرۆك بەرەو پێشەوەی دەبات، بەتەواوی تێگەیشتن لێی بەدینەهاتووە، هەموو ئەمانە مەترسی

لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. بۆیە لەناو ئێمەشدا هەندێك کەس دەیانخواست لەژێر ناوی نوێبوونەوەدا پەرشوبڵاوی و لێك هەڵوەشاندنەوە پێشبخەن. بۆیە ئێمە لەهەندێك رووەوە بەتەدبیر لە پرۆسەی نوێبوونەوەکە نزیك دەبووینەوە. واتا ئێمە نەماندەتوانی ئەو گۆڕانکارییانەی کە پێویستبوو لە کات و ساتی خۆیدا ئەنجامی بدەین ئەو هەنگاوانەمان بهاوێشتبایە. بەڵام دەمانبینی؛ ئەگەر ئەو هەنگاوە بهاوێژین لەژێر مەترسیدا دەبین، بۆیە ئەو هەنگاوەمان نەهاوێشت و درەنگمان خست. بێگومان ئەمانە هەمووی بۆ ئێمە کێشە و گرفتی دەنایەوە. ئیدی لە حەوتەمین کۆنگرەدا هەندێك هەنگاومان هاوێشت، هەنگاوی راستمان هاوێشت، هەندێك هەنگاویش کە پێویستبوو بیانهاوێژین، کە دەمانبینی ئەگەر بیهاوێژین مەترسیدارە، نەمانهاوێشت. هەندێك هەنگاویش کە هاوێشتمان بەراستمان دەزانی، بەڵام پاشان دەرکەوت بەهەڵە ئەو هەنگاوەمان هاوێشتووە. ئیدی ئەو هەنگاوە هەڵانەی کە هاوێشتبوومان و ئەو هەنگاوانەش کە پێویستبوو بهاوێژرێت نەهاوێشتران بۆ ئێمە مەترسی و کێشە و گرفتی دەنایەوە...

**وەك لەشرۆڤەکەی خۆشتاندا باستان لێوەی کرد؛ لەلایەکەوە ئەو گروپە چەتەگەرییەی د. سلێمان و زەکی بچووك هەڵدێن، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو چەمك و مەیلانەی لەدوای شەشەمین کۆنگرەوە لەلایەن هەندێك لەکەسانی ناو تەڤگەری ژندا پەرەیسەندبوو، وەکو دیاردەبێت لەکۆنگرەی حەوتەمیشدا سەرهەڵدەداتەوە و خۆی دووپات دەکاتەوە. واتا ئەوەی بەدیار دەکەوێت؛ ئەو رێنمایی و بڕیار و هەنگاوانەی حەوتەمین کۆنگرە بۆ نوێبوونەوە و گۆڕانکاری ئەنجامی دا زۆر بەزەحمەتی پراکتیزە دەکرێت. هەم ئومێد و چاوەڕوانییەکانی هێزە دەرەکییەکان پووچەڵ دەبێتەوە، هەمیش**

**ئەوەی دەیخوازرێت ئەنجام بدرێت بەتەواوی ناتوانرێت هەنگاوی بۆ بنرێت. لەرەوشێکی وەهادا، ئەو پراکتیکەی تەڤگەر لەدوای حەوتەمین کۆنگرەوە چۆن بەڕێوە دەچێت...؟**

هەڵبەتە وەکو گووتم؛ گروپی چەتەگەری حیساباتی سەرەکی خۆیان لەسەر تەڤگەری ژن کردبوو. چونکە دوای کۆنگرەی شەشەم کێشەی ژن لەتەڤگەردا دەرکەوتبوو، حیساباتی خۆیان لەسەر ئەوە کردبوو، کە لەحەوتەمین کۆنگرەشدا، لەسەر ئەو کێشەیە هەنگاو بهاوێژن و ئەنجام بەدەستبخەن. بۆیە خیتابی ژنانیان دەکرد و دەیانگووت:" ناحەقی لەبەرامبەر ئێوە کراوە..." دەیانخواست بەمشێوەیە پراواکسیۆن بکەن. بۆیە هەندێك پراواکسیۆنیش ئەنجام دران.

بێگومان لەناو تەڤگەری ژنیشدا کەسانێك هەبوون پەیوەندییان بە "بۆتان" و ئەوانەوە هەبوو. لەبنەڕەتدا "بۆتان" ئەوانەی دەخستە ناو پراواکسیۆنەوە. هەڵبەتە ئێمە ئەو کاتە نەماندەزانی، ئێمە وامانەدزانی کەوا تەنیا "د.سلێمان" و "ناسر" پراواکسیۆن دەکەن، بەڵام لەبنەڕەتدا ئەوەی پراواکەی دەکرد "بۆتان" بوو، بەڵام خۆی دەشاردەوە، خۆی وانیشاندەدا کە لەگەڵ تەڤگەردایە، پاشان ئێمە لەم راستییە تێگەیشتین. بۆیە تەڤگەری ژن هەم لەکۆنگرەی حەوتەمدا، هەمیش لەدوای کۆنگرەوە هەندێك کێشە و گرفتیان بۆ تەڤگەر نایەوە، لەبەر ئەوەی ئەوانیان وروژاند بوو. بێگومان ئێمە نەهاتینە نێو ئەم وروژاندن (تحريض)ەوە. ئەوان دەیانخواست کە ئێمە بوروژێین، تاکو ئەمەش لەدژی ئێمە بەکاربهێنن و ئەنجامگیر ببن، ئێمە هەندێك لەو لەیستۆکە تێگەیشتین، بۆیە ئێمە نەوروژاین و ماقووڵانە نزیك بووینەوە، بۆیە ئەو تاکتیکەی ئەوان پووچەڵ بووەوە. هەڵبەتە لەم رووەوە زەبرێکی مەزنیان خوارد. حیساباتی سەرەکی خۆیان لەسەر ژن کردبوو، ئەو حیساباتەش بەمشێوەیە پووچەڵ کرایەوە.

لەدوای کۆنگرەشەوە؛ هەموو هەوڵی خۆیان بۆ ئەوە چڕ کردبۆوە کە بتوانن بڕیارەکانی کۆنگرە پووچەڵ بکەنەوە و ئەو هەنگاوانەی تەڤگەر دەخوازێت بیانهاوێژێت پووچەڵی بکەنەوە، هەروەها ئەو هەڵە و کەموڕییانەی لەنێو تەڤگەردا لەئارادایە لەدژی تەڤگەر

بەکاربهێنن لەسەر ئەو مەسەلانە کاریان کرد. لەمیانەی پەیوەندییان بەهێزی دەرەوەش خواستیان ئەو هەنگاوانەی بەناوی گۆڕانکارییەوە بەهەڵە هاوێشتبوومان، هەروەها ئەو هەنگاوانەی کەوا پێویستبوون بیهاوێژین و نەمانهاوێشتووە، کە هەمووی ئەمانە کێشەی لەگەڵ خۆیدا هێنا لەدژی تەڤگەر بەکاربهێنن، لەسەر ئەم بنەمایە دەستیان بە جموجۆڵ کرد. ئیدی گوایە:" گۆڕانکاری نەبووە، لەگۆڕانکاری دەترسێن، ناهێڵن گۆڕانکاری ئەنجام بدرێت، ناهێڵن بەگوێرەی خەتی سەرۆك گۆڕانکاری بکرێت..." بەمشێوەیە ئەو پڕوپاگەندانەیان دەکرد، بەمەش دەیانخواست ئاڵۆزی دروستبکەن، خواستییان کێشەکانی تەڤگەر لەدژی تەڤگەر بەکاربهێنن و لەمەش ئەنجام بەدەستبخەن. کاتێك کە دەستیان بەوجۆرە کارانە کرد، بێگومان تەڤگەریش چووە سەریان و بانگهێشتی جددییەتی کردن و پێیانی گووت:" ئەگەر دەخوازن گفتوگۆ بکەن بەفەرمی گفتوگۆ بکەن، بەو شێوەیە بەنهێنی گفتوگۆ کردن، کێشەی تەڤگەر لەدژی تەڤگەر، کێشەی کادیر لەدژی کادیر بەکارمەهێنن...". بێگومان کاتێك ئەو زەمینەیەی پڕوپاگەندەیان لەسەر دەکرد لەدەستی ئەوانمان دەرخست، ئیدی نەیاندەتوانی شتێك بکەن، بۆیە ئەو تاوان و خراپەکارییەی کردبوویان ئاشکرابوو، کە لەگەڵ هەندێك هێزی دەرەوە ئەو شتانەیان کردووە، بۆیە لەناو تەڤگەر هەڵاتن، هەڵاتن و چوونە لای (ی ن ك) لەوێش خواستیان بەهاوکاری (ی ن ك) زەبر لەتەڤگەر بوەشێنن. ئیدی چوون گووتیان:" تەڤگەر لاواز بووە و کێشەی زۆری تێکەوتووە، کەس گۆنسەی سەرۆکایەتی تەڤگەر بەجددی وەرناگرێت، کەس لەگەڵ ئەواندا نەماوە، زۆر کەم لەگەڵیاندا ماون، ئەگەر مرۆڤ هێرشیان بکاتەسەر ئەوا ناتوانن شەڕ بکەن و بەرگە بگرن و هەموویان تەسلیم دەبن". زانیاری بەو شێوەیان بە (ی ن ك) دابوو، (ی ن ك)ش لەسەر بنەمای ئەو زانیارییانە جموجۆڵیان کرد. ئیدی شەڕی ساڵی (٢٠٠٠) بەو شێوەیە روویدا، ئەو گروپە چەتەگەرییەی کە هەڵاتن، "د.سلێمان" و ئەوان، چوونە لای (ی ن ك) و (ی ن ك)شیان وروژاند، لەلایەکی دیکەشەوە (ی ن ك) حیساباتی دیکەیشی هەبوو، کاتێك کە ئەو زانیارییە هەڵانەشی دەسکەوت و باوەڕی بەو زانیارییانەش کرد و پەلاماری تەڤگەری دا و خواستی زەبر لە تەڤگەر بدات، ئەوا لەمەدا دەستی ئێرانیش هەبوو، دەستی تورکیاش هەبوو. بۆیە شەڕی ساڵی (٢٠٠٠) زۆر مەترسیدار بوو. دوای دەستگیرکردنی سەرۆك

خواستیان بەو شەڕە تەڤگەر تەسلیم وەربگرن. بۆیە تەڤگەر بەرخۆدانێکی بەهێزی پێشخست. ئەو بەرخۆدانە بەرخۆدانێکی زۆر بەهێزە، ئەگەر تەڤگەر بەرخۆدانی نەکردبایە. ئەوا لەوانەبوو پیلانگێڕییەکە تەواو (کامڵ) ببایە. چونکە ئامانجی ئەو شەڕە ئەوە بوو کە ئیرادەی تەڤگەر بشکێنن و تەسلیمی وەربگرن. وا حیساباتیان دەکرد کە تەڤگەر ناتوانێت بەرخۆدان بکات و خۆی بپارێزێت. بەڵام تەڤگەر لەو نیازمیان تێگەیشت و ئەمەی کردە هۆی بەرخۆدانێکی مەزن. بۆیە بەرخۆدانیساڵی (٢٠٠٠) بەرخۆدانێکی مێژووییە. شەهیدانی ئەو کاتەش لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا خاوەن تایبەتمەندییەکی خۆیانن. هەموو شەهیدان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەڵام هەندێك شەهید هەن لەهەندێك قۆناخدا زۆر گرنگن. چونکە چارەنووسی تەڤگەر دەستنیشان دەکەن. شەهیدانی ساڵی (٢٠٠٠)یش شەهیدی بەمجۆرەن، چارەنووسی تەڤگەریان دەستنیشان کرد. بۆیە لەمێژووی تەڤگەردا شوێنێکی تایبەت و شکۆدار و گرنگیان هەیە.

دوای کۆنگرە، تەڤگەر لەلایەکەوە لەبەرامبەر شەڕی ساڵی (٢٠٠٠) راوەستا و بەرخۆدانێکی بەهێزی پێشخست، لەلایەکی دیکەوە لەدژی ئەو تەخریباتانەی گروپی چەتەگەرێتی هەڵاتوو راوەستا، بۆ ئەوەی ئەو تەخریباتانە نەهێڵێت. لەلایەکی دیکەشەوە لەسەر ئەوە راوەستەی دەکرد کە ئەو بڕیارانەی لە حەوتەمین کۆنگرەدا وەریگرتووە پراکتیزەی بکات.

هەروەها تەڤگەر تاکتیکی سەرهەڵدانی خستبووە بەرنامەی خۆیەوە، بەڵام رێکخستن (رێکخراو)ی ئەمە لەئارادا نییە. بۆیە خواستی لەمیانەی کۆبوونەوەیەك ئەمە راست بکاتەوە، بەر لەشەڕی ساڵی (٢٠٠٠) کۆبوونەوەیەکی ناوەندی سازدرا. لەو کۆبوونەوەیەدا ئێمە بڕیارمان دا کە هەندێك هەنگاو سەبارەت بە رێکخستەبوون بهاوێژین، خواستمان ئەو هەڵانەی کە لەکۆنگرەی حەوتەمدا کردوومانە راستی بکەینەوە، بەڵام کە ئەو هەنگاوەمان هاوێشت هێشتا کۆبوونەوەکە تەواو نەببوو (ی ن ك) هێرشی بۆ سەر ئێمە کرد. لەبەر ئەوەی ئامانجی هێرشەکەش تەسلیم وەرگرتنی ئێمە بوو، پێویستبوو لەبەرامبەر ئەو هێرشە رابوەستینەوە و خۆمان بپارێزین. بۆیە بەهەموو هێز و تواناکاری و تەرکیزی خۆمانەوە لەدژی ئەو هێرشە راوەستاین، ئەمەش ئەو هەنگاوەی

ئێمە دەمانخواست لەرووی رێکخستەبوونەوە بیهاوێژین زۆر درەنگ کەوت. ئەمەش بۆ ئێمە بووە زەرەر و لەدەستدانێك. هەڵبەتە لەکۆنگرەی حەوتەمدا هەنگاوێکی هەڵەمان هاوێشتبوو، خواستمان لەو کۆبوونەوەیەی بەر لەشەڕ راستی بکەینەوە، لەم رووەوە هەندێك بڕیاریشمان وەرگرت کە هەنگاوی بۆ بهاوێژین، بەڵام هێرشی (ی ن ك) لەبەردەم ئەمە بووە ئاستەنگ. ئێمەش هەموو تەرکیزمان لەسەر ئەو شەڕە بوو، بۆیە ئەو بڕیارانەمان زۆر درەنگ کەوتە پراکتیکەوە. ئەمەش زۆر شتی لەدەست ئێمە دا.

**بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات، هەندێك جموجۆڵ لەئارادابوون کە ئاماژەی بەدەستپێکردنی هێرشێکی بەو جۆرەی (ی ن ك) دەدا، بۆ نموونە: ئەو دامودەزگاییانەی ئەو کاتەی لەناوچەی سنووری ئیدارەی (ی ن ك)دا هەبوون یەك بەدوای یەك لەژێر فشاردا دادەخران، پاشانیش هێرش کرایە سەر کامپی قەرەداخ و کۆمەڵکوژییەکی لێکەوتەوە، ئیدی ئاتمۆسفێری شەڕی دروستکرد. ئەو شەڕە لەرووی کاتەوە زۆری نەخایاند، بەڵام هەندێك مەسەلەشی لەگەڵ خۆیدا یەکلایی کردەوە. کەواتە ئەم شەڕە هەم بۆ هێزە دەرەکییەکان، هەمیش بۆ گرووپی چەتە، یان دوودڵ و بێ باوەڕەکانی ناو تەڤگەر، بەچ واتایەك دەهات؟ هەروەها چ ئەنجامێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا...؟**

ئەو شەڕە لەلایەکەوە، زەبرێکی مەزنی لەئێمە دا، لەلایەکی دیکەشەوە، بۆ ئەوەی تەڤگەر خۆی کۆبکاتەوە خزمەتی کرد. زۆر لەو کادیرانەی لەنێو کێشەدا بوون، کاتێك کە بینی (ی ن ك) هێرشی سەر تەڤگەر دەکات، ئەمەیان کردە مەسەلەی شەرەف و کەرامەت بۆخۆیان، واتا تێگەیشتن کە پیلانگێڕییەکە بەوجۆرە تەواو (کامڵ) دەکرێت.

ئەمەش بۆ هەر کەسێك بەواتای مردن دێت. بۆیە ئیدی زۆر لەو کادیرانەی لەنێو کێشە دابوون، کێشەکەی خۆیان خستە لایەکەوە و کەوتنە نێو بەرخۆدانەوە و لەگەڵ تەفگەردا بوونە یەك، لەم رووەوە ئەو هێرش و پەلامارەی لەدژمان کرا خزمەتی بەتەفگەر گەیاند، تاکو تەفگەر زووتر خۆی کۆبکاتەوە، هەروەها توانی ئەو کێشانەی کە کادیران تێیدا دەژیان و ئەو خراپەکارییانەی گروپی چەتەگەری دروستیان کردبوو بەلاوە بنێت و چەمکەکانی تەفگەر لەکادیراندا بچەسپێنێت. بەڵام لەروویێکی دیکەوە، هەڵبەتە زەرەرێکی مەزنی لەئێمە دا. واتا ئێمە کۆنگرەمان سازدابوو و هەندێك بڕیارمان وەرگرتبوو، پاشان کۆبوونەوەمان کرد و هەندێك بڕیاری دیکەمان وەرگرت تاکو ئێمە خەباتی خۆمان بەهێز بکەین، زیاتریش بتوانین سەرهەڵدان لەباکووری کوردستان بەهێز بکەین تاکو تاکتیکی خۆمان بەڕێوە ببەین. بەڵام ئەو شەڕە رێگیری لەمە کرد کە بتوانین ئەو هەنگاوە بهاوێژین، شەڕەکە نەیهێشت ئەو هەنگاوە بهاوێژین و زەرەری لەئێمە دا. هەروەها ئێمە دەمانخواست کە لەگەڵ هێزەکانی باشوور پەیوەندییەکانی خۆمان خۆش بکەین، رێگیری لەمەش کرا، لەبری ئەمە دووژمنایەتی لەنێوان ئێمە و (ی ن ك) دا دروستبوو، لەم رووەشەوە زەرەرێکی لەئێمە دا. لەو شەڕەشدا زۆر هەڤاڵی ئێمە شەهید بوون، نزیکەی (١٠٠) هەڤاڵ شەهیدبوون، هەموویان کادیر بوون. ئێمە نەماندەخواست ئەو کادیرانە لەشەڕدا لەبەرامبەر (ی ن ك) شەهید ببن، لەم رووەوە زەرەری لەئێمە دا. ئێمە دەمانخواست پەیوەندی خۆمان لەگەڵ هێزەکانی باشوور باش ببێت. نزیکبوونەوەی ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە بوو، تەنانەت ئەو کاتە پەیوەندیمان لەگەڵ (ی ن ك) هەبوو، (ی ن ك) بەئێمەی گووت:" ئێمە هاوکاریتان دەکەین، ئێمە پشتیوانی لەئێوە دەکەین...". ئێمەش گووتمان:" ئەمە باشە، ئەوەی کە دەخوازرێت هەر ئەوەیە و راستیش ئەوەیە..." بەڵام بینیمان (ی ن ك) هێرشی سەر ئێمەی کرد. سەرەتا لە"کامپی قەرەداخ" دەستیان پێکرد، پێش ئەوەش هەڤاڵانیان گرتین، دەزگاکانی ئێمەیان گرت، ئێمە زێدە دەنگمان نەکرد، لە "قەرەداخ"یش دەوروبەری هەڤاڵانیان گرت و گەمارۆیان دان. ئێمە لەرێگەی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستانەوە خەبەرمان نارد و پێمان گووتن:" بە (ی ن ك) بڵێن با هێزی خۆیان لەوێ بکشێننەوە، با ئەمە نەبێتە هۆی شەڕ لەنێوانماندا". ئێمە کە بینیمان هێرشی سەر

"قەرەداخ"یان کرد، هەڤاڵانیان شەهیدکرد و دەستگیریان کردن. ئەوە بەدیارکەوت کە ئەوان بەداخستنی دەزگاکانمان، دەستگیرکردنی هەڤاڵانمان و بەهێرشی سەر "کامپی قەرەداخ" دەخوازن تەڤگەر بەتەواوی تەسلیم وەربگرن. نزیکبوونەوەی (ی ن ك) دیاربوو. بۆیەش ئیدی ئێمە بخوازین و نەخوازین دەبێت خۆمان بپارێزین. بەئێمەیان گووتبوو: " پشتیوانیتان لێدەکەین و هاوکاریتان دەکەین..." کەچی بینیمان دەخوازن تەسلیممان وەربگرن و تەسفیەمان بکەن. بینیمان رەوشێکی زۆر مەترسیدار رووبەڕوومان دەبێتەوە، ناچاربووین خۆمان بپارێزین. ئێمە دەستبەرداریمان لەکارەکانی دیکەی خۆمان کرد، بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین. تاکو تەسفیە نەبین. ئیدی ئەمە زۆر زەرەری لەئێمە دا.

ئەگەر ئەو شەڕە نەبایە، ئێمە دەمانخواست لەباکوور سەرهەڵدان پێشبخەین. ئەگەر لەو قۆناخەدا سەرهەڵدان پێشبکەوتبایە، لەوانەبوو تورکیا بۆ چارەسەری هەندێك هەنگاوی بهاوێشتبایە. چونکە ئەو کاتە رەوش جودا بوو. ئەگەر ئێمە ئەو هەنگاوەمان نەهاوێشت ئەوا ئەو شەڕە نەیهێشت ئەو هەنگاوە بهاوێژین. بۆیە زەرەرێکی بەو شێوەیەی لەئێمە دا...

**لەساڵی (٢٠٠٢)دا هەشتەمین کۆنگرە سازدەدرێت، لەو کۆنگرەیەدا (PKK) ناوی خۆی دەگۆڕێت و دەبێتە "کۆنگرەی ئازادی و دیموکراتی کوردستان ـ KADEK". ئەو هەڵانەی لەکۆنگرەی حەوتەم کران هەشتەمین کۆنگرە تاچەند توانی ئەو هەڵانە راست بکاتەوە؟ هەروەها ئەو ناوگۆڕینە بە چ ئامانجێك ئەنجام درا، ئەمە لەکاتێکدا لەساڵی (١٩٧٨) وە تا ئەو کاتە هەر بە (PKK) دەناسرا؟ هەشتەمین کۆنگرە چ هەنگاوێکی هاوێشت؟ هەروەها بەرچاوترین رۆژەڤی کۆنگرە چیبوو؟**

دوای حەوتەمین کۆنگرە من لە وڵات نەبووم، لەدەرەوە بووم، بەر لەوەی هەشتەمین کۆنگرە سازبدرێت من گەڕامەوە، بۆیە لە ئامادەکارییەکانی کۆنگرەدا من ئامادە نەبووم. هەڵبەتە کاتێك کە گەڕامەوە ئامادەکارییەکان تەواو ببوون و کۆنگرەش دەستیپێکرد. ئەو گۆڕانکاری و نوێبوونەوەیەی لە حەوتەمین کۆنگرەدا پێشمانخستبوو پێویستبوو لە هەشتەمین کۆنگرەدا تەواومان بکردبایە. بەڵام ئەمە لە هەشتەمین کۆنگرەدا ئەنجام نەدرا، سەرۆك ئەو بەرگرینامەیەی بۆ دادگای ماڤ مرۆڤی ئەورووپای نووسیبوو، گەیاندبوویە دەستی تەڤگەر. هەرچەندە کاتێکی کەم بەدەستەوە مابوو بۆ سازدانی کۆنگرە کە ئەو بەرگرینامەیە گەیشتە دەستی تەڤگەر، بەڵام کە گەیشتبووە دەستی تەڤگەر کادیران پەروەردەشیان لەسەر ئەو بەرگرینامەیە بینیبوو. واتا بۆ کادیران و بۆ تەڤگەر قۆناخێك بوو وەك قۆناخی بەر لە حەوتەمین کۆنگرە نەبوو، تەنانەت بۆ کۆنگرەی حەوتەم لەرێگەی دیدار لەگەڵ پارێزەرەکانیدا هەندێك تێڕوانین و تێبینی خۆی ناردبوو. بۆیەش ئەو نوێبوونەوەیەی لەتەڤگەردا پێشدەخست، لە دووتوێی ئەو دیدارانەیدا هەبوو، بەڵام مرۆڤ نەیدەتوانی بەتەواوی لێی تێبگات، بەڵام بەرێگەی بەرگرینامەکەیەوە ئیدی مرۆڤ دەیتوانی بەئاسانی لێی تێبگات. واتا ئەو زەحمەتییەی کە لە حەوتەمین کۆنگرەدا بینیبوومان دەمانتوانی لە هەشتەمین کۆنگرەدا هەمان زەحمەتی نەبینین، چونکە ئاڕادەیەك لە زۆر رووەوە یەکلایی بوونەوە هەبوو. واتا سەرۆك بناخەیەکی تیۆری بەهێزی لەبەرگرینامەکەیدا داڕشتبوو، لەرووی فەلسەفی، ئایدیۆلۆژی نزیکبوونەوەیەکی بەهێز و تۆکمەی پێشخستبوو، بەڵام لەرووی رێکخستنییەوە هێشتا یەکلایی بوونەوەیەك بەتەواوی لەئارادا نەبوو. چونکە بەگوێرەی ئەو شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنانەی سەرۆك، مرۆڤ چ گۆڕانکارییەك لەرووی رێکخستنییەوە ئەنجام بدات؟ چ مۆدێلێکی رێکخستنی پێشبخات؟ هێشتا سەرۆك لێبڕاوانە و یەکلاییکەرەوە پێشینەخستبوو. لەم رووەوە ئێمە کێشەمان هەبوو. هەڵبەتە شتی هەرە گرنگیش ئەوەبوو، لەرووی رێکخستنییەوە پێویستبوو نوێبوونەوەیەك ئەنجام بدرابایە. بۆ ئەوەی نوێبوونەوەیەك لەرووی رێکخستنییەوە ئەنجام بدرێت، سەرۆك لەرووی فەلسەفی و ئایدیۆلۆژییەوە نوێبوونەوەیەکی بەهێزی پێشخستبوو، بەڵام ئەمە لەرووی رێکخستنییەوە چۆن تەواو (کامڵ) بکرێت؟ لەم رووەوە تێگەیشتن

بەدینەهاتبوو. چونكە تا ئەو كاتە هەم لەدیدارەكانیدا و هەمیش لەبەرگرینامەكانیدا سەرۆك هێشتا مۆدێلی ڕێكخستنی ئەوەی پێشنەخستبوو. لێرەدا ئێمە زەحمەتییەكمان دەبینی. پێویستبوو لەرووی ڕێكخستنیشەوە نوێبوونەوە ئەنجام بدرابایە.

ئیدی مەسەلەی **كۆنگرەی ئازادی و دیموكراتی كوردستان** (KADEK) بەمشێوەیە پێكهات. ئەو كاتە (PKK)ش بەتیرۆریست راگەیەنرا بوو، بۆیە هەڤالان پێشتر ناوی (KADEK)یان پێشنیار كردبوو. ئیدی لەكۆنگرەدا ناوی (PKK)مان گۆڕی و كردمان بە (KADEK). ئەمە لەرووی نیاز و نزیكبوونەوەوە هەر تەنیا گۆڕانكارییەك نەبوو لەناودا، واتا گۆڕانكارییەكیش بوو لەمۆدێلی ڕێكخستنیدا. نیاز (نییەت) ئەوە بوو، بۆیەش ناوەكەمان نەكردبووە "پارتی..." بەڵكو كردبوومان بە "كۆنگرەی.." واتا بەگوێرەی ئەو فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیاییەی كەوا سەرۆك پێشیدەخست، ئێمە دەمانگووت:" پێویستە (كۆنگرە)یەك دابمەزرێنین". ئەمە راستبوو و هەڵە نەبوو، ئێمە لەبنەڕەتدا دەمانتوانی ئەو هەڵەیەی لەكۆنگرەی حەوتەمدا كردبوومان بەو شێوەیە راستی بكەینەوە. واتا ئێمە لەبەرگرینامەكەدا ئەوەمان هەڵدەهێنجا كە دەتوانین مۆدێلێكی كۆنگرە پێشبخەین. بەڵام لەكۆنگرەی هەشتەمیشدا دیسان هەڵەیەكی مەزنمان كرد. ئەو هەڵەیە چیبوو؟ ئێمە پارتیمان هەڵوەشاندەوە و لەجێی ئەوە (KADEK)مان پێشخست. ئەمەش هەڵەیەكی دیكەی مەزن بوو. پێویستبوو لە هەشتەمین كۆنگرەدا پارتی هەڵنەوەشابایەوە، بەڵكو پێویستبوو پارتی بمابایەوە و ئێمە ڕێكخستنی گەلمان پێشخستبایە. چونكە ئێمە ڕێكخستنی گەل (ERNK)مان لە حەوتەمین كۆنگرەدا هەڵوەشاندبووەوە، پاشان كە ئەو بۆشاییەمان بینی، ئێمە هەندێك تەدبیرمان وەرگرت، بەڵام پێویستبوو لەكۆنگرەدا ئەو هەنگاوەمان هاوێشتبایە. ئیدی (KADEK) كەمێك لەو پێداویستییەوە سەریهەڵدا. كەمێكیش لە نزیكبوونەوە (شیكردنەوە)ی بەرگرینامەكەدا هەڵهێنجرابوو. بۆیە ئەو هەنگاوەی (KADEK)مان پێشخست. بەڵام (KADEK) نەبوو بە"پارتی" و نەبوو بە"**كۆنگرە**"ش. راستە ناوەكەی "**كۆنگرە...**" بوو، بەڵام سیستەمەكەیشی "پارتی" بوو. واتا لەنێوان "**پارتی**" و "**كۆنگرە**"دا مایەوە. نەبوو بە"پارتی"یەك و نەبوو بە"**كۆنگرە**"یەكیش. بۆیەش (KADEK) نەبووە هۆی گۆڕانكارییەك و هەشتەمین كۆنگرەش زێدە ڕۆڵێكی ئەوتۆی نەگێڕا.

هەڵەی هەرە مەزنیش ئەوەبوو کە پارتیمان هەڵوەشاندەوە. واتا ئێمە ڕێکخستنی ئایدیۆلۆژی و ڕێکخستنی کادیرانمان هەڵوەشاندەوە. ئەگەرچی (KADEK) ڕۆڵی نیمچە پارتییەکی دەبینی، بۆیە زێدە لەکادیراندا پەرشوبڵاوییەکی نەهێنایە ئاراوە و دیسان لەخۆوەی گرت، کادیرانی لەخۆوە گرت و ڕێکخستنی لەخۆوە گرت کە پەرشوبڵاو نەبێت، بەڵام لەکادیر و لەڕێکخستنیشدا پێشکەوتنێکی ئەنجام نەدا. هەڵبەتە لەڕووی ڕێکخستەکردنی گەلیشدا زێدە پێشکەوتنێك بەدینەهات. چونکە زێدەتر دەمانخواست ئەرکی "پارتی" بخەینە ئەستۆی (KADEK)وە و پێکیبێنێت. لەلایەکی دیکەشەوە ئەرکی "کۆنگرە"یەکی بخەینەپێش، بۆیە نە بەتەواوی ئەوەی "پارتی"یەکەی پێکهێنا و نە بەتەواویش ئەوەی "کۆنگرە"کەی پێکهێنا. ئیدی هەشتەمین کۆنگرە زێدە ڕۆڵی خۆی نەبینی. هەرچەندە ئەو هەنگاوەی لەحەوتەمین کۆنگرەدا هاوێشتبوومان پێویستبوو لەهەشتەمین کۆنگرەدا تەواو ببایە و تەڤگەر لەڕووی ڕێکخستنییەوە بکەوتبایە قۆناخێکی نوێوە. دەبووایە هەڵەکەی حەوتەمین کۆنگرەی ڕاست بکردبایەوە، هەروەها ئەو کەموکوڕییەی لەئارادا هەبوو پڕبکرابایەوە، ئەو هەنگاوانەی کە لەڕووی ڕێکخستنییەوە پێویستبوو لە حەوتەمین کۆنگرەدا بمانهاوێشتبایە و نەمانهاوێشتبوو، تەواومان بکردبایە و تەڤگەر بەتەواوی بەگوێرەی ستراتیژ و تاکیکی نوێ نوێبوونەوەی خۆی تەواو (کامڵ) بکردبایە و بکەوتبایە قۆناخێکی نوێوە. ئەوەی کە دەخواسترا ئەوە بوو. بەڵام ئەمە ئەنجام نەدرا. نە هەڵەکانی حەوتەمین کۆنگرەمان ڕاستکردەوە، نە کەموکوڕییەکانیشمان پڕکردەوە. بۆیە هەشتەمین کۆنگرە ڕۆڵی خۆی نەگێڕا. لەوانەیە لەبیرکردنەوە و ڕاماندا گۆڕانکاری ڕوویدا بێت، هەندێك بڕیار وەرگیران، بەڵام لەبنەڕەتدا ڕۆڵی هەشتەمین کۆنگرە بەگوێرەی ئەو بەرگرینامەیەی کە بۆ دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا (بەرگرینامەی لەدەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانییەتی دیموکراتی) نووسرابوو پێویستبوو لەڕووی ڕێکخستنییەوە هەنگاو هاوێشترابایە، واتا ئەو نوێبوونەوەیەی کەوا سەرۆك لە تەڤگەردا پێشیخستبوو پێویستبوو لە هەشتەمین کۆنگرەدا تەواو بکرابایە، تەڤگەر بەتەواوی بکەوتبایە نێو قۆناخی نوێوە، لەسەر ستراتیژ و تاکتیکی نوێ، فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای نوێدا خۆی بەڕێکخستن بکردبایە و

بكەوتبایە نێو پراكتیكەوە، ئیدی ئەوەی كە روویندەدا ئەوەبوو. بۆیە هەشتەمین كۆنگرە رۆڵێكی مەزنی نەبینی.

**لەو قۆناخەدا، لەنێو تەڤگەردا، دوو رووداوی شەهیدبوون روودەدەن، كە كاریگەری خۆی لەسەر تەڤگەر كرد. یەكێكیان شەهیدبوونی هەڤاڵ "گوڵان"ە و ئەوەی تریش شەهیدبوونی هەڤاڵ ئەردال (ئەنگین سنجار)ە، ئەم دوو رووداوی شەهیدبوونە هەژاندنێك لەنێو تەڤگەردا دروست دەكەن. چونكە رووداوی بەمشێوەیە لەنێو تەڤگەردا هیچ روویندەدابوو... لەدۆخێكی وەهادا ئەو دوو رووداوە چۆن لێكدەدرێتەوە؟**

شەهیدبوونی هەڤاڵ "گوڵان" بۆ ئێمە گرنگ بوو، چونكە هەڤاڵ "گوڵان" لە بەڕێوەبەرایەتی" هێزی تایبەت ÖZEL KUVVET"دا جێگەی خۆی دەگرتە لەرێكخستنكردنی "هێزی تایبەت"دا بەرپرسیارێتی خۆی هەبوو، لەكاتی سازدانی كۆنگرەی تەڤگەری ژندا شەهید بوو. بۆیە ئەو شەهیدبوونە هەم بۆ تەڤگەری ژن، هەم بۆ "هێزی تایبەت" هەمیش بۆ پارتیمان گرنگ بوو، ئەو شەهیدبوونە بۆخۆی پیلانگێڕییەك بوو، ئەو هەڤاڵە بەپیلانگێڕی شەهید كرا، بۆیە تەڤگەر بۆ ئەوەی ئەو پیلانگێڕییە ئاشكرا بكات رووداوەكەی خستە ژێر لێكۆڵینەوەوە، بۆ ئەوەی لێكۆڵینەوەكە بەراستی و دروستی بەڕێوە بچێت و بگەینە ئەنجام و پیلانگێڕییەكە ئاشكرا بكەین كۆمسیۆنێك (لیژنەیەكی لێكۆڵینەوە)مان پێكهێنا و ئەو كۆمسیۆنە دەستی بەكاركرد، لەئاكامی راپۆرتی ئەو كۆمسیۆنەدا، كۆنسەی سەرۆكایەتی گووتی:" ئەو راپۆرتە كەمە، پێویستە لێكۆڵینەوەكە زیاتر قووڵ ببێتەوە". چونكە راپۆرتەكە هێشتا یەكلایی بوونەوەیەك (سافیبوونێك)ی بەدینەهێنابوو. واتا كۆمسیۆنەكە لێكۆڵینەوەیەكی ئەنجام دابوو، بەڵام بەتەواوی قووڵ نەببووەوە و بە یەكلایی بوونەوە

و سافیبوونێك نەگەیشتبوو، لە لێکۆڵینەوەکەدا هەنگاوێك هاوێشترا بوو، لەسەر ئەو بنەمایە کۆنسەی سەرۆکایەتی بڕیاری دا کە ئەو لێکۆڵینەوەیە زیاتر قووڵ ببێتەوە و بە کۆمسیۆنێکی تر قووڵتر ببێتەوە، کۆمسیۆنێکی نوێ پێکهات، ئەو کۆمسیۆنەش زێدە کارەکەی خۆی پێشنەخست، چونکە ئەوانەی لەو کۆمسیۆنەدا بەشداربوون ئەرکی دیکەشیان لەئەستۆ گرتبوو، نەیانتوانیبوو بەتەواوی هەموو کاتی خۆیان بۆ تەرخان بکەن. ئەو هەڤاڵانە گووتیان:" ئێمە بەو شێوەیە ناتوانین، نە دەتوانین کاری کۆمسیۆن پێکبێنین و نە دەشتوانین کارەکانی دیکەش راپەڕێنین، ئەگەر دەکرێت با کۆمسیۆنێکی نوێ پێکبێت". ئێمەش وەك کۆنسەی سەرۆکایەتی ئەوەمان بەراست زانی، ئێمە کۆمسیۆنێکی نوێمان پێکهێنا، کە ئەو کۆمسیۆنە هەموو کاتی خۆی لەسەر ئەو کارە رابوەستێت، بۆ ئەوەی بگەینە ئەنجام. کاتێك کە ئەو کۆمسیۆنە دروستبوو و دەستی بەکارکرد، من گووتم:" پێویستە ئێوە تاراپۆرتی خۆتان ئامادە دەکەن هیچ زانیارییەك دەربارەی لێکۆڵینەوەکەی خۆتان بەهیچ کەسێك نەدەن، زانیاری بە منیش مەدەن. بۆ ئەوەی ئێوە بتوانن ئەنجام وەربگرن، هەرچییەك لەئێمە دەخوازن ئێمە ئامادەین کە بۆ ئێوەی ئامادە بکەین" ئەوانیش دەستیان بە لێکۆڵینەوەکە کرد، راپۆرتیان ئامادەکرد و هێنایان. کاتێك کە راپۆرتەکەیان دایە من، سەرۆکی ئەو کۆمسیۆنەش کەسێك بوو بەناوی "مەروان تورك" گووتی:" پێشنیازی ئێمە ئەوەیە کە ئەو راپۆرتە تەنیا هەڤاڵانی پیاو لەنێو کۆنسەی سەرۆکایەتی بیخوێننەوە و هەڤاڵانی ژنی ناو کۆنسەی سەرۆکایەتی نەیخوێننەوە" ئەمە لەکاتێکدا لێکۆڵینەوەکە پەیوەست بە کۆنسەی سەرۆکایەتی بەڕێوە دەبردرا، پێشنیازێکی بەمجۆرە راست نەبوو، کاتێك کە ئەو پێشنیازەی کرد من گووتم:" بۆچی چی بووە؟" گووتی:" تۆ بیخوێنەوە دەزانیت بۆچییە؟" منیش گووتم:" ئێوە ئیشی خۆتان تەواوکرد، ئیدی کۆنسە هەر چ بڕیارێك بدات، بەگوێرەی ئەمە ئێوە هەڵسوکەوت دەکەن، ئێستا کاری ئێوە تەواو، ئەو لێکۆڵینەوەیەی ئێوە ئەنجامتان داوە، رێکخستن یان پەسندی دەکات یان دەڵێت:" لێکۆڵینەوەکە هێشتا کەمە و پێویستە قووڵتر ببێتەوە، کۆمسیۆنەکەی ئێوە بەڕێوەی بباتەوە، یان کۆمسیۆنێکی دیکە بەڕێوەی ببات، ئەوا پاشان بەدیار دەکەوێت، بەڵام ئێوە هیچ قسەیەك لێرە و لەوێ نەدرکێنن". من راپۆرتەکەم خوێندەوە بینیم

لێکۆڵینەوەکەیان لەسەر بنەمای لۆژیکێك پێشخستبووە کە تەواوی تەڤگەری ژنیان گوناهبار کردووە، لەئاکامیشدا ناوی سێ ژنیان هێناوە کە ئەوان بەرپرسیارن لەپیلانگێری شەهیدبوونی ئەو هەڤاڵەدا و پێویستە ئەوانە دەستگیر بکرێن و بکەونە ژێر لێکۆڵینەوەوە. بێگومان ئێمە بەرەو کۆنگرەی گشتی "کۆنگرەی گەل"یش دەچووین. کاتیش زۆرکەم ماوە، ئەگەر ئەو لێکۆڵینەوە و ئەو راپۆرتە بخەینە رۆژەڤەوە، ئەوا بۆ ئێمە کێشە و گرفت دەنێتەوە، چونکە لە کۆنگرەی شەشەم و حەوتەم دا کێشەی تەڤگەری ژنان دەرکەوت، ئەگەر بەر لەسازدانی کۆنگرەی "کۆنگرەی گەل"ش ئەو راپۆرتە بخەینە رۆژەڤەوە، من دەمزانی کە کێشەی جددی دەردەکەوێت. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو لۆژیکەی کۆمسیۆنەکە کاری پێکردبوو لۆژیکێکی راست نەبوو، ئەوەش دەبینرا. بۆیە گووتمان ئێمە بیهێڵینەوە بۆ دوای جڤاتی گشتی کۆنگرەی گەل، بۆ ئەوەی هەم کێشە دەرنەکەوێت و هەمیش لەبەر ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە راست بەرێوە نەچووە، ئەو کۆمسیۆنەی ئەو لێکۆڵینەوەیەی بەرێوە بردووە پابەند بە "فەرهاد" و "بۆتان" بەرێوەی بردبوو، بەگوێرەی داخوازی ئەوان بەرێوەی بردبوو، بەم لێکۆڵینەوەیە دەیانخواست بەو ئامانجانە بگەن کە خستبوویانە پێش خۆیانەوە، ئەو شەهیدبوونە و لێکۆڵینەوەیە بۆ خۆیان بکەنە هەنگاوێك و تاکتیکی خۆیان لەسەر ئەوە دانابوو، بۆ ئەوەی بتوانن تەڤگەری ژن بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. ئیدی دەیانخواست بەم لێکۆڵینەوەیە ئەوە بکەن. دەیانگووت:" سێ کەس لەمەدا بەرپرسیارن و پێویستە بکەونە ژێر لێکۆڵینەوەوە، پێویستە ئێمە ئەرکیان لێوەربگرینەوە و بیانخەنە ژێر لێکۆڵینەوەوە". خۆشیان لەژێرەوە بەرێوەبەرایەتییەکی نوێشیان بۆ کۆردیناسیۆنی تەڤگەری ژن ئامادە کردووە، تاکو بەمشێوەیە تەڤگەری ژن بخەنە ژێرکۆنترۆڵی خۆیانەوە. چونکە تاکتیکی خۆیان لەسەر "ریفۆرمی کۆمەڵایەتی" و لەسەر مەسەلەی رەگەزایەتی (الجنسوية) پێشدەخەن، دەشزانن کە تەڤگەری ژن دژی ئەمە رادەوەستێت، ئەو کاتەش نەیانئەتوانی ئەنجام وەربگرن، بۆیە پێویستە تەڤگەری ژن بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، تاکو بتوانن تاکتیکی خۆیان پراکتیزە بکەن. "بۆتان" و "فەرهاد"یش بەرێگەی "مەروان تورك" ئەو لێکۆڵینەوەیان بەو شێوەیە پێشخستبوو. ئەو راپۆرتەی ئامادە کرابوو راپۆرتێکی راست نەبوو، ئامانجی ئەوان بەتەواوی ئەوەبوو

كه بەرێگەی ئەمەوە تەڤگەری ژن بێكاریگەر بكەن، بۆ ئەوەی بتوانن لەیەكەمین كۆنگرەی جڤاتی گشتی كۆنگرەی گەلیشدا تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. بێگومان لەبەر ئەوەی ئێمە لەوە تێگەیشتین، رێگەمان لەو لەپستۆكە گرت، كاتێك كە بینیمان ئەو راپۆرتە بەر لە یەكەمین كۆنگرەی "جڤاتی گشتی" ناخەینە رۆژەڤەوە، فشاریان لەسەر من دروستكرد كە بیخەینە رۆژەڤەوە، بینیان كە من نایخەمە رۆژەڤەوە، لەژێرەوە وابلاویان كردەوە گوایە؛" لە لێكۆڵینەوەكەدا دەركەوتووە كە سێ كچ لەشەهیدبوونی هەڤاڵ "گوڵان"دا بەرپرسیارن، پێویستە ئەو سێ كچە بكەونە ژێر لێكۆڵینەوەوە، كەچی نایانخەنە ژێر لێكۆڵینەوەوە و دەیانپارێزن..." بەمەش خواستیان فشار لەسەر ئێمە دروستبكەن و ئێمەش بێكاریگەر بكەن. بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانی ئەو لەپستۆكەی ئەنجامی دەدەن سەربكەون. ئیدی ئەو شەهیدبوونە، بۆیە ئەو پیلانگێڕییە گرنگ بوو. گروپی خیانەتكار و چەتەگەرایی "بۆتان" و "فەرهاد" دەیانخواست ئەمە لەدژی تەڤگەر بەكاربهێنن، بۆ ئەوەی تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. ئەوانەی ئەو هەڤاڵەیان شەهید كردبوو و ئەو پیلانگێڕییەشیان ئەنجام دابوو هەر ئەوانن، هەم ئەوان ئەنجامیان دابوو و هەمیش دەیانخواست بیخەنە سەر هەندێك كەسی دیكە، هەندێك كچ، بۆ ئەوەی بتوانن كچانیش بێكاریگەر بكەن، ئێمەش بێكاریگەر بكەن، بەمەش تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە.

بێگومان ئێمە تاكتیكی ئەوانمان خراپ كرد، ئێمە نەمانهێشت ئەو تاكتیكە پێك بێت، نەمانهێشت ئیرادەی تەڤگەری ژنان بشكێنن و ژنان بەتەواوی بێكاریگەر بكەن. چەندە خواستیان لەسەر ئێمە فشار و گوشار بكەن بۆ ئەوەی ئەو هەنگاوە بهاوێژین نەمانهێشت ئەوەش روویدات. كاتێك كە بینیان ئێمە نابین بەئامرازی مەبەستی ئەوان و ناكەوینە ناو لەپستۆكی ئەوانەوە، گوایە بەمەش بمانخەنە ژێر تۆمەتەوە، بۆ ئەوەی بێكاریگەرمان بكەن، تاكو بڵێن؛" لێكۆڵینەوەكە بەرێوە چووە، بەرپرسیاری شەهیدبوونی ئەو هەڤاڵە دەركەوتووە، ئەوانە ئەو كەسانە ناگرن و دەیانپارێزن". بۆ ئەوەی ئەمجارەیان ئێمە بێكاریگەر و تاوانبار بكەن و بەئاسانی تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە. بێگومان كاتێك ئەو گوشار و فشارەی ئەوانمان پووچەڵ كردەوە، ئەوا تاكتیكی ئەوانیش زەبری بەركەوت.

سەبارەت بە شەهیدبوونی هەڤاڵ "ئەردال"؛ لە (١٥)ی ئابی (٢٠٠٢) لەنزیك گوندی "سوورەدێ" كۆبوونەوە و مۆراڵێك سازدرابوو، هەم هەڤاڵانی گەریلا و هەمیش گەل تێیدا ئامادە ببوون، كۆمیتەیەكی ئامادەكاری ئەو مۆراڵ و كۆبوونەوەیە هەبوو و بەرنامەی ئەو كۆبوونەوەیە هەمووی ئەو كۆمیتەیە بەڕێوەی دەبرد، هەڤاڵ "ئەردال" خۆیشی لەو كۆمیتەیەدا بوو، لەبەرنامەكەدا شانۆگەریش هەبوو، ناوەڕۆكی شانۆییەكەش سەبارەت بەیادەوەری قەڵەمبازی (١٥)ی ئاب بوو. پێویستبوو لە شانۆییەكەدا چەك نەتەقێندرێت، بەڵام لەدیمەنێكی شانۆییەكەدا چەك و تەقاندنی چەك هەیە، خۆی ئەمە هەڵەیەكە، چونكە مەراسیمێكی هێندە مەزنە و خەڵك هاتووە، گەریلا ئامادەیە، چۆن دەبێت فیشەك بتەقێنرێت؟. پێویستبوو چەكە بەكارهاتووەكانی نێو شانۆییەكە بێ فیشەك بن، فیشەكی راستەقینەش بەكار نەهێنرێت. بەڵام شانۆكاران لەشانۆییەكەدا باوەڕییان بەخۆیان هەیە و بە لۆژیكی" دەی كێشە نییە" لەدیمەنێكی شانۆییەكەدا فیشەك دەتەقێت، پاشان هەڤاڵان ئاگاداریان دەكەنەوە، دەڵێن:" با چەك نەتەقێنرێت، گەل و هەڤاڵان ئامادەن، باش نییە نەوەك رووداوێك رووبدات، با بەبێ تەقاندنی فیشەك بێت" هەڤاڵان موداخەلە دەكەن، ئەوانیش دەڵێن:" تەواو تەدبیرمان وەرگرت، چیدی فیشەك ناتەقێنرێت"، كچێك كە لە سوێدەوە تەڤلی ئێمە ببوو و هاتبوو، ئەویش گەریلا بوو، لەو شانۆییەشدا بەشدار ببوو، لە چەكەكەی ئەودا فیشەك ماوە، دەبووایە فیشەكی تێدا نەبێت و نەتەقێنرێت، بەڵام ئەو كچە چەكەكەی دەتەقێنێت و فیشەكێك بە هەڤاڵ"ئەردال" دەكەوێت، فیشەكێكی تریش بەهەڤاڵ "خەڵات سۆران" كە خەڵكی باشووری مەزن بوو، دەكەوێت، ئەم دوو هەڤاڵە هەرلەوێ شەهید دەبن، بە بەرچاوی هەڤاڵان و گەلەوە. رووداوەكە بەمشێوەیە روویدا. بێگومان سەبارەت بەم رووداوە لێكۆڵینەوە دەستپێكرد، هەڵبەتە لەبەر ئەوەی ئاهەنگی (١٥)ی ئاب بوو، بەكامێرای ڤیدیۆیی وێنەی ئاهەنگەكەش دەگیرا، بۆیە هەموو وێنە (تصویر)ەكانی ئەو ئاهەنگەش درا بە كۆمسیۆنی لێكۆڵینەوەی ئەم رووداوە، لەئاكامی لێكۆڵینەوەكەدا بەدیاركەوت كە رووداوەكە بەئەنقەست نەبووە و (قەزا) یە و لەم رووەوە نیازێكی خراپ لەئارادا نییە. بەڵام بێگومان لەتەدبیر وەرگرتندا، كێماسی جدی لەئارادایە، لەنزیكبوونەوە و لۆژیكی كارەكەدا (ئامادەكاری ئاهەنگەكەدا) كێماسی هەیە.

بۆیە لەئاکامی لێکۆڵینەوەکەدا هەندێك رەخنە و هەندێك تەدبیریش پێشکەوت، بۆ نموونە؛ ئەگەر رووداوەکە بەنەنقەستیش نەبووبێت، ئەوا ئەوەی رووداوەکەی لەدەست دەرچوو بوو دەستگیرکرا، ئەوەی ئەو شانۆییەی ئامادەکرد دەستگیرکرا، چونکە زانیاری نەدابوو کە بەو شێوەیە چەك لەشانۆییەکەدا دەتەقێنرێت، هەر ئەو کاتە کە چەك لەشانۆییەکەدا تەقێنرابوو، هەڤاڵان رەخنەیان کردبوون، گووتبوویان:" بۆچی چەك دەتەقێنرێت؟ بۆچی ئەو چەك تەقاندنانەتان قەدەخە نەکرد، بەتایبەتی بە هەڤاڵ "ئەردال" و ئەوان گووترابوو، چونکە هەڤاڵ "ئەردال" خۆی بەرپرسیاری کۆمیتەی ئامادەکاری ئاهەنگەکەش بوو، هەڤاڵ "ئەردال"یش دەڵێت:"باشە پێیان دەڵێم، ئیدی با چەك نەتەقێنن، گووتمان؛ یادی (١٥)ی ئابە، ئەگەر بەشێوەیەکی زیندوو بەرجەستەی ئەو هەڵمەتە بکەین باش دەبێت، بۆیە رێمان لێنەگرتبوون" کاتێك کە هەڤاڵان ئەوە رەخنە دەکەن، ئەویش دەڵێت:" ئاگاداریان دەکەمەوە با چیدی چەك نەتەقێنن" ئاگاداریشیان دەکاتەوە، گوایە هەموو فیشەکەکانیش لەمەخزەنەکان دەردەخەن، بەڵام ئیدی ئەو کچە لەیاد دەکات، فیشەکەکانی مەخزەنی چەکەکەی دەریخات، وامەزەندەی دەکرد کە فیشەکی تێدا نەماوە، بەو شێوەیە چەکەکەی دەتەقێنێت. رووداوەکە وەها روویدا.

بێگومان راگەیاندنەکانی تورکیا خواستیان ئەو رووداوە لەدژی تەڤگەر بەکاربهێنن، ئیدی گووتیان:" لەناوخۆیاندا شەڕ روویداوە و یەکتریان کوشتووە، "ئەردال"یان کوشتووە..." نازانم دەیانگووت:" ئەردال لەدژی شەڕ رادەوەستا، هەندێکیان شەڕیان دەخواست بۆیە کوژراوە" هەروەها دەیانگووت:" ئەردال بووە بە بەرپرسیار بۆیە کوژراوە"، واتا خواستیان ئەو رووداوە لەدژی تەڤگەر بەکاربهێنن، بەمەش خێزانی شەهید "ئەردال" بوروژێنن و لەدژی تەڤگەر بەکاریبهێنن. خەڵکی ئەو ناوچەیە (مەرعەش)یش لەدژی تەڤگەر بوروژێنن، ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو، هەڵبەتە ئەمەش هەندێك سەرئێشەی بۆ ئێمە دروستکرد. ئیدی خێزانەکەی (خانەوادەکەی) هەڤاڵ "ئەردال" هاتنەلامان، بۆ خانەوادەکەیمان باس کرد کە رووداوەکە چۆن بووە و شوێنی رووداوەکەشمان نیشاندان، گووتمان:" ئێوە دەتوانن خۆشتان بپرسن، ئەمەش کاسێتی وێنەگیراوی ئاهەنگەکەیشە، بیبەنە لای کەسانی پسپۆڕ، لەم رووەوە دەتوانن نیشانیان

بدەن، دیارە کە رووداوەکە بەئەنقەست نەبووە و ئێمە لێکۆڵینەوەشمان لەسەری کردووە. ئەمەش راپۆرتی کۆمسیۆنی لێکۆڵینەوەی رووداوەکەیە، شتێکی وەهای تێدا نییە کە رووداوێکی بەئەنقەست بووبێت. بەڵام ئەو رووداوە تاراددیەك سەرئێشەی بۆ تەڤگەر دروستکرد.

چونکە گروپە خائینەکەی "فەرهاد" و "بۆتان" خانەوادەکەی هەڤاڵ "ئەردال"ی بەگژ تەڤگەر وەدەنا، گوایە:" ئەردال بە پلان و بەئەنقەست کوژراوە، ئەردال زۆر پێشدەکەوت، بۆیە کوژراوە" هەم وروژاندنەکانی دەزگاکانی راگەیاندنی تورکیا و هەمیش ورژندنەکانی ئەو گروپە کاریگەری لەسەر خانەوادەکەی و لەسەر خەڵکی ئەو ناوچەیەش کرد. خانەوادەکەی لەو قەناعەتە دابوون کە گروپی خیانەتکار (بۆتان و فەرهاد) هەڤاڵ "ئەردال"یان شەهید کردبێت، ئەمە قەناعەتی ئەوان بوو، چونکە هەڤاڵ "ئەردال" پابەندی تەڤگەربوو، هەڤاڵێکی زۆر دروستبوو، لە هێزی پاراستنی گەل (HPG)شدا پێشدەکەوت، ئیدی خانەوادەکەی دەیانگووت:" ئەو گروپە ئەویان شەهیدکردووە" ئێمەش گووتمان:" نا، راستە ئەو گروپە خائینن، بەڵام شتێکی وەها نییە و لە لێکۆڵینەوەشدا نەگەیشتووین بە ئەنجامێکی بەمجۆرەوە". دوای ئەوەی ئەو گروپە لەناو ئێمە دەرچوون و خیانەتیان لەدژی تەڤگەر کرد و دەستیان لەرووداوی شەهیدبوونی هەڤاڵ "ئەردال"یش وەردا و خواستیان بیخەنە سەر ئەستۆی تەڤگەر و گووتیان:" تەڤگەر کوشتوویەتی". ئەو کاتە خانەوادەکەی گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئەوان ئەومیان ئەنجام دابێت و دەیخەنە ئەستۆی تەڤگەرەوە، بۆیە خانەوادەکەی دەیانگووت:" ئەو گروپە ئەمەیان کردووە، چونکە ئەوانە لەدژی تەڤگەرن لەدژی ئەو هەڤاڵانەشن کە سەرۆك بەبنەما وەردەگرن. بۆیە ئەوانیان بەهۆکار دەزانی" ئێمە گووتمان:" نا، هەرچەندە ئەوانە خائینیش بن، لەدژی تەڤگەریش راوەستا بن، بەڵام لە لێکۆڵینەوە و راستی رووداوەکەدا شتێکی وەها بەدیار ناکەوێت"، مەسەلەی هەڤاڵ "ئەردال"یش بەمشێوەیە بوو.

# گێژاوە قووڵەکە

**لەساڵی (٢٠٠٣)دا بەشێوەیەکی کرداری ئەمریکا موداخەلەی ئێراق و ناوچەکەی کرد. لەئاکامیشدا رژێمی بەعس ڕووخا. ئەو موداخەلەیە بەگشتی و کەوتنی رژێمی بەعسی بەتایبەتی بە چ واتایەك دەهات؟ ئەو دەرفەت و هەلومەرجەی ئەو موداخەلەیە لەگەڵ خۆیدا هێنای چیبوو... ؟**

ئەو موداخەلەیەی ئەمریکا لەسەر ئێراق کردی، موداخەلەیەکە بۆ سەر خۆرهەڵاتی ناوین، ئەو موداخەلەیە کە بەسەرۆکایەتی ئەمریکا ئەنجام درا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی سیستەمی سەرمایەداری بوو. ئامانجی ئەو موداخەلەیە ئەوەبوو کە خۆرهەڵاتی ناوین هەم لەرووی ئابووری و سیاسی و هەمیش لەرووی کولتوورییەوە، بەگوێرەی سیستەمی سەرمایەداری ئامادە بکات، تاکو ئەم ناوچەیە بکەوێتە خزمەتی ئەو سیستەمەوە. چونکە ئێستا خۆرهەڵاتی ناوین لەهەموو رووێکەوە لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری لەنێو ناکۆکی دایە، لەم رووەوە رژێمەکانی ناوچەکە هەم لەگەڵ گەلانی ناوچەکە هەمیش لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری لەنێو ناکۆکییەکی مەزندا دەژین، هەم گەلانی ناوچەکە دەخوازن لەو رژێمانە رزگاریان ببێت، هەمیش سیستەمی سەرمایەداری دەخوازێت ناوچەکە بەتەواوی بخاتە خزمەتی سیستەمەوە، چونکە بەم دۆخەی ئێستایەوە خزمەتی سیستەمەکە ناکات. ئیدی لەمیانەی ئەو موداخەلەیەوە سیستەمی سەرمایەداری خواستی ئەو رژێمانەی خۆرهەڵاتی ناوین بگۆڕێت، تاکو ناوچەکە لەرووی سیاسی، ئابووری، کولتووری و کۆمەڵایەتییەوە بەگوێرەی سەرمایەداری (کاپیتالیزم) رێکبخات. هەروەها بۆ ئەوەی ئیسرائیلیش بەهێز بکات، ئەو

مەترسییانەی لەناوچەکە بۆ ئیسرائیلیش لەنارادان نەهێڵێت. بێگومان ئامانجی موداخەلەکە ئەمەیە و ئەمە موداخەلەیەکی مەزنە. ئیدی بۆ ئەوەی ئەو موداخەلەیە بکات، بەرلەوە موداخەلەی کەنداوی کرد، بەمەش هەنگاوێکی هاوێشت و رژێمی بەعسی رووخاند. چونکە ئەوەی بخوازێت لەجیهاندا بالآدەست بێت، ئەوەی بخوازێت کێشەکانی سیستەمی سەرمایەداری چارەسەر بکات، ئەوەی سەرۆکایەتی ئەو سیستەمە دەکات پێویستە خۆرهەلآتی ناوین قازانج بکات. ئەگەر وەها نەبێت هەم ناتوانێت سەرۆکایەتی بکات و هەمیش ناتوانێت کێشەکانی سیستەم چارەسەر بکات. چونکە خۆرهەلآتی ناوین وەك بڕبڕەی پشتی جیهانە، هەروەها خۆرهەلآتی ناوین لانکەی شارستانییەتە و دایکایەتی بۆ شارستانییەت کردووە، بۆیە پێویستە تۆ خۆرهەلآتی ناوین بخەیتە دەستی خۆتەوە و بەگوێرەی خواستی خۆت ئامادەی بکەیت، تاکو بتوانیت بالآدەستی خۆت پێکبێنیت. ئیدی ئەو موداخەلەیەی کە لەسەر خۆرهەلآتی ناوین ئەنجام درا لەسەر ئەو بنەمایە بوو.

## بۆچی لەئێراقەوە دەستپێکرد؟

ئەمە هۆکاری خۆی هەیە، چونکە رژێمی بەعس رژێمێك بوو لەجیهاندا گۆشەگیر ببوو، رژێمێك بوو لەناو گەلی خۆیدا گۆشەگیر ببوو، بۆیە هەم لەناوخۆ و هەم لەدەرەوەدا، هەموو کەسێك لەدژی ئەو رژێمە بوو و بەئاسانی دەیتوانی بیڕووخێنێت. لەلایەکی دیکەشەوە، لەخۆرهەلآتی ناویندا، لەدەرەوەی تورکیا، سوپای هەرە مەزن لە ئێراق دروستکرا بوو. هەڵبەتە ئەوەی تورکیا لەبەر ئەوەی ئەندامی ناتۆیە و بۆ سیستەم مەترسی دروستناکات، بەڵکو هەمیشە لەخزمەتی سیستەم دابووە، بەلآم ئەوەی ئێراق مەترسی بۆ سەر سیستەم و بۆ ناوچەکە دروست دەکرد، پێویستبوو ئەو سوپایە هەڵوەشێنێتەوە و پەرشوبلآوەی پێبکات، هۆکارێکیش ئەوەبوو کە موداخەلەی سەر ئێراقیان بۆخۆیان بەبنچینە وەرگرت. هۆکاری سێیەمیش ئەوەیە کە لە ئێراقدا وزە (پەترۆڵ و سامانە سروشتییەکانی دیکە) هەیە، ئەو شوێنانەی دیکە کە وزەیان تێدایە لەژێر کۆنترۆڵی ئەمریکا دان، لەژێر کۆنترۆڵی سیستەم دان، بەلآم لە ئێراق و ئێراندا

سەرچاوەکانی وزە زێدە لەژێر کۆنترۆڵدا نەبوون، ئەمەش کێشەیان بۆ دەنێتەوە. دەیانتوانی ئەوەی ئێراق بەگوێرەی ئێران، بەئاسانتر بیڕووخێنن، تاکو بتوانن ئێرانیش بەتەنیا بهێڵنەوە و پاشان بەهەموو هێزی خۆیانەوە بچنە سەر ئێران. ئێراق لە پەترۆڵدا دەوڵەمەندە و پێویستیان بەوە هەبوو کۆنترۆڵی سەر پەترۆڵیان بکردبایە، هەموو کەسێکیش دەیخواست لەو رژێمە رزگاری ببایە، بۆیە ئەو موداخەلەیەیان لەسەر ئێراق پێکهێنا.

لەلایەکی دیکەشەوە لەدژی ئێراق ئۆپۆزسیۆنیش هەبوو، بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەو رژێمە بڕووخێنرێت. لەشوێنانی دیکە ئۆپۆزسیۆنێکی وەها بەهێز لەئارادا نەبوو، بەرێگەی ئەو ئۆپۆزسیۆنەوە دەیانتوانی ئەنجام بەدەستبخەن. ئیدی بۆ ئەوەی ئەو موداخەلەیە ئەنجام بدرێت و سەرکەوتوو بێت، پێوویستبوو تەدبیری ئەوەشیان وەربگرتبایە کە چ شتێك ئەو موداخەلەیە (دەستێوەردانە) دەخاتە مەترسییەوە. ئیدی بەر لە موداخەلەکە بە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی هاتنە سەر سەرۆك ئاپۆ و (PKK)، تاکو بتوانن زەبرێك لەتەفگەر بدەن و بیخەنە ژێر فشار و گوشارەوە، بۆ ئەوەی موداخەلەی خۆیان بەئاسانی پێشبخەن، بۆ ئەوەی (PKK) زێدە سوود لەو موداخەلەیە وەرنەگرێت. چونکە (PKK) لە کوردستانیشدا پێگە (ستووند ـ ڤاچ)ی موداخەلەکەی لاواز دەکرد، لەناوچەکەشدا (PKK) و سەرۆك ئاپۆ دەبوونە ئومێدێك بۆ گەلانی ناوچەکە. ئەگەر زەبر لەو تەفگەرە نەوەشێنن، هەم موداخەلەکە لاواز دەکات و هەمیش دەیخاتە ژێر مەترسییەوە. ئەگەر موداخەلەکە ببێت ئەوا لەوانەیە سوود لەو موداخەلەیەش وەربگرێت. چونکە دوای موداخەلەکەی کەنداو (شەڕی یەکەمی کەنداوی ساڵی ١٩٩١)، (PKK) سوودمەند بوو، ئەمەیان بینیبوو و لەمە ئەزموونیان وەرگرتبوو، بۆ ئەوەی لەو موداخەلەیەی ئەمجارەی سەر ئێراق (PKK) سوودمەند نەبێت پێویستە بەرلەوە تەدبیر وەربگرن و زەبری لێبوەشێنن. بەمەش هاتنە سەر تەڤگەر و سەرۆکیان بەدیلگرت، هێرش و فشارێکی زۆریان بۆ سەر تەڤگەر هێنا، تاکو تەڤگەر مژوولی خۆی و کێشەکانی ببێت. بۆ ئەوەی ئەوان بتوانن بەئاسانی موداخەلەی خۆیان ئەنجام بدەن و سەربکەون، هەروەها بتوانن ئەو خەتەی کە کوردان دەخاتە خزمەتی سیستەمەوە بەهێز بکەن و بەمەش بتوانن پێگە و باڵادەستی خۆیان لە کوردستاندا تۆکمەتر بکەن و

کوردانیش لە ستراتیژییەتی خۆیاندا بۆخۆیان بکەنە هێزێکی سەرەکی، ئیدی موداخەلەکەیان بەمشێوەیە پێشخست و رژێمیان رووخاند. بەڵام دوای ئەوەی رژێمیان رووخاند ئەو ئامانجانەی لەپێش خۆیان دانابوو پێکنەهات، تاکو ئێستاش ئەو ئەنجامەیان بەدینەهێناوە.

راستە رژێمیان رووخاند، لەمەدا ئەنجامگیر بوون، لەدوای رووخاندنیشەوە هەندێك هەنگاوی تریان هەڵهێنا. واتا بۆ ئەوەی ئێراق بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی سیستەمی سەرمایەداری رێکبخەن هەندێك هەنگاویان هاوێشت. بەڵام ئەوانە دەیانخواست لەماوەیەکی کورتدا بەئامانجەکانی خۆیان بگەن، لەمەدا بەئامانج نەگەیشتن، هەرچەندە هەنگاویشیان هاوێشتبێت، هێشتاش لەسەر ئەوە هەڵوەستە دەکەن تاکو هەنگاوی دیکە بهاوێژن. ئەو کاتەی موداخەلەکە لەسەر ئێراق ئەنجام درا و رژێم رووخا، ئەوا بۆ تەڤگەرەکەمان و بۆ کوردان شتێکی نوێ دەرکەوت، دەرفەتێکی نوێی بۆ تەڤگەرەکەمان و گەلەکەمان و گەلانی ناوچەکە رەخساند، هەم ئەو ستاتۆیەی لەناوچەکە کە لەسەر بنەمای نکۆڵی و قڕکردنی کوردان ئاواکرابوو تێکیدا، هەمیش بۆ ئەوەی کورد لە شێوەگرتنی سەرلەنوێی خۆرهەڵاتی ناویندا جێگە و پێگەیەك بگرێت توانست و دۆخێکی هێنایە ئاراوە. ئەمە شتێکی باش و زەمینەیەکی باش بوو. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ئەمریکا خواستی لە کوردستاندا خەتێکی میللیگەرایی کە سیستەمی سەرمایەداری بەبنەما وەردەگرێت و دەکەوێتە خزمەتی ئەو سیستەمەوە بەبنچینە وەرگرت و خواستی بەهێزی بکات. ئیدی لەسەر ئەو بنەمایە هاوکاری خەتی میللیگەرایی کرد و لەباشووردا کردی بەحکومەت و تەنانەت کردی بەنیوە دەوڵەتێك. خواستی ئەمە بۆ هەموو کوردان سەرنجراکێش بکات و ئاراستەی هەموو کوردان بداتە ئەو خەتە، کە کوردان لەژێر خەتی ئازادی و سەربەخۆی سەرۆك ئاپۆ و (PKK) دەربخات، هەوڵێکی بەمجۆرەیان دا.

سەرۆك لەم رووەوە چیکرد؟ بینی کە لە باشوور دەسەڵاتێکی میللیگەرایی لەسەر ئایدیۆلۆژیایەکی میللیگەرایی ئاوادەبێت، پەرلەمان و حکومەت لەسەر ئەو بنەمایە ئاوا دەگرێت، ئەمریکا پرۆژەی خۆی بۆ خورهەڵاتی ناوین لەناوچەکە پێشدەخات، سەرۆکیش هەم بۆ کوردان و هەمیش بۆ گەلانی ناوچەکە پرۆژەیەکی پێشخست. ئەو

پرۆژمیە چیبوو؟ پرۆژەی ئازادی و دیموکراتی گەلانی پێشخست. هەڵبەتە لەرووی ئایدیۆلۆژی و فەلسەفییەوە خەتەکەی پێشخستبوو، ئیدی لەسەر ئەو بنەمایەش مۆدێلی" کۆنگرەی گەل"ی پێشخست، ئەمەش موداخەلەی سەرۆك ئاپۆ بوو، موداخەلەی گەلان بوو، کە بتوانن ئەلتەرناتیفی خۆیان لەبەرامبەر پرۆژەکەی ئەمریکا پێشبخەن. چونکە ئەو پرۆژەیەی کە ئەمریکا لەناوچەکەدا پێشیخست تەنیا بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی و سیستەم بوو، نەك بۆ گەلانی ناوچەکە. ئەگەر تۆ لەبەرامبەر ئەوە موداخەلەی گەلان پێشنەخەیت و پرۆژەی گەلان پێشنەخەیت ئەوا بێ ئەلتەرناتیف دەمێنیتەوە، ئەو کاتە گەلانی ناوچەکە زەبرێکی مەزنیان لێدەدرێت. ئیدی بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات، وەك چۆن ئەمریکا پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی پێشخست سەرۆکیش "پرۆژەی شارستانییەتی دیموکراتی" پێشخست و لەسەر ئەو بنەمایەش مۆدێلی" کۆنگرەی گەل"ی پێشخست. تاکو بتوانێت بەم مۆدێلە هەم گەلانی ناوچەکە بێ ئەلتەرناتیف نەهێڵێتەوە، هەمیش بەم مۆدێل و خەتە بتوانێت لە کوردستاندا خەتی گەل بگەیەنێتە سەرکەوتن. ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو. ئیدی رێك لێرەدا "بۆتان" و "فەرهاد" کەوتنە جموجۆڵەوە، ئەو خەتەی کە لەناو تەڤگەردا چەتەگەرێتی بەبنەما وەردەگرت، تەواو لەو قۆناخەدا کەوتە جموجۆڵەوە. واتا بەمەزندەی ئەوان ئەگەر ئەو خەتی چەتەگەرێتییە لەو قۆناخەدا بکەوێتە جموجۆڵەوە ئەوا دەتوانێت ئەنجامگیر ببێت و باڵادەستێتی خۆی لەنێو تەڤگەردا دروستبکات. چونکە ئەو گروپی چەتەگەرییە پەیوەندی خۆی هەم لەگەڵ پارتەکانی باشوور، هەمیش لەگەڵ ئەمریکادا هەبوو، ئەگەر بەهاوکاری ئەوان بکەوێتە جموجۆڵەوە، ئەوا دەتوانێت ئەنجامگیر ببێت و زاڵ ببێت. هەندێك خۆیان لەناو تەڤگەریشدا بەرێکخستن کردبوو، واتا خواستیان لەم موداخەلەیەی ئەمریکا و لەرووخاندنی رژێمی ئێراقدا و بەپێشکەوتنی خەتی میللیگەرایی لەناو تەڤگەری کوردانڈا سوودمەند بن، بەمەش خەتی خۆیان لەناو تەڤگەری (PKK)دا بەسەر بخەن. بێگومان ئەوانە دوای دەستگیرکردنی سەرۆك دەستیان بە خۆرێکخستن کردبوو لەناو تەڤگەردا، ئێمە ئەمەمان لەساڵی (٢٠٠٢)وە دەستنیشان کردبوو؛ لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٢)دا ئێمە کۆبوونەوەیەکی ناوەندیمان سازکرد بۆ ئەوەی بچینە سەر ئەو خەتە. لەو

کۆبوونەوەیەدا چووینە سەر ئەو خەتە و رەخنەشمان کردن، ئەوانە بینیان کە ئێمە لە پیلانی ئەوان تێگەیشتووین و دەچینە سەریان، ئەوا تاکتیکیانە هەڵسوکەوتیان کرد، گوایە ئەو رەخنانەی بۆ ئەوان کردوومانە پەسندیان کردووە و بەمشێوەیە رەخنەی خۆیان دا، تاکو بتوانن بەئاسانی خۆ بەرێکخستن بکەن. ئیدی ئەو سەرکۆنە و رەخنەگرتنەی بۆ سەر ئەوان دەگرێت پووچەڵ بکەنەوە. چونکە بینیان ئەگەر لەدژی ئەمە رابوەستن رەوشی ئەوان بەتەواوی ئاشکرا دەبێت، لەوانەیە ئەو ئامانجانەی لەپێش خۆیان دانابوو، بکەوێتە زێر مەترسییەوە و بێ ئەنجام بمێننەوە، ئیدی بۆ ئەوەی نەکەونە نێو رەوشێکی بەوجۆرەوە و بتوانن هەوڵەکانی تەڤگەر پووچەڵ بکەنەوە و رێگیری لەمە بکەن، وەك بڵێی رەخنەیەکە و کراوە و پەسندیان کردووە، رەخنەدانی خۆیان دا، بۆ ئەوەی کەس بەسەر ئەواندا نەچێت، تاکو ئەوانیش بتوانن دیسان کاری خۆیان بەردەوام بکەن. بەراستیش وەهای لێهات.

لەبنەڕەتدا ئێمە خواستمان لەو کۆبوونەوەیەدا رەوشی ئەوان یەکلایی بکەینەوە و بێکاریگەریان بکەین، ئێمە هەنگاومان بۆ ئەمە هاوێشت و ئەوانیش بەو شێوەیە وەڵامیان دایەوە. ئیدی لەمەدا بەڕێوبەرایەتی ئێمە کەوتە نێو دوودڵییەوە و نەچوونە سەریان. هەڵبەتە ئەوانە بینیان کە ئیدی تەڤگەر لەرەوشی ئەوان تێگەیشتووە و دەچێتە سەریان، ئەوانە بەو هەنگاویان (بەرەخنەدانی شکلی خۆیان) چوونی تەڤگەر بۆ سەر ئەوان رەخنەگرتنیان لاواز کرد و کاری خۆشیان بەهێز کرد، کاتێك کە ئێمە گەیشتینە ساڵی (٢٠٠٣) سەرۆك بەرگرینامەی ئەسینا (گوردی ئازاد ناسنامەی خۆرهەڵاتی ناوینی نوێیە)ی بۆ ئێمە نارد، لەو بەرگرینامەیەدا ئەو خەتەی بەرێگەی بەرگرینامەکەی بۆ دادگای ماڤ مرۆڤی ئەوروپا (لەدەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانییەتی دیموکراتی) پێشخستبوو، سەرۆك لەرێگەی بەرگرینامەکەی بۆ ئەسیناوە موداخەلەیەکی بۆ تەڤگەر کردبوو، چونکە بینی کە لەرووی رێکخستنییەوە هیچ گۆڕانکارییەك ئەنجام نەدراوە، ئەمەش مەترسی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، پێویستە تەڤگەر لەرووی رێکخستنییەوە گۆڕانکاری ئەنجام بدات. ئیدی لەسەر چ بنەمایەك ئەو گۆڕانکارییە بکات؟ وەڵامی ئەوەی لەو بەرگرینامەیە (بەرگرینامەکەی ئەسینا) دایەوە و گەیاندیە تەڤگەر، سەرۆك گووتی:" من یەکلایەنە ئاگربەست رادەگەیەنم، تاکو رۆژی

یەکی ئەیلول، یان ئەوەتا ئاگربەستەکە دەبێتە دوولایەنە یانیش ئەگەر نەبێت ئەوا شەڕ دەستپێدەکات". ئەمەی خستە بەردەم تەفگەر، تاکو تەفگەر گفتوگۆی لەسەر بکات و بە بڕیارێك بگات. بۆچی؟ چونکە سەرۆك بینی کە ئەمریکا موداخەلەیەکی کردووە، ئەو موداخەلەیە هەم لە کوردستان و هەمیش لەناوچەکەدا پێشدەکەوێت، پرۆژەی خۆی داناوە، لەسەر ئەو بنەمایەش هەنگاو دەهاوێژێت. ئەگەر لەبەرامبەر ئەو موداخەلەیە موداخەلەیەك پێشنەکەوێت ئەوا مەترسیدارە، هەم بۆ کوردان و هەمیش بۆ گەلانی ناوچەکە. چونکە بەتەواوی بێ ئەلتەرناتیف دەمێننەوە. بۆیە سەرۆك ئاپۆ چی گووتبوو؟ گووتبووی:" با کۆنگرەی ئازادی و دیموکراتی کوردستان (KADEK) و کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان (KNK) ببنەیەك و با جڤاتی گشتی کۆنگرەی گەل ئاواببێت. هەمیش زوو ئاوا ببێت"، ئیدی بەمشێوەیە سەرۆك لەبەرامبەر موداخەلەکەی ئەمریکا موداخەلەیەکی لە کوردستان و ناوچەکە پێشدەخست، ئەلتەرناتیفی گەلانی بەرێگەی مۆدێلی " کۆنگرەی گەل" پێشدەخست. ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو. چونکە ئەگەر وەها نەبایە ئەوا ئەمریکا پرۆژەکەی خۆی بەپێشدەخست ئەو کاتە گەلان و گەلی کوردیش زەرەر دەکەن. بۆچی دەیگووت:" ئەگەر ئاگربەستەکە یەکلایەنە بمێنێتەوە ئەوا کۆتایی پێدێت"؟ چونکە دەیبینی؛ ئەگەر لەو قۆناخەدا ئاگربەست نەبێتە دوولایەنە و چارەسەری پێشنەکەوێت، ئەوا تورکیا بەرنامەی خۆی بەڕێوە دەبات، ئەمریکاش بەرنامەی خۆی بەڕێوە دەبات، لێرەدا تەفگەر و گەل زەرەرمەند دەبن، لەلایەکەوە کێشەکانی تورکیا جدیین، ئەگەر چارەسەری پەسندنەکرد و تۆش شەڕت پێشخست، بەگوێرەی ئەو بارودۆخەی ئەو کاتەی تورکیای تێدا بوو، کێشەکانی بەردەم تورکیا گران ببوون، ئەوا ڕەوشی شەڕیش ئەو کێشانە قورستر دەکات، تورکیا ناتوانێت شەڕ بخاتە پێش خۆی، لەوانەیە هەنگاو بۆ چارەسەری بهاوێژێت. ئیدی بۆیە سەرۆك گووتی:" من یەکلایەنە ئاگربەست رادەگەنم". چونکە دەیزانی کە ئەگەر تورکیا کێشەکانی خۆی چارەسەرکرد ئەوا هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد ناهاوێژێت. ئەگەر تۆ پێش ئەوە تورکیات خستە سەرڕێی چارەسەری ئەوا دەکرێت هەنگاو بهاوێژێت، ئەو توانستەش هەبوو.

هەروەها کاتێك که سەرۆك ئەوانەشی گەیاندە ئێمە، بۆخۆیشی کەوتبووە نێو مانگرتنەوە(١). واتا لە زیندان بەرخۆدانێکی پێشخستبوو، بەم بەرخۆدانەش دەیخواست تەڤگەر و گەل بخاتە جموجۆڵەوە. چونکە دەیبینی ئەگەر تەڤگەر و گەل نەکەونە جموجۆڵەوە ئەوا مەترسی لەئارادایە، ئەمریکا موداخەلەی کردووە و پێشیدەخات، لەکوردانیشدا موداخەلەی کردووە، هەڵبەتە پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتیش هەیە، ئەوا ئەمریکا لەوانەیە تەڤگەر تەنگاو بکات. تەنانەت ئەو کاتە لەوانەیە پیلانگێڕییەکە بەردەوام ببێت و بەئامانجی خۆیشی بگات. ئیدی بۆ ئەوەی ئەوانە روونەدەن و رێگیری لەبەردەم بکات کەوتە نێو بەرخۆدانێکەوە. بەمەش گەل و تەڤگەر ئەو کاتە دەکەونە نێو بەرخۆدانەوە. ئەو کاتە دەتوانێت پیلانگێڕێتی ئەمریکا و تورکیا لەسەر تەڤگەری کوردان خراپ بکرێت. لەسەر ئەو بنەمایە تەڤگەر کۆبوونەوەی بەرفراوانی ناوەندی سازکرد، بۆ ئەوەی هەموو ئەو مەسەلانە گفتوگۆ بکات و بیکاتە بڕیار.

کاتێك که ئێمە دەستمان بە کۆبوونەوەکە کرد، ئیدی ئەو گروپەی خیانەت (فەرهاد ـ بۆتان) و ئەوان خواستیان رۆژەڤی کۆبوونەوەکە بگۆڕن و ئەو کۆبوونەوەیە پووچەڵ بکەنەوە. چونکە قسەیان لەگەڵ ئەمریکا کردبوو، زانیارییان بە ئەمریکا دابوو، کە تەڤگەر دەخوازێت چیبکات!! بۆیە ئەمریکییەکانیش سێ شتیان دابووە پێش ئەو گروپەوە، یەکەم: دەستبەرداری ئۆجەلان ببن و ئۆجەلان بەلاوە بنێن، دووەم: ئەو گروپی ئەنقەرە ـ واتا ئەو گروپەی سەرەتا، ئەو هەڤاڵانەی کە هەر لەسەرەتاوە لە ئەنقەرە هەنگاویان بۆ ئاواکردنی ئەم تەڤگەرە هاوێشتبوو ـ ئەو گروپە بەلاوە بنێن. چونکە ئەگەر ئەو گروپە نەدەنە لایەکەوە ئێوە ناتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆتانەوە. سێیەمینیش: ئێوە ژیانی تەڤگەر بگۆڕن. ئەگەر ئێوە ئەو کارانەتان کرد ئەوا ئێمە ئێوە بەبنچینە (موخاتەب) وەردەگرین، ئەگەر ئەو هەنگاوانەتان نەنا ئەوا ئێمە پەیوەندی لەگەڵ ئێوە پێشناخەین. ئیدی ئەو مەسەلانەیان لەگەڵ "بۆتان" باسکردبوو. "بۆتان" لەسەر ئەو بنەمایانە هاتبووە کۆبوونەوەوە، کە کۆبوونەوەکە گفتوگۆ لەسەر ئەو شتانە نەکات کە سەرۆك خستبوویە پێش تەڤگەرەوە. چونکە ئەگەر ئەو شتانە ببنە بڕیار ئەوا تەڤگەر هەنگاو دەهاوێژێت، ئیدی تەڤگەر بەدەستخستن و خستنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان بەدینایەت، پیلانگێڕێتییەکەش بەتەواوی پووچەڵ دەبێتەوە. بۆیە

تەڤگەر پێویستە ئەو شتانە نەکاتە بڕیار، ئەگەر نەیکاتە بڕیار ئەوا دەتوانن پیلانی خۆیان لەسەر تەڤگەر بەڕێوە ببەن، لەبەرئەوە ئەو کۆبوونەوەیە هەم بۆ ئێمە گرنگ بوو و هەمیش بۆ ئەوان گرنگ بوو.

وەکوتریش کاتێك کە کۆبوونەوەکە سازدەکرا "**محەممەد عەلی بیراند**"(٢) لە کەناڵی ئاسمانی (CNN turk)دا گووتی:" پیلانی ئەمریکا بۆ (PKK) ئەوەیە کە دەخوازێت گەریلا بۆ تورکیا بنێرێتەوە (بگەڕێنێتەوە) و نزیکەی سەد لەبەڕێوەبەرانی (PKK)ش بنێرێتە ئەرووپا" ڕێك ئێمە ئەو کاتە لە کۆبوونەوەکە دابووین کە ئەوەی لە تەلەفزیۆن باسکرد، ئەمە موداخەلەکردن بوو بۆ ئەو کۆبوونەوەیە. لەدەرەوە وەها موداخەلەیان دەکرد و لەناوەوەشدا بەرێگەی ئەو گروپی چەتەگەر و خیانەتکارەوە موداخەلەیان دەکرد، تاکو ئەو کۆبوونەوەیە تێك بچێت. بەراستیش لەمێژووی تەڤگەری ئێمەدا یەکەمجارە شتێك کە سەرۆك خستبێتییە پێش تەڤگەر و نەبووبێت بە بڕیار، ئەمە یەکەمجار بوو. بەرلەوە هەموو کاتێك و جارێك هەرچییەکی دابووبێتە پێش تەڤگەر، ئەوا تەڤگەر کردوویەتی بەبڕیار، لەوانەیە لەپراکتیکدا پێکنەهاتبێت، یان کەم پێك هاتبێت، بەڵام کردوویەتی بە بڕیار، کەچی ئەوە یەکەمجار بوو لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو شتەی سەرۆك خستییە پێش تەڤگەر نەبووە بڕیار. ئیدی ئەو گروپی خائین نەیهێشت ئەو بڕیارە وەربگیردرێت. کاتێك کە کۆبوونەوەکە بەمشێوەیە کۆتایی هات، چ ئامانجێکیان بەدەستخست؟ گووتیان:" کەواتە ئیدی حاکمییەتی سەرۆك لەسەر تەڤگەر نەماوە، ئەو کاتە ئێمە دەتوانین بەئاسانی ئەنجامگیر ببین، کەواتە "**بۆتان**" و "**فەرهاد**" و ئەوان بەهێزن و دەتوانن تەڤگەر بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە، ئیدی ئەگەر ئێمە هەندێك هاوکارییان بکەین، ئەوا لە کۆنگرەدا دەتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە". "**بۆتان**" و "**فەرهاد**" و ئەوانیش وەها حیسابیان کردبوو، بینیان کە لەکۆبوونەوەکەدا نەیانهێشت ئەو بڕیارەی کە سەرۆك پێشنیازی کردووە، بدرێت. ئیدی گووتیان:" دەتوانین لەکۆنگرەشدا ئەنجامگیر ببین. دوای ئەو کۆبوونەوەیە تاکو سازدانی کۆنگرە کەوتنە نێو ئامادەکارییەکی بەمجۆرەوە، کە بتوانن لەکۆنگرەدا ئەنجامی تەواو وەربگرن. ئیدی کۆمیتەی ئامادەکاری بۆ سازدانی کۆنگرە ئاواکرا، ئەو کۆمیتەیەی ئامادەکاریش بەتەواوی بەگوێرەی ئەوان کاری کردووە، ئەو بەڵگانەی ئامادەشیان

کردبوو بۆ کۆنگرە بەتەواوی بەگوێرەی ئەوان ئامادەیان کردبوو. واتا بەپیلان و بەرنامە کاریان دەکرد. بۆیەش متمانە و باوەڕی ئەوەیان دابوو کە دەتوانن بەئاسانی لەکۆنگرەدا ئەنجام بەدەستبخەن.

بێگومان ئێمە خەتایەکمان کرد، ئەو خەتایە چیبوو؟ لەو کۆبوونەوەیەی کە لەساڵی (٢٠٠٢)دا ئەنجاممان دابوو چووینە سەر ئەوان و رەخنەیانمان کردبوون، ئەوانیش لەمە تێگەیشتن و هەوڵیاندا رەخنە و چوونەسەر ئەوانی ئێمە پووچەڵ بکەنەوە، لەم رووەوە تاکتیکیان کرد، وەك بڵێی رەخنەیان پەسند کردبێت و رەخنەدانی خۆیان دا و لەمەدا ئێمەیان خەڵەتاند. لەبنەڕەتدا ئێمە لەو خاڵەدا کەوتینە خەتا (هەڵەوە)وە، واتا وەك ئەوە وایە تۆ مارێك بریندار بکەیت و نەیکوژیت، ئیدی ئەو مارە هاردەبێت. کۆبوونەوەی ساڵی (٢٠٠٢) وەهای لێهات، خەتاکە لەوێوە دەستی پێکرد. پێویستبوو ئێمە لەو تاکتیکەی ئەوان تێگەیشتبینایە، دەبووایە لەکۆبوونەوەکەدا و لەدوای کۆبوونەوەکەش بچووباینایە سەریان و بەتەواوی بێکاریگەرمان بکردبانایە، ئێمە ئەوەمان نەکرد. ئیدی لەوەدا خەتامان کرد. خەتای دووەمیش لەکۆبوونەوەی ساڵی (٢٠٠٣)دا کردمان، کە کۆبوونەوەکە کۆتایی هات، پێویستبوو ئێمە سەبارەت بەوان زانیاریمان بە سەرۆك دابایە، کە رەوشێکی وەها لەئارادایە، ئەگەر ئێمە زانیاریمان بە سەرۆك دابایە، لەوانەیە موداخەلەی سەرۆك زوو ئەنجام بدرابایە، لەوانەیە ئەو تەخریباتانەی کەوا پاشان تێیدا ژیاین، کەمتر روویدا بایە. بۆچی ئەو خەتایەمان کرد؟ چونکە سەرۆك لەنێو بەرخۆدان دابوو، هاتن و چوونی پارێزەران نەبوو، بۆیە ئێمە گووتمان:" ئێمە ناتوانین زانیاری بە سەرۆك بدەین، هەڵبەتە ئێمە بڕیارمان وەرگرتووە کە کۆنگرە سازبدرێت، سێ مانگ ماوە کە کۆنگرە ئەنجام بدرێت. سەرۆك لەدیدارێکیدا لەگەڵ پارێزەرەکانی گووتبووی:" ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی هەیە، ئەگەر کۆنگرە سازدرا با لە بەڕێوەبەرایەتیدا شوێن نەگرن با لە " کۆمیتەی زانست، رۆشنگەری، هونەر(٣)"دا شوێن بگرن" ئێمەش گووتمان:" هەرچۆنێك بێت کۆنگرە سازدەدرێت، هەڵبەتە ئەو بەڕێوەبەرایەتییەش دەگۆڕدرێت، ئیدی پێویست ناکات مەسەلەکە مەزن بکەین"، ئیدی لەمەدا کەوتینە نێو خەتاوە، هەرچەندە سێ مانگی مابووبێت بۆ کۆنگرە و بەڕێوەبەرایەتییەکەش بگۆڕدرێت، پێویستبوو ئەو رەوشەی کە دەرکەوتبوو، ئێمە بە

سەرۆكمان بگووتبایە. راستە بەرخۆدانی سەرۆك هەبوو، ئەگەر رەوشەكەمان بۆ پارێزەرانی روون بكردبایەوە، ئەوا لەوانەبوو بەرێگەیەك لەرێگاكان ئەو زانیارییانەیان بگەیەندبایە لای سەرۆك، ئەو كاتە سەرۆكیش دەیتوانی موداخەلەیەكی بكردبایە، لەوانەبوو ئەو تەخریباتە لەو ئاستەدا روونەدابایە، ئیدی ئێمە لەمەدا خەتامان كرد.

وەكو تریش ئێمە كۆمیتەی ئامادەكاریمان ئاواكرد، تاكو ئەو كۆمیتەیە هەموو ئامادەكارییەكانی بۆ سازدانی كۆنگرە جێبەجێ بكردبایە. لە نەریتی تەڤگەری ئێمەشدا نەریتێكی وەها هەیە كە كۆمیتەی ئامادەكار هەموو شتێك ئامادە دەكات و كەسێكیش موداخەلەی كاری ئەوان ناكات، ئێمە گووتمان:" ئەوە كولتوور و نەریتێكی ئێمەیە، با دیسان هەروا بێت". بێگومان ئەو گروپە خیانەتكارە ئەو كولتوور و نەریتەیان پێشێل كرد، بەنهێنی كۆمیتەی ئامادەكاری بەڕێوە دەبرد و دەستی لەكاروباری كۆمیتەكە وەردەدا، كۆمیتەی ئامادەكاریش بەتەواوی كەوتبووە ژێر كاریگەری ئەوانەوە و هەموو شتێكی بەگوێرەی ئەوان كرد. كاتێك كە ئێمە هاتینە كۆنگرەوە ئینجا لەو مەسەلەیە تێگەیشتین، واتا ئەوان بەپیلان و پرۆگرام ئامادەكارییان كردووە كە بەسەر كۆنگرەدا زاڵ بن، لەم رووەشەوە زۆر هەنگاویان هاوێشتووە. ئێمە كاری تەڤگەرمان بەڕێوە دەبرد، ئەوانەش بۆ ئەوە كاریان كردووە كە چۆن بتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، ئیدی سوودیان لەنزیكبوونەوە و خەتاكانی ئێمە وەرگرتبوو، ئەو ئامادەكارییانەیان كردبوو و خۆیان ئامادەكردبوو.

# ئیدی گەل دەبێتە خاوەن سیستەمی خۆی...!!

دوای ئەوەی ئامادەکاری سازدانی کۆنگرەکە تەواو دەبێت، ئیدی کۆنگرەکە سازدەدرێت، ئەم کۆنگرەیە نۆیەمین کۆنگرەی تەڤگەرە، دووەمین کۆنگرەی (KADEK)ە کە تێیدا (KADEK) خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە و "کۆنگرەی گەلی کوردستان " دادەمەزرێت. بەگوێرەی ئەو مەسەلانەی بەر لەسازدانی کۆنگرە باستان لێیەوە کرد، کەشوهەوای نێو کۆنگرەکە چۆن بوو و ئەو مەیل و چەمکانەی دەرکەوتن چیبوون؟ ئەو رێنمایی و شرۆڤانەی سەرۆك ئاپۆ ناردبووی تاچەندە رەنگدانەوەی خۆی لەسەر کرنگرە هەبوو؟ ئەو کێشە و گرفتانەی دەبایە کۆنگرە چارەسەری بکردبایە تاچەند چارەسەریانی کرد؟

سەرۆك ئەو کەموکورِی و هەڵانەی کە لە حەوتەمین و هەشتەمین کۆنگرەدا دەرکەوتبوون بینی و خواستی ئەوانە بەرێگەی "کۆنگرەی گەل"وە راستیبکاتەوە. کۆنگرەی گەل رێکخستەبوونی گەل بوو، چونکە ئێمە ئەو رێکخستەبوونەمان

هەڵوەشاندبووەوە(٤) بۆیە ستراتیژ و تاکتیك بەڕێوە نەدەچوو. ئیدی مۆدێلی "کۆنگرەی گەل"ی پێشخست و ئەمەی بەڕێگەی کۆنگرەی گەل ڕاستکردەوە، لەم ڕووەوە کۆنگرەی گەل گرنگ بوو. لەلایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوە گرنگ بوو کە لەبەرامبەر پرۆژەی ئەمریکا پرۆژەیەکی بۆ گەلان پێشدەخست، کۆنگرەی گەل پش ئەو پرۆژەیە بوو.

بێگومان گروپی خیانەتکار، بەرێگەی پەیوەندی خۆی بەدەرەوە، پەیوەندی خۆیان لەگەڵ پیلانگێران دروستکردبوو، دەیانخواست ئەو پرۆژەیە پووچەڵ بکەنەوە، ئەو هەنگاوەی کە سەرۆك بۆ گەلان دەیهاوێشت، دەیانخواست پووچەڵی بکەنەوە. وەکوتریش دەیانخواست ئەو هەنگاوە بکەنە هەنگاوی باڵادەستبوون بەسەر تەڤگەر. ئەو ئامادەکارییانەی کە کردبوویان، بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە بوو. بۆیە کاتێك کە جڤاتی گشتی کۆنگرەی گەل کۆبووەوە (یەکەمین کۆنگرەی خۆی کرد)، ئێمە بینیمان دۆخەکەیان شێواندووە، ئیدی کاری خۆیان بەئاشکرا بەڕێوە دەبرد، باوەڕیان بەخۆیان هەبوو کە ئەنجام دەگرن، بۆیەش ئیدی بەئاشکرا کاری خۆیان دەکرد، کولتوور و ئەخلاقی تەڤگەریان بەتەواوی خستبووە لایەکەوە. ئیدی کاری خۆیان بێباکانە و بێپەروا بەڕێوە دەبرد، زۆر شێوازیان بەکارهێنا بۆ ئەوەی ئەنجام بەدەستبخەن. لەو باوەڕەش دابوون کە ئەنجام دەگرن. دەیانخواست بەرلەوەی جڤاتی گشتی کۆببێتەوە ئەنجام بگرن و بەمشێوەیە بکەونە نێو جڤاتی گشتی هەموو کار و ئامادەکارییەکانی ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە بوو. بەر لەوەی جڤاتی گشتی کۆببێتەوە، ئێمە دوا کۆبوونەوەی مەرکەزیمان دوو ڕۆژ بەر لەسازدانی کۆنگرە سازدا. ئەو کۆبوونەوەیەشمان بۆچی سازدا؟ چونکە بینیمان ئەو بەڵگانەی کە کۆمیتەی ئامادەکار بۆ کۆنگرە ئامادەی کردووە، زۆر شتی هەڵە و لەدەرەوەی خەتی تەڤگەری تێدایە. ئێمە گووتمان:" با ئەوانە ڕاست بکەینەوە و گفتوگۆی لەسەر بکەین، بۆ ئەوەی لە جڤاتی گشتی دا زێدە گفتوگۆی لەسەر نەکرێت، تاکو جڤاتی گشتی نەکەوێتە ژێر مەترسییەوە". چونکە زۆر کەسی نوێ هاتبوون تەڤلی دەستەی گشتی ببوون، زێدە تەڤگەریان نەدەناسی، زێدە جڤاتی گشتییان نەدەناسی، ئێمە گووتمان:"بەر لە کۆنگرە هەندێك لەو مەسەلانە چارەسەر بکەین، بۆ ئەوەی لەوێ زێدە کێشە دروست نەبێت و کاریگەری خراپ دروست نەکات، تەنانەت بۆ ئەوەی پارچەبوون دروست نەبێت، بۆیە ئەو کۆبوونەوەیەمان سازدا.

هەروەها ئێمە نیازی ئەوانمان بینی و بەو شێوازانەی بەڕێوەیان دەبرد، دەبینرا کە دەخوازن بەر لە کۆنگرە ئەنجام بەدەست بخەن و بەو شێوەیە بکەونە نێو جڤاتی گشتییەوە. واتا بەرلەوەی جڤاتی گشتی دروست ببێت مەسەلەکان تەواو بکەن و کۆنگرە بخەنە دەستی خۆیانەوە. ئیدی بۆ ئەوەی ڕێگیری لەمە بکەین ئەو کۆبوونەوەیەمان سازدا، ئێمە لە کۆبوونەوەکەدا هەندێك گفتوگۆمان کرد، لە کۆتایی کۆبوونەوەکە دابوو، من بینیم "بۆتان" ـ بێگومان پێشتر لەنێوان خۆیاندا قسەیان کردووە و خۆیان ئامادە کردووە ـ هەڤاڵ "قەرەسوو"ی کردە ئامانج و یەکسەر هەندێك قسەی لەدژی ئەو هەڤاڵە کرد، هەم بەبێ هۆکار، هەمیش ئاخافتنی گران بوون، کە ئاخافتنی دەرەوەی ئەخلاق و کولتوور و شێوازی ئێمە بوون، ئەمە وروژاندن (تحريض)ێك بوو. بێگومان لەبەر ئەوەی لە مەسەلەکە تێگەیشتین، ئێمە نەمانهێشت ئەو وروژاندنە ڕووبدات. کە بینیان بەو شێوازە ئەنجام بەدەستناخەن، مەسەلەی شەهیدبوونی هەڤاڵ "گوڵان"یان خستە ڕۆژەڤەوە، گووتیان:" پێویستە ئەو سێ کچانە نەکەونە کۆنگرەوە، ئەگەر ئەوان بکەونە کۆنگرەوە ئەوا ئێمە ناکەوینە کۆنگرەوە..." بەمشێوەیە هەڕەشەیان لە کۆنگرە کرد، ئەوانە دەیانخواست سوود لە هەستیارێتی دۆخەکە وەربگرن و وامەزەندەیان دەکرد کە؛ ئەگەر ئەو هەڕەشەیەیان کرد، ئەوا ئێمە هەنگاو بۆ دواوە دەهاوێژین، بۆ ئەوەی کۆنگرە نەکەوێتە ژێر مەترسییەوە. بەمەش داخوازی ئەوان پێك دەهێنین، کە ئەو داخوازییەی ئەوانمان پێکهێنا، ئەوا دەتوانن تاکتیکی خۆشیان بەڕێوە ببەن. تاکتیکی ئەوان چی بوو؟ بەگوێرەی چەمك و ڕوانینی ئەوان ئێمە و هەڤاڵانی کچ ڕێککەتووین، پێویستە ئەوان ئەو ڕێککەوتنە تێك بدەن. تاکو بتوانن ئەنجام بگرن، بۆ ئەوەی ئەو ڕێککەوتنە تێك بدەن پێویستە ئێمە و هەڤاڵانی کچ بەگژیەکدا بدەن. بۆ ئەو مەبەستەش بەو شێوەیە شەهیدبوونی هەڤاڵ "گوڵان"یان خراپ بەکارهێنا. کاتێك کە بینیان ئەو هەڕەشە و گوشارەی ئەوان بەڕێوە ناچێت سەرناگرێت، چونکە کاتێك ئەو گوشارەیان کرد منیش گووتم:" ئیدی من بەراستی نازانم ئەو کۆبوونەوەیە بەمشێوەیە بەردەوام بکات، کێ ئەو کۆبوونەوەیە بەردەوام دەکات با بیکات" و من لە کۆبوونەوەکە دەرچووم، کاتێك کە منیش دەرچووم هەندێك لە هەڤاڵانی دیکەش بەدوای مندا دەرچوون، بەمشێوەیە کۆبوونەوەکە کۆتایی

هات. بۆیە تاکتیکی ئەوان تێکچوو، لەبەر ئەوەی تێکچوو ئەمجارەیان تاکتیکێکی دیکەیان بەڕێوە برد؛ "بۆتان" و "فەرهاد" و ئەوان چوونە شوێنێك کۆبوونەوە و بڕیاریان وەرگرت کە" بەشداری لەکۆنگرەدا ناکەین تا داخوازییەکانی ئێمە جێبەجێ نەکرێت". هەڕەشە و گوشارێکی وەهایان کرد. خواستیان بەمشێوەیە کەسانی بێلایەنیش بکەنە لایەنگری خۆیان. ئیدی "ئەکرەم"ێك هەبوو، گووتی:" ڕەوش مەترسیدارە، "بۆتان" و "فەرهاد" و ئەوان دەڵێن؛ ئەگەر داخوازییەکانمان جێبەجێ نەکرێت ئەوا ئێمە بەشداری لە کۆنگرە ناکەین، بۆیە ڕەوشەکە مەترسیدارە..." منیش گووتم:" ئەگەر بەشداری کۆنگرە دەبن با ببن، ئەگەر بەشداریش نابن با هەر بەشدار نەبن، هیچ ئیشی من پێی نییە" بە ئاشکرا لەسەر کۆنگرە هەڕەشە و مەترسی هەیە و گێرەشێوێنییەك پەرەپێدەدەن، ئەمەش پەسند ناکرێت، من گووتم:" ئەگەر وەها بێت ئەوا ئەو کۆنگرەیە ئەنجام نادرێت و منیش خۆم بەشداری ئەو کۆنگرەیە نابم" کاتێك کە بینیان من ملکەچی بۆ هەڕەشە و گوشارەکانی ئەوان ناکەم، گووتی:" من دەچم لەگەڵ کۆمیتەی ئامادەکار قسە دەکەم" منیش گووتم:" بڕۆ قسەیان لەگەڵ بکە" گووتی:" من دەخوازم لەگەڵ هەڤاڵانی کچ قسە بکەم" گووتم:" دەخوازیت لەگەڵ کێدا قسە بکەیت بڕۆ قسەی لەگەڵدا بکە، هیچ ئیشی من پێی نییە" بێگومان ئەو "ئەکرەم"ە چووە لای کۆمیتەی ئامادەکار، ئەوانەی نێو کۆمیتەی ئامادەکاریش، کە لەگەڵ ئەواندا بوون، هاتن گووتیان:" ئەگەر تۆ بەشداری کۆنگرە نەکەیت نابێت، خەڵك کۆبووەتەوە، ئەمە باش نابێت، پێویستە تۆ بڕیاری خۆت بگۆڕیت" من پێداگریم کرد، ئیدی گووتیان:" با ئێمە کۆبوونەوەیەك سازبدەین و بڕیارێك وەربگرین، تا ئێمە بڕیارێك وەردەگرین تۆ هیچ بڕیارێك وەرمەگرە" منیش گووتم:" من چاوەڕێی بڕیاری ئێوەم" ئەوانیش دەچن لەنێوان خۆیاندا قسە دەکەن و لەگەڵ هەڤاڵانی کچ قسە دەکەن، بە هەڤاڵانی کچ بەپەسند کردن دەدەن کە ئەو سێ هەڤاڵە کچانە بەشداری لە کۆنگرە نەکەن، بەمشێوەیە داخوازی "بۆتان" و "فەرهاد" جێبەجێ دەکەن، دەچنە لای ئەوانیش و پێیان دەڵێن:" ئەوا داخوازی ئێوەمان پێکهێنا" و هاتنە لای من و گووتیان:" مەسەلەکە چارەسەر بوو" گووتم:" چۆن چارەسەرتان کرد؟" گووتیان:" ئیدی ئەو سێ کچانە بەشداری لە کۆنگرە ناکەن، ئێمە بەو شێوەیە چارەسەرمان کردووە" منیش

گووتم:" بەگوێرەی خۆتان چارەسەرتان کردووە، بەگوێرەی تێڕوانینی منیش مەسەلەکە چارەسەر نەبووە، من ئەمە پەسند ناکەم و بەشداری کۆنگرەش نابم و من دەڕۆم" بێگومان کە بینیان من جددیم. زۆر گفتوگۆمان کرد، هەڤاڵانی دیکەش هاتن گووتیان:" بۆ ئەوەی کۆنگرە بە سەلامەتی دەرباز ببێت و ئەمەش دژ بە تەڤگەر بەکار نەهێنن پێویستە تۆ بەشداری کۆنگرە ببیت" لەسەر ئەو بنەمایە گووتم:" بۆ خاتری ئەوەی کۆنگرە سەلامەت بەڕێوە بچێت من دەمێنمەوە و بەشداری کۆنگرە دەبم".

واتا پێش ئەوەی بچینە کۆنگرەوە، بەو شێوەیە پراواکسیۆن و هەڕەشە و گوشاریان دەکرد، تاکو بتوانن ئەنجام وەربگرن. واتا کەشێکی گرژ و بارگراویی کراویان دروستکرد، پروپاگەندە و ڕێکخستەکردنیان ئەنجام دەدا، دەیانگووت:" لەنێو تەڤگەر دوو لایەن هەیە، یەکەمیان: خەتی سەرۆك بەبنەما وەردەگرێت، دووەمیشیان: خەتێکە لەدژی خەتی سەرۆك ڕادەوەستێت. ئیدی بەخۆیان دەگووت:" ئێمە خەتی سەرۆك بەبنەما وەردەگرین و ریفۆرمخوازین و گۆڕانکاری دەخوازین" بەئێمەشیان دەگووت:" ئەمانە دۆگماتیك و چەقبەستوون و ناخوازن گۆڕانکاری ئەنجام بدرێت" پروپاگەندەیەکی بەمجۆرەیان پێشدەخست، لەسەر ئەو بنەمایەش خۆیان ڕێکخستە دەکرد. ئەوانەی نەکەوتبایەتە ژێر کاریگەری ئەوانیشەوە، دەیانخواست تۆمەتباری بکەن و فشاری بۆ بێنن و بەمشێوەیە بێکاریگەری بکەن و ئەنجام بەدەستبخەن.

لەبنەڕەتدا ئامانجی ئەوان سەرۆك بوو، نەك ئێمە. بەڵام نەیاندەتوانی بەئاشکرا لەدژی سەرۆك ڕابوەستن و بیانگووتبایە:" لەدژی سەرۆك و خەتی سەرۆکین و پەسندی ناکەین". چونکە کادیران و گەل پەیوەستی سەرۆکن، ئەگەر بەمشێوەیان بگووتبایە، ئەوا لەسەرەتاوە ئیفلاسیان دەکرد و نەیاندەتوانی کەسێك بخەڵەتێنن و ئەنجام بەدەست بخەن. بۆ ئەوەی هەرکەس بخەڵەتێنن و ئەو شتەی دەشیکەن کەس لێی تێنەگات خۆیان لەپشت سەرۆك دەشاردەوە، خۆیان وانیشان دەدا کە دەخوازن لەسەر خەتی سەرۆك بەڕێوە بچن، ئێمەشیان وانیشان دەدا کە لەدژی خەتی سەرۆکین، بەمەش کاردانەوەی کادیران و گەل لەبەرامبەر ئێمە دروست بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو کاردانەوەیە ڕێکخستە بکەن و ڕێکخستن لەژێر کۆنترۆڵی ئێمە دەربخەن و بیخەنە دەستی خۆیانەوە، کە ڕێکخستنیشیان خستە دەستی خۆیانەوە، هەڵبەتە دەتوانن ئیشی سەرۆك بەئاسانی

تەواو بکەن. ئەگەر ئێمەیان دەکردە ئامانج بۆ ئەو مەبەستە بوو. چونکە دەیانزانی تاکو ئێمە بێکاریگەر نەکەن ئەوا ناتوانن ڕێکخستن بخەنە دەستی خۆیانەوە، بۆ ئەوەی ڕێکخستن بخەنە دەستی خۆیانەوە، دەیانخواست سەرەتا ئێمە بێکاریگەر بکەن، ئەو پڕوپاگەندانە و لەیستۆکانەیان بۆ ئەو مەبەستە دەکرد، تاکو کەس لەڕەوشی ئەوان تێنەگات و هەموو کەسێك بخەڵەتێنن و ئەنجام بگرن.

پێشتریش من باسم لێیەوە کرد کە لە پیلانگێڕی شەهیدکردنی هەڤاڵ "حەقی قەرار"دا چۆن لەناوەوەی ئێمە و دەرەوەی ئێمەدا دەستیان لەگەڵ یەکتر تێکەڵاو کردبوو و هەڤاڵ "حەقی قەرار"یان شەهید کرد، دوای ئەوەی شەهیدیشیان کرد دەیانگووت: "ئێمە حەقیجین" بەمەش دەیانخواست ڕاستینەی خۆیان بشارنەوە و ڕێکخستن بخەنە دەستی خۆیانەوە، ئەوانەش هەمان تاکتیکیان بەڕێوە دەبرد. بێگومان تێگەیشتنی بەردەوام لەو تاکتیکە و ئاشکراکردنی شتێکی هەروا ئاسان نەبوو. هەروەها ئەوانە خیتابی لاوازییەکانی مرۆڤیان دەکرد، خیتابی مەیلی ئەوانیان دەکرد، بەمەش دەیانخواست هەموو لاوازییەکانی کادیر لەدژی کادیر و تەڤگەر بەکاربهێنن و بۆخۆیان بەکاری بهێنن و بەمەش ئەنجامگیر ببن. ئیدی گفت و بەڵێنی زۆریان بەوان دەدا و دەیانگووت:" ئەگەر ئێمە بووینە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی ئەوا هەندە شتەتان بۆ دەکەین و ئێوە دەنێرینە فلان شوێن و نازانم بۆ ئێوە چ دروست دەکەین..." سیاسەتمەدارانی چینی باڵادەستیش بۆ ئەوەی گەلانی خۆیان بخەڵەتێنن هەزار درۆی وەها دەکەن، ئەوانەش بەهەمان شێوە ئەو شێواز و ئوسلوبەیان بەڕێوە دەبرد. بێگومان زۆر کەس لەدۆخێکی وەهادا کە پڕاواکەیان کردبوو و ڕاستی و چەوتیان تێکەڵ یەکتر کردبوو، چ ڕاستە و چ هەڵەیە نەیاندەتوانی لەیەکتری جودا بکەنەوە. ئەوانە بەئەنقەست دۆخێکی وەهایان دروستکردبوو، بۆ ئەوەی بتوانن لەو دۆخە ئاڵۆزەدا بەئاسانی ئەو پیلانگێڕییەی بەڕێوەی دەبەن بیگەیەننە ئەنجام و ئەنجامگیر ببن، لەنێو ئاتمۆسفێرێکی بەمجۆرەدا ئێمە چووینە نێو کۆبوونەوە (کۆنگرە)ی جڤاتی گشتییەوە.

بێگومان لە کۆبوونەوە (کۆنگرە)ی جڤاتی گشتییدا نیازی ئەوان زیاتر ئاشکرا بوو، سەرۆك گووتبووی:" ئەگەر کۆنگرە سازدرا، با هەڤاڵانی بەڕێوەبەرایەتی ئێستا بەشداری لە بەڕێوەبەرایەتی نوێدا نەکەن"، ئێمەش لە کۆبوونەوەی ناوەندی خۆماندا ئەو

بڕیارەمان وەرگرتبوو، من لەسەر ئەو بنەمایە لە ڕاگەیاندندا ڕیپۆرتاژێکیشم لەگەڵدا کرابوو، لەو ڕیپۆرتاژەدا گووتبووم:" ئەگەر کۆنگرە سازبدرێت ئێمەی هەڤاڵانی کۆن ناگەوینە نێو بەڕێوەبەرایەتی نوێوە" ئەوە تەدبیرێك بوو، هەم ئامادەکردنی گەل بوو، هەمیش تەدبیرێك بوو، من بینیم کە "فەرهاد" و "بۆتان" و ئەوان دەخوازن ئەو بڕیارە خراپ بەکار بهێنن و پێشێلی بکەن و ئێمە ئەو بڕیارە پێك بهێنین و ئەوانیش پێکینەهێنن و لە بەڕێوەبەرایەتی نوێشدا بمێننەوە، هەڵبەتە بەنهێنی لەیستۆکێکی بەمجۆرەشیان پێشدەخست. ئێمە چۆن بەو مەسەلەیەمان زانی؟ ئەو هەڤاڵانەی کە لە ئەورووپاوە لەناو گەل هاتبوون، لەگەڵ هەندێکیان قسە و باسیان کردبوو و گووتبوویان:" لەبەڕێوەبەرایەتی کۆندا با "فەرهاد" و "بۆتان" و هەروەها "ڕەمزا ئاڵتون" بمێننەوە، با ئەوانی دیکە نەمێننەوە، ئەگەر هەموو هەڤاڵە کۆنەکان لەبەڕێوەبەرایەتیدا نەمێنن باش نابێت..." شەخسی خۆیان بەوان بە پەسندکردن دابوو، هەندێك پڕوپاگەندەشیان کردبوو. بێگومان ئەو کەسانەی کە لە ئەورووپا هاتبوون بەمنیان گووت:" پێویستە تۆش لە بەڕێوەبەرایەتیدا بمێنییەوە" من گووتم:" بۆچی من بمێنمەوە؟ تەعلیماتی سەرۆك لەبەرچاوانە، بڕیاری ئێمە لەبەرچاوانە، ڕیپۆرتاژەکەی من لەبەرچاوانە، ئەخلاقێکی ئێمە هەیە، ئێمە ناتوانین ئەوانە هەمووی ژێرپێ بکەین" بەڵام من دەرکم بەوە کرد کە مەسەلەکە ئەوە نییە کە دەخوازن من لە بەڕێوەبەرایەتیدا بمێنمەوە، مەسەلەکە ئەوەبوو کە ئەوانە لەیستۆك دەکەن و دەخوازن لە بەڕێوەبەرایەتیدا بمێننەوە، دەخوازن هەڵوێستی ئێمە لەم بارەیەوە بزانن، بۆ ئەوەی تەدبیر وەربگرن، بۆ ئەوەی هەڵوێستی ئێمە تێبگەن ئەو قسانە دەکەن. ئەو کەسانەش بەو شێوەیە بۆ ئامانجەکانی خۆیان بەکاردەهێنن. کاتێك کە بینیم ڕەوشەکە بەمجۆرەیە، منیش لە جڤاتی گشتیدا ئەوەم ئاشکرا کرد و گووتم:" بڕیاری سەرۆك و تەڤگەر ئەوە بوو کە هەڤاڵانی بەڕێوەبەرایەتی کۆن لە بەڕێوەبەرایەتی نوێدا جێنەگرن. بەڵام بەداخەوە وادیار دەبێت کە هەندێك لە هەڤاڵان دەخوازن ئەو بڕیارە پێشێل بکەن" بەمشێوەیە ئەوەمان ئاشکرا کرد. من بەئەنقەست ئاشکرام کرد، بۆ ئەوەی دەست لەو کارەیان بەربدەن. هەروەها دوای ئەوەی من ئەو قسەیەم کرد "فەرهاد" هەڵسا و گووتی:" ئەو بڕیارە کاتی (KADEK) وەرمانگرتووە، هەڵبەتە

ئێستاش (KADEK)مان هەڵوەشاندۆتەوە، بۆیە ئەم بڕیارە بڕیارێکی بەسەرچووە" بەمشێوەیە نیازی خۆی ئاشکرا کرد، دیسانیش من بینیم کە ناخوازن دەستبەرداری ئەوە ببن، بۆیە من ئاخافتنێکی دیکەم کرد و گووتم:" پێویستە ئەو هەڤالانەی دیکەش لە بەڕێوەبەرایەتیدا بمێننەوە، ئەو هەڤالانەی کە بڕیاریان دابوو نەکەونە بەڕێوەبەرایەتی نوێوە، پێویستە لەبەڕێوەبەرایەتیدا بمێننەوە" ئیدی هەڤالان "عەباس و جەمال و... هتد" دوای ئاخافتنی من لە بەڕێوەبەرایەتیدا مانەوە. ئەگەر وەها نەبایە، ئەوا ئەو هەڤالانەش بەگوێرەی تەعلیماتی سەرۆك و بڕیاری ئێمە خۆیان لە بەڕێوەبەرایەتیدا دەکشاندەوە و نەدەکەوتنە نێو بەڕێوەبەرایەتییەوە. چونکە من بینیم کە ئەگەر ئەو هەڤالانە لە بەڕێوەبەرایەتیدا نەمێننەوە، ئەوا تەنیا ئەوان دەمێننەوە، ئەگەر هەموو هەڤالان لە بەڕێوەبەرایەتیدا دەربکەون و تەنیا ئەوان (گروپەکەی فەرهاد و بۆتان) بمێننەوە ئەوا تەڤگەر بەتەواوی دەکەوێتە دەستی ئەوانەوە، بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات، بە هەڤالانم گووت:" پێویستە ئێوە بمێننەوە" هەڤالانیش بەو شێوەیە مانەوە. لێرەدا لەیستۆکی ئەوان کەمێك خراپ بوو. لەپاشاندا کاتێك کە هەڵبژاردن ئەنجام درا، "فەرهاد" و "بۆتان" دەچن دەبینن لەوانەیە خۆیان لەهەڵبژاردنەکەدا بەسەرنەکەون، بۆیە دیسان پراواکسیۆنێکی دیکەیان کرد؛ هەردووکیان نامەیەکیان نووسیبوو کە گوایە:" ئێمە ئیستقالە دەکەین" و بۆ هەڤاڵ "زوبێر ئایدار"(٥) یان ناردبوو، هەڤالان هاتن بەمنیان گووت، منیش گووتم:" ئەگەر ئیستقالە دەکەن با بیکەن" هەڵبەتە ئەوەش گوشار (شانتاژ)ێك بوو، هەڕەشەیەك بوو، پاشان وادیارە هەڤاڵ "زوبێر" و ئەوانیش چووبوون قسەیان لەگەڵدا کردبوون، بەو شێوەیە دەستبەرداری ئەو کارە ببوون. لەئاکامی هەڵبژاردنەکاندا ئەوانیش بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەرچووبوون، ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی کە دروست بوو بەزۆری لەوان دروست ببوو. بێگومان کاتێك کە بینیان بەڕێوەبەرایەتی بەزۆری لەگروپی خۆیانە، ئەوا بەگوێرەی خۆشیان ئەرك و کاریان دابەشکرد. ئیدی گووتیان:" ئیدی ئێمە ئەنجامگیر بووین و کەس ئەماوە موداخەلەیەك بکات" گەیشتبوونە ئەو قەناعەتە، چونکە ئەوانە چ حیساباتێکیان دەکرد؟ دەیانگووت:" ئەگەر لە کۆنگرەدا هەندێك کەس بیانخواستبایە شتێکیان بکردبایە ئەوا دەیانکرد، ئیدی کۆنگرەش تەواو بوو،

بەڕێوبەرایەتیش بەزۆری لەدەست ئێمە دایە، بەگوێرەی خۆشمان ئەرك و كار دابەش دەكەین، ئیدی مەسەلەكە تەواو بوو..." ئەوانە حیسابی وەهایان دەكرد. بێگومان كاتێك كە ئێمە هاتینە كۆنگرە و ئەو دۆخەمان بینی، كە كۆنگرەش دەستپێكرد و لەیستۆكی ئەوانیشمان بینی، ئەو كاتە من چیم بەهەڤالان گووت؟ پێمگووتن:" ئێمە رووبەڕووی مەترسییەكی مەزن بووینەتەوە، یان دەبێت ئێمە تەڤگەر تەسلیمی ئەوان بكەین، یانیش دەبێت ئێمە لەدژی ئەوان رابوەستین، ئەو كاتە پارچەبوون لەكۆنگرەدا روودەدات. هەم تەسلیمكردن و هەمیش پارچەكردن هەردووكیان مەترسیدارن. چونكە ئەوان لەهەردوو رێگا یەكێكیان دەخەنە پێش ئێمەوە، دەزانن كە هەستیارێتی و پەیوەستبوونی ئێمە بۆ تەڤگەر هەیە، بەمشێوەیە پارچەبوون پەسند ناكەین، ئەو كاتە ئێمە تەڤگەر تەسلیمی ئەوان دەكەین. ئەوانە حیساباتێكی وەهایان دەكرد. ئێمە رێگەی پارچەبوون نادەین، ئێمە ملكەچی ئەوان دەبین... حیساباتێكی بەمجۆرەیان كردبوو، بۆیە من بە هەڤالانم گووت:" هەردووكیشیان مەترسیدارە، با وریا بین بۆ ئەوەی پارچەبوونێك روونەدات، هەروەها با ئێمە زیاتر لەدژی ئەو شتانە بین كە زۆر مەترسیدارن، بەو شێوەیە كۆنگرە بەسەلامەتی تەواو ببێت، ئەگەر ئەوانە دەستبەرداری ئەو كارەیان نەبوون، ئەوا ئێمە پاشان دەتوانین موداخەلە بكەین، هەندێك خراپەكاری روودەدات، بەڵام مەترسی دروست نابێت، هەڤالانیش ئەوەیان پەسند كرد. ئیدی ئەوانە دەیانگووت:" ئەوان لە كۆنگرەدا رێی پارچەبوونیان نەدایە بەرچاو، چونكە ئەگەر وابووایە ئەوا ئەوەیان بەسەر ئێمەدا دەسەپاند، كەواتە لەمەودوا شتێكی دیكە بیكەن نەماوە، تەڤگەریش بەقورسایی لەدەست ئێمە دایە، ئیدی دەتوانین بەئاسانی وەكو خۆمان دەمانەوێت بیكەین و مەزەندەش ناكەین كەوا هیچ موداخەلەیەكی دیكە بكرێت و مەسەلەكە كۆتایی هات..."

بێگومان دوای ئەوەی كۆنگرەی جڤاتی گشتی دامەزراندنی " كۆنگرەی گەل" تەواو بوو، بەڕێوەبەرایەتی نوێش كۆبووەوە، من بە "فەرهاد" و "بۆتان"م گووت:" ئەوەی روویدا ئەوە روویدا، پێویستە هەموو شتێك لەم دۆڵەدا بمێنێتەوە، لێرە نەچێتە دەرەوە، پێویستە ئێوە دەست لەو كارە بەردەن، ئەگەر دەست بەرنەدەن ئەوا پەسند ناكرێت" هەروەها گووتم:" ئێوە كۆبوونەوە دەكەن پێویستە هەستیارێتی تەڤگەر

لەبەرچاو بگرن" هەردووكیشیان گووتیان:" ئەوانەی تۆ دەیڵێیت راستن، ئێمەش هەر بەمجۆرە بیردەكەینەوە" كۆبوونەوەیان دەستپێكرد، لە كۆبوونەوەكەدا پشوویێكیان دا، من لەهەڤاڵانم پرسی، لەهەڤاڵ جەمال (موراد كارایلان) و هەڤاڵ عەباس (دوران كالكان) و ئەوانم پرسی گووتیان:" بەردەوامن لەسەر كار و پیلانی خۆیان" هەروەها گووتیان:" دەخوازن ئێمەش بەتەواوی بێكاریگەر بكەن" كە كۆبوونەوەكە تەواو بوو و هەر كەس چووە سەركاری خۆی، بێگومان زۆر بیرم كردەوە، سێ شەو و سێ رۆژ من گفتوگۆم لەگەڵ خۆمدا كرد، دوای ئەو گفتوگۆیەم لەگەڵ خۆمدا من بڕیارمدا كە موداخەلە بكەم. كاتێك من موداخەلەم كرد. كەس لێی ئاگادار نەبوو، من ئەو بڕیارەم بەتەنیا وەرگرت.

ئیدی كاتێك من دەستم بە موداخەلەكردن كرد، بینیان ئەو تەڤگەرەی كە دەیانگووت:" ئێمە خستوومانەتە دەستی خۆمانەوە" واخەریكە لەدەست ئەوان دەردەچێت، ئەو كاتە تێگەیشتن كە هەروا ئاسان نییە تەڤگەر بكەوێتە دەستی ئەوانەوە. هەڵبەتە ئەو كاتە "كانی یڵماز" گووتبووی:" ئەگەر ئەو "جومعە" ئەو موداخەلەیەی نەكردبایە، ئەوا ئیشەكەی ئێمە سەریگرتبوو و تەواو ببوو، ئیدی كە موداخەلەی كرد ئیشی ئێمەی تێكدا" ئەمە راستە. بۆ ئەوەی ئەو موداخەلەیەی من كردبووم پووچەڵی بكەنەوە، هەندێك شێوازیان بەكارهێنا. تەنانەت هەڕەشەی كوشتنیان لێكردم، لەدژی من زۆر پروپاگەندەیان كرد، تاكو بتوانن فشار و گوشارێك دروستبكەن بۆ ئەوەی دەستبەرداری ئەو كارە ببم، هەموو شێوازێكیان بەكارهێنا. بەڵام كە بینیان من هەر بەبڕیارم، واتا هەرچییەكیش بكەن من هەنگاو بۆ دواوە ناهاوێژم. ئەمجارە خواستیان بەرێگەی هەڤاڵانی كچەوە؛ هەم تاكتیكی خۆیان بەڕێوە ببەن، هەمیش ئێمە بێكاریگەر بكەن. بەڵام ئەوە سەرینەگرت. واتا هەڤاڵانی كچ بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە و لەدژی ئێمە بەكاریان بهێنن، بۆ ئەوەی ئێمە بێكاریگەر بكەن، هەم بەخۆیان زانیارییان بۆ سەرۆك دەنارد، هەمیش بەناوی هەڤاڵانی كچەوە و بەرێگەی ئەوانەوە، ئەو كچانەی لەگەڵ گرووپی ئەواندا بوون، زانیارییان بۆ سەرۆك دەنارد، تاكو بتوانن كاریگەری لەسەر سەرۆكیش بكەن. سەرەتا خواستیان بەرێگەی هەڤاڵانی كچەوە ئێمە بێكاریگەر بكەن، بۆ ئەمەش لە موسڵ كۆبوونەوەیەكیان سازدابوو، بڕیاریان وەرگرتبوو، كە من و هەڤاڵ

"عەباس" ناچار بكەن دەستبەرداری تەڤگەر و ئەركی تەڤگەر ببین، دەخوازن ئەو بڕیارە بكەنە بڕیاری تەواوی هەڤالانی كج، كە گوایە تەڤگەری ژن و "بۆتان" و "فەرهاد" هەموویان پێكەوە بێنە سەر ئێمە و ئێمە بێكاریگەر بكەن. بێگومان ژنان ئەو بڕیارەی ئەوانیان پەسند نەكردبوو، كاتێك كە دەبووایە ئێمە كۆبوونەوەیەك ئەنجامبدەین، پێش سازدانی ئەو كۆبوونەوەیە ئەوان ئەو بڕیارەیان وەرگرتبوو و ئەو كارەیان كردبوو، لەلایەكی دیكەشەوە بەر لە كۆبوونەوەكە "ئەكرەم" خواستی بەرێگەی هەندێك لەهەڤالان، پاسەوانەكانی منیش لە من دوور بخاتەوە. چونكە ئەو هەڤالانە تێنەدەگەیشتن كە مەسەلەكە چییە، دەیانخواست سوود لە نیازپاكی ئەو هەڤالانە وەربگرن و پاسەوانەكانی ئێمە لە ئێمە دوور بخەنەوە، بەو هەڤالانەی گووتبوو:" هێزی عەسكەری لە دەوەربەرمان هەیە، ئەو پاسەوانانە قەرەباڵغی دروست دەكەن، با پاسەوانەكان لێرە دوور بكەونەوە باشترە." ئەو هەڤالانەش بە نیازپاكی خۆیان هاتن بە منیان گووت:" لێرە هێزی عەسكەری هەیە، پێویست بەپاسەوانی نزیك ناكات، ئیتر ئێرە زۆر قەرەباڵغ دەبێت با ئەو پاسەوانانە لێرە دەربكەون باشترە" بێگومان زانیم ئەمە فیتی "ئەكرەم"ە، دەشمزانی كە ئامانجیان چییە. منیش بەو هەڤالانەم گووت:" ئەمانە پاسەوانی ئێمەن، ئەگەر من بە پاسەوانەكانم بڵێم:" لێرە بڕۆن" ئەوا پاسەوانەكانم منیش لەگەڵ خۆیان دەبەن، ئەگەر من لێرە بمێنم ئەوا پاسەوانەكانیش لێرە دەمێننەوە" من پێمگووتن:" تۆ بەوە دیارە بەمن دەڵێیت لێرە بڕۆ". ئەو هەڤاڵە گووتی:" من شتێكی وەها ناڵێم". گووتم:" تۆ دەڵێیت: با پاسەوانەكانی من ئێرە بەجێبهێڵن و دەربچن؟! نا من بەجێناهێڵن و لێرە ناچن" كاتێك من وەهام گووت:" ئەو كاتە ئەو هەڤالانە تێگەیشتن كە لە ژێرەوەدا شتێك هەیە، ئیدی ئەو هەڤاڵە بێدەنگ بوو. بۆچی وەهایان دەكرد؟ كاتێك كە ئێمە كەوتینە كۆبوونەوە بە من و هەڤاڵ "عەباس" بڵێن دەست لەئەرك بەربدەن، دەزانن كە ئێمە دەست لەئەرك بەرنادەین، بە چەك و بەزۆرەملێیی وامان لێبكەن كە ئێمە ئیستقالە بكەین، ئەگەر پاسەوانەكانی ئێمە لەوێ بن ئەوا ناتوانن ئەمە لەبەرامبەر ئێمە ئەنجام بدەن، بۆیە دەخوازن پاسەوانەكان لەئێمە دوور بخەنەوە، تاكو چەك بخەنە سەر سەرمان و گوایە بەزۆرەملێیی تەڤگەر لەدەست ئێمە دەربخەن، كە بەتەواوی تەڤگەر بخەنە دەستی

خۆیانەوە، واتا دەیانخواست کە کودەتایەك ئەنجام بدەن، ئەمە بۆ ئەو مەبەستە بوو.
بێگومان لەبەر ئەوەی ئێمە لەو لەیستۆکە تێگەیشتبووین، ئەو لەیستۆکە هەمووی تێکچوو، نە بەرێگەی ژنانەوە توانیان ئەو لەیستۆکە ئەنجام بدەن، نە بەرێگەی کودەتایەکی عەسکەری توانیان ئەنجامگیر ببن.

کاتێك کە بینیان بەو شێوەیە ئەنجامگیر نەبوون، تەنیا یەك رێگە مایەوە، پێیان وابوو ئەمەش لەرێگەی سەرۆکەوە دەکرێ ببێت، کە بتوانن بەگوێرەی خۆیان زانیاری بگەیەننە سەرۆك، کە سەرۆك لەدژی ئێمە بخەنە جموجۆڵەوە، ئەمەش دوا ئومێدیان بوو، چونکە بەخۆیان هەرچییەکیان دەکرد نەیاندەتوانی ئەنجام بەدەستبخەن، دەیانزانی کە کادیران و گەل پەیوەستن بە سەرۆکەوە، ئەگەر سەرۆك رەخنەی ئێمە بکات و ئێمە شەرمەزار بکات ئەو کاتە دەتوانن کادیران و گەل لەژێر کاریگەری ئێمەدا دەربخەن، چونکە پروپاگەندەیان دەکرد و لەسەر ئێمە دەیانگووت:" ئەوانە لەدژی سەرۆکن، ناهێڵن ئێمە خەتی سەرۆك جێبەجێ بکەین"، ئیدی ئەگەر سەرۆکیش رەخنەی ئێمە بکات و مەحکوممان بکات ئەو کاتە دەڵێن:" دەفەرموون سەرۆك چی بۆ ئەوان دەڵێت!!" ئەو کاتە دەتوانن تەفگەر لەژێر کۆنترۆڵی ئێمەدا دەربخەن. ئەو لەیستۆکەیان دەکرد، لەیستۆکێکی زۆر گڵاو بوو؛ کە چۆن ئێمە و سەرۆك بخەنە دژی یەکترەوە، چۆن وابکەن کە سەرۆك رەخنەی ئێمە بکات، چۆن وابکەن کە سەرۆك ئێمە مەحکوم بکات، تاکو باوەڕی گەل و کادیران و سەرۆك بەئێمە نەمێنێت، تاکو بتوانن بەئاسانی تەفگەر بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە. ئەو لەیستۆکەی دەیانکرد ئەمە بوو.

بێگومان سەرۆك ئاگاداری شتێك نەبوو، هیچ زانیارییەك لەدەست سەرۆك نەبوو، ئەو زانیاریانەی پێی گەیشتبوو، هەمووی "بۆتان" و "فەرهاد" و ئەوان ناردبوویان، بەناوی "کۆنگرەی گەل" و بەڕێوەبەرایەتی ژنەوە، دەیانزانی کە ناردنی زانیاری بەناوی ئەوانەوە، بەناوی ئەو دەزگایانە سەرۆك باوەڕ دەکات. ئیدی ئەو کاتە دەتوانن لەیستۆکی خۆیان بەڕێوە ببن، ئیدی ئەو زانیارییانەی ناردبوویان بەناوی ئەو دەزگایانەوە ناردبوویان، هەمیش زانیارییەکی وەهایان دابوو کە گوایە ئێمە لەدژی سەرۆکین، لەدژی خانەوادەی سەرۆکین، ئێمە لەدژی ئەو کادیرانەین کە سەرۆك بەبنەما وەردەگرن، ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران و سوریا دروستکردووە، ئێمە

کودەتامان بەسەر سەرۆکدا کردووە، ئێمە هەمووومان دەزگاکانمان بەرووی سەرۆکدا داخستووە، ئەو زانیارییانەی کە ناردبوویان لەسەر ئەو بنەمایانە بوو. سەرۆك دەرك بەوە دەکات کە پیلانگێڕییەك لەئارادایە، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی پێشی دەگات ئەوا ئێمە لەناو پیلانگێڕییەکە داین و لەدژی سەرۆك پیلانگێڕی ئەنجام دەدەین، لەلایەکی دیکەشەوە سەرۆك ناخوازێت باوەڕ بەمە بکات و دەڵێت:" ئەوە چۆن دەبێت؟" چونکە ئامانجی پیلانگێڕییەکە ئەوەبوو کە ڕێکخستن لەژێر کاریگەری سەرۆك دەربخەن، ئەمە ئامانجەکەیان بوو، بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی پێیدەگات سەرۆك دەرك بەوە دەکات کە پیلانگێڕییەك پێشدەکەوێت، وەك بڵێی تەفگەر لەژێر کۆنترۆڵی سەرۆکدا دەردەچێت و دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی هەندێك لە دەوڵەتەکانەوە. چونکە دەوڵەتانی ناوچەکەش ئامانجێکی بەوجۆرەیان هەبوو و بۆ ئەم مەبەستەش کاریان دەکرد. بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی بەدەستی گەیشتبوو ئەوا؛ دوو تەڕەف هەن؛ یەکێکیان "فەرهاد" و "بۆتان"ە ئەوەی تریش ئێمەین، ئەوان گوایە ڕیفۆرمخوازن و ئێمە دۆگماتیکین، شەڕ شەڕی دەسەڵاتە... ئەو زانیارییانەی پێیدەگات لەسەر ئەو بنەمایانەیە. هەروەها ئەزموونی کاتی شەڕی (١٩٩٢)یش هەبوو، سەرۆك ئەو ئەزموونەی لەبەرچاو گرت، لەو شەڕەشدا "فەرهاد" لەلایەك بوو و ئێمەش لەلایەك بووین، لە "خواکورك"دا "فەرهاد" تەسلیم بوو، سەرۆك ئەو کاتە بۆ "فەرهاد" گووتی:" لەسەر خەتی تەسلیمکارییە" بۆ ئێمەش گووتی:" لەسەر خەتی چەپین، ئەو خەتەی دەکوژێت و دەمرێت" ئەم هەڵسەنگاندنەی لەدوای شەڕی (١٩٩٢)دا کردبوو، ئیدی بینی کە ئێستاش هەر ئێمە دوو تەڕەفین؛ تەڕەفێك "فەرهاد" و تەڕەفەکەی تریش ئێمەین. بۆ "فەرهاد" ڕیفۆرمیست و ئێمەش دۆگماتیك، بۆیە سەرۆك هەم ئەو زانیارییانەی لەبەرچاو گرتبوو، هەمیش ئەزموونی کاتی شەڕی (١٩٩٢)ی لەبەرچاو گرت، لەسەر ئەو بنەمایە هەڵسەنگاندنی کرد، لە هەڵسەنگاندنەکانی خۆیشیدا بۆ ئەوەی یەکلایی بکاتەوە دەیگووت:" ئەگەر هەندێك زانیاری بە من نەگەیشتووە و من نازانم ڕەوشەکە چییە و هەڵسەنگاندنەکانی من هەڵەن، هەڤاڵان دەتوانن زانیاری دیکە بگەیەننە من، ئەگەر هەڵەش هەبێت دەتوانم ڕاستیبکەمەوە و لێبوردن دەخوازم" دەیخواست ئەو مەسەلەیەش یەکلایی بکاتەوە. بێگومان بەرلەوەی زانیاری بە سەرۆك بگات، ئەوانە هەڵاتن، کە هەڵاتن، سەرۆك

لەمەسەلەکە تێگەیشت کە ئەوە ئێمە نین لە پیلانگێڕییەکەدا شوێن دەگرین، بەڵکو ئەوە "فەرهاد" و "بۆتان"ن بەشدارن لە پیلانگێڕییەکەدا. هەڵبەتە گووتی:" ئەمە پیلانگێڕییە و پیلانگێڕییەکی ئەمریکایە، پێویستە هەموو کەسێك بەر نەفرەتی بدات"، تا ئەو رادەیە هەڵوێستی خۆی بەئاشکرا و بەروونی دیارکرد. واتا بینی کە ئەو زانیارییانەی پێیگەیشتووە زانیاری راست نین، ئەوەی لەناو پیلانگێڕییەکەش دایە "فەرهاد" و "بۆتان"ن، نەك ئێمە بین.

بێگومان "فەرهاد" و "بۆتان" دەیانگووت:" ئەگەر سەرۆك ئەوانە رەخنە بکات و مەحکومیان بکات، ئەوا ئێمە بەئاسانی دەتوانین تەفگەر بخەینە دەستی خۆمانەوە" ئەگەر جارێکی دیکە ئەوانە بۆ بەشداریکردن لە دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی گەڕانەوە ئەوا بۆ ئەو مەبەستە گەڕانەوە، گەڕانەوە تاکو تەفگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، دەیانگووت:" ئیشی جومعە و عەباس تەواو و کۆتایی هات، هەمیش بەدەستی سەرۆك تەواو کران، ئەگەر ئەو رەخنانە کران، ئیدی کادیران و گەل باوەڕ بە جومعە و عەباس و ئەوان ناکەن، ئێمە دەتوانین تەفگەر بخەینە دەستمانەوە، هەروەها ئەگەر رەخنەکران ئەوا جومعە و عەباس و ئەوان بەکاردانەوە (ردفعل) لە سەرۆك نزیك دەبنەوە، ئەو کاتە ئێمەش دەڵێین؛ ها بڕوانن، ئێمە دەمانگووت ئەوانە لەدژی سەرۆکن، ئێوە ئەوەتان پەسند نەدەکرد، فەرموون بڕوانن وا بەچاوی خۆتان دەبینن کە چۆن دژی سەرۆکن" ئەو کاتە لەمیستۆکەکەیان بەسەردەکەوت، ئیدی باوەڕییەکی بەوجۆرەیان هەبوو، بۆیە گەڕانەوە.

بێگومان سەرۆك نزیکبوونەوەیەکی پۆلەتیك (سیاسی)ی بەڕێوە دەبرد، بۆ ئەوەی ئەوانە لەناو تەفگەردا بمێننەوە، ئێمە لەوە تێدەگەیشتین. ئێمەش ئەوەمان بەبنەما وەردەگرت، تاکو لەناو تەفگەردا بمێننەوە، بۆیە لەو کۆبوونەوانەدا ئێمە شەڕێکی ئایدیۆلۆژیمان لەبەرامبەریان نەکرد، چونکە ئەگەر ئێمە ئەو شەڕەمان بکردبایە، ئەوا هەڵدەهاتن، بۆیە ئێمە لە هەڵسەنگاندنەکاندا بەتەواوی هەڵسەنگاندنی سیاسییانەمان بەبنەما وەردەگرت. من خۆم بەتەواوی ئەوەم بەبنەما وەردەگرت، بۆ ئەوەی بتوانین ئەوانە لەناو تەفگەردا بهێڵینەوە.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ من گووتم:" پێویستە لێکۆڵینەوە (لێپرسینەوە)یەك بکرێتەوە؛ داخوا کێ لەناو پیلانگێرییەکە دایە و کێ تێیدا نییە و رۆڵی کێ چییە و چ نییە و کێ خراپەکاری کردووە با ئاشکرا ببێت. با ئەو بڕیارەش ببردرێتە جڤاتی گشتی و با کۆمسیۆنی ئەو لێکۆڵینەوەیەش لە جڤاتی گشتیدا دەستنیشان بکرێت و رەوشی کێ چییە با روون بێتەوە..." ئەمەش پێشنیازی من بوو. لەلایەکەوە نزیکبوونەوەیەکی سیاسیمان دەکرد و لەلایەکی دیکەشەوە پێشنیازمان کرد کە لێپرسینەوە (لێکۆڵینەوە) بەڕێوە بچێت، بۆ ئەوەی راستی بۆ هەموو کەسێك ئاشکرا ببێت. ئیدی جڤاتی گشتی بڕیاری لێکۆڵینەوەی وەرگرت، کاتێك کە ئەو بڕیارەش وەرگیردرا، دوای ئەوە من لە کۆبوونەوەی جڤاتی گشتیدا گووتم:" لەیستۆکێکی مەزن لەسەر تەڤگەر هەیە، پێویستە ئەو لەیستۆکەش تێك بدرێت، بۆ ئەوەی تێکیش بدرێت هەرچییەك لەمن بخوازرێت ئەوا من ئامادەم پێکیبهێنم، ئەگەر ژەهریش بێت ئەوا من دەیخۆمەوە..." ئیدی لەیستۆکەکە گەیشتە کۆتایی، "فەرهاد" و "بۆتان" بینیان کە ئیدی مومکین نییە تەڤگەر بخەنە ژێردەستی خۆیانەوە، مومکین نییە ئێمە بێکاریگەر بکەن، هەروەها لەیستۆك و خیانەتی ئەوانیش دەرکەوتەڕوو و ئاشکرا بووە، ئیدی شتێکی بیکەن نەماوە و ناتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، بۆیە هەڵاتن...

دوای ئەوەی کە هەڵاتن، یەکسەر لەبەرەی دژدا دەستیان بەهێرش کرد و گووتیان:" مەسەلەی بنچینەیی ئێمە سەرۆك و خەتی ئەوە" تا ئەو کاتە دەیانگووت:" مەسەلەی ئێمە جومعە و عەباسە و ئەوان کێشەن لەبەردەم ئێمەدا، ئێمە سەرۆك بەبنەما وەردەگرین" بەڵام کە رەوشی ئەوان ئاشکرا بوو. و سەرنەکەوتن و هەڵاتن ئینجا گووتیان:" مەسەلەی بنەڕەتی ئێمە خەت و رێبازی سەرۆکە" واتا بەراستینەی خۆیانەوە ئاشکرا بوون، تەنانەت گووتیان:" نەك لەئێستاوە، بەڵکو لە (١٩٩١)وە باوەڕمان بە سەرۆکی پارتی و خەتی سەرۆك نەمابوو" ئیدی دەستیان بەهێرش کردن بۆ سەر سەرۆك کرد، بەمەش خواستیان کەوا تەڤگەر تەسفیە و پارچە بکەن، مادام بەدەست ئەوان نەکەوت، ئەمجارە پارچە و تەسفیەی بکەن. بۆیە کەوتنە نێو هێرشێکی مەزنەوە، ئیدی هەرچییەك دەهاتە بەردەمیان لەدژی سەرۆك دەیانگووت...

هەرچییەکیان کرد و نەکرد نەیانتوانی پارچەبوون ئەنجام بدەن و تەسفیەی بکەن و لەمەشدا لەمیستۆکەکەیان پووچەڵ بووەوە.

لەبەر ئەوەی بەتەواوی بێئەنجام مانەوە ئەوا ڕێککەوتنی نێوان "فەرهاد" و "بۆتان"یش کۆتایی پێهات. چونکە ئەوانە لەدژی تەڤگەر ڕێککەوتبوون، کە تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، بۆیە زۆر هەوڵ و تەقەللایان دا، ئەمجامگیر نەبوون، ئیدی هەلاتن بۆ ئەوەی تەڤگەر پارچە بکەن و کەوتنە نێو هێرش و پرۆپاگەندە کردنەوە، ئەمەش سەرینەگرت، شتێکی بیکەن نەمابوو، سەرنەکەوتبوون، ئیدی ڕێککەوتنی ئەوانیش تا ئەو خاڵە بوو، بۆیە ڕێککەوتنی نێوانیان بێواتا دەمایەوە، ئەو شتەی لەسەری ڕێککەوتبوون و خستبوویانە پێش خۆیانەوە بەدینەهاتبوو، بۆیە نەیاندەتوانی ئەو ڕێککەوتنەی نێوانیان بەڕێوە ببەن و بەردەوامی پێبدەن. بۆیە ئەمجارە کەوتنە دژایەتیکردنی یەکتر، بەمەش لەنێوان خۆیاندا پارچە پارچە بوون. هەڵبەتە پێشتریش یەکگرتوو نەبوون، بەمجۆرە ئەو ڕێککەوتنەی نێوانیان تێکچوو و هەڵوەشایەوە.

**وادیارە لەو قۆناخەدا ئەو گروپە چەندین شرۆڤە و هەڵسەنگاندنی سەرۆك ئاپۆشیان بەکاردەهێنا، وابزانم لەبەرگرینامەکەی ئەسینا (کوردی ئازاد ناسنامەی خۆرهەلاتی ناوینی نوێیە)دا سەرۆك ئاماژەی بە ریفۆرمکردن داوە؛ ریفۆرمی سیاسی، ڕێکخستنی و کۆمەلایەتی، ئەو گروپە ئەو زاراوانەیان بەکاردەهێنا. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە چۆن توانیان ئەو چەمك و زاراوانە بۆ سوودی خۆیان بەکاربهێنن، ئەمە لەکاتێکدا پێشینەی پراکتیکی کەسانی نێو ئەو گروپە دیار و بەرچاو بوو، لەکۆنگرەشدا وەکو باستان کرد تارادەیەك ئەوان قازانجیان کرد... ئەمە چۆن روویدا؟**

هەڵبەتە کاتێك کە ئەوانە هەڵاتن و ڕۆیشتن، من ئەو کاتە گووتم:" تەڤگەری ئێمە ڕشایەوە، هەرچەندە ئێمە کەمێك ئازارمان بینی، بەڵام ئیدی لەمەودوا دەحەسێینەوە".
بۆچی من ئەمەم گووت؟ چونکە هەرچی پیسی و خراپی نێو ئەو تەڤگەرە هەبوو لەئەوانەوە دروستببوو، ئەوانە هەموویان زۆر خراپییان لەناو تەڤگەردا تەشەنەپێدا، بە ڕۆیشتنی ئەوانیش تەڤگەر لەئەوان و لە پیسی ئەوان ڕزگاری بوو. ئیدی تەڤگەر دەیتوانی خۆی پاك بکاتەوە و لەسەر بناخەی خۆی هەنگاو بهاوێژێت. بۆیە من ئەو گووتنەم کرد، من گووتم:" تەڤگەر ڕشایەوە، ئێمە ئازارمان چەشت، بەڵام ئیدی تەڤگەر دەحەسێتەوە، ئیدی دەتوانین لەسەر بناخەی خۆمان بژین و هەنگاو بهاوێژین". چونکە ئەوانە نەیاندەهێشت ئێمە لەسەر بناخەی خۆمان بڕۆین، ئەوانە بەردەوام لەنێو تەڤگەردا پیسی و خراپەکارییان دەکرد و هەموو خراپییەکی خۆشیان خستە سەر تەڤگەر و ڕۆیشتن. گووتمان:" هەرچۆنێك بێت دەتوانین پیسییەکانی ئەوان خاوێن بکەینەوە، دەتوانین تەڤگەر خاوێن بکەینەوە، لەمەودوا تەڤگەر دەتوانێت لەسەر بناخەی خۆی کاربکات و بەرێوە بڕوات". ئەگەر من ئەو هەڵسەنگاندنەم کرد لەبەر ئەو هۆیە بوو.

چونکە ئەگەر مرۆڤ باش لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی ئەو تەڤگەرە بکات ئەوا دەبینێت کە هەرچی خراپی و گەمارییەك دەرکەوتووە، لەئەواندا دەرکەوتووە، ئەوانە هەموو ئەو خراپەکارییەیان کردووە، ئەوان چەتەگەرییان پێشخست، ئەوان لیبرالیزمبوونیان پێشخست، ئەوان سەکتەریزم (توندگەرایی)یان پێشخست، ئەوان یارییان بە بەها ماددی و مەعنەوییەکانی ئەو تەڤگەرەوە کرد... ئیدی ئەو تەخریباتانەی کردبوویان ئەوا کردبوویان، ئیدی بەهەڵاتنیان شتێکی دیکە نەمابوو بیکەن، تەخریباتیان لەناو تەڤگەردا کردبوو، ئیدی شتێك کە بە هەڵاتنی خۆیان بیکەن نەمابوو، بۆیە من گووتم:" ئیدی دەحەسێینەوە و لە بەڵایەك ڕزگارمان بوو"

ئەگەر لەناو تەڤگەردا ئەو هەموو گەماری و خراپییەیان کردبێت، کەواتە چۆن لە یەکەمین کۆنگرەی جڤاتی گشتیی "کۆنگرەی گەل"دا بەرێوەبەرایەتیان خستە دەستی خۆیانەوە...؟ بێگومان هۆکاری خۆی هەیە، یەکەمیان: ئێمە لەوێدا هەندێك خەتامان کرد و سوودیان لەخەتاکانی ئێمە وەرگرت، خۆیان باش بەرێکخستن کردبوو. هەروەها

لەزۆر شوێندا ئەو بەشداربووانەی کە دەبووایە بەهەڵبژاردن بێنە جڤاتی گشتی، بەتاڵیان کردبووەوە و لەرێگەی فشار و کەسانی خۆیان، پیاوانی خۆیان، کردبووە بەشداربووی کۆنگرەی جڤاتی گشتییەوە...

بۆ دموونە؛ لە پارتی ژیانی ئازادی کوردستان (PJAK)دا سێ جار هەڵبژاردن دەکرێت، هەر سێ جاریش ئەوانەی هەڵدەبژێردرێن بەگوێرەی ئەوان نین و پیاوی ئەوان نین، "فەرهاد" بەفشار و گوشار ئەو هەڵبژاردنانە بەتاڵ دەکاتەوە. ئەو کاتە هەڤاڵان دەڵێن:" مادام سێ جار بەهەڵبژاردن بەشداربووان (پاڵێوراوان) هەڵدەبژێردرێن و ئێوە پەسندی ناکەن، کەواتە ئێوە کێ دەخوازن ئەوان ببەنە کۆنگرەوە..." واتا بەگوێرەی خۆیان بەشدارانی کۆنگرە دەستنیشان دەکەن. هەروەها لەنێو تەڤگەری لاوانیشدا دیسان بەمشێوەیە دەکەن. ئێمە بەو شتانەمان نەزانیبوو، پاشان پێمانزانی و هەستمان پێیکرد. دووەمیشیان: ئەوانەی لەنێو گەلەوە تەڤلی کۆنگرە ببوون نەیاندەزانی لەناو تەڤگەردا چ کێشە و گرفتێك هەیە، ئێمە هەریەکە و لەجێگەیەکدا لەنێو کاردا بووین، "فەرهاد" و "بۆتان" و ئەوان چەند رۆژێك بەر لە کۆنگرە دانیشتوون و کێ هاتووە بە رۆژان و بەسەعاتان هەر ئاخافتنیان بۆ کردووە، کە چۆن ئەوان پابەندی سەرۆکن و چۆن بەگوێرەی سەرۆك دەیخوازێت گۆڕانکاری دەخوازن، چۆن ئێمەش دۆگماتیکین و چەقبەستووین و لەبەردەم گۆڕنکارییدا ئاستەنگیین... ئەو ئاخافتنانەیان کردووە. ئیدی ئەو کەسانەشیان خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. هەروەها هەندێك لەهەڤاڵانیش کە پەیوەستی تەڤگەریش بوون، بەفشار و هەڕەشەی ئاشکرا بێکاریگەرییان کردوون. ئیدی بەهەندێکیان گووتووە:" ئێوە دۆگماتیکن، ئێمە ریفۆرمخوازین، ئێوە چەقبەستوون" بەمشێوەیە ئەوانەیان خستۆتە ژێر تۆمەتەوە، بۆ ئەوەی بێکاریگەرییان بکەن. ئیدی لەئاکامی ئەوەدا بوونە زۆرینە لەکۆنگرەدا و زۆربەی بەرێوەبەرایەتیان خستە دەستی خۆیانەوە.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئێمە ئامانجێکی وەهامان نەبوو کە هەندێك کەس بەتایبەت بۆ بەرێوەبەرایەتی دەستنیشان بکەین، ئێمە شێوە و شێوازێکی دیموکراتییانەمان بۆ ئەم مەبەستە بەرێوە دەبرد، کولتوور و ئەخلاق و نەریتێکی ئێمە لەم رووەوە هەبوو. واتا ئێمە موداخەلەی ئیرادەی کەسێکمان نەکرد، کێ دەخوازێت ببێتە ئەندامی

بەڕێوەبەرایەتی با ببێت، جڤاتی گشتی دەخوازێت کێ بکاتە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی با بیکات، چەمك و ئەخلاقێکی گشتی ئێمە وەها هەبوو، کەچی ئەوانە موداخەلەی ئیرادەی مرۆڤەکانیان دەکرد:" ئێوە فلاّن کەس مەکەن بە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی و فیسار بکەن بە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی، ئەگەر ئێوە فلاّن کەس بکەنە ئەندامی بەڕێوەبەرایەتی ئێمە وەها و وەهاتان بۆ دەکەین. واتا ئەو شێوازانەیان هەموو بەکارهێنابوو، لەئاکامی ئەوەدا بەقورسایی لە بەڕێوەبەرایەتیدا شوێنگیر بوون. لەلایەکی دیکەشەوە لە جڤاتی گشتی دا دۆخەکەیان شێواندبوو (پراواکە کردبوو). وەك بڵێن:" یان تەفگەر تەسلیم بە ئێمە بکەن، ئەگەرنا ئەوا تەفگەر پارچە دەکەین" ئەوەیان خستبووە پێش ئێمەوە. ئێمەش ئەوەمان بە مەترسی دەزانی، بۆیەش ئێمە زێدە موداخەلەمان نەدەکرد، ئەوانە سوودیشیان لەمە بینی و هەندێك چەمکی خۆیانیان لە جڤاتی گشتیدا پێشخست، ئەو ئامادەکارییانەی لەرێگاری کۆمیتەی ئامادەکارییەوە کردبوویان بەمە تەواویان کرد، بۆیەش قورساییەکیان بۆخۆیان دروستکردبوو و زۆر کەس نەیاندەزانی چ لەیستۆکێك ئەنجام دەدرێت و وەها باوەڕیان دەکرد کە ئەوانە شتێك دەکەن و پەیوەستی سەرۆکن. چونکە ئەمە بەکاردەهێنن و ئەو مەترسییانەیان نەدەبینی، ئەگەر قورسایی خۆیان لە کۆنگرەدا دروستکرد لەبەر ئەو هۆیە بوو، نەك بەراستی خەتی سەرۆکیان بەبنەما وەردەگرت، یان بەو شێوەیە بەهێزبوون، وەها نەبوو. ئەوانە یاریان بەچەمك و زاراوە و هەڵسەنگاندنەکانی سەرۆك دەکرد و دەیانشێواند و ناواخنی چەکك و هەڵسەنگاندنەکانیان پووچ دەکردەوە. ئیدی بەگوێرەی خۆیان چەمکەکانی "دیموکراسی، ئازادی و ئازادی تاك"یان لێکدەدایەوە و بەگوێرەی خۆیان چەمکێکی دەرەوەی رێکخستن و ژیانێکی جودای ژیانی رێکخستنیان پێشدەخست، زێدەتریش خیتابی سۆزی مرۆڤەکانیان دەکرد، لەمەوە ئەنجامگیر بوون و قورسایی خۆیان دروستکرد... ئەمە بووە هۆکاری ئەو قازانجکردنەیان...

## وەکو دیار دەبێت تەسفیەگەرێتی لەیەکەمین کۆنگرەی جڤاتی گشتی "کۆنگرەی گەل" دا بەو شێوەیە دەبێت و چوارچێوەکەی روون

**دەبێتەوە، ئەی لەدووەمین و سێیەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی "کۆنگرەی گەل" دا ناکۆکی و جموجۆڵەکانی ئەو گروپە بە چ رەنگێك بەدیار دەکەوێت؟ چونکە دوای یەکەمین کۆنگرە هەڵدێن و پاشان دەگەڕێنەوە ناو تەڤگەر و تەنانەت بەشداری دووەمین کۆنگرە یان بڵێین دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی کۆنگرەی گەلیش دەبن...**

هەڵبەتە دوای یەکەمین کۆنگرەی جڤاتی گشتی هەڵاتبوون و چووبوونە ئێراق. ئیدی سەرۆکیش دەیخواست هەرچۆنێك بێت بیانگەڕێنێتەوە بۆ چیا و بۆ ناو تەڤگەر، بۆ ئەوەی ئەمریکا و ئەوان لەدژی تەڤگەر بەکاریان نەهێنن، بۆ ئەوەی (ی ن ك) و (پ د ك) بەکاریان نەهێنن. چونکە (ی ن ك) و (پ د ك) دەیانخواست ئەو هەڵاتنەی ئەوان لەدژی تەڤگەر بەکاربهێنن و بەرێگەی ئەوانەوە تەڤگەر بخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە، ئەگەر ئەمەش نەکرێت، ئەوا تەڤگەر پارچە پارچە بکەن و لاواز و بێتوانای بکەن. سەرۆك ئەو مەترسییەی دەبینی، بۆ ئەوەی لەدژی تەڤگەر بەکار نەهێندرێن دەیخواست لە ئێراق دەریانبخات و بیانگەڕێنێتەوە بۆ چیا و لەناو تەڤگەریشدا بیانهێڵێتەوە. ئیدی سەرۆك گووتی:" با لیژنەیەك ئاوا بکرێت و ئەو لیژنەیە بەبێ لایەنی هەڵسوکەوت بکات، هەم بۆ بۆتان و فەرهاد، هەم بۆ جومعە و ئەوان با ئەو لیژنەیە کار بکات تاکو کۆبوونەوەی ئاوارتەی جڤاتی گشتی سازدەدرێت، لەوێش ئەو کێشە و گرفتانە چارەسەر بکرێت، ئیدی با لیژنەی سەرلەنوێ بنیادنانەوە پێکبێت... لەسەر ئەو بنەمایە ئەو لیژنەیە پێکهات. ئەو لیژنەیە دەستی بەکارەکانی کرد و ئێمەش هاوکاری ئەو لیژنەیەمان دەکرد، تاکو داخوازی سەرۆك بێتەدی. ئیدی ئەوانە لەسەر ئەو بنەمایە گەڕانەوە، وەکو گووتم:"رەخنەی سەرۆك هەبوو، رەخنەکانیش زیاتر بۆ ئێمە بوو، ئەوانە بەمە باوەڕیان کرد و گووتیان:" ئەگەر ئێمە بچینەوە دەتوانین تەڤگەر بخەینەوە دەستی خۆمان" بۆیە گەڕانەوە، نەك گەڕابنەوە و تەڤلی کۆبوونەوەی جڤاتی

گشتی ببنن و کێشەکان چارەسەر بکەن، بۆ ئەوە گەڕابوونەوە بەئومێدی ئەوەبوون کەوا لە دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتیدا تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە بۆ ئەو مەبەستە گەڕانەوە، ئێمە بەر لە کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد و بەو کۆبوونەوانەوە چووینە دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی ، بەڵام کە بینیان ناتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە و ڕەوشی ئەوانیش ئاشکرا بوو، ئیدی جارێکی دیکە هەڵاتنەوە و ڕۆیشتن.

هەڵبەتە دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی کۆبوونەیەکی ئاوارتە (نائاسایی) بوو، زێدەتر ئەو کێشانەی دەرکەوتبوون کردبووی رۆژەڤی خۆیەوە تاکو چارەسەریان بکات. واتا لەتەڤگەردا پارچەبوون و تەسفیە ڕوونەدات و ئەو گروپەش لەناو تەڤگەردا بهێڵێتەوە. ئەو کۆبوونەوە ئاوارتەیە بۆ ئەو مەبەستە بوو. بۆ ئەمەش ئێمە هەوڵماندا. بەڵام ئەوانەش بینیان کە ناتوانن تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، ئەوا هەڵاتن و ڕۆیشتن. ئیدی ئەو مەسەلەیەش لەهەموو ڕوویێکەوە دەرکەوتەڕوو کە مەسەلەکە چییە و چی نییە. واتا ئەرکی دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی ئەوەبوو کە ئەو کێشە و گرفتانەی سەریانهەڵداوە چارەسەریان بکات، هەر ئەمەشی کردبووە ڕۆژەڤی خۆی، ڕۆژەڤی دیکەی نەبوو.

دوای ئەوەی ئەوانە هەڵاتن و ڕۆیشتن و ڕەوشی ئەوان یەکلایی بووەوە؛ تەڤگەر لەدژی خیانەت و تەسفیەگەرێتی کەوتە نێو خەبات و کارەوە، بەمەش هەنگاوی هاوێشت و کاریگەرییەکانی ئەوانی هەندێك کەم کردەوە، تەخریباتەکانی کەم کردەوە، ڕێگیری لەبەردەم تەسفیەبوون و خیانەت کرد. لەسەر ئەو بنەمایەش سێیەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی ئەنجامدرا. جڤاتی گشتی ئەوەی خستە ڕۆژەڤی خۆیەوە کە مۆدێلی "کۆنگرەی گەل" چۆن پێشبخرێت؟ ئەو تەخریبات و تەسفیەگەرییەی ئەنجام درابوو تاچەند کاریگەری لەسەر کادیران و گەل کردووە، ڕاوەستەی لەسەر ئەو مەسەلانە کرد، تاکو لەسەر ئەو مەسەلانە باش تێگەیشتن بێتەدی، بۆ ئەوەی کادیران و گەلیش بەتەواوی لەژێر کاریگەری و تەسفیەگەری ڕزگار بکات. لەبنەڕەتدا سێیەمین کۆبوونەوە ئەمەی بۆخۆی کردە ئامانج. هەروەها ویستی مۆدێلی "کۆنگرەی گەل" بەرەو پێشەوە ببات. چونکە لە یەکەمین و دووەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتیدا تێگەیشتنی ڕاست بۆ

مۆدێلی "کۆنگرەی گەل" بەدینەهاتبوو، گروپی خیانەتکار و تەسفیەگەرای چەتەگەر نەیانهێشت تێگەیشتن بۆ مۆدێلی "کۆنگرەی گەل" دروست ببێت. بۆیە پێویستبوو لەمیانەی سێیەمین کۆنگرەوە تێگەیشتن لەمەدا بەدیهاتبایە، یەکێك لەئەرکەکانیش ئەمە بوو، لەم رووەوە هەنگاوی هاوێشت.

ئیدی چوارەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی کۆنگرەی گەل تەسفیەگەرێتی لەدوای خۆی بەجێهێشتبوو، تەڤگەر لەهەوڵی ئەوەدابوو کەوا چۆن بتوانرێت "کۆنگرەی گەل" بەهێز بکرێت و ئەو هەنگاوانەی لەم رووەوە هاوێشتراون هەڵە و کەموکورییەکانی چین؟ چۆن بتوانرێت ئەو هەڵە و کەموکورییانە نەهێڵرێت؟ لەبنەمادا لەسەر ئەو مەسەلانە راوەستەی کرد. چونکە لەسیستەمی "کۆنگرەی گەل"دا هەم کێماسی تێدا هەبوو، هەمیش هەڵەی تێدا هەبوو. پێویستبوو ئەمەی بەتێگەیشتن دابایە و تەدبیری ئەوەی وەربگرتبایە و مۆدێلی خۆیشی قووڵ بکردبایەوە. ئیدی چوارەمین کۆبوونەوە (کۆنگرە)ی جڤاتی گشتی ئەو ئەرکەی پێکهێنا. لەبنەڕەتدا مۆدێلی "کۆنگرەی گەل" لەسێیەمین و چوارەمین کۆبوونەوەکانی جڤاتی گشتی‌دا گفتوگۆی لەسەرکرا، تاکو تێگەیشتن لێی بێتە ئاراوە؛ کە چییە و چی نییە. لەیەکەمین و دووەمین کۆبوونەوە (کۆنگرە)دا زێدە ئاخافتن و گفتوگۆ ئەنجام نەدرا. بۆیەش تێگەیشتن لێی بەدینەهات، هەریەکە و بەگوێرەی خۆی لێی نزیکبووەوە. بێگومان لەیەکەمین کۆنگرە (کۆبوونەوە)دا بەتەواوی ئاڵۆزی و تەڤلیهەڤی هەبوو، تەسفیەگەرێتی هێنایە ئاراوە، دووەمین کۆنگرەش ئاوارتە بوو، بۆ ئەوەی رێگیری لەو تەسفیەگەرێتییە بکرێت کە بەرمیسەنبوو. لەم رووەوە هەنگاو هاوێشتران. هەڵبەتە ئەو گروپەی خیانەت دابڕان و رۆیشتن، ئەو کارەی ئێمە ئەنجاممان دابوو ڤاڵا دەرکەوت. واتا ئێمە دەمانخواست لەناو ئێمەدا بمێننەوە، لەئاکامدا ئەنجامگیر نەبووین و ئەوان نەمانەوە هەڵاتن. بۆیە ئەو ئەرکەی کە لەیەکەمین و دووەمین کۆبوونەوەدا خستبوومانە پێش خۆمان و پێکنەهات، پێویستبوو سێیەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی بیخستبایە پێشخۆیەوە، ئەو ئەرکانەی پێکنەهاتبوون سێیەمین کۆبوونەوە کردی بەرۆژەڤی خۆی. چوارەمین کۆنگرە (کۆبوونەوە) لەم رووەوە هەنگاوەکانی تەواو کرد، ئەو هەڵە و کەموکورییانەی لەمۆدێلی

"کۆنگرەی گەل"دا هەبوو دەستنیشانی کرد و خواستی راستیان بکاتەوە، بڕیاری لەسەر ئەمە دا.

## لە حەوتەمین کۆنگرەی (PKK) لەساڵی (٢٠٠٠)دا گۆڕانکاری ستراتیژی بەشێوەیەکی فەرمی بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئایا تاچەند ئەو گۆڕانکارییە ستراتیژییە بۆهەر پارچەیەك لە پارچەکان رەنگدانەوەی خۆی هەبوو؟ ئەو کێشە و گرفتانەی لەپرۆسەی گۆڕانکاری ستراتیژی هاتنە ئاراوە چیبوون؟

کاتێك کە (PKK) لە کوردستاندا دەستی بەکار و تێکۆشان کرد، یەکێتی گەلی کورد و تەواوی کوردستانی بەبنەما وەرگرت، هیچ کاتێك کوردستانی تەنیا لەبەشێکدا نەبینی، بەڵکو گەلی کوردی لەهەر چوار پارچەدا بینی، بۆیە لەو رۆژەوەی دەرکەوتووە کێشەی هەموو کورد و کوردستانی دایە پێشخۆی و ئەوەی کردە ئامانج کە چۆن بتوانێت چارەسەری بکات. لەبەر ئەوەی سەرەتا ستراتیژییەتی کوردستانێکی سەربەخۆ و دیموکرات و ئازادی کردە ئامانج، واتا یەکێتی گەلی کورد و دەوڵەتێکی کوردی کردە ئامانج. بۆیە لەم پێناوەدا خەباتی کرد، لەسەر ئەو بنەمایە زۆر پێشکەوتن و هوشیارکردنەوەی بەدیهێنا، رۆحێکی کوردانە و یەکێتییەکی لەنێوان گەلی کورد خوڵقاند و نەتەوەیبوون و ئیرادەی کوردانی ئافراند.

کاتێك کە سەرۆك لەساڵی (١٩٩٣)وە دەستی بە گۆڕانکاری ستراتیژی کرد و هەوڵیدا کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو لەسەر تەفکەر نەهێڵێت و نوێبوونەوەیەك لە تەفکەردا بێنێتەدی، سەبارەت بەمەسەلەی پارچەکانی کوردستانیش هەندێك گۆڕانکاری ئەنجام دا. چونکە تەواوی تەفگەری هەم لەکاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراوی رزگارکرد، بۆیە نوێبوونەوەیەکی تۆکمەی ئەنجام دا، هەمیش لەستراتیژدا گۆڕانکاری ئەنجام دا، ئەمەش نوێبوونەوەیەکی زۆر مەزن بوو. پێشتر تەفکەر کێشەی کوردی هەر تەنیا وەك کێشەی ئازادی گەل نەدەبینی، شانبەشانی ئەمەش وەك مەسەلەی

دەوڵەتیشی دەبینی. واتا:" ئەگەر تۆ دەخوازیت کێشەی گەلی کورد چارەسەر بکەیت، ئەوا دەبێت تۆ دەوڵەتێکی کوردی ئاوا بکەیت، بەمشێوەیە کێشەی کورد چارەسەر دەبێت، ئەگەر دەوڵەت ئاوا نەکرێت ئەوا کێشەکە چارەسەر نابێت و ئازادی و دیموکراتیش نایەتەدی". ئەم تێڕوانینە ستراتیژییە کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو بوو، بەڵام کە سۆسیالیزمی بنیادنراو تەسفیەبوو، هەندێك راستینەی ئاشکرا کرد کە" مەسەلەی ئازادی و دیموکراسی مەسەلەی دەوڵەت نییە، تەنانەت ئەگەر تۆ دەوڵەتت بەبنەما وەرگرت ئەوا تۆ ناتوانیت ئازادی و دیموکراتی بەتەواوی بەدیبهێنیت" ئەو راستییە روون بووەوە کەوا مەسەلەی ئازادی و دیموکراتی مەسەلەی دەوڵەت (دروستکردن یان نەکردن) نییە. بەڵام تا ئەو کاتە، تێڕوانینی وەها نەبوو، بەڵکو ئەگەر تۆ دەخوازیت کوردستان رزگار بکەیت ئەوا پێویستە تۆ دەوڵەتێك ئاوا بکەیت. تا ئەو کاتە وەها تێگەیشتبووین و لەم پێناوەشدا کارمان دەکرد.

بەڵام بەهەڵوەشاندنەوە و تەسفیەبوونی سۆڤییەت ئێمە بینیمان کە دەوڵەت چارەسەر نییە، تەنانەت ئەو کەسەی بەراستی دەخوازێت ئازادی و دیموکراسی و عەدالەت بێنێتەدی، پێویستە دەوڵەت بەبنەما وەرنەگرێت، چونکە دەوڵەت بەهەر شێوەیەك بێت یا ببێت، حاکمییەت (باڵادەستی) بەبناخە وەردەگرێت، ئەگەر باڵادەستیشی بەبناخە وەرگرت ئەوا باڵادەستێتی لەسەر کۆیلایەتی بنیاد دەنرێت، ئەگەر لەشوێنێکدا کۆیلایەتی نەبێت ئەوا باڵادەستیش نابێت. بۆیە ئەگەر تۆ باڵادەستیت بەبناخە وەرگرت ئەوا باڵادەستێتی لەسەر کۆیلایەتی بنیاد دەنرێت، کەواتە ئەمە ئازادی، دیموکراسی و یەکسانی ناهێنێتەدی. بۆیە بینیمان کە کێشەی کورد کێشەی دەوڵەت (دەوڵەتبوون) نییە. کێشەی کورد کێشەی ئازادییە (ئازادبوونە). واتا مەرج نییە تەنیا بە دروستکردنی دەوڵەت ئازادی و دیموکراسی بێتەدی. چونکە زۆر دەوڵەتیش دروستکراون، بەڵام ئازادی و دیموکراسیش تێدا بەدینەهاتووە. گەلی عەرەب بیست و دوو دەوڵەتیان هەیە، بەڵام کێشەی ئازادی و دیموکراسیان هەیە.

بۆیە سەرۆك لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژی خۆیدا، نزیکبوونەوەیەکی نوێی پێشخست و فەلسەفە و فیکر و ئایدیۆلۆژیای خۆی لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراودا رزگارکرد و خاوێنی کردەوە، بینی کە دەوڵەت هۆکاری سەپاندنی کۆیلایەتییە نەك

بەدیهێنانی ئازادی و ئازادیش ناهێنێتەدی. لەسەر ئەو بنەمایە دەستبەرداری دەوڵەت (دامەزراندنی دەوڵەت) بوو.

پێشتر ئەو سیستەمەی کەوا سەرۆك پێشیدەخست بەتەواوی لەسەر بنەمای ئاواکردنی دەوڵەت پێشیدەخست، دیموکراسیش پارچەیەك بوو لەو سیستەمەی دەوڵەت و لەناو ئەو سیستەمەدا بوو، ئیدی بینی کە ئەگەر تۆ دیموکراسی لەناو سیستەمی دەوڵەتدا بەبنەما وەربگریت ئەوا هیچ کاتێك دیموکراسی راستەقینە نایەتەدی. سەرۆك لەدەرەوەی دەوڵەت سیستەمی دیموکراسی کردە ئامانج. وەك چۆن دەوڵەت سیستەمێکە ئەوا دیموکراسیش سیستەمێکە، سیستەمی دیموکراسی وەك ئەلتەرناتیفی دەوڵەتە، ئەگەر تۆ سیستەمی دیموکراسی وەك ئەلتەرناتیفی دەوڵەت ببینی و ئەو سیستەمەت بەبناخە وەرگرت تۆ دەتوانیت ئازادی و دیموکراسی فەراهەم بکەیت.

ئیدی سەرۆك سیستەمی خۆی بەتەواوی لەسەر بناخەی دیموکراسی پێشخست، بۆ ئەوەی سیستەمی دیموکراسیش ئاوا بکات، ئەوا لەسەر بنەمای کۆمەڵگای ژێرەوە (خوارەوە)ی سەقامگیر کرد، لەسەر بنەمای گەل بنیادی نا، بۆ ئەوەی بتوانێت سیستەمی دیموکراسی پێك بهێنێت. چونکە ئەگەر تۆ کۆمەڵگایەکی ئازاد بنیاد نەنێیت - هەڵبەتە کۆمەڵگای ئازادیش لەسەر بنەمای تاکی ئازاد بنیاد دەنرێت - ئەگەر تۆ لەشەخسدا (لەتاکدا) ئازادی نەئافرێنیت، لەکۆمەڵگادا ئازادی نەئافرێنیت، ئەوا تۆ ناتوانیت سیستەمی دیموکراسیش بئافرێنیت. چونکە سیستەمی دیموکراسی لەسەر کۆمەڵگایەکی ئازاد و کەسێتییەکی ئازاد بنیاد دەنرێت. هەڵبەتە کاتێك تۆ دەتوانیت کۆمەڵگایەکی ئازاد و کەسێتییەکی ئازادیش بنیاد بنێیت کە تۆ کۆمەڵگای خوارەوە بەبناخە وەربگریت. کاتێك کە تۆ دیموکراسی، شۆڕشی رەگەزی و شۆڕشی ئیکۆلۆژیت بەبناخە وەرگرت ئینجا دەتوانیت کۆمەڵگایەکی ئازاد و کەسێتییەکی ئازاد بئافرێنیت. کاتێك کە تۆ لەنێوان کۆمەڵگا و تاکدا هاوسەنگیت بەبناخە وەرگرت، تۆ لەنێوان ژیری سۆزداری (الذكاء العاطفي) و ژیری ئەنالیتیکی (الذكاء التحليلي)دا هاوسەنگی بەبناخە وەربگریت ئینجا دەتوانیت کۆمەڵگایەکی ئازاد و کەسێتییەکی ئازاد بنیاد بنێیت. سەرۆك سیستەمی خۆی لەسەر ئەو بنەمایە پێشخست و دەخوازێت لەسەر

بنەمای زانست، ئایدیۆلۆژیا، ئەخلاق و سیاسەت کۆمەڵگایەکی ئازاد و کەسێتییەکی ئازاد و سیستەمێکی ئازاد و سیستەمێکی دیموکراسی پێشبخات.
سەرۆك ئاپۆ دەخوازێت کێشەی کوردیش لەنێو ئەو سیستەمەدا چارەسەر بکات، نەك لەنێو سیستەمی دەوڵەتدا. بۆیە دەستبەرداری دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو. چونکە ئێمە پێشان دەمانگووت:" دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد" کاتێك کە ئێمە دەستبەرداری ئەمە بووین زۆر کەس و لایەن هێرشیان کردە سەرمان و گووتیان:" ئیدی ئاپۆ و (PKK) دەستبەرداری کوردان بوون، پێشان دەیانگووت؛ کوردستانێکی ئازاد و یەکگرتوو و دیموکرات و هەموو کەسێکی لەسەر ئەو بنەمایە دەخستە نێو جموجۆڵەوە، ئێستاش دەستبەرداری لەهەموو بەشەکانی دیکە بوون، تەنیا باکوور بەبنەما وەردەگرن..." گوایە بەشەکانی دیکە دەفرۆشێت، پرۆپاگەندەیەکی بەمجۆرەیان پێشخست، ئەمە بووختانێك بوو و راست نەبوو. وەك چۆن (PKK) کێشەی کورد لەهەر چوار پارچەدا بینی، دوای ئەوەی کە ستراتیژی خۆیشی گۆڕی دیسان کێشەی کوردی لەهەر چوار پارچەی کوردستاندا بینی، هیچ کاتێك لەمەدا گۆڕانکاری نەکردووە و دەستبەرداری پارچەکان نەبووە، لەپراکتیکیشدا، پێشتر بەناوی بەشەکان (پارچەکان) رێکخستنێکی بۆ هەر پارچەیەك دروست نەکردبوو، بەڵام دوای ئەوەی کە ستراتیژی خۆی گۆڕی، بەناوی بەشەکانیش رێکخستنی دامەزراند، کەواتە ئەگەر یەکێك دەستبەرداری بەشەکانی کوردستان بووبێت، چۆن بەناوی بەشەکانی دیکە و بۆ بەشەکانی دیکە رێکخستن دادەمەزرێنێت؟. ئەمە لەکاتێکدا بەگوێرەی ستراتیژی خۆی، ئەو هەنگاوەی لە پارچەکانی کوردستاندا هاوێشتوومانە، ئێستا لەرابردوو قووڵتر و بەهێزتر بووە؛ پێشتر تێکۆشانی ئێمە گشتی (عام) بوو، بەڵام لەمیانەی ستراتیژی نوێدا ئێمە رێکخستن و رێکخستەبوونی بەشەکانمان دامەزراند و پێشمانخست. ئەگەر یەکێك دەستبەرداری بەشەکان (پارچەکان) بووبێت چۆن بەناوی ئەو بەشانەوە رێکخستن و رێکخستەبوون پێشدەخات؟. سەرۆك لەهەموو بەرگرینامەکانی خۆیشیدا بەئاشکرا و بەروونی کێشەی کورد بە کێشەی هەموو پارچەکان دەبینێت، زۆر بەروونی و ئاشکرایی ئەمەی خستۆتەڕوو، کێشەی کورد تەنیا لەبەشێکدا نابینێت، لەرێکخستەبووندا تەنیا بەشێك بەبنەما وەرناگرێت، بەڵکو هەموو بەشەکان بەبنەما وەردەگرێت. ئەو پرۆپاگەندانەی

دەیانکرد شێواندن و بووختانکردن بوو. تا ئەمڕۆش لەپێش چاوانە، ئەوەی بۆ هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستانیش خەبات و تێکۆشان دەکات تەنیا تەڤگەری (PKK)یە، لەدەرەوەی تەڤگەری (PKK) کامە پارتی بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان رێکخستن و رێکخستەبوونی پێشخستووە؟ هیچ پارتییەکی وەها نییە. ئەمڕۆ هەموو کەسێکیش ئەمە دەبینێت و لەپێش چاوانیشە، لەهەر چوار پارچەدا خەڵك لەم تەڤگەرەدا بەشدارن و بۆ هەر چوار پارچە شەڕ دەکەن و خەبات دەکەن و شەهیدیش دەبن.

بۆ نموونە؛ لەباکوور، لەشاری "مووش" چواردە هەڤاڵی هەر چوار پارچە بەیەکەوە شەهیدبوون(٦) لەرۆژهەڵاتی کوردستان هەڤاڵانی خەڵکی هەر چوار پارچەی کوردستان لەوێ کار و خەبات دەکەن و شەهیدیش دەبن، لەبەشەکانی دیکەش بەهەمان شێوەیە. ئەمە هەموو کەسێك دەیبینێت. ئیدی ئەوەی کە یەکێتی کورد و رۆحی کورد و نەتەوەیبوونی کوردان ئاوا دەکات و مۆراڵ و هوشیاری و توانایی کوردان دەئافرێنێت ئەم تەڤگەرەیە.

ئەگەر باشوور بۆتە فەوارەیەك و زلهێزەکانی جیهانیش پشتیوانی لێدەکەن، کوا ئەم فەوارەیەی باشوور چەندە بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستان کاردەکات؟ بۆ ئەوەی لەبەشەکانی دیکە کێشەکە چارەسەر ببێت چەندە کاری بۆ دەکات؟ کاردەکات یان نایکات؟ ئەمە لەپێش چاوانە و هەموو کەس دەیبینێت. مەگەر کەسێکی بێویژدان بتوانێت نکۆڵی لەمە بکات.

پێشتریش (PKK) بۆ تەواوی کوردستان خەباتی دەکرد، بەڵام گشتگیرانە دەمایەوە، بەمەش لە کوردستاندا هەندێك پێشکەوتن بەدیهات و گەیشتە ئاستێك، ئیدی ئەگەر تێکۆشانی تۆ هەر گشتگیرانە (بشکل عام) بمابایە، ئەوا تۆ نەتدەتوانی لەو ئاستەی هەیە زیاتر پەرەی پێبدەیت. بۆیە ئیدی پێویستبوو لەهەر بەشێکی کوردستان رێکخستن و رێکخستەبوون پێشبکەوتبایە، تەڤگەر ئەمەی ئەنجام دا، نەك هەر دەستبەرداری بەشەکان نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاتر قورسایی خستە سەر بەشەکان. بەڤاوی بەشەکانەوە رێکخستن و رێکخستەبوونی پێشخست، کار و خەباتی پێشخست، ئەمەش ئەوە بەدیار دەخات کە ئەم تەڤگەرە تەواوی کوردستان بەبنچینە وەردەگرێت، نەك تەنیا بەشێك، کوردستان تەنیا لەبەشێکدا نابینێت، هەر تەنیا چارەسەری لەبەشێکیشدا

نابێت. بۆیە سەرۆك دەخوازێت لەنێوان هەر چوار پارچەشدا پەیوەندی پەرەبسێنێت. هەرچەندە شێوەگرتنی هەر پارچەیەك جودا جودایە، ئەمەش لەبەرچاو دەگرێت، بەڵام لەنێوان کوردان خۆیان و کوردان و گەلانی دیکە چ جۆرە پەیوەندییەك بەبنەما وەردەگرێت، ئەوا لەنێوان هەر چوار پارچەشدا هەمان پەیوەندی بەبنەما وەردەگرێت. رێککەوتنی نێوان کوردان لەنێوان هەر چوار پارچە دەخوازێت، رێککەوتنی نێوان کوردان و گەلانی ناوچەکە دەخوازێت، ئەمانە روون و ئاشکران.

بۆیە ئەم تەڤگەر و سەرۆکە هیچ کاتێك دەستبەرداری بەشەکانی دیکە نەبوون، بەڵکو تا هاتووە کار و خەباتی خۆیان لەهەموو بەشەکان بەهێزتر کردووە، شتی هەرە راستیش ئەمەیە. ئیدی ئەمە راستییەکە و هەموو کەسێك دەیبینێت، دووژمنیش دەیبینێت، هەر کەسێکی وڵاتپارێز و خاوەن ویژدانیش دەیبینێت. ئەوەی ئەمرۆ لەرۆژهەڵاتی کوردستاندا خەبات و شەڕ دەکات ئەم تەڤگەرەیە، ئەوەی ئەمرۆ لەباکووری کوردستان و باشووری رۆژئاوای کوردستاندا خەبات و تێکۆشان دەکات هەر ئەم تەڤگەرەیە، لەوانەیە لەباشووری مەزندا خەبات و تێکۆشانی خۆی زۆر پێشنەخستبێت، بەڵام دیسان هەر بەهەمان چەمك و تێروانینەوە خەبات دەکات. ئەمە هەموو کەسێك دەیبینێت و دەشزانێت. ئەوەی بۆ گەلی کورد هێز و مۆراڵ و هوشیاری و ویژدان و رۆحی بەرخۆدان دەئافرێنێت هەر ئەو تەڤگەرەیە. هەڵبەتە لەبەر ئەوەشە کە دەبێتە ئامانجی هەموو داگیرکەران، دەبێتە ئامانجی هەموو چەوسێنەر و ستەمکاران. بۆچی لەناو هەموو تەڤگەرەکاندا ئەو تەڤگەرە دەبێتە ئامانجی هەموو هێز و لایەنێکی ستەمکار؟ گوایە هەموو پارتەکان هەر کوردن و بۆ کوردان خەبات دەکەن، کەواتە بۆچی دەوڵەتانی داگیرکەر، دەوڵەتانی سەرمایەدار بەو شێوەیەی سەرۆك ئاپۆ و (PKK) دەکەنە ئامانج، ئەو سەرۆك و پارتانەی دیکەی کورد ناکەنە ئامانجی خۆیان؟ هۆکار چییە؟ هۆکار ئەوەیە کە ئەم تەڤگەرە یەکێتی کوردان و رۆحی بەرخۆدانڤانی کوردان، هەروەها یەکێتی رۆحی کوردان، نەتەوەیبوونی کوردان لەسەر بنەمای ئیرادەیەکی ئازاد بنیاد دەنێت، بۆیە کردوویانە بەئامانجی خۆیان، ئەگەر ئەم تەڤگەرەش وەکو پارتەکانی دیکەی بکردبایە، وادیارە ئەوەندە نەدەبووە ئامانجی هەموو ئەو لایەنانە، ئەگەر وابووایە ئەوا وەك چۆن دەوڵەتانی داگیرکەر و دەوڵەتانی سەرمایەدار و ئیمپریالیست

لەگەڵ هەندێك پارتی كورد دۆستایەتی دەكەن و چارەنووسی خۆیان لەگەڵیاندا دەكەنەیەك، وادیارە لەگەڵ ئێمەشدا دەیانكردەیەك، پەیوەندی دۆستایەتی خۆیان لەگەڵ ئێمەش دروست دەكرد. ئەگەر پەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ ئێمە دروست ناكەن و هێرش و شاڵاو دێننە سەر ئەم تەڤگەرە و دەخوازن ئەم تەڤگەرە لە كۆڵ خۆیان بكەنەوە و لێی رزگار ببن، كەواتە ئەم تەڤگەرە زیان بەوانە هەموویان دەگەیەنێت. بەگوێرەی ئەوان كورد نائافرێنێت، ئەو كوردەی بەگوێرەی خۆیان دروستیان كردووە، لەوان دەستێنێتەوە، كوردێكی دیكە دەئافرێنێت، بۆیە دەیكەنە ئامانجی خۆیان. ئەمەش لەبەرچاوانە و روون و ئاشكرایە...

**لەبەرامبەر ئەو گۆڕانكارییە ستراتیژییەدا ئەو تەسفیەگەرییەی دەركەوت چ كاریگەرییەكی خۆی لەسەر خەبات و تێكۆشانی هەر پارچەیەك لەپارچەكانی كوردستان كرد، تاچەندە توانیان تێكۆشانی ئەو پارچانە بۆخۆیان بەكار بهێنن و كاریگەری خۆیان لەسەر هەر پارچەیەكی كوردستان و دەرەوەی وڵات بكەن؟ رەنگدانەوەی ئەم تەسفیەگەرێتییە لەسەر خەبات و تێكۆشانی ئەو پارچانە چیبوو؟**

بێگومان گروپی چەتەگەری دەیانخواست تەڤگەر بەتەواوی بخەنە دەستی خۆیانەوە، ئەم تەڤگەرەش هەر تەنیا لەبەشێكی كوردستان نەبوو، بەڵكو لەهەموو بەشەكاندا هەبووە و خۆی بەرێكخستن كردووە، بۆیە دەیانخواست لەهەر چوار بەشیشدا تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، تەڤگەر بەگوێرەی ستراتیژی خۆی هەندێك رێكخستن و رێكخُستەبوونی لە پارچەكاندا پێشدەخست، ئەوانەش هەوڵ و تەقەللایان دەدا كە ئەو رێكخستنانە پێشنەكەوێت، بەڵكو ئەو رێكخستنانەی دامەزراون بكەوێتە دەستی ئەوانەوە. بۆ ئەم مەبەستە زۆر هەوڵیاندا. ئامانجی ئەوان هەرە ئەوە نەبوو لەو تەڤگەرەدا بەشێك لەو تەڤگەرە بخەنە دەستی خۆیانەوە، بەڵكو ئامانجیان ئەوەبوو

بەڕێوەبەرایەتی تەڤگەر و تەڤگەر بەگشتی بخەنە دەستی خۆیانەوە. بۆیە راوەستەیان لەسەر تەواوی تەڤگەر و لەسەر تەواوی دامودەزگا ڕێکخستنییەکانی تەڤگەر دەکرد، چ ئەوەی لەبەشەکانی کوردستاندا هەبوو و چ ئەوەش کە لەدەرەوەی وڵاتدا هەبوو. واتا لەسەر هەموو بەشەکان راوەستەیان دەکرد، بۆ ئەوەی تەواوی تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، بەنهێنی ڕێکخستەبوونی خۆیان پێشدەخست و بەگوێرەی خۆیان شێوەیان بەکادیر دەدا و جێگیریان دەکرد، لەبەشەکانی کوردستان جێگیریان دەکردن، دەیاننادرنە دەرەوەی وڵات، بۆ ئەوەی بتوانن لەهەموو شوێنێك تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، بۆیە لەوەی بەشەکانیش و دەرەوەی وڵاتیش هەندێك کادیریان بەگوێرەی خۆیان دروست کردبوو و چەمکی خۆیان لەو شوێنانەدا پەرەپێدا بوو.

بۆیە هەندێك تەخریباتیان لەو شوێنانەش کردبوو، کاتێك ئێمە تەواوی تەڤگەرمان لەژێر کۆنترۆڵی چەمکی تەسفیەگەرێتی و چەتەگەرێتی رزگارکرد، لەهەر یەك لەو بەشانەش هەوڵ و خەباتمان کرد بۆ ئەوەی تەخریباتەکانی ئەو چەمکە نەهێڵین. چونکە ئەو تەخرییباتانەی کردبوویان هەر تەنیا لەناوەندەکاندا، لەکادیرەکاندا، یان تەنیا لەیەك بەشدا نەیانکردبوو، بەڵکو لەهەر بەشێك و لەدەرەوەی وڵاتدا کردبوویان. چونکە ئەم تەڤگەرە تەڤگەرێکی کوردستانییە، لەنێو ئەم تەڤگەرەدا لەهەر پارچەیەکی کوردستان و دەرەوەی وڵات کادیر و ڕێکخستن هەیە، لەم تەڤگەرەدا هەرشتێك روودەدات کاریگەری خۆی لەسەر هەموو پارچەکان و بەشەکان دەکات، بەراستی کاریگەری خۆیشی کرد.

ئیدی بۆ ئەوەی چەمکەکانی تەسفیەگەرێتی و ئەو تەخریباتانەی لەهەموو بەشەکان و لەدەرەوەی وڵات پێشیانخستبوو بەلاوە بنرێت، تەڤگەر موداخەلەی هەموو ئەو شوێنانەی کرد تاکو ئەو کاریگەرییە نەهێڵێت، بۆ هەر پارچەیەکیش موداخەلەی کرد، لەهەر پارچەیەك ئەوانەی خەتی سەرۆکیان بەبنچینە وەرگرت لەدژی خەتی خیانەت راوەستان، لەم رووەوە شەڕێك بەڕێوەچوو. تاکو ئێستاش هەندێك چەمك و کاریگەری ئەوان ماوەتەوە، هەم لەناو کادیراندا و هەمیش لەناو گەلدا، واتا گەلیش و کادیرانیش نەفرەتیان لێکردوون و لەدژیان راوەستاون، ئیدی لەهەموو روویێکەوە فەشەلی پێهێناون، ئیدی تەسفیەگەرێتی و گروپی خیانەتەیان لەرۆژەڤی خۆیاندا نەهێشتۆتەوە، بەڵکو

ئەركی دیكەیان خستۆتە رۆژەڤی خۆیانەوە و راوەستە لەسەر ئەو ئەركانەی خۆیان دەكەن و بەرێوە دەچن. بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت ئەو تەخریباتانەی كردبوویان و ئەو كاریگەرییەی ئەوان دروستیان كردبوو بەتەواوی نەماوە. چونكە بەناوی دیموكراسی، ئازادی، مافی شەخسی و دژی مەركەزی بوون و...هتد زۆر چەمكی هەڵەیان بڵاوكردەوە و پێشخست. بۆیە زۆر كەس نەیاندەزانی ئەمە چییە؟ بۆ ئەوەی لەچەمكەكانی ئەم تەڤگەرە بۆ دیموكراسییەت و ئازادی تێبگات و ئەو گۆڕانكاری و نوێبوونەوەیەی ئەنجام دراوە تێبگات و پەرەی پێبدات، ماوەیەكی زۆری خایاند، كاریگەری ئەوان بەقورسایی نەما، بەڵام هێشتاش كاریگەری بچووك بچووكی خۆی هەرماوە، بێگومان بۆ ئەوەی ئەمەش بەتەواوی نەمێنێت، كاتیش پێویستە. بەڵام ئیدی بۆ تەڤگەر كێشە نین و تەڤگەر ئەو كێشەیەی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە.

**لە (٢٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤)دا لەموسڵ رووداوی شەهیدبوونی هەڤاڵ شیلان كوبانی (مەیسا باقی) و چوار هەڤاڵی دیكە (جەمیل، فوئاد، زەكەریا، جوان) روویدا. دیارە ئەو هەڤاڵە ماوەیەكی درێژ لەنێو ئەم تەڤگەرەدا بووە و رۆڵێكی بەرچاوی لەبەرزكردنەوەی تێكۆشانی ژنیش هەبوو، هۆكاری شەهیدبوونی هەڤاڵ شیلان و هەڤاڵەكانی لەنێو ئەو دۆخەی كە روویدا چیبوو و بۆچی خۆی و هەڤاڵەكانی كرانە ئامانج...؟**

ئەوانەی ئەو هەڤاڵانەیان لەموسڵ دەستگیركرد و شەهیدیان كردن، تیرۆریستە ئیسلامییەكان بوون، ئەوانە بوون كە بەناوی ئیسلامییەتەوە تیرۆریزم تەشەنە پێدەدەن. ئەوانە گرتیانن و شەهیدیان كردن. بێگومان، ئەوانە ئەو هەڤاڵانەیان نەدەناسی، هەندێك كەس ئەو زانیارییانەیان بەوان دابوو، لەسەر ئەو زانیارییانە هەڤاڵانیان گرت و شەهیدیان كردن. ئەوانەی هەڤاڵانیان كوشت دەیانزانی كە ئەو

هەڤاڵانە کوردن و لای ئەوانیش کورد هاوپەیمانی ئەمریکا و ئیسرائیلن، ئەوان کورد وادەبینن و وەها تێگەیشتوون. ئیدی مادام ئەوانە کوردن، وەهاش زانیارییان پێدابوون کە ئەم هەڤاڵانە ئەو کوردانەن کە لەگەڵ ئەمریکان، ئەوانەش ئەو هەڤاڵانەیان گرتبوو و بەوجۆرە شەهیدیان کردن. دوای ئەوەی کوشتیانن تێگەیشتن کە ئەوانە بەو شێوەیە نین کە زانیارییان پێدابوون، بەڵام ئیدی کوشتبوویانن. تەنانەت هەندێکیان پەشیمان بوونەوەی خۆشیان نیشان دابوو و گووتبوویان:" ئێمە نەمانزانی و بەنەزانی ئەوانمان کوشت، ئێمە بمانزانیبایە ئەوانە (PKK)یین نەماندەکوشتن، ئیدی بەئێمەیان گووتبوو ئەوانە ئەو کوردانەن کە لەگەڵ ئەمریکاییەکاندا جموجۆڵ دەکەن..."

## کێ ئەو زانیارییانەی بەوان دابوو؟ چۆن ئەو زانیارییانەیان بەوان دابوو؟

خائینەکانی ناو ئێمە ئەو زانیارییانەیان بەئەوان دابوو، لەموسڵ هەندێك عەرەب هەبوون پەیوەندی ئێمە لەگەڵیاندا هەبوو، کاتێك ئەو خائینانە لەموسڵ و دەوروبەری کار و جموجۆڵیان دەکرد، ئەو عەرەبانەیان خستبووە ژێر کاریگەری خۆیانەوە کە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵیاندا هەبوو، بەرێگەی ئەو عەرەبانەوە ئەو زانیارییانەیان دابووە ئەو گروپە تیرۆریستییەی کە هەڤاڵانیان شەهیدکرد بوو، ئەو گروپەی هەڤاڵانیان شەهیدکرد پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئیستخباراتی سوریاش هەبووە. ئەو گروپە خیانەتکارە لەلایەکەوە پەیوەندییان لەگەڵ ئیسخباراتی سوریا هەبوو و زنیارییان بە ئیستخباراتی سوریا دابوو، هەمیش بەو گروپە ئیسلامییەوە، تۆڕەکانی ئیستخباراتی سوریاش لەناو ئەو گروپە ئیسلامییانەدا هەبووە و هاوکاریشیان کردوون. ئیدی بەمجۆرە بە پیلانگێرییەك شەهیدیان کردن.

بۆیە لەلایەکەوە لەرێگەی ئەو عەرەبانەوە زانیارییان ناردبوو، لەلایەکی دیکەشەوە لەرێگەی ئیستخباراتی سوریاوە ئەو زانیارییەیان گەیاندبووە ئەو گروپە تیرۆریستەوە.

ئیستخباراتی سوریاش بەو گروپە ئەو هەڤاڵانەی بەکوشتن دا. ئەو شەهیدبوونە و کۆمەڵکوژییە بەوجۆرە روویدا.

بۆچی هەڤاڵ "شیلان" و هەڤاڵانی دیکەی لەگەڵیدابوون بەئامانجیان گرتبوون؟ هۆکاری خۆی هەیە. هەر لەیەکەمین کۆنگرەی جڤاتی گشتیدا لەناو هەڤاڵانی کچدا ئەوەی لەبەرامبەر گروپی خیانەتکار هەڵوێستی وەرگرت بۆیەکەمجار هەڤاڵ "شیلان" بوو، هەڤاڵ "شیلان" لەنێو پارتی یەکێتی دیموکراتی (PYD)شدا لەدژی ئەو چەمکی چەتەگەرێتییە راوەستا، لەدژی کەماڵە سوور (کەمال شاهین) و ئەوان راوەستا، ئەوانە بینیان کە ئەگەر "شیلان" بێکاریگەر نەکرێت ئەوا ناتوانن (PYD) بخەنە نێو دەستی خۆیانەوە.

هەر لەدەستپێکدا کاتێك کە کامپی (PYD) لە کانی شیلان(٧) بوو، دوای یەکەمین کۆبوونەوەی جڤاتی گشتی کە هەڤاڵ "شیلان" خواستبووی بچێتە ئەوێ، "کەماڵە سوور" و "فەرهاد" و ئەوان هەڕەشەیان کردبوو کە "شیلان" نەچێتە ئەوێ، سەرەڕای ئەمەش هەڤاڵ "شیلان" هەرچووبوو، لەوێش هەڤاڵانی ئەوێیان ئامادەکردبوو، کە کاتێك هەڤاڵ "شیلان" چووە ئەوێ ئەو هەڤاڵانە لەدژی هەڤاڵ "شیلان" بخەنە جموجۆڵەوە، بۆ ئەوەی هەڤاڵ "شیلان" نەتوانێت لەوێ بمێنێتەوە، سووکایەتیان بەرامبەری کردبوو، بەڵام دیسان هەڤاڵ "شیلان" بەجورئەتەوە لەدژی هەڕەشەکانی ئەوان راوەستایەوە. لەنێو (PYD)شدا لەدژی چەمکەکانیان خەبات و شەڕی کرد و تەسلیمی چەمکەکانی ئەوان نەبوو و نەشیخواست کە (PYD)یش تەسلیمی چەمکەکانیان ببێت. تادەهات ئەو خەتی تەسفیەگەرێتییەی بەرتەسك کردەوە، بەخۆی هاتە لای ئێمە و هەڤاڵانی کچی ناردە لامان، هەڤاڵانی (PYD)ی ناردە لای ئێمە، تەنانەت ئەوانەی کە لەنێو تەڤگەری ژندا بوون و لەگەڵ گروپی "فەرهاد" و "بۆتان" بوون هەڕەشەیان لێکردبوو و پێیان گووتبوو:" بۆچی دەچیتە لای جومعە (جەمیل بایك)؟" پێویستە نەچیتە لای ئەو، تەنانەت لەبەرامبەر ئەو هەڕەشانەدا هەڤاڵ "شیلان" هەنگاوی بۆ دواوە نەهاوێشت و خۆی هاتە لام و هەڤاڵانی دیکەی کچ و هەڤاڵانی (PYD)ی ناردە لای من بۆ ئەوەی لەگەڵیاندا قسە بکەم و سەبارەت بەدۆخەکە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەم. بێگومان ئێمە پێکەوە لەدژی ئەو خەتە هەم لەناو تەڤگەر

بەگشتی و هەمیش لەناو (PYD)دا جموجوڵێکیان دەستخست. چۆن لەناو تەڤگەردا بەگشتی گروپی چەتەگەری خیانەتکار ئاشکرا بوون و شکستیان هێنا و هەڵاتن و رۆیشتن، لەناو (PYD)شدا بەهەمان شێوە شکستیان هێنا و هەڵاتن و رۆیشتن. هەڵبەتە ئەوانیش پێکەوە کاریان دەکرد. ئیدی (PYD) بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندا دەرچوو. تەنانەت هەڤاڵ "شیلان" بۆ ئەو مەبەستە چووە خۆرئاوای کوردستان و لەوێش کار و خەباتی کرد، لەوێش چەمکە خیانەتکارییەکان و تەسفیەگەرییەکانی ئەوانی بە گەل و کادیران ناساندبوو و تێیگەیاندبوون، لەوێش نەیهێشت ئەو گروپە خیانەتکارە تەخریبات بکات، ئەو گروپە خواستیان بەرێگەی ئیستخباراتی سوریا بەگرتنی بدەن، کەمێك مابوو دەستگیر بکرێت، هەڤاڵ "شیلان" ناچارما لە سوریا دەربکەوێت، ئێمە گووتمان:" لەوێ دەربکەوە و وەرەوە" چونکە دەستگیرییان بکردبایە لەناویان دەبرد. هەڤاڵ "شیلان" گەڕایەوە، بەڵام دەچووە موسڵ و لەسەر سنوور

پەیوەندی لەگەڵ رێکخستنەکانی ئەوێ دەکرد. واتا لە موسڵەوە کار و خەباتی باشووری خۆرئاوا و سوریای بەڕێوە دەبرد، سەرپەرشتیاری ئەو کار و خەباتەی ئەوێ بوو، ئیستخباراتی سوریا بەمەی زانی، خائینەکانیش بەو جۆرە زەبریان لەو هەڤاڵە و هەڤالانی لەگەڵیدا بوون دا. واتا تۆڵەی خۆیان کردەوە، لەبەر ئەوەی هەم بەگشتی و هەمیش لەنێوان (PYD)دا لەدژی چەمکە تەسفیەگەرییەکان راوەستابوو و راستینەی ئەوانی ئاشکرا کردبوو و تەڤگەری لەژێر کۆنترۆڵی ئەوان دەرخستبوو. ئەوانیش بەو شێوەیە پیلانیان دانا و تۆڵەی خۆیان کردەوە، ئەو رووداوی شەهیدبوونە بەو شێوەیە روویدا.

بێگومان ئەو شەهیدبوونە بۆ ئێمە گرنگ بوو، بۆیە پێویستبوو ئەوەمان بکردبایە بناخەی پێشکەوتنی تەڤگەر، بناخەی مەزنبوونی (PYD)، وەك چۆن شەهیدبوونی هەڤاڵ "حەقی قەرار"مان کردە بناخەی دامەزراندنی (PKK) و (PKK)مان لەسەر ئەو بنەمایە ئاواکرد، پێویستبوو شەهیدبوونی هەڤاڵ "شیلان"یش ببایە هۆکاری ئەوەی (PYD) بەرەو پێشەوە ببەین و بەهێزی بکەین. بێگومان ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە لەو

رووداوەی شەهیدبوونی هەڤاڵ "شیلان" و هەڤاڵانی نزیك بووینەوە، بەو شێوەیە کاریگەری چەمکە تەسفیەگەرییەکانی ئەوانمان بێکاریگەر کرد.

**دوای ئەوەی "کۆنگرەی گەل" ئاوادەبێت و ئارادەیەك ڕۆڵ و پێگەکەی دیاردەبێت، پاشان کار بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی (PKK)ش دەکرێت. پێش ئەمەش سەرۆك ئاپۆ ڕۆڵێکی بەمجۆرەی بە "کۆمیتەی زانست، ڕۆشنگەری، هونەر"ی دابوو لەنێو کۆنگرەی گەل دا... بەڵام پاشان پرۆژەی سەرلەنوێ بنیادنانەوەی (PKK) پێشکەوت و لەساڵی (٢٠٠٥)دا یەکەمین کۆنگرە بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی (PKK) سازدەکرێت و (PKK) بنیاد دەنرێتەوە. لێرەدا سەرلەنوێ بنیادنانەوەی (PKK) بەچ واتایەك دێت؟ ئەمڕۆ لەنێو ئەم تەڤگەرەدا بەگشتی ئەو ڕۆڵ و پێگەیەی کە (PKK)ی نوێ لەئەستۆی خۆی گرتووە چییە؟**

ئەو بڕیارە هەڵانەی ئێمە لە حەوتەمین کۆنگرەدا سەبارەت بەناو گۆڕین دامان و لە هەشتەمین کۆنگرەشدا لەسەری بەردەوام بووین، سەرۆك بەرێگەی ئاواکردنی مۆدێلی "کۆنگرەی گەل"ەوە ئەو هەڵانەی ڕاستکردەوە. واتا ئێمە ڕێکخستنی گەل (ERNK)مان تەسفیە کردبوو، سەرۆك بەرێگەی ئاواکردنی "کۆنگرەی گەل"ەوە جارێکی دیکە ئەو هەنگاوەی هاوێشت و ئەو هەڵەیەی ڕاستکردەوە، کاتێك کە مۆدێلی "کۆنگرەی گەل"یشی پێشخست گووتی:"با کۆمیتەی زانست، ڕۆشنگەری، هونەر ئەرکی پارتی جێبەجێ بکات". واتا ئەرکی ئایدیۆلۆژی، فەلسەفی و ئەخلاقی جێبەجێ بکات. ئەو ئەرکەی خستە ئەستۆی "کۆمیتەی زانست، ڕۆشنگەری، هونەر"ەوە. بێگومان لەبەر ئەوەی گروپی خیانەتکار هەم مۆدێلی "کۆنگرەی گەل"یان شێواند و نەیانهێشت تێگەیشتن لەو

مۆدێلە بەدروستی بێتەئاراوە، هەمیش بەناوی "کۆنگرەی گەل" گەلێك چەمکی هەڵیان پێشخست و تەسفیەگەرێتییان ئەنجام دا. هەڵبەتە "کۆمیتەی زانست، رۆشنگەری، هونەر"یش نەیتوانی لەدۆخێکی وەهادا ئەو ئەرکەی خۆی پێکبهێنێت، سەرۆك کە بینی ئەو کۆمیتەیە ناتوانێت ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات. هەم لەبەر ئەوەی ئەو پرۆژەیەی کە پێشکەشی کردووە پێشنەکەوتووە، هەمیش تەسفیەگەرێتی تەشەنەی سەندبوو، بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار تەشەنەی سەندبوو، بۆیە موداخەلەی ئەو دۆخەی کرد. چونکە دەرکی بەوە کرد کە تەسفیەگەرێتی لەنێو کادیراندا پەرەیسەندووە. بۆچی؟ چونکە کادیران بێ رێکخستن ماونەتەوە، لەکادیراندا پەرشوبڵاوی و تەسفیەگەرێتی پەرەیسەندووە، ئەمە بۆ ناو گەلیش شۆڕدەبێتەوە. بۆیە پێویستە رێگیری لەمە بکرێت. کە بینی ئەمە بەرێگەی "کۆمیتەی زانست، رۆشنگەری، هونەر" ئەنجام نادرێت، بۆیە گووتی:" پێویستە سەرلەنوێ (PKK) ئاوابکرێتەوە" واتا پێویست دەکات رێکخستنی کادیران جارێکی دیکە ئاوابکرێتەوە، بۆ ئەوەی لەکادیراندا کۆکردنەوەیەك بێتەدی و ئەو پەرشوبڵاوییەی لە پەرەیسەندووە و ئەو تەسفیەگەرێتییەی لەئاکامی ئەو پەرشوبڵاوییە پەرەیسەندووە رێگیری لێبکرێت. سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی (PKK) بۆ ئەو مەبەستە بوو.

بۆیە پێویستبوو (PKK) ئاوا بکرێتەوە. چونکە ئەم تەڤگەرە تەڤگەری کادیرانیشە، کاتێك کە کادیرانیش بێ رێکخستن مانەوە پەرشوبڵاوی پەرەیسەند و کەمێك مابوو تەڤگەریش تەسفیە ببێت. بۆ ئەوەی رێگیری لەمە بکرێت و کۆکردنەوەیەك بێنێتەدی گووتی:"با (PKK) دابمەزرێتەوە، بەڵام پێویستە لەسەر بناخەیەکی نوێ ئاوابکرێتەوە" کاتێك کە سەرەتا (PKK) دامەزرا سۆسیالیزمی بنیادنراو هەبوو، هەموو لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراو دابوون، پاشان کە سەرۆك بۆ ئەوەی تەڤگەر لەکاریگەرییەکانی سۆسیالیزمی بنیادنراو خاوێن بکاتەوە زۆر کاری کرد. هەڵبەتە ئێستاش کە کاریگەری سۆسیالیزمی بنیادنراوی لە ئایدیۆلۆژیای خۆی خاوێن کردۆتەوە، ئەوا بەمە قووڵبوونەوەیەکی لەئایدیۆلۆژیای خۆیدا ئەنجام دا. بەگوێرەی ئەمەش مۆدێلێکی رێکخستنی لەپارتیبوونیشدا پێشخستبوو، کە مۆدێلی کۆنگرەی گەل بوو، بۆیە پێویستبوو "PKKی نوێ" لەسەربنەمای ئەو مۆدێلە نوێیە ئاوابکرێت، نەك لەسەر

مۆدێلی کۆن. چونکە مۆدێلی کۆنی پارتیبوونی (PKK) لەسەر بنەمای مۆدێلی "بەلشەفیك"ی ئاواکرابوو. هەڵبەتە ئەو مۆدێلەش، کە سۆڤییەت نموونەکەی بوو، تەسفیە ببوو، تۆ نەتدەتوانی جارێکی دیکە (PKK) لەسەر بنەمای ئەو مۆدێلە ئاوابکەیتەوە، هەڵبەتە خودی ئەو مۆدێلە خۆی لەدونیادا نەما بوو و تەسفیە ببوو، بۆیە پێویستبوو لە پارتیبووندا مۆدێلێکی نوێ پێشبخرێت، ئیدی پێویستبوو (PKK)ی نوێ لەسەر مۆدێلێکی نوێ ئاوابکرێت، ئەو مۆدێلەش سەرۆك لە بەرگرینامەکەی خۆیدا چوارچێوەکەی دارشتبوو، کە لەسەر کامە مۆدێل ئاوا ببێت. ئیدی (PKK)ی کۆن دەوڵەت و دەسەلاتی بۆخۆی بەبنەما وەرگرتبوو، مەسەلەی چارەسەرکردنی کێشەی گەلی ژێردەستە و دیاریکردنی چارەنووسی خۆی لەمەسەلەی دەوڵەتدا دەبینیەوە، لەسەر ئەو بنەمایە خۆی ئاواکردبوو. لەپارتیدا چەمکی دوڵەت و دەسەلات هەبوو، بۆیە (PKK) دەوڵەت و دەسەلاتی کردبووە ئامانجی خۆی، چونکە دیاریکردنی چارەنووسی گەلی کوردی بەجودابوون و بەدەوڵەتێکی سەربەخۆ و جودای دابووە پێشخۆی. هەروەها ستراتیژی خۆی بەگوێرەی رەوشی ئەو کاتەی جیهان پێشخستبوو، تاکتیکی خۆی لەسەر بنەمای "شەری گەلی درێژخایەن" دارشتبوو، شەرێك کە ئەو کاتە تەڤگەرەکانی گەلانی ژێردەستە بەرێوەیان دەبرد. رەوشی جیهانیش گۆردرابوو، بەناوی سۆسیالیزم ئەو سۆسیالیزمەی لەئارادا بوو پەرشوبلاو ببوو، ئیدی تۆ ناتوانیت بەو سۆسیالیزمە و بەو مۆدێلەی ئەو سۆسیالیزمە رێکخستن پێشبخەیت. سەرۆك لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای خۆیدا نوێبوونەوەیەکی بەهێزی ئەنجام دا، بەتەواوی دەستی لە دەوڵەت و دەسەلات بەردا، زیهنییەتێکی نوێی پێشخست، بەگوێرەی ئەو زیهنییەتەش کولتوور و ئەخلاقێکی نوێ و سیاسەتێکی نوێی پێشخست. بۆیەش پێویستبوو ئەو پارتییەی ئاوا ببێت لەسەر ئەو بنەمایە ئاوا ببێت. ئیدی (PKK)ی نوێ لەسەر ئەو بنەمایانە ئاوابوو. لەسەر بنەمای سیستەمی دیموکراسی ئاوا بوو، نەك لەسەر بنەمای سیستەمی دەوڵەتگەرا.

## واتا هیچ ئامانجێکی سیاسی خۆی نییە؟

پێویستە ئامانجی خۆی بەتەواوی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی بێت، خەباتی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی پێکبێنێت، سیاسەتیش لەسەر ئەو بنەمایە پێکبێنێت، نەك لەسەر بنەمای ئاواکردنی دەسەڵات و دەوڵەت، بەڵکو پێویستە پارتی لەسەر بنەمای ئاواکردنی سیستەمێکی دیموکراتی کاربکات و سیاسەت بکات و خۆی نەکاتە هەموو شتێك. چونکە هەر پارتییەك کە بەگوێرەی مۆدێلی سۆفییەت و بەلشەفیك دروستببووایە، ئەوا خۆی دەکردە هەموو شتێك؛ دەوڵەت، دەسەڵات، پارتی، چین و هەموو شتێك. ئەگەر تۆ پارتییەکی نوێ پێشبخەیت، پێویستە بەمشێوەیە خۆی نەکاتە ناوەندی هەموو شتێك، پارتی رۆڵی خۆی هەیە، ئەویش سیاسەتکردنە، رۆڵی پارتی سیاسەتکردنە، سیاسەتیش لەسەر چ بنەمایەك بکات؟. لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژی و ئەخلاق سیاسەت بکات تاکو بتوانێت کۆمەڵگایەکی نوێ پێشبخات و بەردەوام نوێی بکاتەوە، هەروەها پێداویستییەکانی کۆمەڵگا لەرووی ئازادی و دیموکراسی و عەدالەت بێنێتەدی، ئیدی پێویستبوو (PKK)ی نوێ لەسەر ئەو بنەمایە ئاوا بکرێت. بۆیە سەرۆك دەستەواژەی "(PKK)ی نوێ"ی بەکارهێنا. چونکە (PKK)ی نوێ لەهەموو رووێکەوە لە (PKK)ی کۆن جوداترە.

راستە لەسەر خەبات و میراسی ئەو ئاواکراوە، بەڵام وەکو ئەو ئاوا نەبووە، ئەرکی (PKK)ی پێشوو لە (PKK)ی ئێستا جیاوازتربوو، (PKK)ی پێشوو بەتەواوی سیستەمی دەوڵەت و دەسەڵاتی بۆخۆی بەبنەما وەردەگرت. لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیای سەرۆکدا دەوڵەت و دەسەڵات نییە، بەڵکو سیستەمی دیموکراسی هەیە، پێویستە هەموو شتێکی بەگوێرەی ئەو سیستەمە رێکبخرێت، پارتیش بۆ ئەوەیە کە بتوانێت پێشەنگایەتی بۆ ئەو سیستەمە بکات. هەر پارتییەکیش کە ئاوا بکرێت پێویستە بەتەواوی لەسەر بنەمای ئەو سیستەمە خۆی ئاوا بکات. لەسەر بنەمای دیموکراسی، شۆڕشی ژن (رەگەزی)، شۆڕشی ئیکۆلۆژی، لەسەر ئەو بنەمایەش ئەخلاقی نوێ پێشبخات. پێویستە پارتی لەسەر ئەو سێ ستوند و پایانە سیاسەت بکات، ئیدی ئەو کاتە ئەو پارتییە دەبێتە پارتییەکی نوێ، بەتەواوی بەگوێرەی ژیهنییەتێکی نوێ، کولتوور و ئەخلاقێکی نوێ خۆی ئاوابکات، تاکو بتوانێت کۆمەڵگایەکی نوێ، سیستەمێکی نوێ ئاوا بکات و پێشەنگایەتی بۆ بکات. لەو سیستەمەدا ئەرکی پارتی پێشەنگییە، پێشەنگی ئایدیۆلۆژی

و ئه‌خلاقییه‌، سیاسه‌تیش له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ ده‌كات. ئه‌ركی پارتی سیاسه‌تكردنه‌، نه‌ك به‌ڕێوه‌بردنی ده‌وڵه‌ت و ده‌سه‌ڵات.

## له‌ (١)ی حوزه‌یرانی (٢٠٠٤)دا له‌لایه‌ن ته‌ڤگه‌ره‌وه‌ هه‌ڵمه‌تێك (قه‌ڵه‌مبازێك) ئه‌نجام درا. به‌ر له‌هاوێشتنی ئه‌و هه‌ڵمه‌ته‌ ره‌وشه‌كه‌ چیبوو؟ ئه‌و هه‌ڵمه‌ته‌ به‌ چ ئامانجێك هاوێشترا و چ ئه‌نجامێكی له‌گه‌ڵ خۆیدا هێنا؟

له‌دووه‌مین كۆنگره‌ی جڤاتی گشتیدا ئه‌و بڕیاره‌ وه‌رگیرا، چونكه‌ هێزه‌ پیلانگێڕه‌كان كه‌وتبوونه‌ نێو جموجۆڵه‌وه‌، به‌رێگه‌ی گروپی خیانه‌تكاره‌وه‌ ده‌یانخواست ته‌ڤگه‌ر بخه‌نه‌ ده‌ست خۆیانه‌وه‌، ده‌وڵه‌تی داگیركه‌ریش له‌مه‌ سوودمه‌ند ببوو و ده‌یخواست هێرشه‌كانی خۆی زیاتر بكات، له‌به‌رامبه‌ر ته‌ڤگه‌ردا له‌هه‌موو روویێكه‌وه‌ هێرشێكی مه‌زن پێشده‌كه‌وت، هه‌م له‌لایه‌ن ده‌وڵه‌تی داگیركه‌ره‌وه‌، هه‌میش له‌لایه‌ن ئه‌مریكاوه‌. ته‌نانه‌ت له‌ناو كوردانی به‌كرێگیراو و میللیگه‌راشدا بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ كه‌وتبوونه‌ نێو جموجۆڵه‌وه‌، به‌مجۆره‌ هێرشێكی مه‌زنیان له‌سه‌ر ته‌ڤگه‌ر په‌ره‌پێده‌دا، هێرشی عه‌سكه‌ری، سیاسی، ئایدیۆلۆژی و رێكخستنی له‌سه‌ر گه‌ل و ته‌ڤگه‌ر په‌ره‌ی ده‌سه‌ند، پێویستبوو كه‌ ته‌ڤگه‌ر له‌به‌رامبه‌ر ئه‌و هێرشانه‌ به‌رگری له‌خۆی بكردبایه‌. چونكه‌ ئه‌گه‌ر به‌رگری له‌خۆی نه‌كردبایه‌، ئه‌وا ئه‌و هێرشانه‌ مه‌ترسیدار ده‌بوون و ته‌ڤگه‌ر زه‌بری به‌رده‌كه‌وت، گه‌ل زه‌بری به‌رده‌كه‌وت. ئیدی بۆیه‌ ته‌ڤگه‌ر له‌یه‌كی حوزه‌یراندا بڕیاری "به‌رگری ره‌وا"ی وه‌رگرت. واتا له‌به‌رامبه‌ر هێرشه‌كاندا به‌رگری له‌خۆی بكات و خۆی بپارێزێت.

ئه‌و بڕیاره‌ راگه‌یاندنی شه‌ڕ نه‌بوو، گۆڕانكاری نه‌بوو له‌ ستراتیژی و تاكتیكدا، به‌ڵكو به‌ته‌واوی له‌به‌رامبه‌ر هێرشه‌كاندا خۆی بپارێزێت ته‌ڤگه‌ر ئه‌و بڕیاره‌ی وه‌رگرت، له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ش ته‌ڤگه‌ر خۆی به‌رێكخستن كرد تاكو بتوانێت به‌رگری له‌خۆی بكات، له‌به‌رامبه‌ر هێرشه‌كان راوه‌ستا و وه‌ڵامی هێرشه‌كانی دایه‌وه‌، چونكه‌ تاكو ئه‌و كاته‌

وەڵامی نەدەدایەوە، لەبەر ئەوەی وەڵامی نەدایەوە هێرشەکانیش تادەهات زێدەتر و مەترسیدارتر دەبوون، بەڕادەیەك تەڤگەر نەیدەتوانی خۆی بپارێزێت و بەرەو تەسفیەبوون دەچوو، ئەو هێرشانەی لەسەر تەڤگەر دەکران، تەڤگەری خستبووە نێو رەوشێکی بەمجۆرەوە. ئەگەر ئەو بڕیارە وەرنەگیرابایە و ئەو پێڤاژۆیە (قۆناخە) بەردەوام ببایە، ئەوا تەڤگەر بێ خۆپاراستن بوو، هێرشەکان زێدەبوون و تەڤگەر لەهەموو لایەکەوە زەبری بەردەکەوت. ئەمەش تەڤگەری بەرەو لەناوچوون دەبرد. ئیدی بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات تەڤگەر ئەو بڕیارەی وەرگرت تاکو بەرگری لەخۆی بکات و ئەگەر هەر هێرشێك روویدا بتوانێت زەبری بەرنەکەوێت و وەڵامی ئەو هێرشانە بداتەوە، لەسەر ئەو بنەمایە ئێمە هەنگاومان هاوێشت.

کاتێك ئێمە ئەو بڕیارەمان وەرگرت گروپی خیانەتکاریش هێشتا لەناو تەڤگەرمابوون و هەڵنەهاتبوون، ئەوانە گووتیان:" ئەو بڕیارە چییە؟ ئەمە گەڕانەوەیە بۆ ستراتیژی رابردوو" ئەوانەی دەرەوەی ئێمەش، ئەوانەی ئەو هێرشانەیان لەسەر تەڤگەر دەکرد و دەیانخواست تەڤگەر بێتوانا بکەن و پەرە بە تەسفیەکردنی بدەن و تەسلیمی بکەن، ئەوانەش گووتیان:" ئەمە چ بڕیارێکە؟ بۆچی ئەو بڕیارەتان وەرگرت؟" ئەو بڕیارەیان بەهەڵە زانی. واتا بەگوێرەی ئەوانە دەبووایە تەڤگەر بەرگری لەخۆی نەکات، بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن بەئاسانی ئەنجامگیر ببن. تەنانەت لەناو ئێمەشدا لەبەر ئەوەی هێشتا کاریگەری ئەو گروپە هەبوو و پروپاگەندە و چەمکی هەڵەیان بڵاوکردبووەوە، هێشتا کاریگەری ئەوان مابوو، هەندێك لە هەڤاڵان دەیانگووت:" بۆچی تەڤگەر ئەم بڕیارەی وەرگرت؟ تۆبڵێی ئەم بڕیارە جارێکی دیکە ئێمە دەگەڕێنێتەوە بۆ ستراتیژی کۆن؟" بۆیە بە دوودڵی لەو بڕیارەی تەڤگەر نزیك دەبوونەوە، تەنانەت هەندێکیان لەدژی ئەو بڕیارەش راوەستان. کاتێك ئێمە بڕیاری بەرگری رەوا (پاراستنی رەوا)مان پێشخست، تەنانەت (HPG)ش لەدوودڵی دابوو؛ تۆبڵێی تەڤگەر بەتەواوی خاوەنداری ئەو بڕیارە دەکات یان نا؟ ئەگەر لەسەرەتادا بەرگری رەوا بە لاوازی پێشکەوت لەبەر ئەو هۆیە بوو. چونکە هەموو تەڤگەر لەپشت ئەو بڕیارە رانەوەستا، لەپشت (HPG) رانەوەستا، (HPG)ش ئەمەی بینی، بۆیە ئەمە کاریگەری لەسەر (HPG)ش کردبوو، بەڕێوەبەرایەتی تەڤگەر لەدژی ئەو چەمکە راوەستا، ئەو هێرشانەی لەسەر ئەو بنەمایە

لەدەرەوە دەكرێت، ئەوەی كە هەڵمەتەكە لاواز دەكات و خەبات لاواز دەكات و مەترسییەكان مەزنتر دەكات لەدژی ئەو چەمكانە شەڕی كرد، ئیدی لەئاكامی ئەوەدا كاریگەری خیانەتكاری و هێزەكانی دەرەوە كەم بۆوە.

ئەو هەڵمەتەی یەكی حوزەیران بەو شێوەیە پێشكەوت و تەڤگەر بەوجۆرە خۆی پاراست. ئیدی ئەگەر ئێمە گەیشتینە رۆژی ئەمڕۆ، ئەوا لەسەر بنەمای ئەو بڕیارە گەیشتینە رۆژی ئەمڕۆ. ئاشكرابوو كە ئەو بڕیارە تاچەند راستبووە، ئەگەر ئەو بڕیارەمان وەرنەگرتبایە ئەوا تەڤگەر خۆی كۆنەدەكردەوە، بەڵكو تەڤگەر زەبری مەزنی بەردەكەوت. چونكە تەڤگەر بێ خۆپاراستن مابۆوە، بۆیە هەموو كەسێك هێرشی لەسەر تەڤگەر دەكرد، هەموو كەسێكیش چەندە هێرشی دەكرد ئەوەندە ئەنجامگیر دەبوو، ئیدی بەم بڕیارە رێگیری لەمە كرا، تەڤگەر خۆی كۆكردەوە و جارێكی دیكە گووتی:" من هەم...!!" بەم هەڵوێستەی و بەتێكۆشانی خۆی ئەو هێرشانەی لەسەر خۆی كەم كردەوە و بێكاریگەری كردن و خۆیشی بەهێز كرد. هێرشكارانیش بینیان كە هەروا زۆر بەئاسانی ناتوانن ئەم تەڤگەرە وەها تەسلیم بكەن و پەرشوبڵاوەی پێبكەن، ئەمەیان بینی. بۆیە تەنانەت تەڤگەر هەر خۆی كۆنەكردەوە، بەڵكو ئەو پراكتیكەی بە گەریلا و سەرهەڵدانیش پێشیخستبوو كاریگەری لەسەر گەلێك هێز و لایەن كرد و سیاسەتی ئەوان و بەرژەوەندی ئەوانیان خستە ژێر مەترسییەوە. بۆیە ناچاربوون گووتیان:" با (PKK) و ئاپۆ ئاگربەستێك رابگەیەنن..."

ئەو هێزانە هەموویان بەم بڕیارە و لەئاكامی پراكتیكی ئەو بڕیارەوە تەڤگەر ئەوانی راكێشایەوە ئەو دۆخەوە. ئەگەر ئەوانە داوایان لەسەرۆك كرد كە ئاگربەست رابگەیەنێت، لەبەر ئەوەبوو داوایان كرد، ئەگەر وەها نەبایە كەسێك ئەو داوایەی لە سەرۆك ئاپۆ نەدەكرد، هەموو كەسێك بەئێمەی دەگووت:" مسۆگەر دەبێت دەستبەرداری سەرۆك و (PKK) ببن" چونكە بەرێگەی گرووپی خیانەتكارەوە بەو هیوایە بوون كە تەڤگەر بخەنە دەستی خۆیانەوە، ئەگەر ئەمەش مەیسەر نەبێت ئەوا تەڤگەر پارچە بكەن و پەرشوبڵاوی بكەنەوە، بۆیە دەیانگووت:" ئیدی ئەو تەڤگەرە مرد..." هەر بۆیە بەئاشكرا دەیانگووت:" دەست لە ئاپۆ و (PKK) بەربدەن، ئیدی ئەوانە نوێنەرایەتی كوردان ناكەن" چونكە دەیانگووت:" ئیدی ئەو تەڤگەرە بەرەو

تەسفیەبوون دەچێت"، بۆیە ئەو بانگەوازییەیان دەکرد. بەڵام ئەو بڕیارەی یەکی حوزەیران، ڕێگیری لەمە کرد و تەڤگەر خۆی کۆکردەوە و سەرهەڵدان و گەریلا و بەرگری ڕەوای بەهێز بوون.

ئیدی بەمە (PKK) جارێکی دیکە لەسیاسەتی ناوچەکەدا شوێنی خۆی گرتەوە. چونکە لەسیاسەتی ناوچەکەیان دەرخستبوو، جارێکی دیکە کەوتەوە نێو سیاسەتی ناوچەکە و شوێنی خۆی گرتەوە و کاریگەری لەسەر سیاسەتی ناوچەکە کرد، کاریگەری لەسەر سیاسەت و بەرژەوەندی دەوڵەت و پارتەکانی کرد، بۆیە ناچاربوون گووتیان:"با سەرۆك ئاگربەست ڕابگەیەنێت". ئیدی ئەگەر ئێمە بەو ئاستە گەیشتین ئەوا بەهۆی بڕیاری یەکی حوزەیرانەوە بەدیهات.

کاتێك سەرۆك ئەمەی وەك پێشنیاز پێشکەشی تەڤگەری کرد و تەڤگەریش کردی بەبڕیار و وەك هەنگاوێك هاوێشتی، پیلانگێڕان و دەوڵەتی داگیرکەر زۆرتووڕە بوون، ئەو گۆشەگیرییەی لەسەر سەرۆك بەڕێوەیان دەبرد توندتریان کرد، کەمێك مابوو سەرۆك لەناوببەن. وەك بڵێی بەسەرۆك بڵێن:" تۆ بۆ تەڤگەر وریا دەکەیتەوە؟ تۆ بۆ ناهێڵیت تەڤگەر تەسفیە ببێت؟ ئێمە دەخوازین تەسفیەی بکەین، تۆش ناهێڵیت تەسفیە ببێت". بۆیە خواستیان بەو شێوەیە تۆڵەی خۆیان لەسەرۆك بکەنەوە، بۆیە ... گۆشەگیرییەی بەڕێوەیان دەبرد، لەئاستێکی زۆر وەحشیگەرانە پێشیانخست کە؛ یان ...ك خۆی خۆی لەناوببیات یان ئەمە نەکات و تەسلیم ببێت. تا ئەو ئاستە وەحشییەتیان بە پێشخست، سەرۆکیش نە تەسلیمی ئەوان بوو و نە خۆیشی لەناوبرد، بەڵکو لەبەرامبەر ئەواندا بەرخۆدانی خۆی پێشخست و پێداگری لەسەر ڕێگای چارەسەری کرد. بینیان کە پێداگری لەسەر ئەمە دەکات، ئەمجارەیان لەبەرامبەر ئەوەدا چییان کرد، هەوڵیاندا سەرۆك لەنێوان مردن و ژیاندا بهێڵنەوە، ئەو سیاسەتەیان بەڕێوە برد، بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژ بیکوژن، سیاسەتێکی هێندە وەحشیگەرانەیان لەسەر سەرۆك پێشخست. چونکە هێشتنەوەی لەنێوان مردن و ژیاندا، هەموو ڕۆژ مردنە و ژیانبوونیش هەر مردنە، کەس ناتوانێت بەرگەی ئەمە بگرێت، ئەو کاتە یان خۆی دەکوژێت یان تەسلیم دەبێت.

ئیدی سەرۆك لەدژی ئەو سیاسەتەش راوەستایەوە، لەبەر ئەوەی لەدژی ئەو سیاسەتە راوەستایەوە، بینیان بەمەش ناتوانن ئەنجام بگرن. بۆیە کەمێك هەنگاویان هاوێشت و گووتیان:"با ئاپۆ ئاگربەست رابگەیەنێت..."

# سیستەمێك لەدەرەوەی كۆشك و سەراكانی دەوڵەت...!!

لەنەورۆزی ساڵی (٢٠٠٥)دا سیستەمی كۆما كۆمەڵانی كوردستان (KKK) لەلایەن سەرۆك ئاپۆوە راگەیەنرا، گەلی كوردیش لەمیانەی پیرۆزكردنی نەورۆزدا خاوەندارێتی لەسیستەمی (KKK) كرد. هەڵبەتە گەوهەری ئەو سیستەمەش كۆنفیدرالیزمی دیموكراتییە. راگەیاندنی ئەو سیستەمە چ رەنگدانەوەیەكی لەناو تەفكەر و گەلدا هەبوو؟ پرۆژەی كۆنفیدرالیزمی دیموكراتیك خاوەن چ ناوەرۆك و گەوهەرێكە و لەسەر چ بنەمایەك پێشدەكەوێت؟ تا رۆژی ئەمرۆ لەماوەی ئەم یەك دوو ساڵەدا تا چەند توانیویەتی هەنگاو بۆ پراكتیزەكردنی بهاوێژێت، لەم رووەوە تا چ ئاستێك پێكهاتووە؟

سەرۆك بەساڵان لەرووی فەلسەفی، ئایدیۆلۆژی و تیۆریدا تێکۆشانی کردووە و هەنگاوی هاوێشتووە، تا گەیشتە ئەو ئاستەی بتوانێت ئەوە روون بکاتەوە کە مۆدێلی ئەو رێکخستنە لەرووی تیۆرییەوە لەسەر چ بنەمایەکە و لەرووی پراکتیکیشەوە چۆن پێکدێت. کاتێك دوای ئەوەی هەموو ئەوانەی تەواوکرد و یەکلایی کردەوە ئینجا لەسەر ئەو بنەمایە سیستەمی کۆما کۆمەڵێن کوردستان (KKK)یان بەناوێکی دیکە "کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی"ی راگەیاند، ئاڵاکەیشی دەستنیشان کرد و گووتی:" ئاڵاکەی ئەمەیە و سیستەمەکەشی ئەمەیە، منیش بەشەرەفەوە سەرۆکایەتی ئەو سیستەمە لەئەستۆی خۆم دەگرم" واتا کاتێك بەتەواوی لەرووی ئایدیۆلۆژی، فەلسەفی، رێکخستنی، تاکتیکی و سیاسی چوارچێوەکەی دیارکرد، ئینجا بەفەرمی رایگەیاند. تا ئەو کاتە (ساڵی ٢٠٠٥) مژوولی روونکردنەوەی سیستەمەکە و یەکلایی کردنەوەی بوو، بۆیە تا ئەو کاتەش راینەگەیاندبوو. ئیدی کاتێك لەهەموو روویێکەوە سیستەمەکەی روونکردەوە و یەکلایی کردەوە ئەو کاتە رایگەیاند.

وەکوتریش لەرۆژی نەورۆزدا رایانگەیاند، بەمەش واتایەکی مەزنی بە نەورۆز بەخشی. بۆیە لەنەورۆزدا رایگەیاند، چونکە نەورۆز بۆ گەلی کورد و گەلانی خۆرهەڵانی ناوین واتایەکی خۆی هەبوو، سیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیش هەر تەنیا بۆ کوردان نەبوو، بەڵکو بۆ گەلانی ناوچەکەش بوو، تەنانەت ئەو مۆدێلەی سیستەمی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی راگەیاند و پێشیخست. هەڵبەتە نەورۆز تەنیا بۆ کوردان نییە، بۆ گەلانی ناوچەکە و تەنانەت بۆ تەواوی گەلانی جیهانیشە، چونکە واتای "ئازادی" هەیە. ئیدی سەرۆك لەنەورۆزدا رایگەیاند، بەمەش هەم واتای بەنەورۆز بەخشیەوە، هەمیش پردێکی لەنێوان ئەمڕۆ و مێژوودا دروستکرد.

بێگومان کاتێك سیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی و ئاڵاکەی راگەیاند، ئەوا لەناو گەلدا دەنگدانەوەیەکی مەزنی دایەوە و کاریگەرییەکی مەزنی دروستکرد، گەل یەکسەر خاوەنداریێتی لێکرد و لەنەورۆزی هەمان ساڵدا زۆر بەئاشکرایی خاوەندارێتی لە کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کرد و ئاڵاکەیشی بەرزکردەوە. داگیرکەران ئەو مەزەندەیەیان نەدەکرد کە گەل یەکسەر خاوەندارێتی لێبکات. هەڵبەتە کاتێك رایگەیاند دوو سێ رۆژ مابوو بۆ جەژنی نەورۆز. کاتێك کە لەنەورۆزدا بینی گەل هەمووی ئاڵای کۆما

**کۆمەڵانی کوردستان** (KKK)ی بەرزکردۆتەوە گەل بەدروشمەکان و ئاڵاکان خاوەندارێتی لێکرد، ئەمە داگیرکەرانیشی شۆك کرد. واتا چۆن لەکاتێکی وەها زۆرکەمدا هێندە ئامادەکاری بۆ کرا و هێندە خاوەندارێتی لێکرد؟ ئەومیان بۆ روون نەبووەوە کە ئەو تەڤگەرەی پێیان دەگووت:" ئێمە بەرێگەی بۆتان و "فەرهاد"ەوە ئیفلیجمان کرد، ئیدی ناتوانێت پشتی خۆی راست بکاتەوە" بینیان پڕ بەهێزەوە دەکەوتەڕوو کە؛ تەڤگەر نەك هەر بێهێز نەبووە، بەڵکو پڕ بەهێزتر بووە. ئیدی لێرەدا بۆیان دەرکەوت کە تەسلیمبوونی ئەو تەڤگەرە یان تەسفیەکردنی ئەو تەڤگەرە زۆر دژوارە. چەندە دەڵێن:" ئێمە وا زەبرمان لێدان، ئێمە وا ئەنجام دەگرین" کەچی دەبینین تەڤگەر جارێکی دیکە لەبەرامبەریاندا بەهێزەوە دەردەکەوێت. ئەمەش ترس و شڵەژانێکی لەوان دروستکرد. ئیدی چۆن ئەمە بێکاریگەر بکەن؟

دەوڵەتی داگیرکەری تورك لەبەرامبەر ئەمە یەکسەر کەوتە جموجۆڵەوە؛ چۆن گەلی کورد ئاڵای کۆما **کۆمەڵانی کوردستان** (KKK)ی بەرزکردەوە تورکیاش یەکسەر ئاڵای تورکیای بەرزکردەوە و دایەدەستی هەموو کەسێك و **"پراواکسیۆنی ئاڵا"**(٨) دەستپێکرد. بۆچی؟ چونکە ئاڵای تورکیا نوێنەرایەتی سیستەمەکەی تورکیای دەکرد، ئەو ئاڵایەی سەرۆك دایە دەستی کوردان نوێنەرایەتی سیستەمێکی دیکەی دەکرد. ئەمە هەر تەنیا ئاڵایەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو ئاڵایەك بۆ گەل و میللەتێك بوو، ئاڵای سیستەمێك بوو، بۆیە مەسەلەی ئاڵاکە لە تورکیادا زۆر گرنگ بوو، لەشەڕی نێوان ئاڵاکاندا گوزارشتی لەشەڕی سیستەمەکان دەکرد. چونکە سەرۆك ئاپۆ ئاڵایەکی دابووە دەستی کورد و مرۆڤایەتییەوە، ئەو ئاڵایە ئاڵای سیستەمێك بوو. بۆیە یەکسەر ئاڵای تورکیایان لەبەرامبەریدا بەرزکردەوە، بەرێگەی پراواکسیۆنی ئاڵاکانەوە خواستیان ئەو کاریگەرییە نەهێڵن. چونکە ئەگەر ئەو کاریگەرییەی دروست بووە نەسڕنەوە ئەوا لەلای تورکیاش ئەو هەنگاوە دەهاوێشترێت و یەکێتی نێوان گەلی کورد و تورك دێتەدی. ئەمەش چارسەری بەرەو پێشەوە دەبات، بۆیە ئەمان مەترسیدار بینی و بە پێویستیان زانی رێگیری لەمە بکرێت. ئیدی لەبەر ئەوە تیرۆرێکی مەزنیان لەسەر دیموکراتیخوازانی تورك پێشخست، بۆ ئەوەی بەتەواوی دیموکراتیخوازانی تورك تەسلیم بکەن، تاکو بەرەی تورکیا سەلامەت بێت. بەرێگەی پراواکسیۆنی ئاڵاکان و لینجکردنەوە

خواستیان کوردان گۆشەگیر بکەن و چاوی گەلی کورد بترسێنن و سەرهەڵدان پەرە نەسێنێت و بەهێز نەبێت، بۆ ئەوەی بتوانن کۆنترۆڵی گەل بکەن، بتوانن گەریلاش بەتەنیا لەچیا عاسێ و گۆشەگیر بکەن و زەبریشی لێبدەن. هەر بۆیە شانبەسانی پراواکسیۆنەکەی ئاڵا و بەلینجکردن یەکسەر ئامادەکاری نۆپەراسیۆنیشیان پێشخست، تاکو بتوانن رێگری لەو پێڤاژۆیە بکەن و رووبەرووی مەترسی نەبنەوە.

ئیدی بۆیە راگەیاندنی **کۆما کۆمەڵانی کوردستان** (KKK) یەکسەر کاریگەرییەکی بەهێزی خۆی کرد، لەناو گەلدا یەکسەر گەل خاوەنداریێتی لێکرد. لەوانەیە گەل بەقووڵایی لەمە تێنەگەیشتبێت، بەڵام باوەڕییەکی تۆکمەی بەسەرۆك هەبوو، ئەو سیستەمەی راشیگەیاندبوو بەرجەستەیان کرد و پێشتریش کەمێك تێیدا ژیابوون و لەپراکتیکی ئەو تەڤگەرەشدا، لەهەندێك شوێندا تێیدا ژیابوون، بۆیە ئەگەر بەقووڵاییش نەبێت بەڵام تارادەیەك دەیانزانی چییە و یەکسەر خاوەنداریێتییان لێکرد. چونکە لە **حیلوان**دا ئێمە پراکتیکێکی **کۆما کۆمەڵانی کوردستان**مان پێشخستبوو. لە **باتمان**یش کەمێك تێیدا ژیابوون، لەهەندێك شوێنی دیکەشدا تێیدا ژیابووین و گەل ئەمانەیان دەزانی و لێی نامۆ نەبوون. بۆیە خاوەنداریێتی لێکرد.

## کەواتە بناخەی سیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی چییە؟

ئەو سیستەمە لەدەرەوەی دەوڵەت سیستەمێکی دیموکراتی بۆخۆی بەبنەما وەردەگرێت، دیموکراسییەت وەك سیستەمێك دەبینێت و ئەو سیستەمەش لەدەرەوەی دەوڵەت دەبینێت. سیستەمی دیموکراسی بە ئەلتەرناتیفی سیستەمی دەوڵەتگەرا دەزانێت. دیموکراسی وەك لەدەوڵەتدا هەیە تەنیا شێوەیەکی (شکلێکی) ئیداری نابێت، لەو سیستەمەدا لەبەر ئەوەی دەسترۆیی (صلاحیة) و هێز لەئارادا نییە، لەبەر ئەوەی بەتەواوی ئازادی، دیموکراسی، یەکسانی و عەدالەت بەبنەما وەردەگرێت و باڵادەستێتی و دەسەڵات و دەوڵەت بەبناخە وەرناگرێت، بۆیە دابەشکردنی دەسترۆییش لەئارادا نییە، بەو شێوەیە دابەشکردنی هێزیش لەئارادا نییە، لەو سیستەمەی کە دەوڵەت بەبناخە وەردەگرێت، دابەشکردنی هێز هەیە، چونکە ئەگەر ئەمە نەکات ناتوانێت باڵادەستێتی

خۆی بەڕێوەببات، ئەو کاتە حاکمییەت (باڵادەستێتی) دەکەوێتە ژێر مەترسییەوە. بۆیە هێزی دادوەری، یاسادانان، جێبەجێکردن دابەش دەکەن، تاکو سیستەم بەڕێوە بچێت. چونکە سیستەم لەسەر دەسەڵات و حاکمییەت ئاواکراوە، بۆیە ئەو جودابوونەش دەکەن تاکو نەکەونە ژێر مەترسییەوە. ئەو سیستەمەی سەرۆك بەناوی کۆما کۆمەڵانی کوردستانەوە پێشیدەخات، تێیدا سیستەم لەسەر دەسەڵات و دەوڵەت و حاکمییەت ئاوای ناکات. بۆیە دابەشکردنی هێز بەبنەما وەرناگرێت. یەکێك لەخاڵە سەرەکییەکانی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیش ئەوەیە.

هەروەها ئەو سیستەمە بەتەواوی کۆمەڵگای ژێرەوە (خوارەوە) بۆخۆی بەبنەما وەردەگرێت، بەڵام ئەو سیستەمەی حاکمییەت بەبنەما وەردەگرێت، جا بە چ شێوەیەك دەبێت بابێت، کۆمەڵگای سەرەوە (ژوورەوە) بۆخۆی بەبنەما وەردەگرێت. ئەو سیستەمەی کە سەرۆك پێشیدەخات؛ لەکۆمەڵگادا کۆمەڵگای خوارەوە بەبنەما وەردەگرێت، بۆیەش دیموکراسییەتی راستەوخۆ (الديمقراطية المباشرة) بەبناخە وەردەگرێت نەك دیموکراسییەتی نوێنەرایەتی (الديمقراطية النيابية). لە سیستەمی دەسەڵاتدارێتیدا دیموکراسی ئیدارەیەك و پارچەیەکی ئەو سیستەمەیە و لەناو خودی ئەو دایە، بۆیەش دیموکراسییەتی نوێنەرایەتی بەبنەما وەردەگرێت. لەبەر ئەمەش هیچ کاتێك بەتەواوی دیموکراسی تێیدا بەرجەستە نابێت. بەڵام لەبەر ئەوەی لەسیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیدا کۆمەڵگای خوارەوە بەبناخە وەردەگرێت، ئەوا دیموکراسییەتی راستەوخۆ بەتەواوی بەبنچینە وەردەگیردرێت. یەکێك لەخاڵە جیاوازەکانیشی ئەمەیە.

لە کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیدا پێویستە هەموو کەسێك بەزمان، ناسنامە، کولتوور و بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە خۆی رێکبخات و بەئازادیش گوزارشت لەخۆی بکات. واتا لێرەدا ژمارەی نفوسی هەر گەلێك، ئایینێك، ئایینزایێك... هتد چەند دەبێت بابێت، هیچ کاتێك پێوانەی زۆرینە و کەمینە، گەورەیی و بچووکی بەبنەما وەرناگرێت، بەڵکو عەدالەت بەبنەما وەردەگرێت، مافی ئەو بەبناخە وەردەگرێت. بۆ نموونە؛ چۆن مافی میللەتێکی سەد ملیۆنی هەیە، میللەتێکی چەند هەزار کەسیش هەمان مافی هەیە،

مافەكانیان وەك یەكە، چۆن ئەم دەڵێت:" زمانی و كولتوور و ناسنامەی من" ئەویش هەمان مافی هەیە كە بڵێت:" زمان و كولتوور و ناسنامەی من".

مرۆڤ ئەگەر سەرنج بداتە مێژوو؛ دەبینێت كە ئەو شەڕانەی بەرپابوون لەسەر چی بەرپابوون؟ ئەوەی بەهێز بووە هەموو شتێكی بەمافی خۆی زانیوە، بەڵام بەمافی ئەوەی دیكەی نەزانیوە و خواستوویەتی لەناوی ببات، بۆیە شەڕەكان بەرپابوونە. شەڕەكان یان لەنێوان گەلاندا یان لەنێوان ئایینەكان و ئایینزاكاندا روویداوە، یاخود لەنێوان چینەكانیشدا روویداوە، چینێك خۆی باڵادەست دەبینێت، هەموو شتێك بەمافی خۆی دەزانێت، بۆ چینەكەی دیكەش بەمافی نازانێت و لەبەرامبەریدا زوڵم و چەوسانەوە بەبنەما وەردەگرێت، ئیدی لەنێوان چینەكاندا شەڕ بەرپا دەبێت. هەروەها لەنێوان رەگەزەكاندا شەڕ دەركەوتووە، دەسەڵاتی پیاو هەیە پیاو هەموو شتێك بەمافی خۆی دەزانێت، بەڵام بە مافی ژنانی نازانێت، ئەوەی كە بۆ ژن بەمافی دەزانێت چییە؟ تەنیا شوو بكات و ماڵ و منداڵی هەبێت و پیاوەكەی خۆی تێربكات و ئیشوكاری ماڵەوە بكات، ببێتە ژنێكی ماڵەوە.

هەروەها لەژینگە و سروشتدا تەخریباتێكی مەزن لەئارادایە و هاوسەنگی نێوان مرۆڤ ـ كۆمەڵگا، كۆمەڵگا ـ ژینگە نەماوە، بۆ ئەوەی دەستكەوت و كار و قازانج زیاتر بكەن بێسنوور سروشت تێكدەدرێت. هەڵبەتە ئەمەش ژیانی مرۆڤ دەخاتە مەترسییەوە، بەرێگەی ئەتۆم و كیمیاوی و بایۆلۆژی و...هتد، بێسنوور بەكاربردن (ئیستهلاك كردن) و پیسبوونێكی مەزن و نەخۆشی مەزن دروست دەكات، ژیانی مرۆڤیش دەخاتە مەترسییەوە. لەلایەكی دیكەوە مرۆڤ خۆی بەپارچەیەكی سروشت نازانێت، دەخوازێت بەسەر سروشتدا زاڵ ببێت، هەمیش بێسنوور دەخوازێت بەسەریدا زاڵ ببێت، ئیدی ئەمانە هەمووی كێشە بۆ مرۆڤایەتی دروستدەكەن.

لێرەوە كۆنفیدرالیزمی دیموكراتی كێشە مرۆڤایەتییەكان بەبناخە وەردەگرێت. واتا دەخوازێت ئەو هاوسەنگییەی تێكچووە و ئەو ناهاوسەنگییەی لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا هەیە چارەسەر بكات و هاوسەنگ بكاتەوە، هەروەها مرۆڤ خۆی بەپارچەیەك لە سروشت بزانێت و لەگەڵ سروشتدا بەیەكەوە بژین. بێسنوور باڵادەستێتی خۆی بەسەر سروشتدا [illegible]خات و تێكدان و وێرانكردن ئەنجام نەدات.

لەلایەکی دیکەشەوە؛ لەنێوان تاك و کۆمەڵگادا هاو... تێکچووە، یان کۆمەڵگا نکۆڵی لەتاك دەکات و یانیش تاك نکۆڵی لەکۆمەڵگا دەدات. ئەم سیستەمە هەوڵدەدات لەنێوان تاك و کۆمەڵگادا هاوسەنگی دروست بکات. هەروەها لەنێوان دەوڵەت ـ تاك و کۆمەڵگادا ناهاوسەنگی دروستبووە، دەوڵەت هەموو شتێك بەقوربانی خۆی دەکات، تەنانەت تاك و کۆمەڵگاش، پێویستە لەبەرامبەر دەوڵ... کۆمەڵگا و تاك بپارێزرێت، پێویستە لەنێوان هەردوو رەگەزدا یەکسانی و هاوسەنگی بێتەدی، هەروەها نێوان ئایینەکان، ئایینزاکان، میللەتاندا هاوسەنگی دروست ببێت و ئەو ناهاوسەنگییەی لەئارادایە نەمێنێت. بۆ هەموو کەسێك ئازادی و بەئازادی گوزارشت لەخۆکردن هەبێت. لەمەسەلەی چینەکاندا، چینێك بەسەر چینێکی دیکەدا زاڵ نەبێت و دەسەڵاتدار نەبێت. لەگەوهەری کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیدا ئەمانە بەبناخە وەردەگیردرێت، کە هەموو کەسێك، چی بەماف خۆی دەزانێت دەبێت بە ماف ئەوەی بەرامبەریشی بزانێت، شتێك کە بە شایستەی خۆی دەبینێت بە شایستەی ئەوەی دیکەشی ببینێت، تاکو لەسەر بنەمای نکۆڵی و کوشتوبڕی و لەناوبردن نەژین، یەکتری پەسند بکەن و بەیەکەوە بژین، ژیان لەسەر بنەمای نکۆڵی و قڕکردن و توانەوە و لەناوبردن بەرێوە نەچێت، هەموو کەسێك بەناسنامە، زمان، ئایین، کولتوور و بەرژەوەندییەکانی خۆی خۆی رێکبخات و گوزارشت لەخۆی بکات. بەڵام هەموو کەسێکیش لەبەرامبەر ئەوانەی دیکە خۆی بەرپرسیار ببینێت. واتا وەك چۆن ئەوەی دیکە خۆی لەبەرامبەر تۆ و ئەوانی دیکە خۆی بەرپرسیار دەبینێت، پێویستە تۆش لەبەرامبەر ئەوانەی دیکە خۆت بە بەرپرسیار ببینیت، پێکەوە بژین و کاربکەن، هەموو شتێك پێکەوە دابەش بکەن (پارڤە بکەن). واتا دەرك بەوە بکات کە بەبێ ئەوەی دیکە و ئەوانەی دیکە ناتوانێت بژیت، وەك چۆن دەخوازێت بژیت و ماف ژیانی هەیە، ئەوەی لەبەرامبەریشی دایە بەهەمان شێوە ماف ژیانی هەیە، پێویستە پێکەوە بژین و لەبەرامبەر یەکتری بە بەرپرسیارێتییەوە بژین، تاکو یەکێتییەکی بەهێز بێتەدی و کێشە و گرفت و پارچەبوون روونەدات، ناحەقی و زوڵم و نکۆڵی و شەڕ روونەدات. ئیدی راستینەی ئەم سیستەمە بەکورتی و پووختی ئەوەیە.

کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی ئیدارەیەکی ناوەندی ناخوازێت، بەڵکو ئیدارەیەکی خۆجێی (مەحەلی) بەڵام لەناوەندێکدا و لەکۆردیناسۆنێکدا بگەنەوە یەکتری بەبنچینە وەردەگرێت، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك نوێنەرایەتی خۆی لەو کۆردیناسیۆنەدا بکات، تاکو بتوانن بەیەکەوە بژین، پارچەبوون و ناحەقیش روونەدات. واتا ناوەندێتی بەبنەما وەرناگرێت و نکۆڵی لە لۆکالی (خۆجێی) ناکات و لاوازی ناکات، هەروەها لۆکالێتی (خۆجێتی) بەهێز ناکات و ناوەندێتیش بەتەواوی بەلاوە نانێت، بەمشێوەیە لەنێوان ناوەند و خۆجێییشدا هاوسەنگییەك دروست دەکات، تاکو بتوانێت کۆمەڵگا لەنێو ناهاوسەنگییدا نەژیت و کێشە و حاکمییەت و زوڵم و توندوتیژی روونەدات، تاکو مافی هەموو کەسێك بپارێزێت و لەوێدا ئاشتی، عەدالەت، ئازادی و یەکسانی سەقامگیر ببێت. سیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە ئاوادەکرێت...

## لەسیستەمی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیدا کێشەی جوگرافیا و سنوور، کە لەرابردوودا و تا ئێستایشی لەگەڵدابێت زۆر گەل، نەتەوە و...هتد کێشە و ناکۆکییان لەنێواندا هەبووە و هەیە، پەیوەست بەمەشەوە کێشەی ئابووری و سەرچاوە ئابوورییەکان چۆن چارەسەر دەکرێن؟

کێشە جوگرافییەکان لەچییەوە سەرچاوە دەگرن؟ لەئەنجامی ناعەدالەتی و حەقییەکانەوە دەردەکەوێت، لەئەنجامی نکۆڵی و قرکردن و توانەوە دەردەکەوێت. ئەگەر نکۆڵیکردن نەبێت و یەکتری پەسندکردن و پێکەوە ژیان سەقامگیر بووبێت، کە هەرکەس بەناسنامە و ئازادی و راستینەی خۆی گوزارشت لەخۆی بکات و خۆی رێکبخات، مەسەلەی جوگرافیا نابێتە کێشەیەك، مەسەلە سنوورییەکان نابنە کێشەیەك، ئەگەر دەبنە کێشە لەبەر ئەو هۆکارەیە. چەندە جوگرافیا و رێژەی دانشتوانی خۆی مەزنتر و زیاتر بکات ئەوەندەش دەسەڵاتدارێتی خۆی مەزنتر و زیاتر دەکات، چەندە کەم ببێتەوە، ئەوا دەسەڵاتدارێتییەکەیشی کەمتر دەبێتەوە، یان بڵێین؛ لاوازییەکانی

زیاتر دەبن بۆیە هەموو ئەو کێشە جوگرافی سنوورییانە دەردەکەون. لە کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیدا مەسەلەی جوگرافیا گرنجیتی خۆی لەدەست دەدات، واتا ژمارەی دانیشتوان (نفوس)ی خۆی زێدە بووە، کەم بووە، توانستەکان کەمبوونە یان زیادبوونە، کێشەیەکی بەمشێوەیە لەئارادا نامێنێت، بۆیەش شەڕی سنوورەکان، شەڕ لەسەر جوگرافیا روونادات.

سەبارەت بەمەسەلەی ئابووریش؛ نەك بەگوێرەی کارکردن، بەڵکو بەتەواوی بەگوێرەی "پێداویستی" و دابەشکردن (پارڤەکردن) کایەی ئابووری بەرێوە دەچێت. ئێستا ئەو ئابوورییەی لەئارادایە، لەسەر چ بنەمایەکە؟ لەسەر بنەمای کارگردنە، واتا هەموو شتێك کراوە بە موڵك و سامان و دەفرۆشرێت و دەکرێتە سەرمایە و پارەو قازانج (ربح). واتا ئەو بەرهەمەی بەرهەم دەهێنرێت لەسەر چ بنەمایە؟ لەسەر بنەمای مەتریال (سەرمایە، کاڵا) و کارە. ئیدی هەموو شتێك دەکرێتە کاڵا و دەفرۆشرێت. بۆچی ئەو کاڵایە دەفرۆشرێت؟ تاکو قازانج بکات، هەمیش بێسنوور قازانجکردن، ئابووری ئێستا بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایەیە. ئیدی ئەمە بۆ مرۆڤ کێشەی جددی دروست دەکات و تەخریباتی جددی دێنێتە ئاراوە؛ برسیبوون، هەژاری، ناحەقی و خراپی دروست دەکات، لە مرۆڤ و ژینگە و سروشتدا تەخریبات دروست دەکات، پێویستە ئابووری لەسەر بنەمای "پێداویستی" و "پێکهێنان" و دابەشکردن (توزیع) بێت. چەمکی ئابووری کۆما کۆمەڵانی کوردستان لەسەر ئەو بنەمایەیە، بەمەش دەڵێن "ئابووری سروشتی" واتا ئەو ئابوورییەی کەوا پێداویستییەکانی مرۆڤ بەبنچینە وەردەگرێت، ئەوەی لەنێوان مرۆڤەکاندا هەیە دابەشکردن (توزیع) بەبنەما وەردەگرێت و بەرهەمهێنانیشی بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایەیە. ئەگەر وەهابێت، ئەوا لەسروشتدا تەخریبات دروست ناکات و لە مرۆڤیشدا تەخریبات دروست ناکات، ئەمە ناعەدالەتیش دروست ناکات، دەوڵەمەندبوون ـ هەژاربوون و برسیبوونیش ناهێنێتەوە کایەوە، کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێرانیش دروست ناکات، سیاسەتی ئابووری کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی لەسەر ئەو بنەمایە بەرێوە دەچێت...

# ڤیان، ئەلەفتەریا
# ئەو بلێسانەی واتایان بۆ هەموو
# شتێك گەڕاندەوە...!

**لەشەوی (½)ی شوباتی (٢٠٠٦)دا هەڤاڵ ڤیان جاف (لەیلا والی حوسێن) چالاکییەك ئەنجام دەدات، هەم بۆ شەرمەزارکردنی ئەو زوڵم و چەوسانەوەیەی لەبەرامبەر گەلی کورد دەکرێت، هەمیش لەبەرامبەر ئەو گۆشەگیرییەی بەسەر سەرۆك ئاپۆدا سەپێنرا بوو. لەشەخسی هەڤاڵ ڤیان دا ئەو چالاکییە چۆن شرۆڤە دەکەن؟ ئێوە خۆشتان هەڤاڵ ڤیانتان لەنزیکەوە دەناسی، هەڤاڵ ڤیان کەسێتییەکی چۆن بوو؟**

مرۆڤ دەتوانێت لەچالاکییەکەی هەڤاڵ "ڤیان"دا کەسێتی هەڤاڵ "ڤیان"یش بناسێت و تێبگات کە چ کەسێتییەکی هەبوو؟ کەسێتی هەڤاڵ "ڤیان" ئەو کەسێتییەیە کە سەرۆك ئاپۆ خواستوویەتی لەکەسێتی مرۆڤی کورددا، لەکۆمەڵگای کورددا پێشیبخات. ئەو کەسێتییەیە کە لەناو (PKK)دا بەرجەستەبووە، ئەو کەسێتییەیە کە تەنیا

لەئاستی هەندێك لەهەڤاڵاندا خۆی سەلماندووە. کەسێتی هەڤاڵ "ڤیان" کەسێتی (PKK)یە، پراکتیکبوونی کەسێتی (PKK)یە، هەم بەژیانی خۆی و هەمیش بە چالاکییەکەی خۆیشی. کەسێتییەکە بەتەواوی خۆی لەخۆی دەرخستووە و بۆخۆی نائژیت، بۆ بنەماڵەکەی و عەشیرەتەکەی و چینەکەی و ناوچەکەی خۆی نەژیاوە، ئەو کەسێتییەیە کە بۆ پارچەکی کوردستان یان تەنیا بۆ میللەتێك نەژیا، چونکە کەسێتی (PKK) ئەو کەسێتییەیە کە خۆی لەهەموو ئەوانە دەردەخات و لەکەسێتی خۆیدا بەرژەوەندی مرۆڤایەتی، بەرژەوەندی گەلان و گەلی کورد بەبنەما وەردەگرێت، ئەوەی کە بەتەواوی خۆی لەگەڵ ئازادی کلیل کردووە، بەتەواوی بۆ ئازادی دەژیت و بۆ ئازادی دەمرێت، ژیان و مردنی خۆی بەگوێرەی ئازادی رێکدەخات، لەدەرەوەی ئەمە ژیانێکی دیکە و مردنێکی دیکە پەسند ناکات، کەسێتی هەڤاڵ "ڤیان"یش کەسێتی (PKK)یە و (PKK) لەکەسێتی ئەودا بەرجەستەبووە. کەسێتییەکە خاوەن مۆراڵ و باوەڕی، هوشیاری و زانایی، ئیرادە و فیداکاری و جورئەت بوو، بەبێ مەرج خۆی تەڤلی کردبوو، هەڤاڵ و گەل و سەرۆکی خۆی خۆشدەویست، مرۆڤایەتی خۆشدەویست، هەم بەتێگەیشتن و هەمیش بەپێکهێنان.

"ڤیان" کەسێتییەك بوو نەك بەتەعلیمات و فەرمان و چاودێری کردن هەڵسوکەت و جموجۆڵ بکات، بەڵکو بەتەواوی بەگوێرەی پێداویستییەکان هەڵسوکەوت و جموجۆڵی دەکرد، پێداویستییەکان دەبینێت و دەیخاتە پێشخۆی و لەسەر بنەمای دابینکردنی ئەو پێداویستییانە پێداگری دەکات تاکو ئەو پێداویستییانە پێکبێنێت. لەژیانی خۆیدا بەتەواوی سادە و دڵنزم بوو، ئەو ژیانەی کە گەلەکەی تێیدا دەژیت، دەژیا. کەسێتی هەڤاڵ "ڤیان" کەسێتییەکی بەمجۆرە بوو. واتا کەسێتی (PKK)یە، ئەو کەسێتییەیە کە سەرۆك ئاپۆ دەیخواست لەمرۆڤ و کۆمەڵگای کورددا بنیای بنێت. هەڤاڵ "ڤیان" ئەو کەسێتییەی بۆخۆی بەبنەما وەرگرت.

لەکەسێتی هەڤاڵ "ڤیان"دا تۆ خێزانت نەدەبینی، عەشیرەتت نەدەبینی، چەمکی مەحەلی و ناوچەگەرێتی و پارچەگەرێتیت نەدەبینی، بەڵکو لەکەسێتی خۆیدا بەتەواوی ئاستی هەرە پێگەیشتووی گەلی کورد و ئاستی مرۆڤایەتی بەبنەما وەرگرتبوو و بەمشێوەیە لەخۆیدا سەرتاپاگیری ئافراندبوو، بۆخۆی نەدەژیا، ژیانێکی شەخسی

خۆی نەبوو، هەموو شتێکی خستبووە راژەی ئازادی و بەئازادی هەڵدەستا و دادەنیشت و دەژیا، لەکەسێتی خۆیدا ژنێتی باوی کوشتبوو، لەخۆیدا چڵێسی و کۆیلایەتی کوشتبوو و بەتەواوی کەسێتییەکی ئازاد و ئیرادەیەکی ئازادی لەکەسێتی خۆیدا ئافراندبوو و پێشیخستبوو.

هەڵبەتە ئەگەر مرۆڤ لەو چالاکییەی کە هەڤاڵ "ڤیان" ئەنجامی دابوو بڕوانێت ئەوا دەتوانێت لەکەسێتییەکەشی تێبگات. لەسەر سەرۆك ئاپۆ زوڵمێکی مەزن و وەحشییەتێکی مەزن بەڕێوە دەچێت، هەڤاڵ "ڤیان" ئەمە پەسند ناکات، ئەو زوڵمەی لەسەر سەرۆك ئاپۆ پەیڕەو دەکرێت زوڵمێکە لەسەر مرۆڤایەتی و گەلی کورد و تەڤگەر ، بۆیە پەسندی ناکات. چونکە سەرۆك ئاپۆ بەهایەکی مرۆڤایەتی مەزنە و سەرۆکی گەلێك و تەڤگەرێکە، ئیرادەی گەل و تەڤگەرێکە، ئەو سەرۆکێکە نەك تەنیا دەخوازێت کێشەی تەڤگەرێك یان گەلێك چارەسەر بکات، بەڵکو دەخوازێت کێشەی تەواوی مرۆڤایەتی چارەسەر بکات، دەخوازێت کێشەی ژن چارەسەر بکات. سەرەڕای ئەمە کاتێك وەحشییەتێك لەسەر ئەو سەرۆکە بەڕێوە بچێت ئەوا بەو واتایە دێت کە ئەو وەحشییەتە لەسەر ئەو تەڤگەرە و گەلی کورد و ژن و تەواوی مرۆڤایەتی بەڕێوە دەچێت.

ئیدی هەڤاڵ "ڤیان" ئەمەی پەسند نەکرد و لەدژی ئەوە بە رکوکینێکی مەزنەوە راوەستا. بینی کە وەحشییەتێکی هێندە مەزن لەسەر سەرۆك بەڕێوە دەچێت، کەچی لەدونیادا کەس دەنگی خۆی ناکات، لەناو گەلیشدا کاردانەوەیەکی وەها مەزن بەدیار ناکەوێت، تەنانەت لەناو تەڤگەریشدا وەڵامێکی مەزنی ئەمە نادرێتەوە. ئەمەی پەسند نەکرد، ئەو سەرۆکە بۆ ئەم تەڤگەرە، بۆ ئازادی ئەم گەلە، بۆ ئازادی ژن، بۆ مرۆڤایەتی لەژێر ئەو زوڵمەدا دەژیت و بەرخۆدانێك پێشدەخات، چۆن مرۆڤایەتی، ژن، گەلی کورد و ملیتانانی (PKK) ئەمە نابینن؟ بۆچی لەدژی ئەو وەحشییەتە بەهەموو توانستی خۆیانەوە بەئەرکی خۆیان رانابن؟ ئیدی کاردانەوەی خۆی لەبەرامبەر ئەوە بوو، واتا هەم لەدژی زوڵم و زۆری، هەمیش لەدژی ئەوەی کە لەبەرامبەر ئەو زوڵم و زۆرییە زێدە کاردانەوە نیشان نادرێت، بەو چالاکییەی خۆی ئەمەی پرۆتستۆ کرد و لەدژی ئەمە راوەستا. بەمەش خواستی کە؛ تەڤگەر، ژن، گەل و مرۆڤایەتی لەدژی ئەو زوڵم و

وەحشییەتە بخاتە نێو جموجۆڵەوە، چونكە بەو شێوەیە خۆسووتاندن (گڕ لەخۆبەردان) و لەخۆیدا سووتاندنی زوڵم، لەخۆیدا سووتاندنی ئەو مەیلەی كەوا لەبەرامبەر زوڵم ئەركی خۆی پێك ناهێنێت، چلاكییەكی هەروا ئاسان نییە و كاریگەرییەكی مەزن دروست دەكات. هەر كەس ناتوانێت گڕ لەخۆ بەربدات. بۆیە مرۆڤ دەزانێت كە ئەوەی ئەمە ئەنجام دەدات كەسێتییەكی مەزنە، كەسێتییەكە بۆ مرۆڤایەتی، بۆ ژن، بۆ گەلی كورد و هەڤاڵانی خۆی دەژیت. ئەوەی بۆ خودی خۆی ژیانێكی شەخسی بژیت و دوودڵییەكی خۆی هەبێت، ناتوانێت چالاكییەكی وەها پێشبخات، بەو چالاكییەی خۆی خواستی ئەركی هەركەسێك لەهەر كەسێك تێبگەیەنێت، تاكو هەركەس ئەركی خۆی پێك بێنێت، بۆیە ئەو چالاكییەی پێشخست. هەڵبەتە ئەو نامانەی كە پێش ئەنجامدانی چالاكییەكە نووسیبووی هەن، باسی ئەوە دەكات كە بۆچی ئەو چالاكییەی پێشخستووە. لەو نامانەیدا بانگەوازی خۆی بۆ هەموو كەسێك هەیە، بۆ ئەوەی ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆیان پێكبهێنن.

بێگومان لە باشووری مەزندا، كچێكی وەها دەربكەوێت و لەو ئاستەدا ئەو چالاكییە پێشبخات، ئەمە بۆ باشووری مەزنیش پڕ گرنگە. چونكە لە باشووری مەزندا حكومەت و پەرلەمان و قەوارەیەكی كوردان ئاوابووە، ئەوانە چەندە دەكەونە راژە (خزمەت)ی تەواوی كوردانەوە؟ هەڤاڵ "ڤیان" دەرك بەمە دەكات، دەبینێت كە ناكەوێتە راژەی هەموو كوردان. تەنانەت لەهەندێك رووەوە كێشە و گرفت بۆ بەشەكانی دیكە و بۆ تەڤگەری ئازادیخوازیش دروست دەكات. تەنانەت لەم رووەوە هوشیارییەك و هۆشدارییەكیش دێنێتە ئاراوە، رەخنەیەكیش پێشدەخات.

بۆیە چالاكی هەڤاڵ "ڤیان" چالاكییەكی مەزنە، پێویستە هەر كەسێك "ڤیان" بناسێت و لێی تێبگات، چالاكییەكەی بناسێت و تێیبگات. هەڤاڵ "ڤیان" ئەو چالاكییەی لەدژی چییدا پێشخست؟ چی پرۆتستۆ كرد؟ چی خواست؟ چۆن خواستی ئەركی هەركەسێك بە هەركەسێك بناسێنێت و تێبگەیەنێت و چۆن خستییە پێش هەركەسێكەوە؟ پێویستە هەركەس ئەمانە ببینێت، لەبەرامبەر ئەمەشدا لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی بكات (خۆی موحاسەبە بكات) كە بەراستی ئەو بەرپرسیارێتی و ئەركەی هەڤاڵ "ڤیان" بەبیری هەموو كەسێكی هێنایەوە و خستییە پێش هەموو كەسێك، چەندە لێی

تێگەیشتووە و چەندە پێکیهێناوە؟ پێویستە خۆ موحاسەبەکردنێکی بەمجۆرە بکرێت و هەر کەس راستینەی خۆی بناسێت و تێبیگات و بەرپرسیارێتی خۆی لەبەرامبەر مێژوو و ژن و ئازادی و گەلی کورد بزانێت و جێبەجێی بکات. هەڤاڵ "ڤیان" ئەمە لەهەر کەسێك دەخوازێت. وەك چۆن هەڤاڵ "ڤیان" لەکەسێتی خۆیدا (PKK)ی بەرجەستەکرد و ملیتانێتی (PKK)ی لەپراکتیکدا پێکهێنا و خواستی بەشەهیدبوونی خۆیشی هەنگاو بەتەڤگەر و گەل و ژن و مرۆڤایەتی بهاوێژێت، پێویستە هەموو کەسێکیش لەبەرامبەر هەڤاڵ "ڤیان" خۆی قەرزاربار ببینێت و قەرزی خۆیشی بەپێکهێنانی ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆی بداتەوە. ئەو کاتە هەرکەس دەتوانێت ویژدانی خۆی بحەسێنێتەوە، ئەگەر وەها نەبێت، کەس ناتوانێت ویژدانی خۆی بحەسێنێتەوە.

ئەخاسمە کەسێتییەکی بەمجۆرە و چالاکییەکی بەمجۆرە کە لەکەسێتی باشووردا بەرجەستەی کرد، ئەمە زۆر گرنگە. ئەمە لەباشووردا هەروا بەئاسانی پێشناکەوێت. چونکە رژێمی بەعس زۆر تەخریباتی لەکەسێتی مرۆڤی کورددا کردووە، لەناو ئەو تەخریباتانەدا هەڤاڵ "ڤیان" هەنگاوی هاوێشت. بێگومان وزە و توانستی ئەو هەنگاوە ئەم تەڤگەر و سەرۆکە بە هەڤاڵ "ڤیان"ی بەخشی. ئەو کەسێتییە ئەم تەڤگەرە لە هەڤاڵ "ڤیان"ی پێشخست. بێگومان ئەگەر هەڤاڵ "ڤیان"یش بۆ ئەوەی ئەو کەسێتییە لەخۆیدا پێکبهێنێت بەدڵ کاری نەکردبایە، ئەم تەڤگەرە نەیدەتوانی ئەم کەسێتییە لەو هەڤاڵەدا بنیاد بنێت. کەواتە ئەو هەڤاڵەش خواستی ئەو کەسێتییە پێك بهێنێت، ئەم تەڤگەرەش بۆ ئەوەی ئەو کەسێتییە لەو هەڤاڵەدا پێکبهێنێت کاریکرد، لەئاکامی ئەوەدا ئەو کەسێتییە خوڵقا.

(PKK) کەسێتی بەمجۆرە بۆ کوردان و بۆ مرۆڤایەتی دەئافرێنێت. تاکو ئێستا کامە ژن بۆ ئازادی خۆی سووتاندووە؟ لەمێژووی باشووری کوردستاندا یەکەمین جارە ئەمە روودەدات، تەنانەت دەتوانم بڵێم لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، لەوانەیە تاك تاك روویدا بێت، بەڵام لەمێژووی کورداندا چالاکییەکی ئەوازەیە، ئەوەی لەمێژووی گەلانی دیکەدا تاك تاك رووید بێت، ئێستا لە کۆمەڵگای کورددا ئاسایی بووە، لەزۆربەی هەرە زۆری مرۆڤی کورددا ئەمە پێشدەکەوێت. ئەمە کولتوورێکی نوێیە، ئەخلاقێکی نوێیە، ئیدی

ئەمە ئاواکردنی کەسێتی و کۆمەڵگایەکە لەسەر کولتوورێکی نوێ و ئەخلاقێکی نوێ.
ئیدی راستینەی ژنی کوردیش راستینەی "ڤیان"ە، "ڤیان" لەکەسێتی خۆیدا راستینەی ژنی کوردی خستەڕوو، واتا بۆ ژنی کورد لەدەرەوەی ئازادی ژیانێکی دیکە نییە، پێویستە لەژیانی ساختەدا، ژیانێك کە هەر رۆژ ژن دەکوژێت و هەر رۆژ دایدەرووخێنێت خۆی رزگاربکات، خۆی خاوێن بکاتەوە، ئیدی "ڤیان" خۆی لەو ژیانە دەرخست و خۆی پاککردەوە، ئەوەی خستەڕوو کە ژنی کورد کامە رێگا بۆخۆی بەبنەما وەربگرێت، بەکامە رێگا خۆی پاك بکاتەوە و خۆی بگەیەنێتە کەسێتی خۆی و ئیرادەی خۆی و ناسنامەی خۆی؟ بۆیە پراکتیکبوونی خۆی مەزن ئافراند، مەزن ژیا، ئیدی ئەگەر ئەمڕۆش "ڤیان" دەژی و نەمرە لەبەر ئەوەیە. "ڤیان" خۆی نەمر کرد، بۆیە "ڤیان" نامرێت. لەکەسێتی خۆیدا هەم ژنێتی باوی کوشت، هەم کۆیلایەتی کوشت، هەمیش مردنی کوشت. بۆیە مەزن ئافرا و مەزن ژیا، ئیدی هەر کەسێك دەخوازێت "ڤیان" بناسێت، پارتی ئەو، ئایدیۆلۆژیای ئەو، سەرۆکی ئەو بناسێت.
تاکو ئەم تەڤگەرە هەبێت "ڤیان" هەمیشە دەژیت و نەمر دەبێت. ئەم تەڤگەرە هەمیشە "ڤیان" دەکاتە هۆکارێك کە ژن مەزن بکات، گەل مەزن بکات، ئازادی و عەدالەت مەزن بکات، "ڤیان"یش دەیزانی کە نزیکبوونەوەی ئەم تەڤگەرە لەسەر ئەو ‌ەمایەیە، هەڵبەتە بۆیە ئەو کەسێتییەی بەبنچینە وەرگرت. بێ دوودڵی بۆ ئازادی، بۆ ‌ـری شەهیدبوونی دایە پێشخۆی. چونکە ئەو چالاکییەی پێشیخستووە بەتەواوی لەپێناو ئازادی دایە، لەدژی زوڵم و وەحشییەت و کۆیلایەتییە، رەتکردنەوەی ئەمانەیە. دەیزانی کە ئەم تەڤگەرە یەکێك لەدژی زوڵم و کۆیلایەتی رابوەستێت و بۆ ئازادی بژیت و بمرێت دەیکاتە بناخەیەك بۆ خۆی و هەمیشە تەڤگەر لەسەر ئەو بنەمایە ژن و گەل و مرۆڤایەتی پێشدەخات، بۆیە بە باوەڕییەکی مەزن ئەو چالاکییەی خستەپێشخۆی، واتا باوەڕی خۆی بە هەڤاڵی خۆی و بە تەڤگەری خۆی و بە گەلی خۆی بەهێزە کە ئەو چالاکییە مەزنتریش بکەن و لەسەر ئەو بنەمایە ئیرادەی خۆیان و ناسنامەی خۆیان و کەسێتی خۆیان مەزن دەکەن، لەو باوەڕییەوە ئەو چالاکییەی پێشخست. هەڵبەتە راستینەی ئەم تەڤگەرەش ئەوەیە. "ڤیان" دەبێتە بناخەی ئەم

تەڤگەرە و ئەم گەلە، تا ئەم تەڤگەر و گەلە هەبن لەسەر راستینەی ڤیان بەڕێوە دەچن...

**دوای شەهیدبوونی هەڤاڵ ڤیان بەچەند رۆژێك ئەلەفتەریای کچە یۆنانی لە یۆنانستانەوە چالاکییەکی بەهەمان شێوەی ئەنجام دا. ئەو چالاکییەی ئەلەفتەریا جیا لەهەموو چالاکییە پرۆتستۆییەکانی دیکە واتا و شرۆڤەی زۆر هەڵدەگرێت... لێرەدا چالاکییەکەی ئەلەفتەریا چۆن شرۆڤە و لێکدانەوەی بۆدەکرێت؟**



شەهید روناهی (ئاندرەئولف) بەرەگەز ئەڵمان

"**ئەلەفتەریا**" ژنێکی یۆنانی بوو، شووی کردبوو و دوو منداڵی هەبوو، بۆ سەرۆك ئاپۆ و (PKK) و گەلی کورد خۆی سووتاند. بێگومان چالاکییەکەی "**ئەلەفتەریا**" واتایەکی مەزنی خۆی هەیە، چونکە لەپیلانگێڕییە نێودەوڵەتییەکەی (١٥)ی شوباتی (١٩٩٩)دا دەوڵەتی یۆنان رۆڵێکی زۆر خراپی بینی. واتا ئەگەر پیلانگێڕییەکە لەپراکتیکدا پێکهات لێرەدا رۆڵی یۆنانستان مەزنە. چونکە لەدەرچوونی سەرۆك لە سوریاوە و چوونی بۆ یۆنانستان، یۆنانستان سەرۆکی بانگهێشت (دەعوەت) کردبوو، سەرۆك بەو دۆستایەتییە باوەڕی کرد و چووە یۆنانستان، کاتێك کە چووە یۆنانستان بێگومان یۆنانستان خاوەنداری لە سەرۆك نەکرد.

بێگومان مێژووی یۆنانستان دەزانرێت کە بە پیلانگێڕێتی بەناوبانگە و لەم رووەوە زۆر حیکایەت و داستانی ئەوانیش هەیە، لەم بارەیەوە بەناوبانگن. واتا کارەکتەری یۆنان کەمێك لەمێژووی خۆیەوە دێت. بۆیەش کارەکتەرێکە پیلانگێڕێتی بەبناخە وەردەگرێت و لەسەر پیلانگێڕێتی دەژیت، دووڕوویی، درۆ، هەڵخەڵەتاندن، فرۆشتن و هەموو شتێك لەو کارەکتەرەدا هەیە. ئیدی لەپیلانگێڕی نێودەوڵەتی دژی سەرۆك ئاپۆشدا یۆنانستان خاوەندارێتی لەمێژووی خۆی کرد، خاوەندارێتی لەکارەکتەری خۆی د. بۆیە ئەگەر ژنێکی یۆنانی لە یۆنانستان دەربکەوێت و بۆ سەرۆك ئاپۆ و (PKK) و ی کورد خۆی بسووتێنێت ئەوا زۆر گرنگە. هەڵبەتە ئەمە وەڵامێکە بۆ خیانەتی دەوڵەتی یۆناستان، بەم چالاکییە "**ئەلەفتەریا**" خیانەتی دەوڵەتی یۆنانستانی لەخۆیدا سووتاند و تواندەوە. ئەو چالاکییەی هەر تەنیا لەدژی خیانەتی دەوڵەتی یۆنانستان نەبوو، بەڵکو لەدژی خیانەتی کورد، لەدژی هەموو ئەو خیانەتانەی لە گەلی کورد دەکرێن، لەدژی ئەو پیلانگێڕییانەی لەدژی گەلی کورد و سەرۆکی گەلی کورد دەکرێت ئەو چالاکییەی ئەنجام دا. بێگومان ئەو جۆرە چالاکییە، تا چالاکییەکەی "**ئەلەفتەریا**" زێدەتر لەنێوان کوردان و لەنێو تورکان دەرکەوتووە، ئەمە یەکەمجارە کەوا لەمیللەتێکی دیکە چالاکییەکی بەمجۆرە پێشبکەوێت. بێگومان ئەگەر ئەوانە لە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) و گەلی کورددا خۆیان نەبینیایە، کەسێتی و ناسنامە و ئیرادەی خۆیان نەبینیبایە، ئومێد و باوەڕی و خەیاڵی خۆیان نەبینیبایە، وادیارە ژنێکی یۆنانی و

خاوەن دوو منداڵ بەمشێوەیە خۆی نەدەسووتاند و وەها لەخۆیدا خیانەتی نەدەتواندەوە.

ئێمە "**ئەلەفتەریا**"مان نەدەناسی و هیچ كاتێك ئێمە پەروەردەشمان نەكردبوو و هیچ توانستێكیشمان پێی نەداوە، بەڵكو بە توانستی خۆی چەندە لە **سەرۆك ئاپۆ** و تەڤگەری ئازادیخوازی گەلی كورد تێگەیشتووە، ئەوا هەمووی هەر بەتوانستی خۆی تێیگەیشتووە، بەتەواوی بەتوانست و هێزی خۆیەوە خۆی پێگەیاندووە، نە ئێمە پەروەردەمان كردووە و نە ئێمە توانستێكمان پێی داوە، نە كادیرێكی تەڤگەریش بوو، بێگومان ئەگەر كەسێك كادیری ئەم تەڤگەرە نەبێت و هەم كوردیش نەبێت و ژنێكی یۆنانی بێت، وەها بەتوانستی خۆی لەم تەڤگەرە تێبگات، بەگوێرەی ئەو توانست و تێگەیشتنەی خۆیشی لەو ئاستە بەرزەدا چالاكییەكی بەمجۆرە پێكبێنێت و خاوەنداری لە سەرۆك و تەڤگەر و گەلی كورد بكات و لەدژی هەموو هێرشێك و خیانەتكارییەك رابوەستێت و لەجەستەی خۆیدا هەموو ئەو خیانەت و هێرشانە بسوتێنێت بێگومان واتایەكی مەزنی خۆی هەیە.

هەر كەسێكی كوردی خاوەن ویژدان دەتوانێت لەمە ئەنجام بۆخۆی هەڵبهێنێت، نەك هەر تەنیا كادیرانی ئەم تەڤگەرە بەڵكو كەسانی وڵاتپارێزیش دەتوانن لە "**ئەلەفتەریا**" بڕوانن كە چۆن مرۆڤ لەدژی دووژمنی خۆی رابوەستێت، لەدژی خیانەت رابوەستێت، كە چۆن خاوەندارێتی لەوڵات و گەل و ناسنامە و ئیرادە و كەسێتی و ئازادی خۆی بكات، چۆن ئەرك و بەرپرسیارێتی خۆی جێبەجێ بكات، دەتوانێت لەم رووەوە ئەنجام دەربخات. ئەگەر ژنێكی یۆنانی خاوەنی دوو منداڵ لەپێناو كوردان و ئازادی كوردانداا خۆی دەسوتێنێت ئەوا پێویستە هەر مرۆڤێكی كورد لەدژی دووژمنی خۆی و خیانەت خۆی بكاتە تۆپێك ئاگر. ئەگەر "**ئەلەفتەریا**" بۆخۆی بەبنەما وەربگرێت و ئەنجامی بۆخۆی لێ هەڵبهێنجێت، زێدە زانایی و ئەزموونیشی پێوست ناكات. تەنیا لەو بڕوانێت دەتوانێت بەئاسانی ئەوە ببینێت كە چۆن بژیت؟ چۆن كار بكات؟ چۆن خاوەندارێتی لەئازادی و لەخودی خۆی بكات و چۆن لەدژی دووژمن رابوەستێت. بۆیە چالاكییەكەی "**ئەلەفتەریا**" زۆرگرنگە.

ئەگەر ژنێكی یۆنانی لەپێناو ئەم تەڤگەر و سەرۆكە خۆی دەسووتێنێت كەواتە لەو سەرۆكەدا خۆی و ئازادی و ئومێدی خۆی دەبینێت، بۆیە ئەو چالاكییە ئەنجام دەدات.

ئەگەر وەها نەبێت بۆچی خۆی وەها دەسووتێنێت؟ لەمێژوودا شتێکی بەمجۆرە هیچ نەبینراوە، کەواتە لەو سەرۆکەدا ئازادی، ئازادی ژن، ئازادی گەلان دەبینێت، لەو سەرۆکەدا سەرکەوتن دەبینێت، دەبینێت کە ئەو سەرۆکە لەدژی هەموو جۆرە زوڵمێك رادەوەستێت، بۆیە بۆ ئەو سەرۆکە خۆی دەسووتێنێت. بۆچی بۆ یەکێکی دیکە ئەو چالاکییەی پێشنەخستووە؟ ژنێکی یۆنانییە، ئەگەر ئامانجێکی مەزنی لەپێشدا نەبێت، بۆچی بۆ کەسێکی یۆنانی یان کەسێکی دیکە خۆی ناسووتێنێت، بۆ سەرۆك ئاپۆ خۆی دەسووتێنێت؟ پێویستە هەموو مرۆڤێك کە خوازیاری ئازادی و دیموکراسییە، خوازیاری بەدیهێنانی ناسنامە و ئیرادەیە لەسەر ئەوە بەجددی راوەستە بکات و بۆخۆی ئەنجام هەڵبهێنجێت، کە چۆن بژیت و چۆن نەژیت؟ چۆن لەدژی زوڵم و خیانەت رابوەستێت؟ دەتوانێت لەم چالاکییەدا دەرکی پێبکات.

چالاکییەکەی "ئەلەفتەریا" نەك تەنیا بۆ گەلی کورد بەڵکو بۆ مرۆڤایەتیش گرنگە و مەزنە. بۆیەش گەلی کورد هیچ کاتێك "ئەلەفتەریا" لەیاد ناکات، "ئەلەفتەریا" لەدڵی گەلی کورددا جێیەکی مەزنی بۆخۆی کردەوە، لەدڵی مرۆڤایەتیدا جێیەکی مەزنی بۆخۆی کردەوە، بووە مێژوویێك، بووە پێوانە و کولتوور و ئەخلاقێك. مرۆڤایەتی و گەلی کورد و (PKK) قەرزارباری "ئەلەفتەریا"ن. پێویستە ئەو قەرزەی خۆیان بدەنەوە، مرۆڤایەتی ئەو قەرزە دەداتەوە یان نا، من ئێستا ناتوانم شتێك بڵێم، بەڵام گەلی کورد و (PKK) بۆ ئەوەی ئەو قەرزەی خۆیان بدەنەوە هەمیشە "ئەلەفتەریا" بۆخۆیان بەبنچینە وەردەگرن. "ئەلەفتەریا" خەتێکی دایە پێش ئێمە، پێوانەیەکی دایە پێش ئێمە، بۆ ئەوەی ئێمە هەمیشە لەسەر ئەو بنەمایە بژین، لەدەرەوەی ئەمە هیچ کاتێك ژیانێکی دیکە بەشایستەی خۆمان نابینین و لێیشی نزیك نابینەوە.

لێرەدا پێویستە دەرك بەم راستییە بکرێت کە تەڤگەری (PKK)، تەڤگەرێك نییە هەر تەنیا ئازادی گەلی کورد بەبناخە وەربگرێت، خۆی تەڤگەرێکی ئازادییە، لەبەر ئەوەی تەڤگەرێکی ئازادییە، کەواتە کەسێك ئازادیخواز بێت و دەخوازێت بۆ ئازادی کاربکات و دەیەوێت ئەو تەڤگەرە بناسێت، نەك تەنیا هەر کورد، بەڵکو سەرنجی هەرکەسێك بۆ لای خۆی رادەکێشێت. بۆیە زۆر کەس لەدەرەوەی کوردان لەم تەڤگەرەدا بەشدار دەبن. هەر لەدەستپێکەوە تارۆژی ئەمڕۆ زۆر شەهیدی (PKK) هەیە کە بەرەگەز کورد نین و

لە نەتەوەی ترن. ئیدی ئەمە کارەکتەری ئەم تەڤگەرە نیشان دەدات. ئەگەر تەڤگەری (PKK) تەنیا تەڤگەرێك بۆ کوردان بووایە، ئەوا لەدەرەوەی کوردان کەسێکی دیکە بەشداری تێدا نەدەکرد، لەوانەیە ئێستا هەندێك کەس بەشدارییان تێدا بکردبایە. بەڵام کاتێك مرۆڤ لەمێژووی (PKK) بڕوانێت، دەبینێت کە هەر تەنیا لەئێستاوە چەند کەسێك بەشدارییان تێدا نەکردووە، بەڵکو زۆر کەس لە گەل و نەتەوەکانی دیکە بەشدارییان تێداکردووە و تەڤلیبوونە و خەبات و تێکۆشان لەنێو ئەم تەڤگەرەدا دەکەن و لەنەتەوە و گەلانی دیکەن، لەواندا شەهید و کەم ئەندام بوونە.

بۆچی تەڤگەرەکانی دیکەدا ئەم هەموو کەسە لە نەتەوە و گەلانی دیکەیان تێدا بەشدار نەبووە، بەڵام لە تەڤگەری (PKK)دا جێیان گرتووە و تەڤلی بوونە و دەبن؟ چونکە لەم تەڤگەرەدا ئازادی خۆیان و سەرکەوتنی خۆیان دەبینن، ئومێد و خەیاڵی خۆیان دەبینن. بەم تەڤگەرە ئینسانییەتی خۆیان بەدەست دێننەوە، بۆیە تەڤلی ئەم تەڤگەرە دەبن. هەر لەدەستپێکدا کاتێك سەرۆك ئاپۆ بەتەنیا هەنگاوی هاوێشتبوو لەگەڵ سەرۆکدا هەردوو هەڤاڵ "حەقی قەرار" و "کەمال پیر" جێگەیان تێدا گرتبوو، بێگومان هەردووکیشیان کورد نەبوون و لەکوردستانیش نەژیابوون. چونکە هەر لەسەرەتاوە ئەو سەرۆك و تەڤگەرەی سەریانهەڵدا سەرۆك و تەڤگەرێکی میللیگەرایی نەبوون، سەرۆك و تەڤگەرێك نەبوون بەزیهنییەتێکی بەرتەسك بیر بکەنەوە، هەر لەسەرەتاوە سەرۆك ئەوەی خستبووە پێشخۆی کە چۆن بتوانێت کێشەی مرۆڤایەتی چارەسەر بکات؟ بۆیە سەرنجی "حەقی قەرار" و "کەمال پیر"ی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. ئەگەر سەرۆك ئاپۆیان وەك سەرۆکێك کە ئازادی بەبناخە وەردەگرێت نەبینیبایە ئەوا هیچ کاتێك لەگەڵ سەرۆکدا شوێنیان نەدەگرت.

دوای ئەوەش ئەگەر زۆر کەس هەڤاڵێتی سەرۆکیان کرد و تەڤلی ئەو تەڤگەرە بوون و بێ دوودڵی کەوتنە نێو خەبات و شەڕەوە و شەهیدبوون و بریندابوون و کەمئەندام بوون و هێشتاش لەنێو تەڤگەردا زۆرن و خزمەت دەکەن و بەردەوامن لە تێکۆشاندا هەروا بێ هۆ نییە. چونکە لەم تەڤگەر و سەرۆکەدا زیهنییەتێکی نوێیان بینی، ویژدانێکی نوێیان بینی، ئەو ئینسانییەتیان بینییەوە کە زۆر تایبەتمەندی خۆی لەدەستدابوو. بینیان کە ئەم تەڤگەرە نوێنەرایەتی مرۆڤایەتی دەکات، ئەو

مرۆڤایەتییەی کەوا کەوتۆتە ژێر پێیانەوە و دەخوازێت لەژێر پێیانی رزگاربکات، ئەو ئینسانییەتەی کەوا زۆر تایبەتمەندی لەدەستداوە، جارێکی دیکە ئەو تایبەتمەندییانەی بۆ دەگەڕێنێتەوە، ئەمەیان بینی، بینیان کە ئەم تەڤگەرە دەخوازێت کێشە مرۆڤایەتییەکان؛ کێشەی ئازادی، دیموکراسی، یەکسانی، عەدالەت و ئاشتی چارەسەر بکات... بینیان ئەوانەی کە لەم تەڤگەرەدا جێدەگرن بۆ بەرژەوەندی خۆیان جێناگرن. بەڵکو بەتەواوی بۆ ئازادی و ئازادی مرۆڤایەتی جێدەگرن، ئیدی ئەڵقەی دواییش "ئەلەفتەریا"یە، ژنێکی یۆنانییە و خاوەن دوو منداڵە و نە پەروەردەیەکی ئەم تەڤگەرەی بینیوە و نە تەڤگەر توانستی پێداوە، بەڵکو بەگوێرەی توانست و دەرفەتی خۆی بیستوویەتی و لێکۆڵینەوەی کردووە، ئیدی چەندە لێی تێگەیشتووە ئەوەندەش لەسەر ئەوە مەزن رابوو، مەزن ژیا. ئەگەر "ئەلەفتەریا" لەم تەڤگەر و سەرۆکەدا ئازادی ژن و ئازادی گەلان و مرۆڤایەتی نەبینیبایە، وادیارە لەم تەڤگەرە نزیک نەدەبووەوە، بۆ ئەم سەرۆکەش بەوجۆرە خۆی نەدەسووتاند و خۆی نەدەتواندەوە. کەواتە لەم تەڤگەرەدا سەرکەوتنی بینیوە و خۆی بینیوەتەوە. لەپێناو ئەم تەڤگەرەدا ئەو چالاکییەی ئەنجام داوە. ئەمەش سەلماندنی ئەوەیە.

بۆیە تادێت ئەم تەڤگەرە سەرنجی مرۆڤایەتی رادەکێشێت، هەرکەس دەخوازێت زیاتر لەم سەرۆك و تەڤگەرە تێبگات. چونکە لەمێژوودا کەسێك بۆ کەسێکی دیکە خۆی نەسووتاندووە، تەنانەت بۆ پێغەمبەرەکان کەس خۆی نەسووتاندووە، بۆ سەرۆك ئاپۆ نزیکەی سەد کەس کە لەنێوانیاندا کورد هەیە، تورك، عەرەب، ئەرمەن، زۆر کەس کە لەنەتەوە و گەلی دیکەن خۆیان سووتاندووە. هەرکەس دەخوازێت لەمە تێبگات، تا لێی تێدەگات دەبینێت لەخۆی تێدەگات، چەندەش لەخۆی تێبگات ئەوەندە لە سەرۆك ئاپۆ و فیکر و فەلسەفەکەی تێدەگات. ئیدی گەلان ئەوانەی ئازادی، دیموکراسی، عەدالەت و یەکسانی دەخوازن ئەم تەڤگەر و سەرۆکە بۆخۆیان ئومێدێك دەبینن. ئەوانەی سەردەست، داگیرکەر و خوێنڕێژیشن هەموویان ئەم تەڤگەرە و ئەم سەرۆکە بۆخۆیان بەمەترسی دەزانن. هەم دووژمنایەتی بۆ ئەم تەڤگەرە پەرەدەسێنێت، هەمیش دۆستایەتی و باوەڕی بۆ ئەم تەڤگەرە پەرەدەسێنێت، لەنێو سەرمایەداران و چینی سەردەستدا دووژمنایەتییەکی مەزن پێشدەکەوێت. بۆیە جڤاکی خوارەوە، ژێردەستان و

زوڵملێکراوان، جا چ چین و توێژ بن، یان ڕەگەز و نەتەوە بن، بۆ ئەوانەش دەبێتە ئومێدیکی مەزن. ئێستا ڕاستینەی ئەم تەڤگەرە وەهایە، بەو شێوەیەش دەرکەوتۆتە ڕوو، هەر کەسێك بەگوێرەی ئەم ڕاستییە یان لێی نزیك دەبێتەوە یان دووژمنایەتی دەکات. ئەوانەی بۆخۆیان وەك ئومێدێکی دەبینن، ئەوا لەگەڵ ئەم تەڤگەرەدا جێدەگرن، ئەوانەش کە ئەم تەڤگەرە بۆخۆیان بەمەترسی دەزانن ئەوا دووژمنایەتی ئەم تەڤگەرە دەکەن. بۆیە ئەگەر ئێمە دەخوازین پێوانەیەك بۆخۆمان دروستبکەین، ئەمە پێوانەیەکە، کێ دووژمنایەتی دەکات و کێ دۆستایەتی دەکات، لێرەدا پێویستە جیاوازی بکەین، ئەوەی دووژمنایەتی دەکات مرۆڤ دەزانێت کە دووژمنایەتی گەلی کورد و گەلان و مرۆڤایەتی دەکات، دووژمنایەتی ئازادی و دیموکراسی، عەدالەت و ئاشتی دەکات. ئەمە لەشەخسی ئەو تەڤگەرەدا هێندە ڕوونبۆتەوە، ئەم تەڤگەرە ئەمە زیاتر ڕووندەکاتەوە، ئەو جیاوازییە زیاتر یەکلایی دەکاتەوە.

**ئێستا تەڤگەری (PKK) یەکلایەنە ئاگربەستی ڕاگەیاندووە، زۆر قسە و باس لەسەر ئەو ئاگربەستە دەکرێت. بیرۆکەی ئەو ئاگربەستە لەبنەڕەتدا لەکوێوە دەستیپێکرد؟ تائێستا هەڵوێستی هێزە دەرەکییەکان، هەرێمییەکان و تورکیا لەم ئاگربەستەدا چۆن بووە؟ هەروەها ئێستا ئەو ئاگربەستە گەیشتۆتە چ خاڵێك و چی لەگەڵ خۆیدا هێناوە؟ چاوەڕێ دەکرێت بگاتە چ خاڵێك؟ ئایا ئەم ئاگربەستە دوای ئەزموونی چەندین ئاگربەستی ڕابردوو، شانسی ئەوەی هەیە کە بگاتە ئاشتییەکی هەمیشەیی و هەنگاوێك بۆ چارەسەری کێشەی کورد؟**

ئەم تەڤگەرە لەساڵی (١٩٩٣)وە دەستی بەئاگربەست کردووە. تاکو ئێستا پێنج جار یەکلایەنە ئاگربەستی راگەیاندوە. ئەمە چی دەخاتەڕوو؟ ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەم تەڤگەرە شەڕ ناخوازێت و نایەوێت کێشەی گەلی کورد بە شەڕ چارەسەر بکات، بەڵکو دەیەوێت بەرێگەی دیالۆگ و بەرێگەی سیاسی و دیموکراتییانە چارەسەری بکات. ئەگەر ئەو پێنج جارە یەکلایەنە ئاگربەست پێشدەخات بۆ ئەم مەبەستەیە. ئەگەر بیخواستبایە کێشەکەی بە شەڕ چارەسەر بکردبایە، هێندە یەکلایەنە ئاگربەستی پێشنەدەخست. ئەمە راستینەی ئەم تەڤگەرەش دەخاتەڕوو، راستینەی دەوڵەتی تورکیاش ئاشکرا دەکات، کە دەوڵەتی تورکیا ناخوازێت کێشەی کورد بەدیالۆگ و بەرێگەی سیاسی و دیموکراتییانە چارەسەر بکات، بەڵکو دەیەوێت بە نکۆڵی و کومەڵکوژی و لەناوبردن و ژینۆساید و تواندنەوە (ئاسمیلاسیۆن) چارەسەر بکات.

لێرەدا ئەگەر ئەم ئاگربەستەی ئێستا کەوا سەرۆك پێشیخست لەبەرئەوە بوو کە گەلێك هێز و لایەن داوایان کردبوو، بۆیە لەسەر ئەو بنەمایە سەرۆك ئاپۆ ئەم ئاگربەستەی پێشخست. چونکە سەرۆك پێداگری لەسەر چارەسەری کێشەی گەلی کورد بەرێگەی سیاسی دەکات. بۆ ئەم مەبەستە هەوڵ و کاری زۆر جددی کردووە. کاتێك کە زۆر هێز و لایەنیش؛ لەوانە هێزە کوردییەکانی باشوور (ی ن ك ـ پ د ك)، هەروەها ئەمریکا و ئەوروپاش داوایان کرد، لەناو تورکیاشدا هەم هێز و لایەنە سڤیلەکان، هەمیش هەندێك دامودەزگای ناو دەوڵەت، هەموویان داوای ئاگربەستیان کرد، و گووتیان: " ئەگەر ئاگربەستێك رابگەیەندرێت ئەوا ئێمەش بۆ چارەسەری کاردەکەین" هەروەها هەر تەنیا داوای ئاگربەستیان نەکرد، بەڵکو بەڵێنیشیان دا کە بۆ چارەسەریش کاربکەن، ئەو گووتنانەیان کرد و ئەو بەڵێنانەیان دا. لەسەر ئەو بنەمایەش سەرۆك ئاپۆ ئاگربەستی راگەیاند.

## نزیکبوونی ئەو هێز و لایەنانە دوای راگەیاندنی ئاگربەستەکە چیبوو؟

دوای ئەوەی ئاگربەستەکە راگەیەندرا، ئەوا هەموویانی مورتاح کرد (حەساندەوە) و دڵخۆشی کردن. بەڵام بۆ ئەوەی ئاگربەستەکە پێشبکەوێت و ببێتە دوو لایەنە و کێشەکە بکەوێتە سەرڕێی چارەسەری هیچیان نەکرد. ئەوانەی کە ئاگربەستیان دەخواست و دەیانگووت:" ئەگەر ئاگربەست رابگەیەنن ئەوا ئێمە بۆ چارەسەری کار دەکەین..." دوای ئەوەی ئاگربەستەکە راگەیەندرا هەموویان بێدەنگ بوون، هەموویان بەئەرك و کاری دیکەوە خۆیان خەریك کرد.

کەواتە بۆچی ئەو هێز و لایەنانە داوایان کرد کە سەرۆك ئاپۆ ئاگربەستێك رابگەیەنێت؟ ئەگەر مرۆڤ لەنزیکبوونەوەی ئەوانە لەدوای راگەیاندنی ئاگربەستەکە بڕوانێت ئەوا تێدەگات بۆچی ئەو داوایەیان لە سەرۆك ئاپۆ و تەڤگەر کرد. مرۆڤ لەوە تێدەگات کە ئەو لایەن و هێزانە بینیان کە؛ تەڤگەر هەنگاوی هاوێشت، بە سەرهەڵدان و بە گەریلا بەرخۆدانێکی مەزنی پێشخست، جارێکی دیکە لەسیاسەتی خۆرهەڵاتی ناویندا جێگە و پێگەیەکی بەهێزی گرتەوە. چونکە ئەوان دەیانخواست لەو پێگەیەی دەربخەن، کەچی تەڤگەر پێگەی بەهێزتری گرت و کاریگەری لەسەر سیاسەتی ناوچەکە زیاتر کرد، کاریگەری لەسەر سیاسەتی زۆر هێز و لایەن کرد و بەرژەوەندییەکانی ئەوانی خستە مەترسییەوە، بۆ ئەوەی بتوانن سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەژێر مەترسییەکان دەربخەن، داوای ئاگربەستیان کرد. بۆیە کە ئاگربەستەکە راگەیەندرا هەموویانی حەساندەوە و دڵخۆشی کردن. ئیدی بۆخۆیان بەکاری دیکەوە مژوول بوون و لەسەر ئاگربەستەکە راوەستەیان نەکرد. دەوڵەتی تورکیاش بینی کە راگەیاندنی ئاگربەستەکە کەشوهەوایەکی باشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. بەڵام دوای ئەوە بینی کە ئەوانەی داوای ئاگربەستیان کردووە، تەنیا داوای ئاگربەستیان کردووە، واتا بۆ ئەوەی کێشەکان چارەسەر ببێت هیچ هەنگاو ناهاوێژن، تەنانەت ئەوانەی کە دەخوازن ئاگربەستەکە پێشبکەوێت و بیگەیەننە چارەسەری، زۆر کەم و لاوازن، ئیدی هەوڵیاندا بۆ ئەوەی ئەو کەشوهەوایە کپ بکەنەوە، چۆن ئاگربەستەکە بێکاریگەر بکەن؟ چیبکەن تاکو بتوانن زەبر لەتەڤگەر بدەن؟ ئەومیان بەبنەما وەرگرت. ئەگەر ئەو هێز و لایەنانەی داوای ئاگربەستیان کردبوو خاوەنداریان لێبکردبایە و بۆ چارەسەری هەوڵ و

تەفەللایان بدابایە، ئەوا کێشەکە دەکەوتە سەرڕێی چارەسەری. واتا هێزێکی مەزنی ئەوتۆی تورکیا نییە کە لەدژی ئەو ئاگربەستەی ئێمە رابوەستێت.

بەڵام ئەوەی لەسەر سیاسەتی تورکیا باڵادەستە سوپای تورکیایە، ئەویش بینی کە ئەوانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان ئاگربەستەکە دەخوازن نەك بۆ چارەسەری، ئەوانەی چارەسەری دەخوازن زۆر کەم و لاوازن، بۆیە بینی هەر خۆی باڵادەست و بەهێزە، ئەگەر لەدژی ئاگربەستەکە رابوەستێت ئەوا دەتوانێت ئاگربەستەکە بێکاریگەر بکات و ئەو کەشوهەوایەی ئاگربەستەکە دروستیشی کردووە تێکی بدات. سوپای تورکیا لەلایەك لەمە سوودمەند بوو، لەلایەکی دیکەشەوە بینی کە ئێران و سوریاش پشتیوانی لەسیاسەتی سوپای تورکیا دەکەن، سوریا و ئێرانیش ناخوازن کێشەکە چارەسەر ببێت. چونکە ئەگەر کێشەکە چارەسەر ببێت، ئەوا لەوانەیە تورکیا لەدەست بدەن و هاوپەیمانێتی و رێککەوتی نێوانیان تێك بچێت و تورکیا بەتەواوی بەرەو لای ئەمریکا بڕوات، ئەمەش بۆخۆیان بە مەترسیدار دەزانن، بۆیەش پێویست دەکات ئاگربەستەکە پێشنەکەوێت، چارەسەری پێشنەکەوێت، پێویست دەکات شەڕ بەرپا ببێتەوە، کە شەڕیش بەرپا بووەوە تورکیا لەو رێککەوتن و هاوپەیمانێتییەیان دوور ناکەوێتەوە. بۆیە ئێران و سوریاش لەپشت سیاسەتی سوپای تورکیا راوەستان، سوپای تورکیا و ژەنراڵەکانی ئەوانیش ئەمەیان بۆخۆیان وەك هێزێك و پشتیوانییەك دەبینی. هەروەها سوپای تورکیا دەیبینی کە ئەمریکا لەئێراق موحتاجی تورکیایە، بۆ ئەوەی پرۆژە و سیاسەتی خۆی لە ناوچەکە پێشبخات موحتاجی تورکیایە و پێویستی پێی هەیە، ئەو کاتە دەتوانێت لەم رووەوە ئەمریکاش بۆ لای سیاسەتی خۆی رابکێشێت، دەتوانێت ئەوروپاش رابکێشێتە نێو سیاسەتی خۆیەوە، ئەو کاتە پێویست نییە هەنگاو بۆ چارەسەری بنێت، دەتوانێت لەسەر ئەو سیاسەتی نکۆڵی و لەناوبردنەی پێشتر پەیڕەوی کردووە بەردەوام ببێت و بیگەیەنێتە سەرکەوتن. سوپای تورکیا ئەمەی بەبنەما وەرگرت. لەسەر سەرۆك ئاپۆ و دامودەزگا دیموکراتی و مەدەنییەکان لە تورکیا و لە کوردستاندا، هەروەها لەسەر گەل و گەریلا ئۆپەراسیۆن، فشار و گوشار، کوشتن و ئەشکەنجەی خۆی بەردەوام بوو و زیاتر پەرەی پێدا، تاکو بتوانێت رێ لەبەردەم گەشەسەندنی ئەو کەشوهەوایەی ئاگربەستەکە دروستیکردووە بگرێت، هەمیش بتوانن

لەو دۆخە سوود وەربگرن و زەبر لەتەفگەر بدەن، بەمشێوەیە لەئاگربەستەکە نزیك بوونەوە. ئەو کەس و هێز و لایەنانەی دەیانخواست ئاگربەستەکە بەرەو چارەسەری ئاراستەگیر بکەن، لە ئەنقەرە کۆنفرانسێکیان سازدا، "یەشار کەمال" و ئەوانیش تەفلیبوون. لە کۆنفرانسەکەدا بڕیاری باشیشیان وەرگرت و ئومێدێکیشیان بەخشی، بەشدارانی کۆنفرانسەکە گووتیان:" ئێمە هەر تەنیا لەچوارچێوەی کۆنفرانسەکەدا نامێنینەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەو بڕیارانە بخەینە پراکتیکەوە هەوڵەکانی خۆمان بەردەوام دەکەین، واتا ئێمە خۆمان دەکەینە تەفگەرێکی ئاشتی و چارەسەری..." کاتێك کە دەوڵەتی تورکیا و سوپایەکەی بینیان تەفگەرێکی بەمشێوەیە لەناو تورکیادا پێشدەکەوێت، ئەوەیان بەمەترسی زانی، ئیدی هەوڵیان دا کە چۆن ئەو کۆنفرانسە پووچ بکەنەوە؟ هەوڵیان دەدا کە چۆن بتوانن ئەوانەی ئەو کۆنفرانسەیان سازداوە و ئەو بڕیارانەیان وەرگرتووە بترسێنێن. تاکو ئەو کارە پێشنەکەوێت و نەبێتە تەفگەرێك، بۆ ئەوەی تەنگەتاویان نەکات. ئیدی لەم چوارچێوەیەدا رۆژنامەوانی ئەرمەنی "هیرانت دینك"یان کوشت(٩) کە بەمە بتوانن کاریگەری ئەو کۆنفرانسە نەهێڵن. ئەوانەی بۆ چارەسەری کێشەکە کار دەکەن و دۆستایەتی کوردان دەکەن بترسێنن، تاکو دەستبەرداری ئەو کارە ببن، ئەو تاوانەیان بۆ ئەو مەبەستە ئەنجام دا.

هەروەها لەکاتێکدا کە مەسەلەی کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لەرۆژەڤی مەجلیسی ئەمریکا دایە، بەم کوشتنە وەڵامێکی ئەو بەرۆژەڤکردنەیان دایەوە. واتا:" ئەگەر ئێوە بەمشێوەیە خاوەندارێتی لە ئەرمەنییەکان بکەن، ئێوە بەمشێوەیە لەمەجلیسی خۆتان بڕیار وەربگرن، ئەوا ئێمەش ئەرمەنییەکان دەکوژین، ئێمە لەدژی ئێوە رادەوەستین". ئەو پەیامەیان دا. واتا" پێویستە کەس خاوەندارێتی لە ئەرمەنییەکان نەکات". بۆ ئەوەی لەمەجلیسدا بڕیار سەبارەت بە ئەرمەنییەکان و کومەڵکوژییەکەیان وەرنەگرن خواستیان رێگیری لەمە بکەن.

وەکوتریش بەکوشتنی "هیرانت دینك" خواستیان لە تورکیا شوڤێنیزمی تورك بەهێز بکەن و میللیگەرایی و نەژادپەرستی بەهێز بکەن، ئەمەش لەدژی کوردان و (PKK) بخەنەگەڕ و جموجۆڵەوە، ئامانجێکی ئەو کوشتنەیان ئەمە بوو. بێگومان کاتێك کە "هیرانت دینك"یان کوشت، ئەوانە مەزەندەی ئەوەیان نەدەکرد کە کەس بەو شێوەیە

خاوەنداریێتی لە"هیرانت دینك" بکات، مەراسیمێکی زۆر مەزنی بۆ کرا، ئەوانەی کە تەڤلی ئەو مەراسیمەبوون گووتیان:" ئێمە هەمووومان "هیرانت دینك"ین، هەمووومان ئەرمەنین" ئەمە کەشوهەوا و دۆخێکی دیکەی لە تورکیا پێشخست، ئەوانەی ئەو تاوانەیان ئەنجام دا بینیان ئەو ترسەی دەیانخواست دروستی بکەن، دروست نەبوو و ئەنجامگیر نەبوون، ئەو شۆڤێنیزمەی دەیانخواست بەو تاوانە پێشیبخەن پێشنەکەوت و تەواو بەپێچەوانەی ئەمە، ئەو تاوانەیان لەسەر ئەستۆی دەوڵەت مایەوە، لەسەر ئەستۆی میللیگەرایی تورکیا مایەوە، دەوڵەت و هێزە میللیگەراکانی زۆر تەنگەتاو کرد، وەك بڵێی لەسەر تاوان دەستگیر کرابن وابوو. لە تورکیادا هێزە دیموکراتیخوازەکان، تەنانەت هێزە لیبرالەکانیش ئەو تاوانەیان مەحکوم و ریسوا کرد، دەستیان بە موحاسەبەکردن و مەحکومکردنی میللیگەرایی تورك کرد. ئەمە چی لەگەڵ خۆیدا هێنا؟ ئەمە ئەگەر رێگیری لێنەکرێت، ئەوا دۆستایەتی مەزنیش بۆ کوردان دروست دەکات، ئەوانەی ئەمرۆ گووتیان:" ئێمە هەموو ئەرمەنین" ئەوا سبەینێش دەڵێن:" ئێمە هەموو کوردین" ئەمە مەترسییەکی مەزنە، تەنانەت لەو مەراسیمەدا گووتیشیان:" ئێمە هەمووومان کوردین"، بۆیە بینیان کە شۆڤێنیزم گورزێکی مەزن دەخوات، یەکسەر دەوڵەت و هێزە فاشیست و شۆڤێنیستەکان کەوتنە نێو جموجۆڵەوە، تاکو رێگیری لەو کەشوهەوایە بکەن و بۆ ئەوەی پێچەوانەی وەرگەرێننەوە، تاکو بتوانن دیسان ئامانجەکانی خۆیان پێکبهێنن. بۆیە ئیدی لە "دەنیز بایکال"ەوە بگرە تا دەگاتە "دەڤلەت باخچەلی" و هەموویان، ئەوانەی ناو حکومەت و دەوڵەت گووتیان:" میللیگەرایەتی بربڕەی پشتی تورکیایە" و خاوەنداریێتیان لێکرد. گووتیان:" هێرش بۆ سەر میللیگەرایی هەیە و ئێمە ئەوە پەسند ناکەین. ئەم هێرشە لەدژی دەوڵەتە، لەدژی هێزە میللیگەراکانە، ئەمە بۆ دوارۆژی کۆماری تورکیا مەترسیدارە" یەکسەر کەوتنە ناو هێرش و گوشار و فشارەوە، بۆ ئەوەی هەرکەس بێدەنگ بکەن، بۆ ئەوەی موحاسەبەی میللیگەرایەتی و دەوڵەت پێشنەکەوێت، بەمەش تەڤگەری کورد بەهێز نەبێت و چارەسەری کێشەی کورد پێشنەکەوێت. ئیدی ئەمجارە شەپۆلێکی شۆڤێنیزمی بەهێزیان بەئاشکرا پێشخست، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بترسێنن، زۆر بەئاشکرایی گووتیان:" ئێمە هیرانت دینکنین و ئێمە ئەرمەنی نین و ئێمە هەموو تورکین، هەموو کەس

تورکە، ئەوەی تورك نەبێت پێویستە نەژیت" بەئاشکرا و بێ پێچ و پەنا ئەوەی "هیرانت دینك"ی کوشت خاوەنداریتیان لێکرد، گووتیان:" ئێمە هەموو ئۆگونین"(١٠) بەمەش خواستیان کۆمەڵگا بەتەواوی بترسێنن، هێزە دیموکراتیخوازەکان بترسێنن و تەسلیمیان بکەن، ئیدی دەستیان بەهەڕەشە کردن کرد. ئەو کەسانەی بە دیموکراتیخواز دەناسرێن، هەر لە "یەشار کەمال"ەوە بگرە تا دەگاتە "ئۆرهان پاموك"(١١) و ئەوان هەڕەشەی کوشتنیان لێکردن. ئیدی لەلایەکەوە خاوەنداریتیان لەبکوژەکان کرد، لەلایەکی دیکەشەوە هەڕەشەیان لەو کەس و هێزە دیموکراتیخوازانە کرد، بۆ ئەوەی بتوانن شۆڤێنیزمی تورك بپارێزن و جارێکی دیکە زەبری بەرنەکەوێت، بەڵکو ئەو شۆڤێنیزمە لەدژی کوردان بخەنە جموجۆڵەوە.

دەوڵەتی تورکیا بەو شێوەیە و بەئاشکرا خاوەندارێتی لەشۆڤێنیزم دەکات، شۆڤێنیزم پێشدەخات و دەخوازێت زاڵی بکات. بۆیەش هەر کەسێك لەناوەوە لەدژی (PKK) و کوردان دەخاتە نێو جموجۆڵەوە، ئۆپەراسیۆنی سەربازی مەزن و فراوان دەکات، گرتن، سووکایەتی و ئەشکەنجە چڕوپڕ و بەرفراوانتر دەکات. لەدەرەوەش دەیەوێت هەموو دەوڵەتان لەدژی (PKK) بخاتە نێو جموجۆڵەوە، بینیویەتی کە ئەمریکا پێویستی پێی هەیە، ئەوروپا پێویستی پێی هەیە، هەڵبەتە هێزەکانی ناوچەکە، وەك سوریا و ئێرانیش پێویستیان پێی هەیە، دەخوازێت سوود لەمانە وەربگرێت و هەرکەس لەدژی (PKK) بخاتە نێو جموجۆڵەوە.

ئەمریکاش بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی، بۆ ئەوەی تورکیا بەلای خۆیدا رابکێشێت و رێککەوتنی نێوان تورکیا، سوریا و ئێران تێك بدات، بۆ ئەوەی بتوانێت لە ئێراق ئەنجامگیر ببێت و شالاو و موداخەلەی خۆی بۆ ئێران و سوریا پێشبخات و ستراتیژی خۆی لەخۆرهەلاتی ناوین پێك بێنێت، ئەوا (PKK) و کوردان دەکاتە قوربانی. بەمەش داخوازییەکانی تورکیا پێك دێنێت، بۆیە ئەمریکا جارێکی دیکە دەخوازێت ئەو پیلانگێڕییەی کەوا لەدژی (PKK) پێشیخستبوو بەگوێرەی هەلومەرجی نوێ رێکیبخاتەوە. ئیدی پێگەی ئەوروپای ئەو پیلانگێڕییەی دروستکرد، ئەوروپای خستە نێو جموجۆڵەوە، ئەڵمانیا کەوتە نێو هێرشەوە، فەرەنسا و بەلژیکا کەوتنە نێو هێرشکردنەوە، سەرلەنوێ دادگاییکردنەوەی سەرۆکیان پووچەڵ کردەوە، هەروەها بۆ

ئەوەی لە تورکیادا کورد لەهەڵبژاردنەکاندا سەرنەکەون ڕێژەی (٪١٠)یان دانابوو، دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا ئەوەی پەسندکرد و گووتی:" ئەمە بۆ ئارامی تورکیا پێویستە و پێشێلکردن نییە بۆ ماف مرۆڤ" زۆر بەئاشکرایی لەدژی (PKK) و سەرۆك و کوردان کەوتنە نێو جموجۆڵەوە. بەمەش هەم داخوازییەکانی ئەمریکا پێکدێنن، هەمیش داخوازییەکانی تورکیا پێکدێنن، بۆ ئەوەی بتوانن بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە تورکیا و لەرێی تورکیاشەوە، لە خۆرهەڵاتی ناوین بپارێزن.

بێگومان ئەمریکا دەیەوێت پێگەی دووەمی ئەو پیلانگێڕییەش پێشبخات، ئەم پایە و پێگەیەش لە ئێراقە و زیاتر دەخوازێت بەرێی (ی ن ك) و (پ د ك)ەوە پێشبخات. ئیدی بۆیە کۆبوونەوە لەگەڵ (ی ن ك) و (پ د ك) سازدەکەن و نێوان ئەوان و تورك کۆبوونەوە رێکدەخەن. "راڵستۆن"(١٢) هات و "مەسعود بارزانی" بینی و گووتی:" من لەسەر مەترسی (PKK) لەگەڵ مەسعود بارزانی قسەم کردووە، کە چەندە بۆ (ی ن ك) و (پ د ك) و باشوور مەترسیدارە، لەو باوەڕەدام کە قەناعەتی پێبهێنم" پاشان "نێچیرڤان بارزانی" چووە ئەمریکا، "عەبدوڵڵا گویل"یش لە تورکیاوە چووە ئەمریکا، لەوێ دیدار ئەنجام دەدەن. لێرەدا دیارە کە هەندێك هەنگاویان لەم رووەوە هاوێشتووە "ئەدیب باشەر"ی کۆردیناتۆری تورکیا(١٣) ئاخفتنێکی کرد و گووتی:" ئەگەر سوودی هەبێت ئەوا دەتوانم دیدار لەگەڵ تاڵەبانی و بارزانی سازبدەم" ئەمە لەکاتێکدا پێش ئەوە هیچ کاتێك نەیدەخواست دیدار لەگەڵ ئەوانە سازبدات و ئەوانە ببینێت. ئیدی ئەگەر ئەمرۆ کە دەڵێت:" ئەگەر سوودی هەبێت دەتوانم ئەوانیش ببینم، دیارە لە ئاخافتنەکاندا؛ لەئاخافتنی سەرانی ئەمریکا و "تاڵەبانی" و "بارزانی"دا، لەئاخافتنی "نێچیرڤان بارزانی" و "عەبدوڵڵا گویل"دا کە ئەمریکا کۆردینەی هەموویان دەکات هەندێك هەنگاویان لەم رووەوە بەرەو پێشەوە هەڵهێناوە تاکو "ئەدیب باشەر"یش لەئاخافتنی خۆیدا هەڵوێستێکی نوێ پێشدەخات. ئیدی ئەمەش ئەوە بەدیار دەخات کە پێی پیلانگێڕییەکە لەباشووری کوردستانیش واخەریکە پێشدەکەوێت، تاکو بتوانن لە ئەوروپا و لەباشووریش زەبر لە تەڤگەر بوەشێنن.

ئەم پیلانگێڕییە بەتەواوی ئەمریکا ئۆرگانیزەی دەکات. ئاشکرا بوو کە ئەو میکانیزمی کۆردیناتۆرییە بۆ ئەوە دروستبووە تاکو پیلانگێڕییەکە بەگوێرەی هەلومەرجی تازە

ڕێکبخەن و کۆردینەی بکەن. ئیدی پایە (ڤاچ)ی ئەوروپا ئەڵمانیا نوێنەرایەتی دەکات، ئەڵمانیا ئەوروپا دەخاتە نێو جموجۆڵەوە و لە ئەورووپاش هەر ئەڵمانیا کۆردینەی دەکات. لەئێراقیشدا بۆ ئەوەی بتوانن بەو شێوەیە ئەنجامگیر ببن، دەخوازن پایەی دووەمیش لە (ی ن ك) و (پ د ك) دروستبکەن. لەناوەوە فاشیزم پێشدەخەن، لەدەرەوەش بەو شێوەیە پیلانگێڕی پێشدەخەن، بۆ ئەوەی بتوانن ئەنجام بەدەستبخەن.

ئێستا نزیکبوونەوە لەئاگربەستەکە لەسەر ئەو بنەمایەیە. ئەمریکا و ئەوروپا و (ی ن ك) و (پ د ك)ش نەك بۆ ئەوەی ئاگربەست پێشبکەوێت و بەرەو چارەسەری ئاراستەگیر ببێت، هەوڵدەدەن، بەڵکو دەخوازن ئاگربەستەکە بکەنە ئامراز و ڕێگەی تەسفیەکردنی تەڤگەری (PKK)، ئێستا بۆ ئەو ئامانجە کاردەکەن. هەڵبەتە تورکیا هیچ جارێك ئاگربەستی پەسند نەکردووە، دوای ئەم ئاگربەستەش هێرشەکانی خۆی زۆر زیاتر و فراوانتر کردووە. واتا دەخوازن تەڤگەر لەناو ببەن بکەن. هەڵبەتە بۆیە ئێستا ئاگربەستەکە وەکو پێویستە بەڕێوە ناچێت. بەم حاڵەشەوە مومکین نییە ئاگربەستەکە بپارێزرێت. ئێمە تاکو ئێستا یەکلایەنە ئاگربەستمان ڕاگەیاندووە و پێداگریمان لەسەر ئاگربەستەکە کردووە، لەژێر ئەو هێرشانەشدا ئێمە بڕیاری ئاگربەستی خۆمان دەپارێزین، ئێمە دەشخوازین ئەو ئاگربەستە بپارێزرێت، بەڵام کەس ئاگربەست پەسند ناکات و هەر کەسێکیش شەڕی لەبەرامبەر (PKK) ڕاگەیاندووە. دەڵێن:" یان ئێوە تەسلیم ببن، یانیش ئێمە ئێوە تەسفیە دەکەین" ئەمەیە وەڵامی ئەوان، ئەو هەنگاوەی دەیهاوێژن بەو واتایە دێت. بێگومان تەڤگەری (PKK) خۆی دەپارێزێت، بەو شێوەیە تەسلیم نابێت، هەتاکو دواییش هەرخۆی دەپارێزێت. بۆیە ئەو پێڤاژۆیە (قۆناخە)ی پێشدەکەوێت، پێڤاژۆیەکە دەخوازرێت تێیدا تەڤگەر تەسفیە بکەن. لەهەموو شوێنێکەوە؛ هەمیش زۆر بەئاشکرا هێرش و فشار زیاتر دەکەن... تەنانەت شتێکی وەکو ئاشتی یان چارەسەری بۆ کوردان ناهێننە نێو ئەقڵی خۆشیانەوە. بیر لەوە دەکەنەوە کە چۆن لەناویان ببەن. ئەمەش ناشارنەوە و بەئاشکرا دەیڵێن:" ئێمە تەسفیەیان دەکەین". نزیکبوونەوەیان لەم ئاگربەستە وەهایە.

هەڵبەتە ئێمە چەندە هەوڵیشمان داوە تاکو ئاگربەستەکە ببێتە دوو لایەنە، وادیارە ئەمە نایەتەدی، بەڵکو دەخوازن زەبر لە تەڤگەر بوەشێنن. هەڵبەتە تەڤگەریش

ناتوانێت بەو شێوەیە پێداگری لەسەر ئاگربەستەکە بکات. ئەگەر پێداگریش بکات بێسوودە، بۆیە لەبەرامبەر ئەو هێرشانە تەفگەر و گەل خۆیان دەپارێزن.

# بەرەو لوتكەی سەركەوتن...

**دوای هەموو ئەو پرسیارانەی سەبارەت بەمێژوو و تێكۆشانی سی ساڵ زیاتری تەڤگەری (PKK) كردم؛ ئەمڕۆ داهاتووی ئەم تەڤگەرە، ئاسۆی پێشكەوتن و مەزنبوون و سەركەوتنی ئەم تەڤگەرە چۆن دەبینن؟**

ئەم تەڤگەرە بەبێ میراس دەستی بەتێكۆشان كرد، بەبێ توانست و دەستپێكرد، لەنێو نەبوونی و سەختی و دژوارییەكی مەزندا دەستپێكرد و بەتەواوی لەسەر هێز و توانستی خۆی سەریهەڵدا. هەر لەدەستپێكەوە زۆر بەدژواری و زەحمەتی سەریهەڵدا، زۆر هێز و لایەن هەر لەسەرەتاوە خواستیان ئاستەنگی لەبەردەم دەركەوتنی ئەو تەڤگەرە دروستبكەن، بۆ ئەوەی هیچ دەرنەكەوێت، ئەم تەڤگەرە پێداگری كرد، ئەو ئاستەنگییانە زەحمەتیش بن لەبەردەم خۆیدا لایبرد و دەركەوتن و پێهەڵگرتن (إنطلاقة)ی خۆی ئەنجام دا، لەو رۆژەوە تاوەكو رۆژگاری ئەمڕۆ بەردەوام لەنێو بەرخۆدانێكی مەزن دابووە، بە بەرخۆدان و توانست و هێزی خۆیەوە لەسەر پێیان مایەوە و پێشكەوت، بەردەوامیش خواستیان رێگیری لەم تەڤگەرە بكەن، بۆ ئەوەی ئەم تەڤگەرە تەسلیم وەربگرن و تەسفیەی بكەن. بەڵام ئەم تەڤگەرە نە تەسلیم بوو و نە تەسفیە بوو، تارۆژی ئەمڕۆش هاتووە. لەمەودواش هەر لەسەر هێزی خۆیی خۆی، لەسەر توانست و ئیمكانییەتی خۆی، لەسەر رۆحی خۆی بەردەوام دەبێت تا ئامانجەكانی خۆی بەدیدێنێت. ئەمە كاروانێكی ئازادییە و مێژوویێكی پڕ لەبەرخۆدانە.

بۆیەش تا ئەم کاروانە دەگاتە ئامانجەکانی خۆی شێلگیرانە هەر بەردەوام دەبێت، چ ئاستەنگی و سەختی و دژواری دەبن باببن، ئەم کاروانە هەر بەردەوام دەبێت. وەك چۆن تاکو ئێستا بەردەوام بووە، لەمەودواش هەروا بەردەوام دەبێت. بە نکۆڵی و قڕکردن و پیلانگێڕی ناتوانن هەروا ئەم تەڤگەرە تەسلیم وەربگرن و تەسفیەی بکەن. ئەم تەڤگەرە چەندە نکۆڵی لێکراوە و چەندە خواستوویانە لەناوی ببن، تەسلیم ببێت و تەسفیەی بکەن، ئەوانەی هەموو کردۆتە هۆکاری ئەوەی کە تەسلیم و تەسفیە نەبێت. بۆیەش نەیانتوانیوە ئەنجامگیر ببن. چونکە ئەم تەڤگەرە هەمیشە خۆی دەئافرێنێتەوە، لەبەر ئەوەی لەسەر هێزی خۆیی خۆی رابووە و باوەڕی بەخۆی دەکات، هەروا بەئاسانی ناتوانن تەسلیمی وەربگرن و تەسفیەی بکەن. ئەم تەڤگەرە تەڤگەرێکی وەها بەرتەسك نییە، هەر تەنیا تەڤگەری کادیران نییە، ئەم تەڤگەرە بۆتە تەڤگەری گەل، کەوتۆتە نێو دڵی گەلەوە، لەهەر چوار پارچەی کوردستان و لەدەرەوەی کوردستان، هەروەها هەر تەنیا نەکەوتۆتە دڵی کوردانەوە، بەڵکو کەوتۆتە دڵی گەلانی دیکەشەوە، کەسانی دیکەشەوە. بۆیە تەسفیەکردنی و تەسلیم وەرگرتنی ئەم تەڤگەرە زۆر دژوارە. ئیدی بۆتە تەڤگەری ملیۆنان مرۆڤ، بۆتە تەڤگەری گەلان، نەك هەر تەنیا گەلی کورد، جگە لە گەلی کوردیش زۆر کەسی دیکە لەنێو گەلانی دیکەدا جێیان تێیدا گرتووە و بەشداربوونە و ئەم تەڤگەرەیان بۆخۆیان کردۆتە ئومێدێك...

هەروەها لەرێگەی تێکۆشان و بەرخۆدانی ئەم تەڤگەرەوە رەنجێکی پڕ. مەزن ئافرێنراوە، بەهای زۆر مەزن ئافرێندراون، شەهیدبوونی زۆر مەزنی داوە، بەملیۆنان کەس کۆچبەربوونە، بەهەزارانِ گوند تێکدراون و سووتێنراون، لەباکووردا مرۆڤ نەماوە بەدەست داگیرکەرەوە ئەشکەنجە نەدرابێت، بۆیە گەل چارەنووسی خۆی لەگەڵ ئەم تەڤگەرەدا کردۆتە یەك، زۆر بەئاشکرایی ئەمەش دەبێژن:" بێ سەرۆك، بێ (PKK) ژیان نابێت" و "(PKK) گەلە و گەلیش ئێمەین" وەها دەڵێن:" هەر هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەك لە سەرۆك ئاپۆ و (PKK)، هەڵوێست و نزیکبوونەوەیە لە کێشەی گەلی کورد" ئەمانە هەرکەس بەئاشکرا و بێ پێچ و پەنا دەبێژن. ئەمریکا هێندە پیلانگێڕییەکی مەزن لەسەر تەڤگەر بەڕێوە دەبات، هەرچی دەوڵەتە ئەم دونیایە هەیە لەدژی ئەم تەڤگەرە دەخاتە جموجۆڵەوە، کەچی ناتوانێت ئیرادەکەی تێك بشکێنێت و

تەسلیمی وەربگرێت. چونکە گەلی کورد بڕیاری خۆی داوە کە بەئازادی بژیت، یانیش هیچ نەژیت. ئیدی گەلی کورد بەرێگەی ئەم تەڤگەرەوە ئەو ژیانەی کە سیستەمی کاپیتالیزم، داگیرکەران و بەکرێگیراوانی کورد بەسەدان ساڵە بەسەریدا سەپاند بوو، رەتیکردۆتەوە و ئەو ژیانە پەسند ناکات و چیدی تێیدا ناژیت، ئیرادەیەکی ئازادی خۆی دەرخستۆتەڕوو، لەمەشدا پێداگری دەکات و دەڵێت:" یان دەبێت من بەئازادی بژیم یانیش ناژیم" ئەم بڕیارەی داوە، بۆیە بەرخۆدانێکی مەزن دەکات، بۆیە لەدژی ئەم هەموو پیلانگێڕییە رادەوەستێت. ئەگەر وەها نەبایە لەمێژ بوو ئەم تەڤگەرە یان تەسلیم دەبوو، یانیش تەسفیە دەبوو. زیهنییەت و فەلسەفەیەکی ئەم تەڤگەرە هەیە؛ کەسێتی ئەم تەڤگەرە و گەلی ئەم تەڤگەرە بەتەواوی لەسەر ئەو بنەمایە ئافرێندراوە، ئەو فەلسەفە و زیهنییەتە چییە؟ "یان من بەئازادی دەژیم یانیش ناژیم" بەم فەلسەفەیە کۆمەڵگایەکی بەمشێوەیە و مرۆڤێکی بەمشێوەیە و تەڤگەرێکی بەمشێوەیەی خولْقاندووە، خیانەت و بەکرێگیراوێتی و تەسلیمییەت پەسند ناکات، سەودا و مامەڵە و درۆ پەسند ناکات، تەنیا و تەنیا دەڵێت:" ئەگەر من بژیم بۆ ئازادی دەژیم، ئەگەر بشمرم هەر بۆ ئازادی دەمرم" لەم رووەوە بڕیاری خۆی داوە، ئەگەر تەڤگەرێك، میللەتێك بڕیاری وەها بدات ئەوا هیچ هێزێك ناتوانێت رێگیری لێبکات، هێزێکی لەمە مەزنتریش لەئارادا نییە، ئەم هێزە دەتوانێت لەبەرامبەر هەر هێزێکی دیکە رابوەستێت و راوەستاوە و لەمەودواش هەر رادەوەستێت.

زۆر کەس بۆ ئازادی خۆیان سووتاندووە، ئەوەی بۆ ئازادی خۆی بسووتێنێت، کێ دەتوانێت ئازادییان لێبستێنێتەوە؟ ئەوەی ئەمە بخوازێت ئەوا ئەوانیش دەسووتێنن. پێویستە هەرکەس ئەم راستییە ببینێت. چەندە لەسەر نکۆڵی و لەناوبردن پێداگری بکەن، ئەوا ئەم تەڤگەرەش زیاتر لەسەر ئازادی پێداگری دەکات. ئەو بڕیارەی گەل و تەڤگەر داویەتی ئەمەیە:" یان بەئازادی بژین یانیش ئەو ژیانە پەسند ناکەین، وەك بڵێی؛ تێیدا نەژیاوم و تێیدا ناژیم"، بۆیە تا ئەو ئامانجانەی لەپێش خۆی داناوە پێکنەهێنێت دەستبەرداری لەخەبات و تێکۆشان و بەرخۆدان ناکات. سەختی و دژواری چەندە دەبن با ببن، خیانەت چەندە دەبێت با ببێت، پیلانگێڕی چەندە دەبێت با ببێت، دەستبەرداری لەمە ناکات. پێویستە هەموو کەسێك ئەم راستییە بەمشێوەیە

تێبگات. چونکە ئەم تەڤگەرە، هەموو خیانەت و پیلانگێڕێتییەك دەکاتە هۆی ئەوەی کەوا ئیرادە و خەباتی خۆی بەهێزتر بکات، شەڕی ئازادی بەهێزتر بکات، ئەگەر تەڤگەرێك بەم فەلسەفەیە جموجۆڵ بکات، ئەوا کەس ناتوانێت ڕێگیری لێبکات. تاکو ئێستا زۆر هەوڵ و تەقەللایان دا کە تەسلیم ببێت و تەسفیەی بکەن. بەڵام ئەنجامیان نەگرت و لەمەودواش هەر ناتوانن ئەنجام بگرن. چونکە ئەم تەڤگەرە رەنجێکی مەزنی داوە، بەهای زۆر مەزنی ئافراندووە، ئەم گەلە چارەنووسی خۆی لەگەڵ ئەم تەڤگەرەدا کردۆتە یەك، هەموو شتێکی خۆی خستۆتە نێو ئەم تەڤگەرەوە و دەزانێت کە ئەگەر ئەم تەڤگەرە بەسەر نەکەوێت، ئەوا هەموو شتێك لەدەست دەدات، مرۆڤایەتی خۆیشی لەدەست دەدات. ئەمە باش دەزانێت. بۆیە خاوەنداریێتی لە سەرۆك و (PKK) دەکات، خاوەنداریێتی لە بەها و رەنجەکانی خۆی دەکات، خاوەنداریێتی لەداهاتوو و مرۆڤایەتیبوونی خۆی دەکات.

ئەم زیهنییەتە و ئەم دڵە لەم تەڤگەرەدا خوڵقاوە، بۆیە ناتوانن شکستی پێبهێنن. شتی هەرە راست ئەوەیە کە ئیرادەی ئەم تەڤگەرە پەسند بکەن و ڕێز لەم گەلە بگرن. بانگەوازی من بۆ هەموو کەسێك ئەمەیە. پێویستە کەس بێڕێزی لەبەرامبەر ئەم تەڤگەر و گەلە نەکات و حیساباتی هەڵە نەکات، ئەوانەی تاکو ئێستا دووژمنایەتیان کردووە، با هەوڵبدەن خۆیان بەم گەلە بە عەفوکردن بدەن، پێویستە ئازادی و مافی ئەم گەلە پەسند بکەن، مەگەر تەنیا بەمشێوەیە بتوانن خۆیان و تاوانەکانی خۆیان بە عەفوکردن بدەن، ئەگەرنا ئەگەر تاوانەکانی خۆیان قورستر بکەن، ئەوا حیساب پرسینەوە و لێپرسینەوەش قورستر دەبێت. پێویستە هەموو کەسێك ئەو راستینەیەش وەها تێبگات.

ئەم تەڤگەرە ئامانجی مەزنی لەپێش خۆی داناوە، بۆیەش پراکتیکبوونی خۆیشی مەزن دەرکەوتۆتەڕوو. چونکە چارەسەرکردنی کێشەکانی مرۆڤایەتی لەپێش خۆی داناوە، بۆیە لەدژی ئەو زیهنییەتەی ئەمڕۆ لە دونیادا هەیە و باڵادەستە شەڕ دەکات، لەدژی ئەو ئەخلاق و کولتوورەی لەو زیهنییەتەوە سەرچاوەی گرتووە شەڕ دەکات، شەڕێکی هێندە مەزن پێشدەخات، دەخوازێت دونیایەك بگۆڕێت، لەبەرامبەر دونیایەك رادەوەستێت، ئەم جورئەتەی لەخۆیدا خوڵقاندووە، ئامانجی خۆی وەها مەزنە، ئەوەی

ئەقڵ و دڵی خۆی بەگوێرەی ئەمە مەزن خولقاندبێت، ئەوا بەگوێرەی ئەمەش دەژیت و کاردەکات. بۆیە هەروا بەئاسانی ناتوانن ئەم تەڤگەرە تەسلیم وەربگرن و پەرشوبڵاوەی پێبکەن. ئەم تەڤگەرە تۆوێکی هاوێشتووە، هەمیش تۆوێکی مەزنی هاوێشتووە، ئەم تۆوە تادێت بڵاودەبێتەوە، ناشتوانن رێگێری لە بڵاوبوونەوەی بکەن، ناتوانن بە گرتن و کوشتن و پیلانگێرێتی، رێگیری لێبکەن. زیاتر لەچوار هەزار گوندیان تێکداوە، بەملیۆنان کەسیان کۆچبەر کردووە و لەکۆڵانان فرێیان داون و برسیان کردوون، هەموویان ئەشکەنجە دەکرێن، سووکایەتی هەرە مەزن بەرامبەر کوردان دەکەن، هەموو شێوە زوڵم و چەوسانەوەیەك بەرێوە دەبەن، تاکو ئێستا سەرۆکی ئەو گەلە دەستگیر کراوە، بەهەزاران کەسیان لە کوچە و کۆڵانەکاندا کوشت، دەوڵەتی هەرە زلهێز هاتنە سەر ئەم تەڤگەر و گەلە چ ئەنجامێکیان بەدەست خست؟ هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە، هەموو کات دەڵێن: " ئێمە ئەنجامگیر بووین". کەچی دەبینن جارێکی دیکە زۆر مەزنتر سەریهەڵدایەوە، وەك درەختی بەڕوو وایە، تۆ دەیبڕیتەوە، کەچی جارێکی دیکە لەسەر هەمان رەگدا سەرهەڵدەداتەوە و دەبێتە پێنج شەش رەگی دیکە. راستینەی ئەم تەڤگەرە وەهایە. بۆچی؟ چونکە لەسەر راستینەیەك و بناخەیەکی راست و ئامانجێکی راست سەریهەڵداوە، لەسەر بنچینەیەکی مرۆڤایەتی و کارەکتەری مرۆڤایەتی سەریهەڵداوە و دەخوازێت کێشە مرۆڤایەتییەکان چارەسەر بکات، کێ دەتوانێت رێگیری لەم تەڤگەرە بکات و تەسلیمی وەربگرێت؟ تاکو ئێستا سەلمێندراوە کە کەس ناتوانێت ئەنجامگیر ببێت.

وەکو دیارە دەخوازن زیاتریش بۆیان بسەلمێت، هێشتاش ئومێدێکی وەهایان هەیە کە دەتوانن تەسلیمی وەربگرن یان پەرشوبڵاوەی پێبکەن، بۆیە دەستبەرداری خراپەکاری خۆیان نابن و بێ ویژدانی دەکەن، مادام وەهایە و هێشتاش ئومێدێکی وەهایان هەیە، ئەوا ئەم تەڤگەرەش تا ئەو ئومێدەیان ئەوان مایەپووچ نەکات و نەڵێن: " ئێمە هەموو شتێکمان لەبەرامبەری کرد و نەمانتوانی تەسلیمی وەربگرین و پەرشوبڵاوەیان پێبکەین" ئەوا ئەم تەڤگەرەش بەرخۆدانی خۆی بەردەوام دەکات. بەداخەوە ئێمە نەماندەخواست وەها بێت، بەڵام وەکو دیارە بۆ ئەوەی ئەو ئومێدەی ئەوان نەمێنێت پێویستە ئێمە ئەو بەرخۆدانەش زیاتر و زیاتر بکەین، پێویستە گەلی کورد ئەم

راستییە باش تێبگات. بۆیە پێویست دەكات بەرخۆدانی خۆی بەهێزتر بكات. لێرەدا شەڕێكی ئیرادە بەڕێوە دەچێت، ئەوان دەخوازن ئیرادەی خۆیان بەئێمە بە پەسندكردن بدەن، ئێمە ناخوازین پەسندی بكەین و ئێمەش خاوەنداریێتی لەئیرادەی خۆمان دەكەین، لەئاكامی ئەو شەڕەدا دەبێت لایەك ئیرادەی ئەویتر پەسند بكات. ئێمە وەكو كورد پێشتر لەكۆندا ئیرادەی ئەوانمان پەسندكردبوو، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدان و پێشكەوتنی ئەم تەڤگەرە ئیدی ئیرادەی ئەوان هەرگیز پەسند ناكەینەوە و رەتمانكردۆتەوە، لەپێناو گەیشتن بە ئیرادەیەكی ئازاد و سەربەخۆشدا دەستمان بە تێكۆشان و بەرخۆدان كردووە و تا رۆژگاری ئەمرۆش هەر لەنێو تێكۆشان و بەرخۆدان داین و تاگەیشتن بە ئازادی و تەواوی مافەكان ئەم تێكۆشان و بەرخۆدانە هەر بەردەوام دەبێت و بەرەو سەركەوتن هەڵدەكشێت. بێگومان ئەگەر ئێمە پەسندمان بكردبایە ئەوا رەتمان نەدەكردەوە، پێویستە ئەوان ئیرادەی ئێمە پەسند بكەن، ئیرادەی ئازادی پەسند بكەن، ئێمە بە بەرخۆدانی خۆمان ئیرادەی ئەوانمان شكاند، بەڵام ئەوان دەیانەوێت جارێكی دیكە ئیرادەی شكێنراوی خۆیان بە پەسندكردنەوە بدەن، ئەمەش هیچ مومكین نییە، ئێمە ئیدی بڕیارمان داوە؛ یان ئێمە بەئیرادە و ناسنامە و ئازادی و زمان و كولتووری راستینەی خۆمان دەژین یانیش ئێمە ناژین. ئەمە بە چ واتایەك دێت؟ پێویستە هەركەس بیزانێت و بەگوێرەی ئەمە بڕیاری خۆی بدات...

## دوا پەیام و گووتنی ئێوە چییە بۆ ئەو كەسانەی كە ئەم مێژووە دەخوێننەوە؟

ئەوەی كە من بیڵێم ئەوەیە؛ پێویستە بزانن كە سەرۆك ئاپۆ و (PKK) هەر تەنیا بۆ باكووری كوردستان نیین و تەنیا لەپێناو باكوور شەڕ و تێكۆشان ناكەن، بەڵكو لەپێناو تەواوی پارچەكانی كوردستاندا شەڕ و خەباتی ئازادیخوازانە پێشدەخەن. سەرۆك ئاپۆ و (PKK) دەخوازن رۆحی كورد و یەكێتی كورد مەزن بكەن، دەخوازن كێشەی كورد لەتەواوی پارچەكاندا چارەسەر بكەن. كێشەی كورد هەر تەنیا كێشەی پارچەیەك نییە،

کوردستان تەنیا یەك پارچە نییە و کورد تەنیا لەیەك پارچەدا نییە، کورد و کوردستان بەهەر چوار پارچەی خۆیەوە کورد و کوردستانە، ئەوەی دەڵێت؛ من بۆ کورد و کوردستان کار و خەبات دەکەم، ناچارە هەر چوار پارچە بداتە پێشخۆی و بۆ ئەوەی لەهەر چوار پارچەدا کێشەی کورد چارەسەر بکات خەبات و بەرخۆدان پێشبخات، پێویستە هەموو توانستی خۆی بخاتە خزمەت و راژەی هەر چوار پارچەکەوە، پێویستە یەك رۆحیی کوردان و یەکێتی کوردان بخولقێنێت، تا کێشەکە لەهەر چوار پارچەی کوردستان چارەسەر نەبێت رانەوەستێت و ژیانی شەخسی لەخۆی حەرام بکات. سەرۆك ئاپۆ و (PKK) لەو رۆژەوەی دەرکەوتووە تا رۆژی ئەمرۆ لەسەر ئەو بنەمایە کاریان کردووە، بۆیە سەرۆك ئاپۆ، (PKK) هێز و وزەی گەلی کوردن، زانایی و توانستی گەلی کوردن، دڵ و ویژدانی گەلی کوردن، کورد بە (PKK) و سەرۆك ئاپۆوە مەزن بوون و لەمەش زیاتر مەزن دەبن. ئەگەر ئەمرۆ لە باشووردا نیوە دەوڵەتێکی کوردی ئاوا بووە لێرەدا پێویستە لەمەدا کەس رەنجی سەرۆك ئاپۆ و (PKK) لەیاد نەکات. پێویستە رێز لەمەش بگیردرێت.

کاتێك کە سەرۆك ئاپۆ بە پیلانگێرییەکی نێودەوڵەتی دەستگیرکرا، لەنێو فڕۆکەدا گووتی:" لەوانەیە شەخسی من زەرەر بکەم، بەڵام کوردانم بە قازانجی مەزن گەیاندووە" ئەمە راستە. ئیدی ئاکامی ئەمەش ئەمرۆ لەباشووری کوردستان لەبەرچاوان دایە. ئەگەر ئێستا قەوارەیەك لەباشوور ئاوابووە، ئەوا لێرەدا بەرەنجی گەلەکەمان لەباشوور و رەنجی (PKK)، هەروەها هاوکاری ئەمریکا ئاوابووە و پێویستە هەموو کەسێك ئەو راستییە ببینێت. ئەگەر خەباتی (PKK) نەبایە، (PKK) تورکیای موحتاجی (ی ن ك) و (پ د ك) نەکردبایە، (ی ن ك) و (پ د ك)ش هاوکارییان لە تورکیا وەرنەگرتبایە هیچ جارێك نەیاندەتوانی ببنە هێز. (PKK) رێی تورکیا و بەرێگەی تورکیاشەوە بۆ هەموو دونیای بۆ ئەوان کردەوە، خەبات و تێکۆشانی (PKK) ئەو رێگایەی کردەوە، ئەگەر وەها نەبایە ئەوا هیچ کاتێك رێگەی تورکیا بۆ باشوور نەدەکرایەوە، هێندەش رێگەی دونیا بۆ باشوور نەدەکرایەوە، تورکیاش هێندە هاوکاری ئەوانی نەدەکرد، ئەم هەنگاوە (PKK) بەتورکیای هاوێشت، (PKK) تورکیای خستە ناو ئەو هەڵەیەوە و ئەمرۆ تورکیا ئەو هەڵەیەی خۆی دەبینێت و ژەنراڵ و سەرانی تورکیا

دەڵێن:" ئێمە بەدەستی خۆمان لەباکووری ئێراق (باشووری کوردستان) دەوڵەتێکمان ئاواکرد، ئێمە خواستمان (ی ن ك) و (پ د ك) و (PKK) بەگژ یەکیاندا بدەین و بەمەش کورد بەکورد بەکوشتن بدەین و کوردان وەها تەسفیە بکەین، بەڵام پاشان بەدیارکەوت کە کوردان قازانجیان کرد و ئێمە دۆڕاندمان". ئەمڕۆ ئەو قسەیە دەکەن. ئیدی ئەگەر تورکیا دۆڕاندی و ئەو هەڵانەی کرد، ئەوا (PKK) تورکیا خستە ناو ئەو هەڵەیەوە. لەئاکامی ئەوەدا لەباشوور دەوڵەت ئاوابوو، پێویستە هەموو کەسێك ئەم راستینە بزانێت.

پێویستە هەر کەسێکیش بزانێت کە تا لەباکووری کوردستان کێشەکە چارەسەر نەبێت ئەوا کورد هیچ ناحەسێتەوە. ئەمڕۆ ئەو راستییەش لەباشوور لەپێش چاوانە.

تورکیا تازە لەوە گەیشتووە کە (PKK) ئەو هەڵەیەی پێ کردووە و خستیە خزمەتی ئاواکردنی دەوڵەتێك لەباشوور، لەبەر ئەمە ئێستا رکوکینێکی مەزنی لەبەرامبەر سەرۆك ئاپۆ و (PKK) هەروەها لەدژی باشووریش هەڵگرتووە، دەخوازێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە، دەخوازێت هەڵەکانی خۆی راست بکاتەوە، دەڵێت:" من چۆن ئەو هەڵانەم کرد؟ من دەمخواست کوردان لەناوببەم، کەچی من کوردم کردە هێز" هەروەها دەڵێت:" ئاپۆ و (PKK) ئەو هەڵەیان بەمن کرد" بۆیە دەخوازێت تۆڵەی خۆی بکاتەوە. بەهاوکاری تورکیا دەوڵەت لەباشوور ئاوا بوو، دیسان دەخوازێت چۆن ئاوایکردووە تێکیشی بداتەوە، لەم پێناوەشدا کار دەکات. پێویست دەکات گەلەکەمان لەباشوور ئەمە ببینن، نرخ و بەهای (PKK) ببینن و بیزانن. چونکە (PKK) گەلی کوردی لەباشوور گەیاندە قازانجی مەزن، ئەگەر دەخوازن ئەو دەسکەوتانەی بەدەستهاتوون بپارێزن و دەسکەوتی زیاتریش بە دەستبهێنن، پێویست دەکات (PKK) بپارێزن و رێزی لێبگرن و پیشتیوانی لێبکەن. (PKK) چەندە کار بکات، ئەوا باشوور ئەوەندە قازانجی مەزن دەکات، تا ئێستا چەندەی قازانج کردووە، ئەوا لەمەودواش زیاتر قازانج دەکات. بۆیە پێویستە (PKK) وەك چاوی خۆیان بپارێزن، (PKK) هێزی ئەوانە، رۆحی ئەوانە، (PKK) گەرەنتی ئەوانە.

هەروەها با هەڕەشەکانی تورکیا بۆ سەر باشوور لەلایەك بمێنێت، ئەگەر چارەسەری لەباکوور بە دینەیەت ئەوا گەلەکەمان لەباشوور ناحەسێتەوە و بەردەوام لەسەر ئەوان

مەترسی هەیە، ئەگەر تورکیا دەرفەت و هەلی بۆ بڕەخسێت، ئەوا هەرچی دەستکەوتی بەدیهاتووە بەفیڕۆی دەدات و تێکی دەدات و کۆمەڵکوژی ئەنجام دەدات. بۆیە پێویستە گەلەکەمان لەباشووردا باش لەراستینەی تورکیا تێبگات.

لەو رۆژانەدا لەدادگایی ئەنفالدا بەدیارکەوت؛ کاتێك کە رژێمی سەددام کوردی ئەنفال کردووە، ئەوا بەهاوکاری سوپای تورکیا ئەمەی ئەنجام داوە، ئەمەش روون و ئاشکرایە، کە هەر چییەك بەسەر باشووردا هاتووە، هەر تەنیا سەددام و پارتی بەعس و سوپای ئێراق بەسەرینەهێناون، بەڵکو ئەمەی بەهاوکاری دەوڵەتی تورکیا پێکهێناوە، ئیدی دادگاییەکە لەپێش چاوانە.(١٤) مادام ئەگەر راستی مەسەلەکە وەهایە، پێویستە گەلەکەمان لەباشوور دووژمنی خۆی ببینێت و بناسێت کە لەبنەڕەتدا مەترسییەکان لەکوێوە دێن، ببینێت. ئەوەی لەبەرامبەر ئەو مەترسیانە رادەوەستێت (PKK)یە، پێویست دەکات خۆی لەگەڵ (PKK)دا بکاتە یەك و هێز بە (PKK) ببەخشێت، بۆ ئەوەی هەم ئەو مەترسییەی لەسەر خۆی لەئارادایە کەم بکاتەوە و ئەو مەترسییانە پووچەڵ بکاتەوە، هەمیش کاتێك لەسەردەمی حوکمی سەددامدا ئەو کۆمەڵکوژی و ئەشکەنجەیەی بەسەریهاتووە رۆڵی تورکیای تێدا ببینێت، پێویستە جارێکی دیکە دەرفەتی بەمجۆرە بە تورکیا نەداتەوە، بۆئەمەش پێویستە بەهەموو هێزی خۆی پشتیوانی (PKK) بکات، تاکو (PKK) بتوانێت چارەسەری لەباکووری کوردستان پێشبخات، بۆ ئەوەی ئەو مەترسییانەی تورکیاش دروستی دەکات نەیهێڵێت.

لەوانەیە پێشتر زێدە ئەو ئیمکانییەت و توانستەی خۆی نەبووبێت، پێشان دەیانگووت:" دەوروبەری ئێمە گیراوە" بەڵام ئەمرۆ بوونەتە خاوەن قەوارە، تەنانەت لەئاستی ئێراقیشدا قورسایی خۆیان هەیە، ئەمریکا و سیستەمی کاپیتالیزمیش پشتیوانیان لێدەکات، دەتوانن ئەو هێزەی خۆیان بخەنە خزمەتی گەلەکەی خۆیان لەپارچەکانی دیکەشدا. بۆ ئەوەی لەپارچەکانی دیکەشدا چارەسەری پێشبکەوێت، ئەوا پێویستە لەباکوور چارەسەری بێتەدی. ئەگەر لەباکوور کێشەی کورد چارەسەر بوو، ئەوا لەپارچەکانی دیکەشدا پێشدەکەوێت، ئەوەی ناهێڵێت ئەمە بێتەدی تورکیایە. ئەمە راستینەیەکە و ئەگەر ئێمە دەمانەوێت چارەسەری لەتەواوی کوردستان پێشبخەین و رۆح و یەکێتی کوردان بەهێز بکەین و لە کوردستاندا ئازادی بێنینەدی

ئەوا پێویستە بەهەموو هێزی خۆمانەوە هەوڵ بدەین لەباکوور چارەسەری بێتەدی. هەڵوێستی هەرە راستیش ئەمەیە. بۆیە پێویستە پشتیوانی لە (PKK) بکەن، نەك باشوور ببێتە ئامرازی تورکیا. ئێستا تورکیا هەوڵ دەدات دیسان لەنێوان کوردان دووژمنایەتی دروست بکاتەوە، پێویستە ئەم لەیستۆکە ببینن و نەکەونە نێو ئەو لەیستۆکەوە، پێویستە دووژمنایەتی (PKK) و برای خۆیان نەکەن. ئەگەر دووژمنایەتی بکەن ئەوا دووژمنایەتی خۆیان دەکەن، چەندە دۆستایەتی (PKK) بکەن ئەوەندە قازانجی مەزن دەکەن. تورکیا دەیەوێت جارێکی دیکە نێوان کوردانی باکوور و باشوور شەڕ بەرپا بکاتەوە، لەنێوان (پ د ك) و (ی ن ك) و (PKK) شەڕ بەرپا بکات، بۆ ئەوەی کورد نەبنەیەك، تاکو دەسەڵاتدارێتی خۆی لاواز نەبێت و نەکەوێتە مەترسییەوە. لەم پێناوەشدا هەوڵ و تەقەللای زۆر دەدات، ئیدی چۆن تۆڵە لە (PKK) بکاتەوە؟ دەیەوێت شەڕێکی بەمجۆرە بەرپا بکات و تاکو تۆڵەی خۆی بستێنێتەوە. چونکە دەڵێت:" (PKK) ئەو هەڵەیەی بەمن کرد، منی خستە خزمەتی ئاواکردنی دەوڵەتێك لەباشوور" بەمەش دەیەوێت بەوجۆرە تۆڵەی خۆی لە (PKK) و هەمیش لەباشوور بکاتەوە، پێویستە ئێمەش هەموو لایەکمان ئەو دەرفەتەی پێنەدەین. با ئەنفالەکان و رۆڵی تورکیا تێیدا و ئەو دادگاییەش بخەینە پێش چاومان، پێویستە ئێمەش پیلانە گڵاوەکانی تورکیا هەڵوەشێنینەوە.

ئێمە گەیشتووینەتە ئەو قۆناخەی کە بگەینە ئامانج. ئیدی پێویستە هەموو کەسێك پشتیوانی ئەمە بکات. نەك ئەمە لاواز بکات یان تێکیبدات، دەوڵەتانی داگیرکەر و دەوڵەتانی دیکە ئەمە دەخوازن و بەرژەوەندیی ئەوان وا دەخوازێت. بەرژەوەندییەکانی گەلی کوردیش وا دەخوازێت کە لەدژی ئەوان رابوەستێت. وا دەخوازێت لەگەڵ برای خۆی ببێتەیەك، ئەگەر کوردان ببنە یەك، دڵی خۆیان بکەنە یەك، لەسەر ئیرادە و ئازادی خۆیان پێداگری بکەن، ئەوا کەس ناتوانێت کوردان تێك بشکێنێت، ئەمە راستییەکە، پێویستە کورد نەترسێت، پێویستە کورد حیسابی زۆر مەزنتر بکات. ئەگەر حیسابی خۆی مەزن کرد، ئەوا دەتوانێت خۆی بکاتە هێزی یەکەمین لەناوچەکەدا. ئەم رۆژە هاتووە و ئەو دەرفەت و توانستە رەخساوە، ئەمە دەمێنێتەوە سەر کوردان، ئەگەر یەکێتی نێوان خۆیان بەهێز بکەن و لەهەموو پارچەکاندا چارەسەری پێشبخەن و

کێشەی کورد چارەسەر بکەن و ببنە هێزی یەکەم لەناوچەکەدا، ببنە هێزی ئازادی، یانیش خیانەت لەخۆمان بکەین و گورز لەخۆمان بوەشێنین، ئەو لەسەر کوردان دەمێنێتەوە.

من لەو باوەڕەدام ئیدی گەلەکەمان لەباشوور لە ڕاستییەکان تێدەگات و لەڕاستینەی (PKK)ش تێدەگات، باش لەمە تێدەگات کە (PKK) بۆ تەواوی کوردستان و باشوور بەتایبەت گوزارشت لەچی دەکات و ناکەوێتە نێو لەیستۆکەکانەوە، بەڵکو شانبەشانی (PKK) لەدژی لەیستۆکەکان رادەوەستێت و ئەو لەیستۆکانە تێك دەدات...

**زۆر سوپاس بۆ ئەم دیدارە...**

**سوپاس بۆ تۆش...**

## پەراوێزەکان:

(١) مەبەستی ئەو مانگرتنەیە کە سەرۆك ئەو کاتە لەزینداندا دژ بە هەڵسوکەوتەکانی حکومەتی تورکیا ئەنجامی دا. لەئاکامدا داوای کرد کەوا پارێزەرانی و برا و خوشکەکانی بۆ ماوەیەك سەرردانی نەکەن سەردانی نەکەن.

(٢) محەمەد عەلی بیراند: رۆژنامەوانێکی بەناوبانگی تورکیایە، بەوە دەناسرێت کە زۆر لەدەزگای میت (MİT) و کەسانی باڵادەستی نێو دەوڵەتی تورکیاوە نزیکە.

(٣) کۆمیتەی زانست، رۆشنگەری، هونەر: کۆمیتەیەکە لەکۆمیتەکانی نێو پێکهاتەی کۆنگرەی گەل.

(٤) مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی بەرەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان (ERNK) بوو لە کۆنگرەی حەوتەمدا.

(٥) هەر لەو کۆنگرەیەی جفاتی گشتیدا هەڤاڵ "زوبێر ئایدار" وەك سەرۆکی دیوانی کۆنگرەی گەل هەڵبژێردرا.

(٦) مەبەستی رووداوی شەهیدبوونی ئەو چواردە گەریلایەیە کە لە ناوچەی مووش لە (٢٤) مانگی ئاداری (٢٠٠٦)دا لەئاکامی هێرشی چەکی کیمیاوی سوپای تورکیا شەهید بوون.

(٧) کانی شیلان: دۆڵێکە لە چیای قەندیل، کانییەکی بەو ناوە لێیە. ئەو کاتە کەمپی پەروەردەیی پارتی یەکێتی دیموکراتی (PYD)ی لێبوو.

(٨) پراواکسیۆنی ئاڵا: مەبەستی رووداوە گێرەشێوێنییەکەی دوای پیرۆزکردنی جەژنی نەورۆزی (٢٠٠٥) و خاوەندارێتی گەلی کورد لەراگەیاندنی سیستەمی ( KKK) بوو لەلایەن رێبەر ئۆجەلانەوە، کە حکومەتی تورکیا زۆر تەنگەتاو بوو و بۆ ئەوەی شەڕی کورد ـ تورك بەرپابکات هات ئاڵای تورکیای دایە دەستی هەموو کەسێك و کردی بە شەڕە ئاڵا.

(٩) هیرانت دینك: رۆژنامەوانی بەناوبانگی ئەرمەنی لەرێكەوتی (١٩)ی مانگی (١)ی (٢٠٠٧) كوژرا و پاشان بكوژانی ئەو رۆژنامەوانە ئاشكرابوون كە پشتیوانییەكی مەزنیان لەناو دەوڵەتدا هەیە.

(١٠) ئۆگون سامەست: ئەو كەسە بوو كە رۆژنامەوان هیرانت دینكی كوشت.

(١١) ئۆرهان پاموك: رۆماننووسێكی بەناوبانگی توركیایە و لەساڵی ٢٠٠٧دا خەڵاتی نۆبلی لەبواری ئەدەبیات وەرگرت.

(١٢) جۆزیف راڵستۆن كۆنەژەنراڵ و سەرمایەدارێكی گەورەی ئەمریكییە و نوێنەری ئەمریكا بوو لە كۆردیناتۆری مەسەلەی PKK و پاش ئەوەی ئەو كۆردیناتۆرییە سێ قۆڵییەی نێوان ئەمریكا و توركیا و ئێراق لەقۆناخی یەكەمیدا بێئەنجام بوو راڵستۆن دەستی لەو ئەركەی خۆی كێشایەوە.

(١٣) ئەدیب باشەر ژەنراڵێكی خانەنشینكراوی توركیایە و نوێنەری توركیا بوو لە كۆردیناتۆرە سێ قۆڵییەكەی مەسەلەی PKK ئەویش پاشان دەستی لەئەركەكەی خۆی كێشایەوە.

(١٤) مەبەستی ئاشكرابوونی ئەو بەڵگانەیە كە لە كاتی دادگاییكردنی سەرانی رژێمی بەعسدا دەركەوتن كە سوپای توركیا هاوكاری سوپای ئێراقی كردووە بۆ بەئەنجام گەیاندنی پرۆسە بەدناوەكانی ئەنفال.

# جەمیل بایك لەچەند دێڕێكدا

** لەساڵی( ١٩٥٥) لەخێزانێكی زۆر هەژاری گوندی (**ئەشایا چەخماخ**)ی سەر بەقەزای "**كەبان**"ی سەر بەشاری **خەرپووت (ئەلازخ)** لەدایكبووە. شاری خەرپووت شارێكی دێرینە و بەنداوێكی مەزن لەنێوان ئەلازج و كەبان بەناوی بەنداوی "كەبان" دروستكراوە.

** خێزانەكەی بەزۆری و زەحمەتی بژێوی ژیانی دابینكردووە و خەریكی كشتوكاڵ بووە.

** خوێندنی سەرەتایی لەگوند خوێندووە. بەهۆی دۆخی هەژاری خێزانەكەیەوە دوای تەواوكردنی خوێندنی سەرەتایی، چووەتە تاقیكردنەوەی خوێندنگا (پەیمانگا)یەی مامۆستایانی سەرەتایی. چونكە سەركەوتن لەو تاقیكردنەوەیە مەرجە بۆ خوێندن تێیدا. ئەویش لەو تاقیكرنەوەیەدا سەردەكەوێت.

بۆ ئەم مەبەستەش لە شاری مەلاتیە لە **خوێندنگای مامۆستایانی ئەكچاداغ** دەخوێنێت، لەبەرئەوەی خوێندن لەم خوێندنگایەدا لەسەر كیس و خەرجی دەوڵەت بوو و زیاتریش خەڵكی هەژار دەچنە ئەو خوێندنگایەوە.

** لەهەموو قۆناخەكانی خوێندندا یەكێك بووە لەخوێندكارە هەرە زیرەكەكان.

** ئەو خوێندنگایانەش زیاتر لەهەرێمە كوردییەكان (باكووری كوردستان) ئاواكرابوون. بێگومان ئامانجی شاراوەی دەوڵەت لەئاواكردنی ئەو خوێندنگایانە ئەوەبوو كە سیاسەتی توانەوە جێبەجێ بكات. واتا دەوڵەت دەیەویست خوێندكارە ناتوركەكان بكاتە تورك و بیخاتە خزمەتی توركیاوە. واتا ئامانج ئەوە بوو كوردان لەوێ بتوێننەوە. هەڵبەتە ئەوەی دەچووە ئەو خوێندنگایەوە شەو و رۆژ لەوێ دەمایەوە، بۆ ئەوەی

پرۆسەی تواندنەوەکە زیاتر و زووتر ئەنجام بگرێت. بەرێز بایك پێنج ساڵ لەوێ دەخوێنێت، کاتێك کە دەربازی پۆلی شەشەم دەبێت لەبەر ئەوەی خوێندکارێکی زیرەك بوو لەسەر بڕیاری بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگایەکە دەینێرنە ئەنقەرە بۆ خوێندنی خوێندنگای مامۆستایانی باڵا. لەو خوێندنگایەی ئەنقەرەدا مامۆستای قۆناخی ناوەندی و دواناوەندی لێدەردەچێت. لەبەر ئەوەی بەرێزی قوتابییەکی زیرەك دەبێت لەخوێندنی خۆیدا، بەبڕیاری ئیدارەی قوتابخانە دەینێرنە ئەنقەرە تاکو ئەو قوتابخانە بخوێنێت.

** بەرێزیشی دەچێتە ئەنقەرە و لەوێ لە تاقیکردنەوەی وەرگرتندا سەردەکەوێت و دەچێتە ئەو خوێندنگایەوە. لەوێ ساڵێك لە قۆناخی ئامادەکاری دەخوێنێت بۆ ئەوەی بچێتە زانکۆ، لەو قۆناخەشدا سەردەکەوێت و دەچێتە زانکۆ.

** لەزانکۆی ئەنقەرە لە"کۆلێژی زمان، مێژوو، جوگرافیا"دا وەردەگیردرێت، لەو کۆلێژەشدا دەچێتە بەشی زمان و ئەدەبیاتی تورکی.

** لەساڵی (١٩٧٣)دا لەزانکۆدا هەڤاڵ کەمال پیر دەناسێت کە یەکێکە لەو سێ سەرکردانەی گروپی سەرەتایی ئاپۆچیتیان ئاواکردووە. ئیدی لەرێی هەڤاڵ کەمال پیرەوە سەرۆك ئۆجەلان دەناسێت و دەست بەتێکۆشانی شۆڕشگێڕی دەکات.

** تا قۆناخی سێیەمی کۆلێژ شانبەشانی خوێندنەکەی پەرەی بەتێکۆشانی شۆڕشگێڕی خۆی دژ بە فاشیستەکان دەدا.

** لەساڵی چوارەمی زانکۆدا دەستبەرداری خوێندن دەبێت. چونکە هەموو ژیان و کاتی خۆی بۆ تێکۆشانی شۆڕشگێڕێتی تەرخان کرد، ئیدی کاتێك کە دەربازی ساڵی چوارەم دەبێت بەتەواوی دەستبەرداری لەخوێندندا دەکات. چونکە وەك گروپی سەرەتای تەڤگەری ئاپۆچی بڕیار دەدەن کە تێکۆشان بگوازنەوە بۆ کوردستان و لەم پێناوەشدا دەگەڕێنەوە کوردستان و دەست بەخەبات و تێکۆشان دەکەن. کاتێك کە لەگەڵ یەکەم گروپدا دەگەڕێتەوە کوردستان سەرەتا دەچێتە شاری "عەنتاب"و دەست بەجموجۆڵ و چالاکی شۆڕشگێڕی دەکات.

** وەك يەكێك لەئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری تەڤگەری ئاپۆچێتی و (PKK) لەنێو تێكۆشانی شۆڕشگێڕیدا تێكۆشاوە. ئیدی لەو ڕۆژەوە تاكو ڕۆژی ئەمڕۆ لەتێكۆشاندا بەردەوامە و لەسەرجەم ئاستەكانی تێكۆشاندا كار و خەباتی كردووە...

** ئێستا جێگری سەرۆكی كۆما جڤاكێن كوردستان (KCK)یە.

# کرۆنۆلۆژیای مێژووی پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK)

★ لەدوای کودەتاکەی (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٧١) رەوتی شۆڕشگێڕی و چەپگەری لەژێر کاریگەری شۆڕشی گەلی ڤێتنام و بزاڤی لاوانی پاریسی (١٩٦٨)دا لەنێو لاوان لەتورکیادا لەبرەو دابوو و ئاتمۆسفێرێکی شۆڕشگێڕی خوڵقابوو.

★سەرۆك ئاپۆش سەبارەت بە کورد و کێشەکەی و گرفتەکانی دیکەی کۆمەڵگا لەنێو لێگەڕین و لێکۆڵینەوە دایە و تادێت زیاتر لە راستینەی کێشە و گرفتەکان و ناکۆکییەکان قووڵتر دەبێتەوە. بەهاتنیشی بۆ ئەنقەرە و زانکۆی ئەنقەرە و کۆلێژی زانستە سیاسییەکان و ئەو دۆخ و ئاتمۆسفێرەی لەپەرەسەندن دابوو بەرەوتی چەپگەری و شۆڕشگێڕی ئەو کاتە کاریگەر دەبێت. بەتایبەتی زیاتر بزاڤەکانی پارتی - بەرەی رزگاری گەلی تورکیا (Türkiye Halk Kurtuluş Partisi-Cephesi) بەرێبەرایەتی "ماهیر چایان" و ئەرتەشی رزگاری گەلی تورکیا ( Türkiye Halk Kurtuluş Ordusu) بەرێبەرایەتی"دەنیز گەزمیش" و ئارتەشی شۆڕشگێڕی رزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی تورکیا (TİİKKO) بەرێبەرایەتی " ئیبراهیم کایپاك کایا"ی لەهەموو گروپەکانی دیکەی چەپگەر کاریگەر دەبێت و لەگروپەکانی دیکەی چەپڕەو باشتریان دەبینی.

* **بۆیە لەدژی شەهیدبوونی ماهیر چایان سەرۆکی بەرەی - پارتی - رزگاری گەلی تورکیا** (Türkiye Halk Kurtuluş Partisi-Cephesi) و نۆ لەهاوڕێکانی لە(٣١)ی ئاداری (١٩٧٢)دا لە ناوچەی قزلدەرە، هەروەها بۆ رێگیری لە لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیش سەرۆکی **ئارتەشی رزگاری گەلی تورکیا** (Türkiye Halk Kurtuluş Ordusu) و دوو لە هاوڕێیانی **"یوسف ئەسلان و حوسێن ئینان" رێبەر ئۆجەلان** لەگەڵ هاوڕێیەکی بەناوی **"دۆغان فرتنە"** پێشەنگایەتی رێپێوانێکی پرۆتستۆیی دەکەن لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە. بەهۆی ئەو پێشەنگایەتیکردنەی لەرێپێوانەکەدا دەستگیر دەکرێت و نزیکەی (٧) مانگ لەزیندانی **"ماماك"**دا دەمێنێتەوە، لەماوەی زیندانیبوونیدا بیر لە ئاواکردنی گروپێکی رێکخستنی شۆڕشگێڕی دەکاتەوە، لەدوای ئازادبوونی لەزینداندا هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکی بۆ ئەو مەبەستە دەبێت.

* دوای ئازادبوونی لەزیندان و گەڕانەوەی بۆ خوێندن، لەرێگای ئەدرەسێك کە **دۆغان فرتنە** دەیداتێ، هەردوو هەڤاڵ **"حەقی قەرار و کەمال پیر"** دەناسێت، ئیدی بەیەکەوە دەژین و تێدەکۆشن و یەکەم گروپی ئایدیۆلۆژی تەڤگەری ئاپۆچێتی بنیاد دەنێن.

* لەنەورۆزی (١٩٧٣)دا لە لەمیانەی گەشتێکی ئاساییدا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی زانکۆیدا بۆ بەنداوی **" چووبوك"**، بۆ یەکەم جار سەرۆك **ئۆجەلان** ئەو دەرئەنجامە فیکرییەی لەمیانەی قووڵبوونەوە و لێکەڕینی تیۆریدا پێیگەیشتبوو لەلای ئەو هاوڕێیانەی باس دەکات و خوازیارە هەڵوێست و بیر و رایان لەمبارەیەوە بزانێت، تاکو بناخەی یەکەم گروپ دارێژێت. لەو کۆمەڵە هاوڕێیەیدا تەنیا **" عەلی حەیدەر قەیتان"** تێیدا دەمێنێتەوە و تاکو ئێستا لەنێو تێکۆشاندا بەردەوامە. ئیدی لەو کاتە بەدواوە سەرۆك تێکۆشانی خۆی دەگەیەنێتە ئاستی گروپێکی ئایدیۆلۆژی و بەناوی **"شۆڕشگێڕانی کوردستان"** یان بەناوی **"تەڤگەری ئاپۆچی"**یەوە لەزانکۆ و هەندێك گەڕەکی هەژارنشین و کوردنشینی ئەنقەرەدا فیکر و بیروباوەڕی خۆیان بڵاودەکەنەوە.

* لەساڵی (١٩٧٦)دا لە ئەنقەرە لە **"ژووری بیناسازان"** ی **"کۆمەڵەی ئەندازیاران"** سیمینارێکی سەبارەت بە فیکر و بیر و باوەڕی خۆی سازکرد. ئەمەش یەکەم جار بوو سەرۆك ئاپۆ لەدەرەوەی گروپەکە تێڕوانین و دەرئەنجامە فیکرییەکانی خۆی بە ئاشکرا بۆ خەڵکی دیکە باس بکات و رایدەگەیەنێت.

⭑ لە (١٩٧٦)دا لە ئەنقەرە دا یەکەم کۆبوونەوەی گروپەکە لە گەڕەکی "دیکمان " ئەنجام دەدرێت. ئەم کۆبوونەوەیە یەکەم کۆبوونەوەی فەرمی تەڤگەری ئاپۆچێتییە، کە تێیدا بڕیاری گەڕانەوە لە ئەنقەرەوە بۆ کوردستان و دەستکردن بەتێکۆشانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ڕێکخستنی دەدرێت.

⭑ لەساڵی (١٩٧٦) لەکاتی مەشقپێکردنی هەڤاڵان لەسەر بەکارهێنانی دەمانچە، هەڤاڵ "عەلی دۆغان یلدرم" لەگەڕەکی "تووزلوچایر"ی ئەنقەرە فیشەکی لەدەست دەردەچێت و شەهید دەبێت. ئەمە یەکەم شەهیدی تەڤگەری (PKK)یە.

⭑ لەساڵی (١٩٧٦)دا سەرۆك ئاپۆ یەکەم نامیلکە دەنووسێت بەناوی "مێژووی کۆلۆنیالیزم" ئەم نامیلکەیە سەرەتا لەسەر کاسێت تۆمار دەکرێت و پاشان لەلایەن هەڤاڵ "محەمەد خەیری دوورموش"ەوە دەکرێتە نامیلکە.

⭑ لە(٨)ی ئاداری (١٩٧٧)دا لەشاری دیرسیمدا هەڤاڵ "ئایدن گول" بەدەستی ڕێکخراوی چەپی تورکی ڕزگاریخوازانی گەل (Halkın Kurtuluşu) شەهید دەکرێت. چونکە دەستبەرداری ئەوان بووە و تەڤلی تەڤگەری ئاپۆچێتی بووە. بەمەش تەڤگەری ئاپۆچێتی یەکەم شەهیدی خۆی دەدات.

⭑ لە (١٨\٥\١٩٧٧)دا هەڤاڵ "حەقی قەرار" یاریدەدەری یەکەمی سەرۆك ئۆجەلان بەدەستی ڕێکخراوی سیخوڕی "ستێرکا سۆرSıtêrka sor" لە چایخانەیەك لەگەڕەکی نووری پازاڕ باشی شاری "عەنتاب" لەمیانەی پیلانگێڕییەکدا بەدەستی سیخوڕ "عەلائەددین قاپان" شەهید دەکرێت.

⭑ لەپایزی (١٩٧٧)دا سەرۆك ئۆجەلان دەست بە نووسینی یەکەم ڕەشنووسی پرۆگرامی پارتییەکی سیاسی کرد و لەزستان و بەهاری (١٩٧٨) بەسەر تەواوی کادیرانی تەڤگەرەکەدا بڵاودەکرێتەوە، بۆ ئەوەی هەموویان پەروەردەی لەسەر ببینن و تێڕوانینی خۆیانی لەسەر بدەن. ئەو ڕەشنووسە پاشان دەبێتە پرۆگرامی (PKK).

⭑لە(٩)ی ئاداری ١٩٧٨ دا لەعەنتاب بەدەستی ڕزگاریخوازانی گەل (Halkın Kurtuluşu) هەڤاڵ پارێزەر "حەسەن ئایدن" شەهید دەکەوێت.

⭑لەساڵی (١٩٧٧)وە تا بەرپابوونی کودەتای سەربازی (١٢)ی ئەیلولی (١٩٨٠) چەندین ڕێکخراوی فاشیستی و چەپی تورکی و ڕێکخراوی کوردی دژایەتی تەڤگەری ئاپۆچی

(PKK)یان دەكرد و هەندێك لەو ڕێكخراوانە دژایەتی خۆیان گەیاندە ئاستی كوشتن و هێرش و پەلاماردانیش. لەمیانەی ئەو هێرش و پەلاماردانانەدا بەدەیان كادیر و هەواداری تەفگەری ئاپۆچییان شەهید كرد.

★ لەبەهاری (١٩٧٧)وە تا (١)ی گوڵانی (١٩٧٧) سەرۆك ئاپۆ لە كوردستاندا زنجیرەیەك كۆبوونەوەی بۆ كادیرانی پێشكەوتووی تەفگەرەكە ئەنجام دا. وەك ئامادەكارییەك بۆ نووسینی ڕەشنووسی بەرنامەی پارتی. ئەم زنجیرە كۆبوونەوەیە بەماراتۆنی جڤینەكان دەناسرێت.

★ لەشەوی(١٩\٢٠)ی گوڵانی (١٩٧٨) لەكاتی كۆبوونەوەیەكی نهێنیدا لەشارۆچكەی حیلوان‌دا هەڤاڵ"خەلیل چاوغون" لەلایەن عەشیرەتی سلێمانان‌ەوە شەهید دەبێت.

★ بۆیە لەهەمان ساڵدا (١٩٧٨)دا لەشارۆچكەی "حیلوان" چالاكییەك لەدژی سەرۆك جاش و سەرۆكی عەشیرەتی سلێمانان ئەنجام دەدرێت. لەو چالاكییەدا سەرۆك عەشیرەتەكە و چەندین جاشی ئەو عەشیرەتە دەكوژرێن، لەئاكامدا "حیلوان" دەكەوێتە دەستی ئاپۆچییەكان، ئەوانیش دەسەڵات بەجەماوەری شارۆچكەكە دەسپێرن و دەسەڵاتی گەل ئاوا دەكەن. برینداركانیشیان دەبەنە نەخۆشخانەی دیاربەكر، لەوێش لەبەردەم نەخۆشخانەكەدا دیسان هێرشیان دەكرێتەوە سەر و چەندین كەسی دیكەیان بریندار دەبێت ناچار بریندارەكانی دیاربەكریش دەبەنە عەنتاب، لەوێش لێیان دەدەنەوە دەكوژرێن...

★ لە (٢٧\١١\١٩٧٨)دا لەگوندی "فیس"ی سەر بە قەزای"لیجە"ی شاری "ئامەد"، بەئامادەبوونی بیستو دوو تا بیستو سێ كەس، كە دوویان كچ بوون، یەكەم كۆنگرەی تەفگەری ئاپۆچێتی ئەنجام دەدرێت و لەو كۆنگرەیەدا پارتی كرێكارنی كوردستان (PKK) دادەمەزرێت.

★ لە(٣٠\٧\١٩٧٩)دا لەگوندی "قرباشی"ی سەر بە شارۆچكەی "حیلوان"ی سەر بە شاری "ئورفە" چالاكییەك لەبەرامبەر گەورەترین بەكرێگیراو "محەممەد جەلال بوجاك"ی سەرۆكی عەشیرەتی بوجاك لەلایەن ئاپۆچییەكانەوە ئەنجام دەدرێت و لەئاكامدا "محەممەد جەلال" بەبرینداری خۆی ڕزگار دەكات. بەم چالاكییە دامەزراندنی (PKK) ڕادەگەیەندرێت. لەو چالاكییەدا هەڤاڵ "ساڵح كەندال" شەهید دەبێت.

* لەرێکەوتی نێوان (٢٧ ـ ٢٤)ی کانوونی یەکەمی (١٩٧٨)دا دەوڵەتی تورك بەهاوکاری هێزە فاشیستەکانی ئەوکاتە کۆمەڵکوژییەکی مەزن لەشاری "مەرعەش" ئەنجام دەدات، ئەم کۆمەڵکوژییە وەك کاردانەوەیەك بۆ پەرەسەندنی تەڤگەری ئاپۆچیتی و دامەزراندنی (PKK) و هەنگاوێك بۆ ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی ئەنجام درا. لەو کۆمەڵکوژییەدا بەسەدان کەس کوژران. هەروەها شانبەشانی ئەو کۆمەڵکوژییەش حوکمی عورفی "رەوشی ئاوارتە"ی لە(١٣) پارێزگا کە(١٠)یان لە باکووری کوردستان بوو راگەیاند.

* لەساڵی (١٩٧٩)دا لەهەڵبژاردنی شارەوانیدا، لەشارەکانی حیلوان و باتمان لایەنگرانی (PKK) لەهەڵبژاردنەکاندا سەردەکەون. بەڵام دوای (٣) مانگ سەرۆکی هەڵبژێردراوی شارەوانی باتمان "ئەدیب سۆڵماز"لەلایەن دەوڵەتەوە تیرۆر دەکرێت. ئەو ئەزموونەی شارەکانی حیلوان و باتمان بەنموونەیەکی دیموکراتیانەی دەسەڵاتی گەل و کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیانە دادەنرێت.

* وەك تەدبیر وەرگرتنێك لەبەرامبەر ئەگەری بەرپابوونی کودەتایەکی سەربازی، لەسەرەتای تەمموزی (١٩٧٩)دا بە هاوکاری هەڤاڵی شەهید "ئەدهەم ئەکچان" سەرۆك ئۆجەلان تورکیا و باکووری کوردستان بەجێدێڵێت و بەنهێنی بەرەو باشووری رۆژئاوای کوردستان و سوریا دەڕوات و لەوێ لەماڵی خزمێکی شەهید "ئەدهەم ئەکچان" لە شارۆچکەی کوبانێ بەنهێنی ماوەیەك دەمێنێتەوە.

* هەر لەهەمان ساڵدا لە دیمەشق رێکخراوە فەلەستینییەکان دەناسێت و پەیوەندییان لەگەڵدا دەبەستێت و توانستی ئەوە دەئافرێنێت تا لە لوبناندا لەکامپی پەروەردەیی فەلەستینییەکاندا کادیرانی (PKK) تێیدا پەروەردەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و گەریلایی دەبینن. هەر لەکۆتایی هەمان ساڵدا بەدەیان کادیری (PKK) بۆ مەشق و پەروەردە بینین دەربازی کامپی فەلەستینییەکان لە لوبنان دەبن.

* لە (١٩٨٠\٩\١٢)دا وەك سەرۆك شیمانەی دەکرد؛ کودەتایەکی سەربازی لەتورکیا ئەنجام دەدرێت و بەهەزاران کەسی سڤیل دەکوژرێن و بەدەیان هەزار کەسی دیکەش دەخرێنە زیندانەوە و بڕیاری داخستنی سەرجەم پارتە سیاسییەکان و رێکخراوە مەدەنییەکان و تەواوی رۆژنامە و گۆڤارەکان دەدرێت و هەموویان دادەخرێن و حوکمی جۆنتای

سەربازی دەسەڵاتدار و باڵادەست دەبێت. هەروەها تەواوی توركیا و باكووری كوردستان كەوتە ژێر حوكمی عورفییەوە. لەو هەڵمەتەدا بەسەدان كادیری (PKK) و هەزاران لایەنگری (PKK) و كەسانی وڵاتپارێزیش دەستگیر دەكرێن. لەئاكامی ئەشكەنجەیەكی هۆڤیگەرانەوە كادیرانی (PKK) لەزیندانی "ئامەد" بەرخۆدانێكی مەزن ئەنجام دەدەن.

* لە(١٥)ی تەمموزی (١٩٨١)دا یەكەمین كۆنفرانسی (PKK) لە لوبنان ئەنجام دەدرێت و تێیدا بڕیاری گەڕانەوە بۆ وڵات و ئامادەكاری بۆ دەستكردن بەخەباتی پروپاگەندەی چەكداری (الدعایة المسلحة) و دەستكردن بەتێكۆشانی چەكداری دەدرێت.

* لەرۆژی نەورۆزی (١٩٨٢)دا هەڤاڵ **"مەزلوم دۆغان"** لەژێر دروشمی **" بەرخۆدان ژیانە، تەسلیمییەت مردنە"**دا لەحوجرەی (٩)ی قاتی (٤)ی زیندانی "ئامەد"دا ئاگر لەجەستەی خۆی بەردەدات و شەهید دەبێت. بەمەش بەدوایدا زنجیرەیەك چالاكی بەرخۆدانڤانی لەو زیندانە دەست پێدەكات، پاشان ئەو بەرخۆدانڤانییە زیندانەكانی دیكەی باكوور و توركیاش دەگرێتەوە.

* لە كاتژمێری نێوان دوو تا سێی شەوی (١٨\١٩)ی مانگی (٥)ی ساڵی (١٩٨٢)دا لەقاوشی (٣٣)ی قاتی (٢)ی زیندانی "ئامەد"دا بۆ بەردەوامكردنی چالاكییە بەرخۆدانییەكەی هەڤاڵ **"مەزلوم دۆغان"** هەڤاڵان **"فەرهاد كورتای، مەحمود زەنگین، ئەشرەف ئانیك، ئەجمی ئۆنەر"** بەدروشمی **"بەرخۆدان ژیانە، تەسلیمییەت مردنە"** هەر چواریان بەیەكەوە گڕ لەجەستەی خۆیان بەردەدەن و شەهید دەبن. ئەم چالاكییە بە**"چالاكی شەوی چوار قارەمانەكە"** بەناوبانگە.

* لە (١٤\٧\١٩٨٢)دا هەڤاڵان" **محەممەد خەیری دوورموش، كەمال پیر، عاكیف یڵماز، عەلی چیچەك**" دەستیان بەمانگرتن لەخواردن كرد و پاش ( ٥٥ـ ٦٥ )رۆژ لە مانگرتن هەر چواریان دەبردرێنە نەخۆشخانەی سەربازی "دیاربەكر" و هەموویان لەوێ شەهید بوون. كەمال پیر لە حوجرەی (١)ی قاتی(٤)دابوو، لەرۆژی (٧\٩\١٩٨٢)دا شەهید بوو. هەڤاڵ **"محەممەد خەیری دوورموش"** لەحوجرەی (٣)ی قاتی (٤)دابوو، لەرۆژی (١٢\٩\١٩٨٢)دا شەهید بوو. هەڤاڵ **"عاكف یڵماز"** لەقاتی (٢)دابوو، لەرۆژی (١٥\٩\١٩٨٢)دا شەهید بوو. هەڤاڵ **"عەلی چیچەك"** لەرۆژی (١٧\٩\١٩٨٢)دا شەهید بوو.

★ لەساڵی (١٩٨٢)دا لەبەرامبەر هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر باشووری لوبنان و کەمپی فەلەستینییەکاندا (PKK) بڕیاری پشتیوانیکردنی گەلی فەلستین و لوبنان دەدات و لە شارەکانی بەیروت، حەسبایا، ئەلدامور، سەیدا سور.. بەگشتی و لە قەلای شەقیف و قەلای سەلاحەددینی ئەیوبی بەتایبەتی بەرخۆدانێکی مەزن لەبەرامبەر سوپای ئیسرائیلییەکان دەکەن. ئەو بەرخۆدانە کاریگەرییەکی مەزن لەسەر پەیوەندی کورد ـ عەرەب دەکات.

★ لە (٢٠)ی ئابی (١٩٨٢)دا لە لوبناندا دووەمین کۆنگرەی (PKK) ئەنجام دەدرێت و بڕیاری گەڕانەوە بۆ وڵات و دەستکردن بە تێکۆشانی چەکداری دەدرێت. بەمەش بەشێوەیەکی پراکتیکی گەڕانەوە بۆ وڵات دەست پێدەکرێت و ئیتر هەڤاڵان گروپ گروپ بۆ وڵات دەگەڕێنەوە.

★ لە (٢\٥\١٩٨٣)دا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (PKK) هەڤاڵ "محەمەد قەرەسوونگور" و هەڤاڵ "ئیبراهیم بیلگین" لەشەڕی ناوخۆی نێوان (ی ن ك) و حزبی شیوعی ئێراق کە بەشەڕی قرناقا و پشتئاشان دەناسرێت شەهید دەکرێن. ئەو دوو هەڤاڵە لەگەڵ دوو هەڤاڵی دیکەیان بەمەبەستی ڕاوەستانی شەڕی براکوژی ئەوکاتەی نێوان هێزەکانی باشوور و فەراهەمکردنی ئاشتی و تەبایی نێوان لایەنەکان سەردانی بارەگای ئەو پارت و لایەنانەیان دەکرد. لەو هەوڵەیان دابوون کە شەهید دەکرێن.

★ لەساڵانی (١٩٨٣ـ ١٩٨٤)دا چەندین گروپ و یەکینەی گەریلایی بەرەو وڵات دەگەڕێنەوە و لەسەر سنووری نێوان باکوور ـ باشووری کوردستان (تورکیا ـ ئێراق) جێگیردەبن و دەست بە پروپاگەندەی چەکداری دەکەن و ئامادەکاری بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی چەکداری لەباکووری کوردستان دەکەن.

★ لە (١٥)ی ئابی (١٩٨٤)دا دوای ئامادەکارییەکی چڕوپڕ بە فەرماندەیی و سەرپەرشتی هەڤاڵ عەگید (مەعسوم قۆرقماز) لە شارۆچکەکانی" ئەروھ ـ شەمزینان" هەڵمەتی چەکداری دەستپێدەکات و یەکەم فیشەك دەتەقێنرێت. بەمەش تێکۆشانی چەکداری (PKK) دەستپێدەکات و قەڵەمبازێکی مێژوویی لەمێژووی تێکۆشانی (PKK) و گەلی کورد دەهاوێشترێت. هەروەها لەگەڵ ئەو هەڵمەتەدا هێزی ڕزگاری کوردستان (HRK) ڕادەگەیەنرێت.

★ لەرۆژی نەورۆزی (١٩٨٥)دا بەرەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان (ئەنیا رزگاریا نەتەوا کوردستان ERNK) رادەگەیەندرێت. ئەم بەرەیە بریتی بوو لە رێکخستنە جەماوەری و دیموکراتییەکانی گەلی کوردستان.

★ لە(١٩٨٦\٢\٢٨)دا بەپیلانێکی هاوبەشی دەزگا ئیستخباراتییەکانی (CIA)ی ئەمریکی و (MİT)ی تورکی و (SAPO)ی سوێدی، "ئۆلف پالمە"ی سەرۆك وەزیرانی سوێد تیرۆر کرا. پالمە کەسایەتییەکی ئەنتەرناسیۆنال و سۆسیال ـ دیموکرات بوو و سەرۆکی پارتی سۆسیال ـ دیموکراتی سوێد بوو، دۆستێکی دڵسۆزی گەلی کورد و (PKK) بوو. بەئامانجی ناوزڕاندنی (PKK) لە ئەورووپا، ئەو تاوانەیان دایە پاڵ (PKK). بەڵام پاش ماوەیەك لە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونێکی زۆر، تاوانی تیرۆرکردنی ناوبراو ئاشکرا بوو و زانرا کە (CIA) و (MİT) و (SAPO) تیرۆریان کردووە.

★ لە (١٩٨٦\٣\٢٨)دا هەڤاڵ عەگید (مەعسوم قۆرقماز) فەرمانداری هەڵمەتی (١٥)ی ئاب و (HRK) لەمیانەی شەڕ و پێکدادانێکدا لەچیای گلیار شەهید دەبێت. شەهیدبوونی کاریگەرییەکی مەزن لەسەر ئاراستەی تێکۆشانی چەکداری دەکات.

★ لە(١٩٨٦\١٠\٢٥)دا کۆنگرەی سێیەمی (PKK) لە ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز لە دۆڵی بیقاع لە لوبنان بەسترا. لەو کۆنگرەیەدا سەرۆك ئۆجەلان شیکردنەوەیەکی پڕ گرنگ سەبارەت بە تاك، کۆمەڵگا، سۆسیالیزم، سۆسیالیزمی بنیادنراو و بەسوپابوونی گەریلا و پارتیبوون دەکات. هەر لەم کۆنگرەیەدا بڕیاری ئاواکردنی "ئارتەشی رزگاریخوازی گەلی کوردستان ARGK "درا.

★ لە (١٩٨٨\٢\٥) حکومەتی ئەڵمانیا هەڤاڵان "دوران کاڵکان و عەلی حەیدەر قەیتان" و چەند ئەندامێکی دیکەی (PKK)ی گرت و خستنییە زیندانەوە. ئەڵمانیا دەیویست لەکەسایەتی ئەو سەرکردانەدا، تێکۆشانی (PKK) و خەباتی ئازادیخوازی گەلی کوردستان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، ئەگەرنا مارژیناڵ یان تەسفیەی بکەن. بەڵام بەرگریکردنی رەوایانە و یاساییانەی ئەو سەرکردانەی (PKK) لە دادگای دۆسلدۆرفدا وایکرد کە ئاراستەی دادگاییەکە بە بەرژەوەندی حکومەتی ئەڵمانیا بەڕێوە نەچوو، ناچار ئازادکران.

* لەگولانی (١٩٩٠)دا کۆنفرانسی نەتەوەیی دووەمی (PKK) بەسترا. رۆژەڤی گشتی کۆنفرانسەکە هەڵسەنگاندنی پراکتیکی دوای سێیەمین کۆنگرە بوو، کە لەو پراکتیکەدا چەمکی چەتەگەرێتی مۆرکی خۆی لێدا بوو. بۆیە لەو کۆنفرانسە چەتەگەرێتی مەحکوم کرا و بڕیاری خەبات لەدژی چەتەگەرێتی درا.

* لەرۆژی نەورۆزی (١٩٩٠)دا کچە خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی زانکۆی دیجلە "زەکیە ئالكان" لەسەر قەڵاکەی شاری ئامەد گڕی لەجەستەی خۆی بەردا و بەگیانی خۆی نەورۆزی پیرۆز کرد.

* لەنەورۆزی (١٩٩٠) تا ساڵی (١٩٩٢)دا لە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی باکووری کوردستاندا سەرهەڵدانی گەل بەرپا بوو. تێکۆشان گەیشتە ئاستێکی گەلەری و گەل و گەریلا بوونە یەك. سەرەتا هەڤاڵ زانا (کامەران دوندار) لە (١٩٩٠\١٣\١٠) لە ماردین شەهید دەبێت و سەرهەڵدان لە شارۆچکەی نسێبین دەستپێدەکات. هەروەها هەر لەو سەرهەڵدانانەدا لە"جزیرە" و "بۆتان" یش سەرهەڵدان بەرفراوان دەبێت و لەنێو سەرهەڵدانەکەدا هەڤاڵ بێریڤان (بنەوش ئاگال) لەساڵی (١٩٩٢) لە "جزیرە" شەهید دەبێت.

* لەپایزی (١٩٩٠)دا کۆنگرەی چوارەمی (PKK) لە کوردستان بەسترا. کە نوێنەری هەر چوار پارچەی وڵات و کوردەکانی دەرەوەی وڵات تێیدا بەشدار بوون، ئەم کۆنگرەیە بە کۆنگرەی نەتەوەیی ناسێنرا. لەم کۆنگرەیەدا، بڕیاری مەزنکردنی سوپای گەریلا و فراوانکردنی شەڕ و پێشخستنی سەرهەڵدانی گەل لەباکووری کوردستان درا. هەروەها بڕیار درا کە ئەنجوومەن (مەجلیس)ی نەتەوەیی دابمەزرێت.

* لە ساڵی (١٩٩١)دا بۆیەکەمین جار کۆنفرانسێکی تایبەت بە گیراوەکانی زیندانەکانی تورکیا و باکووری کوردستان لە ئەکادیمای مەعسوم قۆرقماز لە "دۆڵی بیقاع"ی لوبنان دا سازدرا.

* لەساڵی (١٩٩١)دا پارتی ئازادی کوردستان (PAK) لەلایەن هەڤاڵان و کادیرانی خەڵکی باشوور کە تا ئەو کاتە لەنێو (PKK)دا لەتێکۆشان دابوون دامەزرا.

* لە (١٩٩٢\٧\١٠) ویداد ئایدن سەرۆکی لقی دیاربەکری (DEP) شەهید دەکرێت و لەئاکامدا سەرهەڵدانێکی مەزن بەرپا دەبێت.

* لە نەورۆزی (١٩٩٢)دا هەڤاڵ رەهشان دیمیرال لە شاری ئیزمیر، لەسەر قەڵای قەدیفە گڕی لەجەستەی خۆی بەردا و جەژنی نەورۆزی پیرۆز کرد.

* لە (١٩٩٢)دا کۆنفرانسی نەتەوەیی سێیەمی (PKK) بەسترا.

* لە (١٩٩٢/١٠/٤)دا تورکیا و (پ د ك) و (ی ن ك) و بەپشتیوانی سیاسی و راگەیاندنی ئەمریکا و زۆربەی پارتە کوردییەکانی، ئەوکاتە، هێرش کرایە سەر (PKK) و شەڕ هەرێمەکانی حەفتانین، خواکورك و چوقورجەی گرتەوە.

* لەهەمان شەڕدا و بۆ ئەوەی خۆی تەسلیمی دووژمنان نەکات هەڤاڵ بێریتان (گوڵناز قەرەتاش) لەخواکورك لە (١٩٩٢/١٠/٢٥)دا دوای ئەوەی فیشەك و تەقەمەنی پێ نامێنێت تفەنگەکەی خۆی دەشکێنێت و خۆی لەسەر لوتکەی چیادا دەهاوێژێت و شەهید دەبێت.

* لەرۆژی (٨)ی مایسی (١٩٩٣)دا یەکەم ژمارە(ژمارە سفر)ی رۆژنامەی وڵات لە شاری هەولێر دەرچوو، وڵات خاوەن بیرێکی نەتەوەیی دیموکراتی بوو و وەك رۆژنامەیەکی سەربەخۆ و نەتەوەیی و دیموکراتی رۆڵێکی گرنگی لەهوشیاری نەتەوەیی و دیموکراتی لەباشووری کوردستاندا بینی و بووە قوتابخانەیەکی گرنگی پێگەیاندنی رۆژنامەوانی. دەرچوونی ئەو رۆژنامەیە بەچەندین قۆناخی جیاجیا تێپەڕی و چەندین جار قەدەخەکرا و بەنهێنی لەهەولێر، سلێمانی و شاخ دەردەچوو. خاوەنی زیاتر لە (١٠) رۆژنامەوانی شەهیدە و تا ساڵی (٢٠٠٢) لەدەرچوون بەردەوام بوو.

* لە (١٩٩٣/٣/١٧)دا (PKK) یەکلایەنە ئاگربەستی راگەیاند. لە (١٧\٤\١٩٩٣ ) بێوادە درێژکرایەوە. بەڵام ئەو ئاگربەستە بێ وەڵام دەمێنێتەوە و شەڕ و پێکدادان دەستپێدەکاتەوە. لە ( ٢٠\٥\١٩٩٣ ) کۆتایی پێهات.

* لەرۆژی نەورۆزی ( ١٩٩٤)دا بۆ پرۆتستۆکردنی سیاسەتی دژە دیموکراتیانەی حکومەتی ئەڵمانیا بەرامبەر بە تەڤگەری ئازادیخوازی گەلی کورد لە ئەڵمانیا؛ هەردوو کچە کورد "رووناهی و بێریڤان" ئاگریان لەجەستەی خۆیان بەردەدەن و شەهید دەبن.

* لە (١٩٩٤)دا (PKK) لە شاری ژنێڤ، پەیمانی نێودەوڵەتی بەناوی پەیمانی ماف مرۆڤی ئیمزا کرد، پاش ئیمزاکردنی ئەو پەیمانە (PKK) لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی وەکو لایەنێکی شەڕ ناسرا.

★ لە (کۆتایی کانونی دووەمی (١٩٩٤) تا سەرەتای شوباتی (١٩٩٥) کۆنگرەی پێنجەمی (PKK) لە کوردستان بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا بڕیاری نەهێشتنی تەسفیەگەرێتی و چەتەگەرێتی درا، هەروەها بڕیار و پێداگری لەسەر پێشخستنی پارتیبوون درا...

★ لەبەهاری (١٩٩٥)دا سوپای تورکیا بەهاوکاری (پ د ك) ئۆپەراسیۆنێکی مەزنی بەناوی ئۆپەراسیۆنی پۆڵایین (ÇELİK OPERASYONU) بەئامانجی لەناوبردنی (PKK) ئەنجام دا. بەڵام وەك هەموو ئۆپەراسیۆنەکانی دیکە بەو ئامانجەی خۆی نەگەیشت و زەبرێکی مەزنی خوارد.

★ لەنەورۆزی (١٩٩٥)دا لەمیانەی کۆنفرانسێکدا؛ یەکێتی نەتەوەیی دیمۆکراتی کوردستان (YNDK) دامەزرا، لەو کۆنفرانسەدا شەهید دسەروان بەسکرتێری گشتی هەڵبژێردا، زۆری نەبرد لەلایەن (پ د ك) و (ی ن ك)وە هەوڵی مارژینالکردن و پارچەکردنی درا و هەر یەکێکیان لەلای خۆیەوە (YNDK)یەکی ساختە و گرێدراوی خۆیان دروستکرد. لەساڵی (١٩٩٩)وە (YNDK)وەك ڕێکخستن هەڵوەشایەوە.

★ لە(١٩٩٥/٣/٣١)دا یەکەم کەناڵی ئاسمانی کوردان (MED -TV) لەئەورووپا کرایەوە و دەستی بە پەخشی فەرمی خۆی کرد و بووە هێزێکی مەعنەوی مەزن و هەڵمەبازێکی مێژوویی لە بواری ڕاگەیاندنی کوردیدا.

★ لە (١٩٩٥/٤/٢١) پەرلەمانی کوردستان لەدەرەوەی وڵات (PKDW) دامەزرا. ئەو پەرلەمانە وەك سەکۆیەکی سیاسی و دیپلۆماسی گەلی کورد ڕۆڵێکی گرنگی بینی لەناساندنی دۆزی ڕەوای گەلی کوردستان لەئاستی ئەورووپادا. ئەو پەرلەمانە لەنوێنەری زۆر پارت و ڕێکخراوی سیاسی و مەدەنی و کەسایەتی سەربەخۆی هەر چوار پارچەی کوردستان و هەندەران پێکهاتبوو و تا ساڵی (١٩٩٩) خەباتی خۆی بەردەوام کرد و پاشان لەچوارچێوەی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان (KNK)دا درێژەی بەخەباتی سیاسی و دیپلۆماسی خۆی دا...

★ لە (١٩٩٥/٨/٢٦)دا شەڕ لەنێوان (PKK) و (پ د ك) هەڵگیرسا و تا کۆتایی ئەو ساڵە بەردەوام بوو. پاشان (PKK) ئاگربەستی ڕاگەیاند و (پ د ك)ش ئەو ئاگربەستەی پەسندکرد و تا مانگی گوڵانی (١٩٩٧)بەردەوام بوو. لەمیانەی بەشداریکردنی (پ.د.ك) لە ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورکیا لە(١٩٩٧\٥\١٤) دیسان شەڕ و پێکدادان دەستیپێکردەوە.

★ لەئایاری ( ١٩٩٦)دا کۆنفرانسی چوارەمی (PKK) بەسترا.

★ لە (٢٤\١٢\١٩٩٥ ) جارێکی دیکە ئاگربەستی یەکلایەنەی لەبەرامبەر تورکیا و (پ د ك)ی ڕاگەیاند. بەڵام دیسان ئەو ئاگربەستەش بێ وەڵام مایەوە.

★ لە (٦)ی ئایاری (١٩٩٦)دا لەمیانەی پیلانگێرییەکی هەمەلایەنەدا؛ لە شام ترومبێلێکی بۆمبڕێژکراو لەنزیك شوێنی مانەوەی سەرۆك ئاپۆ تەقێندرایەوە. لەم پیلانگێرییەدا ئیستخباراتی چەندین دەوڵەت هەندێك هێزی کوردانیش تێیدا بەشدار بوون. بەڵام پیلانەکە سەرناکەوێت.

★لە(١٩٩٦/٦/٣٠) کچە گەریلای (ARGK) هەڤاڵ زیلان (زەینەب کناجی) لە شاری دێرسیم لەبەرامبەر پیلانگێڕییەکەی (٦)ی ئایاردا لەنێو ژمارەیەك ئەفسەر و سەربازی داگیرکەری تورك چالاکییەکی گیانبازی ئەنجام دا و خۆی تەقاندەوە و بەدەیان سەرباز و ئەفسەری تورکی کوشت.

★ لە(١٩٩٦/١٠/٤)دا دکتۆر سیروان، سکرتێری گشتی یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان "YNDK". لەنزیك گوندی"قەڵاچووغەی سەی کەریم"ی سەر بەناوچەی"ئاغجەلەر" بەدەستی چەکدارانی (پ د ك) لەگەڵ هەڤاڵان"حاجی قامشلۆیی، عەگید گەرمیانی، بابان، دیلان ماردینی دا شەهید کران.

★ لە(١٩٩٦/١٠/٢٥)دا لە شاری ئامەد هەڤاڵ رەوشەن (لەیلا کاپلان) بە چالاکییەکی گیانبازی ڕووبەڕووی دووژمن بۆوە.

★ لە(١٩٩٦/١٠/٢٩)دا لە شاری سیواس هەڤاڵ بەرماڵ (گولەر ئاتاچ) بە چالاکییەکی گیانبازی ڕووبەڕووی دووژمن بۆوە.

★ لە(١٩٩٧/٥/١٤)دا بەپاڵپشتی (پ د ك) سوپای تورك ئۆپەراسیۆنێکی مەزنی دژی (PKK) و باشووری کوردستان ئەنجام دا.

★ لە(١٩٩٧/٥/١٦)دا چەکدارانی (پ د ك) لە شاری هەولێر پەلاماری بنکە و بارەگاکانی "YNDK" و نووسینگەی ڕۆژنامەی وڵات و نەخۆشخانەی مانگی سووری کوردستان و نوێنەرایەتی باشووری (PKK) و مەڵبەندی ڕۆشنبیری مێزۆپۆتامیا و نووسینگەی "MEDTV"یان دا و لەئاکامدا کۆمەڵکوژییەکی مەزن ئەنجام درا و بە دەیان شۆڕشگێڕ و برینداری شەڕ و نەخۆش و نووسەر و ڕۆشنبیر و وڵاتپارێز شەهید و شونبزر کران.

* لەسەرەتای حوزەیرانی (١٩٩٧)دا لە هەرێمی زاپ بە دەستی گەریلاکانی "ARGK" کۆپتەرێکی سوپای داگیرکەری تورك بەردرایەوە کە چەندین گەورە ئەفسەری بەڕێوەبەری ئۆپەراسیۆنەکەی تێدا کوژران و لەناوچوون. پاشان دەوڵەتی تورك پاشەکشێی خۆی لە ئۆپەراسیۆنەکە ڕاگەیاند.

* لە(٢٠)ی ئەیلولی (١٩٩٧)دا جارێکی دیکە داگیرکەری تورك پەلاماری باشووری کوردستانی دایەوە و دیسان شکستی هێنا.

* لە (١\٩\١٩٩٨)دا بەبۆنەی ڕۆژی ئاشتی جیهانییەوە و لەپێناو زەمینە خۆشکردن بۆ دیالۆگ و چارەسەرکردنی کێشەی کورد (PKK) ئاگربەستێکی یەکلایەنەی ڕاگەیاند. بەڵام ئەو بانگەوازییەی ئاشتیش وەك بانگەوازەکانی دیکە بەپیلانگێڕی وەڵام درایەوە.

* لە (١٩٩٨\٩\١٧)دا بەسەرپەرشتی و هاوکاری ئەمریکا و تورکیا ڕێککەوتنی واشنتۆن لەنێوان (ی ن ك) و (پ د ك) ئەنجام درا، لەم ڕێککەوتنەدا پیلاننامەی تەسفیەکردنی ڕێبەر ئۆجەلان و (PKK) درا، کە پاشان ئەو ڕێککەوتنە بەشێوەیەکی کرداری لەڕێککەوتی (٩\١٠\١٩٩٨) دەستپێیکرد و بەتۆمەتی داڵدەدانی ڕێبەر ئۆجەلان هەڕەشە لەسوریا دەکرێت. ڕێبەر ئۆجەلان لە خۆرهەڵاتی ناوینەوە (سوریا) بەرەو ئەوروپا (یۆنان) چوو.

* لە (١٩٩٨)دا سەما یوجە لە زیندانی ساغمالجیلەر (لە ئەستەنبوڵ) دژی مەیلە خیانەتکارییەکان و هێرش و شاڵاوەکانی ڕژێمی تورکیا ئاگر لە جەستەی خۆی بەردەدات و پرۆتستۆی خیانەت و داگیرکاری دەکات.

* لە (٩\١٠\١٩٩٨)دا ڕێبەر ئۆجەلان سوریا بەجێدێڵێت و بەرەو یۆنانستان بەڕێدەکەوێت. بەڵام هەر لە فرۆکەخانەوە ئەوانەی بانگهێشتیان کردووە پێشوازی لێناکەن و خاوەنداری لە بانگهێشتنامەکەی خۆیان ناکەن. بۆیە ڕێبەر ئۆجەلان بەرەو روسیا بەڕێدەکەوێت. دوای ماوەیەك حکومەتی روسیاش پەسندناکات ڕێبەر ئۆجەلان لەوێ بمێنێتەوە، بۆیە جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە یۆنانستان. بەڵام دیسان ڕێگەی مانەوەی پێنادەن. بۆیە ڕەوانەی سەفارەتی یۆنانستان لە "کینیا" دەکرێت. ئیدی دوای مانەوەی چەند ڕۆژێك لەو سەفارەتە لەفرۆکەخانەی ئەو وڵاتە دەرفێندرێت و بەدەستگیرکراوی تەسلیمی تورکیا دەکرێتەوە.

* لە (١٥\٢\١٩٩٩)دا رێبەر ئۆجەلان بەپیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی لە وڵاتی "کینیا"وە دەرفێندرێت و دەستگیر دەکرێت و تەسلیمی تورکیا دەکرێتەوە. لەو کاتەوە تاکو ئێستا لەزیندانی ئیمرالی لەنێو رەوشێکی پڕ دژواردا لەژوورێکی تاکەکەسییدا زیندانیکراوە.
* لەکاتی دەستپێکردنی پیلانگێڕیی نێودەوڵەتی و دەرچوونی رێبەر ئۆجەلان لە سوریاوە بۆ ئەوروپا و پاشان دەستگیرکردنی و تەسلیمکردنەوەی بە تورکیا زیاتر لە (٨٥) کەس لە کادیران و دۆست و هەواداران لەهەر چوارپارچەی کوردستان و دەرەوەی وڵات، چ بەچالاکی فیدایی دژی هێزەکانی دووژمن یان بە ئاگر لەخۆبەردان چالاکی گیانبازیان ئەنجام دا و ئەو پیلانگێڕییەیان مەحکوم و پرۆتستۆ کرد. ئەگەر بانگەوازی چەندین جارەی رێبەر ئۆجەلان بۆ دەستبەردان لەو جۆرە چالاکییە نەبووایە، ئەوا ئەو شێوە چالاکییانە زیاتر بەربلاو و فراوان دەبوو...
* لە شوباتی (١٩٩٩)دا شەشەمین کۆنگرەی (PKK) سازدرا، لەئانوساتی بەستنی کۆنگرەکەدا هەواڵی رفاندن و دەستگیرکردنی رێبەر ئۆجەلان بەپیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی دەبیسترێت... ئیدی کۆنگرە دەستبەرداری رۆژەڤەکانی خۆی دەبێت و بڕیاری بەرزکردنەوەی شەڕ و بەرخۆدانی نەتەوەیی دەدرێت...
* لەساڵی (١٩٩٩)دا بڕیاری کشاندنەوەی سەرجەم هێزەکانی گەریلا لە تورکیا و باکووری کوردستانەوە بۆ سەر سنووری باشوور دەدرێت، لەپێناو دروستکردنی زەمینەی دیالۆگ و ئاشتی و چارەسەری.
* لە (١٩٩٩)دا دوو گروپی ئاشتی بەمەبەستی نیشاندانی نیازپاکی و داخوازی دیالۆگ و ئاشتی بەرەو تورکیا بەڕێدەکەون. ئەم دوو گروپە یەکێکیان لەناو هێزەکانی گەریلا و ئەوەی تریشیان لە ئەورووپاوە هەڵگری نامە و پەیامی ئاشتی و نیازپاکی بوون و ئەو نامەیە ئاراستەی سەرۆك کۆمار و سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆك وەزیران و سەرۆك ئەرکانی گشتی کرابوون. بەڵام هەر لەگەڵ گەیشتنی هەردوو گروپەکە دەستگیر کران و هیچ وەڵامێکی ئەو نامانەیان نەدایەوە.
* لە زستانی ساڵی (٢٠٠٠)دا حەوتەمین کۆنگرەی (PKK) بەشێوەیەکی ئاوارتە ساز دەدرێت. لەو کۆنگرەیەدا بڕیار لەسەر گۆڕانی ستراتیژی (PKK) دەدرێت.

★ لەئەیلولی (٢٠٠٠)دا (ی ن ك) دوای داخستنی هەموو بارەگاکانی وەك" رۆژنامەی وڵات، مەڵبەندی رۆشنبیری میزۆپۆتامیا، یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان، بیرۆی پەیوەندییەکانی (PKK) و....هتد، پەلاماری کەمپی پەروەردەیی قەرەداغی دا و پاشان هێرش و شاڵاوەکانی خۆی بۆ سەر قەندیل دەستپێکرد و شەڕ و پێکدادان پەرەی سەند...

★ لەساڵی (٢٠٠١)دا شەشەمین کۆنفرانسی (PKK) سازدرا.

★ لە هاوینی (٢٠٠١) یەکەمین کۆنفرانسی هێزی پاراستنی گەل ( HPG) سازدەدرێت. بڕیاری هەرە گرنگ کردنەوەی ئەکادیمیای ئەفسەری عەسکەری بکرێتەوە.

★ لە ساڵی (٢٠٠٢)دا هەشتەمین کۆنگرەی (PKK) سازدەدرێت. لەم کۆنگرەیەدا ناوی (PKK) دەگۆڕدرێت و دەبێتە کۆنگرەی ئازادی و دیموکراتی کوردستان (KADEK).

★ لەکۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)دا دووەمین کۆنگرەی (KADEK) سازدەدرێت. لەم کۆنگرەیەدا (KADEK) خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە و کۆنگرەی گەلی کوردستان (KONGRA GEL) دادەمەزرێت. لەهەمانکاتدا ئەو کۆنگرەیە دەبێتە یەکەمین کۆنگرەی "کۆنگرەی گەل"یش. بەڵام بەهۆی مەیل و جموجۆڵە تەسفییەگەرایانەکانەوە سیستەمی کۆنگرەی گەل بەشێوەیەکی راست جێگیر نابێت و لەگەڵ خۆیدا پەرشوبڵاوی دێنێت.

★ لە (١٥)ی (٢٠٠٣)دا هەڤاڵ ئەردال (ئەنگین سینجەر) فەرماندەی (HPG) بەرووداوێك شەهید بوو.

★ لە (٢٠٠٤)دا دووەمین کۆبوونەوە (کۆنگرە)ی جڤاتی گشتی کۆنگرەی گەل سازدەدرێت. لەو کۆنگرەیەدا مەیل و جموجۆڵە تەسفیەگەرییەکان زیاتر ئاشکرا و مەحکوم دەکرێت.

★ لە (١\٦\٢٠٠٤)دا لەسەر بنەمای ماف بەرگری لەخۆکردندا؛ هەڵمەتێکی بەرفراوانی بەرگری لەخۆکردن ئەنجام دەدرێت. لەمیانەی ئەو هەڵمەتەدا تەفگەر خۆی کۆدەکاتەوە و هێرش و پیلانگێڕییەکان بێکاریگەر دەکات و جارێکی دیکە توانستی هەنگاو هاوێشتن بەرەو پێشەوە دەئافرێنێت.

★ لە (١٢\٣\٢٠٠٤) لەمیانەی پیلانگێڕییەکدا و بەئامانجی شکاندنی ئیرادەی گەلی کورد لەرۆژئاوای کوردستاندا هێزەکانی رژێمی سوریا کۆمەلۆژییەکیان لە قامیشلۆ ئەنجام دا،

ئەو كۆمەڵكوژییە لەگەڵ خۆیدا سەرهەڵدان هەموو رۆژئاوای كوردستانی گرتەوە و هاوسۆزی و پشتیوانی نەتەوەیی لەتەواوی كوردستان پتەوتركرد.

★ لە(١٥ - ٢٢)ی گوڵانی (٢٠٠٥)دا سێیەمین كۆبوونەوەی جڤاتی گشتی كۆنگرەی گەل سازدەدرێت.

★ لە (٢٠٠٤\١١\٢٩)دا هەڤاڵان "شیلان كوبانێ، جەمیل، زەگەریا، فوئاد، جوان" لەمیانەی پیلانگێرییەكدا لە دەوروبەری شاری موسڵ شەهید دەكرێن. ئەو هەڤاڵانە لە بەڕێوەبەرایەتی پارتی یەكێتی دیموكراتی (PYD)دا بوون.

★ لە نەورۆزی (٢٠٠٥)دا رێبەر ئۆجەلان لەرێگەی پارێزەرەكانییەوە سیستەمی كۆما كۆمەڵێن كوردستان (KKK) رادەگەیەنێت و گەلیش لەمیانەی پیرۆزباییەكانی جەژنی نەورۆزی هەمان ساڵدا وەك ریفراندۆمێكی جەماوەری و گەلەری ئەو سیستەمە پەسند دەكات و بە هەڵكردنی ئەو ئالآیەی رێبەر ئۆجەلان بۆ (KKK) وەسفی كردبوو خەڵك دروستیان كرد و لەئاهەنگەكانی پیرۆزباییدا بەرزیان كردەوە. لەو كاتەوە (KKK) كە پاشان ناوی گۆڕدرا و بووە كۆما جڤاكێن كوردستان (KCK) یەكەمین سیستەمی گەلە لەمێژوودا كە لەدەرەوەی پێكهاتەی دەوڵەتگەراییەوە دادەمەزرێت و بەڕێوە دەچێت.

★ لەشەوی (٢\١١)ی شوباتی (٢٠٠٦)دا هەڤاڵ ڤیان ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (PKKی ٠٠ی) و فەرماندای هێزی پاراستنی گەل (HPG) و یەژا ستار (YJA STAR) وچەی حەفتانیندا بۆ پرۆتستۆكردنی پیلانگێری (١٥)ی شوباتی (١٩٩٩) و گۆشەگیركردنی رێبەر ئۆجەلان لەزیندانی ئیمرالی و لەبەرامبەر ئەو زوڵم و چەوسانەوەیەی لە گەلی كورد و ژنانی كورد دەكرێت بەچالاكییەكی گیانبازی ئاگری لە جەستەی خۆی بەردا و شەهیدبوو. شەهید ڤیان لەدوای خۆیدا نامەیەكی (٢٤) لاپەڕەیی بەجێهێشتووە، لەو نامەیەدا بەقووڵی باس لە هۆكاری ئەنجامدانی ئەو چالاكییەی خۆی دەكات.

★ لە ئاداری (٢٠٠٦)دا كچە یۆنانی ئەلەفتەریا فۆرتاكی لە یۆنانستانەوە دژ بەسیاسەتی گۆشەگیری لەسەر سەرۆك ئۆجەلان و كوشتوبڕكردنی گەلی كورد چالاكییەكی گیانبازی ئەنجام دا و ئاگری لەجەستەی خۆی بەردا.

★ لە (٢٠٠٦) چوارەمین كۆبوونەوەی جڤاتی گشتی كۆنگرەی كۆنگرەی گەل سازدرا.

* لە (١\١٣\٢٠٠٧)دا پارێزەرانی **ڕێبەر ئۆجەلان** لە ئەورووپادا لەمیانەی **کۆنفرانسێکی** ڕۆژنامەوانیدا ڕایانگەیاند کە **ڕێبەر ئۆجەلان** لە زیندانی ئیمرالیدا بە ماددەی **سترانسیۆم و کرۆم** ژەهرخوارد کراوە. بەمەش بۆ نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بەو پلانگێڕییەی ژەهرخواردنە گەلی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان و دەرەوەی وڵات بەچەندین شێوە دەستیان بە چالاکی پرۆتستۆیی کرد.

* هەر داوی ئەو کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەدا بە بەشداری (٦٨) کەس، (٨)یان هەمیشەیی و (٥٠)یان بەنۆرە لەبەردەم بینایەی **دادگای ماف مرۆڤی ئەورووپا** لە **ستراسبۆرگ** دەستیان بە مانگرتنی بێکۆتایی کرد، بەمەبەستی شەرمەزارکردنی پیلانی ژەهرخواردکردنی **ڕێبەر ئۆجەلان** و فشارخستنە سەر ڕێکخراوی دژ بە ئەشکەنجە (CPT) بۆ ئەوەی دەستەیەك پزیشکی سەربەخۆ سەردانی ئیمرالی بکات و بەزووترین کات پشکنینی پزیشکی ئەنجام بدرێت و چارەسەر بکرێت و لە زیندانی ئیمرالی دەربخرێت. ئەو چالاکییە (٣٩)ی خایاند. ئەو ڕێکخراوە لەژێر فشاری ئەو چالاکییانەدا سەردانی ئیمرالی کرد، بەڵام تا ئێستا ئەنجامی پشکنینەکەی ئاشکرا نەکردووە!!.

* لە (١\١٠\٢٠٠٧)دا لەچوارچێوەی تێکۆشان بۆ ڕاوەستاندنی زوڵم و تیرۆری دەوڵەتی تورکیا و داگیرکەرانی دیکەی کوردستان و زەمینە خۆشکردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی گەلی کورد و ئازادی ڕێبەر ئۆجەلاندا، هەڵمەتی" **ئیتر بەسە**" بەچەندین شێوە و جۆری چالاکی نواندن دەستپێکردووە و تا ئێستا بەردەوامە....

* لە (٢٠\١١\٢٠٠٧)دا کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتی **کۆما جڤاکێن کوردستان** (KCK) و دیوانی سەرۆکایەتی **کۆنگرەی گەل** پرۆژەیەکی چارەسەری بەناوی **"جارنامەی چارەسەری دیموکراتیانە"**ی لە حەوت خاڵدا پێشکەش کرد، بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی کورد. بەڵام ئەم پرۆژەیە بە پیلانگێڕی و ئۆپەراسیۆنی بەرفراوانی سەربازی وەڵام درایەوە.

* ڕۆژی (٣ ١١\٢٠٠٨) حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ چەندین جار و لەدەرەوەی یاسا بارەگای "هەولێر" و "سلێمانی"ی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (PÇDK)ی داخستەوە.

* رۆژی (٥ ـ ١١ـ ٢٠٠٨) حکومەتی هەرێمی کوردستان ئابلۆقەی ئابووری و راگەیاندنی لەسەر بناری قەندیل (هەرێمی پاراستنی میدیا) و کامپی ئاوارەکانی مەخمور سەپاند.

* لەشەوی (١٥ ـ ١٦)ی مانگی (١٢)ی (٢٠٠٨)دا (٥٣) فرۆکەی جەنگی سوپای تورك گوندەکانی باشووری کوردستانیان بۆردومان کرد. لە ئاکامدا (٢) گوندنشینی بناری قەندیل و (٥) گەریلا شەهیدبوون و بەدەیان کەسیش بریندار بوون. هەروەها چەندین نەخۆشخانە و خوێندنگا و خانووی گوندنشین وێران کران و بەسەدان سەر مەڕیش لەناوچوون.

# کورتکراوەی

# ناوی پارت و ڕێکخراوەکان

کۆنگرا گەل KONGAR GEL: کۆنگرەی گەلی کوردستان.

PKK: پارتیا کارکەرێن کوردستان، پارتی کرێکارانی کوردستان.

KNK: کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان

KJB: کۆما ژنێن بلند

YAJK: یەکێتی ئازادی ژنانی کوردستان

PAJK: پارتی ئازادی ژنانی کوردستان

ARGK: ئارتەشی رزگاریخوازی گەلی کوردستان

ERNK: ئەنیا رزگاریا نەتەوا کوردستان، یان بەرەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان

YAJK: یەکێتی ئازادی ژنانی کوردستان

HEP: پارتی رەنجی گەل

DEP: پارتی رەنجی دیموکراتی

DEHAP: پارتی گەلی دیموکراتی

HADEP: پارتی دیموکراتی گەل

HRK: هێزی رزگاری کوردستان

(KCK)KKK: کۆما کۆمەڵانی کوردستان، یان کۆما جڤاکێن کوردستان

PKDW: پەرلەمانی کوردستان لەدەرەوەی کوردستان

HPG: هێزی پاراستنی گەل.

TİİKKO: TÜRKİYE İHTİLALCİ İŞÇİ KÖYLÜ KURTULUŞ ORDUSU ئارتەشی رزگاریخوازی کرێکاران و جووتیارانی شۆڕشگێری تورکیا

DDKD: Devrimci Demokratik Kültür Dernekleri کۆمەڵەکانی کولتووری دیموکراتی شۆڕشگێڕ

DEV-YOL: DEVRİMCİ YOL رێگای شۆڕشگێری

DEV-SOL: DEVRİMCİ SOL چەپی شۆڕشگێڕ

ADYÖD: ANKARA DEVRİMCİ YÜKSEK ÖĞRENİM DERNEĞİ کۆمەڵەی خوێندکارانی خوێندنی باڵای شۆڕشگێڕ لە ئەنقەرە

TSP: TÜRKİYE SOSYALİST PARTİSİ پارتی سۆسیالیستی تورکیا

TSIP: TÜRKİYE SOSYALİST İŞÇİ PARTİSİ پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی تورکیا

THKO: TÜRKİYE HALK KURTULUŞ ORDUSU ئارتەشی رزگاری گەلی تورکیا

THKP-C: (Türkiye Halk Kurtuluş Partisi-Cephesi) بەرەی - پارتی - رزگاری گەلی تورکیا.

KUK: Kürdistan Ulusal Kurtuluşçuları رزگاریخوازانی نەتەوەیی کوردستان.

UDG: Ulusal Demokratik Güçbirliği یەکێتی هێزە دیموکراتییە نەتەوەییەکان

PSK: Partiya Sosyalist a Kürdistan پارتی سۆسیالیستی کوردستان

پ د ك: پارتی دیموکراتی کوردستان

ی ن ك: یەکێتی نیشتمانی کوردستان

# فەرهەنگۆکی هەندێك
# لە وشە و زاراوەکان

**ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز:** ئەکادیمیای پەروەردەیی تەڤگەری (PKK) بوو، تێیدا پەروەردەی فیکری، سیاسی و عەسکەری بەڕێوەدەچوو. شوێنی ئەو ئەکادیمیایە لە دۆڵی "بیقاع"ی لوبنان بوو، لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا (PKK) بەهاوکاری رێکخراوە شۆڕشگێڕە فەلەستینییەکانی وەك "بەرەی دیموکراتی فەلەستینی" دایمەزراند. لەدوای شەهیدبوونی هەڤاڵ عەگید (مەعسوم قۆرقماز) و وەرگرتنی بڕیاری بەسوپابوون (بەئارتەشبوون) و دامەزراندنی (ARGK) لە کۆنگرەی سێیەم (١٩٨٦)دا، وەك رێزگرتن و بیرەوەرییەکی شەهیدبوونی هەڤاڵ عەگید ، ئەو ئەکادیمیایە بەناوی ئەوەوە کرا. لەساڵی (١٩٩٢)دا لەژێر فشارێکی زۆری ئەمریکا و تورکیادا بۆ سەر حکومەتی لوبنان، ئەو ئەکادیمیایە داخرا.

**بەرگری رەوا:** بەرگری رەوا مافێکی سروشتی و گەردوونی هەموو کەس و هێز و لایەن گەل و نەتەوەیەکە لەبوارە سیاسی، سەربازی و یاساییەکانەوە و بەندێکی نێو جاڕنامەی جیهانی ماف مرۆڤیشە. لەبەرامبەر هەر هێرش و پەلاماردانێك ماف بەرگری لەخۆکردن مافێکی رەوایە، تەنانەت پێشێلکردنی هەرە مەزن بەرگری لەخۆنەکردنە، واتا بەکارنەهێنانی ئەو مافەیە. بەرگری رەوا سێ جۆرە یان بڵێین سێ ئاستی هەیە: بەرگری رەوای پاسیف، بەرگری رەوای چالاك، بەرگری رەوای سەرتاسەری.

**بەڕێوەبەرایەتی پراکتیکی:** (سەرۆکایەتی مەیدانی، یان سەرۆکایەتی تاکتیکی) بەو بەڕێوەبەرایەتییە دەگووترێت کە بەرپرسیار و سەرپەرشتیکار و جێبەجێکارە لە پراکتیکدا.

**بکەری نادیار:** واتا ئەو کارەی کە بکەرەکەی دیار نییە و نازانرێت کێ کردوویەتی. بەڵام لەم پەرتووکەدا مەبەست لە دەستەواژەی (بکەری نادیار) سەرجەم ئەو کارە تیرۆریستیانەیە کە لەسەرەتای ساڵانی نەوەدەکانەوە تاوەکو ئێستا لەباکووری کوردستان و تورکیا لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە و لەرێگەی رێکخراوە شاراوە و نهێنییەکانی وەك "

میت، حزبوڵڵا، ژیتەم، کۆنتراگەریلا، ئۆزەل تیم...هتد" بەرێوە دەبردرێت. ئەو کارە تیرۆریستیانەی لەژێر ناوی "بکەری نادیارەوە ئەنجام دەدرێت، بەشێکە لە" تیرۆری دەوڵەت"ی تورکیا کە بەردەوام لەدژی گەلی کورد بەگشتی و ئازادیخواز و دیموکراتیخوازەکان لە کوردستان و تورکیا بەرێوەی دەبات. لەسەرەتای نەوەدەکانەوە تاوەکو ئێستا قوربانیانی "بکەری نادیار" زیاتر لە (١٠٠٠٠) دەهەزار کەسە، کە لەنێویاندا رۆژنامەوان ، هونەرمەند، نووسەر، چالاکوانانی بواری ماف مرۆڤ و حقوق، سیاسەتمەدار، مامۆستا، خوێندەڤان، کاسبکار، جووتیار، شوان، هەروەها ژن، منداڵ و پیریش هەن. تیرۆرکردنی نووسەری گەورەی کورد موسا عەنتەر کە تەمەنی لەسەرووی هەشتاوە بوو، نموونەیەکی قوربانی تیرۆری دەوڵەتی تورکیایە. ئەوەی جێی سەرنجە تا ئێستا یەك کەسیش لەسەر ئەو تاوانانەی لەژێر ناوی "بکەری نادیار" کراوە، لەلایەن دادگای دەوڵەتەوە سزا نەدراوە، تەنانەت ئەگەر بکەرەکە ئاشکراش ببێت هەر سزا نادرێت، بەڵکو دەپارێزرێت و ئیمتیازی زیاتری پێدەدرێت، بۆنموونە؛ تەقاندنەوەی پەرتووکخانەی ئومێد لە شەمزینان لە (٩)ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) گەل تاوانبارانیان لەسەر تاوانەکە و بەدەمیان بەڵگەوە دەستگیرکرد کەچی داداگا بەرەڵای کردنەوە....

**بەلشەفیك**: وشەیەکی روسییە، واتا زۆرینە. کاتێك کە "**لینین**" لەساڵی (١٩٠٤)دا مۆدێلێکی رێکخستنی بۆ **پارتی کۆمۆنیستی روسیا** پێشنیاز کرد، زۆربەی بەشدارانی کۆنگرەکە لەگەڵ مۆدێلەکەی "**لینین**" دابوون و کەمینەش لەدژی ئەو مۆدێلە پێشنیازکراوەی "**لینین**" نەبوون. بەزمانی روسی بەزۆرینەکانیان دەگووت"**بەلشەفیك**" بە کەمینەکانیش "**مەنشەفیك**". ئەو مۆدێلەی کە "**لینین**" پێشنیازی کردبوو؛ میکانیزمەی "**ناوەندی دیموکراتی**" بەبنەما دەگرت و دەبوو ئەندامی پارتی ئامادە بێت لەشانەیەکی رێکخستنیدا جێگە بگرێت و ببێتە ئەندامی شانەیەکی رێکخستنی ئەوکاتە ئەندامێتی ئەو کەسە پەسند دەکرا. بەڵام "**مەنشەفییەکان**" پێیان وابوو مەرج نییە ئەندام ببێتە ئەندامی ئۆرگانێکی رێکخستنی، بەڵکو هەر کەسێك بەرنامە و بیروبۆچوونی پارتی پەسند کرد و کاری بۆکرد ئەوا ئەندامی پارتییە. کاتێك کە بەلشەفیکەکان لەمیانەی شۆرشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧)دا سەردەکەون و دەسەڵات دەگرنە

دەست، ئەوا بەگوێرەی چەمکەکانی خۆیان سۆفییەتیان بەڕێوە برد. بەو شێوە ڕێکخستنییەی کە "لینین" دایهێنا دەگووترێت شێوە ڕێکخستنی بەلشەفیانە و لەهەموو جیهاندا بووە مۆدێلی پارت و ڕێکخراوە کۆمۆنیستیی و سۆسیالیستییەکان.

**تەسفیەگەرێتی:** بریتییە لەو هەوڵانەی لەناو ڕێکخستندا دراون بۆ بەلاڕێدا بردنی ڕێکخستن و گۆڕینی هێڵی تێکۆشانی ڕێکخستن.

**تەڤگەر:** بزووتنەوە، بزاڤ، جولانەوە، جموجۆڵ. بەڵام لەدووتوێی ئەم پەرتووکەدا وشەی (تەڤگەر) لەزۆر کاتدا بەواتای تەڤگەری ئاپۆچی یان تەڤگەری (PKK)دێت.

**چەتەگەرێتی:** لەبنەڕەتدا ئەو چەمکی چەتەگەرێتییە لەچەمکی گوندێتییەوە دەرچوو. لەبنەمادا چەمکی چەتەگەرێتی ساڵی (١٩٨٧) دەستیپێکرد و "کۆر جەمال" نوێنەرایەتی ئەو چەمکەی دەکرد و لەناو تەڤگەر و لەناو گەریلادا پەرەی پێدا. هەرچەندە ئەو چەمکە **چوار چەتەکان** لەپراکتیکدا پێشیانخست و بەهێزیان کرد، بەڵام لەبنچینەشدا ئەبوبەکر (خەلیل ئەتاج) و بۆتان (نیزامەددین تاش) کە دوو بەرپرسیاری ئەوکاتە بوون، ئەو خەتەی ئەوانیان دەپاراست، ئەوانە بوونە هۆی ئەوەی خەتی چەتەگەرێتی و ڕێکخستنکردنی چەتەگەرێتی ئەوەندە تەشەنە بکات و ئەوەندە تەخریبات لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. لەبنەمادا، لەژێر بەرپرسیارێتی هەردووکیاندا ئەو خەتە و ئەو هەموو تەخریباتانە ڕوویاندا. بەڕێز **جەمیل بایك** لەم بارەیەوە دەڵێت:" ئەو پراکتیکەی لە ماردین و بۆتان و دەوروبەری لەدژی گوندەکان، لەدژی کەسانی سفیل پێشکەوت لەژێر ناوی "ئەوانە سیخوڕن، چەتەن و جاشن" تەسفیەکردنی ئەو کەسانە هەمووی لەژێر بەرپرسیارێتی" **نیزامەددین تاش و خەلیل ئەتاج**"دا پێشکەوت...". لەساڵانی (٢٠٠٤ ـ ٢٠٠٥ )شدا ئەو کەسانە خواستیان ئیدی تایبەتمەندێتی چەتەگەرێتی و تەسفیەگەرێتی خۆیان بەتەواوی بسەپێنن. بەڵام کە لەمەدا سەرنەکەوتن، بەیەکەوە لەنێو ڕێکخستندا هەڵاتن.

**چوارچەتە:** بە" کۆر جەمال، هۆگر، مەتین، شەمدین ساکیك" دەگووترێت "چوار چەتە"کە. چونکە ئەوانە سەرکێشی پراکتیکی چەتەگەرێتیان لەنێو تەڤگەردا کردووە. ئەوانە لەنێو تێکۆشانی گەریلاییدا لەدەرەوەی ئامانج و پرەنسیپ و ڕێبازی (PKK)

چالاکی و جموجۆڵ و هەڵسوکەوتیان کردووە. ئەو چەتانە بەسوود وەرگرتن لە رەوشی پـڕ دژواری خـەباتی گـەریلایی لـە هەشـتاکان و سروشـتی پێکهاتـەی گونـدێتی و گوندنشینی کۆمەڵگای کوردستان و خۆشکردنی زەمینەی چەتەگەرێتی لەلایەن هەردوو بەرپرسیاری ئەو کاتەی گەریلا "خـەلیل ئـەتاج" و "نیزامـەددین تـاش" ئـەو چـەتانە چـەمکی چـەتەگەرێتی خۆیـان تەشـەنەپێدا. سـەرەڕای هـەموو تـەدبیرەکانی سـەرۆك و رێکخـستن، بـەڵام زەرەر و زیـانێکی زۆریـان لـە تەڤگـەر و گـەل دا، چـەندین چـەمکی دواکـەوتووی وەك؛" گروپـچێتی، پێرپێرێتـی، تەکـەتول، بـەکارهێنانی توندوتیـژی لەرادەبەدەر و بێ هۆ، موڵکییـەتی شەخسی، دەسـەڵاتخوازێتی، پیلانگێرێتـی، گونـدێتی و...هتـد"یـان لـەناو تەڤگـەردا پـەرە پێـدا. دوای هـەوڵ و کۆشـشێکی زۆری سـەرۆك و هەڤاڵانی ملیتان و گشت تەڤگەر توانرا ئەو چەتانە و چەمکەکانیان ریسوا و بێکاریگەر بکـرێن و پاشماوەکانیـان بـسڕدرێتەوە، بەمـەش تەڤگـەر لـە کەسـانی چـەتە و چـەمکە چەتەگەرییەکانیان پاك بکرێتەوە و تەڤگەر بکەوێتەوە سەر رەوت و راستەڕێی خۆی.

**دیموکراتی راستـەوخۆ:** بریتییە لـەو سیـستەمەی کە گەل راسـتەوخۆ خـۆی بـەڕێوە دەبات. ئەم سیستەمە لەخوارەوە بۆ سەرەوە خۆی بنیاد دەنێت و دیموکراسییەت تـەنیا میکـانیزمێکی ئیـداری نییـە، بـەڵکو خـودی سیـستەمەکەیە و گـەل هـەمووی بەیەکـەوە مومارەسەی دەکەن، نەك تەنیا نوخبەیەکی سیاسی باڵادەست. هەروەها ئـەم سیـستەمە لەدەرەوەی زیهنییەت و پێکهاتەی دەوڵەتگەراییەوە بەڕێوەدەچێت.

**دیمـوکراتی نوێنـەرایـەتی:** بریتییـە لـەو سیـستەمەی کە گـەل نوێنـەرانی خـۆی بـۆ ئۆرگانەکانی دەسەڵات و دەوڵەت هەڵدەبژێرێت و لەرێگەی ئەو نوێنەرانەیەوە بەشـداری لەدەسەڵات دەکات. واتا دیموکراسییەت وەك میکـانیزمێکی ئیـداری دەوڵـەت بـۆ دەسـتاو دەسـتکردنی دەسـەڵات کـاری پێـدەکرێت، نـەك وەك سیـستەمێك کـە ئیرادەی گـەل راسـتەوخۆ بەشـداری تێـدا دەکـات، بـەڵکو بەنوێنـەرایـەتی گـەل نوخبەیـەکی سیاسـی مومارەسەی دەسەڵات دەکات.

**سۆسیالیزمی بنیادنـراو:** سۆسیالیزمی ریئال، بەو ئەزموونە دەگووترێت کە سۆڤییەت و چین و وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات و هەندێك وڵاتی ئەمریکای لاتین پەیڕەویان کرد و خواستیان سۆسیالیزم پەیڕەو بکەن. بەڵام لەجێبەجێکردندا لەجەوهـەر و راسـتینەی

سۆسیالیزمی زانستی لایاندا و لەئاکامدا لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا ئەو ئەزموونانە بەرەو هەڵوەشانەوە چوون. ئێستاش هەندێك وڵاتی وەك چین و کۆریای باکوور و کوبا پێداگری لەسەر هەمان ئەزموون دەکەن. ئەو زاراوەیە وەك ئاماژەیەك بۆ دوورکەوتنەوەی ئەو ئەزموونە لە راستینەی سۆسیالیزم بەکاردەهێنرێت...هەروەها بۆ هەموو ئەقڵییەت، چەمك، کولتوور، شێوازی بیرکردنەوە و ژیان و کارێك دەگووترێت کە لەو ئەزموونەدا سەریهەڵداوە، یان خوازیار بێت لاسایی بکاتەوە.

**ژیری سۆزداری و ژیری ئەنالیتیکی:** بەپێی زانست ژیری مرۆڤ دوولایەنەیە؛ لایەنی سۆزداری و لایەنی شیکاری. ژیری سۆزداری ئەو لایەنەی پێکهاتەی ژیری مرۆڤە کە سۆز بەسەریدا زاڵە و رەنگدانەوەی خۆی لەهەڵسوکەوت و مامەڵەکردن لەگەڵ رووداو و دیاردەکاندا. ژیری شیکاریش بریتییە لەو بەشەی ژیری مرۆڤ کە پیشت بەزانیاری و پێدراوەکان دەبەستێت و دابڕاو لەسۆز مامەڵە لەگەڵ رووداوەکاندا دەکات.

**کۆمەڵگای ژێرەوە:** بریتییە لەسەرجەم ئەو رەگەز، توێژ و چین، ئایین، ئایینزا، ئەتنیك و گەلانەی ژێردەستە و چەوساوەن. وەك ژن، کۆیلە، سەپان، جوتیار، کرێکار....

**کۆمەڵگای سەرەوە:** بریتییە لە سەرجەم رەگەز، توێژ و چینە دەسەڵاتدار و باڵادەستەکان، ئەوانەی لەئاستی سەروودا لەدەسەڵات و دەوڵەتدا شوێنگیرن. وەك: پیاو، تەکنۆکرات، خانەدان، کۆیلەداران، دەرەبەگ، بۆرژوا...هتد.

**کۆمیناڵی دیموکراتی:** (کۆمەڵگاری دیموکراتی) لەسەر بنەمای بەها کۆمەڵگارییی و هەرەوەزییەکان بنیاد دەنرێت. شانبەشانی لەبەرچاوگرتنی ماف ئازادییەکانی تاك، ماف و ئازادییەکانی کۆمەڵگاکان و پێکهاتە ئەتنیکییەکانیش بەهادار دەبینێت.

**گۆڕەپانی سەرۆکایەتی:** بەشوێنی مانەوەی سەرۆکایەتی (PKK) بەتایبەتی سەرۆك ئۆجەلان دەگوترا. لە ساڵانی نێوان (١٩٧٩ ـ ١٩٩٨) گۆڕەپانی سەرۆکایەتی لوبنان و سوریا بوو. ئەو گۆڕپانە شوێنی سەرەکی پەروەردە و قووڵبوونەوەی فیکری بوو.

**میلیگەرای سەرەتایی:** بریتییە لەو چەمك و پێکهاتەیەی کە بانگەشەی نەتەوەییبوون دەکات، بەڵام لەرووی کردارییەوە پێداویستییەکانی نەتەوەییبوونیش نە لەرووی زیهنی و نە لەرووی کردارییەوە لەخۆیدا بەرجەستە ناکات و بەدیناهێنێت.

بەڵكو پێوانە خێڵەكی و ناوچەگەرییەكان لەبوارە فیكری و سیاسی و كولتووری و ئابوورییەكان بەسەر ئەو پێكهاتە و رێكخستنەدا زاڵە.

**ئاتمۆسفێر:** كەشوهەوا

**ئاژیتاسۆن:** خیتابی حەماسی، هاندان.

**ئەلتەرناتیف:** بەدیل، جێگرەوە.

**ئەنتەرناسۆنالیست:** كەسی نێونەتەوەیی

**ئەماتۆر:** ناپرۆفیشناڵ، رانەهاتوو، بەكەسێك دەگووترێت كە كارێك بكات بەڵام نەیكردبێتە پیشە و خۆی تێدا قووڵ نەكردبێتەوە.

**ئۆبژێكتیف:** بابەتی

**ئۆرگانیزە:** بەرێوەبردن، سەرپەرشتیكردن،رێكخستەكردن.

**ئیكۆلۆژی:** زانستی ژینگە، ژینگەناسی، ژینگەپارێزی.

**ئینسیاتیف:** دەستپێشخەری، مبادرە.

**بایكۆت:** نەچوونە سەر كار، یان نەچوونە دەوام.

**پارادیگما:** جیهانبینی، دیدگا.

**پارڤەكردن:** دابەشكردن،

**پێڤاژۆ:** پێواژۆ، قۆناخ، دۆخ، دۆخی بەرێوەچوو یان دۆخی بەرێوەبراو.

**پراواكسیۆن:** گێرەشێوێنی. ئاڵۆزی دروستكردن.

**پرۆتستۆ:** شەرمەزار و مەحكومكردن

**جڤات:** ئەنجوومەن، شورا

**جڤاك:** كۆمەڵگا

**جڤین:** كۆبوونەوە، گردبوونەوە

**چێبوون:** دروست بوون، ئافراندن

**دیرۆك:** مێژوو.

**دۆگماتیـك:** ، ئـەقڵ وەسـتاو، قاڵبـچی، چەقبەسـتوو، بـەو كەسـانە دەگووترێـت كـە بەشێوەیەكی رەها لەمەسەلەكان دەڕوانێت و باوەڕی بەگۆڕان و پێشكەوتن نەبێت.

**دیالیكتیك:** جەدەلییەت

**تەڤلیهەڤ:** تێكەڵ و پێكەڵ، ئاڵۆز.

**تەڤلیبوون:** بەشداربوون

**تەرز:** شێواز، ئوسلوب.

**تیم:** گروپ، دەستە، مەفرەزە.

**رەوش:** بارودۆخ، هەلومەرج.

**رۆژەڤ:** باسوخواس، ئەجیندا، بابەتی باس.

**زەلال:** روون، ئاشكرا، سازگار.

**كاپیتالیزم:** سەرمایەداری

**كەناڵیزەكردن:** ئاراستەكردن، رێڕەودان.

**كۆردیناتۆر:** كارگێڕ

**كۆردیناسیۆن:** لیژنەی تەنسیق، ئەنجوومەنی كارگێڕی، ئەنجوومەنی تەنسیق.

**كۆنسێپت:** پیلان، نەخشەیەكی كار.

**كێماسی:** كەموكوڕی.

**ڤالا:** پووچ، بەتاڵ، بۆش.

**سەنترالیزم:** ناوەندگەرایی

**سۆبژێكتیف:** خودی (ژاتی)

**ستاتۆ:** قەوارە، كیان، پێكهاتە... ستاتۆپارێز: قەوارەپارێز یان كۆنەپارێز.

**شانتاژ:** هەڕەشە، گوشار، بەكارهێنانی كارتی فشار.

**لەیستۆك:** یاری، گەمە. بۆ پیلانگێڕییش بەكار دێت.

**لینجكردن:** بێكاریگەركردن، گۆشەگیركردن.

**مارژینال:** بێکاریگەر، بچووککردن.

**مەتریال:** کەرەستە.

**مژوول:** خەریك، مژوولبوون: خەریکبوون.

**ملیتان:** شۆڕشگێڕی پرۆفیشناڵی فیداکار

**نۆرماڵ:** ئاسایی.

**نیۆلۆتیك:** چەرخی بەردینی نوێ.

**لیستی ناوی ئەو هەڤاڵ و دۆست و لایەنگرانەی کە لەماوەی نزیکەی سێ مانگدا لەرێکەوتی نێوان (١٩٩٨\١٠\٩) و (١٩٩٩\١٢) بەچالاکی فیدایی یان خۆسووتاندن یان شێوازی دیکەی چالاکی لەدژی پیلانگێری نێودەوڵەتی دەستگیرکردنی سەرۆك ئاپۆ راوەستانەوە.**

| ژمارە | ناوی چالاکوان | رێکەوتی ئەنجامدان چالاکی | شوێنی ئەنجامدانی چالاکی |
|---|---|---|---|
| ١ | محەمەد خالد ئۆزال | (١٩٩٨/١٠/٩) | زیندانی مەرعەش |
| ٢ | موراد کایا | (١٩٩٨/١٠/١٨) | زیندانی بارتن |
| ٣ | محەمەد گول | (١٩٩٨\١٠\١٩) | زیندانی ئەماسیا |
| ٤ | عەلی ئایدن | (١٩٩٨/١٠/١٩) | زیندانی ئەماسیا |
| ٥ | مەرال کاشۆ توراجاك | (١٩٩٨/١٠/٢٠) | زیندانی چاناك قالە |
| ٦ | بولەند بایرام | (١٩٩٨/١٠/٢١) | زیندانی ئادیەمان |
| ٧ | عیسمەت ئینانج | (١٩٩٨/١٠/٢٢) | زیندانی یۆزگات |
| ٨ | حەسەن عیسا حەسەن | (١٩٩٨/١٠/٢٢) | قامیشلی |
| ٩ | فەتاح قەرەتاش | (١٩٩٨/١٠/٢٢) | ئامەد |
| ١٠ | سەلامەت مەنتەش | (١٩٩٨/١٠/٢٢) | زیندانی میدیات |
| ١١ | ئاینور ئارتان | (١٩٩٨/١٠/٢٣) | زیندانی میدیات |
| ١٢ | محەمەد باریانك | (١٩٩٨/١٠/٢٣) | زیندانی ئەلەبستان "مەرەش" |
| ١٣ | جەننەت گونەش | (١٩٩٨/١٠/٢٤) | زیندانی عەنتاب |
| ١٤ | سەبری ئیپەك | (١٩٩٨/١٠/٢٤) | زیندانی ساکاریا |
| ١٥ | ئایسەل جەیلان | (١٩٩٨/١٠/٢٤) | زیندانی ساکاریا |
| ١٦ | سەمەد ئۆکتای | (١٩٩٨/١٠/٢٤) | زیندانی کۆنیا |

| ١٧ | میرزا سەفیملی | (١٩٩٨/١٠/٢٦) | زیندانی ئەرزرۆم |
|---|---|---|---|
| ١٨ | موسلیم محەممەد | (١٩٩٨/١٠/٢٦) | زیندانی عەنتاب |
| ١٩ | کەنعان قەرە حەسەنۆ - لی | (١٩٩٨/١٠/٢٦) | زیندانی ئەرزرۆم |
| ٢٠ | بەرزان ئۆزتورك | (١٩٩٨/١١/١) | ئەڵمانیا(١٩٩٩/١/٤) شەهیدبوو |
| ٢١ | محەممەد ئایدن | (١٩٩٨/١١/١٣) | زیندانی چەناك قالە |
| ٢٢ | ئەردالّ جەکەن | (١٩٩٨/١١/١٣) | زیندانی ماردین |
| ٢٣ | عەباس سەرتکایا | (١٩٩٨/١١/١٤) | زیندانی عومرانی |
| ٢٤ | عیسمەت ئاکای | (١٩٩٨/١١/١٤) | زیندانی ئادیەمان |
| ٢٥ | موحەییەدین سەفیملی | (١٩٩٨/١١/١٥) | زیندانی ئامەد |
| ٢٦ | عومەر شەن | (١٩٩٨/١١/١٥) | زیندانی عومرانی |
| ٢٧ | عەدنان ئۆزجان | (١٩٩٨/١١/١٥) | زیندانی بورسا |
| ٢٨ | قادری ئیلهان | (١٩٩٨/١١/١٥) | زیندانی سێرت |
| ٢٩ | سیراجەدین حەسەن | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی بورسا |
| ٣٠ | رەمەزان مالکۆچ | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی عومرانی |
| ٣١ | عەزیمە ئینان | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی باتمان |
| ٣٢ | رەمزیە زەنگین | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی باتمان |
| ٣٣ | ئیدریس باشاران | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی جەیهان |
| ٣٤ | حانیفی کوزو | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی سێرت |
| ٣٥ | حەمدوڵلا داشجی | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی ماردین |
| ٣٦ | عەلی ئەربەك | (١٩٩٨/١١/١٦) | زیندانی ماردین |
| ٣٧ | مستەفا شاهین | (١٩٩٨/١١/١٦) | ئەڵمانیا |
| ٣٨ | ئەحمەد یلدرم | (١٩٩٨/١١/١٧) | مۆسکۆ |
| ٣٩ | محەممەد تورگای | (١٩٩٨/١١/١٧) | زیندانی کۆنیا |
| ٤٠ | زەینەب عەرەب | (١٩٩٨/١١/١٧) | زیندانی عەنتاب |
| ٤١ | رەمەزان ئیدیبەللی | (١٩٩٨/١١/١٧) | زیندانی کۆنیا |
| ٤٢ | رەمزی ئاککوش | (١٩٩٨/١١/١٧) | مۆسکۆ |

| ٤٣ | فاتمه ئۆزەن (رۆژبین) | (١٩٩٨/١١/١٧) | یوکسەکۆڤا\چالاکی فیدایی |
|---|---|---|---|
| ٤٤ | ئەمروڵلا داملایجی | (١٩٩٨/١١/١٨) | قامیشلی |
| ٤٥ | سولێمان گولتەکین | (١٩٩٨/١١/١٨) | زیندانی ترابزۆن |
| ٤٦ | سەید بایرام | (١٩٩٨/١١/١٨) | دێرك(باشووری رۆژئاوا) |
| ٤٧ | زولکیف یلماز | (١٩٩٨/١١/١٨) | رۆما |
| ٤٨ | فەتیحە عەبدوڵلا | (١٩٩٨/١١/١٨) | زیندانی مەلاتیە |
| ٤٩ | عوسمان تینیت | (١٩٩٨/١١/١٨) | زیندانی مەلاتیە |
| ٥٠ | فازڵ سولوك | (١٩٩٨/١١/١٩) | زیندامی عەنتاب |
| ٥١ | خەلیل ئاکنجی | (١٩٩٨/١١/١٩) | زیندانی بورسا |
| ٥٢ | جەنگیز کایا | (١٩٩٨/١١/١٩) | زیندانی ئاگری |
| ٥٣ | حەمید چاکر | (١٩٩٨/١١/١٩) | ئامەد |
| ٥٤ | مەتین یورتسەڤەر | (١٩٩٨/١١/١٩) | کۆجائەلی |
| ٥٥ | زەهرا رزگار | (١٩٩٨/١١/٢٧) | رۆژهەڵاتی کوردستان |
| ٥٦ | نوری ئاجار | (١٩٩٨/١١/٢٧) | زیندانی ئۆردوو |
| ٥٧ | جەمیل ئۆزالپ | (١٩٩٨/١١/٢٧) | ئامەد |
| ٥٨ | میرزا چوبوکچو | (١٩٩٨/١١/٢٧) | زیندانی باتمان \ لەئەنجامی چالاکی مانگرتن شەهیدبوو |
| ٥٩ | حوسنییە ئۆروج (بنەفش) | (١٩٩٨/١٢/١) | لیجە (چالاکی فیدایی) |
| ٦٠ | حەسەن تاشکن | (١٩٩٨/١٢/٣) | ئەڵمانیا |
| ٦١ | جیهاد شێخۆ | (١٩٩٨/١٢/١٠) | قوبرس |
| ٦٢ | تاقیبە گولتەکین | (١٩٩٨/١٢/١٢) | زیندانی سیواس |
| ٦٣ | خەدیجە فالای | (١٩٩٨/١٢/١٣) | ئەستەمبوڵ |
| ٦٤ | گوڵستان تاش | (١٩٩٨/١٢/١٦) | باتمان |

| ٦٥ | تایلان ئۆزگور قەهرەمان | (١٩٩٨/١٢/٢١) | روسیا |
|---|---|---|---|
| ٦٦ | محێدین ئشك | (١٩٩٨/١٢/٢٤) | عەنتاب |
| ٦٧ | حەمدیە کاپان (بەروار) | (١٩٩٨/١٢/٢٤) | وان \ چالاکی فیدایی |
| ٦٨ | ئەردال ئاکسو | (١٩٩٨/١٢/٢٩) | لەچالاکی رفاندنی فرۆکەدا |
| ٦٩ | سیروان رەئوف | (١٩٩٩/٢/١٨،١٧) | سلێمانی ـ لەشەوی (٢٦ ـ١٩٩٩\٢\٢٧ ) شەهیدبوو |
| ٧٠ | فەلات قادر | (١٩٩٩/٢/٢٥) | یوکسەکۆڤا\ چالاکی فیدایی |
| ٧١ | نورەددین شاهین(فەرهاد بەروار) | (١٩٩٩/٣/٥) | باشکەلا\ چالاکی فیدایی |
| ٧٢ | شاهین حوسێن | (١٩٩٩/٣/١٠) | دهۆك\ چالاکی فیدایی |
| ٧٣ | دیلان گەفەر | حوزەیرانی( ١٩٩٩) | ئەرزرۆم\ چالاکی فیدایی |
| ٧٤ | باقی تاتلی (باران شاهین) | (١٩٩٩/٤/٥) | بینگۆل\ چالاکی فیدایی |
| ٧٥ | نەزهات باراجی (شەهرستان بۆتان) | ١٩٩٩ | |
| ٧٦ | یافوز گوزەل | (١٩٩٩/١١/٣٠) | زیندانی بارتن (١٩٩٩/١٢/٦) لە نەخۆشخانە شەهیدبوو |
| ٧٧ | حوکمیە سەیهان (رووکەن بێریتان) | (١٩٩٩/١٢/) | روسیا |
| ٧٨ | رێناس | (١٩٩٩\٦\٣٠) | زیندانی ورمێ |

| ٧٩ | موسلم | ٢٠٠٠ | زیندانی ئاکریٚ \ لەنەخۆشخانەی ئاکریٚ شەهیدبوو |
|---|---|---|---|

کۆتایی




ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز ـ دۆڵی بیقاع



ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز - دۆڵی بیقاع - لوبنان



شەهید ئەژبیر ـ لەڕێپێوانێکی جەماوەری لەهەولێر
لەمانگی ئابی ، 1992 ، شەهیدکرا



راگەیاندنی ئاگربەستی یەکلایەنە لە
کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا
1993 ـ 3 ـ 17



شەهید بـیریتان (گولناز قەرەتاش)




پۆستەرێك سەبارەت بەساڵرۆژی
دامەزراندنی (PKK)



کۆبوونەوەیەکی جەماوەری لەشاری ئامەد




شەهید د.سیروان لەگەڵ ڕێبەر ئۆجەلان - 1991



شەهید شەرڤان خەڵکی وڵاتی مەغریب

لە کۆمەڵکوژییەکەی هەولێر لە بارەگای پ. د. ك (لە 1997/5/16) شەهیدکرا



شەهید هێلین سەرحەد

لە کۆمەڵکوژییەکەی هەولێر شەهیدکرا

لە (1997/5/16)



شەهید ساڵح ( حەسەن ئاغاچ )
لە کۆمەڵکوژییەکەی هەولێر ( 1997/5/16 )
شەهیدکرا



شەهید هۆزان



شەهید مەریەم لەگەڵ ڕێبەر ئۆجەلان و هەڤاڵانیدا



شەهید سەما یوجە



شەهید ڕووناهی



رێبەر ئۆجەلان لە بەناو دادگای ئیمرالیدا

پۆلێک گەریلا لەکاتی  بەڵێندانی شۆڕشگێریدا



شەهید نوودەم (نووتا)
بە رەگەز ئەڵمان



شەهید ئەمارە ( بەرگەز تورك )

# هەندێك لە ئارم و ئاڵاكانی تەڤگەری ئاپۆچی




ئاڵای (PKK)

لەكۆنگرەی یەكەمەوە تا كۆنگرەی پێنجەم

1978 - 1995



ئاڵای (HRK)



ئالای (ARGK) و (HPG)



ئالای (ERNK) لە 1985وە تا 2000 * ئالای (PKK) لە نەورۆزی 2005وە تا ئێستا



ئالای (PKK)
لەکۆنگرەی پێنجەمەوە تا کۆنگرەی حەوتەم
(1995- 2000)



ئاڵای(PKK) لەکۆنگرەی حەوتەمەوە
تا کۆنگرەی هەشتەم -
پاشان بووە ئاڵای KADEK



ئاڵای کۆنگرەی گەلی کوردستان



ئارمی پارتی ئازادی ژنانی کوردستان PAJK




ئارمی تەڤگەری جوانانی ئازادیخوازی کوردستان
(TECAK)




ئالای (YJA-STAR)



ئالای کۆما جڤاکێن کوردستان (KCK)

# چەپکێک وێنە
# لە مێژووی تێکۆشانی (PKK)



هەڤاڵ جەمیل بایک سڵاو دەداتە هەڤاڵانی خۆی

کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی بۆ راگەیاندنی ئاگربەست



ڕێبەر ئۆجەلان لەگەڵ هەڤاڵ جەمیل بایکدا



هەڤاڵ جەمیل بایك



شەهید سیروان لە نەخۆشخانەدا



شەهید سیروان رەنووف لە نەخۆشخانەدا

چوارده گەریلای شەهیدی کیمیابارانەکەی سوپای تورکیا لە
هەریمی مووش لە 2006 ـ 3 ـ 25


شەهید زەکیە ئەلکان



شەهید زیلان رۆژهەلاتی



شەهید دایکە عایشە کە لەئاکامی هێرشە ئاسمانییەکەی
فرۆکە جەنگییەکانی تورکیا لە16-12-2008



رژێمی تورکیا هەموو گیانەوەرێکی کوردستانیش
بەدووژمنی خۆی دەزانێت



گەریلاکانی هێزی تایبەتی HPG



گەریلاکانی هێزی تایبەتی HPG



پەیمانی شۆڕشگێڕانەی گەریلا




ئیدی ( PKK ) تەڤگەرێکە وەك رووبار هەمیشە شەپۆل دەدات و دەهەرکێت و خۆی نوێدەکاتەوە و پێشدەکەوێت. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لە فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیاکەیەوە وەردەگرێت. بۆیە کەس ناتوانێت بە لۆژیکی باو و لەئارادا راست لە ( PKK ) تێبگات، چونکە ( PKK ) بەگوێرەی ئەو لۆژیکە باوەی هەیە ئاوا نەبووە و بەرێوە ناچێت و کارناکات، بەڵکو لەدەرەوەی ئەو زیهنییەت و لۆژیکەی هەیە ئاوابووە و بەرێوەدەچێت و کاردەکات، بۆیە ئەو زیهنییەتەی لەئارادایە ناتوانێت لە ( PKK ) تێبگات.

لە بڵاوکراوەکانی کۆمیتەی راگەیاندنی (پ.چ.د.ك)